بلاْوكراوەی سایتی مەدینە
www.madinaa.com
07507902026
07501338550

# مێرگ و گوڵزاری بەهار

## بۆ گەشتیارانی

## ﴿ژیانی پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ﴾

دانانی
عبد الله عبد العزیز هەرتەلی

چاپی یەكەم
ربیع الأول (١٤٣٢)ی كۆچی
ڕێبەندان (٢٧١٠)ی كوردی
شـــباط (٢٠١١)ی زایینی
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتیەكان ژمارە سپاردنی (٦٢) ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە
*كتێبخانەی حاجی قادری كۆیی لە هەولێر، چاپی كردوە*

**ناوی کیتاب: مێرگ و گوڵزاری بەهار**

**بابەت: (ژیانی پێغەمبەری ڕێزدارﷺ).**

**دانەر: عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی.**

**بەرواری چاپ: (١٤٣٢)کۆچی- (٢٧١٠)کوردی- (٢٠١١)زایینی.**

**نۆبەتی چاپ: یەکەم.**

**تیراژ: (٦٠٠٠) دانە.**

**چاپخانە: گرین گلوری- لبنان.**

**بڵاوکەرەوە: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی، لە هەولێر.**

---

**بەهار بە باران گوڵان ئەڕوێنێ * گوڵزار بە گوڵان باڵا ئەنوێنێ**

**بەهار هێزێکی تازە ئەهێنێ * بەهەشتی جیهان بۆ گیان ئەنوێنێ**

**بۆ دین و بۆ ژین بۆ ئاوەدانی * بۆ عیلم و زانست بۆ خووی ئینسانی**

**بۆ بەرزکردنەوەی پایەی نیشتمان * بە عەقڵ و عیلم و کردەوە و پەیمان**

**بۆ ڕۆڵەی گەنجم هەتا تێبگەن * بۆ خاوەن ڕەنجم هەتا پێبگەن**

**پێشکەشم کردن بە بەچکەی مەردان * بە ڕۆڵەی هوشیار لە گەلی کوردان**

*لە (بەهار و گوڵزار)ی مامۆستا (عبدالکریم المدرس) گوڵبژێر کراوە*

## *دانراوەکانی تری دانەر:*

**١- هۆنراوەی ﴿ئیمان و ئیسلام﴾.**

**٢- ڕوونکردنەوەی ﴿الأربعین النواویة﴾.**

**٣- ﴿عەقیدەی ئیسلامی﴾.**

**٤- ڕوونکردنەوەی ﴿العقیدة الطحاویة﴾.**

**٥- چەند گوڵێك لە ﴿گوڵزاری ئیسلام﴾.**

**٦- ڕووناکی (رب العالمین) ڕوونکردنەوەی ﴿مِنْهاج الطَّالبین﴾.**

**٧- ڕوونکردنەوەی ﴿قطرالعارض فی علم الفرائض﴾.**

**٨- ﴿چۆنیەتی حەج و عومرە﴾.**

**٩- ﴿ ڕۆژی پرشنگدار، ڕوونکردنەوەی (غایة الإختصار)﴾.**

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

اَلْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعالَمِينَ حَمْداً يُوافِي نِعَمَهُ وَ يُكافِئُ مَزيدَهُ، يا رَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ كَمَا يَنْبَغِي لِجَلالِ وَجْهِكَ ولِعَظِيمِ سُلْطانِكَ لا أُحْصِي ثَناءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَما أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ، اَللَّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ وَبارِكْ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَأَصْحابِهِ كَما صَلَّيْتَ عَلَى إِبْراهِيمَ وَآلِ إِبْراهِيمَ فِي الْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ.

ئەی موسوڵمانی خۆشەویست–اَلسَّلامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ– بزانە: خوایگەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ بۆ دانیشتووانی سەر زەمین، بۆ ئەوە ناردویەتی: (عَقِيدَة)= بیروباوەڕی یەکخواپەرستیو (شَرِيعَة)=لقەکانی ئایین بە خەڵکی ڕابگەیەنێ.

جا لە لایەنی (عَقِيدَة)=بیروباوەڕەوە هیچ جیاوازی لە ڕاگەیاندنی هیچ پێغەمبەرێکدا نەبوەو گشتی بۆ خوا ناسینو تاکو تەنیایی خوایگەورە بووە، لە حەزرەتی باب (آدَم)وە تا حەزرەتی (مُحَمَّد) صلى الله عليهم أجمعين، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلاّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاّ أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ الأنبياء: ٢٥، هەر پێغەمبەرێکمان لە پێش تۆ ناردبێ –ئەی مُحَمَّدﷺ– وەحیمان هەر بۆ ناردووە: کە جگە لە خۆم هیچ خودایەك نیە، کەوابوو: من بپەرستنو بە تاکو تەنیام بناسن.

بەڵام لە (شَرِيعَة)=لقەکانی ئاییندا پێغەمبەران–عليهم الصلاه والسلام–جیاوازییان هەبوو؟ چونکە– بەگوێرەی سەردەم– بۆ بەرژەوەندی ئوممەتەکە، پێغەمبەرەکەیان (شَرِيعَة)ی خوای پێ ڕادەگەیاندن، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً﴾ المائدة: ٤٨، بۆ هەر ئۆممەتێك لە ڕێگای پێغەمبەرانیانەوە جۆرە یاساو بەرنامەیەکمان ناردووە.

ئینجا بە ناردنی حەزرەتی(مُحَمَّد)–پێغەمبەریئیسلامﷺ– خوایگەورە کۆتایی بە ناردنی پێغەمبەران–عليهم الصلاه والسلام–هێناو ئەوی کردە پێغەمبەری ئاخیر زەمانو ناوی لە ئایینی وی نا: (إِسْلام)، جا بە شەریعەتی ئیسلام خوایگەورە گشت شەریعەتەکانیڕابردووی (نَسْخ) کردنەوەو لە کاری خستنو فەرمووی: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلامِ دِيناً فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ آل عمران: ٨٥، هەر کەسێك جگە لە ئیسلام ئایینێکیتری بوێ، لێی قبوڵ ناکرێو ئەو کەسە لە ڕۆژی قیامەت لە زەرەمەندەکانە.

جا ئەو بڕیارەی خوایگەورە بۆ بەرژەوەندی مرۆڤایەتی بوو، خوایگەورە گشت بەرژەوەندیو ڕەوشتە جوانەکانی ئایینەکانی پێغەمبەرانیڕابردووی–عليهم الصلاة والسلام– لە ئایینی ئیسلامدا کۆ کردەوەو بە ناردنی حەزرەتی(مُحَمَّد)ﷺ گشت شەریعەتەکانو

ڕەوشتە بەرزو جوانەكانی تەواو كردن، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إنَّ مَثَلِي وَمَثَلَ الْأَنْبياءِ مِنْ قَبْلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بَيْتاً فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ إِلاَّ مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زاوِيَةٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ وَيَعْجَبُونَ لَهُ وَيَقُولُونَ: هَلاَّ وُضِعَتْ هَذِهِ اللَّبِنَةُ! قالَ: فَأَنَا اللَّبِنَةُ وَأَنَا خاتَمُ النَّبِيِّينَ﴾ رواه الشيخان، هاوێنەیی منو پێغەمبەرانی پێش من، وەكو پیاوێكە خانووێكی دروست كردبێو جوانو ڕازاوەی كردبێ، تەنها شوێنی خشتەیەك نەبێ لە قوژبنەیەك، جا خەڵك بە دەورەی خانووەكەدا دەسوڕانەوەو پێیان سەیر بوو و دەیانگوت: بریا ئەم خشتەیەش داندرابا ! جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: من خشتەكەم، من كۆتایی پێغەمبەرانم عليهم الصلاة والسلام.

جا ئەی موسوڵمانی خۆشەویست: كە پێغەمبەرمانﷺ ئەوها گەورەو ڕێزدار بێو گەورەی هەموو پێغەمبەران بێ-عليهم الصلاة والسلام- زۆر زۆر پێویستە مرۆڤی موسوڵمان شارەزای ژیانی ئەو پێغەمبەرە بێﷺ تا بتوانێ شوێن ئەو پێغەمبەرە بكەوێ، تاكو لە دونیاو قیامەتدا بەختەوەر ببێ.

بەڵێ: هەر چەند پێغەمبەرﷺ-وەكو ئێمە- ئادەمیزادە، بەڵام بە هۆی پێغەمبەرایەتیو ڕەوشتە بەرزەكانی لە سەرەوەی گشت ئادەمیزادێكە: لە ڕەوشتی حاڵەتی گەنجایەتیو پێغەمبەرایەتی، لە ڕەوشتی پەروەردەكردنو فێركردن، لە ڕەوشتی هاوسەریەتیو خێزانداری، لە ڕەوشتی جەنگو سەركردایەتی جەنگ، لە ڕەوشتی ڕاستگۆییو ئەمینیو داوێنپاكیو دەستپاكیو لەخواترسیو بەزەییو...هتد، پێغەمبەرﷺ تاكە سواری گشت ئەو مەیدانانەیەو خوایگەورە بە فەرموودەی ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ القلم: ٤، مەدحی كردوە، واتە بەڕاستی-ئەی پێغەمبەر- تۆ لە سەر ڕەوشتێكی گەورەی.

جا بۆ ئەوەی كوردی موسوڵمان بە ناسینی پێغەمبەرﷺ دڵی ڕۆشن ببێو وەكو ڕۆشنبیرێكی ئیسلام شارەزای ژیانی پێغەمبەرﷺ ببێو هەم لە هەندێك دەققەكانی قورئانو حەدیس تێبگاو گرۆە و كۆمەڵە فێڵبازو دۆرزنەكان-بە ناوی ئایین- لە ڕێبازی پێغەمبەرﷺ لایندەدەن، هەم بۆ ئەوەی منیش-بەندەی گوناهبار-بە باسكردنی پێغەمبەرﷺ سەربەرزو بەختەوەر ببم لە دونیاو قیامەت، ناوی خوام لێهێناو دەستم كرد بە نوسینی ژیانی پێغەمبەرﷺو ناو لێنا:

## ﴿(مێرگو گوڵزاری بەهار) بۆ گەشتیارانی (ژیانی پێغەمبەری ڕێزدارﷺ)﴾

جا من بێگومان دەزانم: ناتوانم مافێكی تەواو بدەمە ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ، چونكە من زۆر زۆر لەوە بێهێزو كەم زانستترم كە ببمە سواری ئەم مەیدانە، بەڵام بەگوێرەی كەم زانستیی خۆم گوڵبژێرێك دەكەم لە گوڵزارەكانی زانایانی ئیسلامو دەیخەمە بەرچاوی خوێنەری خۆشەویست، بە شێوەیەكی وەها: كە ئەم ژیاننامەی پێغەمبەریﷺ

خوێندنەوە–إن شاء الله–هەست بکا لە ناو مێرگو گوڵزارەکانی بەهاردا گەشتێك دەکاو لە هەر جۆرە گوڵێکی باسی پێغەمبەرﷺ بۆنێکی خۆشی بۆ دێ.
هەروەها بە پشتیوانی خوایگەورە لە باسەکانی ئەم ژیاننامەیە چەند سودێك وەردەگرمو –لە دوای باسەکە–بە فەرموودەکانی زانایانی ئیسلام روونی دەکەمەوەو لە سەردێرەکەیدا دەڵێم: ﴿ گوڵبژێریك لەم گوڵزارە ﴾.
جا بۆ نوسینی ئەم ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ سود لە چەند سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو وەردەگرم، وەك:
١–(الجامع لأحكام القرآن) ناسراو بە (تفسير القرطبي).
٢–(تفسير القرآن العظيم) ناسراو بە (تفسير ابن كثير).
٣–(شرح صحيح مسلم بهامش القسطلاني) دانراوی (الإمام النواوي).
٤–(فتح البارى شرح البخاري) دانراوی (الحافظ ابن حجر العسقلاني).
٥–(البداية والنهاية) دانراوی (الحافظ ابن كثير).
٦–(السيرة الحلبية) دانراوی (الإمام على بن برهان الدين الحلبي).
٧(فقه السيرة) دانراوی (الدكتور محمد سعيد رمضان البوطي) ط:٣.
٨–(السيرة النبوية) دانراوی (الدكتور على محمد الصلابي).
هەم چەند سەرچاوەیەکیتریش: کە لە شوێنی خۆیاندا ناویان دەهێنم.
ئینجا جاری وا هەیە: باسەکە لە سەرچاوەیەك دەهێنم، جاری واش هەیە: لە دووان، یان لە زیاتر باسەکە پێك دەهێنم، واتە: کە ئاماژەم بۆ زیاتر لە سەرچاوەیەك کرد، ئەوە وا دەگەیەنێ: باسەکە لە تێکڕای ئەوان پێك هاتووەو دەقی هیچیانم نەهێناوە.
جا ئەگەر لە کۆتایی حەدیسێکدا گوتم: (رَوَاهُ الشَّيْخَان)، ئەوە مەبەستم ئیمامی(الْبُخَارِي)و ئیمام (مُسْلِم)ن. وە ئەگەر گوتم: (رَوَاهُ أَصْحَاب السُّنَن)، ئەوە مەبەستم ئیمام (أَبُودَاوُد) ئیمامی(التِّرْمِذِي) ئیمامی(النَّسَائِي)یە.
جا بزانە: کتێبەکانی ژیانی پێغەمبەرﷺ حەدیسی (صَحِيح)=ڕاستو حەدیسی (ضَعِيف)= بێهێزیشی تێدایە، ئیمام (أحمد)و زانایانیتر فەرموویانە: هەر کاتێك بۆ حەڵاڵو حەرام حەدیس بێنین توند دەکەین، بۆ باسی گەورەیش ئاسانکاری دەکەین.
هەروەها زۆر لە زانایانیئیسلام ڕێگایان داوە: بۆ پەندو ترساندنو ئەو جۆرە شتانەی جگە لە حەرامو حەڵاڵ، حەدیسی (ضَعِيف)=بێهێز بە کار بهێندرێ. هەروەك لە پێشەکیی (السيرةالحلبية)دا گێڕاویەتیەوە، هەم بڕوانە (قواعد التحديث من فنون مصطلح الحديث) ل(١٦٥و١٦٨).
ئیتر لە خوایگەورە دەپاڕێمەوە: یارمەتیم بدا بۆ تەواوکردنی ئەم ژیاننامەی پێغەمبەرووﷺ بیکاتە نوسراوێکی سودبەخش بۆ موسڵمانان، آمین.

عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی

هەولێر–کوردستان

## ﴿ ڕێخۆشکردنێك ﴾

خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُمْ مِنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ﴾ آل عمران: ٨١، باسی ئەوە بکە کە خوایگەورە بەڵێنی لە پێغەمبەران-عليهم الصلاة والسلام- وەرگرت–هەرچەند زانستو پێغەمبەرایەتیم داوەتە ئێوە–: ئەگەر پێغەمبەرێکتان بۆ هات کە ناوی (مُحَمَّد)ەﷺ، ئەبێ ئیمانی پێبێنن‌و یارمەتیشی بدەن.

ئیمام (عَلِي)و حەزرەتی(ابن عبّاس)ﷺ فەرموویانە: (خوایگەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ، بەڵێنی لێوەرگرتووە: ئەگەر ئەو زیندوو بوو و حەزرەتی(مُحَمَّد)ﷺ نێردرا بە پێغەمبەر، ئەبێ ئیمانی پێبێنێ‌و یارمەتیشی بدا، هەم بەڵێنیش لە ئۆمەتەکەیخۆی وەربگرێ: ئەگەر ئەوانیش زیندوو بون‌و حەزرەتی(مُحَمَّد)ﷺ کرایە پێغەمبەر، ئەبێ ئیمانی پێبێنن‌و یارمەتیی بدەن).

جا ئەوە وادەگەیەنێ: کە لە حەزرەتی(آدَم)وە تا حەزرەتی(عِيسی)-عليهما الصلاة والسلام- گشت پێغەمبەرێك موژدەی هاتنی حەزرەتی(مُحَمَّد)یﷺ داوەتە ئوممەتەکەی‌و فەرمانیشی کردوە شوێنی بکەون. بڕوانە (تفسيرالقرطبي) و(تفسير ابن كثير) آل عمران:٨١.

کەواتە: پێغەمبەری ئێمەﷺ یەکەمین پێغەمبەرە لە ڕووی دروستکردنەوە، دوایین پێغەمبەرە لە ڕووی ناردنەوە، هەروەك خۆی فەرموویەتی: ﴿إِنِّي عِنْدَ اللهِ لَخاتَمُ النَّبِيِّينَ، وَإِنَّ آدَمَ لَمُنْجَدِلٌ فِي طِينَتِهِ﴾ وفی رواية: ﴿وَآدَمُ بَيْنَ الرُّوحِ وَالْجَسَدِ﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد والبيهقي، من لە لای خوا کۆتایی پێغەمبەران بوم هێشتا باب (آدم)ﷺ لە لاشە قوڕەکەیدا بوو و گیانی نەهاتبوە ناو لاشەکەی. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦٤٢).

جا ئایەتەکەو حەدیسەکە بەڵگەنە: کە پێغەمبەری خۆشەویستمان-حەزرەتی(مُحَمَّد المُصْطَفی)ﷺ- گەورەو سەرداری هەموو پێغەمبەرانە-عليهم الصلاة والسلام- هەروەك خۆی فەرموویەتی: ﴿أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيامَةِ وَأَوَّلُ مَنْ يَنْشَقُّ عَنْهُ الْقَبْرُ وَأَوَّلُ شَافِعٍ وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ﴾ رواه مسلم، زاد الترمذي: ﴿وَبِيَدِي لِواءُ الْحَمْدِ وَلاَ فَخْرَ وَما مِنْ نَبِيٍّ يَوْمَئِذٍ آدَمُ فَمَنْ سِواهُ إلاَّ تَحْتَ لِوائِي﴾ من گەورەی نەتەوەی باب (آدَم)م لە ڕۆژی قیامەتدا، من یەکەم کەسم کە گۆڕەکەم بۆ لەت دەبێ‌و دێمە دەرەوە، من یەکەم کەسم کە (اَلشَّفاعَةُالْعُظْمَی)= تکا گەورەکەی مەیدانی مەحشەر دەکەم‌و تکایەکەم وەردەگیرێ، ئاڵای سوپاس تەنها لە دەست مندایە، بە شانازی وا ناڵێم، هەر پێغەمبەرێك هەیە: باب (آدَم)و ئەوانیتریش-عليهم الصلاةوالسلام-گشتی لە ژێر ئاڵای منن لە ڕۆژی قیامەت.

کەواتە: پێغەمبەری ئێمەﷺلە دونیاو قیامەتدا لە هەموو دروستکراوێك گەورەترە، واتە: لە (مَلائِكَة)ش گەورەترە. (شرح صحيح مسلم) ب(٩) ل(١٢٨و١٢٩) بهامش القسطلاني.

جا لە بەر ئەوەی حەزرەتی(إبراهِيم) پێغەمبەرﷺ بابە گەورەی گشت پێغەمبەرەکانی دوای خۆیەتی-عليهم الصلاة والسلام-واتە: پێغەمبەری ئێمەش-حەزرەتی(مُحَمَّد الْمُصْطَفی)ﷺ- لە نەژادی ئەم بەڕێزیەو لە شاری (مَكّة) لە دایك بووە، پێویستە هەندێك بەسەرهاتی حەزرەتی(إبراهِيم)وﷺ دروستکردنی شاری (مَكّة) باس بکەین:

## ﴿ کۆچکردنی حەزرەتی ( إِبْراهِيم ) پێغەمبەرﷺ لە ( بابِل ) بۆ وڵاتی ( شام ) ﴾

سەرچاوەکانی ئیسلام لە تەفسیرو حەدیسو مێژوو یەکدەنگن: کە حەزرەتی(إبراهِيم) پێغەمبەرﷺ بێئومێد بوو لە موسوڵمانبونی گەلەکەی لە وڵاتی (بابل)، لەوێ کۆچی کرد بۆ شاری (حَرّان)-کە ئێستا سەر بە وڵاتی (تُرْكِيا)یە- ئینجا لەوێش کۆچی کرد بۆ وڵاتی (شام)، لەوێ لە خاکی (بَيْتُ الْمُقَدَّس)-کە هەم پێی دەگوترێ: (الْقُدس)-جێگیر بوو، جا لەم کۆچکردنەش (سارَة)ی ژنیخۆی-کە هەم گیژە مامیخۆی بوو-و هەم حەزرەتی(لُوط) پێغەمبەری برازایخۆیﷺ لەگەڵیدا بون.

ئینجا لە خاکی (الْقُدس) قاتیو نەبوونیو گرانی پەیدا بوو، ناچار هەرسێکیان بەرەو وڵاتی (مِصْر) ڕۆیشتن، جا لەو کاتدا گەورەی (مِصْر) پاشایەکی ستەمکار بوو، هەر ئافرەتێکی جوان کەوتبا بەردەستی، داگیری دەکردو دەستدرێژی دەکردە سەر، وە ئەگەر خاوەن مێرد بوایە مێردکەشی دەکوشت، (سارَة)ی ژنی حەزرەتی(إبراهِيم)شﷺ لە جوانترینی ئافرەتان بوو و هێشتا هیچ منداڵیشی نەبووبوو، جا پاشایەکە فەرمانی دا: حەزرەتی(إبراهِيم)ﷺ هێندرا لایو لێی پرسی: ئەم ئافرەتە چی تۆیە؟ حەزرەتی (إبراهِيم)ﷺ فەرمووی: خوشکی منە. جا کە حەزرەتی(إبراهِيم)ﷺ گەڕاوە لای (سارَة)، فەرمووی: تۆش بڵێ: من خوشکی ئەو پیاوەم؟ چونکە لە ئاییندا تۆ خوشکی منی. (واتە: مەڵێ: من ژنی ئەو پیاوەم؟ نەوەك ستەمکارەکە بمکوژێ).

ئیتر (سارَة) بردرا لای ستەمکارەکە، حەزرەتی(إبراهِيم)شﷺ دەستی بە نوێژکردن کردو (سارَة)ش هەر دوعای دەکردنو دەیفەرموو: (خودایە-ئەگەر-دەزانی من ئیمانم بە تۆ و بە پێغەمبەرەکەت هێناوەو داوێنی منت-جگە لە مێردەکەم-لە گشت کەسێکت پاراستووە، ئەم کافرە بە سەر مندا زاڵ نەکەی).

جا کە ستەمکارەکە دەستی بۆ درێژ کرد، یەکسەر دەستی لە کار کەوتو وەك بێهۆشی لێهات، جا تا سێ جار ستەمکارەکە وایدەکردو وای لێدەهات، ئیتر کە ستەمکارەکە زانی دەسەڵاتی بە سەر (سارَة)دا نابێ، بانگی خزمەتکارێکیخۆی کردو گوتی: ئەم ئافرەتە

ببەنـە دەرەوەو ئـەو کەنیزەیـەش-کـە نـاوی (هـاجَر)یـە- بیـدەنێ. ئا بـەم شـێوەیە خوایگەورە ئابڕوو و ناموسی پێغەمبەری خۆی پاراست.

جا کە (سارَة) گەڕاوە لای حەزرەتی(إبراهِیم)ﷺ، ئەو هێشتا هەر نوێژی دەکردو پێی گۆت: خوایگەورە پیلانی ستەمکارەکەی پوچەڵ کردەوەو (هاجَر)شی دامێ بۆ خزمەتی خۆم. ئینجا ستەمکارەکە ئەوانی لە (مِصر)دەرکردنو ناچار ئەوانیش گەڕانـەوە خـاکی (بَیْت المُقَدّس)، ئینجا حـەزرەتی(لُوط) پێغەمبـەرﷺ لـە خـاکی (فَلَسطِین) ڕۆیشتو چووە ناوچەی (سَدُوم)و خوایگەورە کردیە پێغەمبـەری ئـەو ناوچـەیە. (البدایـة والنهایـة ب(١) ل-(١٦٥-١٦٨) و(فتح الباری) ب(٦) ل(٤٦٩-٤٧٦).

**﴿ لـە دایکبـوونی حـەزرەتی ( إِسْـماعِیل ) پێغەمبـەرﷺ کـوڕی حـەزرەتی ( إِبْـراهِیم ) پێغەمبەرﷺ ﴾**

کە حەزرەتی(إبراهِیم)ﷺ لە (مِصر) گەڕاوە بۆ (بَیْت المُقَدّس)، ماوەی دە ساڵان لەوێ مایەوەو هیچ منداڵی نەبون، جا دوعای کرد خوا منداڵی بداتێو فەرمووی: ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ * فَبَشَّرْنَاهُ بِغُـلامٍ حَلِـيمٍ﴾ الصافات: ١٠٠-١٠١، خودایە منـداڵی سـالحم بدەیێ، جا خوایگەورە موژدەی دایێ: بە کوڕێکی هێمنو ئارامگر، کە حـەزرەتی (إِسْماعِیل) پێغەمبەر بووﷺ.

ئـەوە بـوو: (سـارَة) بـە حـەزرەتی(إبـراهِیم)ﷺی گـوت: مـن منـداڵم نابـێ، بـۆیێ مـن کەنیزەکەیخۆم-(هاجَر)- دەیبەخشمە تۆ، بەڵکی خوا لە (هاجَر) منداڵێکت بداتێ.

جا حەزرەتی(إبراهِیم) قبوڵی کردو لێی بووە زاوا، لە تەمەنی (٨٦) هەشتاو شەش ساڵیدا خوایگەورە حەزرەتی(إسماعِیل)یﷺ پێ بەخشیو دوعایەکەی قبوڵ بوو.

جـا لـە نـاو هـەموو پێغەمبـەران-علـیهم الـصلاة والـسلام-تـەنها پێغەمبـەری ئێمـە-(مُحَمَّـد الْمُصْطَفی)ﷺ- لە نەژادی ئەم (إسماعِیل) پێغەمبەرەی کوڕی(إبراهِیم) پێغەمبەرە علیهما الصلاة والسلام، ئینجا بـە ویـستی خوایگـەورە حـەزرەتی(إبـراهِیم)ﷺ (هـاجَر)و حـەزرەتی (إِسـماعِیل)ی کـوڕی لـەوێ لابـردنو هـەردووکی بردنـە ئـەو شـوێنەی ئێـستا (مَکَّـة)ی پیرۆزە، هەروەك لەدوای ئێرە ڕوون کراوەتەوە.

ئەمە لە لایەك، لە لایەکیتریشەوە: لە دوای لە دایکبوونی حەزرەتی(إسماعِیل)ﷺ-بـە سێزدە ساڵان-خوایگەورە کوڕێکیشی لە (سارَة) بە حەزرەتی(إبراهِیم)ﷺ بەخشی، لەو کات تەمەنی (سارَة) نەوەد ساڵ بوو، تەمەنی حەزرەتی(إبراهِیم)شﷺ نەوەدو نۆ ساڵ بـوو، خوایگـەورە دەفـەرموێ: ﴿...فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِنْ وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ﴾ هـود:٧١، موژدەمان دایە (سارَة) بە کوڕێکی ناو (إسحاق)، لـە دوای (إسـحاق)ش (یَعقُـوب)ی کـوڕی إسحاق علیهما الصلاة والسلام.

جا (يَعقوب)ﷺ به (إسرائيل) ناو دەبردریٚو هەموو پێغەمبەرەکانی (بَنی إسرائِيل) بەويەوە دەگەنەوە حەزرەتی(إبراهِيم)ﷺ. (البداية والنهاية) ب(١) ل(١٦٩–١٧٧).

### ﴿ نيشتەجێ کردنی حەزرەتی ( إسْماعِيل ) پێغەمبەروﷺ( هاجَر )ی دايکی لە ( مَكّة ) ﴾

بزانە: لەو کات (مَكّة) ناوی (فاران) بوو، هەر بەم ناوەش لە (التوراة)دا هاتووە: (جاءَ الرَّبُّ مِنْ سَيْناءَ وَأَشْرَقَ مِنْ ساعِيرَ وَاسْتَعْلَنَ–تَلألأ– مِنْ جِبالِ فارانَ) بڕیاری خوا لە دەشتی (سَيْناء) هات بە ناردنی حەزرەتی(مُوسى) پێغەمبەرﷺ، لە (ساعِير) بەدەرکەوت بە ناردنی حەزرەتی(عيسى) پێغەمبەرﷺ، لە کێوەکانی (فاران)=(مَكّة) ئاشکرا بوو= درەوشاوە بە ناردنی حەزرەتی(محمد)ﷺ. (تفسير القرطبي) و(تفسير الخازن) سورة النَّمل، الآية (٨).

جا–بەندەش دەڵێ: بە چاوی خۆم دیتومە–ئەم وشانەیڕابردوو تا ئێستاش لە (التَّوْراة)دا ماون‌و دەستکارییان نەکراوە، وَالْحَمْدُ للّه تَعالَى. بڕوانە (التوراة) ل(٢٣٤).

ئينجا حەزرەتی(إبراهِيم)ﷺ، حەزرەتی(إسماعِيل)وﷺ (هاجَر)ی دايکی هێنان‌و لەو شوێنەی ئێستا (مَكّة)يە لە لای درەختێکی گەورە لە سەرەوەی بیری (زَمزَم)ی ئێستا داينان، هێشتاش حەزرەتی(إسماعِيل)ﷺ شيرخۆر بوو، لەو کاتيش ئەو شوێنە هيچ ئاو و ئاوەدانی لێنەبو، بۆيێ کوندەيەك ئاو و پرێسکەيەك قەسپی بۆ دانان‌و لەوێ بەجێی هێشتن‌و ڕۆيشت، جا (هاجَر)ی دايکی حەزرەتی(إسماعِيل)ﷺ بانکی کرد و گوتی: هۆ (إبراهِيم) ئەوە بۆ کوێ دەڕۆی؟ ئێمەش لەو گەڵيە چۆلەدا بەجێ دەهێڵی؟ بەلاّم حەزرەتی(إبراهِيم)ﷺ هەر ئاوڕيشی لێنەداوە، جا ئەم جارە (هاجَر) گوتی: هۆ (إبراهِيم) ئايا خوا ئەوها فەرمانی پێکردوی؟ حەزرەتی(إبراهِيم)ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

جا (هاجَر) گوتی کەوابێ، خوا ئێمە لە دەست نادا.

ئينجا حەزرەتی(إبراهِيم)ﷺ ڕۆيشت تا گەيشتە دەربەندی سەرەوەی (مَكّة)، لەوێ ڕووی لە (بَيْت) کردو دەستەکانی بەرز کردنەوەو بەم وشانە دوعای کرد: ﴿رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنْتُ مِنْ ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِنْدَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُمْ مِنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾ إبراهيم: ٣٧، خودايە من هەندێك لە نەتەوەیخۆمم نيشتەجێ کرد لە شيوێکی بێ کشتوکاڵ لە لای شوێنی ماڵە ڕيزدارەکەت–*واتە: ئەو شوێنەی خوا بڕياری داوە لەمەودوا (بَيت)ی لێ دروست بکرێ*– خودايە بۆ ئەوەی نوێژ ئەنجام بدەن، خودايە دڵی هەندێك کەس وا لێبکە ئەوانی بوێ‌و جۆرەها ميوەجاتيان بدێ بەڵکو شوکری تۆ بکەن.

ئينجا (هاجَر) شيری دەدا حەزرەتی(إسماعِيل)ی کوڕیوﷺ بەخۆيشی ئاوی کوندەکەی دەخواردەوە تا ئاوەکە نەما، جا (هاجَر) بەخۆی تێنوو بوو، کوڕەکەشی تێنوو بوو و بە هۆی تێنووەتی خۆی بە زەویدا دەدا، بۆيێ (هاجَر) ڕۆيشتە سەر کێوی (صَفا)–کە

نزیکترین کێو بوو لەوێ– لە سەر کێوەکە تەماشای شیوەکەی دەکرد بەڵکی کەسێك ببینێ، بەڵام هیچ کەسێکی نەدیت، ئینجا (هاجَر) لە کێوێ (صَفا) هاتە خوارەوە تا گەیشتە ناو شیوەکە، ئینجا لیچکی کەوایەکەی بڵند کردو وەك مرۆڤێکی ماندووکراو بە پەلە ڕۆیشت تا لە شیوەکە تێپەڕیو بە سەر (مَروَة) کەوت، جا لە سەر (مَروَة)ش تەماشای شیوەکەی کرد بەڵکی کەسێك ببینێ، بەڵام هیچ کەسێکی نەدیت، تا حەفت جار (هاجَر) لە نێوان (صَفا)و (مَروَة)دا ئەوهای کرد، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿فَذلِكَ سَعْيُ النّاسِ بَيْنَهُما﴾ رواه البخاري، لەو ڕووداوە، (سَعْي)ی نێوان (صَفا)و (مَرْوَة) لە سەر حاجیەکان واجب کراوە.

## ﴿ پەیدابوونی ئاوی (زَمْزَم) ﴾

جا کە جاریحەفتەم (هاجَر) چووە سەر (مَروَة)، گوێی لە دەنگێك بوو–وەك کەسێك بانگی بکا– ئینجا گوێی لێگرتو گوتی: گوێم لێتە ئەگەر فریام بکەوی. جا کە تەماشای کرد حەزرەتی(جِبْرائِیل)عليه السلام–کە (مَلائِکَة)یەکیخودایە– بە باڵەکەیخۆی لە شوێنی (زَمْزَم)ی دا، ئاوی (زَمْزَم) هەڵقوڵا و بەدەرکەوت، ئینجا (هاجَر) بە دڵێکی خۆش گڵی لە دەورەی ئاوەکە کۆ کردەوەو کردیە حەوز، هەم کوندەکەشی لێ پڕ کرد، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿يَرْحَمُ اللهُ أُمَّ إِسْماعِيلَ، لَوْ تَرَكَتْ زَمْزَمَ–أَوْ قالَ: لَوْ لَمْ تَغْرِفْ مِنَ الْماءِ– لَكانَتْ زَمْزَمُ عَيْناً مَعِيناً﴾ رواه البخاري، خوا ڕەحم بە دایکی (إِسْماعِيل) بکا، ئەگەر وازی لە (زَمْزَم) هێنابا و هەڵینەهێنجابا، (زَمْزَم) دەبووە سەرچاوەیەك ئاوەکەی لە بەر دەڕۆیشت.

جا (هاجَر) ئاوەکەی خواردەوەو شیری دایە حەزرەتی(إِسماعِیل)یکوڕی، جا حەزرەتی (جِبْرائِیل)عليه السلام پێی گوت: (مەترسن ئێوە بەهیلاك ناچن، (بَيْتُ الله)=ماڵیخوا لێرەیە، ئەم کوڕەو باوکی ئەم کوڕە (بَيْتُ الله) دروست دەکەن، خوایگەورە کەسوکاری ئەم (بَيْتُ الله)یە لە ناو نابا).

*شوێنی (بَيْتُ الله)–لەو کات–وەکو تەپۆلکەیەکی بەرز بوو، لافاو دەهات لە لای ڕاستەییو لە لای چەپەی لێی دەبرد.*

جا (هاجَر) هەر لە سەر ئاوی (زَمْزَم) مایەوەو–وەك خواردەمەنی– بە خواردنەوەی ئاوی (زَمْزَم) تێر دەبوو و برسیەتیی نەدەما، پێغەمبەرﷺ لە بارەی ئاوی (زَمْزَم) فەرموویەتی: ﴿إِنَّها مُبارَكَةٌ إِنَّها طَعامُ طُعْمٍ﴾ رواه مسلم فی فضائل أبیذررضي الله عنه، ئاوی (زَمْزَم) بە بەرەکەتەو خۆراکێکی تێرکەرە.

ئینجا کۆمەڵە خەڵکێك لە بنەماڵەی (جُرْهُم)–کە خەڵکی (یَمَن) بونو لە نزیکی (مَکَّة) بون– بە لایاندا تێپەڕینو لە خوارەوەی (مَکَّة) دابەزین، کە تەماشایان کرد: باڵندەیەك

بەو هەوایەدا–وەك لە سەر ئاویك–دەسوڕێتەوەو لەوێ دور ناكەوێتەوە، گوتیان: ئەم باڵندەیە بە سەر ئاودا دەگەڕێ، خۆ ئێرە هیچ كاتێك ئاوی لێنەبوە، بۆیێ یەك دوو كەسیان ناردن: هەواڵی هەبوونی ئاویان بۆ هێنان، جا ئەوانیش هاتنە لای (هاجَرَ)و گوتیان: ئیزنمان دەدەی ئێمەش لە لای تۆ دابەزین؟ جا چونكە (هاجَرَ) دڵی بە ئاوەدانی خۆش بوو، گوتی: بەڵێ، بەڵام هیچ مافێكتان لە ئاوەكەدا نەبێ.

ئیتر ئەو بنەماڵەیەش بە هەموو خزمو كەسەكانیانەوە لە لای (هاجَرَ) دابەزینو ئاوەدانی لەوێ پەیدا بوو و حەزرەتی(إسماعِیل)ش ﷺ گەورە بوو و لەوان فێرە زمانی (عَرَبِي) بوو، ئەوانیش زۆر ڕێزیان لە حەزرەتی(إسماعِیل) ﷺ دەناو دڵیان بۆ دەچوو بیكەنە زاوای خۆیان، بۆیێ كە جەحێڵ بوو، ئافرەتێكی بنەماڵەكەیان لێ مارەكرد.

جا بزانە: جار جارە حەزرەتی(إبراهِیم) ﷺ بە سواری(البُراق)=بۆڕاق دەهاتە (مَكَّة)و سەردانی (هاجَرَ)و كوڕەكەی دەكرد. (فتح الباري) ب(٦) ل(٤٧٨و٤٨٩).

## ﴿ سەر بڕینی حەزرەتی (إسْماعِیل) پێغەمبەر ﷺ ﴾

زانایانی (تفسیر) فەرموویانە: كە تەمەنی حەزرەتی(إسماعِیل) پێغەمبەر ﷺ بووە سێزدە ساڵ، حەزرەتی(إبراهِیم) ﷺ سێ جار لە خەوندا دیتی: ﴿لە لای خوا فەرمانی پێدەكرێ كوڕە تاقانەكەی بۆ خوا سەر ببڕێ﴾.

جا لە بەر ئەوەی خەونی پێغەمبەران-علیهم الصلاة والسلام- بە (وَحي) داندراوە، حەزرەتی (إبراهِیم) ﷺ ناچار بوو جێبەجێی بكا، بۆیێ چووە لای حەزرەتی(إسماعِیل)ی كوڕیو پێی گوت: هۆ كوڕە بچكۆڵەكەم من لە خەونمدا دەبینم تۆ سەر دەبڕم، تۆش بیر بكەوە چ بڕیارێك دەدەی؟ حەزرەتی(إسماعِیل) ﷺ فەرمووی: بابە گیان لە لایەن خواوە چ فەرمانێكت پێدەكرێ بیكە، إن شاءالله دەمبینی من لە خۆڕاگران دەبم.

جا حەزرەتی(إبراهِیم) ﷺ حەزرەتی(إسماعِیل)ی ﷺ بردە (مِنَى)و لەوێ تەسلیمی فەرمانیخوا بونو حەزرەتی(إسماعِیل)ی ﷺ خستە سەر زەمینو لە سەر تەوێڵەی درێژی كردو كێردەكەی بە گەردەنیدا هێنا، بەڵام كێردەكە نەیبڕی، جا خوایگەورە فەرمووی: ﴿وَنَادَيْنَاهُ أَنْ يَا إِبْرَاهِيمُ ★ قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ★ إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ ★ وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ﴾ الصافات، الآيات: ١٠٤-١٠٧، بانگمان كرد: هۆ (إبْراهِیم) بەڕاستی كوێڕایەڵی فەرمانی خەونەكەت بوی، ئێمە ئەوها پاداشتی چاكەكاران دەدەینەوەو لە تەنگانە ڕزگاریان دەكەین، بەڕاستی ئەوە تاقیكردنەوەیەكی ئاشكرایە، ئێمە سەربڕینی بەرانێكی پلەوپایە گەورەمان كردە قوربانی (إسْماعِیل) پێغەمبەر ﷺ. واتە: حەزرەتی(جُبْرائِیل) ﷺ لە بەهەشت بەرانەكەی هێنا، جا حەزرەتی(إبراهِیم) بەرانەكەی گرتو لە جیاتی حەزرەتی

(إِسماعِيل)ى كوڕى ﷺ له ڕۆژى جەژنى قوربان له (مِنى) سەرى بڕىو كرديه قوربانى.
(تفسيرالقرطبي)و (تفسيرالخازن) الصافات، الآيات: (١٠١–١٠٧).

## ﴿ دروستكردنى (كَعْبة )=( بَيْتَ الله )=( اَلْمَسْجِدُ الْحَرام ) له( مَكّة )ى پيرۆز﴾

خواىگەوره دەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ أَنْ لا تُشْرِكْ بِي شَيْئاً وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ * وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالاً وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾ الحج:٢٦و٢٧، باس بكه: كه خواىگەوره شوێنى (بَيْت)ى بۆ (إِبْراهِيم)ﷺ ديارى كرد تاكو دروستى بكا، لەو دروستكردنەدا هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، (بَيْت)ش پاك بكەوه بۆ ئەوانەى (طَواف) ئەكەنو بە پێوه نوێژ دەكەنو ڕوكووعو سوجده دەبەن، هەم فەرمانمان به (إِبْراهِيم)ﷺ كرد: ئادەميزادەكان بانگ بكه تاكو بێنه ئەو (بَيْت)ى خوا حەج بكەن، ئەوان بەرەو بانگكردنەكەى تۆ دێن: به پيادەيىو به سوارى گشت وشترێكى لاوازو بىٚهێز كه له گشت ڕێگايەكى دورو درێژەوه وشترەكان دێن.

حەزرەتى(ابن عَبّاس)-رضى الله عنهما-فەرموويەتى: كه خواىگەوره ئەم فەرمانەى به حەزرەتى(إِبراهِيم) پێغەمبەرﷺ كرد، گوتى: خودايه چۆن دەنگم دەگاتە ئەو هەموو ئادەميزادانەه؟ خواىگەوره فەرمووى: ﴿تۆ بانگ بكه، ئێمەش بانگەوازيەكەت دەگەێنين﴾. جا حەزرەتى(إِبراهِيم)ﷺ چووه سەر كێوى (أَبىقُبَيس)و بانگى كرد: ﴿هۆ ئادەميزادەكان خواىگەوره فەرمانى به ئێوه كردووه بێنه ئەم (بَيْت)ى خوا، بۆ خوا حەج بكەن﴾. جا هەر كەسێك حەجى بۆ نوسرابێ، له مندالْدانەى دايكانو له پشتى باوكان وەلاٚميان داوه: (لَبَيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ). جا به قەد وەلاٚمدانەوەكانيان حەج دەكەن: جارێك، دوو جار...هتد. (تفسيرالقرطبي) و(تفسير ابن كثير) الحج (٢٦–٢٧).

ئيمام (ابن كثير) فەرموويەتى: (كَعْبَة)=(بَيْت الله)–كه له شارى (مَكّة)يه– دەكەوێته ئاستى (اَلْبَيْت الْمَعْمُور)–كه قيبلەى (مَلائِكَة)كانى ئاسمانىحەفتەمە– هەروەهاش له هەموو ئاسمانێكدا –لەو ئاست–(بَيْت)ێك هەيه خواپەرستىى تێدا دەكرێ، جا (بَيْت)ى ئاسمانى يەكەم پىٚى دەگوترێ: (بَيْتُ الْعِزّة). بروانه (تفسير ابن كثير) الطور(٤) و(البداية والنهاية) ب(١) ل(١٧٩).

گوتمان: جار جاره حەزرەتى(إِبراهِيم)ﷺ به سوارىى بۆڕاق دەهاته (مَكّة)و سەردانى (هاجَر)و كوڕەكەى دەكرد، جا كه حەزرەتى(إِسماعِيل)ﷺ ژنى هێناو (هاجَر)ى دايكيشى له (مَكّة) وەفاتى كرد، ديسان حەزرەتى(إِبراهِيم)ﷺ بۆ سەردان هاته (مَكّة)، بەلاٚم ئەم جاره حەزرەتى(إِسماعِيل)ﷺ له مالْەوه نەبو، ژنەكەشى زۆر ناشوكرو ڕوو كرژ بوو و گوتى: وەزعمان خراپه. جا حەزرەتى(إِبراهِيم)ﷺ گەڕاوەو فەرمووى: كه

مێردەکەت هاتەوە سەلامی منی لێبکەو پێی بڵێ: با کۆسپەی دەرگاکەی بگۆڕی. جا کە حەزرەتی(إِسماعِیل)ﷺ هاتەوە، ژنەکەی گوتی: پیرەمێردێکی ئەوهاو ئەوها هاتو گوتی: بە مێردەکەت بڵێ: با کۆسپەی دەرگاکەی بگۆڕی. حەزرەتی(إِسماعِیل)ﷺ فەرمووی: ئەوە باوکم بوو، فەرمانی پێکردوم تەڵاقت بدەم. جا ئەم ژنەی تەڵاق دا و ژنێکیتری مارە کرد.

جا دووبارە حەزرەتی(إِبراهِیم)ﷺ هاتەوە سەردانیان، ئەم جارەش حەزرەتی (إِسماعِیل)ﷺ لەماڵەوە نەبو، بەڵام ژنەکەی زۆر ڕوو خۆشو شوکر بوو و گوتی: وەزعمان باشەو خواردنمان گۆشتو ئاوە. جا حەزرەتی(إِبراهِیم)ﷺ فەرمووی: کە مێردەکەت هاتەوە، سەلامی منی لێبکەو پێی بڵێ: با کۆسپەی دەرگاکەی ڕابگری.

جا کە حەزرەتی(إِسماعِیل)ﷺ هاتەوە، ژنەکەی گوتی: پیرێکێ جوان هاتە لامانو سەلامی لێدەکردیو گوتی: با کۆسپەی دەرگاکەی ڕابگری. حەزرەتی(إِسماعِیل)ﷺ فەرمووی: ئەوە باوکم بوو، فەرمانی پێکردوم تۆ بهێڵمەوەو تەڵاقت نەدەم.

جا حەزرەتی(إِبراهِیم)ﷺ دوعای بۆ کردن: (خوا بەرەکەت بخاتە گۆشتو ئاوەکەیان). پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ يَوْمَئِذٍ حَبٌّ، وَلَوْ كانَ لَهُمْ دَعا لَهُمْ فِيهِ﴾ رواه البخاري، لەو کات دانەوێڵەیان نەبو، ئەگەر دانەوێڵەیان هەبوایە دوعای بەرەکەتی ئەویشی بۆ دەکردن.

جا پاش ماوەیەك-بۆ جاری سێیەم- حەزرەتی(إِبراهِیم)ﷺ هاتەوە (مَكَّة)، دیتی حەزرەتی(إِسماعِیل)ﷺ لە بن درەختە گەورەکەی لای (زَمزَم) تیر چاك دەکا، جا حەزرەتی(إِسماعِیل)ﷺ لە بەری هەڵساو وەك باوكو كوڕ ڕەفتاریان لەگەڵ یەکتری کرد، ئینجا حەزرەتی(إِبراهِیم)ﷺ فەرمووی: خوایگەورە فەرمانی داومێ: لێرە ماڵێك دروست بکەم. *(ئاماژەی بۆ تەپۆلکەیەکی بەرز کرد)*.

ئیتر دەستیان بە دروستکردنی (بَیْت) کرد: حەزرەتی(إِسماعِیل)ﷺ بەردی دەهێنانو حەزرەتی(إِبراهِیم)ش‌ﷺ دیواری دادەنا تا گەیشتە شوێنی (الْحَجَرالأسْوَد)، حەزرەتی (إِبراهِیم)ﷺ ویستی بەردێك دابنێ بۆ ئەوەی ببێتە نیشانەی سەرەتای (طَواف)و کۆتاییەکەی، جا فەرمووی: کوڕەکەم بڕۆ بەردێکی جوانم بۆ بێنە لێرە دایبنێم. جا ئەو بەردێکی بۆ هێنا، بەڵام حەزرەتی(جِبْرائیل)ش-علیه السلام-(الْحَجَرالأسْوَد)ی بۆ هێنا-بەردێکی ئەوەندە سپی بوو دەدرەوشایەوە- جا حەزرەتی(إِبراهِیم)ﷺ (الْحَجَرالأسْوَد)ی لە قوڕنەکەی ڕۆژهەڵاتی باشوری (بَیْت) دانا-*ئێستاش هەر لە شوێنیخۆیەتی*-، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿نَزَلَ الْحَجَرُ الأَسْوَدُ مِنَ الْجَنَّةِ وَهُوَ أَشَدُّ بَياضاً مِنَ اللَّبَنِ فَسَوَّدَتْهُ خَطايا بَنِي آدَمَ﴾ رواه الترمذي وحسّنه، بەردە ڕەشەکەی (بَیْت) لە بەهەشت هاتۆتە خوارەوە، لە شیر

سپیتر بوو، بەڵام تاوانەکانی ئادەمیزادان ڕەشی کرد.

ئینجا کە دیوارەکە بەرز بوو، ئەو بەردەی (مَقام إِبراهِیم)ی هێناو حەزرەتی (إِبْراهِیم)ﷺ لە سەری ڕادەوەستاو دیواری دادەناو لەگەڵ خۆیاندا بە دەورەی (بَیْت)دا دەیانسوڕاندو ئەم دوعایەیان دەکرد: ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ البقرة: ١٢٧، خوایە لێمان قبوڵ بکە بەڕاستی تۆ بیسەرو زانای.

ئینجا کە حەزرەتی(إِبْراهِیم)ﷺ دیوارەکەی تەواو کرد، بەردەکەی لەوێ بەجێ هێشتو لە تەنیشت دەرگای (بَیْت) لە بن دیوارەکە داینا.

جا بزانە: ئاسەواری پێیەکانی حەزرەتی(إِبْراهِیم)ﷺ بە پەنجەکانیاوە لە سەر بەردەکە دیار بوو، بەڵام خەڵك ئەوەندە بۆ بەرەکەت دەستی پێدا دەهێنا تا ئاسەواری پەنجەکانی نەما و تەنها شوێنی پێیەکانی ماوە، جا تا سەردەمی ئیمام (عُمر)ﷺ بەردەکە هەر لە بن دیواری (بَیْت) بوو، بەڵام لە بەر پاڵەپەستەی خەڵك، ئیمام (عُمر)ﷺ بەردەکەی کشاندەوە دواوەو (صَحابَة)ش ڕەخنەیان نەبو.

جا بزانە: پاڵەبەستەکەش لەو نوێژە دروست دەبوو: کە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾البقرة: ١٢٥، لە لای (مَقام إِبْراهِیم) نوێژ بکەن.

هەم خەڵکیش بۆ بەرەکەت دەستی پێدا دەێنا، *جا ئێستا بەردەکە قەفەزێکی ئاسنی لە سەر داندراوەو دەستی هیچ کەسێکی ناگاتێ.*

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلرُّكْنُ وَالْمَقامُ ياقُوتَتانِ مِنْ يَواقِيتِ الْجَنَّـــةِ﴾ رواه ابن حبان والبیهقی بإسناد صحیح، بەردە ڕەشەکەی (بَیْت)و بەردەکەی (مَقام إِبْراهِیم) دوو یاقوتن لە یاقوتەکانی بەهەشت.

جا لە دوای تەواوبوونی دروستکردنی (بَیْت)=(کَعْبَة)، حەزرەتی(جُبْرائیل)ﷺ هەموو خواپەرستیەکانی (حَج)ی فێری حەزرەتی(إِبْراهِیم)ﷺ کردنو ئەویش لەگەڵ حەزرەتی (إِسْماعِیل)ﷺ حەجیان کرد، ئینجا حەزرەتی(إِبْراهِیم)ﷺ گەڕاوە بۆ (قُدس)، لەوێ وەفاتی کردو لە شاری (حَبْرُون)–کە ئێستا ناسراوە بە (اَلْخَلِیل)– نێژراوە، هەروەها حەزرەتی(إِسْماعِیل)ش ﷺ لە (مَکَّة) وەفاتی کردو لە ناو (حِجْر إِسْماعِیل)دا نێژراوە. (تفسیر ابن کثیر) البقرة (١٢٥) و(البدایة والنهایة) ب(١) ل(١٧٥و١٩٢) و(فتح الباري) ب(٦) ل٤٧٨–٤٩٢) و(السیرة الحلبیة) ب(١) ل(٢٢٣و٢٣٢).

## ﴿ دروستکردنی (كَعْبَة)=(بَيْتُ الله) لە سەردەمی (ذِیالْقَرْنَیْن)دا بوو ﴾

خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكاً وَهُدىً لِلْعَالَمِينَ﴾ آل عمران: ٩٦، یەکەم ماڵیخوا کە بۆ خواپەرستنی خەڵك داندرابێ، ئەوەیە کە لە (بَکَّة)= (مَکَّة)یە، بە بەرەکەتو هیدایەتی خەڵك داندراوە. (تفسیر ابن کثیر) آل عمران: (٩٦).

﴿عَنْ أَبِی ذَرٍّ﷜ قُلْتُ: يا رَسوُ لَ الله أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ فِی اْلأَرْضِ أَوَّلَ؟ قــالَ: اَلْمَــسْجِدُ الْحَرامُ. قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ؟ قالَ: اَلْمَسْجِدُ اْلأَقْصَى. قُلْتُ: كَمْ كانَ بَيْنَهُما؟ قالَ: أَرْبَعُونَ سَــنَةً﴾ رواه الـشيخان، **گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری‌خوا کامـە مزگـەوت لـە سـەر زەمـین پێـشتر دانـدراوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اَلْمَسْجِدُالْحَرام) لـە (مَكَّة). گـوتم: ئینجا کامـە مزگەوت؟ فەرمووی: (اَلْمَسْجِدُالأقْصَى) لە (فَلَسْطِين). گوتم: نێوان دروسـتکردنیان چەند بوو؟ فەرمووی: چل ساڵ.**

**هەندێ لە زانایان فەرموویانە: ئەو کەسەی یەکەم جار (اَلْمَسْجِدالأقْصى)ی دروست کرد: حەزرەتی(یعقـوب) پێغەمبـەر کـوڕی (إسحاق) پێغەمبـەری کـوڕی حـەزرەتی(إبْـراهِیم) پێغەمبەر بوو** صلى الله عليهم اجمعين، **واتە: بە چل ساڵ لـە دوای دوروسـتکردنی (الْمَسْجِدالْحَرام)، دروستی کرد، ئینجا حەزرەتی(سُلَیْمان) پێغەمبەر ﷺ نوێی کردەوە. ئیمام (ابن كثير)ش پشتگیری ئەم فەرموودەیەی کردوە.** (البداية والنهاية) ب(١) ل(١٧٨) و(السيرةالحلبية) ب(١) ل(٢٢٣).

**جا لە لایەکی‌تریش: فەرموودەکانی ئیمـام (ابـن کـثیر)و ئیمـام (ابـن حجـر العـسقلاني) تێك دەکاتەوە: کە لەو کاتەی حەزرەتی(إبْراهِیم)ﷺ (بَیْت)=(اَلْمَسْجِدالْحَرام)ی دروست دەکـرد، (أسـکَندر)ی (ذِی‌الْقَـرْنَیْن) هاتۆتـە (مَکّـة)ی پـیرۆزو تۆقـەی لەگـەڵ حـەزرەتی (إبْراهِیم)ﷺ کردوەو لەگەڵ ئەوی (طواف)ی (بَیْت)ی کردوەو هەم قوربانیشی کردوە.** (تفسير ابن كثير) البقرة: (١٢٧)، الكهف: (٨٣) و(فتح الباري) ب (٦) ل (٤٦٢).

**لە لایەکی تریشەوە دەفەرموون: پاشا ستەمکارەکەی (مِصر)-کـە ویـستی دەسـتدرێژی بکاتە سەر (سـارة)ی ژنـی حـەزرەتی(إبْـراهِیم)ﷺ- بـرای (الـضُحاك)ی سـتەمکار بـوو، واتە: لە لایەن برایەوە کاربەدەستی (مِصر) بوو.** (البدايه والنهايه) ب(١) ل(١٦٨) و(فـتح البـاری) ب(٦) ل(٤٧٤).

**هەم لە لایەکی‌تریش: (السيّد الآلوسي) لـە تەفـسیری ئایـەتی ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ ذِی الْقَرْنَيْنِ﴾** الكهف: ٨٣، **فەرمویەتی: (أَجْمَعَ أَهْلُ التَّأْرِيخِ عَلَى أَنَّهُ-أَيْ ذِی‌الْقَرْنَيْنِ- لَـمْ يُـسافِرْ لا شَـرْقاً وَلاَ غَرْباً وَإِنَّما دَوَّخَ لَـهُ الْـبِلادَ كـاوه اْلأَصـفَهانِيُّ الْحَـدّادُ الَّذِی مَزَّقَ اللهُ عَلـی يَـدِهِ مُلْـكَ الضُّحَاك وَبَقِيَ رَئِيسَ عَسَاكِرِهِ إِلى أَنْ ماتَ) زانایـانی مێـژوو یەکـدەنگن: کـە (أسکَندَر)ی (ذِی‌الْقَرْنَیْن) بەخۆی بە سەفەر نەچۆتە ڕۆژ هەڵاتو ڕۆژئاوا، بەڵکو (کاوە)ی ئەسفەهانـی ئاسنگر ئەو شارو وڵاتانەی بۆ وی ملکەچ کردونو خستنیە ژێر دەستی ئەوی، خوای‌گەورە لە سەر دەستی (کاوە) دەسەڵاتی (الضُحاك)ی تێـك داو تـەفروتونای کـرد، (کاوە) هـەر بـە سەرلەشکری (ذِی الْقَرنَیْن) مایەوە تا وەفاتی کرد.** (تفسير روح المعاني) الكهف (٨٣).

**جا لەم سەرچاوانە ئاشکرا بوو: دروستکردنی (بَیْت الله) لە لایەن حەزرەتی(إبْراهِیم)ﷺو هەم (ذُوالْقَرنَیْن)و (ضَحاك)ی ستەمکارو (کاوە)ی ئاسنگرو پاشا ستەمکارەکەی (مِصر)،**

گشتیان هاوچەرخن، هەم فەرموودەکەی (الآلوسي) وا دەگەیەنێ: کە (کاوە)ی ئاسنگر خواپەرست بووە-نەك ئاگرپەرست-؟ چونکە ناگونجێ خواپەرستێکی وەك (ذِی القَرنَیْن) کافرێکی ئاگرپەرست بکاتە سەرلەشکری خۆی، کەوابوو: با شەمشەمە کوێرەکانی (علماني) بچنەوە ناو کونە تاریکەکانیخۆیان کە بە خەیاڵی خاویان هەوڵ دەدەن-بە هۆی داستانەکەی کاوەی ئاسنگر- گەلی کورد لە ڕووناکیئیسلام دور بخەنەوەو بیبەنە ناو دوکەڵی ئاگرپەرستی.

﴿ گوڵبژێریك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: حەزرەتی ( إبْراهیم ) پێغەمبەرﷺ ڕێزدارەو پێشەوایە،** *بزانە: وشەی حەزرەت لە (حَضْرَة)ی عەرەبی گۆڕدراوە بۆ کوردی، واتە: پایە بەرز و ڕێزدار.*

لە بارەی کۆچکردنەکەی حەزرەتی(إبْراهیم)ﷺ خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَى رَبِّي﴾ إلى قوله تعالى: ﴿وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ﴾العنكبوت: ٢٦و٢٧، **(إبْراهیم)ﷺ فەرمووی: من لە وڵاتیخۆم کۆچ ئەکەم بۆ ئەو شوێنەی خوا فەرمانی پێکردوم.**

بەڵێ: حەزرەتی(إبْراهیم)ﷺ لە پێناویخوا خزمو کەسو وڵاتی بە جێهێشت، خوای گەورەش پاداشتی دایەوە: لەجیاتی وڵاتەکەی پیرۆزترین شوێنێ دایێ-کە (بَيْت الْمُقَدَّس)و (مَكَّة)ی پیرۆزە- لەجیاتی خزمو کەسەکانی بەشەڕەفترینو بەڕێزترین نەتەوەی دایێ، ئەوە بوو: لە تەمەنی پیریدا خوایگەورە دوو کوڕی پێ بەخشین:

یەکەمیان: لە (هَاجَر) حەزرەتی(إسْماعیل)یﷺ دایێ، کە پێغەمبەری ئاخر زەمان -حەزرەتی (مُحَمَّدُ الْمُصْطَفَى)ﷺ- لە پشتی ئەم بەرێزەیە.

دووەمیان: لە (سارَة) حەزرەتی(إسْحاق)ی دایێ کە باوکی حەزرەتی(يَعْقُوب)-عليهما الصلاة والسلام- حەزرەتی(یَعْقوب)یشﷺ پێی دەگوترێ: (إسْرائیل)، هەموو پێغەمبەرەکانی (بَنِی إسْرائیل) لە نەژادی ئەم بەرێزەن عليهم الصلاة والسلام.

هەم لەجیاتی ملكو ماڵیش خوایگەورە دەوڵەمەندی کردو ئاژەڵو سامانێکی زۆری دایێ، بە شێوەیەکی وەها: گوێلکی برژاوی دەرخواردی میوانەکانی دەدا.

هەروەها خوایگەورە حەزرەتی(إبْراهیم)یﷺ کردە دۆستی خۆیو فەرمووی: ﴿وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً﴾النساء: ١٢٥، **خوا (إبْراهیم)ی کردە دۆستی خۆی.**

هەم کردیە پێشەوای ئیماندارانی سەر ڕووی زەمین، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا﴾ البقرة: ١٢٤، **باس بکە: کە خوایگەورە حەزرەتی(إبْراهیم)ی تاقی کردەوە: بە چەند ئەرکێکی ئایینی، جا حەزرەتی(إبْراهیم)ﷺ هەموو ئەرکەکانی بە تەواوی کردن، خودا**

فەرمووی: من تۆ دەکەمە پێشەوا بۆ خەڵکی.

جا هەندێك لەو ئەرکانە -بە فەرموودەی جۆراوجۆر- لە کتێبەکانی (تفسیر)و (حدیث) ئەمانەن: **کۆچکردن، سوننەتکردنی نێرو مێ، تارەت کردن لە میز و پیسایی، سیواك کردن، ریش بەردان، قرتاندنی نینۆك، ئاو لەدەم و لووت وەرکردن، هەڵکەندنی موەکانی بن هەنگڵ، تاشینی بەر**...چەند ئەرکێکیتریش. (تفسیر ابن كثير) البقره: ١٢٤.

جا پێویستە مرۆڤی موسڵمان: حەزرەتی(إبْراهيم)ﷺ بە پێشەوایخۆی دابنێ و ئەو ئەرکانە بەجێ بێنێ، بە تایبەتیش سوننەتکردن واجبێکی گرنگە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِخْتَتَنَ إِبْراهِيمُ-عليه السلام-وَهُوَ ابْنُ ثَمانِينَ سَنَةً بِالْقَدُومِ﴾ رواه الشيخان، (**إبْراهيم**) **پێغەمبەرﷺ بە تەشوێی دارتاشین خۆی سوننەت کرد، تەمەنی هەشتا ساڵ بوو.**

بەڵام لە فەرموودەیەکی بێهێزدا -کە فەرموودەی زۆرترینیزانایانە-: سوننەتکردنی ئافرەتان سوننەتە، وەك سوننەتکردنی پیاوان واجب نیە. (تفسیرالقرطبي) البقره: ١٢٤ و(تحفة المحتاج شرح المنهاج)ب(٩) ل(١٩٨).

**دووەم: پاراستنی ئایین و گیان و ئابروو**، حەزرەتی(إبْراهيم)ﷺ فەرمووی: **(سارَة) خوشکی منە**. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَمْ يَكْذِبْ إِبْراهِيمُﷺ إلاّ ثَلاثَ كَذِباتٍ: قَوْلُهُ: (إِنِّي سَقِيمٌ)، وَقَوْلُهُ: (بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ)، وَقَوْلُهُ فِي سارَةَ: (هِيَ أُخْتِي)﴾ رواه الشيخان، **حەزرەتی (إبْراهيم)ﷺ تەنها سێ قسەی وەکو درۆی کردون، یەکەم: کە گەلەکەی بۆ جەژنی بتەکان رۆیشتن ئەو لەگەڵیان نەچو و فەرمووی: (من نەخۆشم)**، واتە: لە رقی بتپەرستنەکەی ئێوە خەفەتبارم. **دووەم: کە بتەکانی شکاندن فەرمووی: (بەڵکی بتە گەورەکە ئەوانی شکاندبێ؟)**، واتە بۆ دەمکوتکردن و ئاشکراکردنی نەفامیی ئەوان وای پێگوتن. **سێیەم: کە ستەمکارەکەی (مِصْر) ویستی (سارَة)ی لێزەوت بکا -لە ترسی کوشتن- فەرمووی: (سارَة) خوشکی منە.** واتە لە ئاییندا خوشکی منە، چونکە لەو کاتدا جگە لەوان هیچ ژن و مێردێکیتری موسوڵمان لە سەر زەمین نەبون.

جا لە راستیدا ئەوانە هیچیان درۆ نین؟ چونکە درۆ لە پێغەمبەران-عليهم الصلاة والسلام- ناوەشێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو حاڵەتانەدا درۆکردن دروستە، **بەڵکو بۆ مەبەستی پاراستنی ئایین و ئابروو درۆکردن واجبە**، ئەو سێیانەش لەو بابەتەنە. (تفسير ابن كثير الصافات (٨٩) و(فتح الباری) ب(٦) ل(٤٧٣).

**سێیەم: دڵسۆزیی ژن لەگەڵ مێردەکەی**، (سارَة) بە حەزرەتی(إبْراهيم)یﷺ گوت: **(من منداڵم نابێ، (هاجَر) بۆ تۆ، بەڵکی خوا کورێکت بداتێ).**

هەی ئافەرین: ژنی دڵسۆز لەگەڵ مێردەکەی ئەبێ ئەوها بێ، بەزەیی بە مێردەکەیدا بێ و داگیری نەکا بە وەجاغکوێری بمێنێتەوە، هەر لە بەر ئەم هەڵوێستە بوو: خوایگەورە

پاداشتی (سارَة) خاتونی دایەوەو لە تەمەنی نەوەد ساڵیدا کوڕێکی پێ بەخشیو ناوی نا: (إسْحاق)، خوایگەورە بە هۆی ئەم هەڵوێستە مەردانەیە کردیە داپیرەگەورەی هەموو پێغەمبەرەکانی (بَنِیإسْرائیل) علیهم الصلاة والسلام.

دەی خوشکی موسوڵمان، تۆش–وەکو (سارَة) خاتون–لەگەڵ مێردەکەت خاونی هەڵوێستی دڵسۆزانە بە، تاکو خوایگەورە لە دونیاو قیامەت پاداشتت بداتەوە.

**چوارەم: (هاجَرَ) گوتی: هۆ (إبْراهِیم)، خوا ئەوها فەرمانی پێکردوی؟ ...کەوابێ: خوا ئێمە لە دەست نادا.** ماشاء الله، لەم ئافرەتە ورە بەرزو بە غیرەتە! چۆن ملکەچی فەرمانی خوا بوو لەو دۆڵە چۆڵو بێ ئاوە–بە تەنهایی– خۆی ڕاگرت! ئاخر چی بڵێمو چی بنوسم؟ چۆن پێنووسەکەم دەتوانێ مەدحی داپیرە گەورەکەی پێغەمبەری ئاخیر زەمان بکاﷺ؟ تەماشا بکە خوایگەورە چۆن گەیشتە فریایو فەرمان دا: حەزرەتی(جُبْرائیل)عليه السلام بۆ ئەوان ئاوی (زَمْزَم)ی هەڵقوڵاندو بەرەکەتی خستێ! ئەدی لەوە گەورەتر چییە: خوایگەورە (هاجَرَ)ی کردە داپیرە گەورەی پێغەمبەری ئاخیر زەمانوﷺ هاتوچۆیەکەی نێوان (صَفا)و (مَرْوَة)شی کردە خواپەرستی=ڕوکنێکی (حَج)و (عُمْرَة)و هەتا هەتایی ئەم بیرەوەریەی هەر دەمێنێ، ئەی داپیرەی پێغەمبەرەکەمﷺ دەك بە قوربانی ئەو بەرە پێیانەت بم کە لە نێوان (صَفا)و (مَرْوَة)دا پێیان بە دوای ئاودا دەگەڕای، نەوەك بابە گەورەی پێغەمبەری ئاخیر زەمانﷺ تێنوو بێ، دەك پیرۆزت بێ ئەو هەموو شەرەفو ڕێزدارییە، ئینجا تۆش ئەی خوشکی موسوڵمان ئەوها لە پێناوی خوادا خۆڕاگرو ماندوو نەناس بە تاکو پاداشتی دونیاو قیامەت وەدەست بێنی.

**پێنجەم: بەرەکەتی ئاوی (زَمْزَم)**، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إنَّها مُبارَكَةٌ﴾ **ئاوی (زَمْزَم) بە بەرەکەتە.** هەم پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ماءُ زَمْزَمَ لِما شُرِبَ لَهُ: إنْ شَرِبْتَهُ لِتَشْفِيَ شَفاكَ اللهُ، وَإنْ شَرِبْتَهُ لِشَبَعِكَ أَشْبَعَكَ اللهُ، وَإنْ شَرِبْتَهُ لِقَطْعِ ظَمَئِكَ قَطَعَهُ اللهُ وَهِيَ هَزْمَةُ جِبْرِيلَعليه السلام وسُقْيا اللهِ إسْماعِيلَ﴾ رواه الدارقطني وصححه الحاكم، **ئاوی (زَمْزَم) بۆ ئەو مەبەستەیە کە بۆی دەخورێتەوە: ئەگەر بۆ شیفای نەخۆشی بیخۆیەوە خوا شیفات دەدا، ئەگەر بۆ تێربوون بیخۆیەوە خوا تێرت دەکا، ئەگەر بۆ بڕینی تێنووەتی بیخۆیەوە خوا دەیبڕێنێ، ئاوی (زَمْزَم) ئاسەواری لێدانی باڵی (جُبْرائیل)و ئاودانی خوایە بۆ (إسْماعیل)ﷺ.** (السیرةالحلبیة) ب(١) ل(٣٩٨) و(سیرةالصلابی) ب(١) ل(٥١).

**شەشەم: بەجێهێنانی فەرمانیخوا لە پێش سۆزی باوكو کوڕایەتیدایە**، کێ هەیە وەکو حەزرەتی(إبْراهِیم) پێغەمبەرﷺ لە تەمەنی (٩٩) نەوەدو نۆ ساڵیدا لەو تاقیکردنەوەیە سەر بکەوێو کوڕە تاقانەکەی تەمەن سێزدە ساڵیی بۆ خوا سەر ببڕێ؟ یان کام کوڕ وەکو حەزرەتی(إسْماعِیل) پێغەمبەرەﷺ خۆی تەسلیمی فەرمانیخوا بکاو گوێڕایەڵی

باوكی خۆی بێ؟ جێی خۆیەتی ئوممەتی(مُحَمَّدُ الْمُصْطَفى)ﷺ لە جەژنی قوربانـدا –كە جەژنی حەزرەتی(إِسْماعِيل) پێغەمبەرەﷺ– وەكو باپیرە گەورەی پێغەمبەرەكەیانﷺ قوربانی بكەنو لە واجبەكانی (حَج)دا شەیتان ڕەجم بكەن!.

حەزرەتی(إبن عَبّاس)-رضي الله عنهما- فەرموویەتی: كە حەزرەتی(إِبْراهِيم)ﷺ فەرمانی سەربڕینی كوڕەكەی پێكرا، شەیتان هاتە ڕێگەی لەو شوێنەی ئێستا شەیتانیگەورەیە–واتە: تاكو لە سەربڕینی كوڕەكەی پەشێمانی بكاتەوە–جا حەزرەتی(إِبْراهِيم)ﷺ حەفت بەردی بۆ هاویشتن تا ڕۆیشت، دووبارە شەیتان هاتەوە ڕێگەی لەو شوێنەی ئێستا شەیتانی ناونجیەیە، دیسان حەفت بەردی بۆ هاویشتن تا ڕۆیشت، جاری سێیەمیش شەیتان هاتەوە ڕێگەی لەو شوێنەی ئێستا شەیتانیسێیەمە، دیسان حەفت بەردی بۆ هاویشتن تا ڕۆیشت، جا حەزرەتی (إِبْراهِيم)ﷺ بۆ بەجێهێنانی فەرمانی خوا ڕۆیشت. (تفسيرالقرطبي) الصافات (١٠٣–١٠٥).

**پیرۆزی بێ:** كە خوایگەورە پاداشتی دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي ٱلْآخِرِينَ﴾ الصافات:٧٨، **مەدحو سوپاسمان لە سەر (إِبْراهِيم) هێشتەوە كە ئوممەتانی داهاتوو هەر مەدحی دەكەن.**

**پیرۆزی بێ:** كە لە (تَحْيات)ی نوێژدا ئێمە لەگەڵ پێغەمبەریخۆمانﷺ سەلاوات لە سەر حەزرەتی(إِبْراهِيم)شﷺ لێدەدەین، جا لە دوای ئەو هەموو ڕێزلێنانەی خوایگەورە موژدەیەكیشی دایێو فەرمووی: ﴿وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ الصافات:١١٢، **لە دوای ئەو تاقیكردنەوەیە موژدەمان دایە (إِبْراهِيم) بە بەخشینی كوڕێكیتر بە ناوی (إِسْحاق)، كە ئەویش دەبێتە پێغەمبەرو پیاوچاك.**صلى الله عليهم اجمعين.

**حەفتەم: تەلاقدانی ژنی خراپو بەد ڕەوشت،** حەزرەتی(إِبْراهِيم)ﷺ فەرمووی: **(بە مێردەكەت بڵێ: با كۆسپەی دەرگاكەی بگۆڕی).**

ئافرەتی ناشوكرو نارازی بە بەشیخوا، شیاوی ئەوە نیە ببێتە هاوسەری پێغەمبەریخوا، ئایا (إِسْماعِيل) پێغەمبەرێكی ئەوهاﷺ: كە بە هۆی خۆڕاگریو خولق خۆشی، خەزورانی تەماعی لێبكەنو بیكەنە زاوای خۆیانو هەم خوایگەورە فەرمانی سەربڕینی دەر بكاو ئەویش تەسلیمی فەرمانیخوا ببێ، چۆن دەبی ئەو جۆرە ژنە هاوسەری بێ؟

لەم بابەتە ئیمام (ابن حجر الهيتمى) فەرموویەتی: **(ئەگەر هاوسەرەكەی خولقی لەگەڵ خراپ بوو، یان دایكو باوكی مێردەكە فەرمانی تەلاقدانی ژنەكەیان پێكرد، ئەو كاتە سوننەتە تەلاقی بدا، بەو مەرجەی فەرمانی دایكو باوكەكە بە ڕقەكاریو هەواو هەوەس نەبێ).** ﴿عَن ابْنِ عُمَررضي الله عنهما: كان تَحْتِي اِمْرَأَةٌ أُحِبُّها وَكانَ أَبِي يَكْرَهُها فَأَمَرَنِي أَنْ أُطَلِّقَها، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّﷺ فَذَكَرْتُ لَهُ، فَقالَ: يا عَبْدَالله طَلِّقْ اِمْرَأَتَكَ﴾ رواه ابوداود والترمذي بسند صحيح، **(عبدالله)ی كوڕی ئیمام(عُمَر) فەرمووی: ژنێكم هەبوو خۆشم**

دەویا، بەڵام باوکم ڕقی لێبوو و فەرمانی پێکردم تەڵاقی بدەم، جا منیش هاتمە لای پێغەمبەرﷺ باسی وەزعەکەم کرد؟ ئەویش فەرمووی: تەڵاقی بدە.

**با کۆسپەی دەرگاکەی ڕابگری.** بەڕاستی ئافرەتی شوکرو خوڵق خۆش شیاوی ئەوەیە: بە هاوسەری پێغەمبەریخوا بمێنێتەوە لە دونیاو قیامەت، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ﴾ النور: ٢٦، ژنەکانی پاكو خاوێن بۆ پیاوانی پاكو خاوێنن.

بۆیێ پێویستە ئەم جۆرە ئافرەتە بە ڕێزدارەیەوە هاوسەریی لەگەڵ بکرێو تەڵاقدانیشی ناپەسەندە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أَبْغَضُ الْحَلَالِ إِلَى اللهِ-عَزَّ وَجَلَّ-الطَّلَاقُ﴾ حديث صحيح رواه أبوداود وغيره، لە هەموو حەڵاڵێك ڕق لێهاتووتر لە لای خوایگەورە تەڵاقدانە. (تحفة المحتاج) ب(٨) ل(٣).

**هەشتەم:** پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿نَزَلَ الْحَجَرُالْأَسْوَدُ مِنَ الْجَنَّةِ...﴾ رواه الترمذي وحسّنه، بەردە ڕەشەکەی (بَيْت) لە بەهەشت هاتۆتە خوارەوە. هەم پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ لِهذا الْحَجَرِ لِساناً وَشفَتَيْنِ يَشْهَدانِ لِمَنْ اِسْتَلَمَهُ يَوْمَ الْقيامة بِحَقٍّ﴾ صححه ابن حبان وحسّنه الترمذي، ئەم بەردە ڕەشەیە لە ڕۆژی قیامەت زوبانێكو دوو لێوی هەنە شاهیدی بۆ ئەو کەسە دەدەن کە دەستی لێداوە. هەروەها لە (أَثَر)ێکی بێهێزدا لە ئیمام(علی)ﷺ گێڕدراوەتەوە: ﴿کە خوایگەورە لە ڕۆژی (قَالُوا بَلَى) بەڵێنی خوایەتیی لە ئادەمیزادان وەرگرت، ئەم بەڵێنەی خستۆتە ناو (الْحَجَرُالْأَسْوَد)=بەردە ڕەشەکە، جا هەر کەسێك هاتە زیارەتیی، ئەوە لە ڕۆژی قیامەت بەردەکە شاهیدی یەکخواپەرستیی بۆ ئەدا﴾. (فتح الباری) ب(٣) ل(٥٨٣و٥٨٤).

**نۆیەم: دوعایەکانی حەزرەتی (إِبْراهِيم):** ﴿فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە. جگە لەو دوعایانەش: پێش ئاوەدانکردنەوەی (مَكَّة) دوعای کرد ﴿رَبِّ اجْعَلْ هَذَا بَلَداً آمِناً﴾ إبراهيم: ٣٥، خوایە ئەم شوێنە بکەیە شارێکی ئەمین.

هەم دوعای کرد: ﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ﴾ البقرة: ١٢٩، خوایە پێغەمبەرێکی وەهایان بۆ بنێرە فێرە قورئانو حەدیسیان بکاو لە گوناهەکانیان پاکیان بکاتەوە.

جا ئەم دوعایانە گشتی خوا قبوڵی کردن، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أَنَا دَعْوَةُ أَبِي إِبْراهِيم وَبُشْرى عِيسَى وَرَأَتْ أُمِّي حِينَ حَمَلَتْ بِي أَنَّهُ خَرَجَ مِنْها نُورٌ أَضائَتْ لَهُ قُصُورُ الشَّامِ﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد وغيره، من دوعایەکەی باوکمم (إِبْراهِيم) پێغەمبەرﷺ -کە تازە ڕابرا- موژدەی (عیسى) پێغەمبەرمﷺ، دایکیشم دیتی نورێکی لێهاتە دەرەوە تەلارەکانی (شام)ی ڕوناك کردن.

موژدەی (عیسى) پێغەمبەرﷺ ئەوەیە: ﴿وَمُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾

الصف: ٦، هۆ (بَنِي إِسْرائِيل)...من موژدەدەرم بە پێغەمبەرێك لە دوای من دێ ناوی (أَحْمَد)ەﷺ. (صفوةالتفاسير) سورةالصف: الآية (٦).

*** *** ***

## ﴿ نەژادە ڕێزدارەكەی پێغەمبەرﷺ تا وەفاتكردنی باوكی ﴾

پێغەمبەرمان: ناوی ﴿(مُحَمَّد)ﷺ كوڕی (عَبْدُالله) كوڕی (عَبْدُالْمُطَّلِب) كوڕی (هاشِم) كوڕی (عَبْدِ مَناف) كوڕی (قُصَيّ) كوڕی (كِلاب) كوڕی (مُرَّة) كوڕی (كَعْب) كوڕی (لُؤَيّ) كوڕی (غالِب) كوڕی (فِهْر) كوڕی (مالِك) كوڕی (النَّضْر) كوڕی (كِنانَة) كوڕی (خُزَيْمَة) كوڕی (مُدْرِكَة) كوڕی ( إِلْياس) كوڕی (مُضَر) كوڕی (نِزار) كوڕی (مَعَدّ) كوڕی (عَدْنان)﴾ رواه البخاري في صحيحه، وزاد في التأريخ: ﴿كوڕی (أُدَد) كوڕی (الْمُقَوَّم) كوڕی (تارِح) كوڕی (يَشْجُب) كوڕی (يَعْرُب) كوڕی (نابِت) كوڕی (إِسْماعِيل)ﷺ كوڕی (إِبْراهِيم)ﷺ﴾. (فتح الباري) ب(٧) ل(٢٠٤-٢٠٧).

دايكی پێغەمبەرﷺ: ناوی ﴿(آمِنَة) كيژی (وَهَب) كوڕی (عَبْد مَناف) كوڕی (زُهْرَة) كوڕی (كِلاب) كوڕی (مُرَّة)....هتد﴾. واتە: دايكو باوكی پێغەمبەرﷺ لە (كِلاب) دەگەنەوە يەكتری، چونكە (قُصَيّ)و (زُهْرَة) برای يەكتری بون، كەواتە: (كِلاب) باپيرەی سێيەمی (آمِنَة)يە، هەم باپيرەی چوارەمی (عَبْدُالله)يە. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٥٤٨و٥٥٣).

داپيرەكانی پێغەمبەرﷺ: دايكیباوكی ناوی (فاطِمَة)يە، دايكیدايكی ناوی (بَرَّة)يە، (سيرة ابن هشام) ب(١) ل(١٦١و١٦٥).

جا بزانە: بە يەكدەنگی زانايان: لە پێغەمبەرەوەﷺ تا (عَدْنان) ڕاستەو گومان لەوەدا نيە: كە (عَدْنان) لە نەژادی حەزرەتی(إِسْماعِيل) پێغەمبەرەﷺ، بەڵام لە (عَدْنان) بە سەرەوەتر فەرموودەی جۆراوجۆر هەنە: ئايا بە چەند پشت (عَدْنان) دەگاتەوە حەزرەتی(إِسْماعِيل) پێغەمبەرﷺ.

جا نەژادی بنەماڵەی (قُرَيْش) دێتەوە سەر (النَّضر)ی كوڕی (كِنانَة)، چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموويەتی: ﴿إِنَّ الله اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْماعِيل، واصْطَفَى قُرَيْشاً مِنْ كِنانَةَ، وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْش بَنِي هاشِم، وَاصْطَفانِي مِنْ بَنِي هاشِم﴾ رواه مسلم والترمذي، خوایگەورەلە نەتەوەكانی (إِسْماعِيل) پێغەمبەرﷺ (كِنانَة)ی هەڵبژارد، لە(كِنانَة)ش (قُرَيْش)ی هەڵبژارد، لە (قُرَيْش)ش (بَنِي هاشِم) هەڵبژاردن، لە (بَنِي هاشِم)ش منی هەڵبژارد. (فتح الباري) ب(٦) ل(٦٤٧و٦٥٣) و(تحفةالأحوذي) ب(١٠) ل(٣٠٣).

## ﴿ چەند بەسەرهاتێكی باوكو باپيری پێغەمبەرﷺ پێش لە دايكبوونی ﴾

پێش لە دايكبوونی پێغەمبەرﷺ چەند شتێكی سەرسوڕهێنەر ڕووی داوە نيشانەی

خۆشیو شادی بون بۆ ئەم بونەوەرە، وەك: نوێکردنەوەی بیری (زَمْزَم) لە لایەن (عَبْدُالْمُطَّلِب)، ڕزگاربوونی باوکیپێغەمبەرﷺ لە سەربڕین، تەفروتوناکردنی (أصْحاب الْفِيل)، خەونەکەی (عَبْدُالْمُطَّلِب)ی باپیرەی پێغەمبەرﷺ کە لە خەوندا دیتی: ﴿درەختێك ڕواو گەیشتە بەرزایی ئاسمان، لقەکانیشی بە ڕۆژھەڵاتو ڕۆژئاوادا بڵاو بونەوە، ڕۆناکیەکەشی لە ڕۆناکی ڕۆژ بەھێزتر بوو و عەرەبو عەجەم سوجدەیان بۆ دەبرد، بەرەبەرەش لە زیادبووندا بوو، کۆمەڵێك لە (قُرَيْش) دەیانویست دەرختەکە ببڕن، بەڵام گەنجێك پشتی شکاندنو چاوی کوێر کردن...﴾.
لێکدانەوەی ئەم خەونە: ئایینی ئیسلامو پێغەمبەرەﷺ. (الخصائص الكبرى). ب(١) ل(٣٩).

﴿ ھەڵکەندنەوەی بیری (زَمْزَم) بە دەستی (عَبْدُالْمُطَّلِب)ی باپیری پێغەمبەرﷺ﴾

**پێشەکی** بزانە: (عَبْدُالمُطلِب) ناوی (شَيْبَة)یە–پیّی دەگوترا: (شَيبَةُ الحَمد)– زانایان فەرموویانە: بنەماڵەی (جُرهُم) لە (مَكّة) دەستیان بە خراپەکاری کردو بیری (زَمزَم)شیان پڕ کردەوەو ئاوەکەی ون بوو، ناچار دانیشتووانی (مَكّة) چەند بیرێکیتریان ھەڵکەندنو لەو بیرانە ئاویان دەخواردەوە تا بە دەستی (عَبدُالمُطَّلِب)ی باپیری پێغەمبەرﷺ بیری (زَمزَم) ھەڵکەندراوە.

ئیمام(علی)ﷺ فەرموویەتی: جارێك (عَبدُالمُطلِب) لە ناو (حِجر إسماعِيل)داﷺ خەوتبوو، لە خەوندا پێیان گوت: ﴿(زَمْزَم) ھەڵکەنەو ئاوەکەی نابڕیٚو حاجیەکانی پیٚ ئاو بدە، شوێنەکەی لە نێوان شیاكو خوێنەکەیە لەو شوێنەی قەلەکەی قاچ سپی دندوکی لیٚدەدا لە لای شارە مێرووەکە﴾.

جا (عَبدُالمُطلِب) بەو ڕێنموونیە شوێنی (زَمزَم)ی دۆزیەوەو دەستی بە ھەڵکەندن کرد بەخۆیو (الحارِث)ی کوڕی–کە جگە لە (الحارِث) ھیچ کوڕیتری نەبو– جا کە ئاسەواری بیرەکە دەرکەوت، (عَبدُالمُطلِب) گوتی: (اَللهُ أكبَر). ئیتر کە (قُرَيشي)یەکان زانییان (عَبدُالمُطلِب) گەیشتە مەبەستیخۆی، لە دژی کۆ بونەوەو گوتیان: ھۆ (عَبدُالمُطلِب) ئەم بیرەی (زَمزَم)، بیری (إسماعِيل)ی باوکمانە، کەوابوو: ھەموومان لەم کارەدا ھاوبەشین– نەك تۆ بە تەنھا– جا (عَبدُالمُطلِب) گوتی: من وا ناکەم ئەم کارە تایبەتە بە خۆم، ئێوە ھیچ مافێکتان لەم کارەدا نیە. جا (قُرَيشي)یەکان گوتیان: وازت لیٚ ناھێنین تەنھا بە دادگا نەبیٚ. ئیتر ڕێك کەوتن: بچنە لای (کاهِنَة)ی (بَنى سَعْد) لە وڵاتی (شام).

جا بە تێکڕایی ڕۆیشتنو لە ڕێگەدا لە بیابانێکدا ئاویان لیٚبڕاو خەریك بوو بە تێنووەتی بمرن، ناچار ڕێك کەوتن ھەر کەسەیان بۆ خۆی قۆرتێك ھەڵکەنیٚ، بۆ ئەوەی ھەر کاتێك مرد، ئەوەی زیندووە بیخاتە ناو قۆرتەکەیو خۆڵەکەی بە سەردا بکاتەوە، جا قۆرتەکەیان ھەڵکەند و دانیشتن چاوەڕوانی مردنیان دەکرد، ئینجا (عَبدُالمُطلِب)

گوتی: مانەوەمان لێرە بەم شێوەیەو تەسلیمبوونمان بۆ مردن بەم جۆرە تەمبەڵییە، کەوابوو: با بە تێنووەتی بڕۆین بەڵکی خوایگەورە ئاومان بداتێ. ئینجا هەڵسان ڕۆیشتن، جا کە (عَبْدُالْمُطَّلِب) وشترەکەیخۆی هەڵساند، یەکسەر لە بن سمی وشترەکەی سەرچاوەیەکی ئاو هەڵقوڵاو (عَبْدُالْمُطَّلِب)و ئەوان گوتیان: (اَللهُ أكْبَر). جا دابەزینو ئاویان خواردەوەو کوندەیان پڕ ئاو کردن، ئینجا داواکارەکان گوتیان: وَاللهِ خوایگەورە بڕیاری دادگایەکەی بۆ تۆ دا، هیچیتر لەبارەی (زَمْزَم) کێشەت لەگەڵ ناکەین، ئەو خوایەی لەم بیابانە ئاوی دایێ، هەر ئەو خوایەش (زَمْزَم)ی داویێ. ئینجا هەر لەم بیابانەوە گەڕانەوە بۆ (مَكَّة)و وازیان لە بیری(زَمْزَم) هێنا بۆ (عَبْدُالْمُطَّلِب).

## ﴿ ڕزگاربوونی (عبدالله)ی باوکی پێغەمبەرﷺ لە سەربڕین ﴾

ئیمام (ابن إسحاق) فەرموویەتی: کە (قُرَيْشی)یەکان لە سەر بیری (زَمْزَم) کێشەیان لەگەڵ (عَبْدُالْمُطَّلِب) کرد، گوتیان: تۆ تەنها یەك کوڕت هەیەو دەوڵەمەندیش نی، چۆن زماندرێژیمان دەکەیە سەر=ململانەمان لەگەڵ دەکەی؟

جا (عَبْدُالْمُطَّلِب) گوتی: بۆ خوا لە سەرم نەزر بێ ئەگەر خوا دە کوڕم بداتێ، یەکیکیان لە لای (كَعْبَة) سەر ببڕم. ئینجا دە کوڕی بە تەواوی بون–(**الحارِث، الزُّبَيْر، حَجْل، ضِرار، اَلْمُقَوِّم، أَبُولَهَب، العَبّاس، حَمْزَة، أَبُوطالِب، عبدالله**)–جا هەموویانی کۆ کردنەوەو هەواڵی نەزرەکەی پێگوتن؟ ئەوانیش گوێڕایەڵی باوکیان بون، جا (عَبْدُالْمُطَّلِب) تیروپشکی لە نێوان کوڕەکانیدا کردو ناوی (عبدالله) بۆ سەربڕین دەرچوو، بەڵام (قُرَيْشی)یەکان ڕێگایان نەدا و گوتیان: ئەگەر تۆ (عبدالله) سەر ببڕی، ئەو سەربڕینە لە ناوماندا دەبێتە عادەت.

ئیتر بڕیاریان دا: بچنە لای (كاهِنَة)ی (حِجاز) لە (مَدِينَة)، جا کە هاتنە (مَدِينَة)، لەو کات (كاهِنَة)کە لە (خَيْبَر) بوو، جا چونە لایو وەزعەکەیان بۆ باس کرد، (كاهِنَة)کە گوتی: خوێنی یەك پیاو لە لای ئێوە چەندە؟ گوتیان: دە وشترە. جا (كاهِنَة)کە گوتی: بڕۆنەوە شارەکەیخۆتان، تیروپشك لە نێوان (عبدالله)و دە وشتردا بکەن: ئەگەر تیرەکە لە دژی (عبدالله) دەرچوو، دیسان تیروپشك لە نێوان (عبدالله)و دە وشتریتردا بکەن... هەر بەم جۆرە تا تیرەکە بۆ (عبدالله) لە دژی وشترەکان دەردەچێ.

جا ئەوان گەڕانەوەو بەو جۆرەیڕابردوو تیروپشکیان لە نێوان (عبدالله)و دە وشتردا دەکرد تا ژمارەی وشترەکان گەیشتە سەد وشتر، ئینجا (قُرَيْشی)یەکان گوتیان: هۆ (عَبْدُالْمُطَّلِب) خوا ڕازی بوو. جا (عَبْدُالْمُطَّلِب) سەد وشترەکەی لەجیاتی (عبدالله) سەر بڕینو کردنیە قوربانی، ئادەمیزادو دڕندەو باڵندە لە گۆشتەکەیان دەخوارد.

ئیمامی(الزُّهْري) فەرموویەتی: (عَبْدُالْمُطَّلِب) یەکەم کەس بوو: خوێنی یەك پیاوی

کردە سەد وشتر، پێغەمبەریشﷺ لە ئیسلامدا ئەم خوێنەی جێگیر کرد: بەو شێوەی لە کتێبەکانی شەریعەتی‌ئیسلامدا ڕوون کراوەتەوە. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٥٨٦–٥٩٠) و(السيرة الحلبية) ب(١) ل(٤٨–٥٥).

﴿ مارەکردنی ( آمِنَة )ی دایکی پێغەمبەرﷺ لە ( عبدالله )ی باوکیی ﴾

(عبدالله)ی باوکی پێغەمبەرﷺ لە لای باوکی‌خۆی لە هەموو برایەکانی خۆشەویستتر بوو، چونکە نوری پێغەمبەرﷺ لە نێوچاوانی‌دا دیار بوو، بۆیێ لە هەموو گەنجەکانی (قُرَیْش) جوانتر بوو و ئافرەتانی (قُرَیْش)ش دڵیان بۆ دەچوو ببێتە هاوسەریان، بۆیێ باوکی ویستی جوانترین‌و بەشەرەفترین‌و ڕەسەنترین ئافرەتی (قُرَیْش)ی لێ‌مارە بکا، ئەوە بوو: کە (عبدالله) لە سەربڕین ڕزگاری بوو، باوکی لەگەڵ خۆیا بردیە لای ماڵی (وَهَب)ی کوڕی (عَبْد مناف)و لەوێ (آمِنَة)ی کیژی (وَهَب)ی لە (عبدالله) مارە کرد، هەر لەوێ‌ش لە ڕۆژی دوو شەممە (عبدالله) لێی بووە زاوا؟ چونکە لەوێ وەها عادەت بوو: زاوا لە ماڵی خەزوری لە بوکێ ببێتە زاوا، ماوەی سێ شەوانیش بمێنێتەوە، ئینجا لەوێ بڕواتە دەر، جا لەم بەزاوابوونە نوری پێغەمبەرﷺ لە پشتی (عبدالله)ی باوکی گواسترایەوە بۆ مندالْدانەی (آمِنَة)ی دایکی‌و پێغەمبەرﷺ لە زگی دایکی‌دا جێگیر بوو.

﴿ وەفاتکردنی باوکی پێغەمبەرﷺ ﴾

جا کە تەمەنی پێغەمبەرﷺ لە زگی دایکی‌دا بووە دوو مانگ، (عبدالله)ی باوکی لە (مَدِينَة) وەفاتی کرد؟ چونکە (عبدالله) لە گەڵ کاروانی (قُرَیْش) بۆ بازرگانی چونە (شام)، لە گەڕانەوەدا (عبدالله) لە (مَدِينَة) نەخۆش کەوت‌و لە لای ماڵە خاڵەکانی–کە (بَنِی‌النَّجَّار) بون– بەو نەخۆشییە وەفاتی کرد، هەر لە (مَدِينَة)ش بە خاك سپێردرا، لە کاتی وەفاتکردنی‌دا تەمەنی (٢٥) بیست‌و پێنج ساڵ بوو. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٥٩١و٦٠٣) و(الخصائص الكبرى) ب(١) ل(٤١و٤٢) و(السيرةالحلبية) ب(١) ل(٥٨و٥٩و٧٤).

﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: نەژادی پێغەمبەرﷺ نەژادێکی ڕەسەن‌و پاکە**، حەدیسەکەی ﴿إِنَّ اللهَ اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَﷺ...﴾ بەڵگەیە: **(کە پێغەمبەرﷺ بە باوك‌و باپیرانیەوە تا دەگاتە حەزرەتی(إِبْراهِيم) پێغەمبەرﷺ هەموویان ڕێزداری سەردەمی‌خۆیان بون).**

جا ئەم نەژادە ڕێزدارەش خوای‌گەورە بۆ ئەوە ئامادەی کردووە: تاکو پێغەمبەری ئاخیر زەمانیﷺ لێ‌ببێ، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللهَ خَلَقَ الْخَلْقَ فَجَعَلَنِي فِي خَيْرِ خَلْقِهِ، وَجَعَلَهُمْ فِرْقَتَيْنِ فَجَعَلَنِي فِي خَيْرِ فِرْقَةٍ، وَخَلَقَ الْقَبَائِلَ فَجَعَلَنِي فِي خَيْرِ قَبِيلَةٍ، وَجَعَلَهُمْ بُيُوتاً فَجَعَلَنِي فِي خَيْرِهِمْ بَيْتاً، فَأَنَا خَيْرُكُمْ بَيْتاً وَخَيْرُكُمْ نَفْساً﴾ حديث حسن أخرجه الامام أحمد والترمذي والبيهقي، **خوای‌گەورە بوونەوەری دروست کرد، جا منی خستە ناو**

چاكترینی دروستكراویخۆی، خوایگەورە دروستكراویخۆی كردە دوو چین، جا منی خستە ناو چاكترین چین، خوایگەورە بەرەبابەكانی دروست كردن، جا منی خستە ناو چاكترین بەرەباب، خوایگەورە بەرەبابەكانی كردنە بنەماڵە، جا منی خستە ناو چاكترین بنەماڵە، كەوابوو: من لە هەمووتان چاكترم لە ڕووی بنەماڵەو لە ڕووی كەسایەتییەوە.

**دووەم: دۆزینەوەو هەڵكەندنەوەی بیری (زَمْزَم) لە لایەنی (عَبْدُالْمُطَّلِب)ی باپیری پێغەمبەرﷺ**، ئاماژەیە بۆ نوێبوونەوەی پێغەمبەرایەتی لەو نەژادەی یەكەم جار بیری (زَمْزَم)ی بۆ هەڵقوڵاوە؟ چونكە لە ڕاستیدا پێغەمبەرایەتی حەزرەتی(إِبْراهِیم)و حەزرەتی (إِسْماعِیل)-علیهما الصلاة والسلام- لە بیر كرابوو و تەنها ئاسەوارێكی كەمی مابوو.

**سێیەم: ڕزگاربوونی (عبدالله)ی باوكی پێغەمبەرﷺ لە سەربڕین**، وەبیرهێنانەوەی ڕزگاربوونی حەزرەتی(إِسْماعِیل) پێغەمبەرەﷺ لە سەربڕین-كە ئەویش باپیرە گەورەی پێغەمبەرمانەﷺ، بۆیە بە پێغەمبەرﷺ دەگوترا: (ابْنُ الذَّبِيحَيْن) كوڕی دوو سەربڕاوەكان. هەم نیشانەی نزیكبوونەوەی هاتنی پێغەمبەرەیشەﷺ.

**چوارەم: سەد وشتر كرانە قوربانی (عبدالله)ی باوكی پێغەمبەرﷺ،**

**پرسیار:** بۆچی سەد وشتر بونە قوربانی (عبدالله)ی باوكی پێغەمبەرﷺ، بەلام تەنها یەك بەران بووە قوربانی حەزرەتی(إِسْماعِیل)ﷺ كە بەخۆی پێغەمبەرەو بابەگەورەی پێغەمبەریشەﷺ؟

**وەڵام:** ئەو بەرانە-سەد قات- لە سەد وشترەكە ڕێزدارتر بوو، چونكە ئەوە ئەو بەرانە بوو كە (هابیل)ی كوڕی باب (آدم)عليه السلام كردبویە قوربانیو خوا لێی قبوڵ كرد، ئینجا هەر لە بەهەشتدا دەلەوەڕا تا خوایگەورە كردیە قوربانی حەزرەتی(إِسْماعِیل)ﷺ.

جا تا سەرەتای ئیسلامیش سەركی بەرانەكە بە شاخەكانیەوە لە (كَعْبَة) هەڵواسرابوو، هەروەك ئیمامی(القرطبي)لە تەفسیرەكەیدا لە (ابن عَبّاس)ی-رضي الله عنهما- گێڕاوەتەوە، بۆیێ خوایگەورەدەرهەق بەرانەكە فەرموویەتی: ﴿وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ﴾ الصافات:١٠٧، **بەرانێكی بە قەدرو ڕێزدارمان كردە (فِدْيَة)ی (إِسْماعِیل).**

كەوابوو: بەرانەكە شیاوی ئەوەیە ببێتە قوربانی (إِسْماعِیل) پێغەمبەرێكی بە قەدرو ڕێزدارﷺ، سەد وشترەكەش شیاوی ئەویە ببێتە قوربانی (عبدالله)ی باوكی پێغەمبەرێكی بە قەردو ڕێزدارﷺ، چونكە (عبدالله) پێغەمبەر نیە.

**پێنجەم: هەڵبژاردنی (آمنَة)ی بنەماڵەی (الزُّهْري) بۆ دایكایەتی پێغەمبەرﷺ**، بەڵگەیەكیترە: كە پێغەمبەرﷺ لە ڕووی دایكیشیەوە هەر پاكو ڕەسەنە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنِّي خَرَجْتُ مِنْ نِكاحٍ وَلَمْ أَخْرُجْ مِنْ سِفَاحٍ﴾ حدیث حسن رواه البیهقي، من

بەردەوام لە مارەبڕینێکی حەڵاڵەوە دەر هاتوم، لە جیماعی حەڕام دەرنەهاتوم.
ئیمامی(السُّبْكي) فەرموویەتی: لە پێغەمبەرەوەﷺ تا باب (آدَم)عليه السلام هەموو مارەبڕینەکان دروستبوونە وەکو مارەبڕینەکانیئیسلام. (السيرة الحلبية) ب(١) ل(٦٣و٦٤).

**شەشەم: نوری پێغەمبەرﷺ لە نێوچاوانی( عبدالله )ی باوکی پێغەمبەرداﷺ دیار بوو.**

خوایگەورە لە قورئانی پیرۆزدا ناوی پێغەمبەریﷺ هێناوە بە (نُور)، واتە: ڕۆناکی دونیاو دڵو دەرون، چونکە هەروەك ڕۆناکی تاریکی لادەبا، ئەوهاش پێغەمبەرﷺ تاریکی (کُفْر) لادەبا، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿قَدْ جَاءَكُمْ مِنَ اللهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُبِينٌ﴾ المائدە: ١٥، **بەڕاستی لە لای خواوە بۆ ئێوە هات (نُور)ێك–کە پێغەمبەرەﷺ– هەم قورئانێکی ڕوونکەرەوە.** (تفسيرالخازن) و(تفسير مدارك التنزيل) المائدة: ١٥.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿رَأَتْ أُمِّي حِينَ حَمَلَتْ بِي كَأَنَّهُ خَرَجَ مِنْهَا نُورٌ أَضاءَ لَهُ قُصُورُ الشّامِ﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد والبيهقي، **لەو کاتەی دایکم منی بە زگ کەوت، لە خەوندا دیتی نوریکی وەهای لێ هاتە دەرەوە: تەلارەکانی (شام)ی پێ ڕۆناك بونەوە.** لە باسی ( لە دایکبوونی پێغەمبەر)ﷺ حەدیسەکە بە تەواوی ڕوون کراوەتەوە.

جا بە سەیری مەزانە بە هۆی نوری پێغەمبەرﷺ، (عبدالله) ئەوەندە جوان ببێ: ئافرەتانی (قُرَيْش) ڕێگای لێبگرنو داوای هاوسەریەتیی لێبکەن، ئەوە بوو: (رُقَيَّة)ی کیژی (نَوْفل)–کە خوشکی (وَرَقَة بن نَوْفل) بوو– لە برایەکەیخۆی گوێی لێدەبوو، کە نزیك بووە پێغەمبەری ئاخیر زەمان بێ، نیشانەشی ئەوەیە: نوری وی لە نێوچاوانی باوکیدا دیارە، بۆیێ (رُقَيَّة) ڕێی لە (عبدالله) گرتو گوتی: بە قەد ئەو سەد وشترەی بە قوربانی تۆ کراون، وشترت دەدەمێ جیماعم لەگەڵ بکە. (عبدالله) وەڵامی داوەو گوتی: ناتوانم بێ بڕیاری باوکم هیچ بکەم. ئینجا ( عبدالله) ئەم شیعرانەشی بۆ (رُقَيَّة) گوتن:

| | |
|---|---|
| أَمَّا الْحَرامُ فَالْمَماتُ دُونَهُ | وَالْحِلُّ لا حِلَّ فَأَسْتَبِينَهُ |
| يَحْمِي الْكَرِيمُ عِرْضَهُ وَدِينَهُ | فَكَيْفَ بِالأَمْرِ الَّذِي تَبْغِينَهُ |

واتە: هەرچی حەڕام بێ، ئەگەر لە نەکردنیدا بشمرم هەر نایکەم، لەبارەی حەڵاڵیش هیچ حەڵاڵێك نیە ئاشکرای بکەم، واتە: چونکە تۆ ژنی من نیی، مرۆڤی ڕێزدار ئابروو و ئاینی خۆی دەپارێزێ، جا چۆن دەگونجێ ئەو کارەی تۆ داوام لێدەکەی بە حەڕامی بیکەم.

بەڵێ: خوایگەورە ئەوها باوکی پێغەمبەریخۆیﷺ لە داوێنپیسی پاراست، چونکە ناکرێو نابێ دایكو باوکی پێغەمبەران–عليهم الصلاة والسلام– داوێنپیس بن، کەواتە: ئەم پاراستنەی (عبدالله) لە بەر خاتری پێغەمبەرﷺ بوو.

جا لە دوای ئەوەی (عبدالله) لە (آمِنَة) بووە زاوا، نورەکەی گواستراوە لای (آمِنَة)، بۆیێ کە ئەم جارە (رُقَيَّة) چاوی بە (عبدالله) کەوت، پێی گوت: تازە هیچ کارم بە تۆ نیە؟ چونکە

نورەکە لە نێوچاوانتدا نەماوە. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦٠٣) و(السيرة الحلبية) ب(١) ل(٥٨).

**حەفتەم: ئەمەنی پێغەمبەرﷺ لە زگی دایکیدا دوو مانگ بوو، باوکی وەفاتی کرد.**

بەڵێ: لە دوای بەزاوابوون، زمانحاڵی قەزاو قەدەر بە (عبدالله)ی گوت: ﴿**تازە کارم بە تۆ نیە؟ چونکە کارە گرنگەکەی تۆ ئەوە بوو: ئەو ئەمانەتەی لە پشتی تۆدایە—بێ خیانەتکاری— تەسلیمی شوێنی‌خۆی بکەی کە منداڵدانەی (آمِنَة)یە، جا ئەوە کارەکەت ئەنجام دا، ئیتر خوات لەگەڵ‌و ماڵئاوا**﴾.

*جا (عبدالله)ی گەنج‌و جوان‌و داوێنپاك وەفاتی کرد و ماڵئاوایی کرد لە هاوسەرەکەی‌و لە کۆرپەکەی ناو زگی، بەڵێ: ئەو باوکە دڵسۆزە لە (مَدِينَة) لە ناو گۆڕەکەی پاڵی داوە، با لەوێ چاوەڕوان بێ، تا کۆرپەکەی دەبێ‌و دەبێتە پێغەمبەرﷺ ئەویش دێتە (مَدِينَة)و لەوێ وەفات دەکاﷺ.*

## ﴿ باسێکی گرنگ لەبارەی دایك‌و باوك‌و باپیری پێغەمبەرﷺ ﴾

لە ڕووداوەکانی ئەم باسەو لەو سێ حەدیسانەی هێناومانن بۆمان ئاشکرا بوو: کە دایك‌و باوك‌و باپیری پێغەمبەرﷺ ئیماندارن‌و کافر نین، هەر چەند نەشگەیشتونە ئیسلامەتی؟ چونکە پێش پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەرﷺ وەفاتیان کردوە، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ الإسراء: ١٥، **ئێمە هیچ کەسێك سزا نادەین تا پێغەمبەرێکیان بۆ دەنێرین.** ئیمامی(القُرْطُبي) دەفەرموێ: دانیشتووانی دورگەکان کاتێ ئیسلامەتیان دەگاتێ‌و ئیمان دێنن لە ڕابردوودا داواکاری شەرعیان لە سەر نیە.

لە لایەکی‌تریشەوە: خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿لِتُنْذِرَ قَوْماً مَا أَتَاهُمْ مِنْ نَذِيرٍ مِنْ قَبْلِكَ﴾ السجدة: ٣، **ئەو قورئانە ڕاستە تاکو—ئەی پێغەمبەرﷺ—گەلێکی وەهای پێ بترسێنی کە پێش تۆ هیچ ترسێنەرێکیان بۆ نەهاتوە.** ئیمامی(القُرْطُبي) لە ئیمام(قَتادَة) دەگێڕێتەوە: مەبەست (قُرَيْش)ن، گەلێکی نەخوێندەوار بون‌و پێش پێغەمبەرﷺ هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتبوو. (تفسيرالقرطبي) الإسراء (١٥) والسجدة (٣).

**جا بزانە:** لە حەدیسێکی (صحيح)دا پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿إِسْتَأْذَنْتُ رَبِّي أَنْ أَسْتَغْفِرَ لِأُمِّي فَلَمْ يَأْذَنْ لِي وَاسْتَأْذَنْتُهُ فِي أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا فَأَذِنَ لِي﴾ رواه مسلم، **داوای ئیزنم لە خودا کرد تا داوای لێخۆشبوون بۆ دایکم بکەم، بەڵام خوا ئیزنی نەدام، تکای ئیزنم لێکرد زیارەتی گۆڕەکەی بکەم، خوا ئیزنی دام.**

هەم لە حەدیسێکی‌تری (صحيح)دا پێغەمبەرﷺ بە پیاوێکی فەرموو: ﴿إِنَّ أَبِي وَأَبَاكَ فِي النَّارِ﴾ رواه مسلم، **باوکی من‌و باوکی تۆ لە ئاگری دۆزەخدانە.**

**بزانە:** ئەم دوو حەدیسانە هیچ وشەیەکی وەهایان تێدا نیە کە بڵێ: دایك‌و باوکی پێغەمبەرﷺ کافرن، هەروەها لە هیچ حەدیسێکی‌تری (صحيح)دا بە ئاشکرایی نەهاتووە:

کە دایكو باوكی پێغەمبەرﷺ كافر بنو بتوسەنەمیان پەرستبێ.

ماوەتـەوە: واتەیـەكی گونجـاو بـۆ حەدیـسەكان بڵـێین؟ تـاكو دژایـەتییان لەگـەڵ دوو ئایەتەكەیڕابردوو نەبێ، چونكە حەدیس بەروەستی قورئان ناكا، بۆیێ ئیمـامی (النّـواوي) فەرموویەتی: (مَتى خالَفَ خَبَرُ الْآحادِ نَصَّ الْقُرْآنِ أَوْ إجْماعاً وَجَبَ تَرْكُ ظاهِرِهِ) هەر كاتێك حەدیسێكی (صحیح)–كە (مُتَواتِر) نەبێ– دژایەتی دەقی قورئان، یان (إجْماع) بكا، واجبە واز لە واتە ئاشكرایەكەی بهێندرێ. (المجموع شرح المهذب) ب(٤) ل(٣٤٢).

كەوابوو: دەگونجێ: بۆیێ ڕێگای داوای لێخۆشبوونی نەدرابێ، چونكە دایكی تاوانی نەبووەو پێش پێغەمبەرایەتی مردوە، هەم مەبەست بـە (أَبي وَأَباكَ فِي النَّار): بـاوكی خـۆی نـەبوبێ بەڵكو مەبەستی (أَبُوطالِب)ی مامی بوبێ؟ چونكە لە جێی بـاوكی بـەخێوی دەكـرد، هـەم دەشگونجێ باوكی پێغەمبەرﷺ لەو جۆرە ئیماندارانە بێ: كە بە هۆی گوناهباری–نەك بە هۆی كافری– تا ماوەیەك دەچنە دۆزەخ، چونكە هەندێك ئیمانداری گوناهباریش تا ماوەیەك دەچنە دۆزەخ، یان حەدیسەكان بە ئایەتەكە (نَسْخ) كراونەوە، والله أعلم.

جا ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، بۆیـێ ئـەم باسـەم هێنـا، چـونكە كەسـانێكی بێئـەدەبو بـێ حورمـەت هەنـە بـە هەڵـە لـە حەدیـسەكەیڕابردوو تێگەیـشتونو دەڵـێن: دایـكو بـاوكی پێغەمبەرﷺ كافرن. شانازیش بەم بێئەدەبیە دەكەن!.

پرسیاریان لە ئیمام (أَبُوبَكْر بن العَرَبي المالكي) كرد: لەبارەی ئەو كەسـەی دەڵـێ: بـاوكی پێغەمبـەرﷺ لـە دۆزەخدایـە؟ لـە وەڵامـدا فـەرمووی: ئـەو كەسـە مەلعونـە، چـونكە خوایگەورە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَاباً مُهِيناً﴾ الاحزاب: ٥٧، **بەڕاستی ئەوانـەی خـواو پێغەمبـەریخوا ئـازار دەدەن، خـودا لەعنـەتی لێكـردون لـە دونیـاو قیامـەت، هـەم بـۆ ئـەوان ئامـادەی كـردوە سـزایەكی ڕسـواكەر**...جـا فـەرمووی: هـیچ ئازارێـك لـەوە گـەورەتر نیـە كـە بگـوترێ: باوكیپێغەمبەرﷺ لە دۆزەخدایە. (الحاوی للفتاوی) ب(٢) ل(٢٧٩).

هەروەها ﴿عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً ذَكَرَ أَبا الْعَبّاسِ فَنالَ مِنْهُ فَلَطَمَهُ الْعَبّاسُ فَاجْتَمَعُوا فَقالُوا: وَاللهِ لَنَلْطِمَنَّ الْعَبّاسَ كَما لَطَمَهُ. فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِﷺ فَخَطَبَ فَقالَ: مَنْ أَكْرَمُ النّاسِ؟ فَقالُوا: أَنْتَ يا رَسُولَ اللهِ. قالَﷺ: فَإِنَّ الْعَبّاسَ مِنِّي وَأَنا مِنْهُ، لا تَسُبُّوا أَمْواتَنا فَتُؤْذُوا بِهِ الْأَحْياءَ﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد والنسائي وصححه الحاكم، **پیاوێك بە خراپە باسی باوكی ئیمام (العَبّاس)ی كرد–كە دەكاتە باپیریپێغەمبەرﷺ– جا ئیمام (العَبّاس)رضي الله عنه لەپە دەستێكی لە دەمو لوتی پیاوەكە دا، جا خزمەكانی لێدراوەكە ویستیان لـە ئیمام (العَبّاس)رضي الله عنه بدەن، جا پێغەمبەرﷺ وتارێكی دا و فەرمووی: كێ لە هەموو كەسێك ڕێزدارترە؟ گوتیان: تۆ–ئەی پێغەمبەریخوا– لە هەموو كەسێك ڕێزدارتری. جا**

**پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (العَبّاس) لە منەو من لە (العَبّاس)م، جنێو مەدەنە مردووەکانمان نەوەك بەو جنێودانە زیندووەکان ئازار بدەن.**

**جا ئەم حەدیسە وا ئەگەیەنێ: حەرامە بە ناتەواوی باسی دایكو باوکی پێغەمبەرﷺ بکرێ، چونکە ئەمە پێغەمبەرﷺ ئازار دەدا، ئازاردانی پێغەمبەریشﷺ کوفرە، هەروەك ئیمامی(المُناوي) فەرموویەتی.** (فيض القدير) ب(٦) ل(٥١٧).

***بەندەش دەڵێ: ئەم حەدیسە بەڵگەیە: ئەگەر کەسێك: بڵێ: دایكو باوکی پێغەمبەرﷺ کافرن، جا یەکێك لەپەدەستێکی لە لووتی بدا، ئەوە هیچ تۆڵەی لە سەر نیە، چونکە پێغەمبەرﷺ تۆڵەی نەخستە سەر ئیمام (العَبّاس)، والله أعلم.***

***          ***          ***

## ﴿ باسی لەدایکبوونی پێغەمبەرﷺ- تا وەفاتکردنی دایكو باپیری ﴾

﴿عَنْ أَبِي قَتادَةَ سُئِلَ النَّبِيُّﷺ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الْإِثْنَيْنِ؟ فَقَالَﷺ: ذاكَ يَوْمٌ وُلِدْتُ فِيهِ، وَيَوْمٌ بُعِثْتُ-أَوْ أُنْزِلَ عَلَيَّ- فِيهِ﴾ رواه مسلم، **پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا لەبارەی بەڕۆژووبوونی ڕۆژی دووشەممە؟ ئەویش فەرمووی: دووشەممە ڕۆژێکی ئەوهایە من تێیدا لە دایك بوومو هەم لە دووشەممەدا کرامە پێغەمبەر و قورئانم بۆ هات.**

**پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ لە ڕۆژی دووشەممەی (١٢) دوانزەی مانگی (ربیع الأول) لە کاتی بەرەبەیان لە شاری (مَكّة)دا لە دایك بوو، کە دەکاتە بەرامبەر (٢٠) بیستی مانگی (نیسان)ی ساڵی (٥٧١) پێنجسەدو حەفتاو یەکی زایینی، ئەم ساڵە ناسراو بوو بە (عامُ الفِيل)=ساڵی فیل، چونکە ڕووداوەکەی (أصحَابُ الفِيل) لە نیوەی (مُحرَّم)ی ئەم ساڵەدا بوو، پێغەمبەریش بە پەنجاو پێنج ڕۆژ لە دوای ڕووداوەکە لە دایك بوو،** (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦٠٠-٦٠٢) و(نورالیقین) ل(٨).

**جا لە شەوی لە دایکبوونی پێغەمبەرداﷺ (آمِنَة)ی دایکی بە چاویخۆی دیتی (نور)ێکی لێهاتە دەر، تەلارەکانی (بُصری)ی ڕۆناك کردنەوە، هەروەها هەموو شتێکی ناو ماڵ ڕۆناکی دەداو ئەستێرەکانی ئاسمان بەرەو زەمین نزیك دەبونەوە،**

**(الشّفاء) دایکی (عبدالرحمن بن عَوف) مامانی پێغەمبەریﷺ دەکرد، (أمّ أيْمَن)ش خزمەتی دەکردو لە باوەشی دەکرد، دایکیخۆیشی بۆ ماوەی حەفت ڕۆژان شیری دایێ، ئینجا (ثوَيْبَة)ش یەکەم ئافرەت بوو-لە دوای دایکی- شیری دایێ،**

**ئینجا لە ڕوژی حەفتەمی لە دایکبوونی پێغەمبەرداﷺ (عَبدُالمُطَلِب)ی باپیری هۆزەبانەی بۆ کردو بەرانێکی سەربڕیو ناوی لێنا: (مُحَمَّدﷺ)، جا (عَبدُالمُطَلِب) گوتی: بۆیێ ئەم ناوەم لێنا، ویستم خوایگەورە لە ئاسمانو هەم خەڵکیش لە زەمین مەدحی بکەن.** (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦٠٤و٦٠٦و٦١٢) و(السيرة الحلبية) ل(٩٣و٩٤و١١٥و١٢٩).

## ﴿ شیرخواردنی پێغەمبەرﷺ لە (حَلِيمَة)ی سەعدیە ﴾

ئینجا –بەگوێرەی عادەتی ئەو سەردەم –(حَلِيمَة السَعْدِيَّة) لەگەڵ کۆمەڵە ئافرەتێکی (بَنِیسَعْد) هاتنە (مَكّة) تاکو هەر یەکەیان منداڵێکی شیرخۆر بۆ خۆی وەربگرێو بە کرێ شیری بداتێ، جا ئەو ئافرەتانە هەر یەکەیان منداڵێکی بۆ خۆی وەرگرت، بەڵام (حَلِيمَة) جگە لە پێغەمبەرﷺ هیچ منداڵێکیتری دەست نەکەوت وەریبگرێ، ئەویشی بە دڵ نەبو؟ چونکە یەتیم بوو و دەیگوت: دایکی چی بۆ ئێمە پێدەکرێ، بەڵام بە ناچاری وەریگرت، جا کەوتنە رێ، (حَلِيمَة) سواری گوێدرێژەکەیخۆی بوو و پێغەمبەریﷺ لە پێش خۆی داناو بەرەو ماڵەکانی (بَنِیسَعْد) گەڕانەوە، جا لە ڕێگەدا گوێدرێژەکەی (حَلِيمَة) ئەوەندە بە پەلە دەڕۆیشت هاوڕێکانی بەجێ هێشتن، تا ئافرەتەکان گوتیان: هۆ (حَلِيمَة) گوێدرێژەکەت دوێنێ هەر دوا دەکەوت، ئەوە چی بووە ئەمڕۆ پێش دەکەوێ؟ (حَلِيمَة) لە وەڵامدا گوتی: کوڕێکی موبارەکم لە سەر بار کردوە.

ئیتر لە بەرەکەتی پێغەمبەرﷺ شیری مەمکەکانی (حَلِيمَة) زۆر بوو، هەم شیری مەڕەکانی زۆر بوو و ئێواران ئاژەڵەکانی بە تێریو ورگ پڕیو گوان پڕی لە لەوەڕگە دەگەڕانەوە، بەڵام مەڕەکانی خەڵکیتر بە برسیەتیو بێشیری دەگەڕانەوە.

## ﴿ لەتکردنی سینگی پێغەمبەرﷺ بە دەستی (مَلائِكَة)ی خوا ﴾

کە تەمەنی پێغەمبەرﷺ بووە دوو ساڵ، (حَلِيمَة) بردیەوە (مَكّة)و بە (آمِنَة)ی دایکی پێغەمبەریﷺ گوت: دەترسم کوڕەکەت نەخۆشیی (مَكّة) کاری لێبکا، لێیگەڕێ با ماوەیەکیتریش لە لای ئێمە بێ. جا (آمِنَة) ڕازی بوو و (حَلِيمَة)ش پێغەمبەریﷺ لەگەڵ خۆیا بردەوە، ئینجا ڕۆژێك لە پشتەوەی ماڵەکەی (حَلِيمَة) پێغەمبەروﷺ برا شیریەکەی لە گەڵ بەرخو کاریلەکان گەمەیان دەکرد، لە ناکاو برا شیریەکەی بە غاردان هاتەوە ماڵو گوتی: برا قوڕەیشیەکەم دوو پیاوی بەرگ سپی گرتیانو درێژیان کردو زگیان لەت کرد. ئیتر (حَلِيمَة)و مێردەکەی–کە ناوی (الحارِث) بوو– بە پەلە هاتنە لای پێغەمبەرﷺ، کە دیتیان ڕەنگی گۆڕاوە، جا (حَلِيمَة)و مێردەکەی ماچیان کردو گوتیان: ڕۆڵە چیت بە سەر هاتووە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دوو پیاو هاتن بەرگی سپیان لەبەردا بوو، منیان لە سەر زەمین درێژ کردو زگیان لەت کردمو شتێکیان لێدەرهێناو فڕێیان دا، ئێنجا زگمیان وەکو خۆی پێك وەناوە.

ئیتر (الحارِث)ی مێردی (حَلِيمَة) گوتی: دەترسم ئەم کوڕە شتێکی توش ببێ، هەڵسە با بیبەینەوە لای خزمو کەسەکانی. جا (حَلِيمَة) دەڵێ: کە بردمانەوە، (آمِنَة)ی دایکی گوتی: ئەوە بۆچی هێناتانەوە، خۆ ئێوە زۆر حەزتان دەکرد لە لاتان بێ!؟ جا ئەوانیش بە ڕاستی ڕووداوەکەیان بۆ گێڕایەوە، جا (آمِنَة) گوتی: ئێوە ترسان شەیتان شتێکی

لێبكا؟ نا وَاللهِ شەیتان ناتوانێ هیچی لێبكا، ئەم كوڕەی من كارێكی گەورەی بۆ دەبێ، چونكە كە لە زگمدا بوو، باری سوك بوو و لە خەونمدا دیتم (نور)ێكم لێهاتە دەر تەلارەكانی (شام)ی ڕۆناك كردنەوە، ئینجا كە لێم بوو، وەك منداڵەكانی لەدایكبوو نەبو، بەڵكو هەر دوو دەستی خستنە سەر زەمین و سەری بەرەو ئاسمان بەرز كردەوە، دە ئێوەش وازی لێبێنن. جا (آمِنَة) كوڕەكەی لێوەرگرتنەوەو ئەوانیش گەڕانەوە.

حەزرەتی (ابن عبّاس)ﷺ فەرموویەتی: لە كاتی ئەم گەڕاندنەوەی كۆتایی، تەمەنی پێغەمبەرﷺ پێنج ساڵ بوو. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦١٢) و(السيرةالحلبية) ب(١) ل(١٣٥و١٥٠و١٥١).

## ﴿ وەفاتكردنی دایك و باپیری پێغەمبەر ﷺ ﴾

ئینجا كە تەمەنی پێغەمبەرﷺ بووە (٦) شەش ساڵ، (آمِنة)ی دایكی لەگەڵ خۆیا بردیە (مَدِينة) بۆ سەردانی ماڵە خاڵەكانی، جا لە گەڕانەوەیدا لە ڕێگەدا لە نێوان (مَكّة)و (مَدِينة) دایكی نەخۆش كەوت و وەفاتی كردو لە (الأبواء) نێژرا، جا (أمُّ أيمَن) –كە لەو سەفەرەدا لەگەڵیاندا بوو– پێغەمبەریﷺ هێناوە تەسلیمی (عَبدُالمُطَّلِب)ی باپیری كردەوە، ئینجا كە تەمەنی پێغەمبەرﷺ بووە (٨) هەشت ساڵ، باپیریشی وەفاتی كرد، جا (أبُوطالِب)ی مامی هێنایەوە لای خۆی و بەخێوی كرد، هەروەك لە باسەكەی داهاتوودا ڕوونی دەكەینەوە، إن شاء الله تعالى. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦١٧و٦٢٠) و(السيرة الحلبية) ب(١) ل(١٥٤و١٦٤).

## ﴿ گوڵبیژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

### یەكەم: مەولود=یادی لە دایكبوونی پێغەمبەرﷺ:

لە حەدیسەكەی ڕابردوودا پێغەمبەرﷺ دەربارەق بەڕۆژووبونی ڕۆژی دووشەممە فەرمووی: ﴿دووشەممە ڕۆژێكی وەهایە من تێیدا لە دایك بووم و هەر لەو دووشەممەشدا كرامە پێغەمبەرو قورئانم بۆ هات﴾.

ئەم حەدیسە بەڵگەیە: كە سوننەتە شوكری خوا بكرێ بە عیبادەت و خێر و چاكە بە هۆی لە دایكبوونی پێغەمبەرﷺ.

ئیمام (جلال الدِّين السُّيُوطِي) فەرموویەتی: مەولود كردن ئەوەیە: خەڵك كۆ ببێتەوەو هەندێك قورئان بخوێندرێ و چەند بەسەرهاتێكی پێغەمبەرﷺ بۆ خەڵك باس بكرێ، ئینجا خواردنێكیان بدرێتێ و بیخۆن و بڕۆن...ئەم شێوەیە (بِدْعَة حَسَنَة)یەو ئەو كەسەی ئەیكا پاداشتی ئەدرێتەوە؟ چونكە ڕێزلێنانی پێغەمبەریﷺ تێدایە...

جا یەكەم كەس كە مەولود كردنی –بەم شێوەیە– پەیدا كرد، سوڵتان (مُظَفَّرُ الدِّين)ی گەورەی (أرْبِيل)=هەولێر بوو.

ئینجا هەر ئیمام (جلال الدين السيوطي) لە ئیمام (ابن حجر العسقلاني) دەگێڕێتەوە كە

فەرموویەتی: مەولود کردن (بِدْعَـة)یـەو لـە سـەردەمی(الـسلف الـصالح)دا نـەکراوە، بـەڵام –لەگەڵ ئەوەشدا– شتی باش‌و خراپی تێدایە، جا هەر کەسێك شتە باشەکانی بکاو خۆی لە خراپەکانی بیپارێزێ، ئەوە دەبێتە (بِدْعة حَسَنَة)، ئەگەر نا، باش نیە.

جا فەرمووی: من مەولود کردنم لە بنچینەی حەدیسی (البخـاری)و (مـسلم) وەدەرهێنـاوە: ﴿کە پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە بەڕۆژووبونی ڕۆژی (عاشُوراء) کردوە، چونکە لەو ڕۆژەدا خوایگـەورە حـەزرەتی(مُوسـی) پێغەمبـەروﷺ گەلەکـەی لـە ژێـر دەسـتی (فِرْعَوْن) ڕزگار کردن‌و (فِرْعَوْن)شی لە دەریادا خنکاندوە﴾...جا فەرموویەتی: ئایا کام نیعمەت‌و خۆشی گەورەترە لە نیعمەت‌و خۆشیی هاتنە دونیای پێغەمبەری ڕەحمـەتﷺ لەم ڕۆژەدا؟. (الحاوي للفتاوى) ب(١) ل(٢٢١و ٢٢٩) و(حاشيةالشرواني) ب(٧) ل(٤٢٢).

هەروەها ئیمام (ابن حجـر الهيتمـي) لـە ئیمـام (أبوشـامة)ی مامۆسـتای ئیمـامی(النَّـواوِي) دەگێڕێتەوە: (لە جوانترین (بِدْعَة)کانی ئێستامان ئەو کرادارەیە کە هەموو ساڵێك لـە ڕۆژی لەدایکبوونی پێغەمبـەرداﷺ دەکرێ: لـە خێـر کـردن‌و چاکەو خۆشـی‌و ڕازاندنەوە، ئەم ڕەفتارە–لەگەڵ ئەوەی چاکەی لەگەڵ هەژاراندا تێدایە–نیشانەیە: بۆ خۆشویستن‌و گەورەیی پێغەمبەرﷺ لە دڵی ئەو کەسەدا کە ئەو خێرانە دەکاو شوکریخوا دەکا لە سەر ئەو نیعمەتەیخوا کە پێغەمبەرێکی هێناوەتە دونیاو بە ڕەحمەت بۆ ئەم خەڵکەی ناردوە). (فتح المبين شرح الاربعين النواوية) ل(٩٥).

هەروەها خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَـةً لِلْعَـالَمِينَ﴾ الانبياء:١٠٧، ئـەی پێغەمبەرﷺ ئێمە تۆمان نەناردوە تەنها بە ڕەحمەت نەبێ بۆ هەموو خەڵك.

لە ئایەتێکیتردا خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ بِفَضْلِ اللهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا﴾ يونس: ٥٨، ئـەی پێغەمبـەرﷺ بڵـێ: بـەو ئیـسلام‌و قوڕئانـەی لـە لای خـوا هـاتوە، ئێـوە دڵخۆش ببن.

جا ئایا ڕەحمەت لەو پێغەمبەرەی ڕەحمەتﷺ گەورەتر هەیە ئێمە پێی دڵخـۆش ببین؟ چونکە هەر ئەو پێغەمبەرەﷺ ئیسلام‌و قوڕئانی بە ئێمـە ڕاگەیانـدوە، هـەر کەسـێك ئـەو ڕەحمەتە قبوڵ بکاو شوکریخوای لە سەر بکا ئەوە بەختەوەری دونیاو قیامەتە، ئەگەر نا: قوڕبەسەری دونیاو قیامەتە (تفسير ابن كثير) الأنبياء: (١٠٧).

هەروەها ئەو جـۆرە کـۆڕ و کۆبوونەوانـەی وەك (مَوْلُـود)ی پێغەمبـەرﷺ، سـودێکی زۆری هەیە بۆ شارەزاکردنی موسوڵمانان لە ژیـانی پێغەمبـەروﷺ لـە ئـایینی ئیـسلام، ئەمـەش سوننەتێکی گرنگی پێغەمبەرەﷺ! چونکە لە وەرزی بازاڕەکان‌و حەج کردندا، هۆزەکانی عەڕەب کۆ دەبونەوە، جا پێغەمبەرﷺ ئـەو کۆبوونەوەیـەی بـە هـەل دەزانـی‌و لەگـەڵیان دادەنیشت‌و باسـی ئایینیئیـسلامی بـۆ دەکـردن‌و خـۆی پێدەناسـاندن، تـا لـە ئەنجامـدا

هەندێك لە خەڵكی (مَدِينَة) موسوڵمان بونو (مَدِينَة) بووە پایتەختی ئیسلام، کەوابوو: ئێمەش دەبی کۆبوونەوەی خەڵك لە بیرەوەری لەدایکبوونی پێغەمبەرداﷺ بە هەل بزانین تاکو باسی پێغەمبەروﷺ ئیسلامیان بۆ بکەین.

جگە لەمەش: (أَبُولَهَب)ی مامی پێغەمبەرﷺ، بە کافری مردو سورەتێکی قورئان لە زەمی ئەویدا هاتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەرﷺ لە دایك بوو، کەنیزەیەکی خۆی –کە ناوی (ثُوَيْبَة) بوو– موژدەی لە دایکبوونی پێغەمبەریﷺ دایێ، جا (أَبُولَهَب)ش لە مزگێنی ئەو خەبەرە خۆشە، (ثُوَيْبَة)ی ئازاد کردو (ثُوَيْبَة)ش شیری دا پێغەمبەرﷺ، بۆیێ خوای گەورە پاداشتی ئەم چاکەیەی داوەتە (أَبُولَهَب)، بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: ﴿قالَ عُـرْوَةُ: وَثُوَيْبَةُ مَوْلاةُ أَبِىلَهَب، وَكانَ أَبُولَهَب أَعْتَقَها فَأَرْضَعَتِ النَّبِيَّﷺ، فَلمَّا ماتَ أَبُولَهَب أُرِيَهُ بَعْضُ أَهْلِهِ بِشَرِّ حِيبَةٍ، قالَ لَهُ: ماذا لَقِيتَ؟ قالَ أَبُولَهَب: لَمْ أَلْقَ بَعْدَكُمْ–خَيْراً–غَيْرَ أَنِّي سُقِيتُ فِي هذِهِ بِعَتاقَتِي ثُوَيْبَةَ﴾ رواه البخاری، **(ثُوَيْبَة) کەنیزەی(أَبُولَهَب) بوو، (أَبُولَهَب) ئازادی کرد چونکە موژدەی لەدایکبوونی پێغەمبەریﷺ دایێ، جا (ثُوَيْبَة)ش شیری دا پێغەمبەرﷺ، جا کە (أَبُولَهَب) مرد، (الْعَبّاس)ی برای لە خەونیدا دیتی حاڵی زۆر خراپ بوو و لێی پرسی: توشی چی بووی؟ (أَبُولَهَب) گوتی: لە دوای ئێوە نەگەیشتمە هیچ خۆشیەك، بەڵام لە ڕۆژانی دووشەممەدا سزام سوك ئەبێ و لە نەوپایی پەنجەی گەورەمدا هەندێك ئاوم دەدرێتێ لە پاداشتی ئازادکردنی (ثُوَيْبَة).**

(البداية والنهاية)ب(١) ل(٦١٢) و(فتح الباري) ب(٩) ل(١٨١).

(الحافظ: شمس الدين الدِّمشقي) لەبارەی دڵخۆشبوونی (أبیلَهَب): بە لەدایکبوونی پێغەمبەروﷺ سوکبوونی سزای، فەرموویەتی:

إذا كانَ هـذا كافـراً جاءَ ذَمُّـهُ ... وَتَبَّتْ يَداهُ فِي الْجَحِيمِ مُخَلَّدا
أَتَى أَنَّهُ فِي يَوْمِ الْإِثْنَيْنِ دائماً ... يُخَفَّفُ عَنْهُ لِلسُّرُورِ بِأَحْمَداﷺ
فَمَا الظَّنُّ بِالْعَبْدِ الَّذى كانَ عُمْرَهُ ... بِأَحْمَدَﷺ مَسْرُوراً وَماتَ مُوَحِّدا

کە (أَبُولَهَب) کافرێکی ئەوها بێ لە قورئاندا بە خرابە باسی کراوە: **(دەستەکانی بشکێن و بە یەکجاری لە دۆزەخدایە)**، لەگەڵ ئەوەشدا لە حەدیسی(صحیح)دا هاتووە: بەردەوام لە ڕۆژانی دووشەممەدا سزای لێ سوك ئەکرێ بە هۆی دڵخۆشبوونی بە لەدایکبوونی پێغەمبەرﷺ، جا ئەبێ گومان چۆن بێ بەو بەندەیەی بە درێژایی تەمەنی بە پێغەمبەرﷺ دڵخۆش بوبێ و بە باوەڕی یەکخواپەرستیش مردبێ؟. (الحاوی للفتاوی) ب(١) ل(٢٣٠).

**جگە لەمەش:** کافرەکان و دوژمنانیئیسلام بەو کۆڕو کۆبوونەوانەی یادی مەولودی پێغەمبەرەﷺ زۆر خەفەتبار دەبن و ڕقیان هەڵدەستێ و تورە دەبن، خوایگەورەش دەفەرموێ: ﴿وَلا يَطَأُونَ مَوْطِئاً يُغِيظُ الْكُفَّارَ وَلا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَيْلاً إِلاّ كُتِبَ لَهُمْ بِهِ عَمَلٌ

صَـــالِحٌ﴾ التوبـة: ١٢٠، **موسـولْمانان پـێ بنێنـه هـەر شـوێنێك كـه ڕقـی كافرەكـان هەڵبـستێنێ و خەفـەتباريان بكـاو هـەر زيانێـك لـه دوژمنـی ئـايين بـدەن، خێـری كردەوەيەكی چاكيان بۆ دەنوسرێ.**

*جا ئەوەی جێی داخ و سەرسوڕمانە: چينە موسوڵمانێك هەنـە لاف ئيـسلامەتی لێـدەدەن، بەلام وەك دوژمنانیئيسلام ڕقيان له(مَوْلود)= يادكردنـەوی لـەدايكبوونی پێغەمبـەرەوە ﷺ وەك دوژمنانیئيسلام پـێی دڵگير دەبن!.*

**دووەم: دوو جار (آمنَة) ديتی (نُور)ێكـی لێهاتـه دەرەوەو تـەلارەكانی (بُـصْرى)ی ڕۆنـاك كردنەوە، يەكەم: ﴿له شەوی له دايكبوونی پێغەمبـەداﷺ (آمِنَـة) ديتـی (نُـور)ێكـی لێهاتە دەرەوەو تەلارەكانی(بُصْرى)ی ڕۆناك كردنەوە﴾.**

دووەم: هەم له حەديسێكیتری (صحيح)دا هاتووە: **﴿(آمِنَة) لەو شـەوەی پێغەمبـەریﷺ وەزگ كەوتووە–بە هەمان شێوە–(نُور)ێكی ئەوهای ديتووە﴾.**

واتە: له كاتی وەزگكەوتنی پێغەمبەرداﷺ له خەوندا (نُور)ەكەی ديـت، بـەلام لـه شـەوی لەدايكبوونی پێغەمبەرداﷺ به ئاشكرايی به چاویخۆی ديتی (نُور)ەكەی لێهاتە دەرەوە. (البدايةوالنهاية) ب(١) ل(٦٠٤) و(الخصائص الكبرى) ب(١) ل(٤٦).

جا ئيمام (ابن كثير) فەرموويـەتی: تايبـەتكردنی وڵاتـی (شـام) بـە (نُـور)ی پێغەمبـەرﷺ ئاماژەيە: كە ئايينی ئيسلام لە (شام) جێگير دەبێو لـە كۆتـايی زەمانـدا دەبێتـە شـوێنی حاوانەوەی ئيسلامو موسـوڵمانان، هـەم حـەزرەتی(عيـسى) پێغەمبـەرﷺ لـە (دِمَـشْق)ی (شام) دێتە خوارەو، بۆيێ لە حەديسی (صحيح)دا هـاتووە: ﴿لا تَزالُ طائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ لا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ وَلا مَنْ خالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ وَهُمْ كَذالِكَ–وفيالْبُخاري–: وَهُمْ بِالشّامِ﴾ رواهالشيخان، **بەردەوام كۆمەڵێك لە ئوممەتی من سەركەتوونەو لـە سـەر ڕاستين، ئەوەی لە دژيان دەوەستێ و سەرشۆڕيان دەكا زيانيان لێنادا، تا بڕياری خوا دێ ئەوان هەر ئەوهان، ئەوان لە (شام)ن.** (تفسير ابن كثير) البقرة (١٢٩).

*بەندەی بچوكيش دەڵێ: دەشكونجێ تايبەتكردنەكە ئامـاژە بـێ بـۆ (الإسْـراء)=شـەوڕۆيی پێغەمبەرﷺ بۆ (اَلْمَسْجِدُالأَقْصى)–كە بەشێكە لە وڵاتی (شام)– هـەم لـەوێوەش چـووە (مِعْراج)و سەركەوت بۆ ئاسمانەكان، والله أعلم.*

**له شەوی (مَوْلُود)دا هەموو شتێكی ناو ماڵ ڕۆناكی دەداو ئەستێرەكانی ئاسمانيش نزيـك دەبونەوە.** له بارەی ئەو نيشانەگەورانە (أحمد شَوقِي) دەڵێ:

**وُلِـدَ الْهُدَى فَالْكائِنَاتُ ضِياءُ وَفَـمُ الـزَّمَانِ تَبَـسُّمٌ وَثَنَاءُ**

**اَلـرُّوحُ وَالْـمَـلأُ الْمَلائِكُ حَوْلَهُ لِلـدِّينِ وَالـدُّنْيا بِهِ بُشَـراءُ**

**ڕێنموونی–كه پێغەمبەرەﷺ–له دايك بوو، جا هـەموو بوونـەوەر ڕۆناكیيـەو دەمـی ئـەو**

کاتەش زەردەخەنەو مەدحی پێغەمبەرەﷺ، حەزرەتی(جُبْرائِیل)و کۆمەڵی (مَلائِکَة)ش لە دەورەی وی موژدەدەرن بۆ ئەم دینەو ئەم دونیایە. (سیرة الصلابي) ب(١) ل(٦٤).
هەروەها لە شەوی (مَوْلُود)=لەدایکبوونی پێغەمبەرداﷺ ئەستێرەکانی ئاسمان لە زەمین نزیك دەبونەوە، هەم بتو سەنەمەکان سەرنخون بونو تاقی(کِسْری) لە ت بوو و ئاگری ئاگرپەرستەکانی فارس کوژاوەو دەریاچەی (ساوَة) ڕۆچوو و ئاوەکەی وشك بوو و دەنگی نەبینراوان دەهاتو موژدەیان دەدا بە لەدایکبوونی پێغەمبەرﷺ، جگە لەوانەش چەند ڕوداوێکیتری سەیر ڕوی‌دا. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦٠٦و٦٠٨) و(السيرة الحلبية) ب(١) ل(١٠٣و١٠٥).
**سێیەم: (أُمُّ أَيْمَن) خزمەتی پێغەمبەریﷺ دەکرد:** (أُمُّ أَيْمَن) ناوی (بَرَكَة) بوو، کەنیزەی باوکی پێغەمبەرﷺ بوو، بە میرات بۆ پێغەمبەرﷺ مابۆوە لەگەڵ پێنج سەر وشترو پارچە مەڕێك، (أُمُّ أَيْمَن) خۆیو (أَيْمَن)ی کوڕی رضي‌الله عنهما موسوڵمان بون، جا پێغەمبەرﷺ ئازادی کردو لە (زَيْد)ی کوڕی (حارِثَة)یرضي‌الله‌عنه مارە کرد–کە خزمەتکارێکیخۆی بوو–خوایگەورە لە (زَيْد)ش (أُسامَة)ی پێ بەخشی، (زَيْد)و (أُسامَة)ی کوڕی رضي‌الله عنهما–هەردووکیان–خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ بوون. (السيرةالحلبية) ب(١) ل(٧٧).
**چوارەم: (الْعَقِيقَة)=هۆزەبانەی لەدایکبوونی منداڵ سوننەتە، لە ڕۆژی حەفتەمی لەدایکبوونی پێغەمبەرداﷺ باپیری هۆزەبانەی بۆ کرد: بەرانێکی سەر بڕی.**
پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿كُلُّ غُلامٍ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سابِعِهِ وَيُحْلَقُ وَيُسَمَّى﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، **گشت منداڵێك بارمتەی هۆزەبانەکەیەتی: کە لە ڕۆژی حەفتەمی لە دایکبوونی‌دا–بزنێك، یان مەڕێك– بۆی سەر دەبڕیو هەم لە ڕۆژی حەفتەمی لە دایکبوونی‌دا سەری دەتاشرێو ناوی ل‌یدەنرێ.** واتە: ئەگەر هۆزەبانەی بۆ نەکرێ شەفاعەت بۆ دایكو باوکی ناکا. جا تکایە: باسی (هۆزبانەی منداڵ) لە بەرگی پێنجەمی (ڕووناکی (رب العالمين))دا بخوێنەوە سودی لێ وەردەگری.
**پێنجەم: باپیری پێغەمبەرﷺ ناوی لێنا: (مُحَمَّد)ﷺ، تاکو لە ئاسمان و زەمین سوپاسی بکرێ.** شێخ (مُحَمَّد)ی خاڵ فەرموویەتی:

**قوربانی ناوت، ناوت چەند خۆشە * ئارەقەت گوڵاو، بۆنت وەنەوشە**

**ناوت بووەتە بەستەی فریشتە * کلیلی دەرگای باغی بەهەشتە**

لەبارەی ناو لێنان، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّكُمْ تُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيامَةِ بِأَسْمائِكُمْ وَأَسْماءِ آبائِكُمْ، فَأَحْسِنُوا أَسْمائَكُمْ﴾ رواه أبوداود بإسناد جيد، **لە ڕۆژی قیامەت ئێوە بە ناوی خۆتانو ناوی باوکانتان بانگ دەکرێن، کەوابوو: ناوی جوان لە خۆتان بنێن.**
جا بۆ ناوە جوانەکانیش پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿تَسَمَّوْا بِأَسْماءِ الْأَنْبِياءِ، وَأَحَبُّ

﴿الأَسْمَاءِ إِلَى اللهِ: عَبْدُاللهِ وَعَبْدُالرَّحْمَنِ﴾ رواه أبوداود بسند صحيح، **ناوی پێغەمبەرەکان لە منداڵەکانتان بنێن، وە خۆشەویستترینی ناوەکان لە لای خوایگەورە: (عَبْدُالله)و (عَبْدُالرَّحْمَن)ن.**

**جا لەبارەی ناوە ڕێزدارەکانی خۆیشی، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿سَمُّوا بِاسْمِي وَلا تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي﴾ رواه الشيخان، **ناوی من لە منداڵەکانتان بنێن، بەڵام (كُنْيَة)ی من بۆ خۆتان دامەنێن. واتە: بە خۆتان مەڵێن: (أبُوالْقاسِم).**

**شەشەم: لە بەرەکەتی پێغەمبەرﷺ، شیری مەمکەکانی (حَلِيمَة) زۆر بوو.**

**(عاجز) فەرموویەتی:**

**مزگێنی بۆ (حَلِيمَة) بێ * شیرخۆری ئەو یەتیمە بێ**

**هەرزانی لەو ئیقلیمە بێ * هەم شیری زۆر بێ جاری من**

**ئیمام (ابن حَجَرالْعَسْقَلاني) فەرموویەتی: یەکێك لە بەختەوەریی (حَلِيمَة) ئەوە بوو: خۆیو (الحارِث)ی مێردیو (عبدالله)ی کوڕیو (شَيْماء)و (أنِيسَة)ی کیژی، هەر هەموویان بونە موسوڵمانرضي الله عنهم اجمعين، واتە: ئەم ناوانە دایکی شیریو باوکی شیریو برای شیریو خوشکەکانی شیریی پێغەمبەرنﷺ.**

**هەم لە (الإصابَة)دا فەرموویەتی: جارێك پێغەمبەرﷺ لە سەر جلێك دانیشبوو ، جا باوکی شیریی هاتە لای، پێغەمبەرﷺ بەشێکی جلەکەی بۆ دانا و لە سەری دانیشت، ئینجا دایکی شیریی هاتە لای، جا پێغەمبەرﷺ پارچە جلەکەیتری بۆ دانا و لە سەری دانیشت، ئینجا برا شیریەکەشی هات، پێغەمبەرﷺ لە بەر دەستی دانیشت.**

**جا حەدیسەکەی هاتنی دایکە شیریو باوکە شیریی پێغەمبەرﷺ ئیمام (أبوداود، بسند صالح) گێڕاویەتیەوە، جگە لەم بەرەکەتەش لە غەزای (هَوازِن) چەندەها خزمو کەسی (حَلِيمَة) لە دیلی ئازاد کران، هەروەك لە غەزای (حُنَيْن)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.**

**جا بزانە: لەو سەردەمدا بۆیێ شیردەریان لە دەرەوەی (مَكَّة) بە کرێ دەگرتن، تاکو منداڵەکە لە دەرەوەی شاردا زمانی ڕەوان ببێو نەجیبزادەو نەترس بێو دەرون پاكو لەشساغ بێو لە ماندووبوونو بارگرانایی دونیا لێڕابێ.** (السيرةالحلبية) ب(١) ل(١٢٩-١٣١).

**حەفتەم: سێ جار (مَلائِكَة) سینگی پێغەمبەریانﷺ لەت کردوە. (عاجز) فەرموویەتی:**

**چەند جار مەلائیکەی خودا * شەقیان کرد سینەی (أَلْهُدَى)**

**(حَظّ)ی شەیتانیان کرد جودا * کردیانە گوڵی گوڵزاری من**

**جاری یەکەم: لە کاتی منداڵیدا لە لای (حَلِيمَةالسَعْدِيَة):** ﴿عَن أَنَسٍرضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ أَتاهُ جِبْرِيلُعليه السلام وَهُوَ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمانِ فَأَخَذَهُ فَصَرَعَهُ فَشَقَّ عَنْ قَلْبِهِ فَاسْتَخْرَجَ مِنْهُ عَلَقَةً سَوْداءَ وَقالَ: هذا حَظُّ الشَّيْطانِ، ثُمَّ غَسَلَهُ فِي طَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ بِماءِ زَمْزَمَ ثُمَّ لَأَمَهُ﴾ رواه

مسلم، وزاد أحمد بسند حسن: ﴿وَخَتَمَ عَلَى قَلْبِي بِخَاتَمِ النُّبُوَّةِ﴾ لەو حاڵەتەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ منداڵان یاریی دەکرد، حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه السلام هاتە لای و گرتی و لە سەر پشت درێژی کردو سینگی لەت کردو دڵی لێدەرهێناو لەتی کردو پارچە خوێنێکی ڕەشی لێدەرهێناو فڕێی دا و فەرمووی: ئەمە بەشی شەیتانە. ئینجا دڵەکەی لە ناو تەشتێکی زێڕدا بە ئاوی (زَمْزَم) شوشت، ئینجا دڵەکەی لە شوێنی خۆی داناوەو سینگیشی پێك وەناوەو مۆری پێغەمبەرایەتیشی لە سەر دڵی دا.

واتە: حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه السلام بەخۆی ئەم کارانەی ئەنجام دا، بەڵام (مَلائِكَة)یتریشی لەگەڵدا بون، هەروەك لە چەند (روايَة)ێکی (صحيح)دا هاتووە. (السيرةالحلبية) ب(١) ل(١٤٧).

جا بزانە: مۆری پێغەمبەرایەتی لە نێوان شانەکانی پێغەمبەردا بووﷺ بە لای چەپەیەوە ﴿عن السَّائِب بن يزيد‌رضي الله عنه...ثُمَّ قُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِﷺ فَنَظَرْتُ إِلى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْـــهِ﴾ رواه الشيخان، وفي صحيح مسلم: ﴿إِلَى جِهَةِ كَتِفِــهِ الْيُـــسْرَى﴾ ئینجا لە پشتیەوە هەڵسام تەماشای مۆری پێغەمبەراتیم کرد: لە نێوان شانەکانی پێغەمبەرﷺ بە لای شانی چەپەیەوە بوو.

**جاری دووەم:** ﴿لە کاتی هاتنی قورئانو بوونی بە پێغەمبەرﷺ﴾—(رواه أبوداود الطيالسي وأبو نعيم)— تاکو بۆ وەرگرتنی (وَحْي) ئامادە ببێ.

**جاری سێیەم:** ﴿لە شەوی (اَلإِسْراء وَالْمِعْراج)﴾—رواه الشيخان—تاکو بۆ بە خزمەتگەیشتنی خوایگەورە ئامادە ببێ، هەروەك لە باسی (مِعْراج)دا (البخاری) گێڕاویەتیەوە. (فتح الباری) ب(٦) ل(٦٨٦)، ب(١٣) ل(٥٩٧).

جا ئەم لەتکردنەی سینەی پێغەمبەرﷺ لە حاڵەتی منداڵیدا پێشەکیەکی پێغەمبەرایەتی بوو و نیشانەیە: کە خوایگەورە ئەوی هەڵبژاردوە بۆ کارێکی گەورە.

کەوابوو: مەبەست لەو ڕووداوە ئەوەیە: هەر لە ئێستاوە کارە گرنگەکەی پێغەمبەرﷺ ئاشکرا بکرێو ئامادە بکرێ بۆ پاراستن لە گوناهو بۆ وەرگرتنی (وَحْي)، واتە: مەبەست ئەوە نیە پارچەی خرابەکاری لە پێغەمبەرﷺ دەربهێندرێ، چونکە خراپە لە دڵی پێغەمبەرداﷺ هەر نەبوەو هەر ناشبێ، کەوابوو: با هەر لە ئێستاوە شەیتان بێئومێد ببێ: کە ناتوانێ کار لە دڵو زوبانو ڕەوشتی پێغەمبەر بکاﷺ، بۆیێ پێغەمبەرﷺ لەبارەی شەیتانەکەی خۆی فەرموویەتی: ﴿...إِلاّ أَنَّ اللهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمَ، فَلا يَأْمُرُنِي إِلاّ بِخَيْرٍ﴾ رواه مسلم، **بەڵام خوایگەورە یارمەتی دام لە سەر شەیتانەکەم تا موسوڵمان بوو، بۆیێ جگە لە چاکە هیچ فەرمانێکم پێناکا.**

ئیمامی(النواوي) لە قازی (عَياض) دەگێڕێتەوە: ئوممەتی ئیسلام یەکدەنگە: پێغەمبەرﷺ لە شەیتان پارێزراوە لەبارەی لاشەو هەستو بۆچوونو زوبانی. (شرح صحيح مسلم بهامش

القسطلاني) ب(١) ل(٢٧٥).

**هەشتەم: (آمِنَة) بە (حَلِيمَة)ی گوت: ئەم کوڕەی من کارێکی گەورەی بۆ دەبێ...شەیتان ناتوانێ هیچی لێبکا**. ئەوە وا دەگەیەنێ: (آمِنَة) قەناعەتی هەبوو کە کوڕەکەی دەبێتە پێغەمبەرﷺ! ؟ چونکە ئیمام (ابن إسحاق) گێڕاویەتیەوە: (آمِنَة) فەرموویەتی: کە پێغەمبەرم وەزگ کەوت، لە خەونمدا پێم گوترا: **﴿گەورەی ئەم ئوممەتە وەزگت کەوتووە، جا کاتێ بوو و لێت جیا بۆوە، بڵێ: بە خوای تاک و تەنیا دەتپارێزم لە خراپەی گشت حەسودێك. نیشانەشی ئەوەیە: (نُور)ێکی لەگەڵ دێتە دەرەوە تەلارەکانی (بُصْرى) لە (شام) پڕ ڕۆناکی دەکا، ئینجا ناوی لێبنێ (مُحَمَّد)، چونکە لە (تَوْراة)و لە (إنْجِيل)دا ناوی (أحْمَد)ە، دانیشتووانی ئاسمان و زەمین مەدحی دەکەن، لە (قورئان)دا ناوی (مُحَمَّد)ە﴾**. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦٠٤) و(السيرة الحلبية) ل(١)ل (٦٩).

هەروەها (آمِنَة) لە نەخۆشی مردنیدا تەماشای پێغەمبەریﷺ کردو چەند پارچە شیعرێکی پێدا گوتن، بەشێکی ئەم شیعرانە ئەمەیە:

**إنْ صَحَّ ما أَبْصَرْتُ فِي الْمَنامِ فَأَنْتَ مَبْعُوثٌ إِلَى الْأَنَامِ**

**مِنْ عِنْدِ ذِيالْجَلالِ وَالْإِكْرامِ** أخرجه أبونعيم

واتە: ئەگەر ئەو خەونەی من بە ڕاستی بێتە جێ، ئەوە تۆ بە پێغەمبەر دەنێردرێی بۆ هەمو خەڵك لە لایەن خوای خاوەن گەورەیی و ڕێزداری. (الخصائص الكبرى) ب(١) ل(٧٩).

**نۆیەم: پێغەمبەرﷺ لە زگی دایکیدا بوو باوکی مرد، لە شەشساڵیدا دایکی مرد، لە هەشت ساڵیدا باپیری مرد**. کارلەجێیی خوایگەورە حەزی کرد: پێغەمبەرﷺ بە یەتیمی پێبگا، دور لە پەروەردەی دایك و باوك و باپیر، نەوەك دڵی بۆ گەورەیی و کۆکردنەوەی ماڵی دونیا بچێ، چونکە بنەماڵەکەی پێغەمبەرﷺ هەر هەموویان گەورەو ڕێزداری سەردەمی خۆیان بون، جا ئەگەر ماڵ و گەورەیی دونیای لە باوك و باپیران وەرگرتبا، ئەو دونیادارییە تێکەڵی پیرۆزیی پێغەمبەرایەتی دەبوو و خەڵك لێیدەشێورا.

هەم بۆ ئەوەش خوایگەورە پێغەمبەریخۆی یەتیم کرد: تاکو ورەی بە هێز بێ و هەر بەخۆی بڕیار بداو جگە لە خوا پشت بە کەس نەبەستێ و دایك و باوکی بە هیچ جۆرێك تێکەڵی پێغەمبەرایەتیی نەبن و کار لە بانگەوازیئیسلام نەکەن، ڕەوشتە جوانەکەشی بەڵگەی ئەوە بێ: کە خوایگەورە بەخۆی چاودێریی کردوەو بۆ پێغەمبەرایەتی ئامادەی کردوە، هەم نەوەك دوژمنانی ئەم ئیسلامە کەلێنێك ببینن و لەو کەلێنەدا تیرو تانە لە پێغەمبەرﷺ بدەن و بڵێن: بە هۆی لێهاتوویی دایك و باوکی، (مُحَمَّد) ئەوها لێهاتووە، چونکە ئەوان باوەڕ بەوە ناکەن: کە خوایگەورە بەخۆی چاودێری پێغەمبەریﷺ کردوەو

هەر خوایگەورەش بۆ پێغەمبەرایەتی ئامادەی کردوەو فێری زانستی ڕابردوو و داهـاتووی کردوە، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر نەخوێندەوار بوو و لە کۆمەڵگەیـەکی نەخوێندەواریـشدا بووەﷺ. بە دەستکاریەوە لە (فقه السيرة، للبوطي) ل(٥٢) و (سيرة الصلاّبي) ب(١) ل(٧٢).

ئیمامی(اَلْبُوصیری)و وەرگێڕەکەشی فەرموویانە:

كَفاكَ بِالْعِلْمِ فِي الْأُمِّيِّ مُعْجِزَةً * فِي الْجَاهِلِيِّةِ وَالتَّأْدِيبَ فِي الْيُتُمِ

لەمە گەورەتر (مُعْجِزَة) کامە * یەتیم بە ئەدەب (أُمِّي) عەللامە

*** *** ***

## ﴿ بەخێوکردنی پێغەمبەرﷺ لە لایەن مامی خۆی...تا نوێکردنەوەی (كَعْبَة) ﴾

گوتمان: کە (آمِنَة) وەفاتی کرد، پێغەمبـەرﷺ لـە لای (عَبْدُالْمُطَّلِب)ی بـاپیری بـەخێو دەکرا جا (عَبْدُالْمُطَّلِب) زۆر ڕێزی پێغەمبەری دەگرتو لە کوڕەکانیخۆی زیاتر بایەخی پێدەدا، بە جۆرێکی وەها: کە یاتاغ بۆ (عَبْدُالْمُطَّلِب) ڕادێخسترا، کوڕەکانی نەدەوێران و شەرمیان دەکرد لە سـەر یاتاغەکـەی باوکیـان دانیـشن، بـەڵام پێغەمبـەرﷺ لـە سـەری دادەنیشتو (عَبْدُالْمُطَّلِب)ش دەیگوت لێیگەڕێن با دانیشێ، ئەم کوڕەم کارێکی گەورەی بۆ دەبێ. جا لەگەڵ خۆی دایدەنیشاندو دەستی بە پشتیدا دەهێنا.

جا کە تەمەنی پێغەمبـەرﷺ بـووە هەشـت سـاڵ، (عَبْدُالْمُطَّلِب)ی بـاپیری مـرد، بـەڵام پێش مردنی وەسێتی کرد: لە دوای مردنی وی، (أبُوطالِب) بـەخێوی بکـا، (أبُوطالِب)– ناوی (عبدمناف) بوو– لە دایكو باوکەوە برای (عبدالله)ی بـاوکی پێغەمبـەرﷺ بـوو. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦٢٠).

## ﴿ بەسەفەرچوونی پێغەمبەرﷺ بۆ وڵاتی (شام)و چاوپێکەوتنی (بَحِيرا)ی ڕاهیب ﴾

کە تەمەنی پێغەمبەرﷺ بووە (١٢) دوانزە ساڵ، لەگەڵ (أبُوطالِب)ی مامیو کاروانێکی (قُرَيْش) بۆ بازرگانی چونە وڵاتی (شام)، جا کاروانەکە لە (بُصْرى) دابەزی، کە (بَحِيرا)ی ڕاهیبی تێدا نیشتەجێ بوو، (بَحِيرا) ناوی (جَرْجِيس) بوو، قەشەیەکی دیانی خواپەرست بوو و لە زانستی دیانایەتی زۆر شارەزا بوو، (بَحِيرا) جارەکانیتر نەدەهاتە لای کاروانەکە، بەڵام ئەم جارە هاتو لە ناویاندا دەگەڕاو یەکسەر دەستی پێغەمبەریﷺ گرتو گوتی: (ئەمـە گـەورەی هـەموو عالەمـە، ئەمـە پێغەمبەریخوایـە، ئەمـە خـوا بـە ڕەحمـەت دەینێرێ بۆ هەموو عالەم).

کاروانـچیەکان گوتیـان: بـە چـی دەزانـی ئەوهایـە؟ (بَحِیرا) گـوتی: کـە ئێـوە لـە سـەرەوە دەرکەوتن، گشت درەختێكو بەردێك کەوتنە سوجدە بردن، ئەوانەش تەنها بۆ پێغەمبەر سوجدە دەبەن، من بەوە دەیناسم: مۆری پێغەمبەرایەتی لە سەر شەپکەی شانیەتی وەك سێو وایە. ئینجا (بَحِیرا) گـەڕاوە دێرەکەیخۆیو خـواردنێکی بـۆ ئامـادە کـردنو گـوتی:

کەستان دوا نەکەوێ، جا کە بۆ میوانداریەکە هاتن، پێغەمبەرﷺ لە لای بارگەو بارخانە بەجێما، بەلاّم (بَحِیرا) گوتی: بنێرن با ئەویش بێتە سەر خواردنەکە. جا کە پێغەمبەرﷺ هات، هەور لە لای سەرەوە سێبەری لێدەکردو ئەو درەختەی کاروانچیەکان لە بنی دانیشتبون، ئەویش یەکسەر سێبەرەکەی بە لای پێغەمبەرداﷺ سوڕاوە.

لە (رِوایَة)یێکی‌تردا دەفەرموێ: کە (بَحِیرا) تەماشای پێغەمبەریﷺ کردو دیتی مۆری پێغەمبەرایەتی لە نێو شانەکانیەتی، بە (أبُوطالِب)ی گوت: ئەم کوڕە چی تۆیە؟ (أبُوطالِب) گوتی: کوڕی خۆمە. (بَحِیرا) گوتی: نابێ باوکی ئەم کوڕە زیندوو بێ؟ (أبُوطالِب) گوتی: کەوابوو: ئەمە کوڕی برامە، هەر لە زگی دایکیدا بوو باوکی مرد. (بَحِیرا) گوتی ڕاست دەکەی، تکات لێدەکەم ئەم کوڕە بگەڕێنەوەو ئاگاداری بە؟ چونکە ئەگەر جولەکە ببینن‌و وەك من بیناسن دەیکوژن. جا (أبُوطالِب) پێغەمبەریﷺ لەگەڵ هەندێك لە خزمەتکارەکانی‌خۆیدا گەڕاندەوە بۆ (مَكَّة). (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦٢٢و٦٢٣) و(الخصائص الكبرى) ب(١) ل(٨٣و٨٤) و(السيرة الحلبية) ب(١) ل(١٧٢و١٧٤).

## ﴿ بەشداری‌کردنی پێغەمبەرﷺ لە جەنگی (اَلْفِجار)و پەیمانی (اَلْفُضُول)﴾

**جەنگی (اَلْفِجار):** لە نێوان عەشیرەتی (هَوازِن)و (كِنانَة) ڕوویدا، هۆی جەنگەکەش ئەوە بوو: (البرّاض) کە پیاوێکی (كِنانَة)یی بوو، پیاوێکی لە (هَوازِن) کوشت–کە ناوی (عُروَة الرّحّال) بوو– جا لەم جەنگەدا (قُرَیْش) یارمەتی (كِنانَة)یان دا، چونکە (قُرَیْش) لقێکی (كِنانَة)ن، جا لەو جەنگەدا تەمەنی پێغەمبەرﷺ (١٤) چواردە ساڵ بوو و لەگەڵ مامەکانی بەشداری جەنگەکەی کرد، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿كُنْتُ أُنَبِّلُ عَلَى أَعْمامِي﴾ من لەو جەنگەدا تیرەکانی‌دوژمنم بۆ مامەکانم دەهێناوە.

**(حِلْفُ الْفُضُول)=پەیمانی (الْفُضُول)** بە چوار مانگ لە دوای جەنگی (الفِجار) بەسترا، لەم پەیمانەدا (بَنُو هاشِم)و (بَنُو زُهْرَة)و (بَنُو تَيم بن مرّة) بەشدار بونو لە مانگی (ذِیالْقَعْدَة) لە مالی (عبدالله بن جُدْعان) سوێندیان بۆ یەکتری خوارد و پەیمانیان دایە خوای‌گەورە: (هەموویان یەك دەست بن لە دژی ستەمکار، یارمەتی ستەملێکراو بدەن، مافی هەموو خاوەن مافێك بدەنەوە).

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ شَهِدْتُ فِي دارِ عَبْدِاللهِ بن جُدْعانَ حِلْفاً ما أُحِبُّ أَنَّ لِي بِهِ حُمْرَ النَّعَمِ، لَوْ دُعِيتُ بِهِ فِي الْإِسْلامِ لَأَجَبْتُ﴾ رواه الحميدى وأحمد والبيهقى بألفاظ متقاربة، لە مالّی (عَبْدُالله بن جُدْعان) ئامادەی پەیمانێك بوم، پێم خۆش نیە لەجیاتی ئەو پەیمانە وشترەکانی سوّرم بدرێنێ، ئەگەر لە ئیسلامدا بەو پەیمانە بانگم بکرێتێ، من وەلاّم دەدەمەوە. واتە ئەگەر کەسێك هاوار بکاو بلّێ: هۆ پەیمانبەستەکانی (اَلْفُضُول) فریام کەون.

من فریای دەكەوم. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦٢٨) و(السيرة الحلبية) ب(١) ل(١٨٨-١٩١).

**﴿ شوانەتی پێغەمبەرووﷺ پاراستنی لە لایەن خوایگەورەوە ﴾**

**پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿ما بَعَثَ اللّٰهُ نَبِيّاً إلاّ رَعَى الْغَنَمَ. فَقَالَ أَصْحَابُهُ: وَأَنْتَ؟ فَقَالَﷺ: نَعَمْ، كُنْتُ أَرْعاها عَلَى قَرارِيطَ لِأَهْلِ مَكَّةَ﴾ رواه البخاری، **خوایگەورە هەر پێغەمبەرێكی ناردبێ، مەڕ و بزنی لەوەڕاندون، گوتیان: ئەتۆش لەوەڕاندوتن؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، منیش بۆ خەڵكی(مَكَّة) بە كرێ مەڕم دەلەوەڕاندن هەر مەڕێك بە قیراتێك. قیرات:** بەشێكیكەمی دیرهەمو دینارە. (فتح الباري) ب(٧) ل(٥٥٧).

**هەروەها ئیمام (علی) گێڕاویەتیەوە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿هیچ كاتێك بیرم بۆ كارە خراپەكانی پێش ئیسلام نەچووە، تەنها دوو جار نەبێ، لەم دوو جارەشدا خوایگەورە منی پاراست:**

**١-شەوێك لەگەڵ گەنجێك لە سەرەوەی (مَكَّة) مەڕمان دەلەوەڕاند، بە گەنجەكەم گوت: ئەم شەو چاوت لە مەڕەكانی من بێ، تاكو بچمەوە (مَكَّة)، لەوێ وەك گەنجەكان شەوەكەم ببەمە سەر. گەنجەكەش گوتی: باشە. جا كە هاتمەوە (مَكَّة) گوێم لێبوو دەنگی لێدانی دەهۆڵو زوڕنا دەهات، گوتم: ئەمە چییە؟ گوتیان: فلان پیاو فلانە ژنی مارە كردوە. ئیتر دانیشتم تاكو گوێ لەو دەنگە ڕابگرم، بەلاّم خەو بە سەر چاومدا هات تا بە گەرمایی ڕۆژ بە خەبەر هاتم، ئیتر گەڕامەوە لای هاوڕێكەمو هەواڵەكەم بۆ گێڕاوە.**

**٢-هەروەها شەوێكیتریش بە هەمان شێوە ئیزنم لە هاوڕێكەم وەرگرتو بە هەمان شێوە خەوم بە سەردا هاتو بە گەرمایی ڕۆژ لە خەو هەڵسام...جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی:** ﴿فَوَاللّٰه ما هَمَمْتُ وَلا عُدْتُ بَعْدَهُما لِشَيْءٍ مِنْ ذلِكَ-أَيْ لِسُوءٍ- حَتَّى أَكْرَمَنِي اللّٰهُ بِنُبُوَّتِهِ﴾ أخرجه ابن إسحاق والبزار والبيهقي وغيرهم، قال (ابن حَجَر): إسناده حسن متصل ورجاله ثقات، **سوێندم بە خوا: لە دوای ئەم دوو جارە چیتر نەمویستو نەگەڕاومەوە بۆ هیچێك لەو كارە خراپانە، تا خوا بە پێغەمبەرایەتیەكەی ڕێزی لێنام﴾.** بروانە (الخصائص الكبرى) ب(١) ل(٨٨و٨٩) و(مجمع الزوائد ومنبع الفوائد) ب(٨) ل(٢٩٤) و(سيرة الصلابي) ب(١) ل(٧٧).

**﴿بازرگانی پێغەمبەرﷺ بە ماڵی (خَدِيجَة) و مارەكردنی (خَدِيجَة) لە پێغەمبەرﷺ﴾**

**(خَدِيجَة)**رضی‌الله عنها **كیژی (خُوَيْلِد) كوڕی (أَسَد) كوڕی (عَبْدُالْعُزّى) كوڕی (قُصَيّ)-كە باپیری چوارەمی پێغەمبەرﷺ-واتە: پێغەمبەرووﷺ (خَدِيجَة) لە (قُصَيّ) دەگەنەوە یەكتری.**

**(خَدِيجَة)** رضی‌الله عنها **بێوەژنێكی ناودارو بە شەرەفو دەوڵەمەندی (قُرَيْش) بوو، پیاوانی بە كرێ دەگرتن بە (قِراض)=ماملەتی قازانجی هاوبەش، بازرگانی بۆ بكەن، جا كە زانی: پێغەمبەرﷺ پیاوێكی دەستپاكو ڕاستگۆو ئەمینەو خاوەنی ڕەوشتی جوانە، داوای**

لێکرد ماڵەکەی بە بازرگانی بۆ بباتە وڵاتی (شام)، زیاتر لە بازرگانەکانیتریش کرێی بداتێ، جا پێغەمبەرﷺ قبوڵی کردو لەگەڵ خزمەتکارەکەی (خَدیجَة)–کە ناوی (مَیْسَرَة) بوو– بەرەو (شام) ڕۆیشتن، لەوێ کەلوپەلی بازرگانیەکەیان فرۆشتو قازانجێکی زۆریان کردو ئەوەی پێویست بوو کڕییانو بەرەو (مَكّة) گەڕانەوە.

لەم سەفەرەدا (مَیْسَرَة) بە چاویخۆی دوو (مَلائِكَة)ی دەدیتن لە گەرمایی نیوەڕۆ سێبەریان لە پێغەمبەرﷺ دەکرد، جا کە گەڕانەوەو (خَدیجَة) دیتی بە چەند قات قازانجیان کردوەو (مَیْسَرَة)ش باسی سێبەری (مَلائِكَة)ی بۆ کرد، دڵی بۆ چوو پێغەمبەرﷺ ببێتە هاوسەری، بۆیی لە ڕێگای (نُفیسَة)ی کیژی (مُنیَة) داوای لە پێغەمبەرﷺ کرد داخوازی بکاو مارەی بکا.

جا پێغەمبەرﷺ لەگەڵ مامەکانی خۆی: (أبُوطالِب)و (حَمزَة) چونە لای مامی(خَدیجَة) –کە ناوی (عَمْرو بن أسَد) بوو– خوازبێنی (خَدیجَة)یان کرد بۆ پێغەمبەرﷺ، جا مامی(خَدیجَة) لە وەڵامدا گوتی: (هذا الْفَحْلُ لاَ يُقْدَعُ أَنْفُهُ) ئەم نێرییە لە لوتی نادرێ. واتە: چونکە ڕێزدارە.

ئینجا (خَدیجَة)ی لە پێغەمبەرﷺ مارە کردو بیست وشتری کردنە مارەیی، لەو کات تەمەنی پێغەمبەرﷺ (٢٥) بیستو پێنج ساڵ بوو، تەمەنی (خَدیجَة)ش (٤٠) چل ساڵ بوو، (خَدیجَة) رضي الله عنها یەکەم ژنی پێغەمبەرﷺ بوو.

منداڵەکانی پێغەمبەرﷺ–جگە لە (إبراهیم)–گشتیان لە حەزرەتی(خَدیجَة)ن: (قاسم)و (عبدالله)–کە پێی دەگوترا: (الطّاهِر) و(الطَّیِّب)– (زَینَب)، (رُقَیَّة)، (أمُّ کُلثوم)، (فاطِمَة)ﷺ، جا هەردوو کوڕەکانی پێش پێغەمبەرایەتی بە منداڵی لە (مَكّة)دا مردن، بەڵام کیژەکانی گەورە بونو موسوڵمان بون.

هەروەها (إبراهیم) لە (مَدینَة) لە دایك بوو، هەر لە (مَدینَة)ش لە تەمەنی ساڵو نیوی‌دا وەفاتی کرد، دایکی (إبراهیم) ناوی (ماریَةالْقِبطیَّة) بوو، جا پێغەمبەرﷺ (٢٥) بیستو پێنج ساڵ لەگەڵ حەزرەتی(خَدیجَة)دا مایەوەو هیچ ژنیتری نەهێنا، تا حەزرەتی(خَدیجَة) لە تەمەنی (٦٥) شەستو پێنج ساڵی‌دا وەفاتی کرد. (البدایة والنهایة ب(١) ل(٦٣٠) و(فتح الباري) ب(٧) ل(١٦٨) و(نور الابصار) ل(٤٣).

## ❁ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ❁

**یەکەم: قەشەو ماڵەکانی جولەکەو دیانەکان دەزانن (مُحَمَّد)ﷺ پێغەمبەری‌خوایە.**

(بَحیرا) دەستی پێغەمبەریﷺ گرتو گوتی: (ئەمە پێغەمبەری خوایە). خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ وَإِنَّ فَرِيقاً مِنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾البقرة: ١٤٦، زانایانی جولەکەو دیانەکان (مُحَمَّد)ی دەناسن

کە پێغەمبەریخوایەﷺ، هەروەك کوڕەکانیخۆیان دەناسن، بەڕاستی کۆمەڵێك لەوان ڕاستی لە خەڵکی دەشارنەوەو دەشزانن ڕاستە.

حەزرەتی(عبدالله بن سَلام)ﷺ زانایەکی جولەکە بوو و موسوڵمان بوبوو، جا لەبارەی ئەم ئەم ئایەتە ئیمام (عُمر)ﷺ پرسیاری لێکرد: ئایا تۆ چۆن کوڕیخۆت دەناسی، ئەوهاش پێغەمبەرﷺ دەناسی؟ حەزرەتی(عبدالله)ﷺ لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ، زیاتریش دەیناسم! چونکە خوایگەورە ئەمینداریخۆی لە ئاسمانەوە ناردۆتە لای ئەمینداریخۆی لە زەمین، سیفەتەکانی پێغەمبەری بۆ هێناوەو بەو سیفەتە پێغەمبەرمﷺ ناسی، بەڵام نازانم دایکیکوڕەکەم چی کردوە. (تفسیر الطبري) و(ابن كثير) البقرة (١٤٦).

دووەم: (بَحِيرا) گوتی: (ئەگەر جولەکە بیبینن و بیناسن دەیکوژن).

جا بۆ ڕاستیی ئەم قسەیە، ئیمامی(الترمذي بسند حسن) گێڕاویەتیەوە: ﴿لەو کاتەی (بَحِيرا) ئامۆژگاری (أَبُوطالِب)ی دەکرد تاکو پێغەمبەر بگەڕێنێتەوە (مَكَّة)، لە ناکاو حەفت پیاوی ڕۆمی هاتن، جا (بَحِيرا) گوتی: بۆچی هاتون؟ گوتیان: بۆیێ هاتوین ئاگادار کراوینەوە: کە پێغەمبەریئیسلام لەم مانگەدا لە (مَكَّة) دەردەچێ! بۆیێ بۆ سەر هەر ڕێگەیەك کۆمەڵە خەڵکێك نێردراون، ئێمەش بۆ ئەم ڕێگەیەی تۆ هەڵبژێردراوین. جا (بَحِيرا) گوتی پێم بڵێن: ئەگەر خوایگەورە بیەوێ بڕیارێکی خۆی جێبەجێ بکا، ئایا کەسێك دەتوانێ بڕیارەکەیخوا ڕەد بکاتەوە؟ گوتیان: نا. ئینجا (بَحِيرا) قەناعەتی بەو حەفت پیاوانە هێناو پەیمانیان دا: کە هەواڵی هاتنی پێغەمبەرﷺ بشارنەوەو ئاشکرای نەکەن، جا ڕۆمەکان گەڕانەوە﴾. واتە: بەم جۆرە خوایگەورە پێغەمبەریخۆی لە کوشتن ڕزگار کردو (أَبُوطالِب) گەڕاندیەوە بۆ (مَكَّة)ی پیرۆز. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦٢٣) و(الخصائص الكبرى) ب(١) ل(٨٣).

سێیەم: (الإرْهاصاتُ)، گشت درەختێك و بەردێك بۆ پێغەمبەرﷺ کەوتنە سوجدەو درەختەکە سێبەری لە پێغەمبەرﷺ دەکرد. ئەو ڕووداوە سەیرو گرنگانەی پێش پێغەمبەرایەتی گشتی (إرْهاصاتُ النُّبُوَّة)= پێشەکیەکانی بناغەی پێغەمبەرایەتی بون و زۆر جار ڕوویان دەدا: وەك ڕووداوەکەی هەڵکەندنەوەی بیری (زَمْزَم)و...تا ڕووداوەکانی ئەم باسە، هەم وەك پێغەمبەرﷺ خۆی فەرموویەتی: ﴿إِنِّي لَأَعْرِفُ حَجَراً بِمَكَّةَ كانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُبْعَثَ﴾ رواه مسلم وأحمد، من بەردێك لە(مَكَّة) دەناسمەوە سەلامی لێدەکردم پێش ئەوەی بکرێمە پێغەمبەرﷺ .

چوارەم: پێغەمبەرﷺ هەر لە سەرەتای کوروکاڵیەوە ئازاو لێهاتوو بوو، لە بارەی جەنگی (الْفِجار) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿من تیری دوژمنم بۆ مامەکانم دەهێناوە﴾.

مەبەست لە هێنانی ئەم باسە ئەوەیە: پێغەمبەرﷺ هەر لە تەمەنی چواردە ساڵیەوە فێری

ئازایەتیو جەنگ بووە، بە شێوەیەکی وەهاش لە جەنگکردن ڕاهاتووە: کە بوێرانە بەرەو پێش هەڵمەت بباو لە بەرەی جەنگیشدا ئەوەندە لە لای پێشەوە بێ: کە چەکی دوژمن بیگاتیو نەشترسێ، بەڵێ: ئەوەش ئامادەکردنێکیتری خوایگەورەیە بۆ پێغەمبەرەکەی خۆیﷺ تاکو بتوانێ بەرگری لە ئایینەکەی بکاو بە بەکارهێنانی چەك وەڵامی دوژمنانی ئیسلام بداتەوە ! چونکە (مست لە درێشە دەگەڕێتەوە).

**پێنجەم: ستەم لە ئیسلامدا نیە**، لەبارەی پەیمانەکەی (اَلْفُضُول) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لَوْ دُعِيتُ بِهِ فِي ٱلْإِسْــلاَمِ لَأَجَبْـــتُ﴾ **ئەگەر بە ناوی پەیمانەکەی (اَلْفُضُول) بانگ بکرێم، من فریای بانگکەرەکە دەکەوم.** جا هەر چەند ئەم پەیمانە لە سەردەمی (جاهِلِيَّة)ی پێش ئیسلام بەستراوە، بەڵام لە ئیسلامەتیشدا پێغەمبەرﷺ بنەماکانی ئەم پەیمانەی جێگیر کردون؟ چونکە ویژدانو دادپەروەری ڕەوشتێکی جوانەو ستەمیش ڕەفتارێکی خراپە، بۆیێ پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّما بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ مَكارِمَ ٱلْأَخْــلاَقِ﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد والبيهقي واللفظ لَـهُ، **من هەر بۆ ئەوە کراومە پێغەمبەر تاکو ڕەوشتە ڕێزدارەکان لە ئیسلامدا تەواو بکەم.**

جا ستەم لە لایەن هەر کەسێکەوە بێ، لە ئایینیئیسلامدا جێگەی نابێتەوەو واجبە لابېردرێ، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی ستەمکاران نەمێنێو خەڵك لە خۆشیو ئەمینیدا بژیێو هیچ کەسێك مافی هیچ کەسێك لە دەست نەدا، کەوابوو: لەو حاڵەتەی کاربەدەست ئەم ئەرکە جێبەجێ ناکا، یان شوێنەکە دەسەڵاتی کاربەدەستی لێنەبو، واجبە موسوڵمانان–وەك پەیمانەکەی (اَلْفُضُول)– بەم ئەرکە پیرۆزە هەڵبستن، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ النّاسَ إِذا رَأَوُا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللهُ بِعِقَــابٍ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، **هەر کاتێك خەڵك ستەمکارێکیان دیتو لە ستەمکردن قەدغەیان نەکرد، ئەوە نزیکە خوایگەورە هەموویان بە تێکڕایی سزاد بدا.** بۆ دڵنیابوون بڕوانە (شرح صحيح مسلم بهامش القسطلانی) ب(١) ل(٣٣٧–٣٤٢).

**شەشەم: شوانەتی پێغەمبەرﷺ بازرگانیی بە ماڵی (خَدِيجَة)، بۆ چی بوو؟.**

(أَبُوطالِب)ی مامیپێغەمبەرﷺ لە ڕووی ئابوورییەوە دەست کورت بوو، بۆیێ پێغەمبەرﷺ دەیویست یارمەتی مامی بداو لە بەرهەمی دەستی خۆی بخواو پێویستی بە هیچ کەسێك نەبێو منەتی هیچ کەسێکی لە سەر نەبێ، بەڵێ: باشترین ماڵی مرۆڤ ئەو ماڵەیە: کە بە دەستی خۆیو بە ئارەقەی نێوچاوانی خۆی وەدەستی دێنێ، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ما أَكَلَ أَحَدٌ طَعَاماً قَطُّ خَيْراً مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللهِ داوُدَعليه السلام كانَ يَأْكُلُ مِــنْ عَمَــلِ يَــدِهِ﴾ رواه البخاری، **هیچ کەسێك خواردنێکی لەوە باشتری نەخواردوە کە لە بەرهەمی دەستی خۆی دەیخوا، بەراستی (داوُد) پێغەمبەرﷺ**

ئاسنگرییی دەکردو لە بەرهەمی دەستی خۆی دەیخوارد.

جا کە کارکردنو وەدەستهێنانی بژێو و پێویستیەکانیتری ژیان ڕێبازی پێغەمبەران بێ-صلی الله علیهم اجمعین-جێی خۆیەتی مامۆستای ئایینی-کە میراتگری پێغەمبەرانە صلی الله علیهم اجمعین- بە سەر بڵندی بژێیو چاوی لە دەستی خەڵك نەبێ، شەرم نەکاو هەوڵ بدا شان بەشانی بڵاوکردنەوەی ئاین، بژێوی خۆیو ماڵو منداڵی بە ئارەقەی نێوچاوانیخۆی وەدەست بێنێ، تاکو سەر بڵندو بێمنەت بێو بوێرانە ئایینیئیسلام بە خەڵکی ڕابگەیەنێ، هەر ئەوهاش باشتری لێوەردەگیرێ، خۆ ئەگەر چاو لە دستی خەڵك نەبێ، ئەو کاتە: دەوڵەمەندی لەخوا دوریش ناتوانێ بە چاوی سوك تەماشای بکا، بۆیێ پێشینەکان گوتویانە: (دەستی ماندوو لە سەر زگی تێرە). شاعیریش دەڵێ:

لە دەرگەی نامەرد مەکە (دَقُّ الْبَاب) * گۆشتی ڕانیخۆت، نەك منەتی (قَصّاب).

ئەی برای ڕێزدارو خۆشەویست، تەماشای قورئانی پیرۆز بکە: کاتێ پێغەمبەران-علیهم السلام- ئایینی خوایان بە گەلەکەی خۆیان ڕاگەیاندوە، فەرمویانە: ﴿مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْـرٍ﴾ الفرقان: ٥٧، داوای هیچ کرێیەك لە ئێوە ناکەم لە سەر ڕاگەیاندنی ئەم ئایینە.

کەوابوو: هەر بانگەوازکارێکیئیسلام لە پەنای ئایینیدا خۆی بە خەڵکی بەخێو بکا، بانگەوازەیەکەی هیچ نرخێكو هیچ بەرهەمێکی باشی نابێ.

بەلام شوانەتی پێغەمبەرﷺ بۆ ڕاهێنانیش بوو، پێغەمبەرﷺ سەرکردەیەو پێشەوایەو ڕابەرە، جا کاتێ لە شەوێکی هێمندا لە بەر ڕۆناکی مانگەشەودا لە چۆلو بیاباندا بیر لە گەورەییخوا دەکاتەوەو لە کاتی بەیانیشدا شنە با لاشەی فێنك دەکاتەوەو لە ڕۆژی گەرمیشدا لە شوێنێکی بێ نانو ئاو ژیان دەباتە سەر، هیچ بیر لە یاتاغی نەرمو کۆشكو تەلار ناکاتەوە، سەرەڕای ئەو هەموو ئازارەش یارمەتی ئەو ئاژەڵە بەستەزمانە دەداو بەزەیی پێدا دێو بێچووەکەشی لە باوەش دەکاو چاودێرییو پاسی درندەشی لێدەکا، ئەوانە وای لێئەکەن بۆ ڕاگەیاندنی ئایینیخوا خۆڕاگر بێو هێمن بێو بوێرو نەترس بێو لەگەڵ ئوممەتەکەی بە بەزەیی بێو لەگەڵ بێدەسەڵاتەکانی ئوممەت ملکەچ بێو بەرامبەر بە زۆرداران ورە بەرز بێو وەك شوانی مەڕ بەرگری لە ئوممەتەکەی بکا، تاکو گورگی دور لە ئایین، لە ئایین دوریان نەخاتەوە، بەڵێ: بە شوێنکەوتنی ئەم جۆرە پێشەوایە مرۆڤ دەبێتە بەختەوەری دونیاو قیامەت.

**حەفتەم: مۆسیقاو زورنا حەرامە**، لە باسەکەی شوانەتیدا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **﴿گوێم لێبوو دەنگی لێدانی دەهۆڵو زورنا دەهات...دانیشتم گوێی لێڕابگرم، بەلام خەو بە سەر چاومدا هات...لە دوای ئەم دوو جارە چیتر نەمویستو نەگەڕاومەوە بۆ هیچێك لەو کارە خرابانە﴾.**

ئاشكرایە مەبەست بە خرابەكەی ئەم باسە: دەهۆڵو زوڕنایە، خوایگەورە هەردوو جار پێغەمبەرﷺ لەو خراپەیە پاراستووە، جا كە پێغەمبەرﷺ زۆڕنای بە خرابە دانابێ، ئەوانەی لاف ئیسلامەتی لێدەدەن، چۆن شەرم ناكەن: مۆسیقا حەڵاڵ دەكەن! بە گۆتەی خۆیان: دەیانەوێ بە لێدانی مۆسیقا ئایینیئیسلام بڵاو بكەنەوە!

كاكی خۆم ئایینیئیسلام بە لێدانی شمشێر و ڕەوشتی جوانو پەندو ئامۆژگاریی ژیرانە بڵاو كراوەتەوە، نەك بە مۆسیقاو زوڕناو كاری چاوەشانە، ئایا ئەوانە بەرامبەر بەو حەدیسەیڕابردوو چی دەڵێن؟ ئێمە وەڵام دەدەینەوەو دەڵێین: پێغەمبەرﷺ باسی ئەو جۆرە گومرابووانەی كردوەو فەرموویەتی: ﴿لَيَكُونَنَّ أَقْوَامٌ مِنْ أُمَّتِي يَسْتَحِلُّونَ الْحِرَ وَالْحَرِيرَ وَالْخَمْرَ وَالْمَعَازِفَ﴾ رواه البخاری، **هەندێك لە ئوممەتی من پەیدا دەبن: داوێنی ژنان بە ناشەرعیش بە حەڵاڵ دەزانن، ئاوریشم بە حەڵاڵ دەزانن، شەڕابیش–ناوێكیتری لێدەنێنو– بە حەڵاڵی دەزانن، مۆسیقاو زۆڕناش بە حەڵاڵ دەزانن.**

ئیمام (ابن حجر العسقلانی) فەرموویەتی: (اَلْمَعازِف) كەرستەكانی یاریو گۆرانییە. (فتح الباری) ب(١٠) ل(٦٥و٧٠).

لەبارەی حەڕامیی گۆرانیو مۆسیقا، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ لقمان: ٦، **هەندێ كەس كەلوپەلی گەمەی گفتوگۆ دەكڕێ تاكو خەڵكی لە ڕێگایخوا لابدا.**

لە چینی (صَحابَة)ی پێغەمبەرﷺ، (ابن عَبّاس)و (عبدالله بن مَسْعُود)و (جابِر بن عبدالله)ﭫ فەرموویانە: مەبەستی ئەم ئایەتە گۆرانییە.

لە چینی (التّابِعِين)ش: (عِكْرَمَة)و (مُجاهِد)و (سَعِيد بن جُبَيْر)و (مَكْحُول)و چەندانیتریش هەر ئەوهایان فەرمووە.

ئیمام (الحسن البَصْري) فەرموویەتی: مەبەستی ئایەتەكە: گۆرانیو موسیقایە.

ئیمامی(القرطبي) فەرموویەتی: بە بەڵگەی قورئانو حەدیس گۆرانی قەدەغە كراوەو ئەم ئایەتەش یەكێكە لە بەڵگەكان.

ئیمام (ابن حجر الهيتمي) فەرموویەتی: زانایانی هەر چوار مەزهەبی (أهل السُّنَّة) لە سەر ئەو فەرموودەنە: كە هەموو جۆرە كەرستەیەكی مۆسیقا حەڕامە. (تفسير القرطبي) و(تفسير ابن كثير) لقمان (٦)، و(تحفة المحتاج بحاشية الشروانی) ب(١٠) ل(٢١٨و٢٢٠).

**خوایگەورە لە منداڵیەوە پێغەمبەریﷺ لە خراپە پاراستووە**، پێغەمبەرﷺ–وەكو ئێمە– ئادەمیزادەو تایبەتمەندیەكانی ئادەمیزادیی هەیەو حەز بۆچوونیشی هەیە، بەڵام لەوەدا جیاوازیی هەیە: **خوایگەورە ئەوی پاراستووە لە گشت ڕەوشتو ڕەفتارێكی خراپ؟** نەوەك دوژمنانیئیسلام كەلێنێك بدۆزنەوە بۆ لێدانی پلەوپایەی پێغەمبەرﷺ، چونكە

گشت ڕەفتارێکی نالەبارو خراپ دژ بە پلەی پێغەمبەرایەتی‌یەو تۆمەت دروست دەکا، بۆیی خوای‌گەورە زۆر بایەخی بە پەروەردەی پێغەمبەرەکەی‌خۆیﷺ داوەو هەر لە منداڵیەوە– لە ڕۆژی لەتکردنی سینەی تا وەفاتیشی کرد– لە هەموو خراپەیەك پاراستویەتی، تا ئێستاش هیچ دوژمنێکی‌ئیسلام نەیتوانیوە تۆزێك عەیبێك لە سەر پێغەمبەرﷺ ئاشکرا بکا، بەڵکو بە پێچەوانەوە: هەر ڕەفتارو ڕەوشتێکی باش هەبێ لەم دونیایەدا گشتی لە پێغەمبەردا کۆ بۆتەوە، بۆیێ حەزرەتی(عائشە)-رضي الله عنها- فەرموویەتی: ﴿كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد وغيره، **ڕەوشتی پێغەمبەرﷺ ڕەوشتی قورئان بوو.**

شاعیریش دەڵێ:

**وَلَمّا أرادَ اللهُ لِلْمَعْلاةِ أَنْ تَجَسَّدا * قالَ لَها: كُونِي. فَكانَتْ مُحَمَّداﷺ**

کە خوای‌گەورە ویستی ڕەوشتی بەرز ببێتە جەستە، فەرمانی پێکرد: ببە. ئەویش بووە (مُحَمَّد)ﷺ. بە دەستکاریەوە لە (فقه السيرة، للبوطي) ل(٥٨–٦٠) و(سيرة الصلابي) ب(١) ل(٧٣–٧٨).

**هەشتەم: مامڵەتی (اَلْقِراض)=قازانجی هاوبەش،** ﴿**پێغەمبەرﷺ بازرگانی‌ی بە ماڵی (خَدِيجَة) کرد**﴾، ئەم جۆرە بازرگانی‌یە بە (إجْماع)ی زانایانی‌ئیسلام: دروستەو پێی دەگوترێ: (اَلْقِراض)=(اَلْمُضارَبَة) واتە: مامڵەتی قازانج بە هاوبەشی، وەك خاوەن ماڵێك پارە بداتە کرێکارێك تاکو بازرگانی‌ی پێبکاو بەشێکی قازانجەکە–لە بەرامبەر کرێ–بۆ کریکارەکەی بێ‌و ئەگەر زەرەریش ڕوویدا، ئەوە زەرەکە بە قازانجەکە پڕ دەکرێتەوە، واتە دروست نیە: لە زەرەردا هاوبەش بن. جا ئەم مامڵەتەم لە بەرگی سێیەمی(ڕووناکی رب العالمين)دا بە درێژی ڕوون کردۆتەوە بیخوێنەوە سودی لێوەردەگری.

**بازرگانی سەرچاوەیەکی بژێوە،** بە تایبەتیش ئەم جۆرە مامڵەتەی قازانجی هاوبەش بەو مەرجەی: هاوبەشەکان خیانەت لەگەڵ یەکتری نەکەن، هەم لەگەڵ خەڵکی‌تریش ئەمین‌و ڕاستگۆ بن، ئەوانە سیفەتەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ بون، لەبارەی ئەم سیفەتە باشانە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿يَقُولُ اللهُ تَعالى: أَنَا ثالِثُ الشَّرِيكَيْنِ مَا لَمْ يَخُنْ أَحَدُهُما صاحِبَهُ، فإذا خانَ خَرَجْتُ مِنْ بَيْنِهِما﴾ رواه أبوداود وصححه الحاكم، **خوای‌گەورە لە حەدیسێکی (قُدْسِي)دا دەفەرموێ: من هاوڕێی سێیەمینی دوو هاوبەشەکانم تا یەکێکیان خیانەت لەگەڵ ئەوی‌تر ناکا، جا هەر کاتێك خیانەتی کرد، من لە نێوانیان دەردەچم.** واتە: بەرەکەت لە مامڵەتەکەیان نامێڵم.

هەروەها لەبارەی بازرگانەکانی‌تریش بە گشتی، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ التُّجّارَ يُبْعَثُونَ يَوْمَ الْقِيامَةِ فُجّاراً إلاّ مَنِ اتّقَى اللهَ وَبَرَّ وَصَدَقَ﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، **بازرگانەکان لە ڕۆژی قیامەت بە تاوانکار زیندوو ئەکرێنەوە، تەنها ئەو بازرگانەی خۆی لە خیانەت‌و حەرام پاراستووەو چاکەی کردوەو ڕاستی‌ی گوتووە.** واتە: ئەوە لەگەڵ

پێغەمبەرانو شەهیدانو ڕاستگۆیان زیندوو ئەكرێتەوە.

**نۆیەم: بۆچی (خَدِيجَة) پێغەمبەری ﷺ هەڵبژارد بۆ هاوسەریەتی؟** گوتمان: مامی (خَدِيجَة) گوتی: **(هذا الْفَحْلُ لا يُقْدَعُ أَنْفُهُ) ئەم نێرییە لە لوتی نادرێ.**

عادەتی شوانەكان ئەوهایە: ئەگەر نێری ڕەسەن نەبێ، لە لوتی دەدەنو ڕێگای نادەن بپەڕێتە سەر مێیەكان؟ نەوەك بیچووەكە نابوتو دوورە دەربچێ، جا لێرەدا مەبەستی مامی(خَدِيجَة) ئەوەیە: (مُحَمَّد)ﷺ پیاوێكی ڕەسەنو ڕێزدارەو خوازبێنیەكەی ڕەد ناكرێتەوە. ئینجا جگە لە ڕێزداریو دەستپاكیو ئەمینیو ڕەوشت جوانیی پێغەمبەرﷺ، (خَدِيجَة) بۆ (وَرَقَة)ی كوڕی (نَوْفَل)ی گێڕاپەوە: كە (مَيْسَرَة) گوتویەتی: ﴿لەم سەفەرەدا دوو (مَلائِكَة) سێبەریان لە (مُحَمَّد)ﷺ دەكرد﴾.

جا (وَرَقَة) گوتی: **(ئەگەر ئەمە ڕاست بێ، بەڕاستی (مُحَمَّد) پێغەمبەری ئەم ئوممەتەیە، من دەزانم: ئەم ئوممەتە پێغەمبەرێكی بۆ دێ، كاتی هاتنی هاتووە).**

ئەم (وَرَقَة)یە كوڕە مامی (خَدِيجَة) بوو و زانستێكی زۆری لە كتێبەكانی ئاسمانی هەبوو، چونكە بەخۆی دیان بوو. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦٣٢) و(السيرةالحلبية) ب(١) ل(١٩٨و١٩٩).

**پێغەمبەرﷺ (شَهْواني) مێخواز نەبو...بێوەژنێكیتەمەن چل ساڵی لە پێغەمبەرﷺ بە تەمەنتر دەبێتە هاوسەری؟** تاكو دەربكەوێ پێغەمبەرﷺ دونیاداریو تێركردنی حەزیخۆی نەویستووە! چونكە گومان لەوەدا نیە: پێغەمبەرﷺ لە گەورەترینو بەڕێزترین بنەماڵەی نەتەوەی (عَرَب) بوو، خودیخۆیشی جوانترینو لێهاتووترین پیاوی سەر ڕووی زەمین بوو، لە هەموو كەسێكیش دەستپاكترو ڕەوشت جوانتر بوو، ئەوانە گشتی دەبونە ڕێخۆشكەر بۆ ئەوەی جوانترینو گەنجترینو بەشەڕەفترین كچی(قُرَيْش) لە خۆی مارە بكا، بەڵام بە هاوسەرەیەتی (خَدِيجَة) خوایگەورە ویستی ئەو دوژمنە سوكو چروكانە دەمكوت بكا، كە دەیانەوێ تۆمەتی مێخوازیو حەزحەزۆكێو حەز تێركردن بدەنە پاڵ پێغەمبەرﷺ، بەڵێ: كافرەكانی ڕۆژئاواو نۆكەرەكانیان–وەكو (علمانية) لە دین دەرچووەكان– تۆمەتی (شَهْوَة)و مێخوازی دەدەنە پاڵ پێغەمبەرﷺ بە بیانوی فرە ژنی، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان هەندە نەزانن نەزانینەكەیان جێگەی سەرسوڕمانە!؟ چونكە پێغەمبەرﷺ هەر ژنێكی هێنابێ هۆكارێكی ئایینی، یان كۆمەڵایەتیی هەبووە، هەروەك هەر یەكەیان لە شوێنیخۆیدا ڕوون دەكەینەوە، إن شاءالله تعالى.

بەڵام ئایا كەسێك تەمەنی گەنجیی لە (٢٥) بیستو پێنج ساڵیەوە تا (٥٠) پەنجا ساڵی بباتە سەر لەگەڵ بێوەژنێكی تەمەن (٤٠) چل ساڵی تا دەگاتە (٦٥) شەستو پێنج ساڵی، هیچ ژنێكشی بە سەر نەهێنیو هیچ كاتێك بیر لە كچێكی جەحێڵ نەكاتەوە، لەو هەموو تەمەنەشدا هەر داوێنپاك بێو خیانەتی چاولێكردنیشی لە سەر ئاشكرا نەبوبێ، توخوا ئەو

جۆره كەسە (شَهْواني)و مێخوازه، یان ئەو كەسانەی وەكو ئاژەڵ بەرگی شەرمو شەرمفیان لە خۆیان داڕنیوەو لە ژێر ناوی (مافی ئافرەت)و (ئازادی)و (دیمقراطي) هەر چی بەدڕەوشتییە دەیكەنو ئەم ئادەمیزادە ڕێزدارەیان هێناوەتە پلەی ئاژەڵەكان!.

جا چونكە ئەو بەدڕەوشتانە، پەیوەندییان بە ئیسلامەوە نەماوە، خەفتابارییان ناگاتە خەفتاباریی ئەو كەسانەی خۆیان لە ئیسلام دەژمێرنو لە هەمان كاتیشدا تۆكەری ئەو بەدڕەوشتانەنو خراپەكانیان لە بەر چاوی خەڵك جوان ئەكەنو ئایینی خوا دەگۆڕنو ئەو كافرانەو شەیتان لە خۆیان ڕازی دەكەنو بست بە بست بۆیان ئیمزا دەكەن.

**هۆی زۆریی ژنەكانی پێغەمبەر ﷺ:** ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: كانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ تِسْعُ نِسْوَةٍ، فَكانَ إذا قَسَمَ بَيْنَهُنَّ لا يَنْتَهِي إلَى الْمَرْأَةِ الأُولَى إلاّ فِي تِسْعٍ، فَكُنَّ يَجْتَمِعْنَ كُلَّ لَيْلَةٍ فِي بَيْتِ الَّتِي يَأْتِيها...﴾ رواه مسلم، **پێغەمبەر ﷺ نۆ ژنی هەبون، جا كە نۆبەتی لە نێوانیادا دەكرد تا نۆ شەوان نەدەهاتەوە لای ژنەكەییەكەمی، جا هەموو ژنەكانیشی هەموو شەوێك لە ماڵی ئەو ژنەی كۆ دەبونەوە: كە پێغەمبەر ﷺ شەوێ لە لای دەماوە.**

جا لە بەر ئەوەی-لە ڕووی ئابوورییەوە- ژیانی پێغەمبەر ﷺ ژیانێكی گەداییو هەژاری بوو، ژنەكانی داوای بژێوێكی زیاتریان لە پێغەمبەر ﷺ كرد، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لێیان توڕە بوو و ماوەی مانگێك هاتوچۆی نەكردن، ئینجا خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ كرد: ژنەكانی بكاتە سەرپشك، ئەم دوو ئایەتانەی بۆ ناردنە خوارەوە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ إنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً * وَإِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْراً عَظِيماً﴾ الأحزاب: ٢٨و٢٩، **ئەی پێغەمبەر ﷺ بە ژنەكانت بڵێ: ئەگەر ئێوە ژیانو جوانیی دونیاتان دەوێ، وەرن (مُتْعَة)=مافی تەڵاقتان دەدەمێ و بە تەڵاقدانێكی جوان تەڵاقتان دەدەم، وە ئەگەر خواو پێغەمبەر ﷺ خۆشیی ڕۆژیدواییتان دەوێ، ئەوە خوای گەورە ئامادەی كردوە بۆ چاكەكاران لە ئێوە پاداشتێكی گەورە.**

جا بۆ بەجێهێنانی ئەم فەرمانەی خوا، پێغەمبەر ﷺ ژنەكانی كردنە سەرپشك: بۆ هەڵبژاردنی تەڵاق، یان مانەوەو ڕازیبوونیان بەم ژیانە. جا یەكەم جار پێغەمبەر ﷺ لە حەزرەتی(عائِشَة)وە دەستی پێكردو فەرمووی: **زیانی نیە ئەگەر پەلە نەكەی تا پرسێك بە دایكتو باوكت دەكەی.** جا حەزرەتی(عائِشَة)-رضي الله عنها- فەرمووی: لەبارەی كامەیان پرسیان پێبكەم؟ من خواو پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی دواییم دەوێ، واتە: تەڵاقدانم ناوێ. جا ژنەكانیتریشی-وەك حەزرەتی(عائِشَة) رضي الله عنهن- مانەوەیان لە لای پێغەمبەر ﷺ هەڵبژاردو تەڵاقدانیان نەویست.

**جا بزانە: پێغەمبەر ﷺ هەر ژنێكی-لە دوای حەزرەتی(خَدِيجَة)رضي الله عنها- هێنابێ، هۆیەكی**

ئایینی، یان کۆمەڵایەتیی هەبووە، هۆیەکەش لە باسی مارەکردنی هەر ژنێکیدا بە درێژی ڕوون دەکەینەوە–إن شاءالله تعالى–، بەڵام لێرەدا بە پەلەو بە کورتی چەند هۆیەك باس دەکەین:
١–تاکو بە هۆی زاواوخەزورایەتی یارمەتیدەرەکانی زۆر ببن بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلامو بۆ جەنگی دوژمنانیئیسلام. ٢– تاکو بە هۆی زاواوخەزورایەتی دڵی دوژمنەکانی نەرم بکاو دوژمنانیئیسلام کەم ببنەوە. ٣–تاکو بە هۆی زاواوخەزورایەتی ڕێز لە هۆزەکانو لە بنەماڵەکان بنێو بە خزمایەتیی ڕێزدار بنو شانازیی پێبکەن. ٤–تاکو ژنەکانی ﷺ ئەو بڕیارە شەرعیانەی تایبەتی ئافرەتانن بۆ موسوڵمانان بگێڕنەوە. ٥–بۆ جێبەجێکردنو چەسپاندنی بڕیاری شەریعەتیئیسلام: وەك مەسەلەی (زَيْد)و (زَيْنَب) رضي‌الله عنها.
٦–بۆ بەخێوکردنو دڵدانەوەی ئەو بێوەژنە موسوڵمانانەی بە بێ خزموکەس دەمانەوە.
٧–ئاگاداربوون لە حاڵەتەکانی پەنهانییو لە ڕەوشتە باشەکانی کە خەڵك نەیاندەزانین.
(شرح صحيح مسلم) ب(٦) ل(٢٣٢) و(فتح الباري) ب(٨) ل(٦٦١–٦٦٣)، ب(٩) ل(١٤٤–١٤٥).

***  ***  ***

## ﴿ بەشداریکردنی پێغەمبەرﷺ لە دروستکردنەوەی (كَعْبَة)دا ﴾

کە تەمەنی پێغەمبەرﷺ بووە (٣٥) سێو پێنج ساڵ، (قُرَيْش) کۆ بونەوەو بڕیاریان دا: (كَعْبَة)=(بَيْتَ الله) سەرلەنوێ دروست بکەنەوە؟ چونکە بە هۆی سوتانو لافاو نەختێکی لێ ڕوخا بوو و دیوارەکانی دەرەزی تێکەوتبوو، جا هەر بنەماڵەیەك لە (قُرَيْش) بە جیا بەردی کۆ دەکردنەوەو ئیشی تێدا دەکرد، پێغەمبەریشﷺ لەگەڵ (عَبَّاس)ی مامیدا بەردیان دەهێنا بۆ دیواری (كَعْبَة)، جا (عَبَّاس) بە پێغەمبەریﷺ گوت: (پەشتەماڵەکەت لە سەر شانت دابنێ، تاکو بە هۆی بەرد هێنان بریندار نەبێ). جا پێغەمبەرﷺ وایکردو عەورەتی بەدەرکەوتو یەکسەر کەوتە سەر زەویو لە هۆش خۆی چوو و چاوی بەرەو ئاسمان زەق بونەوە، ئینجا هۆشی هاتەوەو فەرمووی: ﴿إِزارِي إِزارِي﴾ رواه الشيخان، پەشتەماڵەکەم پەشتەماڵەکەم. ئینجا یەکسەر پەشتەماڵەکەی لە خۆی بەستەوەو لە مەودوا هیچیتر بە ڕووتی نەدیترا.

جا کە (قُرَيْش) لە دانانی دیوارەکەدا گەیشتنە شوێنی (الحَجَرالأسْوَد)، کێشەیان لێ پەیدا بوو و هەر بنەماڵەیەك دەیگوت: ئێمە (الحَجَرالأسْوَد) لە شوێنیخۆی دادەنێینەوەو ئەبی ئەم سەربڵندییە بۆ ئێمە بێ. ئیتر کێشەکەیان گەیشتە حاڵەتی ئامادەبوون بۆ جەنگکردن، بەڵام (أبُوأمَيّة)–کە پیرترین پیاوی (قُرَيْش)بوو– گوتی: خەڵکینە ئەم جەنگە پێویست ناکا، بەڵکو بڕیار بدەن: (کێ–یەکەم کەس– لە دەرگای مزگەوت هاتە ژورەوە، ئەو کێشەکەتان بڕێنێتەوە). ئەوانیش گوتیان: باشە، ئێمە ڕازین. جا هەر لەو کاتدا پێغەمبەرﷺ یەکەم کەس بوو هاتە ژورەوە، جا کە دیتیان گوتیان:

ئەوە (مُحَمَّد)ى ئەمین هات، بەوی ڕازینە کێشەکەمان ببڕێنێتەوە.

جـا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: پەشـتەماڵێکم بـۆ بێـنن. پەشـتەماڵەکەیان هێنـاو پێغەمبەریشﷺ (الحَجَرالأسْوَد)ى لە سەر پەشتەماڵەکە دانا، ئینجا فەرمووی: ﴿با هەر بنەماڵەیەك لایەکی پەشتەماڵەکە هەڵبگرێ﴾. جا بەم شێوەیە گشتیان هەڵیانگرت تا گەیـشتنە بـن دیوارەکـە، جـا لـەوێش پێغەمبـەرﷺ بـە دەسـتە پیرۆزەکـانی‌خۆی (الحَجَرالأسْوَد)ى هـەڵگرتو لـە شـوێنەکەی‌خۆی دایناوە، سـەربەرزی بـۆ ئـەو بـوو و کێشەکەشی بڕاندەوە، تا ئێستاش (الحَجَرالأسْوَد) هەر لە شوێنەکەی‌خۆیەتی.

جا ئەوەی پێویستە بیزانین، ئەوەیە: لەم دروستکردنەوەدا (قُرَيْش) یەك دەرگایان لـە لای ڕۆژهەڵات بـۆ (كَعْبَة) کـردەوەو کۆسپەکەشیان زۆر بڵنـد کـرد، تـا بتـوانن بـە دڵی خۆیان: ڕێگا بدەن‌و ڕێگا نەدەن بۆ چونە ناو (كَعْبَة)، هەروەها (حِجْر إسماعيل)شیانﷺ لە (كَعْبَة) جیا کردەوە، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿يا عائِشَةُ لَوْلاَ حِداثَـةُ قَوْمُـكِ بالْكُفْرِ –فَأَخافُ أَنْ تُنْكِرَ قُلُوبُهُمْ- لَنَقَضْتُ الْكَعْبَةَ ثُمَّ بَنَيْتُهُ عَلى أَساسِ إبْراهِيمَﷺ وَجَعَلْـتُ لَها باباً شَرْقِيّاً وَباباً غَرْبِيّاً–وأَلْزَقْتُهُ بالأَرْضِ– وَأَدْخَلْتُ فِيها الْحِجْرَ﴾ رواه الشيخان بروايات مُتَعَدِّدَة، ئەی (عائِشَة) ئەگەر گەلەکەی تۆ–(قُرَيْش)– لـە کوفر نزیك نەبوان، چونکە تازە موسـوڵمان بوینـە، بۆیـێ دەترسـم بـە دڵیـان نـەبێ، ئەگـەر نـا: (كَعْبَـة)م هەڵدەوەشاندەوەو لـە سـەر بناغـەی حـەزرەتی(إبْراهِيم)ﷺ دروستم دەکردەوەو دەرگایەکم لە ڕۆژهـەڵات بۆ دەکردەوەو دەرگایـەکیش لـە ڕۆژئـاوا، دەرگاکەشم تا زەمین نـەوی دەکـردو (حِجْر إسْماعِيل)شـمﷺ وەنـاو (كَعْبَـة) دەخـستەوە. (البداية والنهاية) ب(١) ل(٦٣٤) و(فتح الباري) ب(٣) ل(٥٥٤).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکـەم: پێغەمبـەرﷺ بـە (الـصَّادِقُ الأَمِـين)=ڕاسـتگۆ و ئـەمین بـە ناوبـانگ بـوو، (قُرَيْشِي)یـەکان گوتیـان: ئـەوە (مُحَمَّد)ى ئـەمین هـات، بـەوی ڕازینـە کێـشەکەمان ببڕێنێتـەوە. ئەمەش نیشانەیەکی‌تـرە کـە پێغەمبـەرﷺ–پـێش پێغەمبەرایـەتیش– هـەر ڕاسـتگۆو ئـەمین‌و خۆشەویـست بـوو لـە لای هـەموویان‌و ڕێـزی تایبـەتی هـەبوو، بـۆ چارەسەری کێشەکان لـە ڕیـزی پیاوماقوڵانی (مَكَّة) بـوو، جـا لێـرەدا پێغەمبـەرﷺ دوو شەرەفی وەدەست کەوتن:**

**یەکـەمیان: بڕاندنـەوەی کێـشەی (اَلْحَجَرُالأَسْـوَد) لـە نێـوان بنەماڵـەکانی (مَكَّـة)دا.**

**دووەمیـان: دانـانی (اَلْحَجَرُالأَسْوَد) لـە شـوێنەکەی‌خۆی بـە دەسـتە پیرۆزەکـانی‌خۆی.**

**بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە: کە (مُحَمَّد)ى ئەمین بـووە پێغەمبـەرﷺ، هـەر ئـەوان بون باوەڕیان پێ‌نەکردو ئازاریان دا و پیلانی کوشتنیان بۆ داناوە، بـە دەستکاریەوە لـە (فقه السيرة، للبوطي) ل(٧٣) و(سيرةالصلابي) ب(١) ل(٩٠).**

**جا بزانە: (كَعْبَة)ی پیرۆز چوار جار دروست كراوەتەوە:**

**جاری یەكەم:** بە دەستی حەزرەتی(إِبْراهِيم) پێغەمبەر و حەزرەتی(إِسْماعِيل) پێغەمبەر-صلى الله وسلم عليهما -كە باسمان كرد.

**جاری دووەم:** بە دەستی (قُرَيْش) كە پێغەمبەریشﷺ بەشداریی كرد، بەڵام ((قُرَيْش) بە ناتەواوی دروستیان كردەوە، بۆیێ پێغەمبەرﷺ ئارەزووی هەبوو: وەك سەردەمی حەزرەتی(إِبْراهِيم) پێغەمبەرﷺ دروستی بكاتەوە، هەروەك لە حەدیسەكەیڕابردووی حەزرەتی(عائِشَة)دا-رضى الله عنها-باسمان كرد.

**جاری سێیەم:** بە دەستی حەزرەتی(عبدالله بن الزُّبَيْر)-رضى الله عنهما-، لەو كاتەی لەشكری (يَزِيد بن مُعاوِيَة) بە سەركردایەتی (الحصن السُّكُونی) گەمارۆی (مَكَّة)ی پیرۆزیان دا، چونكە حەزرەتی(عبدالله)رضي الله عنه دەستەڵاتداریەتی (يَزَيْد)ی قبوڵ نەكردو ئەمیرایەتیخۆی لە (مَكَّة)دا ئاشكرا كرد، ئینجا لە شكرەكە بە مەنجەنیق بۆردومانی (كَعْبَة)ی پیرۆزیان كردو بەشێكیان لێ سوتاندو ڕوخێندرا، ئنیجا كە (يَزِيد) مرد، لەشكرەكە بەرەو (شام) گەڕاوە، ئینجا حەزرەتی (عبداللهرضي الله عنه) سەر لەنوێ (كَعْبَة)ی بە تەواوی دروست كردەوە: وەك ئەو نەخشەیەی پێغەمبەرﷺ ویستبووی-كە لە حەدیسەكەی حەزرەتی(عائِشَة)دا-رضى الله عنها- ڕابرا- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەزرەتی(ابن عَبّاس)-رضى الله عنهما- ئامۆژگاری حەزرەتی(عبدالله)ی كرد: كە تەنها ڕووخاوەكە چاك بكاتەوەو دەستكاری هەموو (كَعْبَة) نەكاو وەك سەردەمی پێغەمبەرﷺ بیهێڵێتەوە. بەڵام حەزرەتی(عبدالله)رضي الله عنه گوێی نەدایێ.

**جاری چوارەم:** بە دەستی (الحَجّاج الثَّقَفِي) لە سەردەمی ( عَبْدُالْمَلِك بن مَرْوان)، واتە: ئەم جارە لەشكری (عَبْدُالْمَلِك) بە سەركردایەتی (الحَجّاج) هێرشی هێناوە سەر (مَكَّة)ی پیرۆزو حەزرەتی(عبدالله بن الزُّبَيْر)ی-رضى الله عنهما- شەهید كرد، ئینجا (الحَجّاج) بە فەرمانی (عَبْدُالْمَلِك): دروستكردنەوەكەی حەزرەتی( عبدالله بن الزُّبَيْر)ی-رضى الله عنهما-تێك دا و (حِجْر إِسْماعِيل)ی وەك خۆی لێكردەوەو دەرگەی دووەمیشی داخست: وەك ئێستا لە بەرچاوە.

ئینجا كە (أُمَوِيّ)یەكان لە دەسەڵاتدا نەمانو (عَبّاسِي)یەكان هاتنە سەردەسەڵات، خەلیفەكانی (عَبّاسِي): (المَنْصُور)و (المَهْدِي)و (هارُون الرَّشِيد) هەر یەكەیان ویستی دروستكراوكەی (الحَجّاج) تێك بداتەوەو وەك دروستكراوەكەی حەزرەتی(عبدالله بن الزُّبَيْر)-رضى الله عنهما-بە نەخشەكەی پێغەمبەرﷺ-دروستی بكاتەوە، بەڵام ئیمام (مالك) بە هەر یەكەیانی گوت: (**ناشَدْتُكَ اللهَ يا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِين: أَلاّ تَجْعَلَ هَذا الْبَيْتَ مَلْعَبَةً لِلْمُلُوك...فَتَذْهَبَ هَيْبَتُهُ مِنْ صُدُورِ النّاسِ**) بۆ خاتری خوا تكات لێدەكەم ئەی گەورەی موسوڵمانان: ئەمماڵەی خوا مەكە گاڵتەجاڕی پاشایەكان، هەر پاشایەك بیەوێ بە دڵی خۆی دەستكاریی بكا، نەوەك ترسو ڕێزداریەكەی لە دڵی خەڵك بڕواتە دەرەوە. بەڵێ: بەم

جۆرە ئیمام (مالك) هەر یەكەیانی لە بڕیارەكەی لادا. (فتح الباري) ب(٣) ل(٥٥٤-٥٦٦).

**دووەم: دروست نیە بە ئەنجامدانی هیچ سوننەتێك پەرتەوازەیی پەیدا بكرێ،** پێغەمبەرﷺ بە حەزرەتی(عائشة)ی-رضي الله عنها-فەرموو: ﴿لَوْلا حِداثَةُ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ فَأَخافُ أَنْ تُنْكِرَ قُلُوبُهُمْ...﴾ تا كۆتایی حەدیسەكە. زانایانیئیسلام (قاعدة)یەكی (أُصُولُ الْفِقْه)یان لەم حەدیسە وەرگرتووە: (دَرْءُ الْمَفاسِدِ أَوْلَىَ مِنْ جَلْبِ الْمَصالِحِ) **لادانو لابردنی خراپەكان لەپێشترە لە وەدەستهێنانی بەرژەوەندیەكان.** واتە: پێغەمبەرﷺ زۆری پێخۆش بوو ناتەواوی (كَعْبَة) تەواو بكاتەوەو وەك سەردەمی حەزرەتی(إِبْراهِيم) پێغەمبەرﷺ دروستی بكاتەوە، بەڵام چونكە دانیشتووانی (مَكَّة) تازە موسوڵمان بوبونو ئەو گۆڕانكاریە دەبووە هۆی دڵشكانی ئەوان، بۆیێ پێغەمبەرﷺ وازی لەم بەرژەوەندییە هێنا، تاكو ئەم خراپەیە ڕوو نەدا.

تەماشا بكە: لە ڕووی بەرژەوەندییەوە، خوایگەورە فەرمانی داوەتە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْراهِيمَ﴾النحل: ١٢٣، **ئینجا وەحیمان بۆ تۆ نارد: شوێن ئایینی (إِبْراهِيم) پێغەمبەرﷺ بكەوە.**

بەڵام لە ڕووی لادانی خراپە، خوایگەورە قەدەغەی كردووەو دەفەرموێ: ﴿أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾الشورى: ١٣، **ئەم ئایینە ئەنجام بدەنو پەرتەوازەیی تێدا مەكەن.**

كەوابوو: ئەگەر بە هۆی وەدەستهێنانی بەرژەوەندیێك پەرتەوازەو دووبەرەكی ڕووی دا، واجبە: واز لە بەرژەوەندیەكە بهێندرێو پەرتەوازە لە ئیسلامدا پەیدا نەكرێو بیرو هۆشی خەڵك چەندی پێوەردەكرێ هەر ئەوەندەی لێ داوا بكرێ. ئیمامی (النَّواوي)و ئیمام (ابن حَجَر العسقلاني) ئەم باسەیان زۆر بە پوختی ڕوون كردۆتەوە، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ب(٦) ل(١٤و١٥) و(فتح الباري) ب(٣) ل(٥٦٦).

جا لە كۆتاییدا-ئەی موسوڵمانی ڕێزدار-كە لەم باسە ورد بویەوە، ئەوەش بزانە: جەنابت لە پێغەمبەرﷺ لەخواترستر نی، لەویش لێزانتر نی بۆ بەرژەوەندی ئایین، هەروەها لە ئیمام (مالِك)ش زاناتر نی، لە (خَلِيفَة)كانی (عَبّاسی)ش بە دەسەڵاتتر نی، كەوابوو: ئەگەر تۆ شتێك بە سوننەت دەزانی، بەڵام دڵی موسوڵمانانی پێدەشكاو یەكڕیزیی موسوڵمانی تێك دەدا، ئەم سوننەتە مەكەو شوێن ڕێبازی پێغەمبەرﷺ بكەوەو واز لەم سوننەتە بێنە! ؟ چونكە یەكڕیزیی موسوڵمانان واجبەو پەرتەوازەییش حەرامە، بەڵام كردنی سوننەت واجب نیەو نەكردنیشی حەرام نیە.

هەر لەم بابەتە: جارێك ئیمامی(الشافعي) لە مزگەوتی ئیمامی(الْحَنَفي) لە (بَغْداد)، پێشنوێژی نوێژی سبەینێی كردو (قُنُوت)ی نەخوێند؟ چونكە نوێژكەرەكانی ئەوێ لە سەر مەزهەبی ئیمام(اَلْحَنَفي) بونو لە مەزهەبی ئەواندا (قُنُوت) لە نوێژی سبەینێدا نیە، واتە:

ئیمامی(الشافعي) نەیویست بە هۆی ئەنجامدانی سوننەتێك دڵی ئەوان بشكێنیّو پەرتەوازەیەك پەیدا بكا. بڕوانە (مغنى ابن قدامة) ب(١) ل(٢١).

جا ئەی موسڵمانی ڕێزدار تەماشا بكە: ئەو ڕەفتارەو ئەو نوێژە سەیرەی هەندێك موسوڵمانەكانی هەڵخەڵتێندراو لە مزگەوتەكاندا دەیكەن، چۆن بووەتە هۆی دووبەرەكیو غەیبەتكردنو تێكدانی ڕیزی موسوڵمانان.

ئەی موسڵمانی ڕێزدار: خۆ حەزرەتی(عبدالله بن الزُّبَیْر)-رضي الله عنهما- سوننەتێكی پێغەمبەریﷺ ئەنجام دا، بەڵام خۆزگە هەر بە ئامۆژگاریەكەی حەزرەتی(ابن عَبّاس)-رضي الله عنهما- ڕەفتاری كردبا؟ نەوەك ستەمكارێكی وەك (الحَجّاج) دەستكاری (كَعْبَة)ی كردبا، خۆ ئەگەر ئیمام (مالك) لە مەیدان نەبوایە: ئێستاش (كَعْبَة) دەبووە گاڵتەجاڕی كاربەدەستان، بەڵام ئافەرین بۆ خەلیفەكانی (عَبّاسی)ش بەو هەموو دەسەڵاتەی خۆیان گوێڕایەڵی (فتوا)ی ئیمام (مالك) بون، كەوابوو: ئەی لاوی موسوڵمان تۆش گوێڕایەڵی زانایانیئیسلام بە، هیچیتر بە قسەی ئەمیرە نەزانەكانت یەكڕیزی موسوڵمانان تێك مەدەو دڵی موسڵمانان مەشكێنە، هدانا اللهُ وَإِيّاك إلى طريق الصواب، آمين.

*** *** ***

## ﴿ باسی سەرەتای هاتنی قورئان بە (وَحْي)و بوونی بە پێغەمبەرﷺ ﴾

(عَنْ أَبىقَتادَةَ: سُئِلَ النَّبيُّﷺ عَنْ صَوْمِ الْإِثْنَيْنِ؟ فَقالَﷺ: ذاكَ يَوْمٌ وُلِدْتُ فِيــهِ وَيَــوْمٌ بُعِثْتُ–أَوْ أُنْزِلَ عَلَيَّ– فِيهِ) رواه مسلم، **لەبارەی بەڕۆژووبوونی ڕۆژی دووشەممە پرسیار لە پێغەمبەرﷺ كرا؟ ئەویش فەرمووی: دووشەممە ڕۆژێكی ئەوهایە: منی تیّدا لە دایك بومو هەم لە دووشەممەشدا كرامە پێغەمبەرو قورئانم بۆ هات.**

**كە تەمەنی پێغەمبەرﷺ بووە (٤٠) چل ساڵ، لە ڕۆژی دووشەممەی (١٧) حەڤدەی مانگی ڕەمەزان، سەرەتای هاتنی قورئان لە لای خوداوە بە (وَحي) بۆ پێغەمبەرﷺ دەستی پیّكرد و بووە پێغەمبەرﷺ، بەو شێوەی لێرەدا ڕوونی دەكەینەوە.** (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٩) و(فتح الباري) ب(١٢) ل(٤٤٧).

**ئەم (وَحي)هاتنەش دەكاتە بەرامبەر (١) یەكی (شُباط)ی ساڵی (٦١٠) شەشسەدو دەی زاینی.** (نورالیقین) ل(٢٦).

(عَنْ عائِشَةَ-رضي الله عنها-: أَوَّلُ ما بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللهِﷺ مِنَ الْوَحْيِ اَلرُّؤْيا الصّادِقَةُ فِــي النَّــوْمِ، فَكانَ لا يَرَى رُؤْياً إلاّ جائَتْهُ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ، فكانَ يَخْلُو بغارِ حِراءَ فَيَتَحَنَّثُ فِيــهِ اللَّيــالِيَ ذَواتِ الْعَدَدِ وَيَتَزَوَّدُ لِذلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إلى خَدِيجَةَ فَتُزَوِّدُهُ لِمِثْلِها، حَتَّى فَجَئَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غارِ حِراءَ، فجاءَهُ الْمَلَكُ فِيهِ فَقالَ: إِقْرَأْ. فَقالَ لَهُ النَّبيُّﷺ: مَا أَنَا بقارِئ. فَأَخَذَنى فَغَطّنى حَتّى بَلَغَ مِنِّى الْجَهْدُ، ثُمَّ أَرْسَلَنى فَقالَ: إِقْرَأْ. فَقُلْتُ ما أَنَا بِقارِئٍ. فَأَخَذَنى فَغَطَّنى الثّانِيَةَ حتّى بَلَغَ مِنِّــى

الْجَهْدُ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقالَ: إقْرَأْ. فَقُلْتُ ما أَنَا بقارِئ. فَأخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ حَتّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدُ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقالَ: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِى خَلَق)، حَتّى بَلَغَ (عَلَّمَ الإنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ)﴾ الحديث بطوله رواه الشيخان، **سەرەتای دەستپێکردنی (وَحْي) بۆ پێغەمبەرﷺ خەونی ڕاست بوو، کە لە خەودا دەیدیت، هەر خەونێکی دەدیت وەك ڕۆشنایی سبەینە دەهاتە جێ، جا پێغەمبەرﷺ بە تەنهایی لە ئەشکەوتی (حراء)دا دەماوە، لەوێ بە تەنهایی ماوەی چەند شەوێك خواپەرستیی دەکردو ئازوقەی ئەو ماوەیەشی لەگەڵ خۆیا دەبرد، ئینجا دەگەڕاوە لای (خَدِيجَة)**-رضي‌الله عنها-**بۆ ماوەیەکیتریش ئازوقەی دەدایێ، تا (وَحْي) هەشیاریی بۆ هات، واتە: لە بەرەبەیانی ڕۆژی دووشەممە لە حاڵەتی هەشیاریدا لە ئەشکەوتی (حراء)دا حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه‌السلام هاتە لای پێغەمبەروﷺ پێی گوت: (إقْرَأْ) بخوێنە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: من خوێندەوار نیم، جا حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه‌السلام منی گرتو هەڵیگوشیم تا زۆر بێهێز بووم، جا بەریهەڵدامو گوتی: (إقْرَأْ) بخوێنە. گوتم: من خوێندەوار نیم، جا بۆ جاریدووەم گرتمیو هەڵیگوشیم تا زۆر بێهێز بووم، جا بەریهەڵدامو گوتی: (إقْرَأْ) بخوێنە. جاری سێیەمیش منی گرتو هەڵیگوشیم تا زۆر بێهێز بوم، جا بەریهەڵدامو گوتی:** ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِى خَلَقَ * خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ * اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ * الَّذِى عَلَّمَ بِالْقَلَمِ * عَلَّمَ الإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾: العلق: ١-٥.

**واتە: ئەو پێنج ئایەتانە لەم سورەتەدا یەکەمین ئایەتەکانی قورئان بون کە بۆ پێغەمبەرﷺ هاتن، جا پێغەمبەرﷺ ئەو ئایەتانەی لەبەر کردنو گەڕاوە ماڵەوەو دڵەڕاوکێ گرتیو شانەکانی دەلەرزینو بە حەزرەتی(خَدِيجَة)ی فەرموو:** ﴿زَمِّلُونِى زَمِّلُونِى﴾ **داموپۆشن داموپۆشن. جا دایانپۆشی تا دڵەڕاوکێی نەما، جا فەرمووی: هۆ (خَدِيجَة) ئەوە چیم لێهات؟! جا هەواڵەکەی بۆ گێڕاوەو فەرمووی:** ﴿قَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِى﴾ **بەڕاستی لە خۆم ترسام نەخۆشیەکم توش ببێو بمرم.**

**جا حەزرەتی(خَدِيجَة)**-رضي‌الله عنها-**فەرمووی: نا، موژدەت لێبێ: وَاللهِ هەرگیز خوایگەورە تۆ سەرشۆڕ ناکا، چونکە تۆ سیلەی ڕەحم بەجێ دێنیو ڕاستی دەڵێیو باری ماندووبووان هەڵدەگریو میوانداری دەکەیو یارمەتی بێ ماڵو لێقەوماوان دەدەیو لە سەر ڕووداوەکانی ڕاست یارمەتی خەڵك دەدەی.**

**ئینجا حەزرەتی(خَدِيجَة)**-رضي‌الله عنها-**پێغەمبەریﷺ لەگەڵ خۆیا بردە لای (وَرَقَة بن نَوْفَل)-کە کوڕە مامی حەزرەتی(خَدِيجَة) بوو- ئەم (وَرَقَة)یە بوبووە دیانو زۆر شارەزای زمانی (عَرَبي)و (عِبْراني) بوو، بەڵام پیر بوبوو و کوێریش بوبوو، جا حەزرەتی(خَدِيجَة)**-رضي‌الله عنها-**پێی گوت: مامۆزا گوێ لە کوڕەبرایەکەت ڕابگرە چی**

دەڵێ؟! جا پێغەمبەرﷺ چی دیتبوو بۆ (وَرَقَة)ی گێڕاوە، جا (وَرَقَة) گوتی: (هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَى مُوسَى) ئەم (مَلائِكَة)یە خاوەنی ئەو نهێنییەیە کە بە (وَحْي) بۆ (مُوسى) پێغەمبەریﷺ هێناوە، خۆزگەم لەو کاتەی بانگەوازی ئیسلام ئەکەی و گەلەکەت لە (مَكّة) دەرتدەکەن، مـن گەنجێکی بەهێزو زیندوو بوام تاکو یارمەتیم دابای، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿أَوَ مُخْرِجِيَّ هُمْ؟﴾ ئایا گەلەکەم لە (مَكّة) دەرمدەکەن؟! (وَرَقة) گوتی: (نَعْم لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ إلاَّ عُودِيَ) بەڵێ: هەر پیاوێك ئەو جۆرە بەرنامەی تۆ بێنێ، دوژمنایەتی هەر دەکرێ.

جا ئەوەندەی پێنەچوو (وَرَقَة) مرد، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێکیش هاتنی (وَحْي) وەستێندرا، جا بەم وەستاندنە پێغەمبەرﷺ بە شێوەیەکی وەها غەمبار بوو: دەیویست لە سەر لوتکەی چیایەکان خۆی فڕێ بداتە خوارەوە، بەڵام هەر جارێك ئەوەهای ویستبا، حەزرەتی(جُبْرائيل)ﷺ خۆی نیشان دەداو دەیفەرموو: ﴿يا مُحَمَّدُ إنَّكَ رَسُولُ اللهِ حَقّاً﴾ رواه البخاري، هۆ (مُحَمَّد) تۆ پێغەمبەریخوای بە ڕاستی.

جا بەم گوفتارەی حەزرەتی(جُبْرائيل)ﷺ، دڵی پێغەمبەرﷺ چاك دەبۆوەو غەمی نەدەما، ئینجا هاتنی (وَحْي)دەستی پێکراوەو خوایگەورە سەرەتای سوڕەتی﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ﴾ تا ﴿وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ﴾ی بۆ پێغەمبەرﷺ ناردە خوارەو (وَحْي) بە دوای یەکدا هات. ( فتح الباري) ب(١) ل(٢٩–٣٧)، ب(١٢) ل(٤٤٠–٤٥٢).

## ﴿ گوڵبژێریك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: قورئانی پیرۆز بە دوو قۆناغ بۆ پێغەمبەرﷺ هاتۆتە خوارەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ذاكَ يَوْمٌ وُلِدْتُ فِيهِ وَيَوْمٌ بُعِثْتُ –أَوْ أُنْزِلَ عَلَيَّ– فِيهِ﴾ لە ڕۆژی دووشەممەدا لە دایك بووم و هەم لە دووشەممەشدا کرامە پێغەمبەر و قورئانم بۆ هات.**

**قۆناغی یەکەم:** لە ( اَللَّوْحُ الْمَحْفُوظ)ەوە بە تێکڕایی هێنراوەتە ئاسمانی دونیا، لەوێ لە (بَيْتُ الْعِزَّة) داندراوە، ئەم قۆناغە لە (لَيْلَةُالْقَدْر)دا بوو، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾القدر: ١، ئێمە لە (لَيْلَةُالْقَدْر)دا قورئانمان ناردۆتە خوارەوە. ﴿عَنْ ابن عَبّاس رضیالله عنهما: فُصِلَ الْقُرْآنُ مِنَ الذِّكْرِ فَوُضِعَ فِي بَيْتِ الْعِزَّةِ مِنَ السَّماءِ الدُّنْيا فَجَعَلَ جبْرِيلُ يَنْزِلُ بِهِ عَلَى النَّبِيِّﷺ﴾ إسناده صحيح أخرجه الحاكم، وعنه من وجه آخر: ﴿أُنْزِلَ الْقُرْآنُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ إِلَى سَماءِ الدُّنْيا جُمْلَةً واحِدَةً ثُمَّ أُنْزِلَ نُجُوماً﴾ إسناده لا بأس به أخرجه الطبراني، (ابن عَبّاس)-رضیالله عنهما- فەرموویەتی: **لە (لَيْلَةُالْقَدْر)دا قورئان لە (اَللَّوْح الْمَحْفُوظ) جیا کراوەو بە تێکڕایی هێندرا ئاسمانی دونیاو لە (بَيْتُ الْعِزَّة) داندرا، ئینجا (جُبْرائيل)ﷺ لەوێوە بەش بەش بۆ پێغەمبەریﷺ ئەهێنا خوارەوە.**

(تفسيرالقرطبي) سورة القدر (١) و(الاتقان) ب(١) ل(٣٩و٤٠).

**قۆناغی دووەم:** لە ڕۆژی دووشەممە (١٧) حەڤدەی مانگی ڕەمەزان بەرامبەر (١) یەکی (شُباط)ی ساڵی (٦١٠) شەشسەدو دەی زایینی–کە تەمەنی پێغەمبەرﷺ بووە (٤٠) ساڵ– هاتنە خوارەوەی قورئان بۆ پێغەمبەرﷺ دەستی پێکردو بووە پێغەمبەرﷺ، هەروەك لەم باسەدا ڕونمان کردەوە، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْـزِلَ فِيهِ الْقُـرْآنُ﴾ البقرة: ١٨٥، **مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە.**

**جا بزانە:** لەم قۆناغەیدووەمدا بە بیستو سێ ساڵان هەموو قورئان–بۆ پێغەمبەرﷺ– هاتە خوارەوە، یەکەم جار سەرەتاکەی سورەتی ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ تا ﴿عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾، حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه السلام بۆ پێغەمبەریﷺ هێنا خوارەوە، ئینجا ئایەت ئایەتو سورەت سورەت بەگوێرەی ڕووداو و پێویست حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه السلام بۆ پێغەمبەریﷺ ئەهێنا خوارەوەو شوێنی ئایەتەکانو سورەتەکانی بۆ دیاری ئەکرد: بەو ڕیزەی لە (اللَّوْح الْمَحْفُوظ)دایە، جا ئاخیر سورەت–کە هاتۆتە خوارەوە–﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللهِ وَالْفَتْحُ﴾ بوو، وە ئاخیر ئایەت: ﴿وَاتَّقُوا يَوْماً تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللهِ﴾ البقرة: ٢٨١ بوو، ژمارەی سورەتاکانی قورئان: (١١٤) سەدو چواردە سورەتن، ژمارە ئایەتەکانیش: (٦٦١٦) ئایەتن، هەروەك (ابن عَبّاس)-رضي الله عنهما- فەرموویەتی. (الإتقان) ب(١) ل(٢٣و٢٧و٦٤و٦٧)

**دووەم: ئایینی ئیسلام ئایینی خوێندنو زانستو پێنووسە، یەکەم جار پێنج ئایەتەکەی سەرەتای سورەتی(إقْرَأْ) بۆ پێغەمبەرﷺ هاتنە خوارەوە.** ڕاڤەی پێنج ئایەتەکان:

﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ **بخوێنەوە بە ناوی خوایخۆت، ئەو خوایەی بوونەوەری دروست کردوە** ﴿خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَـقٍ﴾ **خوا ئادەمیزادی لە کرمێکی وەك زیڕوو دروست کردوە**–ئەم کرمە لە ناو (مَنِي)ی پیاودایەو بە ئامێری (وردبین) دەدیترێ، هەم (عَلَق) بە خوێنی پەیتیش دەگوترێ، سەرەتای دروستبوونی ئادەمیزاد ئەو دوو واتەیە بە خۆیەوە دەبینێ– ﴿اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ﴾ **بخوێنە، خوای تۆ ئەو خودا ڕێزدارترەیە: کە** ﴿الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ﴾ **بە پێنووس ئادەمیزادی فێرە زانست کردوە** ﴿عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَـمْ يَعْلَمْ﴾ **ئادەمیزادی فێرە ئەو زانستە کردوە کە نەیزانیبوو.**

باش بیر بکەوە بەم پێنج ئایەتە پیرۆزانە پێغەمبەرایەتی (مُحَمَّد)ﷺ دەستی پێکرد؟ تاکو بزانین ئایینیئیسلام ئایینی خوێندنو زانستو پێنووسە، ئاینێکە ڕێزی لە مرۆڤ ناوە، ما شاء الله، هاتنی ئەم سورەتە چەند ڕووداوێکی گەورەیەو چ ڕەحمەتێکەو چ نیعمەتێکە خوایگەورە بۆ بەندەکانیخۆی ناردویەتی! چ هاندانێکە بۆ خزمەتی خوێندنو زانستو پێنووس! خوایگەورە بە هۆی زانست ڕێزی لە ئادەمیزاد ناوەو هەر بە هۆی زانستیش ڕێزی باب (آدَم)یعليه السلام لە ناو(مَلائِكَة)دا ئاشکرا کرد.

بۆیێ ئیمام (ابن حجر العسقلاني) فەرموویەتی: لەم پێنج ئایەتانەدا مەبەستەکانی قورئـان کۆ کراونەوەو شیاوی ئەوەنە ببنە سەردێڕی قورئان؟ چـونکە زانـستەکانی یەکخواناسـین و گێڕانەوەی ڕووداو و بڕیارەکانی شەریعەتی تێدایە: وەك فەرمان بە خوێندن و دەستپێکردنی خوێندن بە (بِسْمِ اللهِ).

ئیمامی(الحلبي)ش دەگێڕێتەوە: موناسـەبەی نێـوان دروسـتکردنی ئـادەمیزاد لـە (عَلَـق)= کرمی زێروو لەگەڵ فێرە زانستکردنی، ئەوەیە: نزمترین پلەی ئادەمیزاد حاڵەتی (عَلَقَة)یە، واتە: کرمی ناو (مَني)ی پیاو، بەرزترین حاڵەتیـشی ئـەو حاڵەتەیـە: کـە دەبێتـە زانـا، جـا خوایگەورە منەت لە سەر ئادەمیزاد دەکا: کە لـە نـزمترین حاڵـەت بـەرزی دەکاتـەوە بـۆ بەرزترین حاڵەت. (فتح الباري) ب(٨) ل(٩١٨) و(السيرة الحلبية) ب(١) ل(٣٤٥).

**سێیەم: سەرەتـای دەسپێکردنی (وَحْي) بۆ پێغەمبەرﷺ خەونی ڕاست بوو**، بۆیێ سەرەتای (وَحْي) بۆ پێغەمبەرﷺ بە خەون دەستی پێکرا، تاکو ببێتە ڕێخۆشکردنێك بۆ (وَحْيٍ)ی هەشـیاری، نـەوەك لـە ناکـاو حـەزرەتی(جُبْرائِيـل)عليه السلام بێتـە لای و پێغەمبەرایـەتی پێڕابگەێنی؟ چونکە هێزی ئادەمیزادی بەڕووەستی ئەم جۆرە ناکاویە ناکا، واتـە: چـونکە قورئانی پیرۆز هیچی لە خەوندا نەهاتووە، کەوابوو: ئەم خەون دیتنـەی پێغەمبـەرﷺ بـۆ لێڕاهاتنی وەرگرتنی (وَحْي)ی هەشیاری بوو، وەك پێشینیەکانیتر–کە لە چەند حەدیـسێکدا هاتون–: وەك سەلامکردنی بەردو درەختو دیتنی ڕۆناکیو بیستنی دەنگی (مَلائِکَة). (شـرح صحيح مسلم) ب(١) ل(٣٩) و(فتح الباري) ب(١) ل(٣٠).

**جا بزانە**: ماوەی ئەم جۆرە خەونانە شەش مانگ بوو، بۆیێ پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (اَلرُّؤْيا الْحَسَنَةُ مِنَ الرَّجُلِ الصَّالِحِ جُزْؤٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءً مِنَ النُّبُوَّةِ) رواه البخاري، **خەونی ڕاسـت کـە پیـاوی چاك لـە خـەودا دەیبینـێ، بەشـێکە لـە چلو شـەش بـەش لـە پێغەمبەرایـەتی**. واتە: چونکە (وَحْـيٍ) هەشـیاری مـاوەی (٢٣) بیـستو سـێ سـاڵ بـوو، (وَحْيٍ) خەونیش شەش مانگ بوو، شەش مانگیش نیوی ساڵێکە، بیستو سـێ سـاڵەکەش چلو شەش نیوەی تێدایە، کەواتە شەش مانگی خەونەکە بەشێکی چلو شەش مانگەکەی هەشیاریەکەیە. (فتح الباري) ل(١٢) ل(٤٥٦).

**چوارەم: (تَصَوُّف)ی ڕاستەقینە لە چی وەرگیراوە؟** ﴿فَکانَﷺ يَخْلُو بِغارِ حِراءِ﴾رواه البخاری، **پێغەمبەرﷺ بە تەنهایی لە ئەشکەوتی (حِراء)دا دەمـاوەو خواپەرستیی دەکـرد.** ئەمەش لە لایەن خواوە ئامادەکردنێکیتری پێغەمبەرﷺ بوو بۆ وەرگرتنی (وَحْي)، تـاکو یادو بیرکردنەوەکانی دونیای لە دڵدا نەمێنێو دڵەکەی ببێتە بارەگای زانستەکانی خودایی، چونکە دورکەوتنەوە–تا ماوەیەك–لـە خـەڵکو خواپەرسـتنی بـە تـەنهایی بـە تایبـەتی لـە شەوێدا، هەم بیرکردنەوەی حاڵەتی تەنهایی لە گەورەییخواو لە دروستکراوی‌خوا، گشتی

دەبێتە هۆی ڕۆشنکردنەوەی دڵو دەروونی مـرۆڤ و نزیکبوونـەوەی لـە خوایگـەورە، هـەر بۆیێش خوایگەورە چل ڕۆژی ماوەی (مُناجاة)ی بۆ حەزرەتی(مُوسى) پێغەمبەرﷺ دانا، هەم پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ (إعْتِكاف)ی ناو مزگەوتی بە سوننەت داناوە.

ئەوەش وا دەگەیەنێ: ئەو کەسـانەی بانگـەوازی ئیـسلام دەکـەنو بـە ڕاگەیانـدنی ئـایینی ئیـسلامەوە خـەریکن، لـە هـەموو کەسـێك زیـاتر پێویـستییان بـە بەخۆداچـوونەوە هەیـە، ئەمەش بەوە دەست دەکەوێ: جار جارە لە خەڵك دور بکەوێتەوەو لە مزگەوتو لە شوێنی چۆڵو تەنهادا خواپەرستی بکاو بیر لە گەورەیی خواو دروستکراوی خـوا بکاتـەوە، بـەڵێ: مرۆڤ—لە بەر ئەوەی مرۆڤە—مەترسی چەند نەخۆشیەکی پیـسی لێـدەکرێ: وەك دەعیـەو لەخۆڕازیبوونو حەسودیو خۆ بە چاك زانینو ئاشکراکردنی خواپەرەستیو خۆشویستنی دونیاو بڵاوبوونەوەی ناوبانگو ئاماژە بۆ کردن، ئەوانە گشتی نەخۆشی دەروونیی ترسناکنو زیاتریش توشی ئەو کەسانە دەبن کە بە کاروباری ئیسلامەوە خەریکن.

بۆیـێ پێـشینەکان بـۆ ڕێگـرتن لـەو نەخۆشـیانەو بـۆ نزیکبوونـەوەیان لـە خـوا، شـوێن پێغەمبەرﷺ دەکەوتنو جار جارە لە خەڵکی دور دکەوتنەوەو لە شوێنی چۆڵو تەنهاییـدا بە تایبەتی لە شەوێدا خواپەرستییان دەکردو بە زیکری خواو بە بیرکردنەوە: لـە گـەورەیی خواو لە دروستکراویخوا خەریك دەبـون، تـا دڵیـان وەکـو ئاوێنـەی ڕونـاك ڕۆشـن دەبـۆوەو هـەنگاو هـەنگاو بـەرەو دۆسـتایەتیخوا دەڕۆیـشتن، جـا کـە دڵیـان ڕۆشـن دەبـۆوەو دور دەکەوتنـەوە لـەو نەخۆشـیانەیڕابردوو، خۆیـان تێکـەڵی پیـاوانی دونیـاو دەسـەڵاتداران نـەدەکرد، نـەوەك خۆشویـستی دونیـاش ببێتـە دەردێکیـتر و ببێتـە کۆسـپێك لـە ڕێگـەی ڕاگەیاندنی ئایینیئیسلام، چونکە تێکەڵبوون لەگەڵ دەسـەڵاتدارانو پیـاوانی دونیـا، مرۆڤـی موسوڵمان توشی باوەڕی بێهێزو ورە دابەزینو ترسـەنۆکی دەکـاو نـاتوانی لـە ڕێگـای خـوا (جِهاد) بکاو قوربانی بدا، کەواتە: پێویستە موسـوڵمانی بێگـەرد: خـۆی یـەکلا بکاتـەوە بـۆ خوای گەورەو جگە لە خودا هەموو شتێك بە کەم بزانێـو لـە گەورەییـدا نەیگەینێتـە پلـەی خوایەتیو باوەڕی وا بێ: جگە لە خودا هیچ شتێکیتر سودبەخشو زیانبەخـشی ڕاسـتەقینە نیە.

بەڵێ: زۆر کەسمان دیتن لە ڕێگای بانگەوازیئیسلامدا ڕوخانو بە سـەر یەکدا کـەوتنو لـە ئەنجامدا بونە نۆکەری دەسەڵاتدارانو دوژمنانیئیسلام؟ بـە هـۆی تێکـەڵبوونی دونیـا، یـان یەکێك لەو نەخۆشیانەیڕابردوو، یان نزیکبوونەوە لە دەسەڵاتدارانی ستەمکار، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلدُّنْيا مَلْعُونَةٌ، مَلْعُونٌ ما فِيها إلاّ ذِكْرَ اللهِ-تَعالى- وَما والاهُ وَعالِماً وَمُتَعَلِّماً﴾ رواه الترمذي بسند حسن، **ئەم دونیایە دورە لە ڕەحمەتیخوا، ئەوەی لە دونیاشدایە دورە لە ڕەحمەتیخوا، تـەنها زیکریخـواو ئـەو کـارە نـەبێ: کـە خـوا پـێی خۆشـە، هـەم**

تەنها زانای ئایین‌و خوێندەواری ئایینی نەبێ.

بەڵێ: ئەوانەی ئاماژەمان بۆ کردن، بە خۆشویستنی دونیا خەریك بونو بە ڕێبازەکەی پێغەمبەرداﷺ نەڕۆیشتن‌و هیچ کاتێك بەو دەرمانەی پێغەمبەرﷺ دڵو دەروونی خۆیان دەرمان نەکرد، ئیمام (الحَسن البَصْري)-رحمه الله تعالى- فەرموویەتی: (حُبُّ الدُّنْيا رَأْسُ كُلِّ خَطِيئَةٍ) خۆشویستنی دونیا سەری هەموو تاوانێکە.

جا وا تێمەگە لێرەدا مەبەست ئەوەیە: بە یەکجاری واز لە دونیا بێنی‌و هیچ ماڵی دونیات نەوێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە: ماڵی باش بۆ پیاوی باش باشە، بەڵام مەبەست ئەوەیە ئاگادار بە: ئایینی‌خۆت بە قوربانی دونیا مەکەو لە نێوان ئایین‌و دونیادا تەرازووی شەرع بە ڕاستی ڕابگرە، هەروەك خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللهُ الدَّارَ الْآخِـرَةَ وَلَا تَنْسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِنْ كَمَا أَحْسَنَ اللهُ إِلَيْكَ﴾القصص: ٧٧، ئەو ماڵەی خوا داویەتیە تۆ لە کاروباری ڕۆژی قیامەتدا بە کاری بێنە، بەڵام بەشی خۆت لە حەڵاڵەکانی دونیا لە بیر مەکەو بۆ خۆت‌و خێزانت بەشێك سەرف بکە، چاکەش لەگەڵ خەڵکی بکە، هەروەك خوا چاکەی لەگەڵ تۆ کردوە.

کەواتە: ئەگەر ئایینەکەت‌و دونیایەکەت ڕووبەڕووی یەکتری بونەوەو شتێك بە سەر دڵتدا هات، بە تەرازووی شەرع بیکێشە: جا ئەگەر فەرمان پێکراو بوو-واجب، یان سوننەت- بەگوێرەی توانا بیکە، ئەگەر قەدەغەکراو بوو بە هیچ جۆرێك نەیکەی‌و دونیایەکەت بە قوربانی ئایینەکەت بکە، جا ئەگەر ئەوها بەم تەرازووەی شەرع کار بکەی، ئەو کاتە خوا خۆشی دەوێی‌و دەتکاتە دۆستی خۆی، هەروەك ئیمام (أَبُوبَكْر)و ئیمام (عُثْمان)و (صَحابَة) دەوڵەمەندەکانی‌تریشرضي الله عنهم اجمعين- ئەوها ڕەفتاریان دەکرد.

جا ئەم جۆرە ڕەفتارانەی لەم چوارەمەدا ڕوونمان کردنەوە، لە لای زانایانی‌ئیسلام پێی دەگوترێ: (عِلْمُ التَّصَوُّف)، یان (عِلْمُ السُّلُوك). ئیمامی(النَّواوِي) فەرموویەتی: بنچینەکانی ڕێگای (تَصَوُّف) پێنجن: ترسان لە خوا لە پەنهانی‌و لە ئاشکرایی‌دا. شوێنکەوتنی ڕێبازی پێغەمبەرﷺ لە گوفتارو لە کرداردا. وازهێنان لە خەڵك لە ڕووتێکردن‌و لە پشتتێکردندا. ڕازی‌بوون لە خوا لە کەم‌و لە زۆردا. گەڕانەوە بۆ لای خوا لە خۆشی‌و لە ناخۆشی‌دا. (المقاصد للإمام النواوي) ل(٢٠) و(شرح جمع الجوامع مع حاشية البناني) ب(٢) ل(٤٤٩-٤٥١) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٧٤) و(سيرةالصلابي) ب(١) ل(١٠٠).

**پێنجەم: لە ئەشکەوتی (حِراء)دا حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه السلام بۆ یەکەم جار (وَحْيِ) هەشیاری بۆ پێغەمبەرﷺ هێنا: کە سەرەتای سورەتی (إقْرَأ) بوو.**

**پێشەکی بزانە:** ئەشکەوتی (حِراء) دەکەوێتە ناو کێوی (نُور) لە لای سەرەوەی (مَكّة). جا حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه السلام بە فەرمانی خوای‌گەورە (وَحْي) بۆ پێغەمبەرﷺ دێنێ، بۆیێ

خوایگەورە فەرمانی پێکردوە بە پێغەمبەرﷺ بڵێ: ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلاّ بِأَمْرِ رَبِّكَ﴾ مريم: ٦٤، **ئێمە دانابەزینە خوارەوە تەنها بە ئیزنی خوای تۆ نەبێ.**

حەزرەتی(جُبْرائیل)-عليه السلام- (٢٤٠٠٠) بیستو چوار هەزار جار هاتۆتە لای پێغەمبەرﷺ، بۆ لای هیچ پێغەمبەرێك ئەوەندە جارە نەهاتووە. (ارشاد الساری لشرح صحیح البخاری) ب(١) ل(٦٠).

جا لەو هەموو جارانەش پێغەمبەرﷺ تەنها دوو جاران حەزرەتی(جُبْرائیل)یعليه السلام لە وێنەی فریشتەییدا دیتووە: یەكەمیان: لە زەمیندا، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَآهُ بِالأُفُقِ الْمُبِينِ﴾ التكوير: ٢٣، **پێغەمبەرﷺ (جُبْرائیل)ی لە وێنەی فریشتەییدا دیتووە لە بناری لای ڕۆژهەلاّت،** واتە: دیتی شەشسەد باڵی هەبوو. دووەمیان: لە ئاسمانی حەفتەمدا، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى * عِنْدَ سِدْرَةِالْمُنْتَهَى﴾النجم: ١٣و١٤، **جارێكیتریش پێغەمبەرﷺ (جُبْرائیل)ی لە وێنەی فریشتەییدا دیتووە لە لای (سِدْرَةُالْمُنْتَهی).** ( فتح الباري) ب(١) ل(٣٢) و(السيرةالحلبية) ب(١) ل(٣٦٨).

**شەشەم: (وَرَقَـة) بـە پێغەمبـەریﷺ گـوت: خۆزگـەم لـەو كاتـەی بانگـەوازی ئیـسلام دەكەیو لە (مَكَّة) دەرتدەكەن، من گە نجێكی بـەهێز بـوام تـاكو یارمـەتیم دابـای...تـا كۆتـایی.**

ئەمەش بەڵگەیە: كە دورکەوتنەوە لە وڵات، ناخۆشیەكی بەهێزە—هەروەك لە باسی كۆچكردنی پێغەمبەرداﷺ ڕوونی دەكەینەوە، إن شاءالله تعالى— هەم وەدرنـانی پێغەمبـەران-صلى الله عليهم اجمعين- لـە هەموو كاتێكدا هەبووە، هەم بەڵگەیە: كە (وَرَقَة) زۆر زانایەكی بەهێز بووەو هەم باوەڕیشی بە پێغەمبەرﷺ هەبووە، هەروەك (ابن كثير) فەرموویەتی ﴿عَن جابرﷺ: سُئِلَ النَّبيُّﷺ عَنْ وَرَقَةَ بن نَوْفَلٍ؟ فَقالﷺ: قَدْ رَأَيْتُهُ، فَرَأَيْتُ عَلَيْهِ ثِيابَ بَياضٍ أَبْصَرْتُهُ فِي بُطْنـانِ الْجَنَّـةِ وَعَلَيْهِ السُّنْدُسُ﴾ رواه أبويعلى وإسناده حسن، **لەبارەی (وَرَقَة) پرسیار لە پێغەمبەرﷺ كرا؟ پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: (وَرَقَة)م بینی جلی سپیی لەبەردا بوو، بە چاوی خۆم دیتم لە ناوەندی بەهەشتدا ئاوریشمی تەنكی لە سەر جلەكان لەبەردا بوو.** (البداية والنهاية) ب(٢) ل(١١و١٢).

**پرسیار:** لێرەدا دەركەوت كە (وَرَقَة) ئیماندار بووەو باوەڕی بە تاكو تەنیایی خوا هەبووەو هاوبەشی بۆ خوا دانەناوە، ئەدی بۆچی كافركانی (قُرَيْش) دژایەتی ئەویان نەدەكرد؟

**وەڵام:** خواناسینو خواپەرستنی (وَرَقَة) لە سەر خۆی دەوەستاو بانگەوازی بۆ نەدەكرد، چونكە ئەو پێغەمبەر نەبو، بەڵام پێغەمبەرﷺ بانگەوازی دەكرد، بانگەوازیەكەشی دژی (عَقیـدَة)و (شَـرِيعَة)ی (قُـرَيْش) بـوو و خوایـەكانی ئـەوانی بـە پوچـەڵ دادەنـاو پـێی ڕادەگەیاندن: كـە ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاّ تَعْبُدُوا إِلاّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَـيِّمُ﴾: يوسـف:٤٠، **بڕیاردان تەنها مافی خودایە، خودا فەرمانی داوە: جگە لەوی هیچیتر نەپەرستن،**

ئەمە ئایینی ڕاستەقینەیە.
بەڵێ: ئەم بانگەوازیەی پێغەمبەرﷺ هەموو دیاردەیەکی کۆمەڵگەی دەگۆڕیو (قُـرَیْش)ش بــەو گۆڕانکاریـیە ڕازی نــەبون، بــۆیێ زۆر بــە تونـدی بەرهەڵـستی بانگەوازیەکــەی پێغەمبەریانﷺ دەکرد، جا (طـاغُوت)و گرۆهـە (عَلمانیـة)کـانی ئـەم سـەردەمەش هـەمان ڕەفتار بە کار دێنن: ڕازی دەبن مرۆڤ خواپەرستنێکی وەکو (وَرَقَـة) بکـا، بـەڵام ڕازی نـابن بانگـەوازی بـۆ (حُکْـم)و (شَـرْع)ی خـوا بکـرێ، جـا ئـەم وەڵامـە لـە وەڵامەکـەی (وَرَقَـة) وەردەگیرێ، کـە گـوتی: ﴿لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ إِلاّ عُودِيَ﴾ رواەالـشیخان، **هـەر پیاوێك ئەو جۆرە بەرنامەی تۆ بێنێ، دوژمانیەتی هەر دەکرێ.**

**حەفتـەم: چـەند ڕۆژێکـیش هــاتنی (وَحْـي) وەسـتێندرا**، ئـەم وەسـتاندنەش هــەر لــە پێشەکیەکانی بناغەدانانی پێغەمبەرایەتی بوو، تـاکو پێغەمبـەرﷺ لێڕابـێو بـەرە بـەرە بچێتە ناو پێغەمبەرایەتیو ئەو ترسەی دیتبوی لە دڵیدا نەمێنێو بەخۆی دڵی بێتەوە سەر هاتنی (وَحْي)، بەڵێ: پێغەمبەرﷺ بە شێوەیەکی وەها دڵی هاتەوە سـەر (وَحْـي): تـا بـە هۆی وەستانی (وَحْي) غەمبار دەبو و دەیویست خـۆی لـە بـەرزایی چـیایەکان فـڕێ بداتـە خوارەوە، چونکە تا ئێستاش لە لای خوداوە پێ نەگوترابوو: تـۆ پێغەمبـەریخوای، بـەڵام کە لە حاڵەتی ئەم غەمباریەدا بە فەرمانیخوا حەزرەتی(جُبْرائیل)ﷺ هاتو پـێی گـوت: ﴿يا مُحَمَّد إِنَّــكَ رَسُــولُ اللهِ حَقّــاً﴾ رواە البخاري، **هـۆ (مُحَمَّد) تـۆ پێغەمبـەریخوای بـە بێگومانی**. بەم فەرموودەیە دڵی چاك بۆوەو بەرە بەرە بۆ وەرگرتنی (وَحْي) دڵی بەرفراوان دەبوو. ناوەڕۆکەی وەرگیراوە لە ( فتح الباري) ب(١٢) ل(٤٥١).

**جا بزانە**: (وَحْي) بە چەند جۆرێك بـۆ پێغەمبـەران-علیهم الصلاة والسلام- دەهـات: **یەکـەم**: خـەون دیــتن. **دووەم**: (الإِلْهــام)=خــستنە نــاودڵ. **ســێیەم**: وەك زرینگــەی زنگــوڵ. **چـوارەم**: حەزرەتی(جُبْرائیل)ﷺ خۆی دەهێنا سەر وێنەی پیاوێك وەك حەدیسەکەی ئیمانو ئیسلامو ئیحسان. **پێنجـەم**: خوایگـەورە ڕووبـەڕوو (وَحْـي) بداتـە پێغەمبـەرﷺ، هـەروەك ڕووبـەڕوو قسەی لەگەڵ حەزرەتی(موسی)ﷺ کردو لە شەوی (معـراج)دا قـسەی لەگـەڵ پێغەمبـەرﷺ کرد. **شەشەم**: حەزرەتی(جُبْرائیل)ﷺ لە وێنەی فریـشتەییدا بـێ، ئەمـەش تـەنها دوو جـار پێغەمبەرﷺ دیتویەتی، هەروەك لە پێنجەمەکەدا ڕابرا. (السیرة الحلبیة) ب(١) ل(٣٦٦-٣٦٩).

***        ***        ***

## ﴿ دەستپێکردنی بانگەوازی ئیسلامو موسوڵمانبوونی خەڵك ﴾

**پێشەکی بزانە**: بانگەوازی ئیـسلام لـە سـەردەمی پێغەمبـەرداﷺ بـە چوار قۆناغـدا تێپەڕیوە:

**یەکەم**: بانگەوازی نهێنی بە بێجەنگ، ئـەم قۆناغـە لـە دوای هـاتنی (وَحـي) دەسـتی

پێکرد بە هاتنی سەرەتای سورەتی ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ * قُمْ فَأَنْذِرْ﴾ ئەی ئەو پێغەمبەرەی خۆت داپۆشیوە، هەڵسە خەڵك بترسێنە لە عەزابیخوا. جا ئەم قۆناغە سێ ساڵان بەردەوام بوو.

**دووەم:** بانگەوازی ئاشکرا بە بێجەنگ، ئەم قۆناغە لە دوای تەواوبوونی سێ ساڵەکەیڕابردوو دەستی پێکرد، بە ئایەتی ﴿فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ﴾ الحجر: ٩٤، ئاشکرا بکە ئەو بانگەوازیەی فەرمانت پێکراوە. ئەم قۆناغەش تا کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ بەردەوام بوو، جا ئەم دوو قۆناغانە بە قۆناغی (مَکّي) ناو دەبرێنو قۆناغی بانگەوازیو خۆڕاگری بون.

**سێیەم:** بانگەوازی ئاشکرا شان بەشانی جەنگکردن لە گەڵ ئەو کەسانەی جەنگ لە دژی موسوڵمان دەکەن، ئەم قۆناغە لە دوای کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ دەستی پێکرد بە هاتنی ئایەتی ﴿وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ﴾البقره: ١٩٠، لە ڕێگایخوا جەنگ لەگەڵ ئەوکەسانە بکەن کە جەنگتان لەگەڵ دەکەن. ئەم قۆناغە تا ڕزگارکردنی (مَکّة) بەردەوام بوو.

**چوارەم:** دوا قۆناغ: کە بانگەوازی ئاشکرایە شان بەشانی جەنگکردن لە گەڵ گشت ئەو کەسانەی باوەڕیان بە ئیسلام نیە، یان دەبنە کۆسپ لە ڕێی بانگەوازی ئیسلام، ئەم قۆناغە لە دوای ڕزگارکردنی (مَکّة) دەستی پێکرد بە هاتنی (آيَة السَّيف)= ئایەتی شمشێر، کە ئەم ئایەتەیە: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً﴾ التوبة: ٣٦، جەنگ لەگەڵ کافرەکان بکەن بە گشتی. یان ئەم ئایەتە: ﴿انْفِرُوا خِفَافاً وَثِقَالاً وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللهِ﴾ التوبة: ٤١، ڕاپەڕن بە سوکیو بە گرانی، (جهاد) بکەن بە ماڵتانو بە گیانتان لە ڕێگایخوا. جا لە سەر ئەم قۆناغەیچوارەم، بڕیاریخوا جێگیر بوو، تا دونیا وێران دەبێ بە بڕیاری هیچ کەسێك بڕیارەکەیخوا هەڵناوەشێتەوە. (تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٩) ل(٢١٢) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٩١).

## ﴿ بانگەوازی نهێنی ﴾

گوتمان: لە دوای وەستاندنی (وَحي) چەند ڕۆژێك، هاتنی (وَحي) دەستی پێکراوەو ئەم پێنج ئایەتانەی سەرەتای سورەتی (اَلمُدَثِر) بۆ پێغەمبەرﷺ هاتنە خوارەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ* قُمْ فَأَنْذِرْ * وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ * وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ * وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ﴾ ئەی ئەو پێغەمبەرەی خۆت بە جلەکەت پۆشیوە، هەڵسە خەڵك بترسێنە لە عەزابیخوا ئەگەر ئیمان نەهێنن، تەنها خوایخۆت بە گەورەو ڕێزدار دابنێ، جلەکانت پاك بکەوەو دڵەکەت بێ تاوان ڕابگرە، بتو سەنەمیش تێهەڵدەو نزیکیان مەکەوە.

ئینجا پێغەمبەرﷺ لە سەر فەرمانیخوا بە ڕێگای بانگەوازیدا ڕۆیشتو بە نهێنی

خەڵكی بۆ ئیسلامەتی بانگ دەكرد، چونكە خوایگەورە ئەوها (إِلْهامِ)ی كردبوو، واتە: خستبویە ناو دڵی پێغەمبەرﷺ: كە ئەم قۆناغەی بە نهێنی بێ‌و ئاشكرای نەكا، بۆیێ پێغەمبەرﷺ داوای موسوڵمانبوونی تەنها لەو كەسانە دەكرد، كە دەیناسین‌و پەیوەندیی لە گەڵیان هەبوو، جا یەكەمین كەس كە بووە موسوڵمان حەزرەتی(خَدِیجَة)ی ژنی پێغەمبەرﷺ بوو رضی الله عنها.

## ﴿ واجببوونی نوێژ و دەستنوێژ ﴾

ئینجا حەزرەتی(جِبْرائِیل)عليه السلام هاتە لای پێغەمبەرﷺ–لەو كاتەی نوێژ واجب بوو– لە سەرەوەی (مَكَّة) لە لای گەڵیەكە پاشنە پێی خۆی لە زەمین دا، یەكسەر سەرچاوەیەكی ئاوی (زَمزَم)ی لێهەڵقوڵا، ئینجا حەزرەتی(جِبْرائِیل)وعليه السلام پێغەمبەرﷺ دەستنوێژیان گرت، ئینجا دوو ڕەكعەت نوێژێكی چوار سوجدەییان كرد.

ئینجا پێغەمبەرﷺ گەڕاوە ماڵەوەو بەو نوێژە زۆر دڵی خۆش بوو، جا دەستی حەزرەتی (خَدِیجَة)ی–رضی الله عنها– گرت‌و لەگەڵ خۆیا بردیە لای سەرچاوەكە، جا بە هەمان شێوەی حەزرەتی(جِبْرائِیل)عليه السلام دەستنوێژی گرت‌و نوێژێكی دوو ڕەكعەتی چوار سوجدەیی كرد، جا لە مەودوا پێغەمبەروﷺ حەزرەتی(خَدِیجَة)–رضی الله عنها– بە نهێنی نوێژەكەیان دەكرد.

جا بزانە: ئەم نوێژە لە سەرەتای ئیسلامدا دوو ڕەكعەت سبەینان پێش ڕۆژ هەڵاتن‌و دوو ڕەكعەت ئێواران پێش ڕۆژ ئاوابوون واجب كرا، تا (نَسخ) بۆوە بەو پێنج نوێژانەی لە شەوی (مِعْراج)دا لە سەر پێغەمبەروﷺ ئوممەتی واجب كران.

ئینجا لە دوای حەزرەتی(خَدِیجَة)ش ئیمام(علی بن أبی طالب) لە تەمەنی هەشت، یان دە ساڵیدا موسوڵمان بوو، ئینجا حەزرەتی(زَیْد بن حارثة)، ئینجا ئیمام (أبُوبَكْر)رضي الله عنهم اجمعین.

جا بەرە بەرە ئافرەت‌و پیاو دەبونە موسوڵمان: وەك كیژەكانی پێغەمبەروﷺ (أمّ أیمن)و (أمّ الفَضل)=ژنی ئیمام (العَبّاس)و (أسماء)ی كیژی ئیمام (أبُوبَكْر)و (فاطِمَة بنت الخَطّاب)=خوشكی ئیمام (عمر)و (عبدالله بن مَسْعُود)و (عَمّار)و (یاسِر)ی باوكی‌و (سُمَیَّة)ی دایكی‌و (صُهَیب الرُّومي) (بلال الحَبَشِي)و (المِقْداد)و (أبو ذَرّالغِفاري)و (الأرْقَم بن أبیالأرْقَم)رضي الله عنهم اجمعین.

هەم لە سەر دەستی ئیمام (أبُوبَكْر)رضي الله عنه ئەم پێنج پیاوانەش بونە موسوڵمان: ئیمام (عُثمان بن عَفّان)و حەزرەتی(الزُّبَیْر بن العَوّام)و حەزرەت(طَلحَة بن عُبَیْدِالله)و حەزرەتی(سَعْد بن أبی وَقّاص)و حەزرەتی(عَبْدالرحمن بن عَوف)رضي الله عنهم اجمعین، ئیتر كۆمەڵ كۆمەڵ خەڵك موسوڵمان دەبون‌و ئیسلامەتی لە (مَكَّة)دا بڵاو بۆوە، تا ژمارەی موسوڵمانەكان گەیشتە نزیكەی چل كەس لە پیاو و ئافرەت.

جا (صَحابَة)کانی پێغەمبەرﷺ بۆ نوێژکردن دەچوونە گەڵیەکانی (مَکَّة)و بە نهێنی لەوێ نوێژیان دەکرد، تا ڕۆژێك (سَعد بن أبیوقاص)ﷺ لەگەڵ کۆمەڵە موسوڵمانێك لە گەڵیەکەدا نوێژیان دەکرد لە ناکاو کافرەکان ئەوانیان بینیو ڕەخنەیان لێگرتنو بووە پێکدادان لە نێوانیاندا، ئیتر حەزرەتی(سَعد)ﷺ شەوێلە وشترێکی بۆ کافرێك هاویشتو سەری بریندار کرد، جا (ئەمە یەکەم خوێن بوو لە ئیسلامدا ڕژێندرا).

ئینجا لە دوای ئەم ڕووداوە، پێغەمبەرﷺ خانووەکەی حەزرەتی(الأرقم بن أبیالأرقم)ی تەرخان کرد بۆ کۆبوونەوەو بەیەکگەیشتنی موسوڵمانو بۆ نوێژکردنو فێربوونی قورئانو ڕەوشتەکانی ئیسلام، تا خوایگەورە فەرمانی پێکرد: بانگەوازی ئاشکرا بکا.

جا بزانە: خانووەکەی حەزرەتی(الأرقم)ﷺ لە لای (صَفا) بوو، (أبوجَعفَرالمَنصُور) کڕییو لە ئەنجامدا بووە مڵکی (خَیزَران)ی دایکی (هارُون الرَّشید). (البداية والنهاية) ب(٢) (٢٧-٤٠) و(السيرة الحلبية) ب(١) ل(٣٨٠-٤٠٣).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: پێغەمبەرایەتی (مُحَمَّد)ﷺ بۆ هەموو دانیشتووانی سەر زەمینە: ئادەمیزاد و جنۆکە تا دونیا وێران دەبێ، قۆناغی بانگەوازیی نهێنی بە بێ‌جەنگ، دەستی پێکرد بە هاتنی سەرەتای سوڕەتی ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ * قُمْ فَأَنْذِرْ﴾ هۆ ئەو پێغەمبەرەی خۆت بە جلەکەت پۆشیوە، هەڵسە خەڵك بترسێنەلە عەزابی خوا.**

خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿تَبَارَكَ الَّذِى نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيراً﴾الفرقان:١، **پاكو بێ‌عەیبی بۆ ئەو خوایەی قورئانی ناردۆتە خوارەوە بۆ بەندەکەیخۆی-کە (مُحَمَّدُالْمُصْطَفَى)یەﷺ-تاکو ببێتە ترسێنەر بۆ هەموو خەڵك: جنۆکەو ئادەمیزاد.**

هەروەها خوایگەورە فەرمانی بە پێغەمبەرﷺ کرد: کە پێغەمبەرایەتیەکەی بە خەڵك بناسێنێ، دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً﴾ الأعراف: ١٥٨، **ئەی (مُحَمَّد) بەو خەڵکە بڵێ: هۆ خەڵکینە من پێغەمبەریخوامە بۆ ئێوەی دانیشتووانی سەر زەمین هەمووتان.** هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی ﴿...وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خاصَّةً وَأُرْسِلْتُ إِلَى الْخَلْقِ كافَّةً﴾ رواه الشيخان، **هەر پێغەمبەرێك بۆ گەلەکەیخۆی بە تایبەتی ئەنێردرا، منیش بە پێغەمبەرایەتی بۆ هەموو خەڵك-ئادەمیزادو جنۆکە- بە تێکڕایی نێردراوم تا دونیا وێران دەبێ.**

ئیمام (جلال الدين السيوطي) فەرموویەتی: (إجْماع) لە سەر ئەوە بەستراوە: کە پێغەمبەرﷺ بۆ هەموو ئادەمیزادو جنۆکە نێردراوە. (تفسير ابن كثير) الأعراف (١٥٨)و (الخصائص الكبرى) ب(٢) ل(١٨٨). هەم بڕوانە ڕوونکردنەوەی (العقيدة الطحاوية) ل(٢٥-٢٨) سودی لێوەردەگرێ.

بەڵکو پێغەمبەرﷺ بۆ پێغەمبەرەکانیڕابردوو و ئوممەتەکانیشیان نێردراوە–ئەگەر بگەنە سەردەمی وی– واجبە ئیمانی پێ بێن، هەروەك لە (ڕێخۆشکردنی) سەرەتادا ڕوونمان کردەوە، بۆیێ کە ئیمام (عُمر)ﷺ پارچەیەك (تَوْراة)ی بە دەستەوە بوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿وَالَّذِى نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ مُوسَىﷺ كانَ حَيّاً ما وَسِعَهُ إلاّ أَنْ يَتَّبِعَنى﴾ حَسن بكثرة طرقه رواه الإمام أحمد والطبراني والبزار، سوێندم بەو خوایەی گیانی منی بە دەستە: ئەگەر (مُوسى) پێغەمبەرﷺ زیندوو بوایە، هیچی پێنەدەکرا تەنها دەبوا شوێن من بکەوێ. (مجمع الزوائد ومنبع الفوائد) ب(١) ل(٢٣٥) و(السيرة الحلبية) ب(١) ل(٣٣٠). (عاجز) دەفەرموێ:

(نائِب)ی وی بون (مُرْسَلِين) هەر یەك بۆ قەومیٚ داوەرین
ئەمما ئەوی بۆ (عالَمِين) بە عام هەنارد (غَفّار)ی من



## ﴿ بڕیاری ئەو کەسەی ڕەفتار بە قورئان ناکا ﴾

خوایگەورە لە ئایەتەکەیڕابردوودا دەفەرموێ: ﴿نَزَّلَ الْفُرْقَانَ﴾ قورئانی ناردۆتە خوارەوە. ناوی لە قورئان ناوە (اَلْفُرْقان)، چونکە هەر بەم قورئانە حەق‌و ناحەق‌و حەڕام‌و حەلاڵ‌و کافرو موسوڵمان لێك دەکرێنەوە، هەروەك ئیمامی (القرطبي) لە تەفسیرەکەیدا فەرمویەتی.

بۆیێ خوایگەورە فەرمانی بە پێغەمبەرﷺ کردوەو دەفەرموێ: ﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللهُ إِلَيْكَ﴾ المائدة:٤٩، داد لە نێوان خەڵکدا بکە بە یاسای ئەو قورئانەی خوا ناردویەتیە خوارەوە، شوێن هەواو هەوەسەکانی ئەوان مەکەوەو لێیان بە ئاگا بە: نەوەك لە هەندێك یاسای ئەم قورئانە لاتبدەن کە خوا بۆ تۆی ناردۆتە خوارەوە.

بەڵێ: ﴿أَهْوَاءَهُمْ﴾ ئەو یاسا دەستکردانەنە: کە ئادەمیزاد دایانئەڕێژێ، کەوابوو: هەر کەسێك بە یاساکانی دەستکرد ڕەفتار بکاو واز لە قورئان بێنێ، ئەوە یان کافرە، یان زالم‌و فاسقە، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ المائده: ٤٤، ﴿عَنْ ابْن عَبّاس–رضى الله عنهما–فِى تَفْسِير هذِهِ الْآيَةِ: (مَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِما أَنْزَلَ اللهُ جاحِداً بِهِ فَقَدْ كَفَرَ، وَمَنْ أَقَرَّ بِهِ وَلَمْ يَحْكُمْ فَهُو ظالِمٌ فاسِقٌ)﴾ رواه‌ابن جرير، هەر کەسێك بەم قورئانە ڕەفتار نەکاو باوەڕیشی پێی نەبێ، ئەوە کافرە، وە هەر کەسێك باوەڕی پێی هەبێ‌و ڕەفتاری پێنەکا، ئەوە زالم‌و فاسقە. واتە: هەروەك لە دوو ئایەتەکەیتردا فەرموویەتی. (تفسير ابن كثير) المائده (٤٤).

**دووەم: گرنگی بانگەوازی نهێنی،** خوایگەورە (إِلْهام)ی پێغەمبەریﷺ کردبوو: کە لەم قۆناغەدا بە نهێنی خەڵك بانگ بکا بۆ ئیسلامەتی.

(**اَلإِلْهام**)=خستنە ناوڵ، جۆرێکی(وَحْي)یە، هەروەك لە شەش بەشەکەی(وَحْي)دا باسمان کرد.

جا بزانە: نهێنیی ئەم قۆناغە بە هۆی ترسانی پێغەمبەرﷺ نەبو کە بە خۆی شتێکی بە

سەر بێ، بەڵكو بۆ سەركەوتن‌و بەرەوپێشچوونی بانگەوازی بوو، چونكە پێغەمبەرﷺ بە ئایەتی ﴿قُمْ فَأَنْذِرْ﴾ فەرمانی بانگەوازیی پێكرا، بە بێگومانی دەیزانی: ئەو پێغەمبەری خوایەو هەر ئەو خوایەش توانای هەیە بیپارێزێ.

بەڵێ: بەرژەوەندی بانگەوازیی ئەم قۆناغە لەوەدا بوو: كە پێغەمبەرﷺ بە نهێنی پەیوەندی بەو كەسانەوە بكا، كە ئەیناسین‌و دڵی دەچوو ببنە موسوڵمان، نەوەك بانگەوازیەكە لە تەمەنی ساواییدا ڕووبەڕوی كۆسپ‌و ئاژاوەچیەكان ببێتەوەو بێهێز ببێ، یان بە یەكجاری لەناو بچێ، بۆیێ ئێستاش ئەگەر كات‌و شوێنەكە بۆ بانگەوازی ئاشكرایی نەگونجێ، پێویستە بانگەوازكارەكانی‌ئیسلام بە نهێنی‌و بە نەرمی بانگەوازیەكە بكەن تا بەهێز دەبن، نەوەك تووشی ئازارێكی بێسود ببن، یان هەر لەناو بچن.

كەوابوو: ئەگەر موسوڵمانەكان كەم بون، یان بێهێز بون‌و دەترسان لەناو ببردرێن، ئەو كاتە واجبە: گیانی‌خۆیان بپارێزن، چونكە ئەگەر شەهیدبوون سەركەوتنێكی‌ئیسلامی تێدا نەبێ‌و زیانێكی گەورەی دوژمنی تێدا نەبێ، ئەو كاتە هەڵاتن‌و خۆپاراستن واجب دەبێ، نەوەك بە لەناوچوونی موسوڵمانان دوژمن دڵخۆش ببێ‌و برینی دەرمان ببێ‌و موسوڵمانیش خەفەتبار ببن‌و هیچ بەرهەمێكیشی نەبێ، هەروەك ئیمام (العِزّ بن عبدالسَّلام) لە (قواعِدالأحكام)دا ئەوهای ڕوون كردۆوە.

بەڵام ئەگەر موسوڵمانان بەهێز بون‌و ترسی لەناوچوونیان نەبو، ئەو كاتە بانگەوازی ئاشكرایی واجب دەبێ‌و دروست نیە نەرمونیانی لەگەڵ ستەمكاران‌و دوژمنانی ئیسلام بە كار بهێندرێ، بەڵكو ئەگەر دەسەڵاتی تەواو هەبێ، ئەو كاتە واجبە: لە ناو وڵاتی كافرەكاندا بە گژ كافرەكاندا بچین.

جا بە نهێنی بێ، یان بە ئاشكرایی، یان بە چەكداری، ئەوە كاروانی (جهاد) هەر بەڕێوەیەو هەر بەردەوامە، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿اَلْجهادُ ماضٍ مُنْذُ بَعَثَنِی اللهُ تَعالی، إِلَى أَنْ یُقَاتِلَ آخِرُ هَذِهِ الْأُمَّةِ الدَّجَّالَ لا یُبْطِلُهُ جَوْرُ جائِرٍ وَلا عَدْلُ عَادِلٍ﴾ رواه أبوداود بسند صحیح، **(جِهاد) هەر واجب‌و بەردەوامە لەو ڕۆژەوە كە خوا منی ناردوە بە پێغەمبەرایەتی، تا ئەو ڕۆژەی كۆتایی ئەم ئوممەتە جەنگ لە دژی (دَجّال) دەكا، ستەمی هیچ ستەمكارێك‌و دادپەروەریی هیچ دادپەروەرێك بڕیاری واجبوونی (جِهاد) بەتاڵ ناكاتەوە.** بە دەستكاریەوە لە (فقه السیرة، للبوطي) ل(٩٣).

**سێیەم: گەورەیی‌و ڕێزداریی حەزرەتی (خَدیجَة)ی هاوسەری پێغەمبەرﷺ، یەكەمین كەس كە بووە موسوڵمان حەزرەتی(خَدیجَة)ی ژنی‌پێغەمبەرﷺ بوو** رضی‌الله عنها.

نازانم لەبارەی دایكە (خَدیجَة) رضی‌الله عنها ئەم گەورەو ڕێزدارە چی بنوسم؟! یەكەمین‌و گەورەترین هاوسەری پێغەمبەری ئاخیر زەمانەﷺ، یەكەم موسوڵمانی ئەم ئۆممەتەیە، چاكترینی ئافرەتانی ئەم ئۆممەتەیە، گەورەترینی ئافرەتانی بەهەشتە، لەگەڵ ئەوەشدا

**خوایگەورە ڕێزێکیتری لێناوەو دەفـەرموێ: ﴿وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَــاتُهُمْ﴾الأحزاب: ٦، ژنـەکانی پێغەمبەرﷺ دایکی ئیماندارانن.**

**بـەڵێ: دایکـە (خَدِیجَـة) لـە ڕووی گـەورەییو ڕێزدارییـەوە دایکـی ئێمـەی موسـوڵمانانە، لە نەژادیشەوە: دایکی هەموو منداڵەکانی پێغەمبەرەﷺ–جگە لە (إِبْراهِيم)–، واتە: دایکی (قاسِم)و (عبدالله)و (زَيْنَب)و (رُقَيَّة)و (أُمُّ كَلْثُوم)و (فاطِمَة الزَّهْراء)یـە، داپـیرەی (الْحَسَن)و (الْحُسَيْن)و خەسووی ئیمام (عُثْمـان)و ئیمـام (عَلِـی)یـە رضیالله عنهما، دایکـە (خَدِیجَـة) بـەردی بناغەی بنەماڵەی پێغەمبەرەﷺ.**

**جا هەروەك لە پێش ئیسلامدا دایکە (خَدِيجَة) رضيالله عنها، کابـانی مـاڵێ بـوو، لـە دوای هـاتنی ئیسلامیش سەرکەوتووترین کابانی ماڵێ بوو؟ چونکە لە سەرەتای ئیسلامدا جگە لە مـاڵی دایکە (خَدِيجَة) رضيالله عنها هیچ خێزانێکیتر تەواوی ئەندامەکانی موسـوڵمان نـەبوبون، بـەڵێ: ئیمام (علی)ش رضی الله عنه هەر ئەندامێکی ئەم خێزانـە ڕێـزدارە بـوو؟ چـونکە–بـە هـۆی هـەژاریی باوکی– لە ماڵی پێغەمبەرداﷺ بەخێو دەکرا، کەواتە: ماڵی دایکە (خَدِيجَة) رضيالله عنها، یەکـەم ماڵە لە ئیسلامدا نوێژی تێدا کرابێو قورئانی تێدا خوێندرابێ.**

**ئەی دایکە (خَدِيجَة)، تۆ گەورەیی دونیاو قیامەتت دەست کـەوت، پـیرۆزت بـێ، هـەم ئـەم موژدەیەشت پیرۆز بێ: کە حەزرەتی(جُبْرائِیـل)عليه السلام هاتـە لای پێغەمبـەرووﷺ فـەرمووی: ﴿یارَسُولَ الله هَذِهِ خَدِيجَةُ قَدْ أَتَتْ، مَعَها إناءٌ فِيهِ إِدامٌ أَوْ طَعامٌ أَوْ شَرابٌ، فَإِذا هِيَ أَتَتْكَ فَاقْرَأْ عَلَيْها السَّلامَ مِنْ رَبِّها وَمِنِّي، وَبَشِّرْها بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لا صَخَبَ فِيهِ وَلا نَــصَبَ﴾ رواه الشيخان، ئەی پێغەمبەریخوا، ئەمە (خَدِيجَة)یە هـات، قـاپێکی پێیـە: پێخۆرێـك، یـان خواردنێـك، یـان خواردنەوەیـەکی تێدایـە، جـا کـە هاتـە لای تـۆ پـێی بڵـێ: خوایگەورە سەلامی لێدەکا، منیش سەلامی لێدەکەم، موژدەشی بدێ: بە ماڵێك لـە بەهەشـتدا کـە لـە قامیـشی (لُؤْلُؤْ) دروسـت کـراوە، هـیچ گاڵـە گـاڵو مـشتومڕو ماندوویی تێدا نیە.**

**بەڵێ: دایکە (خَدِيجَة) رضيالله عنها شیاوی ئەم پاداشتەیە؟ چونکە لە هەموو تەمەنی هاوسەریدا تەنها جارێکیش شتێکی وەهای نەکرد پێغەمبەرﷺ تورە ببێ، بەڵکو سووڕ بـوو لـە سـەر ڕازیکردنـی پێغەمبـەرﷺ بـە هـەر ڕێگایـەکی گونجـاو، بـێ مـشتومڕو مانـدووکردنی پێغەمبـەرﷺ بـووە موسـوڵمان، بـەڵکو ئاسانکاریـشی بـۆ دەکـردو کۆسـپو تەگەرەشـی لـە ڕێی پێغەمبـەرﷺ لا دەدا، کـەوابوو: پاداشتەکەشـی لـە چەشـنی کردارەکەیـەتی.**

ناوەڕۆکەکەی وەرگیراوە لە (فتح الباري) ل(٧) ل(١٦٦–١٧٥).

***خۆزگەم بە خزمەتکارێکی بەر دەرگەی ماڵی دایکە (خَدِيجَة) رضيالله عنها، بەڵکی جار جارە خاکی بن پێی پێغەمبەرمﷺ ماچ دەکردو ڕووی خۆم پێدا دەهێنا، دایکە (خَدِيجَة) خـۆ***

*ئەگەر لە دونیاش ئەم بەختەوەریەم دەست نەکەوت، با بەختەوەری قیامەتم لە دەست نەچێو هاوسەرەکەت پێغەمبەری خوایەﷺ تکا لە خوا دەکەم: شەفاعەتم بۆ بکا، تاکو لە بەهەشتدا بە دیداری ماڵە خۆشەکەی ئێوە بەختەوەر ببم، آمین آمین آمین.*

**چوارەم: پێکهاتەی موسوڵمانبووەکانی قۆناغییەکەم، زۆرینەیان پیاوماقوڵو بژاردەی بنەماڵەکانی( مَكَّة ) بون، بەڵام کەمینەیەکی هەژارو چەوساوەشیان لەگەڵدا بون، کە ژمارەیان سێزدە کەس بون:**

**بۆ نمونە:** ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ پیاوماقوڵی (قُرَيْش) بوو، ناوی (عَبْدُالْكَعْبَة) بوو، پێغەمبەرﷺ ناو لیێنا: (عَبْدُالله)، باوکیشی ناوی (عُثْمان) بوو، پێی دەگوترا: (أبُوقُحافَة)، ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ خۆیو دایكو باوكیو هەموو كوڕو كیژەكانی بە موسوڵمانی مردن، ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ خاوەنی دیوەخان بوو، خەڵك هاموشۆی دەكردو زانستیان لێوەردەگرت، چونكە زاناترینی (قُرَيْش) بوو، جگە لە مەش بازرگانێكی دەوڵەمەندو ڕووخۆشو بە ئاسانكاریو خۆشەویست بوو، جا كە پێغەمبەرﷺ داوای موسوڵمانبوونی لێكرد، بێ هیچ بیركردنەوەیەك بێ سێودوو بووە موسوڵمان، هەر بە هۆی ڕەوشتە جوانەكەی ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ پێنج كەس لە (الْعَشَرَة الْمُبَشَّرَة) لە سەر دەستی وی بونە موسوڵمان: (عُثْمان، الزُّبَيْر، طَلْحَة، سَعْد بن أبي وقّاص، عبدالرحمن بن عَوْف)ﷺ اجمعين، ئەوانەش گشتیان پیاوماقوڵو ناودار بون.

ئیمام (علي)ﷺ هەر چەند منداڵ بوو، بەڵام كوڕی گەورەترین بنەماڵەی (قُرَيْش) بوو، جا لەو كاتەی گرانی لە (مَكّة) تووشی خەڵك بوو، (أبُوطالِب)ی باوكی ئیمام (علي) خاوەن خێزانێكی زۆر بوو، بۆیێ پێغەمبەرﷺ بە (العَبّاس)ی مامیخۆی گوت: (أبُوطالِب)ی برات خێزانێكی زۆری هەیەو ئەم گرانیەش تووشی خەڵك بووە، وەرە با بە یەكەوە باری خێزانیی بۆ سوك بكەین. جا پێغەمبەرﷺ ئیمام (علي)ی بردە لای خۆی تا بەخێوی بكا، ئیمام (العَبّاس)ش (جَعْفَر)ی بردە لای خۆی تا بەخێوی بكا.

ئیتر كۆیلەو چەوساوەكانیش موسوڵمان بون، وەك: (بِلال الْحَبَشي)و (صُهَيْب الرُّومي)و (عَمّار)و (ياسِر)ی باوكیو (سُمَيَّة)ی دایكیﷺ...هتد.

جا ئەو پێكهاتەیەش وا دەگەیەنێ: كە ئەم خەڵكە لە سەر بناغەی یەكخواپەرستیو برایەتیئیسلام بونە موسوڵمان، نەك شۆرشێكی چینی هەژاران بێ لە دژی سەرمایەداران، یان بە پێچەوانەوە شۆڕشێكی بەهێزەكان بێ بۆ چەوساندنەوەی بێهێزەكان، ئەم دوو بیرۆكەیە لە دڵی هیچ كەسێكیاندا نەبو كە دەبووە موسوڵمان.

بەڵێ: ئەم بیرۆكەیە نەبو، بەڵكو هەموویان بە یەكسانی دەبونە برای یەكتری لە ژێر سێبەری یەكخواپەرستی، تاكو لە مەودوا لە پێناوی ئەم بیرو باوەڕەدا (أبُوبَكْر)ی

دەوڵەمەندو (بلال)ی کۆیلە-رضیالله عنهما-بە یەکسانی تاڵیو سوێری ببیننو کاروانیئیسلام بگەیەننە قۆناغیخۆی، ئەم ڕاستیەش لە باسەکەی داهاتوودا ئاشکرا دەبێ: کە دەبینین (أبوبَکْر)ی دەوڵەمەندو خاوەن خزمو کەس، لەگەڵ (بِلال)ی هەژارو بێکەس-رضیالله عنهما- بە یەکسانی بە دەستی کافرەکان ئازار دەدرێن.

بەڵێ: بەم تاڵیو سوێرییە ئیسلام گەیشتە قۆناغیخۆی، تەماشا بکە: لە غەزای (الْقادِسيَّة) بە سەرکردایەتی حەزرەتی(سَعْد بن أبيوَقّاص)-کە تازە لێرەدا باسی موسوڵمانبوونی کرا- سەربازێکی بچوکی لەشکریئیسلام-(رِبْعي بن عامِر)- دەچێتە لای (رُسْتَم)ی سەرکردەی لەشکری کافرەکانی فارس، جا (رُسْتَم) لێی دەپرسێ: ئێوە بۆچی هاتونە ولاتی ئێمەو جەنگمان لەگەڵ دەکەن؟ (رِبْعي) لە وەڵامدا فەرمووی: (جِئْنَا لِنُخْرِجَ مَنْ شاءَ مِنْ عِبادَةِ الْعِبَادِ إِلَى عِبادَةِ اللهِ وَحْدَهُ) هاتوین ئەو کەسەی حەز دەکا لە بەندایەتی بەندەکان ڕزگاری بکەین بۆ بەندایەتیخوا بە تەنهایی.-إن شاءالله لە باسی حەزرەتی(جابان)ی کوردی غەزای (القادِسيَّة) ڕوون دەکەینەوە- بە دەستکارییەوە لە (فقه السيرة، للبوطي) ل(٩٦) و(سيرة الصلّابي) ب(١) ل(١٢٠-١٢٥).

## پێنجەم: خانووەکەی (الأرْقَم بن أبيالأرْقَم) بووە بارەگای قوتابخانەی ئیسلام،

بەڵێ: پێویستە شوێنێك هەبێ بۆ فێرکردنی قورئانی پیرۆزو پەروەردەکردنی تازە موسوڵمانبووان، بۆ یەکتر ناسینو ڕاگەیاندنەکانی ئیسلام، بۆ وەرگرتنی زانست لە دەمی پێغەمبەرﷺ، بەڵام بۆچی خانووی (الأرْقَم)؟ یەکەم: (الأرْقَم) هێشتا خەڵك نەیزانیبوو بووەتە موسوڵمان. دووەم: (الأرْقَم) گەنجێکی شانزە ساڵی بوو، هیچ کەسێك بیری لە ماڵی وی نەدەکردەوە. سێیەم: (الأرْقَم) لە بنەماڵەی (مَخْزوم) بوو-خزمی (أبوجَهْل) بوو- ئەم بنەماڵەیەش دوژمنترین بنەماڵەی پێغەمبەرﷺ بون. ئەم سێ هۆیانە وای لە کافرەکان کرد کە بە هیچ شێوەیەك شوێنی کۆبوونەوەی موسوڵمانان نەزانن. (سيرة الصلّابي) ب(١) ل(١٣٧).

*** *** ***

## ﴿ ئاشکراکردنی بانگەوازی ئیسلامو ئازاردانی موسوڵمانان ﴾

لە قۆناغیيەکەمدا سێ ساڵان پێغەمبەرﷺ بە نهێنی خەڵکی بانگ دەکرد بۆ ئایینی ئیسلام، تا ژمارەی موسوڵمانان گەیشتە سیو هەشت کەس لە پیاو و ئافرەت، بە شێوەیەکی وەها لە (مَكّة)دا ناوی ئیسلام بڵاو بۆوەو خەڵك بە ئاشکرایی ناوی ئیسلامی دەهێنا، ئینجا لە دوای سێ ساڵان خوایگەورە فەرمانی ئاشکراکردنی بانگەوازیی بە پێغەمبەرﷺ کردو فەرمووی: ﴿فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ﴾ الحجر: ٩٤، ئەی پێغەمبەر ئەو بانگەوازیەی فەرمانت پێکراوە ئاشکرای بکەو واز لە کافران بێنەو گوێیان مەدێ.

ئیتر پێغەمبەرﷺ فەرمانیخوای بەجێ هێناو بە ئاشکرایی داوای لە خەڵك دەکرد

ببنە موسوڵمان، جا خوایگەورە ئایەتێکیتریشی بۆ پێغەمبەرﷺ ناردە خوارەوەو فەرمانی پێکرد لە ناو خزمەکانیخۆیشی بانگەوازی ئیسلام ئاشکرا بکاو فەرمووی: ﴿وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْـــرَبِينَ﴾الشعراء: ٢١٤، هۆزە نزیکترەکانت بترسێنە لە عەزابیخوا ئەگەر نەبنە موسوڵمان.

بۆیێ پێغەمبەرﷺ چووە سەر کێوی (صَفا)و بە دەنگێکی بەرز بانگی بنەماڵەکانی (قُرَيْش)ی کرد، تا خزمەکانی (قُرَيْش) لێی کۆ بونەوە، بە شێوەیەکی وەها: ئەگەر یەکێك نەیتوانیبا بڕواتە لای، یەکێکیتری دەنارد تا بزانێ ئەم بانگەوازیە چیە؟ جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ خَيْلاً بالْوادِي يُرِيدُ أَنْ تُغِيرَ عَلَيْكُمْ أَكُنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ؟ قالُوا نَعَمْ، ما جَرَّبْنا عَلَيْكَ إلاّ صِدْقاً. قالَﷺ: (فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَـــدَيْ عَـــذاب شَدِيدٍ). فَقالَ أَبُولَهَب: تَبّاً لَكَ سائِرَ الْيَوْمِ، أَلِهَذا جَمَعْتَنا؟ فَنَزَلَتْ (تَبَّتْ يَدَا أَبِىلَهَبٍ وَتَــبَّ)﴾ رواه الشيخان، پێم بڵێن ئەگەر پێتان ڕابگەیەنم لەشکرێك لەو دۆڵەوە دەیەوێ هێرشتان بکاتە سەر: ئایا باوەڕم پێدەکەن؟ (قُرَيْش) گوتیان بەڵێ، جگە لە ڕاستی هیچیترمان لە تۆ نەبینیوە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: من ترسێنەرم بۆ ئێوە لە بەردەست عەزابێکی بەهێز لە لایەن خواوە. جا (أَبُولَهَب) گوتی: دەك زەرەرو سەرشۆڕی بۆ تۆ-ئەی (مُحَمَّد)- تا ئەم ڕۆژە ماوە، ئەوە تەنها بۆ ئەم وەزعە ئێمەت کۆ کردەوە؟ ئینجا خوایگەورە لە دژی (أَبُولَهَب) سورەتی (تَبَّتْ يَدا أَبِىلَهَب)ی ناردە خوارەوە:

﴿بِسمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * تَبَّـــتْ يَـــدا أَبِىلَهَـــبٍ﴾ هەردوو دەستەکانی (أَبِىلَهَب) بشکێن و خوا لە ناوی ببا ﴿وَتَبَّ﴾ بێگومان (أَبُولَهَب) لەناو چوو، واتە: لە دوای غەزای (بَدْر) خوایگەورە ئاگرەکەی تووش کردو بۆگەن و بوو و مرد، جا هیچ کەسێك بێزی نەهات هەڵیبگرێ، بۆیێ بە باسکە دارێك غلۆریان کردە ناو قۆرتێك و دایانپۆشی ﴿مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُــهُ وَمَـــا كَـــسَبَ﴾ سودی نەدا (أَبُولَهَب) نە ماڵەکەی و نە منداڵەکانی ﴿سَيَصْلَى نَاراً ذَاتَ لَهَبٍ﴾ بێگومان (أَبُولَهَب) دەچێتە ناو ئاگرێکی بڵێسەدار کە ئاگری دۆزەخە ﴿وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَـــةَ الْحَطَـــبِ﴾ هەم ژنەکەشی لەگەڵ خۆیدا دەچێتە ناو دۆزەخ -کە ناوی (أُمُّ جَمِيل)ە کوێر بوو- دڕك و داری هەڵدەگرتن و لە شەویدا لە سەر ڕێگەی پێغەمبەرﷺ پەرتی دەکردن تا ئازاری بدا ﴿فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ﴾ لە دۆزەخدا پەتێکی ئاسنی لولدراو لە ملی ژنەکەی دەکرێ و پێی سزا دەدرێ. (صفوة التفاسير) المسد (١-٥).

ئیتر جگە لەم جارەش چەند جارێکیتریش پێغەمبەرﷺ خزمەکانی(قُرَيْش)ی کۆ کردنەوەو لە ماڵیخۆی خواردنیشی بۆ ئامادە کردن و دەرخواردی دەدان و ئامۆژگاری

دەكردن، بەڵام سودی نەبو، تەنها (أبُوطالِب)ی مامی گوتی: سوێندم بە خوا، ئێمە (مُحَمَّد) دەپارێزین تا بمێنین.

﴿ گفتوگۆی ( قُرَيْش ) لەگەڵ ( أبِي طالِب ) لەبارەی بانگەوازی پێغەمبەرﷺ ﴾

ئینجا پێغەمبەرﷺ بە ئاشكرایی ڕەخنەی لە بتو سەنەمەكانی (قُرَيْش) گرتو بە هۆی بتپەرستن (قُرَيْش)ی بە نەفام دانان، بۆیێ (قُرَيْش) هاتنە لای (أبُوطالِب)ی مامی پێغەمبەرﷺ گوتیان: كوڕە برایەكەت جنێو بە خوایەكانی ئێمە دەداو گاڵتە بە ئایینو عەقڵی ئێمە دەكا، بۆیێ داوات لێدەكەین: یان ڕێگای لێبگرە هیچیتر وا نەكا، یان واز لە ئەو و ئێمە بێنە چی بمانەوێ وای لێبكەین. جا (أبُوطالِب) بە گفتوگۆی خۆشو نەرم ئەوانی سارد كردنەوەو گەڕاندنیەوە.

بەڵام پێغەمبەرﷺ لە بانگەوازیەكەی هەر بەردەوام بوو و بە ئاشكرایی بە خەڵكی دەفەرموو: وەرن بڵێن: (لاَ إلَهَ إلاّالله). بۆیێ دوژمنایەتی (قُرَيْش) زیاتر بەهێز بوو و ئەم جارەش هاتنەوە لای (أبُوطالِب)و گوتیان: تۆ خاون پلەو ڕێزیو بە تەمەنی، داوامان لێكردی: ڕێگا لە كوڕە برایەكەت بگریو ڕێگات لێنەگرت، ئەویش هەر بەردەوام جنێو بە خوایەكانمانو بە ئایینەكەمان دەدا، ئەم جارە-وَاللهِ- خۆمان ڕاناگرین: یان دەبێ ڕێگای لێبگری هیچیتر وا نەكا، یان هەردوو لامان دەست بە جەنگی یەكتری دەكەین تا یەكێكمان ئەویتر لە ناو دەبا.

جا لێرەدا (أبُوطالِب) پێی ناخۆش بوو دوژمنایەتی خزمەكانی بكا، نەشیدەویست پێغەمبەریشﷺ سەرشۆڕ بكا، بۆیێ بە پێغەمبەریﷺ گوت: كوڕی برام خزمەكان هاتنە لام ئەوهایان گوت: كەوابوو: هەندێك بەزەیی بۆ خۆتو بۆ من بهێڵەوەو شتێك لە توانامدا نەبێ لێم بار مەكە. جا پێغەمبەرﷺ وایتێگەیشت: (أبُوطالِب) سەرشۆڕی دەكاو هیچیتر یارمەتیی نادا، بۆیێ فەرمووی: ﴿يا عَمِّ لَوْ وَضَعُوا الشَّمْسَ فِي يَمِينِي وَالْقَمَرَ فِي يَسَارِي عَلَى أَنْ أَتْرُكَ هَذا الأمْرَ ما تَرَكْتُهُ حَتّى يُظْهِرَهُ اللهُ أَوْ أَهْلِكَ فِي طَلَبِهِ﴾ أخرجه ابن اسحاق، ئەی مامە، ئەگەر ڕۆژ لە ڕاستەم دابنێنو مانگ لە چەپەم دابنێن، من واز لەم كارەی ئیسلام ناهێنم تا خوای گەورە ئاشكراو سەركەوتووی دەكا، یان تا لە پێناویدا لەناو دەچم.

ئینجا پێغەمبەرﷺ فرمێسكی لە چاوەكان هاتنە خوارەوەو گریا، جا كە ویستی بڕوا، (أبُوطالِب) بانگی كردو پێی گوت: لە سەر كاری خۆت بەردەوام بەو چی پێت خۆشە بیكە، وَاللهِ تۆ تەسلیم بە هیچ شتێك ناكەم.

﴿ ئازاردانی پێغەمبەرﷺ ﴾

ئەم باسە زۆر درێژە، ئەگەر بەشێكی زۆری لێ باس بكەین زۆری دەوێ، بەڵام ئێمە

چەند نمونەیەکی کەم باس دەکەین:

حەزرەتی(عبدالله بن مَسعُود)ﷺ فەرموویەتی: جارێك پێغەمبەرﷺ لە لای (کَعبَة) نوێژی دەکرد، (أبوجهل) گوتی: کێ دەچێ ورگ و پزدانی ئەم وشترە بینێ و چاوەڕوان بکا: کە (مُحَمَّد)ﷺ سوجدەی برد، لە سەر شانی دابنێ؟ جا (عُقبة بن أبی مُعَیط) هەڵسا ورگ و پزدانەکەی هێنا –کە پێغەمبەرﷺ سوجدەی برد– فڕێیدا سەر شانی پێغەمبەرﷺ، کافرەکانیش کەوتنە پێکەنین، بەڵام پێغەمبەرﷺ لە سوجدە هەڵنەستاوە تا (فاطِمَة)ی کیژی-رضی الله عنها- هات ورگەکەی لە سەر لادا، جنێویشی بە کافرەکان دا، جا کە پێغەمبەرﷺ نوێژەکەی تەواو کرد، دوعای لێکردن و فەرمووی: ﴿اَللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِهَذا الْمَلَإ مِنْ قُرَيْش –ثَلاثَ مَرّاتٍ– اَللَّهُمَّ عَلَيْكَ بأَبِیجَهْلِ بن هِشام وَعُتْبَة بن رَبيعَة وَشَيْبَةَ بن رَبيعَة وَالْوَليد بن عُتْبَة وأُمَيَّة بن خلَف وَعُقْبَة بن أَبی مُعَيْطٍ وَعَمارَة بن الْوَلِيد﴾ رواه الشيخان، واتە: خوایە ئەم کۆمەڵەی (قُرَيْش) بە هیلاك ببە. جا (عبدالله) فەرموویەتی: ئەوانەم هەموو دیتن لە غەزای (بَدْر) کوژران.

جارێکیتریش کۆمەڵێك لە گەورەکانی (قُرَيش) لە (کَعبَة) کۆ بونەوەو گوتیان: ئێمە زۆر خۆمان ڕاگرتووە لە سەر ئەم پیاوە–(مُحَمَّد)ﷺ– جنێو بە خوایەکانمان دەداو گاڵتە بە عەقڵی ئێمە دەکا. جا لەم کاتەشدا پێغەمبەرﷺ هات، جا کافرەکان وێکڕا هێرشیان کردە سەر پێغەمبەرﷺ، یەکێکیان ویستی بە پەشتەماڵەکەی بیخنکێنێ، بەڵام ئیمام (أبُوبَکر)ﷺ بە گریانەوە هەڵساو کافرەکەی لە پێغەمبەرﷺ لاداو فەرمووی: ﴿أَتَقْتُلُونَ رَجُلاً أَنْ يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ؟﴾ رواه البخاری، چۆن پیاوێکی وەها دەکوژن کە بڵێ: خوای من (اَللّه)یە؟.

جگە لەوەش: کافرەکان سوکایەتییان بە پێغەمبەرﷺ دەکردو جنێویان دەدایێ و دەیانگوت: شێتە، سیحربازە، شاعیرە، کاهینە، درۆزنە.

﴿ ئازاردانی (صَحابَة)کانی پێغەمبەرﷺ ﴾

**پێناسە:** (صحابة)=ئەسحابە: ئەو موسوڵمانەیە لە کاتی ئیسلامەتیدا پێغەمبەریﷺ لە کاتی پێغەمبەرایەتیدا بە زیندوویی دیتبێ، یان پێغەمبەرﷺ ئەوی دیتبێ، هەر بە موسوڵمانیش مردبێ، جا ئادەمیزاد بێ، یان جنۆکە. (فتح المبين شرح الاربعين) ل(١٧٩).

**ئیمام (أَبُوبَکْر)ش**ﷺ **ئازار درا،** جارێك ئیمام (أبُوبَکر)ﷺ زۆر تکای لە پێغەمبەرﷺ کرد: تاکو خۆیان ئاشکرا بکەن –لەو کات ژمارەی پیاوە موسوڵمانەکان (٣٨) سی و هەشت پیاو بون– جا هەر چەند پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿يا أَبَابَکْرٍ إِنّا قَلِيلٌ﴾ ئەی (أبُوبَکر) ئێمە کەمین. بەڵام موسوڵمانەکان بە ناو (اَلْمَسجدُالْحَرام)دا بڵاو بونەوەو ئیمام

(أبـوبكر)ﷺ هەڵساو وتـارێكی دا: داوای لـە خەڵكەكـە كـرد بێنـە سـەر ئـایینی خـواو پێغەمبـەرﷺ، پێغەمبـەریش دانیـشتبوو–ئیمـام(أبُـوبَكْر)ﷺ یەكـەم وتـارخوێن بـوو بانگەوازی ئیـسلامی كـرد– جا كافرەكـان لـە موسوڵمانەكان هەڵسانو لێیـان دانو ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ كەوتـە بـن پـێی كافرەكـانو بـە سـەر زگـی دەكـەوتن، بـە تایبـەتی (عُتبَـة) ئەوەندەی بە پێو بە پێڵاو لـە دەمو چاوی ئیمـام (أبُوبَكْر)ی داﷺ تـا وای لێهات دەمو چـاوی نەدەناسـراوەو لـەوێ لـە هـۆش كـەوت، جـا خزمـەكانی ئیمـام (أبُـوبَكْر) هـاتنو بردیانەوە بـۆ مـاڵیخۆی، جا خزمـەكان گەڕانـەوە بـەو كافرانـەیان گـوت: وَاللهِ (أبُـوبَكْر) بمرێ، ئێمەش (عُتْبَة) دەكوژین. بەڵام–اَلْحَمْدُ لله– لە ئاخیری ڕۆژێدا ئیمـام (أبُـوبَكْر) هاتـەوە هـۆش خـۆیو یەكـەم قـسەی ئـەوە بـوو: (پێغەمبـەرﷺ چـی كـرد؟)...ئینجـا حەزرەتی(فاطِمَة بنت الخطاب)-رضيالله عنها-خەبەری بۆ هێنـا: پێغەمبـەرﷺ سـەلامەتە. جا ئیمــام (أبُــوبَكْر)ﷺ فــەرمووی: (وَاللهِ هــیچ نــاخۆمو ناخۆمــەوە تــا دەچــمە لای پێغەمبـەرﷺ). ئـیتر كـە شـەو داهـاتو خـەڵك بێهەسـت بـوو، حـەزرەتی(فاطِمَـة بنـت الخطـاب)و دایكیخـۆی بردیانــە لای پێغەمبــەرﷺ لــە خانووەكـەی (الأرقـم)دا، ئـیتر پێغەمبـەرووﷺ موسـوڵمانەكان ماچیان كـردو پێغەمبـەرﷺ دوعـای كـرد هـەر لـەوێ دایكیشی موسوڵمان بوو، والحمد لله تعالى.

**حەزرەتی( بِلال الْحَبَشِي )ش**ﷺ **ئازار دەدرا**، (بلال) كوڕی (رَباح)، دایكی ناوی (حَمامَة)یـە، (بلال)ﷺ كۆیلەی (أمَیَّة بن خَلَف) بوو، بـە شـێوەیەكی وەها ئـازاری دەدا كە جێگـەی سەرسوڕمانە: پەتێكی لە ملـی (بـلال) دەكـرد و دەیـدا دەسـت منـداڵان بـە كۆڵانەكانـدا دەیانگەڕاند، ئینجا شەو و ڕۆژێك تێنووی دەكرد، ئینجا دەیبردە سەر لیمە گەرمەكەی (مَكَّة)و لەوێ لە گەرمایی نیوەڕۆدا لە سەر پشت درێژی دەكردو بەردێكی گەورەشی لە سەر سینگی دادەناو پێی دەگوت: دەبی هەر لـەم ئـازارەدا بمێنیـەوە، یـان دەبـی واز لـە (مُحَمَّد) بێنیو بتو سەنەمەكان بپەرستی.

حەزرەتی(بلال)شﷺ لەو هەموو ئازارو تێنووەتیـەدا وەڵامـی دەداوەو دەیگـوت: (أَحَدٌ أحَدٌ) خوا تاكو تەنیایە!. ئیتر ڕۆژێك ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ بە (أمَیَّة)ی گوت: ئەرێ تـۆ لە خوا ناترسی تا كەی ئەم هەژارە ئازار دەدەی؟ (أمَیَّة)ش گـوتی: تـۆ (بـلال)ت لـە مـن تێك داوە، ڕزگاری بكە. جا ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ كۆیلەیەكی كافری هەبوو و دایە (أمَیَّة)، بەم كۆیلەیە (بلال)ی لێكڕیو لێیوەرگرتو ئازادی كرد.

جگە لە (بلال)ش: ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ شەش كۆیلەیتریشی كڕین، لـە ئـازاردان ڕزگـاری كردنو ئازادیشی كردن: (عامِر بن فُهَیرَة)، (أمُّ عُبَیْس)، (أبُو فُكَیهَة)، (زِنّیرة)، (النَّهْدِیة)، (حَمَامَة)ی دایكی(بلال)رضي الله عنهم أجمعين.

حەزرەتی ( خَبّاب بن الأَرَتّ ) ئاسنگر بوو، کە بووە موسوڵمان ئەویش ئازار دراو بە ئاسنی گەرمکراو داغیان دەکرد، بەخۆی دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك ئاگرێکیان لە سەر پشتم داگیرساند کەس نەیکوژاندەوە تا بە چەورایی پشتم کوژاوە.

جا حەزرەتی(خَبّاب) فەرموویەتی: سکالاّمان لە لای پێغەمبەرﷺ کرد: ئەریٚ دوعای یارمەتیمان بۆ ناکەیٚ؟ پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ﴿لَقَدْ كانَ مَنْ قَبْلَكُمْ لَيُمْشَطُ بِمِشاطِ الْحَدِيدِ ما دُونَ عِظامِهِ مِنْ لَحْمٍ وَعَصَبٍ ما يَصْرِفُهُ ذلِكَ عَنْ دِينِهِ، وَيُوضَعُ الْمِنْشارُ على مَفْرَقِ رَأْسِهِ فَيُشَقُّ باثْنَيْنِ ما يَصْرِفُهُ ذلِكَ عَنْ دِينِهِ، وَلَيُتِمَّنَّ اللهُ هَذَا الْأَمْرَ حَتّى يَسيرَ الرّاكِبُ مِنْ صَنْعاءَ إلَى حَضْرَمَوْتَ ما يَخافُ إلاّ اللهَ أَوِ الذِّئْبَ عَلَى غَنَمِهِ وَلِكَنَّكُمْ تَسْتَعْجِلُونَ﴾ رواه البخاري، ئیمانداری وەها لە پێش ئێوەدا هەبوو: بە شانەی ئاسن ئێسقانو گۆشتی لێك دادەڕنا، هەبوو: بە مشار دوو لەت دەکرا، ئەوجا وازیشی لە ئایینیخۆی نەدەهێنا، خوایگەورە ئەم ئایینە بە تەواوی سەرکەوتوو دەکا، تا سوار لە (صَنْعاء) دەڕواتە (حَضْرَمَوْت) تەنها لە خوا دەترسیٚ و لە گورگیش دەترسیٚ بەربیێتە مەڕەکانی، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن.

## ﴿ یەکەم شەهید لە ئیسلامدا ﴾

بنەماڵەی حەزرەتی(یاسِر)، واتە: (عَمّار)و (یاسِر)ی باوکیو (عبدالله)ی برایو (سُمَيّة)ی دایکیرضي الله عنهم هەر چواریان لە گەرمایی نیوەڕۆدا لە ناو لیمە گەرمەکەی (مَكّة)دا ئازار دەدران، جا پێغەمبەرﷺ بە لایاندا تێپەڕیو فەرمووی: ﴿صَبْراً آلَ يَاسِرٍ –وفِي رِوايَةٍ– أَبْشِرُوا آلَ عَمَّارٍ وآلَ يَاسِرٍ فَإِنَّ مَوْعِدَكُمُ الْجَنَّةُ﴾ صححه الحاكم والذهبي، خۆ ڕابگرن هۆ بنەماڵەی (یاسِر)، مژدەتان لیٚبیٚ: وادەی ئێوە بەهەشتە.

جا (أبُوجَهْل)-لعنه الله- ڕمێکی لە عەورەتی (سُمَيّة) دا و شەهیدی کرد، کەوابوو: حەزرەتی (سُمَيّة)ی دایکی(عَمّار)رضي الله عنهما یەکەمین شەهیدە لە ئیسلامدا، هەروەها حەزرەتی (یاسِر)ی باوکی(عَمّار)ش رضي الله عنهما لە ژێر ئازاردا وەفاتی کرد. لە ئاشکراکردنی بانگەوازیەوە تا ئێرە، بڕوانە (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٤١–٦٦) و(السيرة الحلبية) ب(١) ل(٤٠٢–٤٢٦).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم:** ﴿وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾ الشعراء:٢١٤، **هۆزە نزیکترەکانت بترسێنە.**

بۆییٚ خوایگەورە فەرمانی پیٚکرد: یەکەم جار لە ناو خزمەکانی خۆیەوە بانگەوازی دەست پیٚ بکا، نەوەك کەسێك وا تیٚبگا: پێغەمبەرﷺ لە ئیسلامدا خزمایەتی بە کار دێنیٚو چاوپۆشی لە خراپەی خزمەکانیخۆی دەکا، جا بەم توندکردنە خەڵك باشتر گوێڕایەڵی بانگەوازیەکەی دەبیٚ، هەم لە بەر ئەوەش بزانین: بەرپرسیاریەتی مرۆڤی موسوڵمان یەکەم جار لە خۆیەتی، ئینجا لە خزمو کەسەکانیەتی، ئینجا لە خەڵکیترە، جا ئەگەر یەکەم جار خزمەکانی پێغەمبەرﷺ

بەرەو بانگەوازی ئیسلامەوە بێن‌و ببنە موسوڵمان، ئەوە لە هەموو کەسێك لەپێشترن ببنە پاڵپشتی پێغەمبەرﷺ، بەڵام ئەگەر نەبنە موسوڵمان، ئەوە پێغەمبەرﷺ-هەروەك لە کافرەکانی بێگانە بەری دەبێ- لەوانیش بەری دەبێ، چونکە هەر لە دوای ئایەتەکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تَعْمَلُونَ﴾ الشعراء: ٢١٦، **ئەگەر خزمەکانت گوێڕایەڵی تۆ نەبون، پێیان بڵێ: من بەریمە لەو کردارەی ئێوە دەیکەن.**

هەروەها کە پێغەمبەرﷺ خزمەکانی‌خۆی کۆ کردنەوەو بە عەزابی خوا ترساندنی، فەرمووی: ﴿فَإِنِّي لاَ أَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللهِ شَيْئاً، إِنَّ لَكُمْ رَحِماً سَأَبُلُّها بِبِلاَلِهَا﴾ رواه مسلم، **هۆ خزمەکانم، من لە لای خوا بۆ ئێوە هیچم لە دەست نایێ، تەنها لە دونیادا خزمایەتیتان لەگەڵ من هەیە، منیش بە تەڕایەتی‌خزمایەتی تەڕی دەکەم. واتە:** مافی ئەو خزمایەتیەتان لە دونیادا دەگەێنمێ.

کەوابوو: ئایەتەکەو حەدیسەکە بەڵگەنە: لە قیامەتدا خزمایەتی سودی نیە بۆ ئەو کەسەی لە ئیسلام دور کەوتبێتەوە، هەروەك لە دووەمەکەدا ئەم ڕاستیە ئاشکرا دەبێ، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿يا أَيُّها النَّاسُ أَلاَ إِنَّ رَبَّكُمْ واحِدٌ وَإِنَّ أَبَاكُمْ واحِدٌ أَلاَ لاَ فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى عَجَمِيٍّ وَلا عَجَمِيٍّ عَلى عَرَبِيٍّ وَلاَ لِأَسْوَدَ عَلَى أَحْمَرَ ولاَ لِأَحْمَرَ عَلَى أَسْوَدَ إِلاَّ بِالتَّقْوَى﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد والقرطبي، **هۆ خەڵکینە ئاگادار بن: خوای ئێوە یەکە، باوکیشتان یەکە-کە باب (آدَمَ)ؑ ئاگادار بن: هیچ عەرەبێك لە هیچ عەجەمێك گەورەتر نیەو هیچ عەجەمێکیش لە هیچ عەرەبێك گەورەتر نیە، هیچ ڕەشپێستێك لە سۆرپێستێك گەورەتر نیەو هیچ سۆرپێستێکیش لە ڕەشپێستێك گەورەتر نیە، تەنها بە خواپەرستی و لەخواترسان نەبێ.** (تفسير القرطبي) الشعراء (٢١٤-٢١٦)، الحجرات (١٣).

**دووەم: لە دژی ( أَبُولَهَب ) سورەتی** ﴿تَبَّتْ يَدا أَبِيلَهَبٍ﴾ **هاتە خوارەوە،**

بەڵێ: (أَبُولَهَب)-لعنه الله- (قُرَيْشِي) بوو و مامی پێغەمبەر بووﷺ، (بِلال الحَبَشِي)ش رضي الله عنه بێگانە بوو، بەڵکو هەر عەرەبیش نەبو، جا بە هۆی کافری‌و دژایەتی ئیسلام، خوای‌گەورە (أَبولَهَب)ی ڕووڕەش کرد لە دونیاو قیامەتدا، هەر لەم سورەتەدا بڕیاری نەگۆڕاوی خوای‌گەورە هاتە خوارەوەو فەرمووی: ﴿سَيَصْلَى ناراً ذاتَ لَهَبٍ﴾ **بێگومان (أَبُولَهَب) دەچێتە ناو ئاگرێکی بڵێسەدار کە ئاگری دۆزەخە.**

هەروەها بە هۆی ئیسلامەتی‌و دۆستایەتی‌ی پێغەمبەرﷺ، (بِلال الحَبَشِي) بەختەوەر بوو لە دونیاو قیامەتدا، پێغەمبەرﷺ موژدەی بەهەشتی دایێ‌و فەرمووی: ﴿يَا بِلاَلُ ...فَإِنِّي سَمِعْتُ اللَّيْلَةَ دَفَّ-خَشْفَ-نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ﴾ رواه الشيخان، **ئەی (بِلال) ئەم شەو گوێم لە جولەی پێڵاوەکانت بوو لە پێشە من لە بەهەشتدا دەڕۆیشتی.** بۆ ڕوونکردنەوەی حەدیسەکە بڕوانە (فتح الباري) ب(٣) ل(٤٤-٤٦).

*ئیتر ئەم موژدەیەو ئەم ڕێزدارییە بەسە بۆ کۆیلەیەکی چەوساوەی (اَلْحَبَشی)ی ڕەشپێست، کە بە هۆی ئیسلامەتی لە بەهەشتشدا دەبێتەوە هـاوڕێی پێغەمبـەرﷺ، دەك پـیرۆزت بـێ ئەم موژدەیە ئەی (بِلال)ی ئازاردراو، ئەمـە پاداشـتی ئـەو ئـازار و تـاڵیو سـوێرییەیە کـە لـە دونیادا تێکەڵی شیرنایەتی ئیمانت دەکرد و دەتگوت: (أَحَدٌ أحدٌ).*

**سێیەم: دوژمنایەتی (أَبُولَهَب) بەرامبەر بە پێغەمبەرﷺ**، (أَبُولَهَب) بە پێغەمبەری گوت: **(تَبّاً لَكَ سَائِرَ الْيَوْمِ) سەر شۆڕی بۆ تۆ تا ئەم ڕۆژە کۆتایی دێ.**

دوژمنایەتی (أَبُولَهَب) زۆر لەوە زیـاترو بـەهێزتر بـوو: کـە باسـی بکـرێ، ئیمـامی(الحلبي) دەگێڕێتەوە: کە سورەتی (تَبَتْ يَدا أَبِيلَهَبٍ) لە دژی (أَبُولَهَـب) هاتـە خـوارەوە، داوای لـە هەردوو کوڕەکانیخۆی—(عُتْبَة)و (عُتَيْبَة)—کرد: کە کیژەکانی پێغەمبەرﷺ تەڵاق بدەن؟ چونکە ئەو دوو کوڕانەی (أَبُولَهَب) هەر دووکیـان زاوای پێغەمبـەرﷺ بـون، واتـە: (عُتْبَـة) دەستگیرانی (رُقَيَّة) بوو، مارەی کردبوو بەڵام لێی نەبوبووە زاواو تەڵاقی دا، ئەم (عُتْبَة)یە لە (فَتْح مَكَّة)دا موسـوڵمان بـووﷺ، هـەروەها (عُتَيْبَـة)ش مێـردی (أُمُّ كَلْثُـوم) بـوو و لێی بوبـووە زاوا، ئینجـا کـە تـەڵاقی دا، تفـی کـردە ڕووە پیرۆزەکـەی پێغەمبـەرﷺ، بۆیـێ پێغەمبەرﷺ دوعای لێکردو فەرمووی: ﴿اَللَّهُمَّ سَلِّطْ عَلَيْهِ كَلْباً مِـنْ كِلابِـكَ﴾ **خودایـە سەگێك لە سەگەکانی خۆت زاڵ بکە بە سەر (عُتَيْبَة)دا.**

ئینجا (عُتَيْبَة) لەگەڵ (أَبُولَهَب)ی باوکی چونە وڵاتی (شام)، جـا لـە قۆنـاغێکی دڕنـدەداردا دابەزینو (أَبُولَهَب) بە کاروانەکەی گوت: ئەم شەو یارمەتیمان بدەن تا ئاگاداری کوڕەکـەم ببین، من دەترسم دوعایەکەی (مُحَمَّد)ﷺ کاری لێبکا !.

ئیتر کاروانچیەکان لە دەورەی (عُتَيْبَة) خەوتن، تـاکو بپـارێزێن، بـەڵام لـە ناکـاودا شـێرێك هات: یەکە یەکە کاروانچییەکانی بۆن دەکردن تا گەیشتە (عُتَيْبَة)و هەڵمەتی بردە سەر، لەوێ تێکیشکاندو کوشتی، جا (أَبُولَهَب) گوتی: دەمزانی: کوڕەکەم لە دوعـای (مُحَمَّـد) قورتـار نابێ !. (صفوةالتفاسیر) المسد (١—٥) و(السیرةالحلبیة) ب(١) ل(٤١٣).

**چوارەم: ئازاردانی موسوڵمان تاقیکردنەوەیە**، بۆچـی خوایگـەورە ئـەو هـەموو ئـازارەی توشـی پێغەمبـەروﷺ (صَـحابَة)کـانﷺ کـرد؟ وەڵام: خوایگـەورە ئەگـەر حـەزی کردبـا توانای هەبوو بە ڕێگایـەکی زۆر ئاسـانو بـێ مانـدووبوون ئـایینیخۆی جـێگیر بکـا، بـەڵام خوایگـەورە ڕێبـازێکی بـۆ بانگەوازکارانیئیـسلام دانـاوە، دەبـی تێیـدا بـڕۆن: ئـەویش تاقیکردنەوەی موسوڵمانە بە ئازاردانو ماندووکردنو دورخستنەوە لە وڵاتیخۆی؟ تاکو بـەم تاقیکردنەوەیە بەندایەتی بەندە بۆ خوای خۆی بە پـوختی ئاشـکرا ببـێو ڕاسـتگۆو درۆزن لێـك جیـا ببنـەوە، جـا لـە ڕاسـتیدا ئـەم ئـازاردانو تـاڵیو سـوێرییە ڕاهێنـانو مەشـق پێکردنێکە بۆ بەرەو پێشبردنی کاروانی(جِهاد)و سەرکەوتنیئیسلام.

بەڵێ: (صَحابة)ی پێغەمبەرﷺ لەم جۆرە ڕاستگۆیانە پێك هاتبون، بۆیێ خوایگەورە سەرکەوتنی دانێ، لەبارەی ئەم ئازاردراوانە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لا يُفْتَنُونَ * وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ﴾: العنكبوت: ٢و٣، ئایا خەڵك وا تێدەگا وازیان لێبهێندرێو خوا لێیان ڕازی بێ بە تەنها ئەوەی بە زوبان بڵێن: ئیمانمان هێناوە، ئەوهاش تێبگەن: تاقی ناکرێنەوە؟-نا، نا، ئەو تێگەیشتنە ڕاست نیە، بەڵکو دەبی تاقی بکرێنەوە-بەڕاستی ئێمە ئوممەتەکانی پێش ئەوانیشمان تاقی کردونەوە بە جۆرەها ئازارو تاڵیو سویری، بەم تاقیکردنەوەیە خوایگەورە ڕاستگۆو درۆزنەکان لێك جیا دەکاتەوە. حەدیسەکەیڕابردووی (خبّاب) شاهیدی ئەم تەفسیرەیە. (صفوة التفاسير) العنكبوت (٢و٣).

شاعێرێکی موسوڵمان- لە سەر زمانحاڵی شەهیدێك- دەڵێ:

دایە لە مێژە کەوتۆتە بەر گوێت * بە بێ ماندووبوون ئیسلام ناچەسپێت
بێگومان خوێنو ئارەقەی دەوێ * خەوی بێ نوێنو شەوڕۆیی دەوێ

**پێنجەم: لە قۆناغەکانی بانگەوازی (مَكّة)یدا جەنگکردن قەدەغە بوو،** حەزرەتی (خَبّاب)ﷺ داوای دوعای سەرکەوتن لە پێغەمبەرﷺ دەکا، پێغەمبەریشﷺ لە وەڵامدا دڵی دەداتەوەو هانی دەدا بۆ خۆڕاگریو فەرمووی: ﴿لَقَدْ كانَ مَنْ قَبْلَكُمْ لَيُمْشَطُ بِمِشاطِ الْحَدِيدِ...﴾ ئوممەتەکانی پێش ئێوە بە شانەی ئاسن گۆشتیان لێدادەڕناو بە مشار دوو لەت دەکران...تا کۆتایی حەدیسەکە.

لە قۆناغەکانی بانگەوازی (مَكّة)یدا پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)کانیﷺ پەروەردە دەکردن: لە سەر یەکخواپەرستیو خۆڕاگریو خۆ ئامادەکردن بۆ دواڕۆژێکی ڕۆناكو سەرکەوتوو، بە هیچ جۆرێك ڕێگای جەنگی بەرگریشی نەدا (صَحابَة)کانﷺ-هەرچەند لە ناو (صَحابَة)کاندا گەنجی بەهێزو ئازاو خوێن گەرم هەبون-، پێغەمبەرﷺ هەر دەیفەرموو: ﴿أُمِرْتُ بِالْعَفْوِ فَلا تُقَاتِلُوا الْقَوْمَ﴾ حديث صحيح رواه النسائي والحاكم والبيهقي، فەرمانی لێبوردنم پێکراوە، ئێوە جەنگ لەگەڵ ئەو کافرانە مەکەن.

جا دەگونجێ-والله أعلم- لە بەر ئەم هۆیانەیداهاتوو جەنگکردن قەدەغە کرابێ:

*بانگەوازیی ئاشتیانە کاریگەرترە بە تایبەتی لە ناو ژینگەیەکی وەهادا کە زۆربەی دانیشتووانی خۆ بە زل دەزانن و خاوەن پلەو پایەنە.

*هەم ئەم قۆناغەش زیاتر قۆناغی پەروەدەیی بوو و بە هۆی پەروەردە جوانەکەی پێغەمبەرﷺ چەند کەسێکی ڕقەکاری ئیسلام -کە موسوڵمانیان سزا دەدان- بونە موسوڵمان: وك ئیمام (عُمر)ﷺ.

*هەم تا ڕادەیەکیش ڕێگای ئەم پەروەردەکردنە هەبو و پێویستی بە جەنگی بەرگریش نەبو.

*هەم ئەگەر لە ناو (مَكّة)دا جەنگ ڕوو بدا، ئەوە یەكەم جار ڕێزی (كَعْبَة)ی ماڵیخوا كەم دەبێتەوە، هەروەها دەبووە جەنگی كۆلان بە كۆلانو ماڵ بە ماڵ، دەبوا خزم خزمیخۆی بكوژێو باوكو كوڕ یەكتری بكوژن، بەمەش ئیسلام لە ناو خەڵكیدا ناشیرن دەبوو و بە شەڕخواز ناوی موسولمانانیان دەهێناو خەڵك لە ئیسلام دور دەكەوتنەوە، هەم كافرەكانیش زۆر لە موسولمانان زیاتر بون، بە ئەندازەیەكی وەها: ئەگەر چەندەها لە خۆیان زیاتر كافریان كوشتبان، هێشتا هەر كافرەكان بە خاوەن دەستەلاتی (مَكّة) دەمانەوەو موسولمانەكانیش: یان لەناو دەچون، یان ئەوەندە كەم دەبونەوە هیچ هێزێكیان نەدەماو جەنگەكەیان دەبووە جەنگی خۆبەزێنو ڕیسیان لێدەبۆوە خوری.

كەواتە: لەو سەردەمەدا ژینگەی (مَكّة)ی پیرۆز كەڵكی (جِهاد)ی چەكداریی نەبو، تا پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)ﷺ كۆچیان كرد بۆ (مَدینَة)، ئینجا لە دوای كۆچكردن ئیزن دران جەنگ لە دژی كافرەكان بكەن، جا مەیدانی پیاوان ئاشكرا بوو و نەڕەی شێرانی ڕۆژێو خواپەرستانی شەوێ قەیسەرییان لە كافرەكان كردنە كونە مشك. بە دەستكاریەوە (سیرةالصلاّبي) ب(١) ل(٢٨٥-٢٨٨).

**شەشەم: ئیمام (أَبُوبَكر)ﷺ (بِلال)و شەش كۆیلەیتری ئازاردراوی كڕینو ئازادی كردنﷺ.**

ڕۆژێك (أبوقُحافة)ی باوكی ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ پێی گوت: كوڕم دەتبینم تۆ كۆیلە بێهێزەكان ئازاد دەكەی دەبوا-ئەگەر هەر وا دەكەی-هەندێك پیاوی بەهێز ئازاد بكەی تاكو بەرگریت لێ بكەن؟ ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ لەوەلامدا فەرمووی: هۆ باوكی خۆم ئەوەی من دەمەوێ بیكەم تەنها بۆ خوا دەیكەم. جا خوایگەورە دەرهەق ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ لە سورەتی (وَاللَّيْل) ئایەتەكانی ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى﴾ تا كۆتایی سورەتەكەی ناردنە خوارەوە، بە تایبەتیش لەبارەی ئازادكردنی حەزرەتی(بلال) ئەم ئایەتانە:

**﴿وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى﴾ بێگومان لە ئاگری دۆزەخ دور دەخرێتەوە ئەو پیاوە زۆر لەخواترسەی كە ﴿الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّى﴾ ماڵیخۆی بۆ چاكە دەبەخشێ و دەیەوێ لە لای خوا دڵەكەی پاكو بێگەرد بێ ﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِنْدَهُ مِنْ نِعْمَةٍ تُجْزَى﴾ هیچ كەسێكیش چاكەی لە سەر ئەو پیاوە نیە، تا بەو ماڵ بەخشینە پاداشتی چاكەكەی بداتەوە ﴿إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَى﴾ تەنها مەبەستی ڕازیبوونی خوای خۆیەتی ﴿وَلَسَوْفَ يَرْضَى﴾ بێگومان ئەو پیاوەش بە پاداشتی چاكەكانیخۆی ڕازی دەبێ لە قیامەتدا.**

دەك پیرۆزت بێ ئەم موژدە خۆشەو ئەو شەرەفو ڕێزدارییە، ئەی پیری پیرانیئیسلامو ئەی پێشەوا دڵسۆزەكەی گەنجە خوێن گەرمەكانیئیسلام، پێنوسەكەم بێتوانایە لە نوسینی باسی گەورەییتو ئیمانە بەهێزەكەت.

دەك خوا لە تۆش ڕازی بێ ئەی ئیمام (عُمر) کە فەرمووت: ﴿أَبُوبَكْرٍ سَيِّدُنا وَأَعْتَقَ سَيِّدَنا﴾ (أَبُــوبَكْر)ﷺ گــەورەی ئێمەیــەو گــەورەی ئێمــەی ئــازاد کــردوە، کــە (بِــلال الْحَبَشِي)یەﷺ. (تفسير القرطبي) سورة الليل (٥-٢٠) و(البداية والنهاية) ب(٢) ل(٦٣).

*** *** ***

## ﴿ گفتوگۆی داواکاریەکانی کافرەکانی (قُرَيْش)–ڕاستەوخۆ- لەگەڵ پێغەمبەرﷺ ﴾

کە کافرەکانی (قُرَيش) دێتیان ناوبانگی پێغەمبەرﷺ لە نـاو هۆزەکانی عـەرەب بڵاو دەبێتەوەو ژمارەی موسوڵمانەکانیش هەر لە زیادبووندا بوو، بڕیاریان دا: ڕاستەوخۆ لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بکەونە گفتوگۆو چەند پلەو پایەو ماڵی دونیای بدەنێ، تاکو لێیان نزیك ببێتەوە، هەم چەند شتێکیان لە پێغەمبەرﷺ داوا کردن، جا ئێمەش لێرەدا چەند نمونەیەك دەگێرینەوە:

جارێکیان (عُتبَة بن رَبيعَة)–کە (أبُوالْوليد)ی پێ دەگوترا– بە نوێنەرایەتی (قُـرَيش) هاتە لای پێغەمبەروﷺ پێی گوت: ئەی کوڕی برام، تۆ لە نـاو ئێمـەدا خـاوەن نـەژادو ڕێزداری، بەڕاستی تۆ کارێکی گەورەت لە ناو گەلەکەی خۆتدا پەیدا کـردوە: جنێـو بـە سەنەمەکانیان دەدەی‌و گاڵتە بە عەقڵی ئەوان دەکەی، جا مـن هاتومـە لای تـۆ چـەند کارێکت پێ دەڵێم، بەڵکی هەندێکیان قبوڵ بکەی؟

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بڵێ، منیش گوێی لێدەگرم. جا (عُتبَة) گوتی: ئەی کوڕی برام ئەگەر بەو کارەی تۆ هێناوتە مەبەستت ماڵی دونیا بێ، ئەوەندە ماڵت بۆ کۆ دەکەینەوە: تا لە هەموومان تۆ زیاتر ماڵت هەبێ، ئەگەر مەبەستت گەورەیی‌و پلەو پایەیە، ئەوە دەتکەینە گەورەی‌خۆمان‌و بێ‌ئامادەبوونی تۆ هیچ کارێك بڕیار نادەین، وە ئەگــەر مەبەســتت ســەرۆکایەتــیــە، ئــەوە دەتکەینــە پاشــای‌خۆمان: فــەرمانکردن‌و قەدەغەکردن گشتی لە دەست تۆدا بێ، ئەگەر حەزت لە ژن هێنانە، هەر ژنێك لە ژنەکانی (قُرَيش) بۆ خۆت هەڵدەبژێری هەڵیبژێرە تا دە ژن لێت مارە دەکەین، وە ئەگەر ئەوەی دێتە لای تۆ جنۆکە بێ‌و توانای ڕەدکردنەوەیت نەبێ، ئەوە پزیشکت بۆ دێنین‌و ماڵی‌خۆمان لە پێناوی تۆدا سەرف دەکەین تا چاك دەبیەوە؟

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی (أبَاالوَليد) قسەکانت تەواو بون؟ (عُتبَة)ش گوتی: بەڵێ. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: گوێت لە من ڕابگرە: ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ حم تَنْزِيلٌ مِنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ تا گەیشتە ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنْذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ﴾ فُصِّلَت: ١-١٣، حديث صحيح رواه الإمامان: عبد بن حميد والبيهقي، جا (عُتبَة) دەستی خۆی لە سەر دەمی پێغەمبەرﷺ داناو گوتی: بۆ خاتری خزمایەتیمان واز بێنە. جا

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی (أبَاالْوَلِيد) خۆت و ئەوەی گوێت لێبوو.

هەم لە (رِوايَة)ێکی‌تردا هاتووە: پێغەمبەرﷺ-لە وەڵامی (عُتبَة)دا- فەرمووی: ﴿من جنۆکەم نیەو بۆ ئەوەش نەهاتومە لاتان داوای ماڵتان لێبکەم‌و داوای گەورەیی‌و سەرۆکایەتی‌ی سەر ئێوە بکەم، بەڵکو خوای‌گەورە منی بە پێغەمبەر ناردۆتە لای ئێوەو قورئانی بۆ ناردومە خوارەوەو فەرمانی پێ‌کردوم بۆ ئێوە موژدەدەرو ترسێنەر بم، منیش پەیامی‌خوام بە ئێوە گەیاندو ئامۆژگاریم کردن، جا ئەگەر ئەو پەیامەم لێقبوڵ بکەن، ئەوە بەختەوەری‌ی ئێوەیە لە دونیاو قیامەتدا، وە ئەگەر ڕەدیشی بکەنەوەو قبوڵی نەکەن، ئەوە خۆم ڕادەگرم بۆ فەرمانی‌خوا، تا خوای گەورە داد لە نێوان من‌و ئێوەدا دەکا﴾.

جا (عُتبَة) گەڕاوە لای (قُرَيْش)و گوتی: گوێم لە قسەیەکی وەها بوو: وَاللهِ هیچ کاتێك ئەو قسەیەم گوێ لێنەبوە، ئەو قسەیەی (مُحَمَّد)ﷺ شیعر نیە، سیحر نیە، فاڵچیەتی نیە، هۆ گەلی (قُرَيْش) بە قسەم بکەن: واز لەم پیاوە—مُحَمَّد— بێنن، خۆی‌و کارەکەی، وَاللهِ کارەکەی وی هەواڵێکی‌گەورەی بۆ دەبێ، جا ئەگەر خەڵك بیکوژێ ئەوە بە دڵی ئێوەیەو کەسێکی‌تر لە کۆڵ ئێوەی کردۆتەوە، ئەگەر سەرکەوتووش بوو ئەوە گەورەیی وی گەورەیی ئێوەیە، ئێوە لە هەموو کەسێك زیاتر بەویەوە بەختەوەر دەبن؟

جا (قُرَيْش) گوتیان: ئەی (أبَاالوَلِيد) وَاللهِ (مُحَمَّد)ﷺ سیحری لێکردوی!. (عُتبَة)ش گوتی: ئەمە بۆچوونی منەو ئێوەش کەیفی خۆتانە.

جارێکی‌تریش نوێنەرێکی‌تری (قُرَيْش) هاتە لای پێغەمبەروﷺ گوتی: ئەی (مُحَمَّد) ئەگەر واز لە خوایەکانی ئێمە بێنی‌و بە خراپە باسیان نەکەی، ئەوە دەتکەینە دەوڵەمەندترین پیاوی (مَكَّة)...جا ئەگەر ئەمەش قبوڵ ناکەی، وەرە ماوەیەك سەنەمەکانی ئێمە بپەرەستە، ئێمەش ماوەیەك خوای تۆ دەپەرستین، تاکو ئێمە بە خوایەکەی تۆ بەختەوەر ببین، تۆش بە خوایەکانی ئێمە بەختەوەر ببێ؟

جا خوای‌گەورە ئەم سوڕەتەی ناردە خوارەوە: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ ئەی پێغەمبەرﷺ بڵێ: هۆ کافرەکان ﴿لا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾ من ئەو سەنەمانە ناپەرستم کە ئێوە دەیانپەرستن ﴿وَلا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴾ ئێوەش ئەو خوایە ناپەرستن کە من دەیپەرەستم ﴿وَلا أَنَا عَابِدٌ مَا عَبَدْتُمْ﴾ لە داهاتووشدا من ئەو سەنەمانەی ئێوە ناپەرەستم ﴿وَلا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴾ ئێوەش لەمەودوا خوای من ناپەرستن ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ ئایینە پوچەکەی ئێوە بۆ خۆتان، ئایینە ڕاستەکەی منیش بۆ خۆم.

جا ئیمامی(الحلبي) فەرموویەتی: بە ئایەتەکانی (جِهاد) ئەم ئایەتە (نَسْخ) بۆتەوە.

## ﴿ لەتكردنی مانگی شەوی چواردە ﴾

﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّ أَهْلَ مَكَّةَ سَأَلُوا رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنْ يُرِيَهُمْ آيَةً؟ فَأَراهُمُ الْقَمَرَ شِقَّتَيْنِ، حَتّى رَأَوْا حِـــراءَ بَيْنَهُمـــا﴾ رواه الشيخان، **كافرەكانی (مَكّة) داوایان لە پێغەمبەر ﷺ كرد بەڵگەیەكی پێغەمبەرایەتییان نیشان بداو مانگ لەت بكا؟ جا پێغەمبەر ﷺ مانگی نیشان دان بووە دوو لەت، تا كێوی (حِراء)یان لە نێوان هەردوو لەتەكەدا بینی.**

**جا كافرەكان گوتیان: ئەمە سیحرە. بۆیێ خوایگەورە سەرەتای ئەم سورەتەی ناردە خوارەوە:** ﴿اِقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ * وَإِنْ يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُـــسْتَمِرٌّ﴾ القمر: ١و٢، **دونیا وێرانبوون نزیك بوو و مانگ لەت بوو، ئەگەر كافرەكان بەڵگەیەكی پێغەمبەرایەتی ببینن، دەڵێن: ئەمە سیحرێكە بەردەوام نابێ و پوچەڵ دەبێتەوە.**

**جگە لەم داوكاریەش: چەند شتێكیتریان لە پێغەمبەر ﷺ داوا كرد: كە لە سورەتی (الإسراء) ئایەتەكانی (٩٠-٩٣)دا خوایگەورە باسی كردون، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئەو داواكاریانەی بەجێ نەهێنان؟ نەوەك خوایگەورە عەزابیخۆی بنێرێتە سەر كافرەكان.**



(البداية والنهاية) ب(٢) ل(٥٤و٦٨و١٢٢) و(السيرةالحلبية) ب(١) ل(٤٢٨–٤٣٤).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەكەم: نابێ موسوڵمان لە سەر داواكاری كافرەكان واز لە بەشێكی ئایینیئیسلام بێنیو تەواوی شەریعەتیئیسلام ئە نجام نەدا،** لە بەرامبەر وازهێنانی پێغەمبەر ﷺ لە باسكردنی سەنەمەكانیكافرەكان بە خراپەو گاڵتەكردن بە عەقڵی ئەوان، بڕیاریان دا: **بیكەنە دەوڵەمەندترین پیاوی (مَكّة)و بیكەنە گەورەی ئەنجومەنی (مَكّة)، بەڵكو بڕیاریان دا: بیكەنە پاشای (مَكّة)و تا دە ژن لە جوانترین ژنەكانی (قُرَيْش)ی لێ مارە بكەن!؟**

بەڵام هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ لە بەرامبەر ئەو هەموو تەماعو دونیاداریەیە، هەمان هەڵوێستی نەگۆڕاویڕابردووی بوو، كە–لە ئاشكراكردنی بانگەوازیدا– فەرمووی: **﴿ئەی مامە ئەگەر ڕۆژ لە ڕاستەم دابنێنو مانگ لە چەپەم دابنێن، من واز لەم كارەی ئیسلام ناهێنم...هتد﴾.** بەڵام لێرەدا زیاتر–لەوەیڕابردوو–ترساندنو ئامۆژگاری لە وەڵامی پێغەمبەردا ﷺ هەبوو.

**پرسیار: بۆچی پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی قبوڵ نەكردن! خۆ ئەگەر قبوڵی كردبا ئەو كاتە دەیتوانی ئەنجومەنو گەورەییخۆی بكاتە ڕێگاو هۆكارێك بۆ بەرەوپێشبردنی بانگەوازیی ئیسلامو بۆ پاراستنی موسوڵمانان؟**

**وەڵام:** خوایگەورە ئەو دەسەڵاتەی نەداوەتە بەندەكان: هەر ڕێگایەكو هەر هۆكارێكی ئەوان بە باشی بزانن، بە كاری بێنن بۆ گەیشتنە مەبەستو ئامانجەكانی باش، كەواتە: **(اَلْغَايَةُ لاَ تُبَرِّرُ الْوَسَائِلَ) گەیشتنە مەبەست هەموو هۆكارەكان پەسند ناكا.** بەڵكو

دەبی ئەو ڕێگاو هۆکارانە شەرعی بن‌و بەگوێرەی یاسای شەریعەتی‌ئیسلام بن، هەروەك مەرجە: ئامانج‌و مەبەستەکانیش شەرعی بن‌و بەگوێرەی شەریعەتی‌ئیسلام بن.

جا بۆیێ پێغەمبەرﷺ هیچێکی لەوانەی‌ڕابردوو لە کافرەکان قبولێ نەکرد، چونکە خوای گەورە ڕێگای نەدایێ‌و بەوە ڕازی نەبو: لە سەر داواکاری کافرەکان لە بەشێکی ئایینی ئیسلام واز بهێندرێ، هەرچەند سودی بانگەوازی ئیسلامیشی تێدا بێ، چونکە کافرەکان واز لە کوفرەکەی خۆیان ناهێنن‌و خوای‌گەورەش دەیەوێ: ﴿وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾ الأنفال: ٣٩، **ئایین هەر هەمووی بۆ خوا بێ‌و کوفری لەگەڵدا نەبێ.**

هەم خوای‌گەورە پێغەمبەریﷺ ترساندووەو دەفەرموێ: ﴿وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ﴾ المائده: ٤٩، **شوێن هەواو هەوەسی ئەوان مەکەوەو لێیان ئاگادار بە: نەوەك لە بەشێکی ئەم قورئانەی خوا ناردویەتیە خوارەوە لاتبدەن.**

بەڵێ: ئەگەر لەو ڕێگا ڕاستەی‌خوا لابدەی، ئەوە لە ناو ئەنجومەنی ئەواندا جێگەت دەبێتەوەو کورسیت دەدەنێ، بەڵام خوای‌گەورە ڕازی نابێ لە بەشێکی کەمیش بە یاسای دەستکرد ڕەفتار بکەی‌و شوێن هەواو هەوەسی دوژمنانی‌ئیسلام بکەوی‌و واز لە بەشێکی بەرنامەی ئیسلام بێنی‌و تەواوی شەریعەتی‌ئیسلام ئەنجام نەدەی.

جا لێرەدا بانگەوازکاری درۆزن‌و بەزیو، لە بانگەوازکاری ڕاستگۆو خۆڕاگر جیا دەبێتەوە، چونکە ئەمەیان بە پێشنیارەکانی ئەوان هەڵناخەڵەتێ‌و لە سەر ڕێبازەکەی پێغەمبەرﷺ دەڕواو (جِهاد) دەکاو قوربانی دەداو واز لە بەشێکی ئایینەکەشی ناهێنی‌و بە ئاشکرایی– وەکو پێغەمبەرﷺ– دەڵێ: (**داوای ماڵتان لێ‌ناکەم، داوای گەوریی‌و سەرۆکایەتیی سەر ئێوە ناکەم‌و کارەبەدەستیم ناوێ، بەڵکو من پەیامی خوا بە ئێوە ڕادەگەیەنم، ئەوەی خوا فەرمانی پێ‌کردون‌و لێی‌قەدەغەی کردون جێ بەجێی بکەن**).

ئەوانی‌تریش بە ماڵی دونیا هەڵدەخەڵەتین‌و–بە ناوی ئیسلام–هەوڵ دەدەن بگەنە کورسی‌ی کاربەدەستی‌و واز لە شەریعەتی ئیسلام دەهێنن، جا لە بەر ئەوەی شەیتان ئەوانی لە ڕێبازی پێغەمبەرﷺ لاداوەو ئەوانیش–بۆ ئەوەی فێڵ لە موسوڵمانان بکەن– پاساو بۆ گومڕابوونەکەیان دێننەوەو دەڵێن: بۆ بەرژەوەندی ئیسلام تێکەڵی ئەم دوژمنانەی‌ئیسلام بوینەو دەمانەوێ قسەیەکی باش بکەین‌و ئەوان بهێنینەوە سەر ڕێگای ڕاست!.

دەك قوڕتان بە سەر، ئێوە نازانن دوژمنانی‌ئیسلام تەلەیان داناوەتەوە بۆ ڕاوکردنی بانگەوازکارانی ئیسلام‌و دەڵێن: **پلەو پایەی بەرز لە دەوڵەتدا بدەنە ئەو بانگەوازکارانەو بە بازرگانی سەرقاڵیان بکەن‌و بە کاروباری‌تر خەریکیان بکەن.**

ئا بەم جۆرە ئەوان ئێوەیان لە ئیسلام لاداو گومڕایان کردن، ئەوان بە ئیسلامەکەی ئێوە ڕازی نەبون، بەڵام ئێوە بە دۆستایەتی ئەوان ڕازی بون‌و لە ناو چڵکاوی ئەواندا

تاوانەوە، بۆ خەڵكیش ئاشكرا بوو: نەعرەتەكەی وتارەكانتان لە مزگەوتو لـە كۆڕەكانـدا تەنها بۆ ئەوە بوو: لە سەر حیسابیئیسلام ماڵی دونیا كۆ بكەنـەوەو بگەنـە پلەوپایـەكی دونیا، دەك پیرۆزتان نەبێ.

ئیمام (عبدالله بن المُبارك) لەبارەی فێڵبازەكانی وەك ئێوە فەرموویەتی:

**يَا جَاعِلَ الْعِلْمِ لَهُ بَازِياً يَصْطادُ أَمْوالَ الْمَسَاكِينِ**
**احْتَلْتَ لِلدُّنْيَا وَلَذّاتِهَا بِحِيلَةٍ تَذْهَبُ بِالّدِيـنِ**
**وَصِرْتَ مَجْنُوناً بِهَا بَعْدَمَا كُنْتَ دَواءً لِلْمَجانِينِ**

واتە: ئەی ئەو كەسەی زانستی ئایینی كردۆتە باز تاكو ماڵی هەژارانی پێ ڕاو بكا، فێڵـت كرد بۆ وەدەستهێنانی دونیاو خۆشیەكەی، فێڵێكی وەها: كە ئایین لادەبا، تۆ بە هۆی ئەو دونیایە شێت بوی، پاش ئـەوەی پێـشتر دەرمـانی شـێتەكان بـوی. (طبقـات الـشافعية الكـبرى، للـسبكي) ب(١) ل(١٥٠). هـەم بـە دەسـتكاریەوە لـە (فقـه الـسيرة، للبـوطي) ل(١١٧) و(سـيرة الـصّلابي) ب(١) ل(٣٠٢).

## ﴿ بەشداربوون لە (برلمان)ی ( علمانی ) ﴾

**مەبەست بە (علمانية)كان: ئەو بێدینانەن كە ڕەفتار بە شەریعەتی ئیسلام ناكەن‌و دەیانەوێ ئیسلام هیچ دەسەلاًتێكی لە دەوڵەتدا نەبێ.**

جـا لێـرەدا كێـشەیەكی زۆر هەیـە: ئایـا دروسـتە موسـوڵمان بەشـداری بكـا لـە(برلمـان)ی (علمانية)كان كە ڕێگا نادەن ڕەفتار بە شەریعەتیئیسلام بكرێ؟

ئەوانەی لافی ئیـسلامەتی لێـدەدەن‌و لـە ڕاستیـشدا لـە ڕێبـازی پێغەمبـەرﷺ لایانـداوە، دەڵێن: بەشداریكردنەكە دروستە، بەڵكو هەندێكیان دەڵێن: واجبە !.

جا بـۆ ئـەم بەهەڵەداچـوونەیخۆیان چـەند پاسـاوێك‌و چـەند بەڵگەیـەكی پوچـەڵ‌و نادروسـت دەهێننەوە، ئێمەش–بە پشتیوانیخوا– بە بەڵگەكانی قورئان‌و حەدیس دەمكوتیان دەكەین:

***ئەوان دەڵێن:** ئێمـە بـێهێزین‌و دوژمنانیئیـسلام بـەهێزن، بـەم بەشـداریكردنە خۆمـان دەپارێزین‌و بانگەوازیش بۆ ئیسلام دەكەین؟

**وەڵام:** ئەمـە ڕاسـت نیـەو نابێتـە بەڵگـە، چـونكە لـە (مَكّـة)دا موسـوڵمانەكان لـەو پـەڕی بێهێزیدا بون‌و كافرەكانیش لەو پەڕی بەهێزیدا بون، ئێوەش لە پێغەمبـەرﷺ عـاقڵترو لێزانترو بە بەزەییتر نین، ئەگەر ئـەو بەشـداریكردنە دروسـت بوایـە، ئـەوە پێغەمبـەرﷺ بەشداری دەكردو تـەنها چـەند كورسیەكیـشی وەرنـەدەگرتن، بـەڵكو دەبـووە سـەرۆكی ئەنجومەنی (مَكّة)، موسـوڵمانەكانی (مَكّـة)ش توشـی كۆچـكردن‌و دەربـەدەری نـەدەبون، هەروەك لە پێش ئێرەدا ڕوونمان كردەوە.

***ئەوان دەڵێن:** خۆ (علمانية)كان هەموویان كافر نین، ئێمەش دەتوانین لە (برلمان)دا چەند

بڕیارێکی ئیسلام پەسند بکەین؟

**وەڵام:** ئەوەش ڕاست نیەو پوچەڵە، چونکە بە پەسندکردنی چەند بڕیاریك خوا ڕازی نابێ، بەڵکو خوایگەورە دەیەوێ: ﴿وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾الأنفال: ٣٩، **ئایین هەر هەمووی بۆ خوا بێ و کوفری لەگەڵدا نەبێ.**

بەڵێ: خوایگەورە نایەوێ هاوبەشی لە بڕیارداندا هەبێ، هەروەك نایەوێ هاوبەشی لە پەرستندا هەبێ، هەروەك خۆی دەفەرموێ: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ يوسف: ٤٠، **بڕیاردان تەنها مافیخوایە، خودا فەرمانی داوە جگە لەوی هیچیتر نەپەرستن، ئەمە ئایینی ڕاستەقینەیە، بەڵام زۆرینەی خەڵك نازانن.** بەڵێ: زۆرینەی نەزانەکان، بەشداربووەکانی (برلمان)ی (علمانی)ش دەگرێتەوە !.

هەروەها خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾ الكهف: ٢٦، **خوایگەورە هیچ کەسێك ناکاتە هاوبەش لە بڕیارەکەی خۆیدا.**

جگە لە مەش کە لە (برلمان)دا بە زۆرینەی دەنگەکان هەندێك بڕیاری دژ بە ئیسلام دەردەچن، دەبی ئەوان گوێڕایەڵی بڕیارەکە بن، ئەمەش دەبێتە (شِرْك)=هاوبەش دانان بۆ خوا، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾الانعام: ١٢١، **ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی ئەوان بن لە حەرامو حەلاڵ، بێگومان ئێوە (مُشْرِك)ن.** واتە: هاوبەشتان بۆ خوا داناوە لە بڕیارەکەیدا.

***ئەوان دەڵێن:** خۆ ئێمە بڕیارەکانی دژ بە ئیسلام پەسند ناکەین، بەڵکو ڕەدی دەکەینەوەو ڕەخنەش دەگرین؟

**وەڵام:** ئەم قسەیەش گاڵتەجارییە، چونکە (علمانیة)کان بە ئیسلام ڕازی نابن و ڕێبازی (علمانی)و موسوڵمانان دژی یەکترەو لە هیچ ڕێگایەکدا ناگەنەوە یەکتری، ئێنجا لە (برلمان)شدا زۆرینەی دەنگەکان کار دەکا، کەوابوو: ڕەدکردنەوەو ڕەخنەی ئەوان سودی نیەو ئەوان لە ناو چڵکاوی (علمانیە)کاندا دەتاوێنەوە، کەوابوو: تەنها تاوانباریو سەرشۆڕییان بۆ دەمێنێتەوە، چونکە لەگەڵ ئەم بێباوەڕو ستەمکارانە لە (برلمان)دا دانیشتون، تەماشا بکە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذاً مِثْلُهُمْ إِنَّ اللهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعاً﴾النساء: ١٤٠، **بەڕاستی خوایگەورە لە قورئاندا بۆ ئێوەی ناردۆتە خوارەوە: هەر کاتێك گوێتان لێبوو کوفر بە ئایەتەکانیخوا دەکرێ و ڕەفتاری پێناکرێ و گاڵتەی پێدەکرێ، ئێوە لەگەڵیان دامەنیشن تا دەچنە ناو قسەیەکیتر، ئەگەر لەوێ دانیشن ئێوەش لە تاواندا وەکو**

**ئەوانن، خوایگەورە موونافیقەکانو کافرەکان پێکەوە لە دۆزەخدا کۆ دەکاتەوە.**

جا ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، لە کاتی کێشەی پەرلەمانتاران لە ناو (برلمان)دا بە چاوی خۆت دەبینی: چۆن یاساکانی دژ بە شەریعەتیئیسلام پەسند دەکرێنو موسوڵمانە سپۆرتەکانی ناو (برلمان)ش بە بێدەنگیو بە چاوشۆڕی دادەنیشن، خۆ ئەگەر بێدەنگیش نەبن، ئەوان بە هۆی دانیشتنەکەیان هەر تاوانبارن. بڕوانە (تفسير القرطبي) النساء (١٤٠).

***ئەوان دەڵێن:** (یُوسُف) پێغەمبەرﷺ لە دەوڵەتێکی کافردا بەشداری حوکمی کردوە، کەواتە بۆ ئێمەش دروستە بەشداری بکەین؟

**وەڵام:** ئەمەیان ئەوەندە بەڵگەیەکی نەزانانەو پوچەڵە، پێویست بە ڕەددانەوە ناکا!

**چونکە ئەگەر شەریعەتیپێغەمبەرێك–لە پێغەمبەرانیڕابردوو** علیهم الصلاة والسلام– **بە پێچەوانەی شەریعەتی پێغەمبەری ئێمە بێﷺ، نابی ئێمە ڕەفتاری پێبکەین،** پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَوْ كانَ مُوسَىﷺ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ ثُمَّ اتَّبَعْتُمُوهُ وَتَرَكْتُمُونِي لَضَلَلْتُمْ ضَلاَلاً بَعِيداً﴾ حسن بكثرة طرقه رواه الطبراني وأحمد، **ئەگەر (مُوسَى) پێغەمبەرﷺ لە نێوانتاندا بوایە، ئینجا ئێوە شوێنی بکەونو واز لە من بێنن، ئێوە گومڕا دەبن بە گومڕابوونێکی دور لە ڕاستی.**

جا بۆ ئەوەی ئەوان هیچیتر موسوڵمانان چەواشە نەکەن، ئێمە بەشداریکردنی حەزرەتی (یُوسُف) پێغەمبەرﷺ روون دەکەینەوەو دەڵێین:

حەزرەتی(یُوسُف) پێغەمبەرﷺ بەو مەرجە بەشداری حوکمی کرد: کە گشت بڕیارێك بەگوێرەی شەرعیخودا بێ لەو سەردەمدا، نەك بەگوێرەی یاسای کافرەکانی ئەو سەردەم، بە بەڵگەی ئایەتی ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ﴾ يوسف: ٥٦، **ئەوها دەسەڵاتو توانامان دابووە (یُوسُف) لە خاکی (مِصْر)دا: چۆن حەزی کردبا ئەوها دەستکاریی لە کاروباری دەوڵەتدا دەکرد.**

جا لێرەدا لێتان دەپرسین: ئایا دەگونجێ حەزکردنی حەزرەتی(یُوسُف) پێغەمبەرﷺ بەگوێرەی حەزکردنی کافرەکان بێ؟ نا، نا، پێغەمبەران–عليهم الصلاة والسلام– شتی وا ناکەن، ئەوان زۆر زۆر لە ئێوە لەخواترسترو بە غیرەتترن.

**هەم بەڵگەیەکیتریش:** کە حەزرەتی(یُوسُف) پێغەمبەرﷺ، (بنیامین)ی برایخۆی هێشتەوە، بەگوێرەی شەریعەتیخوا–لەو سەردەمدا–هێشتیەوە، چونکە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ﴾ يوسف: ٧٦، **لە یاسای پاشای (مِصْر)دا (یُوسُف) بۆی دروست نەبو: برایخۆی لە لای خۆی بهێڵێتەوە.** واتە: بەڵام بە شەریعەتی (بَنِيإِسْرائِيل) هێشتیەوە. (تفسيرالقرطبي) و(تفسير ابن كثير) يوسف (٧٥–٧٦).

جا بەڵای هەرە گەورە لەوەدایە: ئەو موسوڵمانە بەزیوانە بانگەوازی بۆ کوفری

(ديمقراطية)ش دەكەنو دەڵێن: لە (برلمان)دا بە (ديمقراطي) ڕەفتار دەكرێو (ديمقراطية)ش سيستەمێكى باشەو ئيسلاميش هەر (ديمقراطية)!؟

نَعُوذُ بِاللهِ، كەينێ (ديمقراطية) باشەو كەينێ دێتە ڕيزى ئيسلام؟! خۆ (ديمقراطية) دوژمنێكى هەرە گەورەى ئيسلامەو (طاغُوت)ى ئەم سەردەمەيەو ئازادىو بەرەڵڵايى دەداتە خەڵك تاكو هەرچى بيانەوێ بيكەن، واتە: خەڵك بەخۆى فەرمانڕەوايىخۆى بكا، هەر چەند خواو پێغەمبەريشﷺ ڕازى نەبن.

چۆن دەڵێن: (ديمقراطية) وەكو ئيسلام باشە!؟ خۆ (ديمقراطية) كافرەكانى ڕۆژئاوا دايانناوە، هەر ئەوانيش هێنايانە ناو موسوڵمانان، تاكو گومڕايان بكەنو لە ئيسلام لايانبدەن، ئيسلاميش ئايينىخودايە، پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)كانﷺ بە خەڵكيان ڕاگەياندوە، خواىگەورەش دەفەرموێ: ﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ * مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾ القلم: ٣٥و٣٦، ئايا موسوڵمانەكانو كافرەكانى تاوانبار بە يەكسانى دابنێين، ئەوە چيتانە! ئێوە چۆن ئەو بڕيارە نادروستە دەدەن؟.

جا ئێمە دەپرسين: ئايا ئيسلام هيچ ناتەواويەكى تێدايە؟ تاكو ئێوە ببنە دەلالى كافرەكانو بانگەوازى بۆ (ديمقراطية) بكەن!، ئەوە خواىگەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلا تَمُوتُنَّ إِلاّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ البقرة: ١٣٢، خواىگەورە ئايينىئيسلامى بۆ ئێوە هەڵبژاردوە، كەوابوو: ئێوە تەنها بە موسوڵمانى بمرن.

جا ئەگەر ئيسلام هيچ عەيبێكى هەبوايە چۆن خوا هەڵيدەبژارد، بەڵێ، بەڵێ: خواىگەورە (ديمقراطية)ى بۆ ئێمە ناوێو نايەوێ بە (ديمقراطي) بمرين، ئيتر بەسيەتى هيچىتر–بۆ كورسيەكەى خۆتان– موسوڵمانان لە ڕاستى لامەدەنو چەواشەيان مەكەنو (بِدْعَة)يان بۆ مەكەنە (سُنَّة)و (سُنَّة)يان لىمەكەنە (بِدْعَة)، ئايا دەزانن ئەم حەديسەى پێغەمبەرﷺ ئێوەش دەگرێتەوە؟ كە فەرموويەتى: ﴿يَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمانِ رِجالٌ يَخْتِلُونَ الدُّنْيا بِالدِّينِ، يَلْبَسُونَ لِلنّاسِ جُلُودَ الضَّأْنِ مِنَ اللِّينِ، وَأَلْسِنَتُهُمْ أَحْلى مِنَ السُّكَّرِ وَقُلُوبُهُم قُلُوبُ الذِّئابِ، يَقُولُ اللهُ عزّوجلّ: أَبِي يَغْتَرُّونَ أَمْ عَلَيَّ يَجْتَرِئُونَ؟ فَبِي حَلَفْتُ لَأَبْعَثَنَّ عَلَى أُولئِكَ فِتْنَةً تَدَعُ الْحَلِيمَ مِنْهُمْ حَيْراناً﴾ رواه الترمذي بسند حسن، لە ئاخيرى زەماندا هەندێك پياو پەيدا دەبن: بە ناوى ئايين دونيا وەدەست دێنن، بۆ فێڵكردن لە خەڵكى پيستەى مەڕ دەبەر دەكەن، ئەوەندە نەرمى دەنوێنن زوبانيان لە شەكر شيرنترەو دڵيان دڵى گورگەو مەبەستى پيسو خراپى تێدايە، خواىگەورە دەفەرموێ: ئايا ئەوانە بە من هەڵخەڵەتاون، يان سوكايەتيم پێدەكەن؟ سوێندم بە گەورەيىخۆم: ئاژاوەيەكى وەها دەنێرمە سەر ئەوانە: ژيرو عەقڵمەندەكەشيان سەرلێشێواو بكا.

بەڵێ: پێغەمبەرﷺ ڕاستى فەرمووە، ئێستا پياوماقوڵو گەورەكانيشيان بەندەو زەليلى

بەردەستی دوژمنانیئیسلامن؟ چونکە خەڵکی لە ئایینی ڕاستەقینە لادەدەنو بانگەوازی بۆ یاسای کافرەکان دەکەن، تاکو لێیان ڕازی بن، بەلام ﴿وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ أَنْ يُرْضُوهُ إِنْ كَانُوا مُؤْمِنِينَ﴾ التوبة: ٦٢، **خواو پێغەمبەریخوا ﷺ شیاوترن ڕازییان بکەن ئەگەر ئەوان بەڕاستی ئیماندارن.**

## ﴿ دەنگدان بۆ ( برلَمان )ی ( عَلْمانی ) دروست نیە ﴾

**بزانە:** به هیچ جۆرێك دروست نیە مرۆڤی موسوڵمان دەنگ بداتە گرۆهەکانی(علماني)، دەنگدانەکەشی دەبێتە شاهیدیی به درۆ، چونکە گرۆهەکانی(علماني) ڕەفتار به شەریعەتی ئیسلام ناکەن، کەوابوو: هەر مافی ئەوەشیان نیە–لە (دارُالإسْلام)دا– حوکمڕانی موسوڵمانان بکەن، ئەمە لە لایەك، لە لایەکیتریش: هەندێکیتر به ناوی ئیسلام دێنە مەیدانو دەڵێن: دەنگ بدەنە ئێمە تاکو ئەندامامان لە (برلمان) زۆر ببیو خزمەتی ئیسلام بکەین!.

**جا لێرەدا** پێویستە موسوڵمانان ئاگادار بکرێنەوە: کە ئەو دەنگدانەیان–هەروەك بۆ گرۆهەکانی(علماني) دروست نیە– بۆ ئەو جۆرە موسوڵمانانەش به هیچ جۆرێك دروست نیە؟ چونکە ئەو موسوڵمانانە بوینە هاوبەشی زاڵمەکانی(علماني) لە (برلمان)دا، بەڵکو هەندێکیان هەندێ جار دەبنە هاوپەیمانی گرۆهەکانی(علماني)، ئەم جۆرە هاوبەشیو هاوپەیمانیەش هەڕەشەی خوای دەرهەق هاتووەو خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾هود: ١١٣، **دڵتان بە لای ستەمکارەکاندا نەچێ نەوەك ئاگری دۆزەخ بتانسوتێنێ**. واتە: هاوڕێیەتییان مەکەنو بە کردەوەکانیان ڕازی مەبنو بێدەنگی لە کافربوونەکەیان مەکەن. (تفسير القرطبي) هود (١١٣).

**جا ئەگەر ئەوان بڵێن: پێغەمبەرﷺ هاوپەیمانیی لەگەڵ کافرەکان کردوە؟.**

**ئێمەش دەڵێین:** ڕاستە، پێغەمبەرﷺ وەك سەرۆکی دەوڵەتیئیسلام هاوپەیمانیی لەگەڵ کافرەکان کردوە، **بەڵام لە هەمان کاتیشدا پایتەختیئیسلام (مَدِينَة)ی پیرۆز بوو و ڕەفتار بە شەریعەتیئیسلام دەکراو کافرەکان هیچ دەسەڵاتێکیان بە سەر موسوڵماناندا نەبو، چونکە پێغەمبەرﷺ چەکی(جِهاد)ی هەر لە دەستدا بوو و لە غەزا کردندا هەر بەردەوام بوو،** کەواتە: هاوپەیمانیەکە تەنها بۆ ئەوە بوو: ئەو کافرانە جەنگی لە دژ نەکەنو هێزی دوژمنانیئیسلام کەم ببێتەوە.

جا–بە پێچەوانەوە–جەنابتان بە فەرمانی گرۆهەکانی(علماني) چەکی (جِهاد)و شەڕەفتان داناوەو لە جیاتی چەکی (جِهاد) زوڕناو مۆسیقاتان بە دەستەوە گرتووەو لە سەر کورسیی ستەمکاری پاڵتان داوەتەوەو موسوڵمانە بە غیرەتەکانیشتان–وەکو خۆتان– بێغیرەت کردونو بەرەی (علمانية)کانتان بەهیز کردوەو بەو هاوبەشیەتان مافتان داوەتە (علمانية)کان: لە ناو (دارالاسلام)=خاکی موسوڵماناندا بە یاسای کوفر ڕەفتار بکەنو بە

سەر موسوڵمانانداو بیسەپێنن، ئێوەش ئایینی ڕاستەقینەتان لە موسوڵمانان شێواندووەو موسوڵمانەکانتان پەرتەوازە کردون، بە ئەندازەیەکی وەهاش ئیسلامتان کردۆتە حیزبایەتی: پیرۆزبایی دامەزراندن لە حیزبی(شیوعی)ش دەکەن!،
پیرۆزبایی چی لێدەکەن؟ پیرۆزبایی ئەوە کە دەڵێ: **(خوا نیە)**، **(ئایین تریاکی گەلەکانە)**!. ئەم پیرۆزباییەی ئێوە چ جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ پیرۆزبایی لە کافرەکانی (قُرَیْش) کە دەیانگوت: **خودا هاوبەشی هەیە**، (مُحَمَّد)شﷺ **درۆزنە؟**
یان ئێوە وا تێدەگەن بانێکەو دوو هەوایە!؟ نا، هیچ جیاوازیەکی نیەو پیرۆزباییەکەتان دەبێتە ڕازیبوون بە کوفری (مارکسیة)، ڕازیبوونیش بە کوفر کافربوونە، بە بەڵگەی ئایەتەکەی ﴿فَلا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ﴾یراببردوو، هەم بروانە (تفسیرالقرطبي) النساء (١٤٠).

## ﴿ مەرجەکانی دەنگدەر و دەنگ بۆ دراو ﴾

ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، ئەم جۆرە هەڵبژاردنەی (برلمان)—کە ئێستا دەکرێ— ناشەرعیەو (بِدْعَة قَبِیحَة)یەو لە سەردەمی پێغەمبەرووﷺ (صحابة)و (التابعین)دا ئەم جۆرە هەڵبژاردنە نەبوە، بەڵکو کافرەکانی ڕۆژئاوا ئەم جۆرە هەڵبژاردنەیان بە ناوی (دیمقراطیة) پەیدا کردوەو موسوڵمانەکانیش بست بە بستو گەز بە گەز شوێنیان کەوتون.
بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی لاڤ ئیسلامەتی لێئەدەن، بە ناوی ئیسلام داوای دەنگدانت لێدەکەنو دەڵێن: خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾الشوری: ٣٨، **کاروباریان لە نێوانیاندا بە پرسو ڕایە.**
هەم دەڵێن: پێغەمبەرﷺ لە پەیمانی (اَلْعَقَبَة)دا بە پەیماندەرەکانی (مَدِینَة)ی فەرموو: **(دوانزە نوێنەریخۆتان بۆ من دیاری بکەن)**. هەم لەبارەی دەسکەوتووی غەزای (حُنَیْن)ش فەرمووی: **(با سەرکردەکانتان ئیزندانەکەتان بۆ من بێنن)**.
بەم بەڵگانە چەواشەت دەکەن؟ چونکە لە خوێندنەوەی ئایەتەکەدا فێڵت لێدەکەنو سەرو بنی ئایەتەکە دەدزنو نایڵێن، بەڵام کە ئایەتەکە بە تەواوی بخوێنیەوە، دەبینی هەر لەو ئایەتەدا چوار مەرج وەردەگیرێن: بۆ دەنگدەرو بۆ دەنگ بۆ دراو، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ الشوری: ٣٨، **ئەوانەی گوێڕایەڵی خوایخۆیان دەبن، واتە: شوێن شەریعەتی پێغەمبەرەکەی دەکەون، هەم نوێژەکانیش بە مەرجەکانیەوە ئەنجام دەدەنو فەرمانی پێدەکەن، هەم کاروباریخۆیان لە نێوان خۆیاندا بە ڕاوێژکردنە، هەم لەو ماڵەی داومانێ ئەوان دەیبەخشنە هەژاران.**
جا ئیمامی(الماوردي) ئەم چوار مەرجانەی لە یەکەمین مەرجەکانی هەڵبژاردندا کۆ کردونەوەو فەرموویەتی: ئەوانەی کاربەدەست هەڵدەبژێرن دەبی سێمەرجیان تێدا بێنەجێ:

**یەکەم: (عَدالَة)=دادپەروەر بن و هەموو مەرجەکانی دادپەروەرییان تێدا بێ.**
**دووەم: زانستێکی وەهیان هەبێ بزانن کێ شیاوی کاربەدەستییە.**
**سێیەم: بیرو لێزانینێکی وەهایان هەبێ بتوانن کەسێکی شیاوترو بە تواناتر دابنێن بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری موسوڵمانان.**

ئینجا حەفت مەرجیشی بۆ کاربەدەستی هەڵبژێردراو داناون: یەکەمیان: (اَلْعَدالَة)= دادپەروەری بە هەموو مەرجەکانیەوە، واتە: نوێژو ڕۆژوو و گشت خواپەرەستیەکانی واجب بکا، هەم خۆی لە گوناهە گەورەکان بپارێزێو بەردەوام نەبێ لە سەر گوناهە بچوکەکان، هەم پیاوەتیو گرانقەدریخۆی بپارێزێ...(الأحكام السلطانية) ل(١٦).

جا دەڵێین: پەیماندەرەکانی (مَدينَة) هەر هەموویان ئەو مەرجانەیان تێدا هاتبونە جێو پەیمانیان دا: پێغەمبەرﷺ لە زیانی کافرەکان بپارێزن. دەنگدەرەکانیانو دەنگ بۆ دراوەکانیان بە یەکسانی شیاوی نوێنەرایەتی بون، چونکە (صَحابَة) بونو دەستیان لە ناو دەستی پێغەمبەرﷺ دانابوو، هەم (صَحابَة)کانی غەزای (حُنَيْن)ش بە لێدانی ڕمو شمشێر دەستکەوتووەکەیان وەدەست هێنابوو، کەوابوو: جیاوازی ئێوەو ئەوان ئاسمانو ڕێسمانە؟ چونکە ئێوە ناتوانن موسوڵمانێکیش لە زیانی کافرەکان بپارێزنو بۆ مەبەستیخۆتان دەست لە ناو دەستی کافرەکان دادەنێن.

جا گومان لەوەدا نیە: کە دەنگدەرو دەنگ بۆ دراوی (علمانیە)کان زۆرینەیان–وەکو (قُرَيْشِي)یەکانی (مَكَّة)– نوێژ نەکەرو زەکات نەدەرو شەڕابخۆرو ڕیباخۆرن...هتد، کەوابوو: ئەوان هیچ مەرجێکیان لێنەهاتۆتە جێ، هەروەها مەرجی ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ لە هیچێکتان نایەتە جێ: نە لە ئێوەو نە لە (علمانیة)کان، چونکە هەردوو لا لە لای حیزبەکەی خۆتان فەرمانتان بۆ دێ: ئەوها دەنگ بدەن، ئەوها دەنگ مەدەن.

کەواتە: ئێوەو ئەوانیش بەرژەوەندیی ئیسلامو موسوڵمانان ڕەچاو ناکەن؟ بەڵکو بەرژەوەندیی حیزبەکەیخۆتان لە پێش هەموو شتێکدایە، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾الروم: ٣٢، **هەر حیزبێك بە بەرنامەیخۆی ڕازییەو پێی خۆشە.**

جگە لەمەش: دەنگدانەکەی ناو (برلمان) بە یاسای (دیمقراطیة) بەڕێوە دەچێ، نەك بە شەریعەتیئیسلام، ئەمە لە لایەك، لە لایەکیتریش: ئەندامەکانیئێوەش–وەکو (علمانیە)کان– شیاوی ئەوە نین ببنە نوێنەری موسوڵمانان؟ چونکە شارەزای شەریعەتی ئیسلام نینو لە هیچ خوێندگایەکی ئایینی نەیانخوێندووە، بەڵکو هەمووتان وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِراً مِنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ﴾الروم: ٧، **ئاشکراییەکی ژیانی دونیا دەزانن و ئەوان لە کاروباری قیامەت بێئاگانە.**

جا له كۆتـایی‌دا ئـه‌ی موسـوڵمانی ڕێـزدار بـه‌ ئامۆژگاریه‌كـه‌ی پێغه‌مبـه‌رﷺ ئامۆژگاریـت ده‌كه‌م: واز له‌و گرۆهانـه‌ی ئیـسلامی‌و (علمـاني) بێنـه‌و لـه‌ خـوا بپـاڕێوه‌: سـه‌ركرده‌یه‌كی موسوڵمانی ڕاسته‌قینه‌مان بۆ دابنێ‌و ڕه‌فتار به‌ شه‌ریعه‌تی‌ئیسلام بكا، تاكو ئێمه‌ش له‌ ژێر ئاڵای ئه‌ودا ببینه‌ سه‌ربازێكی ڕێگای خوداو له‌ ڕێی خوا (جِهاد) بكه‌ین.

له‌ حه‌دیسێكی درێژدا حه‌زره‌تی(حُذَيْفَة)ﷺ له‌م بابه‌ته‌ چه‌ند پرسیارێكی له‌ پێغه‌مبه‌رﷺ كردو گـوتی: ﴿...فَهَلْ بَعْدَ هَذَا الْخَيْرِ مِنْ شَرٍّ؟ قَالَﷺ: نَعَمْ، دُعاةٌ عَلَى أَبْوابِ جَهَنَّمَ مَـــنْ أَجابَهُمْ إِلَيْها قَذَفُوهُ فِيها. قُلْتُ: يارَسُولَ الله صِفْهُمْ لَنا؟ قَالَﷺ: هُم مِنْ جِلْدَتِنا وَيَتَكَلَّمُـــونَ بِأَلْسنَتِنا. قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي إِنْ أَدْرَكَنِي ذَلِكَ؟ قالَﷺ: تَلْزَمُ جَماعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَإِمامَهُمْ. قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ جَماعَةٌ وَلا إِمامٌ؟ قالَﷺ: فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّها وَلَوْ أَنْ تَعَـــضَّ بِأَصْـــلِ شَجَرَةٍ حَتّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وَأَنْتَ عَلَى ذَلِكَ﴾ رواه الشيخان، ئایا لـه‌ دوای ئـه‌و چاكه‌یه‌ی ئیسلام خراپه‌یه‌ك ده‌بێ؟ پێغه‌مبـه‌رﷺ فـه‌رمووی: بـه‌ڵێ، چـه‌ند بانگـه‌وازكارێك لـه‌ سه‌ر ده‌رگای دۆزه‌خن، هه‌ر كه‌سێك به‌ ده‌م بانگه‌وازه‌كه‌یان بچێ فڕێی ئه‌ده‌نه‌ ناو دۆزه‌خ. گــوتم: ئـــه‌و بانگه‌وازكارانـــه‌مان بـــۆ ڕوون بكـــه‌وه‌ چـــۆنن؟ پێغه‌مبـــه‌رﷺ فه‌رمووی: ئه‌وانیش له‌ هۆزی ئێمه‌ی ئاده‌میزادن‌و به‌ زمانی ئێمه‌–به‌ حه‌دیـسه‌كانی پێغه‌مبــه‌رﷺ– قـسه‌ ده‌كـه‌ن. گـوتم: ئه‌گـه‌ر ئـه‌م وه‌زعـه‌م گه‌یـشتێ چ فـه‌رمانمێكم پێ‌ده‌كـه‌ی؟ پێغه‌مبـه‌رﷺ فـه‌رمووی: كۆمه‌ڵی‌موسـوڵمانان‌و پێـشه‌وای‌موسوڵمانان بگـره‌و لێیـان جیا مه‌به‌وه‌. گـوتم: ئـه‌ی ئه‌گـه‌ر موسـوڵمانه‌كان كۆمـه‌ڵ‌و پێـشه‌وایان نه‌بو–واته‌: پارچه‌ پارچه‌ بون– چی بكه‌م؟ پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: خۆت له‌و هه‌موو گرۆهانـه‌ جیـا بكـه‌وه‌ بـه‌ گـشتی، هه‌رچـه‌ند بـه‌ ددان بنكـه‌ دارێك بگـری تـا مردنـت ده‌گاتی تۆ هه‌ر ئه‌وها به‌ بێ‌لایه‌نی بمێنه‌وه‌.

ئیمام (ابـن حجـر العـسقلانی) فه‌رموویـه‌تی: حه‌دیـسه‌كه‌ به‌ڵگه‌یـه‌: ئه‌گـه‌ر موسـوڵمانه‌كان پێشه‌وایان نه‌بو و بونه‌ چه‌ند حیزب‌و گرۆهێك، نابی موسوڵمان شـوێن هیـچێكیان بكـه‌وێ‌و ده‌بی خۆی له‌ هه‌مووانیان جیا بكاته‌وه‌؟ نه‌وه‌ك توشی خراپه‌ ببێ. (فتح الباری) ب(١٣) ل(٤٧).

**دووه‌م: له‌تبوونی مـانگی چـوارده‌ بـه‌ ئامـاژه‌ی پێغه‌مبـه‌رﷺ**، خوای‌گـه‌وره‌ ده‌فـه‌رموێ: ﴿وَانْشَقَّ الْقَمَرُ...﴾ القمر: ١و٢، مانگ له‌ت بوو. (عاجز) ده‌فه‌رموێ:

چه‌ند موشریكان دیتیان به‌ چاو * بۆی شـه‌ق ده‌بوو (بَدْر)ی ته‌واو

لـه‌ مـوشـریـكـی نـه‌بـون بـلاو * گـــوێیـان نــه‌دا نـازداری مــن

ئه‌مه‌ش یه‌كێكه‌ له‌ (مُعْجِزَة) گه‌وره‌كانی پێغه‌مبه‌رﷺ، كـه‌ بـه‌ ئایـه‌تی قورئـان‌و حه‌دیـسی (صحیح) ئاشكرا بووه‌و گومانی تێ‌دا نیه‌، به‌ڵام له‌ به‌ر ئه‌وه‌ی له‌ شه‌وێ‌دا ئه‌م (مُعْجِزَة)یـه‌ ڕووی‌داوه‌ هه‌موو خه‌ڵكێك نه‌یبینی؟ چونكه‌: یان خه‌وتبون، یان له‌ ناو خانووه‌كانـدا بـون،

جا ئەو کافرانەی لەتبوونەکەیان بە چاوی خۆیان دیتو گوتیان: ئەوە سیحرە. هەر ئەوانیش گوتیان: خۆ (مُحَمَّد) ناتوانێ سیحر لە هەموو خەڵکی بکا، با لە ڕێبوارەکانیش بپرسین: ئایا ئەوانیش ئەم لەتبوونەیان دیتووە؟ چونکە ڕێبوارەکان لە شەوێدا لە ڕووناکایی مانگدا دەڕۆن، جا ڕێبوارەکانیش هاتنەوەو گوتیان: ئێمەش ئەم لەتبوونەمان بە چاویخۆمان دیت. کەواتە: بەمە دەیسەلمێنین کە ئەو لەتبوونە سیحر نیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر باوەڕیان بە پێغەمبەرﷺ نەبو. (شرح صحیح مسلم) ب(٧) ل(٢٦١) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٢٣٢-٢٣٤).

**پێناسە:** (مُعْجِزَة)=بێتواناکردن، کارێکە لە سنوری توانای ئادەمیزاددا نیە، خوایگەورە لە کاتی مەیدان خواستنەوەدا لە سەر دەستی پێغەمبەرانی خۆی-علیهم الصلاة والسلام- ئەیهێنێتە جێ، تاکو باوەڕیان پێبکرێ کە ئەڵێ: (من پێغەمبەری خوام). وەکو نەسوتانی حەزرەتی(إبْراهِیم) پێغەمبەرﷺ، دار عەسای حەزرەتی(مُوسی) پێغەمبەرﷺ، لەتکردنی مانگ بە ئاماژەی پێغەمبەرمان (مُحَمَّدُالْمُصْطَفَی)ﷺو چەند (مُعْجِزَة)یەکیتریش. جا گەورەترینو بەهێزترین (مُعْجِزَة)ی پێغەمبەرمانﷺ: قورئانی پیرۆزە؟ چونکە تا ئێستا هیچ کەسێك نەیتوانیوە دەستکاریی بکا، یان ئایەتێکی وەکو قورئان بێنێ.
جا بزانە: (مُعْجِزَة) لە بەهێزی بەڵگەیدا ئەکاتە ئەو پلەیە کە خوایگەورە بفەرموێ: (بەندەی من ڕاست ئەکا لە هەموو ڕاگەیاندنێکی لە لای منەوە). (تحفةالمرید) ل(٧١-٧٥).

***          ***          ***

## ﴿ کۆچکردنی موسوڵمانان بۆ (حَبَشَة)و...گەمارۆدانی خزمەکانی پێغەمبەرﷺ ﴾

(**حَبَشَة**) ئێستا پێی دەگوترێ: (إثْیُوبیا)، پایتەختەکەشی (أدیس أبابا)یە، دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی باکوری (أفریقیا)، (البَحْرالأحمَر)=دەریای سوور سنوری لای ڕۆژهەڵاتیەتی.
جا کە پێغەمبەرﷺ دیتی موسوڵمانەکان زیاتر ئازار دەدرێنو ناشتوانێ بەرگرییان لێبکا، فەرمووی: ﴿لَوْ خَرَجْتُمْ إلَی أرْضِ الْحَبَشَةِ فَإنَّ بِها مَلِكاً لا یُظْلَمُ عِنْدَهُ أَحَدٌ وَهِيَ أَرْضُ صِدْقٍ، حَتّی یَجْعَلَ اللهُ لَكُمْ فَرَجًا مِمّا أَنْتُمْ فِیهِ﴾ رواه ابن إسحاق، ئەگەر لە (مَكَّة) بڕۆنە دەرەوە بۆ وڵاتی (حَبَشَة)-وا باشە- چونکە لەوێ پاشایەك هەیە، لە لای وی هیچ کەسێك ستەمی لێناکرێ، ئەوێ وڵاتی ڕاستیە، تا خوایگەورە ئەو ناخۆشیەی ئێوە تێیدانە بۆتانی دەکاتە خۆشی.
ئەم پاشایەی (حَبَشَة) دیان بوو، لە سەر ئایینی حەزرەتی (عِیسَی) پێغەمبەرﷺ بوو، ناوی (أصْحَمَة) بوو، پێی دەگوترا: (النَّجاشِي)، ئینجا لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ موسوڵمان بوو و لە ساڵی (٩) نۆی کۆچیدا بە موسوڵمانی وەفاتی کردرضي الله عنه.

ئیتر لە مانگی (رَجَب) ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتی، موسوڵمانەکان دەستیان بە کۆچکردن کرد بۆ (حَبَشة)، یەکەم کەس کۆچی کرد: ئیمام (عثمان)ﷺ بوو، خۆیو ژنەکەی: کە (رُقَيَّة)ی کیژی پێغەمبەرﷺ بوو، ئینجا لە دوای ئەویش موسوڵمانان بە دوای یەکدا بە نهێنی لە (مَكَّة) دەردەچون بۆ کەناری دەریای سوور، تا لەوێ چینی یەکەمی کۆچکەرەکان ژمارەیان بووە یازدە پیاو و چوار ئافرەت، جا کافرەکانی (قُرَيْش) تا سەر لێوی دەریای سوور بە دوایاندا هاتن، بەڵام نەیانگەیشتنێ، چونکە ئەوان لەوێ کەشتیەکیان بە نیو دیناری زێڕ بە کرێ گرتو گەیاندنیە (حَبَشَة).

ئینجا لە دوای ئەوانەش بەرە بەرە موسوڵمانەکان بە دوای یەکدا بە نهێنی کۆچیان دەکرد بۆ (حَبَشَة)، تا ژمارەیان لە سی کەس زیاتر بوو؟ چونکە لە دوای سێ مانگ سیو سێ کەس لەو کۆچکەرانە گەڕانەوە بۆ (مَكَّة)–کە ئیمام (عثمان)ﷺ یەکێك بوو لەوان– هەندێکش لە (حَبَشَة) مانەوە، جا هۆی گەڕانەوەشیان ئەوە بوو:

لەو ماوەیەدا ئیمام (حَمـزَة)ی مامی پێغەمبەروﷺ ئیمام (عمر بن الخطاب) هەردووکیان موسوڵمان بون-رضي الله عنهما- هەروەك (الصلابي) فەرموویەتی، هەم هەواڵێکی ناڕاستیش بڵاو بۆوە، گۆیا: کافرەکانی (مَكَّة) هەموویان موسوڵمان بوینە، بۆیێ کۆچکەرەکانی (حَبَشَة) گوتیان: کە ئەوانە موسوڵمان بوبن، ناو خزمو کەسیخۆمان پێ خۆشترە، بۆیێ ئەوانە گەڕانەوە، جا کە هاتنەوە (مَكَّة) بۆیان ئاشکرا بوو: هەواڵەکە ڕاست نیە، جا ئەمەیان پێی دەگوترێ: (الهِجْرَةُ الأولى)=کۆچکردنیەکەم بۆ (حَبَشَة).

ئیتر ئەو موسوڵمانانەی گەڕانەوە، هەر یەکەیان لە ژێر پاراستنی کەسێکدا هاتەوە (مَكَّة)و لەوێ مانەوە تا کافرەکان گەمارۆیان لە سەر خزمەکانی پێغەمبەرﷺ داناو زیاتریش موسوڵمانانیان ئازار دان، ناچار بۆ جاریدووەمیش پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: موسوڵمانان کۆچ بکەن بۆ (حَبَشَة)، جا ئەم جارە زۆربەی موسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ (حَبَشة)، تا ژمارەیان گەیشتە (٨٣) هەشتاو سێ پیاو و (١٨) هەژدە ئافرەت –جگە لە منداڵە بچوکەکانیانو ئەوانەی لەوێ لە دایك بون– ئیتر ئەم جارە هەر لەوێ مانەوە، تا پێغەمبەرﷺ کۆچی کرد بۆ (مَدِينـة)، ئینجا ئەوانیش هەمویان لە (حَبَـشَة)وە گەڕانەوە بۆ (مَدِينة)، هەروەك ئیمامی(البخاري) گێڕاویەتیەوە.

**﴿ ئیمام ( أَبُوبَكْر )ش ﷺ ویستی کۆچ بکا بۆ ( حَبَشَة )و گەڕاندیانەوە ﴾**

کە بە هۆی گەمارۆدانی خزمەکانی پێغەمبەرﷺ موسوڵمانەکان بە فەرمانی پێغەمبەرﷺ دووەم جار کۆچیان کرد بۆ (حَبَشَة)، ئیمام (أبُوبَكْر)ش ﷺ بەرەو (حَبَشَة) کەوتنە ڕێ، تا گەیشتە (بَرْك الغَماد) لەوێ (ابن الدُّغْنَة)ی سەرۆك عەشیرەتی (القارَة)ی گەیشتێو پێی گوت: ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ ئیمام (أبُوبَكْرﷺ) فەرمووی:

گەلەکەیخۆم دەریان کردومو دەمەوێ لە زەمیندا بگەڕێمو خوا بپەرستم. (ابن الدُغنة) گوتی: پیاوی وەك تۆ نابی دەربکرێ!. جا لەگەڵ خۆیا گەڕاندیەوە بۆ (مَكّة)، بە خۆیشی چووە لای گەورەکانی (قُرَیش)و پێی گوتن: پیاوی وەك (أبُوبَکْر) نابی دەربکرێ، (أبُوبَکْر) پیاوێکە: یارمەتی نەبووان دەداو مافی خزمایەتی دەداو باری لێقەوماوان هەڵدەگرێو میوانداری دەکاو یارمەتی لە سەر ڕووداوەکانی ڕاست دەدا، ئەوە (أبُوبَکْر) لە ژێر پاراستنی منداییەو من دەیپارێزم. ئیتر (قُرَیش) نەیانتوانی (ابن الدُغنة) بە درۆزن دابنێنو پاراستنەکەیان لێقبوڵ کرد.

﴿ پیلانی کافرەکانی ( قُرَیْش ) لە دژی کۆچکەرەکانی ( حَبَشَة ) ﴾

ئینجا کە کافرەکانی(قُرَیش) زانییان: (صَحابَة) کۆچکەرەکان لە (حَبَشَة)دا حاوێندراوەو ڕێزیان لێندراو پارێزران، پیلانێکیان لە دژی ئەو کۆچکەرانە داناو بڕیاریان دا: وەفدێکی پێکهاتوو لە (عَمْرو بن العاص)و (عَمارة بن الوَلِید) بنێرنە لای (النجاشي)ی پاشای (حَبَشة)، چەند دیاریەکی باشیش لەگەڵ خۆیاندا بۆ (النجاشي)و گەورە کاربەدەستەکانی ببەنو داوای لێبکەن: ئەو کۆچکەرانە بگەڕێنێتەوە بۆ (مَكّة).

جا وەفدەکە چووە (حَبَشَة)و پێشدا لەگەڵ گەورە کاربەدەستەکانی(حَبَشَة) کۆ بونەوەو هەر یەکەو دیاریەکیان دانێو داوایان لێکردن: یارمەتییان بدەنو قەناعەت بە (النجاشي) بێنن: تاکو موسوڵمانە کۆچکەرەکان بگەڕێنێتەوە بۆ (مَكّة)و هیچ قسەیەکیش لەگەڵ ئەو موسوڵمانانە نەکا.

ئینجا وەفدەکە لەگەڵ کاربەدەستەکان چونە لای (النجاشي)و دیاریەکەی ئەویشیان لەگەڵ خۆیانا بردو (النجاشي) دیاریەکەی لێقبوڵ کردن، ئینجا وەفدەکە بە (النجاشي)ی گوت: (ئەی پاشا، چەند گەنجێکی کەم عەقڵ لە عەشیرەتو خزمەکانی ئێمە هاتونەتە ناو خاکی تۆ، وازیان لە ئایینی گەلەکەیخۆیان هێناوەو نەشهاتونە سەر ئایینی تۆ، بەڵکو ئایینێکی تازەیان هێناوە، هیچێکمان ئەو ئایینە ناناسین، بۆیێ گەورەکانی خزمو عەشیرتەکەیان ئێمەیان ناردۆتە لای تۆ، تاکو بیانگەڕێنیەوە لای ئەوان، چونکە خزمەکانیخۆیان باشتر شارەزای ئەوانن).

جا گەورە بەرپرسەکانی (حَبَشَة)ش گوتیان: (ئەی پاشا ئەوانە ڕاست دەکەنو ئەوانە باشتریان دەناسن، کەوابوو: ئەو کۆچکەرانە تەسلیمی ئەوان بکەوەو با لەگەڵ خۆیانا بیانبەنەوە وڵاتیخۆیان).

بەڵام (النجاشي) لە وەڵامدا گوتی: (نا، وَاللهِ تەسلیمیان ناکەم و فێڵیش لەو کەسانە ناکرێ کە منیان لە هەموو کەسێك بە پیاوتر داناوەو هاتونەتە ژێر سێبەری من تاکو بیانپارێزم، تا نەزانم ئەوان لە سەر چ ئایینێکن؟ جا ئەگەر وەفدەکە ڕاست بکا،

ئەوە تەسلیمیان دەكەم، ئەگەر نا، با هەر لە لای من بمێننەوە).

ئینجا (النجاشي) فەرمانی دا: قەشەكانیخۆی بە ئینجیلەوە بێن‌و موسوڵمانە كۆچكەرەكانیش بێنە لای. جا هەندێك لە موسوڵمانەكان گوتیان: ئێمە لە لای (النجاشي) چی بڵێین؟ ئەوانیتر گوتیان: پێغەمبەرﷺ چی فێر كردوین ئەوەیان دەڵێین. جا موسوڵمانەكان بڕیاریان دا: (جَعفَر)ی كوڕی (أبُوطالِب)ی مامی پێغەمبەرﷺ قسەكەری ئەوان بێ، جا كە هاتنە لای (النجاشي)، سەلامیان لێكرد، جا پێیان گوتن: لە بەر چی سوجدە بۆ پاشا نابەن؟ لە وەڵامدا گوتیان: پێغەمبەرمانﷺ فەرمانی پێ كردوین: جگە لە خوا سوجدە بۆ هیچ كەسێك نەبەین.

جا (النجاشي) لێی پرسین: ئەو ئایینەی ئێوە چ ئایینێكە؟ بۆچی لە خزم‌و كەسانی خۆتان جیا بوینەوە؟ حەزرەتی(جَعفَر)ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: (ئەی پاشا ئێمە گەلێكی كافر بوین‌و بت‌و سەنەممان دەپەرست‌و مردارمان دەخواردو لەگەڵ یەكتری خراپ بوین‌و مافی خزمایەتیمان نەدەداو یەكتریمان بە ناهەق دەكوشت‌و بەهێزەكەمان بێهێزەكەی دەچەوساندەوە، تا خوایگەورە پێغەمبەرێكی لە خۆمان بۆ ئێمە نارد، باش دەیناسین: خاوەن نەژادەو ئەمین‌و ڕاستگۆیە، داوای لێكردین: تەنها خوا بپەرستین‌و هاوبەشی بۆ دانەنێین، لەگەڵ خزمەكانمان باش بین، ڕاستگۆ بین، ئەمین بین، یارمەتی هەژاران بدەین، یەكتری بە ناهەق نەكوژین، نوێژو ڕۆژوو بۆ خوا بكەین، جا ئێمەش باوەڕمان پێكرد و شوێنی كەوتین‌و بوینە موسوڵمان، جا خزم‌و كەسەكانمان دوژمنایەتییان كردین‌و ئازاریان داین‌و ویستیان لە ئیسلامەتییەوە بمانگەڕێننەوە سەر بتپەرستی‌و بگەڕێینەوە سەر ڕەوشتە خراپەكانی كافرەكان، بۆیێ ئێمەش كۆچمان كرد بۆ وڵاتی تۆ، تۆمان بە باشتر دانا لە هەموو كەسێكیتر، چاوەڕوانی ئەوەت لێدەكەین لە ژێر سێبەری تۆدا ستەممان لێنەكرێ).

جا (النجاشي) گوتی: ئایا ئەو قوڕئانەی خوا بۆ پێغەمبەركەتانی ناردوە، هیچی لە لاتان هەیە؟ لە وەڵامدا حەزرەتی(جعفر)ﷺ فەرمووی: بەڵێ. (النجاشی) گوتی: بۆم بخوێنەوە. جا حەزرەتی(جعفر)ﷺ سەرەتای سوڕەتی (كهیعص)ی بۆ خوێندەوە، جا ئەم قوڕئانخوێندنە ئەوەندە كاری لێكردن: (النجاشي) ئەوەندە گریا تا ڕیشی بە فرمێسكەكانی تەڕ بوو، هەروەها قەشەكانیش گریان تا ئینجیلەكانیان بە فرمێسكەكانیان تەڕ بون، چونكە ئینجیلەكانیان كردبونەوە، جا (النجاشی) گوتی: (إِنَّ هَذا وَالَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَى لَيَخْرُجُ مِنْ مِشْكاةٍ واحِدَةٍ، إِنْطَلِقا فَوَاللهِ لاَ أُسَلِّمُهُمْ إِلَيْكُما أَبَداً وَلاَ يُكادُونَ) رواه الإمام أحمد، ئەم قوڕئانەو ئەو ئایینەی (مُوسَی) پێغەمبەرﷺ لە لای

خوا هێناویەتی، هەردووکیان لە یەك دەلاقە دەردەچن، هەڵسن بڕۆن، وَاللهِ ئەو موسوڵمانانە تەسلیمی ئێوە ناکەمەوەو نابێ فێڵیان لێبکرێ. بزانە: ئاینی حەزرەتی (عِیسَی) پێغەمبەرﷺ تەواوکەری ئاینی حەزرەتی(مُوسَی) پێغەمبەرەﷺ، بۆیێ (النَّجاشِي) باسی نەکرد.

جا کە وەفدەکە ئەمڕۆ لەم پیلانەیدا سەرکەوتوو نەبو، سبەنێ جارێکیتر هاتنەوە لای (النجاشی)و گوتیان: ئەم کۆچکەرانە لەبارەی (عِیسَی) پێغەمبەرﷺ قسەیەکی زۆر گەورە دەکەن، بەخۆت لێیان بپرسە؟.

جا ئەم جارەش (النجاشی) ناردی موسوڵمانەکان هاتنو لێی پرسین: ئێوە لەبارەی (عِیسَی) پێغەمبەرﷺ چی دەڵێن؟ حەزرەتی(جعفر)رضي الله عنه فەرمووی-وەك پێغەمبەرمانﷺ فەرموویەتی- دەڵێین: ﴿(عِیسَی) بەندەو پێغەمبەری خوایەﷺ ڕوح و فەرموودەی خوایە-بە بێ باوك-خوایگەورە خستویەتیە زگی (مَرْیَم)=کیژە بێمێردەکە﴾.

جا (النجاشي) زڵکە دارێکی لە زەوی هەڵگرتەوەو فەرمووی: (ما عَدا عِیسَی ابْنُ مَرْیَمَ ما قُلْتَ هَذا الْعُودَ) رواه الإمام أحمد، (عِیسَی)ی کوڕی (مَرْیَم) بە قەد ئەم دارۆچکەیە زیاتر نیە لەوەی تۆ گوتت. جا بەم قسەیە گەورە کاربەدەستەکانی (حَبَشَة) پرتە پرتیان لێهاتو (النجاشي)ش پێی گوتن: پرتەپرتیش بکەن، هەر ئەو قسەیە ڕاستە.

جا (النجاشي) گوتی: دیاریەکانیشیان بدەنەوەو پێویستیمان پێ نیە، ئێوەش ئەی موسوڵمانەکان لە وڵاتی مندا ئەمینن، هەر کەسێك ئازارتان بدا، یان جنێوتان پێبدا، چوار دیرهەمی زیو سزای لێدەستێنین.

جا وەفدەکەی (قُرَیْش) بە سەر شۆڕی گەڕاوە (مَکّة)، موسوڵمانەکانیش هەر لە (حَبَشَة)دا مانەوە، تا پێغەمبەرﷺ کۆچی کرد بۆ (مَدِینَة)، جا موسوڵمانەکان لەوێوە هاتنەوە (مَدِینَة)ی پیرۆز.

حەزرەتی(جعفر)رضي الله عنه دەفەرموێ: کە ویستمان لە (حَبَشَة)وە بۆ (مَدِینَة) بگەڕێینەوە، (النَّجاشِي) ئازوقەی ڕێگەشی داینێو نوێنەرێکیخۆیشی لەگەڵدا ناردینو پێی گوتم: بە پێغەمبەرﷺ بڵێ: داوای لێخۆشبوونی گوناهەکانم لە خوا بۆ بکا، (أَشْهَدُ أَنْ لاّ إِلَهَ إلاّاللّهُ وَأَنَّهُ رَسُولُ اللهِ)-واتە: (النجاشي)رضي الله عنه بە نهێنی بووە موسوڵمان-جا کە هاتینەوە خزمەت پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەرﷺ سێ جار دوعای بۆ کردو فەرمووی: ﴿اَللّهُمَّ اغْفِرْ لِلنَّجاشِيِّ﴾ خوایە لە (النَّجاشِي) خۆش ببە. (صحابة)کانیش گوتیان: آمین. هەروەها کە (النَّجاشِي)رضي الله عنه وەفاتی کرد، پێغەمبەرﷺ لە (مَدِینَة)وە نوێژی جەنازەی لە سەر کرد، هەروەك (البخاري)و (مسلم) گێڕاویەتیانەوە.

کە موسوڵمانەکان کۆچیان کرد بۆ (حَبَشَة)، ڕۆژێك (أبُوجَهْل) لە لای (صَفا) گەیشتە پێغەمبەرﷺ جنێوی پێداو سوکایەتی پێکرد، ئافرەتێکیش چاوی لەو ڕووداوە بوو، جا (أبُوجَهْل) چووە شوێنی دانیشتنی (قُرَیْش) لە لای (كَعْبَة)، جا لەو کاتەدا (حَمْزَة)ی مامی پێغەمبەرﷺ لە ڕاوکردن گەڕاوەو بەرەو (كَعْبَة) هات، ئافرەتەکەش ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە، جا (حَمْزَة) توڕە بوو و یەکسەر ڕووی کردە لای (أبُوجَهْل)و کەوانێکی لە سەری (أبُوجَهْل) دا و بریینداری کردو گوتی: چۆن جنێو بە کوڕی برام ئەدەی؟ خۆ منیش لە سەر ئایینی ئەوم، ئەگەر دەتوانی وەڵامم بدەوە، من شاهیدی دەدەم: (مُحَمَّد) پێغەمبەری خوایەﷺ.

بەڵام (أبُوجَهْل) نەوێرا وەڵامی ئیمام (حَمْزَة)رضي الله عنه بداتەوە، ئینجا ئیمام (حَمْزَة)رضي الله عنه سبەینێ چووە خزمەت پێغەمبەرﷺ ئیسلامەتیخۆی ئاشکرا کرد، پێغەمبەریشﷺ زۆر بە موسوڵمانبوونی ئیمام (حَمْزَة)رضي الله عنه خۆشحاڵ بوو، چونکە ڕێزدارترو لێهاتووتری گەنجەکانی (قُرَیْش) بوو لە (مَكَّة)دا.

## ﴿ موسوڵمانبوونی ئیمام ( عُمَر بن الْخَطّاب )رضي الله عنه ﴾

لە دوای موسوڵمانبوونی ئیمام (حَمْزَة)رضي الله عنه –بە سێ ڕۆژان– ڕۆژێك (عُمَر بن الخَطّاب) شمشێرەکەی لە مل کردو ویستی هێرش بکاتە سەر پێغەمبەرﷺ کۆمەڵێکی (صَحابَة)کان، جا لە ڕێگەدا حەزرەتی(نعیم بن عَبْدالله)یرضي الله عنه گەیشتێو پێی گوت: ئەوە دەتەوێ چی بکەی؟ (عُمر)ش گوتی: دەمەوێ (مُحَمَّد) بکوژم. جا حەزرەتی(نعیم)رضي الله عنه فەرمووی: بەخۆت هەڵخەڵەتاوی، واتێدەگەی ئەگەر (مُحَمَّد) بکوژی، خزمەکانی (مُحَمَّد) دەتهێڵن لە سەر ڕووی زەوی بڕۆی؟ بۆچی ناگەڕێیەوە کاروباری خزمو کەسی خۆت ڕاست بکەیەوە؟ خۆ ئەوانیش موسوڵمان بوینە. (عُمر) گوتی: کام خزمو کەسم؟ حەزرەتی(نعیم)رضي الله عنه فەرمووی: (فاطِمَة)ی خوشکتو (سَعِید)ی مێردی خوشکەکەت.

بزانە: ئەم (سَعِید)ە ماموزای (عُمر)ش بوو، جا حەزرەتی (نعیم)شرضي الله عنه بە نهێنی موسوڵمان ببوو، بەڵام بۆیێ ئەو نهێنیەی ئەوانی ئاشکرا کرد، تاکو (عُمر) واز لە پێغەمبەرﷺ بێنێو ئازاری نەدا.

ئیتر (عُمر) یەکسەر گەڕاوە بۆ ماڵی خوشکەکەی، لەو کاتیش حەزرەتی(خَبّاب)رضي الله عنه لەوێ بوو دەرسی سوڕەتی (طه)ی بە (سَعِید)و (فاطِمَة)-رضی الله عنهما-دەگوت، جا هەستیان کرد: (عُمر) دەیەوێ بێتە ژورەوە، بۆیێ یەکسەر (خَبّاب)رضي الله عنه لە ژورێکی بچکۆلەدا خۆی حەشار دا، (فاطِمَة)ش-رضیالله عنها-پەڕە قورئانەکەی لە بن ڕانی خۆیدا شاردەوە، جا کە (عُمر) هاتە ژورەوە، گوتی: ئەم ورتە ورتە چی بوو لە پشت دەرگەوە گوێم لێبوو؟ گوتیان: هیچ نەبو. (عُمر) گوتی: بەرێ وَاللهِ وام زانیوە ئێوە شوێن ئایینی (مُحَمَّد) کەوتون. جا (عُمر) هەڵمەتی بردە سەر زاوایەکەی، (فاطِمَة)ی خوشکیشی

هەڵسا بەرگری لە مێردەکەی بکا، بەڵام (عُمر) لە (فاطِمَة)شی دا و سەریشی بریندار کرد، ئیتر کە خوشکەکەی خوێنی بە خۆیەوە بینی، فەرمووی: (هەی دوژمنی خوا، ئەوە بۆیێ لێم دەدەی چونکە خوای تاكو تەنیا دەپەرستم؟ بە کوێری چاوی تۆ ئێمە موسوڵمان بووینە؟ چی دەیکەی بیکە).

جا کە (عُمر) خوێنی بە خوشکەکەیەوە بینی، شەرمی کردو پەشیمان بۆوەو بە خوشکەکەی گوت: ئەم پەڕە کاغەزەی دەتانخوێند، بمدەنێ تەماشای بکەم؟ خوشکەکەشی فەرمووی: دەترسم شتێکی لێبکەی. جا (عُمر) سوێندی بۆ خواردن: کاغەزەکەتان دەدەمەوە. جا خوشکەکەی فەرمووی: تۆ کافریو پیسی، هەڵسە (غوسل) بکە، ئینجا کاغەزەکە دەدەمە دەستت. ئیتر (عُمر) غوسلی کردو خوشکەکەشی کاغەزەکەی دایێ، جا لە کاغەزەکەدا سەرەتای سوڕەتی (طه)ی خوێندەوە تا گەیشتە ئایەتی ﴿إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاّ أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلاةَ لِذِكْرِي﴾ طه: ١٤، بەڕاستی هەر من خودامە، جگە لە من هیچ پەرستراوێکیتر نیە، کەوابوو: من بپەرستەو نوێژم بۆ بکە تا منت لە یاد بێ.

جا کە (عُمر) ئەم ئایەتەی خوێندەوە گوتی: ئای ئەمە قسەیەکی چەند جوان و بەرێزە!. جا کە حەزرەتی(خَبّاب)ﷺ گوێی لەم قسەیەی (عمر) بوو، یەکسەر خۆی ئاشکرا کردو لە ژورەکە هاتە دەرەوەو فەرمووی: هۆ (عمر) تکام وایە خوایگەورە تۆی وەبەر دوعایەکەی پێغەمبەرﷺ دابێ، کە دوێنێ دوعای کردو فەرمووی: ﴿اَللَّهُمَّ أَيِّدِ الإِسْلامَ بِأَبِى الْحَكَمِ أَوْ بِعُمَرَ بنِ الْخَطَّابِ﴾ خوایە ئیسلام بەهێز بکەی بە موسوڵمانبوونی (أَبِى الْحَكَمِ)=(أبوجَهْل)، یان (عُمر بن الخَطّاب). ئەی (عمر) هەر خودا هەر خودا.

جا (عمر) گوتی: ئەی (خَبّاب) شوێنی پێغەمبەرمﷺ پێ بڵێ، دەچمە لایو موسوڵمان دەبم. جا (خَبّاب)ﷺ فەرمووی: پێغەمبەرﷺ لە ماڵێکدایە لە لای (صَفا)، هەندێك (صَحابَة)شی لەگەڵدانە. جا (عُمر) بەرەو پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانی ڕۆیشتو لە دەرگەی ماڵەکەی دا، جا (صَحابَة)یەك لە کەلێنی دەرگەکەدا دیتی (عُمر) شمشێری لە ملەو لە دەرگە دەدا، گەڕاوەو فەرمووی: (یا رَسُولَ الله) ئەمە (عُمر بن الخَطّاب)ە شمشێریشی لە ملە. ئیمام (حَمزَة)شﷺ فەرمووی: ئیزنی بدە، ئەگەر چاکەی بوێ دەیدەینێ، ئەگەر خراپەشی بوێ هەر بە شمشێرەکەیخۆی دەیکوژین.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دەرگەی بۆ بکەنەوە. جا کە (عُمر) هاتە ژورەوە پێغەمبەرﷺ یەخەی گرتو بە توندی هەڵیتەکاندو ڕایکێشاو فەرمووی: ﴿مَا جَاء بِكَ يا ابْنَ الْخَطّاب؟﴾ ئەوە بۆچی هاتوی ئەی کوڕی (خَطّاب)؟ (عُمر)ش گوتی: هاتومە ببمە موسوڵمانو ئیمان بە خواو پێغەمبەرەکەی بێنم. جا یەکسەر پێغەمبەرﷺ

فەرمووی: (اَللّه أكبَر). جا (عُمر) شادەی هێناو موسوڵمان بوو، جا بە موسوڵمانبوونی ئیمام (عمر)ﷺ ژمارەی ئەو موسوڵمانانەی لە (مَكّة) مابونەوەو كۆچیان نەكردبوو، بووە چل موسوڵمان. ئیمام (عُمر)ﷺ لە ڕۆژی موسوڵمانبوونی، تەمەنی (٢٦) بیستو شەش ساڵ بوو.

ئیتر بە موسوڵمانبوونی ئیمام (حَمزَة)و ئیمام (عمر)-رضي‌الله عنهما- موسوڵمانەكان ورەیان بەرز بۆوە، پشتیان بەهێز بوو، حەزرەتی(عبدالله بن مَسعُود)ﷺ فەرموویەتی: ﴿ما زِلْنَا أَعِزَّةً مُنْذُ أَسْلَمَ عُمَرُ بنُ الْخَطَّاب﴾ رواه البخاري، ئیمە بەردەوام لە بەهێزیو سەربەرزیدا بوین لەو ڕۆژەوە كە (عُمر بن الخَطّاب) موسوڵمان بوو.

﴿ دانانی گەمارۆی ئابووریو كۆمەڵایەتی لە سەر خزمەكانی پێغەمبەرﷺ ﴾

ئینجا كە كافرەكان دیتیان ئیسلام لە ناو خەڵكیدا بڵاو دەبێتەوەو ئیمام (حَمزَة)و ئیمام (عُمر)ش-رضي‌الله عنهما-موسوڵمان بون، زیاتر ڕقیان هەڵساو بڕیاریان دا: پێغەمبەرﷺ بكوژن، جا كە (أبُوطالِب) ئەمەی زانی، خزمەكانیخۆی كۆ كردنەوەو فەرمانی پێكردن پێغەمبەرﷺ بپارێزن.

جا بنەماڵەی (المُطَلِب)و (هاشِم)–كافرەكانیانو موسوڵمانەكانیان– كۆ بونەوەو بڕیاریان دا: پێغەمبەرﷺ بپارێزن، كافرەكان لە بەر دەمارگیری خزمایەتی، موسوڵمانەكانیش بۆ خاتری خوا، ئیتر كە كافرەكان ئەوەیان زانی، لە ساڵی حەفتەمی پێغەمبەرایەتیدا كۆ بونەوەو بڕیاریان دا: گەمارۆ دابنێنە سەر خزمەكانی پێغەمبەرﷺ، بەم جۆرە:

لەگەڵیان دانەنیشن، سەردانیان نەكەن، شتیان نەفرۆشنێ، شتیان لێنەكڕن، ژنیان نەدەنێ، ژنیان لێنەهێنن، ڕێگا نەدەن هیچ كەسێك ئازوقەیان بداتێ، سولحیشیان لەگەڵ نەكەن تا پێغەمبەرﷺ تەسلیمی ئەوان ئەكەن بیكوژن.

ئیتر كافرەكان لە سەر ئەم ستەمكاریە پەیمانیان بەستو لە پەڕە كاغەزێكدا نوسییانو نوسراوەكەشیان لە ناو (كَعْبَة)دا هەڵواسی، ئیتر بە هۆی ئەم گەمارۆدانە پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە موسوڵمانان كرد: دووبارە كۆچ بكەن بۆ (حَبَشَة)–هەروەك باسمان كرد– هەم خۆیو خزمەكانیشی: (بَنی هاشِم)و (بَنی المُطَلِب) كافرەكانیانو موسوڵمانەكانیان –جگە لە (أبُولَهَب)– هەموویان چونە ناو گەلی (أبُوطالِب)؟ چونكە كافرەكان لە (مَكّة)ش دەریان كردنە دەرەوە، بەڵام (أبُولَهَب) وەگەل دوژمنەكانی پێغەمبەرﷺ كەوتو هەر لە (مَكّة)دا مایەوە.

ئینجا تا سێ ساڵان ئەم گەمارۆیە بەردەوام بوو، بە شێوەیەكی وەها برسی بون: گەڵای درەختو پیستەی ئاژەڵیان دەخوارد، دەنگی گریانی منداڵەكانیان دەگەیشتە ئەو دیوی گەڵیەكە، ئینجا كە سێ ساڵ تەواو بون–واتە: لە ساڵی دەیەمی

پێغەمبەرایەتیدا، سێ ساڵ پێش کۆچکردن– پێغەمبەرﷺ بە (أبُوطالِب)ی فەرموو: ﴿يَاعَمِّ إنَّ اللهَ قَدْ سَلَّطَ الأرَضَةَ عَلَى صَحِيفَةِ قُرَيْشٍ، فَلَمْ تَدَعْ فِيها إسْماً هُوَ لِلّهِ إلاّ أثْبَتَهُ فِيهـا وَنفَتْ مِنْها الظُّلْمَ وَالْقَطِيعَةَ وَالْبُهْتَانَ﴾ ئەی مامە، خوایگەورە مۆرانەی ناردۆتە سەر نوسراوەکەی (قُرَيْش)، تەنها ناوی خوای هێشتۆتەوەو ستەمو بچڕانی ڕەحمو بوختانیشی هەمووی خواردوە.

جا (أبُوطالِب) گوتی: (خوای خۆت ئەم هەواڵەی دایێ)؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: بەڵێ.–لە ڕیوایەتێکدا–(أبُوطالِب) گوتی: سوێندم بە پرشنگدارەکان درۆت لەگەڵ نەکردوم. ئینجا یەکسەر (أبُوطالِب)و کۆمەڵە پیاوێکیتری (بَنِيهاشِم)و (بَنِيالمُطَّلِب) هاتنە مزگەوت=(كَعْبَة)و لەوێ بە کافرەکانی گوت: هۆ کۆمەڵەی (قُرَيْش)، کوڕە برایەکەم -مُحَمَّد-ﷺ پێی گوتم: مۆرانە نوسراوە ستەمکارەکەی ئێوەی خواردوەو جگە لە ناوی خوا هیچی لێنەهێشتووە، کەوابوو: ئێوەش نوسراوەکەتان بێنن‌و تەماشای بکەن: ئەگەر کوڕە برایەکەم -مُحَمَّد-ﷺ ڕاستی گوتبێ، ئێوە واز لەو ستەمو گەمارۆدانەی ئێمە بێنن، ئەگەر درۆشی کردبێ، ئەوە کوڕە برایەکەم ئەدەمە دەستتان.

کافرەکانیش گوتیان: ئێمەش بەوە ڕازینە. ئیتر نوسراوەکەیان هێناو تەماشایان کرد، مۆرانە هەموو نوسینەکەی خواردوەو تەنها ڕستەی (بِاسْمِكَ اللّهُمَّ)ی هێشتۆتەوە، جا کە دیتیان پێغەمبەرﷺ ڕاستی فەرمووە، هەندێکیان زیاتر گومڕا بون‌و گوتیان: ئەمە سیحری کوڕە برایەکەتە. بەڵام لەو جەماعەتە پێنج پیاو بە نهێنی لە شەوێدا کۆ بونەوەو بڕیاریان دا: بڕیارەکەی ئەم نوسراوە هەڵبوەشێننەوەو گەمارۆیەکە لابەن، ئەمەش ناوی پێنج پیاوەکانە: (هِشام بن عَمْرو)، (زُهَيْر بن أبِيأُمَيَّة)، (الْمُطْعِم بن عَدِيّ)، (أَبُوالبَخْتَرِي بن هِشام)، (زُمْعَة بن الأسْوَد).

جا (زُهَير) گوتی: من پێشتر قسە دەکەم. ئینجا سبەینێ هەر پێنجیان چونە دانیشگەی (قريشي)یەکان‌و (زُهَير) ڕووی تێکردن‌و گوتی: ئایا ڕەوایە ئێمە خواردەمەنی بخۆین‌و جل‌وبەرگ دەبەر بکەین، بنەماڵەی (هاشِم)و (بَنِيالمُطَّلِب)ش بە هیلاك بچن‌و شتیان نەدرێتێ؟ وَاللهِ من دانانیشم تا ئەم نوسراوە ستەمکارە نەپچڕێندرێ. جا (أبُوجَهْل) وەڵامی داوەو گوتی: درۆ دەکەی، وَاللهِ نابێ بپچڕێندرێ. ئینجا چوار کەسەکەیتریش پشتگیرییان لە (زُهَير) کردو (المُطْعِم) هەڵسا نوسراوەکەی هێناو بچڕاندی–(أبُوطالِب)ی مامی پێغەمبەریشﷺ لە قوڕنەیەکی مزگەوت دانیشتبوو هیچ قسەیەکی نەدەکرد–، ئینجا ئەم پێنج پیاوانە گەمارۆیەکەیان شکاندو چەکیخۆیان هەڵگرت‌و چەند پیاوێکیتریشیان وەگەڵ خۆیان دا و چونە لای (بَنِي هاشِم)و (بَنِي المُطَّلِب)و هەموویان

هێنانەوە ناو ماڵەکانیخۆیان لە (مَکَّة)، والحمد لله تعالی. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٣٦و٧٠و١٠١) و(السيرةالحلبية) ب(١) ل(٤٢٠و ٤٢٦و٤٥٦و٤٨٧) و(نورالأبصار) ل(١٢).

﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکـــــەم: موســــوڵمانەکان کۆچـــیان کـــــرد لـــــە (مَکَّــــة) بـــــۆ (حَبَـــشَة).**

کە بیر لەم کۆچکردنە دەکەیەوە، کۆچکردنی یەکجاری نەبو-بە واتەی مانەوەی یەکجاری لە (حَبَشَة)، یان بە واتەی کۆچکردن لە (دارُالکُفْر) بۆ (دارُالإسْلَام)- بەڵکو دەرچوونێکی کاتی بوو لە وڵاتی خۆیان بۆ پاراستنی ئایینەکەیان، جا ئەم جۆرە دەرچوونەش پاداشتی وەك پاداشتی کۆچکردنی یەکجارییە لە (دارُالکُفْر) بۆ (دارُالإسلام)-کە لە باسی کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)کان بۆ (مَدینَة)، ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءالله تعالی-، بۆیی کە ئەم کۆچکەرانە لە (حَبَشَة)وە هاتنەوە (مَدینَة)و ئیمام (عُمر)ﷺ شانازیی لە سەرکردنو فەرمووی: **ئێمە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ کۆچمان کردوە.** پێغەمبەرﷺ ڕەدی داوەو فەرمووی: ﴿...لَـــهُ وَلأَصْحَابِهِ هِجْرَةٌ واحِدَةٌ وَلَكُمْ-أَنْتُمْ أَهْلَ السَّفِينَةِ- هِجْرَتَانِ﴾رواه الشيخان، **(عُمر)و هاوڕێکانی خێری تەنها یەك کۆچکردنیان هەیە، ئێوەش-ئەی کۆچکەرانی ناو کەشتیەکە- خێری دوو کۆچکردنتان هەیە.** واتە: کۆچکردن بۆ (حَبَشَة)و کۆچکردن بۆ (مَدینَة).

کەوابوو: لە هەر شوێنێك موسوڵمان بە هۆی ئایینەکەی سزا درا، یان ناحەق بە سەر حەقدا زاڵ بوو و ناشەرعی پەرەی سەندبوو، ئەو کاتە واجبە: موسوڵمان بۆ خۆی بڕواتە شوێنێکی وەها: کە بگونجێ بە ئاشکراییو بە ئازادی ئایینیخۆی ئەنجام بداو بێشەرعیی پێ نەکەن.

هەروەها دروستە لە حاڵەتی ناچاری، یان پێویستیدا موسوڵمان بچێتە ژێر پاراستنی کافرەکانیش بەو مەرجەی ئەم پاراستنە زیان لە ئایینو لە بانگەوازیی ئایین نەداو گۆڕینی ئایینی تێدا نەبێو بێشەرعیشی پێنەکەن، ئەگەر نا: دروست نیە موسوڵمان بچێتە ژێر ئەم جۆرە پاراستنە، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەم پاراستنەی لە (أبُوطالِب)ی مامی خۆی قبوڵ نەکردو فەرمووی: **﴿ئەگەر ڕۆژ لە ڕاستەم دابنێنو مانگ لە چەپەم دابنێن، واز لەم کارەی خۆم ناهێنم...هتد﴾.**

کەوابوو: ئایینو دەستپێوەگرتنی ئایینو ڕاگرتنی ستونەکانی ئایین، پەرژینێکە بۆ پاراستنی ماڵو خاكو وڵاتو ئازادیو شەرەفو ناموس، ئەگەر ئایین پارێزراو بێ، ئەوانە گشتی دەپارێزرێن، بەڵام ئەگەر ئایین بەخۆی نەما، یان دەسەڵاتی نەما، ئەو کاتە ئازادیو ماڵو وڵاتیش لە دەست دەچێ، بۆیێ ئێستا کافرەکان بە سەر وڵاتانی ئیسلامدا زاڵ بوینەو بەروبومی موسوڵمانان بۆ خۆیان دەبەنو موسوڵمانەکانیش بوینە کۆیلەی ژێر دەستی ئەو کافرانە، کاربەدەستەکانیشیان بوینە نۆکەری ئەو کافرانە، (إنالِلّه وإنَّا إلَيْه راجِعُونَ).

بە دەستکاریەوە (فقه السيرة، للبوطي) ل(١٢٣-١٢٦) و(سيرة الصلابي) ب(١) ل(٣٥٦و٣٦٣).

**دووەم: سـوجدەی (تِـلاوَة) سـوونەتە، هـەواڵێکی ناڕاسـتیش بـڵاو بـۆوە، گۆیـا: دانیشتووانی(مَكَّة) هەموویان موسوڵمان بوینە.** ﴿عن ابن عَبّاس-رضي الله عنهما-قالَ: سَجَدَ النَّبيُّﷺ بالنَّجْمِ، وَسَجَدَ مَعَهُ الْمُسْلِمُونَ وَالْمُـشرِكُونَ والْجِـنُّ وَالْإِنْـسُ﴾ رواه البخاري، **پێغەمبەرﷺ سوڕەتی (وَالنَّجْم) خوێند، جا کە تەواوی کرد، سوجدەی (تِلاوَة)ی برد، ئەوەی لەوێش بوو سوجدەی برد: لە موسوڵمانو کافر و جنۆکەو ئادەمیزاد.**

واتە: ئەوەی هەواڵەکەی بڵاو کردەوە، وای زانی بـەم سـوجدەبردنە کافرەکـان موسـوڵمان بوینە، هەواڵەکەش گەیشتە (حَبَشَة)، جا کۆچـکەرەکانیش وایـان زانـی هەواڵەکـە ڕاسـتەو کافرەکان موسوڵمان بوینە، بۆیێ گەڕانەوە.

جـا لێـرەدا ئاگـادار بـە: لـە چـەند کتێبێکـدا بوختـان بـە پێغەمبـەرﷺ کـراوە: گۆیـا پێغەمبەرﷺ مەدحی سەنەمەکانی (قُرَیْش)ی کردووەو بە (الْغَرانِیـق) نـاوی هێنـاون، بـۆیی کافرەکانیش لەگەڵ ئەودا سوجدەیان بردوە. ئەمە ڕاست نیەو باوەڕی پێ مەکە.

جەنابی (المبارکفوری) وەهای ڕوون کردۆتەوە: کە خودی کافرەکانی(مَكَّة) ئەم بوختانەیان هەڵبەستووە!؟ چونکە لەو کاتەی پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانﷺ کەوتنە سوجدە بـردن، ئەوانیش—لە ترسی گەورەیی قوڕئان—دەسەڵاتیان بە سەر خۆیاندا نەماو یەکسەر کەوتنـە سوجدە بردن، ئینجا ئەو کافرانەی لـەوێ نـەبون گلـەییان لـەو سـوجدەبەرانە کـرد: چـۆن سوجدەتان برد؟! ئەوانیش بۆ ڕزگاربوون لە گلەییەکە، هەڵسان ئەم درۆیەیان هەڵبەستو گوتیان: (مُحَمَّد)ﷺ مەدحی خوایەکانی ئێمەی کرد، بۆیێ ئێمەش سوجدەمان برد. واتـە: ئەم درۆیەیان کردە پاساو بۆ سوجدەکەیان. (فتح الباري) ب(٨) ل(٧٨١) و(الرحيق المختوم) ل(٨٨).

**سێیەم: وەفدی کافرەکانی (قُرَیْش) بە (النَّجاشِي)ی گوت: چەند گە نجێکی کەم عەقڵ لە خزمەکانی ئێمە هاتونە ناو خاکی تۆ...ئاییینێکی تازەیان هێناوە.**

ماشاء الله، دوژمنانیئیسلام بۆ دژایەتی گەنجە موسوڵمانەکان، ئەم جۆرە بوختانانەیان لە یەکتری بە میرات گرتووەو لە هەموو سەردەمێکدا دوژمنانیئیسلام ناو و ناتۆرە بۆ گەنجە موسوڵمانەکان دادەنێنو ڕێگای بانگـەوازیی ئیـسلامو خواپەرسـتنیان لێدەگـرن، وەك لـە سەردەمی ئێستاماندا گەنجە موسوڵمانەکان بە (إرْهابِي)=تیرۆرسـت نـاو دەبـەن، جـا ئـەو جۆرە بوختانو ناو و ناتۆرانە لە سەردەمی هەموو پێغەمبەراندا-عليهم الصلاة والسلام- لە دژی گەنجە خواپەرەستەکان بە کار هاتووە، بۆیێ ئێمەش لە باسی کۆچکردنی پێغەمبـەرﷺ گـەورەییو ڕێزداری گەنجە موسوڵمانەکان ڕوون ئەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

جا ئەگەر بە ویژدانەوە تەماشای کۆچکەرەکانی (حَبَشَة) بکەین، دەبینین:—بە پێـچەوانەی بوختانی وەفدەکە— زۆرینـەیان خـاوەن نـەژادو نـەجیبزادەی هۆزەکانیـان بـون، توخـودا: حەزرەتی(جَعْفَر بن أبيطالِب)و هاوڕێکانیﷺ گەنجی کەم عەقڵن؟! ئەی ئەگەر کەم عـەقڵن،

بۆچی وەفدەکەی (قُرَیْش) لە بەردەم زیرەکایەتی حەزرەتی(جَعْفَر)ﷺ بەزیو دەمکوت بوو و بە سەرشۆڕی گەڕاوە (مَكّة)؟ نەخێر، نەخێر، ئەو کۆچکەرانە هەر هەموویان عەقڵمەندی دونیاو قیامەتن و پەروەردەکراوی قوتابخانەی پێغەمبەرن ﷺ، ئەو ئازاردانەی کافرەکانی (مَكّة)ش بێ جیاوازی هەموویانی گرتبۆوە.

**بەڵام کۆچکردن و بەجێهێشتنی وڵاتیش تاڵی و سوێریەکی تر بوو-لە ڕێگای خوا- بۆ گەیاندنی ئایینی ئیسلام،**

کە تەماشا دەکەین: حەزرەتی(بِلال)و حەزرەتی(خَبّاب)و حەزرەتی(عَمّار)ﷺ لەگەڵ ئەو کۆچکەرانەدا نەبون! ئەوەش وا دەگەیێنێ: کە کۆچکردنەکەیان تەنها لە ترسی ئازاردان نەبو، بەڵکو گەیاندن و بڵاوبوونەوەی ئیسلامیش لەم کۆچکردنەدا مەبەست بوو-هەروەك چەند زانایەك وای بۆ چووە- جا ئەگەر ئەوان ئەو هەموو ئازارو تاڵی و سوێری و دەربەدەریەیان نەدیتبا، ئەو ئیسلامەش ئەوها بڵاو نەدەبۆوە.

*بەڵێ: ئەگەر کوێستانەکان بەفرو ساردیی زستان نەبینن، لە بەهاردا کەنگر و ڕێواس و گوڵزاری بەهاری تێدا نابینی و لە هاویندا ئاوی ساردی لێ ناخۆیەوە، جا لە بەر ئەوەی ئێستا موسوڵمانان لە سەر ڕێبازی ئەو کۆچکەرانە نارۆن، بۆیێ کاروانی ئیسلام هەر لە دواوەیە.*

ئەمە لەلایەك، لە لایەکیتریشەوە: ئەم کۆچکردنە پلەو پایەی (قُرَیْشي)یەکانی لە ناو عەرەبەکاندا دابەزاندو عەرەبەکان لەو هەڵوێستەی ئەوان ڕازی نەبون و بە عەیبدارییان لە قەڵەم دا، ئەوەش لە قسەکانی (ابْن الدُّغْنة) دەردەکەوێ: کە ئیمام (أَبُوبَكْر)ی ﷺ لە کۆچکردن گەڕاندەوەو لە ناو (قُرَیْش)دا مەدحی کردو نەیانتوانی وەدرۆی بێخنەوە. بە دەستکاریەوە لە (السيرة الحلبية) ب(١) ل(٤٢٧) و(سيرة الصّلابي) ب(١) ل(٣٤٢و٣٦٦).

**چوارەم: زیرەکایەتی حەزرەتی( جَعْفَر )ﷺ وای لە ( النَّجاشِي ) کرد ببێتە لایەنگری کۆچکەرەکان.** بەڵێ: زیرەکایەتی موسوڵمانە کۆچکەرەکانیش لەوەدا دەردەکەوێ: کە ڕاوێژیان لە نێوان خۆیاندا کردو بڕیاریان دا: (جَعْفَر بن أبيطالِب)ﷺ ببێتە نوێنەری ئەوان و لەجیاتی هەموانیان قسە لەگەڵ (النّجاشِي) بکا؟ چونکە حەزرەتی(جَعْفَر)ﷺ لە بنەماڵەی (قُرَیْشي)یەو کوڕە مامی پێغەمبەرە ﷺ، (النّجاشِي)ش بەوە زیاتر دڵنیا دەبێ: کە باسی ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ لە نزیکترین خزمی پێغەمبەر ﷺ گوێی لێ ببێ، جا هەرچەند حەزرەتی(جَعْفَر)ﷺ گەنجێك بوو لە سەرەتای تەمەنی بیستەکاندا بوو، بەڵام لە دەریای زانست و ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ ئاوی هەڵێنجابوو لە ڕووباری زمانڕەوانیی (قُرَیْش)دا مەلەوانیی دەکردو جۆگەی هەڵدەبەستن، پاشایەکی گەورەی وەکو (النّجاشِي)ش ئەو جۆرە نوێنەرەی پێویستە، چونکە گوتراوە: **(لِكُلِّ مَقامٍ مَقالٌ) هەر شوێنێك قسەیەکی دەوێ.**

جا هەرچەند وەفدەکەی (قُرَیْش)ش لەو پەڕی لێزانیی و فێڵبازیدا بون و هەموو درۆو دەلەسەو

بوختانکردنیان خسته کار، بەڵام زیرەکیو لێزانیی حەزرەتی(جَعْفَر)ﷺ تەمومژەکەی ڕەواندەوەو عەیبەکانو ستەمەکانی کافرەکانی(مَكّة)ی هەمووی بۆ (النجاشی) باس کردن، ئینجا نەژادو گەورەیی پێغەمبەرﷺ ڕەوشتە جوانەکانی ئیسلامیشی بۆ ڕۆن کردنەوە، لە ئیسلامیشدا ئەو مەسەلانەی هەڵبژاردن: کە پەیوەندیی بە ئایینی (النجاشي)یەوە هەیە، چۆن پێغەمبەرﷺ فێری کردبوو ئەوهای پێ ڕاگەیاندن، تا وای کرد: ئایینی ڕاستەقینەی (نَصْرانِيّة) باوەش لە ئایینی ڕاستەقینەی ئیسلام وەرێنێو (النجاشي) بڵێ: (ئەمەو ئەوەی (مُوسَى) پێغەمبەرﷺ هێناویە لە یەك دەلاقە دەردەچن...(عِیسَی) پێغەمبەرﷺ لەوەی تۆ گوتت زیاتر نیە).

ئینجا با موسوڵمانەکانیش پەند لەو کۆچکەرە موسوڵمانانە وەربگرنو کاروباریان لە نێوان خۆیاندا بە ڕاوێژ بێو نوێنەرێکی لێهاتوو و قسەزان هەڵبژێرین بۆ ڕووبەڕووبونەوەی وەفدو پیاوماقولان، دەسەڵاتی تەواویش لە قسەکردندا بدەنەوە نوێنەرەکەو لە کاتی قسەکردنی ئەودا، ئەوان قسە نەکەنو قسەی نەبڕن، هەروەك (صحابة)کان لەگەڵ حەزرەتی(جَعْفَر)دا ئەوها بونﷺاجمعین. بە دەستکاریەوە لە (سیرة الصلاّبي) ب(١) ل(٣٥٨-٣٦٢).

## ﴿ پێغەمبەرﷺ ڕێز لە (النَّجاشِي) دەنێ ﴾

جارێك وەفدێکی(النّجاشِي) هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ هەڵسا بەخۆی خزمەتی دەکردن، (صَحابَة)کان فەرموویان: (یا رَسُولَ الله) ئێمە لەجیاتی تۆ خزمەتیان دەکەین. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إِنَّهُمْ کانُوا لِأَصْحابِی مُکْرِمِینَ، وَإِنِّی أُحِبُّ أَنْ أُکَافِئَهُمْ﴾ رواه البیهقی، ئەوان-لە (حَبَشَة)- ڕێزیان لە (صَحابَة)کانی من ناوە، منیش دەمەوێ چاکەیان لەگەڵ بکەمەوە.

هەروەها ﴿عن أَبیهریرةﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهﷺ نَعَی النَّجاشِيَّ فِي الْیَوْمِ الَّذِی مَاتَ فِیهِ، خَرَجَ إِلَی الْمُصَلَّی فَصَفَّ بِهِمْ وَکَبَّرَ أَرْبَعاً﴾ رواه الشیخان، ئەو ڕۆژەی (النّجاشِي) لە (حَبَشَة) وەفاتی کرد، پێغەمبەرﷺ بە ئێمەی ڕاگەیاند و ڕیزی کردینو لە (مَدِینَة)وە نوێژی (جَنازَة)ی لە سەر (النّجاشِي) کرد.

کەواتە: بە بەڵگەی ئەم حەدیسە دروستە نوێژی (جَنازَة) لە سەر مردووی نادیار بکرێ هەروەك مەزهەبی ئیمامی(الشافعي) ئەوهایە، بەڵام هەندێ زانا فەرموویانە: بەو مەرجەی لە شوێنیخۆی هیچ کەسێك نەبێ نوێژی لە سەر بکا. (البدایة والنهایة) ب(٢) ل(٨١و ٨٢) و(فتح الباري) ب(٣) ل(٢٤٠و٢٤١). جا ئەم مەسەلەیەم بە درێژی لە (ڕووناکی رب العالمین) لە باسی نوێژی (جَنازَة)دا ڕوون کردۆتەوە، بیخوێنەوە سودی لێوەردەگری.

**پێنجەم: یەکەم خۆپیشاندان لە ئیسلامدا، بە موسوڵمانبوونی ئیمام (حَمْزَة)و ئیمام (عُمَر)-رضي الله عنهما-موسوڵمانەکان ورەیان بەرز بۆوە.**

که ئیمام (عمر)ﷺ موسوڵمان بوو، چووه لای (كَعْبَة)و لەوێ لە دانیشگەی (قُرَیْش)دا موسوڵمانبوونیخۆی ئاشكرا كردو لە بەرچاوی ئەوان شادەی هێنا، ئینجا كافرەكانی (قُرَیْش) هێرشیان كردە سەر ئیمام (عُمر)وﷺ بووە پێكداداان لە نێوانیاندا، تا ئیمام (عمر)ﷺ ماندوو بوو و دانیشت، جا (قُرَیْش) لە سەر سەری ڕاوەستان، ئەویش پێی دەگوتن: (چی دەكەن بیكەن، سوێندم بە خوا: ئەگەر ئێمەی موسوڵمان دەبووینە (٣٠٠) سێسەد پیاو: یان ئێمە (مَكَّة)مان بۆ ئێوە بەجێدەهێشت، یان ئێوە بۆ ئێمەتان بە جێدەهێشت). جا لەو كاتدا پیرێكی (مَكَّة) كە ناوی (العاص) بوو، لە كافرەكانی خوڕیەوەو وازیان لە ئیمام (عُمر)ﷺ هێنا.

ئەمە لە لایەك، لە لایەكیتریشەوە: ئیمام (عمر)ﷺ فەرمووی: (یا رَسُولَ الله)، ئەرێ ئێمە لە سەر ڕێگای ڕاست نین؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿بَلَى، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّكُمْ عَلَى الْحَقِّ إِنْ مُتُّمْ وَإِنْ حُيِّيتُمْ﴾ بەڵێ، سوێندم بەو خوایەی گیانی منی بە دەستە، ئێوە لە سەر ڕێگای ڕاستن ئەگەر بمرن، ئەگەر بژیێن. جا ئیمام (عمر)ﷺ فەرمووی: ئەی بۆچی هەر خۆمان بشارینەوە؟ سوێندم بەو خوایەی تۆی بەڕاستی ناردوە: دەچینە دەرەوە. جا پێغەمبەرﷺ موسوڵمانەكان بە دوو ڕیز چونە دەرەوە: ئیمام (حَمْزَة)ﷺ لە ڕیزێكدا بوو، ئیمام (عمر)ش ﷺ لە ڕیزەكەیتردا بوو، تۆز لە بن پێیەكانیان هەڵدەستاو ئیمام (عمر)ش ﷺ بە دەنگی بەرز دەیگوت: (لاَإِلَهَ إلاّاللهُ مُحَمَّد رَّسُولُ اللهِ). تا چونە ناو (الْمَسْجِدالْحَرام)و تەواف (كَعْبَة)یان كردو نوێژیان كرد، جا لەم ڕۆژەدا پێغەمبەرﷺ ناوی لە ئیمام (عُمر) نا: (اَلْفارُوق)ﷺ چونكە خوایگەورە بەوی حەقو ناحەقی لێك جیا كردنەوە. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٨) و(السيرةالحلبية) ب(١) ل(٤٧٢و٤٧٣).

*دەك پیرۆزت بێ ئەم ناوە ڕێزدارە، ئەی (عُمر)ی كوفر تەقێنی دوژمن بەزێن، ئەو بەهەشتەشت پیرۆز بێ كە پێغەمبەرﷺ موژدەی پێ داوی، بۆ گەورەییو حەق ناسینی تۆ ئەوەندە بەسە: كە خوایگەورە چەند ئایەتێكی بەگوێرەی بۆچوونی تۆ دابەزاندوو.*

*دەك بە قوربانی تۆزەكەی بن پێیەكانی ئێوەش بم ئەی هەردوو ڕیزە خۆپیشاندەرەكەی كەڵ پێغەمبەرﷺ، ئەو تۆزەی لە بن پێیەكانی ئێوە هەڵدەستا، تۆزی بوركانێك بوو: (مَكَّة)ی هەژاند، نەعرەتەی (لَآإِلَهَ إِلَّااللّهُ)ی ئێوە لە چیایەكانی (مَكَّة)دا دەنگی دایەوەو جەرگی كافرەكانی(مَكَّة)ی تەزاند، خودا لێتان ڕازی بێو لە بەر خاتری ئێوە خودا لە ئێمەش ڕازی بێ، آمین.*

**شەشەم: بە هۆی گەمارۆدانەكە، (بَنِی هاشِم)و (بَنِیالْمُطَّلِب) چونە گەلێیەكە.**

نەژادی پێغەمبەرﷺ لە بنەماڵەی (هاشِم) بوو، (بَنِیالْمُطَّلِب) ماڵە مامۆزایەكانی وی بون، چونكە (هاشِم)و (الْمُطَّلِب) برای یەكتری بون، جا لە بەر ئەوەی بۆ پاراستنی پێغەمبەرﷺ

بەشدارییان لەگەڵ (بَنِیهاشـم)دا کـرد، ئـەوانیش وەکـو (بَنِیهاشـم) لـە ئیـسلامدا بڕیـاری خزمەکانی پێغەمبەریانﷺ بۆ دەدرێ، پێغەمبـەرﷺفەرموویـەتی: ﴿إنَّمـــا بَنُو الْمُطَّلِـــب وَبَنُوهَاشِمٍ شَيْءٌ واحِدٌ﴾ رواه البخاری، **بنەماڵەی (الْمُطَّلِب)و بنەماڵەی (هاشِم) لە ئیسلامدا یەك شتن**. کەواتـە: ئـەو دوو بنەماڵەیـە–وەکـو یـەکتری–پێنجێکـی (فَـيْء)و (غَنِيمَـة)یـان دەدرێتێ، واتە: حەرامە زەکاتیش وەربگرن. (تفسیر ابن کثیر الأنفال (٤١).

ئینجا کە تەماشای ناوەڕۆکی گەمارۆدانەکە دەکەین، لە لایـەنی کۆمەڵایەتیـەوە: ژن پێدان و ژن لێهێنانی خزمەکانی پێغەمبەرﷺ قەدەغە کراوە؟ بۆ ئەوەی برایەتی و بەزەیی و سەردان و بە یەکگەیشتن نەمێنێ، لە لایەنی ئابووریشەوە: کڕین و فرۆشـتن قەدەغـە کـرا، هـەم ئەگـەر بازرگانـەکانی دەرەوەش هاتبانـە (مَکَّة)، کافرەکـان بـە نرخێکـی گـرانتر بـە زووتـرین کـات کەلوپەلەکەیان دەکڕی، تاکو هیچ بۆ خزمەکانی پێغەمبەرﷺ نەمێنیو بـە دەسـت بـەتاڵێ بگەڕێنەوە ناو منداڵە برسیەکانی خۆیان، جا لەگەڵ ئەو هـەموو ئـازارو برسیەتیەشـدا ئـەوان زیاتر سووربون لە سەر پاراستنی پێغەمبـەرﷺ، بـە شـێوەیەکی وەهـا: کـە شـەوێ خـەڵك دەخەوت، (أَبُوطالِب) یەکێکی دەنارده سەر یاتاغی پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەریشی بۆ خـەوتن دەنارده سەر یاتاغی یەکێکیتر تاکو شوێنی دیار نەبێ، نەوەك لە شـەوێدا یـەکێك دەسـتی خراپـەی بـۆ درێـژ بکـا، جـا لێـرەدا خزمـە کافرەکـان مەبەسـتیان پاراسـتنی ئیـسلام و پێغەمبەرایەتی (مُحَمَّد) نەبو، بەڵکو مەبەستیان پاراستنی خودی (مُحَمَّد)ﷺ بوو! ؟ نەوەك کەسێکی نامۆ بیکوژێ و ئەوان سەرشۆڕو شەرمەزاری دونیا بن.

کەوابوو: پێویستە مرۆڤی موسوڵمان لەو ڕووداوە ئەو پەندە وەربگرێ: کە بـە خـۆڕاگرتن و کۆڵنەدان مرۆڤی موسوڵمان دەتوانی کۆسپەکان نەوی بکاو پەرژینە ڕێگرەکان بـشکێنێ و بگاتە مەبەستە پیرۆزەکـانی، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا دەبـێ لایـەنی خـزم و کەسەکانیـشی بنرخێنـێ و بـۆ خزمـەتکردنی ئیـسلام سـود لـە هێـز و توانایـەکانیان وەربگـرێ، هەرچـەند بیروڕاشیان جیاواز بێ، تا بۆی بگونجێ بەرەی دوژمنەکانی تەسك بکاتەوە.

تەماشا بکە پێغەمبەرﷺ چۆن لە ناو خزم و کەسەکانیخۆی پارێزراو بانگەوازیەکەشی هەر بەردەوام بوو، بەڵام لـە هـەمان کاتیـشدا پێغەمبـەرﷺ نەیویـست بـەرەی جـەنگ لەگـەڵ کافرەکان بەرفروانتر بکا، ئەگەر نا: پاڵەوانانی وەك ئیمام (أَبُوبَکْر)و ئیمـام (عُمـر)و ئیمـام (حَمْزَة)ﷺ دەیانتوانی بـە ئاسـانی سـەرکردەکانی کـوفر–وەکـو (أَبُوجَهْـل)و ئـەوانیتـر– بکوژن، بـەڵام پێغەمبـەرﷺ ڕێگـای نـەدانی ئـەم جەنگـە هەڵگیرسـێنین، بـەڵکو فـەرمانی خۆڕاگرتنی پێکردن؟ تاکو بەم گەمارۆدانە خزمەتێکیتری ئیسلام بکرێ و موسـوڵمانان لـە تاڵی و سوێری و برسیەتی ڕابهێندرێن و بە هۆی ئەم گەمارۆدانـەش ناوبانگیئیسلام لـە نـاو عەڕەبەکانـدا بـڵاو ببێتـەوەو چەوسـاندنەوەی خزمـەکانی پێغەمبـەرﷺ ببێتـە هـۆی

ڕووڕەشبوونێك بۆ كافرەكانی(مَكّة) لە ناو هەموو عەڕەبەكانداو سۆزیان بۆ پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)كانی بجولێ.

بەڵكو بە هۆی (مُعْجِزَة)كەی مۆرانەكە–كە جگە لە ناوی خوا هەموو نوسینەكەی خواردو پێغەمبەریش ئەو هەواڵەی پێڕاگەیاندن– پێنج پیاو لە بەرەی دوژمنەكانیش ویژدانیان جولا و ئەم ستەمەیان هەڵوەشاندەوە، جا لەگەڵ ئەوەش ئەو (مُعْجِزَة)یان بە چاویخۆیان دیت، هیچیان دڵیان نەهاتە سەر موسوڵمانبوون، كەوابوو: ئەبێ زۆر ئاگاداری خۆت بی: كافر هەر كافرە، هەر چەند چاكەشت لەگەڵ بكا، نەكەی: بە هۆی چاكەی كافرەكان دڵت بە لایاندا بچێو واز لە شەرعیخوا بێنیو سەرت شۆڕ بكەی. بە دەستكاریەوە (سيرة الصلاّبي) ب(١) ل(٣٢١–٣٢٧).

*** *** ***

## ﴿ مردنی ( أَبُوطالِب )ی مامی پێغەمبەرﷺ ﴾

ئینجا كە گەمارۆی سەر خزمەكانی پێغەمبەرﷺ لادرا و هاتنەوە ناو ماڵەكانیخۆیان، لە دوای (٢٨) بیستو هەشت ڕۆژ–واتە: هەر لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتیدا بە سێ ساڵ پێش كۆچكردن– (أَبُوطالِب)ی مامی پێغەمبەرﷺ نەخۆش كەوت، جا كافرەكانی (قُرَيْش) گوتیان: ئەوە كاری (مُحَمَّد) لە ناو هۆزەكاندا بڵاو بۆتەوەو دەترسێین كارەكەمان لە دەست دەربێنێ، با بڕۆینە لای (أَبُوطالِب)، تاكو هەندێك داواكاری بۆ ئێمە لە (مُحَمَّد) وەربگرێو هەندێك داواكاریش لە ئێمەوە بداتە (مُحَمَّد)، چونكە دەترسین ئەم پیرە مێردە بمرێو ئێمەش (مُحَمَّد) بكوژیینو خەڵك پێمان بڵێن: (كاتێ مامی مرد كوشتیان)!.

جا (عُتبَة)و (شَيْبَة)و (أَبُوجَهْل)و (أُمَيَّة)و (أَبُوسُفْيان) چونە لای (أَبُوطالِب)و پێیان گوت: تۆ گەورەو ڕیش سپیی ئێمەی، تكات لێدەكەین چارەیەكی ئێمەو كوڕە برایەكەت بكە: هەندێك داواكاری ئێمەی لێوەربگرەو هەندێك داواكاری ئەویش لە ئێمە بۆ وی وەربگرە، با واز لە ئێمەو ئایینەكەمان بێنێو ئێمەش واز لە ئەو و ئایینەكەی دێنین.

جا (أَبُوطالِب) ناردی پێغەمبەرﷺ هاتو پێی گوت: ئەمانە گەورەكانی گەلەكەتن، هاتونە داواكاریت بدەنێو داواكاریت لێوەربگرن؟ جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿نَعَمْ، كَلِمَةً واحِدَةً تُعْطُونِيهَا تَمْلِكُونَ بِهَا الْعَرَبَ وَتَدِينُ لَكُمْ بِهَا الْعَجَمُ﴾ بەڵێ، یەك وشەم بدەنێ، بەم وشەیە دەبنە گەورەی عەڕەب، هەم عەجەمیش ملكەچی ئێوە دەبن.

جا (أَبُوجَهْل) گوتی: باشە–بە سەری باوكت– ئەم وشەیەو دە وشەیتریشت دەدەینێ. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿تَقُولُونَ: (لاإِلَهَ إِلاَّاللهُ)، وَتَقْلَعُونَ عَمّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ﴾ بڵێن:

(لاإلهَ إلاّاللهُ)، وازيش لە پەرستنی ئەو سەنەمانە بێنن کە جگە لە خوا دەیانپەرستن.
جا کافرەکان چەپڵەیەکیان لێداو گوتیان: ئەی (مُحَمَّد) دەتەوێ تەنها یەك خودا خوایەتی بکا، ئەمە سەیرە! چۆن یەك خودا بەرەوەستی کارەکانی ئێمە دەکا؟ ئینجا کافرەکان هەڵسانو ڕۆیشتن، خوایگەورەش سورەتی﴿ص وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ﴾ی ناردە خوارەوە تا ﴿إِلاّ اخْتِلاقٌ﴾ رواه الإمام أحمد والبيهقي بسند صحيح.
جا (أبُوطالِب) گوتی: ئەی کوڕی برام، وَاللهِ شتێکی دور و ستەمەت لێ داوا نەکردن. جا پێغەمبەرﷺ تەماعی لە موسوڵمانبوونی مامی کردو فەرمووی: ﴿ يَا عَمِّ قُـلْ لاَ إِلَـهَ إلاّاللهُ)، أَشْهَدُ لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ. فَقالَ: لَوْلاَ أَنْ تُعَيِّرَنِي قُرَيْشٌ يَقُولُونَ: إنَّما حَمَلَهُ عَلَى ذلِكَ الْجَزَعُ، لأَقْرَرْتُ بِهَا عَيْنَكَ—وَأَبَى أَنْ يَقُولَ: (لاإلهَ إلاّاللهُ)—فَأَنْزَلَ اللهُ: (إِنَّكَ لا تَهْـدِى مَـنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللهَ يَهْدِى مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ) القصص: ٥٦﴾ رواه الشيخان، ئەی مامە بڵێ: (لاإلهَ إلاّاللهُ)، تاکو لە ڕۆژی قیامەت بەم شادەهێنانە لە لای خوا شاهیدیت بۆ بدەم. جا (أبُوطالِب) گوتی: ئەگەر (قُرَيْش) عەیبم لێنەگرنو نەڵێن: لە ترسی مردن شادەی هێنا، ئەوە لە بەر خاتری چاوی تۆ شادەم دەهێنا. جا (أبُوطالِب) بە قسەی پێغەمبەریﷺ نەکردو نەیگوت: (لاإلهَ إلاّاللهُ)و موسوڵمان نەبو، جا خوایگەورە ئەم ئایەتەیڕابردووی ناردە خوارەوە، واتە: (ئەی پێغەمبەر تۆ ناتوانی ئەو کەسەی خۆشت ئەوێ بیکەیە ئیماندار، بەڵام هەر کەسێك خوا حەز بکا، ئەیکاتە ئیماندار).
**جا بزانە:** کە (أبُوطالِب) مرد، لەو کات تەمەنی پێغەمبەرﷺ چلو نۆساڵو هەشت مانگو یازدە ڕۆژ بوو، حەزرەتی(خَدِيجَة)ش رضي الله عنها بە سێ ڕۆژان لە دوای مردنی (أبُوطالِب) وەفاتی کرد. (شرح صحيح مسلم) ب(١) ل(٢٧٤).

## ﴿ وەفاتکردنی حەزرەتی (خَدِيجَة)ی ژنی پێغەمبەرﷺ ورضي الله عنها﴾

گوتمان: لە دوای مردنی (أبُوطالِب)—بە سێ ڕۆژان—حەزرەتی(خَدِيجَة)ی ژنی پێغەمبەرﷺ—لە مانگی ڕەمەزاندا— وەفاتی کرد، تەمەنی حەزرەتی(خَدِيجَة)رضي الله عنها (٦٥) شەستو پێنج ساڵ بوو، (٢٥) بیستو پێنج ساڵان هاوسەری پێغەمبەرﷺ بوو، جا پێغەمبەرﷺ ناوی لەم ساڵە نا: (عامُ الْحُزْن) ساڵی غەمباری. چونکە پاڵپشتی دەرەوەی نەما—کە (أبُوطالِب) بوو— پاڵپشتی ناوخۆیشی نەما—کە حەزرەتی(خَدِيجَة) بوو—رضي الله عنها.
ئینجا هەر لەو مانگەی حەزرەتی(خَدِيجَة)-رضي الله عنها-وەفاتی کرد—واتە: لە مانگی ڕەمەزاندا— پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(سَوْدَة)ی کیژی (زَمْعَة)ی-رضي الله عنها- لەخۆی مارە کردو چوارسەد دیرهەمی زیوی بۆ کردە مارەییو هەر لە (مَكَّة)شدا گواستیەوە.
ئینجا لە دوای مانگێکیتر—واتە: لە مانگی (شوال)دا—پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(عائِشَة)ی

کیژی ئیمام (أبُوبَكْر)شی-رضی الله عنهما- لە خۆی مارە کرد، بەڵام لە دوای کۆچکردن بۆ (مَدِينَة)، گواستیەوە.

## ﴿ ڕۆیشتنی پێغەمبەرﷺ بۆ ( طائِف ) لە باشوری ڕۆژهەڵاتی ( مَكَّة ) ﴾

ئینجا کە (أبُوطالِب) مرد، کافرەکانی (قُرَیْش)-بە ئەندازەیەکی چاوەڕوان نەکراو- دەستیان کردە ئازاردانی پێغەمبەروﷺ خۆڵیان بە سەر سەری پێغەمبەرداﷺ دەکرد، ئەویش دەچووە ماڵەوەو کیژەکەی خۆڵی لە سەری دەشوشتو دەگریا، جا پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: ﴿لا تَبْكِي-يَا بُنَيَّةُ-فَإِنَّ اللهَ مَانِعٌ أَبَاكِ﴾ مەگری-ئەی کیژۆکەم-خوایگەورە باوکی تۆ دەپارێزێ.

هەروەها لە کاتی چێشت لێنان پزدانی مەڕیان فڕێ دەدا ناو مەنجەڵەکەی ماڵی پێغەمبەرﷺ، هەم بەم لاو بەو لادا ڕایاندەکێشاو پێیان دەگوت: ئەوە تۆی دەڵێی: تەنهایەك خودا هەیە؟ بۆیێ پێغەمبەرﷺ لە مانگی (شوال) ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی بە پیادەیی لە (مَكَّة) چووە دەرەوەو حەزرەتی(زَيْد بن حارِثَة)شیرضي الله عنه لەگەڵدا بوو و بەرەو (طائِف) کەوتە ڕێ، بەڵکی لەوێ هۆزی (ثَقِيف) موسوڵمان بېنو یارمەتیی بدەن، جا کە پێغەمبەرﷺ گەیشتە (طائِف)، چوە لای گەورەکانی ئەوێ: (عَبْد يالِيل)و (مَسْعُود)و (حَبِيب)-کە هەرسێکیان برا بونو کوڕی (عَمْرو)ی (الثَّقَفِي) بون، جا پێغەمبەرﷺ لەگەڵیان دانیشتو داوای لێکردن یارمەتیی بدەن بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام. بەڵام هەرسێکیان زۆر بە نامەردانەو ناشیرنی وەڵامی پێغەمبەریانﷺ دایەوە، ئینجا پێغەمبەرﷺ ماوەی دە ڕۆژان لە (طائِف) مایەوە، جا کە بێئومێد بوو لە خێرو چاکەی (ثَقِيف)، پێی گوتن: (ئەگەر پشتگیریشتان نەکردم ئەم هەواڵەی هاتنی من بۆ ئێرە بڵاو مەکەنەوە). بەڵام ئەو سێ برایانە ئەوەشیان بۆ نەکردو پێیان گوت: لە شاری ئێمە بڕۆ دەرەوە، بۆ کوێ دەڕۆی بڕۆ.

ئینجا خوێڕیەکانو منداڵەکانیان بەردانە سەر پێغەمبەروﷺ جنێویان پێ دەداو بە سەریاندا دەقیڕاندو بەردیان بۆ دەهاویشت، تا پێیەکانی پێغەمبەریانﷺ برینداو کردنو پیلاوەکانیشی بە خوێن بون، حەزرەتی(زَيْد)شرضي الله عنه خۆی دەکردە قەڵغانی پێغەمبەرﷺ تاکو بەردی وێنەکەون، بۆیێ ئەویش چەند شوێنێکی سەری بریندار بون، بەم جۆرە بەردەوام بون تا گەیشتنە لای باغی (عُتبَة)و (شَيْبَة)ی کوڕەکانی (رَبِيعَة)، لەوێ لە سێبەری دارمێوێك دانیشتو خوێڕیەکانی (ثَقِيف)ش گەڕانەوە بۆ (طائِف)، هەردوو کوڕەکانی (رَبِيعَة)ش بە چاویخۆیان ئەم ڕووداوەیان دەتیت.

جا لە ناو ئەو هەموو ماندوویی‌و غەمو دڵشکاویەدا پێغەمبەرﷺ ئەم دوعایەی کرد: ﴿اَللّهُمَّ إِلَيْكَ أَشْكُو ضَعْفَ قُوَّتِي وَقِلَّةَ حِيلَتِي وَهَوانِي عَلَى النَّاسِ يا أَرْحَمَ الرّاحِمِينَ، أَنْتَ رَبُّ الْمُسْتَضْعَفِينَ وَأَنْتَ رَبِّي، إلى مَنْ تَكِلُنِي؟ إلى بَعِيدٍ يَتَجَهَّمُنِي أَمْ إِلَى عَدُوٍّ مَلَّكْتَهُ

أَمْرِى؟ إنْ لَمْ يَكُنْ بكَ عَلَيَّ غَضَبٌ فَلا أُبالِي، ولَكِنْ عَافِيتُكَ هِيَ أَوْسَعُ لِي، أَعُوذُ بنُور وَجْهكَ الَّذِى أَشْرَقَتْ لَهُ الظُّلُماتُ وَصَلُحَ عَلَيْهِ أَمْرُ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ مِنْ أَنْ تُنْزِلَ بِى غَضَبَكَ أَوْ تُحِـلَ عَلَيَّ سَخَطَكَ، لَكَ الْعُتْبَى حَتّى تَرْضَى وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاّ بكَ﴾ رواه ابن اسحاق والطبراني.

جا كە (عُتبَة)و (شَيبَة) پێغەمبەریانﷺ لەو حاڵەتەدا دیت، بەزەییان پیٚدا هاتو بانگی خزمەتكارەكەیان كرد–كە ناوی (عَدّاس) بوو– پێیان گوت: ئەم ترێیە لە ناو ئەم قاپەدا بۆ ئەم پیاوە ببە، تاكو بیخوا.

ئینجا (عَدّاس) ترێیەكەی بۆ پێغەمبەرﷺ بردو لە بەر دەستی داناو پیٚی گوت: بیخۆ. جا پێغەمبەرﷺ دەستی بۆ ترێیەكە بردو فەرموی: (بِسْمِ اللهِ). ئینجا خواردی، جا (عَدّاس) بە سەرسوڕماوی گوتی: خەڵكی ئەم وڵاتە ئەم (بِسْمِ اللهِ)یە ناڵێن!. جا پێغەمبەرﷺ لیٚی پرسی: ﴿ئەی (عَدّاس) تۆ خەڵكی كام وڵاتی، ئایینت چ ئایینێكە﴾؟ (عَدّاس) وەڵامی داوە: من دیانم=گاورم، خەڵكی (نَینَوی)م. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿مِنْ قَرْيَةِ الرَّجُلِ الصّالِحِ يُونُسَ بنِ مَتَّى؟﴾ دیٚیەكەی پیاو چاكەكە (یونُس)ی كوڕی (مَتَّی؟). جا (عَدّاس) گوتی: چۆن (یُونَس) دەناسی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ذاكَ أَخِي، كَانَ نَبِيّاً وَأَنَا نَبِيٌّ﴾ ئەو (یُونُس)ە برای منە، چونكە ئەو پێغەمبەری خوا بوو، منیش پێغەمبەری خوامە. جا (عدّاس) سەرو دەستو پیٚی پێغەمبەریﷺ ماچ كردن، واتە: موسوڵمان بوو.

جا كە (عَدّاس) گەڕاوە لای كوڕەكانی (رَبیعَة)، پێیان گوت: ئەی (عَدّاس) بۆ ئەم پیاوەت ماچ كرد؟ گوتی: گەورەم لە سەر ڕووی زەمین لەم پیاوە باشتر نیە، هەواڵێكی وەهای پیٚگوتم، جگە لە پێغەمبەر كەسیٚتر نایزانیٚ. جا گوتیان: ئەی (عَدّاس) ئاگاداربە: لە ئایینیخۆت لاتنەدا، ئایینیخۆت لە ئایینی وی باشترە!.

ئینجا كە پێغەمبەرﷺ گەیشتە (قَرنِ الثعالِب)=(قَرنِ المَنازِل)، حەزرەتی(جُبرائیل)ﷺ هاتە خزمەتیو پیٚی فەرموو: ﴿خوایگەورە گویٚی لە قسەكانی گەلەكەت بوو چۆن وەڵامی تۆیان داوە، ئێستاش خوایگەورە (مَلائِكَة)ی كێوەكانی ناردۆتە لای تۆ، هەر چی بتەویٚ فەرمانی پیٚبكە﴾.

جا (مَلائِكَة)ی كێوەكان سەلامی لیٚكردو گوتی: ﴿ئەی (مُحَمَّد)ﷺ من (مَلائِكَة)ی كێوەكانم، خوایگەورە منی ناردۆتە لای تۆ، ئەگەر حەز ئەكەی ئەم دوو كێوە بە سەر كافرەكانی (طائِف)دا ئەدەمو لە ناویان ئەبەم؟﴾. بەڵام پێغەمبەرﷺ ئەوەی نەویستو فەرمووی: ﴿بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللهُ مِنْ أَصْلابِهِمْ مَنْ يَعْبُدُاللهَ وَحْدَهُ وَلا يُشْرِكُ بهِ شَيْئاً﴾ رواه الشيخان، بەڵكو تكام لە خوایە: لە پشتی ئەو كافرانە كەسانێكی وەها دەربێنیٚ: كە تەنها خوا بپەرەستنو هاوبەشی بۆ دانەنێن.

## ﴿ سەرەتای موسوڵمانبوونی (الْجِنّ)=جنۆكە ﴾

ئینجا كە پێغەمبەرﷺ لە گەڕانەوەیدا گەیشتە (نَخْلَة) لە نزیك (مَكّة)، لە نیوەی شەویدا هەڵسا شەونوێژ بكا، لەو كاتدا حەفت جنۆكە لە جنۆكەكانی (نَصِيبين) بە لایدا تێپەڕین و گوێیان لە قورئانخوێندنەكەی پێغەمبەرﷺ ڕاگرت، ئینجا كە پێغەمبەرﷺ نوێژەكەی تەواو كرد، ئەو جنۆكانە موسوڵمان بون و گەڕانەوە لای خزم و كەسەكانی خۆیان، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَراً مِنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنْصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِمْ مُنْذِرِينَ﴾الأحقاف: ٢٩-٣٢، باس بكە-ئەی پێغەمبەرﷺ-كە كۆمەڵە جنۆكەیەكمان ناردە لای تۆ، گوێ لە قورئان ڕابگرن، جا كە جنۆكەكان ئامادەی قورئانخوێندنەكەت بون، بە یەكتریان گوت: بێدەنگ بن تا گوێمان لێی بێ، جا كە قورئانخوێندنەكە تەواو بوو، جنۆكەكان گەڕانەوە لای گەلەكەی خۆیان و لە عەزابیخوا دەیانترساندن ئەگەر موسوڵمان نەبن. واتە: چونكە ئەو حەفت جنۆكەیە بەخۆیان موسوڵمان بوبوون.

ئینجا كە پێغەمبەرﷺ ویستی بێتەوە ناو شاری (مَكّة)ی پیرۆز، حەزرەتی(زَيْد)ﷺ پێی گوت: چۆن دەچیەوە ناو گەلی (قُرَيْش)، خۆ ئەوان هۆی ڕۆیشتنی تۆ بون؟ پێغەمبەرﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: ﴿إنَّ اللهَ جاعِلٌ لِما تَرَى فَرَجاً وَمَخْرَجاً وَإنَّ اللهَ ناصِرُ دِينِهِ وَمُظْهِرُ نَبِيِّهِ﴾ ئەو تەنگانەی تۆ دەیبینی خوایگەورە لێدەرچوون و خۆشیەكی بۆ دێنێ و خوایگەورە یارمەتی ئاینیخۆی دەداو پێغەمبەرەكەیخۆی سەركەوتوو دەكا.

جا پێغەمبەرﷺ داوای لە (الأخْنَس)و لە (سُهَيْل) كرد: كە بیپارێزن؟ بەڵام نەیانپاراست، ئینجا ناردیە لای (الْمُطْعِم بن عَدِيّ)و داوای لێكرد لە ژێر پاراستنی ئەودا بێتەوە (مَكّة)؟ جا (الْمُطْعِم) وەڵامی داوەو گوتی: با بێتە لای من. ئینجا پێغەمبەرﷺ هاتەوە ناو (مَكّة)و شەوێ لە لای (الْمُطْعِم) خەوت، ئینجا سبەینێ (الْمُطْعِم) خۆی و حەفت كوڕەكانی لەگەڵ پێغەمبەرﷺ چونە مزگەوت=(الكَعْبَة)و بە (قُرَيْشي)یەكانی گوت: من پارێزەری (مُحَمَّد)م. جا (قُرَيْش) گوتیان: لە بەر تۆ ئێمەش دەستی لێنادەین. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(١٢٧-١٤٣) و(السيرةالحلبية) ب(١) ل(٤٨٨-٥١٢).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەكەم: خوایگەورە (شَرِيك)=هاوبەشی نیە: نەلە (عِبادَة)و نە لە (حُكْم)دا،** پێغەمبەرﷺ بە كافرەكانی (قُرَيْش)ی فەرموو: ﴿تَقُولُونَ: (لاإلَهَ إلاَّاللهُ)، وَتَقْلَعُونَ عَمّا تَعْبُدُنَ مِنْ دوُنِهِ﴾ بڵێن: (لاإلهَ إلاّاللهُ)، وازیش لە سەنەم پەرستن بێنن.

شتێكی ئاشكرایە: كافرەكانی (قُرَيْش) باوەڕیان بە هەبوونی خواو بە پەروەردگاریەتی خوا

هەبوو، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللهُ﴾ لقمان: ٢٥، **ئەگەر لە کافرەکانی (مَكَّة) بپرسی کێ ئاسمانەکانو زەمینی دروست کردون؟ لە وەڵامدا دەڵێن: خوا دروستی کردون.**

بەڵام لە بەر ئەوە کافر بون، چونکە لە (عبادَة)=پەرستندا هاوبەشیان بۆ خوا دائەناو ئەیانگوت: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إلاّ لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللهِ زُلْفَى﴾ الزمر: ٣، **ئێمە هەر بۆ ئەوە ئەم بتانە دەپەرستین تاکو لە خوا نزیکمان بکەنەوە. جا کە پێغەمبەرﷺ پێی فەرموون بڵێن:** ﴿لاإِلَهَ إلاّاللهُ﴾. کافرەکان گوتیان: ﴿أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ﴾ ص: ٥، **ئایا (مُحَمَّد)ﷺ خوایەتیی کردۆتە مافی تەنها یەك خودا؟ ئەوە شتێکی سەیرە!.**

جا لێرەدا پێویستە بزانین: هەروەك خوایگەورە نایەوێ لە (عبادَة)=پەرستندا هاوبەشی هەبێو دەفەرموێ: ﴿وَلا يُشْرِكْ بِعِبادَةِ رَبِّهِ أَحَداً﴾ الكهف:١١٠، **نابی لە پەرستندا هیچ کەسێك بکاتە هاوبەشی خوایخۆی.** ئەوهاش نایەوێ لە (حُكْم)=دادڕەواییدا هاوبەشی هەبێو دەفەرموێ: ﴿وَلا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَداً﴾الكهف: ٢٦، **خوایگەورە هیچ کەسێك ناکاتە هاوبەش لە (حُكْم)=لە دادڕەوایی خۆیدا.**

کەوابوو: بە تەها خوا ناسین مرۆۋ لە کوفر دەرناچێو نابیتە ئیماندار، بەڵکو–لە داوای شادەهێنان– دەبی بە دڵو زوبان باوەڕی هەبێ خوایگەورە تاکو تەنیایە لە (أُلُوهِيَّة)دا، واتە: لە خوایەتیدا: کە (عبادَة)=پەرستنو (حُكْم)=دادڕەوایی دەگرێتەوەو خوایگەورە هەردووکیانی لەم ئایەتەدا بە یەکەوە کۆ کردونەوەو دەفەرموێ: ﴿ إِنِ الْحُكْمُ إِلاّ لِلَّهِ أَمَرَ أَلاّ تَعْبُدُوا إِلاّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾ يوسف: ٤٠، **دادڕەوایی تەنها مافی خودایە، خودا فەرمانی داوە: جگە لەوی هیچیتر نەپەرستن، ئەوە ئایینی ڕاستەقینەیە.**

واتە: **ئیسلام ئایینو دەوڵەتە، نابی ئایینو دەوڵەت لێك جیا بکرێنەوە،** ئەمە بڕیاری ئەم ئایەتەیە، کەوابوو: ئەو کەسانەی خۆیان بە موسوڵمان دائەنێنو لە هەمان کاتیشدا یاسای دەستکرد–بە پێچەوانەی شەرعیئیسلام–دائەنێنو شان بەشانی شەریعەتیئیسلام ڕەفتاری پێدەکەنو دەڵێن: **(شەریعەتیئیسلام بە تەنها–لەم سەردەمەدا– بۆ هەموو کاروبارێك بە کەڵك نایێو پێویستە یاسای دەستکردیشی لەگەڵدا بێ).** ئەوانە وەکو کافرەکانی (قُرَيْش) بە (مُشْرِك) دائەندرێن لە (حُكْم)دا، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ الأنعام: ١٢١، **ئەگە ئێوە گوێڕایەڵی ئەوان بن لەو بڕیارانەی دژ بە شەریعەتیخودانە، بێگومان ئێوە (مُشْرِك)نو هاوبەشتان بۆ خوا داناوە.**

کەوابوو: جەنگی ئیسلام لە دژی کوفر بۆ ئەوەیە: (عبادَة)و (حُكْم)–واتە: پەرستنو دادڕەوایی– تەنها بۆ خودا بێو هاوبەشی نەبێ، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾ الأنفال: ٣٩، **جەنگ لە دژی**

**کافرەکان بکەن تاکو (شِرْك)=هاوبەشدانان بۆ خوا نەمێنێ و ئایین هەر هەمووی بۆ خوا بێ و کوفری لەگەڵدا نەبێ.**

## ﴿ بۆچی شەیتان کافر بوو؟ ﴾

**جا لێرەدا پێویستە ئەوەش بزانین: شەیتان باوەڕی بە خواو بە تاکو تەنیایی خوا هەبوو، هاوبەشی بۆ خوا دانەناوە، بەڵام بۆیێ کافر بوو و لەعنەتی لێکرا، چونکە (حُکْم)ی خوای ڕەد کردەوەو گوتی: ﴿أَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِيناً﴾الإسراء: ٦١، چۆن ڕەوایە من سوجدە بۆ (آدَم)ێك ببەم کە لە قوڕ دروستت کردوە؟. واتە: شەیتان –بە بۆچوونی خۆی– ئەم بڕیارەی خوای پێ ڕاست نەبو و خوایگەورەی بە بەهەڵەداچوو داناو گوتی: ﴿أَنَا خَيْرٌ مِنْهُ خَلَقْتَنِي مِنْ نَارٍ وَخَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ﴾ ص: ٧٦، من لە (آدَم) چاکترم؟ چونکە–ئەی خودایە– منت لە ئاگر دروست کردوە، (آدَم)ش لە قوڕ دروستت کردوە.**

**کەوابوو: ئەوکەسانەی دەڵێن: (شەریعەتی ئیسلام–کە خوا دایناوە– ستەمی تێدایەو بە کەڵك ئەم سەردەمە نایێ و ئێمە پێی ڕازی نین). ئەوانیش وەکو شەیتان کافر دەبن، هەر چەند باوەڕیشان بە خوا هەبێ؟ چونکە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَمَا أُولَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ﴾ النّور: ٤٧، کەسانێك دەڵێن: باوەڕمان هەیە بە خواو بە پێغەمبەرﷺ، گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرﷺ دەبین، ئینجا هەندێکیان لە دوای ئەو قسەیە پشت لە (حُکْم)ی خواو پێغەمبەرﷺ دەکەن و قبوڵی ناکەن، ئەوانە ئیماندار نین.**

**بۆیێ ئیمامی(الطحاوي)ش لە (العقيدة الطحاوية)دا فەرموویەتی: (وَمَنْ رَدَّ حُكْمَ الْكِتَابِ كَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ) هەر کەسێك بڕیاری قوڕئان ڕەد بکاتەوە، دەبێتە یەکێك لە کافرەکان.** جا تکایە بگەڕێوە بۆ گولبژێری بانگەوازیی نهێنیی و باسی (برمان) لەم کتێبەدا، هەم بۆ ڕاڤەی ئایەتەکان بڕوانە (تفسيرالقرطبي) و(تفسير ابن كثير).

**دووەم: پێغەمبەرﷺ شەفاعەت بۆ کافرەکانیش دەکا، پێغەمبەرﷺ بە (أَبُوطالِب)ی فەرموو: ﴿ئەی مامە تۆ بڵێ (لاإِلهَ إلاّاللهُ)، تاکو لە لای خوا شاهیدیت بۆ بدەم...جا (أَبُوطالِب) شادە نەهێناو موسوڵمان نەبو﴾.**

**ئیمام (الْعَبّاس)ﷺ لە پێغەمبەریﷺ پرسی: تۆ چ سودێکت بۆ (أَبُوطالِب)ی مامت هەبووە، چونکە ئەو تۆی دەپاراست و بەرگریی لێدەکردی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿هُوَ فِي ضَحْضاحٍ مِنْ نارٍ وَلَوْلاَ أَنَا لَكَانَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النّارِ﴾ رواه الشيخان، لە بەر شەفاعەتی من (أَبُوطالِب) لە ناو تەنکاییەکی ئاگر لە لێوی دۆزەخ داندراوە– واتە: ئاگر تا گوزینگی دێ– ئەگەر لە بەر من نەبوایە، ئەو لە بنەوەی دۆزەخ دادەندرا.**

**جا بزانە: ئەو شەفاعەتە لە تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەرەوەﷺ تەنها سزای لە سەر سوك**

کراوە، واتە: لە دۆزەخ ناهێندرێتە دەرەوە، خوایگەورە دەفەرموێ:﴿فَمَا تَنْفَعُهُمْ شَـــفَاعَةُ الشَّافِعِينَ﴾ المدثر: ٤٨، **سود ناداتە کافرەکان شەفاعەتی شەفاعەتکاران.**

**جا ئـەوەش بزانـە:** لـە هـەموو مامـەکانی پێغەمبـەرﷺ چـواریان ئیـسلامەتییان پـێ گەیـشتووە: (حَمْـزَة)و (الْعَبّـاس)و (أَبُوطالِـب)و (أَبُولَهَـب)، جـا لەوانـەش تـەنها (حَمْـزة)و (العَبّاس) موسوڵمان بوینە-رضیالله عنهما-. (فتح الباري) ب(٧) ل(٢٤٦)، ب(١١) ل(٥٢٥).

**سـێیەم: پێغەمبــەرﷺ نــاوی لــەم ســاڵە نــا: (عـــامُ الْحُــزْن)=ســاڵی غــەمباری.**

ئەگـەر (أَبُوطالِـب) هـەر بمابـاو بـەردەوام بوایـە لـە پاراسـتنی پێغەمبـەرﷺ، لەوانـە بـوو کەسانێك بڵێن: بە هێزو پاڵپشتی (أَبُوطالِب) ئەم ئیـسلامە چەسپاوە. بۆیـێ خوایگـەورە وایکرد ئەم تۆمەتەش نەمێنێ، هەم ئەگەر پێغەمبەرﷺ ئـازارو مانـدووبوونی نەدیتبایـە، ئەو کاتە موسوڵمانانیش بۆ بانگەوازی ئیسلام تەمبەڵ دەبونو دیتنی ئازارو مانـدووبونیان بە سـوننەتێکی پێغەمبـەرﷺ نـەدەزانیو خـۆڕاگر نـەدەبون بەرامبـەر ئـازاردانو لێـدانو دەربەردەری، جا کە خوایگەورە وەعدەی بـە پێغەمبـەرﷺ دابـوو: بیپـارێزێ، مەبەسـت پاراستن لە کوشتن بوو، نەك نەدیتنی ئازارو سوکایەتیو دەربەدەری.

**جا ئـەوەش بزانـە:** لـە بـەر خـودی مردنـی (أَبُوطالِـب)و حـەزرەتی(خَدِیجَـة)-رضیالله عنها- پێغەمبەرﷺ ناوی لەم ساڵە نەنا: (عامُ الْحُزْن)، بەڵکو بە هۆی ئـەوەی ڕێگـای بانگـەوازی



ئیسلامی لێ بەرتەسك بۆوەو ڕێگرو کۆسپەی زیاتری هاتنە پێشو زیاتر ئـازارو مانـدووبوونی دیت، بۆیێ خوایگەورە لە قورئاندا دڵی پێغەمبەرﷺ دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِنْ قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَى مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا حَتَّى أَتَاهُمْ نَصْرُنَا﴾الأنعام: ٣٤، **لە پێش تـۆدا- ئەی پێغەمبەر- چەند پێغەمبەرێکیتر بە درۆ خستراونەوە، جا ئەوان خۆیان ڕاگرت لە سەر ئەو بەدرۆخستنەوەیە، ئەوان لە ڕێگایخوا ئازاردران تا یارمەتیدانی خوایان بۆ هاتو خوا سەری خستن.** بە دەستکاریەوە (فقه السیرة، للبوطي) ل(١٣٠-١٣٣).

**چـوارەم: هـەر لـەو مانگـەی حـەزرەتی( خَدِیجَـة )-رضیالله عنها-وەفـاتی کـرد، پێغەمبـەرﷺ حەزرەتی( سَوْدَة )ی-رضیالله عنها-لە خۆی مارەکرد.**

**پرســـیار:** بۆچــی دیــسان پێغەمبـــەرﷺ ئــەم بێوەژنەشـــی لـــە خـــۆی مـــارەکرد؟

**وەڵام:** ئەمەش هەر وەفـاداری بـوو، چـونکە حـەزرەتی(سَـوْدَة)-رضیالله عنها-هاوسـەری کـوڕە مامەکەی خۆی بوو-کە ناوی (السّکران) بوو-هەردووکیان موسوڵمان بونو بە یەکەوە کۆچیان کرد بۆ (حَبَشَة)، ئینجا کە گەڕانەوە بۆ (مَكَّة)، مێردەکەی وەفاتی کرد، حەزرەتی (سَوْدَة)ش-رضیالله عنها-بە بێکەسی مایەوەو خزمەکانیشی موسوڵمان نەبون، جا پێغەمبەرﷺ لەوە دەترسا: خزمەکانی بیگرنو ئازاری بدەنو لە ئیسلام پاشـگەزی بکەنـەوە، مێـردیش قەڵاتی ژنـەو پـێی دەپـارێزێ، بۆیـێ پێغەمبـەرﷺ لـە خـۆی مـارە کـردو بـووە دایکـی

ئیمانداران، ئەگەر نا: لە ناو موسوڵماناندا کیژی جوانو جەحێڵ زۆر هەبون ببنە هاوسەری پێغەمبەرﷺ. بروانە (السيرةالحلبية) ب(١) ل(٤٩٠) و(نورالیقین) ل(٦١).

**بەڵام مارەکردنی حەزرەتی( عائشَةَ )-رضي الله عنها- لە دەسەڵاتی خۆیدا نەبو و لە خەوندا (وَحْي)ی بۆهات،** پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿أُرِيتُكِ فِي الْمَنامِ يَجِيءُ بِكِ الْمَلَكُ فِي سَـرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ، فَقَالَ لِي: هَذِهِ اِمْرَأَتُكَ، فَكَشَفْتُ عَنْ وَجْهِكِ الثَّوبَ فَإِذا أَنْتِ هِيَ، فَقُلْتُ: إنْ يَكُ هَذا مِنْ عِنْدِ اللهِ يُمْضِهِ﴾ رواه الشيخان، وعند ابن حبان والترمذي بسند صحيح: ﴿جَاءَ جِبْرِيلُ لِلنَّبِيِّﷺ بِصُورَةِ عائِشَةَ-رضیالله عنـها-...فَقالَ: إنَّ هَذِهِ زَوْجَتُكَ فِي الدُّنْيا وَالْآخِـرَةِ﴾ **ئەی (عائشَةَ) لە خەونمدا تۆم نیشان درا: (جُبْرائِيل) لە ناو پارچە ئاوریشمێکدا وێنەی تۆی دەهێناو فەرمووی: ئەمە ژنی تۆیە لە دونیاو قیامەتدا. جا کە ئاوریشمەکەم لادا، تەماشام کرد ئەتۆی، جا گوتم: ئەگەر ئەم خەونەم (وَحْي)ی لای خودا بێ، خودا جێبەجێی دەکا.** واتە: خەونی پێغەمبەرﷺ-وەك هەشیاری- بە (وَحْي) دادەندرێ. (فتح الباري) ب(٩) ل(٢٢٦-٢٢٨).

**پێنجەم: دەرچوونی پێغەمبەرﷺ بۆ ( طائف )، دەرسێکیترە بۆ بانگەوازکارانی ئیسلام:**

تاکو بتوانن دابونەریتی ناو خۆیان بۆ خزمەتیئیسلام بە کار بێننو سەرۆك هۆزەکان بکەنە دۆستیخۆیانو لە ژێر سێبەری دۆستایەتی ئەواندا بتوانن ئیسلام رابگەیێنن، هەروەها دەرسێکیترە: تاکو مرۆڤی موسوڵمان هیچ کاتێك وەڕەز نەبێو کۆڵ نەدا، هەر چەند ئازاردانو ناخۆشیەکانیش لەو پەڕی بەهێزیدا بن، تەماشا بکە: پێغەمبەرﷺ لەم سەفەرەدا مانگێکی پێچوو: دە ڕۆژان لە (طائف) مایەوە، بیستەکەیتریش لە ڕێگەو شوێنەکانیتر، هیچ کاتێکیش وەڕەز نەبو، کەوابوو: دەبێ ئەم خۆڕاگریەی پێغەمبەرﷺ بریندارببوونی بە دەستی خوێڕیەکانی (طائف)، بەردەوام لە بەرچاومان بێو بیروباوەڕمان وابێ: کە گشت بانگەوازکارێکی ئیسلام-سەرکردەو بەرەوخوارتریش- لە بەرامبەر بەرپرسیاریەتی ئەم ئایینە یەکسانن، ئازارو ماندوبوون بەشی تەنها (بِلال)و (عَمَّار)و (سُمَيَّة) نیەﷺ، بەڵکو بەشی پێغەمبەریشیﷺ تێدایە.

جا ئەگەر یەکێك وا تێبگا: پێغەمبەرﷺ لە خۆی وەڕەز بووەو ئازاردانو سوکایەتی پێکردنی کافرەکان بێزاری کردوە، بۆیی پەنای بردە بەر دوعاو هاواری کردۆتە خوای گەورە؟ دەڵێین: ئەم تێگەیشتنەت هەڵەیە، چونکە هەروەك خوایگەورە فەرمانی بە خۆڕاگری کردوەو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا﴾ آل عمران: ٢٠٠، **ئەی ئیمانداران خۆ ڕاگر بن.** ئەوهاش فەرمانی بە دوعا کردوەو دەفەرموێ: ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُـمْ﴾ غافر: ٦٠، **لێم بپاڕێنەوە منیش دوعایەکەتان قبوڵ دەکەم.**

کەوابوو: دوعاکردنەکەی پێغەمبەرﷺ دەرسێکیترە تاکو شان بەشانی خۆڕاگری دوعای

سەرکەوتن‌و بێبەڵایی بکەین، خۆ ئەگەر دوعایەکەی پێغەمبەرﷺ دوعای وەڕەزی‌و بێزاری بوایە، ئەوە بەزەیی‌و لێبوردنی بە کار نەدەهێناو یەکسەر فەرمانی دەدا: (مَلائِكَة)ی کێوەکان تۆڵەی بۆ وەربگرێتەوە، بەڵام پێغەمبەرﷺ پێغەمبەری ڕەحمەت‌و تۆڵەکردنەوەی ناوێ، تەنها ڕازی‌بوونی خوای دەوێ، ئەوەش لەوەدا دەردەکەوێ کە لە دوعایەکەی‌دا فەرمووی: ﴿إنْ لَمْ يَكُنْ بِكَ عَلَيَّ غَضَبٌ فَلا أُبالِي﴾ **خودایە ئەگەر ئەم ئازاردانە بە هۆی توڕەبوونێکی تۆ نەبێ، من باکم نیەو گوێ نادەمە ئەو ئازاردانە.**

هەروەها لەم ڕستەیە ئەوەش وەردەگیرێ: جاری وا هەیە ئازاردان‌و بەڵایەکانی‌تری دونیا، سزادانێکە لە سەر تاوانێك کە خوای‌گەورەی توڕە کردووەو لە دونیادا سزای تاوانەکەی لێوەردەگرێ، بۆیێ پێویستە مرۆڤی موسوڵمان تکای لێبوردن‌و بێبەڵایی لە خوا بکا، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ولَكِنْ عَافِيَتُكَ هِيَ أَوْسَعُ لِي﴾ **بەڵام بێبەڵایی تۆ- ئەی خودایە- بۆ من بەرفراوانترە.**

کەوابوو: پێویستە موسوڵمان هەوڵ بدا خوا لێی ڕازی بێ‌و بە خۆیشی لە خوا ڕازی ببێ، هەرچەند بەردەوامیش لە ژیانێکی ناخۆش‌و پڕ تاڵی‌و سوێری‌دا بێ، هەروەك خوا ناسی بە ناوبانگ (رابعَةُالْعَدَوِيَّة) فەرموویەتی:

**فَلَيْتَكَ تَحْلُو وَالْحَياةُ مَرِيرَةٌ * وَلَيْتَكَ تَرْضَى وَالأَنامُ غِضابُ**
**وَلَيتَ الَّذِي بَيْنِي وَبَيْنَكَ عامِرٌ * وَبَيْنِي وَبَيْنَ الْعالَمِينَ خَرابُ**

خۆزگە-ئەی خودایە-تۆ لە دڵمدا شیرن دەبوی، با ژیانیشم تاڵ بێ

خۆزگە-ئەی خودایە-تۆ لە من ڕازی دەبوی، با خەڵکیش لێم توڕە بێ.

خۆزگە-ئەی خودایە-ئەوەی نێوان من‌و تۆ بە خواپەرستی ئاوەدان بێ

با نێوان من‌و نێوان خەڵکیش هەر وێران بێ.

(شرح الزقاني على المواهب) ب(١) ل(٣٥٨) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(١٣٦-١٣٨) و(سيرة الصلابي) ب(١) ل(٣٧٤).

**شەشەم: پێغەمبەرﷺ دەستی بۆ ترێیەکە بردو فەرموی: ( بِسْمِ الله ).**

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إذا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَذْكُرِ اسْمَ اللهِ، وَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَذْكُرَ اسْمَ اللهِ فِي أَوَّلِهِ فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ﴾ رواه ابوداود والترمذي بسند صحيح، **کاتێ یەکێکتان ویستی شتێك بخوا، با (بِسْمِ اللهِ) بکا، ئەگەر لە سەرەتادا لە بیری چوو، با بڵێ: (بِسْمِ اللهِ) لە سەرەتاو کۆتایی‌دا.**

بە گوتنی (بِسْمِ اللهِ) لە پێش خواردن‌و خواردنەوەو کارە باشەکاندا، موسوڵمانی ڕاستەقینە لە کەسانی‌تر جیا دەبێتەوەو بەرەکەتی (بِسْمِ اللهِ) کاری‌خۆی دەکا: هەم لە خۆی‌و هەم لە کەسانی‌تر، تەماشا بکە: چۆن (بِسْمِ اللهِ)ی پێغەمبەرﷺ (عَدّاس)ی گاوری بەرەو ئیسلام هێناو هەستی خواپەرستی‌ی جولاندو وای لێکرد ئەوەندە باوەڕی بە پێغەمبەرﷺ بەهێز ببێ، بڵێتە گەورەکانی خۆی: (لە سەر زەمین لەم پیاوە باشتر نیە).

کەوابوو: ئەی موسوڵمانی ڕێزدار تۆش شوێن پێغەمبەرەکەتﷺ بکەوەو لە هەموو کارە حەڵاڵەکانتدا (بِسْمِ اللهِ) بکە، تاکو سەرکەوتوو بیو شەیتان لێت دور بکەوێتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إذا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ فَذَكَرَ اللهَ عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعامِهِ قالَ الشّيْطانُ: لا مَبِيتَ لَكُمْ وَلاَ عَشاءَ﴾ رواه مسلم، **کاتێ مرۆڤ ویستی بچێتە ناو ماڵیخۆی، جا لە کاتی چوونە ژوورەوەو لە کاتی خواردن (بِسْمِ اللهِ) بکا، شەیتان دەڵێتە هاوکارانیخۆی: حاوانەوەو خۆراکتان لێرە نیە.**

**حەفتەم: باوەڕ بە (مَلائِکَة)ی خوا**، حەزرەتی(جُبْرائِیل)عليه السلام بە پێغەمبەریﷺ فەرموو: **﴿خوای گەرە (مَلائِکَة)ی کێوەکانی ناردۆتە لای تۆ، هەر چی بتەوێ فەرمانی پێبکە﴾**. باوەڕ بە هەبوونی (مَلائکَة) ڕوکنێکە لە شەش ڕوکنەکانی ئیمان، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلإِيمانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلائِكَتِهِ وكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشرِّهِ﴾ متفق عليه، **ئیمان ئەوەیە باوەڕت هەبێ: بە خوا، بە (مَلائِکَة)ی خوا، بە کتێبەکانی خوا، بە پێغەمبەرانی خوا، بە ڕۆژی دوایی=(الْقِیامَة)، بە قەزاو قەدەر.** **هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿خُلِقَتِ الْمَلائِكَةَ مِنْ نُورٍ﴾ رواه مسلم، (مَلائِکَة) لە ڕووناکی دروست کراون.**

**جا بزانە:** (مَلائِکَة) خەڵکێکی پیرۆزنو لە وێنەی خۆگۆڕیودا دەبینرێن، بەڵام لە وێنەی راستەقینەیخۆیاندا—جگە لە پێغەمبەران–عليهم الصلاة والسلام- هیچ کەسێك نایانبینێ، (مَلائِکَة) باڵیان هەنە، نە نێرن نە مێن، خەو و خواردنیان نیە، ئەتوانن خۆیان بهێننە سەر هەموو وێنەکی جوان، لە ئاسمانو زەمیندا نیشتەجێنو لە هەموو شوێنێکدا جێیان دەبێتەوەو بە فەرمانی خوا کاروباری بوونەوەر هەڵئەسوڕێننو لە فەرمانیخوا دەرناچن، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْراً﴾ النازعات: ٥، **سوێندم بەو (مَلائِکَة)تانەی کاروباری بوونەوەر هەڵئەسوڕێنن.**

**جا بزانە:** گەورەکانی (مَلائِکَة)تان، سێنە: (جُبْرائِیل): کە (وَحْي) بۆ پێغەمبەران–عليهم الصلاة والسلام- دێنێ. (مِیکائِیل): بارانو گیاو دەغڵو دانی لە دەستە. (إِسْرافِیل) بە (نَفْخ الصُّور) دونیا تێك ئەداو هەر بە (نَفْخ الصُّور)ش خەڵکی زیندوو دەکاتەوە.

ئیتر (مَلائِکَة)ی (کِرَاماًکَاتِبِینَ) کە لە ڕاستەو چەپەنەو کردارو گوفتاری ئادەمیزادان دەنوسنو (مَلائِکَة)ی مرادندنو ناو منداڵدانەو (مَلائِکَة)ی ناو قەبرو ناو (جَهَنَّم)و بەهەشتو چەندانیتریش (مَلائِکَة)هەنە، هەر خوا بەخۆی دەیزانێ. جا لە ڕوونکردنەوەی (العقيدة الطحاوية)دا هەندێك بەڵگەمان بۆ هێناون بیخوێنەوە سودی لێوەرەگری.

جا لێرەدا حەزرەتی(جُبْرائِیل)و (مَلائِکَة)ی کێوەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ، کە توانای هەیە—بە (قُدْرَة)ی خوا— کێو لە بنەوە هەڵکەنێو بە سەر شوێنێکیتریدا بدا و لە

بنەبڕ لە ناویان ببا، بەڵام لێرەدا پێغەمبەرﷺ بەزەیی‌و لێبوردنی بە کار هێناو نەیویست کافرەکانی (طائِف) بنەبڕ بکرێن‌و تکای لە خودا ئەوها بوو: ئیماندارەکان لە نەژادی ئەواندا پەیدا ببن، خوایگەورەش تکایەکەی هێناجێ‌و لە دوای (فَتْحِ مَكّة) دانیشتووانی (طائِف) موسوڵمان بون، والحمد لله رب العالمين.

**هەشتەم: باوەڕ بە (الْجِنّ)=جنۆکە، حەفت جنۆکە لە جنۆکەکانی (نَصِيبِين) گوێیان لە قورئانخوێندنەکەی پێغەمبەرﷺ بوو...موسوڵمان بون.**

**پێناسە:** (الْجِنّ)=جنۆکە چینە خەڵکێکن چاوی ئێمە لە وێنەی ڕاستەقینەیخۆیاندا نایانبینێ، خوایگەورە لە ئاگر دروستی کردون، هەروەك دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ الْجَانَّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ﴾ الرحمن: ١٥، **خوایگەورە (جانّ)ی باوکی جنۆکەی لە بڵێسەی ئاگر دروست کردوە.**

جنۆکە نێرو مێ‌و زاوزێیان هەیە، کافرو موسوڵمانیان هەنە، بە کافرەکانیان دەگوترێ: شەیتان، کەواتە: (إِبْلِيس)=شەیتانیگەورە لە جنۆکە کافرەکانە، جنۆکە توانایان هەیە خۆیان بگۆڕنە سەر هەموو وێنەیەك، جا ئەگونجێ لە وێنەی خۆگۆڕیویاندا بدریترین. (شرح صحيح مسلم) ب(٣) ل(١٩٦) و(فتح الباري) ب(٨) ل(٨٦١).

**جا بزانە: سێ جار جنۆکە لە (مَكّة)دا هاتونەتە خزمەت پێغەمبەرﷺ:**

**جاریەکەم:** لە بازاری (عُكاظ)، کە لە سەرەتای پێغەمبەرایەتیدا شەیتانەکان—جنۆکە کافرەکان—ڕێگەی سەرکەوتنی ئاسمانیان لێگیراو بڵێسەی ئاگری ئەستێرەکانیان بۆ دەهاویشترا، گەڕانەوەو گوتیان: ڕێگەی نێوان ئێمەو هەواڵەکانی ئاسمانمان لێداخراوە. واتە: پێش پێغەمبەرایەتی جنۆکە سەردەکەوتن بۆ ئاسمانەکان‌و گوێیان لە (وَحْي)= هەواڵەکانی ئاسمان ڕادەگرت، ئینجا لە سەرەتای پێغەمبەرایەتیدا قەدەغە کران،

جا (إِبْلِيس)=شەیتانیگەورە گوتی: دیارە شتێك ڕوویداوە، هەڵسن بە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای زەمینـدا بـڕۆن، بـزانن چـی ڕوویـداوە؟ جـا ئەوانـەی بـەرەو (حجـاز) هـاتن، گوێیـان لـە پێغەمبەرﷺ بوو—لەو کات بۆ (عُكاظ) دەڕۆیشت‌و نوێژی بە (صَحابَة)کان دەکرد— جا کە گوێیان لە قورئانخوێندنەکەی پێغەمبەرﷺ بوو، گوتیان: ئەم ڕووداوەیە ڕێگەی ئاسمانی لە ئێوە گرتووە. جا ئەوانە گەڕانەوە لای گەلەکەیخۆیان هەواڵەکەیان بە ئەوان ڕاگەیاند: کە لە سـورەتی ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآناً عَجَباً﴾ بـاس کـراوە، واتە: لەم جارەدا پێغەمبەرﷺ نەیزانی جنۆکە گوێیان لێڕاگرتووە.

**جاریدووەم:** لە (النَّخْلَة)، لەو کاتەی پێغەمبەرﷺ لە (طائِف) گەڕاوەو حەزرەتی(زَيْـد بـن حارِثَـة)ی لەگەڵـدا بـوو، کـە باسمـان کـرد، واتـە: لـەم جارەشـدا پێغەمبـەرﷺ نـەیزانی جنۆکەگوێیان لێڕاگرتووە.

**جاری‌سێیه‌م:** له‌(اَلْحَجُون) لـه دوای جاری‌دووه‌م، سێسه‌د كه‌س– لـه جنۆكـه‌كان هاتنـه خزمـه‌ت پێغه‌مبـه‌رﷺ، كـه حـه‌زره‌تی(عبـدالله بـن مَـسْعُود)ﷺ گێڕاویه‌تیـه‌وه: شـه‌وێك وه‌فدێكی جنۆكه‌ی (نصيبين) هاتنه خزمه‌ت پێغه‌مبه‌رﷺ، تاكو گوێ له قورئان ڕابگـرن‌و شاره‌زای ئیسلام ببن، جا پێغه‌مبـه‌رﷺ له‌گه‌ڵیان دانیـشت‌و قورئـانی بـۆ خوێنـدن، واتـه سوره‌تی(الرّحمن)ی بۆ خوێندن، هه‌روه‌ك (الترمذي) و(البيهقي) گێڕاویه‌تیانه‌وه.

جا ئه‌م جاره جنۆكه داوای ئازوقه‌یان له پێغه‌مبه‌رﷺ كرد، پێغه‌مبـه‌ریشﷺ فـه‌رمووی: ﴿كُلُّ عَظْمٍ يُذْكَرُ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ يَقَعُ فِي أَيْدِيكُمْ أَوْفَرَ ما كانَ لَحماً، وَكُلُّ بَعْرَةٍ أَوْ رَوْثَةٍ عَلَفٌ لِدوابِّكُمْ...وَقالَﷺ: فَلا تَسْتَنْجُوا بِهِما فَإِنَّهُما زادُ إِخْوانِكُمْ اَلْجِنّ﴾ رواه الترمذي ومسلم، **هـه‌ر ئێسقانێك–لـه كاتی سه‌ربڕیندا–(بِسْمِ اللهِ)ی له سه‌ر كرابێ، كه ده‌كه‌وێته ده‌ستی ئێوه زیاتر گۆشتی پێوه‌یه، گشت قشپل‌و ڕیخێكیش ئالیكی وڵاغه‌كانتانه...جا پێغه‌مبـه‌رﷺ فـه‌رمووی: تـاره‌ت بـه ئێـسقان‌و ڕیـخ مه‌كـه‌ن، چـونكه ئازوقـه‌ی بـرا جنۆكه‌كانی ئێوه‌یه.** (السيرة الحلبية) ب(١) ل(٥٠٧–٥١٢).

**نۆیـــه‌م: پێغه‌مبــــه‌رﷺ داوای لــــه (الْمُطْعِــم بـــن عَـــدِيّ) كـــرد بیپـــارێزێ.**

ئه‌وه‌ش به‌ڵگه‌یه: دروسته موسوڵمان له حاڵه‌تی ناچاری‌دا بچێته ژێر پاراستنی كافرێك، به‌و مه‌رجه‌ی ئه‌م پاراستنه زیان له ئایین‌و بانگه‌وازی‌ئیسلام نه‌دا–هه‌روه‌ك له كۆچكردنی (حَبَشَة)دا ڕوونمان كردووه– جا ئه‌وه‌ی پێویسته لێره‌دا بگوترێ: ده‌بی موسوڵمان به‌رامبه‌ر بـه‌م جـۆره كافرانه به ئه‌مه‌ك بێ‌و چاكه‌ی ئـه‌وانی لـه به‌رچـاو بـێ، چـونكه لـه‌باره‌ی دیلـه‌كانی (بَدْر) پێغه‌مبه‌رﷺ فـه‌رمووی: ﴿لَوْ كانَ الْمُطعِمُ بنُ عَدِيّ حيّاً ثُمَّ كَلَّمَني فِي هَؤُلاءِ النَّتْنَى لَتَرَكْتُهُمْ لَهُ﴾ رواه البخاري، **ئه‌گه‌ر (الْمُطْعِم)ی كوڕی (عَدِيّ) زینـدوو بوایـه‌و لـه‌باره‌ی ئـه‌م دیلـه بۆگه‌نانـه قـسه‌ی له‌گـه‌ڵ كردبـام–واتـه: داوای ئازادكردنیـانی لێكردبـام– لـه بـه‌ر خاتری وی وازم لێده‌هێنان‌و ئازادم ده‌كردن.**

جگه له‌م چاكه‌یه‌ش (الْمُطْعِم) ده‌ستێكی باڵای هه‌بوو لـه هه‌ڵوه‌شـاندنه‌وه‌ی گه‌مارۆیه‌كـه‌ی سه‌ر خزمه‌كانی پێغه‌مبه‌رﷺ، هه‌روه‌ها حه‌زره‌تی(حَسّان بـن ثابـت)ﷺش–كـه شـاعیری پێغه‌مبـه‌رﷺ بـوو– بـه چـه‌ند پارچـه شـیعرێك مـه‌دحی (الْمُطْعِـم)ی كـردووه‌و باسـی ئـه‌و چاكه‌یه‌ی تێدا كردوه كه به‌رامبه‌ر پێغه‌مبه‌رﷺ كردویه‌تی. (فتح الباري) ب(٧) ل(٤٠٤).

*** *** ***

**﴿(الإِسْراء وَالْمِعْراج)=شه‌وڕۆیی پێكردن‌و سه‌ركه‌وتنی پێغه‌مبه‌رﷺ بۆ ئاسمانه‌كان﴾**

**(اَلإِسْــــراء):** شــه‌وڕۆیی پێكردنـــی پێغه‌مبــــه‌رﷺ لــــه (مَكّــة)ی پــیرۆزه‌وه بــۆ (الْمَسْجِدِالأَقْصَى)–له (فَلَسْطِين)– له به‌شێكی شه‌وێ‌دا.

**(الْمِعْراج):** سـه‌ركه‌وتنی پێغه‌مبـه‌رﷺ لـه (اَلْمَسْجِدِالأَقْصَى)وه بـۆ سـه‌ره‌وه‌ی هـه‌ر حـــه‌فت ئاسمانـــه‌كان لـــه هـــه‌مان شه‌وه‌كه‌ی شه‌وڕۆیی‌دا.

ئەم (مُعجزة) گەورەیە بە گیانو جەستەی پێغەمبەرﷺ بوو و خەون نەبو، لە شەوی هەینی (٢٧) بیستو حەفتی مانگی (رَجَب)، ساڵی دوانزەی پێغەمبەرایەتی، واتە: ساڵێك پێش کۆچکردنی ڕووی دا.

جا بزانە: (اَلإسْراء) بەڵگەی قورئانو حەدیسو (إجماع)ی لە سەرە، بۆیێ هەر کەسێك باوەڕی بە (اَلإسْراء) نەبێ، ئەوە کافر دەبێ، بەڵام (اَلمِعْراج) بەڵگەی حەدیسی (صحيح) لە سەرە، بۆیێ هەرکەسێك باوەڕی بە (اَلمِعْراج) نەبێ، ئەوە کافر نابێ، بەڵکو (فاسق) دەبێ. بڕوانە (السيرةالحلبية) ب(١) ل(٥١٥) و(تحفة المريد على جوهرة التوحيد) ل(٧٦).

خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَ الَّذِی أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِی بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾الإسراء: ١، پاكو بێ عەیبی بۆ ئەو خوایەی شەوڕۆیی کرد بە بەندەی خۆی–مُحَمَّدﷺ– لە بەشێکی شەویدا لە (اَلْمَسْجِدالْحَرام)وە لە (مَكّة)ی پیرۆز بۆ (اَلْمَسْجِدالأَقْصى)=(بَيْت الْمُقَدَّس) لە (فَلَسْطِين)، ئەو (بَيْت الْمُقَدَّس)َی پیتو بەرەکەتمان کردۆتە دەورەی، ئەو شەوڕۆییە بۆ ئەوە بوو هەندێك لە بەڵگەکانی توانای خۆمان نیشانی پێغەمبەرﷺ بدەین، بەڕاستی خوایگەورە بیسەرو بینەرە.

لە دوای مردنی (أبُوطالِب)و وەفاتی حەزرەتی(خَدِيجَة)و-رضي الله عنها-سوکایەتی پێکردنی دانیشتووانی (طائِف)و موسوڵمانبوونی بەشێکیتری دانیشتووانی سەر زەمین: لە ئادەمیزادو جنۆکە، خوایگەورە ویستی گەشتێك بە پێغەمبەرﷺ بکا بۆ (اَلْمَسْجِد الأقْصى)و لەوێشەوە بۆ ئاسمانەکان، لەوێشەوە بۆ ئەو شوێنەی تەنها خوا بەخۆی دەیزانێ، تاکو بە دیتنی زاتی خوداو بە دیتنی (مَلائِكَة)و پێغەمبەرانو–عليهم الصلاة والسلام–بە دیتنی بەهەشتو جەهەننەمو چەند شتێکیتر شاد ببێ، ئەم گەشتەش ببێتە نیشانەی ئەوەی کە (مُحَمَّد)ﷺ پێغەمبەری هەردوو مزگەوتەکانەو میراتگرو ئیمامی هەموو پێغەمبەرانەو–عليهم الصلاة والسلام–پێغەمبەرایەتیەکەی گشتیەو تا ئاخیری زەمانە، بۆیێ ئەم گەشتەش دەبێتە ڕێخۆشکردنێك بۆ قۆناغێکیتری بانگەوازی ئیسلام کە هەر لە ئێستاوە پێغەمبەرﷺ ئامادەکاری بۆ دەکا.

جا ئەم (مُعْجِزَة) گەورەیە لە (البخاری)و (مسلم)و کتێبەکانیتری (حَدِيث)و (سِيرَة)دا بە (رِوايَة)ی جۆراوجۆر هاتووە، ئێمەش لە هەمووانیان کورتە باسێك پێك دێنین:

شەوێك پێغەمبەرﷺ لە لای (بَيْت)=(كَعْبَة) پاڵی دابۆوە، حەزرەتی(جُبْرائيل)عليه السلام هاتە لای، لە بنەوەی گەردەنی تا بنەوەی زگی لەتی کرد، ئینجا دڵی پێغەمبەریﷺ دەرهێناو لە ناو تەشتێکی زێڕدا بە ئاوی (زَمْزَم) دڵەکەی شوشتو پڕی کرد لە ئیمانو حیکمەت، ئینجا لە شوێنیخۆی دایناوە، ئینجا وڵاغێکیان بۆ پێغەمبەرﷺ هێنا–کە

ناوی (البُراق)=بۆڕاق بوو، پێش پێغەمبەریش ﷺ پێغەمبەرەکانی‌تر-علیهم الصلاة والسلام-سواری پشتی دەبون، هەر شاقاوێکی ئەم بۆڕاقە بە قەد بینینی چاوەکەیەتی.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ لە سەر پشتی بۆڕاق سوار بوو و لەگەڵ حەزرەتی(جِبْرائِیل)ﷺ هاتنە (بَیْت الْمُقَدَّس)=(الْمَسْجِدالأقْصَی) لە (فَلَسطِین)، جا لەوێ بۆڕاقی لە ئاڵقەی دەرگەی (الْمَسْجِدالأقْصَی) بەستەوەو چونە ناو مزگەوت‌و هەر یەکەو دوو ڕەکعەت نوێژیان کرد، جا بە ماوەیەکی کەم پێغەمبەران-علیهم الصلاة والسلام-لەوێ کۆ بونەوەو بۆ نوێژکردن ڕیز بون، ئینجا حەزرەتی(جِبْرائِیل)ﷺ دەستی پێغەمبەری ﷺ گرت‌و بۆ ئیمامەتی وەپێشی خست، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە ناو (اَلْمَسْجِدُالأقْصَی)دا پێشنوێژی بۆ هەموو پێغەمبەران کرد علیهم الصلاة والسلام.

ئینجا کە کاری (بَیْتُ الْمُقَدَّس) تەواو بوو، (اَلْمِعْراج)=پەیژەی ئاسمان بۆ پێغەمبەر ﷺ داندراو لەگەڵ حەزرەتی(جِبْرائِیل)ﷺ بەم پەیژەیەدا سەرکەوتن تا گەیشتنە ئاسمانی یەکەم، ئینجا حەزرەتی(جِبْرائِیل)ﷺ داوای کرد دەرگەی ئاسمانەکەیان بۆ بکرێتەوە، (مَلائِکَة) فەرموویان: ئەوە کێیە؟ حەزرەتی(جِبْرائِیل)ﷺ فەرمووی: من (جِبْرائِیل)م. (مَلائِکَة) فەرموویان: کێ لەگەڵتدایە؟ حەزرەتی(جِبْرائِیل)ﷺ فەرمووی: (مُحَمَّد)م ﷺ لەگەڵدایە. (مَلائِکَة) فەرموویان: لە لایەن خواوە داوا کراوە بێتە ئاسمان؟ حەزرەتی (جِبْرائِیل)ﷺ فەرمووی: بەڵێ. (مَلائِکَة) فەرموویان: مەرحەبای لێبێ، باشترین هاتن هاتنی ئەوە، جا دەرگەی ئاسمانیان بۆ کردنەوەو چونە ژورەوەو دیتی باب (آدم)ﷺ لەوێیە، جا حەزرەتی(جِبْرائِیل)ﷺ فەرمووی: ئەمە (آدم)ی باوکی تۆیە، سەلامی لێبکە. جا پێغەمبەر ﷺ سەلامی لێکرد، ئەویش وەڵامی سەلامەکەی داوەو فەرمووی: (مَرْحَباً بِالْإبْنِ الصّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصّالِحِ) مەرحەبای لێبێ=بەخێر بێ ئەم کوڕە چاکەم‌و ئەم پێغەمبەرە چاکە.

ئینجا بۆ ئاسمانی‌دووەم‌و ئاسمانەکانی‌تریش سەرکەوتن، لە هەر ئاسمانێکدا وەك ئاسمانی‌یەکەم حەزرەتی(جِبْرائِیل)ﷺ داوای دەکرد دەرگەی ئاسمانەکە بکەنەوە، (مَلائِکَة)ش هەمان پرسیارەکانیان دەکردن‌و دەرگەیان دەکردەوە، جا لە ئاسمانی دووەمدا پێغەمبەر ﷺ دیتی حەزرەتی(یَحْیَی) پێغەمبەرو حەزرەتی(عِیسی) پێغەمبەر-صلی الله علیهما- لەوێنەو سەلامی لێ کردن، لە ئاسمانی‌سێیەمدا حەزرەتی(یُوسُف) پێغەمبەری ﷺ دیت‌و سەلامی لێکرد، لە ئاسمانی‌چوارەمدا حەزرەتی(إدْرِیس) پێغەمبەری ﷺ دیت‌و سەلامی لێکرد، لە ئاسمانی‌پێنجەمدا حەزرەتی(هارُون) پێغەمبەری ﷺ دیت‌و سەلامی لێکرد، ئینجا لە ئاسمانی‌شەشەمدا حەزرەتی(مُوسی) پێغەمبەری ﷺ دیت‌و سەلامی لێکرد.

ئینجا لە ئاسمانی‌حەفتەمدا حەزرەتی(إبراهیم) پێغەمبەری‌ﷺ دیت: پشتی خۆی داوەتە (البَیْتُ المَعْمُور) جا پێغەمبەرﷺ سەلامی لێکرد، ئەویش وەڵامی سەلامەکەی داوەو فەرمووی: (مَرْحَباً بِالإِبْنِ الصّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصّالِحِ) مەرحەبای لێبێ=بەخێر بێ ئەم کوڕە چاکەو ئەم پێغەمبەرە چاکە.

جا هەر لە ئاسمانی‌حەفتەمدا (البَیْتُ المَعْمُور)و (سِدرَةُالمُنتَهی) بۆ پێغەمبەرﷺ نزیك کرانەوەو نیشانی دران، جا دیتی چوار ڕووبار لە بن (سِدرَةُالمُنتَهی)وە دێنە دەرەوە: دووانیان ڕوباری بەهەشتن، دووەکەی‌تریش ڕوباری دونیان: کە (النّیل)و (الفُرات)ن، هەروەها جەهەننەمو بەهەشتیشی دیتن، ئینجا جامێکی شەڕابو جامێکی شیرو جامێکی هەنگوینیان بۆ پێغەمبەرﷺ هێنان، ئەویش جامە شیرەکەی وەرگرتو خواردیەو، جا حەزرەتی(جُبْرائِیل)ﷺ فەرمووی: ئەم شیرە پاکی‌ی ئیسلام بوو تۆ هەڵتبژارد.

ئینجا پێغەمبەرﷺ بەرەو سەرەوەتر بەرز کراوە، تا گوێی لە سیرەسیری پێنووسەکانی (مَلائِکَة) بوو: کە بڕیارەکانی خوای‌گەورەیان لە (اللَوْحُ المَحْفُوظ)دا دەنوسی، ئینجا هەورێکی نورانی (سِدرَةُالمُنتَهَی)ی داپۆشی‌و حەزرەتی(جُبْرائِیل)ﷺ لە پێغەمبەرﷺ جیا بۆوەو دەنگو هەست نەماو پێغەمبەرﷺ زیاتر بەرز کراوە—کە هەر خوا بەخۆی دەیزانێ— جا خوای‌گەورە (مُناجاة)ی لەگەڵ پێغەمبەرﷺ کردو پێغەمبەرﷺ گوێی لە فەرموودەی خوا بوو و خوای‌گەورە پەنجا نوێژی لە سەر خۆی‌و ئوممەتی واجب کردن لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا.

جا کە پێغەمبەرﷺ لە (مُناجاة)ی خوای‌گەورە گەڕاوە، بە لای حەزرەتی(مُوسی) پێغەمبەرداﷺ ڕابرد، ئەویش لێی پرسی: خوای‌گەورە چی لە سەر واجب کردی؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: پەنجا نوێژ. جا حەزرەتی(مُوسی)ﷺ فەرمووی: ئوممەتی تۆ توانای پەنجا نوێژی نیە، بگەڕێوە لای خوا، تکای سوککردنی لێبکە. جا پێغەمبەرﷺ گەڕاوە لای خواو فەرمووی: خودایە ئەم واجبە لە سەر ئوممەتم سوك بکە. جا خوای گەورە پێنج نوێژی لە سەر لادان، جا پێغەمبەرﷺ گەڕاوە لای حەزرەتی(مُوسی) پێغەمبەرﷺ، ئەویش فەرمووی: ئوممەتەکەت توانای چلو پێنج نوێژەکەشی نیە، بگەڕێوە لای خوا دیسان تکای سوککردنی لێبکە. دیسان پێغەمبەرﷺ گەڕاوە لای خوا و تکای سوککردنی لێکرد، خوداش پێنج نوێژی‌تری لە سەر لادان...هەر بەم جۆرە پێغەمبەرﷺ نۆ جار گەڕاوە لای خوا، تا نوێژەکانی کردنە پێنج نوێژ لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا...جا پێغەمبەرﷺ بە حەزرەتی(مُوسی)ی‌ﷺ فەرموو: ئەوەندە تکای سوککردنم لە خوا کرد، تا شەرمم کرد تکای زیاتر بکەم، بەم پێنج نوێژانە ڕازی دەبم. جا لە لای خواوە پێی گوترا: ﴿ئەی (مُحَمَّد) ئەوە بڕیارم دا: لە هەموو شەو و

ڕۆژێکدا پێنج نوێژ واجب بن‌و خێری پەنجا نوێژەکەیان هەبێ: هەر نوێژێك بە دە نوێژ، واجبی‌خۆم بڕیار دا، هەم لە سەر بەندەکانی خۆم سوك کرد﴾.

ئینجا پێغەمبەرﷺ لە ئاسمان هاتە خوارەوە بۆ (بَيْت المُقَدَّس)، لەوێش سواری بۆڕاق بۆوەو لەگەڵ تاری‌و ڕۆنی بەیانی‌ی هەمان شەو گەیشتەوە (مَكَّة).

جا کە ئەو هەواڵەی بڵاو کردەوە، هەندێك لە کافرەکان چەپڵەیان لێدا و هەندێك فیکەفیکیان کردو باوەڕیان پێنەکرد، کۆمەڵێکیش هاتنە لای ئیمام (أبُوبَكْرِ‌رضي الله عنه) پێیان گوت: هاوڕێکەت دەڵێ: ئەم شەو چویمە (بَيْتُ المُقَدَّس)و گەڕامەوە (مَكَّة)!. ئیمام (أبُوبَكْرِ‌رضي الله عنه) فەرمووی: من باوەڕی پێدەکەم‌و ڕاست دەکا. جا لەم ڕۆژەوە ئیمام (أبُوبَكْرِ‌رضي الله عنه) ناوی لێندرا: (الصِّدِّيق).

جا کافرەکان گوتیان: کەوابوو: ئەی (مُحَمَّد) بۆمان باسی (بَيْتُ المُقَدَّس) بکە؟ جا خوای گەورە (بَيْتُ المُقَدَّس)=(اَلْمَسْجِدُالأَقْصى)ی هێنا بەرچاوی پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەریشﷺ تەماشای دەکردو یەکە یەکە نیشانەکانی بۆ دەگوتن، جا ئەمەش بووە هۆی بەهێزبوونی باوەڕی ئیمانداران‌و زیاتر گومڕابوونی کافرەکان. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ب(٢) ل(٥٣–٨٨) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٢٤٧–٢٧٢).

### ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: گرنگی‌و ڕێزداری (بَيْتُ الْمُقَدَّس)=(اَلْمَسْجِدُالأَقْصَى)، خوای‌گەورە شەوڕۆیی بە پێغەمبەرﷺ کرد لە (اَلْمَسْجِدُالْحَرام)وە بۆ (اَلْمَسْجِدُالأَقْصَى).** ﴿عَنْ أَبِى ذَرٍّ‌رضي الله عنه قُلْتُ: يا رَسُولَ اللهِ أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ فِي الْأَرْضِ أَوَّلَ؟ قالَ: اَلْمَسْجِدُالْحَرامُ. قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قالَ: اَلْمَسْجِدُالْأَقْصَى. قُلْتُ: كَمْ كَانَ بَيْنَهُما؟ قالَ: أَرْبَعُونَ سَنَةً﴾ رواه الشيخان، **ئەی پێغەمبەری خوا کامە مزگەوت لە سەر زەمین پێشتر داندراوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (اَلْمَسْجِدُ الْحَرام–لە (مَكَّة)–. گوتم: ئینجا کامە مزگەوت؟ فەرمووی: (اَلْمَسْجِدُالْأَقْصَى)–لە (فَلَسْطِين)–. گوتم نێوان دروستکردنیان چەند بوو؟ فەرمووی چل ساڵ.**

کەوابوو: گرنگی‌و ڕێزداری (بَيْتُ الْمُقَدَّس)=(اَلْمَسْجِدُالأَقْصَى)، هەم پەیوەندی بە (اَلْمَسْجِدُالْحَرام)ی قیبلەی موسوڵمانان لەوەدایە: شەوڕۆکەی پێغەمبەرەﷺ، شوێنی سەرکەوتنی پێغەمبەرەﷺ بۆ ئاسمانەکان، یەکەم قیبلەی موسوڵمانان بوو تا لە ساڵی دووی کۆچی‌دا قیبلە گوردرا بۆ (كَعْبَة)، هەروەها مەڵبەندو قیبلەی پێغەمبەرەکانی‌تریش بوو–عليهم الصلاة والسلام–، هەر لە (اَلْمَسْجِدُالأَقْصَى)دا پێغەمبەران–عليهم الصلاة والسلام– ئیمامەتی‌و پێشەوایەتی پێغەمبەریانﷺ قبوڵ کردو نوێژیان لە پشت کردو سەرکردایەتی پێغەمبەرایەتییان تەسلیم بەوی کرد، کەوابوو:–وەك گرنگی‌دان بە (اَلْمَسْجِدُالْحَرام)ی (مَكَّة)– پێویستە موسوڵمانان گرنگی بە (اَلْمَسْجِدُالأَقْصَى)ی (فَلَسْطِين)ش بدەن.

جا به هۆی ئەم ڕێزدارییەیە، بۆ یەکەم جار (اَلْمَسْجِدُالأَقْصَى) لە سەردەمی (خِلافَة)ی ئیمام (عمر)داﷺ لە ژێر دەستی کافرەکانی ڕۆم ڕزگار کرا، ئینجا بۆ جارێکیتر کافرەکانی (أورپا)ی(صَلِيبِي) داگیریان کردەوە: لە ڕۆژی هەینی (١٥)ی (تموز)ی ساڵی (١٠٩٩)ز، بەرامبەر ساڵی(٤٩٢) کۆچی چونە ناو شاری (قُدْس)و حەفتا هەزار موسوڵمانیان لە ناو (اَلْمَسْجِدُالأَقْصَى)دا شەهید کرد، ئینجا–لە دوای نەوەد ساڵی مانگی– لە ڕۆژی هەینی (٢٧)ی مانگی (رَجَب)ی ساڵی (٥٨٣)ی کۆچی، دووبارە (صلاح الدِّين الأَيُّوبِي)ی کوردی ڕزگاری کردەوە، ئینجا هەر لە دەست موسوڵماناندا بوو تا لە ساڵی (١٩٦٧)ی زایینی، ئەم جارەش جولەکە بە پاڵپشتی کافرەکانی (أورووپا)و (أمریکا) داگیریان کردەوە، تا نوسینی ئەم باسەش هەر لە ژێر داگیرکردنی جولەکەدایە، خوا بیگەڕێنێتەوە بۆ موسوڵمانان، آمین.

## ﴿(صلاحُ الدِّين الأَيّوبِي)و ڕزگارکردنی (اَلْمَسْجِدُ اْلأَقْصَى)﴾

(صلاحُ الدِّين) ناوی (يُوسُف) کوڕی (أيّوب) کوڕی (شادی) کوڕی (مَرْوان)ی کوردییە، ئەم بەڕێزە لە هۆزی (زرزار)ی (روادي) کوردییە، کە هۆزە بە شەرەفەکانی گەلی کوردە، لە گوندی (دُوين)–کە دانیشتووەکانی کوردن– لە هەرێمی (آذَربیجانی) ئێرانە، لە نزیك (تفليس). بڕوانە (معجم البلدان) و(طبقات الشافعية الكبرى) ب(٤) ل(٢١٧).

ئینجا کە کافرەکانی (أورپا)ی (صَلِيبي)، وڵاتی (شام)و (قُدْس)ی پیرۆزیان داگیر کردن، سەرکردەیەکی کافری (صَلِيبي)–کە ناوی (أرناط)=(ریجنالد)ی (فَرَنسِي) بوو، بە دەریای سوۆردا لەشکرێکی ناردە وڵاتی (حِجاز)، تاکو (كَعْبَة)ی ماڵی خوا بڕوخێننو لاشەی پێغەمبەریشﷺ لە گۆڕەکەی دەربهێننو ببەنە (فَرَنْسا)و ڕێگەش نەدەنە موسوڵمانان زیارەتی بکەن تەنها بە پارە نەبێ.

جا (صلاح الدين الأيوبي) یەکسەر فەرمانی دا: هێزی دەریایی ئیسلام بە سەرکردایەتی (حسام الدِّين لُؤْلُؤ) بە دەریای سوۆردا بەرەو کافرەکانی (صَلِيبي) ڕۆیشتنو لە خاکی (حِجان)دا ڕووبەڕوویان بونەوەو لە جەنگێکی پێنج ڕۆژەدا قڕانیان بۆ کافرەکان هێنا، تەنها (أرناط)ی سەرکردە خۆیو چەند پاسەوانێکی دەرباز بونو گەڕانەوە قەڵای (الكَرَك) لە (أُرْدُن).

ئینجا (صلاح الدين) دوانزە هەزار جەنگاوەری تایبەتیی ئامادە کرد بۆ جەنگی یەکلاکەرەوەی کافرەکانی (صَلِيبِي)، هەم سەدو پەنجا هەزار جەنگاوەری یەدەکیشی ئامادە کرد لە کوردو تورکمان بۆ پاڵپشتی هێزەکانی تایبەتی، ئەم هێزە یەدەکە پێك هاتبوو لە خۆبەخشەکانی زانایانی ئایینیو سۆفیو چینەکانیتری شارو لادێیەکان، هەندێ جار کاروباری دیلەکانیش بەوان دەسپێردرا.

ئینجا لە (٢٤و٢٥)ی (ربيع الثاني)ی ساڵی(٥٨٣)ی کۆچی، بەرامبەر (٣و٤)ی(تموز)ی (١١٨٧)ز، لە (حِطِّين) ڕووبەڕووی کافرەکانی (صَلِيبِي) بۆوەو موسوڵمانەکان بە دروشمی

(يَحْيَا الْإِسْلام)=بژی ئیسلام، هاتنه مەیدان: (عُمر)ی کوڕە برای (صلاح الدّين) سەرکردەی ڕاستەی لەشکری ئیسلام بوو، سولْتان (مُظَفَّر)ی هەولێریش سەرکردەی چەپەی لەشکرەکە بوو، (صلاح الدين)ش بەخۆی لە ناوەندی لەشکرەکەی بوو، لە ڕۆژی شەممە –کە ڕۆژی دووەمی جەنگەکە بوو– خوایگەورە سەرکەوتنی بۆ موسوڵمانان ناردو کافرەکان بەزینو (جایەی) پاشا کافرەکەی (قُدْس)و (أرناط)ی کافری تاوانکار–هەردووکیان– دەستگیر کران.

بەڵێ: ئەوەی کافرەکانی (صَلِيبي) بە ماوەی نەوەد ساڵ وەدەستیان هێنابوو، لە دوو ڕۆژدا هەموویان لەدەست چوو، ئینجا (صلاح الدّين) دادگای (أرناط)ی کردو تاوانەکانی خستنە بەرچاویو داوای لێکرد موسوڵمان ببێ تاکو عەفوی بکا، بەڵام موسوڵمان نەبو، بۆیێ (صلاح الدّين) بەخۆی خەنجەرێکی لە نێوان شانەکانی (أرناط) داو فەرمووی: (هَا أَنَا ذَا أَنْتَصِرُ لِمُحَمَّدٍﷺ) ها ئەوە منم تۆڵەی (مُحَمَّد)ی پێغەمبەرمﷺ دەستێنم. ئینجا پاسەوانەکان لە ناو خێمە بردیانە دەرەوەو بە تەواوی کوشتیان.

ئینجا (صلاح الدين) لە هێرشەکەی بەرەو (قُدْس) بەردەوام بوو، هەموو ئومێدی ئەوە بوو: لە ساڵرۆژی (الإِسْراء وَالْمِعْراج)دا (قُدْس) ڕزگار بکا، اَلْحَمْدُ لِلّه خوایگەورە ئومێدەکەی هێنا جێو لە ڕۆژی هەینی (٢٧) مانگی (رَجَب)ی ساڵی (٥٨٣)کۆچی، بەرامبەر (٢)ی(تشرين الثاني) ساڵی (١١٨٧) زایینی، بە سەرکەوتوویی چووە ناو شاری (قُدْس)و لە ژێر دەستی کافرەکان ڕزگاری کرد، بەڵام لەم ڕۆژەی ڕزگارکردندا نوێژی (جُمُعَة) نەکرا؟ چونکە موسوڵمانان سەرقاڵی دیل گرتنو ئامادەباشیی جەنگ بون، جا بۆ (جُمُعَة)یداهاتوو، زانایانیئایینی لە وڵاتانیئیسلام بۆ پیرۆزبایییو بۆ زیارەتی (بَيْتُ الْمُقَدَّس)=(اَلْمَسْجِدُ الْأَقْصَى) هاتنە شاری (قُدْس)، زۆربەیان بە تەمای ئەوە بون: یەکەم وتاری (جُمُعَة)ی دوای ڕزگارکردنی (قُدْس)ی بدرێتێ، بەڵام فەرمانی (صلاح الدّين) دەرچوو: کە (أبوالْمَعالِي الْقاضِي مُحْيُ الدَّين)= وتارخوێنی (دِمَشْق) وتارەکەی (جُمُعَة) بخوێنێتەوە؟ چونکە قەسیدەیەکی لە مەدحی (صلاح الدّين)و گەلی کورد گوتبوو تێیدا موژدەی ڕزگارکردنی (قُدْس)شی دابوێ!.

جا ئەویش بە سەر مێنبەری (اَلْمَسْجِدُالْأَقْصَى) کەوتو وتارێکی ڕەوانو بە نرخی خوێندەوەو لە وتارەکەیدا دوعای بۆ (صلاح الدّين) کرد. ئەم ڕۆژەش بووە ڕۆژی خۆشیو شادی بۆ موسوڵمانان، والحمد لله رب العالمين.

ئەم باسەم کۆ کردۆتەوە لە (الروضتين) ب(٢) ل(٨٠–٨٢و ٩٢–١١٠) و(رحلة ابن جبير) ل(٣٥) و(خطط المقريزي) ب(٢) ل(٨٦) و(شعلة الاسلام) ل(٩٤–٩٦) و(صلاح الدين الأيوبي، للصّلابي) ل(٣٧٦و٤٩٨–٥٠٥).

ئەمەش چەند پارچە شیعرێکی هەڵبژێردراوە لە قەسیدەکەی (الْقاضِي مُحْيُ الدِّين) کە لە مەدحی (صَلاح الأيُوبِي)و گەلی کورد دایناوەو تێیدا موژدەی ڕزگارکردنی (قُدْس)ی داوەتێ:

اَلْحَـمْـدُ لِلّـهِ ذَلَّتْ دَوْلَةُ الصُّـلُـبِ * وَعَـزَّ بِالْكُرْدِ دِينُ مُصْطَفَى الْعَرَبِ
بَيَّضْتَ بِالْكَرْدِ وَجْهَ الْكُرْدِ فَأْتَلَقُوا * كَواكِبَ فِى سَمَاءِ الْمَجْدِ وَالْحَسَبِ
رَدُّوا الْحَيَاةَ إِلَى الْإِسْلامِ وَابْتَهَجُوا * بِالدِّينِ مُحْتَسِباً بِإِثْرِ مُـحْتَسِـبِ
أَعْيا جِهَادُكَ قَوْماً أَبْطَنُوا حَسَداً * وَأَظْهَرُوا عَجَباً أَدَّى إِلَى الْعَجَبِ:
أَيَنْصُرُ الدِّينَ كُرْدِيٌّ؟! فَقُلْ لَهُمُ * اَلـدِّيـنُ لِلّـهِ، لاَ لِلْـكُـرْدِ وَالْـعَـرَبِ
وَفَتْحُكُمْ حَلَباً بِالسَّيْفِ فِى صَفَرٍ * مُبَشِّـرٌ بِفُـتُوحِ الْقُدْسِ فِى رَجَـبِ

حەمد و سوپاس بۆ خوا دەوڵەتی (صَلیب)=خاج پەرستەکان زەلیلو بێهێز بوو، بە هۆی گەلی کورد ئایینی پێغەمبەریﷺ هەڵبژێرداوی عەرەب سەربەرز و بەهێز بوو.

بەو هەڵمەتبردنـەت ڕووی گـەلی کـوردت سـپی کـردو کوردەکـان وەك ئەسـتێرەکان دەدرەوشێنەوە لە ئاسمانی گەورەیی‌و ڕەسەنایەتی‌دا.

کوردەکان ژیانیان بۆ ئیسلام گەڕاندەوەو بە ئایینی‌ئیسلام دڵخۆش دەبون: یـەك بـە دوای یەکدا بۆ پاداشتی‌خودا، واتە: نەك بۆ ناوبانگی دونیا.

(جهاد)و تێکۆشـانی تـۆ کەسـانێکی مانـدوو کـردن کـە حەسـوودییان–بەرامبـەر بـە تـۆ– شـاردبۆوەو سەرسـوڕمانێکیان ئاشـکرا کـرد کـە سەرسـوڕمانەکەیان مرۆڤـی دەخـستە سەرسوڕمان: ئایا پیاوێکی کورد یارمەتی ئایینی‌ئیسلام دەدا؟! جا بەو حەسـوودانە بڵـێ: ئایین بۆ خودایە، نەك بۆ کوردو عەرەب.

ڕزگارکردنتان شاری (حَلَب) بە شمشێر لە مـانگی (صَـفَر)دا، مـوژدەدەرە بـە ڕزگـارکردنی (قُدْس) لە مانگی (رَجَب)دا.

جا ئەم موژدیە کە لە شیعرەکەی داویی‌دا کـە دەڵـێ: **ڕزگارکردنتـان شـاری (حَلَب) بە شمشێر لە مانگی (صَفَر)دا**...هتد، دەگونجێ (القاضـی مُحْـيُ الـدِّين) لـە تەفـسیرەکەی (ابن برجان الأندَلُسي)ی وەرگرتبێ کە لە سەرەتای سورەتی ﴿الٓمٓ * غُلِبَتِ الرُّومُ﴾ وەدەری هێناوەو دەڵێ: لە ساڵی (٥٨٣)ی کۆچی‌دا (قُدْس) لە ژێر دەستی گاورەکان ڕزگار دەکرێ، هـەروەك (الآلُوسـي) لـە پێـشەکی‌ی (تـفسیر روح المعـاني)دا ڕوونـی کردۆتـەوە، هـەم بڕوانـە (الروضتين في أخبارالدولتين) ب(٢) ل(٤٥و١١٣).

ئینجا دەڵێین: اَلْحَمْدُ لِلّٰه خوای‌گەورە ئەو شەرەفو ڕێزداریەی بە گەلی کورد بەخشی: کە لە سەر دەستی (صلاح الدّين)ێکی کوردی موسوڵمان هەرسێك (حَرَم)ی ڕێزدار لە پیلانی کافرەکان ڕزگار کران، کە پێغەمبـەرﷺ دەرهـەق هەرسـێکیان دەفـەرموێ: ﴿لا تُـشَدُّ الرِّحالُ إلاَّ إِلَى ثَلاثَةِ مَساجِدَ: اَلْمَسْجِدِالْحرامِ، وَمَسْجِدِالرَّسُولِﷺ وَمَسْجِدِالأَقْصَى﴾ رواه

الشيخان، **بارگەكانی سەفەری خواپەرستی ناپێچرێنەوە تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێ: (اَلْمَسْجِدِالْحرامِ) لە (مَكَّة)، مزگەوتی پێغەمبەرﷺ لە (مَدِينَة)، (اَلْمَسْجِدُالْأَقْصَى) لە (قُدْس).**

بەڵێ: ئەو سەركەوتنەی (صلاح الدّين) بەختەوەریی دونیاو قیامەتە، هۆی ناساندنی گەلی كوردی موسوڵمانە بە هەموو جیهان، ئەی ئەوە شەرەفو رێزداری نیە: كە عەرەبێكی وەك (القاضي مُحْيُ الدِّين)–قازیو وتارخوێنی (دِمَشْق)– بەو جۆرە مەدحی گەلی كورد بكا؟ هەم تا ئێستاش لە وڵاتانی ئیسلامدا شوێنە گرنگەكان ناوی (صلاح الدين)ی لێدەنرێ؟، كەوابوو: گەورەییو بەختەوەریو ئازادی گەلی كورد هەر بەدەست پێوەگرتنی ئیسلامە.

ئینجا با نۆكەرانی كافرەكانی (أمريكا)و (أوربا)ش بە رقو قینی خۆیان بخنكێن كە دەڵێن: (صلاح الدّين) هیچی بۆ گەلی كورد نەكردوە!. ئەو قین لەدڵانە نەزانو شارەزای مێژوو نین؟! چونكە (يَمَن)و (حِجاز)و (مِصْر)و هەموو وڵاتەكانی (شام)و (ديارْبَكْر)و (شارزور)ش، هەمووی لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی (الأيوبي)ی كوردیدا بوو، لە وتاری نوێژی (جُمُعَة)دا لە مزگەوتی پێغەمبەرﷺ لە (اَلْمَسْجِدِالْحرامِ)شدا دوعا بۆ (صلاح الدين) دەكرا، هەروەك لە (رِحْلَة ابن جُبَيْر)دا فەرموویەتی. هەم بڕوانە (طَبَقَاتُ الشافعية الكبرى، للإمام السبكي) ب(٤) ل(٢٢٢).

بەڵام بە داخەوە، خیانەتكاریو خۆفرۆشیی هەندێك لە سەركردە كوردەكانی ئەو كات، ئەو دەوڵەتە گەورەو بەر فراوانەیان لەدەست دا، إنّا للهِ وإنّا إليهِ راجعون.

ئینجا (قُدْس) هەر لە باوەشی موسوڵماناندا بوو، تا لە ساڵی (١٨٩٧)ز، جولەكەكان لە (سويسرا) كۆنگرەیەكیان بەست بە سەرۆكایەتی (تيودور هرتزل)ی جولەكە، لەم كۆنگرەیەدا بڕیاریان دا: دەوڵەتێك لە (فَلَسْطِين) بۆ جولەكەكان دابمەزرێنن، بۆ ئەم كارەش (هرتزل) دیاری كرا: كە بچێتە لای سوڵتان (عبدالحميدالثانى)ی خەلیفەی ئیسلام، لەم بارەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ بكا. جا كاتێك وەفدی جولەكە چووە لای (عبدالحميدالثانى) داوایان لێكرد پارچە زەویەكیان لە (فَلَسْطِين) پێ بفرۆشێ، بەڵام سوڵتان (عبدالحميد) زۆر بە توندی وەڵامی دانەوەو گوتی: (**ئەو شوێنانەی بە خوێن وەرگیراون، بە هەمان پارە نەبێ، نافرۆشرێن**).

ئینجا لە (١٩٠٢) دووبارە وەفدێكیتری جولەكە چۆوە لای سوڵتان (عبدالحميدالثانى) بۆ هەمان مەبەست، بەڵام ئەم جارەش سوڵتان (عبدالحميد) وەڵامی دانەوەو فەرمووی: (**إنَّ بَيْتَ الْمُقَدَّسِ الشَّرِيفَ قَدْ افْتَتَحَهُ لِلإسْلامِ سَيِّدُنَا عُمَرُ بنُ الْخَطّابِ**ﷺ **وَلَسْتُ مُسْتَعِدّاً لأَنْ أَتَحَمَّلَ فِي التَّأْرِيخ وَصْمَةَ بَيْعِهَا لِلْيَهُودِ وَخِيانَةَ الْأَمَانَةِ الَّتِي كَلَّفَنِي الْمُسْلِمُونَ بِحِمَايَتِهَا**–وَفِي بَعْضِ الْكُتُب–: **إنَّ هَذهِ الْأَرْضَ أَرْضُ الْمُسْلِمِينَ فَتَحُوهَا بِدِمائِهِمْ وَلَنْ أُسَلِّمَ شِبْراً منها إلاّ عَلَى أَشْلائِي**) **ئەم خاكە پیرۆزەی ماڵیخوا لە (فَلَسْطِين)، یەكەم جار ئیمام (عمر**ﷺ**) بۆ ئیسلامی وەرگرتووە، من ئامادە نیم لە**

مێژوودا ڕووڕەشیی فرشتنی ئەم خاکە بۆ جووەکان هەڵبگرم، ئامادە نیم خیانەت لەم ئەمانەتەدا بکەم: کە موسوڵمانان بە منیان سپاردوە تا بیپارێزم... ئەم خاکە خاکی موسوڵمانانە، بە خوێنیخۆیان ئازادیان کردوە، یەك بستی ئەم خاکە نادەمە هیچ کەسێك، مەگەر لە سەر لاشەی پارچەکراومدا وەریبگرن. بڕوانە (السلطان عبدالحميدالثاني) ل(٣٣و٣٦) و(القدس المحتلة) ل(٣٣).

## ﴿ کوردستان و وڵاتانیتری ئیسلام پارچە پارچە کران ﴾

ئینجا لە بەر ئەم هەڵوێستە ئیسلامییە جولەکەو حیزبی (الإتحاد والترقي)ی تۆکەری کافرەکان لە تورکیاو چەند کۆمەڵێکیتری دژ بە ئیسلام بونە هاوپەیمان و لە ساڵی (١٩٠٩)ز، سوڵتان (عبدالحميد)یان لە (خِلافَة)ی ئیسلام لادا، ئیجا بە پاڵپشتی کافرەکانی ئینگلیزو تۆکەرایەتی (كمال أتاتورك)ی کافربوو، لە (٣)ی ئازاری (١٩٢٤) بە یەکجاری (خِلافَة)ی ئیسلامیان ڕوخاندو دەوڵەتیئیسلامیان تێك دا.

ئەوە لە لایەك، لە لایەکیتریش: کە جەنگی یەکەمی جیهانی دەستی پێکرا، لە (٢)ی (تشرين الثاني) (١٩١٧)ز، (وعد بلفور)ی کافرەکانی (إنگلیز) درایە جولەکەکان: کە دەوڵەتێکیان لە سەر خاکی (فَلَسْطِين)ی ئیسلام بۆ دابمەزرێنن.

ئینجا جا لە ساڵی (١٩٤٨)ز، بەشێکی (فَلَسْطِين) تەسلیم بە جولەکەکان کرا و لە هەموو وڵاتێك جولەکەیان دەگواستنەوە بۆ (فَلَسْطِين)، تا لە ساڵی (١٩٦٧)ز، شاری (قُدس)ش بە پشتگیری کافرەکانی (أمريكا)و (أوربا) لە لایەن جولەکەوە داگیر کرا، تا ئێستاش هەر لە ژێر داگیرکردنی جولەکەدایە، خوایگەورە ڕزگاری بکاتەوە، آمين.

هەروەها لە لایەکیتریش: لە (١٦)ی (أيار)ی (١٩١٦)ز، کۆنگرەی (سایکس–بیکو)ی کافرەکانی (إنگلیز)و (فرنسا) بڕیاری دا: کوردستان –وەك بەشەکانیتری دەوڵەتی ئیسلام– پارچە پارچە بکرێو بە سەر وڵاتانی دراوسێیدا بەش بکرێ. بەڵێ: بە بڕیاری کافرەکانی ڕۆژئاوا: کوردستان پارچە پارچە کراو تا ئێستاش هەر پارچەکراوەو خاوەنی دەوڵەتی خۆی نیە. بڕوانە (كيف هُدِمَت الخِلافة) ل(١٣و١٤و٤٥و٩٣–٩٧)و (عداوة الإنگليز للإسلام) ل(١٤١).

شێخ (معروف)ی(إلاالله)ی فەرموویەتی:

**پشت لە دین کردن–براکەم–پێم بڵێ: سودی چ بوو؟**

**یان بە لات وابوو کە ئایین بویتە (مَنْع)و بەرگری**

**سا بە (وَالله) عارە هەرگیز پشت لە دین کەی لاوی کورد**

**دوژمنی دین بوو–بزانە– داری هیوای تۆی بڕی**

*جا سەیر ئەوەیە: ئێستاش چەند کاربەدەستێکی کورد لە ئیسلام لایانداوەو تۆکەرایەتی بۆ کافرەکانی ڕۆژئاوا دەکەن و بە دۆستی خۆیان دادەنێن!، خودایە: ئەم خائین و*

*خۆفرۆشانە لەناو ببەو كوردستانمان بۆ بكـەوە یـەك پارچـەو سـەركردەیەكی موسـوڵمانو دڵسۆزمان بۆ دابنـێ، آمین.*

**دووەم: حەزرەتی ( جُبْرائِیل )ﷺ لە ناو تەشتێكی زێڕدا دڵەكەی پێغەمبەریﷺ بە ئاوی ( زَمْزَم ) شوشت.** **بزانـە:** سێ جاران سینەی پێغەمبەرﷺ لەت كراوە: لە كاتی شیرخواردنی لە لای (حَلِیمَة السَّعْدِیَّة)، هەروەك باسمان كرد. هەم لە كاتی (وَحْي) بـۆ هـاتن لـە ئەشـكەوتی (حِرا)، كە (أبوداود الطیالسي)و (أبونعیم)و (البیهقـي) گێراویەتیانـەوە. هـەم بـۆ سـەفەری (الإِسْراء وَالْمِعْراج)، تاكو بۆ (مُناجاة)ی خوا ئامادە ببێ.

**جا بزانـە:** بۆیێ لە تەشتی زێڕدا شۆردرا، چونكە قاپەكانی بەهەشت زێڕن، هەم بە ئـاگرو گلیش تێك ناچێو ژەنگدار نابێ، **دیسان بزانـە:** لەو كاتـەی دڵـی پێغەمبـەرﷺ شـۆردرا، بەكارهێنانی قاپی زێڕو زیو لە ئیسلامدا حەڕام نەكرابوو، هەم (مَلائِكَـة)ش وەك حاڵـەتێكی قیامەتی—نەك دونیایی— ئەم كارەیان ئەنجام دا. (فتح الباري) ب(٧) ل(٢٥٧).

**سێیەم: پێغەمبەرﷺ لە ناو ( الْمَسْجِدُ الْأَقْصَی )دا ئیمامەتی نوێژی بۆ پێغەمبەران كـرد**

**بزانە:** پێغەمبەران–علیهم الصلاة والسلام- وەكو شـەهیدان زیندوونـەو ڕێزدارتریـشن، پێغەمبـەرﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلْأَنْبِیَاءُ أَحْیاءٌ فِی قُبُورِهِمْ یُصلُّونَ﴾ رواه أبویعلي، وقال الإمامان المُناوي والعزیزی: هـو حدیث صحیح، **پێغەمبەران**–علیهم الصلاة والسلام- **لە ناو گۆڕەكانیاندا زیندوونە نوێژ دەكەن.**

جا ئـەم پێـشنوێژیەی پێغەمبـەرﷺ بـۆ پێغەمبـەران–علیهم الـصلاة والسلام- بـۆ زانینـی گـەورەیی پێغەمبـەرﷺ بـوو، هـەم بـۆ جێبـەجێكردنی ئـەو بەڵێنـەش بـوو كـە خوایگـەورە لـە پێغەمبەرانی وەرگرتبوو: **﴿ئەگەر گەیشتنە سەردەمی پێغەمبەرﷺ دەبی ئیمانی پێ بێنن و یارمەتیشی بدەن﴾**. هەروەك لە ئایەتی (٨١)ی (آل عمران)دا فەرموویەتیو لە ڕێخۆشكردنەكەی سەرەتادا ڕوونمان كردەوە،

هەم بـۆ ئـەوەش بـزانین: شـەریعەتی ئـەم پێغەمبـەرەﷺ، شـەریعەتی هـەمووانی (نَـسْخ) كردۆتەوەو لە كاری خستووە، سەركردایەتی هەموو ئایینەكان لە دونیاو قیامەتـدا تەسـلیمی ئەم پێغەمبەرەﷺ كراوەو جگە لە ئیسلام خوایگەورە هیچ ئایینێكیتـری نـاوێ، هـەروەك خۆی دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ یَبْتَغِ غَیْرَ ٱلْإِسْلامِ دِیناً فَلَنْ یُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِی ٱلْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِینَ﴾ آل عمران: ٨٥، **هەر كەسێك جگە لە ئیسلام ئایینێكیتری بوێ، لێی قبوڵ ناكرێو لە ڕۆژی دواییشدا لە زەرەرمەندەكانە.**

**كەوابوو:** ئەوانەی بەشداری كۆنگرەكانی لێك نزیكبوونەوەی ئایینەكان دەكـەن، لـە واتـەی ئەم پێشنوێژییەو لەم ئایەتە تێنەگەیشتون، ئەگـەر نـا: كەسـێك بـاوەڕی بـە پێغەمبـەری ئیسلامﷺ نەبێو بڵێ: (عیسی) كوڕی خوایە. یان ڕێـز لـە شـەیتان بنـێو بڵـێ: تاووسـی مەلائیكەتانە...هتد: ئەم باوەڕە پوچانە، ئەوانە چۆن دەگونجێ لەگەل ئیـسلام لێـك نزیـك ببنـــەوە؟! ناگونجـــێ، ناگونجـــێ، جیاوازیمان نێوان ئاسمانو ڕێسمانە.

**ئینجا بزانە:** دەگونجێ ئەم پێشنوێژیيە: پێش سـەرکەوتنی پێغەمبـەرﷺ بـۆ ئاسمـان، بوبێ–هەروەك (الحافظ ابن حجرالعسقلاني) بە بەهێزی داناوە–، هەم دەشگونجێ لە دوای گەڕانەوەی لە ئاسمان، بوبێ–هەروەك (الحافظ ابن كثير) بە بەهێزی داناوە–، بـەڵام هـیچ قەدەغەیەك نیە: هەردووکیان بوبن، چونکە بەڵگـە لـە سـەر هـەردووکیان هەیـە، هـەروەك ئیمامی(الحلبي) گێڕاویەتیەوە، واتە: پێش سەرکەوتنی پێغەمبەرﷺ پێغەمبەران–صلی الله علیهم–بـۆ پێـشوازیی هاتونەتـە (الْمَسْجِدُالأَقْـصَى)، لـە دوای گەڕانـەوەی پێغەمبـەریشﷺ بـۆ خواحافیزی لەگەڵی دابەزیون، جا لە هەردوو حاڵەتدا ئیمامەتیی بۆ کردن، والله أعلم.

هەروەها هێنانی جامەکانی شیرو شەڕابیش: لە هەندێك حەدیسدا پێش سەرکەوتنی ئاسمان بووە، لە هەندێکیتریشدا لە دوای سەرکەوتنی ئاسمان لە لای (سِـدْرَةُالْمُنْتَهَـى) بـووە، جـا دەگونجێ لە هەردوو شوێناندا جامەکانیان بۆ پێغەمبەرﷺ هێنابێ، والله أعلم. بڕوانە: (تفسير ابن كثير) الإسراء (١)، هەم (فتح الباري) ب(٧) ل(٢٦١و٢٧٠) و(السيرةالحلبية) ب(١) ل(٥٢٦).

**چوارەم: (اَلْمِعْراج) بۆ پێغەمبەرﷺ داندرا.** (الحافظ ابـن کـثير) فەرموویـەتی: (اَلْمِعْـراج) وەکو پەیژەیەو شوێنی پێ لێدانانی هەیە بۆ سەرکەوتن، پێغەمبەرﷺ بەم پەیژەیـەدا بـۆ ئاسمان سەرکەوت.

ئیمامی(الحلبي) گێڕاویەتیەوە: پێغەمبەرﷺ لـە ڕاسـتەی (الـصَّخرة)وە، پاشـان لـە بەردە گەورەکەی (بَيْتُ الْمُقَدَّس)وە بۆ ئاسمان سەرکەوتووە، جا کە پێغەمبەرﷺ چووەتە سـەر بەردە گەورەکە، بەردەکە لە بەر گەورەییو ڕێزداریی پێغەمبەرﷺ بە لادا چووە.

ئێستا ئەم بەردە گەورەیە گومبەتێکی لە سەرەو پێی دەگوترێ: مزگەوتی (قُبَّةُ الصَّخْرَة). هەم لە کوردەواریدا پێی دەڵێن: بەردی (صَخْرَةُالله).

جا (الحافظ ابن كثير) فەرموویەتی: کە ئیمام (عُمر)ﷺ (قُدْس)ی ڕزگار کرد، لەوێ نوێژی کردو بە پەشتەماڵەکەیخۆی بەردەکەی ماڵیو پاکی کردەوە. بڕوانە (تفسير ابن كثير) الإسراء (١) و(البداية والنهاية) ب(٤) ل(١٨٢) و(السيرةالحلبية) ب(١) ل(٥٢٤).

**پێنجەم: سەلامو ئیـزن وەرگـرتن، دەرگەوانـەکانی ئاسمانـەکان گوتیـان: ئـەوە کێـیـە؟** **حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه السلام فەرمووی: من (جُبْرائِيل)م...هتـد. خوایگـەورە دەفـەرمووێ:** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا﴾ النور: ٢٧، **هۆ ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، نەچنە هیچ ماڵێك–جگە لە ماڵیخۆتان–تا ئیـزن وەردەگرنو سەلام لە دانیشتووانی ماڵەکە دەکەن.**

**جا بزانـە: سەلام کردن سوننەتە، بەڵام وەڵامدانەوەی سـەلام واجبـە، دیـسان بزانـە: تـا سـێ جـار ئیـزن وەردەگـیرێ، جـا ئەگـەر ئیـزن نـەدرا، واجبـە: بگەڕێتـەوەو تـوڕە نـەبێ، خوایگەورە دەفەرموێ:** ﴿وَإِنْ قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ﴾ النور: ٢٨، **ئەگـەر ئیزن نـەدرانو پێتـان گـوترا: بگەڕێنـەوە. ئێـوەش بگەڕێنـەوە، ئـەو گەڕانەوەیـە بـۆ**

ئێوە پاكترو ڕێزدارترە. واتە: ململانە مەكەن‌و دڵتان نەشكێ‌و تورە مەبن.

جا ئیزن وەرگرتن: یان بە قسەكردنە، یان بە لە دەرگەدانە، جا ئەگەر گوتیان: كێیە؟ دەبێ –وەكو حەزرەتی(جُبْرائیل)ﷺ– ناوی خۆی بڵێ بە جۆرێكی وەها بیناسن، واتە: ناپەسەندە بڵێ: منم، یان خۆمانین ﴿عَن جابِرٍ رضي الله عنه أَتَيْتُ النَّبيَّ ﷺ فَدَقَقْتُ الْبابَ، فَقالَ: مَنْ ذا؟ قُلْتُ أَنَا. فَقالَ: أَنَا أَنَا. كَأَنَّهُ كَرِهَها﴾رواه الشيخان، هاتم لە دەرگەی ماڵی پێغەمبەرم داﷺ، جا فەرمووی: ئەوە كێیە؟ گوتم: منم. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: منم، منم. وەك ئەوەی وەڵامەكەی پێ ناخۆش بوبێ. (فتح الباری) ب(١) ل(٣٣و٤٣).

**شەشەم: لە ئاسمانی‌حەفتەمدا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی( إبْراهیم ) پێغەمبەری ﷺ بینی.**

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَقِيتُ إبْراهيمَ ﷺ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بي، فَقالَ: يَا مُحَمَّدُ أَقْرِئْ أُمَّتَكَ مِنِّي السَّلامَ وَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ الْجَنَّةَ طَيِّبَةُ التُّرْبَةِ عَذْبَةُ الْماءِ وَإِنَّها قِيعانٌ وَأَنَّ غِراسَها: (سُبْحانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلّهِ وَلاَإلَهَ إلاّاللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاّ باللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ﴾ حديث حسن رواه ابن مردويه والطبراني، لە شەوی شەوڕۆیی‌و (مِعْراج)دا گەیشتمە (إبْراهیم) پێغەمبەرﷺ، فەرمووی: ئەی (مُحَمَّد) سەلامی من لە ئوممەتەكەت بكەو پێیان بڵێ: بەهەشت گڵەكەی بۆنخۆشەو ئاوی شیرنەو زەمینەكەشی نەرمان‌و دەشتێكی ڕاستە، چاندنی درەختەكانی بەهەشت، زیكری (سُبْحانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلّهِ وَلاَإلَهَ إلاّاللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاّ باللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ)ە.

كەواتە: ئەی موسڵمانی ڕێزدار: زۆر ئەو زیكرانە بكە، تاكو زۆر درەختی بەهەشت بۆ خۆت بچێنی، چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ قالَ: سُبْحانَ اللهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ، غُرِسَتْ لَهُ نَخْلَةٌ فِي الْجَنَّةِ﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، واتە: هەر كەسێك ئەم زیكرە بكا، درەختێكی وێنەی دارخورمای لە بەهەشتدا بۆ دەچێندرێ. خودایە بە بەهەشت شادو بەختەوەرمان بكە. آمین. الخصائص الكبرى ب(١) ل(١٦٣).

**حەفتەم: لە ئاسمانی حەفتەمدا (اَلْبَیْتُ الْمَعْمُور)و (سِدْرَةُ الْمُنْتَهَی) نیشانی پێغەمبەرﷺ دران.**

(**اَلْبَیْتُ الْمَعْمُور**): مزگەوتێكە=(بَیْت)ێكە لە ئاسمانی‌حەفتەمدا لە ئاستی (كَعْبَة)یە، ئەگەر بكەوێتە خوارەوە، بە سەر (كَعْبَة)دا دەكەوێتە خوارەوە، ئەویش لە ئاسماندا–وەكو (كَعْبَة) لە زەمیندا– ڕێزدارە، هەموو ڕۆژێك هەفتا هەزار (مَلائِكَة) بۆ نوێژكردن دەچنە ناوی، كە هاتنە دەرەوە ناگەڕێنەوە لای، چونكە نۆبەتیان بەرناكەوێتەوە.

(**سِدْرَةُالْمُنْتَهَی**): درەختێكە لە ئاسمانی‌حەفتەم، میوەكەی وەك مەشكەی هەجەرە، گەڵایەكەی وەك گوێی فیلە، (مَلائِكَة) دادەوەرنە سەر ئەم درەختە–بۆ خواپەرستی‌و زیكری خوا– لە سەر هەر گەڵایەك (مَلائِكَة)ێك هەیە، زانستی (مَلائِكَة)و پێغەمبەران–علیهم الصلاة والسلام– لەوێ كۆتایی دێ، جگە لە پێغەمبەرﷺ هیچ كەسێك لێ ی

تێنەپەڕیوە، لە دوای (سِدْرَةُالْمُنْتَهَی) جگە لە خوا هیچ کەسێك نازانێ چ هەیە.

لە بن (سِدْرَةُ الْمُنْتَهَی) دوو ڕوباری بەهەشت هەڵدەقوڵێن: کە(سَلْسَبِیل)و (کَوْثَر)ن، هەم دوو ڕوباری دونیاش هەڵدەقوڵێن: کە (نِیل)و (فُرات)ن، ئینجا هەر خوا دەزانێ ئەم دوو ڕوبارانە بە کوێدا دادەبەزنە سەر زەمینو لێی هەڵدەقوڵێن، جا لێرەدا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی (جُبْرائِیل)یعليه السلام لە وێنەی فریشتەییدا بینی شەشسەد باڵی هەیە-مەروەك ڕابرا- خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى * عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى * عِنْدَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى﴾ النجم: ١٣-١٥، **جارێکیتریش پێغەمبەرﷺ (جُبْرائِیل)ی لە وێنەیفریشتەییدا دیتووە لە لای (سِدْرَةُالْمُنْتَهی)، بەهەشتیش لە لای (سِدْرَةُ الْمُنْتَهَی)یە.** (شرح صحیح مسلم) ب(٢) ل(٥٩و٧٢) و(فتح الباري) ب(٦) ل(٣٧١و٥٦٥) ، ب(٧) ل(٢٦٦-٢٦٨).

**هەشتەم: ئینجا هەورێکی نورانی (سِدْرَةُالْمُنْتَهَى)ی دا پۆشی و لەوێ حەزرەتی (جُبْرائِیل)عليه السلام لە پێغەمبەرﷺ جیا بۆوە،** بزانە: ئەم هەورەی سەر (سِدْرَةُالْمُنْتَهَی) پێی دەگوترێ: (اَلْحِجاب). ئیمامی(النـواوي) گێڕاویەتیەوە لە حەدیسێکدا هاتووە: **﴿(جُبْرائِیل)عليه السلام لێم جیا بۆوەو دەنگەکان نەمان﴾.**

ئیمامی(القُرطُبي) لە حەزرەتی(ابن عَبّاس)-رضی الله عنهما-دەگێڕێتەوە: لە شەوی (مِعْراج)دا (الرَّفْرَف) بۆ پێغەمبەرﷺ شۆڕ کراوەو لە سەری دانیشتو بەرز کراوەو لە خوا نزیك بۆوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **﴿(جُبْرائِیل) لێم جیا بۆوەو دەنگەکان نەمانو گوێم لە فەرموودەی خودا بوو﴾.**

ئیمامی(الحلبي) دەگێڕێتەوە: کە حەزرەتی(جُبْرائِیل)عليه السلام گەیشتە شوێنیخۆی لە لای (سِدْرَةُالْمُنْتَهَی)، گوتی: ئەی (مُحَمَّد) ئەمە شوێنی خۆمەو ناتوانم لێی تێپەڕم-واتە: ئەگەر تێپەڕم دەسوتێم – ئەی (مُحَمَّد) بەرەو پێش برۆ. ئینجا پێغەمبەرﷺ لە ناو (نور)ێکدا بەرەو پێش ڕۆیشت-کە هەر خوایگەورە بەخۆی دەیزانێ-جا لەوێ (مُناجاة)ی لەگەڵ خوا کرد، واتە: خوایگەورە قسەی لەگەڵ کرد. (تفسیر القرطبي) النجم: (١٢-١٨) و(شرح صحیح مسلم ب(٢) ل(٦٨) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٢٧١) و(السیرة الحلبیة) ب(١) ل(٥٦٤و٥٦٥).

## ﴿ دیتنی خوایگەورە ﴾

لە سەردەمی (صَحابَة)وەرضي الله عنهم زانایان فەرمودەی جیاوازیان هەیە: ئایا پێغەمبەرﷺ لە شەوی (مِعْراج)دا خوای دیتووە، یان نا؟ حەزرەتی(عائِشة)ی هاوسەرەکەی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: نەیدیتووە. بەڵام حەزرەتی(ابن عَبّاس)ی کوڕە مامی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: دیتویەتی. جا حەزرەتی(إبن عَبّاس)-رضی الله عنهما- فەرموویەتی: ﴿أَتَعْجَبُونَ أَنْ تَكُونَ الْخُلَّةُ لِإِبْراهِيم وَالْكَلامُ لِمُوسَى وَالرُّؤْيَةُ لِمُحَمَّدٍﷺ؟﴾ أخرجه النسائي والحاكم بإسناد صحیح، ئایا پێتان سەیرە دۆستایەتی خوا بۆ (إبْراهِیم) پێغەمبەر بێﷺ، قسەکردنی خوا بۆ (مُوسى) پێغەمبەر بێﷺ، دیتنی خوا بۆ (مُحَمَّد)ﷺ بێ؟.

جا ئیمامی(النواوي) فەرموویەتی: ڕای بەهێز لە لای زۆرترینی زانایان ئەمەیە: **پێغەمبەرﷺ بە هەردوو چاوی سەریخۆی لە شەوی (مِعْراج)دا خوای گەورە دیتووە**، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (ابن عبّاس)و چەند حەدیسێکی‌تر...جا زانایانی (أَهْلِ السُّنّة) یەکدەنگن: کە–جگە لە پێغەمبەرﷺ–هیچ کەسێك لە ژیانی دونیادا خوا نابینێ، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو ئیماندارەکان خوا دەبینن، بە چەند بەڵگەیەکی (قُرآن)و (حدیث). (شرح صحیح مسلم) ب(٢) ل(٩٢و١٠٥) و(فتح الباري)ب(٨) ل(٧٧٣و٧٧٤).

**نۆیەم: خەڵاتەکانی شەوی( مِعْراج )، پێغەمبەرﷺ نۆ جار گەڕاوە لای خوا...ئینجا خوای گەورە پێنج نوێژی لە سەر خۆیو ئوممەتی واجب کردن.** بزانە: ئەم نۆ جارە لەگەڵ جاری‌یەکەم دەکاتە دە جار، واتە: پێغەمبەرﷺ لە شەوی(مِعْراج)دا دە جار (مُناجاة)ی لەگەڵ خوا کردوە. جا لە هەندێك (رِوايَة)دا: دە نوێژ، دە نوێژ، هاتووە، ئەو (رِوايَة)ش هەر دەهێنێندرێتەوە سەر پێنجەکە، واتە: بە دوو جار دە نوێژی کەم کردۆتەوە.

**جا بزانە: ئەم پێنج نوێژە واجبانە یەکێکن لەو سێ خەڵاتانەی لە شەوی (مِعْراج)دا درانە پێغەمبەرﷺ** ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ﷜:...فَأُعْطِيَ رَسُولُ اللهِﷺ اَلصَّلَواتِ الْخَمْسِ وَخَواتِيمَ الْبَقَرَةِ وَغُفِرَ لِمَنْ لَمْ يُشْرِكْ بِاللهِ مِنْ أُمَّتِهِ شَـيْئاً اَلْمُقْحِمـاتِ﴾ رواه مسلم، **لە شەوی (مِعْراج)دا پێغەمبەرﷺ سێ خەڵاتی درانێ: پێنج نوێژەکان، ئایەتی﴿آمَنَ الرَّسُولُ﴾ تا کۆتایی سورەتی(اَلْبقرة)، خوایگەورە بڕیاری دا: –جگە لە کافربوون– لە گوناهە گەورەکانی ئۆممەتی خۆش ببێ و بە یەکجاری لە دۆزەخدا نەمێنێتەوە.**

**جا بزانە:** لە ڕۆژەکەی (الإسْراء) لە کاتی نیوەڕۆدا حەزرەتی(جُبْرائيل)﵇ هاتە لای پێغەمبەرﷺ چۆنیەتی ئەو پێنج نوێژانەی فێر کردو دوو جار لە لای (كَعْبَة) ئیمامەتی‌ی بۆ پێغەمبەرﷺ کردو کاتی پێنج نوێژەکانیشی بۆ دیاری کرد–وەك لە (صحیح مسلم)دا گێڕدراوەتەوە– پێغەمبەریشﷺ بە موسوڵمانانی ڕاگەیاند.

کەوابوو: **(نوێژی نیوەڕۆ یەکەم نوێژە لە ئیسلامدا کراوە)**، واتە: نوێژی سبەینەی ئەو ڕۆژە نەکراوە؟ چونکە چۆنیەتی‌ی نەزاندرابوو.

**دیسان بزانە:** حەزرەتی(عائشة)-رضي‌الله عنها- فەرموویەتی: ﴿فُرِضَتِ الصَّلاةُ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ هاجَرَ النَّبِيُّﷺ فَفُرِضَتْ أَرْبَعاً وَتُرِكَتْ صَلاةُ السَّفَرِ عَلَى الْأُولَى﴾رواه الشيخان، زاد ابن خُزيمة وابن حبان والبيهقي: ﴿وَتُرِكَتْ صَلاةُالْفَجْرِ لِطُولِ الْقِراءَةِ، وَصَلاةُالْمَغْرِب لِإنَّها وِتْرُ النَّهارِ﴾، **لە سەرەتادا پێنج نوێژەکان دوو ڕەکعەت دوو ڕەکعەت واجب کران، ئینجا کە پێغەمبەرﷺ کۆچی کرد بۆ (مَدِينَة)، نوێژەکانی ماڵەوە کرانە چوار ڕەکعەتی و لە سەفەریشدا لە سەر واجبیەکەی‌یەکەم بە دوو ڕەکعەتی هێشترانەوە، هەم نوێژی سبەینێ‌ش بە دوو ڕەکعەتی هێشتراوە، چونکە خوێندنی قورئانی تێدا درێژ دەکرێتەوە، نوێژی**

مەغریبیش لە سەرتادا سێ ڕەكعەتی بوو؟ چونكە وەتری ڕۆژێیە. (فتح الباري) ب(١) ل(٦٠٠-٦٠٢) و(السيرةالحلبية) ب(١) ل(٥٧٩-٥٨٢).

**سزای نوێژنەكەر:** بزانە: واجبوونی نوێژ لە شەوی (مِعْراج)دا نیشانەی گرنگیو بایەخ پێدانی نوێژە، كە لە دوای شادەهێنان لە هەموو ڕوكنەكانیئیسلام گەورەترەو لە ڕۆژی قیامەتیش لە پێش هەموو كردارێكی بەندەدا لێپێچانەوەی لە سەر دەكرێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إنَّ أَوَّلَ ما يُحاسَبُ النّاسُ بِهِ يَوْمَ الْقِيامَةِ مِنْ أَعْمالِهِمْ اَلصَّلاةُ﴾ رواه أبوداود بسند حسن، **یەكەم شت كە خەڵك لە ڕۆژی قیامەتدا پێی دادگایی بكرێ لە كردەوەكانیان، نوێژە.**

واتە: ئەگەر لە دادگای نوێژ ڕزگاری بوو، ئەو بەختەوەر دەبێ، ئەگەر نا قوڕ بەسەر دەبێ، چونكە نوێژ گەورەترین دروشمی ئیسلامەو بە نوێژكردن موسوڵمانو كافر لێك جیا دەكرێنەوە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلاةِ﴾ رواه مسلم واصحاب السنن، **بەڕاستی پەردەی نێوان مرۆڤو كافربوون نوێژ نەكردنە، واتە: هەر كاتێك نوێژی نەكرد پەردەكە نامێنێو دەڕواتە ناو كافربوون.**

**جا بزانە:** بە (إِجْماع)=یەكدەنگی زانایانیئیسلام: هەر كەسێك نوێژ نەكاو باوەڕیشی بە واجببوونی نوێژ نەبێ، ئەوە كافرە، بەڵام ئەگەر نوێژنەكەرەكە باوەڕی بە واجببوونی نوێژ هەبێو لە بەر تەمبەڵی نەیكا، ئەوەش بە فەرموودەیەكی ئیمام (أحمد)و بە فەرموودەی چەند زانایەكیتری (السَّلَف): كافرە، بەڵام بە مەزهەبی ئیمام (مالك)و ئیمامی(الشافعي)و زۆرینەی زانایانی (السَّلَف)و (الخَلَف): كافر نیە، بەڵكو داوای نوێژكردنی لێدەكرێ، جا ئەگەر نەیكرد لە سزای نوێژنەكردن دەكوژرێ، هەروەها بە مەزهەبی ئیمام (أبوحنيفە)ش: كافر نابێو ناشكوژرێ، بەڵكو تەمبێ دەكرێو بەند دەكرێ تا نوێژ دەكا. جا بۆ بەڵگەی ئەو زانایانە بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ب(١) ل(٣٩٦و٣٩٧).

**دەیەم: كافرەكان گوتیان: ئەی (مُحَمَّد) بۆمان باسی (اَلْمَسْجِدُالأَقْصَى) بكە.**

**بزانە:** كافرەكان پرسیاری ئاسمانەكانیان لە پێغەمبەرﷺ نەكرد، چونكە ئەوان ئاسمانیان نەدیتبوو، بەڵام لە كاتی بازرگانیدا (اَلْمَسْجِدُالأَقْصَى)یان دیتبوو، دەشیانزانی پێغەمبەرﷺ پێش ئێستا (اَلْمَسْجِدُالأَقْصَى)ی نەدیتووە، جا ئەگەر ئێستا نیشانەكانی (اَلْمَسْجِدُالأَقْصَى) بە تەواوی بڵێ، ئەوە دبیتە نیشانەی ڕاستگۆییی.

**دیسان بزانە:** جگە لەم پرسیارە، پرسیاری كاروانەكانی (مَكَّة)شیان لە پێغەمبەرﷺ كرد؟ جا پێغەمبەرﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: **﴿كاروانی ماڵی فلانكەسم لە (الرَّوْحاء) بینی، وشترێكیان لێ ون بوبوو بە دوایدا دەگەڕان، لە ناو بارگەكەشیان دوڵچە ئاوێك هەبوو من تێنوو بوومو خواردمەوە، جا لێیان بپرسن: ئایا ئاوەكە مابوو؟﴾**

گوتیان: ئەمە نیشانەیەك. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿بە لای کاروانی ماڵی فلانکەسیشدا تێپەڕیم، وشترێکیان لە من ڕەویەوەو دەستێکی شکا-لە (ڕِواية)ێکیتردا- دەستی سوار وشترەکە شکا﴾. گوتیان: ئەمەش نیشانەیەکیترە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لە (التَّنْعِيم)ش بە لای کاروانێکیتریشدا ڕابردم وشترێکی بۆز لە پێش کاروانەکەدایەو دوو خەلاری خەتخەتی لێ بارکراون، ئەمەیان لەگەڵ ڕۆژهەڵاتدا لێتان بەدەر دەکەوێ﴾.

جا کافرەکان یەکسەرە بەرەو دەربەرندەکە ڕۆیشتن و لە (كَداء) دانیشتن-لە(ڕِواية)ێکدا هاتووە: ﴿خوایگەورە لە بەر خاتری پێغەمبەرﷺ ڕۆژی ڕاگرت تا کاروانەکە بەدەرکەوت﴾- جا لە ناکاو یەکێکیان گوتی: ها ئەوە ڕۆژ بەدەرکەوت. یەکێکیتریش گوتی: ها ئەمەش کاروانەکەیە وشترە بۆزەکەی لە پێشدایە. لە (مُعْجِزَة)کانی غەزای (خَنْدَق)دا حەدیسەکانی ڕاگرتنی ڕۆژ دەهێنین، إن شاءالله تعالى.

جا ئەو هەموو نیشانانەی ڕاستگۆیی پێغەمبەرﷺ ئاشکرا بون، بەڵام کافرەکان ئیمانیان نەهێناو گوتیان: ئەمە سیحرێکی ئاشکرایە. (تفسيرالخازن) ب(٣) ل(١٥١) و(السيرةالحلبية) ب(١) ل(٥٣٣-٥٣٨).

**پاشکۆ:** خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى﴾النجم: ١٨، **پێغەمبەرﷺ لە شەوی (مِعْراج)دا چەند نیشانەیەکی گەورەی خوایخۆی دیتن.**

**هەندێك لەو نیشانانە:** پێغەمبەرﷺ بە لای کۆمەڵێکدا ڕابرد، لە ڕۆژێکدا کشتوکاڵیان دەچاندو دەیاندوریەوە، هەر کە دەیاندوریەوە کشتوکاڵەکە وەکو خۆی لێدەهاتەوە ! جا فەرمووی: ئەی (جُبْرائِيل) ئەوانە کێن؟ حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه السلام فەرمووی: ئەوانە (مُجاهِد)ی ڕێگای خودان کە لە ڕێگایخوا غەزا دەکەن، هەر چاکەیەکیان بە حەفتسەد چاکەیە.

**هەروەها پێغەمبەرﷺ بەهەشت و جەهەننەمیشی دیتن و سزای ئەم جۆرە تاوانکارانەشی بینی:**

* کۆمەڵێکی دیتن ورگیان وەك هۆدەی خانووەو پڕە لە مار، هەر جارێك هەڵدەستنەوە بەردەبنەوە، حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه السلام فەرمووی: ئەوانە ڕیبا خۆرەکانن.

* کۆمەڵێکیتریشی دیتن لێوەکانیان وەك لێوی وشترەو بەردی ئاگریان دەخرێتە ناو دەمیان لە کونی بنەوەیان دەردەچێ، حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه السلام فەرمووی: ئەوانە ئەو کەسانەن ماڵی یەتیم دەخۆن.

* کۆمەڵێکیتری دیتن بە بەردی گەورە سەریان پان دەکرێتەوەو ئینجا کە وەك خۆی لێهاتەوە دیسان بە بەردی گەورە سەریان پان دەکرێتەوە، حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه السلام فەرمووی: ئەوانە نوێژنەکەرن.

* کۆمەڵێکیتری دیتن پارچە پەڕۆکیان لە سەر عەورەت داندراوەو کێمو خوێنی جەهەننەم دەخۆن، حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه السلام فەرمووی: ئەوانەن کە زەکات نادەن.

* کۆمەڵێکیتر کەلاکی تۆپیویان دەخوارد، حەزرەتی(جُبْرائِيل)عليه السلام فەرمووی: ئەوانەن کە غەیبەتی خەڵکی دەکەن.

* کۆمەڵێکیتر بە قرتێنەری ئاسن لێو و زوبانیـان دەقرتێنـدرا، حـەزرەتی(جُبْرائِيـل)عليه السلام فەرمووی: ئەوانەش (خُطَباءُ الْفِتْنَة)ن=وتارخوێنەکانی ئـاژاوەن. واتـە: لـە کـاتی ئـاژاوەو دووبەرەکیدا بۆ بەرژەوەندی لایەنێك وتار دەخوێننەوە.

ئـیتر پێغەمبـەرﷺ چـەند نیشانەیەکیتریـشی دیـتن لـە بـەر درێـژی نەماننوسـین. (فـتح الباري)ب(٧) ل(٢٥١) و(الخصائص الكبرى) ب(١) ل(١٦٨و١٧٢).

(**دوا وتـە**): (اَلإِسْـراء وَالْمِعْـراج)=شـەوڕۆیی و سـەرکەوتنی پێغەمبـەرﷺ بـۆ ئاسمانـەکان یەکێکە لە (مُعْجِزَة)کانی پێغەمبـەرﷺ کـە لـە توانـای ئـادەمیزاددا نیـە ئـەم جـۆرە کـارە ئەنجام بدا، جا ئەگەر کەسێك باوەڕی بێهێزەو بە قورئانو حەدیس باوەڕ ناکا–کە بەڵگەی ئەم (مُعْجِزَة)نە– با ئەم دۆزینەوەیە بخوێنێتەوە:

دکتۆر (طالِب الخَفَّاجِي) دەڵێ: (ویلر) کە یەکێکە لەو زانایانەی قومبولەی (اَلْهِيدروجِينِيَّة)یان دۆزیتەوە، هەر ئەویش (اَلْفَضاءُالْعُلْوِي)=بۆشایی سـەرەوەی دۆزیوەتـەوە، کـە هـەم پـێی دەگوترێ: (اَلْكَوْنُ الْخَفِي)=جیهانی نادیار = پەنهان.

جا ئەم زانایە دەڵێ: لە (اَلْفَضاءُالْعُلْوِي)=بۆ شایی سەرەوەییدا کات نیە، هەر ڕۆیشتنێك لە بۆشایی سەرەوەدا دەستبەجێییە، ڕۆیشتن لەوێدا لە تیشکی ڕۆناکی خێراتـرە، جـا هـەر شتێك بڕواتە ناو ئەم بۆشاییەی جیهانی سەرەوە–جا ئادەمیزاد بێ، یان شتێکیتر– ئەوە یەکسەر لە بەرچاو ون دەبێو نابینرێ، کەوابوو: گشت جەستەیەك بۆی دەگونجێ: بڕواتـە ناو بۆشایی جیهانی سەرەوەو بێتە دەرەوەش بێ ئەوەی هیچ کاتێکیشی لێبەسەر بـچێ. (مجلة العلوم) ژمارە (٤) لە (تشرين الثاني، ١٩٨٤ز).

(سبحان الله) زانایەکی سەدەی بیستەم–کە بـاوەڕی بـە قورئـان نیـە– بـە دۆزینەوەیـەکی خۆی ئەوە دەسەلمێنێ: کە دەگونجێ جەستە بڕواتە ناو بۆشایی جیهـانی سـەرەوە، هـەم ڕاڤـەی وشـەی (لَـيْلاً)ش پـشت ڕاسـت دەکاتـەوە، کـە زانایانیئیـسلامیش پـێش هـەزارو چوارسەد ساڵ هەر ئەوهایان ڕاڤە کردوەو فەرموویانە: (لَيْلاً) واتە: لە **بەشێکی شـەوێدا شەوڕۆیی پـێکرا**. کەواتە: ئاشکرا بوو: ئەم بەشـەش لـە نێـوان (مَكَّة)و (قُدْس)دا بـە سواری بوڕاق بەسەر چووە، وَاللهُ أَعْلَم.

*** *** ***

﴿ چاوپێککەوتنی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هۆزەکانی عەرەب تاکو یارمەتیی بدەن ﴾

شـتێکی ئاشـکرایە: کـە پێغەمبـەرﷺ فەرمانی پـێکرا بانگەوازیەکەی ئاشکرا

بکـا، دەچـووە لای هـۆزو پیاوماقوڵو گـەورەکانی عـەرەب، داوای موسـوڵمانبوونی لێدەکردن، ئینجا کە لە (طائِف)ش گەڕاوە، لە سەر بانگەوازیەکەی هەر بەردەوام بـوو: لـە بازارەکـانی (عُکاظ)و (مِجَنَّة)و (ذوالمَجاز) لـە مانگـەکانی حـەج کردنـدا بـە دوای حاجیـەکانی عەرەبـدا دەگـەڕاو داوای لێـدەکردن بیپـارێزن، تـاکو بتوانـێ بەرنامـەی خوایگەورە ڕابگەیەنێ.

جا پێغەمبـەرﷺ دەیفـەرموو: ﴿یَا أَیُّها النّاسُ قُولُوا لاإلهَ إلاّاللهُ تُفْلِحُوا﴾ ئـەی خەڵکینـە بڵێن: (لاإِلهَ إِلاّالله)، بەختەوەر دەبن. جا (أبُولَهَب) بـە دوای پێغەمبـەرداﷺ دەهـاتو دەیگوت: نەکەن بە قسەی بکـەن، ئەمـە لـە دیـن دەرچووەو درۆزنـە. هەنـدێ جاریش (أبُوجَهْل) بە دوای پێغەمبەرداﷺ دەهاتو خۆڵی بـە سـەردا دەکـردو دەیگوت: بەمـە هەڵمەخەڵەتێن، واز لە سەنەمەکانیخۆتان مەهێنن.

جا خەڵکەکەش زۆر بـە ناشـیرنی وەڵامـی پێغەمبـەریانﷺ دەداوەو دەیـانگوت: خـزمو هۆزەکەی خۆت باشتر دەتناسن کە شوێنت ناکەون.

هــەروەها پێغەمبــەرﷺ هاتــە لای بنەماڵــەی (بَنِــی عــامِر بــن صَعْـصَعَة) داوای موسوڵمانبوونی لێکردنو داوای لێکـردن بیپـارێزن. جا یـەکێکیان لـە وەڵامـدا گـوتی: پێمـان بڵـێ ئەگـەر ئێمـە شـوێن تـۆ بکـەوین لـە ئایینەکەتـدا، ئینجا خوایگـەورە تـۆی سەرخست بە سەر نەیارەکانتدا: ئایا ئەم کارەی تۆ–لە دوای تۆ–دەکەوێتە دەست ئێمـە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿اَلأَمْرُ إِلَى اللهِ یَضَعُهُ حَیْثُ یَشاءُ﴾ ئەم کارەی ئیسلام بە دەست خودایە، لە هەر شوێنێك خۆی حەز بکا لەوێ دایدەنێ. جا (بَنی عامِر) گوتیان: ئەوە چۆن دەبێ، ئێمە سینگیخۆمان بۆ تۆ بکەینە ئامانجی عەرەبەکان، ئینجا کە سەر کەوتی، ئەم کارەی تۆ بکەوێتە دەست کەسانێکیتری جگە لە ئێمە؟ ئێمە پێویستیمان بەم کارەی تۆ نیە. واتە: ئەوانەش گوێیان نەدا پێغەمبەروﷺ داواکاریەکەیان بەجێ نەهێنا.

**﴿ دەستپێکردنی موسوڵمانبوونی (اَلأنْصار)ی (مَدِینَة)ی پیرۆز ﴾**

**پێناسە:** (اَلأَنْصَار)=پشتیوانەکان، بەو موسـوڵمانانەی شـاری (مَدِینـَة) دەگـوترێ کـە یارمەتی پێغەمبەروﷺ (صَحابَة) کۆچکەرەکانیان داوەو حاواندونیانەوە.

(اَلْمُهاجِرُونَ)=کۆچکەرەکان، بەو موسوڵمانانە دەگوترێ کە لە سەردەمیپێغەمبەرداﷺ لە ڕێی خوا کۆچیان کردوە بۆ (مَدِینَة). خوایگەورە لـە قورئانـدا ئـەو دوو نـاوەی لـە هەردووکیان ناوەو مەدحی کردون. بڕوانە التوبة: (١١٧) والحشر: (٨و٩).

ئیتر هەر بەو جۆرە پێغەمبەرﷺ لە کاتی حەج لەگەڵ حاجیەکانی عەرەب دادەنیـشتو داوای موسوڵمانبوونی لێدەکردن، تا لە ساڵی یازدەی پێغەمبەرایەتیدا لە لای (اَلعَقَبَـة) گەیشتە شەش کەس لە هۆزی (الخَزرَج)ی دانیشتووی (مَدِینَة)ی پیرۆز، جا پێغەمبەرﷺ

پرسیاری لێکردن: ئێوه کێن؟ گوتیان: ئێمه له هۆزی (الخَزرَج)ن، فەرمووی: ئێوه له دۆستەکانی جولەکەکانی (مَدِينَة)ن؟ گوتیان: بەڵێ. فەرمووی: دادەنیشن قسەتان لەگەڵ بکەم؟ گوتیان: بەڵێ دادەنیشین. جا لەگەڵی دانیشتن‌و پێغەمبەرﷺ قورئانی بۆ خوێندن‌و داوای موسوڵمانبوونی لێکردن، جا ئەوانیش موسوڵمان بون.

جا یەکێك لەو ڕێخۆشکەرانەی وای لێکردن موسوڵمان ببن، ئەوە بوو: کە ئەوان‌و جولەکەکانی (مَدِينَة) کێشەیەك، یان جەنگێك لە نێوانیاندا پەیدا دەبوو، جولەکەکان هەڕەشەیان لێدەکردن‌و دەیانگوت: ئێستا کاتی هاتنی پێغەمبەرێك نزیك بووە، ئێمە شوێنی دەکەوین‌و ئێمە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەدا جەنگتان لەگەڵ دەکەین‌و وەك (عاد)و (إِرَم) بنەبڕتان دەکەین!.

جا کە پێغەمبەرﷺ قسەی لەگەڵ ئەو شەش کەسانە کرد، تەماشای یەکترییان کردو گوتیان: بزانن وَاللهِ ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە جولەکەکان بەوی گەفو هەڕەشتان لێدەکەن، نەکەن جولەکان پێش ئێوە شوێنی بکەون!.

جا ئەو شەش کەسانە بە پێغەمبەریانﷺ گوت: ئێمە کە لە (مَدِينَة)وە هاتین، گەلەکەی‌خۆمان لە دوژمنایەتیەکی وەهادا بەجێ هێشتووە: هیچ کەسێك ئەو دوژمنایەتیەی لە نێواندا نیە، بەڵکی خوای‌گەورە بە سایەی تۆ کۆیان بکاتەوەو ببنە دۆستی یەکتری، جا وا ئێمە دەگەڕێینەوە لایان‌و داوایان لێدەکەین شوێن تۆ بکەون‌و ئیسلامەتییان نیشان دەدەین، جا ئەگەر بە هۆی تۆ خوای‌گەورە کۆیان بکاتەوەو ببنەوە دۆستی یەکتری، ئەوە هیچ کەسێك لە تۆ ڕێزدارتر نیە، ئێمەش لە ساڵی داهاتوودا لە کاتی حەج کردن دووبارە دێینەوە لای تۆ.

جا دانیشتنەکە کۆتایی هات‌و ڕۆیشتن، واتە: ئەو شەش کەسانە هیچ پەیمانێکیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ نەبەست، تەنها گفتیان دایێ: ساڵی‌داهاتوو بێنەوە لای، بۆیێ بەم دانیشتنە دەگوترێ: (دەستپێکردنی موسوڵمانبوونی (أَنْصار)ی(مَدِينَة).

## ﴿ پەیمانی یەکەمی (اَلْعَقَبَة) ﴾

جا کە ئەو شەش کەسانە گەڕانەوە (مَدِينَة)، باسی پێغەمبەریانﷺ کردو داوای موسوڵمانبوونیان لە خەڵکی کرد، تا وای لێهات، ئیسلامەتی لە ناویاندا بڵاو بۆوەو لە ناو ماڵەکانی (أَنْصار)دا باسی پێغەمبەرﷺ دەکرا، تا لە ساڵی‌داهاتوودا –ساڵی دوانزەی پێغەمبەرایەتی– دوانزە پیاوی (اَلأَنْصار)ی (مَدِينَة) هاتنە حەج، جا لە لای (اَلْعَقَبَة) لەگەڵ پێغەمبەرﷺ کۆ بونەوەو پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەست بە (بَيْعَةُالنِّساء)= وەك پەیمانی ئافرەتان، واتە: لەم پەیمانەدا باسی جەنگ‌و (جهاد) نەکرا، ﴿عَن عُبادَةَ بن الصّامِتِ﷜ –وَهُوَ أَحَدُ النُّقَباءِ لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ–: أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قالَ: بَايِعُونِي

عَلَى أَلاّ تُشْرِكُوا باللهِ شَيْئاً وَلاَ تَسْرِقُوا وَلاَ تَزْنُوا وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ وَلاَ تَأْتُوا بِبُهْتانٍ تَفْتَرُونَــهُ بَيْنَ أَيْدِيكُم وَأَرْجُلِكُمْ وَلا تَعْصُوا فِي مَعْرُوفٍ، فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ وَمَنْ أَصابَ مِنْ ذِلِكَ شَيْئاً فَعُوقِبَ بِهِ فِي الدُّنْيَا فَهُوَ كَفّارَةٌ لَهُ وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذلِكَ شيْئاً فَسَتَرَهُ اللهُ فَأَمْرُهُ إِلَــى اللهِ: إِنْ شاءَ عَفا عَنْهُ وَإِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ. فَبَايَعْنَاهُ عَلَــى ذَلِــكَ﴾ رواه الشيخان، **پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پەیمانم بدەنێ هاوبەش بۆ خوا دانەنێن، دزی نەکەن، زینا نەکەن، منداڵەکانی خۆتان نەکوژن، درۆ لە نێوان دەستو پێیەکانتان هەڵنەبەستن-واتە: منداڵی کەسێکیتر بە منداڵیخۆتان دانەنێن- لە فەرمانی پێغەمبەرﷺ دەرنەچن، جا هەر کەسێك ئەو پەیمانە بەجێ بێنێ، ئەوە پاداشتی وی لە سەر خوایە، ئەگەر شتێکیشی لەو تاوانانە کردو لە دونیادا سزا درا، ئەو سزایە بۆی دەبێتە ڕەشکەرەوەی تاوانەکە، ئەگەر سزاش نەدراو خوا بۆی پۆشی، ئەوە بڕیاری وی لە قیامەتدا لە دەست خوایە: ئەگەر حەز بکا سزای ئەدا، ئەگەر حەزیش بکا دەیبورێ.**

**جا ئێمەش ئەوها پەیمانمان دایێ.**

**ئینجا کە ئەو دوانزە کەسانە ئەو پەیمانەیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەستو ویستیان بگەڕێنەوە بۆ (مَدِینَة)، پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(مُصْعَب بن عُمَیْر)یﷺ لەگەڵ ناردن تاکو دەرسی قورئانیان پێ بڵێو فێرە ئایینی ئیسلامیان بکا، جا کە (مُصْعَب)ﷺ گەیشتە (مَدِینَة) لە ماڵی حەزرەتی(أسعد بن زرارة)ﷺ دابەزی-کە یەکێك بوو لە دوانزە کەسەکان- جا بزانە: (مُصْعَب)ﷺ پێی دەگوترا: (مُقْرِئُ الْمَدِینَة) قورئانخوێنی (مَدِینَة).**

**جا حەزرەتی(مُصْعَب) هەر بەخۆی پێشنوێژی بۆ موسڵمانان دەکردو یەکەم کەسیش بوو: کە یەکەم نوێژی (جُمُعَة)ی لە ئیسلامدا بە موسوڵمانانی (مَدِینَة) کرد بە یارمەتیدانی حەزرەتی(أسعد بن زرارة)ﷺ، هەروەها (سَعْد بن مُعاذ)و (أُسَیْد بن حُضَیْر)و چەند کەسانێکیتر لە سەر دەستی حەزرەتی(مُصْعَب)ﷺ موسوڵمان بون، تاوای لێهات: لە گشت خانووێکی (أنصار)یەکاندا ئافرەتو پیاوی موسوڵمان هەبون.**

## ﴿ پەیمانی دووەمی (العَقَبَة)﴾

**ئینجا لە ساڵیداهاتوودا-ساڵی سێزدەی پێغەمبەرایەتی- لە وەرزی حەج کردندا حەزرەتی(مُصْعَب بن عُمَیر)ﷺ گەڕاوە بۆ (مَکّة)و حەفتاو پێنج موسوڵمانیشی لە موسوڵمانەکانی (مَدِینَة) لەگەڵدا بون، چونکە موسوڵمانەکانی (مَدِینَة) کۆنگرەیەکیان بەستو گوتیان: تا کەی واز لە پێغەمبەرﷺ بێنین لە کێوەکانی (مَکّة)دا دور بخرێتەوەو بترسێندرێ؟**

**جا ئەو حەفتاو پێنجەیان هاتنە (مَکّة)، بەڵام کافرەکانی (مَدِینَة)شیان لەگەڵدا بون-کە بۆ حەج کردن هاتبون-ئینجا کە گەیشتنە (مَکّة)، پێغەمبەرﷺ گفتی دانێ: لە**

گەڵیەکەی (اَلعَقَبَة) لە ناوەندی شەوەکانی (أيّامُ التشرِيق)دا یەکتری ببینن.
جا موسوڵمانەکان لە گەڵ هاوڕێ کافرەکانیخۆیان شەوێ خەوتن تا سێیەکی شەوێ ڕابرد، ئینجا لە دوای سێیەکی شەوێ هەڵسان یەك یەكو دوو دوو بە پەنهانی بەرەو (اَلعَقَبَة) ڕۆیشتن، تا لەوێ حەفتاو سێ پیاو و دوو ئافرەت–کە (نُسَیبَة بنت كَعْب)و (أسماء بنت عَمْرو) بون– کۆ بونەوەو چاوەڕوانی پێغەمبەریانﷺ دەکرد، جا پێغەمبەرﷺ هاتو ئیمام (العَبّاس)ی مامیشی لەگەڵدا بوو –هێشتا موسوڵمان نەبوبوو– جا کە دانیشتن، حەزرەتی(البَراء بن مَعْرُور)ﷺ گوتی: (يا رَسُولَ الله)، هەر پەیمانێکی بۆ خۆتو بۆ خودات پێت خۆشە لێمان وەربگرە.
جا پێغەمبەرﷺ قسەی کردو قورئانی بۆ خوێندنو فەرمووی: ﴿تُبايِعُونی عَلَى السَّمْعِ وَالطّاعَةِ فِي النّشاطِ وَالْكَسَلِ، والنَّفَقَةِ فِي الْعُسْرِ وَالْيُسْرِ، وَعَلَى الْأَمْرِ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيِ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأَنْ تَقُولُوا فِي اللهِ لا تَخافُونَ فِي اللهِ لَوْمَةَ لائِمٍ، وَعَلَى أَنْ تَنْصُرُونی فَتَمْنَعُونی إذا قَدِمْتُ عَلَيْكُمْ –وفِي رِوايَةٍ– وَأَسْأَلُكُمْ لِنَفْسِي وَأَصْحابِي أَنْ تُؤْوُونا وَتَنْصُرُونا وَتَمْنَعُونا مِمّا تَمْنَعُونَ مِنْهُ أَنْفُسَكُمْ وَأَزْواجَكُمْ وَأَبْناءَكُمْ وَلَكُمُ الْجَنَّةُ﴾ رواه أحمد والْبَيْهقي بإسناد جيد، پەیمانم بدەنێ: لە سەر گوێڕایەڵی لە حاڵەتی چوستیو تەمبەڵی، هەم لە سەر بەخشین لە حاڵەتی خۆشیو ناخۆشی، هەم لە سەر فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە، هەم لە ڕێگای خوا قسەی حەق بڵێنو دەرهەق مافیخوا لە لۆمەی هیچ لۆمەکارێك نەترسێن، هەم کاتێ لەگەڵ (صَحابَة)کانم هامە لاتان–لە (مَدِينَة)– بمانحاوێننەوەو یارمەتیمان بدەنو بمانپارێزن لەو شتەی گیانتانو ژنەکانتانو منداڵەکانتان لێی دەپارێزن، لە پاداشتی بەجێهێنانی ئەو پەیمانە بەهەشت بۆ ئێوە بێ.
جا حەزرەتی(البَراء)ﷺ گوتی: (يا رَسُولَ الله)، سوێند بەو خوایەی تۆی بە حەق کردۆتە پێغەمبەر دەتپارێزین لەو شتەی گیانمانو ژنەکانمانی لێ دەپارێزین، پەیمانمان لەگەڵ ببەستە–ئەی پێغەمبەریخواﷺ– وَاللهِ ئێمە کوڕی جەنگینو خاوەنی هەموو جۆرە چەکێکین، باپیر بە باپیر ئەم میراتەمان وەرگرتووە.
جا لە ناو ئەم گفتوگۆیەدا حەزرەتی(أبوالهَيْثم)ﷺ هاتە قسەو گوتی: (يا رَسولَ الله) لە نێوان ئێمەو جولەکەکانی(مَدِينَة) چەند پەیمانێك هەیە، ئێمە ئەو پەیمانانە دەپچڕێنین، جا ئەگەر ئێمە وامان کردو خوایگەورەش تۆی سەرخست، ئایا تۆ دەگەڕێیەوە لای گەلەکەیخۆت–لە (مَكّة)–و ئێمەش بەجێ دێڵی؟! پێغەمبەرﷺ زەردەخەنەی هاتێو فەرمووی: ﴿بَلِ الدَّمُ الدَّمُ وَالْهَدَمُ الْهَدَمُ، أَنَا مِنْكُمْ وَأَنْتُمْ مِنِّي، أُحارِبُ مَنْ حارَبْتُمْ وَأُسالِمُ مَنْ سالَمْتُمْ﴾ بەڵکو خوێنیمن خوێنیئێوەیە، بەفیڕۆدانیمن بەفیڕۆدانیئێوەیە، من لە ئێوەم، ئێوەش لە منن، جەنگ لەگەڵ ئەو کەسە دەکەم کە ئێوە جەنگی لەگەڵ

دەکەن، ئاشتی لەگەڵ ئەو کەسە دەکەم کە ئێوە ئاشتیی لەگەڵ دەکەن.
جا پێغەمبەرﷺ بە پەیماندەرەکانی فەرموو: دوانزە نوێنەریخۆتان بۆ من وەدەربێخن، تاکو سەرپەرشتی گەلەکەیخۆیان بکەن. جا دوانزە نوێنەریان دیاری کردن‌و پێغەمبەرﷺ بە نوێنەرەکانی فەرموو: ﴿أَنْتُم كُفَلاءَ عَلى قَوْمِكُمْ كَكَفَالَةِ الْحَوارِيِّينَ لِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَﷺ وَأَنَا كَفِيلٌ عَلى قَوْمِي﴾ ئێوە لەجیاتی من بەرپرسیارو سەرپەرشتکاری گەلەکەیخۆتانن، هەروەك (حَواري)یەکان لەجیاتی (عِیسی) پێغەمبەرﷺ بەرپرسیارو سەرپەرشتکاری گەلەکەیخۆیان بون، منیش بەخۆم سەرپەرشتکاری گەلەکەی خۆمم، واتە: کۆچکەرەکان.
جا پەیمانیان دا پێغەمبەرﷺ، یەکەم کەس کە دەستی نایە ناو دەستی پێغەمبەرﷺ: حەزرەتی(اَلْبَراء بن مَعْرور) بوو، ئینجا حەفتاو دوو پیاوەکەیتریش، ئینجا دوو ئافرەتەکانیش بە قسە–بێ دەست لە دەستنان– پەیمانیان دایێﷺ، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پەرت بن‌و بڕۆنەوە لای بارگەکانیخۆتان. جا حەزرەتی(العَبّاس بن عُبادَة)ﷺ فەرمووی: (یا رَسُولَ الله) ئەگەر حەز دەکەی سبەینێ بە شمشێرەکانمان هێرش دەکەینە سەرخەڵکی (مِنی). جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لَمْ نُؤْمَرْ بِذلِكَ﴾ فەرمانی جەنگمان پێنەکراوە. ئینجا پەیماندەرەکان گەڕانەوە لای بارگەیخۆیان‌و تا بەیانی خەوتن، جا کە لە خەو هەڵسان، کۆمەڵە پیرێکی کافرەکانی (قُرَیْش) هاتنە لایان‌و گوتیان: هۆ گەلی (خَزْرَج)، وامان پێگەیشتووە: ئێوە هاتونە لای ئەم پیاوەی ئێمە–مُحَمَّدﷺ– دەتانەوێ لە ناو ئێمە بیبەنە دەرەوەو پەیمانی بدەنێ: لە دژی ئێمە جەنگ بکەن، وَاللهِ هیچ هۆزێکی عەرەب نیە کە بە قەد ئێوە پێمان ناخۆش بێ جەنگ لە نێوانمان ڕوو بدا؟. جا هاوڕێ کافرەکانی پەیماندەرەکان–کە بۆ حەج هاتبون– ئەوان چون سوێندیان بۆ خواردن، کە هیچ شتێکی وەها نەبوە!–چونکە ئەوان ئاگایان لەم پەیمانبەستنە نەبو– پەیماندەرەکانیش تەماشای یەکتریان دەکرد.
ئینجا کە خەڵکەکە لە (مِنی) چونە دەرەوە، کافرەکانی (قُرَیْش) بۆیان ئاشکرا بوو: هەواڵی پەیمانەکە ڕاستە، بۆیێ بە شوێن پەیماندەرەکاندا ڕۆیشتن لە ڕێگەی (أذاخر)دا گەیشتنە حەزرەتی(سَعْد بن عُبادَة)و حەزرەتی(المُنْذر بن عَمْرو)–کە هەردووکیان لە دوانزە نوێنەرەکان بون– جا حەزرەتی(المُنْذر)ﷺ لە دەستیان هەڵاتو فورتار بوو، بەڵام حەزرەتی(سَعْد)ﷺ کەوتە دەستیان‌و پەلبەستیان کردو بە سەر زەویدا ڕایاندەکێشا، تا پیاوێك پێی گوت: ماڵوێران ئەوە تۆ لەگەڵ هیچ کەسێکی (قُرَیْش) پاراستن‌و پەیمانت نیە هاواری بکەیێ؟ حەزرەتی(سَعْد)یشﷺ گوتی: بەڵێ من بازرگانەکانی (جُبَیْر بن مُطْعِم)و (الحارِث بن أُمَيَّة)م دەپاراستن نەمدەهێشت لە وڵاتیخۆمدا هیچ

کەسێك ستەمیان لێبکا. جا پیاوەکە گوتی: مـاڵوێران بـە نـاوی ئـەوان هـاوار بکـە. جـا حەزرەتی (سَعْد)ﷺ هاوارەکەی کردو هەردووکیان هاتن ڕزگاریان کرد.

ئینجا کە پەیماندەرەکان گەڕانەوە بۆ (مَدِینَة)، بە یەکجاری ئیسلامەتییان ئاشکرا کردو بە ئاشکرایی ئەنجامیان دەدا. (البدایة والنهایة) ب(٢) ل(١٤٣-١٧٢) و(السیرةالحلبیة) ب(٢) ل(٣-٢٦).

﴿ گوڵبژێریك لەم گوڵزارە ﴾

**پێشەکی بزانە:** مەبەست بە (اَلْعَقَبَة)-کە لەم باسەدا زۆر دووبارە دەبێتەوە-: شـوێنێکە لـە نێوان (مَكَّة)و (مِنَى)، حاجیەکان لەوێ شەیتانی گەورە ڕەجم دەکەن، واتە: پێش ئیسلامیش کافرەکانی عەرەب دەهاتنـە (مَكَّة) بـۆ حـەج کـردن، جـا هەنـدێکیان بـە ڕووتـی (طَـواف)ی (بَیْت)=ماڵیخوایان دەکرد، ئینجا پێغەمبەرﷺ کافرەکانی لە حـەج کـردن قەدەغـە کـردنو هەم قەدەغەشی کرد: بە ڕووتی (طَواف)ی (بَیْت) بکرێ. بڕوانە: (تفسیر القرطبي) التوبة: (٢و٣).

**یەکەم: پێغەمبەرﷺ لە وەرزی حەج کردندا بە ناو هۆزەکاندا دەگەڕا...خەڵکەکەش زۆر بە ناشیرنی وەڵامی پێغەمبەریانﷺ دەداوە.**

وەڵامی ناشیرین تەنها لە لای ئەو هۆزانەوە بوو: کە چەواشە کرابونو پڕوپاگندەی (قُرَیْش) لە دژی پێغەمبەرﷺ کاری لێکردبون، ئەگەر نا: هۆزی وەهـاش هـەبوو زۆر مەردانـەو بـە پیـاوەتی وەڵامـی پێغەمبـەریانﷺ دەداوە: وەك هـۆزی (الـشَّیْبان)، کـە پێغەمبـەرﷺ لەگـەڵیان دانیـشت، گوتیـان: بانگـەوازی بـۆ چـی دەکـەی؟ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: **﴿بانگەوازی بۆ ئەوە دەکەم: شادە بێننو بڵێن هیچ خودایەکی بەڕاستی نیە جگە لـەو خوایـەی نـاوی (اَللّٰه)یـە، هـەروەها منـیش پێغەمبـەریخوام، هـەروەها داواتـان لێدەکـەم بمحاوێننـەوەو بمپـارێزنو یارمـەتیم بـدەن، تـا ئـەو ئیـسلامەی خـوا فەرمانی پێکردوم بە خەڵکی ڕابگەیەنم...﴾.**

جا ئەوانیش لە وەڵامدا گوتیان: ئەگەر دەتەوێ لە لایەنی عەرەبەکانەوە بتپـارێزین، ئـەوە دەیکەین، بەڵام لە لایەن (کِسْرَی)وە ناتوانین...جا (المُثَّنَّی بن حارِثَة) گـوتی: (**وَلَعَلَّ هَـذا الْأَمْرَ الَّذِي تَدْعُونا إِلَيْهِ مِمّا تَكْرَهُهُ الْمُلُوكُ**) **لەوانەیە ئەم ئایینـەی تـۆ بانگـەوازیی بۆ ئەکەی پاشایەکان پێیان ناخۆش بێ و نەیانەوێ!.**

جا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ﴿ما أَسَأْتُمُ الرَّدَّ إِذْ أَفْصَحْتُمْ بِالصِّدْقِ، إِنَّهُ لا يَقُومُ بِدِينِ اللهِ إلاّ مَنْ حَاطَهُ مِنْ جَمِيعِ جَوانِبِهِ﴾ **وەڵامەکەتان خراپ نەبو، چونکە ڕاستیتان گوت، بەڵام تـەنها ئەو کەسە بە ئەرکی ئایینیخوا هەڵدەستێ کە لە هەموو لایەکیەوە بیپارێزێ.**

واتە: پێغەمبەرﷺ بۆیێ پاراستنی هۆزی (الـشَّیْبان)ی قبـوڵ نـەکرد، چـونکە لـەو جـۆرە پاراستنەدا ئامانجەکەی نایەتە جێو هەمە لایەن نیە، بەش بەشیش لە ئایینی خوادا قبوڵ ناکرێ، بەڵام چـونکە وەڵامەکـەیان پیاوانـە بـوو، پێغەمبـەرﷺ سوپاسـی کـردن. جـا لـە

ئەنجامدا ئەم هۆزەی (الشَّيبان) هەموویان موسوڵمان بون، (اَلْمَثَنَّى بن حارِثة الشَّيْباني)ﷺ پاڵەوان‌و سەرکردەی جەنگەکانیان بوو. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(١٥٠) و(السيرة الحلبية)ب(٢) ل(٦).

**دووەم: پێغەمبەرﷺ لە وەڵامی (بَنیعامِر)دا فەرمووی: ﴿الأَمْرُ لِلَّهِ يَضَعُهُ حَيْثُ يَشَاءُ﴾ ئەم کارەی ئیسلام بە دەستی خودایە، لە هەر شوێنێك خۆی حەز بکا لەوێ دایدەنێ.**

ئەوە وا دەگەیەنێ: ئەم چاوپێکەوتنانەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هۆزەکانی عەرەب، بە فەرمانی خوای گەورە بوو-نەك بە (إجْتِهاد)و بۆچوونی خۆی- جا بۆیێ دەچووە لای سەرۆك هۆزەکان، چونکە ئەوان لە ناو هۆزەکەیاندا شوێن‌و پلەی خۆیان هەیەو هۆزەکەیان گوێڕایەڵیان دەبێ‌و دەتوانن کاروبار تێك بدەن‌و چاك بکەن، جا بەم چاوپێکەوتنانەش زیاتر ناوبانگی پێغەمبەرﷺ ئایینی ئیسلام لە ناو عەرەبەکاندا بڵاو بۆوەو لە چوارچێوەی نامۆیی هاتە دەرەوە.

جا ئەوەی پێویستە لێرەدا بیری لێبکرێتەوە: پێغەمبەرﷺ لە دوای مردنی (أَبُوطالِب)ی مامی دەستی بەم قۆناغە کرد، چونکە زیاتر ئازار دەدراو نەیدەتوانی بە ئازادی جموجۆڵی بانگەوازی ئیسلام بکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئامادە نەبو-لە پاداشتی یارمەتیدانەکە-هیچ گرێنتی‌و هیچ گفتێکی فەرمانڕەوایی‌و کاربەدەستی بداتە ئەو کەسانەی دەیپارێزن‌و یارمەتی دەدەن؟ چونکە ئەم جۆرە پاداشتە مەترسی ئەوەی لێدەکرێ: لە لایەن کەسانێکی لێنەهاتوو دەسەڵاتی ئیسلام زەوت بکرێ‌و بۆ مەبەستی خۆیان بە کاری بێنن، هەم ئەو کەسەی بە خزمەتکردنی ئایینی ئیسلام هەڵدەستێ پێویستە تەنها ڕەزامەندی خوای مەبەست بێ‌و بە بێگەردی ئەم ئایینە بۆ خوا ئەنجام بداو پاداشتی ماندووبوونەکەشی لە خوا داوا بکا-کە بەهەشتە-هەروەك پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: ﴿وَلَكُمُ الْجَنَّةُ﴾ **لە پاداشتی ئەم پاراستنە بەهەشت بۆ ئێوە بێ.**

کەوابوو: هەر کۆمەڵێك بە ئەرکی بانگەوازی ئیسلام‌و (جهاد) هەڵبستن، پێویستە خۆیان لەو کەسانە بپارێزن: کە بە مەرجی پلەو پایەو کاربەدەستی‌و مەرجەکانی تری دونیایی بەشدارییان لەگەڵ دەکەن، چونکە ئەوانە نیازی ناو دڵیان پاك‌و بێگەرد نیەو ناوبانگ‌و پلەو پاییەیان مەبەستە، بۆیێ (يَحْيَى بن مُعاذ الرّازي) فەرموویەتی: (**لا يُفْلِحُ مَنْ شَمَمْتَ مِنْهُ رائِحَةَ الرِّئاسَةِ**) **بەختەوەر نابێ ئەو کەسەی بۆنی خۆشویستنی سەرۆکایەتی لێدەکەی.**

بەڵێ: لە هەموو سەردەمێکدا زۆر کەس هەنە بۆ تەماعی کاربەدەستی‌و بڵاوبوونەوەی ناوبانگی خۆیان پەرتەوازە دەخەنە ناو موسوڵمانان‌و هەرەس بە بانگەوازی ئیسلام دەهێنن‌و یەکریزی موسوڵمانان تێك دەدەن‌و لە ئەنجامدا بە خۆیشیان دەبنە نۆکەری زاڵم‌و ستەمکاران، بە دەستکاریەوە لە (سيرةالصّلابي) ب(١) ل(٤٠٨-٤١٠).

**سێیەم: ( حاكِمیَّة )=دادوەرەیەتی تـەنها مـافی خودایـە، ( طـاغُوت ) هـیچ مـافێكی نیـە، لـە پەیمانیێیەكـەمی (اَلْعَقَبَـة)دا بـە (بَیْعَةُالنِّـساء)=بـە شـێوەی پـەیمانی ئافرەتـان پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەست، چونكە هێشتا غەزا=(جِهاد)ی چەكداری لە ڕێگای‌خوا-كە پیشەی پیاوانە- واجب نەكرابوو.**

جـا كـە تەماشـای خاڵـەكانی ئـەم پەیمانـە دەكـەین، دەبیـنین: پێغەمبـەرﷺ بـە تـەنها شادەهێنان لەو دوانزە كەسانە ڕازی نەبو، بەڵكو پـەیمانی ئەوەشـی لێـوەرگرتن: كـە بـە ڕەوشتە باشەكانی‌ئیسلام خۆیان جوان بكەن‌و خۆیان لـە نەخۆشـیە پیـسەكانی كۆمەڵگـە بپـارێزن: وەك دزی‌و زینـاو...هتـد، جگـە لـەوەش: ئـەو پەیمانەشـی لێـوەرگرتن: كـە (حاكِمیَّـة)= دادوەرەیـەتی خوایگـەورەیان قبـوڵ بـێ لـە هـەموو حـەرام‌و حـەڵاڵ‌و سـزای تاوانەكان، ئەوەش لە ڕستەی ﴿فَعُوقِبَ بِهِ فِي الدُّنْيا﴾ی حەدیسەكەدا خۆی دەبێنێتەوە.

بەڵێ: كۆمەڵگە بەوە دەبێتە كۆمەڵگەی‌ئیسلام، كە باوەڕی بە تاك‌و تەنیایی خوا هەبێ: لە (عِبادَة)و لە (حاكِمیَّة)دا، واتە: لە پەرستن‌و دادوەرەیەتی‌دا، بەڵێ: ئەو خوایـەی بـە تـەنها ئەم خەڵكەی دروست كردوەو بە تەنها دەیژیێنێ‌و بە تەنها دەیمرێنێ‌و لەو كردارانەشدا هیچ (شَریك)=هاوبەشێكی نەبوە، هەر ئەو خوایەش بە تەنها مافی پەرستن‌و دادوەرەیەتی هەیەو نابی لەم دووانەشدا (شَریك)=هاوبەشی هەبێ، **جا قوڕ بە سەری ئەو كەسانەی خۆیـان بـە موسـوڵمان دائـەنێن‌و لـە هـەمان كاتیـشدا مـافی (حاكِمیَّـة)=دادوەریـەتی نادەنـە خوایگەورەو دەیانەوێ كۆمەڵگە بكەنە دوو بەش:**

**بەشی‌یەكەم:** كۆمەڵگەی ڕەش‌ورووت‌و چەوساوەكان، كە تەنها لە مزگەوت‌و بۆنە ئایینیەكاندا مافی‌خۆیان هەیە، وەك بڵێی بەزەییان بە ئیسلامدا هاتووەو ئەو مافەیان داوێ!.

**بەشی‌دووەم:** كۆمەڵگەی دەسەڵات‌و یاسادانان، كە بە حەزكردن‌و بۆچوونی خۆیـان یاسـای دەستكرد بە سەر كۆمەڵگەدا دەسەپێنن‌و شەرعی‌خوا دەگۆڕن، یان هەر لە كاری دێخن، لـەم یاسادانانەدا خۆیان بە (شَریك)=هاوبەشی خوا دائـەنێن، هـەروەك خوایگـەورە دەفـەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ ما لَمْ يَـأْذَنْ بِـهِ اللَّهُ﴾الشُّورى: ٢١، **ئایـا ئـەوان چەند هاوبەشێكیان هەنە: هەندێك یاسایان لە ئایین بۆ داناون كە خوا ئیزنی نەداوە؟.**

جا گـومڕایی ئـەوان لـەوەدا دەردەكـەوێ: كـە (حاكِمیَّـة)=دادوەریـەتی (دیمقراطیَّـة) قبـوڵ دەكەن -كە (طاغُوت)ی ئەم سەردەمەیەو كافرەكـانی ڕۆژئـاوا بـەرگری لێدەكـەن- بـەڵام (حاكِمیَّة)= دادوەریەتی خوایگەورەیان قبوڵ نیە!.

بەڵێ: ئەوانە گومڕانەو شـوێنكەوتەی شـەیتانن، هەرچـەند نوێـژو خواپەرسـتیەكانی‌تـریش ئەنجام بدەن، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَـا أُنْـزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيـدُ

الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلالاً بَعِيداً﴾ النّساء: ٦٠، ئەی پێغەمبەرﷺ تەماشای ئەو کەسانە ناکەی کە وا تێئەگەن باوەڕیان بەو قورئانە هەیە کە بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوەو باوەڕیشیان بە کتێبەکانی پێش تۆ هەیە، دەیانەوێ دادگای خۆیان ببەنە لای (طاغوت)، لە ڕاستیشدا فەرمانیان پێکراوە: باوەڕیان بە (طاغوت) نەبێ، شەیتان دەیەوێ گومڕایان بکا بە گومڕابوونێکی دور لە ڕاستی.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوە بوو: جولەکەیەکو مونافقێك بووە کێشەیان، جا جولەکەکە گوتی: با بچینە لای (مُحَمَّد)ﷺ؟ چونکە ئەو بە شەرعیخوا بڕیار دەداو بەرتیل وەرناگرێ!. مونافیقەکەش گوتی: نا، دەچینە لای (كَعْب بن الأشْرف)–کە خوایگەورە ناوی لێناوە (طاغُوت)؟ چونکە بە شەرعی خوا ڕەفتار ناکا–، بەڵام جولەکەکە نەیسەلماند، ناچار هاتنە لای پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ بڕیاری دا: بە شەرع مافەکە هی جولەکەکەیە. جا کە هاتنە دەرەوە، مونافقەکە گوتی: من بەم بڕیارەی پێغەمبەرﷺ ڕازی نابم، با بچینە لای (عُمَر). جا کە هاتنە لای ئیمام (عُمَر)ﷺ، جولەکە گوتی: پێغەمبەرﷺ بڕیاری داوە: مافەکە هی منە، بەڵام ئەمە ڕازی نابێ. جا ئیمام (عُمَر)ﷺ بە مونافقەکەی گوت: جولەکەکە ڕاست دەکا؟ گوتی: بەڵێ. جا ئیمام (عُمَر)ﷺ شمشێرەکەی هێناو لە ملی مونافقەکەی دا و کوشتی، جا فەرمووی: (هَكَذا أَقْضِي عَلَى مَنْ لَمْ يَرْضَ بِقَضاءِ اللهِ وَقَضاءِ رَسُولِهِﷺ) من ئەوها بڕیار لە سەر ئەو کەسە دەدەم کە بە حوکمی خواو پێغەمبەرﷺ ڕازی نابێ. جا حەزرەتی(جُبْرائِيل)ﷺ هاتە خوارەوەو فەرمووی: بەڕاستی (عُمر) حەقو ناحەقی لێك جیا کردەوە. (تفسيرالقرطبي) النساء (٦٠)، هەم بڕوانە (فقه السيرة، للبوطي) ل(١٦٣–١٦٥).

**چوارەم: یەکەم نوێژی (جُمُعَة) لە ئیسلامدا، حەزرەتی(مُصْعَب بن عُمَيْر)ﷺ یەکەم کەس بوو: کە یەکەم (جُمُعَة)ی لە ئیسلامدا بە موسوڵمانانی (مَدِينَة) کرد.**

بزانە: لە حەدیسێکی حەزرەتی(كَعْب بن مالك)داﷺ هاتووە: ﴿أَوَّلُ مَنْ جَمَّعَ بِنَا فِي الْمَدِينَة أَسْعَدُ بْنُ زُرارَةَﷺ فِي نَقِيعِ الْخَضْماتِ، قِيلَ: كَمْ كُنْتُمْ؟ قالَ: أَرْبَعُونَ رَجُلاً﴾ حديث حسن رواه أبوداود وابن ماجه، یەکەم کەس کە لە (مَدِينَة)ی پیرۆزدا نوێژی (جُمُعَة)ی پێ کردین، (أسْعَد بن زُرارة) بوو، ئێمە لەو کاتدا ژمارەمان چل پیاو بوو.

لەم حەدیسەدا مەبەستی ئەوەیە: (أسعد بن زُرارة)ﷺ یارمەتی (مُصْعَب) داوەو لە (نَقِيع الْخَضْمات)دا ئاسنکاریی بۆ کردووە، (مُصْعَب)یشﷺ پێشنوێژو وتارخوێن بووە.

دیسان بزانە: نوێژی (جُمُعَة)–پێش کۆچکردن– لە (مَكّة)ی پیرۆزدا واجب کرا، بەڵام نەگونجا لەوێدا (جُمُعَة) بکەن؟ چونکە موسوڵمانەکان بێهێز بونو نەدەکرا خۆیان ئاشکرا بکەن، جا کە پێغەمبەرﷺ (مُصْعَب)ی ناردە (مَدِينَة)، فەرمانی پێکرد لەوێ نوێژی (جُمُعَة) ئەنجام بداو هەر بەخۆیشی پێشنوێژی بکا.

**جا لە بەر ئەوەی نوێژی (جُمُعَة) واجبێکی گرنگی ئیسلامە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿اَلصَّلَواتُ الْخَمْسُ وَالْجُمَعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ كَفّاراتٌ لِما بَيْنَهُنَّ ما لَمْ تُغْشَ الْكَبائِرُ﴾ رواه مسلم، **هەر پێنج نوێژەکان و نوێژی (جُمُعَة) تا (جُمُعَة)کەی تر، ڕەشکەرەوەی گوناهە بچوکەکانن، ئەگەر گوناهە گەورەکان نەکرێن.**

**هەروەها پێغەمبەرﷺ هەڕەشەی توندیشی لەو کەسانە کردوە: کە نوێژی (جُمُعَة) ناکەن، فەرموویەتی:** ﴿لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ رَجُلاً يُصَلِّي بِالنّاسِ، ثُمَّ أُحَرِّقَ عَلى رِجالٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنِ الْجُمُعَةِ بُيُوتَهُمْ﴾ رواه مسلم في الجماعة، **ویستم فەرمان بە پیاوێك بکەم پێشنوێژی بۆ خەڵك بکا، ئینجا بەخۆم بچم ماڵی ئەو کەسانەی نایەنە نوێژی (جُمُعَة)، بە سەریاندا بسوتێنم. هەم فەرموویەتی:** ﴿مَنْ تَرَكَ ثَلاثَ جُمَعٍ تَهاوُناً بِها طَبَعَ اللهُ عَلَى قَلْبِهِ﴾ رواه أحمد واصحاب السنن، **هەر کەسێك سێ (جُمُعَة) نەکا بە بێ عوزر، خوای گەورە مۆری تاریکیی لە سەر دڵی دەدا، واتە دڵ ڕەق دەبێ و لە خوا دور دەکەوێتەوە.**

**دیسان بزانە: لە دوای ڕۆژی (عَرَفة)، ڕۆژی (جُمُعَة) لە هەموو ڕۆژەکان گەورەترە، شەوی (جُمُعَة)ش لە دوای شەوی (لَيْلَةُ الْقَدْر) لە هەموو شەوەکان گەورەترە. هەروەها سەلاوات لێدان لە سەر پێغەمبەرﷺ لە شەو و ڕۆژی (جُمُعَة)دا خێری گەورەترە: لە هەموو زیکرێك– جگە لە زیکری دوای نویژە واجبەکان–، هەم لە قورئانخوێندنیش –جگە لە سورەتی (الکَهْف)–، چونکە ئەم دووانەش بەڵگەی تایبەتیخۆیان هەیە،** بڕوانە (تحفة المحتاج بحاشية الشرواني) ب(٢) ل(٤٠٥و٤٧٩)و (السيره الحلبيه) ب(٢) ل(١٢).

**پێنجەم: حەزرەتی (مُصْعَب بن عُمَيْر)ﷺ بانگەوازکارێکی سەرکەوتوو بوو، (أُسَيْد بن حُضَيْر)و (سَعْد بن مُعاذ)**–رضي الله عنهما– **لە سەر دەستی (مُصْعَب) موسوڵمان بون.**

**(أُسَيْد)و (سَعْد) کوڕە مامی یەکتری بون و هەردووکیان گەورەو پیاوماقوڵی بنەماڵەی (بَني عَبْدالأشْهَل) بون، جا ڕۆژێك حەزرەتی (مُصْعَب) لەگەڵ حەزرەتی (أَسْعَد بن زُرارة)** –رضي الله عنهما– **چونە ناو باغێکی (بنی عبدالاشهل)، لەوێ کۆمەڵە پیاوێکی موسوڵمان لە دەوریان کۆ بونەوە، جا (أُسَيْد)و (سَعْد) بەمە خەفەتبار بون و ڕقیان هەڵسا، جا (سَعْد) بە (أُسَيْد)ی گوت: هەڵسە بڕۆ لای ئەم دوو پیاوە –(مُصْعَب)و (أَسْعَد)– خۆیان لێ توڕە بکە، با هیچیتر بێهێزەکانمان بەم ئایینە هەڵنەخەڵەتێنن، خۆ ئەگەر (أَسْعَد) کوڕە پلکم نەبوایە، بەخۆم ئەم کارەم ئەنجام دەدا. جا (أُسَيْد) ڕمەکەی هەڵگرت و ڕۆیشتە لای (مُصْعَب)و (أَسْعَد)**–رضي الله عنهما– **جنێوی پێدان و گوتی: لێرە بڕۆن و وازمان لێبێنن.**

**جا حەزرەتی (مُصْعَب)ﷺ بە زمانێکی شیرین و بە هێمنی گوتی: بۆ دانانیشی گوێم لێڕابگری، جا ئەگەر ڕازی بوی لێم قبوڵ بکە، ئەگەر ڕازیش نەبوی، ئەوەی تۆ پێت ناخۆشە واز لێدێنین؟ (أُسَيْد) گوتی: وێژدانت بە کار هێنا. جا ڕمەکەی داچەقاندو**

دانیشت، جا حەزرەتی(مُصْعَب)ﷺ قورئانی بۆ خوێندو باسی ئیسلامی بۆ کرد، (أُسَید)ش گوتی: ئای ئەوە فەرموودەیەکی چەند جوانە! ئێوە چی دەکەن کاتێ دێنە ناو ئەم ئایینـە؟ گوتیان: (غُسْل) دەکەینو دەستنوێژ دەگرینو بەرگمان پاك دەکەینەوەو شادە دێنین.

جا (أُسَیْد) هەر لەوێ (غُسْل)ی کردو شادەی هێناو موسوڵمان بوو و دوو ڕەکعەت نوێژیشی کرد، ئینجا گوتی: پیاوێکیتر لە دوای منە، ئەگەر ئـەو موسـوڵمان ببـێ، هـیچ کەسـێك لـە گەلەکەی وی لێی دوا ناکەوێ–موسوڵمان دەبن– ئێستا دەینێرمە لاتان.

جا (أُسَید)ﷺ گەڕاوە لای (سَعْد)و فێڵێکی لێکردو گوتی: قـسەم بـۆ کـراوە: (بَنـی حارِثـة) دەرچوینە تاکو کوڕە پلکەکەت–(أسْعَد بن زُرارة)– بکوژن. ئیتر (سَعْد) توڕە بوو و یەکسەر چووە لای (مُصْعَب)و (أسْعَد)، جا کە دیتی ئەوان بە دڵنیایی دانیشتون، زانی (أُسَیْد) بە فێڵ ئەوی ناردوە، ئیتر ئەویش بە هەمان شێوەی (أُسَیْد) گوێی لە (مُصْعَب) ڕاگرتو موسوڵمان بـوو، جـا (سَـعْد) گـەڕاوە لای گەلەکـەیخۆی، (أسَـیْد)شـی لەگەڵـدا بـوو و گـوتی هـۆ (بنـی عبدالاشهل)، قسەی پیاوەکانتانو ئافرەتەکانتان لە من حەڕام بێ تا موسوڵمان دەبن. جا تا ئێوارە داهات بنەماڵەی (عبدالأشهل) ئافرەتەکانیانو پیاوەکانیـان هـەموو موسـوڵمان بـون، والحمد لله رب العالمین. (البدایة والنهایة) ب(٢) ل(١٥٧و١٥٨) و(السیرةالحلبیة) ب(٢) ل(١٧و١٨).

**حەزرەتی (مُصْعَب بن عُمَیر)ﷺ کێیە؟** ئەو گەنجەیـە کـە لـە (مَکّـة)ی پـیرۆزدا لـەو پـەڕی خۆشیو نازو نیعمەتدا دەژیا، بەڵام هەمووی بە قوربانی ئیسلام کردو لە ڕێگای بانگـەوازی ئیسلامدا هەموو تاڵیو سوێریەکی دیت، جا کە پێغەمبەریشﷺ ناردیـە (مَدینـَة)، زۆر بـە سەرکەوتوویی نوێنەرایەتیەکەی ئەنجام دا و بە زمانە شیرینەکەیو بە خولقـە خۆشـەکەی توانی فەرمانی ئەم ئایەتە بەجێ بێنێ کە خوا دەفـەرموێ: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ﴾ النحل:١٢٥، **بانگەوازی بۆ ڕێگای خوای خۆت بکە بە کارلەجێییو پەندی جوان.**

بـەڵێ: حـەزرەتی (مُـصْعَب)ﷺ بـە فـەرمانی ئـەم ئایەتـە جـوڵاوە، بـۆیە تـوانی چـەند پیاوماقوڵێکی (مَدینَة) بکاتە موسوڵمان، کە ئەوەش بووە هۆی موسوڵمانبوونی خەڵکیتر، هەروەها توانی بنکەی حاوانەوەش بۆ پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانﷺ لە ناو دانیشتووانی (مَدینَة)دا ئامادە بکا، ئەو ئامادەکردنەش لـەوەدا خـۆی دەبینێتـەوە: کـە لەگـەڵ حـەفتاو پێنج موسوڵمانی خەڵکی (مَدینَة)ساڵی داهاتوو، لە (مَکّة) هاتەوە خزمەت پێغەمبـەروﷺ پەیمانی دووەمی (العَقَبَة) بەسـترا، جـا لێـرەدا حـەزرەتی(مُـصْعَب)ﷺ بـەجی دێڵـێنو لـە غەزای (أُحُد) بە خزمەتی دەگەینەوە، إن شاء الله تعالی.

**شەشەم: پێغەمبەرﷺ گفتی دانێ: لە ناوەندی شەوەکانی (أیام التَّشْریق)دا یەکتری ببینن.**

ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺ زۆر بایەخی بەم پەیمانبەستنەیدووەم داوەو زۆر

بـه نهێنــی ئـەنجامی داوە؟ چـونکە جگـە لـە ئیمـام (أبُـوبَكْر)و ئیمـام (علـي)رضی‌الله عنهما هـیچ موسوڵمانێکی (مَكّة)ش ئاگاداری ئەم پەیمانبەستنە نەبو، هەم لە دوای سێیەکی شـەوێو لـە دووەم شەوی (أيام التّشْرِيق)دا لەگەڵ پەیماندەرەکان دانیشت، ئەوەش کـاتێکی گونجـاوە؟ چونکە ئێستا حاجیەکان ماندوونو خەوتوون، سبەینێش لە دوای ڕەجمی شەیتانەکان (مِنَى) بەجێ دێڵنو دەگەڕێنەوە وڵاتیخۆیـان، کەواتـە: ئەگـەر نهێنــیـیـەکیش ئاشـکرا ببــێ، ئـەوە پەیمانـدەرەکان بـە ئاسـانی دەربـاز دەبـن–مـەروەك ئـەوهاش ڕوویدا–جـا ئـەم پەیمانەیـدووەم (اَلْعَقَبَة) بە سەرکەوتنی سەرکەوتنەکان دادەندرێ!؟ چونکە بووە پێشەکیو ڕێخۆشـکردنی کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ بۆ (مَدِينَة). بە دەستکاریەوە (سيرةالصلابي) ب(١) ل(٤٢٦–٤٢٨).

**حەفتەم: بۆ پەیمانبەستنی (اَلْعَقَبَة)یـدووەم پێغەمبـەرﷺ هـاتو ئیمـام (الْعَبّـاس)ی مامیشی لەگەڵدا بوو، هێشتا موسوڵمان نەبوبوو،** لێرەدا مەبەست ئەوەیە: ئیمام (العَبّاس) ئامادەی پەیمانبەستنەکە بوو تاکو لـە کـاری کـوڕە برایخـۆی دڵنیـا ببـێ، ئەگـەر نـا: لـە هەندێك چاوپێکەوتنەکانی پێغەمبەرﷺ ئیمام (أبُوبَكْر)و ئیمام (عَلِي)ش رضی‌الله عنهما ئامـادە دەبون، نەوەك خەڵك وا تێبگا پێغەمبەرﷺ بـە تەنهایـەو یارمەتیـدەری نیـە، هـەم ئیمـام (أبُوبَكْر)ش خەڵکی زۆر دەناسیو شارەزای نەژادی هۆزەکان بوو.

جا لەم پەیمانبەستنەی (اَلْعَقَبَة)، ئیمـام (علـی)ﷺ لـە زارگەڵێیەکـەدا چـاودێر بـوو، ئیمـام (أبُوبَكْر)شﷺ لە زارگەڵێیەکەیتردا چاودێر بوو، جا کە بۆ گفتوگـۆکردن دانیـشتن، ئیمـام (الْعَبّاس) گوتی: **هۆ (خَزْرَج)ی (مَدِينَة)، بەڕاستی (مُحَمَّد) لە ئێمەیـە بـەو شـێوەیەی خۆتـان دەیـزانن، ئێمـەش تـا ئێستا پاراسـتومانە لـەو کەسـانەی لـە سـەر بیروڕای ئێمەنە –واتە: کافرن– کەوابوو: (مُحَمَّد) لە شاریخۆیدا لە سەربەرزیو پاراستندا دەژیـێ، بـەڵام ئـەو سـوورە لـە سـەر ئـەوەی بێتـە لای ئێـوە، جـا ئەگـەر ئێـوە ئـەو پەیمانانە جێبەجێ ئەکەنو لە دژانیخۆی دەیپـارێزن، ئـەوە خۆتـانو ئـەو بـارەی هەڵتانگرتووە، وە ئەگەر دەشزانن سەرشۆڕی دەکەنو تەسلیمی دوژمنانی دەکەن، هەر لە ئێستاوە وازی لێبێنن، چونکە ئەو لە شاریخۆیدا پارێزراوە؟.**

جا حەزرەتی(اَلْبَرَاء)ﷺ لە وەڵامدا گوتی: **وَاللهِ ئەگەر–جگە لەوەی گوتمان– شتێکیترمان لـە دڵـدا هەبوایـە دەمـانگوت، بـەڵام ئێمـە ڕاسـتیمان دەوێو گیانیخۆمـان لـە پێنـاوی پێغەمبەرﷺ دادەنێین...ئینجا گوتیان: (یا رَسُولَ اللهِ)، تۆش بەخۆت قسە بکەو بۆ خۆتو بۆ خودات چیت پێخۆشە لێمان وەربگرە...جا کە پێغەمبەرﷺ خاڵەکانی پەیمانەکەی بۆ ڕۆن کردنەوە،** حەزرەتی(أسْعَد بن زُرارة)ﷺ گوتی: **هۆ خەڵکی (مَدِينَة) نـەختێك لـە سـەر خۆ بن، ئێمە هاتوینە لای ئەم پیاوەو دەزانین پێغەمبەریخوایە، جا کە ئێمە دەیبەینە لای خۆمـان، ئـەوە دەبێتـە هـۆی دژایـەتی هـەموو نەتـەوەی عـەرەب، هـەم پیاوماقوڵانمـان**

دەكوژرێن‌و شمشێرەكان دەمانگەزن، جا ئەگەر دەتوانن لە بەرامبەر ئەوانە خۆڕاگر بن، بیبەنە لای خۆتان‌و پاداشتی ئێوەش لە سەر خوایە، ئەگەر دەشترسێن، ئەوە هەر لە ئێستاوە وازی لێبێنن، ئەوە عوزرێكی باشترە لە لای خوایگەورە.

جا پەیماندەرەكان گوتیان: ئەی (أسْعَد) خۆت لە ئێمە لابدە، وَاللهِ واز لەم پەیمانە ناهێنین‌و لێیشی پەشیمان نابین. ئینجا پەیمانەكەیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەست. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(١٦٦و١٦٧) و(السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٢١-٢٣).

**هەشتەم: تەنها موسوڵمانەكان دۆستی یەكترین**، پێغەمبەرﷺ بە پەیماندەرەكانی (ٱلْعَقَبَة)ی فەرموو: ﴿وَأَسْأَلُكُمْ لِنَفْسِي وَأَصْحابِي أَنْ تُؤْوُونا وَتَنْصُرُونا وَتَمْنَعُونا مِمّا تَمْنَعُونَ مِنْهُ أَنْفُسَكُمْ﴾ رواه البيهقي، **هەم بۆخۆم‌و بۆ (صَحابَة)كانم داواتان لێدەكەم: بمانحاوێننەوەو یارمەتیمان بدەن‌و بمانپارێزن لەو شتەی گیانیخۆتانی لێدەپارێزن.**

بەم فەرموودەیە، پێغەمبەرﷺ بنەمایەكی ئیسلامی بۆ سەرجەم موسوڵمانانی دونیا ڕاگەیاندو ئاگاداری كردنەوە: **كە واجبە موسوڵمان یارمەتی یەكتری بدەن‌و لە هاواری یەكتری بچن هەر چەند وڵات‌و شارەكانیشیان لێك جیا بن.**

ئیمام (ابن العربي)و ئیمامی(النواوي) فەرموویانە: (**ئەگەر كافرەكان موسوڵمانێكیان بە دیل گرت، یان دەیانچەوساندەوە، ئەو كاتە واجبە: موسوڵمانەكان بە تێكڕایی ڕاپەڕن بۆ ڕزگاركردنی-ئەگەر دەگونجا- یان هەموو ماڵیخۆیان لە پێناوی ڕزگاركردنی ئەو جۆرە موسوڵمانە خەرج بكەن، هەر چەند هیچ موسوڵمانێكیش دێرهەمێكی نەمێنێ**، ئیمام (مالِك)و هەموو زانایانی ئیسلام ئەوهایان فەرمووە).

جا هەر وەكو یارمەتیدانی موسوڵمانان واجبە، ئەوهاش واجبە: لە نێوان خۆیاندا تەنها دۆستایەتی یەكتری بكەن‌و ببنە برای یەكتری، نەك دۆستایەتی كافران بكەن‌و خۆشویستنی خۆیانیان بۆ ئاشكرا بكەن، چونكە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ إِلاَّ تَفْعَلُوهُ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ﴾الأنفال: ٧٣، **ئەوانەی كافرن هەندێكیان دۆستی هەندێكیانن**-واتە: موسوڵمانەكانیش دۆستی یەكترن- **ئەگەر ئێوەی موسوڵمان دۆستایەتی یەكتری نەكەن، بێشەرعی‌و ئاژاوەیەكی گەورە لە سەر زەمین دەبێ.**

ئیمامی(القرطبي) فەرموویەتی: خوایگەورە بەم ئایەتە دۆستایەتی نێوان موسوڵمان‌و كافرەكانی بچڕاندوە، موسوڵمانی كردونە دۆستی یەكتری‌و كافریشی كردونە دۆستی یەكتری، هەر كەسەیان بە هۆی ئایین‌و باوەڕی خۆیان یارمەتی یەكتری دەدەن.

جا كە موسوڵمانان توشی دیلی‌و ژێردەستی‌و چەوساندنەوە بوینە، هۆیەكەی دەگەڕێتەوە بۆ نەمانی دۆستایەتی‌و پابەند نەبوون بەم ئایەتە پیرۆزە، ئەگەر نا: موسوڵمانان ماڵ‌و پیاو و

هێزیـان هەیـە بـەرەنگاری کافرەکـان ببنـەوەو موسـوڵمانان ڕزگـار بکـەن، بەڕاسـتیش (أنْصاري)یەکانی (مَدِينَة) مەردی ئەم مەیدانە بونو بە تەواوی پابەندی ئـەم ئایەتـە بـونو بەو بنەمایەی پێغەمبەرﷺ پێی ڕاگەیاندن جولانەوە، بۆیێ بونە بەختـەوەرو سـەربەزری دونیاو قیامەت. بڕوانە (تفسير القرطبي)الأنفال (٧٢و٧٣) و(تحفة المحتاج شرح المنهاج) ب(٩) ل(٢٣٦).

**نۆیەم: تۆقەکردنی پیاو و ئافرەتی بیگانە حەرامە، یەکەم کەس کە دەستی نایـە نـاو دەستی پێغەمبەرﷺ (الْبَرَاء بن مَعْرُور) بووﷺ...** ئەم پەیمانبەستنە لەگەڵ پیاوانـدا بە دەست لە ناو دەست بوو، بەڵام لەگەڵ هەردوو ئافرەتەکاندا بە قسەکردن بوو، **چونکە دەست لە ناو دەستی ئافرەتیبێگانە-تۆقـەکردن لەگـەڵ ئافرەتیبیگانـە- حـەڕامـە** ﴿عَنْ عائِشَةَ-رضي الله عنها-ما مَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللهِﷺ يَدَ امْرَأَةٍ إلاّ إمْرَأَةً يَمْلِكُهـــا﴾ رواه الـشيخان، **پێغەمبەرﷺ دەستی لە دەستی هیچ ئافرەتێکی بیگانە نەداوە، تەنها دەستی ئەو ئافرەتە نەبێ کە حەڵاڵیخۆیەتی.**

هەم پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿لَأَنْ يُطْعَنَ فِي رَأْسِ أَحَدِكُمْ بِمِخْيَطٍ مِنْ حَدِيدٍ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمَسَّ اِمْرَأَةً لا تَحِلُّ لَهُ﴾رواه الطبراني والبيهقي، ورجال الطبراني-ثقات- رجال الصحيح، **ئەگـەر یـەکێکتان بە سوژنێکی ئاسن لـە سـەری بدرێ باشـترە، واتـە: سـوکترە لـە سـزای ئـەو تاوانـەی دەست لە ئافرەتێکی وەها بدا کە بۆی حەڵاڵ نابێ.** (الترغيب والترهيب) ب(٣) ل(٣٩).

**دەیەم: پێغەمبەرﷺ بە پەیماندەرەکانی فەرموو: دوانزە نوێنەری خۆتـان بـۆ مـن وەدەر بێخن.** ئەمەش بەڵگەیە: کە پێغەمبەرﷺ هەڵبژاردنی ئەو دوانزە نوێنەرانەی داوەتە دەست پەیماندەرەکانو بەخۆی هەڵینەبژاردون، چونکە ئـەوان باشـتر یـەکتری دەناسـنو دەزانـن کامـەیان زیـاتر دەتوانـێ کاروبـار بـەڕێوە ببـا، ئـەوەش دەچـێتە ژێـر فـەرمانی ئایـەتی ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِىٱلْأَمْرِ﴾ آل عمران: ١٥٩، **ڕاوێژ بە موسوڵمانان بکە لە کاروباردا.**

جـا نابـێ ئـەوەش لـە بـیر بکـەین: کـە ئـەم حـەفتاو پێـنج کەسـانە هـەموویان مـەرجی هەڵبژاردنیان تێدا هاتبووە جێ، هەروەك لە باسی مەرجەکانی دەنگدەرو دەنگ بـۆ دراودا ڕوونمان کردەوە.

جا بزانە: لە (رواية)یێکدا هاتووە: حەزرەتی(جُبْرائيل)شعليه السلام ئامادەی ئەم پەیمانبەسـتنە بووەو ئاماژەشی بۆ پێغەمبەرﷺ دەکرد کامەیان بکاتە نوێنەر. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(١٦٩).

**یازدەهەم: حەزرەتی (العَبّاس بن عُبادَة)ﷺ فەرمووی: یا رَسُولَ الله ئەگـەر حـەز ئەکـەی سـبەینێ بـە شمـشێرەکانمان هێـرش دەکەینـە سـەر خـەڵکی (منَـی).** پێغەمبـەریشﷺ لەوەڵامدا فەرمووی: (لَمْ نُؤمَرْ بِذَلِكَ) **فەرمانی جەنگمان پێنەکراوە.**

ئەمەش وا دەگەیەنێ: کە بەرگریکردن لە ئیسلامو هەڵسو کەوت لەگەڵ دوژمنانیئیسلام، نادرێتـە دەسـت شـوێنکەوتەکانی ئـەم ئاییـنە، بـەڵکو بڕیاردانەکـەی لـە دەسـت خـوای

گەورەدایەو هەر بە بڕیاری خوایگەورە ڕەفتار دەکرێ، نەك بە بۆچوونی ئەوان، ئینجا هەر کاتێك خوایگەورە (جِهاد)=غەزای واجب کرد، ئەو کاتە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی جەنگەکە دەدرێتە دەست لێزانەکانو سەرکردەکان، تاکو بە ڕاوێژکردنو بۆچوونی خۆیان پلانی جەنگ لە دژی دوژمنانیئیسلام دابڕێژن.

هەروەها فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ وا دەگەیەنێ: کە لەو پەیمانەی دووەمی (اَلْعَقَبَة)دا باسی (جِهاد)و بەرگریکردن لە ئیسلام کراوە، بەڵام–نەك ئەو دەم– بەڵکو هەر کاتێك لە دوای کۆچکردنیپێغەمبەرﷺ، غەزاکردن لە ڕێگایخوا واجب کرا، جا ئەو خاڵە بە ئاشکرایی لە قسەکانی حەزرەتی(العَبّاس بن عُبادَة)رضي الله عنه دەردەکەوێ، کە فەرمووی: ﴿هَلْ تَدْرُونَ عَلامَ تُبايعونَ هَذاالرَّجُلَ؟ إنَّكُمْ تُبايِعُونَهُ عَلى حَرْبِ اْلأَحْمَرِ وَالأَسْوَدِ مِنَ النّاسِ﴾ رواه ابن إسحاق، ئایا دەزانن لە سەر چی پەیمان دەدەنە ئەم پیاوە–پێغەمبەرﷺ–؟ ئێوە پەیمانی دەدەنێ لە سەر جەنگی سوورو ڕەشی ئەم خەڵکە.

هەروەها حەزرەتی(عُبادَة بن الصّامت)رضي الله عنه فەرموویەتی: ﴿بايَعْنا رَسُولَ اللهِﷺ بَيْعَةَ الْحَرْبِ عَلى السَّمْعِ وَالطّاعَةِ فِي عُسْرِنا وَيُسْرِنا....﴾ رواه البيهقي، پەیمانمان دا پێغەمبەرﷺ بە پەیمانی جەنگ: لە سەر گوێڕایەڵی لە کاتی خۆشیو ناخۆشیماندا.

جا ئەمەیان خاڵی جیاوازییە لە نێوان پەیمانی یەکەمو دووەمی (اَلْعَقَبَة)، واتە: لە یەکەمەکەدا باسی جەگ نەکرا، لە دووەمەکەشدا باسی کراوە، بەڵام خوایگەورە ئیزنی نەدا دەست بە غەزا بکرێ تا پێغەمبەرﷺ کۆچی کرد بۆ (مَدينَة)، چونکە لە (مَكّة)دا زەمینەی جەنگ گونجاو نەبو. هەروەك لە کولبژێرەکەی ئازاردانی موسوڵماناندا ڕوونمان کردەوە.

ئینجا لە دوای کۆچکردن، زەمینەی جەنگ خۆش کرا، خوایگەورە ئیزنی دا: جەنگ لە دژی کافرەکان بکرێ، جا یەکەم ئایەت کە لەبارەی غەزا بۆ پێغەمبەرﷺ–لە دوای کۆچکردن– هاتە خوارێ، ئایەتی ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ الحج: ٣٩، ئیزن درا ئەو موسوڵمانانەی جەنگیان لەگەڵ دەکرێ: جەنگ بکەن، چونکە ستەمیان ایکراوە، خوایگەورە توانایە لە سەر یامەرتیدانیان. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(١٦٩و١٧٠) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(١٧٢) و(سيرةالصلابي) ب(١) ل(٤٣٢).

***　　***　　***

## ﴿ کۆچکردنی (صَحابَة)کانرضي الله عنهم لە (مَكّة) بۆ (مَدينَة) ﴾

ئینجا کە حەفتاو پێنج پەیماندەرەکە لە لای پێغەمبەرﷺ ڕۆیشتنو کافرەکانی (قُرَيْش)ش زانییان پێغەمبەرﷺ پاڵپشتێکی وەهای دەست کەوت: کە جەنگاوەرنو خاوەن چەکن، کافرەکان زیاتر ئازاری موسوڵمانەکانیان دا، بە شێوەیەکی وەها: پێشتر وایان نەدەکرد، بۆیێ موسوڵمانەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ تاکو ئیزنیان بدا

کۆچ بکەن، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿أُرِيتُ دارَ هِجْرَتِكُمْ ذاتَ نَخْلٍ بَيْنَ لابَتَيْنِ﴾ وفي حديث آخرَ: ﴿...فَإذا هِيَ الْمَدِينَةُ يَثْرِبُ﴾ رواهما البخاري، شوێنی کۆچکردنتان نیشانی من دراوە، خاوەنی دارخورمایەو لە نێوان دوو زەمینی بەردی ڕەشە: کە شاری (يَثْرِبَ)=(مَدِينَة)ی پیرۆزە.

جا موسوڵمانەکانی (مَكّة)—لە دوای پەیمانیدووەمی (اَلْعَقَبَة)، لە نیوەی (ذِيالْحِجَّة) بەولاوە— کۆمەڵ کۆمەڵ بە نهێنی دەستیان بە کۆچکردن کرد بۆ (مَدِينَة)، جا حەزرەتی (أَبُوسَلَمة المَخزومي)ﷺ یەکەم موسوڵمان بوو، کۆچی کرد بۆ (مَدِينَة)، جا ویستی ژنەکەی خۆیشی لەگەڵ خۆی ببا، بەڵام خەزورەکانی ژنەکەو کوڕە ساوایەکەیان لێسەند، ناچار بە تەنهایی ڕۆیشتە (مَدِينَة)، ئینجا لە دوای ئەویش حەزرەتی(عامِر بن رَبيعة)و ژنەکەی-رضي الله عنهما- لە ناو کەژاوەدا گەیشتە (مَدِينَة)، ئینجا موسوڵمانەکانیتر.

ئیمام (عَلي)ﷺ فەرموویەتی: تەنها ئیمام (عُمَر)ﷺ بە ئاشکرایی کۆچی کرد، کە ویستی کۆچ بکا، شمشێرەکەی هەڵگرتو کەوانەکەشی خستە شانیو هەندێك تیریشی بە دەستەوە گرتنو ڕمێکی بچکۆڵەشی لە کەلەکەی بەستو چووە (كَعْبَة)—کۆمەڵێکی کافرەکانی (قُرَيْش)ش لەوێ بون— جا ئیمام (عمر)ﷺ حەفت جار تەواف کردو دوو ڕەکعەت سوننەتی لە (مَقام إبراهِيم) کردو ئینجا ڕووی لە کافرەکان کردو فەرمووی: خوا ئەم ڕووانە ناشیرین بکا، خوا تەنها ئەم دەمو لووتانە زەلیل بکا، هەر کەسێك دەیەوێ دایکیخۆی زگستوتاو بکاو دادەڕۆی بۆ بکا، یان بیەوێ منداڵەکانی خۆی یەتیم بکاو ژنەکەیخۆی مێر مردوو بکا، با لە پشت ئەم دۆڵە بمگاتێ. ئیتر کەس نەیوێرا شوێنی بکەوێ، ئەویش بەرەو (مَدِينَة) ڕۆیشت.

ئینجا موسوڵمانەکان—هەموویان— بە دوای یەکتردا کۆچیان کرد بۆ (مَدِينَة)، تەنها ئیمام (أَبُوبَكْر)و ئیمام (علي)و بەندەکراوەکانو نەخۆشو بێهێزەکان-رضي الله عنهم- لە (مَكّة)دا مانەوە، هەروەها پێغەمبەرﷺ مابۆوەو چاوەڕوانی دەکرد خوا ئیزنی بدا ئەویش کۆچ بکا. (السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٢٦-٣٣) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(١٧٨و١٧٩).

## ﴿ گوڵبژێریك لەم گوڵزارە ﴾

### یەکەم: موسوڵمانەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ تاکو ئیزنیان بدا کۆچ بکەن.

ئاشکرایە: ئەم ئیزنخواستنەی موسوڵمانان بە هۆی ئازاردانو سوکایەتی پێکردنی کافرەکان بوو، بەڵام کە پێغەمبەریشﷺ ئیزنی دان کۆچ بکەنو دەستیان بە کۆچکردن کرد، ئەم جارەش ئازارێکیتری دەروونی توشی کۆچکەرەکان بوو؟ کە دورکەوتنەوەو وازهێنانە لە خاكو وڵاتو مڵكو ماڵی خۆیان، چونکە ئەوان بە نهێنی لە (مَكّة) چونە دەرەوەو هیچیان لەگەڵ خۆیان نەبرد، بەڵام لە بەر ئەوەی لە ڕێگایخوا لە پێناوی ئایینیئیسلام

کۆچیان کرد، خوایگەورە وڵاتێکی خۆشتر لە وڵاتیخۆیانی دانیوماڵێکی چاکتر لە ماڵیخۆیانی دانیو لەجیاتی خزمو کەسانی خۆیان خوایگەورە دۆستو پشتیوانی وەهای دانی-لە (مَدِینَة)-کە زۆر لە خزمو کەسی خۆیان باشتر بونو خوایگەورە کردنیە برای ئەوان، بە جۆرێکی وەها: ئەم برایەتیەی ئایینی زۆر بەهێزتر بوو لە برایەتی نەژادی؟ چونکە لە سەر بنچینەی ئەم برایەتییە-لە سەرەتایئیسلامدا-موسوڵمانان میراتیان لە یەکری دەگرت، تا بە ئایەتی میراتی خزمەکان ئەم میراتگرتنە (نَسْخ) بۆوە.

جا ئەوەش بێتەوە بیرت: کە حەزرەتی(إِبْراهِیم) پێغەمبەرﷺ لە رێگایخوا لە پێناوی ئایینیخوا کۆچی کرد، خوایگەورە وڵاتێکی خۆشترو چاکتر لە وڵاتی خۆی دایو لەجیاتی خزمو کەسەکانیشی خوایگەورە نەتەوەیەکی پیرۆزی دایو کردیە باوکی پێغەمبەرانی دوای خۆی علیهم الصلاة والسلام.

کەوابوو: ئەی موسوڵمانی رێزدار، پیرۆزیو رێزداریی ئایینو بیروباوەڕی ئیسلام لە سەرەوەی هەموو شتێکە، ئەگەر ئایینو دروشمەکانی ئایین بکەونە مەترسی، ملكو ماڵو خاكو وڵات چ نرخێکی هەیە، جا هەرچەند وڵاتت خۆش بیو ژیانی دونیات خۆش بیو ملكو ماڵت هەبی، بەڵام بۆ بەجێهێنانی ئایینەکەت ئازاد نەبویو تاوانکارییو بیئەخلاقی بە ئاشکرایی لە بەرچاوت ئەنجام دەدرا، ئەو کاتە لە ڕاستیدا تۆ کۆیلەو ژێر دەستیو هیچ سەربەرز نی، بەڵام ئەگەر ملكو ماڵو خاكو وڵات بکرێتە قوربانی ئیسلام، ئەو کاتە سەربەرز دەبی، هەروەك (صَحابَة)کانی پێغەمبەرﷺ-سەرەڕای سەربەرزی (مَدِینَة)-بە سەر بەرزی گەڕانەوە (مَكَّة)و ئازاردەرەکانیشیان بەو پەڕی بیهێزی کەوتنە ژێر دەستی ئەوان. بە دەستکاریەوە لە (فقه السیرة، للبوطي) ل(١٧٩-١٨٩-١٩٠).

## ﴿ بڕیاری شەریعەتی ئیسلام لەبارەی کۆچکردن ﴾

ئەوەمان باس کرد: کۆچکردن لە رێگایخوا، رێبازی پێغەمبەرووﷺ (صَحابَة)کانە، جا بڕیاری شەرعی ئیسلام لەبارەی کۆچکردن بەم جۆریە:

١-ئەگەر مرۆڤی موسوڵمان لە ناو (دارُالْکُفْر)دا، یان لە ناو ئەو (دارُالإِسْلاَم)ی کافرەکان داگیریان کردوە، بۆی دەگونجا ئایینی خۆی بە ئاشکرایی ئەنجام بدا و لە هیچ ئاژاوەیەکی ئایینی نەدەترسا، ئەوە بۆ وی سوننەتە: کۆچ بکا بۆ (دارُالإِسْلاَم)، بەڵام ئەگەر ئومێدی هەبوو بە مانەوەی وی لەوێ ئیسلام بڵاو ببێتەوە، ئەو کاتە مانەوەی لەوێ خێرترە لە کۆچکردن.

٢-ئەگەر مرۆڤی موسوڵمان لە (دارُالْکُفْر)دا بۆی نەدەگونجا ئایینیخۆی بە ئاشکرایی ئەنجام بدا، ئەو کاتە واجبە کۆچ بکا بۆ (دارُالإِسْلاَم) ئەگەر توانای هەبی، واتە: ئەگەر-لەم حاڵەتەدا- لە (دارُالْکُفْر)دا بمێنێتەوە، گوناهبار دەبی، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

﴿أَنَا بَرِيءٌ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ يُقِيمُ بَيْنَ أَظْهُرِ الْمُــــشْرِكِينَ﴾ رواه أبوداود وغيره بإسناد صحيح، **من بەریمە لە هەر موسوڵمانێکی لە ناو کافرەکاندا نیشتەجێ دەبێ.**

بەڵام ئەگەر مانەوەی لە (دارُالْكُفْر)دا بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدا بوو، ئەو کاتە دروستە لەوێ بمێنێتەوە، هەروەها ئەگەر لە (دارُالإِسْلام)شدا (بِدْعَة)و گوناه بە ئاشکرایی دەکران‌و نەیدەتوانی قەدەغەیان بکاو حەق‌و ڕاستیی لێقبوڵ نەدەکراو نەیدەتوانی ڕاستی ئاشکرا بکا، یان جنێو بە زانایانی (السَّلَفُ الصّالح) دەدرا، ئەوە لەو حاڵەتانەشدا–ئەگەر شوێنێکی باشی دەست بکەوێ–واجبە: کۆچ بکا بۆ ئەوێ، چونکە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿فَلا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ الانعام: ٦٨، **لە دوای هاتنەوە بیرت لەگەڵ ستەمکاران دامەنیشە.** جا ئەگەر هەموو شوێنەکانی (دارُالإِسْلام) لە ناحەقی‌و تاوانکاریدا یەکسان بون، ئەو کاتە کۆچکردن واجب نیە.

**جا بزانە:** هەر بە بەڵگەی ئایەتەکەو حەدیسەکەیڕابردوو، کۆچکردن لە (دارُالإِسْلَام) بۆ (دارُالْكُفْر) دروست نیە؟ چونکە (دارُالْكُفْر) وڵاتی خۆی نیە، کەوابوو: لە ڕێگەشدا (جَمْع)و (قَصْر)=کۆکردنەوەو کورتکردنەوەی نوێژ و شکاندنی ڕۆژووی ڕەمەزانی بۆ دروست نیە.

**دیسان بزانە:** لە حەدیسێکدا پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لا هِجْرَةَ بَعْــدَ الْفَــتْحِ﴾ رواه الشيخان، **لە دوای ڕزگارکردنی (مَكَّة) کۆچکردن واجب نیە.** مەبەست: کۆچکردن لە (مَكَّة) بۆ (مَدِينَة) واجب نیە؟ لە بەر ئەوەی (مَكَّة)ش بووە (دارُالإِسْلام)؟ چونکە لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ پێش ڕزگارکردنی (مَكَّة) کۆچکردن بۆ لای پێغەمبەرﷺ واجب بوو، بەڵام خودی کۆچکردن هەر بە واجبی دەمێنێتەوە تا ڕۆژی قیامەت بەو مەرجانەیڕابردوو؟ چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ ما قُوتِلَ الْعَدُوُّ﴾ رواه النسائي و صححه ابن حبان، **تا جەنگ لە دژی دوژمنانی ئایین هەبێ کۆچکردن نابڕێتەوە.** (تفسيرالقرطبي) النساء (٩٧–١٠٠) والانعام (٦٨) و(تحفةالمحتاج بحاشيةالشرواني) ب(٩) ل(٢٦٨–٢٧٠).

## ﴿ پێناسەی (دارُ الإسْلام)و (دارُ الْكُفْر)﴾

**(دارُالإسْلام)=خانەیئیسلام،** ئەو شوێنەیە لە دوای هاتنیئیسلام لە کاتێکدا کەوتبێتە ژێر دەسەڵاتی ئیسلام، هەرچەند دانیشتووەکانیشی موسوڵمان نەبوبن–وەك ئەو جولەکەو گاورانەی سەرانە ئەدەنە دەوڵەتیئیسلام– جا ئەگەر لە مەودوا کافرەکان ئەو شوێنە داگیریش بکەنەوەو ئایینیئیسلامیشی تێدا قەدەغە بکەن، هەر بە (دارُالإِسْلام) دادەندرێ‌و نابێتەوە (دارُالْكُفر)، واتە: (دارُالإِسْلام)ێکی داگیرکراو: وەك (أَنْدلُس)و (بَلْغاريا).

**(دارُالْكُفر)=(دارُ الحَرْب)=خانەی کوفر=خانەیجەنگ،** ئەو شوێنەیە کافرەکانی تێدا نیشتەجێن‌و هیچ کاتێکیش نەکەوتبێتە ژێر دەسەڵاتی ئیسلام، جا ئەگەر دانیشتووانی (دارُالْكُفْر) جەنگ لە دژی موسوڵمانان بکەن، ئەوە پێیان دەگوترێ: **(اَلْحَرْبِيّ)=کافری**

جەنگی، وە ئەگەر لە حاڵەتی جەنگ وەستاندا بن، ئەوە پێیان دەگوترێ: (اَلْمُعَاهَدْ)= پەیمان لەگەڵکراو. (تحفةالمحتاج) ب(٩) ل(٢٦٩و٣٠٤).

**دووەم: تەنها ئیمام( عُمر )ﷺ بە ئاشکرایی کۆچی کرد**، ئازایەتی‌و نەترسیی ئیمام (عُمر)ﷺ شتێکی شاراوە نیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆچکردنەکەی وی بە ئاشکرایی‌و هەڕەشەکردنەکەی لە کافرەکانی (قُرَیْش)، نابێتە بەڵگەی ئەوە: کە ئەو لە پێغەمبەرﷺ بەغیرەتترو ئازاتر بێ، بەڵکو تەنها بەڵگەیە: لە سەر بەهێزی ئیمانی‌و توندوتیژیی بەرامبەر کافرەکان، ئیتر–هەر چەند دروستە– بەڵام واجب نیە: مرۆڤی کۆچکەر لە شێوەی کۆچکردنیدا شوێن ئیمام (عُمر)ﷺ بکەوێ، هەر چەند بە غیرەتو ئازاش بێ، چونکە لە کاتی هەبوونی پێغەمبەرداﷺ تەنها پێغەمبەرﷺ دانەری شەریعەتە، واتە: تەنها کردارو فەرموودەو ڕازیبوونی پێغەمبەرﷺ دەبنە ڕێبازی مرۆڤی موسوڵمان.

جا ئەگەر ئەویش وەکو ئیمام(عمر)ﷺ کۆچی کردبا، ئەو کاتە خەڵك وا تێدەگەیشت ئەمە کردارێکی واجبەو دروست نیە: مرۆڤ پارێزکاری بکاو بە نهێنی کۆچ بکا، بەڵام پێغەمبەرﷺ گشت هۆکارێکی گونجاوی لە کۆچکردنەکەیدا بە کار هێنا، تاکو موسوڵمانانیش شوێنی بکەون‌و لە کارەکانی خۆیاندا گشت پارێزکاری‌و هۆکارێکی گونجاو بە کار بێنن، بۆیێ پێغەمبەرﷺ بە شەوێ لە (مَکّة) چووە دەرەوە، هەم ئیمام (علی)یﷺ لە سەر جێگەی خۆی بەجێ هێشت، هەم سێ شەوان لە ئەشکەوتەکەدا مایەوە؟ تاکو بە دواداگەڕانی سارد ببێتەوە، هەم یەکێکی شارەزای بۆ ڕێگەیەکی نەناسراو بە کرێ گرت، هەم بە (سُراقَة)ی گوت: هەواڵی بینینی ئێمە بشارەوە.

جا بەڵگەش لە سەر نەترسی‌و دڵنیایی پێغەمبەرﷺ ئەوە بوو: کە کافرەکان دەورەیان لە ئەشکەوتەکە دا، ئیمام (أَبُوبَکْر)ﷺ ترس دایگرت، بەڵام پێغەمبەرﷺ دڵنیای دەکردو دەیفەرموو: ﴿لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾التوبە: ٤٠، **ئەی (أَبُوبَکْر) غەمبار مەبە، خوا لەگەڵ ئێمەدایە**. ئیتر لە باسیداهاتوودا ئەم باسانە درێژتر ڕوون دەکەینەوە إن شاء الله تعالى.

بە دەستکارییەوە (فقه السیرة، للبوطي) ل(١٩١و١٩٢).

**سێیەم: خوایگەورە شوێنیکۆچکردنی دیاری کرد**، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿أُرِيتُ دارَ هِجْرَتِكُمْ...فَإذا هِيَ الْمَدِينَةُ يَثْرِبُ﴾ **شوێنی کۆچکردنەکەتان نیشانی من دراوە: کە (مَدِینَة)یە**. لەم فەرموودەیە وا دەردەکەوێ: کە ژیانی پێغەمبەرایەتی‌و بانگەوازیی ئیسلام لە هەموو ڕووێکیەوە لە ژێر چاودێریی خوایگەورەدایەو خوایگەورە بە حەزکردنی خۆی هەڵیدەسوڕێنێ، بەڵێ: هەر خوایگەورە وایکرد بەرهەمی سێزدە ساڵ ماندووبوون‌و ئازارو ئەشکەنجە پێبگا، پێگەیشتنەکەشی لە دەرەوەی (قُرَیْش)یەکانی (مَکّة) بێ؟ نەوەك ناتێگەیشتوویێك وا گومان ببا: بانگەوازیەکەی پێغەمبەرﷺ

بانگەوازیەكی نەتەوەییەو لە ژێر پەردەیەكی ئایینیدایە، هەر بۆیش خوایگەورە وایكرد پێغەمبەرﷺ بە یەتیمی لە دایك ببێو نەخوێندەوار بێو هەر لە ناو گەلێكی وەها نەخوێندەواریش كرا بە پێغەمبەرﷺ: كە هەر ڕۆشنبیریو شارەستانیەتیشیان نەناسیبوو، جا لەگەڵ ئەوەشدا خوایگەورە ئەو پێغەمبەرەیﷺ كردۆتە پێشەوای ئەمینداریو پاكیو ڕەوشت باشی، جا ئەو (مُعْجِزَة) گەورانەش بەسن ئەگەر كەسێك بیەوێ دان بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرداﷺ بێنێ، هەروەك لە گوڵبژێرەكەی مردنی باوكیدا ڕوونمان كردەوە، هەم بروانە (فقه السيرة، للبوطي) ل(٦١).

**چوارەم: خەزورەكانی (أَبُوسَلَمَة)ﷺ ژنەكەو كوڕەكەیان لێسەندو بە تەنهایی كۆچی كرد بۆ (مَدِينَة)**، ئەمەش ڕەفتارە پیسێكیتری (قُرَيْش) بوو: كە لە دژی موسوڵمانان بە كاریان دەهێنا، (أُم سَلَمَة)ی هاوسەرەكەی (أَبُوسَلَمَة)ﷺ فەرموویەتی: (أَبُوسَلَمَة) منو (سَلَمَة)ی كوڕی لە سەر وشترەكەی سوار كردین تا بڕۆینە (مَدِينَة)، جا هەندێ پیاوی (بَنِي مَخْزُوم)= خەزورەكانی (أَبُوسَلَمَة) گوتیان: ئەگەر دەسەڵاتی تۆمان نیە، بەڵام بۆچی ڕێگات بدەینێ ئافرەتێكی ئێمە ببەیو بە شارەكاندا بڕۆی؟ ئیتر جڵەوی وشترەكەیان لە (أَبُوسَلَمَة) وەرگرتو ژنەكەیان لەگەڵ كوڕەكەی لێسەندو (أَبُوسَلَمَة)ش-رضي الله عنهما- بە تەنهایی ڕۆیشت، جا خزمەكانی(أَبُوسَلَمَة)ش تووڕە بونو ئەوانیش چون (سَلَمَة)یان هێناوە لای خۆیانو گوتیان: ئەمە كوڕی ئێمەیەو نابێ لە لای ئێوە بێ.

ئیتر ئەم ئافرەتە موسوڵمانە بێ مێرد و بێ كوڕ لە ماڵی باوكی مایەوەو هەموو ڕۆژێك —تا نزیكەی ساڵێك—لە سبەینەوە تا ئێوارێ هەر دەگریا، تا ڕۆژێك كوڕە مامێكی بەزەیی پێدا هاتو هەوڵیدا ئازادیان كرد، خزمەكانی مێردەكەشی كوڕەكەیان دایەوە، ئیتر (أُمُّ سَلَمَة)-رضي الله عنها- سواری وشترێك بوو و كوڕەكەشی لە پێش خۆی سوار كردو بەرەو (مَدِينَة) كەوتە ڕێو لە ڕێگەشدا (عُثمان بن طَلْحَة) بووە هاوڕێی تا گەیشتنە (قُباء)، لەوێ بە مێردەكەی شاد بۆوە، والحمد لله رب العالمين.

جا (أُمُّ سَلَمَة)-رضي الله عنها-فەرموویەتی: وَاللهِ نازانم هیچ بنەماڵەیەكی ئیسلام موسیبەتێكی وەك بنەماڵەی (أَبُوسَلَمَة)ی بە سەر هاتبێ.

جا ئەی خوشكی موسوڵمان: تۆش—وەك (أُمُّ سَلَمَة)— خۆڕاگر بەو ئارامت هەبێو لە ڕێگەی خوا بەری بەڵاو موسیبەتەكان بگرەو ناشوكر مەبەو یەخەت دامەدڕە، بێ هاوارو ڕۆڕۆ بە چاوی پڕ فرمێسك لە خوا بپاڕێوە: بەڵات لە سەر لاببا‌و ناخۆشیت بۆ بكاتە خۆشی.

جا جگە لەم ڕەفتارەش ڕەفتارێكیتری كافرەكان ئەوە بوو: ماڵی كۆچكەرەكانیان داگیر دەكردو لێیان دەستاندن، ئەوە بوو: كە حەزرەتی(صُهَيْب)ﷺ ویستی كۆچ بكا، كافرەكان پێیان گوت: كاتیخۆی تۆ بە هەژاری هاتویە ناو ئێمە، ئێستاش دەتەوێ ماڵەكەشت لەگەڵ

خۆتا ببەی؟ جا حەزرەتی(صُهَیْب)ﷺ پێی گوتن: ئەوە ماڵی من هەمووی بۆ ئێوە بی، بەڵام ڕێگەم بدەن کۆچ بکەم. ئینجا کافرەکان ڕێگەیان دایێ کۆچ بکاو ماڵەکەشیان لێسەند، جا پێغەمبەرﷺ دوو جار فەرمووی: ﴿رَبِحَ صُهَیْبٌ، رَبِحَ صُهَیْبٌ﴾ (صُهَیْب) لە مامڵەتەکەیدا قازانجی کرد. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(١٧٦و١٨٠).

*** *** ***

## ﴿ کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ ﴾

ئینجا ئیمام (أبُوبَکر)ﷺ زۆر جاران ئیزنی لە پێغەمبەرﷺ دەخواست تاکو ئەویش کۆچ بکا، بەڵام پێغەمبەرﷺ هەر دەیفەرموو: ﴿پەلە مەکە، بەڵکی خوایگەورە منیش ئیزن بدا کۆچ بکەم﴾. جا ئیمام (أبُوبَکر)ﷺ فەرمووی: بە باوکم و دایکمەوە گیانفیدات بم، ئەو ئومێدە دەکەی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ.

جا ئیمام (أبُوبَکر)ﷺ مایەوەو دوو وشتریشی ئامادە کردن و ئالیکێکی باشی دەدانێ و چاوەڕوانی کۆچکردنی پێغەمبەریﷺ دەکرد، ئەمە لە لایەك،

لە لایەکیتریشەوە: کە کافرەکانی (قُرَیْش) دیتیان پێغەمبەرﷺ پاڵپشت و یاریدەدەری لە دەرەوەی (مَکّة)دا بۆ پەیدا بون، ترسی ئەوەشیان گەیشتێ: کە پێغەمبەرﷺ بەخۆیشی کۆچ بکاو جەنگیان لەگەڵ بکا، بۆیێ لە (دارُالنّدْوَة)دا کۆ بونەوەو بڕیاریان دا: لە هەر بەرە بابێکی (مَکّة)، گەنجێکی بەهێز هەڵبژێرن و هەر گەنجەش شمشێرێکی بڕندەی بدەنێ و بە تێکرایی هەر یەکەو شمشێرێك لە پێغەمبەرﷺ بدەن و بیکوژن.

جا حەزرەتی(جِبْرائِیل)ﷺ هات (وَحي)ی بۆ پێغەمبەرﷺ هێناو فەرمووی: کۆچ بکەو شەوێش لە سەر یاتاغی خۆت مەخەوە.

جا خوایگەورە ئەم ئایەتەشی بۆ پێغەمبەرﷺ ناردە خوارەوە، تاکو دوعای پێبکا: ﴿وَقُلْ رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَلْ لِي مِنْ لَدُنْكَ سُلْطَاناً نَصِيراً﴾ الإسراء: ٨٠، بڵێ: خودایە بمبە ناو شوێنێکی ڕاست-کە (مَدِینَة)یە-لە شوێنێکی ڕاست بمهێنە دەرەوە-کە (مَکّة)یە- لە لای خۆتەوە دەسەڵاتێکی یارمەتیدەرم بدەیێ: کە شەرعی خوداو پشتیوانەکانی(مَدِینَة)ن.

حەزرەتی(عائِشَة)-رضي الله عنها-فەرموویەتی: ڕۆژێك لە گەرمەی نیوەڕۆدا لە ناکاو پێغەمبەرﷺ هاتە ماڵی ئێمە، جا یەکێك گوتی: ئەمە پێغەمبەرەﷺ سەرو رووی خۆی داپۆشیوە!. جا باوکم-(أبُوبَکر)-گوتی: بابم و دایکم گیانفیدای بن، وَاللهِ شتێك رووی داوە، بۆیێ لەم کاتەدا هاتووە، جا پێغەمبەرﷺ ئیزنی وەرگرت و هات دانیشت و بە ئیمام (أبُوبَکر)ی فەرموو: ﴿أَخْرِجْ مَنْ عِنْدَكَ﴾ ئەوانەی لە لاتن بیاننێرە دەرەوە. ئیمام (أبُوبَکر)ش فەرمووی: ئەوە خێزانیخۆتە، واتە: (عائِشَة)-رضي الله عنها-جا

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إِنِّی قَدْ أُذِنَ لِی فِی الْخُرُوجِ﴾ من ئیزن درام کۆچ بکەم. جا ئیمام (أبُوبَکْر)ﷺ فەرمووی: دەمەوێ ببمە هاورێت. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، تۆ هاورێمی. جا ئیمام (أبُوبَکْر)ﷺ لە خۆشیان دەستی بە گریان کردو فەرمووی: یا رَسُولَ الله –بە بابم‌و دایکمەوە گیانفیدات بم– یەکێك لەم دوو وشترانەم لێوەربگرە بۆ سواربوونی رێگە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بە پارە لێت وەردەگرم.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە ئیمام (علي)ﷺ کرد: شەوێ لە سەر یاتاغی وی بخەوێ‌و لە دوای وی لە (مَکّة)دا بمێنێتەوە، تاکو ئەو ئەمانەت‌و سپاردانەی خەڵکی (مَکّة) لە لای پێغەمبەریانﷺ داناوە، بیانداتەوە خاوەنەکانیان، وە دڵنیاشی کرد: هیچی بە سەر نایێ، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە: پێغەمبەروﷺ ئیمام (أبُوبَکْر)ﷺ پیاوێکی کافریان بە کرێ گرت–کە ناوی (عبدالله بن أرْقَط)بوو– تاکو بە رێگەیەکی نەناسراودا بەرەو (مَدِینَة) شارەزایان بکا، واتە: لەم کافرە دڵنیا بون‌و هەردوو وشترەکانیان لە لای وی دانان‌و گفتیان لێوەرگرت: پاشی سێ شەوان وشترەکانیان بۆ بێنێتە کێوی (ثَوْر).

ئینجا ئیمام (أبُوبَکْر)ﷺ پارەوپولی خۆیشی–کە پێنج هەزار دیرهەم بوو– هەمووی لەگەڵ خۆیا برد، جا حەزرەتی(عائشة)-رضي الله عنها-فەرموویەتی: ئێمەش باشترین کەل‌وپەلی سەفەرمان بۆ ئامادە کردن‌و ئازوقەمان بۆیان لە ناو زەرفێکدا دانا، جا (أسْماء)ی کیژی ئیمام (أبُوبَکْر)-رضي الله عنهما- پارچەیەکی لە پشتێندەکەیخۆی کردەوەو زارکی زەرفەکەی پێبەست، بۆیێ بە (أسماء) دەگوترێ: (ذاتُ النِّطاق)، هەم (ذاتُ النِّطاقَیْن)، واتە: خاوەن پشتێند. ئەمە لە لایەك،

لە لایەکیتریشەوە: لە دوای عیشا سەد گەنج لە کافرەکانی (قُرَیْش)، لە دەورەی ماڵی پێغەمبەرﷺ کۆ بونەوەو باسیان لەوە دەکرد: کامەیان پێشتر هێرش بکاتە سەر یاتاغی پێغەمبەروﷺ لێیبدا؟ جا لەم کاتەشدا پێغەمبەرﷺ چەنگە گڵێکی هەڵگرت‌و سورەتی ﴿یس وَالْقُرْآنِ الْحَکِیمِ﴾ تا ﴿فَهُمْ لا یُبْصِرُونَ﴾ی خوێندو گڵەکەی بە سەری کافرەکاندا پەرت کردو خەو بە سەر چاوەکانیاندا هات‌و پێغەمبەریانﷺ نەدیت‌و لە نێوانیاندا هاتە دەرەوەو بەرەو ماڵی ئیمام (أبُوبَکْر) رۆیشت، ئیمام (علی)شﷺ لە سەر یاتاغی پێغەمبەرﷺ پاڵی داوە، جا هەرچەند کافرەکان دەیانویست هێرشی بکەنە سەر، خوایگەورە دەیپاراست، جا کە سبەینێ دونیا رۆناك بوو، دیتیان سەریان پر خۆڵ بووەو بۆیان ئاشکرا بوو: ئەوەی خەوتووە: (علي)یە، نەك (مُحَمَّد)ﷺ، جا کافرەکان گوتیان: ئەوە (مُحَمَّد) لە کوێیە؟ ئیمام (علي)ﷺ فەرمووی: نازانم.

جا کە پێغەمبەرﷺ هاتە ماڵی ئیمام (أبُوبَکْر)ﷺ، لەوێوە لە شەوی (جُمُعَة)دا لە (مَکّة) چونە دەرەوەو چونە ئەشکەوتی (ثَوْر) لە خوارەوەی (مَکّة)، ئەمەش دەکاتە (٢)

دووی مـانگی(رَبيـعُ الأول) سـالّی یەکـەمی کۆچـی–واتـە: کۆتـایی سـالّی سـێزدەی پێغەمبەرایەتی– بەرامبەر (٢٠)ی (أيلول) سالّی (٦٢٢)زایینی. ئینجا تا سێ شەوان لە نـاو ئەشکەوتەکەدا مانەوە، واتە: شەوی (جُمُعَة)و شەممەو یەك شەممە.

جا کە پێغەمبەرﷺ لە (مَكّة) دەچووە دەرەوە، فـەرمووی: ﴿وَاللهِ إِنَّكِ لَخَيْـــرُ أَرْضِ اللهِ وَأَحَبُّ أَرْضِ اللهِ إِلَى اللهِ، وَلَوْلاَ أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ مَا خَرَجْتُ﴾ رواه الترمذي وصححه، سـوێندم بە خوا: تۆ–ئەی (مَكَّة)–چاکترین زەمینی خوای‌و خۆشەویسترین زەمینـی خـوای لە لای خوا، ئەگەر من لە تۆ وەدەرنەندرابام، بەخۆم نەدەچومە دەر.

ئینجا کە لە ڕێگەدا دەڕۆیشتن، ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ هەندێ جار لە پـێش پێغەمبـەرداﷺ دەڕۆیشت، هەنـدێ جار لـە دواوەی، هەنـدێ جاریش لـە ڕاسـتەی، هەنـدێ جـاریش لـە چەپەی، جا کە پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێکرد: بـۆ وا دەکـەی؟ لـە وەڵامـدا فـەرمووی: هەندێ جار بیر دەکەمەوە لە پێشەوە کافرەکان بۆمان دانیـشتبن، هەنـدێ جـاریش بـیر دەکەمەوە بە دواماندا بێن، هەنـدێ جاریش بـیر لـە ڕاسـتەو چـەپە دەکەمـەوەو دڵنیـا نابم. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ئەگەر شتێك ببێ، دەتەوێ لە پێناوی مندا توشی تۆ ببێ؟﴾ ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ فەرمووی: ئەرێ وَاللهِ سوێندم بەو خوایەی تۆی بەڕاستی ناردوە. جا لە ڕێگەدا پێی پێغەمبـەرﷺ برینـدار بـوو و خـوێنی لێهـات، بۆیـێ ئیمـام (أبُوبَكْر)ﷺ پێغەمبەریﷺ لە سـەر شـانیخۆی دانـاو هـەڵیگرت، ئینجا کـە گەیـشتنە ئەشکەوتەکە، ئیمام (أبُـوبَكْر)ﷺ فـەرمووی: یـا رَسُولَ اللهِ لـە شـوێنیخۆت بوەسـتە تـا ئەشـکەوتەکە دەپـشکنم، نـەوەك ئـازاردەرێکی تـێدا بـێ. جـا ئیمـام (أبُـوبَكْر)ﷺ ئەشکەوتەکەی پشکنی‌و کونەکانی ناو ئەشکەوتەکەی گرتن؟ نەوەك مار، یان شتێکیتر زیان لە پێغەمبەرﷺ بدا، ئینجا پێغەمبەرﷺ چووە ناو ئەشکەوتەکە.

## ﴿ خوایگەورە بە لەشکری خۆی پشتگیری پێغەمبەریﷺ کرد ﴾

ئینجا خوایگەورە فەرمانی بە درەختێك کرد لە پێش ئەشکەوتەکە ڕوا، هەم فەرمانی بە داپیرۆچکە کرد لە نێوان لقەکانی درەختەکەو ئەشکەوتەکەدا تەونی کرد، هـەم دوو کۆتریش لە زارکی ئەشکەوتەکە هێلانەیان دانا.

ئەمە لە لایەك، لە لایەکیتریشەوە: کە کافرەکانی (قُـرَيْش) زانییـان پێغەمبـەرﷺ لـە (مَكّة) ڕۆیشتە دەرەوە، ئەوان بە ڕێگایەکانی (مَكّة)دا بـڵاو بونـەوەو بڕیاریـان دا: هـەر کەسێك پێغەمبەرﷺ، یان (أبُوبَكْر)ﷺ بگرێ‌و بیهێنێتەوە (مَكّة)، خوێنی خۆی –کـە سەد وشترە– بیدرێتێ.

جـا ئەوانـەی بـەرەو کێوی (ثـوْر) هـاتن، شوێنهەڵگریـشیان لەگەڵـدا بـوو و بـە شـوێن پێیـەکانی پێغەمبــەرداﷺ هــاتن، تــا گەیــشتنە پــێش ئەشــکەوتەکە، جــا لــەوێ

شوێنهەڵگرەکە گوتی: شوێنی پێیەکەی تا ئێرەیە، ئیتر نازانم!. گوتیان: کەوابوو: تەماشایەکی ناو ئەشکەوتەکە بکەن. جا کە دیتیان تەونی داپیرۆچکەو هێلانەی کۆتری لێیە، گەڕانەوەو یەکێکیان گوتی: چ کارێکتان بە ئەشکەوتەکەیە؟ خۆ ئەشکەوتەکە داپیرۆچکەیەکی پێش لەدایکبوونی (مُحَمَّد)ی لێیە!.

جا لەو کات ئەوەندە لە ئەشکەوتەکە نزیك بونەوە، ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ بە پێغەمبەریﷺ فەرموو: خۆ ئەگەر یەکێکیان لە بن پێیخۆیدا تەماشا بکا دەمانبینێ. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ما ظَنُّكَ يا أَبابَكْرٍ بِاثْنَيْنِ اَللّهُ ثالِثُهُما؟﴾ رواه البخاري، ئەی (أَبُوبَكْر) گومانت چۆنە بەرامبەر دوو کەسان کە خوایگەورە سێیەمیانە؟. هەروەها فەرمووی: ﴿لا تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا﴾التوبة: ٤٠، غەمبار مەبە، خوا لەگەڵمانە.

ئیتر کافرەکان بە ناچاری گەڕانەوە، جا لە ماوەی ئەو سێ شەوانەشدا بە فەرمانی ئیمام (أبُوبَكْرﷺ): حەزرەتی(عبدالله)ی کوڕیﷺ شەوێ دەهاتە ئەشکەوتەکەو لە لای پێغەمبەروﷺ ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ دەمایەوەو هەواڵەکانی (مَكّة)ی پێڕادەگەیاندن، ئینجا لە بەرەبەیاندا دەگەڕاوە (مَكّة)و بۆ سبەینێ لەوێ ئامادە دەبوو، هەروەها حەزرەتی(عامِر بن فُهَيْرَة)ش–کە شوانی ئیمام (أبُوبَكْر)بوو رضی‌الله عنهما– لە ڕۆژێدا لەو چیایە مەڕەکانی دەلەوەڕاندن‌و لە ئێوارەشدا دەیهێنانە لای ئەشکەوتەکە تاکو شیرەکەیان بخۆن، هەروەها حەزرەتی(أسماء)ی کیژی ئیمام (أبُوبَكْر)ش-رضی‌الله عنهما-ئێواران دەهات خواردنی بۆ ئامادە دەکردن، جا حەزرەتی(أسماء)-رضی‌الله عنها-دەفەرموێ: کافرەکان هاتنە ماڵی ئێمەو گوتیان: باوکت لەکوێیە؟ منیش گوتم: نازانم. جا (أبُوجَهْل) لەپەدەستێکی لە کوڵمەم دا گوارەکەمی لە گوێم فڕێدا، ئینجا ڕۆیشتن.

ئێنجا کە لە دوای سێ شەوان بەدواداگەڕانی کافرەکان لە دەوروبەری (مَكّة) کۆتایی هات، لە شەوی دوو شەممە (٥)ی (رَبِيعِ الأَوَّل)، (عبدالله بن أُرَيْقِط) هات، وشترەکانی هێنان‌و شەوێ لە پێش بەیاندا لە ئەشکەوتەکە هاتنە خوارەوەو بە کەنارەکانی دەریای سوردا بەرەو (مَدِينَة) ڕۆیشتن‌و (عامِر بن فُهَيْرَة)شیان بۆ خزمەتکردن لەگەڵ خۆیان برد.

### ﴿(سُراقَة)ش لە هێرشەکەی سەرکەوتوو نەبو﴾

(سُراقَة بن مالِك بن جُعْشُم) دەڵێ: کافرەکانی (قُرَيْش) بڕیاریان دابوو: هەر کەسێك (مُحَمَّد)ﷺ، یان (أبُوبَكْر)ﷺ بگرێ، یان بیکوژێ، خوێنی هەریەکەیانی بدرێتێ–کە *سەد وشترە بۆ هەر یەکێکیان*–جا منیش ڕۆژێك لە دانیشگەیەکی گەلەکەیخۆمدا–(بَنِي مُدْلِج) لە (قُدَيْد)– دانیشتبوم، پیاوێك هاتە لامان‌و گوتی: ئێستا چەند کەسێکم دیتن لە کەناری دەریادا دەڕۆیشتن، وا تێدەگەم (مُحَمَّد)و هاوڕێکانی بون!.

جا (سُراقة) گوتی: زانیم ئەوانن، بەڵام گوتم: ئەوان نین، بەڵكو فلانو فلانن، ئێستا لە بەرچاوی ئێمە ڕۆیشتن، جا ماوەیەك لە دانیشگەكەدا مامەوە، ئینجا لەوێ هەڵسام فەرمانم بە كەنیزەكەم كرد: ئەسپەكەم لە پشت گردەكەیە، بۆم بباتە سەر ڕێگەو ڕایبگرێ، منیش بەخۆم ڕمەكەم هەڵگرتو بە پەنهانی بە پشت ماڵەكەمدا چومە دەرەوەو سواری ئەسپەكەم بومو بە غاردان لێمخوڕی تا لێیان نزیك بومەوە، یەكسەر ئەسپەكەم خلیسكی بردو منیش كەوتم، جا هەڵسامەوەو دەستم بردە ناو تیردانەكەمو تیرەكانم دەرهێنان تاكو تیروپشكی سەركەوتنو سەرنەكەوتن بكەم؟ جا بەشی سەرنەكەوتن دەرچوو، بەڵام من گوێم نەدایێو سواری ئەسپەكەم بومەوەو لێیان نزیك بومەوە تا گوێم لە قورئانخوێندنی پێغەمبەرﷺ بوو و هەر ئاوڕیشی نەدەداوە، بەڵام (أبُوبَكْر) زۆر ئاوڕی دەداوە، جا ئەم جارە هەردوو دەستەكانی ئەسپەكەم تا ئەژنۆیەكانی –لە (رِواية)ێكدا: تا بن زگی– بە زەمیندا چونە خوارەوەو منیش كەوتم، جا لە ئەسپەكەم خوڕیەوە، جا كە هەڵساوە، تۆزێكی وەكو دوكەڵ لە شوێن دەستەكانی هاتە دەرەوەو بۆ ئاسمان بەرز بۆوە، دیسان تیروپشكم كردو بەشی سەرنەكەوتنم بۆ دەرچوو، ناچار بانگم كردنێ: ئێوە لە من دڵنیا بن چاوەڕوانم بكەن قسەتان لەگەڵ بكەم.

واتە: چونكە (سُراقة) كەوتە دڵی كە ئایینەكەی پێغەمبەرﷺ سەردەكەوێ، جا كە هاتە لایان پێی گوتن: (قُرَيْش) سەد وشتری داناوە بۆ ئەو كەسەی یەكێكتان بگرێ، یان بیكوژێ. ئینجا ئازوقەو كەلوپەلی ڕێگەشی دانێ، بەڵام پێغەمبەرﷺ لێی وەرنەگرتو فەرمووی: ﴿لا حَاجَةَ لَنَا فِي ذلِكَ، وَلكِنْ أَخْفِ عَنّـــا﴾ پێویستمان بەو ئازوقەیە نیە، بەڵام هەواڵی ئێمە بشارەوەو بە هیچ كەسێكی مەڵێ.

جا (سُراقة) داوای لە پێغەمبەرﷺ كرد نووسراوێكی دڵنیایی بداتێ، پێغەمبەریشﷺ فەرمانی بە (عامِر بن فُهَيْرَة)ﷺ كرد، ئەویش بۆی لە پارچە چەرمێك نوسی، جا ئەوان ڕۆیشتنو (سُراقة)ش گەڕاوەو هەركەسێكی (قُرَيْش)ی دیتبا، دەیگەڕاندەوەو دەیگوت: من بەم شارەزاییەی خۆم هەموو ڕێگاكە گەڕاوم هیچ كەسێكم نەبینیوە. ئا بەم جۆرە دوژمنی پێش نیوەڕۆ، بووە بەرگریكەری دوای نیوەڕۆ، جا ئیمام (ابن سَعْد) فەرموویەتی: ئەم هێرشەی (سُراقة) لە ڕۆژی سێ شەممە بوو لە (القُدَيْد).

## ﴿ مەڕەكەی ( أُمُّ مَعْبَد ) ﴾

ئینجا پێغەمبەروﷺ هاوڕێكانی هەندێكیتر ڕۆیشتنو لە لای خێمەی (أُمُّ مَعْبَد) –(عاتِكَة بِنت خالِد)– دابەزینو داوای شیرو گۆشتیان لێكرد تاكو لێی بكڕن؟ ئەویش لە بەر ئەوەی ساڵەكە نەهاتو بێ بارانی بوو، گوتی: وَاللهِ ئەگەر هیچمان هەبوایە پێویستی بە كڕین نەدەكرد. جا پێغەمبەرﷺ تەماشای كرد مەڕێك لە

تەنیشت خێمەکەیە، جا فەرمووی: ئەی (أُمُ مَعبَد) ئەم مەڕە چییە؟ ئەویش گوتی: لە بەر بێهێزی لە مێگەلْ دوا کەوتووەو نەگەیوەتە لەوەڕگە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: شیری تێدایە؟ گوتی: مەڕەکە زۆر لەوە لاوازترەو نێرەشی نەپڕیوەتێ. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئیزنم دەدەی بیدۆشم؟! گوتی: ئەگەر شیری تێدایە بیدۆشە!. جا پێغەمبەرﷺ داوی جامێکی گەورەی کردو (بِسمِ اللهِ)ی کردو دەستی بە گوانی مەڕەکەدا هێناو شیری لێهاتە خوارەوە تا کەفەکەی گەیشتە سەرەوەی جامەکە!، ئینجا جامەکەی دایە (أُمُ مَعبَد)و تا تێر بوو شیرەکەی خواردەوە، ئینجا هاوڕێکانیشی تا تێر بوون شیرەکەیان خواردەوە، جا پێغەمبەرﷺ لە کۆتایی هەموانیاندا خواردیەوەو فەرمووی: ﴿ساقِي الْقَومِ آخِرُهُمْ شُرْباً﴾ والحديث رواه مسلم في قضاء الفائتة، ئاودێری ئاوخۆرەوەکان لە دوای هەموویاندا ئاو دەخواتەوە.

ئینجا پێغەمبەرﷺ دووبارە مەڕەکەی دۆشیەوەو جامەکەی بۆ پڕ کردەوە، ئینجا لەوێ ڕۆیشتن، جا کە مێردەکەشی—(أبُومَعبَد)—هاتەوەو شیرەکەی دیت، سەری سوڕما، جا (أُمُ مَعبَد) ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە، ئەویش گوتی: وَاللهِ ئەوە پیاوەکەی (قُرَیشی)یە: کە ناوبانگی بۆ ئێمە باس کراوە، ئەگەر ڕێگەم دەست بکەوێ منیش دەبمە هاوڕێی.

ئینجا پاش ماوەیەك (أُمُ مَعبَد)و برایەکەی‌و مێردەکەی—واتە: (أبُومَعبَد) کە ناوی (أكْثَمْ) بوو— کۆچیان کرد بۆ (مَدینَة)و لەوێ موسوڵمان بون، والحَمدُ للهِ رَبِّ العالمين.

## ١١: ژیانی پێغەمبەرﷺ ﴿ پێغەمبەرﷺ دەگاتە (قُباء) ﴾

(قُباء) گوندێك بوو لە نزیك (مَدینَة)ی پیرۆز، جا موسوڵمانەکانی (مَدینَة)ش ئەوەیان پێگەیشتبوو: کە پێغەمبەرﷺ لە (مَکّة) دەرچووەو بەرەو (مَدینَة) وەڕێکەوتووە، بۆیێ ماوەی چەند ڕۆژێك لە دوای نوێژی سبەینێ دەهاتنە دەرەوەی (مَدینَة) بۆ پێشەوازی پێغەمبەرﷺ، تا گەرمایی ڕۆژ ئازاری دەدان، ئینجا دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانی‌خۆیان. (*دەگوترێ: سێ ڕۆژان بۆ پێشوازی هاتبنە دەرەوەی (مَدینَة)*)، *چونکە ئەوان نەیاندەزانێ پێغەمبەرﷺ سێ شەوان لە ئەشکەوتەکەدا ماوەتەوە، واتە: ئەندازەی نێوان (مَکّة)و (مَدینَة)ش هەشت ڕۆژ بوو*).

جا ڕۆژێك موسوڵمانەکان لە بەر گەرمایی ڕۆژ گەڕانەوە ماڵەکانی‌خۆیان، جولەکەیەکیش لە سەر قەڵایەکی‌خۆیانەوە پێغەمبەروﷺ هاوڕیکانی دیتنن بەرگی سپییان لەبەردا بوو، جا جولەکەکە خۆی بۆ ڕانەگیراو یەکسەر بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد: هۆ گەلی عەرەب ئەوە تەخت‌و بەختی ئێوەیە کە چاوەڕوانی دەکەن.

جا زیاتر لە پێنجسەد کەس لە موسوڵمانەکانی (مَدینَة) بە چەکی خۆیانەوە بۆ پێشوازی پێغەمبەرﷺ ڕاپەڕین‌و لە لای بەردە ڕەشەکانی ڕۆژئاوای (مَدینَة) گەیشتنە

پێغەمبەروﷺ هاوڕێکانی، جا موسوڵمانەکان شوێنیان کەوتن تاکو بێنە (مَدینة)، بەڵام پێغەمبەرﷺ بە لای ڕاستەدا لایدا (قُباء)، لەوێ لە ماڵی (کُلثوم بن الهَدَم) دابەزی، ئەوەش لە ڕۆژی دووشەممە (١٢) دوانزەی (ربیع الأول) ساڵی یەکەمی کۆچی بوو، بەرامبەر (٣٠) أیلول (٦٢٢)ز، کەواتە: پێغەمبەرﷺ هەشت ڕۆژان لەو گەرمایەدا لە نێوان (مَکَّة)و (مَدینة)دا بەڕێوە بووە.

ئینجا ئیمام (علی)ش رضي الله عنه لە دوای دەرچوونی پێغەمبەرﷺ سێ ڕۆژان لە (مَکَّة)دا مایەوەو هەموو ئەمانەتو سپاردەکانی تەسلیمی خاوەنەکانیانی کردەوە، ئینجا ئەویش کۆچی کرد بۆ (مَدینة)، لە ماڵی (کُلثوم بن الهَدَم) گەیشتەوە پێغەمبەرﷺ.

حەزرەتی(ابن عبّاس)-رضي الله عنهما-فەرموویەتی: پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی دووشەممە لە دایك بووە، لە ڕۆژی دووشەممە کراوەتە پێغەمبەر، لە ڕۆژی دووشەممە لە (مَکَّة) چۆتە دەرەوە، لە ڕۆژی دووشەممە چۆتە (مَدینة)، لە ڕۆژی دووشەممە وەفاتی کردوە.

**﴿ موسوڵمانەکان بەخێرهاتنی پێغەمبەرﷺ دەکەن ﴾**

﴿عَن أَنَسٍ رضي الله عنه: قَدِمَ النَّبِيُّ وَلَيْس فِي أَصْحابِهِ أَشْمَطُ غَيْرُ أَبِيبَكْرٍ﴾ رواه البخاري، **پێغەمبەرﷺ هاتە (مَدِينَة) لە ناو (صَحابَة) کۆچکەرەکاندا-جگە لە (أَبُوبَکْر)- هیچ پیاوێکی وەها نەبو مووی سپی ی لێدەرکەوتبێ.**

جا کە پێغەمبەرﷺ دانیشت، ئیمام (أبُوبَکر) رضي الله عنه پێشوازی لە خەڵکەکە دەکرد، بەڵام ئەوەی پێغەمبەری نەدیتبوو، سەلامی لە ئیمام (أبُوبَکر) دەکرد! چونکە ئەو ڕیشی سپی بوو و پێغەمبەریشﷺ ڕیشی ڕەش بوو، تا تیشکی ڕۆژ لە پێغەمبەریﷺ دا، جا ئیمام (أبُوبَکر) رضي الله عنه هەڵسا بە پەشتە ماڵەکەیخۆی سێبەری لێکرد، جا ئەو کات خەڵکەکە پێغەمبەریانﷺ ناسی.

ئینجا پێغەمبەرﷺ ڕۆژانی سێشەممەو چوارشەممەو پێنج شەممەش لە (قُباء)دا مایەوەو لەوێ مزگەوتی (قُباء)ی دامەزراندو نوێژیشی بە جەماعەت بۆ موسوڵمانان تێدا کرد، ئینجا ناردی (الأنصار)ی هاتنو لە ڕۆژی (جُمُعَة) سواری وشترەکەی بوو و لە (قُباء) چووە دەرەوەو بەرەو (مَدینة) کەوتە ڕێو موسوڵمانەکانیش-پیادە و سوار- بە چەکەوە لە دەورەی دەڕۆیشتن، تا گەیشتە ناو ماڵەکانی (بَنِی سالِم)، لەوێ کاتی نوێژی (جُمُعَة) هاتو پێغەمبەرﷺ لە شیوەکەی (رانوناء)دا نوێژی (جُمُعَة)ی بە موسوڵمانان کرد، ئینجا لە ڕۆیشتنەکەی بەردەوام بوو، تا کە گەیشتە ناو شاری (مَدینة).

جا خەڵکی (مَدینة) لە ماڵەکانیان هاتنە دەرەوەو چونە سەربانەکانیانو دەیانگوت: (اللّهُ أَکْبَر، جاءَ نَبِيُّ اللّهِﷺ) پێغەمبەریخوا هات. هەم منداڵەکانیش لە کۆڵانەکاندا بڵاو بونەوەو دەیانگوت: (یا مُحَمَّد، یا رَسُولَ اللّه). هەم ئەم شیعرانەشیان دەگوتن:

طَــلَعَ الْــبَدْرُ عَلَيْنا مِنْ ثَنِيّاتِ الْوَداعْ * وَجَــبَ الشُّــكْرُ عَلَيْنا مَا دَعا لِلّهِ داعْ
أَيُّها الْمَبْعُوثُ فِينا جِئْتَ بِالْأَمْرِ الْمُطاعْ * جِئْتَ شَرَّفْتَ الْمَدِينَة مَرْحَباً يا خَيْرَ داعْ

**ئيتر هيچ كەسێك ناتوانێ باسی ئەم خۆشیو شادیەی خەڵكی (مَدِينَة) بكا لەم ڕۆژەدا، بۆیێ حەزرەتی(أنس)ﷺ فەرموویەتی:** ﴿شَهِدْتُ يَوْمَ دَخَلَ النَّبِيُّﷺ الْمَدِينَةَ، فَلَمْ أَرَ يَوْماً أَحْسَنَ وَلاَ أَضْوَأَ مِنْهُ–وفِي رِوايَةٍ– أَضاءَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ﴾ رواه الحاكم والبيهقي، **هیچ ڕۆژێك لەو ڕۆژە جوانترو ڕۆناكتر نەبو: كە پێغەمبەرﷺ هاتە ناو شاری (مَدِينَة)، هەموو شتێك لە (مَدِينَة) ڕۆناكیی دەدا.**

**ئینجا ئەو خەڵكەی لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ دەڕۆیشتن، هەركەسیان بۆ خۆی پێشبڕكێی دەكردو لغاوی وشترەكەی پێغەمبەریﷺ دەگرتو دەیگوت: ئەی پێغەمبەریخوا لە لای ئێمە بمێنەوە. پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو:** ﴿خَلُّوا سَبِيلَها فَإِنَّها مَــأْمُورَةٌ﴾ **ڕێگەی وشترەكەم بەردەن، ئەو لە لای خواوە فەرمان پێكراوە.**

**جا وشترەكەش بە كۆڵانەكانی (مَدِينَة)دا دەڕۆیشت، تا گەیشتە گەڕەكی (بَنیالنَّجار)– كـە خاڵـەكانی (عَبْـدُالْمُطَّلِب)ی بـاپیری پێغەمبــەرنﷺ– لـە وێ لـە پـێش مـاڵی حەزرەتی(أبو أيُوب الأنصارِي)ﷺ لە مشتاغێكدا وشـترەكەی پێغەمبـەرﷺ مۆڵكەوت– لەو شوێنەی ئێستا مزگەوتی پێغەمبەرەﷺ– جا پێغەمبەرﷺ لە وشترەكەی دابـەزیو فەرمووی:** ﴿هَذا–إِنْ شاءَ اللهُ– اَلْمَنْزِلُ﴾ **ئەمە–ئەگەر خوا حەز بكا–هەوارگەیە.**

**جا حـەزرەتی(أبُـو أيُـوب)ﷺ بارگەی پێغەمبـەریﷺ هـەڵگرتو بردیـە مـاڵی خـۆی، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی:** ﴿اَلْمَرْءُ مَعَ رَحْلِهِ﴾ **مرۆڤ لەگەڵ بارگـەی خۆیدایـە. واتـە: پێغەمبەرﷺ لە ماڵی حـەزرەتی(أبوأيـوب) دابـەزی، حـەزرەتی(أسْعَد بـن زُرارة)شﷺ وشترەكەی پێغەمبەریﷺ بردە ماڵیخۆی.**

**ئینجا پێغەمبـەرﷺ مـاوەی حـەفت مـانگ لـە مـاڵی حـەزرەتی(أبُوأيُوب)دا مایـەوە، تـا مزگەوتەكەی خۆیو هەندێك خانووی بۆ خۆی دروست كردن، جا پێغەمبەرﷺ–هـەر لە مـاڵی (أبوأيـوب)بـوو–(زَيْـد بـن حارِثـة)و (أبُورافِع)ی ناردنـەوە (مَكَّة)و دوو وشـترو پێنجسەد دیرهەمیان لەگەڵ خۆیان برد، تا هەردوو كیژەكانی پێغەمبەرﷺ: (فاطِمَة)و (أُمُّ كُلْثوم)، هەم حەزرەتی(سَوْدَة)ی هاوسەرەكەی پێغەمبەروﷺ (أمّ أيْمَن)و (أسامَة بن زَيْـد)ﷺ بهێننـە (مَدِينـة)، جـا (عبـدالله)ی كـوڕی ئیمـام (أبُـوبَكْر)ش-رضی الله عنهما- لەگـەڵ ئەواندا هاتو خێزانو منداڵەكانی ئیمام (أبُـوبَكْر)شـی لەگـەڵ خۆیـا هێنانـە (مَدِينَـة)، واتە: حەزرەتی(عائِشة)شیان-رضی الله عنها-لەگەڵدا بوو.**

**هەروەها (رُقَيَّة) كیژی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئیمام (عُثمـان)=مێردەكەیخۆی-رضی الله عنهما- كۆچی كرد، بەڵام (أبُوالعاص)=مێردی (زَيْنَب)ی كیژی پێغەمبەرﷺ هێـشتا موسوڵمان**

نەبوبوو، بۆیێ ڕێگەی نەدا (زَینب)-رضی الله عنها-كۆچ بكا.

## ﴿( أبو أيوب ) چۆن میوانداری پێغەمبەریﷺ كرد ﴾

حەزرەتی(أبُوأيُوب)رضي الله عنه فەرموویەتی: پێغەمبەرﷺ لە ماڵی ئێمە لە نهۆمی بنەوە دابەزی، منیش گوتم: یا رَسُولَ الله بە باوكم‌و دایكمەوە بە قوربانت بم، من پێم ناخۆشە لە سەرەوەی تۆ بم‌و تۆ لە بنەوە بی، تۆ وەرە سەرەوە، ئێمەش دێینە خوارەوە.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿بۆ ئێمەو بۆ ئەوانەی دێنە لام وەها خۆشترە لە نهۆمی بنەوە بین﴾. جا پێغەمبەرﷺ هەر لە نهۆمی بنەوە بوو، تا كوپەیەكی ئاومان شكا، جا من‌و هاوسەركەم بە لێفەی‌خۆمان ئاوەكەمان وشك كردەوە، نەوەك بە سەر پێغەمبەرداﷺ بچكێتە خوارەوە، جگە لەو لێفەش هیچ لێفەی‌ترمان نەبو، بۆیێ زۆر لە بەر پێغەمبەرﷺ پاڕامەوە، تا ڕازی بوو و هاتە نهۆمی سەرەوە.

ئینجا ئێواران چێشتمان بۆ دەناردو دەیخوارد، جا ئەگەر هیچ بەرماوەی لە قاپەكەدا بمابا، من‌و هاوسەرەكەم هەوڵی شوێنی پەنجە پیرۆزەكانی پێغەمبەرمانﷺ دەدا؛ ئەومان دەخوارد، تاكو بەرەكەتمان پێ‌بگا، تا شەوێك چێشتمان بۆ نارد-سیر و پیازمان تێكردبوو- كە گەڕاندیەوە، هیچ ئاسەواری دەستی دیار نەبو، جا منیش بە تەنگاوی هاتمە لای‌و گوتم ئەی پێغەمبەری خوا-بە باوك‌و دایكمەوە گیانفیدات بم-چێشتەكەت گەڕاندۆتەوەو شوێنی دەستت تێ‌یدا دیار نیە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إِنِّي وَجَدْتُ فِيهِ رِيحَ هَذِهِ الشَّجَرَةِ، وَأَنَا رَجُلٌ أُنَاجِي فَأَمَّا أَنْتُمْ فَكُلُوهُ﴾ لە خواردنەكەدا بۆنی سیرم كرد، من پیاوێكم (مُناجاة) لەگەڵ (مَلائِكَة) دەكەم، بەڵام ئێوە بیخۆن. حەزرەتی(أبُو أيُوب رضي الله عنه) فەرمووی: جا هیچی‌تر سیرمان بۆ تێ‌نەدەكرد.

جا بزانە: -جگە لەمەش-لە هەر شەوێكدا سێ كەس‌و چوار كەس لە بەر دەرگەی پێغەمبەرﷺ بون بە نۆبەت خواردنیان بۆ دەهێنا. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(١٨١-٢٠٧) و (فتح الباري) ب(٧) ل(٢٨٨-٣٠٧) و(السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٣٣-١١١) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(١٨٢-١٨٩).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**پێشەكی بزانە: سەرەتای مێژووی ئیسلام لە كۆچكردنی پێغەمبەرﷺ لە (مَكَّة) بۆ (مَدِينَة) دەست پێ‌دەكا، سەرە ساڵەكەشی مانگی (اَلْمُحَرَّم)ە.**

﴿عَنْ سَهْلِ بن سَعْدرضي الله عنه: ما عَدُّوا مِنْ مَبْعَثِ النَّبِيِّﷺ وَلا مِنْ وَفاتِهِ، ما عَدُّوا إلاّ مِنْ مَقْدَمِهِ الْمَدِينَةَ﴾ رواه البخاري، مێژووی ئیسلامیان لە بوونە پێغەمبەرو وەفاتكردنی پێغەمبەرﷺ دانەنا، تەنها لە هاتنیەوە بۆ (مَدِينَة)، دایاننا.

واتە: ئەو دانانەش بە (إجْماع)=یەكدەنگی (صَحابَة)ی پێغەمبەرﷺ بوو، لە سەردەمی ئیمام (عمر)دارضي الله عنه ساڵی حەڤدەی كۆچی، هۆیەكەشی ئەمەبوو: بەڵگەنامەی قەرزێكیان

هێنا لای ئیمام (عُمر)ﷺ تێیدا نوسرابوو: لە مانگی (شَعْبان) قەزدارەکە قەرزەکە بداتەوە. جا ئیمام (عمر)ﷺ فەرمووی: کامە (شَعْبان)؟ هی ئەم ساڵ، یان داهاتوو، یان ڕابردوو. جا بۆ دانانی مێژوو، (صَحابَة)کانی کۆ کردنەوە: هەندێکیان لە دایکبوونی پێغەمبەریانﷺ هەڵبژارد، هەندێکیش بوونی بە پێغەمبەرﷺ، هەندێکیش وەفاتکردنی، هەندێکیش کۆچکردنی. جا ئیمام (عُمر)ﷺ کۆچکردنەکەی پێخۆش بوو و فەرمووی: کۆچکردن حەق و ناحەقی لێك جیا کردۆتەوەو دیارترە، جا (صَحابَة)شﷺ بە تێکڕایی فەرموودەکەی ئیمام (عُمر)یان پەسند کرد.

جا ئیمام (عُمر)ﷺ فەرمووی: کام مانگ بکەینە سەرە ساڵی کۆچی؟ ئیمام (عثمان)و ئیمام (علی)-رضی الله عنهما-فەرموویان: (المُحَرَّم) سەرە ساڵ بێ-واتە: چونکە پێغەمبەرﷺ لە (المُحَرَّم)دا خۆی ئامادە کرد بۆ کۆچکردن، هەم لەو کاتیش (المُحَرَّم) سەرە ساڵی مانگی بوو- جا ئیمام (عُمر)ﷺ فەرموودەکەی ئەوانی پەسند کرد.

ئیمامی(السُّهَیْلي) وای ڕوون کردۆتەوە: کە (صَحابَة)کانﷺ دانانی مێژووی ئیسلامیان لەم ئایەتە وەرگرتووە: ﴿لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ﴾ التوبة:١٠٨، **ئەو مزگەوتەی دامەزرێندراوە لە یەکەم ڕۆژەوە لە سەر لەخواترسی**. واتە: لە یەکەم ڕۆژی سەربەرزی ئیسلام-کە هاتنی پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)کانەﷺ بۆ (مَدِینَة)- مزگەوتەکەی (قُباء) دامەزرێندراوە، کەوابو: ئایەتەکە وا دەگەیەنێ: هاتنی پێغەمبەرﷺ سەرەتای مێژووی ئیسلامە. (فتح الباری) ب(٧) ل(٣٣٥-٣٣٦).

**یەکەم: کافرەکانی (قُرَیْش) لە (دارُالنَّدْوَة)دا کۆ بونەوەو بڕیاراین دا: پێغەمبەرﷺ بکوژن.**

حەزرەتی(ابن عَبّاس)-رضی الله عنهما- فەرموویەتی: پیاوە گەورەکانی (قُرَیْش) لە دژی پێغەمبەرﷺ لە (دارُالنَّدْوَة)دا کۆ بونەوە، شەیتانیش لە وێنەی پیرێکی (النَّجْدِي)دا هاتە لایان، جا پێیان گوت: تۆ کێی؟ شەیتان گوتی: مـن پیرێکی (النَّجْدِي)م دەمەوێ لەم کۆبوونەوەی ئێوەدا بەشدار بیم، بەڵکی ڕەئیەکی باشتان پێ بڵێم. جا ئیزنیان دا لەگەڵیان چووە ژوورەوەو بەم جۆرە دەستیان بە گفتوگۆ کرد:

**یەکێکیان گوتی:** (مُحَمَّد)ﷺ لە خانوویێکدا دەستو پێی ببەستن و دەرگەشی لە سەر کلیل بدەن تا دەمرێ. جا پیرە شەیتان گوتی: وَاللهِ ئەم بۆچوونە هیچ نیە، هەر (صَحابَة)کانی خۆی لە بەر دەستی ئێوە ڕزگاری دەکەن.

**جا یەکێکی‌تر گوتی:** (مُحَمَّد)ﷺ لە (مَکّة) دەردەکەینە دەرەوەو بۆ کوێ دەڕوا با بڕوا، ئێمەش دەحەسێینەوە. پیرە شەیتان گوتی: ئەم بۆچوونەش هیچ نیە، چونکە (مُحَمَّد)ﷺ زوبانێکی ڕەوان و گوفتارێکی شیرنی هەیە، ئەگەر بگاتە ناو هۆزەکانی عەرەب، ئەوان لە دەورەی خۆی کۆ دەکاتەوەو هێرش دەکاتە سەر ئێوەو دەتانکوژێ.

**جا (أَبُوجَهْل)**-لعنه الله- **گوتی:** وَاللهِ مـن ڕەئیم ئەوەیە: لە هەر بنەماڵەیەکی

(مَكّة) گەنجێك بهێنین‌و هەر گەنجەش شمشێرێكی بڕندەی بدەینە دەست، جا هەموویان بە یەكەوە بە شمشێرەكانیان لە (مُحَمَّد)ﷺ بدەن‌و بیكوژن، ئیتر خوێنەكەی بە ناو بنەماڵەكانی (مَكّة)دا پەرت دەبێ‌و خزمەكانی (مُحَمَّد)ﷺ ناتوانن تۆڵەی بكەنەوەو بە خوێن وەرگرتن ڕازی دەبن. جا پیرە شەیتان گوتی: وَاللهِ ئەمەیان باشەو لەم ڕەئیە باشتر نیە.

ئیتر لە سەر ئەم بڕیارە ڕێك كەوتن، جا حەزرەتی(جُبْرائیل)ؑ هات (وَحْي)ی بۆ پێغەمبەرﷺ هێناو لەو پیلانەی كافرەكان ئاگاداری كردەوەو فەرمانی پێ‌كرد: لە سەر یاتاغی خۆی نەخەوێ‌و كۆچ بكا. جا لە دوای كۆچكردن–لەبارەی ئەم پیلانە– خوای‌گەورە ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەرﷺ ناردە خوارەوە: ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللهُ وَاللهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾الأنفال:٣٠، **باسی ئەو نیعمەتە بكە–ئەی پێغەمبەرﷺ–كە كافرەكان لە دژی تۆ پیلانیان دانا: تاكو بەندت بكەن، یان بتكوژن، یان لە (مَكّة) دەرتبكەنە دەرەوە، ئەو كافرانە فێڵ‌و پیلانیان بۆ تۆ دانا، خوای‌گەورەش پیلانی ئەوانی پوچەڵ كردەوە، پووچەڵكردنەوەی خوای‌گەورە لە پیلانی ئەوان كاریگەرترە.** (تفسیر ابن كثیر الأنفال (٣٠).

بەڵێ: خوای‌گەورە پووچەڵكردنەوەی پیلانی‌كافرەكانی كردە (مُعْجِزَة)یەكی پێغەمبەرﷺ كە بە خوێندنی چەند ئایەتێكی قورئان خەو بە سەر چاوەكانیاندا هات‌و پێغەمبەریانﷺ نەدیت، جا بەوەش زیاتر شەرمەزارو سەرشۆڕ بون: كە سەریان پڕ لە خۆڵ بوبوو، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە: خوای‌گەورە پێغەمبەری‌خۆیﷺ دەپارێزێ‌و پاراستنی خوا لە فێڵی دوژمنانی بەهێزترە، هەم ئەم (مُعْجِزَة)یە لە خۆی‌دا بەڵگەیە لە سەر سودی سورەتی (یس): بۆ پاراستن لە هەموو جۆرە ترسێك، هەر بۆیێش پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إقْرَوُا عَلَى مَوْتَاكُمْ يس﴾رواه ابوداود وصححه ابن حبان، **سورەتی (یس) لە سەر ئەو كەسانە بخوێنن كە خەریكی مردنن.**

**دووەم: نابێ بانگەوازكاری‌ئیسلام تەماع لە ماڵی خەڵكی بكا،** ئیمام (أَبُوبَكْر)ؓ فەرمووی: **یارَسُولَ الله یەكێك لەم دوو وشترانەم بۆ سواربوونی ڕێگە لێم وەربگرە.**
**پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بە پارە لێت وەردەگرم.**

**پرسیار:** خۆ ئیمام (أَبُوبَكْر)ؓ گیان‌و ماڵی‌خۆی بە قوربانی پێغەمبەرﷺ كردبوو، زیاتر لە نرخی ئەم وشترەی بەخشیوەتە پێغەمبەرﷺ، ئەی بۆچی پێغەمبەرﷺ ئەم وشترەشی بە بەخشین لێ‌قبوڵ نەكردو فەرمووی: **﴿بە پارە لێت وەردەگرم﴾؟**

**وەڵام:** پێغەمبەرﷺ پێی خۆش بوو كۆچكردنەكەی بە ماڵ‌و بە گیانی‌خۆی بێ؟ چونكە كۆچكردنەكەی بۆ بانگەوازی ئیسلام بوو، هیچ پێغەمبەرێكیش بۆی نیە لە بەرامبەر

**بانگەوازیەکەیان هیچ شتێك وەربگرن، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ:** ﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلاّ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ الشعراء:١٠٩، **من لە سەر بانگەوازیەکەم داوای کرێ لە ئێوە ناکەم، کرێی بانگەوزیەکەم=پاداشتەکەی تەنها لە سەر خوایە.**

جا هەر لە بەر ئەو هۆیەش بوو: هیچیشی لە (سُراقَة) وەرنەگرت–کە لە هێرشەکەیدا سەر نەکەوتو تۆبەی کرد– واتە: بەڵام شیرخواردنەوەکەی ماڵی (أمّ مَعْبَد) بە ناوی میواندای بوو، پەیوەندیی بە کۆچکردنەوە نەبوو؟ چونکە ماڵی (أمّ مَعْبَد) لە سەر ڕێی ڕێبواران بوو، موسوڵمانو کافر دەبونە میوانی.

**جا بەم وەڵامە، جیاوازیی کۆچکردنو شەوڕۆیەکەی پێغەمبەرﷺ ڕۆن دەبێتەوە،** واتە: شەوڕۆیی پێغەمبەرﷺ ڕێزلێنانێکی تایبەت بەوی بوو، کەسێکیتر ئەم ڕێزلێنانەی بۆ نابێ، بۆیێ خوایگەورە بە سواری بوڕاق شەوڕۆییەکەی پێکرد، بەڵام کۆچکردن دانانی ڕێبازێك بوو بۆ بانگەوازکارانی ئیسلامو تایبەت بە پێغەمبەرﷺ نەبوو، ئەم ڕێبازەش ماندووبوونو تینووەتیو برسیەتیی تێدایە، بۆیێ لەم سەفەرەدا خوایگەورە بوڕاقی بۆ نەنارد، هەرچەند لەم سەفەرەشدا زۆر پێویستی بە بوراق هەبوو؟ چونکە کافرەکان دەورەیان لێدابوو و لە هەموو ڕێگەیەکیشدا بە دوایدا دەگەڕان بیکوژن.

کەوابوو: ڕێزلێنانو ڕێبازدانان زۆر لێك جیاوازنو پێویستە بانگەوازکاری ئیسلام شوێن پێغەمبەرﷺ بکەوێو چاوچنۆك نەبێو تەماع لە ماڵی خەڵکی نەکا، دەستیخۆی تەنها لە بەر خوای گەور پان بکاتەوە، تاکو باشتر لە بانگەوازیەکەی سەر بکەوێو قسەی لێوەربگیرێ.

**تەماشا بکە:** چونکە ئێستا کاروباری ئایینمان بە موچەیەکی دیارکراو ئەنجام دەدەین، وتارو پەندو ئامۆژگاریمان وەك پێویست کاریگەر نیە، چونکە ئەو قسەیەی لە ترسی خوا لە گەرووی خواناسان دێتە دەرەوە، یەکسەر کار لە دڵی خەڵك دەکاو ترسی خوای دەخاتە ناوێ، جا لێرەدا مەبەستمان ئەو کەسانە بون: کە دەست لە بەر خەڵکی پان دەکەنەوە، بەڵام ئەوانەی لە بەرگیئایینیدا لە بەر دەرەگەی کاربەدەستەکان دەبیزێنو دەبنە نۆکەری ستەمکاران، ئەوانە دزو خائینی ئایینیئیسلامن، بە هیچ جۆرێك متمانەیان پێناکرێو خەڵکیش خۆشی ناوێنو لێیان دور دەکەونەوە. بۆ ئەم باسە بڕوانە (فتح الباري) ب(٧) ل(٣٩٤) و(سيرةالصلابي) ب(١) ل(٤٨٣و ٤٨٤و٤٩١).

**سێیەم: کارلەجێیی پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە ئیمام (عَلي)ﷺ کرد: لە سەر یاتاغی وی بخەوێو ئەمانەتەکان بداتەوە خاوەنەکانیان، ئیمام (أَبوبَکْر)شیﷺ کردە هاوڕێی کۆچکرنەکەی.** ئەوەش نیشانەی ئازایەتیو غیرەتو لێهاتوویی ئەم دوو بەرێزانەیە؟ چونکە هەر یەکەیان ترسناکترین کارییان بۆ داندراو لە ئەنجامدانی کارەکەشیان سەرکەوتوو بون، هەم بەڵگەیە لە سەر کارلەجێییو لێزانیی پێغەمبەرﷺ، چونکە مرۆڤی

لێهاتووی بۆ کارێکی شیاویخۆی دادەنا، تاکو تێیدا سەرکەوتوو بێ:
ئیمام (عَلي)ﷺ لە ناو ماڵی پێغەمبەرداﷺ بەخێو دەکرا-هەروەك لە بانگەوازیی نهێنیدا ڕابرا-
لە هەمان کاتیشدا خزمی پشتێی پێغەمبەرﷺ بوو، کەوابوو: لە بەر ئەو دوو هۆیە ئەو بۆ دانەوەی ئەمانەتەکان شیاوترە.
ئیمام (أَبوبَکْر)ش ﷺ کاملە پیاوێکی ڕیش سپیی پەنجا ساڵی بوو، لە هەمان کاتیشدا بە هۆی بازرگانیکردن خەڵکی دەرەوەی (مَکَّة)ش دەیانناسی، کەوابوو: ئەویش بۆ هاوڕێیەتی ڕێگەی کۆچکردن شیاوترە لە ئیمام (علی)ﷺ -کە گەنجێکی بیست ساڵان بوو، وەکو پێغەمبەرﷺ ڕیشی ڕەش بوو و مەترسی تۆمەتو گومانی لێدەکرا، بەڵام ئیمام (أَبوبَکْر)ﷺ بە هۆی ڕیشی سپی لە تۆمەت دورتر بوو، چونکە لە ڕێگەدا خەڵك-لەبارەی پێغەمبەرﷺ- لە ئیمام (أَبوبَکْر)یﷺ دەپرسی: ئەم پیاوە گەنجە کێیە لەگەڵتدایە؟ لە وەڵامدا دەیفەرموو: ﴿هذا الرَّجُلُ يَهْدِيني السَّبِيلَ﴾ رواه البخاري، **ئەم پیاوە ڕێنموونی ڕێگەم دەکا**. ئیمام (أَبوبَکْر)ﷺ -بەم وەڵامە- مەبەستی ڕێگای ئیسلام بوو، خەڵکیش بە ڕێگەی سەر زەمین تێدەگەیشت، جا بەم وەڵامە هیچ تۆمەتو گومانێك نەدەماو ئەوان ئاشکرا نەدەبون.
جگە لەمەش: پێغەمبەرﷺ چەند هۆکارێکیتریشی بە کار هێنان بۆ سەر کەوتنی کۆچکردنەکەی، بۆ نموونە:
*لە کاتی گەرمای نیوەڕۆدا چووە ماڵی ئیمام (أَبوبَکْرﷺ)؟ چونکە لەو کاتدا خەڵك لە ماڵەکانیاندا دەمێننەوەو نایەنە دەرەوەو نایبینن.
*لە تاریکی شەوێدا لە (مَکَّة) چووە دەرەوە، ئیمام (عَلي)شیﷺ لە سەر یاتاغی خۆی بەجێ هێشت تاکو کافرەکان درەنگ لە ڕۆیشتنەکەی ئاگادار ببنەوە.
*جگە لە ئیمام (عَلِي)و ماڵی ئیمام (أَبوبَکْر) رضي‌الله عنهما کەسیتر ئاگاداری کۆچکردنەکە نەبو.
*سێ شەوان لە ئەشکەوتەکەدا مانەوە، تاکو بە دواداگەڕانی کۆتایی بێ.
*بە ڕێگەیەکی نەناسراودا ڕۆیشتن، تاکو خەڵك هەستیان پێنەکا.
ئەوانە گشتی ڕێنموونیکردنی موسوڵمانانە: تاکو ئەوانیش-وەکو پێغەمبەرﷺ-پشت بە خوا ببەستنو هۆکارەکانی شەرعیش بە کار بێنن بۆ سەکەوتنی کارەکانیان.
جا لە کۆتاییدا دەڵێین: ئەم کردارەی کافرەکانی(مَکَّة) نیشانەی گومڕاییو سەرلێشوانیانە؟
لە لایەك دەیانگوت: (مُحَمَّد) درۆزنە، سیحربازە، شێتە.
لە لایەکیتریش: هەر شتێکی بە نرخو باشیان هەبوایەو مەترسی دزیو زەوتکردنیان لێکردبا، بە ئەمانەت لەلای پێغەمبەرﷺ دایاندەنا؟ تاکو بۆیان بپارێزێ!، کەواتە: ئەو کافرانە گومانیان نەبو: کە پێغەمبەرﷺ ئەمینو ڕاستگۆیە، بەڵام لە بەر گومڕاییو

ڕقەكاری ئیمانیان پێنەدەهێنا.

**چا بزانـە: وەفاداریو دڵسۆزیو غەمخۆریو ئەمینیو ڕاستگۆییو لێهاتوویی پێغەمبـەرﷺ لەوەدا خۆی دەبینێتـەوە: كـە بـەخۆی لـە (مَكّـة) نەچـووە دەرەوەو هـەر لـە مەترسـیدا مایەوە، تا (صَحابَة)كانی دەرچونو گەیشتنە شوێنی دڵنیابوون، بەڵێ: پێغەمبەرﷺ وەك سەركردەكانی دونیایی خۆی لە حەشارگەیەكدا نەپاراستو خەڵكیش بە كوشتن بدا.**

**هەروەها: بەجێ هێشتنی ئیمام (عَلي)ﷺ بۆ دانەوەی ئەمانەتەكان، نیشانەیەكیتری ئەمینیو ڕاستگۆیی پێغەمبەرەﷺ؟ چونكە لەو حاڵەتە پـڕ تـرسو تەنگەدا ئەمیندارەیـەتیخۆی لـە دەست نەداو ئەمانەتەكانی گەیاندنەوە دەست خاوەنەكانیانوماڵیخەڵكیی بـە فـیڕۆ نـەدا، ئەگەر نا: لەو جۆرە حاڵەتانەدا مرۆڤ گوێ ناداتە ماڵی خەڵك، بەڵكو تەنها هەوڵی ڕزگاركردنی خۆی دەدا.** ئەم باسەم هەڵێنجاوە لە (فتح الباری) ب(٧) ل(٣١٢و ٣١٣) و(سیرةالصلابي) ب(١) ل(٤٧٨-٤٨٣).

**چوارەم: دەركردن لـە خـاكو وڵات دەردێكـی گرانـە، كـە پێغەمبـەرﷺ لـە (مَكّة) چـووە دەرەوە، لەبارەی (مَكّة) فەرمووی:** ﴿وَالله إنَّكِ لَخَيْرُ أَرْضِ الله...وَلَوْلا أَنّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ ما خَرَجْتُ﴾ ، **سوێندم بە خوا: تۆ-ئەی (مَكّة)-چاكترین زەمینیخوای...ئەگەر من لـە تۆ وەدەرنەندرابام، بەخۆم نەدەچومە دەر.**

**دەركردن لە خاكو وڵات ئـازارو خەفـەتێكی گەورەیـەو پێغەمبـەرەكانی پـێش پێغەمبـەری ئێمەش**-علیهم الصلاة والسلام-**ئەمەیان بە سەر هاتووە، چا لەو ڕۆژەوە كە پێغەمبەرﷺ (وَحْي)ی بۆ هاتو (وَرَقَة) پـێی گـوت: لـە (مَكّـة) دەرت دەكەنـە دەرەوە. پێغەمبـەریشﷺ بـە سـەر سوڕمانەوە فەرمووی:** ﴿أَوَ مُخْرِجيَّ هُمْ ؟﴾ **ئایا گەلەكەم لە (مَكّة) دەرم دەكـەن؟ هـەر لەو ڕۆژەوە پێغەمبەرﷺ بۆ ئەم تـاڵیو سـوێرییە خـۆی ئامـادە كردبـوو، بـەڵام لـە بـەر ئەوەی كۆچكردنەكەی بۆ خوا بوو، خوایگەورە هـاوڕێی وەهـای بـۆ پەیـداكردن: كـە لـە خزمەكانی خـۆی دڵـسۆزتر بـونو خۆیـان بـە قوربـانی وی دەكـرد، هـەر لـە ژێـر سـێبەری شمشێری ئەو هاوڕێیانەشدا بە سەر بڵندیو ڕێزداری گەڕاوە (مَكّة)و هیچ كەسێك نەیدەتوانی بە خراپەش چاوی لێبكا.**

**چا لە بەر ئەوەی دەركردن لە خاكو وڵات دەردێكی گرانە، خوایگەورە ئایـەتی (جهـاد)ی ناردە خوارەوە، دەركردنیشی بە هۆكارێكی (جهاد)داناو فـەرمووی:** ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـــاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ * الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلاَّ أَنْ يَقُولُـــوا رَبُّنَا اللهُ﴾ الحج:٣٨و ٣٩، **ئیزن درا ئەو موسوڵمانانەی جەنگیان لەگەڵ دەكـرێ: جـەنگ بكەن چونكە ستەمیان لێكراوە، خوایگەورە توانایە لە سەر یارمەتیدانیان، ئـەو ستەم لێكراوانەی لە وڵاتیخۆیان بە ناهەق دەركراون بێ ئـەوەی هـیچ تاوانێكیـان هەبێ، تەنها ئەوە نەبێ دەیانگوت: خوای ئێمە (اَللە)یەو تاكو تەنیایە.**

**جا بزانە: بە بەڵگەی حەدیسەکەش: (مَكّة)ی پیرۆز لە گشت شوێنێکی زەمین گەورەترە، بەڵام ئەو پارچە خاکەی گۆڕی پێغەمبەرﷺ-کە دەورەی لە لاشە پیرۆزەکەی پێغەمبەرﷺ داوە- ئەو لە (مَكّة)ش گەورەترە بە (إِجْماع)ی زانایانیئیسلام.** (تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٤) ل(٦٤).

**پێنجەم: ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ هەندێ جار لە پێش پێغەمبەرﷺ دەڕۆیشت، هەندێ جاریش لە دواوەی...هتد، جا لە ڕێگەدا پێی پێغەمبەرﷺ بریندار بوو و خوێنی لێهات، بۆیێ ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ پێغەمبەریﷺ لە سەر شانیخۆی دانـاو هەڵیگرت**...ئەوەش بەڵگەیە: کە ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ ئەوەندە بە دڵسۆزی هەوڵی پاراستنی پێغەمبەریﷺ داوە، ئەگەر جێی بوباوە، لە ناو چاویخۆی دایدەناو دەیپاراست.

*(بە قوربانی خاکی بن پێیەکانت بم یارَسُولَ الله، بە قوربانی دڵۆپەکانی خوێنی پێیەکانت بم یارَسُولَ الله، بە قوربانی ئەو ئەشکەوتەش بم کە تۆی حەشار دابوو یارَسُولَ الله، خۆزگەم تۆزی بن پێیەکانت دەمگەیشتێو دەبووە سورمەی چاوەکانم یارَسُولَ الله).*

دەك خوا لێت ڕازی بێ، ئەی ئیمام (عُمر)ﷺ کە دەرحەق ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ فەرمووت: ﴿وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتِلْكَ اللَّيْلَةُ-أَيْ مِنْ أَبِيبَكْرٍ-خَيْرٌ مِنْ آلِ عُمَرَ﴾ رواه البيهقي، **سوێندم بەو خوایەی گیانی منی بە دەستە: شەوەکەی (أَبُوبَكْر) لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ-کە لە (مَكّة) چونە دەرەوە- لە خزمو کەسی (عُمر) باشترە.**

بەڵێ: ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ هەر لە ناو ماڵو منداڵیخۆیدا سەربازگەیەکی بچکۆڵەی پێك هێنابوو بۆ پاراستنی پێغەمبەرﷺ، بەم شێوەیە: بەخۆی پاسەوانی تایبەتی پێغەمبەرﷺ بوو، (عبدالله)ی کوڕیشیﷺ لێپرسراوی هەواڵگری بوو و جموجۆڵی دوژمنی وەردەگرت، (أسماء)ی کیژیشی-رضي الله عنها- لێپرسراوی ئازووقە بوو: لە (مَكّة)وە بۆی دەبردنە ئەشکەوتەکە، (عامر)ی شوانیشیﷺ لێپرسراوی سەرلێشێواندنی دوژمنو هەم یارمەتیدەری (عبدالله)و (أسْماء) بوو؟ چونکە مەڕ و بزنەکانی بە سەر ئاسەواری پێی ئەواندا لێدەخوڕین تاکو ئاسەواری پێیەکانیان دیار نەبێ.

ئیتر ئێمە ناتوانین مافی گەورەیی ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ بدەین، بەڵام ئەوەندە دەتوانین دەمو لێومان بە پیرۆزبایی تەڕ بکەینو بڵێین: **دەك پیرۆزت بێ-ئەی (أَبُوبَكْر)ی (صَدِيق)ی (صِدِّيق)، ئەی (صَحابَة)ی(رَفِيق) ئەی پیری پیرانو مامۆستای گەنجان- پیرۆزت بێ ئەم ئایەتەی قورئان: کە خوایگەورە هەتا هەتایی لەم ئایەتەدا مەدحی کردویو بە (صاحِب)=هاوڕێی پێغەمبەرەکەیﷺ ناوی تۆی هێناوەو دەفەرموێ:** ﴿إِلاَّ تَنْصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لا تَحْزَنْ إِنَّ اللهَ مَعَنَا﴾ التوبة: ٤٠، **ئەگەر ئێوە یارمەتی پێغەمبەرﷺ نەدەن، بێگومان خوایگەورە**

یارمەتی‌ی دەدا، خودا لەو کاتەش یارمەتی‌ی دا: کە کافرەکان لە (مَکّة) دەریانکردە دەرەوە، لەو حاڵەتەی‌دا کە پێغەمبەرﷺ یەکێك بوو لە دووانەی بە یەکەوە لە ئەشکەوتەکەدا بون، لەو کاتدا پێغەمبەرﷺ بە (أَبُوبَكْر)ی هاوڕێ‌ی‌خۆی فەرموو: دڵتەنگ مەبەو مەترسە، خودامان لەگەڵدایە، واتە: یارمەتیمان دەدا. بڕوانە (البداية والنهاية) ب(٢) ل(١٨٥و١٨٦) و(سيرة الصلابي) ب(١) ل(٤٦٧و٤٧٩).

**شەشەم: خوای‌گەورە بە لەشکری‌خۆی پشتگیری پێغەمبەری‌ﷺ کرد: فەرمانی بە داپیرۆچکە کرد: لە زارکی ئەشکەوتەکەدا تەونی کرد.** خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَيَّـدَهُ بِجُنُودٍ لَمْ تَرَوْهَا﴾ التوبة: ٤٠، **خوای‌گەورە پشتگیری پێغەمبەری‌ﷺ کردو بەهێزی کرد بە چەند سەربازێك کە ئێوە نەتاندیتن: کە (مَلائِكَة) بون.**

جا جەنابی (الصّلابي) داپیرۆچکەشی بە سەربازی خوا داناوەو بەڵگەشی ئەم ئایەتەیە: ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إلاّ هُـوَ﴾المدثر:٣١، **لەشکری خوا ئەوەندە زۆرە، هیچ کەسێك نازانێ سەبازەکانی خوا چەندن، تەنها خوا بەخۆی دەیزانێ.** کەوابوو: پێویستە بانگەوازکارانی‌ئیسلام خەڵکی لە (مُعْجِزَة)کانی کۆچکردن ئاگادار بکەنەوە، چونکە ئەوانەش بەڵگەیەکی‌تری پێغەمبەرایەتین.

جا فەرمودەکەی (الصَّلابي) بەوەش بەهێز دەبێ: کە (مُعْجِزة)کەی تەونی داپیرۆچکە ئیمام (أحمد، بسند حسن) گێڕاویتیەوەو ئیمام (ابن کثیر)ش هەر بە (حَسَن)ی داناوەو فەرموویەتی: ئەوەش پاراستنێکی خوای‌گەورەیە بۆ پێغەمبەرەکەی‌ﷺ.

هەروەها (مُعْجِزَة)کەی درەختەکەو کۆترەکان، (ابن عساکر)و (ابن سَعْد)و (ابن مردویە)و (البيهقي)و (أبونعيم) گێڕاویتیانەوەو زانایانی‌تری (السيرة)ش هێناویانە. (البدايە والنهاية) ب(٢) ل(١٨٧) و(فتح الباري) ب(١) ل(٢٩٥) و(الخصائص الكبرى) ب(١) ل(١٨٥) و(سيرة الصلابي) ب(١) ل(٤٦٥و٤٨٠).

هەروەها (مُعْجِزَة)کەی (سُراقَة)ش (البخاري)و (مسلم) گێڕاویەتیانەوە، هەم لە کتێبەکانی (سِيرة)شدا هاتووە: کە (سُراقَة) نووسراوەکەی دڵنیایی وەرگرتو ویستی بگەڕێتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿كَيْفَ بِكَ–يا سُراقَةُ– إذا تَسَوَّرْتَ بِسِوارَيْ كِسْرَى؟﴾ رواه البيهقي، **ئەبێ حاڵت چۆن بێ–ئەی (سُراقَة)– لەو کاتەی هەردوو بازنەکانی (كِسْرَى) دەخەیە دەستەکانت؟.**

ئینجا لە ساڵی هەشتی کۆچی–کە پێغەمبەرﷺ لە غەزای (حُنَيْن)و (طائِف) گەڕاوە، (سُراقَة) چووە خزمەت پێغەمبەرﷺ گوتی: من (سُراقَة)م، ئەمەش نووسراوەکەتە؟ جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿يَوْمُ وَفاءٍ وَبِرٍّ﴾ **ئەمرۆ ڕۆژی وەفاداری‌و چاکەیە.**

جا (سُراقَة) لێ‌ی نزیك بۆوەو موسوڵمان بوو و تکای لە پێغەمبەرﷺکرد: هێرش نەکاتە سەر هۆزەکەی. جا پێغەمبەرﷺ تکایەکەی قبوڵ کردو هێرشکەی ڕاگرت.

**ئینجا لـه سـاڵی شـانزەی کۆچـی، کـه (اَلْمَـدائِن) لـه ژێـر دەسـتی فارسـەکان ڕزگـار کـراو گەنجینەکەی (کِسْرَی) کەوتە دەستی موسوڵمانان، بازنەکانی (کِسْرى) نێردرانەوە (مَدِينَة)، جـا ئیمـام (عمـر)ﷺ بـانگی حـەزرەتی(سُـراقَة)ی کـرد ﷺ بازنـەکانی خـستنە دەسـتیو فـەرمووی: بڵـێ: (اَللهُ اَكْبر، اَلْحَمْدُلِلّه)، سـوپاس بـۆ ئـەو خوایـەی ئـەم بازنانـەی لـه (كِسْرَى) داڕنیو دەبەر (سُراقَة)ی کردن کە عەرەبێکی دەشتاوییە.** (البدايـه والنهايـه) ب(٤) ل(١٩١) و(فتح البارى) ب(٧) ل(٣٠٣).

*دەك بە قوربانی وەرەی بەرزو نەترسیت بم یارَسُولَ الله، کە لەو ڕێگە سـەختو پـڕ ترسـەی کۆچکردندا نەدەترسایو-پێش پانزە ساڵ-هەواڵی سەرکەوتنی ئیسلامیشت ڕاگەیاند !.*

**هـەروەها (مُعْجِـزَة)ی مەڕەکـەی (أُمِّ مَعْبَـد)ش (ابـن منـده)و (الطبرانـي)و (البيهقـي) گێڕاویەتیانەوەو (الحاكم) بە (صحيح)ی داناوەو (الحافظ ابن كثير)ش فەرموویەتی: لە چەند ڕێگەیەکەوە گێڕدراوەتەوەو یەکتری بەهێز دەکەن. جا ئیمام (ابن سَعْد) فەرموویەتی: ئەم مەڕەی (أُمِّ مَعْبَد) بەردەوام شیری تێدا بوو و سبەینەو ئێواران دەیاندۆشی، تـا لـه سـاڵی هەژدەی کۆچی لە سەردەمی ئیمام (عمر)داﷺ مەڕەکە مرد.**

**ئیمامی (البيهقي)ش (بسند حسن) گێڕاویەتیەوە: (أُمِّ مَعْبَد) بزنو مەڕی زۆر بـونو ڕۆژێـك جەڵەبێکی هێنا (مَدِينَة) بۆ فرۆشتن، لـەوێ کوڕەکـەی چـاوی بـه ئیمـام (أَبُـوبَكْر) کـەوتو ناسییەوەو گوتی: دایە ئەمە پیاوەکەیە کە-لە خێمەکەمان- لەگەڵ پیـاوە موبارەکەکـەدا بـوو، جـا ئێمـام (أَبُـوبَكْر)ﷺ (أُمُّ مَعْبَـد)ی بـردە لای پێغەمبـەرﷺ پێغەمبـەریشﷺ میواندارییی کرد و جلوبەرگو شتیتریشی پێبەخشیو موسوڵمان بوو-مەروەك باسمان کرد- جا (أُمُّ مَعْبَد)ش هەندێك کەشکی پێشکەش بـه پێغەمبـەرﷺ کـردن.** (البدايـة والنهايـة) ب(٢) ل(١٩٧) و(الخصائص الكبرى) ب(١) ل(١٨٩).

**لە بارەی (مُعْجِزَة)کانی کۆچکردن، (عاجز) فەرموویەتی:**

**کافـر و شـەیتـانی لـەعیـن * هـاتـن لـە دویان چین بە چین**
**هـەتـا لــۆ (غـار)ێ داوەرین * ئـەو (غـار)ی پڕ (أنْوار)ی مـن**
**کــە دیتیان تەونی (عَنْكَبُوت) * کـۆتـر لـه هـێـلانه بە جـووت**
**گـەڕانــەوە لــە فـایـدە ڕووت * نــەیـانـدەدیـت نـازداری مــن**
**کـە هـات (سُراقَـة) زۆر بـە تاو * هەڵیکوتـا سـەر هـەردوو لاو**
**وەکو (قارُون) خۆی دی بە چاو * ڕەحمـی نـەکرد بـە یـاری من**
**ئەو مـەڕەی دایکـی (مَـعْبَد)ی * کـە پێشـان شیریان لێنەدی**
**کە دەستی دایێ (أَحْمَد)یﷺ * بـوو بـە ڕووبـاری جاری من**

**حەفتەم: گەورەیی مزگەوتی (قُباء)، پێغەمبـەرﷺ لـەو ماوەیـەی لـە (قُبـاء) مایـەوە،**

مزگەوتی (قُباء)ی دامەزراندو نوێژیشی بە جەماعەت تێدا کرد.
خوایگەورە لە مەدحی مزگەوتی (قُباء)و موسوڵمانانی (قُباء) دەفەرمووێ: ﴿لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَنْ تَقُومَ فِيهِ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا وَاللهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ﴾ التوبة:١٠٨، مزگەوتێك كە لە یەكەم ڕۆژی هاتنی پێغەمبەرداﷺ لە سەر لەخواترسی دامەزراوە، شیاوترە نوێژی تێدا بكەی، لەو مزگەوتەدا هەندێ پیاوی موسوڵمانی لەخواترس هەنە پێیان خۆشە خۆیان پاكو خاوێن ڕابگرن، خوای گەورە پاكو خاوێنەكانی خۆش دەوێن. ﴿عن أبي هُرَيْرَة‌رضي الله عنه: نَزَلَتْ هَذِهِ اْلآيَةُ-فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا-فِي أَهْلِ قُبَاءَ؟ كَانُوا يَسْتَنْجُونَ بِالْمَاءِ﴾حديث صحيح رواه أبوداود والطبراني، ئەم ئایەتە دەرحەق خەڵكی (قُباء) هاتە خوارەوە. جا پێغەمبەرﷺ لێی پرسین: خوایگەورە مەدحی ئێوەی بە پاكی كردوە، ئەم پاكییەی ئێوە چییە؟ گوتیان: ئافرەتو پیاوەكانمان تارەت بە ئاو دەكەن.
جا بزانە: مزگەوتی (قُباء) یەكەم مزگەوتە لە ئیسلامدا: كە پێغەمبەرﷺ بە ئاشكرایی نوێژی بە جەماعەتی بۆ (صَحابَة)كان تێدا كردوە، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿صَلاةٌ فِي مَسْجِدِ قُباءَ كَعُمْرَةٍ﴾ حديث صحيح رواه الترمذي والنسائي، خێری نوێژێك لە مزگەوتی (قُباء)دا وەكو خێری عومرەیەكە. ﴿وَعَنْ ابْنِ عُمَرَ-رضي‌الله عنهما- كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ يَأْتِي مَسْجِدَ قُباءَ كُلَّ سَبْتٍ ماشِياً وَراكِباً﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ هەموو شەممەیەك بە پیادەییو بە سواری لە (مَدِينَة)وە دەهاتە مزگەوتی (قُباء) نوێژی تێدا دەكرد. (تفسير ابن كثير) التوبة (١٠٨) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٣٠٦).

**هەشتەم: پێغەمبەرﷺ لە گەڕەكی (رانُوْناء)دا نوێژی (جُمُعَة)ی بە موسوڵمانان كرد.**

ئەمەیان یەكەم (جُمُعَة) بوو كە پێغەمبەرﷺ لە (مَدِينَة)دا كردویەتی، ئەم مزگەوتەش پێی دەگوترێ: (مَسْجِدُالْجُمُعَة)=مزگەوتی(جُمُعَة). كەوابوو: وتارەكەشی یەكەم وتاری(جُمُعَة)ی پێغەمبەرەﷺلە ئیسلامدا، جا لە خوتبەكەیدا باسی لەخواترسانو چاكە كردنو خێر كردنو خۆشەویستنی نێوان یەكتریو ڕاستگۆیی كردو لە كۆتایی وتارییەكەمدا فەرمووی: ﴿اَلسَّلامُ عَلَى رَسُولِ اللهِ وَبَرَكاتُهُ﴾. لە كۆتایی دووەمەكەشدا فەرمووی: ﴿اَلسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ﴾. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢١٨) و(السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٨١).

**نۆیەم: پێكهاتەی شاری (مَدِينَة) لە كاتی كۆچكردنی پێغەمبەرداﷺ، لە گەڕەكی (بَنِيالنَّجَّار) لە پێش ماڵی حەزرەتی (أَبُوأَيُّوبِ الأنْصارِي) وشترەكەی پێغەمبەرﷺ مۆڵكەوت.**

بزانە: پێش كۆچكردنی پێغەمبەرﷺ (مَدِينَة) ناوی (يَثْرِب) بوو، ئینجا كە پێغەمبەرﷺ هات، بە فەرمانی خوا ناوی لێنا: (اَلْمَدِينَة)، (طابَة)، (طَيْبَة).

جا له كاتی كۆچكردنی پێغەمبەرداﷺ شاری (مَدِينَة) له نۆ گـەڕەكی گـەورەی سـەربەخۆ پێك دەهات له شێوەی چەند گوندێكی پێكوەنوساو، هەر گەڕەكێكیش بنەماڵەیەكی تـێدا نیشتەجێ بوو، دانیشتووانی (مَدِينَة)ش: جولەكەو عەڕەبەكانی بتپەرست بون، بەم جۆرە:

***جولەكەكان** سێ بـەرەباب بـون: (**بَنُوقَيْنُقـاع**)و (**بَنُوالنَّـضِير**)و (**بَنُوقُرَيْظَـة**)، جـا ئـەم جولەكانە پەیمانی جەنگ نەكردنیان لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ مـۆر كـرد، بـەڵام لـە ئەنجامـدا پەیمانەكەیان شكاند، هەروەك لە باسی غەزایەكاندا ڕوونی دەكەینەوە، ان شاء الله تعالی.

***عەڕەبـەكانیش** دوو بـەرەبابی گـەورە بـون: (**اَلأَوْس**)و (**الْخَـزْرَج**)، ئـەم دوو بەرەبابـە بتپەرست بونو ماوەیەكی زۆر بوو دوژمنی یەكتری بونو جەنگ له نێوانیاندا هەڵدەگیرسا، تا زۆر پیاوی گەورەو ڕێزدار له هەردوو لایان كوژران، بەڵام خوا ڕەحمی پـێكردنو هەردوو لا موسوڵمان بونو به سایەیئیسلام بونە برای یەكتریو دوژمنایـەتی لـە نێوانیانـدا نـەماو خواو پێغەمبەرﷺ ناویان لێنان: (**اَلأَنْصار**)= **پشتیوانەكان**.

جا ئەم دوو بەرەبابەش بوبوونە چەند بنەماڵەیـەك، هـەر گـەڕەكێك بـە نـاوی بنەماڵەكـەی خـۆی نـاو دەبـرا، ئینجا خوایگـەورە گـەڕەكی (بَنِىالنَّجَّـار)ی بـۆ پێغەمبـەری خـۆیﷺ هەڵبژارد، چونكە دایكی (عَبْدُالْمُطَّلِب)ی بـاپیری پێغەمبـەرﷺ خـەڵكی (مَدِينَـة) بـوو و لـە بنەماڵەی (بنىالنَّجّار) بوو—كە لقێكـی هـۆزی (اَلْخَـزْرَج) بـون— هـەر بـۆیش پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: ﴿أَنْزِلُ عَلَى بَنِىالنَّجَّارِ أَخْوالِ عَبْدِالْمُطَّلِبِ أُكْرِمُهُمْ بِذلِكَ﴾ رواه مسلم، **من لـە لای بنەماڵەی (بَنِىالنَّجّار) دادەبەزم كە ماڵە خاڵەكانی (عَبْدُالْمُطَّلِب)ی باپیری منن، بەم دابەزینەم ڕێزیان لێدەنێم**.

ئینجا كە پێغەمبەرﷺ لە پێش ماڵی حەزرەتی(أَبُوأَيُوب)ﷺ دابەزی، چـەند كیژۆڵەیـەكی (بَنِىالنَّجّار) بە دەف لێدانەوە هاتنە دەرەوەو دەیانگوت:

(**نَحْنُ جَوارٍ مِنْ بنِى النَّجّارِ * يا حَبَّذا مُحَمَّدٌ مِنْ جارِ**) ئێمـە چـەند كیژۆڵەیـەكین لـە بنەماڵەی (النَجَّار)، لە دراوسێیەكان (مُحَمَّد) دراوسـێیـەكـی باشـە. جا پێغەمبـەرﷺ لێی پرسین: **منتان خـۆش دەوێ؟** كیژۆڵەكانیش گوتیان: ئـەرێ وَالله ئـەی پێغەمبـەریخوا. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿يَعْلَمُ اللهُ أَنَّ قَلْبِى يُحِبُّكُنَّ﴾ رواه ابن ماجه، **خوا دەزانێ دڵی منیش ئێوەی خۆش دەوێ**. (البداية والنهاية) ب (٢) ل(١٥٣و٢٠١و٢٠٥و٢٠٨) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(١٦٢).

### ﴿حەزرەتی(أَبُو أَيُّوب الأَنْصارِي)ﷺ كێیە؟﴾

نـاوی (خالـد بـن زَيْـد النَّجّـارِي الأنـصاري)یـە، لـە پـەیمانی (اَلْعَقَبَـة)و گـشت غەزایـەكانی پێغەمبەرﷺ ئامادە بووە، مـاوەی حـەفت مـانگ میوانـداری پێغەمبـەریﷺ كـردوە، لـە غەزای (خَيْبَر)ش—لەو شەوەی پێغەمبەرﷺ له حەزرەتی(صَفِيَّة)یهاوسەری-رضیالله عنها- بووە زاوا— تا بەیانی پاسەوانی خێمەكەی پێغەمبەرﷺ بوو، جا پێغەمبەرﷺ دوعای بۆ كـردو

فەرمووی: ﴿اَللّهُمَّ احْفَظْ أَبا أَيُّوب كَمــا بــاتَ يَحْفَظُنــي﴾ **خوایە (أبُوأيُّوب) بپارێزە، هەروەك ئەو بە درێژایی شەوێ منی پارستووە.**

جا خوایگەورە دوعایەکەی پێغەمبەری ﷺ قبولّ کرد: لەو کاتەی لە سالّی پەنجای کۆچیدا موسولّمانان لە غەزای (القُسْطَنْطِينِيّة)=(أَسْتَنْبُول) بون، لەوێ لە ناو دەریـادا حـەزرەتی(أَبُـو أَيُّوب) رضي الله عنه وەفاتی کرد، جا حەزرەتی(أبُوأيُّوب) رضي الله عنه پـێش مـردن وەسـێتی کردبـوو: لـە نـاو خاکی دوژمندا تەرمەکەی بنێژن، بۆیێ لە بن شورەکەی (أَسْتَنْبُول)دا ناشتیان، جا کافرەکان لە سەر شورەکەوە پێیان گوتن: ئێوەی موسولّمان زۆر گێلو نەفامن! چۆن ناترسن کە ئێوە رۆیشتن ئێمە لاشەکەی دەربێنینو بیسوتێنین؟ جا (أَمِير)ی موسولّمانەکان سوێندی خـوارد: ئەگەر ئەم کارە دەرحەق (أبُوأيُّوب) بکەن، هەر کەنیسەیەکی لە نـاو خـاکی عەرەبـدا هەیـە، ئێمەش دەیانسوتێنینو گۆڕەکانیشتان دەردێنین. ئـیتر کافرەکـان ترسـانو بـەخۆیان بونـە پاسەوانی گۆڕەکەی حەزرەتی(أبُوأيُّـوب) رضي الله عنه، خوایگـەورە بـە مـردووەتیش بـە بەرەکـەتی دوعایەکەی پێغەمبەر ﷺ پاراستی، ئێستاش گۆڕەکەی زیارەت دەکرێو مزگەوتێکیـشی لـە سەر دروست کراوە. (البداية والنهاية) ب(٤) ل(٥٤٣) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٦٥).

ئا بەم جۆرە: موسولّمانەکان–بە تەنها گەڤ لێکردنێك– کافرەکانیان تەمبێ کردنو نەوێران دەستدرێژی بکەنە سەر تەرمی موسولّمانێك کە بۆ جەنگی ئەوان هاتووەو لە خاکی ئەواندا نێژراوە، ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر بەغیرەتیو ئازایەتی موسولّمانەکانی ئەو سـەردەم کـە بە فەرمانی ئەم ئایەتە ڕەفتاریان دەکرد، کە خوایگـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَلْيَجِدُوا فِــيكُمْ غِلْظَةً﴾ التوبة: ١٢٣، **با کافرەکان توندوتیژی لە ئێوە ببینن.**

***بەلاّم–بە داخـەوە–موسـولّمانەکانی ئێستا بە پێـچەوانەن، (إنّا لله وإنّا إليه راجعـون).***

**جا بزانـە:** بەم غەزایە شاری (القُسْطَنْطِينِيّة)=(أَسْتَنْبُول) ڕزگار نەکراو هەر لە ژێر دەستی کافرەکانـدا بـوو، تـا (مُحَمَّد الْفـاتِح)–کـە خەلیفـەی دەولّـەتی(العُثمـاني) بـوو– لـە ڕۆژی سێشەممە (٢٠)ی(جماديالأولى) سالّی(٨٥٧)یکۆچی، ڕزگاری کـردو بـووە (دارُالإسْـلام)، جا لەم غەزایەدا زانای کوردی بە ناوبانگ: مەولا (أَحْمَد بِن إِسْماعِيل الگـوْراني)و شـێخ (آق شَمْس الدِّين)–کە هەردووکیان مامۆستای (مُحَمَّد الْفـاتِح) بـون–ڕاوێـژکاری (مُحَمَّـد الْفـاتِح) بونو لەگەلّ چـەند زانایـەکیتری پایـە بـەرز، ڕاسـتەوخۆ بەشـداری غەزایەکـەیان دەکـرد، پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئەم غەزایـە فەرموویـەتی: ﴿لَتُفْتَحَنَّ الْقُسْطَنْطِينِيَّةُ فَلَنِعْمَ الْأَمِيرُ أَمِيرُها وَلَنِعْمَ الْجَيْشُ ذلِكَ الْجَيْشُ﴾رواه الإمام أحمد والبزار والطبراني وصححه الحاكم وقالَ الحافظ الهيثمي: رجاله ثقات، **(القُسْطَنْطِينِيّة) ڕزگار دەکرێ، لە ڕەگەزی ئەمیر ئەمیرەکەی ئـەوێ ئـەمیرێکی باشە، لە ڕەگەزی لەشکریش ئەو لەشکرە باشە کە (القُسْطَنْطِينِيّة) ڕزگار دەکا.**

جا لە دوای ئەم سەرکەوتنە ڕۆژێك (مُحَمَّد الْفاتِح) بە شێخ (آق شَمْس الدِّين)ی گوت: منیش

له لای تۆ دێمه ناو (خَلْوَة)! ئەویش ڕێگای نەدایێو فـەرمووی: ئەگـەر بێیـە نـاو (خَلْـوَة)، دەسەڵاتداری له بەرچاوت دەکەوێو کاروباری دەسەڵاتیئیسلام تێك دەچێو خوایگەورە لێمان توڕە دەبێ، مەبەستیش له (خَلْوَة): دادپەروەرییە. واتە: دادپەروەری بە کار بێنە.
(مجمع الزوائد ومنبع الفوائد) ب(٦) ل(٢٣٤) و(الدولة العثمانية، للصلابي) ل(٨٠–١٠٥).

*بەڵێ: کاتێخۆی زانایانی ئایینیو شێخانی (طَرِيقَة)، ئـەوها دڵسۆزو (مُجاهِـد)و گیانفیـدای ئیسلام بون،–وەکو ئێستا–پاشکۆی حیزبەکانو زەلیلی بەر دەرگەی ستەمکاران نەبون.*

**نۆیەم: حەزرەتی (أَبُو أَيُّوب الأنْصارِي)و هاوسـەرەکەی لـە شـوێنی پەنجە پیرۆزەکـانی پێغەمبەریانﷺ دەخوارد، تاکو بەرەکەتیان پێبگا.**

ئەم حەدیسە لە (صحيح مسلم)دا لە (باب إباحَةِ أكْلِ الثُّوم) گێڕدراوەتـەوەو بەڵگەیـە: لـە سەر بەرەکەت وەرگرتنی (صَحابَة)کان لە ئاسەواریپێغەمبەرﷺ، هەم ﴿عَنِ الْمِسْوَرِ ومَرْوانَ –فِي قِصَّةِ الْحُدَيْبِيَّة– قالَ عُرْوَةُ: فَوَاللهِ ما تَنَخَّمَ النَّبِيُّﷺ نَخامَةً إلاّ وَقَعَتْ فِي كَـفِّ رَجُـلٍ مِنْهُمْ فَدَلَكَ بِها وَجْهَهُ﴾ رواه البخاري فی الشروط، **(عُرْوَة) گوتی: وَاللهِ پێغەمبەرﷺ هەر تفێکی فڕێدابا، دەکەوتە دەستی یەکێك لە (صَحابَة)کانیو ڕووی خۆی پێ چەور دەکرد، واتە: تاکو بەرەکەتی پێبگا.**

**جا هەروەك لە ژیانی پێغەمبەرداﷺ (تَوَسُّل)ی پێکراوە، لە دوای وەفاتیشی (تَوَسُّل)ی هەر پێکراوە** ﴿عن عُثْمان بن عَبْدِاللهِ: أَرْسَلَنِي أَهْلِي إلَى أُمِّ سَلَمَةَ رضیالله عنها بِقَدَحٍ مِنْ ماءٍ مِـنْ قُصَّةٍ فِيها شَعَرٌ مِنْ شَعَرِ النَّبِيِّﷺ، وَكانَ إذا أَصابَ الْإنْسانَ عَيْنٌ أَوْ شَيْءٌ بَعَثَ إلَيْها مِخْضَبَهُ﴾ رواه البخاري فی الشيب، **لە ماڵەوە منیان ناردە لای (أُمُّ سَلَمَة)ی هاوسەری پێغەمبەرﷺ، پیاڵە ئاوێکم پێ بوو، چەند موویێکی پێغەمبەریﷺ تێدا بوو، ئەگەر کەسێك چاوێنی، یان نەخۆشیەکی تووش بوبا، قاپێکیان دەناردە لای (أُمُّ سَلَمَة)**رضیالله عنها، **تاکو مووەکانی پێغەمبەریﷺ بۆ بخاتە ناو قاپە ئاوەکە. واتە: نەخۆشەکە (تَوَسُّل)ی بە مووەکانیپێغەمبەرﷺ دەکردو ئاوەکەی دەخواردەوەو بە بەرەکەتی پێغەمبەرﷺ شیفای بۆ دەهات.**

﴿وَعَنْ أَسْماءَ–رضي الله عنها–: هَذِهِ جُبَّةُ رَسُولِ اللهِﷺ...كانَ يَلْبَسُها، فَنَحْنُ نَغْسِلُها لِلْمَرْضَى يُسْتَشْفَى بِها﴾ رواه مسلم فی اللباس، **حەزرەتی(أسماء)**–رضي الله عنها–**فەرمووی: ئەمە (جُبَّة)کەی پێغەمبەرەﷺ کە زیندوو بوو دەبەری دەکرد، ئێستاش ئێمە بۆ نەخۆشەکان دەیشۆینو بە ئاوشۆرەکەی شیفایان بۆ دێ.**

**ئیمامی(النواوي) فەرموویەتی: ئەم حەدیسە بەڵگەیە: کە بەرەکەت وەرگرتن سوننەتە بە ئاسەواری پیاوچاکانو جلەکانیان.** (شرح صحیح مسلم) ب(٨) ل(٣١٩و٣٥٧) و(فتح الباري) ب(١٠) ل(٢٣٤). جا لە (العقيدة الطحاوية)و (گوڵزاری ئیسلام)دا ئەم باسەم درێژتر ڕوون کردۆتەوە.

**دەیــەم: پێغەمبــەرﷺ ئــەو خواردنــەی ســیری تــێدا بــوو، نــە یخوارد و فــەرمووی:** ﴿أَنَا رَجُلٌ أُناجِی﴾ **من پیاوێکم (مُناجاة) لەگەڵ (مَلائِکَة) دەکەم. ئـەم حەدیـسەش بەڵگەیە: هەر کەسێك تێکەڵی خەڵك ببێ، نابی سیر و شتیتری بۆن ناخۆش بخواو نابی بۆنی ناخۆشی لێبێ؟ نەوەك بەو بۆنە ناخۆشە خەڵکی ئازار بدا، هەر بۆیش پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی:** ﴿مَنْ أَکَلَ ثُوماً أَوْ بَصَلاً فَلْیَعْتَزِلْنا–أَوْ فَلْیَعْتَزِلْ مَسْجِدَنا– وَلْیَقْعُدْ فِی بَیْتِهِ﴾ رواه الشیخان، **هەر کەسێك سیر، یان پیازی خوارد با خۆی لـە ئێمـە دور بگرێو نەیەتـە مزگەوتو نوێژمان لەگەڵ نەکا، با لە ماڵیخۆی دابنیشێ و نوێژەکەی بکا.**

**جـا بزانــە:** بـە (إجْمـاع)ی زانایانیئیـسلام: خـواردنی سـیر حەڵاڵـە، بـەڵام پێویـستە سیرخۆرەکە خۆی لە ئازاردانی خەڵك بپارێزێ، هەموو بۆن ناخۆشێکیتریش بڕیاری سیری بۆ دەدرێ. (شرح صحیح مسلم) ب(٣) ل(٣١٦) ب(٨) ل(٣١٧).

## ﴿ گەنجی موسوڵمان گیانفیدای ئیسلامەو لە لای خودا ڕیزدارە ﴾

دەمەوێ: لەم گوڵزارەدا لەگەڵ گەنجە موسوڵمانەکان–کـچوکاڵو کوڕوکـاڵ– گفتوگۆیـەکی هێمنانـە بکـەمو بۆیـان ڕوون بکەمـەوە: ئـەوان لـە لای خـودا چـەند ڕێـزدارن!، چـونکە پێغەمبەرﷺ مەدحی گەنجەکانی کردوەو ڕێزی لێنـاونو فەرموویـەتی: ﴿أُوصِیکُمْ بِالشُّبّانِ خَیْراً–ثَلاثاً– فَإنَّهُمْ أَرَقُّ أَفْئِدَةً، أَلا وَإنَّ اللهَ أرْسَلَنِی شاهِداً وَبَشِیراً وَنَذِیراً فَحــالَفَنی الــشُّبّانُ وَخالَفَنی الشُّیُوخُ﴾ أورده الشیخ إسْماعِیل حقي البرسوی فی تفسیر روح البیان، **ئامۆژگاریتان دەکەم لەگەڵ گەنجەکان باش بن–سێ جاری وای فەرموو– چونکە ئەوان دڵیان ناسکترە، ئاگادار بن: خوایگەورە منی نارد بە پێغەمبەریکی شاهیدو موژدەدەرو ترسێنەر، جا گەنجەکان بە بێگەردی هاوپەیمانییان کردمو پیرەکانیش دژایەتییان کردم.** ژیانی پێغەمبەرﷺ ١٢
بڕوانە (تفسیر روح البیان) الروم: (٥٤) و(صوت الإسلام، مُحَمَّد محمودالصواف) ل(٦٨).

**هـەروەها لـە حەدیـسەکەیڕابردووشدا حـەزرەتی (أَنَـس)ﷺ فـەرمووی:** ﴿لَــیْسَ فِــی أَصْحابِهِﷺ أَشْمَطُ غَیْرَ أَبیبَکْــرٍ﴾ رواه البخاري، **کە پێغەمبـەرﷺ کۆچی کرد، لە ناو (صَحابَة)کانیدا هیچ پیاوێکی وەها نەبو: مـوی سـپیی لێدەکەوتبێ جگـە لـە ئیمام (أَبُوبَکْر)ﷺ.**

**کەوابوو: بۆمان ئاشکرا بوو: گەنجی موسوڵمان–کچوکاڵو کوڕوکاڵ–گیانفیـدای ئیـسلامە، هەر بۆیش خوایگەورە ئەو ڕێزەیداهاتووی لێناوە.**

**تەماشای حەزرەتی(أَسْماء) کیژی ئیمام (أَبُوبَکْر)**–رضیالله عنهما–**بکە: چۆن–ئەم کچۆکاڵە دڵسۆزو خواپەرسـتو نەترسـە– بـە سـەر بـەردە ڕەشو گەرمـەکانی (مَکّة)دا هاتوچـۆی دەکـردو ئێواران دەچووە ئەشکەوتەکەو خواردنو ئاوی دەگەیاندە پێغەمبەروﷺ باوکی!، خۆ ئەم کــچوکاڵە مانــدوو نەناســـ لــە هــەمان کاتیشدا بە جەرگو نەترسیش بوو؟ لەو**

کاتەی (أَبُوجَهْل) لەپەدەستی لێداو گوارەکەی لە گوێی هەڵوەراند، ئەو هیچی نەدرکاندو هیچ نهێنی‌یەکی ئاشکرا نەکرد، جا ئەتۆش ئەی کچوکاڵی موسوڵمان ئەوها نەترس‌و خۆڕاگر بەو بۆ خزمەتی ئیسلام ماندووەتی مەناسەو نهێنیی موسوڵمانانیش ئاشکرا مەکە.

جا ئەگەر بەڵایەکیشت بە سەر هات، ئەو کات تەماشای حەزرەتی(أُمِّ سَلَمَة) بکە: چۆن تا ماوەی ساڵێك لە کوڕ و مێردەکەیﷺ جیا کراوەو هیچ ناشوکریی نەکردو ئایینەکەشی هەر بەهێزتر دەبوو، هەر بۆیش خوایگەورە گەورەترین پلەی دایێ؟ لەو کاتەی لە (مَدِينَة) مێردەکەی مرد، پێغەمبەرﷺ لەخۆی مارەکردو بووە دایکی ئیمانداران! -رضي‌الله عنها-، هەروەك لە گوڵبژێرەکەی غەزای (بني‌النضير)دا باسی دەکەین، إن شاء الله تعالى.

ئەی کچوکاڵی خواپەرست، ئەی بۆچی تەماشای حەزرەتی(سُمَيَّة)ی دایکی (عَمّار) ناکەی: چۆن خۆیو مێردو کوڕەکەیﷺ لە گەرمایی (مَكَّة)دا ئازار دەدران و لێیان دەدرا؟ تا بەخۆی بووە یەکەم شەهید لە ئیسلامدا.

هەروەها تۆش–ئەی کوڕوکاڵی خواناس– بۆچی تەماشای چوستو چالاکیی حەزرەتی (عامِر)ی شوانو حەزرەتی(عبدالله)ی کوڕی ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ ناکەی؟ بۆچی تەماشای نەترسیو لێهاتوویی شێری خودا–ئیمام (علیﷺ)–ناکەی؟.

ئەی لاوی موسوڵمان: لەو کاتەی بە ڕیشە ڕەشەکەتەوە دەتبینم لە دژی (شِرْك)و بتپەرستی ڕادەپەڕی، ئەبێ حەزرەتی(إِبْراهِيم) پێغەمبەری گەنجی بتشکێنمﷺ بێتەوە یاد؟ کاتێ بتەکانی شکاندنو کافرەکان گوتیان: کێ وای لە خوایەکانی ئێمە کردوە؟ ﴿قَالُوا سَمِعْنَا فَتىً يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْراهِيمُ﴾ الأنبياء: ٦٠، **گوتیان: گوێمان لێبوو گەنجێك بە خراپە باسی خوایەکانی ئێمەی دەکرد، ئەوگەنجە پێی دەگوترێ: (إِبْراهِيم).**

خۆ لەو کاتەش بە داوێنپاکیو ڕاستگۆییەوە دەتبینم، ئەوە حەزرەتی (يُوسُف) پێغەمبەری گەنجی ڕاستگۆو داوێنپاکم دێتە بەر چاوﷺ کاتێ لە ترسی بێناموسی ڕایکردو کراسەکەی دڕێندرا، ژنەکانی (مِصْر) گوتیان: ﴿اِمْرَأَتُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَنْ نَفْسِهِ﴾ يُوسُف: ٣٠، **ژنەکەی عەزیزی (مِصْر) پەلاماری گەنجە خزمەتکارەکەیخۆی دەدا و داوای داوێنپیسیی لێدەکا.**

خۆ لەو کاتەش کە دەتبینم لە دژی (طاغُوت)و ستەمکاران ڕادەپەڕیو ماڵو خزمو کەسەکانت بەجێ دێڵی، ئەوە گەنجەکانی ئەشکەوت=(أَصْحابُ الْكَهْف)م دێنەوە یاد، کە خوایگەورە بە گەنج ناویان ئەهێنێو دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ﴾ الكهف: ١٣، **ئەوان کۆمەڵە گەنجێك بون باوەڕیان بە خوایخۆیان هێنابوو.**

جا ئەی لاوی موسوڵمان–کچوکاڵ، کوڕوکاڵ– کە ئێوە لە سەرەتای گەنجایەتی‌دا ژیانی هاوسەریەتی پێك دێنن، شەیتان دەتۆقێو قوڕ بە سەرخۆی دەکا، پێغەمبەرﷺ

فەرمویـەتی: ﴿أَيُّما شابٍّ تَزَوَّجَ فِي حِداثَةِ سِنِّهِ عَجَّ شَيْطانُهُ: يَا وَيْلَتَى عَصَمَ مِنِّي دِينَــهُ﴾ رواه الطبراني، **هـەر کـەنجێك لـە حاڵـەتی تـازە پێگەیـشتندا ژن بێنـێ، یـان شـو بکـا، شەیتانەکەی هاوار ئەکا: قوڕم بەسەر، ئاینەکەی خۆی لە من پاراست.**

ئەی لاوی موسوڵمان-کچوکاڵ، کوڕوکاڵ- تەماشای پاداشـتو ڕێزداریـی خـۆت بکـە: لـە مەیدانی (مَحْشَر)، تۆ گەڕمایی و دڵتەنگی مەحشەر نابینی؟ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لا ظِلَّ إِلاّ ظِلُّهُ...وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عُبَــادَةِ رَبِّــهِ﴾ رواه الشيخان، **حەفت جۆرە کەس هەنە خوایگەورە لە ڕۆژی قیامەت لە سێبەری (عَرْش)ی خۆی دایاندەنێ کە جگە لـە سـێبەری وی هـیچ سـێبەرێکیتر نیـە، یـەکێك لـەو حـەفت کەسـانە: گەنجێکـە لـە خواپەرسـتیدا پێگەیـشتبێ و گەنجایـەتیخۆی لـە خواپەرستیدا بەسەر بردبێ.**

ئەی گەنجی موسوڵمان-کچوکاڵ، کوڕوکاڵ- بەهەشـت بـە گەنجـەکانیش ڕازاوەتـەوەو بـە هاونشینی گەنجان خۆش بووە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿يَدْخُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ اَلْجَنَّةَ جُرْداً مُرْداً مُكَحَّلِينَ أَبْناءَ ثَلاثِينَ أَوْ ثَلاثٍ وَثَلاثِينَ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، **بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشت، هیچ موویان بە لاشەیانەوە نیەو ڕیشیان نیەو چاویان ڕەشە، هەموویان گەنجی تەمەن سی، یان سیوسێ ساڵین.**

کەوابوو: ئەی گەنجی موسوڵمان-کچوکاڵ، کوڕوکـاڵ- ئـەو مێـرگو گـوڵزارەی خـوا بـۆی داناوی بە ئاگری تاوانەکان وشکی مەکەو مەیسوتێنە، ئەگەر تا ئێـستاش تاوانکـار بـووی، ئەوە دەرگای تۆبە بەردەوام کراوەتەوەو دانەخراوە، تۆبە بکەو بگەڕێوە لای خودا، خـودا بە لێبوردنەوە پێشوازیت لێدەکاو لە تاوانەکانت عەفوت دەکا، تەماشا بکـە: خـوایگـەورە شـانازی بـە تـۆ لـە سـەر (مَلائِكَة)ی خـۆی دەکـاو لـە حەدیـسی (قُدْسِي)دا دەفـەرموێ: ﴿أَيُّها الشّابُّ التّارِكُ شَهْوَتَهُ لِي، الْمُبْتَذِلُ شَبابَهُ مِنْ أَجْلِي أَنْتَ عِنْدِي كَبَعْضِ مَلائِكَتِــي﴾ رواه الأئمـة: أحمـد وابـن المبـارك وأبـوداود-كلـهم-في الزهـد، **ئـەی ئـەو گەنجـەی لـە ترسـی مـن واز لـە شـەهوەتە حەرامەکـەی دونیـا دێنـی و گەنجایـەتیخۆت بـۆ مـن بـە کـار دێنـی و دەیبەخشی، تۆ لە لای من وەك هەندێك (مَلائِكَة)یخۆمی.**

هەروەها ئاگادار بە: بە دۆستایەتی پیاو خـراپو سـتەمکاران دۆسـتایەتی خـوا لـە دەسـت مەدە، بەردەوام-بۆ خودا- دۆستایەتی پیاوچاکان بکە، (مريح بن مسروق) فەرموویـەتی: **(ما مِنْ شابٍّ يَدَعُ لَذَّةَ الدُّنْيا وَلَهْوَها وَيُعْمِلُ شَبابَهُ لِلّهِ تَعالى إلاّ أَعْطاهُ اللهُ تَعالى مِثْلَ أَجْرِ اثْنَيْنِ وَسَبْعِينَ صِدِّيقاً)** رواه ابن المبارك في الزهد، **هەر گـەنجێك واز لـە تـامو خۆشیە حەرامەکانی دونیا بێنێو گەنجایەتیخۆی بۆ خوا بە کار بێنێ، خوای گەورە وەك پاداشتی حەفتاو دوو ڕاستگۆی دەداتێ.**

کەوابوو: ئەی لاوی موسوڵمان–کچوکاڵ، کوڕوکاڵ– تۆش گەنجایەتیخۆت بۆ خوا بە کار بێنەو زۆریش ئاگاداری خۆت بە؟ فێڵبازەکان هەڵتنەخەڵەتێننو بۆ مەبەستیخۆیان، یان بۆ کاری حیزبایەتی بە کارت نەهێنن، تەمەنی گەنجیت بە فیڕۆ نەدەنو بە قسەی سەرقۆزو بن ئالۆز–بە ناوی ئیسلام– فێڵت لێنەکەنو (بِدْعَة)ت لێ نەکەنە (سُنَّة)و (سُنَّة)ت لێ نەکەنە (بِدْعَة)، چونکە کاری ئیسلامەتیو کاری حیزبایەتی زۆر لێك جیاوازن؟ حیزب بە بەرنامە داڕێژراوەکەی خۆی ڕەفتار دەکا، ئیسلامیش بە (قُرآن)و (حَدِيث)و فەرموودەکانی زانایانی (مُجْتَهِد) ڕەفتار دەکا، ئیتر ئەم ئامۆژگاریەم لێوەربگرەو دوعای چاکیش بۆ من بکە.

**﴿ بەڵام ڕیش سپیی موسوڵمانیش واجبە: ڕێزی لێبندرێ ﴾**

**گوتمان: ئەوەی پێغەمبەری ﷺ نەدیتبوو، سەلامی لە ئیمام (أَبُوبَکْر)ﷺ دەکرد، چونکە ئەو ڕیشی سپی بوو. ئەوەش بەڵگەیە: کە یەکێك لە ڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلام ئەوەیە: ڕێز لە ڕیش سپیی موسوڵمان بندرێ، واتە: لە ڕۆیشتندا وەپێش بکەوێو لە دانیشگەدا لە لای سەرەوە دابنیشێو لە کاتی هاتنیدا لە بەری هەڵبستنو لە گفتوگۆدا بە گەورە دابندرێ. جا لە بەر ئەوەی ڕیش سپیی موسوڵمان لە ئیسلامدا زۆر ڕێزی هەیە، پێغەمبەر ﷺ زۆر بایەخی پێداوەو ئامۆژگاری ئوممەتی کردوە ئەم ڕەوشتە بەرزە بە جێ بێنن، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ﴿إِنَّ مِنْ إِجْلاَلِ اللهِ تَعَالَى إِكْرامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ، وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغالِي فِيهِ وَالْجَافِي عَنْهُ، وَإِكْرامَ ذِي السُّلْطانِ الْمُقْسِطِ﴾ رواه أبوداود بسند حسن، **بە شێك لە بە گەورە ناسینی خوا ئەوەیە: ڕێز لە ڕیش سپیی موسوڵمان بندرێ، ڕێز لەو قورئانخوێنەش بندرێ کە لە سنوری قورئان تێناپەڕێو لێیشی دور ناکەوێتەوە، ڕێز لە کاربەدەستی دادپەروەر بندرێ.**

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ﴿مَا أَكْرَمَ شَابٌّ شَيْخاً لِسِنِّهِ إِلاّ قَيَّضَ اللهُ لَهُ مَنْ يُكرِمُهُ عِنْدَ سِنِّهِ﴾ رواه الترمذي وقال حديث غريب، **هەر گەنجێك ڕێز لە پیرێك بنێ بە هۆی بەساڵداچوونەکەی، خوایگەورە یەکێیش بۆ وی دادەنێ لە کاتی بەساڵداچوونیدا ڕێزی لێبنێ. هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ﴿لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنا وَ يَعْرِفْ شَرَفَ كَبِيرِنا﴾ حديث صحيح رواه أبوداود والترمذي، **ئەو کەسە لە سەر ڕێبازی ئێمە نیە: کە بەزەیی بە بچوکەکەماندا نەیێو ڕێز لە گەورەکەمان نەنێ.**

**جا لە بەر ئەوەی مووی سپی ئەوەندە ڕێزدارە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ﴿لا تَنْتِفُوا الشَّيْبَ فَإِنَّهُ نُورُ الْمُسْلِمِ يَوْمَ الْقِيامَةِ﴾ حديث حسن رواه أصحاب السُّنَن، **مووی سپی دەرمەکێشن، چونکە مووی سپی ڕووناکی موسوڵمانە لە ڕۆژی قیامەت. خودایە: لە ڕۆژی قیامەت ڕووناکیمان بدێ. آمین.**

*** *** ***

## ﴿ بناغە دانانی دەوڵەتی ئیسلام لە (مَدِينَة)ی پیرۆزدا ﴾

ئینجا کە پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانﷺ لە (مَدِينَة) جێگیر بونو دڵنیا بون لەوێ دەحاوێنەوەو کاری ئیسلام لە (مَدِينَة) چەسپا و (مَدِينَة) بووە یەکەم (دارالإسلام)= خانەیئیسلام لە سەر ڕووی زەمین، پێغەمبەرﷺ دەستی بە بنیاتنانی دەوڵەتی ئیسلام کرد، وەك: دروستکردنی مزگەوتیخۆی لە (مَدِينَة)، برایەتی نێوان (مُهاجِر)و (أنْصار)، نووسینی (دُسْتُور)ی دەوڵەتیئیسلام.

جا شان بەشانی ئەم بنیاتنانەش بڕیارەکانی شەریعەتیئیسلام بە (وَحي) بۆ پێغەمبەرﷺ دەهاتو کۆمەڵگەی ئیسلام گەشەی دەکردو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەشاوەترو بەرفراوانتر دەبوو، جا ئێمە لە پێشدا باسی ئەم سێ کارە گرنگانەی پێغەمبەرﷺ دەکەین:

## ﴿ دروستکردنی مزگەوتی پێغەمبەرﷺ لە (مَدِينَة) ﴾

لە باسەکەی کۆچکردندا گوتمان: وشترەکەی پێغەمبەرﷺ لە پێش ماڵی حەزرەتی (أبُو أيُوب ﷺ) لە مشتاغێکدا مۆڵکەوتو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ئێرە هەوارگەیە إنْ شاءَ الله﴾. جا ئەم مشتاغەش ملکی دوو کوڕی یەتیم بوو–کە لە ژێر سەرپەرشتی حەزرەتی (أسْعَد بن زرارَة)دا بون– ئێنجا پێغەمبەرﷺ بڕیاریدا: لەم مشتاغەدا مزگەوت دروست بکا، بۆیێ پێغەمبەرﷺ داوای لە (بَنِیالنَّجّار)–خزمەکانی یەتیمەکان– کرد: ئەم مشتاغەی بە پارە بفرۆشنێ. جا دوو یەتیمەکان گوتیان: یا رَسُولَ الله بێ پارە پێت دەبەخشین. بەڵام پێغەمبەرﷺ بەو بەخشینە ڕازی نەبو، بۆیێ بە (١٠) دە دیناری زێڕ مشتاغەکەی لێکڕینو ئیمام (أبُوبَكْر)شﷺ لە ماڵیخۆی دە دینارەکەی دانێ.

جا ئەم مشتاغەش چەند گۆڕێکی کۆنی کافرەکانو هەم درەختیشی تێدا بون، جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: گۆڕەکان هەڵکەندرانو فڕێدران، درەختەکانیشیان بڕینو لە قیبلەی مزگەوت دایاننان، ئینجا دەستیان بە کارکردن کردو پێغەمبەرﷺ بەخۆیشی کاری تێدا دەکردو خشتی بۆ دیوار دەهێنان.

بناغەی مزگەوتەکەی سێ گەز= ١٫٥م قوڵ کردو دیوارەکانی بە خشتی قوڕ دانانو لا دیواری زارکەکانی بە بەرد دروست کردن، سێ زارکی تێدا کردنەوە: یەکێك لە دواوەی مزگەوت، یەکێك لە لای ڕۆژهەڵات، یەکێك لە لای ڕۆژئاوا، قیبلەکەشی بەرەو (بَيْت المُقَدَّس) بوو، ستونەکانیشی لە نێری دارخورما بوو، بانەکەشی لە لقی دارخورما بوو، جا پێیان گوت: یا رَسُولَ الله بۆچی بانەکەی قوڕ نەدەین؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿عَرِيشٌ كَعَرِيشِ مُوسَى﴾ کەپرێك بێ وەکو کەپرەکەی موسی پێغەمبەرﷺ، واتە: نەوی بێو لە درەختو وردە گیا بێ.

زەمینی مزگەوتەکەش بە ڕمڵو وردە بەرد ڕایەخرا، بەرزیشی لە باڵای پیاوێك زیاتر

بوو، ئینجا لە لای باکوری مزگەوتیش شوێنێك بە تایبەتی سەرپۆش کرا بە ناوی (اَلصُفَة)، بۆ زوگرتیەکانی موسوڵمانان، لە دەورەی مزگەوتیش چەند ژورێك بۆ پێغەمبەرﷺ دروست کران تاکو بەخۆیو خێزانەکانی تیٚدا بحاوێنەوە.
جا ئەوانە گشتی لە ساڵێیەکەمی کۆچیدا تەواو بونو مزگەوتیش هەر ئەوها مایەوە، تا –لە دوای غەزای (خَیْبَر)– لە ساڵی حەفتەمی کۆچیدا، پێغەمبەرﷺ فراوانتری کرد، واتە: پارچە زەویەکی سێسەد مەتری لە تەنیشت مزگەوت بوو، ئیمام (عثمان)ﷺ بە پارەی خۆی کریی‌و دایە مزگەوت، پێغەمبەریشﷺ وەگەڵ مزگەوتی دا.
جا بەم فراوانکردنە ڕوبەری مزگەوتەکە –لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ– بووە ﴿(٥٠ م × ٤٩,٥ م)= (٢٤٧٥) مەتری چوارگۆشەیی، بەرزیی دیوارەکانیشی بووە: (٣,٥)م، زارەکەکانیشی وەك خۆی سیٚ زارك بون، ژمارەی ستونەکانیشی بوونە (٣٥) ستونە﴾.
جا (الحافظ العسقلاني) فەرموویەتی: ئێستا نێوان مینبەری پێغەمبەروﷺ ئەو ژوورەی گۆڕی پێغەمبەریﷺ تیٚدایە: لە پەنجا گەز دوو سیٚیەکی کەمە، واتە: (٢٤م)و (١٦ سم). (فتح الباري) ب(٤) ل(١٣٠) و(السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٨٨–١١٢) و(الاطلس التأريخي لسيرة الرسولﷺ) ل(١٧٠و١٧٢).

## ﴿ گواستنەوەی حەزرەتی ( عائِشَة )-رضي‌الله عنها- بە بوك بۆ پێغەمبەرﷺ ﴾

لە مانگی (شَوّال) لە ساڵێیەکەمی کۆچیدا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(عائشە)ی هاوسەری بە بوك گواستەوە لە (مَدِینَة)، هەر لە ساڵێیەکەمی کۆچی لە مانگی (رَبِیع الآخِر)دا نوێژەکانی ماڵیٚ–جگە لە مەغریبو سبەینیٚ– بونە چوار ڕەکعەتی، لە سەفەریشدا بە دوو ڕەکعەتی مانەوە، هەروەك (البخاري) گێراویەتیەوەو لە نوێەم گوڵبژێری (معراج)دا ڕابرا.(البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢٣٥و٢٣٦)

## ﴿ گوڵبژێریك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: ( مَدِینَـة )ی پیرۆز بووە یەکەم ( دارُ اْلإِسْلام )=خانەی ئیسلام.**
پێناسەی (دارُاْلإِسْلام)و (دارُاْلکُفْر) لە باسی کۆچکردنی (صَحابَة)کاندا ڕابرا.
**لەبارەی گەورەیی شاری ( مَدِینَة )ی پیرۆز**، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إنَّ إِبْراهِیمﷺ حَرَّمَ مَکَّة وَدَعَا لِأَهْلِهَا، وَإِنِّي حَرَّمْتُ الْمَدِینَة کَما حَرَّمَ إبْراهِیمُ مَکَّةَ، وَإِنِّي دَعَوْتُ فِي صاعِها وَمُدِّها بِمِثْلَيْ مَا دَعَا بِهِ إِبْراهِیمُﷺ لِأَهْلِ مَکَّـةَ﴾ رواه مسلم، **(إِبْراهِیم) پێغەمبەرﷺ (مَکَّة)ی حەڕام کردوە=ڕێزی لیٚناوەو دوعای بۆ دانیشتووەکانی کردوە: ئەمین بن‌و خوا ڕزقیان بداتیٚ، منیش (مَدِینَة)م حەڕام کردوە=ڕێزم لیٚناوەو دوعاشم بۆ ڕبەو مستی دانیشتووەکانی (مَدِینَة) کردوە بە دوو ئەوەندەی (إِبْراهِیم)ﷺ دوعای بۆ دانیشتووانی (مَکَّة) کردوە.** واتە: دوو هەندی (مَکَّة) بەرەکەتی بکەویٚتیٚ.
هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿عَلَى أَنْقَابِ الْمَدِینَة مَلائِکَةٌ لاَ یَدْخُلُها الطّاعُونُ وَلاَ

الدَّجّالُ﴾ رواه الشيخان، **له سەر دەروازەكانی (مَدِينَة)ی پیرۆز (مَلائِكَة) چاودێرن: نە تاعونو نە (دَجّال) ناچنە ناو (مَدِينَة).**

**هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿مَنْ أَرادَ أَهْلَ الْمَدِينَةِ بِسُوءٍ أَذابَهُ اللهُ كَما يَذُوبُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ﴾ رواه مسلم، **هەر كەسێك بیەوێ خراپەیەك لەگەڵ دانیشتووانی (مَدِينَة) بكا، خوا بیتاوێنێەوە، هەروەك خوێ لە ئاودا دەتاوێتەوە.**

**هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿إِنَّ الْإِيمانَ لَيَأْرِزُ إِلَى الْمَدِينَة كَما تَأْرِزُ الْحَيَّةُ إِلَى جُحْرِها﴾ رواه الشيخان، **ئیمان بۆ لای (مَدِينَة) خۆی وێك دێنێەوە، هەروەك مار بۆ كونەكەی خۆی دەگەڕێتەوە خۆی تێدا وێك دێنێتەوە.** واتە: هەر كەسێك ئیماندار بێ، دڵی بەرەو (مَدِينَة)ی پیرۆز دەڕوا بۆ زیارەتی پێغەمبەروﷺ شوێنە پیرۆزەكانیترو بۆ نوێژ كردن لە مزگەوتی پێغەمبەرداﷺ (فتح الباري) ب(٤) ل(١٠٥-١٣١).

**دووەم: كە پێغەمبەرﷺ لە (مَدِينَة)دا جێگیر بوو، بڕیاری دا مزگەوت دروست بكا.**

مزگەوت یەكەمینو گرنگترین شوێنە بۆ بنیاتنانی كۆمەڵگەیئیسلام، چونكە كۆمەڵگەی ئیسلام جێگیریو یەككری خۆی لە ئادابو باوەڕی ئیسلام وەردەگرێ، ئەوەش لە مزگەوت هەڵدەقوڵێ، بەڵێ: ئیسلام دەیەوێ برایەتیو خۆشەویستی لە نێوان موسوڵمانان بڵاو ببێتەوەو ڕەگەزپەرستیو عەشیرەتگەریو لاف لێدانی نەژادی لە ناو ئەو كۆمەڵگەیەدا بتاوێتەوەو نەمێنیو هەموویان بە دڵو زوبان دان بنێن: كە بە یەكسانی بەندەی یەك خودانو نەتەوەی یەك (آدم)نو ئوممەتی یەك پێغەمبەرنﷺ، ئەمەش بەوە تەواو دەبێ: كە موسوڵمانان ڕۆژانە-چەند جارێك- لە ماڵێك لە ماڵەكانی خوادا بە یەك بگەنەوەو بە یەكریزی لە خزمەت خودا بەرەو (كَعْبَة)ی خودا ڕاوەستن، كەواتە: هەر چەند موسوڵمان لە ماڵیخۆی خواپەرستی بكا، هەست بەو یەكسانیو دادپەروەریەی ناو مزگەوت ناكاو ئەو پەروەردەی ناو مزگەوتی لە ماڵەوە دەست ناكەوێ.

**ئەوەی مزگەوت پێی بگەیێنێ * خاكو میللەت نادۆڕێنێ**
**ئەوەی دورە لە ماڵی خوا * نازانی چۆن بژیێو بڕوا**

كەوابوو: مزگەوت شوێنی خواپەرستییە، شوێنی زیكری خودایە، شوێنی پەروەردەكردنی موسوڵمانانە، خوێندنگای ئایینییە، شوێنی حاوانەوەی لێقەوماو و بێكەسوكارانە، شوێنی هەشیاركردنەوەی موسوڵمانانە بۆ ڕاپەڕینو (جِهاد)كردن لە ڕێگایخوا، چونكە پێغەمبەرﷺ لە مزگەوتدا ئاڵای (جِهاد)ی دەدا دەست سەركردەكانو بەرەو غەزا وەڕێی دەكردن.

جا لە بەر ئەوەی مزگەوت لە ئیسلامدا ئەوەندە گرنگە، خوایگەورە دوژمنانی مزگەوتەكانی بە ستەمكارترینی هەموو ستەمكاران داناونو دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ مَنَعَ مَسَاجِدَ اللهِ أَنْ يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَى فِي خَرَابِهَا﴾البقرة: ١١٤، **هیچ كەسێك ستەمكارتر نیە لەو**

کەسەی قەدەغە دەکا مزگەوت زیکریخوای تێدا بکرێ و هەوڵ دەدا مزگەوت وێران بکا: بەوەی بیروخێنێ، یان ڕێگە نەدا دروشمەکانیئیسلامی تێدا ئەنجام بدرێن.
(تفسيرالقرطبي) البقرة: ١١٤ و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٢٠٣) و(سيرة الصلاّبي) ب(١) ل(٥٣٠).

## ﴿ پاداشتی دروستکردنی مزگەوت ﴾

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ بَنَى مَسْجداً يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللهِ بَنَى اللهُ لَهُ مِثْلَهُ فِي الْجنَّةِ﴾ رواه الشيخان، هەر کەسێك مزگەوتێك دروست بکا، مەبەستیشی بەم مزگەوتە ڕازیبوونی خوا بێ، خوایگەورە ماڵێکی وەك مزگەوتەکەی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکا.

جا بزانە: پێغەمبەرﷺ زیاتر بایەخی بە مزگەوتەکانی ناو ماڵان داوە؟ تاکو پیرو پەککەوتەکان نوێژی تێدا بکەن ﴿عَنْ عِائِشَةَ-رضي الله عنها- أَمَرَ رَسُولُ اللهِﷺ بِبناءِ الْمَسَاجِدِ فِي الدُّورِ وَأَنْ تُنَظَّفَ وَتُطَيَّبَ﴾ رواه ابوداود والترمذي بسند صالح، پێغەمبەرﷺ فەرمانی داوە: مزگەوتەکان لە ناو خانووان‌دا=ماڵاندا دروست بکرێن و پاك و خاوێن بکرێن و بۆنخۆش بکرێن.

جا هەر چەند مزگەوتەکە زۆر بچوکیش بێ، ئەوە پاداشتی خۆی هەر هەیە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ بَنَى مَسْجداً وَلَوْ كَمَفْحَصِ قَطاةٍ لِبَيْضِهَا بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ﴾ رواه البزار وابن حبان وصححه السيوطي، هەر کەسێك مزگەوتێك بۆ خوا دروست بکا، هەرچەند بە قەد قۆرتەی هێلکەکردنی قەتێش بێ، خوایگەورە ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکا. مەبەست ئەوەیە: هەرچەند مزگەوتەکە زۆر بچوکێش بێ و جێی تەنها یەك نوێژکەری تێدا ببێتەوە: وەك ئەو مزگەوتە بچوکانەی لە ڕێگەی ڕێبواراندا دروست دەکرێن، هەروەك لە حەدیسێکی (البيهقي، بسند حسن) هاتووە.

جا بزانە: ئەگەر شوێنێکی بۆ نوێژ تێدا کردن دروست کردو ئیزنیشی دا خەڵك نوێژی تێدا بکا، ئەوە نابێتە مزگەوت و هەر ملکی خۆیەتی، بەڵام ئەگەر گوتی: ئەم پارچە زەویەم کردە مزگەوت، ئەوە دەبێتە مزگەوت و لە ملکایەتی خۆی دەردەچێ، هەر چەند وشەی (وَقْف)شی نەگوتبێ و دیواریشی نەکردبێ. (فتح الباري) ب(١) ل(٧٠٤و ٧٠٥) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٦) ل(٢٤٨و ٢٥١).

## ﴿ گەورەیی مزگەوتی پێغەمبەرﷺ ﴾

**پێشەکی بزانە:** لە سەردەمیپێغەمبەرﷺ لە (مَدينَة)ی پیرۆزدا–جگە لە مزگەوتی پێغەمبەرﷺ– نۆ مزگەوتیتریش هەبون، بەڵام تەنها لە مزگەوتی پێغەمبەرداﷺ نوێژی (جُمُعَة) دەکرا، هەروەك (الحافظ العسقلاني) لە (التخليص) لە باسی (جُمُعَة)دا ڕوونی کردۆتەوە.

جا بزانە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿صَلاَةٌ فِي مَسْجدِي هَذا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمـا سِواهُ إِلاّ الْمَسْجدَالْحَرامَ﴾ رواه الشيخان، زاد ابن ماجه والبزار: ﴿وَصَلاَةٌ فِي الْمَسْجدِ الْحَرَامِ أَفْضَلُ

مِنْ مِأَةِ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِواهُ﴾ والبيهقي والبزار: ﴿وَفِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ خَمْسُمِأَةِ صَــلاَةٍ﴾ **یەك نوێژ لە ناو مزگەوتی مندا خێری زیاترە لە هەزار نوێژ لە ناو مزگەوتەكانیتردا جگە لە (اَلْمَسْجِدُالْحَرام)ی (مَكَّة)، چونكە یەك نوێژ لە (اَلْمَسْجِدُالْحَرام)دا خێرترە لە سەد هەزار نوێژی لە مزگەوتەكانیتردا، هەم یەك نوێژ لە (بَيْتُ الْمُقَدَّس)= (مَسْجِدُالْأَقْصَى)دا خێری بە پێنجسەد نوێژە.**

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إلاّ إلَى ثَلاثَةِ مَـساجِدَ: اَلْمَـسْجِدِ الْحَـرامِ، وَمَـسْجِدِالرَّسُولِﷺ، وَمَسْجِدِالْأَقْـصَى﴾ رواه الشيخان، **بارگەكانی سەفەری خواپەرستی ناپێچرێنەوە تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێ: (اَلْمَسْجِدِالْحرامِ) لە (مَكَّة)، مزگەوتی پێغەمبەرﷺ لە (مَدِينَة)، (اَلْمَسْجِدُالْأقْصَى) لە (قُدْس).**

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ، وَمِنْبَرِي عَلَى حَوْضِي﴾ رواه الشيخان، **نێوان گۆڕەكەم و مینبەرەكەم مێرگێكە لە مێرگەكانی بەهەشت، مێنبەرەكەم لە سەر حەوزی كەوسەرەكەمە.**

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ صَلَّى فِي مَسْجِدِي أَرْبَعِينَ صَلاةً لاَ تَفُوتُهُ صَــلاةٌ كُتِبَتْ لَهُ بَراءَةٌ مِنَ النَّارِ وَبَراءَةٌ مِنَ الْعَذابِ وَبَرِئَ مِنَ النِّفاقِ﴾ حديث صحيح رواه أحمد والطبراني، **هەر كەسێك لە مزگەوتی مندا چل نوێژ بكاو هیچ نوێژێكی لە دەست نەچێ، ئەوە ڕزگاربوونێكی لە ئاگر بۆ دەنوسرێ و ڕزگاربوونێكیشی لە عەزابی خوا بۆ دەنوسرێ و لە (نِفاق) و درۆو فێڵبازی دور دەكەوێتەوە.**

**جا بزانە:** ئیامی(النواوي) فەرموویەتی: بە مە زهەبی(الشافعي)و كۆمەڵە زۆرەكەی زانایانی ئیسلام: (مَكّة) لە (مَدِينَة) گەورەترە، مزگەوتی (مَكّة)ش لە مزگەوتی (مَدِينَة) گەورەترە.

**(القاضی عیاض) فەرمویەتی: بە (إجْماع)ی زانایانیئیسلام: پارچە خاكەكەی گۆڕی پێغەمبەرﷺ -كە دەورەی لە جەستە پیرۆزەكەی داوە- لە هەموو شوێنەكانی زەمین گەورەترە، واتە: لە (كَعْبَة)ش گەورەترە، بەڵكو ئیمام (ابْنُ عَقِيل الحَنْبَلِي) فەرمویەتی: لە (عَرْش)ش گەورەترە.**

جا دەفەرموێ: ئەم خێرە گەورەیەش تایبەتە بە خودی ئەو مزگەوتەی لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ بووە، نەك ئەوەی لە دوای وی زیاد كراوە، بەڵام (اَلْمَسْجِدُالْحَرام) هەموو (حَرَمِ مَكّة) دەگرێتەوە لە فەرموودەی ڕاستتردا، جا لەم خێرە گەورەیەشدا جیاوازی نوێژی واجب و سوننەت نیە. (شرح صحيح مسلم) ب(٦) ل(١٠١-١٠٣) و(فتح الباری) ب(٣) ل(٨٢-٨٨) و(إرشادالساري لشرح صحيح البخاري) ب(٢) ل(٣٤٣-٣٤٥).

**سێیەم: پێغەمبەرﷺ بە دە دیناری زێڕ پارچە زەویەكەی مشتاغەكەی بۆمزگەوت لە یەتیمەكان كڕی.** بە بەڵگەی ئەم حەدیسە لە مەزهەبی ئیمامی(الحنفي)دا دروستە: مندالْ

کڕین‌و فرۆشتن بکا، هەروەك لە کتێبەکانی‌خۆیاندا فەرموویانە، بەڵام زۆرینەی پێشەوایانی شەرعزان فەرموویانە: کڕین‌و فرۆشتنی منداڵ دروست نیە–واتە: بە تایبەتی منداڵی یەتیم– چونکە خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلاّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾الأنعام: ١٥٢، نزیك ماڵی یەتیم مەکەون تەنها بەو شێوەیە نەبێ کە جوانترە.

جا وەڵامی حەدیسەکەشیان بەوە داوەتەوە: کە پێغەمبەرﷺ مامڵەتی کڕینەکەی لەگەڵ حەزرەتی(أسْعَد بن زُرارَة)ی سەرپەرشتکاری یەتیمەکان کردوەو بە دە دینار لێی کڕیون، جگە لەمەش: حەزرەتی(أسْعَد بن زُرارَة)ش ڕەزێکی دارخورمای لەجیاتی مشتاغەکە دا بە یەتیمەکان، کەواتە: یەتیمەکان دوو قات قازانجیان لەو فرۆشتنەدا کرد، خۆ ئەگەر یەتیمەکان سەپەرشتکاری خۆیشیان نەبوایە، ئەوە پێغەمبەرﷺ سەرپەرشتکاری گشتیی موسوڵمانانە، سەرەپەرشتکاری گشتیش لە شەرعدا دەسەڵاتی ئەو جۆرە کارانەی هەیە. (السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٨٩–٩٠) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٢٠٤و٢٠٥).

**چوارەم: مشتاغەکە چەند گۆڕێکی کۆنی کافرەکانی تێدا بون‌و هەڵکەندران‌و فڕێدران.**

ئەمە بەڵگەیە: ئەگەر گۆڕستانەکە ملکی کەسێك بێ، ئەوە دروستە بفرۆشرێ: جا ئەگەر مردووەکانیش ڕێزدار نەبون–وەکو کافرەکان– دروستە هەڵبکەندرێن‌و فڕێ بدرێن‌و شوێنەکەشیان بکرێتە مزگەوت‌و شتی‌تریش، بەڵام ئەگەر مردووەکان ڕێزدار بون –وەکو موسوڵمانەکان– ئەوە دروست نیە هەڵبکەندرێن تا بە تەواوی دەبنەوە خۆڵ.

جا ئەگەر گۆڕستانەکە ملك نەبو، بەڵکو (وَقْف)ی گشتی بوو–وەك زۆرینەی گۆڕستانەکانی کوردستان– ئەوە بە هیچ جۆرێك دروست نیە بکرێتە شتێکی‌تر، یان کشتوکاڵی تێدا بچێندرێ، هەرچەند بەرهەمەکەشی بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف کرێ، واتە: بۆ پێشەوای موسوڵمانانیش ئەو دەستکاریە دروست نیە، بەڵام ئەگەر نەزاندرا: ئایا گۆڕستانەکە ملکی کەسێك بووە، یان (وَقْف)ی گشتی بووە–وەك ئەو گۆڕستانە وێرانبووەی ئێستا مردووی تێدا نانێژرێ– ئەو کاتە بۆ پێشەوای موسوڵمانان دروستە دەستکاریی بکا، بەو مەرجەی مردووەکان بوبنەوە خۆڵ، هەروەك هەردوو (إبن حجر) ئەوها ڕوونیان کردۆتەوە. (فتح الباري) ب(١) ل(٦٧٩و٦٨١) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٦) ل(٢٨٤و٢٨٥).

**پێنجەم: پێغەمبەرﷺ بەخۆی کاری لە دروستکردنی مزگەوتدا دەکرد.** ئەم کارکردنەی پێغەمبەرﷺ بۆ پروپاگندە نەبو، تاکو–وەك کاربەدەستەکانی ئێستا لە تەلەفزیۆن‌و ڕۆژنامەکاندا– بخرێتە بەرچاوی خەڵك، بەڵکو لە هەڵکەندنی بناغەکەدا بەخۆی یەکەم کولینکی لێدا، لە دوای هەڵکەندنی بناغەش بەخۆی خشتێکی لە دیوارەکە دانا، ئینجا فەرمانی بە ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ کرد: ئەویش خشتێکی لە تەنیشت خشتەکەی وی دانا، ئینجا فەرمانی کرد: ئیمام (عمر)شﷺ خشتێکی لە تەنیشت خشتەکەی وی دانا، ئینجا فەرمانی کرد: ئیمام (عثمان)شﷺ خشتێکی لە تەنیشت خشتەکەی وی دانا، ئینجا

(صَحابَة)كانیتریشﷺ دەستیان بە دیوار دانان کرد، ئەوەش تاکو خەڵك بزانێ پیش سپیو پیاوماقوڵانو دەوڵەمەندەکانو هەژارەکان لەم کارکردنەدا یەکسانن‌و هەم ئاماژەش بێ: ئەم سێیانە لە دوای پێغەمبەرﷺ جێنیشی ئەون.

ئینجا ڕۆژانەش پێغەمبەرﷺ لەگەڵ (صَحابَة)کان کاری لە مزگەوتدا دەکردو خشتی بۆ دیوار کردن دەهێنانە بەردەستی وەستا، بە قوربانی پێغەمبەر بمﷺ بە هۆی هەڵگرتنی خشت، سینگی پیرۆزی تۆزاوی دەبوو و دەیفەرموو: ﴿هَذا الْحِمَالُ لاَ حِمالُ خَيْبَرْ، هَذا أَبَرُّ رَبَّنا وَأَطْهَــرْ﴾ **ئەی خودایە ئەم بارە خشتەیە چاکترو پاکترە، نەك بارە قەسپو مێوژەکەی (خَيْبَر).** واتە:چونکە ئەمەیان بۆ دروستکردنی مزگەوتە.

هەم بە قوربانی (صَحابَة)کانیشی بم، کاتێ تەماشایان دەکرد پێغەمبەر ﷺ بەخۆی کار دەکا، ئەوانیش زیاتر بۆ کارکردن چوستو چالاکتر دەبونو دەیانگوت:

**لَئِنْ قَعَدْنا وَالنَّبِيُّﷺ يَعْمَلُ * فَذَكَ مِنَّا الْعَمَلُ الْمُضَلَّلُ**

**ئەگەر ئێمە دابنیشین‌و پێغەمبەریشﷺ کار بکا * ئەوە لە ئێمەوە کارێکی زۆر گومڕایە.**

(السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٩٠-٩٨) و(سيرةالصلاّبي) ب(١) ل(٥٣٢و٥٣٣و٥٣٨).

**شەشەم: ڕازاندنەوەو نەقش‌و نیگاری مزگەوت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:** ﴿عَـــريشٌ كَعَريشِ مُوسَى﴾ **کەپرێك بێ وەکو کەپرەکەی مُوسَی پێغەمبەرﷺ.**

ڕازاندنەوەی مزگەوت بە نەقش‌و نیگارو بڵندکردنی لە ئەندازە پێویست، هەمووی ناپەسندن، هەم حەرامە ماڵی (وَقْف) لەو جۆرە شتانە سەرف بکرێ.

ئیمام (عمر)ﷺ فەرمانی بە دروستکردنی مزگەوت کردو فەرمووی: ﴿أَكِنَّ النَّاسَ مِنَ الْمَطَرِ وَإِيّاكَ أَنْ تُحَمِّرَ أَوْ تُصَفِّرَ فَتَفْتِنَ النّـــاسَ﴾ رواه البخاري، **خەڵك لە باران بپارێزەو نەکەی سۆرو زەردی بکەیو خەڵکی لە نوێژدا سەر سوڕماو بکەی.**

بەڵام ئیمام (أبیحَنِيفة) فەرموویەتی: تەنها سەرفکردنی ماڵی (بیت المال)-واتە: هەم (وَقْف)- بۆ ئەو جوانکاریانە حەرامە، بەڵام ئەگەر کەسێك لە ماڵی خۆی کردیو بەرژەوەندیو ڕێزلێنانی مزگەوتیشی تێدا بوو، ئەو کاتە بۆ وی ناپەسند نیە. (فتح الباري) ب(١) ل(٦٩٧-٧٠٠).

**حەفتەم: (أَصْحابُ الصُّفَّة) کێن؟ بەشێکی مزگەوت-بە ناوی (الصُّفَّة)-بۆ زوگرتیەکان سەرپۆش کرابوو.**

**(الصُّفَّة):** شوێنێکی سەرپۆشکراو بوو لە دواوەی مزگەوتی پێغەمبەرﷺ ئامادە کرابوو، بۆ ئەو موسوڵمانانەی لە دەرەوەی (مَدِينَة) دەهاتن‌و ماڵو خێزانیان نەبو، واتە: زووگرتی بون، جا ئەم زوگرتیانە پێیان دەگوترا: (أَهْلُ الصُّفَّة)=دانیشتووانی سەرپۆشکراوەکە، ژمارەی (أَهْلُ الصُّفَّة) هەندی جار کەم دەبۆوە بە هۆی ژن هێنان‌و سەفەرو مردن، هەندێ جاریش

زیاد دەبوو تا دەگەیشتنە زیاتر لە سەد پیاو، بە ئەغلەبیش ژماریان لە سنوری حەفتادا بوو. جا ئەگەر موسوڵمانێکی زوگرتی کۆچی کردبا بۆ (مَدِينَة)، خزمو ناسراوی نەبوایە، ئەوە لە سەرپۆشکراوەکەدا دەماوەو فێری قورئانو زانستەکانی ئایین دەبوو تا ڕێگایەکی ژیانی دەست دەکەوت، چونکە (أهلُ الصُّفَّة) هەموویان خەریکی خواپەرستنو فێربونی زانستی ئایینی بون، کاتێکیش بانگەوازیی (جِهاد) دەکرا، ئەوانیش بەگوێرەی توانا بەشداری غەزایان دەکرد، جاری وا هەبوو هەندێکیان لە غەزادا شەهید دەبون.

جا پێغەمبەرﷺ بەخۆی لە حاڵی (أهلُ الصُّفَّة)ی دەکۆڵیەوەو بژێوی ڕۆژانەی بۆ دابین دەکردنو بە هیچ جۆرێك لە بیری نەدەکردن، بۆ نموونە: ﴿عن عبدالرّحمن بن أبیبکررضی الله عنهما: قالَ النَّبيُّﷺ مَرَّةً: (مَنْ كانَ عِنْدَهُ طَعَامُ اِثْنَيْنِ فَلْيَذْهَبْ بثالِثٍ وَمَنْ كانَ عِنْدَهُ طَعامُ أَرْبَعَةٍ فَلْيَذْهَبْ بِخامِسٍ أَوْ سَادِسٍ-أَوْ كَما قالَ- وَإنَّ أَبابَكرٍ جاءَ بِثَلاثَةٍ، وَانْطَلَقَ النَّبيُّ بِعَشَرَةٍ﴾ رواه الشيخان، هەر کەسێك خواردەمەنی دوو کەسانی هەیە با سێیەمێك لە (أهلُ الصُّفَّة) لەگەڵ خۆیا بباتەوە، هەر کەسێك خواردنی چوار کەسانی هەیە با پێنجەمێك، یان شەشەمێك لەگەڵ خۆیا بباتەوە، جا ئیمام (أَبُوبَكْر) سێ کەسی (أَهْلُ الصُّفَّة)ی لەگەڵ خۆیا هێنانەوەو پێغەمبەریشﷺ دە کەسی بردنەوە.

جگە لەمەش ئەگەر خێرێك، یان بەخشینێك بۆ پێغەمبەرﷺ هاتبا، ئەوە بۆ (أهلُ الصُّفَّة)شی دەناردو هانی خەڵکیشی دەدا: خێریان پێبکەن، دەوڵەمەندەکانی (صَحابَة)ش خواردنیان بۆ دەناردنە مزگەوت. (فتح الباري) ب(٦) ل(٧٢٧) و(سيرةالصلّابي) ب(١) ل(٥٢١-٥٢٦).

**هەشتەم: خانووەکانی پێغەمبەرﷺ، لە دەورەی مزگەوت چەند ژورێك بۆ پێغەمبەرﷺ دروست کران تاکو بەخۆیو خێزانەکانی تێدا بحاوێنەوە.**

پێغەمبەرﷺ هاتە (مَدِينَة)، لە ناو دانیشتووانی (مَدِينَة)دا دەوڵەمەندی زۆر هەبون، بەگوێرەی دەوڵەمەندی خۆیان کۆشكو تەلاریان دروست کردبوو، بەڵکو پایە بەرزەکان قەڵاتیان بۆ خۆیان دروست کردبوو و بەو تەلار و قەڵایانە شانازییان لە سەر یەکتری دەکرد، جا دەبێ کۆشكو تەلارەکەی پێغەمبەریخواﷺ چەند بەرز بێو لە چ جۆرە مەرمەڕ و ساجێك دروست کرابێ؟!

ئیمام (الحَسَن الْبَصْرِي) وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ: **(كُنْتُ أَنَالُ أَطْوَلَ سَقْفٍ فِي حُجَرِ النَّبِيِّﷺ بِيَدَيَّ) من-لە کاتی منداڵیدا- دەستەکانم دەگەیشتنە بەرزترین بانیماڵەکانی پێغەمبەرﷺ.**

ئیمام (ابن کثیر) فەرموویەتی: (الحسن البَصْري) منداڵ بوو لەگەڵ دایکیدا بوو-کە ناوی (خَيْرَة) بوو و خزمەتکاری (أُمُّ سَلَمَة)ی هاوسەرەکەی پێغەمبەرﷺ بوو- هەم فەرموویەتی: ماڵەکانی پێغەمبەرﷺ- وەکو مزگەوت- بە قوڕ و بەرد دروست

کرابـون، بانـەکانیان نـەوی بـون‌و بـە لقـی دارخورمـاو قـوڕ سـەرپۆش کرابـون، جـا کـە هاوسەرەکانی پێغەمبەرﷺ وەفاتیان کرد، ئەم خانووانە گشتیان وەگـەڵ مزگـەوت دران. (البدايه والنهايه) ب(٢) ل(٢٢٥) و(سيرةالصلاّبي) ب(١) ل(٥١٨و٥١٩).

ئەی برای موسوڵمان: ئەمەی باسمان کرد، ماڵی پێغەمبەرمان بووﷺ، خۆ ئەگەر ویستبای وەك پاشاو سەرکردەکانی دونیا کۆشك‌و تەلار دروست بکـا، ئـەوە (أنْـصار)ی (مَدِينَـة) لـە خزمەتی‌دا بون‌و بە پەلە بۆیان دروست دەکرد، بەڵام پێغەمبـەرمانﷺ هـەر ئـەوها دونیـا نەویست بوو، بە دایك‌و باوکەوە بە قوربانی بین.

جگە لەمەش: خوای‌گەورە ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەرﷺ ناردۆتـە خـوارەوەو دەفـەرموێ: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي إِنْ شَاءَ جَعَلَ لَكَ خَيْراً مِنْ ذَلِكَ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَيَجْعَلْ لَـكَ قُصُوراً﴾ الفرقان: ١٠، **بەرەکەتی ئەو خوایە زۆر بێ کە ئەگەر حەز بکا لـەو خۆشیانەی دونیا چاکتر دەداتێ: چەند باغێکت دەداتێ کە ڕووبارەکـانی تـێ‌دا بڕۆن‌و چەند کۆشك‌و تەلارێکت دەداتێ.**

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا زانایان فەرموویانە: (رِضْوان)ی دەرگەوانی بەهەشت هاتە خزمـەت پێغەمبـەرووﷺ فـەرمووی: خوای‌گـەورە سـەلامت لێ‌دەکاو دەفـەرموێ: ئەمـە کلیلـەکانی گەنجینەکانی دونیایە–ئەگەر وەریشی بگری– هـیچ لـە بەهەشـتەکەت کـەم ناکاتـەوە. جـا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿**هیچ پێویستیم بەوە نیەو هەژاریم پێ خۆشترە، پێم خۆشـە بەندەیەکی ئارامگر بم‌و شوکری خوا بکەم**﴾. جـا (رِضْـوان) فـەرمووی: کـارێکی باشـت کرد، خوا بۆ تۆیە، واتە: ئەوها بۆ تۆی پێ باشە. (تفسيرالقرطبي) الفرقان (١٠).

**نۆیەم: پێغەمبەرﷺ لە مانگی( شَوّال )=شەشەڵان حەزرەتی( عائِشَة )ی**-رضي الله عنها- **بـە بـوك گواستەوە.** ئەمەش بەڵگەیە: کە سوننەتە مارەبڕینی‌ژنەکەو گواستنەوەکەشی–هەردووکی– لە مانگی (شوال)دا بێ، چونکە ئەو کەسانەی بوك هێنان لە مانگی (شوال)دا بـە ناپەسـند دادەنێن، حەزرەتی(عائشة)-رضي الله عنها- ڕەدی داونەوەو فەرموویەتی: ﴿تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللهِﷺ فِي شَوّالٍ وَبَنَى بِي فِي شَوّالٍ فَأَيُّ نِسَاءِ النَّبِيِّﷺ كَـانَ أَحْظَـى عِنْـدَهُ مِنِّـي﴾ رواه مسلم، **پێغەمبەرﷺ لە مانگی (شوّال)دا منی مارە بڕی، هەر لە مانگی (شـوّال)شدا منی بە بوك گواستەوە، ئایا کامە لە ژنەکانی پێغەمبەرﷺ لە من خۆشەویستتر بوو لـە لای پێغەمبەرﷺ.** (تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٧) ل(٢١٦).

***          ***          ***

## ﴿ دەستپێکردنی بانگ‌و ئیقامەت بۆ هەر پێنج نوێژەکان ﴾

که پێغەمبەرﷺ هاتە (مَدِينَة)، موسوڵمانەکان لە کاتی نوێژەکان بۆ نوێژکردن دەهاتن بـێ ئـەوەی بـانگ بکـرێن، ئینجا کـە موسـوڵمانەکان زۆربـون–هـەر لـە سـاڵی یەکـەمی

کۆچیدا–پێغەمبەرووﷺ (صَحابَة)کانﷺ ڕاویـژیان کـرد: تـاکو شـتێك دابنـێن کـاتی نوێژەکانی پێ بزانن، جا هەندێك گوتیان: لە کاتی نوێژدا (ناقوس)=زەنگوڵ لێدەدەین؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿زەنگـوڵ بـۆ دیانەکانـە﴾. هەنـدێك گوتیـان: (بُـوق)=زوڕنـا لێدەدەین؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿زوڕنا بۆ جولەکەکانە﴾. هەندێك گوتیان: ئاگر بەرز دەکەینەوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ئاگر بۆ ئاگرپەرستەکانە﴾. هەندێکیتر گوتیان: ئاڵایەك بەرز دەکەینەوە؟جا ئەمەشی نەویست، چونکە بـۆ مرۆڤـی خـەوتوو سودی نەبو، هەم زۆر کەسیش نایبینێ.

ئینجا (صَحابَة)کانﷺ پەرت بونو یەکێك لە (صَحابَة)کان –ناوی (عبدالله بن زَيد بـن عبْدِ رَبِّه) بووﷺ– لە خەونـدا دیتـی یـەکێکی بـەرگ سـەوز بـە لایدا تێپـەڕیو پـێی گوت: کاتێ خەڵك بۆ نوێژکردن بانگ دەکـەی، بڵـێ: (اَللهُ أَکْبَـر)...تـا کۆتـایی بـانگ، وە کاتێ بۆ نوێژکردنیش هەڵدەستی، بڵێ: (اَللهُ أَکْبَر)...تا کۆتایی ئیقامەت.

جا سبەینێ حەزرەتی(عبدالله) هاتە خزمـەت پێغەمبـەرووﷺ خەونەکـەی بـۆ گێـڕاوە، پێغەمبـەریشﷺ فـەرمووی: ﴿إِنَّهَا لَرُؤْيا حَقٌّ–إِنْ شاءَ اللهُ– فَقُمْ مَع بِلاَل فَأَلْقِهَا عَلَيْهِ فَإِنَّـــهُ أَنْدَى صَوْتاً مِنْكَ﴾ حـديث صـحيح رواهأبـوداود وابـن ماجـه وابـن خزيمـة، وبعضـهُ في الـصحيحين، ئـەوە خەونێکی ڕاستە–إِنْ شاءَ اللهُ– لەگەڵ (بِلال) هەڵسە، بانگەکەی پێبڵێ، تاکو ئەو بانگ بدا، چونکە (بِلال) دەنگی لە تۆ بەرزترە.

ئینجا کە حەزرەتی(بِلال)ﷺ بـانگی دا، ئیمـام (عُمـر)ﷺ لـە ماڵەوە گوێی لێبـوو و هاتە خزمەت پێغەبەرووﷺ گوتی: سوێندم بەو خوایەی تۆی بە حـەق نـاردوە، منـیش وەك خەونەکەی (عبدالله) بانگم لە خەوندا دیتووە، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (فَلِلّـــهِ الْحَمْدُ) حەمـدو شـوکر هـەر بۆ خوایـە. (البدايـة والنهايـة) ب(٢) ل(٢٣٥و٢٣٧) و(فـتح البـاري) ب(٢) ل(١٠٣–١٠٧).

## ﴿ گوڵبژێریك لەم گوڵزارە ﴾

### یەکەم: پێغەمبەرووﷺ (صَحابَة)کانﷺ لەبارەی بانگ ڕاوێژیان کرد...هتد،

بزانە: بانگ دروشمی ئیـسلامەو لـە سـەرەتای دامەزرانـدنی دەوڵـەتی ئیـسلامدا لـە سـەر دەستی پێغەمبەرﷺ ئەم دروشمە داندراوە، دروشمەکەش بە ئاشکرایی هاوار ئەکاو ئەڵێ: (اَللهُ أَكْبَر) خوا لە هەموو شتێكو لە هەموو کاربەدەسـتێك گـەورەترە، بـە (أَشْـهَدُ أَنْ لاَإِلَـهَ إِلاّالله) هاوار ئەکا: کەسیتر مافی (حاکِمِيَّة)=دادوەریی نیەو دەسـەڵاتی یاسـا دانـانی نیـەو شیاوی پەرستن نیە، جگە لەو خودایەی ناوی (اَلله)یە، بە (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله) هاوار ئەکا: (مُحَمَّدﷺ) نێردراوی خوایە، هەر ئەو سەرکردەی دینو دونیایەو ئەبی گوێڕایەڵی ئەو پێغەمبەرەﷺ بین لە هەر شتێکی بە ئێمەی ڕاگەیاندوە.

جا كە بانگ ئەوەندە دروشمێكی گرنگە، دروست نیە وازی لێبهێندرێ‌و بانگ نەدرێ، كەوابوو: ئەگەر خەڵكی شوێنێك یەكدەنگ بون لە سەر بانگ نەدان، واجبە: كاربەدەست جەنگیان لەگەڵ بكا—ئەمە یەكێكە لە فەرموودەكانی زانایانی ئایین—﴿عَنْ أَنَس: أَنَّ النَّبيَّ كانَ إِذا غَزا قَوْماً لَمْ يَكُنْ يَغْزُ بِنا حَتَّى يُصْبِحَ وَيَنْظُرَ: فَإِنْ سَمِعَ أَذاناً كَفَّ عَنْهُمْ، وَإِنْ لَمْ يَسْمَعْ أَذاناً أَغارَ عَلَيْهِمْ﴾ رواه الشيخان، **كە پێغەمبەر غەزای شوێنێكی كردبا، هێرشی نەدەكرد تا لە كاتی بەیانیدا تەماشای دەكرد: ئەگەر گوێی لە دەنگی بانگ بوایە وازی لێدەهێنان، ئەگەر گوێی لە بانگ نەبوایە ئەو كات هێرشی دەكردنە سەر.** (فتح الباري) ب(٢) ل(١١٩) و(سیرةالصلاّبي) ب(١) ل(٥٣٤).

**دووەم: حەزرەتی( بِلال الْحبَشِي ) بە بانگدان ڕێزی لێندرا،** پێغەمبەر فەرمووی: **﴿ئەم خەونەی بانگ دیتن خەونێكی ڕاستە، هەڵسە بە (بِلال)ی بڵێ، چونكە ئەو لە تۆ دەنگی بەرزترە﴾.** جگە لە خەونەكەش بانگ بە (وَحْي)ش بۆ پێغەمبەر هات، چونكە كە ئیمام (عمر) گوێی لە بانگ بوو، هاتە خزمەت پێغەمبەر گوتی: **(منیش وەك خەونەكەی (عبدالله)م دیتوە). پێغەمبەر فەرمووی:** ﴿سَبَقَكَ بِذالِكَ الْوَحْي﴾ رواه عبدالرزاق وأبوداود، **پێش هاتنی تۆ بانگ بە (وَحْي) هات.**

**جا بزانە:** جگە لە دەنگ بەرزیش بۆیێ بانگ بە حەزرەتی(بلال) سپێردرا، چونكە لەو كاتەی لە (مَكَّة) ئازار دەدراو بەردی گەورەیان لە سەر سینگی دادەنا، بە دەنگی نزم دەیگوت: (أَحَدٌ أَحَدٌ). جا خوایگەورە هەر لە دونیادا پاداشتی داوە: تاكو لە سەرەتای بانگو لە كۆتایی بانگ بە ئاشكرایی دەنگی یەكخواپەرستی بەرز بكاتەوە.

**ئینجا بزانە:** لە دوای وەفاتی ئیمام (أَبُوبَكْر) حەزرەتی(بلال) بۆ غەزا چووە (شام)و هیچیتر بانگی نەدا، بەلاّم كە ئیمام (عمر) شاری (قُدْس)ی ڕزگار كرد، فەرمانی بە (بلال) كرد بانگ بدا. جا كە حەزرەتی(بلال) بانگی دا، (صَحابَة)كان دەستیان بە گریان كرد؟ چونكە پێغەمبەریان هاتەوە بیر، بە تایبەتیش حەزرەتی(أَبُوعُبَيْدة)و حەزرەتی(مُعاذ بن جَبَل) رضيالله عنهما لە هەموانیان زیاتر گریان.

جگە لەم جارەش جارێكیتریش: كە حەزرەتی(بلال) بۆ زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر هاتەوە (مَدِينَة)ی پیرۆز، حەزرەتی(الحسن)و حەزرەتی(الحسین)-رضی الله عنهما- زۆر داوایان لێكرد بانگ بدا. ئینجا كە بانگی دا، خەڵكی (مَدِينَة) هەموویان كۆ بونەوەو كچوكاڵەكانی داپۆشراویش هاتنە دەرەوە تاكو گوێیان لە دەنگی (بلال) بێ، بەلاّم كە حەزرەتی(بلال) گەیشتە (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله)، هەر هەموو خەڵكەكە دەستی بە گریان كرد!

چۆن نەگریێن؟ جاران كە بانگ دەدرا دەچونە خزمەت (مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله) نوێژیان دەكرد، ئێستاش (مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله) لە ناویاندا نەماوە، بۆیێ گریانی ئەم ڕۆژەیان وەكو

گریانی ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەر بووﷺ، گیانمان بە قوربانی بێ. (فتح الباري) ب(٢) لە(١٠٨و١٠٩) و(السيرةالحلبية) ب(٢) ل(١٣٩و١٤٠).

**سێیەم: چەند سوننەتێکی ئیقامەتو بانگ باس دەکەین:** کە لە (حديث صحيح)دا بەڵگەیان لە سەرەو هەندێك کەس بە (بِدْعَة)ی دادەنێ، هۆیەکەشی ئەوەیە: شارەزای شەریعەتیئیسلام نینو لە لای مامۆستای نەزانیش دەرسیان خوێندووەو هەڵخەڵەتاون:

**١-سەڵا،** واتە: (أسْتَغْفِرُالله)و (تَسْبِيحات)و (حَمْدُ)و (ثَنا)ی خوا لە پێش بانگی سبەینیدا، ﴿عَنْ اِمْرَأَةٍ مِنْ بَنى النَّجّارِ-رضي الله عنها-قالَتْ كانَتْ بَيْتِي مِنْ أَطْوَل بَيْتٍ حَوْلَ الْمَسْجِدِ، فَكَانَ بلالٌ يُؤَذِّنُ عَلَيْهِ لِلفَجْرِ كُلَّ غَداةٍ، فَيَأْتِي بِسَحَرَ فَيَجْلِسُ عَلَى الْبَيْتِ يَنْتَظِرُ الْفَجْرَ، فَإذا رَآهُ تَمَطَّى، ثُمَّ قالَ: (اَللَّهُمَّ أَحْمَدُكَ وَأَسْتَعِينُكَ عَلَى قُرَيْشٍ أَنْ يُقِيمُوا دِينَكَ). قالَتْ ثُمَّ يُؤَذِّنُ، وَاللهِ ما عَلِمْتُهُ تَرَكَها لَيْلَةً وَاحِدَةً، تَعْنِي الْكَلِماتِ﴾ رواه أبوداود والبيهقي بسند حسن، ماڵی ئێمە لە هەموو ماڵەکانی دەورەی مزگەوت بەرزتر بوو، (بِلال) لە سەر ماڵی ئێمە بانگی سبەینێی دەدا، هەموو بەیانییەك لە بەرە بەیاندا لە سەر ماڵەکەمان دادەنیشت چاوەڕوانی دەرکەوتنی بەیانی دەکرد، جا کە بەیانی دەدیت، خۆی لێك دەکشاندەوە، ئینجا دەیگوت: (اَللَّهُمَّ أَحْمَدُكَ....) تا کۆتایی، ئینجا لە دوای ئەم وشانە بانگی دەدا، وَالله: نەمزانیوە یەك شەو (بِلال) ئەو سەڵایانەی نەگوتبێ. هەروەها (الحافظ ابن كثير)ش ئەم حەدیسەی لە ئیمام (إبنُ إسْحاق) گێڕاوەتەوە. بڕوانە (البدايةوالنهاية)ب(٢) ل(٢٣٨).

**٢-(تَثْويب)،** واتە: (اَلصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ)، دوو جار لە دوای (حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ) لە بانگیسبەینێدا، ﴿عَنْ أبىمَحْذُورَةَ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبيَّﷺ عَلَّمَهُ الْأَذانَ...وَقالَ: فَإنْ كانَ صَلاَةَ الصُّبْحِ قُلْتَ: اَلصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، اَلصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ﴾...الحديث رواه أبوداود والنّسائي وابن خزيمة بسند صحيح، پێغەمبەرﷺ بانگی فێرکردمو...فەرمووی: ئەگەر بانگی نوێژی سبەینێ بوو، بڵێ: (اَلصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ)، دوو جار. واتە نوێژ لە خەو باشترە.

هەروەها ئەم حەدیسەی (تَثْويب)ی بانگی سبەینە، (الحافظ البيهقي) و(الحافظ العسقلاني)ش (بإسناد صحيح) گێڕاویەتیانەوە. بڕوانە (فتح الباري) ب(٢) (١٣٠).

**٣- سەلاوات لە سەر پێغەمبەرﷺ لە دوای بانگ،** پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إذا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ ما يَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ، فَإنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاةً صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ بِها عَشْراً، ثُمَّ سَلُوا اللهَ لِي الْوَسِيلَةَ...﴾ الحديث رواه مسلم وأصحاب السنن، هەر کاتێك گوێتان لە بانگدەر بوو، ئێوەش وەکو وی بڵێن-واتە: وەڵامی بانگ بدەنەوە- ئینجا سەلاوات لە سەر من ابدەن، چونکە هەر کەسێك سەلاواتێکم لە سەر ابدا

خـوای گـەورە بـەو سـەلاواتە دە ڕەحمـەتی بـە سـەردا دەڕژێنـێ، ئینجا لـە دوای سەلاواتیش دوعای (اَلْوَسيلَة)م بۆ بکەن.
جا بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: سوننەتە لـە دوای بـانگ سـەلاواتێك لـە سـەر پێغەمبـەرﷺ لێبدرێ: جا بە دەنگی نزم بێ، یان دەنگی بـەرز بـێ، چـونکە چـۆنیەتی سـەلاواتەکە لـە حەدیسەکەدا دیاری نەکراوە.
جا چۆنیەتی ئەو سەلاواتەی ئێستا –لە دوای بانگ– بانگدەر دەیڵـێ، ئـەوە (صـلاح الـدِّين الأيوبي) فەرمانی پێکردوە، لەبارەی چۆنیەتیەکەش چەند زانایەکیئیسلام فتوایـان داوە: (بنچینەی سەلاواتەکە سوننەتە، چۆنیەتیەکەشی (بِدْعَة)یە). واتە: (بِدْعَة حَسَنَة)یە؟ چونکە ئیمام (ابن حجر الهيتمي) فەرمویەتی: (صلاح الـدِّين) کـارێکی باشـی کـردوە، خـوا پاداشتی چاکەی بداتەوە. (الفتاویالکبریالفقهية) ب(١) ل(١٣١).
لەبارەی دوعای (اَلْوَسيلَة)ش پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ قالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّداءِ﴾ هەر کەسێك لە دوای گوێلێبوونی بانگ ئەم دوعایەی (اَلْوَسلة)م بۆ بکـاو بڵـێ: ﴿اَللّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّداً الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقاماً مَحَمُـوداً الَّذِي وَعَدْتَهُ﴾، ئەوە ﴿حَلَّتْ لَهُ شَفاعَتِي يَوْمَ الْقِيامَةِ﴾ رواه البخاری وأصحاب السنن، شەفاعەتی منی بۆ دەبێ لە ڕۆژی قیامەت.
جا بزانـە: ئەو سەلاواتو دوعای (اَلْوَسيلَة)–لـە مەزهـەبی ئیمـامی(الـشّافعي)دا– لـە دوای ئیقامـەتیش سـوننەتن: ﴿عَنْ أَبِیهُرَيْرَةَ﴿ أَنَّهُ كانَ إذا سَمِعَ الْمُؤَذِّنَ يُقيمُ الصَّلاةَ، يَقُـولُ: اَللّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِالتَّامَّةِ وَالصَّلاةِالْقائِمَةِ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَآتِهِ سُؤْلَهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ﴾ رواه ابن السّني، کـە حـەزرەتی(أَبـوهُريره)ﷺ گـوێی لێـدەبوو بانگـدەر ئیقامـەتی دەکـرد، ئـەویش بـەم وشـانەیڕابردوو سـەلاواتی لێـدەداو دوعـای (اَلْوَسـيلَة)ی بـۆ پێغەمبەرﷺ دەکرد. (الأذكار، للإمام النواوي) ل(٣١) و(تحفة المحتاج بحاشية الشرواني) ب(١) ل(٤٨٢).

*** *** ***

## ﴿ برایەتی نێوان (مُهَاجِرُ)و (أَنْصَار) لە (مَدِينَة)ی پێغەمبەرﷺ: ١٣

هەر لە ساڵیەکەمی کۆچیدا–لە کاتی دروستکردنی مزگەوت– پێغەمبەرﷺ (مُهاجِر)و (أنصار)ی کردنە برای یەکتری لە سەر بنچینەی ڕاستیو یارمەتیدانو میراتگرتن.
جا ئەوانەی برایەتییان لە نێواندا کرا، نەوەد تا سەد کەس بون، لەوانـە: پێغەمبـەروﷺ ئیمام (عَلي)ﷺ بونـە بـرا، ئیمـام (حَمْزة)ی مـامی پێغەمبـەروﷺ حـەزرەتی(زَيْـد بـن حارِثة) بونە برا، هەروەها حەزرەتی(جَعْفَر بن أبیطالب)–کە لـە (حَبَـشة) بـوو– لەگـەڵ حەزرەتی(مُعاذ بن جَبَل) بونە بـرا، هـەم ئیمـام (أبُوبَكْر) لەگـەڵ حـەزرەتی(خارِجَة بـن زَيْـد)، هـەم ئیمـام (عُمَـر) لەگـەڵ حـەزرەتی(عِتبـان بـن مالِـك)، هـەم

**جا بەم برایەتییە هەر دوو لا میراتیان لە یەکتری دەگرت نەك بە خزمایەتی؟ چونکە ئەم برایەتییە لە خزمایەتی بەهێزتر بوو.**

﴿عن ابن عَبّاس-رضی الله عنهما- فِي تَفْسِيرِ قَوْلِهِ تَعالَى (وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ): كانَ الْمُهاجِرُونَ لَمّا قَدِمُوا الْمَدِينَةَ يَرِثُ الْمُهَاجِرِيُّ الأَنْصَارِيَّ دُونَ ذَوِى رَحِمِهِ لِلأُخُوَّةِ الَّتِى آخَى النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَهُمْ، فَلَمّا نَزَلَتْ: (وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ)، نُسِخَتْ﴾ رواه البخاري، **کە (مُهاجِر) هاتنە (مَدِينَة)، میراتیان لە (أنْصارِي)یەکان دەگرت بە هۆی ئەو برایەتییەی پێغەمبەر ﷺ لە نێوانیاندا کردبووی، ئینجا ئەم میراتگرتنە (نَسْخ) بۆوە بە ئایەتی** ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ﴾ النساء: ٣٣، **واتە: بۆ هەر کەسەتان میراتگرمان داناون.** (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢٣١و٢٣٢) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٣٣٨).

## ﴿ گولبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: پێغەمبەر ﷺ (مُهَاجِر)و (أَنْصار)ی کردنە برای یەکتری.** هەر دەوڵەتێك دابمەزرێ، جێگیر نابێ و بەرەو پێش ناچێ تەنها لە سەر بناغەی یەکیەتی و یەکگرتنی هاوڵاتیانی نەبێ، ئەم یەکیەتیەش دروست نابێ تەنها بە برایەتی و خۆشویستن نەبێ، برایەتیەکەش دەبی لە سەر یەك بیروباوەڕ بێ؟ چونکە ئەگەر دوو کەس بیروباوەڕیان لێك جیاواز بێ، ئەوە برایەتی نێوانیان وەك خەیاڵێکی خاوەو سەر ناگرێ، بۆیێ پێغەمبەر ﷺ بیروباوەڕی ئیسلامی کردە بناغەی ئەم برایەتیەی نێوان (مُهَاجِر)و (أنصار)، ڕق و قینە لە نێوانیاندا نەبو و هەموویان بە یەکسانی هەستیان دەکرد: بەندەی یەك خودان و ئوممەتی یەك پێغەمبەرن و ﷺ گەوریی لە نێوانیاندا تەنها بە خواپەرستییە.

جا (مُهاجِر)و (أنْصار) ئەوەندە بە بێگەردی ئیسلامەتییان وەرگرتبوو و بە کرداریش جێبەجێیان دەکرد، تا وای لێهات ئەوان ببنە پێشەواو سەرمەشقی هەموو موسوڵمانان تا دونیا ماوە، تەماشا بکە خوایگەورە لە مەدحی (مُهاجِر)=کۆچکەرەکان دەفەرموێ: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللهِ وَرِضْوَاناً وَيَنْصُرُونَ اللهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ الحشر: ٨، **دەستکەوتووی غەزا بۆ ئەو هەژارە کۆچکەرانەیە کە لە لایەن کافرەکانی(مَكَّة) لە وڵات و ماڵیخۆیان دەرکراون، ئەوانیش وڵات و ماڵیخۆیان بەجێ هێشت، چونکە پاداشت و ڕازیبوونی خوایان دەوێ و یارمەتی ئایینی خواو پێغەمبەر ﷺ دەدەن، بەڕاستی ئەو کۆچکەرانە ڕاستگۆی ڕاستەقینەن.**

هەم لە مەدحی (اَلأَنْصار)=پشتیوانەکانی (مَدِينَة)ش دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّأُوا الدَّارَ وَالإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ

عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُــــونَ﴾الحشر: ٩،
**ئەوانەی لە (مَدِينَة)دا نیشتەجێ بون‌و ئیمانیشیان بە خـواو پێغەمبـەرﷺ هـەبوو پێش کۆچکردنی کۆچکەرەکانی (مَكَّة)، ئەوان ئەو کۆچکەرانەیان خۆش دەوێن کە بۆ لای ئەوان کۆچیان کردوە، هیچ ڕق‌و قینەشیان لە دڵدا نیە بە هۆی ئـەو ماڵـەی دراوەتە کۆچکەرەکان، پـشتیوانەکان کۆچـکەرەکان لـە خۆیـان بـە لەپێشتر دەزانـن هەرچەند بەخۆیـشیان پێویـستییان هـەبێ، هـەر کەسـانێك لـە بـەخیلی‌و قاڕنـانی بپارێزرێن، ئەوانە بەختەوەرو ڕزگاربوون.**
**بەڵێ: خوای‌گەورە مەدحی کۆچکەرەکانی کرد: بـەوەی وڵاتو ماڵی‌خۆیـان بـۆ ڕەزامەنـدی خوا بـەجێ هێـشت، مـەدحی پشتیوانەکانیـشی کـرد: کـە لـە سـەر خـاك‌و ماڵی‌خۆیـان بـۆ ڕەزامەندی خوا یامەرمەتی ئەو لێقەوماوانەیان داوە.**
**مەدحی کۆچـکەرەکانی کـرد: کـە یارمـەتی ئـایینی خـواو پێغەمبـەرﷺ دەدەن، مـەدحی پشتیوانەکانیشی کرد: کە پێیان خۆشە ئەو کۆچکەرانە هاتونـە لای ئـەوان‌و یارمەتیـشیان ئەدەن، چونکە ئەوان بۆ یارمەتی‌دانی ئایینی‌خوا کۆچیان کردوە.**
**مەدحی کۆچکەرەکانی کرد: کە ڕاستگۆی ڕاستەقینەن، چونکە بە کردار سەلماندیان خواو پێغەمبــەروﷺ ئــایین خۆشەویــسترن لــە وڵاتو مــاڵ‌و خــزم‌و کەســەکانیان، مــەدحی پشتیوانەکانیشی کرد: بە بەختەوەرو ڕزگاربوو، چونکە ئەوانیش لە ڕێگای خوا–بە کردار– وڵاتو ماڵ‌و خزم‌و کەسیان لە خزمەتی‌ئیسلام دانا.**
***دەك پیرۆزتان بێ ئەی (مُهاجِر)ەکانی ڕێگای خوا، ئەی ئەو کەسانەی خۆتان‌و وڵاتو خزم‌و کەسەکانتان بە قوربانی خواو پێغەمبەرﷺ کردن، پیرۆزتان بـێ ئـەو مەدحـەی سـورەتی (اَلْحَشْر)، کەسێك خوای‌گەورە لێی ڕازی بێ‌و مەدحی بکـاو لـە کۆچکردنەکەشـی هـاوڕێی پێغەمبەری خودا بێﷺ، چۆن بەندەیەکی وەکو من دەتـوانی باسـی گـەورەیی ئـەوان بـە تەواوی بنوسێ؟!.***
**جا ئێوەش ئەی (أَنْصار)ی (مَدِينَة)، پیرۆزتان بێ ئەو مەدحەی سورەتی(اَلْحَشْر)، بەندەیەکی وەکو من چۆن دەتـوانی باسـی گـەورەیی ئێـوە بکـا، خوای‌گـەورە لـە ئێـوە ڕازی بـووەو مەدحی ئێوەی کردوە، پێغەمبەریشﷺ ئێوەی کردۆتە جیاکـەرەوەی (إیمـان)و (نفـاق)و فەرموویـەتی:** ﴿اَلْأَنْصَارُ لاَ يُحِبُّهُمْ إِلاَّ مُؤْمِنٌ وَلاَ يُبْغِضُهُمْ إِلاَّ مُنافِقٌ، فَمَنْ أَحَبَّهُمْ أَحَبَّهُ اللّهُ وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ أَبْغَضَهُ اللّهُ﴾ رواه الشيخان، **تـەنها ئیمانـدار (الأنْـصار)=پـشتیوانەکانی خـۆش دەوێن‌و تەنها (مُنَافِق) ڕقی لێیان دەبێتـەوە، جا هـەر کەسێك (الأَنْـصار)ی خـۆش بـوێن خـودا خۆشـی بـوێ، هـەر کەسـێکیش ڕقـی لێیـان ببێتـەوە خـودا ڕقـی لێـی ببێتەوە. (اَللَّهُمَّ إِنَّ اْلأَجْرَ أَجْرُ اْلآخِرَة فَارْحَمِ اْلأَنْصَارَ وَالْمُهاجِرَة)** رواه البخاري.

به دەستكاریەوەلە (فقه السيرة، للبوطي) ل(٢٠٩) و(سيرةالصلاّبي) ب(١) ل(٥٤٢).

**دووەم: پێغەمبەرﷺ (مُهاجِر)و (أَنْصار)ی لە سەر بنچینەی ڕاستیو یارمەتیدان كردنە برای یەكتری**، یارمەتیدانی (أنْصارِي)یەكان گەیشتە ئەو ڕادەیە: حەزرەتی(سَعْد بن الرَّبِيع الأنصاري)ﷺ كرابووە برای حەزرەتی(عَبدالرَّحْمن بن عَوف)ﷺ، جا حەزرەتی(سَعْد) بە حەزرەتی(عبدالرَّحمن)ی گوت: برای خۆم من لە هەموو دانیشتووانی (مَدِينَة) ماڵم زۆرترەو دوو ژنم هەنە، وەرە: نیوەی ماڵی من بۆ خۆت ببەو لە ژنەكانیشم كامەیانت دەوێ بۆ تۆی تەڵاق دەدەمو لە دوای (عِدَّة) لە خۆتی مارە بكە!.

جا حەزرەتی(عبدالرحمن) گوتی: خوا بەرەكەت بخاتە ماڵو خێزانت، واتە: هیچێكیانی لێوەرنەگرتو گوتی: بازارم نیشان بدەن. جا حەزرەتی(عبدالرحمن)ﷺ چووە بازار، كەشكو ڕونی كڕینو فرۆشتنیو قازانجی كرد، جا پاش چەند ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ حەزرەتی (عبدالرحمن)ی دیت: خۆی جوانو بۆنخۆش كردوە، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿مَهْيَمْ﴾ ئەوە چی‌یە؟ حەزرەتی(عبدالرحمن)شﷺ گوتی: ژنێكم لە (أنصاری)یەكان لە خۆم مارە كردوە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿بارَكَ اللهُ لَكَ أَوْلِمْ وَلَوْ بِشاةٍ﴾ رواەالشيخان، **خوا لێت پیرۆز بكا، زیافەتی بوك گواستنەوەش بكە، هەرچەند بە مەڕێكیش بێ.**

جگە لەمەش: (أنصاری)یەكانیتریش بە پێغەمبەریانﷺ گوت: **(دارخورمایەكانمان لە نێوان ئێمەو برایەكانمان بەش بكە)**. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لا﴾ **دارخورمایەكان بەش ناكەم**. جا (أنصاری)یەكان فەرموویان: **(كەوابوو: لە كاركردنو خزمەتكردنی دارخورمایەكاندا یارمەتیمان بدەن، میوەی دارخورمایەكان لە نێوانماندا بە نیوەی بێ؟)**. جا (مُهاجِر)ەكان بەوە ڕازی بون، هەم خۆیانو خێزانەكانیشیان لە خانووەكانی (أنصار)دا نیشتەجێ بون تا جولەكەكان (بنیالنَّضیر) لە (مَدِينَة) دەركران، ئینجا (مُهاجِر)ەكان ماڵەكانیان گواستنەوە ناو خانووەكانی جولەكەكان.

هەروەها ئەو نیوەییەی دارخورمایەكانیش هەر بەردەوام بوو، تا غەزای (خَيْبَر) تەواو بوو، ئینجا (مُهاجِر)ەكان هەموو نیوەییەكانو بەخشراوەكانیان بۆ (أنصاری)یەكان گەڕاندەوە، واتە: چونكە پێویستی نەما. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢٣٣) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٣٣٧و٤١٦)، ب(٥) ل(٢٩٨).

**سێیەم: پێغەمبەرﷺ (مُهاجِر)و (أَنْصار)ی كردنە برا، تا میرات لە یەكتری بگرن.**

**بزانە**: بەم برایەتیە (مُهاجِر)و (أنْصار) میراتیان لە یەكتری دەگرت، تا لە غەزای (بَدْر) ئەم جۆرە میراتگرتنە (نَسْخ) بۆوە بە ئایەتی ﴿وَأُولُواالأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَـابِ اللهِ﴾ الأنفال: ٧٥، واتە: **خزمەكان بۆ میرات لەیەكتریگرتن لەپێشترن لە خەڵكیتر.**

چونكە مەبەست بەو برایەتیو میراتگرتنە ئەوە بوو: (مُهاجِر)ەكان وڵاتو خزمو كەسی خۆیان لە دڵدا نەمێنیو پاڵپشتیان دەست بكەوێو بحاوێنەوە، جا كە ئیسلام بەهێز بوو و

سەرکەوتو ئەو خەفەتانەش لە دڵیاندا نەمان، میراتگرتنەکەش نەماو بۆ خزمو کەسەکان گەڕاندرایەوە، بەڵام برایەتیی‌ئایینی لە نێوان موسوڵماناندا بە بەردەوامی مایەوەو لە میراتگرتنیشدا ئایین بە مەرج داندراوە، واتە: **ئەگەر میراتگر موسوڵمان نەبێ، میرات لە خزمە موسوڵمانەکەی ناگرێ، چونکە لە ئاییندا برای یەکتری نین.**

**چا بزانە:** فەرموودەکان وا دەگەیەنن: دوو جار ئەم جۆرە میراتەی بە برایەتی (نَسْخ) بۆتەوە، واتە: بەم ئایەتەو بە ئایەتی﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ﴾ی‌ڕابردوو. (فتح الباري) ب(٧) ل(٣٣٨)، ب(٨) ل(٣١٤) و(السيرةالحلبية) ب(٢) ل(١٢٧).

*** *** ***

## ﴿ نووسینی (دُسْتور) بۆ دەوڵەتی نوێی ئیسلام ﴾

هەر لە ساڵی یەکەمی کۆچی‌دا زۆرینەی خەڵکی (مَدينَة) بونە موسوڵمانو ژمارەی موسوڵمانان هەر لە زیادبووندا بوو، بۆیێ پێغەمبەرﷺ نووسراوێکی لە نێوان (مُهاجِر)و (أنصار)دا نوسی، هەر لەم نووسراوەشدا بڕیاری دا: جەنگ لە دژی جولەکەکانی (مَدينَة) نەکاو زیان لە یەکتری نەدەنو ئەوانیش یارمەتی هیچ دوژمنێکی ئیسلام نەدەن، بەم مەرجانە لە سەر ماڵو ئایینی‌خۆیان لە (مَدينَة)دا بمێننەوە. جا ئەم نووسراوە زۆر درێژەو (٤٧) چلو حەفت بڕیاری تێدانە، بەڵام ئێمە تەنها چەند خاڵێکی لێدەبژێرین:

**یەکەم:** موسوڵمانەکانی (قُرَيْش)=(مَكَّة)و موسوڵمانەکانی (مَدِينَة)و ئەو موسوڵمانانەش کە وەگەڵ ئەوان دەکەونو لەگەڵ ئەواندا (جِهاد) دەکەن، هەموویان یەك ئوممەتن، نەك خەڵکی‌تر.

**دووەم:** هەموو موسوڵمانەکان بەگوێرەی هۆزی‌خۆیان لە نێوان خۆیاندا خوێنی کوژراو دەدەنو دیلەکانیان ئازاد دەکەن.

**سێیەم:** نابی موسوڵمانان واز لەو موسوڵمانە بێنن: کە باری ژیانی گران بووە، دەبی بەگوێرەی توانا پێویستیەکەی بدەنێ.

**چوارەم:** موسوڵمانەکانی لەخواترس یەك دەستن لە دژی ئەو کەسەی ستەم دەکا، یان دەیەوێ کارێکی گەورەی ستەم، یان تاوان، یان دوژمنکاری، یان وێرانکاری ئەنجام بدا، ئەبی بە تێکڕایی لە دژی بوەستن، هەرچەند منداڵی یەکێکیانیش بێ.

**پێنجەم:** نابی موسوڵمان لە تۆڵەی کافرێك موسوڵمانێك بکوژێو نابی یارمەتی کافریش بدا لە دژی هیچ موسوڵمانێك.

**شەشەم:** هەر موسوڵمانێك باوەڕی بەم نووسراوە هێنابێو باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هێنابێ، بۆی دروست نیە: یارمەتی تاوانکارو بیدعەکار بدا، یان بیحاوێنێتەوە، لەعنەتو غەزەبی خودای لێبدا لە ڕۆژی قیامەت، خێری هیچ

واجب و سوننەتێکیشی لێوەرناگیری.

**حەفتەم: هەر شتێك لە نێوان خاوەنەکانی ئەم نووسراوە ڕووی دا، یان ململانەیەك کە مەترسی تێکدەرانەی لێبکرێ، ئەوە دەگەڕێندرێتەوە لای بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەیﷺ.** (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢٣٠و٢٣١) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٢٠٨و٢١٣).

## ﴿ دامەزراندنی بازاری موسوڵمانان ﴾

**بە هۆی کۆچکردنی (صَحابَة)کانی (مَکّة) بۆ (مَدِينَة)، ژمارەی موسوڵمانان لە (مَدِينَة)دا زیاد بوو و هەر لە زیادبوونیشدا بوو، بەڵام هێزی ئابووری هەر لە دەست جولەکەی (مَدِينَة)دا بوو، چونکە بازرگانیەکە لە دەست ئەواندا بوو و بە حەزکردنیخۆیان کەلوپەلی بازاڕیان گران دەکردو دەیانشاردەوە، بۆیە پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژئاوای مزگەوتەکەیخۆی شوێنێکی بۆ بازاری موسوڵمانان دیاری کردو فەرمووی:** ﴿هَذَا سُوقُكُمْ، فَلاَ يُنْتَقَصَنَّ وَلاَ يُضْرَبَنَّ عَلَيْهِ خَرَاجٌ﴾ رواه ابن ماجه، **ئەمە بازاڕی ئێوەیە–ئەی موسوڵمانان– لێتان تێك نادرێ و بەردەوام دەبێ و باجی لە سەر دانادرێ.**

## ﴿ سەر ژمێرکردنی موسوڵمانان ﴾

﴿عَنْ حُذَيْفَةَ رضي الله عنه قال النَّبِيُّﷺ: اُكْتُبُوا لِي مَنْ تَلَفَّظَ بِالإِسْلاَمِ مِنَ النَّاسِ. فَكَتَبْنَا لَهُ أَلْفاً وَخَمْسَمِأَةِ رَجُلٍ، فَقُلْنَا: نَخَافُ وَنَحْنُ أَلْفٌ وَخَمْسُمِأَةٍ؟...وَفِي رِوايَةٍ: فَوَجَدْنَاهُمْ خَمْسَمِأَةٍ. وَفِي رِوايَةَ: مَا بَيْنَ سِتِّمِأَةٍ إِلَى سَبْعِمِأَةٍ﴾ رواه البخاري، **پێغەمبەرﷺ فەرموی: بۆم سەرژمێر بکەن، ئەوانەی وشەی ئیسلامیان گوتووە، واتە: موسوڵمان بوینە. جا ئێمەش هەزارو پێنجسەد پیاوی موسوڵمانمان–لە (مَدِينَة)و دەوروبەری (مَدِينَة)– بۆ نوسین، جا گوتمان: چۆن ئێمە بترسێین؟ خۆ ئێمە هەزارو پێنجسەد پیاوین!...جا لەوانەش: پێنجسەد پیاو جەنگاوەری (مَدِينَة) بون، تێکڕای پیاوەکانی (مَدِينَة)– جەنگاوەر و ئەوانیتر– شەشسەد تا حافتسەد پیاوی موسوڵمان بون.**

جا بزانە: بەم لێکدانەوەیە، هەرسێك (روايَة)کانی حەدیسەکە تێك دەکەنەوە. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ب(٢) ل(١٨) و(فتح الباري) ب(٦) ل(٢١٥) و(سيرةالصلاّبي) ب(١) ل(٦٦٤).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: موسوڵمانەکانی (مَكّة)و (مَدِينَة)و ئەو موسوڵمانانەش کە وەگەڵ ئەوانیش دەکەون و لەگەڵ ئەواندا (جِهاد) دەکەن، هەموویان یەك ئوممەتن نەك خەڵکیتر.**

بەم بڕیارە پێغەمبەرﷺ یەکیەتی لە ناو موسوڵماناندا دروست کردو کردنیە یەك ئوممەت، هەر بەم بڕیارەش هەموو جیاوازیی هەرێمیو هۆزایەتیو بنەماڵەیی لە ناو ئوممەتی ئیسلامدا تاواوەو هیچ نرخێکی نەما، خوایگەورەش پشتگیری لەم بڕیارە کردو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ﴾ الأنبياء: ٩٢، **ئەم ڕێبازەی ئیسلام شەرعی ئێوەیە، ئێوەش یەك ئوممەتن، منیش خوای ئێوەمە، کەوابوو: بمپەرستن.**

بەڵێ، بەم بڕیارە: (أَبُولَهَب)ی مامی پێغەمبەرﷺ لە ئوممەتیئیسلام دەرکرا، (بِلال الْحَبَشِي)و (سَلْمانُ الْفارسِي)و (جابان الْكُرْدِي) هاتنە ناو ئۆممەتی ئیسلام، نەك تەنها هاتنە ناو ئوممەتیئیسلامو بەس، بەڵکو دەرهەق ئۆممەتیئیسلام پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لاَ فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى أَعْجَمِيٍّ وَلا لِأَعْجَمِيٍّ عَلَى عَرَبِيٍّ وَلاَ لِأَحْمَرَ عَلَى أَسْوَدَ وَلاَ لِأَسْوَدَ عَلَى أَحْمَرَ إلاّ بِالتَّقْوَى﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد، **لە ئیسلامدا هیچ گەورەییەك بۆ عەرەبێك نیە لە سەر عەجەمێك، هیچ گەورەییەك بۆ عەجەمێكیش نیە لە سەر عەرەبێك، هیچ گەورەییەك بۆ سۆرێك نیە لە سەر ڕەشێك، بۆ ڕەشێكیش لە سەر سۆرێك نیە، تەنها بە لەخواترسان نەبێ.**

بەڵێ، بەم بڕیارە: ئیمام (أَبُوبَكْر)و ئیمام (عُمر)و ئیمام (عُثمان)و ئیمام (عَلي) کە هەر چواریان (قُرَيْشي)نو لە هۆزەکەی پێغەمبەرنﷺ، وەك حەزرەتی(بِلال الْحَبَشِي) ئوممەتی پێغەمبەرنﷺ، بەلاَم بە لەخواترسان پلەو پایەیان بەرزترە، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ﴾الحجرات: ١٣، **ڕێزدارترتان لە لای خوا لەخواترسترەکانتانن.**

کەوابوو: باوكو براو خزمو کەسەکانیتر، ئەگەر موسوڵمان نەبون، ئەو خزمایەتیە بەرامبەر بە دۆستایەتیئیسلام هیچ نرخێكی نیە، چونکە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ﴾المائدة: ٥٥، **دۆستی ئێوە تەنها خواو پێغەمبەریخواوﷺ ئیماندارەکانن، ئەو ئیماندارانەی نوێژ ئەکەنو زەکات ئەدەنو ملکەچی فەرمانی خواو پێغەمبەرنﷺ.**

جا لە سەر ئەم بناغەیە یەکەم دەوڵەتی ئیسلامی یەك پارچەیی دامەزرێندرا.

**دووەم: نابێ موسوڵمانەکان واز لەو موسوڵمانە بێنن کە باری ژیانی گران بووەو دەبێ پێویستیەکەی بدەنێ.** بەم بڕیارەش پێغەمبەرﷺ هەموو مافی مرۆڤی چەسپاند و هەموو موسوڵمانەکانی کردنە لێپرسراوی یەکتری، بۆیە زانایانی شەرع فەرموویانە: (ئەو دەوڵەمەندانەی بژێوی ساڵێکیان زیاتر هەیە، لە سەریان واجبە: زیان لە سەر موسوڵمانان لابدەن، ئەگەر ئەم زیانە بە زەکاتو (بَيْتُ الْمال) لانەدەچوو: وەك پۆشاکی ڕووتەکانو بژێوی برسیەکانو پارەی پزیشكو دەرمان، جا ئەگەر لادانی ئەم زیانانە بە فەرمانی پێشەوای وڵات بوو، ئەو کاتە دەبێتە قەرز لە سەر (بَيْتُ الْمال)، واتە: کە (بَيْتُ الْمال) پارەی پەیدا بوو، ئەو مەسرەفانەیڕابردوو بۆ دەوڵەمەندەکان دەگەڕێنێتەوە. (تحفةالمحتاج بحاشيةالشرواني) ب(٩) ل(٢٢٠).

**سێیەم:** بڕیاری ژمارە چوار و شەش: **دەبێ موسوڵمانان بە تێکڕایی لە دژی ستەمکارو بیدعەکار بوەستنو ڕێگە نەدەن هیچ کەسێك کاری تێکدەرانە ئەنجام بدا هەرچەند منداڵی**

**یەکێکیانیش بێ**. بەم دوو بڕیارە پێغەمبەرﷺ گشت موسوڵمانێکی کردە بەرپرسیار بۆ پاراستنی دەوڵەتیئیسلام، جا ئەگەر موسوڵمانان ئەم بڕیارانە جێبەجێ بکەن، ئەو کاتە گشت موسوڵمانێك لە لایخۆیەوە دەبێتە بەرپرسیارێکی ئاساییش، مرۆڤی ستەمکارو بیدعەکار لە کۆمەڵگەیئیسلامدا جێگەی نابێتەوەو موسوڵمانان لە دژی دەوەستن، چونکە ئەو جۆرە مرۆڤە کۆمەڵگەی ئیسلام تێك دەدا، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ النَّاسَ إِذا رَأَوُا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللهُ بَعَذابٍ﴾رواه أصحاب السنن بسند صحيح، **هەر کاتێك خەڵك دیتی ستەمکار ستەم دەکا، ئەوانیش لە ستەمەکەی قەدەغەیان نەکرد، نزیکە خوایگەورە بە تێکڕایی سزایان بدا.**

جگە لەمەش: لە حەدیسدا لەعنەت بۆ یارمەتیدەری بیدعەکارانو ستەمکاران هاتووە، جا بە پلەییەکەم ستەمکار ئەو کەسانەن: کە یاسای دەستکرد بە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام دادەنێن، یان بە سەر خەڵکیدا دەیسەپێننو ڕەفتار بە شەریعەتیئیسلام ناکەن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾المائدە: ٤٥، **هەر کەسێك ڕەفتار نەکا بەو قوڕئانەی خوا ناردویەتیە خوارەوە، ئەوە ستەمکارە.**

**جا بزانە**: ئەوە لەو حاڵەتەدایە: کە باوەڕی بە قوڕئان هەبێو ڕەفتاری پێنەکا، بەڵام ئەگەر باوەڕیشی بە قوڕئان نەبێ، ئەو کاتە کافرە، هەروەك حەزرەتی(ابن عَبّاس)ﷺ لە تەفسیری ئایەتەکەدا فەرموویەتی. (تفسیر القرطبي) و(تفسیر ابن کثیر) المائدة (٤٤).

**چوارەم: نابی موسوڵمان لە تۆڵەی کافرێك موسوڵمانێك بکوژێ، نابی یارمەتی کافریش بدا لە دژی موسوڵمان**. یارمەتیدانی کافرەکان لە دژی موسوڵمانەکان نیشانەی بێهێزی ئیمانە، یان هەر نیشانەی بێئیمانییە، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿لا تَجدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ باللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾المجادلة: ٢٢، **ناگونجێ و دەستت ناکەوێ گەلێکی وەها هەبێ: باوەڕیان بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێ، لە هەمان کاتیشدا پشتگیری ئەو کەسانە بکەن کە دژایەتی خواو پێغەمبەرﷺ دەکەن، هەر چەند ئەو دژانەش باوکیخۆیان بن، یان کوڕیان بن، یان برایان بن، یان هۆزیخۆیان بن.**

واتە: باوەڕ بە خواو دۆستایەتی دوژمنانیخوا—بە یەکەوە—کۆ نابنەوە، کەوابوو: هەر کاتێك خۆشویستنی دوژمنانیخوا هاتە ناو دڵ، ئیمانی تێدا نامێنێ، بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أَوْثَقُ عُرَى الإيمانِ الْمُوالاَةُ فِي اللهِ وَالْمُعاداةُ فِي اللهِ وَالْحُبُّ فِي اللهِ وَالْبُغْضُ فِي اللهِ﴾ رواه الطبراني وأبوداود بسند صالح، **پتەوترین دەستپێوەگرەکانی ئیمان: دۆستایەتییە لە پێناوی خوا، دوژمنایەتییە لە پێناوی خوا، خۆشویستنە لە پێناوی خوا، ڕق لێهاتنە لە پێناوی خوا**. (صفوة التفاسیر) المجادلة: (٢٢) و(الترغیب والترهیب) ب(٤) ل(٢٤).

**پێنجەم: هەر شتێك لە نێوان خاوەنەكانی ئەم نووسراوەدا رووی دا: كە مەترسی تێكدانی لێبكرێ، ئەوە دەگەڕێندرێتەوە لای خواو پێغەمبەرەكەی**ﷺ. بەم بڕیارەش ئاشكرا بوو: **ئیسلام ئایین‌و دەوڵەتە**، یاسای دەوڵەتی‌ئیسلامیش هەموو سەرچاوەكەی لە خواو پێغەمبەرەوەیەﷺ-كە قورئان پیرۆزو حەدیسەكانی پێغەمبەرنﷺ- واتە: ئەو كاتە دەوڵەت بە دەوڵەتی‌ئیسلام دادەندرێ: كە بڕیارەكانی خواو پێغەمبەریﷺ تێدا جێبەجێ بكرێن ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ يوسف: ٤٠، **بڕیاردان تەنها مافی‌خوایە، خودا فەرمانی كردوە: جگە لەوی كەسی‌تر نەپەرستن، ئەوە ئایینی راستەقینەیە، بەڵام زۆرترینی خەڵك نازانن**.

**جا بزانە:** جولەكەكانی (مَدينَة)ش ملكەچی ئەم نووسراوەی پێغەمبەرﷺ بون‌و دانیان بەوەدا هێنابوو: كە دەسەڵاتداریەتی دەوڵەت بۆ پێغەمبەرﷺ بێ‌و ئەوانیش هەر لە سەر ئایینی خۆیان بن‌و لەژێر سێبەری دەوڵەتی‌ئیسلامدا بژیێن.

جا ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە: ئەو موسوڵمانانەی لە مەیدانی (جهاد) بەزیون‌و بوینە دیلی (علمانية)كان، لە (برلمان)و لە حكومەتدا بەشداری (علمانية)كان دەكەن، ئێرە دەكەنە بەڵگەی خۆیان، واتە: دەڵێن: جولەكە لەگەڵ موسوڵمانان لە (مَدينَة)دا بە هاوبەشی ژیاون؟ **سەیرە!!!** خۆ ئێمە ناڵێین: جولەكەو دیانەكان هاوڵاتیی دەوڵەت نەبن، بەڵكو دەڵێین: ئێوە چەواشەكارن‌و فێڵ لە خۆتان‌و لە خەڵكی‌تر دەكەن؟ چونكە لەم حكومەتەی ئیسلامدا تەنها یەك جولەكەش بەشدار نەبو، جووەكان خاوەنی هیچ بڕیارێك نەبون، بەڵكو ئەگەر كێشەیەك لە نێوان جووەكانیش رووی دابا، دەبوا حكومەتی‌ئیسلام بە بڕیاری خواو پێغەمبەرﷺ چارەسەری بكا، كەواتە: تەنها ئیسلام بڕیاردەرو دەسەڵاتدار بوو.

بەڵام بە پێچەوانەوە: ئێوە لە (برلمان)دا ملكەچی (علمانية)كانن‌و ئەگەر كێشەیەكیش روو بدا، ئێوەو ئەوان بە یاسای (طاغوت)ی (ديمقراطية) چارەسەری دەكەن‌و هیچ مافێك‌و هیچ دەسەڵاتێك نادەنە خواو پێغەمبەرﷺ، خوای‌گەورەش دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ النساء: ٥٩، **ئەگەر لە شتێكدا بووە كێشەتان، ئەو كێشەیە بگەڕێننەوە بۆ خواو پێغەمبەر**ﷺ-واتە: بە بڕیاری قورئان‌و حەدیس كێشەكە چارەسەر بكەن- **ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو بە رۆژی‌دواییی هەیە**.

**زانایانی ئایین فەرموویانە:** ئەم ئایەتە بەڵگەیە: هەر كەسێك-بە باوەڕەوە- كێشەكانی‌خۆی بە قورئان‌و حەدیس چارەسەر نەكا، ئەوە باوەڕی بە خواو رۆژی قیامەت نیە. بڕوانە (تفسير ابن كثير) و(تفسير الخازن) النساء (٥٩)، هەم بگەڕێوەبۆ باسی (برلمان)و هەڵبژاردن لەم كتێبەدا.

جا لە بەر گرنگی ئەم مەسەلەیە، خوای‌گەورە سوێند دەخواو دەفەرموێ: ﴿فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجاً مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا

تَسْلِيماً﴾ النساء: ٦٥، **سوێندم بە خوای تۆ-ئەی پێغەمبەرﷺ- ئەوان ئیمان ناهێنن تا ئەتۆ ئەکەنە (حَکَم)=ناوبژیکار لەو کێشەیەی لە نێوانیاندا ڕوو ئەدا، ئینجا لە ناو دڵیانیشدا نابی هیچ دڵتەنگیەك هەبێ بە هۆی ئەو بڕیارەی تۆ داوتە، دەبی بە ئاشکرایی و پەنهانی ملکەچی بڕیارەکەت بن.** (تفسیر ابن کثیر) النساء(٦٥).

**شەشەم: چەند ئادابو ڕەوشتێکی بازار،** پێغەمبەرﷺ فەرموی: ﴿هذا سُوقُكُمْ...﴾ **ئەمە بارزاری ئێوەیە...**جیاکردنەوەی بازاری موسوڵمانان لە بازاڕی جولەکەکانی (مَدِینَة)، بەڵگەیە: کە پێویستە بازاڕی موسوڵمانان جیاواز بێ لەگەڵ بازاری کافران: لە ڕووی حەڕامو حەڵاڵو ئەنجامدانی ڕەوشتە جوانەکانیئیسلام لە ناو بازاردا، جا پێغەمبەرﷺ ئیمام (عُمر)یﷺ کردبووە چاودێری بازاری (مَدینَة)، تاکو خەڵك بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام کڕینو فرۆشتن بکا، بۆیێ ئیمام (عُمر)ﷺ فەرموویەتی: **(لاَ يَبِيعُ فِي سُوقِنَا إلاَّ مَنْ تَفَقَّهَ فِي الدِّينِ) نابێ لە بازاڕی ئێمەی موسوڵماندا کڕینو فرۆشتن بکا، تەنها ئەو کەسە نەبێ: کە لە شەریعەتیئیسلام تێگەیشتبێ.**

جا پێغەمبەرﷺ چەند ئادابو ڕەوشتێکی بازاری داناون، پێویستە مرۆڤی موسوڵمان جێبەجێیان بکا، وەك: ئاوەدانکردنو پڕکردنی بازاڕ بە هێنانی کەلوپەلێکی زۆر بۆ پێکهێنانی پێویستیەکانی موسوڵمانان، هەم خۆپاراستن لە گرانکردنی نرخو لە شاردنەوەی کەلوپەل لە کاتی پێویستیدا، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلْجَالِبُ مَرْزُوقٌ وَالْمُحْتَكِرُ مَلْعُونٌ﴾ رواه ابن ماجه والحاکم بسند ضعیف لکنه یعمل به فی الترغیب والترهیب، **ئەوەی کەلوپەلێکی زۆر دەهێنێتە بازار خوا ڕزقی زۆر دەکا، ئەوەی کەل و پەلی پێویست دەشارێتەوە بۆ کاتی گرانی، دورە لە ڕەحمەتیخوا.**

هەم خۆپاراستن لە زۆر سوێندخواردن-بە درۆ، یان بە ڕاست- پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إيَّاكُمْ وَكَثْرَةَ الْحَلِفِ فِي الْبَيْعِ فَإنَّهُ يُنْفِقُ ثُمَّ يَمْحَقُ﴾ رواه مسلم، **خۆتان بپارێزن لە زۆر سوێندخواردن لە کڕینو فرۆشتندا، چونکە سوێندەکەماڵەکە دەفرۆشێ، ئینجا بەرەکەتی لێ لادەبا.**

هەم خۆپاراسن لە فێڵ کردنو خیانەت کردن لە فرۆشتنو لە پێوانو لە کێشاندا، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا﴾ رواه مسلم، **هەر کەسێك خیانەتو فێڵ لە ئێمەی موسوڵمان بکا، ئەوە لە سەر ڕێبازی ئێمە نیە.**

هەم وەکو خۆپاراستن لە هەڵگرتنی چەك لە ناو بازاردا، هەم وەکو خۆپاراستن لە پیسکردنی بازاڕو ڕێگەکان، هەروەها سوننەتە: مرۆڤی بازرگان نەرمو لە سەر خۆ بێو چاوپۆشی لە برای موسوڵمانی بکا، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ أَقَالَ مُسْلِماً بَيْعَتَهُ أَقَالَـهُ اللهُ عَثْرَتَـهُ يَـوْمَ الْقِيامَةِ﴾ رواه إبن حبان وصححه الحاکم، **هەر کەسێك چاوپۆشی پەشیمانبوونەوەی مامڵەت**

**لە برای موسوڵمانی بكا، خوایگەورە لە ڕۆژی قیامەت چاوپۆشی لێدەكا.**

**هەروەها پێغەمبەرﷺ ڕێنموونیی كردوین: كە چوینە ناو بـازاڕ بڵـێین:** ﴿لاإِلَهَ إلاَّاللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُـــلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ حديث حسن وراه الترمذي والحاكم وابن ماجه. به دەستكاریەوە (سیرةالصلاّبي) ب(١) ل(٦٦٥-٦٦٨).

**حەفتەم: گومرگ و باج لە ئیسلامدا نیە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:** ﴿لاَ يُضْرَبَنَّ عَلَيْهِ خَرَاجٌ﴾ **ئەم بازارە باجی لە سەر دانانرێ. ئەمەش بەڵگەیە: كە دروست نیە هیچ جۆرە باجێك لە بازرگانەكانی موسوڵمان وەربگیرێ، چونكە ئەو باجە بەشێكی گومرگە، بە (إِجْماع)ی زانایانی ئیسلام: حەرامە گومرگ لە موسوڵمانان وەربگیری، هەر كەسێكیش گومرگ بە حەڵاڵ دابنێ، ئـەوە كـافر دەبـێ، هـەروەك زانایـانی شـەرع لـە باسـی كافربوونـدا فەرموویانـە، چـونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ صاحِبُ مَكْسٍ، يَعْنِي الْعَـــشّارَ﴾ رواه الإمـام أحمد وصححه الحاكم على شرط مسلم، **ئەو كەسەی گومرگ وەردەگرێ ناچێتە بەهەشت.**

**بەڵام دروستە: بە ئەندازەی دەیەك گومرگ لەو كافرانە وەربگیرێ: كە بۆ بازرگانی دێنە ناو وڵاتیئیسلام، پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی:** ﴿إِنَّمَا الْعُشُورُ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصارَى وَلَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ عُشُورٌ﴾ رواه أبـوداود بـسند صـالح، **دەیـەكی بازرگـانی تـەنها لـە سـەر جولەكـەو گاورەكانە، موسوڵمانان هیچ دەیەكی بازرگانییان لە سەر نیە.**

**جا وەرگرتنی ئەم دەیەكەش بەگوێرە پێكهـاتنی كاربەدەسـتی موسـوڵمانە: ئایـا لـە هـەر ساڵێكدا جارێك بێ، یان لە هەر كاروانێك جارێك، جا ئەو دەیەكەش وەكو سەرانە لە (بَيْـتُ المال)ی موسوڵمانان دادەندرێو بۆ بەرژەوەنـدی موسـوڵمانان سـەرف دەكـرێ.** (مغنـی ابـن قدامة) ب(١٠) ل(٥٩٢-٥٩٥) و(تحفةالمحتاج بحاشيةالشرواني) ب(٩) ل(٨٧و٢٨٢) و(ردالمحتـار علـى الـدرالمختار لإبن عابدين) ب(٣) ل(٢٤٤).

**هەشتەم: پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: موسوڵمانەكان سەرژمێر بكرێن. ئەمەش بەڵگەیـە: كـە سەرژمێركردنو تۆماركردنی دانیشتووانو لەشكریئیسلام، شتێكی شەرعیەو هەم پێویستە بۆ كاتی پێویست جەنگاوەركانو ئەوانیتر لێك جیا بكرێنەوە، جـا (الـصلاّبي) فەرموویـەتی: ئەم سـەرژمێركردنە لـە سـاڵیەكەمی كۆچـیدا بـوو...لـە دوای ئـەم سـەرژمێركردنە غـەزا= (جِهاد)ی چەكداری دەستی پێكرد، جا ئەم سەرژمێریەش بەشێك بوو لە بەرەوپێش بـردنو ڕێكخستنی دەوڵەتی تازە پێگەیشتووی ئیسلام.** (سيرة الصَلاّبي) ب(١) ل(٦٣٢).

*** *** ***

## ﴿حەزرەتی (جابان)ی كوردیڤ دەبێتە (صَحابَة)ی پێغەمبەرﷺ﴾

**ئەی كوردی موسوڵمانی ڕێزدار: زۆر جار دەخوێنیەوە، یان گوێت لێدەبێ: (صُهَیب)ی ڕۆمـی، (بـلال)ی حەبەشـی، (سَـلمان)ی فارسـیڤ. بـەڵام زۆر كـەم نـاوی (جابـان)ی**

کوردی‌ﷺ دەبیسی! کە ئەویش-وەکو ئەو سێ بەرێزانە-(صَحابَة)یەکی پێغەمبەرەﷺ؟ هۆیەکەشی ئەمەیە: ئەو سێ بەرێزانە تا پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد هەر لە (مَدِینَة) بون، بەڵام حەزرەتی(جابان)ﷺ گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان.

جا لێرەدا گرنگ ئەوەیە: ئێمەی کورد شوکریخوا بکەین‌و هەم شانازیش بەوە بکەین: کە ئێمەش (صَحابَة)یەکمان هەیەو لە (شارەزور)ەوە چوەتە (مَدِینَة)ی پیرۆزو لە خزمەت پێغەمبەرﷺ موسوڵمان بووە، کەواتە: ئێمەش لە سەرەتای ئیسلامەوە لە خزمەتی ئایینی ئیسلامدا بوین، فالحمد لله على هذه النعمة.

(السَّيِّد الآلوسي) لە تەفسیری سورەتی(إِنَّا فَتَحْنا) ئایەتی(١٦) دەفەرموێ: کوردەکان بە ئازایەتی ناسراون‌و زۆریش پیاوی گەورەیان هەبووە، بەڵکو (صَحابَة)شیان هەبووە، (الحافظ: ابن حجرالعسقلاني) لە (الإصابَة)دا فەرموویەتی: ( **جابان** )ی **باوکی** ( **مَيْمُون** )، ئیمام (ابن مَندە) لە (أبِيخَلْدَة) گێڕاویەتیەوە: گوێم لە (مَيْمُون)ی کوڕی (جابان)ی کوردی بوو، ئەویش لە باوکیخۆی گێڕایەوە: ﴿أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّﷺ غَيْرَ مَرَّةٍ حَتَّى بَلَغَ عَشْراً، يَقُولُ: مَنْ تَزَوَّجَ اِمْرَأَةً وَهُوَ يَنْوِى أَنْ لاَ يُعْطِيَهَا الصِّداقَ لَقِيَ اللهَ وَهُوَ زانٍ﴾ رواه ابن منده في معرفة الصّحابَة، باوکم-(جابان)- فەرمووی: تا دە جار گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك ژنێك مارە بکاو نیەتیشی ئەوها بێ: مارەییەکەی نەداتێ، ئەوە لە ڕۆژی قیامەت دەگاتە دادگایخودا بە زیناکەر دادەندرێ. (تفسير روح المعاني لِلآلوسي) الفتح: (١٦)، هەم (إكمال الإكمال لابن نقطة البغدادي) باب (جابان).

جەنابی دکتۆر (عبدالله مصطفى) لە کتێبی (أمجادالأكراد)دا موسوڵمانبوونی (جابان)ی کوردیی بە درێژی باس کردوە، ئێمەش لێرەدا پوختەیەکی لێوەردەگرین‌و دەینوسین: لە دوای کۆچکردنی پێغەمبەرﷺپیاوماقوڵێکی کورد-کە ناوی (جابان) بوو- هاتە (مَدِینَة)ی پیرۆزو لە سەر دەستی پێغەمبەرﷺ موسوڵمان بوو، (جابان)ﷺ لەو ماوەیەی لە (مَدِینَة)دا مایەوە، بە خزمەت پێغەمبەرﷺ دەگەیشت‌و گوێی لە فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ دەگرت، بەڵام (جابان)ی کوردیﷺ تەنها دوو حەدیسی لە پێغەمبەرﷺ گێڕاونەوە، ئیتر (صَحابَة)ش نەیانزانی لە نێوان پێغەمبەرﷺ و (جابان)داﷺ باسی چی کراوە. لە کوڵبژێرەکەدا حەدیسەکان نوسراون.

ئینجا کە (جابان)ﷺ گەڕاوە بۆ کوردستان، بە لێهاتوویی‌خۆی توانی خۆی بگەیەنێتە ناو هێزە تایبەتیەکەی (کِسرَى)ی پاشای (فارس)و بیانکاتە موسوڵمان؟ چونکە ئەم هێزە تایبەتیەی (کِسرَى) گشتی کورد بون‌و ژمارەیان پێنج هەزارسەرباز بوو، (دێلم) سەرکردایەتیی دەکردن، جا بۆیێ (کِسرَى) ئەو کوردانەی کردبونە پاسەوانی تایبەتی خۆی، چونکە متمانەی بە فارسەکان نەدەکرد.

ئینجا كه له ساڵی (١٥)ی كۆچی لەشكریئیسلام به سەركردایەتی (سَعْد بن أبيوَقَّاص)ﷺ لـه (الْقادِسِـيَّة)دا ڕووبـەڕووی لـه شـكری كافرەكـانی (فـارس) بونـەوە-كـه (رُسـتم) سـەركردەیان بـوو- لـه ناكـاو (سَـعْد)ﷺ دیتـی: هێزێكـی فارسـی دەیـەوێ بـه دەورەی لەشكری ئیسلامدا بسوڕێتەوە، جا كه (سَعْد)ﷺ ئەو لەشكرەی دیت یەكسەر فەرمانی دا: هێزێكی سوارچاكی ئیسلام بەرەو ئەو لەشكرە بچێ. ئینجا كه هێزەكەی ئیسلام گەیـشته لای هێـزه فارسـیەكه، ئـەوان زۆر بـه گـەرمی سـەلامیان لێكـردنو گوتیـان: ئێمـه بـرای ئێوەینەو ماوەیەكی زۆره موسوڵمان بوینەو چاوەڕوانی ئەم ڕۆژەمان دەكرد، ئێـوه سـەبر بگرن تا به تەواوی دەسوڕێینەوە، ئیجا دەبینن چی به سەر لەشكری (رُستم) دێنین!.

ئیتر ئەم هێزه به دەورەی لەشكری (رُستم)دا سوڕاوەو له هـەموو لایەكـەوه بـه هـەموو جۆره چەكێك له لەشكرەكەیان دا و تێكیان شكاندو بونه پاڵپشتی لەشكری ئیسلام.

ئەم هێزەی تازه، هێزه تایبەتیەكەی (كِسْرى) بوو-كه هەمووی كورد بـون-، (كِسْرى) نەیـدەزانی ئـەو هێـزه موسـوڵمان بـووه، بـۆیێ بـه سـەركردایەتی (دێلـم) بـۆ پاڵپـشتی (رُستم) ناردبویه جەنگی (القادِسيَّة)، بـەڵام لـه ئەنجامـدا (رُسـتم) كوژرا و لـه شـكری (فارس)ش شكا و (كِسْرى)ش بەرەو ئێران هەڵات.

جا ئەم هێزه كوردیەش تێكەڵێ هێزی ئیسلام بـوو و پـێی دەگـوترا: (حَمْـراء دێلـم)، ئینجـا لەشـكری ئیـسلام-بـه كـوردو عەرەبـەوە- هێزەكـانی فارسـەكانیان ڕاو نـانو هەرێمەكانیان له ژێـر دەسـتی ئـەوان ڕزگـار كـردن، تـا (الْمَدائن)و (جَلَوْلاء)و (حُلْوان) گشتی ڕزگار كران.

## ﴿ ئیمام ( عُمَرﷺ ) فەرمانڕەوایی خـۆجێیی دەداته گەلی كورد ﴾

ئینجـا (سَـعْد بـن أبيوقـاص)ﷺ مـوژدەو چـۆنیەتی ئـەو سـەركەوتنانەی بـۆ ئیمـام (عُمر)ﷺ نارده (مَدينَة)، جا ئیمام (عمر)ﷺ فەرمانی دا: (سَلْمان الفارسي) بكرێتـه فەرمانڕەوای (الْمدائِن)=(سَلْمان پاك)، هەروەها دوو پیاوی كورد له لەشكرەكەی (حَمْراء دێلم) بكرێنه فەرمانڕەوای هەرێمه كوردیەكان: یەكێكیان له (جَلَوْلاء)، ئـەویتریش لـه (حُلْوان). ئەمه دەسكەوتو بەرهەمی (جهاد)ی نهێنی بوو: كـه (جابـان)ی (الـصَّحابي)و (دێلم)ی (التابعي) سەركردایەتییان كردبوو رضي الله عنهما.

جا ئـەوەش بزانـه: لـه دوای موسـوڵمانبوون، (جابـانﷺ) كـوڕێكی بـوو، نـاوی لێنـا: (مَيْمُون)، واته: پیرۆز،-ئاماژه بـۆ پیرۆزیـی ئیـسلام- كـەوابوو: (مَيْمُون)ی كوردی لـه چینی (التابعِين) دەژمێردرێو حەدیسی پێغەمبەریشیﷺ لـه بـاوكیخۆی گێڕاونـەوە، هەروەك له گوڵبژێرەكەدا ڕوونی دەكەینـەوە. (الفتح الاسلامی فی العراق والجزیرة، للمقدم عبدالحمید حسین ل(١٣١و١٦٢و١٧٧)، بڕوانه (أمجادالأكراد، للدكتور عبدالله مصطفى) ل(٢٩ تا ٤٠).

## ﴿ پێغەمبەرﷺ جل و بەرگی کوردی وەردەگرێ ﴾

﴿عن عائِشَةَ-رضي الله عنها- صَلَّى رَسُولُ اللهِﷺ فِي خَمِيصَةٍ لَهَا أَعْلاَمٌ، فَقالَﷺ: شَغَلَتْنِي أَعْلاَمُ هَذِهِ، اِذْهَبُوا بِهَا إِلَى أَبِىجَهْمٍ وَأْتُونِى بِإِنْبِجانِيَّتِهِ-وَفِي رِوايَةٍ عَنْها:-وَأَخَذَ كُرْدِيّاً كانَ لأَبِىجَهْمٍ، فَقِيلَ: يا رَسُولَ اللهِ اَلْخَمِيصَةُ كانَتْ خَيْراً مِنَ الْكُرْدِيِّ﴾حديث حسن رواه أبوداود في باب النظر في الصلاة، وشطره الأول في البخاري ومسلم، **پێغەمبەرﷺ نوێژی کرد و پەشتەماڵێکی ڕەنگاو ڕەنگی لەبەردا بوو، جا فەرمووی: ڕەنگاوڕەنگی ئەم پەشتەماڵە سەرقاڵی کردمو بیری لە نوێژ لادام، پەشتەماڵەکە بۆ (أبِيجَهْم) ببەنەوەو پەشتەماڵە سادەکەیم بۆ بێنن. جا-کە پێغەمبەرﷺ پەشتەماڵەکەی بۆ ناردەوە- پەشتەماڵێکی کوردیی (أبِيجَهْم)ی وەرگرت، جا گوترا: ئەی پێغەمبەری‌خوا پەشتەماڵە ڕەنگاوڕەنگەکە لەم کوردییە باشتر بوو. واتە: قوماشەکەی باشتر بوو، جا لە (عَوْن المَعْبُود) لە شەرحی حەدیسەکەدا فەرموویەتی: پەشتەماڵێکی کوردیی وەرگرت.**

**هەروەها لە حەدیسێکی (صحیح)دا هاتووە: پێغەمبەرﷺ شەرواڵی کڕیوە** ﴿عَنْ سُوَيْد بن قَيْسٍ﷜:...جاءَنا رَسُولُ اللهِﷺ فَساوَمَنا سَراوِيلَ فَبِعْنَاهُ وَثَمَّ رَجُلٌ يَزِنُ بِالْأَجْرِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِﷺ: زِنْ وَأَرْجِحْ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، **پێغەمبەرﷺ هاتە لامان مامەڵەی شەرواڵێکی لەگەڵ کردین، ئێمەش پێمان فرۆشت و پێغەمبەرﷺ بە پارەدەرەکەی فەرموو: پارەکەی بۆ بکێشەو زیادەشی بدێ.**

**جا ئیمامی(القسطلاني) فەرموویەتی: (سِرْوال) فارسییەو کراوەتە عەرەبی، لە زمانێکدا پێی دەگوترێ: (الشَّرْوال)=شەرواڵ.** (إرشاد الساري لشرح صحيح البخاري) ب(٣) ل(١٠٩).

**لە حەدیسێکیتردا حەزرەتی(أبیهُريرة)﷜ فەرموویەتی: ﴿لەگەڵ پێغەمبەرﷺ چوومە بازار، پێغەمبەرﷺ شەرواڵێکی کڕی بە چوار دیرهەم، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ شەرواڵ دەبەر دەکەی؟! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، لە سەفەرو لە ماڵەوە بە شەو و بە ڕۆژ، چونکە من فەرمانم پێکراوە: باش خۆم داپۆشم﴾.** (أبو يعلي والطبراني بسند ضعيف) گێڕاویەتیانەوە.

**جا ئاشکرایە بۆیێ پێغەمبەرﷺ شەرواڵی کڕیوە تاکو دەبەری بکا، چونکە بە ئیزنی پێغەمبەرﷺ لەو سەردەمدا شەرواڵیان دەبەر دەکرد.** (فتح الباري) ب(١) ل(٦٢٦)، ب(١٠) ل(٣٣٦).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: ( جابان )ی کوردی﷜ تەنها دوو حەدیسی لە پێغەمبەرﷺ گێڕاونەوە:**

**حەدیسی‌یەکەم:** ﴿عَنْ أبِىخَلْدَةَ، قالَ: سَمِعْتُ مَيْمُونَ الْكُرْدِيَّ وَهُوَ عِنْدَ مَالِكِ بن دِينارٍ، فَقالَ لَهُ مالِكُ بنُ دِينارٍ: ما لِلشَّيْخِ لا يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ؟ فَإِنَّ أَبَاكَ قَدْ أَدْرَكَ النَّبِيَّﷺ وَسَمِعَ

مِنْهُ. فَقالَ: كانَ أَبِي لا يُحَدِّثُنا عَنِ النَّبِيِّﷺ مَخافَةَ أَنْ يَزِيدَ أَوْ يَنْقُصَ، وَقالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَقُولُ: (مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ)﴾ رواه الطبراني في الاوسط، قال الحافظ الهيثمي: إسناده حسن إن شاء الله، (مَيْمُون)ى كوردى لە لاى (مالك بن دينار) بوو، جا (مالك) بە (مَيْمُون)ى فەرموو: بۆچى مامۆستا حەديسەكانى پێغەمبەرﷺ لە باوكىخۆى بۆ ئێمە ناگێڕێتەوە؟ خۆ باوكت بە خزمەت پێغەمبەرﷺ گەیشتبوو و لە پێغەمبەریشﷺ گوێى لە حەديس بووە. (مَيْمُون) فەرمووى: باوكم–زۆر–حەديسى بۆ نەدەگێڕاینەوە، لە ترسى ئەوەى نەوەك لە حەديسەكەدا زياد بكا، يان كەم بكا، باوكم فەرمووى: گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو دەيفەرموو: (**هەر كەسێك بە قەسدى لە سەر زمانى من درۆ بكا، با شوێنى خۆى لە ئاگر دۆزەخ ئامادە بكا**). (مجمع الزوائد ومنبع الفوائد) ب(١) ل(١٩٩).

**حەديسى دووەم:** ﴿عَنْ مَيْمُونِ الْكُرْدِيِّ عَنْ أَبِيهِ، قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَقُولُ: أَيُّمَا رَجُلٍ تَزَوَّجَ اِمْرَأَةً عَلَى مَا قَلَّ مِنَ الْمَهْرِ أَوْ كَثُرَ لَيْسَ فِي نَفْسِهِ أَنْ يُؤَدِّيَ إِلَيْهَا حَقَّهَا خَدَعَهَا فَمَاتَ وَلَمْ يُؤَدِّ إِلَيْهَا حَقَّهَا لَقِيَ اللهَ يَوْمَ الْقِيامَةِ وَهُوَ زانٍ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ اِسْتَدانَ دَيْناً لا يُرِيدُ أَنْ يُؤَدِّيَ إِلَى صَاحِبِهِ حَقَّهُ خَدَعَهُ حَتّىَ أَخَذَ مالَهُ، فَمَاتَ وَلَمْ يُؤَدِّ إِلَيْهِ دَيْنَهُ لَقِيَ اللهَ وَهُوَ سارِقٌ﴾ رواه الطبراني في الأوسط والصغير، قال الحافظان المنذري والهيثمي: رجاله ثقات، (مَيْمُون)ى كوردى گێڕاويەتيەوە: باوكم فەرمووى: گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو دەيفەرموو: (**هەر پياوێك ژنێك مارە بكا لە سەر مارييەكى كەم، يان زۆر، لە نيەتيشىدا نەبێ ماف ژنەكەى بداتە ژنەكەى و فێڵى لىٚكرد، جا مێردەكە مرد و مافەكەشى نەدايێ، ئەوە كە لە ڕۆژى قيامەت دەگاتە دادگاىخوا بە زيناكەر دادەندرێ، هەر پياوێكيش قەرزێك وەربگرێ و نەيەوێ مافەكە بداتەوە خاوەن قەرزەكە، فێڵى لىٚكرد تا ماڵەكەى لىٚوەرگرت، جا قەرزدارەكە مرد و قەرزەكەشى نەداوە خاوەن قەرزەكە، ئەوە لە ڕۆژى قيامەت دەگاتە دادگاىخودا بە دز دادەندرێ**). (مجمع الزوائد ومنبع الفوائد) ب(٤) ل(١٦٧) و(الترغيب والترهيب) ب(٢) ل(٦٠٢).

**جا بزانە:** كە لە (روايَة)ى (ابن منده)دا فەرموويەتى: (**تا دە جار گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو**). ئەوەش بەڵگەيە: كە حەزرەتى(جابان)ى كوردىرضي الله عنه لەو ماوەيەى لە (مَدِينَة) بووە كاتى خۆى بە فێرۆ نەداوەو زۆر بە خزمەت پێغەمبەرﷺ گەیشتووە، هەم پێغەمبەريشﷺ زۆر ڕێزى لىٚناوەو ڕاستەوخۆ لە ئاينىئيسلام شارەزاى كردوە.

هەم كە لە حەديسەكەى يەكەمى (الطبراني)دا (مَيْمُون) فەرمووى: (**باوكم دەترسا: نەوەك لە حەديسەكەدا زياد بكا، يان كەم بكا**). بەڵگەيە: كە حەزرەتى (جابان)ى كوردىرضي الله عنه (صَحابَة)يەكى لەخواترس بووەو خۆيشى لە (شُبُهات) پاراستووەو بە بێگەرديش ئاينى ئيسلامى ئەنجام داوە، شارەزاى ئيسلام بووە ئينجا لە (مَدِينَة) گەڕاوەتەوە كوردستان، بە

زانستی ئایینیەوەش گەڕاوەتەوە.
هەم کە هەردوو ئیمامەکان لە کۆتایی حەدیسەکەی‌دووەمدا فەرموویان: (رِجالُهُ ثِقاتٌ) پیاوەکانی حەدیسەکە باوەڕپێکراون. بەڵگەیە کە (مَیْمُون)ی کوڕی (جابان)ی کوردی‌رضي الله عنه لە گێڕانەوەی حەدیسەکانی‌پێغەمبەرﷺ ڕاستگۆ بووەو متمانەی پێ‌کراوە، والحمد لله رب العالمين.
**دووەم: (جابان)ی کوردی‌رضي الله عنه توانی خۆی بگەیەنێتە ناو هێزە تایبەتیەکەی (کِسْرى)و بیانکاتە موسوڵمان.** ئەمەش بەڵگەیە: کە گەلی کورد بە خۆشی‌خۆی موسوڵمان بووە، نەك بە جەنگو زۆرلێکردن، هەم زۆریش تامەزرۆی ئازادی‌و ڕزگاربوون بووە، بۆیێ هاتنی سوپای ئیسلامی بە هەلْ زانی بۆ ڕزگارکردنی کوردستان لە ژێر دەستی فارسەکانی ئاگرپەرست، اَلْحَمْدُلله کوردەکان سەرکەوتووش بونو بە دامەزرێنەرە دێرینەکانی (دارُ الإسْلام)ی کوردستان دادەندرێن.
**لە کۆتاییشدا بزانە:** ڕێکخستنی ناوخۆی نهێنی بۆ ئیسلام، بە (جِهاد)ێکی گەورە دادەندرێ‌و سودەکانی لە (جِهاد)ی چەکداری کەمتر نیە، داستانەکەی حەزرەتی(جابان)ی (الصحابي)و (دێلم)ی(التابعي) بەهێزترین بەڵگەیە.
**سێیەم: ئیمام (عُمَر)رضي الله عنه فەرمانڕەوایی خۆجێیی دەداتە گەلی کورد.** ئەمەش بەڵگەیە: لە سەر دادپەروەریی ئیمام (عُمررضي الله عنه)، هەم بەڵگەیە: کە ئیمام (عُمر)رضي الله عنه متمانەی بە گەلی کورد کردوە: کە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات لێهاتوونە، هەروەك لە جەنگیشدا سوارچاکی مەیدان بون.
جا بۆیێ ئیمام (عُمَر)رضي الله عنه تەنها دوو کوردی کردنە فەرمانڕەوا؟ چونکە لەو کاتدا لە خاکی کوردستان تەنها ئەو دوو هەرێمانە ڕزگار کرابونو لەو کاتدا (جَلَوْلاء)و (حُلْوان) دوو شاری گەورەو پایتەختی ئەو دوو هەرێمانە بون، کەواتە: ئیمام (عُمر)رضي الله عنه هەوڵ‌و تێکۆشانی کوردەکانی بە فیڕۆ نەداو زۆر بە نرخیشی نرخاند.
جەنابی دکتۆر (عبدالله) لێکی داوەتەوە: بەخشینی ساڵانەش زیاتر لە یەك ملیۆن دیرهەمی زیو لە لایەن ئیمام (عُمر)رضي الله عنه تەسلیمی (دێلم) دەکرا تاکو بە سەر سەربازەکانی کوردی (اَلْحَمْراء)دا بەشی بکا. (أمجاد الأكراد) ل(٣٨و٤١و٤٢).
ئینجا با شەمشەمە کوێرەکانی قین لەدڵ بە قینی‌خۆیان بخنکێن، کە لە بەرامبەر ئەم ڕاستی‌یەو ئەم ڕۆناکیە چاویان هەڵنایێ‌و دەڵێن: عەرەبەکان هاتونە کوردستان باوك‌و باپیرانی ئێمەیان کوشتونەو بە زۆرلێکردن گەلی کوردیان کردۆتە موسوڵمان!.
جا بۆ وەڵامی ئەم درۆو بوختانە، لەو قین لەدڵانە دەپرسین: ئەگەر گەلی کورد بە زۆرلێکردن موسوڵمان کرابێ، بۆچی لە چەند شوێنێکی کوردستاندا گاور=دیانەکان لە سەر ئایینی خۆیان ماونەوەو کەنێسەکانیشیان نەڕوخێندراونو هەر لە نزیك ئەوانیش موسوڵمانو مزگەوت

هەنە؟ یان ئەگەر بە زۆرلێکردن موسوڵمان کرابن، بۆچی کە سوپای ئیسلام گەڕاوە بۆ عەرەبستان، کوردەکان هەر بە موسوڵمانی مانەوەو ناوی ئیسلامییان لە منداڵەکانیان ناوەو زیاتر مزگەوتیان دروست کردن‌و بە هەزارەها زانای ئایینیان لێ هەڵکەوت؟.

ئیتر ئاشکرا بوو: زەمینی کوردستان‌و گۆڕستانەکانی کوردستان‌و دەنگی (اللهُ أكْبَر)ی مزگەوتەکانی کوردستان، هەر هەموویان شاهیدن: کە ئێوە درۆزن‌و بوختانکەرێکی قین لەدڵن -مُوتُو بِغَيْظِكُمْ- جا بە هەوڵدانی حەزرەتی(جابان)ی‌کوردی رضي الله عنه گەلی کورد بە سایەی ئیسلام رزگار بوو و فەرمانڕەواییشی وەرگرت، بەڵام ئێستا ئێوەی خائین‌و خۆفرۆش خاك‌و وڵات‌و ناموس‌و هەموو داهاتی کوردستان دەدەنە کافرەکان، ئینجا -وەك سەپانی پوشی- بە دەست بەتاڵی ماونەوەو جگە لە وێرانکاری هیچتان بۆ گەلی کورد نەکرد، إِنّا للهِ وَإِنّا إلَيْهِ راجِعُونَ.

**چوارەم: پێغەمبەر ﷺ پەشتەماڵێکی کوردیی (أبيجَهْم)ی وەرگرت...هتد.**

ئەگەر سەرتاسەری دونیا بگەڕێی لە بەرگی کوردی جوانترو داپۆشەرتر نیە، ئەوەندە شانازی‌یەش بەسە کە پێغەمبەر ﷺ شەرواڵی پەسند کردوە.

جا ئیمامی(القسطلاني) گێڕاویەتیەوە: یەکەم کەس کە شەرواڵی دەبەر کردوە: حەزرەتی (إبْراهِيم) پێغەمبەر بوو ﷺ، هەم حەزرەتی(موسى) پێغەمبەریش ﷺ شەرواڵی دەبەردا بوو لەو ڕۆژەی خوا گفتوگۆی لەگەڵ کرد...هەم فەرموویەتی: **لەوەدا بەڵگە هەیە: کە سوننەتە شەرواڵ دەبەر بکرێ.** (إرشاد الساري لشرح صحيح البخاري) ب(٨) ل(٤٢٧).

جا لەو کاتەوە کە گەلی کورد وازی لەم بەرگە ڕێزدارە هێناوە، کوردایەتی ڕاستەقینەی لەدەست داوە؟ بەڵێ: کەسێك نەتوانێ پۆشاکی ڕەسەنی باوك‌و باپیرانی بپارێزێ، ناشتوانێ نەتەوایەتی‌خۆی بپارێزێ، هەر بۆیێش ئیمام (عمر) رضي الله عنه قەدەغەی کردبوو: عەرەبە موسوڵمانەکان بەرگی عەرەبی دابنێن‌و بەرگی نەتەوەیەکی‌تر دبەر بکەن؟ واتە: تاکو بتوانن ڕەسنایەتی‌خۆیان بپارێزن. (عبقرية عُمر رضي الله عنه) ل(٣٩).

خۆزگە ئێمەی کوردیش غەمخۆرێکی دادپەروەرمان هەبوایە: جلو بەرگی کوردی‌ی بە سەر گەلی کورددا سەپاندبا، تاکو هەست بە کوردایەتی‌خۆمان بکەین، بەڵام بە داخەوە: ئێستا چەند کەسانێکی کورد شەرواڵی کوردی بە کۆنەپەرستی دادەنێن‌و بە سوکی تەماشای دەکەن، بەڵکو ئەوانەی لافی کوردایەتی لێدەدەن، هەر نازانن شەرواڵی کوردی، دەرپێیەکەو دۆخینەکەی ببەستن، بەڵکو شانازی بە پانتۆڵ دەکەن کە ناشیرنترین بەرگی بێگانەیەو کافرەکان لە ناو گەلی کورددا بڵاویان کردۆتەوە، تاکو کوردەکانیش لاسای ئەوان بکەنەوە.



**جا بزانە:** بۆیێ پێغەمبەر ﷺ جلێکی‌تری لە (أبُوجَهْم) وەرگرت، تاکو دڵی نەشکێ‌و وا تێنەگا سوکایەتی‌ی پێکردوەو دیاریەکەی ڕەد کردۆتەوە، جا ئەوەش بەڵگەیە: ئەگەر پێبەخشراوەکە دیاریەکەی بۆ خاوەنەکەی گەڕاندەوە، دروستە لێی وەربگرێتەوەو بۆ خۆی سودی

لێوەربگرێ، بەو مەرجەی بەخۆی داوای گەڕاندنەوەی لێنەکردبێ. (فتح الباري) ب(١) ل(٦٢٦).

*** *** ***

## ﴿ باسی غەزایەکانی پێغەمبەرﷺ، واتە: ( جِهاد )ی چەکداری ﴾

بزانە: لە کتێبەکانی شەرعو حەدیسدا غەزا بە (جهاد)ی چەکداری دەگوترێ، واتە: لە ڕێگای‌خوا جەنگ لە دژی دوژمنانی‌ئیسلام بکرێ، بەڵام لە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەرداﷺ غەزا بۆ دەرچوونی لەشکرێك دەگوترێ: کە پێغەمبەرﷺ بەخۆی لەگەڵدا بوبێ بۆ جەنگی کافرەکان، جا جەنگ ڕووی‌دابێ، یان نا.

جا ئەگەر پێغەمبەرﷺ بەخۆی لەگەڵدا نەبوبێ، ئەو کاتە لەشکرەکە پێی دەگوترێ: (سَرِيَّة)، واتە: دەرچوونی پارچە لەشکرێك.

دیسان بزانە: ژمارەی غەزایەکانی پێغەمبەرﷺ (٢٧) بیستو حەفتن، لە وانەش: تەنها لە (٩) نۆ غەزادا جەنگ ڕووی داوە لە نێوان موسوڵمانو کافرەکان.

هەروەها (٤٧) چلو حەفت (سَرِيَّة)شی ناردون: لە هەندێکیان جەنگ ڕووی داوە لە نێوان موسوڵمانو کافرەکان، لە هەندێکیان ڕووی نەداوە.

جا ئیمامی(الحلبي) گێڕاویەتیەوە: بە (إِجماع)ی موسوڵمانان: ئەگەر موسوڵمانەکانیش لە جەنگدا شکابن، پێغەمبەرﷺ بەخۆی نەبەزیوەو لە جەنگدا هەڵنەهاتووە، بەڵکو هەر لە مەیدانی جەنگدا ماوەتەوەو بەرەو پێش هەڵمەتی بردوە.

ئیمام (علی)ﷺ فەرمویەتی: ﴿كُنّا إِذا حَمِيَ الْبَأْسُ وَلَقِيَ الْقَوْمُ الْقَوْمَ إتَّقَيْنا بِرَسُولِ اللهِﷺ فَلاَ يَكونُ أَحَدٌ مِنّا أَدْنَى إِلَى الْعَدُوِّ مِنْهُ﴾ حديث صحيح رواه النسائي والحاكم، لەو کاتەی جەنگ گەرم دەبوو و کافرو موسوڵمان دەگەیشتنە یەکتری، ئێمە خۆمان بە پێغەمبەرﷺ دەپاراست، هیچ کەسێك لە ئێمە بۆ لای دوژمن نزیکتر نەبو لە پێغەمبەرﷺ.

ئینجا کە پێغەمبەرﷺ (سَرِيَّة)=پارچە لەشکرێکی بۆ جەنگی کافران دەنارد، ئامۆژگاری دەکردنو دەیفەرموو: ﴿إِنْطَلِقُوا بِاسْمِ اللهِ وَبِاللهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللهِﷺ وَلاَ تَقْتُلوُا شَيْخاً فانِياً وَلاَ طِفْلاً صَغِيراً وَلاَ اِمْرأَةً وَلا تَغُلُّوا وَضُمُّوا غَنائِمَكُمْ وَأَصْلِحُوا وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، بە ناوی‌خوا وەڕێبکەون، پشت بە خوا ببەستن، لە سەر ڕێبازی پێغەمبەرﷺ جەگ بکەن: پیری بەساڵداچوو مەکوژن، منداڵی بچوك مەکوژن، ئافرەت مەکوژن، تاڵان مەدزن، تاڵانەکەی‌خۆتان پێکەوە کۆ بکەنەوە، چاکسازی بکەن، چاکە لەگەڵ خەڵکی بکەن، بەڕاستی خوای‌گەورە چاکەکارانی خۆش دەوێن.

جا کە پێغەمبەرﷺ دەچووە غەزای کافرەکان، یان (سَرِيَّة)ی دەناردە شەڕی کافرەکان، (اَلعَلَم)=ئاڵا، هەم (اَلرّايَة)=بەیداخی هەڵدەکردو دەیدا دەست یەکێك لە (صَحابَة)کانﷺ

﴿عَنْ ابن عَبّاسٍ رضي‌الله عنهما: كانَتْ رايَةُ النَّبيِّ ﷺ سَوْداءَ وَلِواؤُهُ أَبْيَضَ مَكْتُوبٌ عَلَيْهِ (لاَإلــهَ إلاّ اللّهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّهِ)﴾رواه الطبراني في الاوسط—قال الهيثمي—فيه راوٍ مجهول وبقية رجاله رجال الصحيح،

بەیداخـە بـچوکەکەی پێغەمبـەرﷺ ڕەش بـوو، ئـاڵا گەورەکەشـی سـپی بـوو—بـە نووسینێکی ڕەش– لە سەری نوسرابوو: (لاَإلهَ إلاّاللّهُ مُحَمَّد رَسُولُ اللّهِ).

کەواتە: هەر ئەم ئاڵایەشەش ئاڵای دەوڵەتی‌ئیسلامە، چونکە (الرّايَة)=بەیـداخ بـەو ئـاڵا بچوکە دەگوترێ: کە لەگەڵ سەرتیپەکانی لەشکردایە.

ئینجا ئێمە هـەموو (سَرِيَّة)کـان نانوسـین، بـەڵکو تـەنها هەنـدێکیان—لـە کاتی‌خۆیـدا— دەنوسین، بەڵام غەزایەکانی‌پێغەمبەرﷺ گشیان دەنوسین، إن شاءالله تعالى.

ئیمـامی(الزّهْـري) فەرموویـەتی: یەکـەم ئایـەت کـە لـەبارەی جـەنگ هاتـە خـوارەوە: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ الحج: ٣٩، واتـە: ئیـزن درا: ئەو موسوڵمانانەی جەنگیان لەگەڵ دەکرێ، ئەوانیش جەنگ بکەن، چونکە ئـەوان ستەمیان لێکراوە: بەوەی لە وڵات و ماڵی‌خۆیـان دەرکـراون. جا ئـەم ئیزندانـە لـە مانگی (صَفَر)ی ساڵی دووەمی کۆچی‌دا بوو.

﴿ یەکەم غەزای پێغەمبەرﷺ غەزای (وَدّان)=(اَلأَبْواء) بوو ﴾

ئینجا کە پێغەمبەرﷺ ئیزن درا، یەکسەر لە (١٢) دوانزەی ئەم مانگەی (صَفَر)ی ساڵی دووەمـی کۆچـی، بـەرەو (اَلأَبـواء) کەوتـە ڕێ، بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی (بَنِی‌ضَمْرَة)و کـاروانێکی (قُـرَيْش)، بـەڵام کـە گەیـشتە (وَدّان)، هـیچ جـەنگێك ڕووی نـەدا، چـونکە گەورەکەی (بَنِی‌ضَمْرَة) سولحێکی ئاشتی‌ی لەگەڵ پێغەمبەرﷺ مۆر کرد: کە ئەوان لە گیان‌و ماڵیان ئەمین بن، بەو مەرجەی جەنگ لە دژی ئیسلام نەکەن.

جا ئەمەیان یەکەم غەزای پێغەمبەرﷺ بوو—کە پێی دەگوترێ: غەزای (الأبْواء)، هەم (وَدّان)— ژمـارەی موسـوڵمانەکان (٢٠٠) دووسـەد جـەنگاوەر بـوو، بـە سـەرکردایەتی پێغەمبـەرﷺ، ئاڵایەکـەی پێغەمبـەریشﷺ ئیمـام (حَمْـزَة)ی مـامی پێغەمبـەرﷺ هەڵی‌ـدەگرت‌و حــەزرەتی(سَـعْد بــن عُبـادَة)ش‌رضي‌الله‌عنه کـارگێری (مَدِينَـة) بـوو، تـا پێغەمبەرﷺ—لە دوای پانزە شەو– لەو غەزایە گەڕایەوە بۆ (مَدِينَة).

﴿ (سَرِيَّة)ی (عُبَيْدة بن الحارث)و یەکەم بەیداخ و یەکەم تیری هاویشتراو لە ئیسلامدا ﴾

ئینجا لە مانگی (ربيع الأوّل)ی ساڵی دووەمی کۆچی، پێغەمبـەرﷺ پارچـە لەشـکرێکی پێکهاتوو لە شەست سوار، نارده (رابغ) بە سەرکردایەتی حەزرەتی(عُبَيْدَة بن الحارِث‌رضي‌الله‌عنه)، لەوێ لەگـەڵ کافرەکـانی (قُـرَيْش) بـە سـەرکردایەتی (أبُوسُفيان) ڕووبـەڕووی یـەکتری بونەوە، بـەڵام بـە تـیر هاویـشتن—نـەك شمـشێر– جا لـەم جەنگەدا یەکەم تـیر کـە لـە ئیـسلامدا بـەرەو کافرەکـان هاویـشترا، تیرەکـــەی حـــەزرەتی(سَـــعْد بـــن

أبىوَقّـاص) بـوو، هـەروەها بەيداخەكـەى ئـەم (سَـرِيَّة)ش يەكـەم بەيـداخ بـوو لـە ئيسلامدا بەستراوە.

ئيتر موسوڵمانەكانو كافرەكان وازيان لە يەكترى هێناو هيچ زيانێكى گيانيش لـە هـيچ لايەكيان نەبو، جا هەر لەم جەنگەدا حەزرەتى(الْمِقْداد بن عَمْرو بن الأسود)و حەزرەتى (عُتبة بن غَزْوان)-رضي الله عنهما- لە ناو لەشكرەكەى كافرەكان هـەڵاتنو هاتنـە نـاو لەشـكرى موسوڵمانەكان، چونكە ئەم دووانە پێشتر موسوڵمان بوبوون، جا بۆيێ لەگـەڵ لەشـكرى كافرەكان هاتبون، تاكو بگەنە ناو موسوڵمانان.

### ﴿ غەزاى ( بُواط ) لە لاى ( رَضْوَى )ى نزيك ( يَنْبَع ) ﴾

ئينجا هـەر لـەم مانگـەى (ربيع الأول)ى سـاڵىدووەمى كۆچى، پێغەمبـەرﷺ دووسـەد (صَحابَة)ى لەگەڵ خۆىدا برد، بۆ گرتنى كاروانێكى (قُرَيْش) بە سەرپەرشتى (أُمَيَّة بن خَلَـف)، تـا گەيـشتنە (بُـواط)، بـەڵام هـيچ جـەنگێك ڕووى نـەدا، پێغەمبـەروﷺ (صَحابَة)كان بە سەلامەتى گەڕانەوە بۆ (مَدِينة)، لەو غەزايەدا حەزرەتى(سَعْد بـن أبـى وقاص) ئاڵايەكەى پێغەمبەرىﷺ هەڵدەگرتو حەزرەتى(السائب بن مظعون)ش كارگێڕى (مَدِينة) بوو، تا پێغەمبەرﷺ لە مانگى (ربيع الآخر)دا گەڕاوە بۆ (مَدِينة).

### ﴿ غەزاى ( اَلْعُشَيْرَة ) لە كەنارى دەرياى سوور ﴾

ئينجا لـە مـانگى (جُمادَى‌الأولى)ى سـاڵى دووەمـى كۆچـىدا پێغەمبـەرﷺ سـەدو پـەنجا (صَحابَة)ى لەگـەڵ خـۆىدا بـرد بـۆ گرتنـى كـاروانێكى (قُـرَيْش) كـە بـە سەرپەرشـتى (أبُوسُفيان) بـەرەو (شـام) دەڕۆيـشت، بـەڵام كاروانەكـە بـە چـەند ڕۆژێـك پـێش هـاتنى پێغەمبەرﷺ تێپەرىبوو و نەيگەشتنێ، جا ئـەم كاروانـە لـە كـاتى گەڕانـەوەىدا بـووە هۆى غـەزا گەورەكـەى (بَـدر)، هـەروەك لـەوىدا باسـى دەكـەين، ان شاءالله تعالى، جا لـەم غەزايەشدا پێغەمبەرﷺ سولحى جەنگ نەكردنى لەگەڵ (بَنِـى مُـدلِج) مـۆر كـردو بـە سەلامەتى لە مانگى (جُمادَى‌الآخِرة)دا گەڕانـەوە بـۆ (مَدِيـنة)، جا هـەڵگرى ئاڵايەكـەى پێغەمبـەرﷺ لـەم غەزايـەدا ئيمـام (حَمـزَة)ى مـامى پێغەمبـەرﷺ بـوو، كـارگێرى (مَدِينة)ش حەزرەتى(أبُوسَلَمَة بن عَبْدالأسَد) بوو.

### ﴿ غەزاى ( سَفْوان )، كە پێى دەگوترێ: ( بَدْر الأُولى ) ﴾

كە پێغەمبەرﷺ لە غەزاى (اَلعُشَيْرة) گەڕاوە، لە مانگى (جُمادَى‌الآخِرة) لە دواى چەند شەوێكى كەم، (كُرز بن جابر الفِهْرِي) هێرشى كردە سەر ئاژەڵەكانى (مَدِينة) لەو كاتەى لـە لەوەڕگـەدا دەلـەوەڕان، چـەند وشـتر و ئاژەڵـەكانـىتريـشى بـە تـاڵان بـردن، جـا پێغەمبەرﷺ بەدواىدا چوو تا گەيـشتنە دۆڵـى (سَـفْوان) لـە لاى (بَـدر)، بـەڵام (كُـرز)

قورتـار بـوو و نـەگیرا، جـا لـەم غەزایـەدا هـەڵگری ئاڵایەکـەی پێغەمبـەرﷺ ئیمـام (عَلي)رضي الله عنه بوو، کارگێری (مَدِينَة)ش حەزرەتی(زَيد بن حارِثة)رضي الله عنه بوو، تا پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانرضي الله عنهم بە سەلامەتی گەڕانەوە بۆ (مَدِينة).

﴿(سَرِيَّة)ی (عبدالله بن جَحْش)رضي الله عنه یەکەم کوژراو و یەکەم دیلی کافرەکان﴾

لە مانگی (جُمادَى‌الأُخِرة)ی ساڵی دووەمی کۆچی‌دا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(عبـدالله بـن جَحْش)ی کردە (أمير)ی هەشت (صَحابَة)ورضي الله عنهم نامەیەکیشی بۆ نوسی‌و فەرمانی پێکرد: (تەماشای ئەم نامەیە نەکەی تا دوو ڕۆژان دەڕۆی، ئینجا تەماشای بکەو فەرمانی ناو نامەکە جێبەجێ بکەو زۆریش لە هیچ هاوڕێیەکت مەکە).

جا حەزرەتی(عبدالله)و (صَحابَة)کانرضي الله عنهم بەرەو (مَكّة) کەوتنە ڕێو لە دوای ڕۆیشتنی دوو ڕۆژان حەزرەتی(عبدالله)رضي الله عنه نامەکەی پێغەمبـەریﷺ کـردەوەو تەماشـای کـرد: تـێ‌یدا نوسـراوە: (کـاتێ تەماشـای نامەکـەی منـت کـرد، بـڕۆ تـا لـە (نَخْلَـة)ی نێـوان (مَکَّـة)و (طائِف) دادەبەزی‌و لەوێ چاودێری (قُرَيْش) بکەو هەواڵی ئەوانمان بۆ بزانە).

جا حـەزرەتی(عبـدالله)رضي الله عنه هـەواڵی نامەکـەی پێغەمبـەریﷺ بـە (صَـحابَة)کـانرضي الله عنهم ڕاگەیاندو ئەوانیش هەموویان گوێڕایەڵی نامەکە بونو ڕۆیشتن، بـەڵام کـە گەیـشتنە (بَحْران)، لەوێ حەزرەتی(سَعْد بن أبي‌وَقّاص)و حـەزرەتی(عُتبـة بـن غَـزْوان)-رضي الله عنهما- وشـــترەکەیان لێ ون بـــوو، بۆیـــێ ئـــەوان مانـــەوەو حـــەزرەتی(عبـــدالله)و شـــەش (صَحابَة)کەی‌تـریشرضي الله عنهم ڕۆیـشتن تـا گەیـشتنە (نَخْلَة)، لـەوێ کـاروانێکی (قُـرَيْش) بـە لایاندا تێپەڕی، مێوژو کەل‌وپـەلی بازرگانییـان هـەڵگرتبوو و لـە (طـائِف) دەگەڕانـەوەو چوار کاروانچی‌ لەگەڵدا بون.

جا (صَحابَة)کانرضي الله عنهم بڕیاریـان دا: جـەنگ لەگـەڵ کاروانـچیەکان بکـەن، جـا لـە یەکـەم شەوی (رَجَب)دا یەکێك لە (صَحابَة)کان (عَمْرو بن الحَضْرَمِي)ی کوشت–کە یەکێك بوو لە کاروانچیەکان–هەروەها: (عُثمان بن عبدالله)و (الحَکَم بن کیسان)ش–هـەردووکیان– بە دیل گیرانو کاروانچیەکەی‌چوارەمیش قورتـار بـوو، کەل‌وپـەلی کاروانەکـەش کەوتـە دەست (صَحابَة)کانرضي الله عنهم.

جـا ئـەم کـوژراوە، یەکـەم کـوژراوی کافرەکانـە بـە دەسـتی موسـوڵمانان، دوو دیلەکانیش یەکەم دیلی کافرەکانن بە دەستی موسـوڵمانان، دەستکەوتووەکەش یەکەم تاڵانی کافرانە بۆ موسوڵمانان.

جا کە دیلەکانو دەستکەوتووەکەیان هێنانەوە (مَدِينة)، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (مـن فەرمانم پێ‌نەکردبون لە (اَلشَّهْرُالْحَرام)دا جەنگ بکەن). ئیتر پێغەمبەرﷺ تاڵانەکەو

دیلەكانی ڕاگرتنو هیچیێكی لێوەرنگرتن، چونكە لەو كاتدا جەنگ لە چوار مانگەكەی (اَلشَهرُالحَرام)دا حەرام بوو، مانگی (رَجَب)ش یەكێكە لە چوار مانگەكەی (اَلحَرام)، بەلاّم (صَحابَة)كانی ئەم (سَرِيّة) وایان دەزانی ئەم شەوەش سیی مانگی (جُمادَى الآخِرة)یەو نەیانزانی: مانگەكە بیستو نۆیەو شەوەكە بووەتە یەكەم مانگی (رَجَب)، بۆیێ كافرەكانیش جەنگێكی پڕوپاگندەیان لە دژی موسوڵمانان دەست پێكردو گوتیان: (مُحَمَّد)وﷺ (صَحابَة)كانی لە مانگی (اَلحَرام)دا خوێنی ڕژاندو ماڵی بە تالاّن بردو پیاوەكانی دیل كردن.

جا بەم جەنگە پڕوپاگندەیە حەزرەتی(عبدالله)و هاوڕێكانیﷺ زۆر دڵتەنگ بونو پەشیمان بونەوە، بەلاّم خوایگەورە دڵتەنگیەكەی لابردو ئەم ئایەتەی نارده خوارەوەو فەرمووی: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَنْ سَبِيلِ اللهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِالْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِنْدَ اللهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ﴾ البقرة:٢١٧، ئەی پێغەمبەرﷺ لەبارەی جەنگ لە (اَلشَّهْرُالْحَرام)دا پرسیارت لێدەكەن؟ بڵێ: جەنگ لە (اَلشَّهْرُالْحَرام)دا گوناهێكی گەورەیە، بەلاّم قەدەغەكردنی خەڵكی لە ئایینی ئیسلامو كوفركردن بە خوایگەورەو قەدەغەكردنی خەڵكی لە (اَلْمَسْجِدُالْحَرام)و دەركردنی موسوڵمانانی دانیشتووی (اَلْمَسْجِدُالْحَرام)، ئەوانە گشتی لە لای خوا تاوانی گەورەترە لە كوشتنی ئەو كافرەی كوژراوە، هەم كافركردنەوەی موسوڵمانانیش بە ئازاردانو زۆرلێكردن ئەویش گوناهی لە كوشتن گەورەترە.

جا كە ئایەتەكە هاتە خوارەوە، پێغەمبەرﷺ تالاّنەكەو دیلەكانی وەرگرتنو (قُرَيْش)ش پارەیان نارد تاكو هەردوو دیلەكانیان بكڕنەوە، بەلاّم پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دیلەكان ئازاد ناكەم، تا (سَعْد)و (عُتبة)—كە وشترەكەیان ون كردبوو— دەگەڕێنەوە، ئینجا كە گەڕانەوە، پێغەمبەرﷺ هەردوو دیلەكانی ئازاد كردن، جا كە ئازاد كران: (الحَكَم) موسوڵمان بوو و لە (مَدينَة) مایەوە، (عُثمان)ش گەڕاوە (مَكّة)و بە كافری مرد.

﴿ گۆڕانی قیبلە : لە (بَيْتُ الْمُقَدَّس) بۆ (اَلْمَسْجِدُ الْحَرام) ﴾

قیبلەی موسوڵمانان گۆڕدرا: لە (بَيتُ اَلْمَقدَس) بۆ (اَلمَسجِدالحَرام)؟ چونكە پێغەمبەرﷺ لە (مَكّة)و هەم لە (مَدينَة)ش ماوەی شانزە مانگ، یان حەڤدە مانگ بەرەو (بَيْتُ اَلْمَقْدَس) نوێژی دەكردو لەو ماوەیەشدا هەر لە خوایگەورە دەپاڕاوە: قیبلەكەی بۆ بكاتە (اَلمَسجِدالحَرام)، ئینجا لە پانزەی (رَجَب)، یان پانزەی (شَعْبان)، پێغەمبەرﷺ نوێژی نیوەڕۆی لە مزگەوتی (بَنیسَلَمَة) بە جەماعەت بەرەو (قُدس) دەكرد، جا كە دوو ڕەكعەتی كردن، حەزرەتی(جُبْرائيل)عليه السلام—لە ناو نوێژدا— (وَحي) بۆ هێناو فەرمانی پێكرد: نوێژەكە بەرەو (كَعْبَة)=(اَلمَسجِدُ الحَرام) بكا.

جا پێغەمبەرووﷺ (صَحابَة)کانﷺ لە ناو نوێژدا یەکسەر خۆیان سوڕاندەوە لای (كَعْبَة)و دوو ڕەکعەتەکەیتریان بەرەو (كَعْبَة) تەواو کردن، بۆیێ بەم مزگەوتە دەگوترێ (مَسْجِدُالْقِبْلَتَيْن)=مزگەوتی دوو قیبلەکە.

جا بزانە: لە حەدیسی (صحیح)دا هاتووە: ﴿أَوَّلُ صَلاَةٍ صَلاَهَا رَسُولُ اللهِﷺ –أَيْ إِلَى الْكَعْبَةِ– صَلاَةُ الْعَصْرِ﴾ رواه الشيخان، یەکەم نوێژ کە پێغەمبەرﷺ بەرەو (كَعْبَة) کردویەتی: نوێژی عەسرە. مەبەست ئەوەیە: یەکەم نوێژی چوار ڕەکعەتی تەواو کە پێغەمبەرﷺ لە مزگەوتیخۆی بەرەو (كَعْبَة) کردویەتی، نوێژی عەسر بووە؟ چونکە نوێژی نیوەڕۆیەکەی لە مزگەوتیخۆی نەکردبوو، هەم بە تەواوەتیش بەرەو (كَعْبَة) نەیکردبوو، هەروەك (الحافظ: ابن حجرالعسقلاني) ڕوونی کردۆتەوە.

هەم ئەو فەرموودەیەشی بە ڕاست داناوە: کە لە نیوەی مانگی (رَجَب)دا قیبلە گۆڕاوە، نەك لە نیوەی (شَعْبان)؟ چونکە (رِوایَة)کەی شانزە مانگەکە، نیوە مانگەکەی هاتنی پێغەمبەرووﷺ نیوە مانگەکەی گۆڕانی قیبلەی بە یەك مانگ داناوە، (رِوايَة)ی حەڤدە مانگەکەش هەردوو نیوەکەی بە دوو مانگ داناون.

ئینجا یەکێك لە (صَحابَة)کان–کە نوێژی لەگەڵ پێغەمبەرﷺ کردبوو– لە (مَدِينَة)دا بە لای چینە (صَحابَة)یەکیتردا تێپەڕی، ئەوانیش لە نوێژی عەسریدا بون، جا (صَحابَة)کە پێی گوتن: شاهیدی دەدەم بەخۆم لەگەڵ پێغەمبەرﷺ نوێژم بەرەو (كَعْبَة) کرد. جا ئەوانیش لە ناو نوێژدا خۆیان بەرەو (كَعْبَة) سوڕاندەوە، واتە: هەر لەو ڕۆژەدا دانیشتووانی (مَدِينَة) ئەو هەواڵەیان گەیشتێ، بەڵام دانیشتووانی (قُباء) لە نوێژی سبەینێی ڕۆژی داهاتوودا ئەم هەواڵەیان گەیشتێ، واتە: ئەوانیش لە ناو نوێژی سبەینێدا خۆیان سوڕاندەوە لای (كَعْبَة).

﴿ واجببوونی زەکات و ڕۆژووی ڕەمەزان ﴾

ئینجا هەر لەم ساڵەیدووەمی کۆچیدا بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزانو سەرفیترەو زەکات واجب کرانو قوربانیو نوێژی جەژنەکان کرانە سوننەت.

جا بزانە: پێش ئەوەی ڕەمەزان واجب ببێ، پێغەمبەرووﷺ (صَحابَة)کان سێ ڕۆژان لە هەموو مانگێکداو هەم ڕۆژی (عاشوراء)ش بەڕۆژوو دەبون. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢٤١–٢٦٠) و(فتح الباری) ب(١) ل(١٣٠و٦٥١)، ب(٦) ل(١٥٣) و(السيرة الحلبية) ب(٢) ل(١٦٩–١٩٦) و(سيرةالصلاّبي) ب(١) ل(٦٢٨–٦٧٢).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: بڕیاری ( جِهاد )ی چەکداری، واتە: جەنگ لە دژی دوژمنانیئیسلام، لە ڕێگایخوا.**

( **جِهاد** ) بە واتە گشتیەکەی: تێکۆشانە بە گیانو ماڵو زوبان بۆ بەرزکردنەوەی

ئیسلام بە چەسپاندنی حوکمی‌خوداو نەهێشتنی دەسەلاتی کوفر، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿جاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ﴾رواه الإمام أحمد والنسائي وصححه الحاكم، **جیهاد لە دژی کافرەکان بکەن: بە ماڵتان و بە گیانتان و بە زوبانتان.**

**جا بزانە:** تێکۆشانی چەکداری–کە پێی دەگوترێ: غەزا– لە بەشەکانی تری (جِهاد) گەورەترە، چونکە گیانی خۆی فرۆشتۆتە خوای گەورە.

ئیمام (ابن حجر) لە (تحفة)دا فەرموویەتی: (إبن أبیعصرون) لە چەند حەدیسێکی (صحیح)ی وەرگرتووە: کە (جِهاد) لە هەموو کردەوەکانی مرۆڤ گەورەترە لە دوای ئیمان. ئیمامی(الأذرعي)ش ئەم رایەی هەڵبژاردوە.

واتە: چونکە پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێکرا: ﴿يَارَسُولَ اللهِ مَا يَعْدِلُ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللهِ تَعَالَى؟ قَالَ لاَ تَسْتَطِيعُونَهُ. فَأَعَادُوا عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً؟ كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ: لاَ تَسْتَطِيعُونَهُ. وَقَالَ فِي الثَّالِثَة: مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْقَانتِ بِآيَاتِ اللهِ لاَ يَفْتُرُ مِنْ صَلاَةٍ وَلاَ صِيَامٍ حَتَّى يَرْجِعَ الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللهِ﴾رواه الشيخان، **ئەی پێغەمبەری‌خواﷺ کام کردەوە بە قەد (جِهاد) خێری هەیە؟ فەرمووی: ناتوانن ئەو کردەوەیە بکەن. جا دوو جار، یان سێ جار پرسیارەکەیان کردەوەو هەر دەیفەرموو: ناتوانن. جا لە جاری سێیەمدا فەرمووی: خێری (مُجَاهِد)ی ڕێگای‌خوا وەکو خێری ئەو کەسەیە: کە بەردەوام بەڕۆژوو بێ و شەونوێژ بکاو قورئان بخوێنێ و هیچ کاتێك لە نوێژو ڕۆژوو نەوەستێ تا (مُجَاهِد)ەکە لە غەزا دەگەڕێتەوە.** (تحفةالمحتاج لشرح المنهاج) ب(٩) ل(٢١١).

**جا بزانە:** غەزا، واتە: (جِهاد)ی چەکداری بە چوار قۆناغدا تێپەڕیوە:

**قۆناغی یەکەم:** قۆناغی (مَكِّي)، کە قۆناغی تەنها بانگەوازیو خۆڕاگری بوو، لەم قۆناغەدا ماوەی سێزدە ساڵان پێغەمبەرﷺ لە (مَكَّة)دا مایەوەو خوای‌گەورە ڕێگای جەنگکردنی نەدایێ و فەرمانی پێدەکرد: ﴿فَاصْبِرْ﴾ المزمل: ١٠، **خۆت ڕابگرە.** هەم ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ النساء: ٦٣، **واز لە کافرەکان بێنە.**

ئیتر زیاتر لە حەفتا ئایەت لەبارەی قەدەغەکردنی جەنگ لە (مَكَّة)دا، هاتونەتە خوارەوە، بۆیێ کە (صَحابَة)کان لێیان دەدراو بریندار دەکران و سکاڵایان دەهێنا لای پێغەمبەرﷺ تاکو ئیزنیان بدا جەنگ بکەن، پێغەمبەرﷺ هەمان فەرمانی خۆڕاگرتنی دەدانێ و دەیفەرموو: ﴿أُمِرْتُ بِالْعَفْوِ فَلاَ تُقَاتِلُوا الْقَوْمَ﴾ حدیث صحیح رواه النسائی والبیهقی، **فەرمانی لێبوردنم پێکراوە، ئێوە جەنگ لەگەڵ ئەو کافرانە مەکەن.** هەروەك لە باسی ئازاردانی (صَحابَة)کاندا ڕوونمان کردەوە.

**قۆناغی دووەم:** قۆناغی بەرگری‌ی حەلاڵ، واتە: جەنگکردن لەگەڵ ئەو کافرانەی جەنگ لە دژی موسوڵمانان دەکەن. ئەم قۆناغە لە مانگی (صَفَر)ی ساڵی دووەمی کۆچی دەستی

پێکرد بە ئایەتی ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ الحج: ٣٩، **ئیزن درا ئەو موسوڵمانانەی جەنگیان لەگەڵ دەکرێ: ئەوانیش جەگ بکەن، چونکە ئەوان ستەمیان لێکراوە: کە لە وڵات و ماڵی خۆیان دەرکراون.** کەواتە: لەم قۆناغەشدا غەزا واجب نەبو، بەڵکو حەڵاڵ و ئیزن پێدراو بوو.

**قۆناغی سێیەم:** قۆناغی هێرشکردنی حەڵاڵ، واتە: جەنگکردن لە دژی گشت کافرێك، هەر چەند جەنگیش لە دژی ئیسلام نەکا، بەڵام بەو مەرجەی لە (اَلأشْهُرُالْحُرُم)دا نەبی، واتە: چوار مانگەکەی حەرام و رێزدار: کە (ذُوالْقَعْدَة)و (ذُوالْحِجَّة)و (مُحَرَّم)و (رَجَب)ن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا انْسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ﴾ التوبة:٥، **هەر کاتێك (اَلأشْهُرُالْحُرُم) تەواو بون، ئێوە کافرەکان بکوژن لە هەر کات و شوێنێکدا دەیانگەنێ، بیانگرن و گەمارۆیان بدەن و لە هەموو رێگایەك بۆیان لە بۆسە دانیشن.** کەواتە: لەم قۆناغەشدا غەزا واجب نەبو، بەڵکو -جگە لەو چوار مانگەدا- حەڵاڵ و ئیزن پێدرا بوو.

**قۆناغی چوارەم:** قۆناغی هێرشکردنی واجب، واتە: جەنگکردن بە واجبی لە دژی گشت کافرێك لە گشت کات و شوێنێکدا، هەرچەند کافرەکانیش جەنگ نەکەن، ئەم قۆناغەش لە دوای (فَتْح مَكَّة) واجب کرا بە هاتنی (آيَةالسَّيْف)=ئایەتی شمشێر، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً﴾ التوبة:٣٦، **جەنگ لە دژی کافرەکان بکەن بە گشتی لە گشت کات و شوێنێکدا.** واتە: هەرچەند لە ((اَلأشْهُرُالْحُرُم))شدا بێ.

جا بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام: لەم قۆناغەی چوارەمدا بڕیاری غەزا جێگیر بوو و بە واجب داندرا، تا دونیاش وێران دەبێ، ئەم واجببوونەی غەزا هەر بەردەوامە لە دژی گشت بتپەرست و بێدین و ئەوانەی دەبنە کۆسپ لە رێگای چەسپاندنی حوکمی خواو دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی راستەقینە، بەڵام جولەکەو دیان=گاورەکان ئەگەر ملکەچ بنو (جِزْيَة)= سەرانە بدەنە دەوڵەتی ئیسلام، ئەوانە جەنگیان لەگەڵ ناکرێ.

**جا ئەوەش بزانە:** بە فەرموودەی بەهێزتر: واجببوونی غەزا لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ (فَرْضُ الْكِفايَة) بوو، واتە: واجب نەبو گشت موسوڵمانێك بچێتە غەزا، تەنها لەو حاڵەتەدا دەبووە (فَرْضُ الْعَيْن): کە پێغەمبەر ﷺ جەنگاوەرکەی دیاری کردبا، یان ژمارەی موسوڵمانان کەم بوایەو کافرەکان دەورەیان دابان.

هەروەها لە دوای وەفاتی پێغەمبەریش ﷺ واجبیەکەی غەزا دەکرێتە دوو حاڵەت:

**حاڵەتی یەکەمیان:** ئەگەر کافرەکان لە وڵاتی خۆیان بن و مەبەستیان نەبێ بێنە ناو شارەکانی ئیسلام و زیان لە موسوڵمانان بدەن، ئەو کاتە بە (إجْماع)ی زانایانی ئیسلام: غەزا واجبە: بە (فَرْضُ الْكِفايَة)، واتە: ئەگەر لە هەر ساڵێکدا کۆمەڵە موسوڵمانێکی وەها غەزا بکەن کە

بەروەستی کافرەکان بکەن، ئەوە گوناهی نەکردنی غەزا لە سەر موسوڵمانانی‌تر لادەچێ.

**حاڵەتی‌دووەمیان:** ئەگەر کافرەکان هاتنە ناو شوێنێکی (دارُ‌الإسْلام): وەك شارێك، یان چیایەك، یان دورگەیەك، یان بە ئەندازەی دوو قۆناغ لە شارێکی ئیسلام نزیك بکەونەوە، ئەو کاتە غەزا دەبێتە (فَرْضُ الْعَیْن)و ڕاپەڕینی گشتی واجب دەبێ، واتە: لە سەر گشت موسوڵمانێك واجب دەبێ: بەگوێرەی گونجانو توانای خۆی بەرگری لە خاکی ئیسلام بکا، هەرچەند موسوڵمانەکە هەژارو قەرزاردارو ئافرەتیش بێ، چونکە هاتنی کافرەکان بۆ ناو (دارُ الإسْلام) کارەساتێکی گەورەیەو سەرشۆڕییە بۆ موسوڵمانان؟ چونکە کافرەکان بڕیاری‌خۆیان بە سەر موسوڵماناندا دەسەپێنن. (تحفة المحتاج بحاشیة الشرواني) ب(٩) ل(٢١٢و٢٣٥) و(السیرةالحلبیة) ب(٢) ل(١٧٠-١٧٢)و (فقه السیرة، للبوطي) ل(١٧٤).

## ﴿ ئامانجەکانی غەزایەکانی پێغەمبەرﷺ ﴾

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلْجِهادُ ماضٍ مُنْذُ بَعَثَنِی اللهُ-تَعالَی- إلَی أَنْ یُقاتِلَ آخِرُ هَذِهِ الْأُمَّةِ الدَّجّالَ، لا یُبْطِلُهُ جَوْرُ جائِرٍ وَلاَ عَدْلُ عَادِلٍ﴾ رواه أبوداود بسند صحیح، **(جِهاد) هەر واجبەو بەردەوامە لەو ڕۆژەوە کە خوا منی ناردوە بە پێغەمبەرﷺ تا ئەو ڕۆژەی دوایینی ئەم ئوممەتەی من جەنگ لە دژی (دَجّال) دەکا، ستەمی هیچ ستەمکارێكو دادپەروەریی هیچ دادپەروەرێك بڕیاری واجبوونی (جِهاد) بەتاڵ ناکاتەوە.**

واتە: جیاوازی نیە: فەرمانڕەوایەکانمان پیاوی چاك بن، یان خراپ بن، واجبە: (جِهاد) لە ژێر سەرکردایەتی ئەواندا هەر بکرێ، چونکە (جِهاد) واجبێکی گەورەیەو نابی بە هۆی تاوانباریی چەند کەسێك ئەم واجبەگرنگە دوابخرێ.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ یَزالُ الْجِهَادُ حُلْواً أَخْضَرَ ما قَطَرَ الْقَطْرُ مِنَ السَّماءِ، وَسَیأْتِی زَمانٌ عَلَی النَّاسِ یَقُولُ فِیهِ قُرّاءٌ مِنْهُمْ: لَیْسَ هَذا أَوانُ جِهادٍ. فَمَنْ أَدْرَكَ ذلِكَ الزَّمانَ فَنِعْمَ زَمانُ الْجِهَادِ، قالُوا: یَا رَسُولَ اللهِ وَأَحَدٌ یَقُولُ ذلِكَ؟! فقالﷺ: نَعَمْ، مَنْ عَلَیْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالْمَلائِكَةِ وَالنّاسِ أَجْمَعِینَ﴾ رواه الإمام أبوعَمْرو الدّاني فی الفتَن عن زَیْد بن أسْلَمﷺ، وروَی نَحْوَه الإمام ابن عَساکر فی تأریخ دِمَشق عن أنسٍﷺ بلفظ: ﴿أُولَئِكَ هُمْ وَقُودُ النّارِ﴾، **بەردەوام غەزاکردن هەر شیرنو سەوزە تا باران لە ئاسمان ببارێ، سەردەمێك بە سەر ئەو خەڵکەدا دێ هەندێ قوڕئانخوێن لەوان دەڵێن: ئێستا کاتی هیچ غەزایەك نیە. جا هەر کەسێك گەیشتە ئەو سەردەمە، ئەو کاتە سەردەمێکی چاکی غەزاکردنە. (صَحابَة)کانﷺ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چ کەسێك هەیە بڵێ: کاتی غەزا نیە؟! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەو کەسەی لەعنەتی خواو (مَلائِکَة)و خەڵکی بە تێکڕایی لە سەرە، ئەو دەڵێ: کاتی غەزا نیە. ئەوانە سوتەمەنی ئاگری دۆزەخن.**

(السنن الواردة فی الفتن) ب(١) ل(٤٢٣) و(تأریخ دِمَشق) ترجمة (عمار بن نصیر) ت(٥١٥٥).

**جا ئەمەش چەند ئامانجێکی غەزاکردنە لە ڕێگای خوا:**

**ئامانجیەکەم: پاراستنی (حاكِمِيَّة)=دادوەریەتی خوایگەورەو (عَقِيدَة)= بیروباوەڕی موسوڵمانان**، ئێمەی موسوڵمانان بیروباوەڕمان ئەوەیە: خوایگەورە تاكو تەنیایە: لە زاتو سیفاتو لە خوایەتیدا، واتە: خودا بە تەنهایی ئەم خەڵکەی دروست کردووەو بە تەنهایی دەیژێنێو بە تەنهایی دەیمرێنێ، لەم دروستکردەنەدا هیچ هاوبەشێکی نەبووەو هیچ کەسێك یارمەتیی نەداوە، کەوابوو: هەر ئەو خودایەش بە تەنهایی مافی (حاكِمِيَّة)= دادوەریەتی هەیە بە سەر دروستکراویخۆیدا، نابی هاوبەشی هەبێ، هەروەك دەفەرموێ: ﴿وَلا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَداً﴾الكهف: ٢٦، **خوایگەورە هیچ کەسێك ناکاتە هاوبەش لە (حُكْم)ی خۆیدا.**

کەوابوو: ئێستاش-وەك سەردەمی پێغەمبەرﷺ-غەزا واجبە: بۆ بنەبڕکردنو نەهێشتنی دەسەڵاتی ئەو ڕژێمانەی خۆیان بە سەر وڵاتیئیسلامدا سەپاندووەو (حاكِمِيَّة)ی خوای گەوریان قەدەغە کردووەو بونەتە کۆسپ لە ڕێگای بانگەوازی ئیسلامی ڕاستەقینە.

بەڵێ: هەر کەسێك مافیخوا قەدەغە بکا، هیچ مافێکی نیە لە (دارُالإِسْلام)دا حوکمڕانی موسوڵمانان بکا، بۆیێ خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾الأنفال: ٣٩، **جەنگ لە دژی کافرەکان بکەن تاکو ئاژاوەو دەسەڵاتی کوفر نەبێ و ئایین هەمووی بۆ خوا بێ و دەسەڵاتی کوفری لەگەڵدا نەبێ.**

**کەوابوو: ڕێبازی (علمانية)کان بە هیچ جۆرێك لەگەڵ ئیسلام ناگونجێ و لە هیچ ڕێگایەکدا تێك ناکەنەوە**، نابی مرۆڤی موسوڵمانیش ئەوەندە ساویلکە بێ: بە پێکهاتنێکی مامناوەنجی هەڵخەڵەتیو ڕازی ببێ: بەوەی (علمانية)کان تەنها ڕێگای نوێژو ڕۆژوو بدەنە موسوڵمانانو (حُكْم)ی خوایگەورەشیان لیقەدەغە بکەنو بە ناوی ئازادی هەموو بەدڕەوشتیەك بڵاو بکەنەوە؟ چونکە خوایگەورە بەم پێکهاتنە ڕازی نیەو دەفەرموێ: ﴿وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾ **ئایین هەر هەمووی بۆ خوابێ.**

هەم دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ﴾ الفتح: ٢٨، **خوا ئەو خوایەیە: کە پێغەمبەریخۆی-مُحَمَّدﷺ- ناردوە بە ئایینو شەریعەتێکی ڕاست، تاکو ئەو ئایینە بە سەر هەموو ئایینێکدا سەرکەوتوو بکا.**

ئیمامی(النواوي) لە قازی (عیاض) دەگێڕێتەوە: (زانایانیئیسلام یەکدەنگن: **نابی کافر ببێتە پێشەوای موسوڵمانان، جا ئەگەر پێشەوا بووە کافر، یان وازی لە نوێژکردن هێناو فەرمانی نوێژکردنی بە خەڵك نەدەکرد...یان گۆڕانکاری شەریعەتی ئیسلامی کرد، یان (بِدْعَة)ی بڵاو دەکردەوە، بەم تاوانانە لە کاربەدەستی دەکەوێو واجبە: موسوڵمانان لە دژی ڕاپەڕنو لای ببەنو یەکێکی**

دادپەروەر بکەنە پێشەوای خۆیان ئەگەر بۆیان بگونجێ، جا ئەگەر نەگونجاو توانایان نەبو، ئەو کاتە واجبە موسوڵمان لەو شوێنە کۆچ بکا بۆ شوێنێکی باش تاکو ئایینەکەی بپارێزێ). (شرح صحيح مسلم) ب(٨) ل(٣٥).

**ئامانجی دووەم: تاقیکردنەوەی موسوڵمانەکان و ئاشکراکردنی (مُنافق) و ناحەزانی ئیسلام،** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا لَوْلا نُزِّلَتْ سُورَةٌ فَإِذَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ مُحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا الْقِتَالُ رَأَيْتَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ يَنْظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ الْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ فَأَوْلَى لَهُمْ﴾ سورة مُحَمَّدﷺ: ٢٠، ئیماندارەکان دەڵێن: بریا سوورەتێك هاتبا خوارەوە فەرمانی غەزای پێکردباین-چونکە زۆر حەزیان لە غەزای ڕێگای خوا بوو- جا کە سوورەتێك دەهاتە خوارەوەو بە ئاشکرایی باسی غەزای تێدا دەکرا، دەبینی ئەوانەی نەخۆشی (نِفاق)یان لە ناو دڵدایە=دوو ڕوونە، تەماشای تۆ دەکەن چاویان زەق دەبێتەوە: وەك ئەو کەسەی مردنی بە سەردا دێ، چونکە ڕقیان لە غەزا دەبێتەوە، قوڕبەسەری و سزای دۆزەخ بۆ ئەوانەیە.

ئەی برای موسوڵمان: ئێستاش ئەو جۆرە دوو ڕووانە زۆرن و ڕقیان لە غەزا دەبێتەوەو بە شتێکی نامۆی دادەنێن و دەڵێن: ئێستا (ديمقراطية) لە گۆڕێیەو کاتی غەزا نەماوە!.

نەکەی بە قسەی ئەو گومڕابووانە هەڵخەڵەتێی و بچیە ڕیزی (مُنافق)=دوو ڕووەکان، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ وَلَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ ماتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنَ النِّفاقِ﴾ رواه مسلم، هەر کەسێك مردبێ و غەزای نەکردبێ و بە دڵیشیدا نەهاتبێ غەزا بکا، ئەوە لە سەر بەشێکی (نِفاق) دەمرێ. کەوابوو: ئەگەر پیاو بۆی نەگونجا غەزا بکا، ئەوە واجبە بە دڵ نیەتی غەزاکردنی هەبێ هەر کاتێك بۆی بگونجێ.

**ئامانجی سێیەم: نەهێشتنی دوژمنکاری و ستەم و زۆرداری،** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَكُمْ لا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيّاً وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيراً﴾ النساء:٧٥، ئەی ئیمانداران بۆچی ئێوە جەنگ ناکەن لە ڕێگای خواو لە ڕێگای ڕزگارکردنی چەوساوەکان: لە پیاوان و ئافرەتان و منداڵان، کە لە بەردەستی کافرەکاندا هاوار ئەکەن و دەڵێن: خودایە دەربازمان بکە لەو دێیەی دانیشتووەکانی ستەمکارن، خودایە لە لای خۆتەوە سەپەرشتکارێکمان بۆ دابنێ و یارمەتیدەرێکمان بۆ دابنێ تاکو لەم تەنگانەیە ڕزگارمان بکا.

کەوابوو: نەهێشتنی ستەم و ڕزگارکردنی چەوساوەکان واجبە: لە سەر گشت موسوڵمانێك، جا هیچ کەسێکیش لەو کەسانە ستەمکارتر نیە: کە یاسای دەستکرد بە سەر خەڵکیدا دەسەپێنن و یاسای خودایان لێ قەدەغە دەکەن.

**بەڵێ: ئەمە گەورەترین ستەمە: کە موسوڵمان لە وڵاتیخۆیدا مافی خوایخۆی لێ قەدەغە بکرێ. کەوابوو: (علمانیة)کان ستەمکارن؟ چونکە خۆیان بە سەر (دارُالإسْلام)دا سەپاندووەو بڕیاری (کُفْر)ی تێدا جێبەجێ ئەگەنو شەریعەتیئیسلامیش قەدەغە دەکەن.**

**ئامانجی چوارەم: پاراستنی بانگەوازیو دروشمەکانیئیسلاو خواپەرستی، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللهِ كَثِيراً﴾ الحج: ٤٠، ئەگەر خوایگەورە بە غەزاکردنی موسوڵمانان کافرەکانی بێدەسەڵات نەکردبان، ئەوە بێدینەکان خۆیان بە سەر هەموو ئایینێکدا دەسەپاندو دروشمی ئایینیان نەدەهێشتو پەرستگەو کەنیسەی دیانەکانو کەنیسەی جولەکەکانو مزگەوتەکانی موسوڵمانیان دەڕوخاند، ئەو مزگەوتانەی زۆر زیکریخوایان تێدا دەکری.**

*بە قوربانت بم خودایە، لە سەردەمی ئێستادا بە سەدان مزگەوت لە (ئیسپانیا)و (برتغال)و لەو وڵاتانەی شیوعیەکان داگیریان کردن، هەموویان کرانە مۆزەخانەو زیناخانە، بەشێکیشیان ڕوخێندران، کاکی موسوڵمانیش دەڵێ: ئێستا (دیمقراطیة) لە گۆڕێیەو کاتی غەزا نەماوە!؟*

*بەڵکو ئەگەر کەسێك لە(دارُ الإسْلام)شدا قسەیەکی ڕاست بکاو بانگەوازیی ئیسلام بکا، ئەوە شوێنەکەی لە بەندیخانە ئامادە کراوەو هەندێ جار خزمو کەسەکانیشی نایبیننەوە، بەڵام زیناکەرو شەڕابخۆرو بێناموس بە ئازادی دەگەڕێنو ڕێزیان لێدەنرێ، کاکی موسوڵمانیش دەڵێ: کاتی غەزا نەماوەو (دیمقراطیة) لە گۆڕێیە!.*

*وا نیە: ئێستا کاتی غەزایە بۆ بنەبڕکردنی ئەوکەسانەی دەبنە کۆسپ لە ڕێگای چەسپاندنی شەرعی خوداو بانگەوازیی ئیسلامو خواپەرستیی ڕاستەقینە.*

**ئامانجیپێنجەم: چاکسازیو پەروەردەکردنی موسوڵمانانو بێهێزکردنی کافرەکان، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللهِ وَعَدُوَّكُمْ﴾ الأنفال: ٦٠، ئامادە بکەن بۆ جەنگی کافرەکان هەر چەندی دەتوانن: لە هێزو بەخێوکردنی وڵاغەکان، تاکو بەو هێزە دوژمنی خواو دوژمنی خۆتان بترسێنن. پێغەمبەرﷺ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا سێ جار فەرمووی: ﴿أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ اَلرَّمْيُ﴾ رواه مسلم، ئاگادار بن مەبەست بەو هێزە: چەك هاوێشتنە.**

بەڵێ: پیاو بە هۆی چەك دەبێتە پیاو و دوژمن لێی دەترسێ، هەر کەسێکیش دوژمن لێی بترسێ دڵنیا دەبێ: کە دوژمن ناتوانێ زیانی لێبدا، ئەو ئایەتو حەدیسە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بووﷺ، ئێمە جێبەجێمان نەکردو دوژمنانیئیسلام ڕەفتاریان پێکردو هەموو جۆرە چەکێکیان دروست کردو خۆیان بە سەر موسوڵماناندا سەپاندو موسوڵمانانیش

–بە هۆی نەبوونی چەك– بونە ژێر دەستی ئەوان، بۆیی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ عَلِمَ الرَّمْيَ ثُمَّ تَرَكَهُ فَلَيْسَ مِنَّا﴾ رواه مسلم، **هەر کەسێك فێرە چەك هاوێشتن ببێ، ئینجا وازی لێبێنێ–لە بیری بچێتەوە– ئەوە لە ئۆممەتی ئێمە نیە.**

**جا بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە ئوممەتی ئێمە نیە، چونکە پیاوی موسوڵمان بە هۆی چەك دانان بێغیرەت دەبێو واز لە غەزا دێنێو دەکەوێتە ژێر دەستی دوژمن، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ:** ﴿إِلاّ تَنْفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَاباً أَلِيماً﴾ التوبة: ٣٩، **ئەگەر ئێوە ڕانەپەڕن بۆ غەزا، خوایگەورە عەزابتان دەدا بە عەزابێکی زۆر بە ئێش. واتە: لە دونیادا دوژمن بە سەرتاندا زاڵ دەبێو بارانیشتان بۆ ناباری، لە قیامەتیشدا بە ئاگر سزا دەدرێن.**

**هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿ما تَرَكَ قَوْمٌ الْجِهادَ إلاّ عَمَّهُمُ اللهُ بِالْعَذَابِ﴾ رواه الطبراني فی الاوسط بسند حسن، **هەر گەلێك واز لە (جِهاد)=غەزا بێنێ، خوایگەورە بە تێکرایی عەزابیان دەدا.** (تفسير القرطبي) التوبة (٣٩).

**ئامانجیشەشەم: ڕزگاربوون لە عەزابی خواو شادبوون بە پاداشتی بەهەشت، بەڵگەی ئەو ئایەتو حەدیسەی تازە ڕابران، هەم پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿مَا اغْبَرَّتْ قَدَمَا عَبْدٍ فِي سَبِيلِ اللهِ فَتَمَسَّهُ النَّارُ﴾ رواه البخاری، **هەر بەندەیەکیخوا پێیەکانی تۆزاوی بێ لە غەزای ڕێگایخوا، ئاگری دۆزەخ خۆی لێنادا.**

**هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿اُغْزُوا فِي سَبِيلِ اللهِ، مَنْ قاتَلَ فِي سَبِيلِ اللهِ فُواقَ ناقَةٍ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ﴾ حديث حسن رواه الترمذي، **لە ڕێگای خوا غەزا بکەن، هەر کەسێك بە قەد وشتر دۆشینێك جەنگ بکا لە ڕێگای خوا، ئەوە بەهەشتی بۆ واجب دەبێ.**

جا ئەگەر سەد لاپەڕەش لە باسی غەزا بنوسم، هەر تەواو نابێ، کەوابوو: کۆتایی باسەکەم بەم شیعرانەی ئیمام (عبدالله بن المبارك) دێنم کە لە بەرەی غەزادا بۆ ئیمام (فُضَيل بن عَياض)ی نوسیون، چونکە وازی لە غەزا هێنابوو و لە (مَكّة)و (مَدينَة) خوا پەرەستیی دەکرد:

**يَا عَابِدَ الْحَرَمَيْنِ لَوْ أَبْصَرْتَنا * لَعَلِمْتَ أَنَّكَ فِی الْعِبادَة تَلْعَبُ**
**مَنْ كانَ يَخْضَبُ خَدَّهُ بِدُمُوعِه * فَنُحُورُنَا بِدِمَائنا تَتَخَضَّبُ**
**رِيحُ الْعَبِيرِ لَكُمْ، وَنَحْنُ عَبِيرُنا * وَهْجُ السَّنابِكِ وَالْغُبارُ الأَطْيَبُ**
**وَلَقَدْ أَتانَا مِنْ مَقالِ نَبِيِّناﷺ * قَوْلٌ صَحِيحٌ لا يَكْذِبُ**
**لا يَسْتَوِی غُبَار خَيْلِ اللهِ فِی * أَنْفِ امْرِئٍ وَدُخانُ نارٍ تَلَهَّبُ**
**هَذا كِتابُ اللهِ يَنْطِقُ بَيْنَنا: * لَيْسَ الشَّهِيدُ بِمَيّتٍ لا يَكْذِبُ**

**واتە: ئەی خواپەرستەکەی (مَكّة)و (مَدينَة)، ئەگەر بە چاوی خۆت ئێمە ببینی، دەزانی تۆ لە خواپەرستیدا یاری دەکەی. ئەی ئەو کەسەی بە فرمێسکەکانی کوڵمەی خۆی ڕەنگ دەکا، ئەوا سینگی ئێمە لە ڕێگایخوا بە خوێنیخۆمان ڕەنگ دەبێ. بۆنی بۆنخۆشەکانی**

تێکەڵکراو بۆ ئێوەیە، بەڵام بۆنە تێکەڵکراوەکەی ئێمە بۆنی ئاگری بن سمی ئەسپەکان‌و تۆزە پاکەکەی غەزایە. فەرموودەیەکی ڕاستی پێغەمبەرمانﷺ بۆ هاتووەو فەرموویەتی: ﴿وێکڕا جێگیر نابن لە لوتی هیچ پیاوێکدا تۆزی ئەسپ سوارانی ڕێگای‌خواو دوکەڵی ئاگری دۆزەخ﴾. ئەمەش قوڕئانی خوای‌خۆمانەو دەفەرمووێ: ﴿شەهید مردوو نیەو هەر زیندووەو لە لای خوای خۆی ڕزقی دەدرێتێ﴾. (طبقات الشافعية الكبرى، للإمام السبكي) ب(١) ل(٢٠٢).

*جا بەندەش دەڵێ: بۆنە خۆشەکەی جەنگاوەرانی ئێستای ئیسلام، بۆنی باروت‌و ئاگری تۆپ‌و موشەکە، بەڵام خواپەرستیی کاکی موسوڵمان: گۆرانی‌و موسیقایە!.*

ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، ئەوانە بەشێك بون لە ئامانجە بەرزەکانی غەزا، جا لە بەر ئەوەی غەزا ئەو سودە زۆرانەی هەنە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿وَذِرْوَةُ سَنامِهِ الْجِهَـــادُ﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، **لوتکەی هەرە بەرزی‌ئیسلام (جهاد)=غەزا کردنە لە ڕێگەی خوا.**

جا لە بەر ئەوەی غەزا سەربەرزی موسوڵمانانی تێدایەو هەر بە غەزاکردنیش دەتوانن وڵاتێکی بەهێزی ئیسلام پێك بێنن، کافرەکان بە هەمو جۆرێك—بە تایبەتی لە ڕێگەی ئەو موسوڵمانانەی نۆکەری ئەوانن— هەوڵ دەدەن: بیری غەزا لە ناو موسوڵماناندا نەمێنێ، تاکو بەردەوام ژێردەستی ئەوان بن‌و نەبنە یەکدەنگو ڕووبەڕووی ئەوان نەبنەوە. بە دەستکاریەوە لە (سیرةالصلابي) ب(١) ل(٦١١-٦٢٥)، هەم بڕوانە (ڕووناکی رب العالمین) بەرگی پێنجەم، بەرتووکی (جهاد)، زۆر سودی لێ وەردەگری، إن شاء الله تعالى.

**دووەم: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿پیری بەساڵدا چوو و منداڵی بچوك‌و ئافرەت مەکوژن﴾**. ئەمەش بەڵگەیە: کە مەبەست لە غەزا: کوشتنی کافرەکان نیە، بەڵکو مەبەست ڕێنموونی‌کردنە بۆ ئیسلام‌و چەسپاندنی حوکمی خودایە لە ناو بەندەکانی خوادا، بۆیێ ئەو کافرانەی لە پێش ئیسلامدا کتێبی ئاسمانییان هەبووە—وەك جولەکەو دیان‌و مەگوش— ئەگەر ملکەچی حوکمی ئیسلام بن‌و (جِزْيَـة)=سەرانە بدەنە دەوڵەتی‌ئیسلام، ئەوان جەنگیان لەگەڵ ناکرێ‌و واجبە: گیان‌و ماڵ‌و منداڵیان بپارێزرێ.

**جا بزانە:** ئەگەر پیرو ئافرەت‌و منداڵی فامیدە جەنگ لە دژی ئیسلام بکەن، ئەو کاتە دروستە ئەوانیش لە حاڵەتی جەنگکردندا بکوژرێن، نەك لە حاڵەتی هەڵاتندا، بەڵام ئەگەر ترسی ئەوە هەبێ: کە وەگەڵ لەشکری کافرەکان بکەونەوە، یان یارمەتیی لەشکرەکە بدەن، ئەو کاتەش هەر دروستە بکوژرێن، هەروەها ئەگەر جنێو بە خودا، یان بە پێغەمبەرﷺ، یان بە ئیسلام بدەن، ئەو کاتەش هەر دروستە بکوژرێن. (تحفة المحتاج بحاشية الشرواني) ب(٩) ل(٢١١-٢٤٠).

**سێیەم: لەبارەی (سَرِيَّة)ی (عبدالله بن جَحش)ﷺ خوایگەورە ئایەتی ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکەی ناردە خوارەوە.**

مەبەستی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەمەیە: موسوڵمانەکان بەردەوام تاوانەکانی کافرەکانیان لە

بەرچاو بێو ئەگەر موسوڵمانێکیش هەڵەیەکی کرد، دانەبەزنە سەری‌و کافرەکان دڵخۆش نەکەن، ڕاستە: کوشتن لە (اَلْأَشْهُرُالْحُرُم)=چوار مانگەکەی حەرامدا–(ذِىالْقَعْدَة، ذِىالْحِجَّة، مُحَرَّم، رَجَب)– تاوانە، بەڵام تاوانی کافرەکان زۆر لەو کوشتنە گەورەترە، چونکە ئەوان موسوڵمانەکانیان لە سەر خاک‌و وڵاتی خۆیان دەرکردون‌و قەدەغەشیان کردون خواپەرستی لە (اَلْمَسْجِدُالْحَرام)دا بکەن‌و هەم هەوڵ دەدەن موسوڵمانەکان لە ئاینی‌ئیسلام پەشیمان بکەنەوە، بەڵکو سزاشیان دەدەن.

*جا بە داخەوە ئێستاش ئەگەر موسوڵمانێك کافرێك بکوژێ، ئەوە دوژمنانی ئیسلام‌و تۆکەرەکانیان لە وڵاتی‌ئیسلامدا، دەیکەنە جەنگێکی پڕوپاگەندەو دادەبەزنە سەر موسوڵمانەکەو فرمێسك بۆ کافرە کوژراوەکە دەڕێژن‌و دەڵێن: ئیسلام ئایینی کوشتن نیە، بەڵام ئەگەر کافرەکان قومبولەی تۆ تەنی بە سەر موسوڵماندا بدەن‌و بە سەدان خانوو و مزگەوت‌و کێڵگە وێران بکەن‌و بە موشەکانیشیان لاشەی هەزاران موسوڵمان پارچە پارچە بکەن، دەڵێن: ئەوە مافی خۆیانە بەرگری لە خۆیان دەکەن! ئاخر ئەو کافرانە بەرگری چی لە خۆیان دەکەن‌و لە کوێ بەرگری لە خۆیان دەکەن؟ خۆ ئەوان هاتونەتە ناو خاکی موسوڵمانان‌و وڵاتی ئیسلامیان داگیر کردوە!، ڕاستە: تا خاوەن ماڵ دزی گرت، دز خاوەن ماڵەکەی گرت.*

## ﴿ ئامانجەکانی (سَرِيَّة)کانی پێغەمبەرﷺ ﴾

بە ناردنی (سَرِيَّة)کان چەند سودێك‌و چەند ئامانجێك هاتنەجێ:

***بڵاوکردنەوەی ترس‌و دەسەڵاتی دەوڵەتی‌ئیسلام لە ناوەوەو لە دەرەوە،** چونکە کە دوژمنانی ئیسلام هەستیان کرد هێزی ئیسلام دەتوانێ بگاتە هەموو شوێنێك‌و ڕووبەڕووی گشت هێزێك ببێتەوە، زۆربەیان ترسان‌و بیرۆکەی جەنگکردنیان لە دژی ئیسلام نەما، بەڵکو هەوڵی ئەوەشیان دەدا سولحی جەنگ نەکردن لەگەڵ پێغەمبەرﷺ مۆر بکەن، بەڵکو وایان لێهات لە چەند ڕوێکەوە یارمەتی ئیسلامیش بدەن، ئەمەش دەستکەوتێکی گەورەیە بۆ دەوڵەتی‌ئیسلام.

***هەم بڵاوکردنەوەی ئاشتی‌و ئاسایش لە ڕێگەکانی بازرگانیدا،** چونکە لە ترسی (سَرِيَّة)کانی ئیسلام ڕێگرەکانی عەرەبە دەشتاویەکان وازیان لە ڕێگری هێناو بازرگانەکان‌و خەڵکی‌تریش بە دڵنیایی بە ڕێگاکاندا دەرۆیشتن.

***هەم ناردنی (سَرِيَّة)کان مەشقێکی سەربازی بوو بۆ لەشکری‌ئیسلام،** تاکو بەو دەرچوونەیان لێراببێن بۆ جەنگە گەورەکانی دوژمنانی ئیسلام‌و هەم شارەزای ڕێگەو دەشت‌و چۆڵ‌و بیابانەکان ببن. لە لایەکی‌تریشەوە: (سَرِيَّة)کانی ئیسلام پشتی دوژمنە گەورەکەی خۆیان شکاندبو–کە (قُرَيْش)ی (مَكَّة) بون– ڕێگەی بازرگانی ئەوانیان بە تەواوی خستبووە مەترسی. بە دەستکاریەوە (سيرةالصلّابي) ب(١) ل(٦٤١).

**چوارەم: لە ساڵی دووەمی کۆچیدا: زەکات‌و ڕۆژوو واجب کران، قوربانی‌و نوێژی جەژنەکان**

**کرانە سوننەت**. واتە: لە ساڵی دووەمی کۆچیدا: لە مانگی(شَعْبان)ی ڕۆژووی ڕەمەزان واجب کرا، ئینجا لە ڕەمەزانیشدا سەرفیترە واجب کرا، ئینجا زەکاتی ماڵیش لـە (شَوّال)دا واجـب کرا.

**زەکات ڕوکنی سێیەمی ئیسلامە**، هەر کەسێك بـاوەڕی بـە واجبـوونی زەکـات نـەبێ کـافر دەبـێ، وە ئەگـەر بـاوەڕی پێهـەبێو بـە هـۆی بـەخیلی نەیـدا، ئـەو کاتـە کاربەدەسـتی موسوڵمانان بە زۆرلێکردن زەکاتی لێوەردەگرێ، جا ئەگەر بە زۆرلێکـردنیش نەیـدا، ئـەو کاتە کاربەدەستی موسوڵمانان جەنگی لەگەڵ دەکا، هەروەك ئیمام (أَبُوبَکْر ﷺ) جەنگی لە گەڵ زەکات نەدەرەکان کرد.

زەکاتـدان دەبێــە هـۆی ئاشـتیو خۆشەویسـتی نێـوان دەوڵەمەنـدو هـەژارەکانو بـەزەیی پێکداهاتنو نەمانی دزیو ڕێگری، هەروەها ماڵی زەکاتدەرەکەش بە زەکـات زیـاد دەبـێ، هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: ﴿ما نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مـــالٍ﴾ رواه البخاري، **زەکـاتو خێرکردن لە هیچ ماڵێك کەم ناکاتەوە.**

جا ئەگەر هەموو کەسێك زەکاتەکەی بە ڕێگایەکی شەرعی بـدا، ئـەوە هـەموو کەسـێك لـە خۆشـیدا دەژیـێو تاوانـەکانی ئـابووری نـامێنن، بۆیـێ لـە سـەردەمی ئیمـام (عمـر بـن عبدالعزیز)دا زەکات لە بەر هەژارەکان مابۆوەو هیچ هەژارێك نەمابوو زەکاتی بدرێتێ، بۆیێ بەو زەکاتە زیادە کۆیلەیان کڕینو ئازادیان کردن.

هەروەها سەرفیترەی ڕەمەزانیش بەشێکە لە زەکات، جا هۆی سەرفیترەش لـە ڕەمەزانـدا ئەوەیە: کە حەزرەتی(ابن عَبّاس)-رضی الله عنهما- فەرموویەتی: ﴿فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زَكاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ، وَطُعْمَةً لِلْمَساكِينَ﴾رواه أبوداود وصححه الحاكم، **پێغەمبـەر ﷺ سـەرفیترەی واجـب کـردوە تـاکو ببێتـە پاککـەرەوەی مرۆڤـی بـەڕۆژوو لـە قسـەی ناڕێكو ناشیرین، هەم ببێتـە پارووەکی پارمـەتیش بۆ هـەژاران لـە ڕۆژی جەژنـدا.**

ئاشکرایە: قوربانیش هەمان مەبەستی تێدایە لە جەژنی قورباندا.

**ڕۆژووی ڕەمەزانیش ڕوکنی چوارەمی ئیسلامە**، هـەر کەسـێك بـاوەڕی بـە واجبـونی ڕۆژووی ڕەمەزان نەبێ کافر دەبێ، بەڵام ئەگەر باوەڕی پێهەبێو–بە بێعوزر– لە بەر تەمبەڵی لـە ڕەمەزاندا بە ڕۆژوو نەبێ، ئەو کاتە بەند دەکـرێو لـە ڕۆژێـشدا خـواردنو خواردنـەوەی لێ قەدەغە دەکرێ تا ڕەمەزان تەواو دەبێ، بەڵام بە مەزهەبی (حَنَفي): هەر کەسێك لە ڕۆژانی ڕەمەزاندا بە بێعوزر بە قەسدیو بە ئاشکرایی خواردن بخوا، دەبی بکوژرێ!، چـونکە: یـان گاڵتە بە ئایین دەکا، یان باوەڕی بە واجبێکی ئایین نیە، ئەو جۆرە کەسەش حەڵاڵە بکوژرێ.

بەڕۆژووبوون مرۆڤ دەگەیەنێتە پلەی لەخواترسانو لە زۆربـەی نەخۆشـیەکان دەیپـارێزێو دەبێتە هۆی وەدەستهێنانی پاداشتو دوورکەوتنەوە لە ئاگری دۆزەخ.

**جا بزانە:** پێغەمبەرﷺ نۆ ڕەمەزانان بەڕۆژوو بووە، جا لەو نۆیانەش تەنها یەك ڕەمەزان سی پڕ بووە، هەشتەكانیتر كمە مانگ–واتە: بیستو نۆ ڕۆژ–بون، ئەوەش بۆ ئەوەیە: موسوڵمانان دڵنیا بن: كە ڕەمەزانی سی ڕۆژیو بیستو نۆ ڕۆژی لە پاداشتدا یەكسانن.

**جا ئەوەش بزانە:** مانگی ڕەمەزان لە هەموو مانگەكان گەورەترە، بەڵام ڕۆژی (عَرَفَـة)، واتە: نۆیەمی (ذیالحِجَّة) لە ڕۆژی جومعەو لە هەموو ڕۆژەكانیتری ساڵێ گەورەترە: (تحفە المحتاج بحاشیه الشروانی) ب (٣) ل(٢٠٩و٣٧٠ و٣٧١) و(رد المحتار علی الدر المختار) ب (٣) ل (٣٩٢) و(سیرة الصلابی) ب (١) ل (٦٦٩–٦٧٤).

**پێنجەم: لە ساڵیدووەمی كۆچیدا پێغەمبەرﷺ بۆ یەكەم جار نوێژی جەژنی ڕەمەزانی كرد.** نوێژی جەژن سوننەتێكی (مُؤكَّدَة)یەو لە دروشمەكانی ئیسلامەو پێویستە بایەخی پێبدرێو خەڵك كۆ ببێتەوە تاكو بەرەكەتی جەژنیان بگاتێو یەكیتریش ببینن‌و جەژنە پیرۆزانەش لە یەكتری بكەن ﴿عن جُبَيْر بن نُفَيْر ومُحَمَّد بن زِياد الألْهاني: كانَ أصْحابُ رَسولِ اللهِﷺ إذا الْتَقَوْا يَوْمَ الْعِيدِ يَقُولُ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: تَقَبَّلَ اللهُ مِنّا وَمِنْكُمْ﴾ أخرجهما زاهر بن طاهر وأبو أحمدالفرضي بسندين حسنين، **كاتێ لە ڕۆژی جەژندا (صَحابَة)كانی پێغەمبەرﷺ دەگەیشتنە یەكتری، جەژنە پیرۆزەیان دەكردو دەیانگوت: خوایگەورە لە ئێمەو لە ئێوە قبوڵ بكا.** (فتح الباری) ب(٢) ل(٥٧٥ و٦٠٦) و(الحاوی للفتاوی، للسیوطی) ب(١) ل(٩٤). ئیتر باسی زەكاتو ڕۆژوو و نوێژی جەژنەكان لە (ڕووناكی "رب العالمین")دا بخوێنەوە سودی لێوەردەگری، إن شاء الله تعالی.

*** *** ***

**﴿غەزا گەورەكەی (بَدْر)=(يَوْمَ الْفُرْقَانِ)=(يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ)، لە ساڵی دووەمی كۆچی﴾**

(بَدْر) گوندێكە لە نێوان (مَكَّة)و (مَدِينَة) دەكەوێتە ڕۆژ ئاوای باشوری (مَدِينَة)، ساڵانە بازاڕێكی بازرگانیی لێ دادەندرا.

لە باسی (غَزْوَةُالْعُشَيْرَة)دا گوتمان: كاروانێكی (قُرَيْش) بە سەرپەرشتی (أبیسُفیان) بەرەو شام ڕۆیشتو قورتار بوو، ئینجا پێغەمبەرﷺ چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەم كاروانەی دەكرد، تا ڕۆژێك گوێی لێبوو: كاروانەكە بە سەرپەرشتی (أبیسُفیان) بەڕێوەیەو لە (شام) دەگەڕێتەوە بۆ (مَكَّة)ی پیرۆز، كاروانەكەش هەزار وشتری تێدایەو سەرمایەكەشی پەنجا هەزار میسقاڵی زێڕە، سی تا چل پیاوی بۆ پاسەوانی لەگەڵدایە، هەموو كافرەكانی (قُرَيْش)ش بەشیان لەو كاروانەدا هەبوو، بۆیێ پێغەمبەرﷺ داوای لە موسوڵمانەكان كردو فەرمووی: ﴿ئەمە كاروانی (قُرَيْشي)یەكانە ماڵی هەمووانیان لە كاروانەكەدا هەیە، بەرەو كاروانەكە بڕۆن، بەڵكی خوایگەورە كاروانەكەتان بداتێ﴾، واتە: لە تۆڵەی ئەو ماڵەی لە (مَكَّة) لێتان داگیر كراوە.

جا هەندێك لە موسوڵمانەكان بە دەم بانگەوازیەكەی پێغەمبەرﷺ هاتن‌و هەندێكیش

نەهاتن؟ چونكە وا تێگەیشتبون پێغەمبەرﷺ توشی جەنگ نایێ.

ئەمە لە لایەك، لە لایەكی‌تریشەوە: كە (أبُوسُفْیان) لە (حِجاز) نزیك بوّوە، زۆر هەوڵی دەدا بزانێ هەواڵی ڕێگاوبانەكان چی‌یە؟ تا هەندێك لە ڕێبوارەكان پێیان گوت: (مُحَمَّد)ﷺ (صَحابَة)كانی‌خۆی ئامادە كردون بۆ گرتنی كاروانەكەت، ئیتر (أبُوسُفْیان) زۆر ترسا، ناچار (ضَمْضَم بن عَمْروالغِفارِي)ی بە كرێ گرتو بە پەلە ناردیە (مَكَّة)، تاكو (قُرَیْشي)یەكان ئاگادار بكاتەوەو ڕاپەڕنو فریای كاروانەكەیان بكەون.

ئینجا (ضَمْضَم) بە شێوەیەكی زۆر ترسناك هەواڵەكەی گەیاندە كافرەكانی (قُرَیْش)، چونكە كراسەكەی خۆی لە پێشەوەو لە پشتەوە دڕاندبوو، لووتو گوێی وشترەكەی بڕیبونو لە سەر پشتی وشترەكەی بە دەنگێكی بەرز دەیگوت: هۆ گەلی (قُرَیْش) فریای كاروانەكەتان بكەون، چونكە (مُحَمَّد)و (صَحابَة)كانی هاتونەتە ڕێی كاروانەكە، فریای كەون، فریای كەون.

جا كە هەواڵەكە گەیشتە كافرەكانی (قُرَیْش)، بە پەلە خۆیان بۆ جەنگی پێغەمبەرﷺ ئامادە كردو وەڕێكەوتن، جا ئەگەر یەكێكیان بەخۆی نەڕۆیشتبا، ئەوە یەكێكی‌تری لەجیاتی‌خۆی دەنارد، تا گەورەكانی (قُرَیْش)یش هەموویان بۆ ئەو جەنگە ڕۆیشتن، تەنها (أبُولَهَب) نەبێ، ئەویش (العاص بن هِشام)ی بە كرێ گرتو لەجیاتی‌خۆی ناردی، چونكە (العاص) چوار هەزار دیرهەمی زیو قەرزداری (أبُولَهَب) بوو و نەیبوو بیداتەوە، جا (أبُولَهَب) پێی گوت: لەجیاتی من بڕۆ و قەرزەكەم بۆ تۆ بێ.

ئینجا كە (قُرَیْش) خۆیان ئامادە كرد بۆ ڕۆیشتن، بیریان لەوە دەكردەوەو دەترسان: (بَنِی‌بَكْر)ی (بَنِی‌كِنانَة) بە دوایاندا بێنو جەنگیان لەگەڵ بكەن، چونكە خوێنی كوژراوێك لە نێوانیاندا هەبوو، جا یەكسەر شەیتان لە وێنەی (سُراقَة بن مالك)دا هاتە لایانو گوتی: من لە (بَنِی‌كِنانَة) دەتانپارێزم، بەڵكو وا دەكەم (بَنِی‌كِنانَة) یارمەتیشتان بدەن. ئیتر كە (قُرَیْش) ئەو ترسەیان نەما، لەشكرەكەیان لە (مَكَّة) چووە دەرەوەو شەیتانیش لە وێنەی (سُراقَة)دا قۆناغ بە قۆناغ لەگەڵیاندا بوو، ژمارەی لەشكرەكە گەیشتە نێوان نۆ سەدو پەنجا تا هەزار چەكدار، دوو سەد ئەسپو شەشسەد زرێی جەنگكردنو چەند ئافرەتێكی گۆرانی‌بێژو ژمارەیەكی زۆر وشتریان لەگەڵدا بوو.

لە لایەكی‌تریشەوە: پێغەمبەرﷺ لە دوای چەند شەوێك لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی كۆچی لە (مَدِینَة) دەرچوو، ئاڵا گەورەكەی‌خۆی –كە سپی بوو– دایە دەست حەزرەتی(مُصْعَب بن عُمَیْرﷺ)و دوو بەیداخی ڕەشیشی بەستن: یەكێكیانی دایە دەست ئیمام (عَلِي)و ئەوەكەی‌تریشی دایە دەست حەزرەتی(سَعْد بن مُعاذﷺ).

هەروەها حەزرەتی(عبدالله ابن أمِّ مَكْتوم)شیﷺ لە جێی‌خۆی دانا تاكو لە (مَدِینَة)

پێشنوێژی بکا، هەم حەزرەتی(أبولبابـة)شی رضي الله عنه لە جێی خۆی کردە بەڕێوەبەری کاروباری (مَدِینَة)، ئینجا لە ڕێگەشدا ئەوانەی تەمەنی پانزە ساڵییان تەواو نەکردبوو، پێغەمبەر ﷺ هەمووی گەڕاندەوە، هەروەها لە ڕێگەدا کافرێکی ئازا –کە ناوی (حَبِیب) بوو– گەیشتەوە پێغەمبەر ﷺ تاکو لەگەڵیاندا بڕواو یارمەتییان بدا، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿إرْجِعْ فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ﴾ بگەڕێوە من داوای یارمەتی لە هیچ کافرێك ناکەم. ئینجا کافرەکە موسوڵمان بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: جا لەگەڵمان وەرە.

جا تێکڕای لەشکری (صَحابَة)کان رضي الله عنهم گەیشتە نێوان سێسەدو سێزدە تا سێسەدو نۆزدە جەنگاوەر، حەفتا وشترو دوو ئەسپو شەست زرێی جەنگیان لەگەڵدا بوو، ئەسپەکانیش: یەکێکیان هی حەزرەتی(الزُبَیْر رضي الله عنه) بوو، ئەوەکەیتریش هی حەزرەتی(المِقْداد رضي الله عنه) بوو، دوو (صَحابَة)و سێ (صَحابَة) بە نۆبەت سواری وشترەکان دەبون، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا: زەنگوڵەکان لە ملی وشترەکان بکرێنەوە، واتە: تا ئاشکرا نەبن.

جا لەشکری ئیسلام ڕۆیشت، تا گەیشتە نزیك (الصَفْراء)، لەوێ پێغەمبەر ﷺ دوو (صَحابَة)ی ناردنە لای (بَدر) –کە ناویان (بَسْبَس)و (عَدِيّ) بوو رضي الله عنهما– تاکو هەواڵی کاروانەکەو (أبُوسُفْیان) بزانن، جا ئەم دوو (صَحابَة)یەش ڕۆیشتن تا گەیشتنە (بَدر)، لەوێ لە نزیك ئاوەکەی (بَدر) دابەزینو کوندەیەکیان هێنا پڕ ئاویان کرد، لەو کاتیش (مَجْدی بن عَمْرو)و دوو کیژی جەحێڵ لە سەر ئاوەکە بون: یەکێك لە کیژەکان ئەوەکەیتری گرتبوو و داوای قەرزێکی لێدەکرد، کیژە گیراوەکەش دەیگوت: سبەینێ، یان دوو سبەی کاروانەکە دێ، هەندێك کاریان بۆ دەکەم، ئینجا قەرزەکەی تۆ دەدەمەوە. (مَجْدی)ش گوتی: ڕاست دەکا. ئیتر هەردوو (صَحابَة)کان گەڕانەوەو ئەم هەواڵەی گوێیان لێبوبوو بۆ پێغەمبەریان ﷺ گێڕاوە.

لە لایەکیتریش: (أبُوسُفْیان) –لە ترسی (صَحابَة)کان– بەخۆی لە پێش کاروانەکەدا دەڕۆیشت تا گەیشتە (بَدر)، لەوێ بە (مَجْدی)ی گوت: هەستت بە کەس کردوە؟ (مَجْدی)ش گوتی: دوو سوار لە لای ئەم تەپۆڵکەیە دابەزینو کوندە ئاوێکیان پڕ کردو ڕۆیشتن. جا (أبُوسُفْیان) چووە شوێنی دابەزینەکەیانو قشپلی وشترەکانیانی بە دەستەوە گرتو وردی کرد، دیتی ناوکە قەسپی تێدایە! جا گوتی: وَاللهِ ئەمە ئالیکی (یَثْرِب)=(مَدِینَة)یە. ئیتر (أبُوسُفْیان)بە پەلە گەڕاوە لای کاروانەکەو ڕێگەی گۆڕیو بە لای ڕاستەدا بۆ ڕێگەی کەناری دەریای سۆر لایدا.

ئینجا کە (أبُوسُفْیان) دڵنیابوو: کاروانەکەی قورتار کردوە، هەواڵێکیتری بۆ لەشکری

(قُرَيْش) ناردو گوتی: ئێوە بۆ ڕزگارکردنی کاروانەکەتان هاتون، ئێستاش کاروانەکە قورتار بوو، کەوابوو: ئێوەش بگەڕێنەوە بۆ (مَكَّة).
بەڵام (أبُوجَهْل) گوتی: وَاللهِ ناگەڕێینەوە تا لە (بَدْر) دادەبەزینو سێ ڕۆژان لەوێ دەمێنینەوە: وشترەکان سەر دەبڕینو خواردن دەخۆینو شەراب دەخۆینەوەو ئافرەتەکانی گۆرانیبێژیش موسیقاو تەپڵمان بۆ لێدەدەنو عەرەبەکانیش ناوبانگو هەواڵی هاتنمان دەزانن و بەردەوام لێمان دەترسێن. جا کافرەکان هەموویان گوێڕایەڵی قسەی (أبُوجَهْل) بون، تەنها (بَنِیزُهْرَة) بە گوێیان نەکردو نزیکەی سەد چەکداریان بە سەرکردایەتی (الأخْنَس) گەڕانەوەو نەهاتنە جەنگی (بَدْر).
ئینجا کە پێغەمبەرﷺ گەیشتە گەڵی (ذِفْران)، هەواڵی دەرچوونی لەشکری کافرەکانی (قُرَيْش)ی پێ گەیشت—واتە: چونکە پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانﷺ بە نیەتی گرتنی کاروانەکە هاتبونو نەیاندەزانی ڕووبەڕووی لەشکری کافرەکان دەبنەوە— بۆیە پێغەمبەرﷺ هەواڵی لەشکری کافرەکانی بە (صَحابَة)کان ڕاگەیاندو ڕاوێژی پێکردونو فەرموی: ﴿ئەوە لەشکری کافرەکان هات، ئێوە چی دەڵێن؟ ئایا کاروانەکەتان لە لا خۆشەویستترە لە جەنگی دوژمن؟﴾ لە وەڵامدا چینە (صَحابَة)یەك گوتیان: ئێمە بۆ گرتنی کاروانەکە هاتوین، ئەومان پێخۆشترە؟ چونکە خۆمان ئامادە نەکردوە. بەڵام پێغەمبەرﷺ ئەم وەڵامەی پێ خۆش نەبو، بۆیێ دووەم جار فەرمووی: ﴿ڕاتان چییە بۆ جەنگی دوژمن؟﴾ ئەم جارە لە وەڵامدا ئیمام (أبُوبَكْر)و ئیمام (عمر)-رضيالله عنهما-وەڵامێکی زۆر جوانیان داوەو حەزرەتی(الْمِقْداد)ﷺش هەڵساو گوتی: (ئەی پێغەمبەریخوا بەرەو فەرمانیخوا بڕۆ، ئێمە لەگەڵ تۆداین ئێمە وەك (بَنِیإسْرائِيل) بە تۆ ناڵێین: ﴿فَاذْهَبْ أَنْتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ﴾ المائدة: ٢٤، ئەی (مُوسَى)ﷺ تۆ لەگەڵ خوایەکەت بڕۆ جەنگ بکە، ئێمەش لێرە دانیشتووین.
بەڵام ئەی پێغەمبەری خواﷺ تۆ لەگەڵ خوایەکەت بڕۆ جەنگ بکە، ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا جەنگ دەکەین... ئینجا پێغەمبەرﷺ دوعای چاکی بۆ کردن.
بەڵام سێیەم جاریش فەرمووی: ﴿أَشِيرُوا عَلَيَّ أَيُّها النّاسُ﴾ ڕای خۆتانم بۆ بڵێن ئەی خەڵکینە؟ جا (أنْصارِي)یەکان تێگەیشتن پێغەمبەرﷺ مەبەستی ئەوانە، بۆیە حەزرەتی(سَعْد بن مُعاذﷺ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەریخوا وا دیارە مەبەستت ئێمەی (أنْصارِي)یە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ. جا حەزرەتی(سَعْد)ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەریخوا، ئێمە باوەڕمان هێناوە بە تۆ و بەو ئایینەی تۆ هێناوتە، پەیمانو بەڵێنمان داوەتە تۆ گوێڕایەڵی تۆ بین، ئەی پێغەمبەریخوا بڕۆ بۆ ئەو مەبەستەی دەتەوێ، سوێند بە خوا ئەگەر داوامان لێبکەی لەگەڵ تۆدا خۆمان لەم دەریایە بدەین،

**لەگەڵ تۆ خۆمان دەهاوێینە دەریایەکە، ئێمەی (أنصار) خۆڕاگرین لە جەنگدا، ڕاستین لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا...**

**جا پێغەمبەرﷺ بە وەڵامەکەی حەزرەتی(سَعد) دڵخۆش بوو و ڕوخساری گەشاوەو فەرمووی:** ﴿سِيرُوا وَأَبْشِرُوا فَإِنَّ اللّٰهَ قَدْ وَعَدَنِي إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ، وَاللّٰهِ لَكَأَنِّي الْآنَ أَنْظُرُ إِلَى مَصَارِعِ الْقَوْمِ﴾ رواه البيهقي، **بەڕەو جەنگ بڕۆن، موژدەتان لێبێ: خوایگەورە وەعدەی یەکێکیانی لەو دووانە داومێ: یان گرتنی کاروانەکە، یان سەرکەوتن بە سەر لەشکرەکەدا، وَاللّٰهِ وەك من ئێستا بە چاوی‌خۆم تەماشای ئەو شوێنانە دەکەم کە کافرەکانی لێدەکوژرێن.**

**ئینجا پێغەمبەرﷺ لە گەڵی (ذِفْران) باری کردو لە نزیك (بَدر) دابەزی، ئینجا پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ سواری وڵاغەکانیان بونو لەو ناوچەیەدا دەگەڕان تاکو هەواڵی لەشکری کافرەکانی (قُرَيْش) بزانن، تا گەیشتنە پیرەمێردێکی عەرەب—ناوی (سُفیان) بوو—جا پێغەمبەرﷺ هەواڵی لەشکرەکەی (قُرَيْش)ی لێپرسی؟ پیرەمێردەکەش گوتی: پێتان ناڵێم، تا ئێوە بە من نەڵێن ئێوە لە کێن. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر کاتێك پێمان بڵێی، پێت دەڵێین. جا پیرەمێردەکە گوتی: ئەگەر ئەو هەواڵەی پێم گەیشتووە ڕاست بێ، ئەمڕۆ (مُحَمَّد)و (صَحابَة)کانی لە فلانە شوێنە دابەزیون، لەشکری (قُرَيْش)ش لە فلانە شوێنە دابەزیون.—قسەی پیرەمێردەکەش ڕاست دەرچوو—جا پیرەمێردەکەش گوتی: ئێوەش پێم بڵێن ئێوە لە کێن؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی:** ﴿نَحْنُ مِنْ ماءٍ﴾ **ئێمە لە ئاوین، واتە: (مَنِي). جا ئەوان ڕۆیشتنو پیرەمێردەکەش دەیگوت: لە ئاوین چی‌یە؟ ئەبێ لە ئاوی (عِراق) بن!.**

**جا پێغەمبەرﷺ گەڕاوە، کاتی ئێوارێش ئیمام (عَلِي)و حەزرەتی(الزُّبَيْر)و حەزرەتی (سَعْد بن أبِيوَقّاص)یﷺ ناردنە لای ئاوی (بَدر) تاکو هەواڵی لەشکری کافرەکان بزانن، جا ئەوانیش دوو خزمەتکاری کافرەکانیان گرتن-هاتبون ئاو بۆ لەشکرەکە ببەن-، جا کە خزمەتکارەکانیان هێنانە لای پێغەمبەرﷺ، لێی پرسین: لەشکری (قُرَيْش) لە کوێیە؟ خزمەتکارەکان گوتیان: لە پشتەوەی ئەم تەپۆلکەنە.** تەپۆلکەکە لەوێ دیار بوو، ناوی (اَلْعَقَنْقَل) بوو، لە لای (الْعُدْوَةالْقُصْوَى)=تەنیشتە دورترەکەی دۆڵی(بَدْر) بوو، کافرەکانی(قُرَيْش) لە پشتەوەی ئەم تەپۆلکەیە دابەزیبون.

**جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ژمارەی لەشکرەکە چەندە؟ خزمەتکارەکان گوتیان: ژمارەی لەشکرەکە زۆرە، ئێمە نایزانین. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە ڕۆژێکدا چەند وشتر سەر دەبڕن؟ گوتیان: ڕۆژێك نۆ، ڕۆژێك دە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەشکرەکە لە نێوان نۆ سەد و هەزارە. جا فەرمووی: لە گەورەکانی (قُرَيْش) کێیان لەگەڵدایە؟ گوتیان: (عُتبَة)و (شَيْبَة)و (أمَيَّة)و (أبُوجَهْل)و...چەندانی‌تریش.**

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿هَذِهِ مَكَّة قَدْ أَلْقَتْ إِلَيْكُمْ أَفْلاَذَ كَبِـــدِها﴾ ئەمە (مَكَّة)یە، پارچە جەرگەکانیخۆی بۆ ئێوە فڕێداوە.

ئینجا پێغەمبەرﷺ لێرەش باری کردو هاتە دۆڵی (بَدر)و لە (اَلْعُدْوَةُالدُّنيا) تەنیشتە نزیکترەکەی لای (مَدِينَة)، لە شوێنێکی نەرمی لیمایی دور لە ئاو دابەزین، جا (صَحابَة)کانﷺ تینوو بونو هەندێکیش جەنابەتیان توش بوو، شەیتانیش (وَسْوَسَة)ی خستە ناو دڵی (صَحابَة)کانو بە هۆی تێنووەتیو لەش پیسی ورەیان دابەزی، جا خوایگەورە لە شەویدا-واتە: شەوی (جُمْعَة)ی حەڤدەی ڕەمەزان -کە شەوی جەنگی سبەینییە-بارانێکی ڕەحمەتی بۆ باراندنو (صَحابَة)کانﷺ بە ئاوی بارانەکە خۆیان شوشتو دەستنوێژیان گرتو کوندەکانیان پڕ ئاو کردنو (وَسْوَسَة)ی شەیتان نەماو ورەیان بەرز بۆوەو زەمینە لیمیەکەش بەو بارانە وەکو لباد یەکتری گرتو پێی لە سەر جێگیر دەبوو و بە ئاسانی هاتوچۆی بە سەردا دەکرا، بەڵام لای کافرەکان بەو بارانە بووە قوڕو نەیانتوانی لەوێ بار بکەنو بەرەو لای موسوڵمانان بێن، هەر لەم شەوەشدا خوایگەورە بۆرژانێکی بە سەر (صَحابَة)کاندا هێناو بەم بۆرژانە دڵنیا بونو ترس لە ناو دڵیاندا نەما.

ئینجا پێغەمبەرﷺ لەم شەوەدا لێرەش باری کردو هاتە لای نزیکترین ئاو لە (بَدر) دابەزین، جا حەزرەتی(اَلْحُبَاب بن الْمُنْذِر)ﷺ فەرمووی: يا رَسُولَ الله پێم بڵێ: ئەم دابەزینەت لەم شوێنە، بە فەرمانیخوایە تا نەتوانین لێی پێش بکەوینو لێی دوا بکەوین، یان ڕاوبۆچوونو جەنگو فێڵ دانانە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ڕاو جەنگو فێڵە. جا (الْحُباب ﷺ) فەرمووی: يا رَسُولَ الله ئێرە شوێنی دابەزین نیە، هەڵسە لەگەڵ (صَحابَة)کان تا دەگەینە نزیکترین ئاو لە لەشکری کافرەکان، لە سەر ئاوەکە دابەزە، لەوێ ئاوێکی زۆر هەیەو نابڕێ، ئەو بیرە ئاوانەی دەکەونە پشتەوەی خۆمانیش گشتیان تێك دەدەین، تاکو کافرەکان هیچ ئاوێکیان دەست نەکەوێ بیخۆنەوە، ئێمەش حەوزێك لە سەر ئاوەکە دروست دەکەینو لێی دەخۆینەوە، ئینجا جەنگ لەگەڵ کافرەکان دەکەین. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لَقَدْ أَشَرْتَ بِالرَّأْيِ﴾ بەڕاستی ڕایەکی باشت دەربڕی. جا لە نیوەیشەویدا پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانﷺ هاتنە سەر نزیکترین ئاوەکەی لای دوژمنو حەوزەکەیان دروست کردو بیرەکانیتریشیان تێك دان.

جا لێرەدا حەزرەتی(سَعْد بن مُعاذ)ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەریخوا بۆ کەپرێك بۆ تۆ دروست نەکەین تا تێیدا بمێنیەوە؟ وڵاغەکانی سواریش لە لای کەپرەکە بۆ تۆ ئامادە دەکەینو بەخۆمانیش ڕووبەڕووی دوژمنەکەمان دەبینەوە، جا ئەگەر ئێمە سەرکەوتین، ئەوەیە کە پێمان خۆش بوو، ئەگەر سەریش نەکەوتینو شکاین، ئەوە بەخۆت لە پشتی وڵاغەکان سوار ببەو خۆت بگەیەنەوە ئەو کەسانەی لە دوای ئێمە

ماونەوە، چونكە ئەی پێغەمبەریخوا هەندێك (صَحابَة) لە تۆ دواكەوتنو نەهاتون، ئێمە زیاتر لەوان تۆمان خۆشتر ناوێ، ئەگەر بیانزانیبا توشی جەنگ دەبوی دوا نەدەكەوتن، خوایگەورە بەوان دەتپارێزیو لەگەڵ تۆ غەزا دەكەن. جا پێغەمبەرﷺ دوعای چاكی بۆ حەزرەتی(سَعْد) كرد، ئینجا لە سەر تەپۆلكەیەك كەپرەكەیان بۆ پێغەمبەرﷺ دروست كرد كە بە سەر مەیدانی جەنگەكەدا دەیڕوانی، لە ناو كەپرەكەدا ئیمام (أبُوبَكْر)شرضي الله عنه لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بوو، كۆمەڵە گەنجێكی (أنصاري)ش بە سەركردایەتی حەزرەتی(سَعْد بن مُعاذ)رضي الله عنه پاسەوانی كەپرەكە بون.

ئینجا هەر لەم شەوەی حەڤدەی ڕەمەزاندا پێغەمبەرﷺ لە خەونـدا دیتـی: لەشكری كافرەكان زۆر كەمە، جا موسوڵمانەكان بەم خەونەش دڵخۆش بونو ورەیان بەرز بۆوە.

ئینجا كە سبەینە داهات لەشكری كافرەكان بە تەپۆلكەی (الْعَقَنقل)دا شۆڕ بونەوەو هاتن لە دۆڵی (بَدْر) لە بەرچاوی لەشكریئیسلام دابەزین، جا كە پێغەمبەرﷺ چاوی بە لەشكری كافرەكان كەوت، لە خوا پاڕاوەو فەرمووی: ﴿اَللّهُمَّ هَذِهِ قُرَيْشٌ أَقْبَلَـتْ بِخُيَلائِهـا وَفَخْرِها تُحادُّكَ وَتُكَذِّبُ رَسُولَكَ اَللّهُمَّ فَنَصْرَكَ الَّذِى وَعَدْتَنِى، اَللّهُمَّ أَحِنْهُمُ الْغَداةَ﴾ خودایە ئەمە (قُرَيْشي)یەكانن بە دەعیەو شانازییانەوە هاتونە دوژمنایەتی تۆ دەكەنو پێغەمبەرەكەت بە درۆ دەخەنەوە، خودایە ئەو سەركەوتنەی وەعدەت پێداوم بۆم بەجێ بێنە، خودایە لەم سبەینەدا ئەو كافرانە بە هیلاك بدە.

جا پێغەمبەرﷺ لە كەپرەكەی هاتە خوارەوەو بەخۆی (صَحابَة)كانی ڕیز كردنو بۆ جەنگ ئامادەی كردنو زانستی جەنگكردنی دەدانیو دەیفەرموو: ﴿إذا أَكْثَبُـوكُمْ فَارْمُوهُمْ وَاسْتَبْقُوا نَبْلَكُمْ﴾ رواه البخاري، زاد أبوداود: ﴿وَلاَ تُسَلُّوا السُّيُوفَ حَتّى يَغْشُوكُمْ﴾ كاتی كافرەكان لێتان نزیك بونەوە تیربارانیان بكەن، هەندێك لە تیرەكانتان بهێڵنەوە، شمشێرەكانیشتان دەرمەكێشن تا دەتانگەنێ.

جا كە پێغەمبەرﷺ بە تیرەدارێك (صَحابَة)كانیرضي الله عنهم ڕیز دەكردن، حەزرەتی(سَواد بن غَزِيّة)شرضي الله عنه لە ڕیزەكە دەرچوبوو، پێغەمبەرﷺ تیرەدارەكەی لە زگی دا و فەرمووی: ئەی (سَواد) ڕاست ڕابوەستە. جا حەزرەتی(سَواد) فەرمووی: یا رَسُولَ الله ئێشاندمت دەمەوێ تۆڵەت لێبكەمەوە. جا پێغەمبەرﷺ زگیخۆی بۆ ڕوت كردو فەرمووی: ها تۆڵەم لێبكەوە. جا حەزرەتی(سَواد) باوەشی لێوەرینـاو زگی پێغەمبەریﷺ ماچ كرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی (سَواد) ئەوە بۆچی ئەوهات كرد؟ حەزرەتی(سَواد)رضي الله عنه فەرمووی: یا رَسُولَ الله ئەوە دەبینی كاتی جەنگ هاتووە، جا ویستم لە كۆتایی دیتنی تۆ پێستم وەپێستی پیرۆزت بكەوێ، جا پێغەمبەرﷺ دوعای چاكی بۆ كرد.

ئینجا كە پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)كانیرضي الله عنهم ڕیز كردن، لەگەڵ ئیمام (أبُوبَكْر)رضي الله عنه گەڕاوە

ناو کەپرەکە، پاسەوانەکانی (الأنصاري)ش بە شمشێرەوە لە بەر دەرگەی کەپرکە بون.

## ﴿ یەکەم کوژراوی کافرەکان لەم غەزایەدا ﴾

(الأسوَد بن عبدالأسَد المَخزومي) کە کافرێکی بەدڕەوشت بوو، زۆریش دوژمنایەتی پێغەمبەریﷺ دەکرد، سوێندی خوارد: لە حەوزەکەی موسوڵمانان ئاو دەخۆمەوە، یان دەیڕوخێنم، یان لە پێناویدا دەمرم. ئیتر کە هاتە لای حەوزەکە، ئیمام (حَمزَة)ﷺ شمشێرێکی لێداو پێیەکی لێپەڕاند، ئینجا ویستی لە سەر زگ بخشێتە سەر حەوزەکە، ئەم جارە ئیمام (حَمزَة)ﷺ شمشێرێکیتری لێداو کوشتی، جا ئەمە یەکەم کوژراوی کافرەکان بوو لە غەزای (بَدر)دا.

## ﴿ یەکەم شەهیدی موسوڵمانان لەم غەزایەدا ﴾

حەزرەتی(مِهجَع)ﷺ ئازادکراوێکی ئیمام (عُمر)ﷺ بوو، یەکەم کەس بوو بۆ جەنگکردن دەرچوو، بەڵام کافرێك تیرێکی بۆ هاویشتو شەهیدی کرد، ئەمەش یەکەم شەهیدی غەزای (بَدر) بوو، ئینجا لە دوای ئەویش: حەزرەتی (حارِثة بن سُراقة)ﷺ شەهیدی دووەم بوو.

## ﴿ دەستپێکردنی جەنگ ﴾

سەرەتای جەنگەکە بە مەیدان خواستنەوە دەستی پێکرد، چونکە کە ئیمام (حَمزَة)ﷺ (الأسوَد)ی کوشت، لە بەرەی کافرەکان (عُتبَة بن رَبیعَة) ڕقی هەڵساو گەرم بوو و ویستی ئازایەتیخۆی ئاشکرا بکا، بۆیێ لەگەڵ (شَیبَة)ی برایی‌و (الوَلید)ی کوڕی هاتنە مەیدان بانگیان کرد: بۆمان وەرنە مەیدانی جەنگ. جا لە بەرەی موسوڵمانان سێ گەنج لە (أنصار)ی (مَدینَة) بۆیان هاتنە مەیدان، بەڵام پێغەمبەرﷺ ئەوانەی گەڕاندەوەو فەرمانی دا: ئیمام (حَمزَة)و ئیمام (علي)و حەزرەتی(عُبَیدَة بن الحارِث)ﷺ بۆیان بچنە مەیدان. جا ئیمام (حَمزَة)ﷺ خۆی گەیاندە (شَیبَة)و کوشتی، ئیمام (علي)شﷺ خۆی گەیاندە (الوَلید)و کوشتی، بەڵام حەزرەتی(عُبَیدَةﷺ)و (عُتبَة) هەریەکەیان ئەویتری بریندار کردو هەردووکیان پەکیان کەوت، جا ئیمام (حَمزَة)و ئیمام (علي)رضی الله عنهما گەڕانەوە سەر (عُتبَة)و ئەویشیان کوشت، جا حەزرەتی(عُبیدة)یان بە برینداری هەڵگرتو بردیانەوە خزمەت پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ کوڵمەکەی وی لە سەر پێی خۆی داناو فەرمووی: ﴿لَأَشْهَدُ أَنَّكَ شَهِيدٌ﴾ من شاهیدی دەدەم تۆ شەهیدی. ئینجا لە کاتی گەڕانەوەی (صَحابَة)کانﷺ بۆ (مَدینَة) لە (الصفراء)دا حەزرەتی(عُبیدة)ﷺ گیانی دەرچوو و هەر لەوێش نێژرا.

ئیتر کە کافرەکان دیتیان ئەو سێ کەسەیان کوژران، ڕقیان هەڵساو بە تێکرایی هێرشیان هێنا سەر لەشکریئیسلام، (صَحابَة)کانیشﷺ وەك بەردی ڕستم لە مەیداندا بۆیان

**چەقین و بەگوێرەی فەرمانی پێغەمبەرﷺ تیربارانیان دەکردن، واتە: (صَحابَة)کانﷺ هێرشیان نەدەکرد، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمانی دابونێ: هێرش نەکەن تا فەرمانیان پێ دەکا، جا دروشمی (صَحابَة)کانﷺ لەم غەزایەی (بَدر)دا: (أَحَدٌ أَحَدٌ) بوو.**

**جا لەم حاڵەتەشدا پێغەمبەرﷺ لە ناو کەپرەکەدا دەستەکانی بەرز کردنەوەو دوعای دەکردن و دەیفەرموو:** ﴿اَللّهُمَّ أَنْجزْ لِي ما وَعَدْتَني، اَللّهُمَّ إِنْ تَهْلِكْ هَذِهِ الْعِصَابَةُ مِنْ أَهْلِ الْإِسْلامِ فَلا تُعْبَدُ فِيالْأَرْضِ﴾ رواه الإمام أحمد ومسلم، **خودایە ئەو سەرکەوتنەی وەعدەت پێداوم بۆم بەجێ بێنە، خودایە ئەگەر ئەم کۆمەڵە موسوڵمانە بە هیلاك بچێ، لە سەر زەمین تۆ ناپەرسترێی.**

**جا پێغەمبەرﷺ هەر لە خوا دەپاڕاوە، تا پەشتەماڵەکەی لە ملی بەربۆوەو ئیمام (أبُوبَکْر)ﷺ پەشتەماڵەکەی هەڵگرتەوەو بە ملی داداوەو باوەشی لێوەریناو فەرمووی: پارانەوەت لە خوا بەسە، خوایگەورە وەعدەکەت بۆ بەجێ دێنێ.**

**جا پێغەمبەرﷺ بۆرژانێکی بە سەردا هات، ئینجا هەشیار بۆوەو فەرمووی:** ﴿أَبْشِرْ يا أَبابَكرٍ: أَتاكَ نَصْرُ اللهِ، هذا جِبْرِيلُ آخِذٌ بِعِنانِ فَرَسِهِ يَقُودُهُ عَلَى ثَناياهُ النَّقْعُ﴾ رواه‌ابن اسحاق، ونحوه في البخاري، **موژدەت لێبێ ئەی (أَبُوبَکْر): سەرکەوتن لە لای خوا هات، ئەمە (جُبْرائِيل)ە جڵەوی ئەسپەکەیخۆی گرتووەو ڕایدەکێشێ، تۆزی جەنگ لە سەر ددانەکانی ئەسپەکەیەتی.**

**ئینجا پێغەمبەرﷺ لە کەپرەکە هاتە خوارەوەو هانی (صَحابَة)کانی دا بۆ جەنگکردن و فەرمووی:** ﴿وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّد بِيَدِهِ لا يُقاتِلُهُمُ الْيَوْمَ رَجُلٌ فَيُقْتَلُ صابِراً مُحْتَسِباً مُقْبِلاً غَيْرَ مُدْبِرٍ إِلاّ أَدْخَلَهُ اللهُ الْجَنَّةَ﴾ رواه ابن هشام وابن اسحاق، **سوێندم بەو خوایەی گیانی (مُحَمَّد)ی بە دەستە: هەر پیاوێك ئەمڕۆ جەنگ لەگەڵ ئەو کافرانە بکا، جا بکوژرێ لە حاڵەتی خۆڕاگری و هەڵمەت بردندا نەك لە هەڵاتندا، داوای پاداشتیش لە خوا بکا، خوا دەیباتە بەهەشت.**

**ئینجا کافرەکان لە موسوڵمانان نزیك بونەوەو پێغەمبەرﷺ فەرمانی دەستپێکردنی جەنگی دانێ و فەرمووی:** ﴿قُومُوا إِلَى جَنَّةٍ عَرْضُها السَّمواتُ وَالْأَرْضُ﴾ رواه مسلم، **هەڵسن بڕۆن بەرەو بەهەشتێکی وەها کە بەرینیەکەی ئاسمان و زەمینە.**

**جا پێغەمبەرﷺ چەنگە گڵێکی هەڵگرت و پرژاندیە دەموچاوی کافرەکان و هەریەکەیان هەندێك گڵی کەوتە چاوەکانیان، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی:** ﴿مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً فَلَهُ سَلَبُهُ وَمَنْ أَسَرَ أَسِيراً فَهُوَ لَهُ﴾ **هەر کەسێك کافرێك بکوژێ، کەلوپەلەکەی بۆ خۆی، وە هەر کەسێك کافرێك دیل بکا، دیلەکە بۆ خۆی. ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی هێرشکردنی بەڕاستیی کردو فەرمووی: هێرش بکەن.**

ئیتر لەشکری(صَحابَة)و کافرەکان تێك ڕژانو (صَحابَة)کان‌ﷺ دەستیان بە دوعا کرد، ڕاستو چەپیش لە کافرەکانیان دەداو دەیانکوشتنو دیلیان دەکردن، هەزار (مَلائِکَة)ش بە سەرکردایەتی حەزرەتی(جِبْرائِیل)و حەزرەتی(مِیکائِیل) بە فەرمانیخوا دابەزینە خوارەوە بۆ یارمەتی (صَحابَة)کان‌ﷺ، جا زۆربەی (صَحابَة)و کافرەکان بە چاوی خۆیان (مَلائِکَة)یان دەدیتن، چونکە نیشانەی (مَلائِکَة)کان مێزەری سپی بوو، تەنها حەزرەتی (جِبْرائِیل) مێزەری زەردی لە سەر بوو، جا لە گەرمەی جەنگدا حەزرەتی(أَبُو عُبَیْدَة بن الجَرّاح)ﷺ باوکیخۆی کوشت، چونکە باوکی ویستی بیکوژێ، بەڵام ئەو خۆی لێ لادا، ئیتر باوکی وازی لێنەهێنا، ئەویش گەڕاوەو کوشتی.

هەروەها ئیمام (أَبُوبَکْر)ش‌ﷺ ویستی بچێتە مەیدانو (عَبدُالرحمن)ی کوڕیخۆی بکوژێ–چونکە هێشتا موسوڵمان نەبوبوو– بەڵام پێغەمبەرﷺ ڕێگای نەدایێو فەرمووی: ﴿مَتِّعْنَا بِنَفْسِكَ–یا أَبابَكْرٍ– لا تَفْجَعْنا بِمَوْتِكَ﴾ بە مانەوەی خۆت سودمان پێ بگەیێنەو بە مردنت دڵمان مەئێشێنە.

ئیتر (أَبُوجَهْل)و (أُمَیَّة بن خَلَف)و زۆربەی سەرکردەکانیتری کافرەکان کوژران، هەروەها پێنج موسوڵمانی (مَکَّة)ش لە بەرەی کافرەکاندا بون، هەر پێنجیان لە ژێر ئاڵای (کُفْر)دا کوژرانو بونە قوڕبەسەری دونیاو قیامەت.

جا هەر لەم ڕۆژەی جومعەی حەڤدەی ڕەمەزاندا خوایگەورە سەرکەوتنی دا موسوڵمانانو کافرەکان شکان، لاشەی حەفتا کوژراویان لێ بەجیێمانو حەفتای دیکەشیان لێ بە دیل گیران، لە موسوڵمانەکانیش چواردە (صَحابَة) شەهید کران: شەش لە (مُهاجِر)، هەشتیش لە(أنصاري)یەکان، ئینجا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(عبدالله بن رَواحَة)و حەزرەتی(زَید بن حارِثة)ی-رضی الله عنهما- ناردنەوە (مَدِینَة)، تاکو موژدەی سەرکەوتن بگەیننە موسوڵمانان، ئینجا کە ئەوان موژدەی سەرکەوتنیان گەیاندە (مَدِینَة)، تازە حەزرەتی(رُقَیَّة)ی کیژی پێغەمبەریانﷺ ناشتبوو، کە لەو ڕۆژەدا وەفاتی کردبوو.

ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: کوژراوەکانی کافرەکان فڕێدرانە ناو بیرێکی (بَدْر)، ئینجا سێ ڕۆژانیش خۆیو (صَحابَة)کانی لە (بَدْر) مانەوە، ئینجا لە دوای سێ ڕۆژان لە شەوی دوو شەممە هاتە سەر لێوی بیرەکەو بانگی لاشەی کافرەکانی ناو بیرەکەی کردو فەرمووی: ﴿هَلْ وَجَدْتُمْ ما وَعَدَكُمْ رَبُّكُمْ حَقّاً، فَإِنِّی وَجَدْتُ ما وَعَدَنِی رَبِّی حَقّاً﴾ ئایا ئەوەی خوایخۆتان وەعدەی پێدابون ڕاست بوو؟ چونکە ئەوەی خوای من وەعدەی بە من دابوو بە ڕاستم بۆ هاتە جێ.

جا ئیمام (عمر)ﷺ فەرمووی: یا رَسُولَ الله، ئەوە چییە! قسە لەگەڵ ئەو جۆرە لاشانە دەکەی کە گیانیان تێدا نیەو بۆگەن بوینە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿وَالَّذِی نَفْسُ

مُحَمَّد بِيَدِهِ ما أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِما أَقُولُ مِنْهُمْ، غَيْرَ أَنَّهُمْ لاَ يَسْتَطِيعُونَ أَنْ يَرُدُّوا عَلَيَّ شَـــيْئاً﴾ رواه الشيخان، **سوێندم بەو خوایەی گیانی(مُحَمَّد)ی بە دەستە: ئێوە لەوان باشتر گوێتان لەم قسەی من نیە، بەڵام ئەوان ناتوانن هیچ وەڵامێکم بدنەوە.**

**ئینجا هەر لەم شەوەی دوو شەممە، پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)كان لە (بَدر) باریان كردو حەفتا دیلەكەو تاڵانە زۆرەكەی كافرەكانیشیان لەگەڵ خۆیانا هێناوە تا گەیشتنە گەڵی (الصَّفْراء)، لەوێ تاڵانەكەی بە یەكسانی بە سەر (صَحابَة)كانی (بَدر)دا بـەش كـرد، كە سەدو پەنجا وشترو دە ئەسپو كەلوپەلێكی زۆری چـەكو خواردنەمـەنیو جلوبـەرگ بوو، هەر لەم تاڵانەش پێغەمبەرﷺ وشترەكەی (أبُوجَهل)و شمشێرەكەی (ذُوالفَقار)—كە شمشێرەكەی (العاص بن مُنبه) بوو— هەردووكی بۆ خۆی دانان.**

**ئینجا لە (الصَّفْراء)دا پێغەمبـەرﷺ فـەرمانی دا: (النَّضر بـن الحارِث) كوژرا، لـە (عِـرْق الظَّبيَّة)شدا (عُقْبَة بن أبىمُعَيط)كوژرا، ئەم دووانەش لەگەڵ حەفتا دیلەكاندا بون، بەڵام لە هەموو كافرەكان كافرتـر بونو زۆر جنێویان بە ئیسلامو موسوڵمانان دەدا** لعنهما الله.

**ئینجا پێغەمبەرﷺ ڕۆژێك پێـشی دیلـەكان گـەڕاوە بـۆ (مَدینـة)، جا كـە لـە (مَدینـة) نزیك بۆوە، موسوڵمانەكان هاتنـە پێـشەوازی، بـە سـرودی (طَلَعَ الْبَـدْر عَلَيْنـا)و دەف لێدان منداڵەكانی (مَدینة)ش لە پێشوازیدا بونو پیرۆزبایی سەركەوتنیان لێكرد.**

**ئینجا كە دیلەكانیش گەیشتنە (مَدینة)، پێغەمبەرﷺ لە نێوان (صَحابَة)كانیدا پەرتی كردنو ئامۆژگاریشی كردن: چاكەیان لەگەڵ بكەنو ئازاریان مەدەن.**

**هەوەرها فەرمووی:** ﴿لَوْكانَ الْمُطْعِمُ بن عَدِيٍّ حَيّاً، ثُمَّ كَلَّمَنِي فِي هَؤُلاءِ النَّتْنَى لَتَرَكْتُهُمْ لَهُ﴾ رواه البخاری، **ئەگەر (مُطْعِم)ی كوڕی (عَدِيّ) زیندوو بوایەو لەبارەی ئەم دیلە بۆگەنانە قسەی لەگەڵ كردبام لە بەر خاتری وی ئازادم دەكردن.**

**لـە لایـەكیـتـریـش: هـەواڵی شـكانی كافرەكـانیش گەیـشتە (مَكَّة)و بـووە هـاوارو ڕۆڕۆو ئافرەتانیان مووی‌خۆیان دەڕنیەوەو بە كۆڵاناندا دەسوڕانەوە، جا لە دوای حەفت ڕۆژان (أبُولَهَـب)ش مـرد، ئینجـا (قُرَیـشي)یـەكان بڕیاریـان دا هیـچیتـر بـۆ كوژراوەكانیـان نەگرییێن؟ نەوەك موسوڵمانەكان پێیان دڵخۆش ببن، هەروەها گوتیان: پەلە مەكەن بـۆ كڕینەوەی دیلەكان؟ نەوەك كڕینەوەكەتان لە سەر گران بكەن.**

**جا ئەوەش بزانـە: پێغەمبـەرﷺ لـەبارەی دیلـەكان ڕاوێـژی بـە (صَحابَة)كان كـردو لـە ئەنجامدا بڕیاری دا: دیلەكان بە خۆكڕینەوە ئازاد بكرێن: بەگوێرەی هەبوونیو نەبوونی دیلەكە، جا لای كەمی پـارەی كڕینەوەكە: چـوار سـەد دیرهـەمی زیـو بـوو، لای زۆریـش: هەزار—تا چوار هەزار— دیرهەمی زیو بوو، جا ئەگەر دیلەكە هیچ پـارەی نەبوایـە، ئـەوە وا بڕیار درابوو: دە منداڵی (مَدینة) فێرە نوسینو خوێندنەوە بكا، ئینجا ئازاد بكرێ.**

جا یەكێك لە دیلەكان: (أبُوالعاص)ی زاوای پێغەمبەرﷺ بوو، یەكێكیتریش: (العَبّاس)ی مامی پێغەمبەرﷺ بوو، دووانیتریش ماموزای پێغەمبەرﷺ بون، واتە: (نَوْفَل بن الحارِث)و (عَقِيل بن أبي‌طالِب): كە برای ئیمام (علي) بووﷺ، جا بە فەرمانی پێغەمبەرﷺ: بە تایبەتی (العَبّاس) سەد (أوقِية)=حەفت سەد میسقال زێڕی لێوەرگیرا: لەجیاتی خۆیو هەردوو كوڕە برایەكەی-(نَوْفَل)و (عَقِيل)- هەم لەجیاتی هاوپەیمانەكەشی كە ناوی (عُتبَة) بوو.

یەكێكیتریش لە دیلەكان (أبُوعَزِيز)ی برای حەزرەتی(مُصعَب بن عُمَيْر)بوو، كە (أبُوالْيُسْر) دیلی كرد، حەزرەتی(مُصعَبﷺ) گوتی: توند دەستەكانی ببەستە، دایكێكی دەوڵەمەندی هەیە، بەڵكی لێتی بكڕێتەوە. جا (أبُوعَزِيز) گوتی: برای‌خۆم ئەوە ڕاسپاردەتە بۆ من؟! حەزرەتی(مُصعَبﷺ) گوتی: ئەم موسوڵمانە برای منە، تۆ برای من نی. جا دایكی بە چوار هەزار دیرهم (أبُوعَزِيز)ی كڕیەوە.

## ﴿ گەورەیی ( صَحابَة )كانی غەزای ( بَدْر)ﷺ ﴾

پێغەمبەرﷺ لەبارەی (صَحابَة)كانی (بَدر) فەرموویەتی: ﴿لَعَلَّ اللهَ إطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقالَ: اِعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ﴾ رواه الشيخان، وفي لفظ: ﴿فَقَدْ وَجَبَتْ لَكُمُ الْجَنَّةُ﴾ رواه البخاری، ڕەجام وایە: خوای‌گەورە بە سەر (صَحابَة)كانی (بَدْر)دا بەدەركەوتبێ‌و فەرموو‌بێتی: چی حەز دەكەن بیكەن، من لێتان خۆش بویمەو بەهەشت بۆ ئێوە واجب بووە. هەروەها: ﴿جاءَ جِبْرِيلُ إِلَى النَّبِيِّﷺ فَقالَ: ما تَعُدُّونَ أَهْلَ بَدْرٍ فِيكُمْ؟ قالَﷺ: مِنْ أَفْضَلِ الْمُسْلِمِينَ-أَوْ كَلِمَةً نَحْوَها- قالَ: وَكَذالِكَ مَنْ شَهِدَ بَدْراً مِنَ الْمَلائِكَةِ﴾ رواه البخاري، حەزرەتی(جِبْرائیل)ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە ناوە خۆتاندا (صَحابَة)كانی (بَدر) چۆن تێدەگەن؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە گەورەترینی موسوڵمانانن. جا حەزرەتی(جِبْرائیل)ﷺ فەرمووی: ئەو (مَلائِكَة)تانەی بەشداری غەزای (بَدر)یان كردوە، ئەوانیش لە گەورەترینی (مَلائِكَة)ن.

هەروەها دایكی حەزرەتی(حارِثة بن سُراقة)ﷺ -كە دووەم شەهیدی غەزای (بَدر) بوو- هاتە لای پێغەمبەرﷺ گوتی: پێم بڵێ: ئەگەر (حارِثة)ی كوڕم لە بەهەشتدا بێ سەبر دەگرم، ئەگەرنا زۆر بۆی دەگرییم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿يا أُمَّ حارِثَةَ...وَإِنَّ ابْنَكِ أَصابَ الْفِرْدَوْسَ الْأَعْلَى﴾ رواه‌البخاری، ئەی دایكی(حارِثة)، كوڕەكەت (الْفِرْدَوْس الْأَعْلَى)ی وەدەست كەوتووە: كە لە هەموو بەهەشتەكانی بە سەرەوەترە.

(البدايةوالنهاية) ب(٢) ل(٢٦٠-٣٣٣)و (السيرة الحلبية) ب(٢) ل(١٩٧-٢٨٠).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەكـەم: بڕیـاری شەریعەتیئیـسلام لـەبارەی ماڵیكافرەكـان، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی:** ﴿**ئەمە كاروانی (قُرَيْشى)يەكانە...بەڵكی خوایگەورە كاروانەكەتان بداتێ**﴾.

خوێنو مڵكو ماڵی ئەو كافرانەی (اَلْحَرْبِي)=كە جەنگ لە دژی موسوڵمانان دەكـەن، گـشتی حەڵاڵە بۆ گشت موسوڵمانێك، بە تایبەتیش بۆ ئەو جۆرە موسوڵمانانەی–كە لە لایەن ئـەو كافرانە–مڵكو ماڵیان داگیر كراوەو لە خاكو وڵاتی خۆیان دەركراون: وەكو (صَـحابَة)كـانی (مُهاجِر)ﷺ، چونكە بۆ ئەوان وەك تۆڵەی داگیركراوەكەیخۆیانە.

جا ئەگەر لە جەنگدا ماڵی ئەو كافرانە گیرا، ئەوە دەبێتە تاڵانو سەركردەی موسوڵمانان بە سەر جەنگاوەرەكاندا بەشی دەكا، بەو جۆرەی لە بیستو پێنجەمدا ڕوونی دەكەینەوە، إن شاء الله تعالى، بەڵام ئەگەر لە جەنگدا نـەبو، بـەڵكو موسـوڵمانێك، یـان كۆمەڵـە موسـوڵمانێك بێئیزنی ئەمیری خۆیان شتێك لە كافرەكانی (اَلْحَرْبِي) بدزن، یان بیڕفێنن، یان لە شوێنێك هەڵیبگرنـەوە، ئـەوەش لـە فـەرموودەی ڕاسـتردا: وەكـو تـاڵان بـەش دەكـرێ، بـەڵام لـە فەرموودەكەیتردا –كە (إمام الحرمين) پشتگیریی كردوە– ئەو جۆرە شتە بـە تایبـەتی بۆ ئەو كەسەیە كە هێناویەتی، واتە: نابی سەركردەی موسوڵمانان هیچی لێبستێنێ.

هـەروەها ئەگـەر ئـەمیری كۆمـەڵێك پـێش گرتنـی تاڵانەكـە بڵـێ: (**هـەر كەسـێك شـتێكی كافرەكـانی (الْحَرْبِيّ) بگـرێ، ئـەو شـتە بـۆ خـۆی بـێ**). ئـەو كاتـەش شـتەكە بـۆ ئـەو كەسـەیە: كـە گرتویـەتی، بـە فەرموودەیـەكی ئیمـامی(الـشافعي)و فـەرموودەی هەرسـێك ئیمامەكەیتری سەر مەزهەبﷺ.

**جا بزانـە:** ئەوەیڕابردوو لەبارەی مڵكو مـاڵی كافرەكـان بـوو، بـەڵام ئەگـەر مڵكو مـاڵی موسوڵمانێك بكەوێتە دەستی دوژمنانیئیسلام، ئەوە نابێتە مڵكی دوژمنەكـەو هـەر مڵكـی موسوڵمانەكەیە، كەواتە: هەر كەسێك ئەو ماڵەی بكەوێتە دەست: بە گرتن، یان بـە دزیـن، یان بە كڕین، یان بە هەر ڕێگایەكیتر، ئەوە واجبە: بیداتەوە خاوەنەكەی ﴿عن ابن عُمَر رضى الله عنهما: ذَهَبَ فَرَسٌ لَهُ فَأَخَذَهُ الْعَدُوُّ فَظَهَرَ عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ فَرُدَّ عَلَيْهِ فِي زَمَنِ رَسُولِ اللهِﷺ﴾ رواه البخاري، **ئەسپێكی (ابن عُمَر)** رضى الله عنهما **ڕۆیشتو دوژمن گرتی، جا موسوڵمانەكان بە سەر دوژمنەكەدا سەر كەوتنو ئەسپەكەیان گرتەوە، جا هەر لە سەردەمی پێغەمبـەرداﷺ ئەسپەكەیان بۆ (ابن عُمَر)** رضى الله عنهما **گەڕاندەوە**. (تحفةالمحتاج بحاشيةالشيرواني) ب(٩) ل(٢٥٤–٢٥٦).

**دووەم: ( أَبُولَهَب ) بەخۆی نەڕۆیـشتە جـەنگی ( بَـدْر )، بـەڵكو ( العـاص )ی بـە كـرێ گـرتو لەجیاتی خۆی ناردی.** هۆی نەڕۆیشتنی (أَبولَهَب) ئەوە بوو: (عاتِكَة)ی كیژی (عَبْدُالْمُطَّلِب) – كە پوری پێغەمبەرەﷺ– سێ ڕۆژ پێش هاواكردنەكەی (ضَمْضَم الْغفاري)، لە خەوندا دیتی: (سوار وشترێك هات بە دەنگێكی بەرز بانگی (قُرَيْشي)یەكانی كردو گوتی: هۆ خاوەن غـەدرو بێوەفاكان ڕاپەڕن بۆ شوێنی كوژرانتـان لـە دوای سـێ ڕۆژان. ئینجا دیتـی سـوارەكە هاتـە

مزگـەوت=(كَعْبَـة)و ئينجـا چـووە سـەر كێـوی (أَبُـوقُبَيْس)و بـە دەنگێكـی بـەرز هـەمان قسەكەی ڕابردووی گوتەوە، ئینجا سوارەكە بەردێكی گەورەی لە كێوی (أَبُـوقُبَيْس) فـڕێ دا خوارەوەو بەردەكە پارچە پارچە بوو و هەر ماڵێكی (مَكَّة) پارچە بەردێكی كەوتێ. جا ئـەم خەونە لە ناو خەڵكی (مَكَّة)دا بڵاو بۆوەو ترس و دڵەڕاوكێیان كەوتـە نـاو، جـا كـە (ضَمْضَم) هاوارەكەی هێنا، (أَبُولَهَب) گوتی: خەونەكەی (عاتِكَة) ڕاست دێتە جێ و نەوێرا بڕواتە جەنگی (بَدْر)، جا بە ماوەیەكی كەم لە دوای غەزای (بَدْر) توشی ئاگرەكەی نیسكە بوو و مـرد، لعنه الله تعالى، لە بیست‌وهەشتەمەكەدا باسی دەكەین، إن شاءالله تعالى. (السيرةالحلبية) ب(٢) ل(١٩٨–١٩٩).

**سێیەم: لەشكری (قُرَيْش) لە (مَكَّة) دەرچوو...شەیتانیش-لە وێنەی (سُراقَة)دا– قۆناغ بـە قۆنـاغ لەگەڵیانـدا بـوو تـا گەیـشتنە (بَـدْر).** لـەبارەی ئـەم ڕووداوە، خوای‌گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ وَقَالَ لا غَالِبَ لَكُمُ الْيَوْمَ مِنَ النَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَكُمْ فَلَمَّا تَرَاءَتِ الْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَى عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكُمْ إِنِّي أَرَى مَا لا تَـرَوْنَ إِنِّـي أَخَافُ اللَّهَ وَاللَّهُ شَدِيدُ الْعِقَـابِ﴾الأنفال:٤٨، **ئـەی پێغەمبـەرﷺ باس بكـە: ئـەو كاتـەی شەیتان خۆی هێنا سەر وێنەی (سُراقَة)و كردەوی كافرەكانی بۆ ئەوان ڕازاندەوەو هانی دان بڕۆن بۆ جەنگی موسوڵمانان و پێی گوتن: هیچ كەسێك–(مُحَمَّد)ﷺو (صَحابَة)كانی– بە سەر ئێوەدا سەركەوتوو نابن و منیش یارمەتیدەرتان دەبمو دەتانپارێزمو نایـەڵم (بَنِیبَكْـر) لـە پـشتەوەڕا لێتـان بـدەن، جـا كـە شـەیتان و لەشكرەكەی لەگەڵ كافرەكان گەیشتنە (بَدْر)و هەردوو لەشكرەكەی ئیسلام و كوفر گەیشتنە یەكتری و جەنگ دەستی پێكرد، شەیتان چاوی بە حەزرەتی(جُبْرائِیل) كەوت و خۆی ڕانەگرت و یەكسەر لە مەیدانی جەنگ هەڵات و بە كافرەكـانی گـوت: من لە ئێوە بەریمە، من (مَلائِكَة) دەبینم بۆ یارمـەتی موسـوڵمانان هـاتون كـە ئێـوە نایـانبینن، مـن لـەخوا دەترسـێم بـە (مَلائِكَـة)ی‌خـۆی سـزام بـدا، خوای‌گـەورە سزادانەكەی زۆر بەهێزە.**

ئینجا كە شەیتان لە وێنەی (سُراقَة)دا هەڵات، (أَبُوجَهْل) بە كافرەكانی گـوت: بـە هـەڵاتنی (سُراقَة) تێك نەچن و نەترسن، چونكە ئەو فێڵی لە ئێمە كـردو ئـەوها وەعـدەی بـە(مُحَمَّد) دابوو، سوێندم بە بت و سەنەم: ئێمە ناگەڕێینەوە تا (مُحَمَّد)و (صَحابَة)كانی بـە گوریسـان لێك دەبەستینەوە، مەیانكوژن، هەر بەدەست بیانگرن. (تفسير ابن كثير) الأنفال: (٤٨).

**چوارەم: پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: زەنگوڵەكان لە ملی وشـترەكان بكرێنـەوە.** هـەر چـەند لێرەدا مەبەستیش ئاشكرانەبوونی جموجۆڵی لەشكرەكە بوو، بەڵام جگە لەمەش: هەڵواسـینی زەنگوڵ بە ملی وڵاغدا ناپەسندە،چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لا تَصْحَبُ الْمَلائِكَةُ رُفْقَةً فِيها كَلْبٌ وَلا جَرَسٌ–وفي رِوايَةٍ-: اَلْجَرَسُ مَـزاميرُ الـشَّيْطانِ﴾ رواه مسلم، **(مَلائِكَة)ی ڕەحمەت هاوڕێیـەتی ئـەو كەسـانە ناكـەن كـە سـەگ، یـان زەنگوڵیـان لـە گەڵدایـە،**

زەنگولێ موسیقای شەیتانە. (شرح صحیح مسلم) ب(٨) ل(٤١٢).

**پێنجەم: ( أَبُوجَهْل ) گوتی: وَاللهِ ناگەڕێینەوە تا لە ( بَدْر ) دادەبەزین و وشتر سەر دەبڕین و خواردن دەخۆین و شەراب دەخۆینەوەو ئافرەتەکانی گۆرانیبێـژیش موسیقاو تە پڵمان بـۆ لێدەدەن و عەرەبەکانیش ناوبانگ و هەواڵی هاتنمان دەزانن و بەردەوام لێمان دەترسێن.**

لەبارەی ئەم گۆتەیە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ خَرَجُوا مِنْ دِيَــارِهِمْ بَطَراً وَرِئَاءَ النَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللهِ وَاللهُ بِمَــا يَعْمَلُــونَ مُحِــيطٌ﴾ الأنفال:٤٧، **ئەی موسوڵمانان ئێوە وەك ئەو کافرانە مەبن کە لە ماڵەکانیخۆیان بۆ (بَدْر) دەرچون، بۆ ڕەدکردنـەوی ڕاستی و بـۆ دەعیـەو خـۆ نیشاندانی خـەڵك، خـەڵکیش قەدەغـە دەکەن لە ئایینی ئیسلام، خوایگەورە زانایە بەوەی ئەوان ئەیکەن و سزایان ئەدا.** (تفسیر ابن کثیر) الأنفال: ٤٧.

***جا لەجیاتی شەڕابخواردنەوە پیاڵەی مردنیان خواردەوە، لەجیاتی گۆشتی وشـتر بخـۆن، کرم گۆشتی ئەوانی خوارد، لەجیاتی گۆرانیو موسیقا ئافرەتەکانیان هاوارو ڕۆڕۆو سـینگ کوتانیان بۆ کردن، لەجیاتی ناوبانگیش شکستەکەیان لە ناو عەرەبەکاندا بڵاو بۆوە.***

**شەشـەم: چـینێکی ( صَـحابَة ) گوتیـان: ئێمـە بـۆ گرتنـی کاروانەکـە هـاتوین و ئـەومان پێخۆشترە**...پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **(خوایگەورە وەعدەی یەکێکیان لەو دووانە داومـێ).** خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يَعِدُكُمُ اللهُ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ الشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ اللهُ أَنْ يُحِقَّ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَيَقْطَعَ دَابِــرَ الْكَــافِرِينَ﴾ الأنفال:٧، **ئەی پێغەمبەرﷺ باس بکە: کە خوایگەورە وەعدەی دانێ یەکێکیان بۆ ئێوە دەبێ: یـان کاروانەکـە، یـان لەشـکرەکە، ئێـوەش ئـەی موسـوڵمانەکان پێتـان خـۆش بـوو لایەنەکـەی بێچـەك بـۆ ئێـوە ببـێ، بـەڵام خوایگـەورە دەیـەوێ ئایینیئیـسلام سەرکەوتوو بکاو قسەی ئیسلام لە سەر قسەی هەموو ئاینێك بێ و کافرەکانیش بنەبڕ بکا.**

واتە: کە هەواڵی دەرچوونی لەشکریکافرەکان گەیشتە پێغەمبەرﷺ، خوای گەورە (وَحْي)ی بۆ نارد: **﴿یان کاروانەکە دەگرن، یان بە سەر لەشکری کافرەکاندا سەر دەکەون﴾.** جا ئێوە سەلامەتیو تەماعی دونیاتان پێخۆش بوو، بەڵام خوایگەورە قوربانیی لە ئێوە دەوێ تاکو ئیسلام سەر بکەوێو ئێوە سەربەرز بن و کافرەکانیش سەر شۆڕ بن.

**جا بزانە:** بۆیێ پێغەمبەرﷺ وەڵامدانەوەی (أنصار)ی (مَدِينَة)ی مەبەسـت بـوو، چـونکە ئەوان زۆرتر بون و لەوەش دەترسا: (أنْصار) وا تێگەیشتبن: کە تەنها لە ناو شاری (مَدِينَة) یارمەتیدان و پاراستنی پێغەمبەرﷺ لە ئەستۆی ئەواندایـە—نـەك لـە دەرەوەی (مَدِینَـة)— چونکە ئەوان لە پەیمانبەستنی (اَلْعَقَبَة)دا گوتیـان: **(ئـەی پێغەمبـەریخوا، ئێمـە بەرینـەو**

پاراستنت لە ئەستۆی ئێمەدا نیە تا دەگەیە لای ئێمە، جا کە گەیشتیە لای ئێمە، ئەو کات دەتپارێزین). جا کە حەزرەتی(سَعْد)ﷺ ئەو وەڵامە جوامێرانەی داوەو هەڵوێستی (أَنْصاري)یەکانی ئاشکرا کرد، پێغەمبەرﷺ دڵنیا بوو و دڵخۆش بوو و فەرمووی: ﴿سِيرُوا وَأَبْشِرُوا﴾ تا کۆتایی حەدیسەکەی ڕابردوو. (تفسير ابن كثير) الأنفال (٧).

**حەفتەم: پێغەمبەرﷺ خۆیو ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ لە ناوچەی (بَدْر)دا دەگەڕانو هەم ئیمام (عَلِي)و حەزرەتی (الزُّبَيْر)و حەزرەتی (سَعْد)شیﷺ ناردن، تاکو هەواڵی لەشکری دوژمن بزانن.** ئەوەش بەڵگەیە کە سوننەتە: سەرکردەی لەشکریئیسلام چەند هەواڵگرێك لە پێش لەشکرەکەدا بنێرێ تاکو جموجۆڵی لەشکرەکانی دوژمن بزانن‌و ژمارەیان بزانن‌و جۆری چەك‌و کەرستەی جەنگیان بزانن‌و شێوەی پیلانەکانیان بزانن‌و ناوی سەرکردەکانیان بزانن...هتد، هەروەها پێویستە: جموجۆڵی لەشکری ئیسلامیش زۆر شاراوە بێ‌و زانستی لەشکرەکە لە لای هیچ کەسێك نەدرکێنن، چونکە پێغەمبەرﷺ لێرەدا هیچ زانستێکیخۆی بە پیرەمێردەکە نەگوت، هەم کە بۆ غەزای (بَدْر)ش دەرچوو، فەرمووی: ﴿إِنَّ لَنا طَلْبَةً فَمَنْ كانَ ظَهْرُهُ حاضِراً فَلْيَرْكَبْ مَعَنا﴾ رواه مسلم، **ئێمە داواکاریەکمان هەیە، جا هەر کەسێك وڵاغی سواریی ئامادەیە، با لەگەڵمان سوار ببێ.** واتە: لێرەدا پێغەمبەرﷺ شوێنی غەزایەکەی ئاشکرا نەکرد، نەوەك بڵاو ببێتەوەو دوژمن خۆی ئامادە بکا. (شرح صحيح مسلم ب(٨) ل(١٠١)و (فقه السيرة، للبوطي) ل(٢٣٢).

**هەشتەم: لە شەوی غەزای (بَدْر)دا خوایگەورە بۆرژانی بە سەر (صَحابَة)کانداﷺ هێناو بارانی بە سەردا باراندن.** خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لِيُطَهِّرَكُمْ بِهِ وَيُذْهِبَ عَنْكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَى قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ﴾ الأنفال:١١، **لەو کاتەی خوایگەورە بۆرژان بە سەر ئێوەدا دەهێنێ، ئەم بۆرژانە ئەمین بوون‌و دڵنیابوونێکە لە لای خوایگەورەوە کە سەرکەوتووتان دەکا، هەروەها خوایگەورە لە ئاسمانەوە بارانتان بە سەردا دەبارێنێ–لە کاتی بێئاویدا– تا ئاو لە جۆگەو شیوەکان هەڵسا، بۆ ئەوەی خوایگەورە بەو ئاوە پاکتان بکاتەوە لە بێدەستنوێژیی‌و لە جەنابەت، هەم (وَسْوَسَة)ی شەیتانیش لە ئێوە لاببا: کە دەیترساندن‌و دەیگوت: ئێوە چۆن سەرکەوتوو دەبن؟ ئاوتان نەماوەو –تینوو دەبن– بە بێدەستنوێژیی‌و بە جەنابەتەوە نوێژ دەکەن‌و وا تێدەگەن ئێوە دۆستیخودانە؟ هەم بەو بارانە دڵتان بەهێز دەکا تاکو باوەڕتان بە یارمەتیدانی**  **خوا بەهێز ببێ‌و لمی زەمینەکەش توند ببێ‌و پێیەکانتان بە لمەکەدا ڕوو نەچێ‌و بە ئاسانی بتوانن هاتوچۆ بکەن.** جا بزانە: بۆرژان لە کاتی جەنگ‌و تەنگانەدا نیشانەی دڵنیابوون‌و نەترسانە. (تفسير ابن كثير) الأنفال (١١).

**نۆیەم: (اَلْحُباب)ﷺ فەرمووی: یارَسُولَ الله ئێرە شوێنی دابەزین نیە، واتە: بە کەڵکی سەربازگە نایێ.** لە کاتێکدا (الْحُباب) ئەو قسەیەی کرد کە دڵنیا بوو: پێغەمبەرﷺ بە بۆچوونی خۆیەتیو بە (وَحْي) نیە، چونکە هەر کردارو گوفتارێکی پێغەمبەرﷺ ئەگەر بە (وَحْي) نەبێ، ئەوە بۆ (صَحابَة)کان دروست بوو: ڕای جیاواز دەربڕن، چونکە لەو حاڵەتەدا پێغەمبەرﷺ وەکو ئادەمیزادێك ئەم کارە ئەنجام ئەدا، نەك وەکو پێغەمبەرێکی ڕاگەێنەر، جا ئەوەی لەم ڕووداوە دەفامێتەوە: موسوڵمان–هەرچەند پلەی نزم بێ–ئازادە، بەڵکو پێویستە ڕایخۆی دەربڕێ بەو مەرجەی بەرژەوەندیئیسلامی تێدا بێ، هەروەها سەرکردەش –هەر چەند پلەی بەرز بێ– لە سەری واجبە: گوێ بداتە ڕاو بۆچوونەکانی جیاوازو بەو ڕاو بۆچوونە ڕەفتار بکا: کە بەرژەوەندیئیسلامی تێدایە، هەرچەند خاوەن ڕایەکەش پلەی نزم بێ، یان تەمەنی بچوك بێ، بۆیێ ئیمام (عُمر)ﷺ بە زۆری ڕاوێژی بە گەنجەکانی تازە پێگەیشتوو دەکردو دەیفەرموو: **(ئەوان بیریان تیژو بەهێزە).**

جا ئەوەش بزانە: کە پێغەمبەرﷺ پلانەکەی (الْحُباب)ی پەسند کرد، یەکسەر (مَلائِکَة)یەك هاتە لایو فەرمووی: خوا سەلامت لێدەکاو دەفەرموێ: بەڕاستی ڕای باش هەر ئەو ڕایەیە کە (الحُباب) دەریبڕیوە،جا حەزرەتی(جُبْرائیل)شﷺ لەو کات لەوێ بوو و فەرمووی: ئەمە (مَلائِکَة)یەو ڕاستگۆیە. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢٧١) و(سيرة الصلابي) ب(١) ل(٦٨٧).

**دەیەم: پێویستە سەرکردەی لەشکر بپارێزرێ، لە سەر تەپۆلکەیەك کەپرێکیان بۆ پێغەمبەرﷺ دروست کرد...هتد،** پێویستە شوێنی سەرکردەی لەشکرەکە لە زەمینێکی وەهادا بێ: بە سەر مەیدانی جەنگدا بڕوانێو بتوانێ چاودێری جەنگ بکا، هەروەها پێویستە شوێنی سەرکردەکە پارێزراو و ئەمین بێ، نەوەك دوژمن بیگاتێو بیگرێ، یان بیکوژێو ببێتە هۆی شکانی لەشکرەکە، واتە: چونکە مرۆڤەکانی جەنگاوەر زۆر دروست دەبن، بەڵام کەم کەس دەبێتە سەرکردەیەکی لێهاتوو، جا لە بەر ئەوەی بە زۆری سەرکەوتنو شکانی لەشکر پابەندی سەرکردەکەیەتی، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ﴾ التوبة: ١٢، **سەرکردەکانی کوفر بکوژن.** واتە: ئەگەر سەرکردەکە لە مەیداندا نەما لەشکرەکە دەشکێو دەبەزێ. بە دەستکاریەوە لە (سیرةالصلابي) ب(١) ل(٦٩٧).

**یانزەهەم: پێغەمبەرﷺ لە شەوەکەی حەڤدەی ڕەمەزاندا لە خەونـدا دیتی لەشکری کافرەکان کەمە.** خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ الْتَقَيْتُمْ فِي أَعْيُنِكُمْ قَلِيلاً وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِيَ اللهُ أَمْراً كَانَ مَفْعُولاً﴾الأنفال: ٤٤، **باس بکە: کە خوایگەورە لە کاتی ڕووبەڕووبونەوەدا کافرەکانی بە کەم هێنا بەرچاوی ئێوە، ئێوەشی بە کەم هێنا بەرچاوی کافرەکان، تا خوایگەورە کاری جەنگ جێبەجێ بکاو سەرکەوتن بداتە لەشکریئیسلام.**

جا حەزرەتی(عبدالله بن مَسْعُود)ﷺ فەرموویەتی: لە جەنگی (بَدْر) کافرەکان لە بەر چاومان کەم کرانەوە، تا بە هاوڕێیەکیخۆم گوت: ئەوانە حەفتا کەس دەبن؟ ئەویش گوتی: وا تێدەگەم سەد کەسن. کافرەکانیش دەیانگوت: **موسوڵمانەکان بخۆری یەك وشترن.**

ئینجا کە جەنگ دەستی پێکردو بووە لێدانی شمشێرو (مَلائِکَة)ش هاتن، خوایگەورە لەشکریئیسلامی بە قەد دوو هەندی لەشکری کافرەکان هێنا بەرچاوی کافرەکان، هەوەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿قَدْ كَانَ لَكُمْ آيَةٌ فِي فِئَتَيْنِ الْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللهِ وَأُخْرَى كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُمْ مِثْلَيْهِمْ رَأْيَ الْعَيْنِ﴾ آل عمران: ١٣، **بەڕاستی بۆ ئێوە پەندو ئامۆژگاری هەبوو لەو دوو کۆمەڵانەی لە جەنگی (بَدْر)دا گەیشتنە یەکتری: کۆمەڵێك موسوڵمان بونو لە ڕێگایخوا غەزایان دەکرد، کۆمەڵەکەیتریش کافر بون، ئەم کۆمەڵە کافرە بە چاویخۆیان موسوڵمانەکانیان بە دوو هەندی خۆیان دەدیتن.**

(البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢٧٢-٢٧٣).

**دوازدەهەم: کە سەبەینە داهات لەشکری کافرەکان هاتە دۆڵی (بَدْر)...هتد،**

ئینجا کافرەکان گوتیانە (عُمَيْر بن وَهَب الْجَمَحِي): بڕۆ (صَحابَة)کانی (مُحَمَّد) بەسەر بکەوە. جا (عُمَيْر) بە دەورەی سەربازگەدا گەڕاو سوڕا، ئینجا گەڕاوەو گوتی: ژمارەی (صَحابَة)کانی (مُحَمَّد) سێسەد پیاوە، کەمێك: یان زیاترن، یان کەمترن، بەڵام مۆڵەتم بدەنێ تا بزانم ئەوان بۆسەو پاڵپشتیان هەیە؟ جا بە دۆڵەکەدا ڕۆیشتو گەڕاوەو گوتی: هیچم نەدی، بەڵام ئەی گەلی (قُرَيْش) دیتم وشترەکانی (يَثْرِب)=(مَدِينَة) مردنێکی بەردەوامیان هەڵگرتووە، ئەو موسوڵمانانە کەسانێکی وەهان: هیچ پەناو حەشارگەیەکیان نیە جگە لە شمشێرەکەی خۆیان نەبێ، وەکو حەزیا زمانیان دەرهێناوە، وَالله وا تێناگەم بتوانین یەکێك لەوان لێبکوژین تا یەکێکیش لە ئێمە دەکوژرێ، جا ئەگەر بە قەد ژمارەی ئەوانمان لێبکوژرێ، لە دوای ئەوە چ چاکەیەك لە ژیاندا هەیە؟ بۆ خۆتان بڕیارێك بدەن؟!.

جا کە (حَكِيم بن حِزام) گوێی لەم قسەیە بوو، چووە لای (عُتْبَة بن رَبِيعَة) تاکو خەڵکەکە بگەڕێنێتەوەو جەنگ نەقەومێ، جا (عُتْبَة) زۆر هەوڵی دا: لەشکری (قُرَيْش) بگەڕێنێتەوە، بەڵام (أَبُوجَهَل) هەوڵەکەی ئەوی پوچەڵ کردەوەو بە ترسنۆکی داناو گوتی: ناگەڕێینەوە تا خوا حوکم لە نێوان ئێمەو (مُحَمَّد)دا دەکا.

ئەمە لە لایەك، لە لایەکیتریشەوە: لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا (أَبُوجَهَل) داوای سەرکەوتنی لە خوا دەکردو دەیگوت: خودایە ڕێزدارتر کۆمەڵ سەرکەوتوو بکە، خودایە کامەمان بێ ڕەحمترینو ڕەحممان بچڕاندوە، کامەمان ئاینێکی وەهای هێناوە کە نایناسین، خودایە هەر ئەمڕۆ بە هیلاکی بدە.

جا خوایگەورە فەرمووی: ﴿إِنْ تَسْتَفْتِحُوا فَقَدْ جَاءَكُمُ الْفَتْحُ﴾ الأنفال: ١٩، **ئەی کافرەکان**

**ئەگەر ئێوە داوای سەرکەوتن بۆ چاکەکەتان دەکەن، ئەوە دوعایەکەتان قبولْ بوو: سەرکەوتن بۆ چاکەکەتان هات کە پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانن، بێ ڕەحمەکانیشتان بە هیلاك چون: کە ئێوەی کافرن.** (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢٧٣و٢٨٦).

**سێزدەهەم: حەرامە بە بێسود چەك بهاویشترێ،** پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إذا أَكْثَبُوكُمْ فَارْمُوهُمْ وَاسْتَبْقُوا نَبْلَكُمْ﴾ **کاتێ کافرەکان لێتان نزیك بونەوە تیربارانیان بکەن، هەندێك لە تیرەکانتان بهێڵنەوە.** بۆ جەنگی ئێستا تفەنگو تۆپو موشەك بە کار دەهێندرێ، جا حەدیسەکە بەڵگەیە: پێویستە چەکدارانیئیسلام ڕابهێندرێن: تاکو چەکەکانیان بەبێسود نەهاوێن، تا دوژمن لێیان نزیك نەبێتەوە چەکی تێنەگرن، تاکو ئامانجەکەیان بە باشی بپێکن، هەم بۆ پارێزکاریش بەشێکی چەکەکانیان بهێڵنەوەو هەمووی بۆ دوژمن نەهاوێن، تاکو بتوانن لە حاڵەتی بە ترسترو تەنگانەتردا بەرگری لە خۆیان بکەنو خۆیان دەرباز بکەن.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لا تُسَلُّوا السُّيُوفَ حَتَّى يَغْشُوكُمْ﴾ **شمشێرەکانتان دەرمەکێشن تا دەتانگەنێ.** ئەمەش بەڵگەیە: پێویستە لە هەر حاڵەتێکی جەنگدا چەکی شیاویخۆی بە کار بهێندرێو زیادەڕۆیی نەکرێ لە بە کارهێنانی چەکدا، هەروەها پێویستە: هێرشکردنو بە کارهێنانی جۆری چەکەکانیش بە بڕیاری سەرکردەی لەشکرەکە بێ، چونکە پێغەمبەرﷺ لە غەزای (بَدْر)دا فەرمانی دابووە (صَحابَة)کان: هێرش نەکەن تا بەخۆی فەرمانیان پێدەکا. (فتح الباري) ب(٧) ل(٣٨٣) و(سيرة الصلابي) ب(١) ل(٧٠٢).

**چواردەهەم: سێ گەنجی ( أَنْصاري ) بۆ ( عُتْبة )و ( شَيْبة )و ( الْوَلِيد ) هاتنە مەیدان، بەڵام پێغەمبەرﷺ ئەوانی گەڕاندەوەو ئیمام ( حَمْزَة )و ئیمام ( عَلِي )و حەزرەتی ( عُبَيْدة )یﷺ بۆ ناردنە مەیدان؟** بۆیێ پێغەمبەرﷺ ئەوانی گەڕاندەوەو ئەو سێیانەشی ناردن، چونکە ئەم جەنگە یەکەم جەنگ بوو، جا پێغەمبەرﷺ پێی خۆش بوو یەکەم هێرش لە خزمەکانی خۆیەوە دەست پێ بکا، جا ئیمام (حَمْزَة)ﷺ هەڵمەتی بردە سەر (شَيْبة)و خۆی پێناساندو فەرمووی: **من شێری خوداو شێری پێغەمبەریخودامﷺ، من (حَمْزَة)ی کوڕی (عَبْدُالْمُطَّلِب)م، واتە: من مامی پێغەمبەرمﷺ.** ئیمام (عَلِي)شﷺ هەڵمەتی بردە سەر (الْوَلِيد)و خۆی پێناساندو فەرمووی: **من بەندەیخوداو برای پێغەمبەریخودامﷺ،-** واتە: ئیمام (عَلِي) مامۆزای پێغەمبەرەﷺ، بەڵام لە (مَدِينَة) کردبویە برایخۆی-. جا حەزرەتی (عُبَيْدة)شﷺ هەڵمەتی بردە سەر (عُتْبَة)و خۆی پێناساندو فەرمووی: **من لە هاوپەیمانەکانی پێغەمبەرمﷺ.** واتە: مامۆزای باپیرەی پێغەمبەرمﷺ.

جا لە (رِوايَة)ێکیتردا هاتووە: ئەو سێ کافرانە بەو سێ گەنجەی (أَنْصاري) ڕازی نەبونو گوتیان: ئێمە هیچ کارێکمان بە ئێوە نیە. جا بانگیان کرد: هۆ (مُحَمَّد) هاوچەشنی خۆمان

له خزمەکانیخۆمان بۆمان بنێرە مەیدان. ئینجا پێغەمبەرﷺ ئەو سێ خزمانەیخۆی بۆ ناردنە مەیدان...هتد. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢٧٦و٢٧٧).

*جا پێویستە سەرکردەی دڵسۆز ئەوها بێ: پێشدا خزمەکانیخۆی بکاتە گیانفیدای ئیسلام، تاکو خەڵکیتریش وەجۆش بێو بە دڵێکی پاكو بێگەرد خۆی بە قوربانی ئیسلام بکا، بەڵام ئەگەر سەرکردە خزمەکانیخۆی لە ناو حەشارگەو شوێنە پارێزراوەکان دابنێو بە پلەو پایە خەریکیان بکا، ئەوکاتە ئەنجامەکە دەبێتە شکستو بەزینی لەشکریئیسلام.*

**پانزەهەم: پێغەمبەرﷺ لە ناو کەپرەکەدا دەستەکانی بەرز کردنەوە دوعای دەکرد.**

ئەمەش بەڵگەیە: کە دەست بەرزکردنەوە لە دوعادا سوننەتێکی پێغەمبەرەﷺ ﴿عَنْ عائِشَةَ-رضي الله عنها-: كانَ رَسُولُ اللهِﷺ يَرْفَعُ يَدَيْهِ يَدْعُو حَتّى إِنِّي لأَسْأَمُ لَهُ مِمّا يَرْفَعُهُما﴾ رواه الإمام أحمد بثلاثة أسانيد رجالها كلّها رجال الصحيح، **پێغەمبەرﷺ هەردوو دەستەکانی بەرز دەکردنەوەو دوعای دەکرد، تا من لەو بەرزکردنەوەیە وەڕەز دەبوم.**

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ما رَفَعَ قَوْمٌ أَكُفَّهُمْ إِلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ يَسْأَلُونَهُ شَيْئاً إِلاّ كانَ حَقّاً عَلَى اللهِ أَنْ يَضَعَ فِي أَيْدِيهِمْ الَّذِى سَأَلُوا﴾ رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح، **هەر گەلێك لەپە دەستەکانیان بۆ لای خوا بەرز بکەنەوەو داوای شتێکی لێبکەن، مافیان لە سەر خوا هەیە: ئەوەی داوایان لێکردوە لە ناو دەستیان دابنێو بیانداتێ.** (مجمع الزائد ومنبع الفوائد) ب(١٠) ل(١٩٢و١٩٣).

**پرسیار:** پێغەمبەرﷺ پێشتر فەرمووی: ﴿لَكَأَنِّى الْآنَ أَنْظُرُ إِلَى مَصارِعِ الْقَوْمِ﴾ **وەك بڵێی ئێستا بە چاویخۆم تەماشای شوێنی کوژرانی کافرەکان دەکەم.** ئەوەش وادەگەیەنێ: کە پێغەمبەرﷺ دڵنیا بوو خوایگەورە سەرکەوتنی دەداتێ، چونکە خوای گەورە وەعدەی سەرکەوتنی دابوێ، خوای گەورەش لە وەعدەکەی پەشیمان نابێتەوە، ئەی بۆچی لە ناو کەپرەکەدا هەر خەریکی دوعاکردن بوو؟

**وەڵام:** دوعاکردن بە جێهێنانی ئەرکی بەندایەتیو ملکەچییە بۆ خوایگەورە، نابێ بەندە لێی بێئاگا بێ، کەوابوو: دوعاکردنیش بەشێکی عیبادەتیخوایە، هەوەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلدُّعاءُ هُوَ الْعِبادَةُ﴾رواه الترمذي وأبوداود بسند صحيح، **دوعاکردن هەر بەخۆی خواپەرستییە.** جا کەپێغەمبەرﷺ دیتی: (مَلائِكَة)و (صَحابَة)کان لە گەرمەی جەنگدانە، ئەویش دڵی دانەدەمەزرا ئەگەر بەشداری لەو جەنگەدا نەکا، بۆیی بە دوعاکردن بەشداریی کرد، چونکە دوعاکردنیش وەکو (جِهاد) خواپەرستییە.

جا بۆیش لە دوعایەکەیدا فەرمووی: ﴿اللّهُمَّ إِنْ تَهْلِكَ هَذِهِ الْعِصَابَةُ مِنْ أَهْلِ الْإِسْلامِ فَلا تُعْبَدُ فِي الْأَرْضِ﴾ **خودایە ئەگەر ئەگەم کۆمەڵە موسوڵمانە بە هیلاك بچێ، لە سەر زەمین تۆ ناپەرسترێی؟** چونکە پێغەمبەرﷺ کوتاییهێنەری پێغەمبەرانە-عليهم الصلاة والسلام-، جا ئەگەر خۆیو ئەو چینە (صَحابَة)یە لەناو بچن، کافرەکان بەردەوام دەبن لە

بتپەرستندا، چونكە هیچ پێغەمبەرێكی‌تر نایێو خواپەرستی بەو شەریعەتەی ئیسلام ناكرێ.
(مجمع الزوائد ومنبع الفوائد) ب(١٠) ل(١٩٢و١٩٣) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٣٦٠و٣٦١).

**شانزەهەم: بەشداریكردنی (مَلائكَة) لە غـەزای (بَـدْر)**، پێغەمبـەرﷺ لـە غـەزای (بَـدْر)دا فەرمووی: ﴿هَذا جِبْرِيلُ آخِذٌ بِرَأْسِ فَرَسِهِ عَلَيْهِ أَدَاةُ الْحَرْبِ﴾ رواه البخاري، **ئەمـە (جُبْرائِیل)ە، سەری ئەسپەكەیخۆی گرتووەو كەرستەی جەنگی لە سەرە.** لەبارەی بەشداریكردنی (مَلائكَة) لە غەزای (بَدْر) خوایگـەورە دەفـەرموێ: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّـي مُمِدُّكُمْ بِأَلْفٍ مِنَ الْمَلائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾الأنفال: ٩، **باس بكەن كە ئێوە لە خوا دەپاڕانەوە: تاكو لـە هاوراتـان بـێ، جـا خوایگـەورە دوعایەكـەی قبـوڵ كـردن: مـن یارمەتیـدەرتانم بـە هەزار (مَلائِكَة)، كە یەك لە دوای یەك بۆ یارمەتیدانتان دەهاتن.**

واتە: حەزرەتی(جُبْرائِیل)عليه السلام پێنجسەد (مَلائِكَة)ی لەگەڵدا بـون، لـە لای ڕاسـتەی لەشـكری موسوڵمانان جەنگی دەكرد، حەزرەتی(مِیكائیل)شعليه السلام پێنجسەد (مَلائِكَة)ی لەگەڵدا بون، لە لای چـەپەی لەشـكرەكە جـەنگی دەكـرد، جـا خوایگـەورە چـۆنیەتی جـەنگكردنی فێـری (مَلائِكَة)كان كردو فـەرمووی: ﴿فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ﴾ الأنفال: ١٢، **لـە ملی كافرەكان بدەن‌و لە هەموو جومگەكانیان بدەن.**

جـا (صَـحابَة)كـان كـوژراوی (مَلائِكَـة)یـان بـەوە دەناسـیەوە: كـە لـە ملیـان درابـوو، لـە جومگەكانیان درابوو، شوێنی لێدانەكەش وەك داغكردنی ئاگر سوتا بوو.

هەروەها موسوڵمانێك بە دوای كافرێكدا غاری دەدا بیكوژێ، لە ناكـاو یـەكێك قامـچیەكی لـە كافرەكەدا و كوشتی، گوێیشی لە سـوار ئەسـپەكە بـوو: دەیگـوت: **(أَقْدِمْ حَيْزُوم) بـەرەو پێش بڕۆ ئەی حەیزوم.** واتە: حـەیزوم نـاوی ئەسـپی (مَلائِكَـة)كـە بـوو، جـا (صَـحابَة)كـە ئەمەی بۆ پێغەمبەرﷺ گێڕاوە، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ﴿صَدَقْتَ ذَلِكَ مِنْ مَدَدِ السَّماءِ الثَّالِثَةِ﴾ رواه مسلم، **ڕاست دەكەی ئەوەیان لە یارمەتیدەرەكانی ئاسمانی سێیەمە.**

جا پێغەمبەرﷺ لە حەزرەتی(جُبْرائِیل)ی پرسی: ئەو (مَلائِكَة)یە كـێ بـوو كـە لـە غـەزای (بَدْر) گوتی: **(أَقْدِمْ حَيْزُوم) ئەی حەیزوم بـەرەو پـێش بـڕۆ؟** حـەزرەتی(جُبْرائِیـل)عليه السلام فەرمووی: من هەموو (مَلائِكَة)ی ئاسمان ناناسم.

جا حـەزرەتی(أَبُوأُسَـيْد)-كـە (صَـحابَة)یـەكی (بَـدْر) بـوورضي الله عنه-دەیفـەرموو: ئەگـەر ئێـستا چاوەكانم بمابان، ئەو گەڵیەم نیشان دەدان كە (مَلائِكَة)ی لێهاتنە مەیدانی جەنگ.

هەروەها (حَكِيم بن حِزام)-كە لەو كاتدا كافر بوو-فەرموویەتی: لە بەرچاوی مـن مێـرووی ڕەش وەك پارچە جلی خەت خەت لە ئاسمان دەهاتنە خوارەوە، هیچ گومانم نەبو ئەوانـە (مَلائِكَة)ن، جا هەندەی پێنەچو كافرەكان بەزین.

جا حەزرەتی(ابن عَبّاس)-رضي الله عنهما-فەرموویەتی: تەنها لە غەزای (بَدْر)دا (مَلائكَة) جەنگیان

کردوه لە غەزایەکانی‌تردا تەنها ژمارەی موسوڵمانیان زۆر دەکرد.
ئیتر داستانی (مَلائِكَة) لە غەزای (بَدْر)دا زۆر درێژو سەرسوڕهێنەرە، لە بەر درێژی هەمووم نەنوسی. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢٧٨-٢٨٦).

**حەڤدەهەم: پێغەمبەرﷺ چەنگە گلێکی هەڵگرت‌و پرژاندیە دەم‌وچاوی کافرەکان،**
ئەمەش یەکێکە لە (مُعْجِزة)کانی پێغەمبەرﷺ، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَكِنَّ اللهَ قَتَلَهُمْ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللهَ رَمَى﴾ الأنفال:١٧، **ئەی موسوڵمانان ئێوە بە هێزو توانای خۆتان کافرەکانتان نەکوشتن-چونکە ئەوان لە ئێوە زۆرتر بون- بەڵکو خوای‌گەورە ئەوانی کوشتن بەو سەرکەوتنەی دایە ئێوەو بەو ترسەی خستیە ناو دڵی ئەوان، هەروەها ئەی پێغەمبەرﷺ لە ڕاستی‌دا تۆ ئەو چەنگە گڵەت نەهاویشت -چونکە چەنگە گڵێك بەڕوەستی چاوی ئەو هەموو کافرانەی نەدەکرد- بەڵام خوای‌گەورە هاویشتی، واتە: چەنگە گڵەکەی گەیاندە ناو چاوی هەموو کافرەکان.**
(تفسير ابن كثير) الأنفال (١٧).

**هەژدەهەم: حەرامە سەرکردەکانی لەشکر خۆیان بە شەهیدکردن بدەن، ئەگەر شەهیدبوونەکە ببێتە هۆی شکستی موسوڵمانان،** لە غەزای (بَدْر) پێغەمبەرﷺ ڕێگای نەدا: ئیمام (أَبُوبَكْر)رضي الله عنه بۆ (عَبْدُالرَّحْمن)ی کوڕی‌خۆی بڕواتە مەیدان. ئەم ڕووداوەی غەزای (بَدْر) لە غەزای (أُحُد)ش دووبارە بۆتەوەو لە هەردوو غەزادا پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿يا أَبابَكْرٍ مَتِّعْنا بِنَفْسِكَ-أَيْ-لا تَفْجَعْنَا بِمَوْتِكَ﴾ **ئەی (أَبُوبَكْر) بە مانەوەی خۆت سودمان پێ‌بگەیێنە، بە مردنی‌خۆت دڵمان مەئێشێنە.**
هەروەها کە لە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ عەرەبەکان کافر بونەوە، ئیمام (أَبُوبَكْر)رضي الله عنه ویستی بەخۆی لەگەڵ لەشکری‌ئیسلامدا بڕواتە جەنگی کافربووەکان‌و شمشێرەکەشی دەست دایێ، بەڵام ئیمام(عَلِي)رضي الله عنه جڵەوی وڵاغەکەی گرت‌و فەرمووی: **ئەی (خَلِيفَة)ی پێغەمبەرﷺ وەك پێغەمبەرﷺ-لە غەزای (أُحُد) پێ‌ی گوتی-منیش پێت دەڵێم: شمشێرەکەت لە کالانەکەی دابنێوەو بە مردنی‌خۆت دڵمان مەئێشێنە، بگەڕێوە، وَاللهِ ئەگەر تۆ ئێستا بکوژرێ‌ی هیچی‌تر ئیسلام ڕێك‌وپێك نابێ.** جا ئیمام (أَبُوبَكْر)رضي الله عنه بەخۆی گەڕاوەو لەشکرەکەشی نارد.
**ئینجا بزانە: ئەو دوو ڕووداوانە بەڵگەنە:** ئەگەر موسوڵمانێك کوشتنەکەی ببێتە هۆی شکستی موسوڵمانان-وەك گەورەیەك، یان سەرکردەیەکی لێهاتوو- ئەوە بۆ ئەو جۆرە کەسە حەرامە بڕواتە بەرەی پێشەوەی جەنگ، هەروەك ئیمامی (الْماوَرْدِي) فەرموویەتی‌و ئیمامی(البُلْقِينِي)ش پشتگیری‌ی کردوە.
**هەروەها ڕووداوەکەی دووەمیش بەڵگەیە:** کە ئیمام (عَلِي)رضي الله عنه دانی ناوە بە (خِلاَفَة)ی ئیمام (أَبُوبَكْر)رضي الله عنه، هەم ڕێزیشی لێناوەو دڵسۆزیشی بووەو بۆ جەنگی کافربووەکانیش

پشتگیری کردوه، بۆیێ که ئافرەتەکانی ئەم کافربووانە دەستگیر کران، ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ لەو ئافرەتانە کەنیزەیەکی دایە ئیمام (عَلِي)ﷺ، جا ئیمام (عَلِي)ﷺ لەم کەنیزەیە –کە ناوی (خَوْلَة) بوو– کوڕێکی بوو، ناوی لێنا: (مُحَمَّد)، کە پێی دەگوترێ: (مُحَمَّد) حەنیفە.

ئیتر با شەمشەمەکوێرەکانی (شِيعَة) هەر لە تاریکی درۆ و بوختاندا بمێننەوەو بە کۆڵێك درۆو بوختانەوە بچنە دادگایخودا؟ چونکە دەڵێن: ئیمام (أَبُوبَكْر ﷺ) ستەمی لە ئیمام (عَلِي ﷺ) کردوە!. بەڵکو دەڵێن: ستەمی لەم کافربووانەش کردوە کە جەنگی لەگەڵ کردون!.

سەیرە: ئەی –ئەگەر جەنگی کافربووەکان ستەم بوو– بۆچی ئیمام (عَلِي)ﷺ هاوبەشی ئەو ستەمەی کردو کەنیزە دەستگیرکراوەکەی ئەم کافربووانەشی قبوڵ کردو کردیە دایکی کوڕێکی خۆی؟!. جا ئاگادار بە: لە گوڵبژێرەکەی مارەبڕینی حەزرەتی (فاطِمَة) لە ئیمام (علی) رضیالله عنهما، پێناسەی (شِيعَة) دەکەین، إن شاءالله تعالی،

بۆ ئەم باسەش بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ب(١) ل (٢٦٠) و(تحفةالمحتاج لشرح المنهاج) ب(٩) ل(٢٤٥) و(فتح المبين لشرح الاربعين النواوية) ل(١١٥) و(السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٣٠٥و٣٠٦).

**نۆزدەهەم: لە غەزای(بَدْر)دا حەزرەتی(أَبُوعُبَيْدَة بن الْجراّح)ﷺ باوکیخۆی کوشت.**

**بزانە:** لە غەزادا نایەسندە موسوڵمان خزمیخۆی بکوژێ، جا ئەگەر خزمەکەی مەحرەم بێ، ئەو کاتە نایەسندیەکەی بەهێزترە، بەڵام ئەگەر گوێی لێبێ خزمەکەی جنێو دەداتە: خوا، یان پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانیخوا–علیهم الصلاة والسلام–، یان ئیسلام، یان تێکڕای موسوڵمانان، یان خزمەکەی هێرشی کردە سەری تاکو بیکوژێ –وەك باوکی (أَبُوعُبَيْدَة) وایکرد– ئەوە لەو حاڵەتانەدا کوشتنی خزمەکەی نایەسند نیە. (تحفةالمحتاج بحاشيةالشرواني) ب(٩) ل(٢٤٠).

**بیستەم: (أُمَيَّة بن خَلَف) کوژرا**، (أُمَيَّة) ئەو کافرە بوو کە لە (مَكَّة)دا حەزرەتی(بِلال الْحَبَشِي)یﷺ ئازار دەدا، حەزرەتی(عَبدالرَّحمن بن عَوْف)ﷺ فەرموویەتی: لە غەزای (بَدْر) چەند زرێیەکم دەست کەوتنو هەڵمگرتن، کاتێك (أُمَيَّة بن خَلَف) لەگەڵ (عَلِي) کوڕی خۆی ڕاوەستابوو، بانگی کردمو گوتی: بۆچی من دیل ناکەی، خۆ من لەو زرێیانە باشترم؟ منیش وەڵامم داوەو گوتم: باشە. ئیتر زرێیەکانم فڕێدانو دەستی (أُمَيَّة)و کوڕەکەیم گرتو لەگەڵ خۆمدا بردنم، لە ئاکاودا (بِلال) ئەوانی لەگەڵ مندا دیتنو هاواری کردو گوتی: (**يا أَنْصارَ اللهِ رَأْسُ الْكُفْرِ أُمَيَّةُ، لا نَجَوْتُ إِنْ نَجا**) هۆ یارمەتیدەرانیخوا، ئەمە (أُمَيَّة)یە سەرکردەی کوفرە، ڕزگارم نەبێ ئەگەر ڕزگاری ببێ. ئیتر (بِلال)و (صَحابَة)کانیتر دەورەیان لێداین، ناچار (عَلِي) کوڕی (أُمَيَّة)م بۆ بەجێ هێشتن بەڵکی واز لە (أُمَيَّة) بێنن، بەڵام ئەوان کوڕەکەیان کوشت، جا بە دوای ئێمەشدا هاتنو گەیشتنەوە ئێمە، ناچار من خۆم خستە سەر (أُمَيَّة)، بەڵام ئەوان لە ژێر منەوە شمشێرەکانیان دە (أُمَيَّة) وەژەنینو کوشتیانو پێی منیشیان بریندار کرد. جا حەزرەتی(عَبدالرحْمن)ﷺ دەیگوت: خوا ڕەحم بە (بِلال) بکا، بە لە دەستدانی زرێیەکانمو هەردوو دیلەکانم دڵنێشای کردم. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢٩٠).

ئا بەم جۆرە حەزرەتی(بِلال)ﷺ تۆڵەی خۆی لەو دوژمنە بێویژدانەیخۆی کردەوەو دڵخۆش بوو و شیفای دەردەکەی هات، جا ئەوها ﴿وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ﴾ التوبة: ١٤، **خوایگەورە شیفای دڵی گەلی ئیماندااران دەدا.**

**بیستو یەکەم: (أَبُوجَهْل)ش کوژرا**، حەزرەتی(عَبدالرَّحْمن بن عَوْف)ﷺ فەرموویەتی: لە غەزای (بَدْر) لە نێوان دوو گەنجی (أنْصارِي) لە ریزەکەدا راوەستابوم، جا یەکێکیان بە نهێنی قونجرکەیەکی لێدامو گوتی: مامە، (أَبُوجَهْل) دەناسی؟ گوتم: بەڵێ، بۆچیتە؟ گوتی: وام زانیوە جنێوی دەدا پێغەمبەرﷺ، سوێندم بە خوا ئەگەر بیبینم لێی جیا نابمەوە تا یەکێکمان دەمرین. جا گەنجەکەیتریش قونجرکەیەکی لێدامو هەمان قسەی لەگەڵ کردم، جا هەندەی پێنەچوو دیتم (أَبُوجَهْل) لە نێوان کافرەکاندا دەسوڕاوە، جا پێم گوتن: ئا ئەمەیان ئەو کەسەیە کە پرسیارتان لێکردم، ئیتر هەردوو گەنجەکان وەك جووتە باز داوەرینە سەر (أَبُوجَهْل)و بە شمشێریخۆیان لێیان دا.

جا بزانە: ئەم دوو گەنجانە، یەکێکیان: حەزرەتی(مُعاذ بن عَمْرو)ﷺ بوو، شمشێرێکی لە (أَبُوجَهْل) دا پێیەکی لێکردەوە، جا (عِكْرَمَة)ی کوڕی(أَبُوجَهْل)ش شمشێریکی لەوی دا دەستێکی لێکردەوە، گەنجەکەیتریش: حەزرەتی(مُعاذ بن عَفْراء)ﷺ بوو، شمشێریکی لە (أَبُوجَهْل) دا برینێکیتری تێکرد، ئینجا لە دوای ئەوانیش: حەزرەتی(مُعَوَّذ بن عَفْراء)ﷺ)– کە برای دووەمەکەیە– ئەویش بە شمشێر لە (أَبُوجَهْل)ی دا تا پەکی خستو هێزی نەما.

جا لە دوای کۆتایی جەنگ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **(کێ دەچێ بزانێ (أَبُوجَهْل) چی لێهاتووە)؟** جا حەزرەتی(عبدالله بن مَسْعود)ﷺ فەرمووی: من دەچم. جا حەزرەتی (عبدالله) ڕۆیشتو دیتی کوڕەکانی (عَفْراء) وەهایان لە (أَبُوجَهْل) داوە: تەنها گیانی تێدا ماوە، جا حەزرەتی(عبدالله)ﷺ پێی لە سەر ئەستۆی (أَبُوجَهْل) داناو ڕیشی گرتو گوتی: **خوا ڕیسوای کردی ئەی دوژمنیخوا؟** ئینجا حەزرەتی(عبدالله)ﷺ هەر بە شمێرەکەی (أَبُوجَهْل) سەری (أَبُوجَهْل) لێکردەوەو هێنایە لای پێغەمبەرﷺ، جا لە (رِوایَة)ێکدا: پێغەمبەرﷺ سوپاسی خوای کردو فەرمووی: ﴿اَللهُ أَكْبَر، اَلْحَمْدُ للهِ الَّذِى صَدَقَ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الْأَحزابَ وَحْدَهُ﴾. ئینجا پێغەمبەرﷺ لەگەڵ حەزرەتی(عبدالله) چووە سەر لاشەی (أَبُوجَهْل)و فەرمووی: ﴿هَذا فِرْعَوْنُ هَذِهِ الْأُمَّةِ﴾ رواه أبوداود والنسائى بسند صحيح، **ئەمە (فِرْعَوْن)ی ئەم ئوممەتەیە.** (فتح البارى) ب(٧) ل(٣٦٨و٣٦٩) و(البدايه والنهايه) ب(٢) ل(٢٩٣).

*بەڵێ: بەم جۆرە غەمو خەفەتە، بەم شکستو ڕەزالەتە بەم سەرشۆڕیو سوکایەتیە، (فِرْعَوْن)و (طاغُوت)ی ستەمکاری پڕ دەعیەی ئەم ئوممەتە، کۆتایی بە ژیانە ناپیرۆزەکەی هاتو بەرەو ژیانی هەتاهەتایی ناو دۆزەخ ڕۆیشت، هەزاران هەزار لەعنەت لە گیانو لە لاشەو لە گۆڕەکەی کە بیرە قوڵەکەی (بَدْر)ە، جا با (طاغُوت)و ستەمکارەکانی ئێستاش بە*

*(أُبوجَهْل) تەمبێ بێ.*

**پرسیار:** له ئیسلامدا هەتککردنی کوژراوەکان دروست نیه، ئەی بۆچی حەزرەتی(عبداللهﷺ) —لەم غەزایەدا—سەری (أبُوجَهْل)ی له لاشەی کردەوەو هێنایانه لای پێغەمبەرﷺ؟

**وەڵام:** لەم غەزایەدا هەتککردن حەرام نەکرابوو، بەڵکو له غەزای (أُحُد)دا حەرام کرا، هەروەك له باسی شەهیدبوونی ئیمام(حمزة)داﷺ بەڵگەی بۆ دێنین، إن شاءالله تعالی، جگه له مەش: ئیمامی (الماوردي)و ئیمامی(الغزالي) به دروستیان داناوە: سەری ئەو جۆرە کافرانه بهێندرێته لای گەورەی موسوڵمانان، ئەگەر فێڵو چاوشکاندنی کافرەکانی تێدا بێ، هەروەك ئیمامی (الحلبي) گێڕاویەتیەوە. (السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٢٣٧).

**بیستو دووەم: پێنج موسوڵمانی (مَكّة)ش له بەرەی کافرەکاندا کوژران؟** ئەو موسوڵمانانه هەر له (مَكّة)دا مابونەوەو کۆچیان نەکردبوو، جا له ترسی کافرەکان وەگەڵ لەشکری کافرەکان کەوتن بۆ جەنگی (بَدْر)، جا هەر پێنجیا کوژران، یەکێك لەو پێنجانه (عَلِي) کوڕی (أُمَيَّة) بوو—که لەگەڵ (أُمَيَّة)دا گوژرا—جا (مَلائكَة)ی عەزاب ئەوانەیان بردنه دۆزەخ، هەوەك خوایگەورە دەرهەق ئەوانه دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي ٱلْأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيراً﴾ النساء:٩٧، والحديث رواه البخاري، **بەڕاستی ئەو موسوڵمانانەی له غەزای (بَدْر) له بەرەی کافرەکاندا کوژرانو (مَلائِكَة)ی عەزاب گیانیانی دەرهێنا لەو حاڵەتەی ئەوان ستەمکاری گیانیخۆیان بون—چونکه لەگەڵ کافرەکاندا بون—(مَلائكَة) پێیان گوتن: ئێوه لەگەڵ چیدا بون؟ موسوڵمانه کوژراوەکانیش گوتیان: ئێمه بێهێزو چەوسێندراو بوین له زەویدا. (مَلائكَة) گوتیان: ئەدی زەمینیخوا فراوان نەبو تا ئێوەش—وەك موسوڵمانەکانیتر— کۆچی تێدا بکەنو لەگەڵ کافرەکاندا نەبن؟ جا ئەو موسوڵمانه کوژراوانه جێگەیان جەهەننەمەو خراپترین شوێنه.**

بەڵێ: به هۆی زۆرکردنی لەشکری کافرەکان ئەوانه چونه دۆزەخ، کەوابوو: ئایەتەکه بەڵگەیه: هەر موسوڵمانێك وەگەڵ کافرەکان بکەویو یارمەتییان بدا، دروسته موسوڵمانەکان بیکوژن، هەوەك (صَحابَة)کان (عَلِي بن أُمَيّة)یان کوشت، جا له دوای کوشتنیش خوایگەورە ئەوها غەزەبی لێدەگرێو دەیباته دۆزەخ، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ جامَعَ الْمُشْرِكَ وَسَكَنَ مَعَهُ فَإِنَّهُ مِثْلُهُ﴾ حديث حسن رواه أبوداود، **هەر کەسێك وەگەڵ کافر بکەوێو لەگەڵی نیشتەجێ ببێ، ئەویش وەکو کافرەکەیه.**

هەروەها ئیمام (أحمد) گێڕاویەتیەوە: خوایگەورە (وَحْي) بۆ پێغەمبەرێك نارد: **﴿به گەلەکەی خۆی بڵێ: نەچنه ئەو شوێنانەی دوژمنانی من دەیچنێ، جلو بەرگی**

دوژمنانی من دەبەر مەکەن، سواری ئەو شتانە مەبن کە ئەوان سواری بوینە، نەوەك ئێوەش وەکو ئەوان ببنە دوژمنی من﴾. (البدایه والنهایه) ب(٢) ل(٣٠٠) و(فیچ القدیر) ب(٦) ل(١٤٥).

**بیستو سێیەم: لەو ڕۆژەی موژدەی سەرکەوتنی (بَدْر) گەیشتە (مَدِینَة)ی پیرۆز، حەزرەتی (رُقَیَّة)ی کیژی پێغەمبەرﷺ وەفـاتی کـرد،** حـەزرەتی(رُقَیَّـة)-رضي الله عنها-هاوسـەری ئیمـام (عُثمان)ﷺ بوو، جا لەو کاتەی پێغەمبەرﷺ بۆ غەزای (بَدْر) ڕۆیشت، حـەزرەتی(رُقَیَّـة) نەخۆش بوو، بۆیێ پێغەمبەرﷺ ئیمام (عُثمان)ی لە لای بەجێ هێشتو نـەیبردە غـەزای (بَدْر)، تاکو ئاگای لێبێ، بۆیێ پێغەمبەرﷺ لە دەسکەوتووی (بَـدْر)-وەکـو ئامـادەبووی غەزایەکە- بەشی بۆ ئیمام (عثمان)ﷺ دانا، جا کە تازەیەی (رُقَیَّة)یان لـە پێغەمبـەرﷺ کرد، فـەرمووی: ﴿اَلْحَمْدُ للهِ دَفْنُ الْبَناتِ مِـــنَ الْمَكْرُمـــاتِ﴾ **سوپاس بۆ خـوا ناشـتنی کیژەکان لە ناو گۆڕدا لە ڕێزلێنانەکانە.**

ئینجا پێغەمبەرﷺ ئەم جارەش حەزرەتی(أُمُّ كَلْثُوم)ی کیژیخۆی لە ئیمام (عثمان) مارە کرد-رضي الله عنهما-، بە فەرمانی حەزرەتی(جُبْرائیل)ﷺ لە لایەن خـواوە، جا لـە بـەر ئـەوەی ئیمام (عثمان)ﷺ دوو کیژی پێغەمبەریﷺ مارە کردون، پێی دەگوترێ: (**ذِیالنُّورَیْن**) **خاوەنی دوو ڕووناکییەکە**، چونکە جگە لە ئیمـام (عثمـان)ﷺ هـیچ کەسـێکیتـر دوو کیژی پێغەمبەرێکی مارە نەکردون.

ئینجـا لـە سـاڵی نـۆی کۆچـیدا حـەزرەتی(أُمُّ كَلْثُـوم)ش-رضي الله عنها- وەفـاتی کـرد، جـا پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: ﴿زَوِّجُوا عُثْمانَ لَوْ كَانَ لِي ثالِثَةٌ لَزَوَّجْتُهُ إِیّاها﴾ وفي روایـة: ﴿لَوْ أَنَّ لِي أَرْبَعِینَ بِنْتاً زَوَّجْتُكَ واحِدَةً بَعْدَ واحِدَة﴾ **ژنێك لە (عُثمان) مارە بکەن، ئەگەر سێیەم کیژم هەبوایە لێم مارە دەکرد...ئەی (عُثمان) ئەگەر چل کیژم هەبوانە، یەك لە دوای یەك لێم مارە دەکردی.** (السیرةالحلبیة) ب(٢) ل(٢٥١-٢٥٣).

**بیستو چوارەم: ژیانی (بَرْزَخِي)ی ناو گۆڕ،** پێغەمبەرﷺ بانگی کوژراوەکـانی کـرد...جـا فەرمووی: ﴿مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِما أَقُولُ مِنْهُمْ﴾ **ئێوە لەوانتان باشترگوێ لێنیە...هتد،**

**ئەمەش بەڵگەیە: کە هەموو جۆرە مردوویێك-موسوڵمانو کـافر- ژیـانی (بَرْزَخِـي)ی هەیـە، بـەڵام ئێمـە چـۆنیەتیی نـازانین، کـەوابوو: گیـانی مردووەکـە پەیوەنـدیی بـە بەشـێکی لاشەکەیەوە هەیە، هەر چەند ئەم بەشەش کلینجە بێ، چونکە کلینجەی ئادەمیزاد نارزێ،** هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ مِنَ الْإِنْسانِ شَيْءٌ إِلاّ يَبْلَى إِلاّ عَظْماً واحِداً: وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيامَةِ﴾ رواه‌الشیخان، **هەموو پارچەیەکی ئـادەمیزاد دەڕزێو لـەناو دەچـێ تـەنها یـەك ئێـسقان نـەبێ کـە نـاوی (کلینجـە)یـە، هـە لـەو (کلینجە)یەش ئادەمیزاد دروست دەکرێتەوە لە ڕۆژی قیامەت.** (کلینجـە) ئێسقانێکی بچکۆڵەیە لە کۆتایی زنجیرەی پشتی ئادەمیزاددا.

جا بەم ژیانە (بَرْزَخِي)یە، مردووەکە گوێی لێدەبێو ئەو کەسەی سەردانی دەکا دەیناسێو وەڵامی سەلامیشی دەداتەوە، هەوەك لە چەند حەدیسێکی (صحيح)دا هاتووە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَا مِنْ أَحَدٍ يَمُرُّ بِقَبْرِ أَخِيهِ الْمُؤْمِنِ كانَ يَعْرِفُهُ فِي الدُّنْيا فيُسَلِّمُ عَلَيْهِ إلاّ عَرَفَهُ وَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ﴾ أخرجه ابن عبدالبرّ في التمهيد والإستذكار باسناد صحيح، **هەر کەسێك بە لای گۆڕی برا ئیمانداڕەکەیدا ڕابُرێ–کە لە دونیادا دەیناسی– جا سەلامی لێبکا، مردووەکە دەیناسێتەوەو وەڵامی سەلامەکەی دەداتەوە.** (فيض القدير ب(٥) ل(٦٢٢) و(السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٢٤٧).

**بیستو پێنجەم: پێغەمبەرﷺ بە یەکسانی تاڵانەکەی بە سەر (صَحابَة)کانی (بَدْر)دا بەش کرد.** ئەم بەشکردنەی بە یەکسانی تەنها لە غەزای (بَدْر)دا بوو، کە خوایگەورە دەرهەقی دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ﴾الأنفال:١، **ئەی پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)کان لە بارەی تاڵانەکانی (بَدْر) پرسیارت لێدەکەن؟ لە وەڵامدا بڵێ: بڕیاری ئەو تاڵانەی (بَدْر) بۆ خواو پێغەمبەرەﷺ.**

ئینجا ئەم ئایەتە (نَسْخ) کراوە بە ئایەتی ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ الأنفال:٤١، بزانن: **هەر شتێکتان لە کافرەکان بە تاڵان گرت، ئەوە پێنجیێکی ئەو تاڵانە بۆ خواو پێغەمبەرەﷺ–ئەم پێنجیێکە بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف دەکرێ– هەروەها بۆ خزمەکانی پێغەمبەرەوﷺ بۆ یەتیمانەو بۆ هەژارانەو بۆ ڕێبوارانە. واتە: چوار پێنجیێکەکەیتریش گشتی بۆ ئەو موسوڵمانانەیە: کە ئامادەی جەنگەکە بوینە.** (تفسير القرطبي) الأنفال (٤١)، هەروەها ئەم باسە بە درێژی لە بەرگی چوارەمی (ڕووناکی رب العالمين)دا بخوێنەوە.

**بیستو شەشەم: هەر دوژمنێك ستەمی زۆر بێ بەرامبەر بە ئیسلام، پێویستە لەناو ببردرێ، پێغەمبەرﷺ لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا فەرمانی دا: دوو دیل کوژران: کە (النَّضْر)و (عُقْبَة) بون، لە هەمووکافرەکان کافرتر بون.**

(**عُقْبَة**) موسوڵمان بوبوو، ئینجا بۆوە کافر و تفی لە ڕوخساری پێغەمبەرﷺ کردو لە سوجدەدا پێی لە سەر ملی پێغەمبەرﷺ دانا.

(**النَّضْر**) گاڵتەی بە قورئانی پیرۆز دەکردو دەیگوت: چیرۆکەکانی من لە قورئانەکەی (مُحَمَّد)ﷺ جوانترن. هەم زۆر بە بێویژدانیش لە (مَكَّة)دا (صَحابَة)ی ئازار دەدان.

کەوابوو: هەر دوژمنێك ستەمی زۆر بێ بەرامبەر بە ئیسلام، ئەوە شیاوی لێبوردن نیەو پێویستە لەناو ببردرێ، تاکو ستەمکارانیتر تەمبێ ببن، بەڵام دەبێ سەرکردەی موسوڵمانان ئەم کارە ئەنجام بدا، چونکە گەورەی موسوڵمانان لەبارەی دیلەکان سەرپشکە: یان دەیانکوژێ، یان بە خۆڕایی ئازادیان دەکا، یان بە پارە ئازادیان دەکا، یان بە دیلەکانی موسوڵمانان دەیانگۆڕێتەوە، یان دەیانکاتە کۆیلە.

جا ئەم بڕیارە لەبارەی کافرەکانی بنەڕەتییە، چونکە ئەو موسوڵمانانەی کافر بوینە، ئەگەر نەبنەوە موسوڵمان، واجبە بکوژرێن. (تحفـةالمحتاج بحاشيةالـشرواني) ب(٩) ل(٢٤٧) و(السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٢٥٥).

**بیست و حەفتەم: بەزەیی و وەفاداری پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەگەڵ دیلەکان باش بن و ئازاریان مەدەن.** هەروەها فەرمووی: ﴿لَوْكَانَ الْمُطْعِمُ بنُ عَدِيٍّ حَيّاً ثُمَّ كَلَّمَنِي فِي هَؤُلاءِ النَّتْنَى لَتَرَكْتُهُمْ لَـهُ﴾ رواه البخاري، **ئەگەر (الْمُطْعِم)ی کوڕی (عَدِيٍّ) زیندوو بوایە و لەبارەی ئەو دیلە بۆگەنانە قسەی لەگەڵ کردبام، ئەوە بێ بەرامبەر لە بەر خاتری وی وازم لێدەهێنان.** ئەمەش وەفاداری و منەتباریی پێغەمبەرﷺ بوو بەرامبەر (الْمُطْعِم)، چونکە کە لە (طائف) گەڕاوە، لە ژێر پاراستنی ئەودا هاتەوە (مَكّة)، هەروەك لە سەفەری (طائف)دا ڕوونمان کردەوە.

**بیست و هەشتەم: هەواڵی شکانی کافرەکان گەیشتە (مَكّة)و (أَبُولَهَب)ش مرد.**

حەزرەتی(أَبُورافع)ﷺ فەرموویەتی: من خزمەتکاری (الْعَبّاس)ی مامی پێغەمبەرﷺ بوم، من و (العَبّاس)و (أُمُّ الْفَضْل)–کە ژنی (الْعَبّاس) بوو– موسوڵمان بوین، بەڵام لە ترسی کافرەکانی (قُرَيْش) ئاشکرامان نەدەکرد، جا ڕۆژێك من و (أُمُّ الْفَضْل) لە لای (زَمْزَم) دانیشتبوین، (أَبُولَهَب)ش هات لە لامان دانیشت، لە ناکاودا (أَبُوسُفْيان بن الحارث) –کە لە هەڵاتووەکانی غەزای (بَدْر) بوو– گەیشتەوە (مَكّة)و هاتە لامان و هەواڵی جەنگەکەی (بَدْر)ی گێڕاوە و گوتی: هەر ئەوەندە بوو: ئێمە گەیشتینە (صَحابَة)کان، ملی خۆمان بۆ شۆڕ کردن، چۆنیان حەز کردبا دەیانکوشتین و دیلیان دەکردین، لۆمەی خەڵکیش ناکەم، چونکە گەیشتینە هەندێك پیاوی سپی لە سەر ئەسپی بازوو سوار بوبون، وَاللهِ هیچ شتێك توانای ئەو سوار ئەسپانەیان نەبوو.

حەزرەتی(أَبُورافع)ﷺ دەڵێ: منیش گوتم: وَاللهِ ئەوانە (مَلائِكَة) بون. ئیتر (أَبُولَهَب) لە ڕقان لەپەدەستێکی لە دەموچاوی من دا، منیش بۆی هەڵسام، بەڵام ئەو منی گرت و خستمیە سەر زەوی و لێیدام، جا (أُمُّ الْفَضْل)ش دارێکی لە سەری (أَبُولَهَب) دا بریینداری کردو پێی گوت: چونکە گەورەکەی خۆی–(العَبّاس)– لێرە نیە بە بێهێزی تێدەگەی؟

جا (أَبُولَهَب) بە سەرشۆڕی هەڵساو ڕۆیشت، ئینجا لە دوای حەفت ڕۆژان ئاگرەکەی (الْعَدَسَة)ی تووش بوو و کوشتی، جا لە بەر ئەوەی ئەو ئاگرەکەیە خەڵك لە یەکتری دەگرتەوە، کوڕەکانی (أَبُولَهَب) تا سێ ڕۆژان نەوێران نزیکی لاشەکەی بکەون، ئینجا کە بۆگەن بوو، لە شەرمی خەڵك لە ماڵەوە هێنایانە دەرەوە و قۆرتێکیان بۆ هەڵکەندو بە دارێك پاڵیان دا و خستیانە ناو قۆرتەکەو لە دوورەوەڕا بە بەردان قۆرتەکەیان لە سەر پڕکردەوەو دایانپۆشی. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٣١٣) و(السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٢٥٨). *هەزاران هەزار لەعنەت لە گیان و لاشە بۆگەنەکەی، یا ربّ خودایە دوژمنانی ئیسلام هەموویان بەو دەردە بچن، آمین.*

**بیستو نۆیەم: پێغەمبەرﷺ لەبارەی دیلەکان ڕاوێژی بە (صَحابَة)کان کردﷺ لە ئەنجامدا بڕیاری دا: دیلەکان بە خۆکڕینەوە ئازاد بکرێن.**

*لەم ڕاوێژەدا ئیمام (أبوبَكْر)ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەریخواﷺ لە بەرامبەر ئازادکردن شتێکیان لێوەربگرەو ئازادیان بکە، چونکە ئەوانە خزمو کەسی خۆمانن بەڵکی خوایگەورە هیدایەتیان بداو ببنە موسوڵمان، بە پارەی خۆکڕینەوەکەش کەرستەی جەنگ بۆ موسوڵمانان دەکڕین.

*ئیمام(عمر)شﷺ فەرمووی: وَاللهِ من ئەو ڕایەی (أبُوبَكْر)م نیە، ڕای من ئەمەیە: فلانە خزمەیخۆم بدە دەستم من دەیکوژم، با (عَلِي)ش (عَقِيل)ی برایخۆی بکوژێ، با (حَمْزَة)ش (الْعَبّاس)ی برایخۆی بکوژێ، تا بزانرێ ئێمە هیچ نەرمیو خۆشەویستیمان بەرامبەر کافرەکان لە دڵدا نیە.

بەڵام پێغەمبەرﷺ ڕایەکەی ئیمام (أبُوبَكْر)یﷺ هەڵبژاردو بڕیاریدا: بە خۆکڕینەوە دیلەکان ئازاد بکرێن. جا ئیمام (عمر)ﷺ فەرمووی: سبەینێ چومە خزمەت پێغەمبەرﷺ، دیتم ئەو و ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ دانیشتونو دەگریێن!، گوتم: یا رَسُولَ الله پێم بڵێ بۆچی دەگریێن؟ تا ئەگەر گریانم دەست بکەوێ بگریێم، ئەگەر نا: خۆم دەگریێنم. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿**بە هۆی ئەو ڕایەی هاوڕێکانت بە منیان گوت: دیلەکان بە خۆکڕینەوە ئازاد بکە، سزادانی هاوڕێکانت نیشانی من درا نزیکتر لەم درەختە**﴾.

واتە: خوایگەورە بۆیێ گلەیی لێکردنو بە سزادان ترساندنی، چونکە کارە باشترەکەیان نەکرد-کە کوشتنی دیلەکان بوو- بەڵام لە بەر ئەوەش کە ئازادکردنی دیلەکانیش بە پارە حەڵاڵ بوو، خوایگەورە لێی بووردنو سزای نەدان، جا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوەو گلەیی لێکردنو فەرمووی: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللهُ يُرِيدُ ٱلآخِرَةَ وَاللهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾الأنفال: ٦٧، **بۆ هیچ پێغەمبەرێك ناگونجێ کڕینەوە لە دیلەکان وەربگرێ تا زۆر لە کافرەکان دەکوژێ، ئێوە-ئەی موسوڵمانەکان- مەبەستتان بە خۆکڕینەوەی دیلەکان کەلوپەلی دونیا بوو، بەڵام خوایگەورە پاداشتی دواڕۆژی بۆ ئێوە دەوێ، خوایگەورە بەهێزو کارلەجێیە.**

ئینجا خوایگەورە لەبارەی لێبوردنیش دەفەرموێ: ﴿لَوْلا كِتَابٌ مِنَ اللهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ الأنفال:٦٨، **ئەگەر لە بەر بڕیارێکیڕابردووی خودا نەبوایە، ئێوە بە هۆی وەرگرتنی کڕینەوە لە دیلەکان، سزایەکی زۆر گەورەتان توش دەبوو.**

واتە: بەڵام خوایگەورە پێشتر بڕیاری دابوو: لە (صَحابَة)کانی (بَدْر) خۆش ببێو سزایان نەدا، چونکە بەشدارییان لە غەزای (بَدْر)، چاکەیەکی زۆر گەورەیە، هەم بڕیاری دابوو: دەستکەوتووی کافرەکانیشیان بۆ حەڵاڵ بکا، خوایگەورەش لە بڕیاریخۆی پەشیمان

نابێتەوە، جا کە ئەم ئایەتە هاتـە خـوارەوە، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ﴿ئەگـەر عـەزابی خودا هاتبا خوارەوە جگە لە (عُمر) کەسیتر لەو عەزابە ڕزگاری نەدەبوو﴾.

واتــە: چــونکە کــارە باشــترەکەیان واز لێهێنــاو بــە کــارە باشــەکە ڕازی بــون، نابــێ پیاوچاکەکانی نزیك لەخوداش ئەوها بکەن، هەروەك پیاوچاکەکان فەرموویانـە: (حَسَنَاتُ الْأَبْــرارِ سَــيِّئَاتُ الْمُقَــرَّبِينَ) چــاکەکانی پیاوچــاکان، خراپــەکانی نزیککراوەکانیخودایە. (تفسير فخرالدين الرازي) و(تفسيرالقرطبي) الأنفال: (٦٧و٦٨).

**سێیەم: نەهێشتنی نەخوێندەواری**، ئەگەر دیلەکە هیچی نەبوایـە خـۆی پـێبکڕێتـەوە، پێغەمبـەرﷺ بڕیـاری دا: دیلەکـە دە منداڵیموسـوڵمانان فێـرە خوێنـدنو نووسـین بکا.

ئەوە لە کاتێکدا بوو: کە (صَحابَة)کان لەو پـەڕی پێویـستیدا بـون بـۆ مـاڵی دونیـا، بـەڵام گەورەییو بەرزی لە سەرەوەی هەموو شتێکی دونیایـەو ئیـسلام ئـایینی خوێندەوارییـەو نایەوێ نەخوێندەواری خۆی بە سـەر کۆمەڵگـەدا زاڵ بکـا، جـا پێغەمبـەرﷺ بـەم بڕیـارە بەردی بناغەی نەهێشتنی نەخوێندەواریی داناو بڕیاری خوایگەورەی بەجێ هێنا: کە لـە سەرەتای (وَحْي)دا فەرمانی پێکردبوو: ﴿اِقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِى خَلَــقَ﴾العلق:١، بگـەڕێوە بـۆ دووەم گوڵبژێرەکەی سەرەتای (وَحْي)، هەم بڕوانە (سيرةالصلابي) ب(٢) ل(٢٢).

**سێو یەکەم: یەکێك لە دیلەکان (أَبُوالْعاص) زاوای پێغەمبەرﷺ بوو.**

(أَبُوالْعاص) مێـردی حـەزرەتی(زَيْنَـب)ی کیـژی پێغەمبـەرﷺ بـوو، هـەم کـوڕی (هالَـة)ی خوشکی حەزرەتی(خَدِيجَة) بوو، بە داخـوازی حـەزرەتی(خَدِيجَـة)-رضي الله عنها-پێغەمبـەرﷺ حەزرەتی(زَيْنَب)ی لە (أبوالعاص) مارە کرد، ئینجا کافرەکانی (قُرَيْش) زۆر داوایان لێکرد: کیژەکەی پێغەمبەرﷺ تەڵاق بداو بە دڵـی خـۆی کـچێکی (قُـرَيْش) هەڵبـژێرێو لێی مـارە بکەن، بەڵام (أبُوالعاص) گوتی: من ژنەکەی خۆم بە هێچ ژنێکی (قُرَيْش) ناگۆڕمەوە، بۆیێ پێغەمبــەرﷺ مــەدحی زاوایــەتیی دەکــرد، واتــە: چــونکە (أَبُوالعــاص) بــە هــۆی زاواو خەزورایەتی شەرمی لە پێغەمبەرﷺ دەکرد، بۆیێ هیچ کاتێك یەك بێئەدەبیشی بەرامبەر بە ئیسلامو موسوڵمانان نەکردبوو.

جا بۆ کڕینەوەی (أَبُوالعاص) لە دیلایەتی، حەزرەتی(زَيْنَب)-رضي الله عنها-گەردانەیەکی زێڕی نارد *-ئەم گەردانەیە کاتی خۆی خشڵی حەزرەتی(خَدِيجَة)یدایکی بوو-رضي الله عنهما-، بە بۆنـەی بـە بوك بردنیی بۆ (أبوالعاص)، گەردانەکەی دابۆێ-* جا کە پێغەمبەرﷺ چاوی بە گەردانەکـە کەوت، ناسییەوەو زۆر بەزەیی بە حەزرەتی(زَيْنَب)دا هاتەوە، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر بڕیار بدەن: دیلەکەی بە خۆڕایی ئازاد بکـەنو گەردانەکەشـی بـۆ بگەڕێننـەوە؟ جـا (صَحابَة)کان ڕازی بونو ئازادیان کردو گەردانەکەشیان بۆ گەڕاندەوە، بەڵام پێغەمبەرﷺ بە مەرجی دانا (أَبُوالعاص) ڕێگا بداتە حەزرەتی(زَيْنَب) تاکو کۆچ بکا بۆ (مَدِينَة).

کەواتە: لێرەدا مەبەستی گەورەتر ڕزگارکردنی موسوڵمانێك بوو لە ژێر دەستی کافرەکان، جا (أبُوالعاص) گەڕاوە (مَكّة)و حەزرەتی(زَیْنَب)شی ناردە (مَدینَة) بۆ لای باوکیﷺ، جا لە دوای شەش ساڵان (أبُوالعاص) موسوڵمان بوو و پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(زَیْنَب)ی لە سەر مارەبڕینەکەیەکەم لێ مارە کردەوە، ئینجا لە سەرەتای ساڵی هەشتەمیکۆچیدا حەزرەتی (زَیْنَب)-رضي الله عنها- وەفاتی کردو پێغەمبەرﷺ بەشتەماڵەکەیخۆی خستە ژێر کفنەکەی.

هۆی وەفاتکردنی حەزرەتی(زَیْنَب)-رضي الله عنها-ئەوە بوو: کە لە (مَكّة) وەڕێکەوت بۆ لای باوکیﷺ، چەند پیاوێکی (قُرَیْش) بە دوایدا هاتن، یەکێکیان ناوی (هَبّار) بوو، ڕمێکی لە وشترەکەی دا، وشترەکە ڕەویەوەو حەزرەتی(زَیْنَب)ی فڕیدا خوارەوەو کۆرپەکەی ناو زگی لە بار چوو، بە هۆی ئەو لەبارچوونە هەر خوێنی لێدەهات تا بەو ئێش و نەخۆشییە وەفاتی کرد. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٣١٦و٣٣٣و٣٣٥) و(عظماء حول الرسولﷺ) ب(١) ل(٢٠٧-٢١٠).

**سیو دووەم: (الْعَبّاس)ی مامی پێغەمبەرﷺ یەکێك بوو لە دیلەکانی (بَدْر).**

(العَبّاس) بە دەستی حەزرەتی(أبُوالْیُسْر)ﷺ دەستگیر کرا-کە (صَحابَة)یەکی کورتە باڵای (أنصاري) بوو، (العَبّاس)ش پیاوێکی باڵا بەرزی کەڵەگەت بوو، جا گوتیان: ئەی (العَبّاس) خۆ (أبُوالْیُسر) پڕ بە دەستی تۆ بوو، چۆن تۆی پێ دەستگیر کرا؟! (العَبّاس) گوتی: وَالله ئەو منی دەستگیر نەکرد، بەڵکو پیاوێکی جوانی سوار ئەسپێکی بازوو منی دەستگیر کرد.

جا پێغەمبەرﷺ بە (أبُوالْیُسْر)ی فەرموو: **خوایگەورە (مَلائِكَة)یێکی ڕێزداری کردە یارمەتیدەری تۆ.**

جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: (الْعَبّاس) خۆیو هەردوو برازاکانی-(عَقیل)و (النَّوْفَل)- بکڕێتەوە، جا (العَبّاس) گوتی: من پێشتر موسوڵمان بویمە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **تۆ لە ئاشکراییدا لە دژی موسوڵمانان بوی لە پەنهانیشدا خوایگەورە زاناترە بە ئیسلامبوونت و پاداشتت دەداتەوە.**-*(مەبەست ئەوەیە: (العَبّاس) لە ئاشکراییدا وەکو کافرێکی جەنگی ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ، هەروەك پێنج موسوڵمانە کوژراوەکانیڕابردووش ئەوها ڕەفتاریان لەگەڵ کرا)*- جا (العَبّاس) گوتی: کەوابوو: ئەو ماڵەی لە جەنگی (بَدْر) لێم گیراوە، ئەوم بۆ بکە کرینەوەیخۆم. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **ئەو ماڵەت لە دژی ئێمە بە کار هێناوەو بۆ تۆی واز لێناهێنین.** جا (العَبّاس) گوتی: هیچ ماڵم نییە خۆم پێ بکڕمەوە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **ئەدی ئەو زێڕەی لە لای هاوسەرەکەت-(أُمُّ الْفَضْل)- بەجێت هێشت و گوتت: ئەگەر شتێکم بە سەر هات، ئەمە بۆ کوڕەکانم بێ؟** جا (العَبّاس) گوتی: وَالله دەزانم تۆ پێغەمبەریخوای، چونکە جگە لە خۆم و هاوسەرەکەم کەسیتر بەو نهێنییەی نەزانیوە.

ئیتر پێغەمبەرﷺ سەد (أُوقِیَّة)=حەفتسەد میسقاڵ زێڕی لە (العَبّاس) وەرگرت: لەجیاتی

کڕینەوەی خۆی‌و هەردوو برازایەکەشی –(نَوْفَل)و (عَقِیل)–، ئینجا چەند (صَحابَة)یەکی (أنصاري) هاتنە لای پێغەمبەرﷺ گوتیان: ئیزنمان بدە پارەی کڕینەوە لە (العَبّاس)ی خوارزمان نەستێنین؟. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لا وَاللهِ لا تَذَرُونَ مِنْهُ دِرْهَماً﴾ رواه البخاري، وَاللهِ نابی یەك دیرهەمیشی بۆ بەجێ بێڵن.

*ئا بەم جۆرە پێغەمبەرﷺ توندیی لە دژی مامیخۆی بە کار هێناو لە هەموو دیلەکانیش زیاتر پارەی کڕینەوەی لێوەرگرت‌و ڕێگاشی نەدا: (أنصاري) خاتری بگرن، تاکو تەمبێ ببێ، هەم نەوەك کەسێك بڵێ: پێغەمبەرﷺ بە هۆی خزمایەتی جیاوازیی لە نێوان دیلەکاندا دەکا، جا پێویستە سەرکردەکانیش دەرس لەم ڕووداوە وەربگرن تاکو سەرکەوتوو بن.*

جا (العَبّاس) بە پێغەمبەریﷺ گوت: هەژارت کردم، وات لێکردم تا ماوم هەر دەرۆزە بکەم، ئینجا خوایگەورە دەرهەق (الْعَبّاس) ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِمَنْ فِي أَيْدِيكُمْ مِنَ ٱلأَسْرَى إِنْ يَعْلَمِ اللهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْراً يُؤْتِكُمْ خَيْراً مِمَّا أُخِذَ مِنْكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾الأنفال: ٧٠، ئەی پێغەمبەرﷺ ئەو دیلانەی لە بەر دەستی ئێوەدانە پێیان بڵێ: ئەگەر خوا بزانێ: ئێوە چاکەتان لە دڵدایەو بە ڕاستی دەبنە موسوڵمان، ئەوە خوایگەورە ماڵێکی چاکتر لەو ماڵەتان دەداتێ کە لە (بَدْر) لێتان وەرگیراوە، هەم لە تاوانەکانیشتان خۆش دەبێ، خوایگەورە لێبوردەو میهرەبانە.

ئیمام (العَبّاس)ﷺ فەرموویەتی: خوایگەورە سەد قات زیاتری داومێ‌و چاوەڕوانی لێخۆشبوون‌و ڕەحمەتیشی لێدەکەم. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٣٠٤) و (السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٢٧٠و٢٧١).

**سیو سێیەم: پاداشتی (شَهید) بەهەشتە**، لە غەزای (بَدْر) پێغەمبەرﷺ فەرمانی هێرشکردنی دا و فەرمووی: ﴿قُومُوا إِلَى جَنَّةٍ عَرْضُها السَّمواتُ وَالأَرْضُ﴾ رواه مسلم، **هەڵسن بڕۆن بەرەو بەهەشتێك کە بەرینیی بە قەد ئاسمانەکان‌و زەمینە.**

هەم بە دایکی شەهیدەکەی فەرموو: ﴿إِنَّ ابْنَكِ أَصابَ الْفِردَوْسَ ٱلأَعْلَى﴾ رواه البخاري، **کوڕە شەهیدبووەکەت بەهەشتی هەرە سەرەوەی وەدەست کەوت.**

بێگومان پاداشتی (شَهید) بەهەشتە، واتە: هەر لە کاتی شەهیدبوونیەوە دەچێتە بەهەشت‌و لە بەهەشتدا خۆشی‌و شادی دەبینێ، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾آل عمران:١٦٩، **وا تێمەگە: ئەوانەی لە ڕێگای خوادا کوژراون، مردوونە، بەڵکو ئەوان زیندوونەو لە لای خوایخۆیان خواردنیان دەدرێتێ.**

جگە لەو پاداشتەش (شَهید) چەند ڕێزێکی تایبەتیشی هەنە، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لِلشَّهِيدِ عِنْدَ اللهِ ستُّ خِصالٍ: يُغْفَرُ لَهُ فِي أَوَّلِ دَفْعَةٍ، وَيَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَيُجارُ مِنْ عَذابِ الْقَبْرِ، وَيَأْمَنُ مِنَ الْفَزَعِ ٱلأَكْبَرِ، وَيُوضَعُ عَلَيْهِ تاجُ الْوقارِ اَلْياقُوتَةُ مِنْهُ خَيْرٌ مِنَ

الدُّنْيا وَما فِيها، وَيُزَوَّجُ اِثْنَيْنِ وَسَبْعِينَ مِنَ الْحُورِ، وَيُشَفَّعُ فِي سَبْعِينَ مِنْ أَقارِبِهِ﴾ حديث صحيح رواه الترمذي وغيره، **شەهیدی غەزا شەش تایبەتمەندیی هەنە: لە سەرتای دڵۆپە خوێنەکەییەکەمدا خوا لێی خۆش دەبێ، یەکسەر شوێنیخۆی لە بەهەشتدا دەبینێ، لە ئازاردانی ناو گۆڕ دەپارێزرێ، لە ترسە گەورەکەی مەحشەر بێ ترس دەبێ، تاجی ڕێزداریی لە سەر دەندرێ: کە هەر یاقوتێکی تاجەکە چاکترە لە دونیاو لەوەی لە دونیادایە، حەفتاو دوو حۆریی لێ مارە دەکرێن، لە ڕۆژی قیامەتیش شەفاعەت بۆ حەفتا خزمی خۆی دەکا.**

**جا بزانە: ئەو لێخۆشبوونەی شەهید لەبارەی مافەکانی خوایگەورەیە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿يُغْفَرُ لِلشَّهِيدِ كُلُّ ذَنْبٍ إِلاّ الدَّيْنَ﴾ رواه مسلم، لە گشت گوناهەکانی شەهید دەبوردرێ تەنها قەرز نەبێ.**

**ئیمامی(النواوي) فەرموویەتی: لەم حەدیسەدا ئاگادارکردنەوەیەك هەیە: لە سەر هەموو مافەکانی ئادەمیزادان: کە (جِهاد)و شەهیدبوونو چاکەکانیتریش مافی ئادەمیزادان لە سەر مرۆڤ لانابەن، بەڵکو تەنها مافەکانی خوایگەورە لا ئەبەن.** (تفسير القرطبي) آل عمران: (١٦٩) و(شرح صحيح مسلم) ب(٨) ل(٨٣).

**﴿پاشکۆ: لەبارەی چەند (مُعجِزَة)یەکی غەزای (بَدْر)و هەوڵدانی کوشتنی پێغەمبەرﷺ﴾**

**یەکەم: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خوایگەورە لە کاروانەکەو لە لەشکرەکە وەعدەی یەکێکیانی پێداوم. جا کە پێغەمبەرﷺ کاری کوژراوەکانی (بَدْر)ی تەواو کرد، پێیان گوت: کاروانەکەش بگرە، هیچ بەرگریەکی نیە. (العَبّاس)ش بە پەلبەستراوی بانگی کردو گوتی: بۆت ناگونجێ! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بۆچی؟ گوتی: چونکە خوا تەنها وەعدەی یەکێکیانی داوییێو وەعدەکەشی گەیاندە جێ.**

**دووەم: دیاریکردنی شوێنی کوژراوەکانی (بَدْر).**

**سێیەم: پرژاندنی چەنگە گڵێك بۆ دەمو چاوی کافرەکان.**

**چوارەم: ئاشکراکردنی ئەو زێڕەی (العَبّاس) لە لای ژنەکەی بەجێی هێشتبوو.**

**پێنجەم: لەگەرمەی جەنگی (بَدْر)دا شمشێرەکەی (عُكّاشَة)ﷺ شکا، پێغەمبەرﷺ پارچە دارێکی داییێو فەرمووی: بەم دارە جەنگ بکە. جا دارەکە لە دەستی (عُكّاشَة)داﷺ بووە شمشێرێکی درێژی سپی، هەر جەنگی پێکرد تا کافرەکان شکان، جا ئەم شمشێرە–کە پێی دەگوترا: (اَلْعَوْن)– هەر لە لای (عُكّاشَة)ﷺ بوو، تا لە جەنگی (الرِّدَّة) بە دەستی (طُلَيْحَةُ الْأَسَدي) شەهید کرا، ئەم (عُكّاشَة)یە یەکێکە لەو حەفتا هەزار کەسانەی بێ دادگای (مَحْشَر) دەچنە بەهەشت.**

**شەشەم: (قَتادَة) لە غەزای (بَدْر) تیرێکی وەچاوی کەوتو گلێنەی چاوەکەی هاتە سەر**

کۆڵمەی، جا پێغەمبەرﷺ بە بەرە دەستی موبارەکی گلێنەکەی لە ناو چاوی داناوەو چاك بۆوەو نەدەزاندرا کام چاوی تیری وێکەوتوە. جا بزانە: لە غەزای (أُحُد)ش جارێکیتر چاوی (قَتادَة) تیرێکی وێکەوتو پێغەمبەرﷺ بۆی داناوەو چاك بۆوە.

**حەفتەم: پوچەڵبوونەوەی هەوڵدانی کوشتنی پێغەمبەرﷺ:** (عُمَیْر بن وَهَب) یەکێك بوو لە پیسترینو کافرترین کافرەکانی (قُرَیْش)، جا کوڕەکەی ئەویش-(وَهَب)-لە (بَدْر) دیل کرابوو، جا ڕۆژێك (صَفْوان بن أُمَیَّة) گوتی: وَاللهِ لە دوای ئەو کوژراوانەی (بَدْر) هیچ خۆشیەك لە ژیاندا نیە. (عُمَیْر)ش گوتی: ڕاست دەکەی، وَاللهِ ئەگەر لە بەر قەرزداریو منداڵەکانم نەبێ، ئێستا دەچمەی لای (مُحَمَّد)و دەیکوژم. جا (صَفْوان) ئەمەی بە هەل زانیو گوتی: من قەرزەکەت بۆ دەدەمەوەو منداڵەکانیشت لەگەڵ منداڵەکانیخۆم بەخێو دەکەم. جا ( عُمَیْر) شمشێرەکەی تیژ کردو ژەهریشی لێداو کەوتە ڕێ تا گەیشتە (مَدِینَة)ی پیرۆز، جا لە کاتێکدا ئیمام (عُمر)و کۆمەڵە (صَحابَة)یەكﷺ دانیشتبون، لە ناکاو دیتیان (عُمَیْر) لە بەر دەرگەی مزگەوت وشترەکەی ئیخ کردو شمشێریشی لە دەستە، جا یەکسەر ئیمام (عُمر)ﷺ چووە لای پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە دوژمنی خوا (عُمَیْر) بە شمشێرەوە هاتووە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بیهێنە لام. جا ئیمام (عُمر)و (صَحابَة)کانﷺ بردیانە لای پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی (عُمَیْر) بۆچی هاتوی؟ گوتی: بۆ کوڕەکەم کە دیلە لە لای ئێوە، فەرمووی: ئەدی ئەم شمشێرە چیە بە دەستتەوە؟ گوتی: خوا ئەم شمشێرە ناشیرن بکا، هیچ سودێکی بۆ ئێمە هەبوو؟ فەرمووی: ڕاستیم بۆ بڵێ، بۆچی هاتوی؟ گوتی: هەر بۆ ئەوە هاتوم.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵکو بە (صَفْوان)ت گوت: ئەگەر لە بەر قەرزو منداڵەکانم نەبێ، دەچم (مُحَمَّد) دەکوژم. ئەویش قەرزەکەو منداڵەکانی تۆی خستە ملی خۆی تاکو من بکوژی، بەڵام خوایگەورە ئەو ڕێگەیەت لێدەگرێ. جا (عُمَیْر) گوتی: (أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ الله) من شاهیدی دەدەم تۆ پێغەمبەریخوای، ئەمە پیلانێك بوو جگە لە منو (صَفْوان) کەسیتر ئامادەی نەبو، وَاللهِ بێگومان دەزانم خوا ئەم هەواڵەی بۆ ناردوی، اَلْحَمْدُ لِلّه سوپاس بۆ ئەو خوایەی منی کردە موسوڵمان، جا شادەی هێناو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: قورئانی پێ بڵێنو لە ئیسلام شارەزای بکەن، دیلەکەی= کوڕەکەی بۆ بەرەڵا بدەن.

جا قورئانیان پێگوتو کوڕەکەشی بەرەڵا درا، ئینجا (عُمَیْر) بە ئیزنی پێغەمبەرﷺ گەڕاوە بۆ (مَکَّة). جا (صَفْوان)ش لەو ماوەیەدا هەر دەیگوت: موژدەتان لێبێ بەم زوانە هەواڵێکی خۆشتان بۆ دێ کوژراوەکانی (بَدْر)تان لە بیر دەباتەوە. بەڵام کە زانی: (عُمَیْر) موسوڵمان بووە، هیچیتر قسەی لەگەڵ نەکرد. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢٩٥و٣٠٠و٣١٨).

*** *** ***

## ﴿ چەند ڕوداوێکی دوای غەزای (بَدْر)...تا غەزای (أُحُد)﴾

## ﴿ مارەکردنی حەزرەتی (فاطِمَة)-رضی الله عنها- لە ئیمام (علي)ﷺ ﴾

لە دوای غەزای (بَدر) لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی، پێغەمبەرﷺ حەزرەتی (فاطِمَة)ی کیژیخۆی لە ئیمام (علی) مارە کرد و لە هەمان ساڵ لە مانگی (ذیالحِجَّة)دا بە بوك بۆی گواستراوە، تەمەنی ئیمام (علی)ﷺ بیستو یەك ساڵ بوو، تەمەنی حەزرەتی (فاطِمَة)ش-رضی الله عنها- پانزە ساڵ بوو، ئەم (فاطِمَة)یە دایکی (الحَسَن) و(الحُسَین)ە، واتە لە کیژەکانی پێغەمبەرﷺ تەنها حەزرەتی(فاطِمَة)-رضی الله عنها- ئەو دوو کوڕانەی لە پاش بەجێمانو نەتەوەی ئەم دوو بەڕێزانەش پێیان دەگوترێ: (سَیِّد)، هەروەها کوڕێکیتریشی هەبوو: ناوی (مُحسِن) بوو، لە تەمەنی منداڵیدا مرد، هەروەها: بە شەش مانگ لە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ، حەزرەتی(فاطِمَة)ش-رضی الله عنها- وەفاتی کرد. هەروەها: حەزرەتی (فاطِمَة)-رضی الله عنها-دوو کیژیشی هەبون: ناویان (أُمُّ کُلثوم)و (زَینَب) بوو، جا ئیمام (عمر)ﷺ (أُمُّ کُلثوم)ی لە ئیمام (علی)ﷺ داخواز کردو ئەویش لێی مارەکرد، جا ئیمام (عمر)ﷺ لە (أُمُّ کُلثوم)ی کیژی ئیمام (علی)-رضی الله عنهما- کوڕێكو کیژێکی بون، ناویان (زَید)و (رُقَیَّة) بوو، کەواتە: ئیمام (عُمر)ﷺ زاوای ئیمام(عَلي)یەﷺ.

*بەڵێ: ئەوانە بەم جۆرە خزمو دۆستی یەکتری بون، جا (شیعَة)کانیش جگە لە درۆ و بوختان هیچیتریان لە دەستدا نیەو دەڵێن:* (هَذا فَرجٌ غُصِبْناهُ) ئەوە-(أُمُّ کَلْثُوم)- عەورەتێکە لێمان زەوت کراوە!. *دەك ڕووی درۆزن ڕەش بێ، چۆن دەگونجێ ئیمام (علي ﷺ) ئەوها ترسنۆكو بێغیرەت بوبێو کیژی لێزەوت کرابێو بێ دەنگ بوبێ؟!، سبحان الله هذا بهتان عظیم.* بۆ باسە مێژووەکە بڕوانە (البدایة والنهایة) ب(٢) ل(٣٥٠)، ب(٤) ل(٢٦٠) و(السیرةالحلبیة) ب(٢) ل(٢٨١).

## ﴿ غەزای (بَنِی سُلَیْم) لە (قَرْقَرَةُ الْکُدْر)﴾

لە دوای غەزای (بَدر) چینێکی (بَنِی سُلَیم) خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگی موسوڵمانان، بەڵام پێغەمبەرﷺ مۆڵەتی نەدانو یەکسەر لە دوای گەڕانەوەی بۆ (مَدینَة) بە حەفت ڕۆژان، واتە: لە مانگی (شَوّال)ی ساڵی دووەمی کۆچی، بۆ بەرەنگاربوونەوەیان ڕۆیشت، ئاڵای جەنگ ئیمام (علی)ﷺ هەڵیگرتبوو، حەزرەتی(عبدالله ابن أُمِّ مکتوم)شﷺ جێگری پێغەمبەرﷺ بوو لە (مَدینَة)، جا پێغەمبەرﷺ ڕۆیشت تا گەیشتە (ماءُالکُدر) لەو شوێنەی پێی دەگوترێ: (قَرْقَرَةُالکُدر)، ژمارەی (صَحابَة)کان دوو سەد چەکدار بوو، بەڵام (بَنوسُلَیم) هەڵاتنو لە چیاکانی ئەو ناوەدا پەرت بون، پێغەمبەریشﷺ لەگەڵ (صَحابَة)کان تا سێ شەوان لەوێ مانەوەو هیچ جەنگێك نەقەوما، بۆیێ بە سەلامەتی گەڕانەوە (مَدینَة).

## ﴿ غەزای جولەکەکانی (بَنِی قَيْنُقاع) لە (مَدِينَة)﴾

ئەم جولەکانە لە هەموو جولەکانی (مَدِينَة) ئازاترو دەوڵەمەندتر بون، ئەوانیش وەکو جولەکەکانیتری (مَدِينَة) پەیمانیان دابووە پێغەمبەرﷺ: کە جەنگی لەگەڵ نەکەنو یارمەتی هیچ دوژمنێکیئیسلام نەدەن، بەڵام کە موسوڵمانەکان لە غەزای (بَدر) سەرکەوتن، جولەکەکانی (بَنوقَينُقاع) پەیمانەکەیان شکاندو ڕقو قینیان بەرامبەر موسوڵمانان ئاشکرا کردو بە ئاشکرایی دوژمنایەتی موسوڵمانانیان دەکرد، بۆیە پێغەمبەرﷺ لە بازاڕێکیخۆیاندا کۆی کردنەوەو ئامۆژگاریی کردنو داوای موسوڵمانبونیشی لێکردنو ئاگاداریشی کردنەوە: شتێکی وا نەکەن وەك کافرەکانی (قُرَيْش) توشیماڵوێرانی بین.

بەڵام جولەکەکان پێغەمبەریانﷺ بێمنەت کردو بە هەڕەشەکردن وەڵامیان داوەو گوتیان: ئەی (مُحَمَّد) بەوە هەڵمەخەڵەتێ کە جەنگت لەگەڵ کەسانێکی نەشارەزا کردو سەرکەوتی، وَاللهِ ئەگەر جەنگ لەگەڵ ئێمە بکەی، ئەو کاتە دەزانی: ئێمە کەسینو جەنگت لەگەڵ کەسانێکی وەکو ئێمە نەکردوە!.

ئیتر جولەکەکان ڕۆژ بە ڕۆژ هەستی ئایینیی موسوڵمانانیان بریندار دەکرد، تا ڕۆژێك ئافرەتێکی موسوڵمان شتێکیخۆی بردە بازاری (بَنیقَينُقاع)و لەوێ فرۆشتی، ئینجا لە لای زێرینگرێکی جولەکە دانیشت، ئەم ئافرەتە پێچەی لە سەر ڕوویخۆی دانابوو، جا جولەکەکان هەوڵیان دا پێچەکەی لاببەو ڕوویخۆی وەدەربێخێ، بەڵام ئافرەتەکە پێچەکەی لانەدا، بۆیێ زێرینگرەکە لە پشتەوەڕا داوێنی جلی ئافرەتەکەی لە پشتی ئافرەتەکە گرێدا، جا کە ئافرەتەکە هەڵساوە عەورەتی بەدەرکەوتو جولەکەکانیش پێی پێکەنین، ئافرەتەکەش هاواری کرد، جا یەکسەر پیاوێکی موسوڵمان پەلاماری زێرینگرە جولەکەی دا و کوشتی، جولەکەکانیش پەلاماری موسوڵمانەکەیان دا و کوشتیان، ئیتر موسوڵمانەکانیش بە هۆی ئەم خیانەتکارییە تورە بونو هاواریان کردە موسوڵمانەکان، بۆیێ پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی شەممە پانزەی مانگی (شَوّال) ساڵی دووەمی کۆچی، هێرشی کردە سەریان.

لەم غەزایەدا لەشکریموسوڵمانان لە (مُهاجِر)و (أنصار) پێك هاتبوو، ئیمام (حَمزَة)شرضي الله عنه ئاڵای جەنگی هەڵگرتبوو، حەزرەتی(أبُولُبابَة)شرضي الله عنه جێنیشی پێغەمبەرﷺ بوو لە (مَدِينَة)، جا کە جولەکەکان زانییان پێغەمبەرﷺ لەشکری هێناوەتە سەر ئەوان، یەکسەر لە ناو قەڵایەکانیخۆیاندا خۆیان حەشار دا، پێغەمبەرﷺ ماوەی پانزە ڕۆژان گەمارۆی دان، ئیتر بەم گەمارۆدانە جولەکەکان سەریان لێشێواو ورەیان دابەزیو لە کۆتاییدا لە سەر بڕیاری پێغەمبەرﷺ دابەزین، پێغەمبەریشﷺ فەرمانی دا:

هەموویان پەلبەست کران، ژمارەی جەنگاوەرەکانیان حەفتسەد چەکدار بوو.

جا حەزرەتی(عُبادَة بن الصّامِت)ﷺ—کە هاوپەیمانی ئەو جولەکانە بوو— هاتەی لای پێغەمبەروﷺ گوتی: من بەریمە لە هاوپەیمانیەتی ئەو جولەکانە، تەنها دۆستایەتیو هاوپەیمانیەتی خواو پێغەمبەرﷺ دەکەم.

بەڵام (عَبدالله ابن سَلُول)ی سەرکردەی (مُنافِق)ەکانی (مَدینة)—کە ئەویش هاوپەیمانی ئەو جولەکانە بوو— یەکسەر خۆی گەیاندە پێغەمبەروﷺ دەستی لە ناو یەخەی پێغەمبەرﷺداناو گوتی: ئەی (مُحمَّد)ﷺ چاکە لەگەڵ دۆستانی من بکە. جا پێغەمبەرﷺ لە ڕقان ڕەنگی ڕوخساری گۆڕاو فەرمووی: بەرمهەڵدە. (عبدالله)ش گوتی: بەرتهەڵنادەم تا چاکە لەگەڵ دۆستەکانم دەکەی. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوا بە تۆم بەخشین، خوا بەرەکەتیان نەداتێ. جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: لە دوای سێ ڕۆژان هەموویان لە (مَدینة) دەرکرانو چونە (أذرِعات) لە وڵاتی (شام)، چەكو ملْكو ماڵەكەشیان بە تاڵان بۆ موسوڵمانان بەجێما.

## ﴿ غەزای (السَّويق)﴾

لە دوای شکستەکەی (بَدر)و گەڕانەوەی هەڵاتووەکان بۆ (مَكّة)ی پیرۆز، (أبُوسُفيان) سوێندی خوارد: غوسلی جەنابەت نەکا تا هێرش دەکاتە سەر (مُحمَّد)ﷺ. بۆیێ دوو سەد سواری لەگەڵ خۆیا هێناو گەیشتە (مَدینة)، شەوێ لە لای جولەکەکانی (بَنِی النَّضِير) دابەزینو (سَلاّم بن مِشْكَمْ) میوانداریی کردنو نهێنییەکانی موسوڵمانانی بۆ ئاشکرا کردن، ئینجا (أبُوسُفیان)و لەشکرەکەی هێرشیان بردە لای (اَلعُرَيْض) لە (مَدینة)، لەوێ هەندێك دارخورمایان سوتاندنو دوو جوتیاری (أنصاري)یان کوشتنو یەکسەر بەرەو (مَكّة) گەڕانەوە، جا کە هەواڵەکە گەیشتە پێغەمبەرﷺ، یەکسەر لەگەڵ دوو سەد (صَحابَة)ی (مُهاجر)و (أنصار) بە دوایاندا چون، جا (أبُوسُفیان)و لەشکرەکەی باری خۆیان بۆ هەڵاتن سوك دەکردو کیسەی (السَّويق)یان فڕێ دەدا—کە جۆرە خواردنێك بوو لە گەنمو شیرو هەنگوین دروست دەکرا— (صَحابَة)ش ئەم خواردنەیان هەڵدەگرتەوە، بەڵام (أبُوسُفیان)و لەشکرەکەی قورتار بون، بۆیێ پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)ش گەڕانەوە (مَدینة)، ئەم غەزایەش لە مانگی (ذِیالحِجَّة)ی ساڵێ دووەمی کۆچیدا بوو و حەزرەتی (أبولُبابە)شﷺ جێنیشی پێغەمبەرﷺ بوو لە (مَدینة)، تا گەڕانەوە.

## ﴿ غەزای (ذی أمَرّ) لە وڵاتی (غَطْفان)﴾

هەواڵێك گەیشتە پێغەمبەرﷺ: کە (دُعثور)ی (الغَطفانی) کۆمەڵێك پیاوی عەشیرەتەکانی کۆ کردونەوەو دەیەوێ هێرش بکاتە سەر (مَدینة)ی پیرۆز، بۆیێ

پێغەمبەرﷺ لە مانگی (رَبیع الأوَّل)ی ساڵی سێیەمی کۆچی، لەگەڵ چوارسەدو پەنجا موسوڵمانی چەکدار بۆیان دەرچوو و ئیمام (عُثمان)یﷺ کردە جێنیشینی خۆی لە (مَدینَة)، ئینجا کە کافرەکان هەواڵی هاتنی لەشکری ئیسلامیان گەیشتێ، هەموویان هەڵاتن و بە چیاکاندا پەرت بون، پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)ش هاتن لە سەر ئاوێك دابەزین؛ کە ناوی (ذُو أمَرّ) بوو، لەوێ بارانێکی زۆر بە سەریاندا باری و جلەکانیان تەڕ بون، پێغەمبەریشﷺ جلەکانی خۆی داکەندن و بە سەر درەختێکی دادان تا وشك ببنەوە، بەخۆیشی لە بن درەختەکە بەرامبەر کافرەکان پاڵی داوەو موسوڵمانەکانیش سەرقاڵی کاری خۆیان بون، جا (دُعثور)=(غَورَث)ی سەرکردەی کافرەکان ئەم تەنهاییەی پێغەمبەریﷺ بە هەل زانی و یەکسەر بە شمشێرەوە هێرشی کردە سەر پێغەمبەروﷺ گوتی: ئەی (مُحَمَّد) کێ ئەمڕۆ لە من دەتپارێزێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (اَللّه) دەمپارێزێ. جا یەکسەر حەزرەتی(جُبرائیل)ﷺ پاڵەدەستێکی لە سینگی (دُعثور) دا و کەوتە سەر پشت و شمشێرەکەشی لە دەست کەوت، جا پێغەمبەرﷺ شمشێرەکەی وی هەڵگرتەوەو فەرمووی: ئەی کێ تۆ لە من دەپارێزێ؟ (دُعثور) گوتی: هیچ کەسێك نیە بمپارێزێ، جا (دُعثور) موسوڵمان بوو و گوتی: (أشْهَدُ أنْ لاإلهَ إلّااللّهُ وأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللّه). ئینجا پێغەمبەرﷺ شمشێرەکەی داوە دەست، ئەویش گەڕاوە لای هاوڕێکانی و ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوەو گوتی: پیاوێکی درێژ پاڵی دام و خستمیە سەر پشت، زانیم ئەوە (مَلائِکَة)یە، بۆیێ موسوڵمان بوم، جا داوای لە ئەوانیش کرد ببنە موسوڵمان. ئیتر پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کان بە سەلامەتی گەڕانەوە (مَدینَة).

## ﴿ غەزای (بَحْران)﴾

هەواڵێك بۆ پێغەمبەرﷺ هات: کە (بَنو سُلَیم) خەڵکێکی زۆریان بۆ جەنگ کۆ کردۆتەوە، بۆیێ لە مانگی (جُمادَیالأوْلی) ساڵی سێیەمی کۆچی، سێسەد (صَحابَة)ی لەگەڵ خۆیا برد تا گەیشتە (بَحران) لەوێ کافرەکان بەم لاو بەو لادا پەرت بونو هیچ جەنگ ڕووی نەداو بە سەلامەتی گەڕانەوە (مَدینَة)، لەو ماوەیەشدا حەزرەتی (اِبنِ أمِّ مَکْتوم)ﷺ جێنیشی پێغەمبەرﷺ بوو لە (مَدینَة).

## ﴿ کوشتنی (کَعْبِ بنِ الأشْرَف)ی جولەکە ﴾

ئەم کافرە بە بەردەوامی لە دوژمنایەتی ئیسلامدا بوو، جا کە هەواڵی سەرکەوتنەکەی (بَدر)ی گەیشتی، زیاتر ڕقی هەڵسا، بۆیێ بە سەفەر چووە (مَکَّة)ی پیرۆز لەوێ شیعری دەگوتن و بە شیعرەکانی جنێوی دەدا پێغەمبەروﷺ موسوڵمانانو هانی کافرەکانی دەدا: تۆڵەی کوژراوەکانی (بَدر) بکەنەوەو پێغەمبەروﷺ موسوڵمانان لەناو ببەن، بە کافرەکانیشی دەگوت: ئایینی ئێوە لە ئایینی (مُحَمَّد) باشترە!.

جا بەم خیانەتكاریيە، (كَعب) پەیمانەكەی شكاند، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿مَنْ لِكَعْبِ بنِ ٱلْأَشْرَف؟ فَإِنَّهُ قَدْ آذَى اللهَ وَرَسُولَهُ﴾ رواه‌البخاري، كێ بۆ كوشتنی (كَعْب بن الأَشْرف) ئامادە دەبێ؟ چونكە ئەو ئازاری خواو پێغەمبەریخوای داوە.

جا حەزرەتی(مُحَمَّد بن مَسْلَمة)ﷺ گوتی: من دەیكوژم، بەڵام ئیزنم بدە هەندێك قسەی ناڕاست بكەم، تاكو بگەمە ئەنجام. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: چی دەیڵێن بیڵێن.

جا حەزرەتی(مُحَمَّد بن مَسْلَمة)ﷺ لە مانگی (رَبیع الأوَّل)ی ساڵی سێیەمی كۆچی، هاتە لای (كَعب)و گوتی: ئەم پیاوە -مُحَمَّدﷺ- بە ملماندا هاتووەو داوای هەندێك ماڵمان لێدەكاو ئێمەی ماندوو كردوە، بۆیێ هاتوینە لای تۆ بارێك، یان دوو بار-خورما- بە قەرزمان بدەیێ. (كَعب)ش گوتی: باشە، بەڵام ژنەكانتان بە بارمتە لە لای من دابنێن!.

حەزرەتی(مُحَمَّد بن مَسْلَمة)ﷺ گوتی: چۆن وا دەبێ؟ تۆ لە هەموو عەرەبەكان جوانتری!–واتە: ژنەكان حەزت لێدەكەن–بەڵام چەكەكانمان بە بارمتە دادەنێین.

ئیتر وا پێك هاتن شەوێ بێن‌و چەكەكانیخۆیان بە بارمتە دابنێن؟، جا كە شەو داهات، حەزرەتی(مُحَمَّد بن مَسْلَمة)و حەزرەتی(أبونائلة)و سێ (صَحابَة)یتریشﷺ بە چەكەوە چونە لای قەڵایەكەی (كَعب)و بانگیان كردە خوارەوە، جا ئەویش دابەزیە لایان‌و ئەوانیش بە شمشێرەكانیان لێیان دا و كوشتیان، بەڵام لەگەڵ شمشێر لێدانەكە، حەزرەتی (الحارث)ﷺ بریندار بوو، جا بە دەست هەڵیانگرت‌و هێنایانەوە، جا پێغەمبەرﷺ تفی كردە سەر برینەكەی‌و چاك بۆوە. والحمد لله تعالی.

﴿مارەبڕینی حەزرەتی(حَفْصَة)ی دایكی ئیمانداران رضي الله عنها لە پێغەمبەرﷺ﴾

لە مانگی (شَعْبان)ی ساڵی سێیەمی كۆچی، پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(حَفْصَة)ی كیژی ئیمام (عمر)یرضي الله عنهما- لەخۆی مارە كرد–كە بێوەژنێكی مێرد مردوو بوو–چونكە حەزرەتی(خُنَیْس)ی مێردی حەزرەتی(حَفْصَة)-رضي الله عنهما-لە غەزای (بَدْر) بریندار بوو و لە (مَدینَة) بەو برینە وەفاتی كرد.

﴿ مارەبڕینی حەزرەتی (زَیْنَب بِنْت خُزَیْمَة)ی دایكی ئیمانداران رضي الله عنها لە پێغەمبەرﷺ﴾

ئەمەش بێوەژن بوو و مێردەكەی–حەزرەتی(عبدالله بن جَحْش‌ﷺ)– لە غەزای (أُحُد) شەهید بوو، جا پێغەمبەرﷺ لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی سێیەمی كۆچی، لە خۆی مارە كرد، بەڵام تەنها دوو مانگ لە لای پێغەمبەرﷺ مایەوەو وەفاتی كرد، پێغەمبەرﷺ نوێژی جەنازەی لە سەر كردو لە گۆڕستانی (البَقیع)دا ناشتی. (البدایة والنهایة) ب(٢) ل(٣٤٧و٣٥١و٣٥٧) و(السیرةالحلبیة) ب(٢) ل(٢٨٠–٢٩١)، ب(٣) ل(٢٢٣و٤٤٧).

﴿ گوڵبژێریك لەم گوڵزارە ﴾

**یەكەم: پێناسەی (شـیـعـة)=(رافـضَـة):** لێرەدا گوتمان: ئیمام (عُمر)ﷺ زاوای ئیمام (عَلِي)یەﷺ. هەم لە هەژدەمین گوڵبژێرەكەی غەزای (بَدْر)دا گوتمـان: ئیمـام (عَلِـي)ﷺ دۆسـتێكی دڵـسۆزی ئیمـام (أَبُـوبَكْر)ﷺ بـوو. بۆیـێ لێـرەدا پێویـستە پێناسـەیەكی (شیِعَة)=(رافضَـة) بكەین:

(**شیعَـة**)=(**رافـضَـة**): زۆرترینو بەهێزترینی گرۆهەكانی (اَلْبِدْعَة وَالضَّلاَلَة)ن: زۆر بە توندی دژایەتی (أهل السُّنَّة وَالْجَماعَة) دەكەنو جنێو بە (صَـحابَة)كـانی پێغەمبـەرﷺ دەدەنو لـە هەر دەرفەتێكدا بۆیان بگونجێ زۆر بە بێویژدانی لە موسوڵمانەكانی (أهل الـسُّنَّه) دەدەنو ئەیانكوژنو لەناویان ئەبـەن، بـۆ لێدانی (أهْـل الـسُّنَّة) دەبنـە هاوپـەیانی كافرەكـان، هـەر هێرشێكی كافرەكان كردبێتیانە سەر ئیسلام، دەستێكی (شـِیعَة)ی لەگەڵـدا بـووە، جـا بـۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیـیە ئەم ڕووداوانە بخوێنەوە:

لە سـاڵی (٥٦٢)ی كۆچـیدا، (صـلاح الـدِّین الأیُّـوبِي) لەگـەڵ (شـێركۆ)ی مـامیخۆی چـونە (مِصْر)، تاكو بەرگریی لێبكەنو كافرەكانی (صَـلِیبِي) داگـیری نەكـەن، ئینجا وەزیرێكـی دەوڵەتی (فـاطِمِي)=(شـِیعِي)=(رافـضِي) لـە (مـِصْر)—كـە نـاوی (شـاوِر) بـوو— ناردیـە لای كافرەكانی (فَرَنگ)، تاكو بێن (مِصْر) داگیر بكەنو (أهْل السُّنَّة) لەناو ببەن، جا بە هۆی ئەم خیانەتە، (صلاح الدِّین الأیُّوبِي) لە ساڵی (٥٦٤)ی كۆچیدا (شـاوِر)ی خـائینی كوشـتو لـە ئەنجامیشدا دەسەڵاتی (شیعَة)ی لە (مِصْر)دا نەهێشتو (مِصْر)ی گەڕاندەوە باوەشی (أهل السُّنَّه)، تا ئێستاش ((مِصْر) منەتباری (صلاح الدِّین الأیُّوبِي)یە.

هەم لە ساڵی (٦٥٦)ی كۆچیدا، (هۆلاكۆ) ویستی شـاری (بَغْـداد)ی داگـیر بكـا، لـەو كاتـدا (بَغْداد) پایتەختی دەوڵەتیئیسلام بوو، جا (ابنُ العَلْقَمي)ی (شِیعِي)=(رافِضِي)—كە وەزیری (خَلیفَة)ی ئیسلام بوو— ڕێی بۆ (هۆلاكۆ) خۆش كردو لەشكری ئیـسلامی لـە (بَغْـداد) كـەم كردەوە: لە سەد هەزار سەرباز، بۆ دە هەزار، بژێوی ئەو دە هەزار سەربازەشی بە تـەواوی نەدەدا، ئینجا (ابنُ الْعَلْقَمي) ناردیە لای (هۆلاكـۆ)و هـانی دا: هێـرش بكاتـە سـەر (بَغـْداد)و داگیری بكا، مەبەستیشی ئەوە بوو: دەوڵەتی (أهل السُّنَّه) لەناو بباو دەوڵەتێكی (شِیعِي)=(رافضِي) دابمەزرێنێ، جا (هۆلاكۆ) بە دوو سەد هەزار سەربازەوە هێرشی كردو لـە مـانگی (مُحَرَّم)ی ساڵی(٦٥٦)ی كۆچی، (بَغْداد)ی داگیر كـردو دەسـتی بـە كوشـتنی موسـوڵمانان كرد—لە زانایانی ئایینیو ئافرەتو منداڵو گەنجو پیر— تا لە مـاوەی چـل ڕۆژدا: ملیۆنێكو هەشت سەد هەزار موسوڵمانی (أهل السُّنَّه)ی كوشتن، (هۆلاكۆ) لەم هێرشەدا ڕاویـژكارێكی (شِیعِي)ی لەگەڵدا بوو، ناوی (نَصِیر الطُّوسِي) بوو، جا (الطُّوسِي)و (ابنُ الْعَلْقَمي) هەردووكیان هانی (هۆلاكۆ)یان دا: (اَلْمُسْتَعْصِم بـاللە)ی (خَلیفَـة)ی ئیسلامیـشی كوشـت—إنـا لله وإنـا إلیـە راجعون— بۆیێ تا ئێستاش (بَغْداد) لە ژێر (بِدْعة)و ستەمی (شیِعَة)كاندا دەناڵێنێ.

جا ئیمام (ابن كثیر) لە باسی ئەم ڕووداوەدا لەعنەت لەم دوو (شیعَة)یەو لە یارمەتیدەرەكانیان دەكـاو دەفـەرموێ: (لعنـة الله علـیهم). بەنـدەش دەڵـێ: *لەعنـەتی خـوا لـە ئـەوان و لـە شوێنكەوتەكانیشیان بێ، خودا لەگەڵ (هۆلاكۆ)دا حەشریان بكاو بە دۆزەخ سزایان بدا، آمین،* چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَعَنَ اللهُ مَنْ سَبَّ أَصْحابِی﴾ رواه الطبراني فـي الأوسـط ورجالـه رجال الصحيح إلاّ ابن سهل فهو ثقة، **لەعنەتی خوا لەو كەسەی جنێو بە (صَحابَة)ی من دەدا.**

هەروەها لە سەدەی (١٦)ی زایینـیدا، شـاه (إِسْماعِیل الـصَّفَوِي)ی (شِـیعِي)=(رافـضِي)، چەندەها زانای (أهل السّنّه)ی كوشتن و بە هێزی چەك مەزهەبی (شیعة)ی لـە (ئێـران) بـڵاو كردەوە، تا ئێستاش (أهل السُّنَّه)ی (ئێران)–بە تایبەتیش گەلی كورد– لە ڕووی مەزهەبی و نەتەوەییەوە دەچەوسێندرێنەوە، خودا لە هاواریان بێ، آمین.

لەبارەی پەیدابوونی (شیعَة)=(رافضَة) ئەم حەدیسە بخوێنەوە: ﴿عَنْ ابن عَبّاس رضـي الله عنـهما: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّﷺ وَعِنْدَهُ عَلِيٌّ رضي الله عنه، فَقالَ النَّبِيُّﷺ يا عَلِيُّ سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي قَـوْمٌ يَنْتَحِلُـونَ حُبَّ أَهْلِ الْبَيْتِ لَهُمْ نَبَزٌ يُسَمُّونَ الرّافِضَةَ، قاتِلُوهُمْ فَإِنَّهُمْ مُـشْرِكُونَ﴾رواه الطبراني، قـال الحـافظ الهيثمي: إسناده حسن. وروى نحوه البزار وأبو يعلى بسند موثوق، حەزرەتی(ابن عَبّـاس)ی كـوڕە مـامی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: من لە خزمەت پێغەمبەرﷺ بووم، ئیمام (عَلِي)شی لـە لا بـوو، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **ئەی (عَلِي)، لـە مـەودوا لـە ئوممـەتی من كەسـانێك پەیـدا دەبن:–بە درۆ–خۆشەویستی (أَهْلِ الْبَیْت) ئەكەنـە دروشمیخۆیـان، ناوبانگێكیـان هەیە پێیان دەگوترێ: (الرّافِضَة)، ئێوە جەنگ لە دژی ئـەوان بكـەن، چونكە ئـەوان (مُشْرِك)ن.** بڕوانە (مجمع الزوائد ومنبع الفوائد) ب(٩) ل(٥٥٤و٥٥٥).

مێژوونووسانی ئیسلام ئەڵێن: دامەزرێنەری بنچینەی (شیعَة)، پیاوێكی جولەكە بـوو: نـاوی (عبدالله بن سَبَأ)ی خەڵكی (یَمَنْ) بوو، بە فێڵ ئیسلامەتیخۆی ئاشكرا كردو بانگەوازیی بۆ زێدەڕۆیی لە ئیمام (عَلِی)دارضي الله عنه دەكرد، تاكو پەرتەوازە بخاتە ناو ئوممەتی ئیسلام.

بەڵام (شیعَة) دان بەم ڕاستییەدا ناهێنن، هەروەك (مُرْتَضَی العَسْكَرِی)ی (شِیعِي) لە كتێبی (عبدالله بـن سَبَأ)دا گێڕاویەتیەوەو لەمەودواش ڕەددی كردۆتەوە.

**ئینجا بزانە:** (شیعَة) دروشمی بەرگریكردن لە (أَهْلُ الْبَیْت)=خزمەكانی پێغەمبەرﷺ بەرز ئەكەنەوەو لە ناو خۆیاندا زۆر بەشن، بەشە هەرە زۆرەكانیان لە زۆربەی باسەكانی (عَقیدَة)و لقەكانی ئاییندا لەگەڵ (أهل السُّنَّة والْجَماعة) جیاوازن و باوەڕیـان بـە (إِجْمـاع)= یەكـدەنگی موسوڵمانەكانی (أهل السّنّه) نیە، باوەڕیان بە (اَلْخُلَفاءالرَّاشِدين) نیە، واتە: ئیمام (أَبُوبَكْر)و ئیمام (عُمَر)و ئیمام (عُثْمان)رضي الله عنهم، ئەڵێن: لە ڕاستیدا ئیمام (عَلـی رضي الله عنه) جێنـیش=(خَلِیفَـة)ی پێغەمبەرﷺ بوو، بەڵام ئـەم سـێیانە سـتەمكار بـوون و (خلافَـة)یـان لێـزەوت كـرد، جنێـو دەدەنە ئەو سێ (خَلِیفَة)یەو دەستخۆشی لە بكوژەكانی ئیمام (عمر)و ئیمام (عثمان)–رضـي الله

عنهما- دەكـەن، جنێـو دەدەنـە هـەردوو هاوسـەرەكانى پێغەمبـەرﷺ: حـەزرەتى(عائـشَة)و حەزرەتى (حَفْصَة)-رضي الله عنهما-، هەروەها جنێو دەدەنە (صَحابَة)كانىترى پێغەمبەريشﷺ.
هەروەها ئەگەر حەديسێك لە ڕێگاى (أَهْلُ البَيْـت)وە نـەهاتبێ بـاوەڕى پێناكـەن، كەواتـە: باوەڕيان بە كتێبـەكانى حەديسى (أهـل السّنّە) نيـە، نوێـژى نيـوەڕۆو عەسـر بـە يەكـەوە ئەكەنو نوێژى مەغريبو عيشا بە يەكەوە ئەكەن هەرچەند لە سەفەريشدا نەبن.
جا بۆ شارەزابوون لە مەزهەبو عەقيدەى (شِيعَة)، بڕوانـە (مَعـالِمُ الْمَدْرَسَتَيْن) دانـراوى (مُرْتَـضَى العَسْكَرِى)ى (الشِيعِي)=(الرّافِضِي)، يان هەر كتێبێكىترى (شِيعَة)، هەم (البداية والنهاية) ب(٦) ل(٦٣٥-٦٤١)، ب(٧) ل(٢٤٤-٢٤٦)و كتێبى (عبدالله بن سَبأ) ب(١) ل(٣٣و٤٥).

**دووەم: سيفەتە خراپەكانى جولەكەكان، جولەكەكانى (بَنِيقَيْنُقاع) پەيمانيان شكاند،**
**جولەكە:** پيسترينو خائينترينو دوژمنترين گەلەكانى سەر زەمينن بەرامبـەر بـە خـواو بـە پێغەمبەرانو-عليهم الصلاة والسلام- بە ئايينىئيسلام، هەر لەو ڕۆژەى پێغەمبەرﷺ كۆچى كرد بـۆ (مَدِينَة)، جولەكەكان دەستيان بە ئاژەوەو پيلانگێڕانو نانەوەى دووبەرەكى كرد لە نێوان موسوڵماناندا، جا ئەى موسوڵمانى خۆشەويست بۆ ئەوەى جولەكەو تۆكەرەكانيان بە باشى بناسى، ئێمە چەند خراپەيەكى جولەكان لێرەدا دەنوسين:
**١-بێ ئەدەبى بەرامبەر زاتى خوایگەورەو كوشتنى پێغەمبەران**-عليهم الصلاة والسلام-، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا بَلْ يَدَاهُ مَبْـــسُوطَتَانِ يُنْفِقُ كَيْفَ يَـــشَاءُ﴾ المائدە: ٦٤، **جولەكـە گوتيـان: خـوا بەخيلـەو دەسـتى بەخـشينى بەستراوە، دەك ئەوان بەخيل بنو لە عنەتيان لێبدا بـە هـۆى ئـەو قسـە ناشـيرينە، بەڵكو خوایگەورە سەخىو بەخشندەيە دەستى بەخشينى كراونەوەو چۆن حـەز بكا وەها دەبەخشێ.**
ڕۆژێك ئيمام (أَبُوبَكْر)ﷺ چووە دانيشگەيەكى جولەكەكان-كە(تَوْراة)ى تێدا دەخوێندرا- مامۆستايەكەيان ناوى (فِنْحَاص) بوو، جا ئيمام (أَبُوبَكْر)ﷺ پـێى گوت: لـە خـوا بترسـەو موسوڵمان ببە، خـۆ بيگومـان تـۆ دەزانـى (مُحَمَّد)ﷺ پێغەمبەرىخوايە. جا (فِنْحَاص) وەڵامى داوەو گوتى: ئەى (أَبُوبَكْر) ئێمە هيچ پێويستيمان بە خوا نيە! ئێمە دەوڵەمەندينو خـودا هـەژارەو پێويـستى بـە ئێمەيـە، چـونكە داواى قـەرزمان لێـدەكا...جـا ئيمـام (أَبُوبَكْر)ﷺ توڕە بوو و لەپەدەسـتێكى لـە ڕووى (فِنْحـاص) دا و فـەرمووى: سـوێندم بـە خوا: ئەگەر پەيمان لە نێوانماندا نەبوايـە لـە سـەرم دەدایو دەمكوشـتى. جا (فِنْحَـاص) چووە لاى پێغەمبەرﷺ گوتى: ئەى (مُحَمَّد) تەماشا بكە هاوڕێكەت چـى لێ كـردم؟! جـا پێغەمبەرﷺ فەرمووى: ئەى (أَبُوبَكْر) ئەوە بۆ وات لێكرد؟ ئيمام (أَبُوبَكْر)ﷺ فەرمووى: بەرامبەر بە خوا بێئەدەبيەكى گەورەى كردو گـوتى: ئێمـە دەوڵەمەنـدينو خـودا هـەژارە، منيش توڕە بومو لێم دا. جا (فِنْحاص) گوتى: وا نيە. بەڵام يەكسەر خوایگەورە پشتگيرى

ئیمام (أَبوبَكْر)ی﷛ كردو ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿لَقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا وَقَتْلَهُمُ الْأَنْبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ﴾ آل عمران: ١٨١، **بەراستی خوایگەورە قسەی ئەو كەسانەی بیست كە گوتیان: خوا هەژارەو ئیمەش دەوڵەمەندین، ئەو قسەیەی ئەوان گوتویانە بۆ ڕۆژی قیامەت لە سەریان دەنوسین، هەم كوشتنی پێغەمبەرەكانیشیان لە سەر دەنوسین: كە پێشتر كوشتونیان، جا لە سزای ئەو بێئەدەبیو تاوانە، لە ڕۆژی قیامەت پێیان دەڵێین: تام بكەن سزای ئەم ئاگرە سوتێنەرە.**

جا ئەی موسوڵمانی خۆشەویست، ئەم هەڵوێستەی ئیمام (أَبوبَكْر)﷛ بەڵگەیە: نابی مرۆڤی موسوڵمان غیرەتی قبوڵ بكا گاڵتەو سوكایەتی بە خواو پێغەمبەرو ﷺ ئیسلام بكرێ، بەڵكو ئەگەر توانای هەبوو، واجبە: وەكو ئیمام (أَبوبَكْر)﷛ بێئەدەبەكە تەمبێ بكا– هەرچەند بە لێدانی لەپەدەستیش بێ– بەڵام ئەگەر توانای نەبو، ئەو كات واجبە: لەو شوێنە بڕواو لەگەڵیان دانەنیشێ، چونكە ئەگەر لەو شوێنە بمێنێتەوە، ئەویش وەكو ئەوان تاوانبارە. بڕوانە (تفسیرالقرطبي) النساء (١٤٠) و(صفوةالفاسیر) آل عمران (١٨١) والمائدة (٦٤).

**٢-بێئەدەبی بەرامبەر بە پێغەمبەرﷺ**، كۆمەڵێك جولەكە هاتنەی لای پێغەمبەرﷺ، لەجایتی سەلامكردن گوتیان: (اَلسّامُّ عَلَيْكَ) مردن لە سەر تۆ بێ، جا حەزرەتی(عائشة)-رضی الله عنها- توڕە بوو، وەڵامی دانەوەو گوتی: (**بَلْ عَلَيْكُمْ السّامُّ وَاللَّعْنَةُ**) بەڵكو مردنو لەعنەت لە سەر ئێوە بێ. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿مَهْلاً يا عائِشَةُ...فَقَدْ قُلْتُ وَعَلَيْكُمْ﴾ رواەالشيخان، **ئەی (عائشة) لە سەرخۆ بە، من وەڵامم دانەوەو گوتم: (وَعَلَيْكُمْ) لە سەر ئێوە بێ.**

جا خوایگەورە لەبارەی ئەو بێئەدەبیەی جولەكەكان دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ﴾ المجادلة: ٨، **كاتێ جولەكەكان دێنە لای تۆ سەلامێكی ستەمكارانەت لێدەكەن، كە خوا ئەم سەلامەی بۆ تۆ دانەناوە.**

جا لە بەر ئەو خیانەتكارییە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إذا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَهْلُ الْكِتـــابِ فَقُولوُا وَعَلَيْكُمْ﴾رواه الشیخان، **هەر كاتێك جولەكەو دیان=گاور سەلامیان لێكردن، لە وەڵامدا بڵێن: (وَعَلَيْكُمْ)**. (فتح الباري) ب(١١) ل(٥١) و(صفوةالفاسیر) المجادلة (٨).

ئیتر ئەی موسوڵمانی خۆشەویست، هەر سیفەتێكی خراپ هەبێ لەم دونیایەدا گشتی لە جولەكان هاتۆتە جێ، وەك دوو ڕوویی، بێئەدەبی بەرامبەر بە خواو پێغەمبەرﷺ، فێڵبازی، ڕقو قینە بەرامبەر موسوڵمانان، بەخیلی، بێئەمەكی، بێوەفایی، بێشەرمی، خۆ بە زۆر زانین، لەخۆ باییبوون، هاوبەش دانان بۆ خوا، گۆڕینی ئایینیخوا، حەڵاڵكردنو خواردنی ڕیبا، بەرتیل خواردن، درۆكردن...هتد، كە لە بەر زۆری ناتوانم بیانوسم.

ئەوەندە بەسە كە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِلَّذِينَ آمَنُوا الْيَهُودَ

وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا﴾ المائدة: ٨٢، **سوێند بە خوا-ئەی پێغەمبەرﷺ- دەبینی توندترین کەس لە ڕوی دوژمنایەتیەوە لە دژیموسوڵمانان جولەکەو بتپەرستەکانن.**

کەوابوو: ئەوکەسەی کەسە، ئەوەندەی بەسە، نابێ دۆستایەتی جولەکەکان بکا. بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە (سیرةالصلابي) ب(١) ل(٥٨١-٦٠٦).

**٣-تێکدانی یەکڕیزی موسوڵمانانو پەرتەوازە کردنیان**، جولەکە هەردەم لە پیلاندان بۆ نەهێشتنی برایەتی ئایینی نێوان موسوڵمانان: بە ناوی ڕەگەزپەرستیو گەل پەرستیو جیاوازی هەرێمایەتیو...هتد، ڕۆژێك (شاس)ی کوڕی (قَیْس)ی جولەکە بە لای دانیشگەیەکی هۆزی (أَوْس)و (خَزْرَج)دا ڕابرد، جا بەم یەکیەتیو برایەتیەی ئەم دووانە زۆر ڕقی هەڵساو یەکێکی نارده لایان تاکو جەنگە کۆنەکانی پێش ئیسلامبوونیان بە بیر بێنێتەوە، ئیتر ئەم ئاژاوەچیەش کارەکەی ئەنجام دا و هەردوو هۆزەکان ڕووبەڕووی یەکتری هەڵسانو نزیك بوو جەنگ لە نێوانیاندا ڕوو بدا، بەڵام پێغەمبەرﷺ لەگەڵ کۆمەڵە (صَحابَة)یەك بە پەلە خۆی گەیاندنێو ئامۆژگاریی کردنو فەرمووی: **﴿چۆن ئێوە بە بانگەوازی (جاهِلِيَّة)ی پێش ئیسلام ڕەفتار دەکەن؟ لە کاتێکدا من لە نێوانتاندا بەمو خوایگەورەش ڕێزی لە ئێوە ناوە بە ئیسلامبوونتانو ئێوەی کردۆتە برای یەکتری!﴾.**

جا ئەم دوو هۆزە تێگەیشتن: ئەوە پیلانێکی شەیتانو فێڵێکی دوژمنەکەیان بوو، بۆیێ یەکسەر هەڵسانو چەکیان فڕێ دا و یەکتریان ماچ کردو لەگەڵ پێغەمبەرﷺ لەوێ ڕۆیشتن، جا خوایگەورە لەبارەی ئەم ڕووداوە، ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تُطِيعُوا فَرِيقاً مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ يَرُدُّوكُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ﴾ آل عمران: ١٠٠، **ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بە خواو پێغەمبەرﷺ هێناوە، ئەگەر بە قسەی هەندێك کافرەکانی جولەکە بکەن، ئەوان لە دوای ئیمانهێنانتان دەتانگەڕێننەوە بۆ کافربوون.** (تفسيرالقرطبي) آل عمران: (١٠٠).

بەڵێ: خوایگەورە ڕاستی فەرمووە: ئێستاش لە نەتەوەکانی سەر زەمین چەند موسوڵمانێك بە گوێڕایەڵی جولەکەکان لە ئایین لایانداوەو ئاگری دوژمنکاریو دوو بەرەکی لە نێوان موسوڵماناندا دەنێنەوە، جا ئەگەر ئەوانە بە باوەڕەوەش لە ئایین لایاننەدا بێ، بە کردار نۆکەری جولەکەکانو حەشریان لەگەڵ ئەواندایە.

**سێیەم: پێچەی ئافرەتی موسوڵمان، جولەکەکان هەوڵیان دا: ئافرەتە موسوڵمانەکە پێچەکەی لابداو ڕووی وەدەر بکەوێ.** ئەمەش بەڵگەیە: کە پێچەی سەر ڕووی ئافرەتی موسوڵمان سوننەتێکی بەرزی ئیسلامەو بەشێکە لەو پۆشاکەی ئیسلام فەرمانی پێکردوە، جولەکەکانیش زۆر باش دەیانزانی پێچەی ئافرەتیموسوڵمان دروشمێکی بەرزیئیسلامە، بۆیێ هەوڵیان دا هەستی ئایینیی ئەم ئافرەتە موسوڵمانە بریندار بکەنو پێچەکەی لە سەر

ڕووی لابدەن، تا لە ئەنجامی بەرگری لەم دروشمە بەرزە، ئەو جەنگە گەورەیە ڕووی دا و موسوڵمانێکیش شەهید بوو و جولەکەکانیش دەربەدەر کران.

جا بە داخەوە لەم سەردەمەدا هەندێك لەوانەی لاف ئیسلامەتی لێدەدەنو لە ڕێگای بانگەوازیدا بە ئەژنۆدا کەوتونو بەزیون–بۆ ڕازیکردنی ئاغا جولەکەکانیان– دەڵێن: پێچە لە ئیسلامدا نیەو سوننەتیش نیە، بەڵکو (بِدْعَة)یە !.

جا بۆ ڕەددانەوەی ئەم جۆرە کەسانە ئەم بەڵگە بەهێزانەیداهاتوو دەنوسین تا بیگومان موسوڵمان بزانێ پێچەی ئافرەتیموسوڵمان لە سەردەمی پێغەمبەرەوەﷺ تا ئێستاش سوننەتێکی بەرزی ئیسلامە، هەندێك لەزانایانیئیسلامیش بە واجبیان داناوە:

١– خوایگەورە دەفەرمویَ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ﴾ الأحزاب: ٥٩، **ئەی پێغەمبەرﷺ بڵێ بە ژنەکانیخۆتو بە کیژەکانیخۆتو بە ئافرەتانیموسوڵمانان: با چارۆگەیخۆیان بە سەر ڕوخساری خۆیاندا بێننە خوارەوەو داپیۆشن.** بۆ ڕاڤەی ئایەتەکە، بڕوانە تەفسیرەکانی (القرطبي، الخازن، ابن كثير، البيضاوي، النسفي، صفوةالتفاسير) الأحزاب: (٥٩).

**حەزرەتی(أُمُّ سَلَمَة)ی هاوسەرەکەی پێغەمبەرﷺ**رضی الله عنها **فەرموویەتی:** ﴿لَما نَزَلَتْ (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ)، خَرَجَ نساءُ الْأَنْصارِ كَأَنَّ عَلَى رُؤُوسِهِنَّ الْغِرْبَانُ مِنَ الْأَكْسِيَةِ﴾رواه ابن أبيحاتم وأبوداود بسند صالح، **کە ئەم ئایەتەیڕابردوو هاتە خوارەوە ئافرەتەکانی (أنْصاري) لە (مَدِينَة) ئەهاتنە دەرەوە، وەك قەلەڕەش لە سەریان نیشتبێ ئەوها بون بە هۆی خۆ داپۆشین بە چارۆگە ڕەشەکەیان.** (عون المعبود) ب(٩) ل(١٣٢–١٣٤).

**هەروەها حەزرەتی(عائشة)**–رضی الله عنها–**فەرموویەتی:** ﴿لَمّا أَنْزَلَ اللّٰهُ: (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ) النور: ٣١، شَقَقْنَ مُرُوطَهُنَّ فَاخْتَمَرْنَ بِهَا﴾ رواه البخاری، **کە خوایگەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، ئافرەتانی موسوڵمان پەشتەماڵەکانیخۆیان لەت کردو ڕووی خۆیان پێ داپۆشی.** (فتح الباري) ب(٨) ل(٦٢١).

﴿عَنْ أَسْماءَ–رضی الله عنها– كُنَّا نُغَطِّي وُجُوهَنَا مِنَ الرِّجالِ﴾رواه الحاكم–في الحج–على شرط البخاري ومسلم، **(أسْماء)ی کیژی ئیمام(أَبُوبَكْر)**–رضی الله عنهما–**فەرموویەتی: ئیمە لە کاتی حەج کردن ڕووی خۆمان لە پیاوی بێگانە دائەپۆشی. واتە: لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ.**

جا لێرەدا مەبەستی کاتەکانیتری جگە لە حاڵەتیئیحرامە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لا تَنْتَقِبُ الْمَرْأَةُ الْمُحْرِمَةُ وَلاَ تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ﴾ رواەالبخاری، **نابی ئافرەتیئیحرامدار پێچە لە سەر ڕووی خۆی دابنێ و نابی دەستەوانە دەبەر بکا. جا ئەمەش بەڵگەیەکیترە: کە لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ پێچەی ئافرەتیموسوڵمان هەبووە، بەڵام لە حاڵەتی ئیحرامدا لێی قەدەغە کراوە.** (فقه السيرة، للبوطي) ل(٢٤٣).

جا ئـەی موسـوڵمانی ڕێـزدار، بـە (إِجْمـاع)=یەکـدەنگی زانایانیئیـسلام: پێـچە کـردن= داپۆشینی ڕووی ئافرەت سوننەتە، بەڵام جیاوازی فـەرموودەکان لـە واجببـوونیدا هەیـە: ئیمام (ابن حجرالهیتمی) لە (إمام الحَرَمَیْن) گێڕاویەتیـەوە: زانایانیئیـسلام لـە سـەر ئـەوە پێکهاتون: نابی ئافرەتان بە ڕووی ڕووتەوە بڕۆنە دەرەوە...بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیمامی (النّواوي) لە قازی (عیاض) گێڕاویتیەوە: بە یەکدەنگی زانایانیئیـسلام: داپۆشـینی ڕووی ئافرەت سوننەتە، واجب نیە، بەڵکو لە سەر پیاوان واجبە چاویخۆیان بنوقێننو تەماشای ئافرەتی بێگانە نەکەن.

جا ئیمام (ابن حجرالهیتمی) جیاوازی ئەو فەرموودانـەی بـەوە کـۆ کردۆتـەوە: هـەر چـەند داپۆشینی ڕووی ئافرەت سوننەتە، بەڵام ڕووتکردنی ڕووی ئافرەت (مَکْرُوه)= ناپەسـندە، کەوابوو: لە دووو حاڵەتدا داپۆشینی ڕووی ئافرەت واجب دەبێ:

یەکەم: ئەگەر کاربەدەستی موسوڵمانان ڕووتکردنەکەی قەدەغە بکا، چونکە کاربەدەسـت بۆی دروستە: (مَکْرُوه) قەدەغە بکا.

دووەم: ئەگەر ئافرەت بێگومان بزانێ پیاوی بێگانە تەماشای دەکا، ئەو کاتـەش واجبـە: ڕووی خۆی دابپۆشێ، ئەگەر نا: دەبێتە یارمەتیدەری پیاوەکە لە سەر کردارێکی حـەڕامو تاوانبار دەبێ. (تحفةالمحتاج لشرح المنهاج) ب(٧) ل(١٩٣).

*جا ئـەی موسـوڵمانیڕێزدار: ئـەم فـەرموودە بەهێزانـە لـە کـوێو قـسەی ئـەو موسـوڵمانە ناتێگەیشتووانە لە کوێ–کـە دەڵـێن: پێـچە لـە ئیـسلامدا نیـەو سـوننەتیش نیـە؟! چـۆن پێشولەی چڵکاوەکان دەتوانێ ڕەخنە لە فڕینی باز و هەڵۆی ئاسمان بگرێ؟.*

***ئەگەر پێچەی سەر ڕووی ئافرەتیموسوڵمان دروشمێکی بەرزی ئیسلام نەبوایە، چۆن پێغەمبەرﷺ بەرگریی لێدەکردو لە سەر پێچەی تەنها ئافرەتێك ئەو جەنگە گەورەی هەڵدەگیرساند؟!.***

پێغەمبەرﷺ دەرهەق ئەم ناتێگەیشتووانە فەرموویەتی: ﴿...حَتّى إذا لَمْ يَبْقَ عَالِمٌ اِتَّخَـذَ النّاسُ رُؤُوساً جُهَّالاً فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا﴾ رواه الشيخان، **زانایانیئـایینی دەمـرن، تـاوای لێـدێ یـەك زانـای بەڕاسـتیش نامێنـێ، ئـەم خەڵکـە هەنـدێك سەرکردەی ئاییزیی نەزان بۆ خۆیـان دادەنێن، جا پرسـیاری ئاینیـان لێدەکـەن، ئەوانیش بە بێ زانست وەڵامیان دەدەنەوەو خۆیان گومڕا دەبنو خەڵکیش گومڕا دەکەن.**

جا ئەمڕۆ ئەم فەرموودەیە هاتۆتەجێو هەر حیزبێك چەند زانایەکی دەسـتکردی بـۆ خـۆی داناوەو بە (فتوا)ی ناڕاستو نادروست خۆیانو خەڵکیان گومڕا کردوە، إنا لله وإنا إليه راجعون.

**چوارەم: نـابێ موسوڵمان دۆستایەتی کافرەکان بکا، حەزرەتی(عُبـادَة بـن الـصَّامِت)رضي الله عنه**

خۆی بەری کرد لە دۆستایەتی جولەکەکانی (بَنِيقَيْنُقاع)، (ابن سَلُّول الْمُنافِق)ش بەرگری‌ی لی‌ئکردن، لەبارەی ئەم ڕوداوە، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ * فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَى أَنْ تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ﴾ المائدة:٥١و٥٢، ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بە خواو پێغەمبەرﷺ هێناوە، ئێوە جولەکەو دیانەکان مەکەنە دۆستی خۆتان، ئەوان کافرن‌و دۆستی یەکترن، هەر کەسێك جولەکەو دیانەکان بکاتە دۆستی خۆی ئەویش یەکێکە لەوان‌و ستەمی کردوە، خوای‌گەورە ڕێنموونی ستەمکاران ناکا، جا دەبینی ئەوانەی نەخۆشی‌ی (نِفاق) لە ناو دڵیاندایە بە پەلە دۆستایەتی جولەکەو دیانەکان دەکەن‌و دەڵێن: ئێمە دەترسێین سوڕانی ڕۆژگارمان توش ببێ‌و ئەوان بە سەر موسوڵماناندا زاڵ بن.

واتە: بۆیێ ئێمە دۆستایەتی ئەوان دەکەین.

ئیمامی(اَلْقُرْطُبِي) فەرموویەتی: ئەم بڕیارەی خوا تا ڕۆژی قیامەت بەردەوامەو نابی موسوڵمان دۆستایەتی دوژمنانی‌خوا بکا، هەر کەسێك دۆستایەتی دوژمنانی‌خوا بکا، ئەوە دژایەتی خواو پێغەمبەری‌ﷺ کردووەو واجبە: موسوڵمانان دوژمنایەتی ئەویش بکەن، ئەویش وەکو دوژمنانی‌خوا دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخ. (تفسير القرطبي) المائدة (٥١-٥٢).

**پرسیار:** لەم ڕووداوەدا (نِفاق)و دووڕوویی (ابْن سَلُّول) ئاشکرا بوو، ئەدی بۆچی پێغەمبەرﷺ ڕێزی لی‌ئنا، جولەکەکانیشی لە بەر خاتری وی نەکوشتن‌و بە دەرکردنیان ڕازی بوو؟

**وەڵام:** ئەمەش یەکێکە لە کارلەجێ‌یی‌و تێگەیشتنە دورو قووڵەکەی پێغەمبەرﷺ، چونکە (ابن سلُّول) خاوەن خزم‌و کەس بوو لە (مَدینَة)، هەندێکیش تازە موسوڵمان ببوون، جا لەوانە بوو: ئەگەر پێغەمبەرﷺ دڵی شکاندبا، ئاژاوەیەکی گەورە ڕووی‌دابا، بەو ئاژاوەیەش تازە موسوڵمانبووەکان پاشگەز ببوبانەوە، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی‌تریش: تەواوی موسوڵمانان بۆیان ئاشکرا بوو: کە لە ڕاستی‌دا (ابن سلول) موسوڵمان نیە، بە (نِفاق)=دوو ڕوویی هاتۆتە ناو ئیسلام، ئەمەش وای کرد زۆر لە موسوڵمانان وازی لێ بێنن‌و لێی دور بکەونەوەو سۆزی خزمایەتییان نەمێنێ، هەم لە لایەکی تریش: چونکە (ابن سلُّول) شادەی هێنابوو، بۆیێ پێغەمبەرﷺ وەك مرۆڤێکی موسوڵمان لە دونیادا مامەڵەی لەگەڵ کردو خاتری گرت، ناو دڵیشی داوەتە دەست خوا بۆ ڕۆژی قیامەت، چونکە بڕیاردان لە سەر ئاشکراییەکانی مرۆڤ لە دەست کاربەدەستی موسوڵماناندایە لە دونیادا، لێکۆڵینەوەی ناو دڵیشی دەدرێتە دەست خودا بۆ ڕۆژی قیامەت (فقه السيرة) ل(٤٤٥) و(سيرةالصلابي) ب(٢) ل(٥٢).

**پێنجەم: هەر کەسێك جنێو بداتە پێغەمبەرێك**-عليهم الصلاة والسلام- **کافر دەبێ‌و واجبە بکوژرێ، پێغەمبەرﷺ بڕیاری دا: (کَعْب بن الأشْرَف) بکوژن.**

(كَعْب بنِ الأشْرَف) یەكێك بوو لەو جولەكانەی پەیمانی جەنگ نەكردنیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ مۆر كردبوو، جا ئەویش پەیمانەكەی شكاندو یارمەتی دوژمنانی ئیسلامی دەدا، بەوەش نەوەستا جنێویشی دەدا پێغەمبەرﷺ.

ئیمامی(السُّبْكِي) لە ئیمام (ابن الْمُنْذِر)و لە قازی (عَیاض) گێڕاویەتیەوە: تێكڕای زانایانی ئیسلام یەكدەنگن: هەر موسوڵمانێك سوكایەتی بە پێغەمبەرﷺ بكا، یان جنێوی پێبدا، واجبە بكوژرێ...جا لە (المَبْسوط)ی مەزهەبی (المالِكي)ی گێڕاوەتەوە: هەر موسوڵمانێك جنێو بداتە پێغەمبەرﷺ، واجبە: بكوژرێ، یان بە زیندوویی لە سێدارە بدرێ، جنێودەرەكەش داوای تۆبەی لێناكارێو كارەبەدەستی موسوڵمانان سەرپشكە: یان دەیكوژێ، یان بە زیندووی لە سێدارەی دەدا.

جا ئیمام (ابن حجرالهیتمی) فەرموویەتی: ئەگەر جنێودەرەكە موسوڵمان ببێتەوە، ئیسلامەتیەكەی لێقبوڵ دەكرێ، بەڵام ئەو فەرموودەیەش هەڵبژێردراوە: كە بە هەموو جۆرێك واجبە بكوژرێ، جیاوازی نیە: جنێوی دابێتە پێغەمبەری خۆمانﷺ یان پێغەمبەرێكی‌تر-علیهم الصلاة والسلام-، هەروەها جیاوازی نیە: ببێتەوە موسوڵمان، یان نا، واتە: موسوڵمانبوونەوەكەی تەنها بۆ قیامەت سودی دەبێو لە سزای دونیا پێی ڕزگار نابێ.

جا ئەگەر جنێودەرەكە موسوڵمان ببێتەوەو بكوژرێ، ئەوە ملكوماڵەكەی بە میرات دەدرێتە میراتگرەكانی، بەڵام ئەگەر موسوڵمان نەبێتەوەو بكوژرێ، ئەو كاتە ملكو ماڵەكەی بە (فَيْء)دەدرێتە (بَیْت الْمال)ی موسوڵمانانو بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف دەكرێ، واتە: هیچی نادرێتە میراتگرەكانی.

هەروەها ئەگەر كافرێكی پەیمان لەگەڵكراو-وەك جولەكەو گاور و ئەوانی‌تریش- جنێو بداتە پێغەمبەرﷺ، ئەویش پەیمانەكەی هەڵدەوشێتەوەو واجبە: بكوژرێ، ئەمەیان فەرموودەی ئیمام(مالك)و ئیمامی(الشافعی)و ئیمام(أحمد)و چەند زانایەكی‌ترە.

جا ئیمامی(الشافعی) بە حەدیسەكەی كوشتنی(كَعْب بن الأشْرَف) بەڵگەی هێناوەتەوە، هەم ئەم دوو حەدیسانەش بەڵگەی مەسەلەكەنە:

﴿عَنْ عَلِيٍّ: أَنَّ يَهُودِيَّةً كَانَتْ تَشْتِمُ النَّبِيَّﷺ، فَخَنَقَهَا رَجُلٌ حَتّى ماتَتْ فَأَهْدَرَ النَّبِيُّﷺ دَمَهَا﴾ رواه أبوداود بسند صالِح، پیاوێك ئافرەتێكی جولەكەی كوشت، چونكە جنێوی دەدا پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ خوێنی بە فیڕۆ دا.

﴿وَعَنْ ابن عَبّاس-رضی الله عنهما-: أَنَّ رَجُلاً أَعْمًى قَتَلَ أُمَّ وَلَدٍ لَهُ كانَتْ تَشْتُمُ النَّبِيَّﷺ فَأَهْدَرَ النَّبِيُّ دَمَها﴾ رواه أبوداود بسند صالِح، پیاوێكی كوێر كەنیزەیەكی‌خۆی كوشت، چونكە جنێوی دەدا پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ خوێنی بە فیڕۆ دا.



(السيف المسلول على من سبّ الرسولﷺ للإمام السُّبكي) ل(٩٦–١٠٠) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٩) ل(٩٦و٩٩و٣٠٢).

**جا ئەم بڕیارەی پێغەمبەرﷺ بەڵگەیە: ئەگەر بگونجێ: سەرکردەکانی کوفر بە نهێنی بکوژرێن نەك بە ئاشکرایی، تا کو زیانێکی زۆر نەگاتە موسوڵمانان، ئەوەش لەو حاڵەتەدا دەبێ: کە موسوڵمانان حەشارگەیەکیان هەبێ تێیدا بحاوێنەوەو هێزێکی وەهاشیان هەبێ بەرگری لە خۆیان بکەن، هەم دەبی سەرکردەیەکی لێهاتوو و شەرعزان ئەم بڕیارە بدا، چونکە بڕیاری کوشتنی سەرکردەکانی کوفر، جێبەجێکردنی فەرمانی خوایە کە دەفەرمووێ:**
﴿وَإِنْ نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ مِنْ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لا أَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنْتَهُونَ﴾ التوبة: ١٢، **ئەگەر دوژمنەکانتان پەیمانەکانیان هەڵوەشاندەوەو عەیب و تانەیان لە ئاینی ئێوە دا، واتە: زەمی ئیسلامیان کرد، ئێوە سەرکردەکانی کوفر بکوژن، چونکە ئەوان هیچ پەیمانێکیان لەگەڵ ئێوەدا نیە، بەڵکی بەو کوشتنە تەمبێ ببن و واز لە دوژمنایەتیئیسلام بێنن.**

**بەڵێ بە کوشتنی (كَعْب) ترس و دڵەڕاوکێ کەوتە ناو جولەکەکانی (مَدِينَة)و گەورەکانیشیان نەدەوێران لە قەڵایەکانیان دابەزن، بۆیێ ناچار بون پەیمانی جەنگ نەکردن لەگەڵ پێغەمبەرﷺ نوێ بکەنەوە.** بڕوانە (سيرةالصلابي) ب(٢) ل(٥٦–٦٦).

**شەشەم: پێغەمبەرﷺ لە مانگی (شَعْبان) ساڵی سێیەمی کۆچی حەزرەتی (حَفْصَة)ی**-رضي الله عنها- **لە خۆی مارەکرد.** ئیمام (عُمر)ﷺ فەرموویەتی: (حَفْصَة)ی کیژم بە بێوەژنی ماوە، چونکە مێردەکەی –کە ناوی (خُنَيْس)بوو– لە غەزای (بَدْر) بریندار بوو و لە (مَدِينَة) وەفاتی کرد، جا منیش چومە لای ئیمام (عُثمان)ﷺ لە دوای وەفاتی (رُقَيَّة)ی هاوسەری –کە کیژی پێغەمبەرﷺ بوو– پێم گوت: وەرە تا (حَفْصَة)ی کیژم لە تۆ مارە بکەم. ئەویش گوتی: لەو ڕۆژەدا بە تەمای ژن هێنان نیم. جا ئیمام (عُمر)ﷺ فەرمووی چومە لای ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ پێم گوت: ئەگەر حەز دەکەی (حَفْصَة)ی کیژم لە تۆ مارە دەکەم. ئەویش هەر وەڵامی نەدامەوە، بۆیێ زیاتر لەوی تورە بوم، نەك لە (عُثمان)، جا–لە (رواية)ێکدا–: پێغەمبەرﷺ **ئەو ڕووداوەی پێگەیشت و فەرمووی: ئەی (عُمر) زاوایەکی لە (عُثمان) باشترت بۆ ببینمەوەو خەزورێکی لە تۆش باشتر بۆ (عُثمان) ببینمەوە؟ ئیمام (عُمر) فەرمووی: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خواﷺ. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (حَفْصَة)ی کیژی خۆت لە من مارە بکە، منیش (أُمُّ كَلْثُوم)ی کیژم لە (عُثمان) مارە دەکەم.**

جا ئیمام (عُثمان)ﷺ بە تەمای کیژەکەی پێغەمبەر بووﷺ بۆیێ کیژی ئیمام (عمر)یﷺ نەویست، ئیمام (أَبُوبَكْر)یشﷺ فەرمووی: گوێم لێبوو پێغەمبەرﷺ باسی (حَفْصَة)ی دەکرد منیش نەمویست نهێنیی پێغەمبەرﷺ ئاشکرا بکەم، بۆیێ وەڵامی ئیمام (عُمر)ی نەداوە. (فتح الباري) ب(٩) ل(٢١٩–٢٢٣).

*ئا ئەم شەرەف و سەربەرزییە پاداشتی ئەو باوکە دڵسۆزانەیە: کە بۆ کیژەکانیان هەوڵی مێردێکی باش دەدەن و دەعیەو خۆ بە زل زانی نایانگرێ و چاوەڕوان ناکەن*

*کەسێك بێتە داخوازییان. دەك پیرۆزت بێ -ئەی (عُمر)ی بە شەرەف‌و بە غیرەت- ئەم زاوا ڕێزدارەی دونیاو قیامەت، لە تۆش پیرۆز بێ-ئەی (حَفْصَة)ی دایکی ئیمانداران- ئەم مێردە بێوێنەی سەرکردەی دونیاو قیامەت.*

**حەفتەم: لە مانگی ڕەمەزان سالّی سێیەمی کۆچی پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(زَیْنَب بِنْت خُزَیْمَة)ی** رضی‌الله عنها **لە خۆی مارەکرد.** مێردەکەی ناوی (عبدالله بن جَحْش) بوو، کوڕە پوری پێغەمبەرﷺ بوو، لە غەزای (أُحُد) شەهید بوو، حەزرەتی(زَیْنَب)ش بە بێوەژنی‌و بە تەنهایی مایەوەو شەهیدبوونی مێردەکەی زۆر دڵ ئێشایی کردبوو، بۆیێ پێغەمبەرﷺ داخوازی کرد، حەزرەتی(زَیْنَب)ش ئەم داخوازیەی بە ڕێزلێنانێکی پێغەمبەرﷺ داناو لە خۆشیان کاری‌خۆی دایە دەست پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ لە خۆی مارە کرد، جا ئەم (زَیْنَب)یە زۆر چاکەی لەگەڵ گەداو هەژاران دەکرد، بۆیێ پێی دەگوترا: (أُمُّ الْمَساكِين)=دایکی گەداو هەژاران.

بەڵێ: لە هەمان کاتیشدا خوا ئەو شەرەفەی دایێ لە دونیاو قیامەتدا ببوە (أُمُّ الْمُؤْمِنِين)= دایکی ئیمانداران، بەڵام ئەوەندە لە خزمەت پێغەمبەرﷺ نەماوە؟ چونکە لە دوای دوو مانگ لە تەمەنی سی ساڵیدا وەفاتی کردو لە (بَقِيع) نێژرا، ئەویش وەکو حەزرەتی (خَدِيجَة)ی هاوسەرەکەی‌تری پێغەمبەرﷺ رضی‌الله عنها هەر لە ژیانی پێغەمبەرداﷺ بەرەو ماڵی قیامەت ماڵئاوایی لە پێغەمبەرﷺ کرد. (السيرةالحلبية) ب(٣) ل(٤٤٦).

***　　***　　***

## ﴿غەزای (أُحُد)﴾

**(أُحُد): کێوێکە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی (مَدِينَة)ی پیرۆز. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** (أُحُدٌ جَبَلٌ يُحِبُّنا وَنُحِبُّهُ) رواه البخاري، **(أُحُد) کێوێکە ئێمەی خۆش دەوێ، ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ.**

**هۆی ئەم غەزایە:** ئەم غەزایە لە ڕۆژی شەممەی پانزەی مانگی (شَوّال) ساڵی سێیەمی کۆچیدا بوو، هۆیەکەشی ئەمەیە: کافرەکانی (قُرَيْش) لە دوای شکستی غەزای (بَدر) بڕیاریان دا: بە قازانجی کاروانەکەی (أبی‌سُفْيان) لە شکرێك ڕێك بخەن‌و هێرش بکەنە سەر پێغەمبەرﷺ، تاکو تۆڵەی کوژراوەکانی (بَدر) بکەنەوە.

جا کافرەکانی (قُرَيْش) ڕازی بون: تەنها سەرمایەی کاروانەکە بۆ خۆیان وەربگرنەوە- کە پەنجا هەزار میسقالی زێڕ بوو- قازانجەکەشی پەنجا هەزار میسقالی زێڕ بوو، هەمووی بۆ جەنگی پێغەمبەرﷺ داندرا، جا لەشکرێکیان لە سێ هەزار چەکدار پێك هێنا: لە کافرەکانی(قُرَيْش)و لە هاوپەیمانەکانی(الأحابيش)، واتە: کافرەکانی دەوروبەری (مَكّة)، هەم (أبُوعامِرالرّاهِب)ش-کە پێغەمبەرﷺ ناوی لێنابوو: (أبُوعامِرالفاسِق)-

ئەویش لەگەڵ پەنجا کافری (مَدِینَة) کە لە ڕقی پێغەمبەرﷺ چوبونە (مَکَّة)، لەگەڵ لەشکری کافرەکاندا بون، جا لەشکری کافرەکان دوو سەد ئەسپو سێ هەزار وشترو حەفتسەد چەکداری زرێپۆشی تێدا بوو و ئافرەتی تاترۆی گۆرانیبێژو دەف لێدەریان لەگەڵ خۆیانا هێنا، هەم سەرکردەکانیشیان ژنەکانیخۆیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابون، سەرکردەی لەشکری کافرەکان (أبُوسُفْیان) بووە، هەڵگری ئاڵای لەشکرەکەش (طَلْحَة بن أبیطَلْحَة بن عُثمان) بووە، جا لەشکری کافرەکان هاتە (عَیْنَین) لە دۆڵایەکەی پێش (أحُد) لە بەرامبەر (مَدِینَة) دابەزی.

ئەمە لە لایەك، لە لایەکیتریش: ئیمام (العَبّاس)ی مامی پێغەمبەرﷺ لە (مَکَّة)وە نامەیەکی بۆ پێغەمبەرﷺ نارد، ئەم خۆ ئامادەکردنەی کافرەکانی (قُرَیْش)ی تێدا نوسیبوو، بەڵام ئیمام (العَبّاس)ﷺ بەخۆی لەگەڵ لەشکرەکەدا نەهات، چونکە بە دیلبوونو خۆکڕینەوەکەی (بَدْر) تەمبێ بوبوو، بۆیێ لەم جەنگەدا یارمەتی کافرەکانیشی نەدا. جا کە پێغەمبەرﷺ نامەکەی پێگەیشت، چاوەڕوانی کرد تا کافرەکان گەیشتنە (ذِیالْحُلَیْفَة)ی نزیك (مَدِینَة)، ئینجا هەواڵەکەی بە موسوڵمانان ڕاگەیاندو پاسەوانی لە (مَدِینَة) دانان.

جا پێغەمبەرﷺ ڕاوێژی بە موسوڵمانەکان کردو فەرمووی: دوێنێ لە خەونمدا دیتم هەندێك ڕەشە وڵاغ سەر دەبڕانو تیژایی شمشێرەکەم کەلێنێکی تێدا بوو و بەرانێکم لە پشت خۆم سوار کردبوو و دەستەکانم لە ناو زرێیەکی قایم دانان. جا فەرمووی: لێکدانەوەی ڕەشە وڵاغەکان: هەندێ (صَحابَة)م دەکوژرێن، کەلێنی شمشێرەکەش: پیاوێك لە بنەماڵەم دەکوژرێ، بەرانەکەش: پارێزەر=خاوەنی ئاڵای دوژمنە دەکوژرێ، زرێیەکەش: شاری (مَدِینَة)یە، واتە: کافرەکان نایگەنێ.

جا فەرمووی: ئەگەر ڕەئیتان هەبێ: با لە ناو (مَدِینَة)دا بمێنینەوەو وازیش لە کافرەکان بێنین لە کوێ دادەبەزن با دابەزن، چونکە لە هەر شوێنێك بمێننەوە، ئەوە خراپترین مانەوەیە بۆ ئەوان، ئەگەر بێنە ناو (مَدِینَة)ش ئەوە کۆڵان بە کۆڵان جەنگیان لەگەڵ دەکەینو لە سەر بانەکانیشەوە لێیان دەدەین؟

جا (صَحابَة) بە تەمەنەکانی (مُهاجِر)و (أنْصار)و هەم (ابن سَلُول المُنافِق)ش هەموویان لەگەڵ ئەو ڕەئیەی پێغەمبەرداﷺ بون، بەڵام گەنجەکانی (صَحابَة)–بە تایبەتیش ئەوانەی نەچوبونە غەزای (بَدْر)– گوتیان: یا رَسُولَ اللهِ بۆیان دەچینە دەرەوەی (مَدِینَة)، نەوەك وامان تێبگەن ئێمە لێیان دەترسێینو بێهێزین. ئیمام (حَمْزَة)ی مامی پێغەمبەریشﷺ لەگەڵ ئەم ڕایەدا بوو، جا لە بەر ئەوەی ئەوانە زۆر لە پێغەمبەرﷺ پاڕانەوەو ژمارەشیان زۆرتر بوو لە پیرەکان، بۆیی پێغەمبەرﷺ بە

ڕەئی ئەوان بڕیاری دا و لە دڵیشدا پێی خۆش نەبو، جا لە دەی مانگی (شَوّال) نوێژی (جُمُعَة)ی بە موسوڵمانان کردو ئامۆژگاریی کردن لە جەنگدا خۆ ڕاگر بنو مەیدان بەجێ نەهێڵنو فەرمانیشی پێکردن خۆیان بۆ جەنگ ئامادە بکەن.

ئینجا پێغەمبەرﷺ چۆوە ماڵەوەو دوو زرێی بە سەر یەکدا دەبەر کردنو شمشێرەکەیو مەتاڵەکەشی لەخۆی بەستن، جا پیرەکانی (صَحابَة)کان لۆمەی گەنجەکانیان کردو گوتیان: ئێوە پێغەمبەرتانﷺ ناچار کرد بۆ چوونە دەرەوەو بە دڵیشی نەبو. بۆیێ گەنجەکانیش پەشێمان بونەوەو گوتیان: یا رَسُولَ الله ئێمە بە ڕەئی تۆ دەکەین، ئەگەر حەز دەکەی لە (مَدِينَة)دا بمێنەوە. بەڵام پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ما يَنْبَغِي لِنَبِيٍّ إذا لَبِسَ لَأْمَتَهُ أَنْ يَضَعَهَا حَتَّى يُقاتِلَ﴾ بۆ هیچ پێغەمبەرێك نابێ هەر کاتێك چەکی هەڵگرت دایبنێتەوە تا جەنگ لەگەڵ دوژمنەکەی دەکا. واتە: نەوەك بە ترسنۆك دابندرێ.

ئینجا پێغەمبەرﷺ هەزار چەکداری ئامادە کردنو سێ ئاڵای بەستن: ئاڵای هۆزی (الأوْس)ی دایە دەست حەزرەتی(أسَيْد بن حُضَيْر)، ئاڵای (الخَزْرَج)شی دایە دەست حەزرەتی(الحُباب بن المُنْذِر)، ئاڵایەکەی (المُهاجِرِين)شی دایە دەست حەزرەتی(مُصْعَب بن عُمَيْر)، حەزرەتی(عبدالله ابن أُمِّ مَكْتُوم)شی کردە جێنیشی خۆی لە (مَدِينَة)ﷻ.

ئینجا پێغەمبەرﷺ لە (مَدِينَة) چووە دەرەوەو لە (الشَّيْخَيْن) سەربازگەی داناو هەر گەنجێك تەمەنی لە پانزە ساڵ کەمتر بوو لەوێ گەڕاندیەوە، هەم لە ڕێگەدا پێغەمبەرﷺ چاوی بە کومەڵێکی گەورە کەوتو فەرمووی: ئەمە چیە؟ گوتیان: ئەوانە جولەکەکانی هاوپەیمانی (ابن سَلُول)ن، جا پێغەمبەرﷺ گەڕاندنیەوەو فەرمووی: ﴿ئێمە بۆ جەنگیکافران یارمەتی لە کافران وەرناگرین﴾.

ئینجا لە بەرە بەیانی شەممەی پانزەی (شَوّال)، لەشکریئیسلام وەرێکەوت، تا گەیشتنە (الشَّوْط)–لە نێوان (أُحُد)و (مَدِينَة)– لەوێ نوێژی سبەینێیان کرد، ئینجا هەر لەوێ (عبدالله ابن سَلُول المُنافِق) لەگەڵ سێسەد (منافق)ی(مَدِينَة) لە لەشکری ئیسلام دابڕانو گەڕانەوە (مَدِينَة)، جا باوکی (جابر)–کە ناوی (عبدالله بن عَمْرو) بوو– بە دوایاندا ڕۆیشتو پێی گوتن: ئەی گەلیخۆم لە خوا بترسن لەم کاتە ناسکەدا پێغەمبەری خواوﷺ گەلەکەیخۆتان شەرمەزار مەکەن. ئەوانیش گوتیان: باوەڕ ناکەین جەنگ ڕوو بدا، بۆیێ ئێمە دەگەڕێینەوە. جا (عبدالله) فەرمووی: خوا دورتان بخاتەوەو بەهیلاکتان بدا، خوایگەورە وا ناکا پێغەمبەرەکەیﷺ پێویستی بە ئێوە ببێ.

جا لەبارەی ئەو سێسەد (مُنافِق)ەی لە لەشکری ئیسلام دابڕانو گەڕانەوە، موسوڵمانەکان بونە دوو چین، چینێکیان گوتیان: با ئەو سێسەد کەسە بکوژین.

چینەکەیتریش گوتیان: وازیان لێبێنین. ئیتر وازیان لێهێنان، جا بە هۆی گەڕانەوەی (ابن سلُول)و جەماعەتەکەی، دوو باڵیتری لەشکری موسوڵمانان–کە (بَنِیسَلَمَة)و (بَنِی حارِثة) بون– ئەوانیش ویستیان بگەڕێنەوە، بەڵام خوایگەورە ئەوانی پاراست، ئیتر تەنها حەفت سەد چەکداری موسوڵمان لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ مانەوە، بۆیێ (الأنْصار) گوتیان: بۆ چی داوای یارمەتی لە جولەکەکانی (بَنِیقُرَیْظة)ی هاوپەیمانانیخۆمان نەکەین؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پێویستمان بەوان نیە.

جا پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئەو لەشکرەدا ڕۆیشت تا گەیشتە گەڵیەکەی لای کێوی (أحُد)، لەوێ دابەزیو سەربازگەی داناو پشتی لە کێوی (أحُد) بوو، ڕووی لە (مَدِینَة) بوو، جا پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)کانی بۆ جەنگ ڕیزکردنو وتارێکی بۆ دانو هانی دان بۆ غەزا، هەم فەرمووی: کەستان جەنگ نەکا تا ئێمە فەرمانی پێدەکەین.

ئینجا پێغەمبەرﷺ پەنجا تیرهاوێژی بە ئەمیرایەتی حەزرەتی(عبدالله بن جُبَیْر) لە سەر کێوی (عَیْنَیْن)ی بەرامبەر کێوی (أحُد) دانان–ئەم کێوە پێی دەگوترێ: (جَبَلُ الرُّماة)=چیای تیرهاوێژەکان– جا پێغەمبەرﷺ بەم پەنجا تیرهاوێژەی فەرموو: (تیربارانیان بکەنو ڕێگەیان نەدەنێ لە لای پشتەوەمان هێرشمان بکەنە سەر، ئەگەر ئێمە سەر بکەوین، یان بشکێین و باڵندەکانیش بمانڕفێنن، ئێوە فریامان مەکەونو لە شوێنیخۆتان لانەچنو هەر لە شوێنیخۆتان بمێننەوە).

ئینجا پێغەمبەرﷺ شمشێرێکی بە دەستەوە گرتو فەرمووی: کێ ئەم شمشێرە بە مافیخۆی وەردەگرێ؟ جا هەریەکە لە ئیمام (عَلي)و ئیمام (عُمَر)و حەزرەتی (الزُبَیْر)ﷺ گوتیان: یارَسُولَ الله من وەریدەگرم. بەڵام پێغەمبەرﷺ شمشێرەکەی نەدانێ، جا حەزرەتی(أبُودُجانَة)ﷺ گوتی: یارَسُولَ الله مافی ئەم شمشێرە چیە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: مافی ئەوەیە پێی لە دوژمن بدەی تا خوار دەبێتەوە. جا حەزرەتی(أبودُجانَة)ﷺ فەرمووی: من وەریدەگرم. جا شمشێرەکەی دایێو حەزرەتی (أبو دُجانَة)ش ﷺ وەریگرتو پارچە پەڕۆکێکی سوری لە سەریخۆی بەستو ڕۆیشتە نێوان ڕیزی موسوڵمانەکانو کافرەکان، بە دەعیەو فیزەوە لەم لا بۆ ئەو لا دەڕۆیشت، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إنَّها لَمِشْيَةٌ يُبْغِضُهَا اللهُ إلاّ فِي مِثْلِ هذا الْمَــوْطِنِ﴾ ئەمە جۆرە ڕۆیشتنێکە خوایگەورە ڕقی لێدەبێتەوە، تەنها لە وێنەی ئەم شوێنەدا نەبێ.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە ئیمام (عَلي) کرد: بەیداخ بەرەو پێش ببە. جا ئیمام (عَلي)ﷺ بەرەو پێش ڕۆیشتو نەعرەتەی لێداو فەرمووی: (أنَا أبُوالقُصَم) من باوکی تێکشکێنەرم. جا (أبوسَعْد بن أبیطَلْحَة)ی خاوەنی ئاڵای کافرەکان بۆی هاتە مەیدانو ئیمام (علی)ﷺ شمشێرێکی لێداو کوشتی، لە (رِوایَة)یێکیتردا: (طَلْحَة بن أبیطَلْحَة)ی

هەڵگری ئاڵای کافرەکان هاتە مەیدانو حەزرەتی(الزُّبَیـر بـن العَوّام)ﷺ بۆی چووە مەیدانو خۆی بۆ هەڵداو لە سەر وشترەکەی ڕایکێشا خوارەوەو بە زەویی داداو سەری بڕی، جا پێغەمبەرﷺ زۆر مەدحی حەزرەتی(الزُّبَیْر)ی کردو فەرمووی: ﴿إنَّ لِكُلِّ نَبِـيٍّ حَوارِيّاً وَحَوارِيِّ الزُّبَيْرُ﴾ هەر پێغەمبەرێك بێگەردێکی هەیە، بێگەردی منیش (الزُّبَیْر)ە.

ئیتر شەش کەسیتر لەو بنەماڵەیە–یەك لە دوایەك– ئاڵای کافرەکانیان هەڵدەگرتو دەکوژران، ئینجا لە دوای ئەوانیش سێ کەسیتر ئاڵایەکەیان هەڵگرتو هەرسێکیان بە دەستی (قُزمان) کوژران،–(قُزْمان) ئەو کەسە بوو کە پێغەمبەرﷺ دەرهەقی‌ی فەرمووی: دۆزەخییە.– جا (عبدالرّحمن)ی کوڕی ئیمام (أبُوبَکْر)ش هاتە مەیدانو ئیمام (أبُوبَکْر)ﷺ ویستی بەخۆی بڕواتە مەیدان، بەڵام پێغەمبەرﷺ ئیزنی نەدا، هەروەك لە غەزای (بَدْر)ش ئیزنی نەداو لەوێ ڕوونمان کردەوە.

جا لەشکری کافرەکان سێ جار بە دوای یەکدا هێرشیان کردە سەر لەشکری ئیسلام، هەرسێك جار تیرهاوێژەکان هێرشەکانیان دەگەڕاندەوەو پەرتیان دەکردن، جا ئەم جارە لەشکری‌ئیسلام هێرشی کردە سەر کافرەکانو هەردوو لا تێکەڵی یەکتری بونو جەنگ گەرم بوو، جا (هِند)ی ژنی (أبُوسُفْیان) لەگەڵ تاترۆیەکان دەستیان بە دەف لێدانو سرود گۆتن کردو هانی کافرەکانیان دەدا بۆ جەنگ کردن.

جا کە پێغەمبەرﷺ گوێی لەو تاترۆیانە بوو، ئەویش لە خوا پاڕایەوەو فەرمووی: ﴿اَللّهُمَّ بِكَ أَحُولُ وَبِكَ أَصُولُ وَفِيكَ أُقاتِلُ، حَسْبِيَ اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ خودایە هەر بە تۆ خۆم پەنا دەدەم، هەر بە پشتیوانی تۆ هەڵمەت دەبەم، هەر لە ڕێگای تۆ جەنگ دەکەم، خوای‌گەورەم بە تەنها بەسەو باشترین کارلەدەستی منە.

ئیتر جەنگ گەرم بوو، دروشمی موسوڵمانان (أَمِتْ، أَمِتْ) بوو، جا لە گەرمەی جەنگدا ئیمام (حَمْزَة)و حەزرەتی(حَنظَلَة)ی تازە زاوا شەهید بون رضي‌الله عنهما، جا خوای‌گەورە سەرکەوتنی بۆ لەشکری‌ئیسلام ناردو کافرەکان شکانو مەیدانیان بەجێ هێشتو تاترۆیەکانیش دەفەکانیان فڕێدانو بەرەو کێوەکە هەڵاتنو موسوڵمانیش بە دوای کافرەکان کەوتن، جا لەم حاڵەتەدا تیرهاوێژەکان لە کێوەکە دابەزین، جا هەرچەند حەزرەتی(عبدالله بن جُبَیر)ﷺ پێی گوتن: بێ فەرمانی پێغەمبەرﷺ دامەبەزن. ئەوان گوێیان نەدایێو دابەزین، تا کەمتر لە دە کەس لەگەڵ حەزرەتی(عبدالله)دا مانەوە. ئینجا کە (خالِد بن الْوَلِید)ی سەرکردەی سوارئەسپەکانی کافرەکان دیتی کێوەکە تیرهاوێژی لە سەر نەماون، یەکسەر لەگەڵ پارچە لەشکرێکی کافران خۆی گەیاندە سەر کێوەکەو حەزرەتی (عبدالله)و هاوڕێکانی‌ﷺ شەهید کردنو لە لای پشتەوە هێرشی کردە سەر لەشکری‌ئیسلام، جا موسوڵمانەکان سەریان لێ‌شێواو بە بێ‌دروشم

جەنگیان دەکردو ڕیزەکەیان تێك چوو و بونە کۆمەڵ کۆمەڵ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەنها نزیکەی چوار کەس مەیدانیان بەجێ هێشتو بەرەو (مَدِينَة) هەڵاتن، ئەوانیتر وەك بەردی ڕستم لە مەیدانیجەنگدا چەقینو بە پەرتبوویی هەر جەنگیان دەکرد، بۆیێ ئەوانە زۆریان لێ شەهید بون‌رضي الله عنهم.

## ﴿بریندار‌بوونی پێغەمبەرﷺ﴾

**بزانە:** نزیکەی دوانزە (صَحابَة) بۆ پاسەوانی لە لای پێغەمبەرﷺ مابونەوە: حەفت کەس لەوانە (أنصار)ی (مَدِينَة)بونو هەر حەفتیان یەك لە دوایەك شەهید بون‌رضي الله عنهم، چونکە کافرەکان لە پێغەمبەرﷺ نزیك بونەوەو ئەوانەش بەرگرییان دەکرد، هەروەها حەزرەتی(مُصعَب بن عُمَيْر)شرضي الله عنه لە کاتی بەرگریکردنی لە پێغەمبەرﷺ، بە دەستی (ابن قَمِئَة) شەهید بوو، بۆیێ پێغەمبەرﷺ ئالایەکەی دایە دەست ئیمام (علی)رضي الله عنه، جا کە حەزرەتی(مُصعَب)رضي الله عنه شەهید کرا، (ابن قَمِئَة) لعنه الله وا تێگەیشت پێغەمبەریﷺ کوشتووە، بۆیێ هاواری کرد: (مُحَمَّد)م کوشت. جا ئەم هەواڵەش زۆر ورەی موسوڵمانانی هێنا خوارەوە، بەڵام پێغەمبەرﷺ نەشێوراو هەر بانگی (صَحابَة)کانی دەکردو دەیفەرموو: وەرنە لای من.

جا بەرە بەرە (صَحابَة)کان هاتنە لای پێغەمبەرﷺ تا نزیکەی سی (صَحابَة) لە دەورەی پێغەمبەرﷺ کۆ بونەوەو کافرەکانیش هەر لە پێغەمبەرﷺ نزیك دەبونەوە تا وای لێهات: (أُبَيِّ بن خَلَف)لعنه الله هەڵمەتی هێنا سەر پێغەمبەروﷺ ویستی بیکوژێ، بەڵام پێغەمبەرﷺ زەرگەیەکی لە ئەستۆی (أُبَيّ) دا و وەك گاجووتی سەربڕاو بە لادا چوو و بۆڕەی لێهات، جا کافرەکان هەڵیانگرتو پێیان گوت: برینەکەت هیچ نیە، تەنها ڕیشاڵۆك بووە! ئەویش گوتی: وَاللهِ ئەوەندە ئازارم دەدا، ئەگەر ئەم برینە بە هۆزی (رَبِيعَة)و (مُضَر)ەوە بوایە هەمووانی دەکوشتن. جا کە گەڕانەوە (مَكَّة) لە ڕێگەدا بەم برینە مرد، (پێغەمبەرﷺ تەنها ئەم کافرەی کوشتووە) لَعَنَهُ اللهُ وَإِلَى جَهَنَّمَ وَبِئْسَ الْمَصِير.

هەروەها (عُتبَة بن أبيوقَّاص)ش لعنه الله بەردێکی بۆ پێغەمبەرﷺ هاویشتو ددانێکی لای خوارەوەی شکاندو لێوە پیرۆزەکەشی لەت کرد، جا حەزرەتی(حاطِب بن بَلْتَعَة)شرضي الله عنه هەڵمەتی بردە سەر (عُتبَة)و لەویێ کوشتی.

هەروەها (إبن قَمِئَة)ش لعنه الله لێدانێکی بەهێزی لە ڕوخسارە پیرۆزەکەی پێغەمبەرﷺ دا، بەم لێدانە دوو ئاڵقەی خودەکە بە کوڵمەی پێغەمبەرداﷺ ڕوچونە خوارەوە.

جا لەم حاڵەتەشدا (مَلائِكَة)یخوا بەرگرییان لە پێغەمبەرﷺ دەکرد، هەروەها حەزرەتی(أبُوطَلْحَةالأنْصاري)رضي الله عنه بەرگری لە پێغەمبەرﷺ دکردو تیری دەهاویشتنە کافرەکانو خۆیشی دەکردە قەڵغانی پێغەمبەروﷺ دەیگوت: یا رَسُولَ الله بە دایکمو

باوكمەوە گیانفیدات بم تەماشایان مەكە نەوەك تیرێكت وێبكەوێ. جا هەر كەسێك تیری لەتیردانەدا هەبوایە، پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: تیرەكانت بدە (أبیطلحة)؟ چونكە (أبُوطَلحَة) تیرهاوێژێكی بەهێز بوو.

هەروەها حەزرەتی(طَلحَة)شرضي الله عنه خۆی كردبووە قەڵغانی پێغەمبەرﷺ، ئەو زیاتر لە حەفتا برینی كەوتە لاشەیو دەستیشی لە كار كەوت، هەروەها حەزرەتی(نُسَیْبَة بنت كَعب)ش رضي الله عنها –كە ئافرەتێكی موسوڵمان بوو– ئەویش بەرگری لە پێغەمبەرﷺ دەكرد، هەروەها حەزرەتی(سَعد بن أبیوَقّاص)ش بەرگری لە پێغەمبەرﷺ دەكردو پێغەمبەرﷺ بەخۆی تیری دەدانە دەستو دەیفەرموو: ﴿یَا سَعْدُ إِرْمِ فِداكَ أَبِی وَأُمِّـــی﴾ رواه الشیخان، ئەی (سَعْد) تیر بهاوێ كافرەكان دایكمو باوكم گیانفیدات بن.

ئینجا حەزرەتی(أبُوعُبَیْدة بن الجرّاح)رضي الله عنه بە ددانەكانیخۆی هەردوو ئاڵقەكانی لە كوڵمەی پێغەمبەرﷺ دەرهێنان، بەڵام دوو ددانیشی شكانو كەولۆس بوو، كەولۆسیەكەشی لە هەموو خەڵك جوانتر بوو، هەروەها حەزرەتی(قتادة)شرضي الله عنه لە كاتی بەرگریكردنی لە پێغەمبەرﷺ، تیرێكی وە چاوی كەوتو چاوەكەی دەرهات، پێغەمبەرﷺ بۆی لە شوێنی خۆی داناوەو لە جاران بەهێزترو جوانتربوو، لە غەزای (بَدْر)ش حەزرەتی(قَتادَة)رضي الله عنه هەمان ڕووداوی بە سەر هات.

جا لەو تەنگانەشدا حەزرەتی(كَعب بن مالِك)رضي الله عنه هاتو پێغەمبەریﷺ ناسیەوەو بە دەنگێكی بەرز هاواری كرد: هۆ موسوڵمانان موژدەتان لێبێ ئەمە پێغەمبەرەﷺ، واتە: زیندووەو نەكوژراوە. بەڵام پێغەمبەرﷺ ئاماژەی بۆ كرد: بێدەنگ بە. ئیتر موسوڵمانان بەم موژدەیە زۆر دڵخۆش بون، ئینجا موسوڵمانەكان پێغەمبەریانﷺ لێرە لابردو بردیانە لای گەڵیەكەی كێوی (أحُد)، پێغەمبەرﷺ لە نێوان (سَعد بن عُبادَة)و (سَعد بن أبیوَقّاص)دا دەڕۆیشتو ئیمام (أبُوبَكر)و (عُمر)و (عَلي)و (طَلحَة)و (الزُّبَیْر)و (الحارِث)ی لەگەڵدا بونرضي الله عنهم.

جا كە گەیشتنە گەڵیەكە، حەزرەتی(فاطِمَة)ی كیژی پێغەمبەرﷺ خوێنەكەی لە پێغەمبەرﷺ شۆراندو ئیمام (عَلي)شرضي الله عنه ئاوی پێدا دەكرد، جا لە بەر ئەوەی خوێنەكە نەدەوەستا، حەزرەتی(فاطِمَة)رضي الله عنها پارچە حەسیرێكی سوتاندو پۆلكەكەی لە سەر برینەكە داناو خوێنەكە وەستا.

جا لەو كاتەشدا پێغەمبەرﷺ چووە سەر بەردە گەورەكەی ناو گەڵیەكەو دیتی: كۆمەڵێكی كافرەكان بە سەركردایەتی (خالِد بن الوَلِید) چونە سەر كێوەكە، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خودایە نابێ ئەوان لە سەرەوەی ئێمە بن، خودایە هیچ توانەیەكمان نیە تەنها بە تۆ نەبێ. جا پێغەمبەر فەرمانی دا: كۆمەڵێكی (صَحابَة)كان

بـه سـەرکردایەتی ئیمـام (عُمـر)ﷺ ڕووبـەڕوویان بونـەوەو لـە کێوەکـە دایانبەزاندنـە خـوارەوە، جـا پێغەمبـەرﷺ نوێـژی نیـوەڕۆی بـە دانیـشتنەوە کـرد، چـونکە بـە هـۆی برینەکانی بێهێز بوبوو.

ئینجا کە کافرەکان زانییان (صَحابَة)کانﷺ مەیانیجەنگ بەجێ ناهێڵن، ناچار وازیـان لە جـەنگ هێنـا، جـا کـە ویـستیان بـەرەو (مَکّـة) بگەڕینـەوە، (أبوسـُفیان) چـووە سـەر کێوەکەو بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد: (اُعْلُ هُبَلْ) سەر بـەرز بـەو ئایینەکـەت ئاشـکرا بکە ئەی (هُبَل)، واتە: ئەی سەنەم. جا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ئـەی (عُمـر) وەڵامـی بدەوەو بڵێ: ﴿اَللهُ أَعْلی وَأَجَلّ﴾ خـوا بـەرزترەو گـەورەترە ﴿قَتْلانا فِی الْجَنَّةِ وَقَتْلاکُمْ فِی النَّارِ﴾ کوژراوەکانی ئێمە لە بەهەشتدانەو کوژراوەکانی ئێوەش لە ئاگری دۆزەخدانە.

جا (أبوسُفیان) گوتـی: هۆ (عُمر) وەرە لام. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بڕۆ لای، بزانـە چـی دەوێ؟ جـا ئیمـام (عُمـر)ﷺ لێـی نزیـك بـۆوەو (أبُوسـُفیان) گـوتی: ئـەی (عُمـر) توخودا ئێمە (مُحَمَّد)مان کوشتووە، یان نا؟ ئیمام (عُمر)ﷺ فەرمووی: نـا وَالله، ئێـستا پێغەمبەرﷺ گوێی لە قسەکانی تۆیە. جا (أبوسُفیان) گوتی: ساڵی داهـاتوو لـە (بَـدر) جەنگێکیتردەکـەین؟ جـا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: پـێ بڵـێن: بـەڵێ، وەعـدەمان ساڵیداهاتوو بێ لە (بَدْر).

جا کافرەکان لەم جەنگەدا بیستو دوو پیاویان لێکوژران، (صَحابَة)ش حـەفتا کەسـیان لێ شـەهید بـونو برینـداری زۆریـشیان هـەبوو، بـەڵام لەگـەڵ ئـەو هـەموو شـەهیدو برینداری مەیدانی جەنگیان بەجێ نەهێشت، هەر بەرگرییان دەکردو لەوێ مانـەوە، تـا بـە ناچـاری کافرەکـان وەڕەز بـونو لـە سـەرکەوتنی کۆتـایی بێئومێـد بـون، بۆیـێ جەنگیان وەستاندو هیچیتر هێرشیان نەکردە سەر موسوڵمانان.

ئینجا کە کافرەکان گەڕانەوە بۆ (مَکّة)، پێغەمبەرﷺ ئیمام (عَلي)ی بـە دوادا نـاردنو فـەرمووی: ﴿بـە دوای ئـەو کافرانـەدا بـڕۆو تەماشـایان بکـە: ئەگـەر سـواری وشترەکانیان بـونو ئەسپەکانیان ڕاکێشان ئـەوە دەچـنەوە (مَکّـة)، بـەڵام ئەگـەر سواری ئەسپەکانیان بن ئەوە دەیانەوی هێرش بکەنە سـەر (مَدِینَـة)، سـوێندم بـە خوا: ئەگەر هێرش بکەنە سەر (مَدِینَة)، ئەوە بۆیان دەچمە ئەوێو لەوێ جەنگیان لەگەڵ دەکـەم﴾. ئـیتر کافرەکـان سـواری وشترەکانیان بـونو گەڕانـەوە (مَکّة)، ئیمـام (علی)شﷺ گەڕاوە لای پێغەمبەرﷺ.

ئینجا موسوڵمانەکانیش بۆ دۆزینەوەی شەهیدەکانیان کەوتنە گەڕان، پێغەمبەریشﷺ هەواڵی هەندێك (صَحابَة)کانی دەپرسیو فەرمووی: کێ دەچێ بزانێ (سَعْد بن الرَّبیع) زیندووە، یان مـردووە؟ جـا حـەزرەتی (أُبَـيّ بـن کَعْـب)ﷺ فـەرمووی: مـن دەچـم. جـا

حەزرەتی(أبیّ)ﷺ ڕۆیشتو دیتی حەزرەتی(سَعْد)ﷺ بریندارەو لە دواگیاندایە، جا پێی گوت: پێغەمبەرﷺ منی ناردوە تاکو هەواڵت بزانم. جا حەزرەتی(سَعْد)ﷺ فەرمووی: سەلام لە پێغەمبەرﷺ بکەو پێی بڵێ: خوایگەورە پاداشتی لە بری ئێمە بداتەوە چاکتر لە پاداشتی هەموو پێغەمبەرێك لە بری ئۆممەتیخۆی، هەم سەلامیش لە گەلەکەی خۆت بکەو پێیان بڵێ: لە لای خوا هیچ عوزرێکتان نیە، ئەگەر زیانێك بگاتە پێغەمبەروﷺ ئێوەش چاوێکتان بجولێ. جا حەزرەتی(سَعْد)ﷺ فەرمووی: من لە ڕیزی مردووانم، چونکە دوانزە برینم تێدانەو گەیشتونەتە شوێنە کوشندەکانم. جا حەزرەتی (أبيّ)ﷺ هەر لە لای ماوە تا گیانی دەرچوو، ئینجا هەواڵەکەی بۆ پێغەمبەرﷺ هێناوە.

إن شاءالله لە گوڵبژێرەکەدا داستانی چەند شەهیدێکیتر باس دەکەین.

**هەڵوێستی دوو ئافرەتی موسوڵمان:** ئافرەتێکی موسوڵمانی (مَدِينَة) بۆ سۆراغی شەهیدەکان هاتە (أحُد)و پێیان گوت: برات و باوکت و مێردەکەت و کوڕەکەت هەرچواریان شەهید بون!. ئەویش هیچ خۆی نەشێواندو فەرمووی: (ما فَعَلَ رَسُولُ اللهﷺ)؟ ئەدی پێغەمبەرﷺ چی لێهات؟ گوتیان: اَلْحَمْدُ لِلّه بێ بەڵایە. فەرمووی: نیشانم بدەن ببینم. جا کە پێغەمبەریﷺ دیت، داوێنی جلەکەی گرت و فەرمووی: بە دایکم و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەریخوا، تا ئەتۆ سەلامەت بی من گوێ نادەمە هیچ بەڵایەك!.

هەروەها ئافرەتێکیتری موسوڵمان تەرمی مێردەکەیو برایەکەیو کوڕەکەی لە وشترێك بارکردبونو لێیان پرسی: چ باسە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: خوا پێغەمبەریﷺ پاراستووەو هەندێك ئیمانداریش شەهید بوینە. گوتیان: ئەوە کێنە بارت کردون؟ فەرمووی: کوڕمەو برامەو مێردەکەمە!.

ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: شەهیدەکانی بگەڕێننەوە ئەو شوێنەی لێی شەهید بوینە، بۆیێ ئەو شەهیدانەی گواستبونیانەوە (مَدِينَة)، هەموویان گەڕاندنەوە شوێنی لێشەهیدبوونیان لە (أحُد)، جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: بە بەرگی خوێنینی خۆیانەوە ناشتران و نوێژی جەنازەی لە سەر نەکردن و نەشۆران.

جا لە بەر ئەوەی (صَحابَة)کان بریندارىان زۆر بون و زۆریش ماندوو بون، پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: دوو شەهید و سێ شەهید وێکڕا لە ناو یەك گۆڕدا بنێژرێن و ئەوەی زیاتر قورئانی خوێندووە، ئەویان وەپێش بێخرێ بۆ لای قیبلە.

ئینجا پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانﷺ گەڕانەوە (مَدِينَة)و موسوڵمانەکانیش بۆ شەهیدەکان دەگریان، (مُنافق)و جولەکەکانی (مَدِينَة)ش دڵخۆشیخۆیان بە شەهیدبوون و بریندار بوونی (صَحابَة)کان ئاشکرا کردو قسەی ناشیرنیان دەکردن: جولەکەکان

دەیانگوت: (مُحَمَّد) داوای پاشایەتی دەکا، ئەگەر (مُحَمَّد) پێغەمبەر بێ، چۆن برینـدار دەبێو ئەو ژمارە زۆرەی لێدەکوژرێ!. (منـافق)ە کـانیش بـە موسـوڵمانەکانیان دەگـوت: ئەگـەر بـە قـسەی ئێمـەتان کردبـا ئـەو بەڵایـەتان تـوش نـەدەبوو. ئینجـا خوایگـەورە لەبارەی غەزای (أحُد) ئایەتەکانی سورەتی(آل عِمْران)ی ناردنە خوارەوە بۆ دڵدانـەوەی موسوڵمانانو ئاشکراکردنی پیسیی (مناڤق)ەکان، هەروەك لە گوڵبژێرەکەدا هەندێکیان نوسراون.

## ﴿غەزای (حَمْراءُ الأَسَد)﴾

ئینجا پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کان لە (أحُد) گەڕانەوەو پێش ڕۆژئاوابوونی هەمان ڕۆژی شەممە، گەیشتنەوە (مَدِینَة)و شەوێ لە (مَدِینَة) مانەوە، گەورە (صَحابَة)کانی (أنصار)ش تا سبەینێ لە مزگـەوت مانـەوە بـۆ پاراسـتنی پێغەمبـەرﷺ، جا سـبەینێ یـەك شـەممە شـانزەی مـانگی (شـوال)، بانگـەواز کـرا: پێغەمبـەرﷺ فـەرمانی داوە بـە دوای دوژمنـدا بڕۆینو هەم فەرموویەتی: جگە لە جەنگاوەرەکانی (أحُد) نابی کەسیتر لەگەڵمانـدا بـێ. بەڵام حەزرەتی(جابر بن عبدالله)رضي الله عنهما گوتی: یا رَسُولَ الله مـن بـە فـەرمانی بـاوکم لـە لای حەفت خوشکەکانم مابومـەوە، بەخۆیـشی هاتـە غـەزای (أحُـد)و شـەهید بـوو. بۆیـێ پێغەمبـەرﷺ تـەنها ئـەوی ئیـزن دا لەگەڵیانـدا بـڕوا، ئینجـا پێغەمبـەرﷺ سـواری ئەسپەکەی بوو و (صَحابَة)کانیشرضي الله عنهم بـە برینـداری لەگـەڵ پێغەمبـەرﷺ دەرچون تـا گەیشتنە (حَمْراءُالأسَد)، کە لە ڕێگەی (مَكّة)یەو هەشت میل لە(مَدِینَة) دورە.

جا پێغەمبەرﷺ بۆیێ ئەوها بـە پەلـە بـە دوای کافرەکانـدا ڕۆیـشت، چونکە پیاوێك هاتە لایو پـێی گوت: گـوێم لێبـوو (أبوسُفیان) دەیگۆتـە کافرەکان: هیـچمان نـەکرد، (مُحَمَّـد) نـەکوژراوە، کیـژەکانی مـەمك خڕمـان بـە تـاڵان نـەهێناوە، با بگەڕێینـەوە (مَدِینَة)، ئەوانەی ماون بنەبڕیان بکەین.

کەواتە: ئەم دەرچوونەی پێغەمبـەرﷺ بـۆ ترسـاندنی کافرەکـان بـوو، هـەم تـا پێیـان ڕابگەیەنێ: موسـوڵمانان هـەر بـەهێزنو بـەم جەنگـەی (أحُـد) بێهێز نەبوینـە، بۆیـێ پێغەمبەرﷺ سێ شەوان لە (حَمْراءالأسد) مایەوەو لە هەر شەوێکدا پێنـج سەد ئاگریان دەکردنـەوەو ئاگرەکـان لـە دورەوە دەبینـران، ئەمـەش بـووە هـۆی ترسـانی کافرەکـانو نەوێران بێنەوە مەیدانی جەنگ.

هـەم هۆیـەکیتریش وای لێکـردن بترسـێن، ئـەویش ئـەوە بـوو: کـە پێغەمبـەرﷺ لـە (حمراءالأسد) بوو، (مَعْبَدُ الخُزاعِي) بە لایدا تێپەڕیو گوتی: ئەی (مُحَمَّد) زۆرمان پـێ ناخۆش بوو ئەوهات بە سەر هات، خۆزگە ئەوهات لێنەهاتبا. (مَعْبَد) بەخۆی کافر بوو، بەڵام هۆزی (خُزاعَة) کافرەکانیشیان پێغەمبەریانﷺ خۆش دەویا.

جا (مَعْبَد) لەوێ ڕۆیشتو لەولاتر گەیشتە لەشکری کافرەکانو دیتی وا خۆیـان ئامـادە

دەکەن بۆ هێرشکردنە سەر (مَدینة)ی پیرۆز، جا (أبُوسُفیان) لێی پرسی: ئەی (مَعْبَد) چ هەواڵێکت لە دوایە؟ (مَعْبَد)ش گوتی: دیتم (مُحَمَّد)و (صَحابَة)کانی بە دواتاندا هاتونو بۆتان دەسوتێن، ئەوەی بۆ جەنگی (أحُد)ش نەهاتبوو، ئێستا لەگەڵ (مُحَمَّد)دا هاتونو دەیانەوێ تۆڵەی کوژراوەکانیان بکەنەوە، شتی وەهام نەدیوە!.

جا (أبُوسُفیان) گوتی: ماڵوێران ئەوە چی دەڵێی؟ (مَعْبَد) گوتی: وَاللّهِ باوەڕم وا نیە بتوانی لێرە بڕۆی تا لەشکرەکەت لێ وەدەردەکەوێ. جا لەشکری کافرەکان لە هێرشکردنەکە پەشیمان بونەوەو لە ترسان یەکسەر بەرەو (مَكَّة) ڕۆیشتن، جا لە ڕێگەدا (أبُوسُفیان) گەیشتە کاروانێك بەرەو (مَدینة) دەهاتو پێی گوتن: بە (مُحَمَّد) بڵێن: وا خۆمان کۆ دەکەینەوە هێرشی بکەینە سەر، تا بنەبڕیان بکەین. جا کە پێغەمبەرﷺ ئەم قسەیەی پێگەیشت، فەرمووی: ﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾.

جا لەو ما وەیەشدا (أبُوعَزَّة)ی شاعیر بە دیل گیراو بە فەرمانیپێغەمبەرﷺ کوژرا، ئەم (أبُوعَزَّة)یە لە (بَدر)ش دیل کرابوو، پێغەمبەرﷺ لە بەر خاتری کیژەکانی بە خۆڕایی ئازادی کردو پەیمانی لێوەرگرت جارێکیتر جەنگ لەگەڵ ئیسلام نەکا، جا ئەم جارەش (أبُوعَزَّة) گوتی: ئازادم بکە، پەیمان دەدەم جارێکیتر جەنگت لەگەڵ نەکەم، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لاَ يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ واحِدٍ مَـــرَّتَيْنِ﴾ الحديث رواه الشيخان، مرۆڤی ئیماندار لە یەك کون دوو جار ناگەسترێو مار پێیەوەنادا. واتە نابی دوو جار فێڵی لێبکرێ. ئینجا پێغەمبەرﷺ لە دوای سێ شەوەکان گەڕاوە (مَدینة).

### ﴿گەورەیی و ڕێزداری شەهیدەکانی (أحُد)﴾

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَمَّا أُصيبَ إخْوانُكُمْ بأُحُدٍ جَعَلَ اللهُ أَرْواحَهُمْ فِي أَجْوافِ طَيْرٍ خُضْرٍ تَرِدُ أَنْهارَ الْجَنَّةِ وَتَأْكُلُ مِنْ ثِمارِها وَتَأْوِى إِلَى قَنادِيلَ مِنْ ذَهَبٍ مُعَلَّقَةٍ فِي ظِلِّ الْعَـــرْشِ، فَلَمّا وَجَدُوا طِيبَ مَأْكَلِهِمْ وَمَشْرَبِهِم وَمَقِيلِهِمْ، قَالُوا: مَنْ يُبَلِّغُ إخْوانَنا عَنّا أَنّا أَحْيَاءٌ فِي الْجَنَّةِ نُرْزَقُ لِئَلاّ يَنْكُلُوا عَنِ الْحَرْبِ وَلاَ يَزْهَدُوا فِي الْجِهادِ؟ فَقالَ تعالى: أَنَا أُبَلِّغُهُمْ عَنْكُمْ. فــأَنْزَلَ اللهُ: (وَلا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ) آل عمران:١٦٩﴾ رواه ابوداود وقال الحاكم: صحيح الإسناد، کە برایەکانی ئێوە لە غەزای (أحُد) شەهید بون، خوایگەورە گیانی ئەوانی لە ناو زگی باڵندەکانی سەوز دانا، دێنە سەر ڕووبارەکانی بەهەشتو لە میوەی بەهەشت دەخۆنو دێنەوە لای چرا زێڕینەکانی هەڵواسراو لە سێبەری عەرشیخوا، جا کە ئەو شەهیدانە دیتیان ئەو خواردنە خۆشەو ئەو خواردنەوە خۆشەو ئەو شوێنە خۆشەیان هەیە، گوتیان: کێ بە برایەکانی ئێمە ڕادەگەیێنێ: کە ئێمە لە بەهەشتدا زیندووینەو خواردنمان دەدرێتێ، نەوەك لە جەنگدا بترسێنو لە غەزا دوا بکەون؟ جا خوایگەورە فەرمووی: من

لەجیاتی ئێوە پێیان ڕادەگەیێنم. جا خوایگەورە ئەم ئایەتەی ڕابردووی-(١٦٩)ی(آل عمران)ی- ناردوە خوارەوە، واتە: (ئەوانەی لە ڕێگای‌خوا کوژراون وا تێمەگە ئەوان مردوونە، بەڵکو ئەوان زیندوونەو لە لای خوای‌خۆیان خواردنیان دەدرێتێ).

﴿وَعَنْ جابر بن عَبْدِالله رضىالله عنهما: اُسْتُشْهِد أَبِي يَوْمَ أُحُدٍ، فَقالَ لِي رَسُولُ اللهِﷺ: ما كَلَّمَ اللهُ أَحَداً إِلاّ مِنْ وَراءِ حِجاب، وَأَحْيَا اللهُ أَباكَ فَكَلَّمَهُ كِفاحا، فَقَالَ: يا عَبْدَالله تَمَنَّ عَلَيَّ أُعْطِكَ. قالَ: يا رَبِّ تُحْيِينِي فَأُقْتَلُ فِيكَ ثانِيَةً، قالَﷻ: إِنَّهُ قَدْ سَبَقَ مِنِّي أَنَّهُمْ إِلَيْهَا لا يُرْجَعُونَ. قال: يا رَبِّ فَأَبْلِغْ مَنْ وَرائِي. فَأَنْزَلَ اللهُ هذِهِ الآيَةَ: (وَلا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ أَمْواتاً بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ)﴾، رواه ابن ماجه والترمذي بسند حسن وصححه الحاكم، حەزرەتی (جابِر)ﷺ فەرمووی: (عبدُالله)ی باوکم لە (أُحُد) شەهید بوو، جا پێغەمبەرﷺ پێی فەرمووم: خوایگەورە قسەی لەگەڵ هیچ کەسێك نەکردوە تەنها لە پشت پەردەوە نەبێ، بەڵام خوایگەورە باوکی‌تۆی زیندوو کردەوەو ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵ کردو فەرمووی: ئەی (عبدالله) چیت دەوێ لێم داوا بکە تا بتدەمێ. (عبدالله)ی باوکت گوتی: خودایە بە زیندوویی بمگەڕێنەوە دونیا تا دووبارە لە ڕێگای تۆ شەهید ببم. خوایگەورە فەرمووی: پێشتر بڕیار لەخۆمەوە دەرچووە: نابێ مردووەکان بگەڕێنەوە دونیا. جا (عبدالله)ی باوکت گوتی: خودایە ئەم ڕێزداریەی من ڕابگەیێنە بەو زیندووانەی لە دوای من لە دونیادا ماون. جا خوایگەورە ئایەتەکەی‌ڕابردووی نارده خوارەوە.

## ﴿ شەهید لە گۆڕەکەیدا ناڕزێ ﴾

دیسان حەزرەتی(جابر)ﷺ لەبارەی شەهیدبوونی حەزرەتی(عبدالله)ی باوکی فەرموویەتی: ﴿...فَدَفَنْتُ مَعَهُ آخَرَ فِي قَبْرِهِ...فَاسْتَخْرَجْتُهُ بَعْدَ سِتَّةِ أَشْهُرٍ فَإِذا هُوَ كَيَوْمِ وَضَعْتُهُ غَيْرَ هُنَيَّةٍ فِي أُذُنِهِ﴾ رواه البخاري، جا باوکم و یەکێکی‌تر بە یەکەوە لە گۆڕێکدا ناشتنم...جا لە دوای شەش مانگ باوکم لە گۆڕەکە دەرهێنا تاکو بە تەنهایی بینێمە گۆڕێکی‌تر، تەماشام کرد وەك ڕۆژی ناشتنیەتی هیچی نەگۆڕاوە، تەنها بەشێکی کەم لە گوێیەکەی گۆڕابوو.

دیسان حەزرەتی(جابر)ﷺ فەرموویەتی:﴿...ئینجا لە دوای چل ساڵ (مُعاوِیَة) ویستی جۆگەی ئاو بە ناو گۆڕستانی شەهیدەکانی (أُحُد)دا لێبدا، ئێمە چووین شەهیدەکانی بگوازینەوە شوێنێکی‌تر، کە تەماشام کرد: باوکم وەك خەوتبێ ئەوها بوو، بێڵێکیش وەپێی ئیمام (حَمْزَة) کەوتﷺ، یەکسەر خوێنی لێهات، (عَمْرو بن الْجَمُوح)ش دەستی هەر لە سەر برینەکەی بوو، کە دەستمان لادا یەکسەر خوێن لە برینەکەی هاتە دەر، کە دەستەکەمان لە سەر داناوە خوێنکە وەستا-لە (رِوایَة)ێکی‌تر-

بۆنی میسك له گۆڕەكانیان دەهات. مەم له (رِوايَة)يێكىترِيش: جا له دوای چل‌و شەش ساڵ لافاو گۆڕی (عبـدالله)و (عَمْـرو)ی هەڵـدڕی، ئـەم جـارەش لاشـەكەیان بەدەركـەوت‌و دیتیان وەك دوێنێ مردبن ئەوها بون.

ئەم حەدیسانه (صحیح)ن، ئیمام (مالك)و ئیمام (أحمد)و ئیمامی(البیهقي)و ئیمام (ابن إسحاق) گێڕاویەتیانەوەو بەڵگەنه: كـه شـەهیدیش وەكـو پێغەمبـەران-عليهم الصلاة والسلام- لـه گۆڕەكەیدا ناڕزێ، واته: ئەو نەرزینه-هـەروەك ڕێزلێنـانێكی شـەهیده- ئاماژەشـه بـۆ فەرموودەكەیخوا كه له حەدیسەكەیڕابردوودا فەرمووی: ﴿أنَا أُبَلِّغُهُــمْ عَــنْكُمْ﴾ مـن لەجیاتی ئێوه پێیان ڕادەگەیەنم.

جا هەروەك خوایگەوره له قورئاندا پێی ڕاگەیاندین: شـەهید ڕێـزداره، ئـەوهاش-بـۆ زیاتر دڵنیابوون- له دونیادا نیشانی داین: شەهید ڕێزدارەو ناڕزێ، چونكه دیتنی چاو له گوێلێبوون كاریگەرتره، والله أعلم. (البدایـة والنهایـة) ب(٢) ل(٣٥٨-٤٠٥) و(فـتح البـاري) ب(٣) ل(٢٧٦)، ب(٧) ل(٤٣١) و(السیرة الحلبیة) ب(٢) ل(٢٩٤-٣٥٢) و(نورالیقین) ل(١٢٥-١٣٤).

## ﴿گوڵبژێرێك لەم گوڵزاره﴾

**یەكەم: كافرەكانی (مَكَّة) بڕیاریان دا: قـازا نجی كاروانەكـەی (أبِیسُفْیان) بـۆ جـەنگی پێغەمبەرﷺ دابنێن.** لەبارەی ئەم پیلانه، خوایگـەوره دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَـــرُوا يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللهِ فَسَيُنْفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ﴾الأنفال: ٣٦، **بەڕاستی كافرەكان ماڵیخۆیان دەبەخشن تاكو خەڵكی قەدەغه بكەن له ئایینی ئیسلام، جا كافرەكـان ئـەو ماڵـه بـۆ ئـەم مەبەسـته دەبەخشن، بـەڵام لـه ئەنجامـدا دەبێته خەفەت بۆیان، چونكه ماڵەكەیان لەدەست دەچێ‌و دەشبەزن.**

واته: پیشەی كافرەكان بـەردەوام ئەوهایـه: ماڵیخۆیـان سـەرف دەكـەن بـۆ ڕێگـرتن لـه سەركەوتنیئیـسلام‌و شـوێنكەوتنی ڕێگـای ڕاسـت، هـەروەك ئێـستاش بـه چـاوی خۆمـان دەبیـنین: كافرەكـان بـه هـەزاران دۆلار سـەرف دەكـەن بـۆ چەواشـەكردنی موسـوڵمانان‌و ناشیرنكردنی ئیسلام‌و بـۆ لێدانی (مُجاهِـد)و بانگەوازكارانیئیـسلام، بـۆ ئـەو مەبەسـتەش چەندەها نۆكەریخۆیان به كرێ گرتوون‌و له دژی ئیسلام به كاریان دێنن، بەڵام له ئەنجامدا بێگومان خوایگەوره ئایینیخۆی سەركەوتوو دەكاو حەقیش ئاشكرا دەكـا، كافرەكـانیش خەفەتبار دەبن بەم سەركەوتنەو به له دەستچوونی ماڵەكەیان.

جگه لەم هۆیەش-كه هۆیەكی ئایینی بوو- هۆیەكی كۆمەڵایەتیش هەبوو: كافرەكانی (مَكَّة) دەیانویست ئەو بەزین‌و سەرشۆڕیەی غەزای (بَدْر) له خۆیان لابدەن‌و ئابڕوویان بگەڕێننەوه، هەروەها له ڕووی ئابوریش: دەیانویست ئەو مەترسیەی له ڕێگەی بازرگانی بۆ وڵاتی (شـام) توشـیان دەبـێ نـەیهێڵن‌و هیـچیتر پێغەمبـەرﷺ (صَـحابَة)كـانﷻ نەیەنـه سـەر ڕێگـەی

کاروانەکانیان، هەروەها لە ڕووی ڕامیاریش: بە هۆی شکستەکەی (بَدْر)، کافرەکانی (مَكّة) نرخ و ڕێزیان نەمابوو لە ناو هۆزەکانی عەرەبدا، بۆیێ دەیانویست–بە هەر نرخێك بێ– سەربەرزیەك بۆ خۆیان بگەڕێننەوە. (تفسير ابن كثير) الانفال (٣٦) و(سيرة الصلابي) ب(٢) ل(٧٠–٧٢).

**دووەم: ئیمام (الْعَبّاس)ﷺ لە (مَكّة)وە نامەیەکی بۆ پێغەمبەرﷺ نوسی و لە پیلانی کافرەکانی (قُرَيْش) ئاگاداری کردەوە.** بۆ گەیاندنی ئەم نامەیەش ئیمام (العَبّاس) پیاوێکی بە کرێ گرت و بە مەرجی دانا: بە پەلە بڕواو بە سێ شەو و سێ ڕۆژان نامەکە بگەیێنێتە پێغەمبەرﷺ، چونکە ڕێگەی نێوان (مَكّة)و (مَدِينَة) هەشت ڕۆژە ڕێیە، جا حەزرەتی(أُبَيّ بن كَعْب)ﷺ نامەکەی بۆ پێغەمبەرﷺ خوێندەوەو پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئەم نامەیە ئاشکرا مەکە. جا لە دوای گەیشتنی نامەکە پێغەمبەرﷺ هەولّی دەدا ڕۆژ بە ڕۆژ هەواڵی لەشکری کافرەکان بزانێ و زانستی لەبارەی لەشکرەکە بۆ دەهات، تا کافرەکان لە (مَدِينَة) نزیك بونەوە، ئینجا پێغەمبەرﷺ خۆی ئامادە کرد.

جا لەبارەی ئیمام(العَبّاس)ﷺ ئیمام (ابن عبدالبَرّ) فەرموویەتی: ئیمام (العَبّاس) لە پێش غەزای (بَدْر) موسوڵمان بوبوو، بەڵام ئاشکرای نەدەکرد، هەر ئەویش لە (مَكّة)وە هەواڵی کافرەکانی (قُرَيْش)ی بۆ پێغەمبەرﷺ دەنوسی و موسوڵمانەکانی (مَكّة)ش بەویەوە بەهێز بوبون، جا ئەویش پێی خۆش بوو: کۆچ بکا بۆ (مَدِينَة)، بەڵام پێغەمبەرﷺ بۆی نوسیبوو: ﴿أَنَّ مَقَامَكَ بِمَكَّةَ خَيْرٌ﴾ **مانەوەت لە (مَكّة)دا باشترە بۆ موسوڵمانان.**

جا ئیمام (ابن حجرالهيتمي) فەرموویەتی: لە واجبوونی کۆچکردن ئەو جۆرە کەسانە جیا کراونەوە: کە وەك ئیمام (العَبّاس)ﷺ مانەوەیان لە (دارُالْكُفْر)دا بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدایە. واتە: دروستە: ئەوان لە (دارُالْكُفْر)دا بمێننەوە. (تحفة المحتاج بحاشية الشرواني) ب(٩) ل(٢٦٩و٢٧٠) و(السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٢٧١و٢٩٦).

**سێیەم: ڕاوێژ کردن، لە غەزای (أُحُد) پێغەمبەرﷺ ڕاوێژی بە موسوڵمانان کرد.**

ئیمامی(القرطبي) فەرموویەتی: ڕاوێژکردن لە بناغەکانی شەریعەتیئیسلامەو لە کارە گرنگەکانە، هەر کاربەدەستێك ڕاوێژ بە زانایان و دینداران نەکا، ئەوە لادانی واجبە...جا دەفەرموێ: –ئیمام–(ابن خُوَيْزِمَنْداد) فەرموویەتی: واجبە کاربەدەستەکان لە کاروباری ئاییندا ڕاوێژ بە زانایانیئایینی بکەن، لە کاروباری جەنگدا ڕاوێژ بە سەرکردەکانی لەشکر بکەن، لە بەرژەوەندیەکاندا ڕاوێژ بە پیاوماقوڵانان بکەن، بۆ ئاوەدانکردنەوەو ڕاگرتنی دەوڵەتیش ڕاوێژ بە وەزیرەکان و کاربەدەستەکان بکا.

لە ئیمام (الْحَسن الْبَصْرِي) گێڕدراوەتەوە: کە خوایگەورە فەرمانی ڕاوێژکردنی بە پێغەمبەرﷺ کردوە، بۆ ئەوە نیە: کە پێغەمبەرﷺ پێویستیی بە ڕای ئەوان هەیە، بەڵکو بۆ ئەوەیە: فێری سودی ڕاوێژکردنیان بکا، تاکو ئۆممەتیشی وەکو وی ڕاوێژ بە یەکتری بکەن...ڕاوێژکردن بەرەکەتە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَا خَابَ مَنِ اسْتَخارَ، وَلا نَدِمَ مَنِ

اسْتَشارَ﴾ رواه الطبراني وحسنه السيوطي، **سەرشۆڕو شەرمەزار نابێ ئەوکەسەی (اِسْتِخارَة)ی کردبێ، پەشیمانیش نابێتەوە ئەو کەسەی ڕاوێژی کردبێ...**

ڕاوێژکردن لە سەر جیاوازی بۆ چوونەکان بنیاتنراوە، جا ڕاوێژکەرەکە تەماشا دەکا: کامە بۆچوون لە قورئانو حەدیس نزیکترە—ئەگەر بۆی بگونجێ—ئینجا خوایگەورە دڵی بردە سەر کام بۆچوون، با ئەویان جێبەجێ بکاو بشت بە خوا ببەستێ.—واتە: لە سەری واجب نیە بۆچوونی هیچ لایەك جێبەجێ بکا—چونکە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللهِ﴾ آل عمران: ١٥٩، **ڕاوێژیان پێ بکە لە کاروباردا، جا لە دوای ڕاوێژکردن دڵت بۆ چ کارێك ڕۆیشت، ئەوی جێبەجێ بکەو پشت بەخوا ببەستە.**

ئیمام (قَتادَة) فەرموویەتی: خوایگەورە فەرمانی بە پێغەمبەرﷺ کردوە: دڵی بۆ کام کار چوو، بەجێی بێنێو پشت بە خوا ببەستێ، نەك بە ڕاوێژەکەی ئەوان—واتە: ئەگەر ڕاوێژکردن واجبیش بێ، بەڵام (مُلْزِم) نیە—کەواتە: واجب نیە ڕاوێژکەرەکە ڕای هیچێکیان جێبەجێ بکا. جا کە پێغەمبەرﷺ کەرستەی جەنگی لە خۆی بەستو گەنجەکان پەشیمان بونەوەو گوتیان: یا رَسُولَ الله ئەگەر حەز دەکەی لە (مَدِینَة) بمێنەوە، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: **﴿بۆ هیچ پێغەمبەرێك نابێ هەر کاتێك چەکی هەڵگرت دایبنێتەوە تا جەنگ لەگەڵ دوژمنەکەی دەکا.﴾** چونکە چەك هەڵگرتن نیشانەی دڵ بۆچوونو بڕیاردانی جەنگە، بەڵام دانانی چەك هەڵوەشاندنەوەی پشت بەستنە بە خوای گەورە، دانانی چەكو دەرنەچوون بۆ مەیدانی جەنگ دەبێتە نیشانەی دوو دڵیو ترسنۆکیو پاشگەزبوونەوە لە بڕیاردان، سەرکردەی لێهاتووش نابێ ئەو سیفەتە خراپانەی تێدا بێنەجێ. بە کورتکراوەیی لە (تفسیرالقرطبي) آل عمران (١٥٩).

**پرسیار:** لە فەرموودەکانی (تفسیرالقرطبي) وا دەرکەوت: ڕاوێژکەر لە سەری واجب نیە ڕای هیچ لایەك جێبەجێ بکا، کەوابوو: واجب نیە ڕای لایەنە زۆرترەکەش جێبەجێ بکا، ئەدی بۆچی پێغەمبەرﷺ ڕای گەنجەکانی هەڵبژارد، چونکە ئەوان زۆرترو بەهێزتر بون؟

**وەڵام:** ڕاستە گەنجەکان زۆرتر بون، بەڵام ئەمە ڕاست نیە: کە پێغەمبەرﷺ ڕای گەنجەکانی بۆیێ هەڵبژاردبێ چونکە زۆرترن، بەڵکو لە بەر ئەوە بوو: ڕای گەنجەکان لە چەند ڕویێکەوە پەسندتر بوو لە ڕای پیرەکان، **بۆ نمونە:**

ڕای پیرەکان ئەوە بوو: لە ناو (مَدِینَة)دا بمێننەوە، جا ئەگەر دووژمن بێتە ناو (مَدِینَة)، ئەوە موسوڵمانان کۆڵان بە کۆڵان جەنگیان لەگەڵ دەکەن، ئافرەتو منداڵیش لە سەر بانەکان لێیان دەدەن، وە ئەگەر دوژمنەکەش لە دەرەوەی (مَدِینَة) بمێنێتەوە، ئەوە پاش ماوەیەك وەڕەز دەبێو دەگەڕێتەوە (مَکَّة).

جا لە بەرامبەریش ڕای گەنجەکان ئەوە بوو: لەشکری کافرەکان [illegible]

هەزار وشترو دوو سەد ئەسپی لەگەڵدایە، کەوابوو: دەگونجێ ئەو لەشکرە زۆرە بۆ ماوەیەکی زۆر گەمارۆی (مَدِينَة) بداو هاتنی ئازوقە بۆ (مَدِينَة) قەدەغە بکا، بەم گەمارۆیە دانیشتووانی (مَدِينَة) توشی برسیەتیو تەنگانە دەبن، هەم لە لایەکیتریش: بێگومان کافرەکان ئەو هەموو ئاژەڵە زۆرانە بەردەدەنە ناو کشتوکاڵی دەرەوەی شاری (مَدِينَة)و وێرانی دەکەن، ئەمەش دەبێتە زیانێکی گەورەی ئابووری، بەڵکو (صَحابَة)کانﷺ بە ئاشکرایی هەستیان بەم زیانە دەکرد، چونکە لەشکری کافرەکان لە لای کارێزکە وشترەکانیان بەردانە ناو کشتوکاڵی موسوڵمانانو (صَحابَة)یەکی (أنصاري)ش گوتی: (**چۆن دەبێ کشتوکاڵی (مَدِينَة) بکرێتە لەوەڕگەو هیچیشمان لەوان نەداوە)؟**.

جا ئەوەش بزانە: تەنها لەو حاڵەتەدا ڕاوێژ دەکرێ: کە بڕیارێکی شەرع لەو ڕووداوەدا نەبێ، چونکە پێغەمبەرﷺ لێرەدا (وَحْي)ی بۆ نەهاتبوو، بۆیێ ڕاوێژی پێکردن، ڕێگەشی دانێ —هەردوو لا— ڕای خۆیان بە ئازادی دەر ببڕن، ئینجا بە (إجْتِهاد)ی خۆی ڕایەکی هەڵبژاردو لێیشی پاشگەز نەبۆوە، هەرچەند ئەو ڕایەش لەگەڵ ناو دڵیخۆی جیاواز بوو.

(البداية والنهاية) ب(٢) ل(٣٦٤) و(السيرة الصلابي) ب(٢) ل(٧٤-٧٨).

**چوارەم: پشت بەستن بە کافرەکان بۆ جەنگی کافرەکان بە چەند مەرجێك دروستە:**

**پێشەکی:** پێغەمبەرﷺ لە (الشَّيْخَيْن) ئەو گەنجانەی گەڕاندنەوە: کە تەمەنیان لە پانزە ساڵ کەمتر بوو، ئەمەش بەڵگەیە: کە موسوڵمانەکانی ئەو سەردەم لەو پەڕی گیانفیدایی بون بۆ ئیسلام، هەی ئافەرین بۆ ئەو دایكو باوکانەش: کە کوڕەکانیخۆیان ئەوها پەروەردە کردونو کردونیانە گیانفیداو دڵسۆزی ئیسلام.

جا لە بەرامبەر ئەو بەچکە شێرانەش، تەماشا بکە: (عبدالله بن سَلُّول الْمُنافِق) لەگەڵ سێسەد (منافق)ی (مَدِينَة) گەڕانەوەو موسوڵمانەکانیش لەبارەی ئەوان بونە دوو چین، جا خوایگەورە لەبارەی ئەو دوو چینانە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُمْ بِمَا كَسَبُوا أَتُرِيدُونَ أَنْ تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ سَبِيلاً﴾ النساء (٨٨)، **بۆچی ئێوەی ئیماندار لەبارەی (مُنافِق)ەکان بونە دوو چین: چینێك گوتی: دەیانکوژین. چینەکەیتر گوتیان: نایانکوژین. خۆ ئەوان (مُنافِق)نو خوایگەورە بە کوفرەکەیخۆیان بە هیلاکی داون، ئایا ئێوە دەتانەوێ ئەوان بهێننە سەر ڕێی ڕاست کە خوا ئەوانی گومڕا کردون، هەر کەسێکیش خوا گومڕای کردبێ، هیچ ڕێگایەکت دەست ناکەوێ بۆ ئیمانهێنانی.**

جا کە ئایەتەکە هاتە خوارە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إنَّها طَيِّبَةٌ تَنْفِي الْخَبْثَ كَما تَنْفِي النّار خَبْثَ الْحَدِيدِ﴾ رواه الشيخان، **شاری (مَدِينَة) پاكو بۆنخۆشە، پیاوی خراپ لادەبا، هەروەك ئاگر چڵکی ئاسن لادەبا.**

جا خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿إِذْ هَمَّتْ طَائِفَتَانِ مِنْكُمْ أَنْ تَفْشَلا وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى اللَّهِ

فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾آل عمران: ١٢٢، **ئەو کاتەش دوو کۆمەڵ لە ئێوەی مسوڵمان ویستیان بترسێنو ئەوانیش بە دوای (ابن سَلُّول)دا بگەڕێنەوە، بەڵام خوایگەورە ئەو دوو کۆمەڵەی پاراستنو نەگەڕانەوە، خوایگەورە سەرپەرشتکاری ئەو دوو کۆمەڵەیە، با ئیماندارەکانیش هەر بە خوا پشت ببەستن.** جا ئەم دوو کۆمەڵەی ئەو مەدحەیان کراوە (بَنُوسَلَمَة)و (بَنُوحارِثَة) بون. هەروەك (البخاري ومسلم) گێڕاویەتیانەوە.

**پرسیار:** ئەو سێسەد (منافق)ەی گەڕانەوە، پێغەمبەرﷺ دەیزانی (منـافق)نو ڕێگەشـی دانێ لەگەڵیدا بڕۆنە غەزای (أُحُـد)، لـە لایـەکیتریش کۆمەڵـە جولەکەیـەکی گەڕاندنـەوەو ڕێگەی نەدانی لەگەڵیدا بێنە غەزا، هەم ڕێگەشی نـەدا: (أنْـصار)ی (مَدِينَـة) جولەکـەکانی هاوپەیمانی خۆیان لە گەڵ خۆیاندا بهێننو فەرمووی: پێویستیمان پێیـان نیـە. ئایا ئـەم دژایەتیە چۆن لادەچێو جیاوازی چیە؟

**وەڵام:** پێغەمبەرﷺ زۆر چاك بـیری لـەوە دەکـردەوە: کـە لەشـکری کافرەکـان سـێ هـەزار چـەکدارن، لەشـکری ئیـسلامیش حـەفت سـەد موسـوڵمانو سێسـەد (منـافق) بـون، جـا (منافق)ەکان مەترسی ئەوەیان لێنەدەکرا: کە وەگەڵ لەشـکری کافرەکـانی (مَكّـة) بکـەون؟ چونکە دانیشتووانی (مَدِينَة) خزمیخۆیان بون، بەڵام جولەکەکان بێگانە بونو ئەو مەترسیەیان لێدەکرا، بۆیێ پێغەمبەرﷺ ڕێگەی نەدا: جولەکەکان لەگەڵیاندا بێن بۆ غەزای (أُحُد).

جا لە سەر ئەم بنچینەیە، ئیمامی(النواوي) فەرموویەتی: دروستە پێشەوای موسوڵمانان بۆ جەنگکردن پشت بەو کافرانە ببەستێ کە لە خیانەتیان ئـەمین بـێو هـەم ژمارەشـیان تـەنها ئەوەندە بێ: ئەگەر ئەوانیش وەگەڵ لەشکری کافرەکان بکەون ئێمە بەرەوەستی هەردوو لایان بکەین. جا بەڵگەی ئیمامی(النواوي) ئەم سێسەد (منافق)یەو هـەم لـە غـەزای (حُنَـيْن)ش پێغەمبەرﷺ سێسەد زرێی لە (صَفْوان بن أُميَّة) وەرگرت، کە لەو کاتدا کافر بوو.

جا ئیمام (ابن حجر الهيتمي) فەرموویەتی: بۆ پشت پێبەستن بە مەرج دانداروە: پێویستیمان بە یارمەتیدانی کافرەکان هـەبێ، جـا کـە پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿إنَّــا لاَ نَــسْتَعِينُ بِمُشْرِكٍ﴾ **ئێمە یارمەتی لە هیچ کافرێك وەرناگرین.** مەبەسـت ئەوەیـە باشـتر ئەوهایـە هیچ جۆرە کافرێك پشتی پێنەبەسترێ لە جەنگدا، واتە: مەبەستی قەدەغەکردن نیە. والله أعلم. (تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٩) ل(٢٣٨)

## ﴿ زیانو سیفەتەکانی (مُنَافِق)کان ﴾

**پێشەکی بزانە:** لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ ژمارەی (مُنـافِق)ەکـانی (مَدِينَـة): سێسـەد پیاو و سەدو حەفتا ئافرەت بون، هـەروەك (ابـن عَبّـاس)رضي الله عنهما فەرموویـەتی، سـەرۆکی (مُنَافِق)ەکانیش (عبدالله ابن سَلُّول) بوو. (تفسير الخازن) و(تفسير النسفي) التوبه: الأيتان (٦٧و٨٤).

جا لە چەند ئایەتو حەدیسدا ڕوو ڕەشیو خیانەتکاریو زیانی (منافق)ەکان بـاس کـراوە،

ئێمەش لێرەدا هەندێکی باس دەکەین، تاکو موسوڵمانان بیانناسن و خۆیان لەوان بپارێزن:

**١-جیاوازی دڵ و زوبان**، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ﴾البقرة: ٨، **چینە خەڵکێك هەنە دەڵێن: باوەڕمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، لە ڕاستیدا ئەوان خاوەن باوەڕ نین. واتە: (مُنافق)ن.**

**٢-بە ناوی چاکسازی و پێشکەوتن، بێ ئەخلاقی و وێرانکاری و بەدڕەوشتی بڵاو دەکەنەوە،** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ * أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِنْ لا يَشْعُرُونَ﴾البقرة (١١و١٢)، **کاتێ بەو چینە خەڵکە دەگوترێ: لەم زەمینەدا وێرانکاری و بێ ئەخلاقی ئەنجام مەدەن و خەڵکی لە ئایین لامەدەن؟ لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە چاکسازی دەکەین. خەڵکینە ئاگادار بن: ئەوانە تێکدەری ئایین و ئەخلاقن بەڵام بە خۆیان هەست ناکەن. واتە: چونکە ڕووناکیی ئیمان لە دڵیاندا نەماوە.**

**٣-ڕەفتارکردن بە ئایینی ئیسلام بە دواکەوتن و نەزانی دادەنێن و ڕەفتار بە شەریعەتی ئیسلام ناکەن،** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا كَمَا آمَنَ النَّاسُ قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاءُ أَلا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ وَلَكِنْ لا يَعْلَمُونَ﴾ البقرة: ١٣، **کاتێ بە (منافق)ەکان دەگوترێ: ئێوەش وەکو خەڵکی موسوڵمان ئیمان بێنن و گوێڕایەڵی خودا بن، ئەوان دەڵێن: چۆن ئێمە وەك نەزانەکان ئیمان دێنین!. خەڵکینە ئاگادار بن: ئەوانە نەزانن، بەڵام بەخۆیان نازانن کە نەزانن.**

**٤-دوو ڕوویی-هەر لە بەر ئەو سیفەتەش ناویان لێندراوە (مُنَافِق)-** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ﴾البقرە: ١٤، **کاتێ (منافق)ەکان دەگەنە ئیمانداران پێیان دەڵێن: ئیمانمان هێناوەو ئێمە موسوڵمانین. کاتێ دەگەڕێنەوە لای گەورەکانی خۆیان دەڵێن: ئێمە لە سەر ئایین و ڕێبازی ئێوەین، ئێمە گاڵتە بە موسوڵمانان دەکەین.**

**٥-شێوەی خۆیان زۆر جوان دەکەن و بە زمانی لووسی و قسەی سەر قۆزو بن ئاڵۆز خەڵکی چەواشە دەکەن،** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ﴾المنافقون: ٤، **کاتێ (منافق)ەکان دەبینی لاشەی ئەوان تووشی سەرسوڕمانت دەکا، ئەگەر قسەش بکەن گوێ لە قسەکانیان ڕادەگری، چونکە زمان لووسن.**

**٦-بەردەوام بە چاوی تۆمەت دەڕواننە موسوڵمانان، هەر وتارێك و هەر پەندێکی ئایینییان گوێ لێبێ بە دژی خۆیانی دادەنێن،** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ﴾المنافقون: ٤، **هەر دەنگێك لە ئیسلامدا (منافق)ەکان گوێییان لێبێ، وا تێدەگەن لە دژی ئەوانە، ئەوان دوژمنی**

ڕاستەقینەی ئیسلامن، ئاگاداری خۆت بەو لێیان ئەمین مەبە.

**٧-بەردەوام فەرمان بە خراپە دەکەن و ڕێ لە چاکەو خواپەرستیی ڕاستەقینە دەگرن،** خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ﴾التوبة: ٦٧، **پیاوانی(منافق)و ئافرەتانی(منافق) هەر یەکەیان پارچەی یەکترین و لە یەك ڕیزی کافرەکانن و فەرمانی بە بێشەرعی و بێئەخلاقی دەکەن و ڕێگا لە چاکەو ڕەوشتی باش دەگرن.**

جا ئەی موسوڵمانی ڕێزدار: ئێستاش لە کوردستان و لە وڵاتەکانیتری ئیسلامدا چەند گرۆهێکی (منافق) هەنە، ئەو سیفەتانەو چەند سیفەتێکیتری (منافق)ەکانیان تێدانە، کەواتە: وا تێمەگە (مُنافق) هەر لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ هەبون و براونەوە، بەڵکو تا ئێستاش بەردەوام (منافق) هەنە، جا ئەگەر لە بەر درێژی باسەکە نەبوایە، زیاتر سیفەتەکانیتری (منافق)ەکانم دەنوسین، بەڵام ئەوەندە بەسە: بۆ ئەوەی موسوڵمان بیانناسێ و خۆیان لێبپارێزێ.

**جا بزانە:** به هۆی ئەو سیفەتانە (منافق)ەکان لە هەموو کافرەکان کافرترو پیسترن و زیانیان زۆرترە بۆ ئیسلام، بۆیێ خوایگەورە زیاتر ڕقی لێدەبنەوەو ناخۆشترین شوێنیشی لە دۆزەخدا بۆ داناون و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيراً﴾ النساء: ١٤٥، **بەڕاستی (مُنافق)ەکان لە نهۆمی هەرە خوارەوەی ئاگری(جَهَنَّم)دا سزا دەدرێن و هیچ یارمەتیدەرێکیشت بۆ ئەوان دەست ناکەوێ.**

**پێنجەم: دەرچوون لە فەرمانی کاربەدەست دەبێتە هۆی بەزین و شکانی لەشکر،** پێغەمبەرﷺ سەربازگەی داناو پشتی لە کێوی (أُحُد) بوو، ڕووی لە (مَدِينَة) بوو...هتد، ئەوەش بەڵگەیە: کە پێویستە سەرکردە هەر چەکدارێك لە شوێنی شیاوی خۆی دابنێ و هانی سوپایەکەی بدا: بە بێگەردیو بە ئازایانە جەنگ بکەن و ململانەو پەرتەوازەیی نەکەن، هەروەها شوێنێکی شیاویش بۆ لەشکرەکەی دابنێ و لە ڕووی سروشتیەوە قایم و پارێزراو بێ و بەرزاییەکان و ناو گەڵیەکان بخاتە ژێر دەستی خۆیی و زانستی پێویستیش بداتە جەنگاوەرەکان و بۆیان ڕوون بکاتەوە لە کاتی بچڕانی پەیوەندیدا ئەوان چۆن ڕەفتار بکەن. ئەوانەش هەموویان بەڵگەنە لە سەر لێهاتوویی و لێزانیی پێغەمبەری سەرکردەمانﷺ، کەوابوو: با موسوڵمانەکانیش دەرس لە هەڵەی تیرهاوێژەکان وەربگرن و لە فەرمانی سەرکردەیان دەرنەچن، چونکە (ابن سلُّول المُنافق) لەگەڵ سێسەد چەکداری (مُنافق) لە لەشکری موسوڵمانان دابڕاو گەڕاوە، بەڵام ئەو دابڕانەی ئەوان بە قەد هەڵەی تیرهاوێژەکان زیانی بۆ لەشکری ئیسلام نەبو.

باش بیر بکەوە، پێغەمبەرﷺ بە نوری پێغەمبەرایەتی ئەم ڕووداوەی دەهاتە بەرچاو، بۆیێ

فـەرمووی: ﴿ئەگـەر باڵنـدەكانیش بمـانڕفێنن، ئێـوە فریامـان مەكـەونو لـە شـوێنی خۆتان لامەكەون﴾. جا تا تیرهاوێژەكان گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبـەر بـونﷺ، لەشـكری ئیسلام هەر لە سەركەوتندا بوو، بەڵام كە ئەوان لە فەرمانی پێغەمبەرﷺ دەرچون، یەكسەر كافرەكان بە سەر موسوڵماناندا زاڵ بونو حەفتا كەسیان لێشەهید كردن.

بـەڵێ: ئەو هەڵەیەی تیرهاوێژەكان كردیان، هەموو ئەو سەركەوتنەی هەڵوەشـاندەوە: كـە موسوڵمانان لە سەرەتای جەنگەكەدا وەدەستیان هێنابوو، ئەوەش بووە هۆی دڵخۆشـبوونی كافرەكان، بەڵام بە هەر جۆرێك بـێ، نـابی ئێمـە زماندرێـژی بكەینـە سـەر ئـەو (صَـحابَة) ڕێزدارانەی (أُحُد)ﷺ، بەڵكو دەبی دەرس لە هەڵەی ئەوان وەربگرین، چونكە خوایگەورە ئەوانی عەفوی كردونو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُمْ بِإِذْنِهِ حَتَّـــى إِذا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي ٱلأَمْرِ وَعَصَيْتُمْ مِنْ بَعْدِ مَا أَرَاكُمْ مَا تُحِبُّونَ مِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِـــنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ ٱلآخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ وَلَقَدْ عَفَا عَنْكُمْ وَاللهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ آل عمران: ١٥٢، بەڕاستی خوای گەور وەعدەی خۆی هێنا جێ كە سەركەوتنی دانێ لەو كاتەی بە ئیزنی خوایگەورە كافرەكانتان دەكوشتنو بە شمشێرەكانتان ئـەوانتان ڕادەماڵین، ئەو سەركەوتنەش هەر بەردەوام بوو تا ئێوە ترسـانو ململانـەتان كـرد لـەبارەی مانـەوە لـە سـەر چیایەكە، ئێـوە لـە فـەرمانی پێغەمبـەری سـەركردەﷺ دەرچون پاش ئەوەی خوایگەورە ئەو سەركەوتنەی دابونێ كە پێتان خۆش بوو، هەندێك لە ئێوە دونیایان دەوێ بۆیێ لە چیایەكە دابەزین، هەندێكیش قیامـەتیان دەوێ: كە ئەو دە كەسانە بون لە سـەر چیایەكە مانـەوەو شـەهید كـران، ئینجا بـە هـۆی ئـەو تاوانـە خوایگـەورە ئێـوەی لـە كافرەكـان گـەڕاندەوەو كافرەكانیشی بـە سەر ئێوەدا زاڵ كردن تا ئێوە تاقی بكاتەوە، بەڕاستی خوا ئێوەی عـەفو كـرد لـەو تاوانە–ئەگەر نا: ئەو تاوانە شیاوی سزایەكی گەورەتر بوو– خوایگەورە خاوەنی نیعمەتە لە سەر ئیمانداران.

جا هەروەك خوایگەورە تیرهاوێژەكانی عەفو كردن، هەڵاتووەكانیشی عەفو كردن، هـەروەك لە دوای ئێرە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَـــدْ عَفَـــا اللهُ عَـــنْهُمْ﴾آل عمران: ١٥٥، بەڕاستی خوایگەور (صَحابَة)كانی (أُحُد)ی عـەفو كـردوە لـە تـاوانی هـەڵاتنیان لـە جـەنگ.

(تفسير ابن كثير) آل عمران: (١٥٢و١٥٥) و(سيرةالصلابي) ب(٢) ل(٨٦و٨٧و١٣٨و١٣٩).

## ﴿هەڵاتن لە كاتی جەنگدا حەرامەو گوناهێكی گەورەیە﴾

پێشەكی بزانە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:﴿لاَ تَتَمَنَّوْا لِقاءَ الْعَدُوِّ وَسَلُوا اللهَ الْعَافِيَةَ، فَـــإِذا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلالِ السُّيُوفِ﴾رواه الشيخان، خۆزگە مەكـەن ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە، لە خوا بپاڕێنەوە بێبەڵاتان بكا، جا هەر كاتێك گەیشتنە

**دوژمنەکانتان ئێوە خۆ ڕابگرن و بزانن: بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێرەکاندایە.**

**ئینجا بزانە: یەکەم جار واجب بوو: موسوڵمانان بەرامبەر دە ئەوەندەی خۆیان لە جەنگدا خۆ ڕابگرن، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ:** ﴿إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِأَتَيْنِ﴾ الأنفال: ٦٥، **ئەگەر لە ئێوە بیست کەسی خۆڕاگر هەبن، بە سەر دوو سەد کافردا زاڵ دەبن و سەردەکەون.**

**ئینجا خوایگەورە فەرمووی:** ﴿اَلْآنَ خَفَّفَ اللهُ عَنْكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفاً فَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِأَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِأَتَيْنِ﴾الأنفال: ٦٦، **ئێستا خوایگەورە ئەم بارەی لە ئێوە سوك کرد، ئەگەر لە ئێوە سەد کەسی خۆڕاگر هەبن، بە سەر دوو سەد کافردا سەردەکەون.**

**جا لە سەر ئەم ئایەتەی سوککردن، بڕیاریخوا جێگیر بوو و حەرامەو نابێ موسوڵمانەکان لە دوژمنێکی بە قەد دوو هەندی خۆیان هەڵبێن و مەیدان بەجێ بێڵن، چونکە موسوڵمان لە سەر** ﴿إِحْدَىالْحُسْنَيَيْن﴾ **جەنگ دەکا: کە (شەهیدبوونە، یان سەرکەوتنە)، کافریش تەنها بۆ وەدەستهێنانی دونیا جەنگ دەکا، جا خوایگەورە بۆیێ هەڵاتووەکانی غەزای (أُحُد)ی عەفو کردن، چونکە دوژمنەکەیان لە دوو هەندی خۆیان زیاتر بوو–بەڵکو لە سێ هەندی خۆیان زیاتر بوو– جا لەگەڵ ئەوەشدا خوایگەورە ڕەخنەی هەر لێگرتن و گلەیی لێکردن.**

**جا هەر وەك هەڵاتنی لەشکرەکە حەرامە، ئەوەهاش هەڵاتنی تاك تاکەی چەکدارەکانیش حەرامەو لە گوناهە گەورەکانە، خوایگەورە دەفەرموێ:** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفاً فَلا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ * وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاّ مُتَحَرِّفاً لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزاً إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾الأنفال: ١٥و١٦، **هۆ ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە هەر کاتێك گەیشتنە کافرەکان و لە جەنگدا لێك نزیك بونەوە، نەکەن ببەزن و پشت بدەنە کافرەکان، هەر کەسێك لە کاتی جەنگدا پشت بداتە کافرەکان و ببەزێ –تەنها بۆ فێڵێکی جەنگ نەبێ و بۆ لای کۆمەڵێکیفریاکەوتن نەبێ– بێگومان ئەو هەڵاتووە بە غەزەب و تووڕەیی خواوە دەگەڕێتەوە، شوێنەکەشی جەهەننەمەو خراپترین شوێنە.**

**هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿إِجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقاتِ...وَعَدَّ مِنْها: اَلتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ﴾ رواه الشيخان، **خۆتان بپارێزن لەو حەفت گوناهە گەورەو بەهیلاکەدەرانە: کە یەکێکیان: هەڵاتنە لە کاتی جەنگدا.** (تفسير القرطبي) الأنفال: (١٦و٦٥و٦٦) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٩) ل(٢٤٣).

**شەشەم: ترسان شەرمەزارییە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:** ﴿مَنْ يَأْخُذُ هَذَا السَّيْفَ بِحَقِّهِ؟﴾ **کێ ئەم شمشێرە بە مافیخۆی وەردەگرێ؟. بزانە: لە لایەکی ئەم شمشێرە نوسرابوو:**

**فِي الْجُبْنِ عارٌ وَفِي الْإِقْدامِ مَكْرُمَةٌ * وَالْمَرْءُ بِالْجُبْنِ لايَنْجُو مِنَ الْقَدَرِ**

له ترساندا شەرمەزارییەو له هەڵمەتبردندا ڕێزدارییه

مـرۆڤ به تـرسـان قـورتـار نـابێ له قـەزاو قـەدەر.

جـا حـەزرەتی (الزُّبَيْـر)ﷺ فەرموویـەتی: کـه پێغەمبـەرﷺ شمـشێرەکەی نـەدامێ و دایـه (أبىدُجانَة)، له دڵم گران بوو؟ چونکه من کوڕی (صَفِيَّة)ی پـوری پێغەمبـەرﷺ بـوم، جا گوتم: تەماشا دەکەم بزانم (أبُودُجانَة) چی دەکا؟ کاتێك دیتم پارچه پەڕۆکێکی سـوری لـه سـەری خـۆی بەسـتو (أنْـصار)ش گوتیـان: (أبُـودُجانَـة) پـەڕۆکی مردنـی دەرهێنـا. جا (أبُودُجانَة)ﷺ چووه مەیدانو دەیگوت:

أَنَا الَّذِى عاهَدَنِى خَـلِيلِى * وَنَـحْـنُ بِالسَّفْـحِ لَدَى الـنَّـخِـيلِ
أَلاَّ أَقُومَ الدَّهْرَ فِى الْكَيُّولِ * أَضْرِبُ بِسَيْفِ اللهِ وَالرَّسُولِﷺ

من ئەو کەسەم دۆستەکەم –پێغەمبەرﷺ– پەیمانی لەگەڵ بەستم، لەو کاتەی کە ئێمە لە بنەوەی کێوەکە لە لای دارخورمایەکان بوین: کە هیچ کاتێـك لـه دواوەی ڕیزەکـان جـەنگ نەکەم –بەڵکو هەر لە پێشەوە بم– بە شمشێری خواو پێغەمبەرﷺ لـه کافرەکـان بـدەم.

جا کـه ئەمـەی گـوت، هێرشـی کـردە سـەر کافرەکـانو هـەر کەسـێك ڕووبـەڕووی بوبـاوە دەیکوشت، کاتێ شمشێرەکەشی کۆل دەبوو بە بەرد تیژی دەکردەوە، تا وای لێهات وەکو داسوکه خوار بۆوە. ***بەڵێ: ئەوە مافی شمشێرەکەیە.***

جا حەزرەتی(كَعْب بن مالِك)ﷺ فەرموویەتی: من بریندار بوم و دیتم کافرێك کەلوپەلێکی تەواوی جەنگی دەبەر دابـوو و موسـوڵمانی کـۆ دەکردنـەوە سـەر یـەکتریو دەیگـوت: بـۆ سەربڕین کۆ ببنەوە، هەروەك بزنو مەڕ کۆ دەبنەوە. له ناکاو دیتم موسوڵمانێك خـۆی بـۆ ئامادە کردوە، هەر تەماشام کرد تا گەیشتنە یەکتری، موسوڵمانەکە شمشێرێکی لە شانی کافرەکە دا، گەیشتە لا قینگیو کردیە دوو لەت، جا گوتی: ئەی (كَعْب) چۆن دەبینی؟ من (أبُودُجانَة)م. ***بەڵێ: ئەوە مافی شمشێرەکەیە.***

هـەروەها حـەزرەتی(أبُـودُجانَـة) دیتنـی یـەکێك هـانی کافرەکـان دەدا بـۆ جـەنگکردن، جا (أبُودُجانَة) شمشێرەکەی هـەڵێنا لێیبـدا، ئـەویش قیڕانـدی، ئـەوجا زانـی ئەمـه ئافرەتـە– (هِنْد)ی ژنی(أبِىسُفْيان) بوو– جا حەزرەتی(أبُـودُجانَـة) فـەرمووی: ڕێـزم لـه شمـشێرەکەی پێغەمبەرﷺ نا: ئافرەتێکی پێبکوژم. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٣٦٦) و(السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٣٠٧).

**حەفتەم: پێویـستە غـەزا تـەنها بـە نیـەتی ڕێگـای خـوا بـێ،** پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: (**قُزْمان**) **دۆزەخییـه**. (قُزْمـان) پیـاوێکی ئـازاو بـەهێز بـوو، لـه غـەزای (أُحُـد) جـەنگێکی جوامێرانـەی دەکـردو بـه تـەنها هەشـت نـۆ کەسـی لـه کافرەکـان کوشـتن، پێغەمبـەرﷺ دەرهەقی وی فەرمووی: ﴿إِنَّهُ لَمِنْ أَهْلِ النَّارِ﴾ **بەڕاستی (قُزْمان) دۆزەخییە.**

ئینجا (قُزْمان) لەم جەنگەدا بریندار بوو و پەکی کەوت، جـا موسـوڵمانانیش پێیـان گـوت:

موژدەت لێبێ ئەمڕۆ جەنگێكی ئازات كرد، ئەویش گوتی: موژدەی چیم لێبێ؟ وَاللهِ من بۆ ناوبانگی گەلەكەم جەنگم كردوە، ئەگەر نا: جەنگم نەدەكرد! . جا كە برینەكەی ئازاری دا، خۆی ڕانەگرتو تیرێكی لە نێوان مەمكەكانی داناو خۆی بە سەردا داو خۆی كوشت، جا پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ گوتی: شاهیدی دەدەم تۆ پێغەمبەریﷺ، ئەو پیاوەی باست كرد بەخۆی خۆی كوشت. جا لە حەدیسێكیتری وێنەی ئەم حەدیسەدا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إِنَّ اللهَ يُؤَيِّدُ هَذا الدِّينَ بِالرَّجُلِ الْفاجِرِ﴾ رواه الشيخان، **خوایگەورە پشتگیری ئەم ئایینە دەكا بە پیاوی خراپ.**

(**الأُصَيْرِم**)ﷺ **بەهەشتییە**. (أُصَيْرِم) لە بنەماڵەی (عَبْدالأَشْهَل) بوو، هەر چەند هەوڵیان دا موسوڵمان نەدەبوو، جا كە خزمەكانی بۆ غەزای (أُحُد) ڕۆیشتن، ئیسلامەتیی هاتە ناو دڵو موسوڵمان بوو، ئینجا كەرستەی جەنگی لەخۆی بەستو سواری ئەسپەكەی بوو و ڕۆیشتە (أُحُد)، لەوێ هێرشی بردە ناو كۆمەڵی كافرەكانو جەنگی كرد تا بریندار بوو و پەكی كەوت، جا كە پیاوەكانی (عَبْدُالأَشْهَل) بە دوای شەهیدەكانیاندا دەگەڕان، دیتیان (أُصَيْرِم) لەوێ بە برینداری كەوتووە، گوتیان: (أُصَيْرِم) ئەوە چۆن هاتوی: بۆ یارمەتی گەلەكەت، یان موسوڵمان بوی؟ (أُصَيْرِم)ﷺ گوتی: من موسوڵمان بویمەو باوەڕم بە خواو پێغەمبەرﷺ هێناوە. جا هەر لە بەردەستیخزمەكانیدا بەو برینە گیانی دەرچوو.

جا كە ئەمەیان بۆ پێغەمبەرﷺ باس كرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إِنَّهُ لَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ﴾ رواه البيهقى، **بەڕاستی (الأُصَيْرِم) بەهەشتییە**. بۆیێ لەبارەی (الأُصَيْرِم)ﷺ دەگوترێ: (**پیاوێك هیچ نوێژێكی نەكردو چووە بەهەشت**)؟

هەروەها پێغەمبەرﷺدەرهەق (الأُصَيْرِم) فەرمووی: ﴿عَمِلَ قَلِيلاً وَأُجِرَ كَثِيراً﴾ رواه الشيخان، **كردەوەیەكی كەمی كردو پاداشتێكی زۆری درایێ**.

جا لێرەدا مەبەست ئەوەیە گشت كردەوەیەك بەگوێرەی نیەتی ناو دڵی مرۆڤە، واتە: ئەگەر بۆ بەرزكردنەوەیئیسلام جەنگ بكا، ئەوە—وەكو (الأُصَيْرِم)ﷺ— لە ڕێگای خوایەو خوایگەورە بە شەهیدی دادەنێو پاداشتی دەداتەوە، بەڵام ئەگەر—وەكو (قُزْمان)— بۆ دەمارگیریو ناوبانگی دونیا جەنگ بكا، ئەوە خوا لێیوەرناگرێو سزاشی دەدا. بڕوانە: (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٣٨٧و٣٨٨) و(فتح البارى) ب(٦) ل(٣٢).

**هەشتەم: داستانی هەندێك لە شەهیدەكانی (أُحُد)ﷺ:**

١-**ئیمام (حَمْزَة)**ﷺ، ئیمام (حَمْزَة)ﷺ مامیپێغەمبەرەﷺ، شێری خواو پێغەمبەرەﷺ، گەورەی شەهیدانە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿سَيِّدُ الشُّهَداءِ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ الْقِيامَةِ حَمْزَةُ﴾ رواه الحاكم وصححه، **گەورەی شەهیدان لە لای خوا لە ڕۆژی قیامەت (حَمْزَة)یە.**

(وَحْشِي)ی بكوژی ئیمام (حَمْزَة)ﷺ دەڵێ: من غولامی (جُبَيْر) بوم، (حَمْزَة)ش لە غەزای

**(بَدْر) مامی (جُبَیْر)ی كوشتبوو، جا (جُبَیْر) پێی گوتم: ئەگەر لە تۆڵەی مامم (حَمْزَة) بكوژی ئازادت دەكەم. جا لە جەنگی (أُحُد) هەردوو لەشكرەكان گەیشتنە یەكتری، منیش بە دوای (حَمْزَة)دا دەگەڕام، دیتم (حَمْزَة) وەك نێرە وشتر بە شمشێرەكەی خەڵكی بە سەر یەكدا دەداو هیچ شتێك خۆی بۆ ڕانەدەگرت، منیش لە پەنای بەردو درەختێ خۆم بۆ ئامادە دەكرد، لە ناكاو (سِباع) بۆی هاتە پێش، جا (حَمْزَة)ش پێی گوت: (هَلُمَّ إِلَيَّ يا ابْنَ مُقَطِّعَةِ الْبُظُورِ) وەرە لایمن ئەی كوڕی ئەو ئافرەتەی ئافرەتان سوننەت دەكا.**

**جا (حَمْزَة) شمشێرێكی لێداو كوشتی.** ***بزانە: بەم كافرەوە سی و یەك كافر بە دەستی ئیمامی (حَمْزَة)ﷺ كوژراون، واتە: لە هەموو غەزایەكاندا.***

**جا لەم حاڵەتەدا (وَحْشِي) ڕمەكەی خۆی بۆ ئیمام (حَمْزَة)ﷺ هاویشتو لە بن ناوكی دا و لە نێوان هەردوو پێیەكانی هاتە دەر، جا ئیمام (حَمْزَة)ﷺ ویستی هێرش بكاتە سەر (وَحْشِي)، بەڵام بەربۆوەو شەهید بوو، جا (وَحْشِي) ڕمەكەی لە لاشەی ئیمام (حَمْزَة) دەرهێناو گەڕاوە سەربازگە، جا (هِنْد)ی ژنی (أَبِيسُفْيان)ش لە خۆشیان گوارەو ملوانەكەو خلْخاڵی خۆی دانە (وَحْشِي).**

**ئینجا (هِنْد)و ئافرەتەكانیتری كافرەكان هاتن گوێو دەمو لوتی شەهیدەكانیان دەبڕینو وەك ملوانكە بە ملی خۆیانەوە دەكردن، بەڵام (هِنْد) بەوەش نەوەستا، بەڵكو زگی ئیمام (حَمْزَة)یﷺ هەڵدڕیو جەرگی دەرهێناو پارچەیەكی لێخوارد، بەڵام پێی قوت نەدرا.**

**جا (وَحْشِي) دەڵێ: كە گەڕامەو (مَكَّة)، ئازاد كرامو هەر لە (مَكَّة) مامەوە تا پێغەمبەرﷺ (مَكَّة)ی ئازاد كرد، جا منیش هەڵاتمو چومە (طائِف)، لەوێ مامەوە تا وەفدی (طائِف) چونە لای پێغەمبەرﷺ موسوڵمان بون، جا منیش دونیام لێتەنگ بوو، تا پیاوێك پێی گوتم: ماڵوێران، هەر كەسێك موسوڵمان ببێ، پێغەمبەرﷺ نایكوژێ. جا منیش لەگەڵ وەفدەكە ڕۆیشتمو لە خزمەت پێغەمبەرﷺ شادەم هێناو موسوڵمان بوم، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تۆ (وَحْشی)ی؟ لە (رِوايَة)یەكیتردا: بە پێغەمبەریانﷺ گوت: ئەمە (وَحْشِي)یە! جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وازی لێبێنن، موسوڵمانبوونی پیاوێكم پێخۆشترە لە كوشتنی هەزار كافر–جا (وَحْشِي) باسی كوشتنی ئیمام (حَمْزَة)ی بۆ پێغەمبەرﷺ باس كرد، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُغَيِّبَ وَجْهَكَ عَنِّي؟﴾ ئایا دەتوانی ڕووی خۆت لە من بشاریەوەو نەتبینم؟.**

**جا (وَحْشِي) دەڵێ: هیچیتر خۆم نیشانی پێغەمبەرﷺ نەدا، تا وەفاتی كرد، ئینجا كە (صَحابَة)كانﷺ بۆ جەنگی (مُسَيْلَمَةُ الْكَذّاب) ڕۆیشتن، منیش لەگەڵیاندا چومو لە گەرمەی جەنگدا (مُسَيْلَمَة)م بینی شمشێرێكی بە دەستەوەیە، منیش ڕمێكم بۆ هاویشت لە نێوان مەمكەكانیم دا و لە پشتی دەرچوو، (صَحابَة)یەكی (أنصاری)ش–ناوی (عبدالله بن زَیْد)**

بووﷺ—وەكو من خۆی بۆ ئامادە كردبوو، ئەویش شمشێرێكی لە سەری دا، جا یەكێك هاواری كردو گوتی: كۆیلە ڕەشەكە كوشتی!. ئیتر خوا دەزانی كامەمان كوشتویەتی: ئەگەر من كوشتبم، ئەوە خراپترین كەسم كوشتووە، هەروەك چاكترین كەسیشم كوشتبوو، واتە: جگە لە پێغەمبەرﷺ.

ئینجا لە دوای كۆتایی جەنگ پێغەمبەرﷺ لە ناو شەهیدەكاندا دەگەڕا، كە دیتی ئیمام (حَمْزَة)ﷺ هەتك كراوەو زگی هەڵدڕاوە، زۆر دڵتەنگ بوو و فەرمووی: ئەگەر لە بەر ئەوە نەبێ لە دوای من ببێتە كردارێكی بەردەوام، وازم لێدەهینا—نەمدەناشت—تاكو خوایگەورە لە زگی دڕندەو باڵندەكاندا زیندووی بكاتەوە...جا پێغەمبەرﷺ سوێندی خواردو فەرمووی: ئەگەر منیش دەسەلاتم بە سەر كافرەكاندا ببێ، لە تۆڵەی (حَمْزَة) حەفتا پیاو لەوان هەتك دەكەم. ئینجا لە دوای ناشتنی شەهیدەكان، خوایگەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَإِنْ عاقَبْتُمْ فَعاقِبُوا بِمِثْلِ ما عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصّابِرِينَ﴾ **ئەگەر دوژمنەكانتان سزا دان، بە وێنەی ستەمەكەیان سزایان بدەن، وە ئەگەر ئارام بگرن و سزایان نەدەن، ئەوە باشترە بۆ ئارامگرەكان.** جا بە هۆی ئەم ئایەتە پێغەمبەرﷺ ئارامی گرت و هەتككردنی كوژراوەكانی قەدەغە كرد.

جا كە پێغەمبەرﷺ لە (أُحُد) گەڕاوە (مَدِينَة)، گوێی لێبوو ئافرەتانی (أَنْصار) بۆ شەهیدەكانیان دەگریێن، جا ئەویش فرمێسكی بە چاوەكاندا هاتنە خوارەوەو فەرمووی: ﴿لِكِنَّ حَمْزَة لا بَوَاكِيَ لَهُ﴾ **بەڵام (حَمْزَة) چ ئافرەتی نینە بۆی بگرییێن!.**

جا حەزرەتی(سَعْد بن مُعاذ)و حەزرەتی(أُسَيْد بن حُضَيْر)رضي الله عنهما فەرمانیان بە ئافرەتەكانی خۆیان كرد: بڕۆنە ماڵی پێغەمبەرﷺ بۆ (حَمْزَة)ی مامی پێغەمبەرﷺ بگریێن. جا ئافرەتەكانی (أنْصار) هاتن و بۆ ئیمام (حَمْزَة)ﷺ گریان، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿مُرُوهُنَّ فَلْيَنْقَلِبْنَ وَلاَ يَبْكِينَ عَلى هَالِكٍ بَعْدَ الْيَوْمِ﴾ حديث صحيح رواه ابن ماجه، **فەرمانیان پێبكەن با بڕۆنەوە ماڵەكانیخۆیان و لەمڕۆ بەولاوە هیچیتر بە دەنگ لە سەر هیچ مردوویێك نەگرییێن.** واتە: لەم ڕۆژەوە گریانی بە دەنگ لە سەر مردوو، حەرام كرا. (تفسير القرطبي) النحل: (١٢٦) و(البداية والنهاية) ب(٢) ل(٣٦٧و٣٦٨و٣٨٩و٤٠٠) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٤٥٩—٤٦٤).

**٢-حەزرەتی( حَنْظَلَة )ی تازە زاواﷺ**، (حَنْظَلَة) كوڕی (أَبُوعامِر الرّاهِب)=(الْفاسِق) بوو—كە هاندەری (مَسْجِدُالضِّرار) بوو و لەم غەزایەشدا بۆ یارمەتیدانی كافرەكان هاتبوو— جا كە حەزرەتی(حَنْظَلَة) شەهید بوو، (أَبُوعامِر)ی باوكی هات بە پێیخۆی لە سینگی حەزرەتی (حَنْظَلَة) دەدا و دەیگوت: پێم گوتی خۆت بە كوشتن مەدە!.

حەزرەتی(حَنْظَلَة)ﷺ پێی دەگوترێ: (**غَسِيل الْمَلائِكَة**) شۆردراوی (مَلائِكَة). چونكە بۆ شەوی یەكەمی زاوایەتی مۆڵەتی لە پێغەمبەرﷺ وەگرت و گەڕاوە لای بوكێ و لێی بووە

زاوا، واتە: تەنها ئەم شەوە لەگەڵ بوكێدا بـوو، ئینجا لـە دوای نوێـژی سـبەینێ جـارێكیتر حەزرەتی (حَنْظَلَة) لە ژنەكەی توشی جەنابەت بۆوەو لە ناكاو بانگەوازیی دەرچوون كرا بـۆ (أُحُد)، بۆیێ ئەم جارە فریا نەكەوت غوسل بكاو بە پەلە ڕۆیشتە (أُحُد)، جا كە جەنگ گەرم بوو، حەزرەتی(حَنْظَلَة) هەڵمەتی بردە سەر (أبُوسُفْیان)ی سەركردەی لەشكری كافرەكانو لە سەر ئەسپەكەی فڕێیدا خوارەوەو ویستی سەری ببڕێ، بەڵام (شَدّاد بن الأسْوَد) هەڵمـەتی هێنا سەر حەزرەتی(حَنْظَلَة)و شەهیدی كردو (أبُوسُفْیان)شی قورتار كرد.

جا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ﴿إنَّ صَاحِبَكُمْ –يَعْنِي حَنْظَلَةَ– لَتُغَسِّلُهُ الْمَلائِكَةُ﴾ **هاوڕێكـەتان –(حَنْظَلَة)– وا (مَلائِكَة) دەیشۆن!**. جا پرسیاریان لە ژنەكەی حەزرەتی(حَنْظَلَة) كرد–كە لە شەوەكەی دەرچوونی بۆ غەزای (أُحُد) بۆی بە بـوك هـاتبوو–؟ ژنەكەشـی وەڵامـی داوەو گوتی: كە بانگەوازیی غەزا كرا، وێرانەگەیـشت خـۆی بـشواو بـە لەشـیجەنابەتەوە ڕۆیـشتە غەزا. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لِذَلِكَ غَسَّلَتْهُ الْمَلائِكَةُ﴾ **بۆیێ (مَلائِكَة) شوشتیان**.

حەزرەتی(أبُوسَعِیدُالسّاعِدِي) فەرموویەتی: دیتمان سەری (حَنْظَلَة) ئاوی لێدەچكاوە. جـا لەم (جِماع)ەی شەوی زاوایەتی، ژنەكەی حەزرەتی(حَنْظَلَة) كوڕپەیەكی وەزگ كـەوت، جـا كە لە دایك بوو، ناویان لێنا: (عبدالله).

**جا ئەم حەدیسە بەڵگەیە: كە شەهید نابێ بشۆرێ هەرچەند جەنابەتداریش بێ**، واتە: شوشتنی (مَلائِكَة) لێرەدا بۆ ڕێزلێنان بوو، نەك لە بەر داوكاری شەرع. (البداية والنهاية ب(٢) ل(٣٧٠) و(السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٣٢٧و ٣٢٨).

**٣- حەزرەتی( مُصْعَب بن عُمَیْر )**رضي الله عنه، لەو كاتەی كافرەكان هێرشیان هێنا سەر پێغەمبـەرﷺ برینداریان كرد، حەزرەتی(مُصْعَب)رضي الله عنه بەرگریی لە پێغەمبەرﷺ دەكردو ئاڵاشی هەر بە دەستەوە بوو، جا (عَبْدُالله بن قَمْئَة)-لعنه الله- شمشێرێكی لـە دەسـتی ڕاسـتەی دا و دەسـتی لێكردەوە، ئینجا حەزرەتی(مُصْعَب)رضي الله عنه بە دەستیچەپەی ئاڵایەكەی بـەرز كـردەوە، جـا (ابن قَمْئَة)-لعنه الله- دەسـتی چەپەشـی لێكـردەوە، جـا حـەزرەتی(مُـصْعَب)رضي الله عنه بـە هـەردوو قۆڵـەكانی ئاڵایەكـەی بـە سـینگی خۆیـەوە نوسـاندو هـەر بـەرزی كـردەوە، جـا (أُبَـيٍّ بـن خَلَـف)ش-لعنه الله- هـات لێـی دا و شـەهیدی كـردو ئاڵایەكـە بـەربۆوە، جـا پێغەمبـەرﷺ ئاڵایەكەی دایـە دەسـت ئیمـام (عَلِـي)رضي الله عنه، جـا (ابـن قَمْئَـة) وا تێگەیـشت پێغەمبـەریﷺ كوشتووە، بۆیێ هاواری كردو گوتی: (مُحَمَّد)م كوشـت. جـا ئـەم هەواڵـە درۆیـە زۆر كـاری كردە سەر ورەی موسوڵمانانو زیاتر سەریان لێشێوا.

حەزرەتی(مُصْعَب)رضي الله عنه پێش كۆچكردنی بە فەرمانی پێغەمبەرﷺ چـووە (مَدینَـة)و لـەوێ بووە مامۆسـتای موسـوڵمانان، هـەم یەكـەم كـەس بـوو: كـە یەكـەم نوێـژی (جُمُعَـة)ی لـە ئیسلامدا بە موسوڵمانانی(مَدِينَة) كرد.

حەزرەتی(مُصْعَب)رضي الله عنه پێش موسوڵمانبوونی جوانترینو دەوڵەمەنترین گەنجی (مَكّة) بـوو،

جوانترین‌و بۆنخۆشترین جل‌و بەرگی دەبەر دەکرد، جا کە موسولمان بوو، ئەو هەموو خۆشی‌و دەولەمەندی‌یەی واز لێهێناو لە ڕێگای ئایینی‌خوا توشی دەربەدەری‌و ناخۆشی‌و هەژاری بوو، بە جۆرێکی وەها: کە لە غەزای (أُحُد) شەهید بوو، تەنها پەشتەماڵێکی هەبوو تێیدا کفن بکرێ، پەشتەماڵەکەش بەشی هەموو لاشەی نەدەکرد، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿غُطُّوا بِهَا رَأْسَهُ وَاجْعَلُوا عَلَى رِجْلَيْهِ الإِذْخِرَ﴾ رواه الشيخان، **لای سەری بە پەشتەماڵەکە داپۆشن‌و گیای (ئیزخیر)ش لە سەر پێیەکانی دابنێن‌و پێی کفن بکەن.** (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٣٦٩و٣٨٤) و(السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٣٣٦و٣٤٤).

**٤- حەزرەتی( أَنَس بن النَّضْر )ﷺ** — مامی حەزرەتی(أَنَس)ی خزمەتکاری پێغەمبەرەﷺ — حەزرەتی(أَنَس بن النَّضْر)ﷺ لە غەزای (بَدْر) ئامادە نەبووبوو، بۆیێ زۆر خەفەتبار بوو و دەیگوت: ئەگەر خوایگەورە لە غەزایەکی‌تر ئامادەم بکا، خوا دەمبینێ چی دەکەم!.

جا کە لە غەزای (أُحُد) جەنگ دەستی پێکردو موسولمانەکان هەندێکیان لە جەنگ هەلاتن، حەزرەتی(أَنَس)ﷺ فەرمووی: (**اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعْتَذِرُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ هَؤُلاءِ –يَعْنِي الْمُسْلِمِينَ– وَأَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ هَؤُلاءِ، يَعْنِي الْمُشْرِكِينَ**) **خودایە من عوزر دێنمەوە لە لای تۆ لەو هەلاتنەی ئەو موسولمانانە کردیان، هەم بەریمە لەو ڕەفتارە خراپەی کافرەکان کردیان.**

ئینجا حەزرەتی(أنس)ﷺ بەرەو پێشەوە هەلمەتی بردو گەیشتە حەزرەتی(سَعْد بن مُعاذ)و پێی گوت: (**يَا سَعْدُ إِنِّ أَجِدُ رِيحَ الْجَنَّةِ دُونَ أُحُدٍ**) رواه الشيخان، **هۆ (سَعْد) من لە لای کێوی (أُحُد) بۆنی بەهەشتم بۆ دێ.** جا حەزرەتی(سَعْد) دەفەرموێ: من توانام نەبو ئەو جەنگەی (أَنَس) کردی من بیکەم، ئینجا شەهید بوو، جا کە جەنازەکەیان دیتەوە، زیاتر لە هەشتا برین لە لاشەی‌دا بوو: برینی شمشێرو ڕم‌و تیر، جا لە بەر زۆری برینەکان هیچ کەسێك نەیناسیەوە، تەنها (الرُّبَيْع)ی خوشکی‌خۆی بە پەنجەکانی ناسییەوە.

جا خوایگەورە لەبارەی حەزرەتی(أَنَس)و شەهیدەکانی‌تری (أُحُد) ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً﴾ الأحزاب: ٢٣، والحديث رواه الشيخان، **لە ئیمانداران هەندێك پیاو هەنە: بەڕاستی ئەو پەیمانەیان هێنا جێ کە دابویانە خوایگەورە: لە ڕێگای وی غەزا بکەن، جا هەندێك لەو پیاوانە پەیمانەکەیان تەواو کردو شەهید بون، هەندێکیش چاوەڕوانی شەهیدبوون دەکەن‌و پەیمانەکەیان بە هیچ شێوەیەك نەگۆڕی.** (فتح الباری) ب(٧) ل(٤٤٣).

**٥-( صَحابَة )یەکی شەلە، ناوی ( عَمْرو بن الْجَمُوح ) بووﷺ**، لە دوای چل ساڵ لە گۆڕەکەی دەرهێندراو دەستی لە سەر برینکەی بوو و خوێنی لێدەهات، هەروەك باسمان کرد.

حەزرەتی(عَمْرو)ﷺ زۆر دەشەلی، چوار کوڕی زۆر ئازای هەبون‌و ڕێگایان نەدایێ لەگەلیان

بێتـه غـەزای (أُحُـد)، جـا ئـەویش لـە لای پێغەمبـەرﷺ شـكایەتی لێكـردن‌و فـەرمووی: كوڕەكانم ڕێگام نادەن لەگەڵ تۆ بێمە غەزا، وَاللّٰهِ من دەمـەوێ بـەم شـەلینەم پـێم لـە نـاو بەهەشت دابنێم!. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **﴿خوایگەورە عوزری داویی‌و غـەزا لـە سەر تۆ واجب نیـە﴾**. به كوڕەكانیـشی فـەرموو: **﴿ئێـوە هیـچتان لـە سـەر نیـە ئەگـەر قەدەغەی نەكەن، ڕەجام وایە خوا شەهیدیی بداتێ﴾**.

ئینجا حەزرەتی(عَمْرو)ﷺ ڕۆیشتە (أُحُد)و لەوێ شەهید بوو، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لَقَدْ رَأَيْتُهُ يَطَأُ الْجَنَّةَ بِعَرْجَتِـــهِ﴾ **من (عَمْرو)م دیت به شەلینەوە پـێی لـە بەهەشـت دادەنا**. له حەدیسێكیتردا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿فَإِنِّي أَرَاكَ تَمْـــشِي بِرِجْلِـــكَ هَـــذِهِ صَحِيحَةً فِي الْجَنَّةِ﴾ **من دەتبینم بەم پێیە شەلەیەت بە ساغی لە بەهەشتدا دەڕۆی**.

واتە: یەكەم جار لە سەر داواكاریخۆی بە شەلەیی چووە بەهەشت، ئینجا پێیەكەی چاك دەبێتەوەو بە ساغی لە بەهەشتدا دەڕوا؟ چونكە نابی بەهەشـت نەخۆشـی تـێدا بـێ، والله أعلم. (السیرةالحلبیة) ب(٢) ل(٣٢٨و٣٢٩).

**نۆیەم: دەنگۆی ئەوە بڵاو بۆوە: كە پێغەمبەرﷺ كوژراوە**. بەم دەنگۆیە ورەی موسوڵمانان دابەزیو سەریان لێشێوا، تا وای لێهات، هەندێك گوتیان: تازە بۆچی جەنگ دەكەن؟ خـۆ پێغەمبـەرﷺ كـوژرا، كـەوابوو: بگەڕێنـەوە لای خـزم‌و كەسـەكانتان تـاكو بتانپـارێزن!. هەندێكیش گوتیان: با خۆمان بدەینە دەسـت كافرەكـان!. بـەڵام لـە بەرامبـەر ئەوانیـشدا كۆمـەڵێكیتر گوتیـان: ئەگـەر پێغەمبـەرﷺ كـوژرا بـێ، خوایگـەورە زینـدووەو نـامرێ، كەوابوو: ئێوەش لـە سـەر ڕێبـازی ئایینیخۆتـان‌و پێغەمبەرەكـەتانﷺ جـەنگ بكـەن تـا شەهید دەبن –لە (روایَة)ێكدا–خوا سەركەوتنتان دەداتێ– لە (روایَة)ێكدا:–(مُـصْعَب)ﷺ پێش ئەوەی گیـانی دەرچـێ گـوێی لێبـوو دەیـانگوت: (مُحَمَّـد)ﷺ كـوژرا. جـا ئـەویش فەرمووی: (مُحَمَّد)ﷺ هەر پێغەمبەرە، لە پێش ئەویش پێغەمبەرانیتر مردون.

ئینجا خوایگەورە لە سەر زمانی ئەم كۆمەڵە (صَحابَة)یـە ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللهَ شَيْئاً وَسَيَجْزِي اللهُ الـــشَّاكِرِينَ﴾آل عمران (١٤٤)، **(مُحَمَّـد)ﷺ هـەر پێغەمبەرێكـە پـێش ئـەویش چـەندەها پێغەمبـەریتر نـەماون: یـا مـردون، یـان كوژراون –چونكە هـەر هـەموویان ئـادەمیزادن– جـا ئەگـەر (مُحَمَّـد)ﷺ بمـرێ، یـان بـە دەسـتی كافرەكـان بكـوژرێ، ئایـا ئێـوە لـە ئایینیئیـسلام پاشـگەز دەبنـەوە؟ هـەر كەسێك لە ئایینیخۆی پاشگەز ببێتـەوە، ئـەوە هـیچ زیانێك لـە خـوا نـادا، بێگومـان خوایگەورە پاداشتی شوكركاران دەداتەوە: كە لە سەر ئایینیخۆیان دەمێننەوە**.

جا ئەی موسوڵمانی خۆشەویست، ئەم ئایەتـە ڕەخنەیەكـە لـەو موسـوڵمانانەی لـە غـەزای

(أُحُد) ورەیان دابەزی، هەم ڕاهێنانێکیشە بۆ دوای وەفاتیپێغەمبەرﷺ، واتە: ئێوە ئەی موسوڵمانان بیروباوەڕو خواپەرستنتان بە مانو نەمانی پێغەمبەرەوەﷺ مەبەستنەوە، چونکە پێغەمبەرﷺ ئادەمیزادێکی پێغەمبەرەو کارێکی گرنگی پێسپێردراوە–کە گەیاندنی ئایینیئیسلامە–جا کە ئەو کارە گرنگەی ئەنجام دا لە ناو ئێوەدا نامێنی، ئەویش وەك پێغەمبەرەکانی ڕابردوو-علیهم الصلاة والسلام- یان دەمرێ، یان دەکوژرێ، بەڵام خاوەنی ئەم ئایینە خوایگەورەیەو هەرگیز نامرێ، کەوابوو: ئێوە باوەڕتان وەهابێ: تەنها خودا شیاوی پەرستنەو ئایینیخۆتان تەنها بۆ خوا ئەنجام بدەنو لە کاتی مانی پێغەمبەرو نەمانی پێغەمبەرﷺ لە ئەنجامدانی ئایینەکەتان شوێن پێغەمبەرﷺ بکەون، چونکە ئەو ڕێبازەکەی بۆ ئێوە ڕوون کردۆتەوە.

**بەڵێ**: بە مردنیپێغەمبەرﷺ ئایینیئیسلام نامرێو ئەو ڕێبازەش کە غەزایەو پێغەمبەرﷺ بۆی داناوین، هەر بەردەوامەو هیچ کاتێك لە کار ناکەوێ، کەواتە: مردنو کوژرانی هیچ سەرکردەیەکیئیسلامیش نابێ کار لە بەرنامەیئیسلام بکا.

بەڵام (صَحابَة)ﷺ ئەوەندە پێغەمبەریانﷺ خۆش دەویا: هیچ کاتێك بە سەر دڵیاندا نەدەهات ڕۆژێك دابێ پێغەمبەرﷺ لە ناویاندا نەمێنێ، بۆیە کە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، ئیمام (عُمر)ﷺ باوەڕی نەدەکرد–بەڵکو دەیفەرموو: نەمردوە– تا ئیمام (أَبُوبَکْر)ﷺ هاتە ناو (صَحابَة)کانوﷺ کۆی کردنەوەو فەرمووی: ﴿مَنْ كانَ مِنْكُمْ يَعْبُدُ مُحَمَّداًﷺ فَإِنَّ مُحَمَّداً قَدْ ماتَ، وَمَنْ كانَ مِنْكُمْ يَعْبُدُ اللهَ فَإِنَّ اللهَ حَيٌّ لا يَمُوتُ﴾ رواه البخاري، **هەر کەسێك لە ئێوە (مُحَمَّد)ﷺ دەپەرستێ، ئەوە (مُحَمَّد)ﷺ مرد، هەر کەسێکیش خوا دەپەرستێ بێگومان خوا زیندووەو نامرێ.** ئینجا ئایەتەکەیڕابردووی بۆ (صَحابَة)کان خوێندەوە، ئیتر ئایەتەکە بووە ویردی سەر زمانی (صَحابَة)کانﷺ، وەك نەیانزانیبێ ئەم ئایەتە خوا پێشتر ناردبێتی، جا ئیمام (عُمر)ﷺ فەرمووی: وَاللهِ هەر ئەوەندە بوو گوێم لە ئیمام (أَبُوبَکْر) بوو: ئایەتەکەی خوێندەوە، باوەڕم کرد پێغەمبەرﷺ وەفاتی کردوە، بۆیێ سەرسام بومو خۆم بۆ نەگیراو لە پێوە بەربومەوە سەر زەوی. ئەمە بوو: ئیمانی ئیمام (أَبُوبَکْر)ﷺ، کە لە ئەزمونی غەزای (أُحُد)و لە واتەی ئایەتەکە ڕاهاتبوو و لە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ بەجێی هێنا. (السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٣٠٩و٣٤٤) و(سيرة الصلابي) ب(٢) ل(١٤٢–١٤٥).

**دەیەم: (مَلائِکَة) بەرگرییان لە پێغەمبەرﷺ دەکرد.** لەم کاتە تەنگەدا کە تەنها دوانزە (صَحابَة) لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ مابونەوە–لە (روايَة)ێکدا: یانزە (صَحابَة) مابونەوە، پێغەمبەرﷺ دوانزەمین بوو– جا لەو دوانزانەش حەفت (صَحابَة)ی (أنصاري)ﷺ بە دوای یەکدا شەهید بون، ئینجا حەزرەتی(مُصْعَب)شﷺ شەهید بوو و ئیمام (علي)ﷺ ئاڵایەکەی هەڵگرت!، ئەدی کێ لەوێ مابۆوە بەرگری لە پێغەمبەرﷺ بکا؟ ئەوە

(أبُوعُثمان) فەرموویەتی: ﴿لَمْ يَبْقَ مَعَ النَّبِيِّﷺ فِي بَعْضِ تِلْكَ الْأَيَام الَّتِي يُقاتِلُ فِيهِنَّ غَيْرُ طَلْحَةَ وَسَعْدٍ﴾ رواه البخاري، **جگە لە (طَلْحَة بن عُبَيْدِالله)و (سَعْد بن أبِيوَقّاص) کەسیتر لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ نەما بەرگری لیٚبکا.**

**ماشاءالله، حەزرەتی(طَلْحَة)شﷺ بریندار بوو و دەستیشی لە کار کەوت، جا حەزرەتی (سَعْد)ﷺ بە تەنها چی بکا؟! واتیر وەکو باران دەبارن و کافرەکانیش هەر نزیك دەبنەوەو گەیشتنە پێغەمبەروﷺ لێیان دا و برینداریان کرد، ئەدی بۆچی گەڕانەوەو پێغەمبەریانﷺ نەکوشت؟! خۆ ئەو سی کەسەی لە دوایێدا کۆ بونەوە، ئەوانیش نەیاندەتوانی ئەو هێزە زۆرە بگەڕێننەوە، حەزرەتی(سَعْد بن أبِيوَقّاص)ﷺ وەلامماندەداتەوەو دەفەرموێ:** ﴿رَأَيْتُ رَسُولَ اللهﷺ يَوْمَ أُحُدٍ وَمَعَهُ رَجُلانِ يُقاتِلانِ عَنْهُ عَلَيْهِما ثِيابٌ بِيضٌ كَأَشَدِّ الْقِتالِ ما رَأَيْتُهُما قَبْلُ وَلا بَعْدُ. يَعْنِي جِبْرِيلَ وَمِيكائِيلَ عليهما السلام﴾ رواه الشيخان، **من لە ڕۆژی غەزای (أُحُد) پێغەمبەرمﷺ دیت دوو پیاوی لەگەڵدا بوون بەرگرییان لیٚدەکرد، جلی سپییان لەبەردا بوو، جەنگێکی دژواریان دەکرد، نە پێشترو نە دواتر ئەم دوو پیاوانەم نەدیتون، واتە: (جُبْرائِیل)و (مِیکائِیل) بون** عليهما السلام.

**بەڵێ: خوایگەورە بە لەشکریخۆی پێغەمبەریخۆیﷺ دەپارێزێو نابێ ئەو کافرە ڕوو ڕەشانەش بە کوشتنی پێغەمبەروﷺ دڵخۆش بن، هێشتاش پێغەمبەروﷺ کارییتری گرنگی ماوەو ڕاگەیاندنییتری شەریعەتی ماوەو خوایگەورە دەیپارێزێ.**

**پرسیار: بۆ چی لە غەزای (بَدْر) خوایگەورە(مَلائِكَة)ی ناردن بۆ یارمەتیدانی (صَحابَة)کان، بەلام لە غەزای (أُحُد) تەنها بۆ بەرگرییکردن لە پێغەمبەروﷺ خوایگەورە (مَلائِكَة)ی ناردن، واتە: بۆ یارمەتیدانی (صَحابَة)کانﷺ نەیناردن؟**

**وەلام: لەم غەزایەشدا خوایگەورە وەعدەی دابوو: (مَلائِكَة) بنێرێ، جا لە بەر ئەوەی پێغەمبەروﷺ لە مەیدانی جەنگدا خۆی ڕاگرتو هەڵنەهات، خوایگەورە (مَلائِكَة)ی ناردن بەرگری لەوی بکەن، بەلام چونکە هەندێك لە موسوڵمانەکان فەرمانی پێغەمبەریانﷺ بەجێ نەهێناو هەندێکیش لە مەیدانی جەنگدا خۆیان ڕانەگرت، بۆیێ خوایگەورە وەعدەکەی خۆی ڕاگرتو (مَلائِكَة)ی نەناردن، هەوەك خوایگەورە بەخۆی دەفەرموێ:** ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَنْ يَكْفِيَكُمْ أَنْ يُمِدَّكُمْ رَبُّكُمْ بِثَلاثَةِ آلافٍ مِنَ الْمَلائِكَةِ مُنْزَلِينَ * بَلَى إِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُمْ مِنْ فَوْرِهِمْ هَذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُمْ بِخَمْسَةِ آلافٍ مِنَ الْمَلائِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾ آل عمران: ١٢٤و١٢٥، **ئەی پێغەمبەروﷺ کاتی بە (صَحابَة)کانت دەڵێی: ئایا بەستان نیە خوایگەورە سێ هەزار (مَلائِكَة) بنێرێتە خوارەوە بۆ یارمەتیدانتان؟ بەڵێ: ئەگەر ئێوە خۆڕاگر بن و لە خوا بترسێن و گوێڕایەڵ بن و کافرەکانیش بە ڕق و قینەیانەوە یەکسەر هێرشتان بۆ بێنن، ئەوە خوایگەورە زیاتریش دەکاو پێنج هەزار**

(مَلائِكَة)ى نیشانەدار دەنێرێ بۆ یارمەتیدانتان. واتـە: بـەڵام خوایگـەورە: پێـنج هەزاری نەناردن‌و سێ هەزاریشی نەناردن، چونکە ئێوە-ئەی (صَحابَة)کان- فەرمانی خواو پێغەمبەرتانﷺ بەجێ نەهێناوخۆتان ڕانەگرت.

ئینجا کە پێغەمبەرﷺ ڕووی موبارکی بریندار کراو ددانە پیرۆزەکەشی شـکێندرا، خـوێنی لێدەهاتە خوارەوەو دەیسڕیەوەو دەیفەرموو: ﴿كَيْفَ يُفْلِحُ قَـوْمٌ شَـجُّوا نَبِـيَّهُمْ؟﴾ رواه الشيخان، زاد مسلم: ﴿وَكَسَرُوا رُباعِيَّتَهُ وَأَدْمَوْا وَجْهَـهُ؟﴾ **چۆن بەختـەوەر دەبێ گەلێکی وەها: پێغەمبەری خۆیانﷺ بریندار بکەن‌و ددانی بشکێنن‌و خوێن بە ڕوویدا بهێننە خوارەوە؟.** جا خوایگەورە ئەم ئایەتەی نـاردە خـوارەوە: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْـرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ﴾ آل عمران: ١٢٨، **ئەی پێغەمبەرﷺ لەبارەی بەنـدەکانی مـن هـیچ بڕیاردانێك بـۆ تـۆ نیـە، بـەڵکو بڕیاردانەکە بۆ خودایـە: یـان تۆبەیان لێقبوڵ دەکاو دەیانکاتە موسوڵمان، یان لە دونیاو قیامەت سزایان دەداو هەر لە سەر کوفریخۆیان دەمێننەوە، ئەوانە ستەمکارن‌و شیاوی سزادانن.** (تفسير ابن كثير) و(تفسير الخازن) آل عمران: (١٢٣و١٢٤و١٢٨) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٤٤٧-٤٥٠و٤٥٦).

**گەورەیی حەزرەتی( سَعْد بن أبي وَقّاص )و حەزرەتی( طَلْحَة بن عُبَيْدالله )رضي‌الله عنهما :**

* **حەزرەتی( سَعْد بن أبیوَقّاص )**رضي‌الله‌عنه یەکێکە لە (الْعَشَرَةُالْمُبَشَّرَة)=دە مژدە پێدراوەکان بە بەهەشت، سێیەم کەسە لـە ئیـسلامدا؟ چـونکە لـە دوای ئیمـام (أَبُـوبَكْر)رضي‌الله‌عنه موسـوڵمان بووە، یەکەم موسوڵمانە لە ڕێگای خوا تیری هاویشتۆتە کافرەکان، لـە هـەموو غەزایـەکان لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بەشداریی کردوە، لـە غـەزای (أُحُـد) بـەرگریی لـە پێغەمبـەرﷺ دەکردو پێغەمبەرﷺ دەیفـەرموو: ﴿إِرْمِ سَعْد فِداكَ أَبِي وَأُمِّي﴾ رواه الشيخان، **ئـەی (سَـعْد) تیر بهاوێ کافرەکان دایکم‌و باوکم گیانفیدات بن.**

پێغەمبەرﷺ شانازیی بە حەزرەتی(سَعْد) دەکردو دەیفـەرموو: ﴿هَذا خالِي، فَلْيُرِنِي امْرُؤٌ خَالَهُ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، **(سَعْد) خاڵی منە، با پیاوێك هەبێ خاڵیخۆی نیشانی من بدا.** واتە: حەزرەتی(سَعْد) لە هۆزی (بَنِيزُهْرَة) بوو: کە بنەماڵەکەی دایکی پێغەمبـەرەﷺ، حەزرەتی(سَعْد بن أبِيوَقّاص)رضي‌الله‌عنه پاڵەوان‌و سەرکردەی جەنگی (الْقادِسِيَّة)یە، کـە دەوڵـەتی فارسەکانی ئاگرپەرستی ڕوخاندو باشوری ڕۆژهەڵاتی کوردستانی لە ژێر سـتەمی فارسـەکان ڕزگار کرد، هەروەك لە باسی (جابان)ی کوردیدارضي‌الله‌عنه ڕوونمان کردەوە.

* **حەزرەتی( طَلْحَة بن عُبَيْدالله )**رضي‌الله‌عنه یەکێکە لە (الْعَـشَرَةُالْمُبَـشَّرَة)و هەشـتەمین کەسـە لـە ئیسلامدا، لە هەموو غەزایەکان لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بەشداریی کردوە، لە کاتێکی غەزای (أُحُد)دا تەنها ئەم (طَلْحَـة)یـەو (سَـعْد بـن أبِيوَقّـاص)رضي‌الله عنهما لـە دەورەی پێغەمبـەرﷺ مابونەوە بەرگریی لێبکەن-هەروەك لە حەدیسەکەی (البخاري)دا ڕابردا-جا حەزرەتی(طَلْحَـة)رضي‌الله‌عنه دەستیخۆی دەدا بـەر چـەکی کافرەکـان نـەوەك وە پێغەمبـەرﷺ بکـەوێ بـۆیە دەستی

(شَلَل) بوو و له كار كەوتو زیاتر له حەفتا برینی كەوتنە لاشەی، پێغەمبەرﷺ ناوی لێناوە: (طَلْحَةُ الْجُود)، (طَلْحَةُ الْخَيْر)، (طَلْحَةُ الْفَيّاض). چونكە (صَحابَة)یەكی دەوڵەمەند بوو و زۆری دەبەخشی. (السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٣٢٤) و(عظماء حول الرسولﷺ) ب(١) ل(٣٣٥و٣٥٥).

**یازدەهەم: ئافرەتیش بەشداری جەنگیان كرد: حەزرەتی(نُسَيْبَة)ش بەرگری لە پێغەمبەرﷺ دەكرد،** ﴿عَن الرُّبَيِّع بِنْتِ مُعَوِّذٍرضی‌الله عنها: كُنّا نَغْزُو مَعَ النَّبيِّﷺ فَنَسْقِي الْقَوْمَ وَنَخْدُمُهُمْ وَنَرُدُّ الْجَرْحَى وَالْقَتلَى إلَىالْمَدِينَةِ﴾ رواه البخاری، **ئێمەی ئافرەت لەگەڵ پێغەمبەرﷺ لە غەزای (أُحُد) بوین، ئاومان دەدا موسوڵمانانو خزمەتمان دەكردنو بریندارو شەهیدەكانمان دەهێناوە بۆ (مَدِينَة).**

جا هەر لە (البخاري)دا هاتووە: ﴿**حەزرەتی(عائشة)ی هاوسەری پێغەمبەروﷺ حەزرەتی(فاطِمَة)ی كیژی پێغەمبەرﷺورضی‌الله عنهما لەگەڵ ئەو ئافرەتانەدا بون**﴾.

ئیمامی (الحلبي) فەرموویەتی: ژمارەی ئافرەتەكان چواردە ئافرەت بون، جا كە ئافرەتەكانی (مَدِينَة) هاتن بۆ (أُحُد)، حەزرەتی(فاطِمَة)شیان لەگەڵدا بوورضی‌الله عنها، كە دیتی پێغەمبەرﷺ بریندار بووە، یەكسەر باوەشی لێوەرینا-یوحم بە قوربانیان بێ- ئینجا خوێنی لە پێغەمبەرﷺ شۆراند، هەروەك باسمان كرد.

*بەخۆمو دایكمو باوكمەوە بە قوربانت بم یارَسُولَ الله، بە قوربانی كوڵمە پیرۆزەكەی خوێناویت بم یارَسُولَ الله، بە قوربانی خوێنی گەشو كوڵاویت بم یارَسُولَ الله، بە قوربانی ددانە پیرۆزەكەی(لُؤْلُؤ)یت بم یارَسُولَ الله،بە قوربانی ورەی بەرزو ئازاییت بم یارَسُولَ الله.*

جا ئیمامی(الحلبي) دەفەرموێ: (أُمُّ عَمارَة) كە پێی دەگوترا: (نُسَيْبَة)ی كیژی(كَعْب)، خۆیو مێردەكەی-كە ناوی (زَيْد بن عاصِم) بوو- لەگەڵ هەردوو كوڕەكانی-(خُبَيْب)و (عَبْدُالله)- هاتنە غەزای (أُحُد)، جا (نُسَيْبَة) دەفەرموێ: كوندە ئاوێكم لەگەڵ خۆمدا هێنا، تاكو ئاو بدەمە بریندارەكان، تا گەیشتمە لای پێغەمبەرﷺ، جا موسوڵمانەكان شكان، من چومە لای پێغەمبەرﷺ بە شمشێرەكەم بەرگریم لێدەكرد، جا (ابن قَمْئَة)-لعنه الله- هات پێغەمبەرﷺ بكوژێ، بەڵام منو (مُصْعَب بن عُمَيْر) ڕێگەمان لێگرت، جا ئەم كافرە شمشێرێكی لە شانم دا ئەم برینەی تێكردم-تا مردن برینەكەی سەر شانی دیار بوو- منیش چەند لێدانێكم لەوی دا، بەڵام ئەو دوو زرێی لەبەردا بونو كاری لێنەكرد، جا پێغەمبەرﷺ لەبارەی (نُسَيْبَة)و مێردەكەیو كوڕەكانی فەرمووی: ﴿بارَكَ اللهُ فِيكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ...اَللَّهُمَّ اجْعَلْهُمْ رُفَقائِي فِي الْجَنَّةِ...مَا الْتَفَتُّ يَميناً وَلا شِمالاً يَوْمَ أُحُدٍ إلاّ وَرَأَيْتُها-أَيْ (نُسَيْبَة)-تُقاتِلُ دُونِي﴾ **خوا بەرەكەت بخاتە ئێوە، ئەی دانیشتووانی ئەم ماڵە...خودایە بیانكە هاوڕێی من لە بەهەشتدا...هەر جارێك لە غەزای (أُحُد) بە ڕاستەدا، یان بە چەپەدا ئاوڕم دەداوە، دەمدیت (نُسَيْبَة) جەنگ دەكاو بەرگریم لێدەكا.** جا لەم غەزایەدا حەزرەتی(نُسَيْبَة)

دوانزه بڕینی کەوتنە لاشەی، ئینجا لە جەنگی (مُسَيْلَمَةُالْكَذّاب)ش حەزرەتی(نُسَيْبَةَ) لەگەڵ (عبدالله)ی کوڕی بەشداریی کردو ویستی (مُسَيْلَمَةالْكَذّاب) بکوژێ، بەڵام (عبدالله)ی کوڕی بە هاوبەشی لەگەڵ (وَحْشي) —کە بکوژەکەی ئیمام (حَمْزَة) بوو ﷺ—(مُسَيْلَمَة)یان کوشت.
**جا بزانە:** کە (ابن قَمْئَة)-لعنه الله- لە ڕوخسارە پیرۆزەکەی پێغەمبەری ﷺ دا و بەم لێدانە دوو ئاڵقەی خودەکە بە کوڵمەی پێغەمبەرداﷺ ڕوچونە خوارەوە، پێغەمبەرﷺ دوعای لێکردو فەمووی: (أَقْمَأَكَ اللهُ) **خوا زەلیلت بکا**. جا خوایگەورە دوعایەکەی قبوڵ کردو ڕۆژێك (ابن قَمْئَة) چووە سەر چیایەك و لەوێ نێرییە کێوی تێیهەڵداو لە چیایەکە فڕێیدا خوارەوەو پارچە پارچە بوو. فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين.
ئیتر حەدیسەکانی (البخاري) بەڵگەنە: کە دروستە: ئافرەتیموسوڵمان لەگەڵ مەحرەمی خۆی —نەك لەگەڵ بێگانە—بڕواتە غەزا، بۆ یارمەتیدانی چەکدارەکان و دەرمانکردنی بریندارەکان و هەر کارێکیتر: کە بتوانێ ئەنجامی بدا، بەو مەرجەی ئافرەتەکە بە شەرم و بە ئەخلاق بێ، تاکو بێشەرعی ڕوو نەدا. (فتح الباري) ب(٦) ل(٩٦-٩٩-١١٤) و(السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٣١٣و٣١٤و٣١٨و٣٢٢و٣٤٤).
**دوانزەهەم: شەهیدی ڕێگایخوا ناشۆرێ، بە فەرمانی پێغەمبەرﷺ:** شەهیدەکانی (أُحُد) گەڕاندرانەوە ئەو شوێنەی لێی شەهید بوینە...هتد، ئەمەش بەڵگەیە: شەهید هەر لەو شوێنە دەنێژرێ کە لێی شەهید بووە، هەم بە بەرگی خوێنینی خۆی دەنێژرێ و ناشۆرێ و نوێژی جەنازەشی لە سەر ناکرێ ﴿عن جابرﷺ: كانَ النَّبيُّﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ فِي ثَوْبٍ واحِدٍ، ثُمَّ يَقُولُ: أَيُّهُمْ أَكْثَرُ أَخْذاً لِلْقُرْآنِ؟ فَإِذا أُشِيرَ لَهُ إِلَى أَحَدِهِمَا قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ وَقالَ: أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلاءِ يَوْمَ الْقِيامَةِ وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ فِي دِمائِهِمْ وَلَمْ يُغَسَّلُوا وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِمْ﴾ رواه البخاري، **لە غەزای (أُحُد) پێغەمبەرﷺ هاوبەشیی دەکرد لە نێوان دوو شەهید لە یەك بەرگدا—واتە: دەیکردە دوو پارچە: هەر پارچەی بۆ یەکێکیان—ئینجا دەیفەرموو: کامەیان زیاتر قورئانی وەرگرتووە؟ جا کە ئاماژەیان بۆ یەکێك دەکرد، ئەوی لە لای پێشەوەی گۆڕەکە دایدەنا—واتە: دوو کەس و سێ کەسی وێکڕا لە گۆڕێکدا دەناشتن— جا فەرمووی: من شاهیدم لە سەر ئەم شەهیدانە لە ڕۆژی قیامەتدا. هەم فەرمانی دا: بە خوێنەوە ناشتران و نەشۆران و نوێژی جەنازەشی لە سەر نەکردن.**
جا لە حەدیسێکیتردا پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لا تُغَسِّلُوهُمْ فَإِنَّ كُلَّ جَرْحٍ يَفُوحُ مِسْكاً يَوْمَ الْقِيامَةِ﴾ رواه الإمام أحمد، **شەهیدەکان مەشۆن چونکە گشت برینێك بۆنی میسکی لێدێ لە ڕۆژی قیامەت**. واتە: لەو خوێنەی لێی دەچکێتەوە.
**پێناسە:** شەهید ئەو موسوڵمانەیە کە لە ڕێگایخوا لە جەنگی کافرەکان لە گەرمەی

جەنگدا دەکوژرێ، جیاوازی نێر و مێ و گەورەو منداڵ نیە، هەم جیاوازی پیاوچاك‌و پیاوخراپ نیە. جا ئەگەر موسوڵمانەکە لە جەنگدا بریندار بوو و لە دوای جەنگ گیانی دەرچوو، یان لە جەنگی ئەو موسوڵمانانە کوژرا کە دژی دەوڵەتی ئیسلامن، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا–تەنها–شەهیدی قیامەتەو لە دونیادا بە فەرموودەی بەهێزتر: واجبە بشورێ‌و نوێژی جەنازەشی لە سەر بکرێ

جا هەر بە بەڵگەی حەدیسەکەی(البخاري) ئەگەر مردوو زۆر بون‌و ناشتنیان–تەنها تەنها–ماندووبونێکی زۆری دەویا، ئەو کاتە لە بەر ناچاری دروستە: دوو پیاو و سێ پیاو–وێکڕا–هەم دوو ئافرەتیش–وێکڕا– لە ناو یەك گوڕدا بنێژرێن، هەروەها دروستە پیاوێك‌و ئافرەتێکیش–وێکڕا– لە ناویەك گوڕدا بنێژرێن، بەو مەرجەی پیاوەکە لە لای پێشەوە بێ‌و ئافرەتەکە لە پشتەوە بێ، هەم پەردەیەکی گڵیش لە نێوانیاندا بێ. (فتح الباري) ب(٣) ل(٢٦٧–٢٧٠) (تحفه‌المحتاج لشرح المنهاج) ب(٣) ل(١٦٣–١٦٥و١٧٤).

**سێزدەم: لە غەزای (أُحُد) موسوڵمانەکان نەشکان‌و مەیدانی جەنگیان بەجێ نەهێشت، بۆیێ کافرەکان وەڕەز بون‌و جەنگیان وەستاندو بەرەو (مَكَّة) گەڕانەوە.**

لەبارەی تێڕوانینی جەنگی (أُحُد)و زیانی موسوڵمانان، (کونستانس) وەزیر (خارِجیَّـة)ی پێشووی (ڕومانیا)، دەڵێ: ئەگەر قسە لەگەڵ شارەزایەکی بواری جەنگ بکەین‌و بڵێین: نیشانەی زیانی جەنگ چیە؟ لە وەڵامدا دەڵێ: ئەگەر لەشکرەکەی بەرامبەر توانی شارەکان بگرێ‌و لەشکری دوژمنەکەشی بنەبڕ بکا، ئەو کاتە بە سەرکەوتوو دادەندرێ، بەڵام ئەگەر وڵاتێکی گرت‌و نەیتوانی لەشکرەکە بنەبڕ بکا، ئەو کاتە وڵاتەکە بە زەرەرمەند دانادرێ، چونکە لە جەنگی جیهانیدا (ألمانیا) توانی هەموو (روسیا) بگرێ، بەڵام چونکە لەشکری (روسیا)ی بە تەواوی لەناو نەبرد، (ألمانیا) بە سەرکەوتوو دانەندرا، کەوابوو: سەرکەوتن دوو مەرجی هەنە، **یەکەمیان**: وڵاتەکە بگرێ. **دووەمیان**: جموجۆڵی لەشکرەکەشی بمرێنێ. جا کافرەکانیش لە جەنگی (أُحُد) نەیانتوانی شاری (مَدِینَة) بگرن‌و نەشیانتوانی لەشکری (مُحَمَّد)ﷺ لەناو ببەن...کەوابوو: بە ڕای من موسوڵمانەکان نەشکاون=نەبەزیون، بەڵکو کەوتنە ناو ئەزمونێکی لەناکاو...قورئانی پیرۆزیش دانی نەهێناوە بە شکستی موسوڵمانەکان بەڵکو لە ئایەتی (١٣٩)ی آل عمران دڵی داونەوە. بڕوانە (نظرة جدیدة فی سیرة رَسُولِ اللهِﷺ لـ(کونستانس)) ل(٢٦٧).

ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، ئەوە شاهیدیی وەزیر (خارِجیَّـة)ی دەوڵەتێکی کافرە، جا بۆ پشتگیری شاهیدیەکەی (کونستانس)، ئەم ڕوونکردنەوەیە دەنوسین: پێغەمبەرﷺ گفتی دا (أبُوسُفْیان): ساڵی‌داهاتوو لە (بَدْر) جەنگێکی‌تر بکەن، هەم سبەینێ فەرمانی دا: بە دوای دوژمندا بڕۆن...هتد، ئەمە ڕاگەیاندنێك بوو: کە ئیسلام هەر بە هێزەو بە شەهیدبوونی حەفتا کەس‌و برینداربوونی کەسانی‌تر بێ‌هێز نەبوە، هەم دەرچوونەکەش بۆ ترساندنی دوژمن بوو،

بۆیش پێغەمبەرﷺ ڕێگای نەدا: ئەو کەسانەی لە (أُحُد) ئامادە نەبوینە، لەم غەزایە بەشدار ببن، نەوەك وا تێبگەن بە هۆی ئەوانەوە بەهێز بوینەوەو سەرکەوتن وەدەست دێنن.

بەڵێ: بەشداربووانی ئەم غەزایەش تەنها بەشداربووەکانی دوێنێی غەزای (أُحُد)ن‌و هەر بەتوانانە، کەوابوو: ئەم حەفتا شەهیدە نابێتە بەزینی موسوڵمانان؟ چونکە موسوڵمانەکان لە (أُحُد) نەگەڕانەوە تا کافرەکان لە (أُحُد) دەرچون، ئینجا لە دوای ڕۆیشتنی کافرەکان شەهیدەکانیان ناشتن، ئینجا بۆ نوێژی مەغریب گەیشتنەوە (مَدِينَة)، هەروەك باسمان کرد.

کەوابوو: حەفتا شەهیدەکە نابێتە سەرکەوتنی کافرەکانیش؟ چونکە ئەوان نەیانتوانی موسوڵمانان لە مەیدانی جەنگ دەربکەن، ناچار بەخۆیان مەیدانیان بەجێ هێشت، ئەوەش نابێتە سەرکەوتن، بەڵکو حەفتا شەهیدەکە بۆ کافرەکان دەبێتە تۆڵەکردنەوەی (بَدْر)، بۆ موسوڵمانانیش دەبێتە زیان لێکەوتن، بۆیێ (أبوسُفْيان) گوتی: **هیچمان نەکرد، (مُحَمَّد)مان نەکوشت، کیژەکانی مەمك خڕمان بە تالآن نەهێنان.**

کەوابوو: ئەم دەرچوونەی پێغەمبەرﷺ بۆ (حَمْراءُالأسَد)و مانەوەی سێ شەوان لەوێ، بۆ ئەوە بوو:

١-هیچ موسوڵمانێك بیر لە بەزین نەکاتەوە. ٢-ئەم غەزایەش غەزایەتری بە دواوەیە بۆ بەرزکردنەوەی‌ئیسلام. ٣-(صَحابَة)کان زیاتر لە جەنگ ڕابهێندرێن. ٤-بە شەهیدبوونی حەفتا (صَحابَة)کە کافرەکان ورەیان بەرز نەبێتەوەو موسوڵمانانیش ورەیان دانەبەزێ.

بۆیێ خوای‌گەورە لەبارەی (أُحُد) دڵیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنْتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ * إِنْ يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِثْلُهُ وَتِلْكَ الْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَتَّخِذَ مِنْكُمْ شُهَدَاءَ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ﴾ آل عمران: ١٣٩و١٤٠، **ئێوە-ئەی موسوڵمانان- بە هۆی ئەو شەهیدو بریندارانەتان بێ‌هێز مەبن بۆ غەزا، غەمباریش مەبن، لە ئەنجامدا هەر ئێوە سەردەکەون ئەگەر ئیمانداری بەڕاستی بن، ئەگەر ئێوە بریندار بوینە، کافرەکانیش وەك ئێوە بریندار بوینە، ئێمە ئەو ڕۆژگارانە لە نێوان خەڵکی‌دا دەسوڕێنین: ڕۆژێك سەرکەوتنەو ڕۆژێك بەزینە، خوای‌گەورە ئەوها تاقیتان دەکاتەوە تا بزانێ کێ ئیمانداریکی وەهایە خۆی لە بەرامبەر دوژمن ڕابگرێ، هەم بۆ ئەوەی هەندێك شەهیدیش لە ئێوە وەربگرێ، خوای‌گەورە ستەمکارەکانی خۆش ناوێ: کە لە جەنگی (أُحُد) لە ڕێگەدا دابڕان‌و گەڕانەوە.** بە دەستکاریەوە: لە (فقه السيرة، للبوطي) ل(٢٦٦) و(سيرة الصلابي) ب(٢) ل(١٢٠-١٢٥).

**چواردەهەم: ( أبُوسُفْيان ) گوتی: بە ( مُحَمَّد ) بڵێن: خۆمان ئامادە کردوە هێرشی دەکەینە سەر و بنەبڕی دەکەین.** **پێغەمبەرﷺ** لەوەڵامدا فەرمووی: ﴿حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾.

لەبارەی غەزای (حَمْراءُ الْأسَد)و ئەم وەڵامەی پێغەمبەرﷺ، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِنْ بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا مِنْهُمْ وَاتَّقَوْا أَجْرٌ

عَظِيمٌ * اَلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُوا حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ آل عمران: ١٧٢و١٧٣، **ئەوانەی گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرﷺ بون بۆ غەزای (حَمْراءُالْأَسَد)، لە دوای ئەوەی لە غەزای (أُحُد) برینیان توش بوبوو، ئەوانەی چاکەیان کردو لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بۆ غەزایەکە ڕۆیشتن‌و لە خوا ترسان، ئەوانە پاداشتێکی‌گەورەیان هەیە لە لای خوا، ئەوانەی خەڵك پێیان گوتن: وا کافرەکانی (قُرَیْش) خۆیان کۆ کردۆتەوە تاکو دووبارە هێرشتان بکەنە سەر، کەوابوو: لێیان بترسن، ئەو موسوڵمانانە باوەڕیان زیاتر بوو بە خوای‌گەورەو گوتیان: ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ خوای‌گەورەمان بەسەو دەمانپارێزی‌و چاکترین پەنادەرمانە.**

**حەزرەتی(ابن عَبّاس)**رضي‌الله عنهما **فەرموویەتی: ئەم دوعایەی ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ (إِبْراهِيم) پێغەمبەرﷺ گوتویەتی لەو کاتەی فڕێدرا ناو ئاگر، هەم (مُحَمَّد)شﷺ گوتویەتی لەو کاتەی پێی گوترا: وا کافرەکان کۆ بوینەوە هێرشتان بکەنە سەر.**

**جا ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، خوای‌گەورە لێرەدا مەدحی (صَحابَة)کانؓ دەکا: باسی بریندارببوونیان دەکا، جا کەسێك خوا بە برینداری دابنێ، ئەبێ برینەکەی چۆن بێ؟ ئەوا ئیمامی(الحلبي) هەندێکمان بۆ باس دەکاو دەفەرموێ:**

**( نُسَيْبَة )**-رضي الله عنها- **ئەو ئافرەتەی بەرگریی لە پێغەمبەرﷺ دەکرد: دوانزە برینی تێدا بون. ( طَلْحَة بن عُبَيْدالله )ؓ دەستی (شَلَل) بوو و لە کار کەوت‌و زیاتر لە حەفتا برینیشی کەوتنە لاشەی: کە تەنها سینگی نۆ برینی تێدا بون. ( عبدالرّحْمن بن عَوْف )ؓ بیست برینی کەوتنە لاشەی: یەکێکیان لە دەمی‌دا بوو، بویێ کەولۆس بوو.**

**( كَعْب بن مالك )ؓ حەڤدە برینی تێدا بون. ( خَراش بن الصِّمَّة )ؓ دە برینی تێدا بون. ( أُسَيْد بن حُضَيْر )و ( عُقْبَة بن عامر )**رضي‌الله عنهما **هەر یەکەو نۆ برینی تێدا بون. تەنها بنەماڵەی (بَنِی‌سَلَمَة) چل بریندداریان هەبون، بۆیێ پێغەمبەرﷺ دوعای بۆ کردن‌و فەرمووی: ﴿اَللّٰهُمَّ ارْحَمْ بَنِى‌سَلَمَة﴾ خوایە ڕەحم بە (بَنِی‌سَلَمَة) بکە.**

**ئیمام (ابن كثير) فەرموویەتی: لە بنەماڵەی (عَبْدُالأَشْهَل) دوو برا بریندار بون، جا کە بانگەوازیی غەزای (حَمْراءُ الْأَسَد) کرا، هەردوو برایەکان گوتیان: چۆن دەبێ غەزای لەگەڵ پێغەمبەرمانﷺ لەدەست بچێ؟ خۆ وڵاغیشمان نیە بە سواری بڕۆین!، ئیتر بە پێیان وەڕێ‌کەوتن، جا لە ڕێگەدا-جار جارە- برایەکەی برین سوك برایەکەی برین سەختی هەڵدەگرت‌و هەندێ جاریش دایدەنا تا گەیشتنە شوێنی غەزایەکە.** (تفسیر ابن کثیر) آل عمران: (١٧٢و١٧٣) و(السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٣١٤و٣٢٤و٣٢٥و٣٥٠).

***    ***    ***

## ﴿( سَرِيَّة )ی ( الرَّجِيع ) لە ناوچەی ( هُذَيْل )﴾

له دوای غەزای (أُحُد) لـه كۆتـایی سـاڵی سـێیەمی كۆچی وەفـدێكی هۆزەكـانی (عَضَل)و (القارَة) هاتنه خزمەت پێغەمبەروﷺ گوتیان: یا رَسُولَ الله، ئێمه ئیسلامەتیمان له ناودا هەیه، هەندێ (صَحابَة)ی خۆت بنێـره: قورئانمـان پـێبڵێن‌و شـەریعەتی ئیـسلاممان فێـر بكەن. جا پێغەمبەرﷺ ده (صَحابَة)ی به سەركردایەتی حەزرەتی(عاصِم بن ثابت)ﷺ لەگەڵدا ناردن، جا هەموویان به یەكەوە ڕۆیشتن تا گەیشتنه سەر ئاوی (الرَّجیـع)، لـەوێ وەفدی (عَضَل)و (القـارَة) خیانـەتی لـه (صَحابَة)كـان كـردو (بَنِیلَحْیـان)ی (بَنِیهُـذَیْل)ی لەوان ئاگادار كردنـەو، جا دوو سـەد چەكداری (بَنِیلِحْیـان)—كـه نزیكـەی سـەد كەسـیان تیرهاوێژ بوو—به دوایاندا هاتن‌و دەورەیان لێدان، جا (صَحابَة)كانﷺ پەنایان بردە سەر بەرزاییـەك، جـا كافرەكـان پێیـان گـوتن: پـەیمانیخواتان دەدەینـێ: ئەگـەر دابـەزن ناتانكوژین. جا حەزرەتی(عاصِم)ی سەركردەﷺ فەرمووی: مـن پـەیمانی هـیچ كافرێـك قبوڵ ناكەم‌و دانابەزم، خودایه ئەم هەواڵەی ئێمه بگەیەنه پێغەمبەرﷺ.

ئیتر كافرەكان به تیربارانكردن هێرشیان كردنه سەر، تا حـەزرەتی(عاصِـم)ی سـەركردەو شەش (صَحابَة)یتریشﷺ شەهید بون‌و تەنها (خُبَیْب)و (زَیْد)و (عبدالله)ﷺ مانەوە، جا كافرەكان ئەم جارەش گوتیان: پەیمان بـێ: ئەگەر دابـەزن ناتـانكوژین. جا ئـەو سـێیانه دابەزین‌و خۆیان دا دەست كافرەكـان، كافرەكـانیش دەسـت‌و پـێی ئـەوانیان بەسـتن، جا حەزرەتی(عبدالله)ﷺ فەرمووی: ئەمه سەرەتای خیانەتكردنه. جا هەرچەند هەوڵیان دا ڕایاندەكیشا حەزرەتی(عبدالله)ﷺ له گەڵیان نەدەڕۆیشت، تا گەیشتنه (الظَهْران)، لـەوێ هەوڵی دا دەستیخۆی كردنەوەو ویستی جەنگ بكـا، بـەڵام كافرەكـان بـەردبارانیان كـردو شەهیدیان كرد، ئێستا گۆڕەكەی له (الظَّهْران)ە.

جا كافرەكـان ویـستیان سـەری حـەزرەتی(عاصـم)ﷺ لـه لاشـەی بكەنـەوەو بیفرۆشـنه (سُلافَة)ی دایكی (مُسافِع)و (جَلاّس) كه هەردووكیان له غەزای (أُحُد) به دەستی حەزرەتی (عاصم)ﷺ كوژرابون‌و دایكەكەیان نەزری كردبوو: لـه نـاو تەپلـەی سـەری (عاصِـم)دا شەراب بخواتەوە. بەڵام خوایگەورە گەواڵەیەكی زەرگەتەی نارده سەر لاشەی حەزرەتی (عاصم)ﷺ، بۆیێ كافرەكان نەوێران لێی نزیك ببنەوەو گوتیان: ئێوارێ زەرگەتـەكان دەڕۆن، ئەو كـات سـەری لێدەكەینـەوە. جـا خوایگەورە لافاوێكی بـه دۆڵەكەدا هێنـاو حەزرەتی(عاصم)ی هەڵگرت‌و كەس نەیزانی بۆ كوێ بردی، بۆیێ حـەزرەتی(عاصـم)ﷺ پـێی دەگـوترێ: (حَمِـيُّ الـدَّبَر) پاراسـتراوی زەرگەتـە. ئینجـا كافرەكـان (خُبَیْـب)و (زَیْد)یان فرۆشتنه كافرەكانی (مَكَّة): حـەزرەتی(خُبَیْـب) بنەماڵەی (الحارِث) كڕییـان تاكو له تۆڵەی (الحارِث) بیكوژن؟ چونكه حـەزرەتی(خُبَیْـب) لـه غـەزای (بَـدْر) ئـەوی كوشتبوو، (صَفْوان بن أُمَیَّة)ش حـەزرەتی(زَیْـد)ی كـڕی تـاكو لـه تۆڵەی بـاوكی بیكـوژێ،

جا حەزرەتی(خُبَیْب)ﷺ لە لای بنەماڵەی (الحارِث) بەند کرا تا (الأشهرالحُرُم)–واتە: (ذوالقَعْدَة)و (ذوالحِجَّة)و (المُحَرَّم)– تەواو بون، ئینجا بڕیاریان دا: لە مانگی (صَفَر) بیکوژن، جا کە حەزرەتی(خُبَیْب)ﷺ زانی دەیکوژن، بە کیژەکەی (الحارِث)ی گوت: گێزانێکم بۆ بنێرە، تاکو بۆ کوشتن خۆمی پێ پاك بکەمەوە–واتە: مووەکانی دامێنی پێ بتاشێ– جا کیژەکەی (الحارِث) گێزانەکەی بۆ حەزرەتی(خُبَیْب) ناردو لەو کاتیش ئافرەتەکە لە منداڵێکیخۆی غافڵ بوو و منداڵەکە چووە لای حەزرەتی(خُبَیْب)، حەزرەتی (خُبَیْب)یشﷺ لە سەر ڕانیخۆی داینا، جا ئافرەتەکە زۆر ترسا، بەڵام حەزرەتی (خُبَیْب)ﷺ فەرمووی: ئەوە دەترسێی بیکوژم؟! مەترسە نایکوژم إن شاءالله.

جا ئەم ئافرەتە دەیگوت: هیچ دیلێك چاکتر لە (خُبَیْب)م نەبینیوە، دەمدیت هێشوی ترێی لە لایەو دەیخوا، لەو کاتیشدا لە (مَكَّة)دا هیچ جۆرە میوەیەك نەبو، ئەویش بە زنجیر بەسترابوو، ئەم ترێیە خواردنێك بوو خوایگەورە دابویە (خُبَیْب)ﷺ.

ئینجا کافرەکان حەزرەتی(خُبَیْب)یان بردە دەرەوەی (حَرَم)ی (مَكَّة) تاکو لەوێ بیکوژن، جا حەزرەتی(خُبَیْب)ﷺ فەرمووی: ماوەم بدەنێ تا دوو ڕەکعەت نوێژ بکەم. جا ماوەیان دایێو دوو ڕەکعەت نوێژی کرد، جا لە دوای نوێژەکە بە کافرەکانی گوت: ئەگەر لە بەر ئەوە نەبێ: وام تێبگەن لە ترسی کوشتن نوێژ دەکەم، زۆرتر نوێژم دەکردن.

ئینجا کافرەکان حەزرەتی(خُبَیْب)یان لە سەر سێدارە بەست، ئەویش ئەم دوعایە کرد: ﴿اَللَّهُمَّ أَحْصِهِمْ عَدَداً وَاقْتُلْهُمْ بَدَداً وَلاَ تُبْقِ مِنْهُمْ أَحَداً﴾ رواه البخاری، خودایە ئەم کافرانە سەرژمێر بکەو بە پەرتبوویی یەك لە دوای یەك بیانکوژەو یەکێکیانی لێمەهێڵە. جا فەرمووی: خودایە هیچ کەسێك لێرە نیە سەلامی من بگەیێنێتە پێغەمبەرﷺ، خودایە تۆ سەلامەکەی پێبگەیێنە. جا حەزرەتی(جُبْرائِیل)ﷺ هەواڵەکەی بۆ پێغەمبەرﷺ هێناو پێغەمبەریشﷺ دانیشتبوو و وەڵامی داوەو فەرمووی: ﴿وَعَلَيْكَ السَّلامُ يا خُبَيْبُ﴾ سەلام لە تۆش ئەی (خُبَیْب).

جا ئەم کافرانەی حەزرەتی(خُبَیْب) دوعای لێکردن، ساڵ نەسوڕاوە هەموویان کوژران، جا حەزرەتی(خُبَیْب)ﷺ لە سەر سێدارەکە پێش شەهیدبوونی چەند شیعرێکی گوتن، هەندێك لەم شیعرانە:

إلى الله أَشْكُو غُرْبَتِي ثُمَّ كُرْبَتِي * وَمَا أَرْصَدَ الأعْداءُ لِي عِنْدَ مَصْرَعِي
فَلَسْتُ أُبَالِي حِينَ أُقْتَلُ مُسْلِماً * عَلى أَيِّ شِقٍّ كان لِلَّهِ مَصْرَعِي
وَذَلِكَ فِي ذات الإلهِ وَإِنْ يَشَأْ * يُبارِكْ عَلَى أَوْصالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ
فَلَسْتُ بِمُبْدٍ لِلْعَدُوِّ تَخَشُّعاً * وَلاَجَزَعاً إنِّي إلَى اللَّهِ مَرْجِعِي

سکاڵای خۆم تەنها لە لای خوا دەکەم: کە من لێرە بێکەسو غەمبارم، هەم ئەوەی

دوژمنەکانم لە لای شوێنی کوشتنم بۆیان ئامادەکردوم. بەڵام من باکم نیە–لەو کاتەی بە موسوڵمانی دەکوژرێم– لە سەر هەر لا تەنیشتێك بۆ خوا بکوژرێم. ئەو کوشتنەی من لە پێناویخوایە، ئەگەر خوا حەز بکا بەرەکەت دەنێرێتە سەر ئەندامەکانی جەستەی پارچە کراوم. کەوابوو: من هیچ جۆرە ملکەچیەك بۆ دوژمنەکەم ئاشکرا ناکەمو هیچ ترسێکی کوشتنیش ئاشکرا ناکەم، چونکە من دەگەڕێمەوە لای خودا.

جا کافرەکان پێیان گوت: ئەگەر لە ئیسلام پاشگەز ببیەوە، ئازادت دەکەین؟ حەزرەتی (خُبَیب)شﷺ فەرمووی: ئەم کوشتنەی من لە ڕێگای خوا کەمەو هیچ نیە. ئینجا کافرەکان چەکی خۆیانی لێ بە کار هێناو شەهیدیان کرد، جا لە دوای شەهیدکردنیشی لاشەکەی حەزرەتی(خُبَیب)ﷺ هەر بە سیدارەکەوە بوو، تا پێغەمبەرﷺ (عَمرو بن أُمَیَّة)ی نارده (مَکَّة)و چووە لای سێدارەکەی (خُبَیب)و لە سێدارەکەی کردەوەو کەوتە سەر زەوی، جا کە (عَمرو) ئاوڕی داوە، هیچ ئاسەوارێکی حەزرەتی(خُبَیب)ی نەدۆزیەوەو تا ئێستاش هەر دیار نیە، وەك زەوی قوتی دابیﷺ.

هەروەها (صَفوان)ش حەزرەتی(زَید)یﷺ بردە دەرەوەی (حَرَم) تاکو لە تۆڵەی باوکی بیکوژێ، جا لە کاتی کوشتن، (أبُوسُفیان) پێی گوت: ئەی (زَید) توخودا پێت خۆش نیە (مُحَمَّد)ﷺ لە شوێنی تۆ بوایە لە ملمان دابا؟ تۆش بە سەلامەتی لە ناو منداڵەکانی خۆت بی. حەزرەتی(زَید)ﷺ فەرمووی: وَاللهِ پێم خۆش نیە پێغەمبەرﷺ لە شوێنی خۆیشی دڕکێکی بگاتێو ئازاری بدا، منیش لە ماڵەوە دابنیشم. جا (أبُوسُفیان) گوتی: هیچ کەسێکم نەبینیوە کەسێکی ئەوەندە خۆش بوێ، وەك (صَحابَة)ی (مُحَمَّد)ﷺ (مُحَمَّد)یان خۆش دەوێ. جا خزمەتکارێکی (صَفوان) ڕمێکی لە سینگی حەزرەتی(زَید) دا و لە پشتی دەرچو و شەهیدی کردﷺ.

## ﴿(سَرِیَّة القُرَّاء) قورئانخوێنەکان بۆ (بِئْرِمَعُونَة)﴾

لە مانگی (صَفَر) ساڵی چوارەمی کۆچی، (عامِر بن مالِك)–کە پێی دەگوترا: (أبُوبَراء) سەرۆك هۆزی (بَنیعامِر) بوو– هاتە لای پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ پێی گوت: موسوڵمان ببە. بەڵام (عامِر) موسوڵمان نەبو و دژایەتی خۆیشی بۆ ئیسلام ئاشکرا نەکردو گوتی: ئەی (مُحَمَّد) ئەگەر هەندێك (صَحابَة)ی خۆت بۆ لای (نَجْد) بنێری تاکو بانگەوازی بۆ ئەم ئایینەی تۆ بکەن، تکام وایە: بە دەم بانگەوازیەکەوە بێن؟ جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دەترسم خەڵکی (نَجْد) بیانکوژن. (عامِر) گوتی: من پەنایان دەدەمو دەیانپارێزم. جا (عامِر) چووە لای (نَجْد)و بە خەڵکەکەی گوت: من (صَحابَة)ی (مُحَمَّد)م پاراستون، واتە: لە پەنای مندا دێنە ئەم ناوچەیە.

جا پێغەمبەرﷺ لە مانگی (صَفَر)دا حەفتا (صَحابَة)ی قورئانخوێنی ناردنو

نامەیەکیشی وێدان، (صَحابَة)کانیش ڕۆیشتن تا گەیشتنە (بیئرِمَعُونَة)، جا لەوێ دابەزینو حەزرەتی(حَرام بن مِلْحان)ﷺ نامەکەی پێغەمبەریﷺ بردە لای (عامِر بن الطُفَیْل)–کە کوڕە برای (عامِر بن مالِك) بوو– پێی گوتن: من نێردراوی پێغەمبەرمﷺ تاکو ئیمان بێنن. بەڵام ئەم کافرە نامەکەی نەخوێندەوەو ئاماژەی بۆ کافرێکیتر کردو لە پشتەوە ڕمێکی لە تەنیشتی (حَرام) دا لە تەنیشتەکەیتری دەرچوو، جا حەزرەتی (حَرام)ﷺ-پێش گیانی دەربچێ- فەرمووی: (اَللهُ اَكْبَرْ، فُزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ) شاد بوم سوێندم بە خوای (كَعْبَة)، واتە: بە بەهەشت شاد بوم.
جا (عامِر بن الطُفَیْل) یەکسەر (بَنِیعامِر)ی خزمەکانیخۆی بانگ کردن تاکو (صَحابَة)کانیتریش بکوژن. بەڵام (بَنِیعامِر) گوتیان: ئێمە پەیمانەکەی (عامِر=أبو بَراء) ناشکێنینو ئەوانە لە ژێر پاراستنی ئەون. ئیتر (عامِر بن الطُفَیْل)ی کافر-لعنه الله- هۆزەکانی (عُصَیَّة)و (رِعْل)و (ذَكْوان)ی بانگ کردن، ئەوانیش گوێڕایەڵی بونو هاتن دەورەیان لە (صَحابَة)کان دا، (صَحابَة)کانیش جەنگیان کرد تا هەموویان شەهید بونﷺ، تەنها حەزرەتی(كَعْب بن زَیْد) بە برینداری لە نێوان شەهیدەکاندا ڕزگار کرا، هەم حەزرەتی (عَمْرو بن أُمَیَّة)و (صَحابَة)یەکیتریشﷺ وڵاغەکانیان دەلەوەڕاندن، کاتێك دیتیان باڵندەکان بە سەر شوێنی (صَحابَة)کاندا دەسوڕێنەوە، جا گوتیان: شتێك ڕوویداوە. جا گەڕانەوەو دیتیان (صَحابَة)کانﷺ شەهید کراونو کافرەکانیش لەوێ ڕاوەستاون، جا ئەوانیش جەنگیان کرد، تا (صَحابَة)کەی هاوڕێی حەزرەتی(عَمْرو) -رضی الله عنهما-شەهید کراو حەزرەتی(عَمْرو)شﷺ دەستگیر کرا، جا (عامِر بن الطُفَیْل) ئاماژەی بۆ شەهیدێك کردو بە حەزرەتی(عَمْرو)ی گوت: ئەم کوژراوە کێیە؟ حەزرەتی(عَمْرو)ﷺ فەرمووی: ئەمە (عامر بن فُهَیْرَة)یەﷺ جا (عامِر)ی کافر گوتی: کە ئەم پیاوە کوژرا، دیتم بۆ ئاسمان بەرزکراوە، ئینجا داندراوە. حەزرەتی(عامر بن فُهَیْرَة)ﷺ خزمەتکارو شوانی ئیمام (أبُوبَكْر)بووﷺ کە لە ڕێگەی کۆچکردن هاوڕێی ئەویو پێغەمبەری بووﷺ خزمەتی دەکردن، لێرەدا شەهید بووﷺ.
ئینجا حەزرەتی(عَمْرو)ﷺ خۆی بە کافرەکان ناساندو فەرمووی: من لە هۆزی (مُضَر)م. بۆیێ کافرەکان نەیانکوشتو ئازادیان کرد، ئینجا حەزرەتی(عَمْرو)شﷺ لە گەڕانەوەیدا گەیشتە دوو پیاوی کافر–کە لە هۆزی (بَنِیعامِر) بون– ئەویش لەوێ هەردووکی لە تۆڵەی شەهیدەکانی (بیئرِمَعُونَة) کوشتن، جا کە گەڕاوە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دوو کەست کوشتون دەبی من خوێنەکەیان بدەم؟ چونکە ئەم دوو پیاوە پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ هەبوو، بەڵام حەزرەتی(عَمْرو) نەیزانیبوو.
لە لایەکیتریش: کە (عامِر=أبُوبَراء) زانی کوڕە برایەکەی پەیمانی وی شکاندوە، زۆر

خەفەتبار بوو، بۆیێ کوڕەکەی (أَبُوبَراء)–کە ناوی (رَبيعَة) بوو– هاتە لای پێغەمبەرﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەریخوا، ئەگەر لێدانێك لە (عامِر)ی مامۆزام بدەم، ئەم عەیبە لە سەر (أَبُوبَراء)ی باوکم لادەچێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ. جا (رَبيعَة) گەڕاوەو ڕمێکی لە ڕانی (عامِر بن الطُفَيل) دا و لە ئەسپەکەی فڕێی دا خوارەو، بەلاَم ئەم کافرە پیسە بەم لێدانە نەمرد، بەڵکو (أَبُوبَراء) لە خەفەتی ڕووداوەکە مرد.

ئینجا خوایگەورە لەبارەی ئەم شەهیدانەی (بئرِمَعُونَة)ﷺ ئایەتێکی لە قورئان ناردە خوارەوەو (صَحابَة)ش دەیانخوێندەوە، بەلاَم ئایەتەکە (نَسخ)بۆوە، ئەمەش ئایەتەکەیە: ﴿بَلِّغُوا قَوْمَنا فَقَدْ لَقِينا رَبَّنا، فَرَضِيَ عَنّا وَرَضِينا عَنْهُ﴾ رواه الشيخان، بە گەلەکەی ئێمە ڕابگەیێنن: ئێمە گەیشتینە لای خوایخۆمان، خودا لێمان ڕازی بوو، ئێمەش لە خودا ڕازی بوین. جا پێغەمبەرﷺ ماوەی مانگێك لە هەر پێنج نوێژەکاندا قنووتی دەخوێند دوعای لە بکوژەکانی قورئانخوێنەکانی (بئرِمَعُونَة) دەکرد. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٤١٩–٤٢٤–٤٢٨–٤٣٠) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٤٧٣–٤٨٩) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٢٣٣–٢٤٤).

## ﴿ گوڵبژێریك لەم گوڵزارە ﴾

**پێشەکی بزانە:** هەردوو ڕووداوەکەی (الرَّجِيع)و (بِئْرِمَعُونَة) بەڵگەنە: کە تێکڕای موسوڵمانان بەرپرسن لەم ئایینە، بانگەوازیی ئیسلام تەنها ئەرکی پێغەمبەران–عليهم الصلاة والسلام– نیەو تەنها ئەرکی میراتگرانی پێغەمبەرانیش نیە–کە زانایانیئاییننن–بەڵکو هەموویان لەم ئەرکەدا هاوبەشن، بەلاَم ئەرکی پێغەمبەران و–عليهم الصلاة والسلام–میراتگرەکانیان زیاترە، جا بە هەر جۆرێك بێ: نابێ موسوڵمان لە ڕێگای بانگەوازیدا کۆڵ بداو ماندوو ببێ.

**زۆر باش بیر بکەوە:** لە ماوەی چوار مانگدا سەدو چل و هەشت (صَحابَة)ﷺ شەهید بون: حەفتا لە (أُحُد)، شەستو هەشت لە (بِئْرِمَعُونَة)، دە لە (الرَّجِيع). ئەوجا ئیمانی (صَحابَة)کانیترﷺ زیاتر بەهێز دەبوو، ڕۆژێك یەکێکیش نەیگوت: ئای چیمان بە سەر هات!

**جا ئەوەش بزانە:** حەفتا (صَحابَة)کەی (بِئْرِمَعُونَة) هەر هەموویان گەنجەکانی قورئانخوێن بون و پێیان دەگوترا: (اَلْقُرّاء) قورئانخوێنەکان. ئەوانە لە ڕۆژیدا دەچونە دارهێنان، بەو دارانە خواردنیان بۆ (أَهْلِ الصُّفَّة) دەکڕی، شەویش دەرسی قورئانیان دەخوێندو بە یەکترییان دەگوت و شەونوێژیان دەکردن، بەڵێ: ئەوانە شێری ڕۆژێ بون و خواپەرستی شەوێ بونﷺ.

**ئینجا بزانە:** ئەم دوو ڕووداوانە بۆیێ لەگەڵ یەکتری دەگوترێن، چونکە لە یەك شەودا هەواڵی هەردووکیان گەیشتە پێغەمبەرﷺو لە قنووتدا وێکڕا دوعای لە بکوژەکانی هەردووکیان دەکرد، جا ئەوە بووەتە هۆی ئەوەی هەندێك سەرچاوە هەردووکیان لە مانگی (صَفَر)دا باس دەکەن، بەلاَم لە ڕاستیدا: (الرَّجِيع) لە دوای (أُحُد) بوو لە کۆتایی ساڵی

سێیەمی کۆچی، بە بەڵگەی ئەوەی: هەموو سەرچاوەکان دەڵێن: (خُبَیْب)ﷺ بە دیلی لە (مَکّة) مایەوە، تا (اَلأشْهُرُالْحُرُم) تەواو بون، ئینجا شەهیدیان کرد. (فتح الباری) ب(٧) ل(٤٧٤-٤٧٧-٤٨٣) و(فقه السیرة، للبوطي) ل(٢٦٨و٢٧٢).

**یەکەم: بڕیاری دیلی موسوڵمان لە شەرعدا:** حەزرەتی(عاصم)ی سەکردەی (صَحابَة)کان ﷺ فەرمووی: **من پەیمانی هیچ کافرێك قبوڵ ناکەم...هتد.** حەزرەتی(عاصم)ﷺ پەیمانی دابووە خوایگەورە: دەست لە هیچ کافرێك نەداو هیچ کافرێکیش دەست لەوی نەدا. ئینجا کە هەواڵی پاراستنی حەزرەتی(عاصم)ﷺ-بە زەرگەتەو لاقاوەکە- گەیشتە (مَدینَة)، ئیمام (عُمر)ﷺ فەرمووی: **(یَحْفَظُ اللهُ الْعَبْدَ الْمُؤْمِنَ بَعْدَ وَفاتِهِ کَما حَفِظَهُ فی حَیاتِهِ)** رواه ابن إسحاق، **خوایگەورە بەندەی ئیماندار لە دوای مردنیش دەپارێزێ، هەروەك لە ژیانیدا پاراستویەتی.**

جا ئەم حەدیسەی (الرَّجیع) بەڵگەیە: دروستە موسوڵمان خۆی تەسلیمی دوژمن نەکا هەرچەند بشکوژرێ، تاکو بڕیاری هیچ کافرێکی بە سەردا نەچەسپێ، جا ئەگەر بێگومان دەیزانی ئەگەر خۆی تەسلیم بکا دوژمن دەیکوژێ، ئەو کاتە حەرامە خۆی تەسلیم بکا، بەڵکو واجبە بەگوێرەی توانا بەرگری لەخۆی بکا تا دەکوژرێ، یان ڕزگار دەبی، بەڵام ئەگەر گومانی لە کوشتن‌و نەکوشتندا هەبوو و دەشیزانی: ئەگەر خۆی تەسلیم نەکا بێگومان دەیکوژن، ئەو کاتە دروستە خۆی تەسلیم بکا، جا هەر لەم حاڵەتەدا ئەگەر خۆیشی تەسلیم نەکردبا نەدەکوژرا، دیسان حەرامە خۆی تەسلیم بکا.

هەروەها ئەگەر ئافرەتیش دەیزانی: ئەگەر خۆی تەسلیمی دوژمن بکا (فاحِشَة)و بێناموسیی لەگەڵ دەکەن، ئەویش حەرامە خۆی تەسلیم بکا، بەڵکو واجبە جەنگ بکا تا شەهید دەبی.

جا ئەگەر دوژمن موسوڵمانێکیان دیل کرد، ئەو کاتە واجبە: موسوڵمانان ڕاپەڕن بۆ ڕزگارکردنی ئەگەر دەگونجا، بەڵام ئەگەر نەدەگونجا، ئەو کاتە ڕاپەڕینەکە واجب نیە، بەڵکو -لە بەر ناچاری-چاوەڕوانی ڕزگارکردنی دەکەین، جا ئەگەر دیلەکە لە دوای دیلبوون توانای هەڵاتنی هەبێ، ئەو کاتە واجبە: بە هەر جۆرێك بۆی بگونجێ هەڵبێ‌و خۆی لە دەستی کافرەکان قورتار بکا، هەرچەند بە جەنگکردن‌و کوشتنی پاسەوانەکانیش بێ. (فتح الباري)ب(٧) ل(٤٨٠و٤٨١) و(تحفة المحتاج بحاشیة الشرواني) ب(٩) ل(٢٣٥و٢٣٦و٢٧١).

**دووەم: مافی منداڵ لە ئیسلامدا،** حەزرەتی(خُبَیْب)ﷺ فەرمووی: **مەترسە، منداڵەکە ناکوژم إنْ شاءَ اللهُ.** ئەی موسوڵمانی خۆشەویست باش تەماشا بکە: کافرەکان چەند قین لە دڵن بەرامبەر موسوڵمانان، هەر کاتێك دەستیان بڕوا هیچ دریخی ناکەن بۆ لەناوبردنی موسوڵمانان، هەروەك خوایگەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنْ يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُمْ بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ﴾المتحنة: ٢، **ئەگەر کافرەکان بۆیان بگونجێ بە سەر ئێوەی موسوڵماندا زاڵ بن، ئەوە تەواوی دوژمنایەتیخۆیان**

وەدەر دێخەن و دەستەکانیان و زوبانەکانیان بۆ ئێوە درێژ دەکەن: بە کوشتن و جنێودان، هەم دەخوازن ئێوە ببنە کافر.

بەڵێ: خوایگەورە ڕاستی فەرموو: دیتمان کافرەکان بەرامبەر ئەم دوو چینە (صَحابَة)یە چەند بێویژدان بون و چۆن ڕق و قینە ژەهراویەکەیان خستە کار بۆ لەناوبردنی موسوڵمانان، لە بەرامبەریشدا تەماشا بکە: حەزرەتی(خُبَیْب)ی دیلکراوﷺ چەند بە بەزەیی بوو، لەو کاتەی خۆی بۆ کوشتن ئامادە دەکرد، منداڵی دوژمنیخۆی لە سەر ڕانیخۆی دانابوو و بە دایکەکەی گوت: نایکوژم. بەڵێ: هەر دیلێکیتر-کە وەکو (خُبَیْب)ﷺ پەروەردەکراوی پێغەمبەرﷺ نەبێ- بڕیاری کوشتنی بۆ دەربچێ، هەر جۆرە هەلێکی بۆ بڕەخسێ، لە دەست خۆی ناداو پێش کوشتنیخۆی تۆڵەیخۆی لە دوژمنیخۆی وەردەگرێ، بەڵام حەزرەتی(خُبَیْب)ﷺ قوتابیی قوتابخانەی پێغەمبەرەوﷺ لە لای پێغەمبەرﷺ دەرسی ئایەتی ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ الإسراء: ١٥، ی خوێندوەو زۆر باش لە واتەی ئایەتەکە تێگەیشتبوو: کە هیچ کەسێك تاوانی هیچ کەسێکیتر هەڵناگرێ.

بەڵێ: ئەو ڕێبازەی (خُبَیْب)ﷺ لە پێناویدا شەهید دەبێ، ڕێگای ناداتێ منداڵێکی بێتاوان لە ڕقی تاوانباران بکوژێ، ئا ئەمەیە مافی منداڵ، هەر ئیسلامیش منداڵ پارێزە، کەوابوو: ڕێکخراوەکانی منداڵپارێز با بە شەرمەزاریەوە تەماشا بکەن و لاشەی ئەو منداڵە موسوڵمانانە ببینن کە بە تۆپ و موشەکی دوژمنانی ئیسلام پارچە پارچە دەکرێن!. بە دەستکاریەوە: (فقه السيرة للبوطي) ل(٢٧٣) و(سيرة الصلابي) ب(٢) ل(١٦٦).

**سێیەم: حەزرەتی( خُبَیْب )ﷺ پێش کوشتن داوای گێزانێکی کرد خۆی پێ پاك بکاتەوە، هەم دوو ڕکعەت نوێژیشی کرد.** ئەم نوێژکردنەی پێش کوشتن پێی دەگوترێ: (سُنَّةُ الْقَتْلِ)= سوننەتی کوشتن، هەر کەسێك دەیزانی دەکوژرێ-ئەگەر بۆی بگونجێ- سوننەتە: دوو ڕکعەت نوێژ بە نیەتی سوننەتی کوشتن بکا، هەروەها -ئەگە بۆی بگونجێ- سوننەتە: مووەکانی دامێن و بن هەنگڵی لابباو نینۆکی بکا، تاکو لە سەر سوننەتی پێغەمبەرﷺ گیانی دەربچێ، چونکە حەزرەتی(خُبَیْب)ﷺ لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ ئەو نوێژەو سوننەتەکانیتری ئەنجام دان و پێغەمبەریشﷺ ڕەخنەی نەبو.

ئەی موسوڵمانی ڕێزدار (صَحابَة)کانﷺ ئەوها سوور بون لە سەر ئەنجامدانی سوننەتەکانی پێغەمبەرﷺ، تا لە کاتی کوشتنیش سوننەتەکانیان لە بیر نەدەکردن، بۆیێ خوایگەورە ئەو پلە بەرزەی داونێ و بە شەهیدبوون ڕێزی لێناون، ئەوەیە: حەزرەتی(خُبَیْب)ﷺ لە دوای چل ڕۆژ لە سێدارەکەی کراوە، هێشتا نەرمو شل بوو و هیچ نەگۆڕابوو کافرەکانیش هەستیان پێدەکرد. فَرَضِيَ اللهُ عَنْ خُبَيْبٍ حَيّاً وَمَيِّتاً. (السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٢٣٥-٢٣٧).

**چوارەم: بەسەرهاتەکەی حەزرەتی( عَمْرِو بنِ أُمَيَّةَ )ﷺ بەڵگەیە لە سەر گەورەیی**

**حەزرەتی (عامِر بن فُهَيْرَة)**ﷺ، بەڵكو لە هەندێك (رِوايَة)دا هاتووە: (مَلائِكَة) ناشتویانە. جێی خۆیەتی ئەو پلەیەی بدرێتێ؟ چونكە كە پێغەمبەرﷺ لە ئەشكەوتی (ثَوْر)دا بوو، حەزرەتی(عامِر)ﷺ مەڕو بزنەكانی دەهێنانە دەورەی ئەشكەوتەكەو دەیدۆشینو شیرەكەی دەدا پێغەمبەرﷺ ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ، هەروەك لە باسی (كۆچكردن)دا باسمان كرد.

**جا بزانە:** ئەگەر كافرێك پەیمانی لەگەڵ موسوڵمانێك هەبێ، جا موسوڵمانێك بیكوژێ، واجبە خوێنەكەی بدرێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ خوێنی هەردوو كوژراوەكەی (عَمْرو)ی دا خزمەكانیان، چونكە واجبە: موسوڵمان وەفاداری پەیمانیخۆی بێو بیهێنیتە جێ.

**پێنجەم: (رَبِيعَة)ی كوڕی (أبِىبَراء) گوتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەگەر لێدانێك لە (عامِر بن الطُّفَيْل) بدەم ئەم عەیبە لە باوكم لادەچێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ.**

**پرسیار:** (رَبِيعَة) نەیگوت: (عامِر) دەكوژم. بەڵكو گوتی: لێیدەدەم. ئەی بۆچی پێغەمبەرﷺ لە بەرامبەر ئەو تاوانە گەورەیە بە تەنها لێدانێك ڕازی بوو؟

**وەڵام:** پێغەمبەرﷺ زۆر باش دەیزانی: هۆزەكەی (بَنِىعامِر) هەڵوێستێكی بێ لایەنیان هەبوو لە شەهیدكردنی (صَحابَة)كانداو ڕێزیان لە پەیمانی (أبِىبَراء)ی سەرۆك هۆزەكەیان گرتو گوێڕایەڵی (عامِر) نەبونو بەشداری جەنگەكەیان نەكرد، بەڵام لە هەمان كاتیشدا ئەم هۆزە ڕازی نابێ گەورە پیاوێكی هۆزەكەیان —كە(عامِر بن الطُّفَيْل)ی كافرە -لعنه الله— لە تۆڵەی (صَحابَة)كانﷺ بكوژرێ، چونكە ئەوان كافرن، بۆیێ پێغەمبەرﷺ بە تەنها لێدانێك ڕازی بوو تاكو پاكانەی (أبُوبَراء) ئاشكرا ببێ، جا بەم لێدانەش (أبُوبَراء) دڵی دەرمان نەبو، بەڵكو لە خەفەتو قینی كرداری برازایەكەی مرد، هەروەها (عامِر بن الطُّفَيْل)ش بەم لێدانە نەمرد، بەڵكو پێغەمبەرﷺ دوعای لێكردو بە تاعون مرد. (السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٢٤٣).

**شەشەم: جۆرەكانی (نَسْخ)**، لەبارەی (صَحابَة)كانی (بِئْرمَعُونَة)ﷺ ئەم ئایەتە لە قوڕئان هاتە خوارەوە، ئینجا (نَسْخ) بووە: ﴿بَلِّغُوا قَوْمَنا فَقَدْ لَقِينا رَبَّنا فَرَضِيَ عَنّا وأرْضَانا﴾ رواه الشيخان.

**(نَسْخ): لابردن=نەهێشتن**، بە (إجْماع)ی هەموو زانایانیئیسلام: (نَسْخ) هەیە، تەنها جولەكەكان دەڵێن (نَسْخ) نیە. **جا بزانە:** (نَسْخ) لە قوڕئاندا سێ جۆرە:

**یەكەم:** (نَسْخُ التِّلاوَةِ وَالْحُكْم) لابردنی خوێندنەوەو بڕیارەكەشی وێكڕا: وەك حەزرەتی (عائِشَة)-رضي الله عنها- گێڕاویەتیەوە: ﴿كانَ فِيمَا أُنْزِلَ مِنَ الْقُرْآن عَشْرُ رَضَعاتٍ مَعْلُوماتٍ يُحَرِّمْنَ، ثُمَّ نُسِخْنَ بخَمْسٍ مَعْلُوماتٍ...الحديث﴾ رواه مسلم واصحاب السنن، واتە: **پێشدا ئایەتی (عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُوماتٍ يُحَرِّمْنَ) لە قوڕئاندا هەبوو، واتە: دە جار شیرخواردنی زاندراو حەرامی دەگەیێنن، ئینجا خوێندنەوەو بڕیارەكەی ئایەتەكە هەردووكی (نَسْخ) بونەوە بە پێنج جار شیرخواردن...هتد.**

**دووەم:** (نَسْخُ الْحُكْمِ دُونَ التِّلاوَة) لابردنی بڕیارەكە، بەڵام خوێندنەوەكەی هەر بمێنێ:

وەك ئەو ئایەتانەی لە قورئاندا فەرمان دەكەن: موسوڵمان خۆ ڕابگرنو واز لە كافرەكان بێنن، خوێندنەوەیان لە قورئاندا ماوە، بەڵام بڕیارەكەیان (نَسْخ) بۆتەوە بە (آيَةُ السَّيْف)= ئایەتی شمشێر، واتە: ئایەتی ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً﴾ التوبة:٣٦، **جەنگ لە دژی كافرەكان بكەن بە گشتی**. ئەم ئایەتەیشمشێر بڕیاری (١٢٤)سەدو بیستو چوار ئایەتی قورئانی (نَسْخ) كردونەوەو تەنها خوێندنەوەیان ماوە.

**سێیەم:** (نَسْخ التِّلاوَة دُونَ الْحُكْم) لابردنی خوێندنەوەكە، بەڵام بڕیارەكەی هەر بمێنی: وەك ئایەتەكەی (بِئْرِمَعُونَة)یڕابردوو، ئێستا لە قورئاندا نەماوە، بەڵام بڕیارەكەی-كە ڕازیبوونی خوایە لە شەهیدان-هەر ماوە.

هەم وەكو ئایەتی ﴿اَلشَّيْخُ والشَّيْخَةُ إذا زَنَيا فَارْجُمُوهُمَا اَلْبَتَّةَ﴾ رَوَى النّسائيُ أنّها كانت في سُورَة الأحزاب، واتە: **پیرەمێردو پیرەژن هەر كاتێك زینایان كرد بەردبارانیان بكەن.**

ئەم ئایەتە لە سورەتی(الأحزاب)دا بوو، خوێندنەوەكەی نەماوە، بەڵام بڕیاری بەردبارانكردنی زیناكەری (مُحْصَن) هەر ماوە، هەروەك ئیمام (عُمر)ﷺ لە سەر مینبەری پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿كانَ مِمّا أَنْزَلَ اللهُ آيَةُ الرَّجْمِ، قَرَأْنَاهَا وَعَقَلْنَاها وَوَعَيْناها، رَجَمَ رَسُولُ اللهِﷺ وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ، فَأَخْشَى إنْ طالَ بالنّاسِ زَمانٌ أَنْ يَقُولَ قائِلٌ: ما نَجدُ آيَةَ الرَّجْمِ فِي كِتابِ اللهِ تَعالَى، فَيَضِلُّوا بتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللهُ، وَالرَّجْمُ فِي كِتابِ اللهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى إذا أَحْصَنَ مِنَ الرِّجَالِ والنِّساءِ﴾...الحديث رواه الشيخان وأصحاب السنن، **ئایەتی بەردبارانكردنی زیناكەر- واتە: ئایەتی ﴿اَلشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ﴾یڕابروو- یەكێك بوو لەو ئایەتانەی لە قورئان بۆ پێغەمبەرﷺ هاتبونە خوارەوە، ئێمەش ئایەتەكەمان خوێندو لەبەرمان كردو لێیشی تێگەیشتین، پێغەمبەریشﷺ زیناكەری بەردباران كردو ئێمەش لە دوای وی بەردبارانمان كرد، جا دەترسم یەكێك بڵێ: بەردبارانی زیناكەر لە قورئاندا نیەو گومڕا بن بە هۆی نەكردنی واجبێك كە خوا ناردویەتیە خوارەوە، بە ڕاستی بەردبارانكردن لە قورئاندا واجبە: لە سەر ئەو كەسەی زینای كردوە بەو مەرجەی (مُحْصَن) بێ: لە پیاوانو لە ئافرەتان.** (شرح صحيح مسلم) ب(٦) ل(٢١١)، (فتح البارى) ب(١٢) ل(١٧٦و١٧٧) و(الاتقان فی علوم القرآن) ب(٢) ل(٢٠-٢٦).

**حەفتەم: جۆرەكانی(قُنُوت)**، پێغەمبەرﷺ ماوەی مانگێك لە هەر پێنج نوێژەكاندا (قُنُوت)ی خوێند، دوعای لە بكوژەكانی حەفتا قورئانخوێنەكە دەكرد.

**بزانە:** سێ جۆرە (قُنُوت) سوننەتن:

**یەكەمیان:** ئەگەر بەڵایەك هاتە سەر موسوڵمانان-وەكو گرانیو جەنگو مردنی بە كۆمەڵو دیلبوونی زانایەكی بەرزی ئیسلام، یان سەركردەیەكی ئیسلام...هتد- ئەوە سوننەتە لە هەر پێنج نوێژەكاندا لە دوای ڕوكووعی ڕەكعەتی كۆتایی (قُنُوت) بخوێندرێ

﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: إِنَّما قَنَتَ بَعْدَ الرُّكُوعِ شَهْراً...يَدْعُوُ عَلَيْهِمْ، أَيْ عَلَى قَاتِلِي الْقُرّاءِ﴾ رواه الشيخان، **پێغەمبەر ﷺ تەنها ماوەی مانگێك لە دوای ڕوکووع (قُنُوت)ی خوێند، دوعای لە بکوژەکانی قورئانخوێنەکان دەکرد.**

**دووەمیان: لە ڕەکعەتە تاکەکەی (وَتْر) لە دوای ڕوکووع، جا لەمەیاندا دوو فەرموودە هەنە:**

**لە فەرموودەی بەهێزتردا: تەنها لە (وَتْر)ی نیوەی دووەمی ڕەمەزاندا دەخوێندرێ، چونکە ئیمام (عُمر) رضي الله عنه فەرموویەتی:** ﴿اَلسُّنَّةُ إِذا انْتَصَفَ شَهْرُ رَمَضانَ: أَنْ يَلْعَنَ الْكَفَرَةَ فِي الْوَتْرِ بَعْدَ مَا يَقُولُ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ﴾ قال الحافظ العسقلاني في التلخيص: إسناده حسن. وروى مُحَمَّد بن نصر نحوه بإسناد صحيح، **هەر کاتێك ڕەمەزان بووە نیوە، سوننەتە لە دوای (سَمِعَ اللهُ...) لەعنەت لە کافرەکان بکرێ. وە لە فەرموودەیدووەمدا– کە ئیمامی(النواوي) بە بەهێزی داناوە–: لە تەواوی ساڵێدا (قُنُوت)ی(وَتْر) سوننەتە.**

**سێیەمیان: (قُنُوت)ی نوێژی سبەینێ، لە دوای ڕوکووع** ﴿عَنْ أَنَسٍ وَعَنِ الْبَراءِ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كانَ يَقْنُتُ فِي الصُّبْحِ وَالْمَغْرِبِ﴾ رواهما البخاري ومسلم، **پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی سبەینێو مەغریبدا (قُنُوت)ی دەخوێند.**

**جا بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام (قُنُوت) لە نوێژی مەغریبدا (نَسْخ) بۆتەوە، هەروەك ئیمامی (الطحاوي)و ئیمامی(النواوي) فەرموویانە. بەڵام لە نوێژی سبەینێدا پێغەمبەر ﷺ بەردەوام (قُنُوت)ی خوێندووە** ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَنَتَ شَهْراً يَدْعُو عَلَيْهِمْ ثُمَّ تَرَكَ، وَأَمّا فِي الصُّبْحِ فَلَمْ يَزَلْ يَقْنُتُ حَتَّى فارَقَ الدُّنْيا﴾ حديث صحيح رواه الدارقطني بأسانيد صحيحة وصححه الحاكم والبيهقي والنواوي، **پێغەمبەر ﷺ ماوەی مانگێك لە هەموو نوێژەکاندا (قُنُوت)ی دەخوێند دوعای لە دژی کافرەکان دەکرد، ئینجا وازی لێهێنا، بەڵام لە نوێژی سبەینێدا بەردەوام (قُنُوت)ی دەخوێند تا وەفاتی کرد.**

**هەروەها هەرچوار (خَلِيفَة)ی پێغەمبەریش ﷺ رضي الله عنهم لە نوێژیسبەیناندا (قُنُوت)یان خوێندوە** ﴿عَنِ الْعَوّامِ بن حَمْزَةَ قالَ: سَأَلْتُ أَبا عُثْمانَ عَنِ الْقُنُوتِ فِي الصُّبْحِ؟ قالَ: بَعْدَ الرُّكُوعِ. قُلْتُ: عَمَّنْ؟ قالَ: عَنْ أَبِىبَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمانَ رضي الله عنهم﴾ رواه البيهقي وقال: هذا إسناد حسن...ثم قال: ﴿وَهَذا عَنْ عَلِيٍ رضي الله عنه صَحِيحٌ مَشْهُورٌ﴾ **لەبارەی (قُنُوت)ی نوێژیسبەینان پرسیارم لە (أَبُوعُثْمان) کرد؟ ئەویش فەرمووی: لە دوای (رُكُوع) دەخوێندرێ. گوتم: لە کێ وەرتگرتووە؟ فەرمووی لە (أَبُوبَكْر)و (عُمَر)و (عُثْمان) رضي الله عنهم وەرمگرتوە...هەروەها (قُنُوت)ی نوێژی سبەینان بە (سَنَدٍ صَحِيح) لە ئیمام (عَلِي)ش رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە.**

**ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، وا بە چاوی خۆت دەبینی–لە لای ئیمامی(الشافعي)– بە بەڵگەی حەدیسە (صحيح)ەکانیڕابردوو: (قُنُوت) لە نوێژیسبەیناندا سوننەتە، جا ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە: هەندێك فەریکە خوێندەواری ناتێگەیشتوو پێشنوێژی دەکەنو (قُنُوت)ی نوێژی سبەینان ناخوێننو دەڵێن: (بِدْعَة)یە! سەیرە: خۆ ئەو گوتەیە وای لێدەفامێتەوە**

زانایانی مەزهەبی(الشافعي) هەموویان بیدعەكار بن!. نا، نا، ئەوان تێنەگەیشتونو لە واتەی حەدیسەكاندا بە هەڵەدا چوینەو ناتوانن ئەو سێ جۆرانە لێك جیا بكەنەوە؟ ئەگەر نا: بۆچی موسوڵمانان لەم سوننەتەی پێغەمبەروﷺ هەرچوار (خَلِيفَة)كانﷺ بێبەش دەكەن؟.

جا ئەوەش بزانە: هەر جۆرە دوعایەك لە (قُنُوت)دا بكرێ دروستە، بەڵام ئەو (قُنُوت)ی (وَتْر)–كە پێغەمبەرﷺ فێری ئیمام (الْحَسَن)ی كوڕی حەزرەتی(فاطِمَة)ی كیژیخۆی كردوە رضي الله عنهما– لە هەموویان خێرترە، كە ئەمەیە: (اَللّٰهُمَّ اهْدِني فِيمَن هَدَيْت...) تا كۆتایی.

(السنن الكُبرى للبيهقي) ب(٣) ل(٤٢–٤٤) و(المجموع بشرح المهذب) ب(٣) ل(٤٧٤و٥١١) و(إرشاد الساري لشرح صحيح البخاري) ب(٢) ل(٢٣٣و٢٣٤).

*** *** ***

## ﴿ غەزای جولەكەكانی (بَنِيالنَّضِير) لە (مَدِينَة) ﴾

گوتمان: (عَمْرِو بن أُمَيَّة) دوو پیاوی (بَنِيعامِر)ی بە هەڵە كوشتن و پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دوو پیاوت كوشتون دەبێ من خوێنەكەیان بدەم.

جا بۆ خوێنەكەی ئەم دوو كوژراوانە، پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئیمام(أبُوبَكْر)و ئیمام (عُمر)و ئیمام (عَلي)و چەند (صَحابَة)یەكیترﷺ چونە لای جولەكەكانی (بَنِيالنَّضِير)، تاكو لێیان بپرسێ: خوێنی مرۆڤی كوژراو لە لای ئەوان چۆنە؟ هەم بۆ ئەوەش لە خوێندانەكە یارمەتیی بدەن، چونكە ئەم جولەكانەش پەیمانی جەنگ نەكردنو یارمەتیدانیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ مۆر كردبوو، لە لایەكیتریش: ئەم جولەكانە هاوپەیمانی (بَنِيعامِر)ش بون –كە هۆزی دوو كوژراوەكەیە–جا جولەكەكان گوتیان: یا (أبَاالْقاسِم)ﷺ چۆنت پێخۆشە، یارمەتیت دەدەین. جا لەم حاڵەتەشدا پێغەمبەرﷺ لە تەنیشت دیوارێكی ئەوان دانیشتبوو، جا جولەكەكان گوتیان: هیچ كاتێك ئەوهامان بۆ ڕێك ناكەوێ، كێ هەیە لە سەر بانەكەوە بەردێكی گەورەی بە سەردا بداو بمانحەسێنێتەوە؟ جا (عَمرِو بن جحاش) گوتی: من ئەم كارە دەكەم.

جا پیاوەكە چووە سەربانەكەو یەكسەر خوایگەورە هەواڵی ئەو خیانەتەی گەیاندە پێغەمبەرﷺ، بۆیە پێغەمبەرﷺ یەكسەر هەڵساو بەرەو ناو (مَدِينَة) گەڕایەوە، ئینجا (صَحابَة)كانیشﷺ بە دوایدا ڕۆیشتن تا گەیشتنەوە پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ هەواڵی خیانەتی جولەكەكانی بە (صَحابَة)كان ڕاگەیاند.

ئینجا پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)یەكی ناردە لای جولەكەكانو فەرمووی: لە بەر ئەوەی ویستتان ئەو تاوانە گەورەیە ئەنجام بدەن، پێویستە تا دە ڕۆژیتر لە شاری من بڕۆنە دەرەوە، هەر كەسێك لە دوای ئەم دە ڕۆژە بدیترێ دەكوژرێ.

جا جولەكەكان خۆیان ئامادە كرد لە (مَدِينَة) بڕۆنە دەرەوە،

المنافق) پـێ‌ی گوتن: مەڕۆنە دەرەوەو هەر لە قەڵایەکانی خۆتاندا بمێننـەوە، مـن‌و دوو هەزار کەس لە خزم‌و هۆزەکەی خۆم یارمەتیتان دەدەین‌و جەنگ دەکەین.
جا جولەکەکان ورەیان بەرز بۆوەو ناردیانە لای پێغەمبەرﷺ گوتیان: ئێمە لـە وڵاتـی خۆمان ناڕۆینە دەروەو چی دەیکەی بیکە!. ئیتر پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: (صَحابَة)کان خۆیـان بـۆ جـەنگ ئامـادە کـردو لـە مـانگی (رَبیـع الأوَّل) سـاڵی چـوارەمی کۆچـی جولەکـەکانیان‌لـە نـاو قەڵایەکانی‌خۆیانـدا- گـەمارۆ دان تـا مـاوەی پـانزە شـەو، جا لـەو ماوەیـەدا -بـە ئیزنـی خوای‌گـەورە- پێغەمبـەرﷺ فـەرمانی دا: دارخورمایـەکانی (بَنِـی النَّضِیر) ببڕن‌و بیانسوتێنن. جا ئـەوانیش بانگیـان کـرد: هۆ (مُحَمَّد)، تـۆ وێرانکاری قەدەغە دەکەی، ئەی بۆچی ئەم دارخورمایانە دەبڕی‌و دەیانسوتێنی؟.
ئـیتر (ابـن سـلُول المنـافق)ش وەعدەکـەی خـۆی نـەهێنا جـێ‌و هـیچ یارمـەتی نـەدان‌و پێغەمبەریشﷺ لە گەمارۆدانەکەیان هەر بەردەوام بوو، تا خوای‌گەورە ترسی خستنە نـاو دڵـی جولەکـەکان‌و تکایـان لـە پێغەمبـەرﷺ کـرد: نـەیانکوژێ‌و ئیزنیـان بـدا لـە (مَدِینَة) بڕۆنە دەرەوەو تەنها باری وشترێك ماڵی‌خۆیان لەگەڵ خۆیانـا ببـەن، چەك‌و کەل‌وپەلی جەنگیش هەمووی بەجێ بێڵن. جا پێغەمبەرﷺ بـەم مەرجانـە ڕازی بـوو، جولەکەکانیش دەستیان بە ماڵ بارکردن کردو شتە باشەکانیان لەگەڵ خۆیانـا دەبـردو ئەندازەیەکی زۆریـش زێـڕو زیویـان بـرد، تـا (سَلاَم بـن أبی‌الْحُقَيْق) بـە تـەنها پـڕ بـە پیستەی گاجووتێك زێڕو زیـوی بـار کـردو دەیگـوت: ئەمـە بـوو ئامادەمـان کردبـوو بـۆ بڵندو نەوی زەمین. جا هەندێکیش لە جولەکەکان خانووی‌خۆیان دەڕوخاند تاکو دارە جوانەکەی سەر دەرگاکەی لەگەڵ خۆیا ببا.
ئیتر جولەکانی (بَنِی‌النَّضِیر) شەسسەد وشتریان بردو هەموویان لـە (مَدِینـَة) ڕۆیـشتن‌و چونە (خَيْبَر)، هەندێکیشیان چونە وڵاتی (شـام)، تـەنها دوو پیاویـان موسـوڵمان بـون: (یامین بن عُمَیر)و (أبُوسَعید بـن وَهـب) بۆیـێ ئـەم دووانـە مڵـك‌و ماڵەکـەیان پـارێزراو هیچیان لەدەست نەچوو.
جـا پێغەمبـەرﷺ زۆرتـرەکـەی مڵـك‌و مـاڵی جولەکـەکانی(بَنِی‌النَّـضِیر)ی بـە سـەر (مُهاجِر)ەکاندا بـەش کـردو هیـچی نـەدا (أنـصاري)ی (مَدِینـَة)، چـونکە دەسـتکەوتووی (بَنِی‌النَّضِیر) گشتی بە تایبەتی بۆ پێغەمبەرﷺ بوو، جا پێغەمبەرﷺ زەویەکانی بن دارخورمایەکانی دەکردە کشتوکاڵ‌و بژێوی ساڵێکی خێزانـەکانی لێ‌پاشـەکەوت دەکـردو زیادەکەشی بۆ چەك‌و وڵاغەکانی غەزا سەرف دەکرد، جا لەبارەی (بَنِی‌النَّضِیر)و مڵك‌و ماڵەکەیان، خوای‌گەورە سورەتی(الحَشر)ی بە تەواوی ناردە خوارەوە.

﴿غەزای (ذاتُ الرِّقَاع) لە لای (نَجْد)، هەم پێ‌ی دەگوترێ: (غَزْوَةُ الْأعاجِيب)﴾

له دوای غەزای (بَنِیالنَّضِیر)، هەواڵێك گەیشتە پێغەمبەرﷺ: کە کافرەکانی (بَنِیمُحارِب)و (بَنِیثَعْلَبَة)ی هۆزی (غَطَفان) لەشکریان کۆ کردۆتەوە بۆ جەنگیئیسلام.
جا لە مانگی (جُمادَیالأُولَی)ی ساڵی چوارەمی کۆچی، پێغەمبەرﷺ بۆ ئەم غەزایە لە (مَدِینَة) دەرچوو، حەزرەتی(أبُوذَرّالغِفارِي)ی کردە جێنیشیخۆی لە (مَدِینَة)، جا پێغەمبەرﷺ چوار سەد (صَحابَة)ی لەگەڵ خۆیا بردو ڕۆیشت تا گەیشتە (نَجد) ، لەویٚ کافرەکان پەرت بونو هیچ جەنگێك ڕوی نەدا، بەڵام هەر دوو لا لە یەکتری دەترسان، بۆیێ پێغەمبەرﷺ نوێژی عەسریٚی بە (صَلاةُالخَوْف)=نوێژیترس بە (صَحابَة)کان کرد، جا هەر لەم غەزایەش هەندێك ئافرەتی کافرەکان کەوتنە دەست (صَحابَة)کانو بە سەلامەتی گەڕانەوە (مَدِینَة).
جا لە گەڕانەوەدا شەوێك پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانرضي الله عنهم لەگەڵیەکدا دابەزینو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کیٚ ئەم شەو چاودێریمان دەکا؟ جا (عَبّاد بن بِشرالأنصاري)و (عَمّار بن یاسِرالمُهاجري)رضي الله عنهما فەرموویان: ئێمە دەبینە چاودێر. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە زارگەڵیەکەدا بنو لەویٚ چاودێریمان بکەن. جا حەزرەتی(عَبّاد)رضي الله عنه گوتیە حەزرەتی(عَمّار): سەرەتای شەوەکە ئەرکی من بیٚ، یان کۆتاییەکەی؟ حەزرەتی (عَمّار)رضي الله عنه فەرمووی: با سەرەتای شەوەکە ئەرکی تۆ بیٚ. ئینجا حەزرەتی(عَمّار)رضي الله عنه خەوتو حەزرەتی(عَبّاد)شرضي الله عنه هەڵسا دەستی بە نوێژ کرد.
جا مێردی یەکێك لەو ژنانەی (صَحابَة) گرتبونیان، سوێندی خواردبوو: واز نەهێنیٚ تا خوێنێکی (صَحابَة)ی پێغەمبەرﷺ دەرژێنیٚ. ئیتر مێردەکە بە دوای لەشکری (صَحابَة)کاندا هاتە نزیك گەڵیەکەو لە تاریکی شەویٚدا لاشەی حەزرەتی(عَبّاد)ی دیتو زانی ئەمە چاودێری لەشکرەکەیە، یەکسەر تیرێکی بۆ هاویشتو لیٚیدا، جا حەزرەتی (عَبّاد)رضي الله عنه تیرەکەی لە لاشەیخۆی دەرهێناو بەردەوام بوو لە نوێژکردنەکەی...تا تیرێکی سێیەمیشی لیٚدا، ئینجا ئەم تیرەشی لە لاشەیخۆی دەر هێناو ڕوکوعو سوجدەی بردنو هاورێیەکەی لە خەو هەڵساندو پیٚی گوت: دانیشە، من بریندارم.
جا حەزرەتی(عَمّار)شرضي الله عنه لە خەو ڕاپەڕی، جا کە کافرەکە دیتی بونە دوو کەس، زانی کارەکەی ئاشکرا بووە، بۆیێ یەکسەر هەڵا ت، جا کە حەزرەتی(عَمّار)رضي الله عنه خوێنی ئەو سیٚ برینانەی بە لاشەی حەزرەتی(عَبّاد)ەوە بینی، گوتی: (سُبْحانَ الله)! نەدەبوا لە یەکەم تیرهاویشتندا منت هەشیار کردباوە؟ حەزرەتی(عَبّاد)شرضي الله عنه فەرمووی: سورەتی (الكَهف)م دەخوێند، بۆیێ پێم خۆش نەبو بیبچڕێنم تا نوێژەکەم تەواو دەکەم، بەڵام کە بە دوای یەکدا تیری بۆ هاویشتم تۆم ئاگادار کردەوە، سوێندم بە خوا ئەگەر ترسی لە دەستدانی ئەو سەنگەرەم نەبوایە کە پێغەمبەرﷺ فەرمانی پاراستنی پیٚکردوم،

دبوا: یان بمکوژێ، یان نوێژەکەم تەواو بکەم.

حەزرەتی(جابر)ﷺ فەرموویەتی: منیش لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بە سواری وشترێکی بێهێز بۆ غەزای (ذاتُ الرِّقاع) چوم، لە گەڕانەوەدا لە هاوڕێکانم بەجێ دەمام، جا پێغەمبەرﷺ دارعەسایەکی لە وشترەکەم دا، وشترەکە وای لێهات پێشبڕکێی لەگەڵ وشترەکەی پێغەمبەرﷺ دەکرد، جا فەرمووی: ئەی (جابِر) وشترەکەت نافرۆشیە من؟ منیش گوتم: یارَسُولَ الله بە بەخشین دەیدەمە تۆ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نا، بیفرۆشە من. منیش گوتم: یارَسُولَ الله مامەڵەم لەگەڵ بکە، بە چەند لێم دەکڕی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بە دیرهەمێك!. گوتم: نا، زەرەر دەکەم. فەرمووی: بە دوو دیرهەم!. گوتم: نا. ئیتر هەر بۆی زیاد کردم تا گەیشتە (أوقیَة)=چل دیرهەمی زیو، جا گوتم: یارَسُولَ الله بەم نرخە ڕازی بوی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، تا دەشگەینەوە (مَدِینَة)، تۆ هەر لە سەر پشتی وشترەکە سوار ببە.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی (جابِر) ژنت نەهێناوە؟ گوتم: بەڵێ، بێوەژنێکم هێناوە. فەرمووی: ﴿هَلاّ بِكْراً تُلاَعِبُها وَتُلاَعِبُكَ﴾رواه الشيخان، بریا کچێکت مارە کردبا، تاکو یاریی لەگەڵ بکەیو یاریت لەگەڵ بکا؟ گوتم: باوکم لە غەزای (أُحُد) شەهید بوو، حەفت کیژی لە دوا بەجێمان، بۆیێ ویستم ژنێکی وەها بێنم ئەوانیش خزمەت بکا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کارێکی چاکت کردوە إِنْ شاءَ الله، جا کە لە (مَدِینَة) نزیك بوینەوە لە (صِرار)دا هەندێك وشتر سەر دەبڕینو ئەو ڕۆژە لەوێ دەمێنینەوە، جا هاوسەرەکەت هەواڵی گەڕانەوەت دەزانێو تۆز لە بالیفەکان دادەکوتێ. گوتم: یارَسُولَ الله بالیفمان نینە. فەرمووی: لەمەودوا بالیفتان بۆ دەبن، جا کە گەیشتیەوە جێ بە هەشیاری کار بکە.

جا کە گەڕاینەوە (مَدِینَة)، وشترەکەم بۆ پێغەمبەرﷺ بردە بەر دەرگەی ماڵەکەی، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی کوڕی برام وشترەکەی خۆت بۆ خۆت. فەرمانیشی بە (بلال) کرد: پارەی وشترەکەشی بە زیادەوە دامێو هەر لە زیادبووندا بوو.

## ﴿ غەزای (بَدْرُ الآخِرَة)= بَدْرُ الْمَوْعِد ﴾

لە غەزای (أُحُد) باسمان کرد: (أبُوسُفْیان) بە موسوڵمانانی گوت: ساڵیداهاتوو لە (بَدْر) جەنگێکیتر دەکەین؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی پێی بڵێن: باشە.

بۆیێ ئەم غەزایە پێی دەگوترێ: (بَدرُالمَوْعِد)، واتە: وەعدەدراو. جا هەر لە سەر ئەو وەعدەیە پێغەمبەرﷺ لە مانگی (شَعْبان)ی ساڵی چوارەمی کۆچی، هەزارو پێنجسەد (صَحابَة)ی لەگەڵ خۆیا بردنو لە (بَدر) دابەزینو ماوەی هەشت ڕۆژان لەوێ مانەوە

چاوەڕوانی هاتنی لەشکری کافرەکانیان دەکرد، جا لەشکری کافرەکانیش لە (مَكّة) وەڕێکەوت، تا گەیشتنە (مَجَنّة)، لەوێ (أبُوسُفيان) گوتی: ئەم ساڵەمان کەلکی ئێمەی نیە، با بگەڕێینەوە. جا هەر لەوێ لەشکری کافرەکان گەڕاوە بۆ (مَكّة)و نەوێران بێنە جەنگی (بَدر)، بۆیێ پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانیش رضي الله عنهم لە دوای هەشت ڕۆژان گەڕانەوە بۆ (مَدِينَة).

## ﴿ غەزای (دُومَةُ الْجَنْدَل) لە وڵاتی شام ﴾

هەواڵێك گەیشتە پێغەمبەرﷺ: کە لە (دُومَةُ الجَندَل) کۆمەڵێکی زۆر کۆ بوینەوەو ستەم لە ڕێبواران دەکەنو دەیانەوێ لە (مَدِينَة) نزیك ببنەوە.

جا لە کۆتایی ساڵی چوارەمی کۆچی –لە (رِوايَة)یکدا: لە (رَبيع الأوَل)ی ساڵی پێنجەمی کۆچی– پێغەمبەرﷺ هەزار (صَحابَة)ی لەگەڵ خۆیا بردو شەوێ دەڕۆیشتنو ڕۆژێ خۆیان پەنهان دەکرد، تا گەیشتنە نزیك (دُومةُالجَندَل)، بەڵام کافرەکان ئاگادار بونەوەو هەر یەکەیان بەرەو لایەك هەڵاتن، جا پێغەمبەرﷺ ماوەی چەند ڕۆژێك لەوێ مایەوەو هیچ کەسێکی دەست نەکەوت، تەنها پیاوێکیان گرت، ئەویش موسوڵمان بوو، جا پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانرضي الله عنهم بە سەلامەتی گەڕانەوە (مَدِينَة).

هەروەها لە مانگی (شَوّال)ی ساڵی چوارەمی کۆچی پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(أمُّ سَلَمَة)ی لەخۆی مارە کرد رضي الله عنها، هەر لەم ساڵەی چوارەمدا لە مانگی (ذِیالْقَعدَة)دا حەزرەتی (زَيْنَب بنت جَحْش)ی لەخۆی مارە کرد رضي الله عنها، هەر لەم ساڵەی چوارەمدا لە کاتی گەمارۆدانی (بَنِیالنَّضير) شەراب حەرام کرا. (البداية والنهاية)ب(٢) ل(٤٣١–٤٤٩) و(السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٣٥٦–٣٧٦) و (ب:٣) ل(٤٤٨).

## ﴿ گوڵبژێریك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: جولەکەکانی (بَنِیالنَّضِير) هەوڵیان دا بەردێکی گەورە بە سەر پێغەمبەرداﷺ بدەن، خوایگەورەش پێغەمبەریﷺ لەم خیانەتە ئاگادار کردەوە.**

ئەمەش پەیمانشکاندنو خیانەتکاریەکیتری جولەکەکانە، پێش ئەوانەش جولەکەکانی (بَنِي قَيْنُقاع) پەیمانیانیان شکاندو سوکایەتییان بە ئافرەتێکی موسوڵمان کردو موسوڵمانێکیشیان شەهید کرد، جا بە درێژایی مێژوو جولەکەکان هەر لە خراپەکاریو دوژمنکاریدا بون، بە جۆرێکی وەها زماندرێژی دەکەنە سەر زاتی خواو پێغەمبەرەکان–عليهم الصلاة والسلام–، هەروەك لە باسی (بَنِیقَيْنُقاع)دا ڕوونمان کردەوە.

جا لێرەدا (مُعْجِزَة)یەکیتری پێغەمبەرﷺ وەدەرکەوت: کە خوایگەورە هەواڵی ئەو خیانەتەی بۆ ناردو لە کوشتن پاراستی، جا خوایگەورە منەت لە سەر ئێمەی موسوڵمان دەکا: کە پێغەمبەری ئێمەیﷺ لە کوشتن پاراستووەو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا

اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَنْ يَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَاتَّقُوا اللهَ وَعَلَى اللهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ المائدة: ١١، **ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە نیعمەتی خوا باس بکەن: ئەو کاتەی گەلێ جولەکە هەوڵیان دا بە خراپە دەستیان بۆ ئێوە درێژ بکەن و پێغەمبەرەکەتانﷺ بکوژن، خوایگەورە دەستی ئەوانی قەدەغە کردو ئێوەی پاراست، ئێوە لە خوا بترسن، ئیماندارەکانیش با پشت هەر بە خوا ببەستن.**
(فقه السيرة، للبوطي) ل(٢٧٨) و(سيرة الصلابي)ب(٢) ل(١٨٦).

**دووەم: پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: دارخورمایەکانی (بَنِیالنَّضِير) ببڕن.** خوایگەورە ئەم کارەی پێغەمبەریﷺ بە کارێکی باش داناو فەرمووی: ﴿مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ﴾ الحشر: ٥، **هەر دارخورمایەکی باشتان بڕیبێ، یان نەتانبڕیبێ و هەر لە سەر بنکیخۆی مابێتەوە، هەمووی بە ئیزنی خودایەو بە ڕێگایەکی شەرعی ئەو کارەتان کردوە، تاکو خوایگەورە فاسقەکان سەرشۆڕو شەرمەزار بکا.** واتە: کە دەیانگوت: هۆ (مُحَمَّد) بۆچی کاری تێکدەرانە دەکەی؟ واتە: ئەو داربڕینەی دوژمن کاری تێکدەرانە نیە.

کەوابوو: بۆ سەرکردەی موسوڵمان دروستە درەختەکانی دوژمن ببڕێ، ئەگەر بەرژەوەندی تێدا بێ و دوژمن خەفەتبار ببێ و شکست بێنێ، ئەمە بڕیاری هەر چوار ئیمامەکەی سەر مەزهەبە. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ب(٧) ل(٣١٢).

**سێیەم: پێغەمبەرﷺ زۆرترەکەی ملك و ماڵی (بَنِی النَّضِير)ی بە سەر (مُهاجِر)ەکاندا بەش کردو هیچی نەدا (أَنْصار)ی (مَدِينَة).** پێغەمبەرﷺ (أنْصار)ی کۆ کردنەوەو وتارێکی خوێندەوەو زۆر سوپاسی کردن: کە ئەوان (مُهاجِر)ەکانیان حاواندونەوەو لە ماڵەکانی خۆیاندا جێیان کردونەوە، ئینجا فەرمووی: **﴿برا (مُهاجِر)ەکانی ئێوە هیچ ملك و ماڵیان لێرە نیە، جا ئەگەر ئێوە حەز دەکەن: ئەم دەستکەوتووەی (بَنِیالنَّضِير) لە نێوان ئێوەو ئەواندا بەش دەکەم و با ئەوانیش هەر لەگەڵ ئێوەدا بن لە ماڵەکانتاندا، ئەگەر حەزیش دەکەن: دەستکەوتووەکە تەنها ئەدەمە (مُهاجِر)ەکان تاکو لە ناو ئێوە بچنە دەرەوە؟﴾.**

جا (أنصار) فەرموویان: يا رَسُولَ اللهِ ئێمە ڕازی دەبین با (مُهاجِر)ەکان هەر لە ماڵەکانی ئێمەدا بمێننەوەو دەستکەوتووەکەش تەنها بدە ئەوان. جا پێغەمبەرﷺ زۆربەی دەستکەوتووەکەی دایە (مُهاجِر)ەکان و ئەوانیش لە خانووەکانی (أنْصار) گواستیانەوە بۆ خانووەکانی (بَنِیالنَّضِير)و خانووەکانیان بۆ خاوەنەکانیان گەڕاندەوە.

**جا بزانە:** (أنْصار) میوەی دارخورمایەکانیشیان دابووە (مُهاجِر)ەکان: جا هەبوو بە خوڕایی میوەکەی وەردەگرت و هیچ کاری تێدا نەدەکرد، هەشبوو کاری لە دارخورمایەکاندا

دەكردو نیوەی میوەكەشی لە خاوەنەكەی وەردەگرت، ئینجا لـە دوای غـەزای (خَیْبَـر)ش (مُهاجِر)ەكان تەواوی دارخورماو بەخشراوەكانیتریان بۆ (أنْصار)ی (مَدِینَة) گەڕانەدەوە، چونكە (مُهاجِر)ەكان دەولەمەند بـونو پێویـستیان نـەما. (السیرة الحلبیـة) ب(٢) ل(٣٦٤-٣٦٦) و(سیرة الصلابي) ب(٢) ل(١٩٤و١٩٥).

**چوارەم: ملكو ماڵی جولەكەكانی (بَنِیالنَّضِیر) بـە تـایبـەتی هـەمووی بـۆ پێغەمبـەرﷺ بوو، بژێوی ساڵێكی لێ پاشەكەوت دەكرد.** بڕیاری شەرع لەبارەی تاڵانو دەستكەوتووی كافرەكـان لـە بەرگی چوارەمی (ڕووناكی (رب العالمین)دا ڕوونم كردۆتەوە، لەوێ بیخوێنەوە.

جا لەبارەی ئەم پاشەكەوتكردنە، ئیمامی(النواوي) فەرموویـەتی: پـێش تـەواوبوونی سـاڵ پێغەمبەرﷺ ئەم پاشەكەوتكراوەی لە ڕووەكانیچاكە سەرف دەكرد، واتە: پاشكەوتكراوەكە پێش تەواوبوونی ساڵ هیچی نەدەما، بۆیێ كە پێغەمبـەرﷺ وەفـاتی كـرد، زرێیەكـەی بـە بارمتەی هەندێك جۆ لە لای جولەكەیەك داندرابوو، كە بە قەرز بۆ خێزانەكانی لێی كڕیبوو، پێغەمبەرﷺ هیچ كاتێك سێ ڕۆژ بە دوایەكدا تێر نەبووە، چەندەها حەدیسی (صَحِیح) هەنە: كە پێغەمبەرﷺ خۆیو خێزانەكانی بە زۆری برسی بوینە.

جا دەفەرموێ: حەدیسەكە بەڵگەیە: دروستە مرۆڤ بژێوی ساڵێك بۆ خێزانەكەی پاشەكەوت بكا، ئەمە زیان لە پشتبەستن بە خوا نادا، بەو مەرجەی ئەم پاشەكەوتە لە بەرهەمی ملكی خۆی بێ، بەڵام ئەگەر لە بازاڕ بژێوەكە بكڕێ، ئەو كاتە تەنها ئەندازەیەكی وەهـا دروسـتە بكڕێ: كە تەنگانە لە ناو خەڵكیدا پەیدا نەكا، كەواتە: ئەگەر ئازوقە لە بازاردا زۆر هەبوو، مەترسیی تەنگانەش نەبو، ئەو كاتە دروستە بژێوی ساڵێك لە بازاڕیش بكڕێ.

**جا بزانە:** ئەگەر گرانیو نەبوونی پەیدا بوو، ئەو كاتە بۆ كاربەدەستیئیسلام دروستە: بە زۆرلێكردن ئازوقەی ئەو كەسانە بفرۆشێ كە لە پێویستی خۆیـان زیاتریـان هەیـە، ئەگـەر كڕیارەكان هیچیان نەبێ پێی بـژێن. (شـرح صـحیح مـسلم) ب(٧) ل(٣٣٦) و(تحفة المحتـاج بحاشـیة الشرواني) ب(٤) ل(٢٢٩) و(ب:٩) ل(٢٢١).

**پێنجەم: غەزای (ذاتُ الرِّقَـاع) واتە: غەزای خاوەنیپەڕۆیەكان**، چـونكە لـەم غەزایـەدا (صَحابَة)كانﷺ پێیان برینداربونو پەڕۆكیان لێبەسـتن. هـەم پـێی دەگـوترێ: (**غَـزْوَةُ الْأعاجِیب**) **غەزای ڕووداوە سەیرەكان. هەندێك لەو ڕووداوە سەیرانە:**

١- لە گەڕانەوەی پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)كانﷺ لە كاتی پشوودانی نیـوەڕۆدا گەیـشتنە دۆڵێكی پڕ درەخت، جا (صَحابَة)كانﷺ لە سێبەری درەختەكاندا پـەرت بـونو خـەوتن، پێغەمبەریشﷺ لە بن درەختێك خەوتو شمشێرەكەشی بە درەختەكەوە هەڵواسـی، جـا حەزرەتی(جابر)ﷺ فەرمووی: لە ناكاو پێغەمبەرﷺ بانگی كردین، كە چوینە لای دیتمان عـەرەبێكی دەشـتاوی لـە لای دانیـشتووە، جـا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: لـەو كاتـەی مـن خەوتوو بوم ئەم پیاوە شمشێرەكەی منـی لـە كێلانەكـەی هەڵكیـشا، جـا منـیش هەشـیار

بومەوەو پێی گوتم: کێ لە من دەتپارێزێ؟ منیش گوتم: (ٱللّٰه) دەمپارێزێ. جا پیاوەکە شمشێرەکەی خستەوە کێلانەکەی‌و لەوێ دانیشت، پێغەمبەریش‌ﷺ هیچ سزای نەدا.

**جا بزانە:** لە غەزای (ذِی أَمَرّ)دا وێنەی ئەم ڕووداوە ڕابرا، پیاوەکەی هەردوو ڕووداوەکەش ناوی (غَوْرَث) بوو، بەڵام پیاوەکەی ئەوێ (دُعْثُور)شی پێدەگوتراو موسوڵمان بوو و پەیمانی جەنگ نەکردنیشی دا پێغەمبەرﷺ، پیاوەکەی ئێرەش موسوڵمان نەبو. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٣٥١و٤٤١).

٢-هەر لەم غەزایەدا ئافرەتێك کوڕێکیخۆی هێنا خزمەت پێغەمبەروﷺ گوتی: ئەم کوڕەم توشی بەڵا بووە، واتە: شەیتان شێتی کردوە، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بمدە دەست. جا پێغەمبەرﷺ دەمی منداڵەکەی کردەوەو سێ جار تفی تێکردو فەرمووی: ﴿بِسْمِ اللهِ، أَنَا عَبْدُاللهِ-وَفِي رِوايَةٍ- أَنَا رَسُولُ اللهِ، إخْسَأْ عَدُوَّ اللهِ﴾ **واتە: بە ناوی خوا، من بەندەی خوامە، پێغەمبەریخوامە، زەلیل بە، دور کەوە ئەی دوژمنیخوا، واتە: ئەی شەیتان.** جا منداڵەکەی داوە دەست دایکەکەی‌و فەرمووی: کە گەڕاینەوە لەم شوێنە وەرە لامان‌و پێمان بڵێ: کوڕەکەت چیکردوە؟ جا کە پێغەمبەرﷺ لە غەزایەکە گەڕاوە، هەر لەو شوێنە ئافرەتەکە هاتەوە لای‌و سێ مەڕی پێ بون‌و گوتی: سوێندم بەو خوایەی تۆی کردوە بە پێغەمبەرﷺ تا ئێستا هەستمان بە هیچ شێتیەکی منداڵەکە نەکردوە. جا پێغەمبەرﷺ مەڕێکی لێوەرگرت‌و دووەکانیتریشی دانەوە.

٣-هەر لەم غەزەیەدا دوو درەخت هاتنە لای یەکتری‌و پێغەمبەریانﷺ داپۆشی لە کاتی میزکردن‌و پیسایی کردن.

٤-هەر لەم غەزایەدا وشترێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ، فرمێسکی لە چاوەکانی دەهاتە خوارەوەو شکایەتی لە خاوەنەکەی کردو گوتی: هەتا پیر بوم هەر کاری پێکردم، ئێستاش دەیەوێ سەرم ببڕێ!. جا پێغەمبەرﷺ بە خاوەنەکەی فەرموو: یان بە فرۆشتن، یان بە بەخشین بیدە من. جا خاوەنەکەشی بە بەخشین دایە پێغەمبەرﷺ. ئیمام (أحمد)و (البزار)و (الطبراني) هەرسێك (مُعْجِزَة)کانیان گێڕاوەتەوەو (الحافظ الهيثمي)ش فەرموویەتی: (سند)ێکی ئیمام (أحمد) پیاوانی حەدیسی (صحيح)ن. (مجمع الزوائد ومنبع الفوائد) ب(٨) ل(٤٠٠) و(الخصائص الكبرى) ب(١) ل(٢٢٦)و (السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٣٧١و٣٧٢).

**شەشەم: پێغەمبەرﷺ لە غەزای (ذات الرِّقاع)دا نوێژی عەسریی بە (صَلاةُ الْخَوْف) کرد.**

**بزانە:** (صَلاةُ الْخَوْف)=نوێژی کاتی ترس چەند جۆرێکی هەنە لە حەدیسی(صحيح)دا هاتون، بەڵام زۆربەیان ئەمڕۆ بە جەماعەت ناگونجێن؟ چونکە جەنگی ئەم سەردەمە بەگوللەو تۆپ‌و موشەك‌و فڕۆکەیە، تەنها یەك جۆریان بە تەنهایی لە کاتی (شِدَّة الْخَوْف)= ترسی بەهێزدا دەگونجێ: وەك لە جەنگدا هەر دوو لا تێکەڵ بن، یان تێکەڵ نەبن، بەڵام ترس زۆر بەهێز بێ‌و نەگونجێ بە ئاسایی نوێژەکە بکەن، ئەو کاتە هەر کەسەیان بۆ خۆی

به تەنهایی نوێژەكە دەكا چۆن بۆی بگونجێ: بە پێوە، یان بە دانیشتوویی، ڕوو لە قیبلە، یان پشت لە قیبلە، بە ڕاوەستایی، یان بە ڕاكردنو غاردان، جا دروستە لەم حاڵەتانەدا چەك بە كار بێنی، بەڵام نابێ نەعرەتە لێبداو هاوار بكا، چونكە نوێژەكەی بەتاڵ دەبێ، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿(فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَاناً)البقره: ٢٣٩، قالَ ابنُ عُمَرَ رضیالله عنـهما فِي تَفْسِيرِها: (مُسْتَقْبِلِیالْقِبْلَةِ وَغَيْرَ مُسْتَقْبِلِيها)﴾رواەالبخاري، **ئەگەر ئێوە ترسان، نوێژەكەتان بكەن: بە پیادەیی و یان بە سواری، ڕووتان لە قیبلەبێ، یان نا.**

**جا بزانە:** ئەم جۆرە نوێژەی ترسیبەهێز لە دوای غەزای (خَنْدَق) ئایەتەكەی هاتە خوارەوە، هەروەك لەگوڵبژێرەكەی ئەوێدا بەڵگەی بۆ دێنین، ان شاء الله تعالى. كەواتە: بە هیچ جۆرێك خوایگەورە ڕێگای نەداوە نوێژەكە لە كاتیخۆی دوا بخرێ، یان نەكرێ. (فتح الباري) ب(٢) ل(٥٥٦و٥٥٧) و(تحفةالمحتاج لشرح المنهاج) ب(٢) ل(١٢-١٥).

**حەفتەم: لە مانگی (شَوّال)ی ساڵی چوارەمی كۆچی پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(أُمُّ سَلَمَة)ی لەخۆی مارە كرد** رضیالله عنها، لە باسی كۆچكردندا گوتمان: حەزرەتی(أَبُوسَلَمَة)ی مێردی ئەم (أُمُّ سَلَمَة)یە رضیالله عنهما، یەكەم موسوڵمان بوو كۆچی كرد بۆ (مَدِينَة)و خەزورەكانیشی ژنەكەو كوڕە ساواكەیان لێسەندن...هتد، جا حەزرەتی(أَبُوسَلَمَة)رضي الله عنه لە غەزای (أُحُد) بریندار بوو، پاش ماوەیەك برینەكەی هەڵوەشاوەو بەو برینە وەفاتی كرد، جا لە بەر ئەوەی حەزرەتی (أُمُّ سَلَمَة) كیژە مامی (أَبُوجَهْل)ی دوژمنی خوا بوو، لە (مَدِينَة)ش مێردی مرد و بە تەنهایی كۆمەڵە منداڵێكی بە كۆڵدا مانەوە، بۆیێ كە (عِدَّة)ی تەواو بوو، پێغەمبەرﷺ ئیمام (عُمر)ی ناردە خوازبێنی، جا حەزرەتی(أُمُّ سَلَمَة) رضیالله عنها وەڵامی داوە: منداڵم زۆرن پێویستیان بە بەخێوكردن هەیە. پێغەمبەریشﷺ وەڵامی داوە: بەخێوكردنی منداڵەكانت لە سەر خواو پێغەمبەرە، واتە: لە سەر تۆ نابێ. جا (أُمُّ سَلَمَة) رضیالله عنها بە ئیمام (عُمر)ی گوت: ڕازی بوم مارەم بكە. جا (سَلَمَة)ی كوڕی (أُمُّ سَلَمَة) لە پێغەمبەرﷺ مارەی كردو بووە (أُمّ الْمُؤْمِنِين)=دایكیئیمانداران.

جا لێرەدا بۆیێ دروست بوو: كوڕ ببێتە سەرپەرشتكاری مارەبڕینی دایكیخۆی، چونكە باوكی (سَلَمَة)و دایكەكەی مامۆزای یەكتری بون، كەوابوو: (سَلَمَة) كوڕی كوڕە مامی دایكی خۆیەتیو دروستە ببێتە سەرپەرشتكار، ئینجا پێغەمبەریشﷺ (أُمامَة)ی كیژی ئیمام (حَمْزَة)ی مامیخۆی رضیالله عنهما لە (سَلَمَة) مارە كرد، تاكو ببێتە پاداشتێك بۆ خێزانەكەی حەزرەتی(أَبُوسَلَمَة)، هەم بەم تێكەڵبوونە دوو لایەنیەش زاوایەتیو خەزورایەتی لەگەڵ هۆزەكەی (أَبُوجَهْل) پەیدا ببێو واز لە دوژمنایەتیئیسلام بێنن، هەم منداڵەكانی حەزرەتی (أَبُوسَلَمَة)ش هەست بە بێ باوكی نەكەن، ئەمەش یەكێكیتر بوو لە ڕەفتارە باشەكانی پێغەمبەرﷺ بۆ كەمكرنەوەی قینی دوژمنانی ئیسلام.

جا حەزرەتی(أُمُّ سَلَمَة) رضیالله عنها نزیكی نەوەد ساڵ ژیاوەو دوایین هاوسەری پێغەمبەرﷺ

بوو له وەفاتکردندا، ساڵی (٦١)شەستو یەکی کۆچی وەفـاتی کـردو لـە (بَقِیـع) نێـژراوە.
(البداية والنهاية) ب(٢) ل(٤٤٧و٤٤٨) و(عظماء حَوْلَ الرَسُولِ) ب(١) ل(١٤٤–١٥٨).

**هەشتەم: لە ساڵی چوارەمی کۆچیدا لە مانگی (ذِیالْقَعْدَة) پێغەمبەرﷺ حەزرەتی (زَیْنَب بنت جَحْش)ی لە خۆی مارە کرد** رضيالله عنها. ئەمەیان فەرمووده ڕاسـتەکەیە–هـەروەك ئیمـامی (الحلبي) فەرموویەتی– واتە: چونکە لە کاتی بوختـان پێکردنەکـەی حـەزرەتی(عائـشة)ی داهاتوودا، ئەم (زَیْنَب)یە هاوسەری پێغەمبەرﷺ بوو، هەروەك لە (شـرح)ی حەدیـسەکەی بوختانەکەدا (الحافظ: ابن حجر العسقلاني) فەرموویەتی.

ئەم (زَیْنَب)یە پێشدا ژنی حەزرەتی(زَیْد بن حارِثَة)بووﷺ، کە کۆیلەی پێغەمبەرﷺ بوو، پێغەمبەرﷺ ئـازادی کردبـوو و کردبوویـە کـوڕی خـۆیو پـێی دەگـوترا: (زَیْـد)ی کـوڕی (مُحَمَّد)ﷺ. حەزرەتی(زَیْنَب)ش رضيالله عنها کیژە پوری پێغەمبەرﷺ بوو و بۆ (زَیْد)ی داخواز کرد تاکو شووی پێبکا، بەڵام: نە حەزرەتی(زَیْنَب)و نە برایەکەشـی ڕازی نـەبون شـوو بـە (زَیْـد) بکـا؟ چـونکە حـەزرەتی(زَیْنـَب) لـە بنەماڵـە گەورەکـەی (قُـرَیْش) بـوو، حـەزرەتی (زَیْد)ش رضي الله عنه کۆیلەیەکی ئازادکراو بوو، جا خوایگەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْـصِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلالاً مُبِيناً﴾ الأحزاب: ٣٦، **هەر کاتێك خواو پێغەمبەرﷺ بڕیارێکیان دا، هیچ ئیمانداری‌کی پیاو و ئافرەت بۆی نیە لە کاروباری خۆیاندا سەرپشك بنو گوێڕایـەڵی بڕیارەکـەی خـواو پێغەمبـەرﷺ نـەبن، هـەر کەسـێك لـە بڕیـاری خـواو پێغەمبەرﷺ دەربچێ، بەڕاستی گومڕا بووە بە گومڕابوونێکی ئاشکرا.**

جا کە خوایگەورە ئەم هەڕەشەیەی نارده خوارەوە، حەزرەتی(زَیْنَب)و برایەکەشی رضيالله عنهما ڕازی بونو پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(زَیْنَب)ی لە حـەزرەتی(زَیْـد) مـارە کـرد، ئینجا خـوای گەورە پێغەمبەریﷺ ئاگادار کردەوە: کە لەمەودوا ئەم (زَیْنَب)یە دەبێتە هاوسەری، تاکو بڕیـاری بـەکوڕکردنی کـوڕی کەسـێکیتر هەڵبوەشـێنێتەوەو ژنـی بەکوڕکراوەکـەش بـۆ بەباوککراوەکە حەڵاڵ ببێو هیچیتر ئەم عادەتە نەمێنێ.

لە لایەکیتریش: ژیـانی حـەزرەتی(زَیْـد)و حـەزرەتی(زَیْنـَب) رضيالله عنهما ژیـانێکی خـۆش نـەبو، چونکە حەزرەتی(زَیْنَب) خۆی بە گەورەتر لە حەزرەتی(زَیْد) دەزانـیو زماندرێـژیی دەکـردە سەر؟ چونکە حەزرەتی(زَیْنَب) کیـژە پـوری پێغەمبـەرﷺ بـوو، بۆیـێ حـەزرەتی(زَیْـد)رضي الله عنه گوتی: یا رَسُولَ الله، (زَیْنَب) زماندرێژیم دەکاتە سەر، من تەڵاقی دەدەم؟ پێغەمبـەریشﷺ فەرمووی: ﴿أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ﴾ الأحزاب: ٣٧، **ژنەکـەت بهێڵـەوە تـەڵاقی مـەدەو لـە خـوا بترسە.**

جا پێغەمبەرﷺ دەیزانی هەر تەڵاقی دەداو حەزرەتی(زَیْنَب)ش دەبێتە هاوسـەری، بـەڵام

له لۆمەی خەڵك دەترسا بڵێن: (مُحَمَّد) ژنی کوڕیخۆی مارە کردۆتەوە. بۆیێ خوایگـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ﴾ الأحـزاب: ٣٧، **ئەو زانستە لە ناو دڵدا دەشاریەوە کە لـە مـەودوا خـوا ئاشـکرای دەکا، ئـەی پێغەمبەرﷺ تۆ لە لۆمەی خەڵك دەترسێی، بەڵام خوا شیاوترە لێی بترسێی.**

ئیتر حەزرەتی(زَیْد)ﷺ حەزرەتی(زَیْنَب)ی تەڵاق دا، جا کە (عِدَّة)ی تەواو بوو، ڕاستەوخۆ خوای گەورە حەزرەتی(زَیْنَب)ی رضیالله عنها لە پێغەمبەرﷺ مارە کرد، هـەروەك دەفـەرموێ: ﴿فَلَمَّا قَضَى زَيْد مِنْهَا وَطَراً زَوَّجْنَاكَهَـــا﴾ **جا کە (زَیْـد) کاریخۆی لـە (زَیْنـَب) بـەجێ هێناو (عِدَّة)ی تەواو بوو، ئێمە (زَیْنَب)مان لە تۆ مارە کرد.**

واتە: بێشاهیدو بێمارەبڕینو بێمارەیی، بە نوێنەرایەتی حـەزرەتی(جُبرائِیـل)ﷺ خـوای گەورە حەزرەتی(زَیْنَب)ی رضیالله عنها لە پێغەمبەرﷺ مارە کرد.

**پرسیار:** خۆ حەزرەتی(زَیْنَب) رضیالله عنها کیژە پوری پێغەمبـەر بـووﷺ، ئەگـەر لـە حاڵـەتی کچایەتیو گەنجیەتیدا خواستبای ئەوە بە شانازیەوە لێیان مارە دەکرد، ئەی بۆچی ئـەو کات نەیویست، بەڵام کە بووە بێوەژنێکی ژێر کۆیلەیەکی ئازادکراو و تەمـەنی بـووە سـیو پێنج ساڵو کچینیو گەنجایەتیی نەما، ئەو کاتە پێغەمبەرﷺ لەخۆی مارە کرد؟

**وەڵام:** خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿لِكَيْ لا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَــراً﴾ **بۆیێ خوا (زَیْنـَب)ی لـە پێغەمبـەرﷺ مارە کـرد: تـاکو ببێتـە شەریعەت: ئیماندارەکان هیچ تانەو تاوانیان لە سەر نەبێ لە مارەکردنی ژنەکانی بەکوڕکراوەکانیخۆیان کاتی پێویستیان پێنەمێنێو تەڵاقیان دان.**

واتە: بەم مارەکردنە دوو بڕیاری شەرعی داندران: **یەکەمیان:** ژنی بەکوڕکراوەکە لـە دوای تەڵاقدان بۆ بەباوککراوەکە حەڵاڵە. **دووەمیان:** عـادەتی بـەکوڕکردن لـە ئیـسلامدا بـەتاڵ کراوەو نەما، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْـــسَطُ عِنْــدَ اللَّهِ﴾ الأحزاب:٥، **بە باوکیخۆیان ناوی بەکوڕکراوەکان بێنن، ئەوە دادپەرەوەرانەترە لە لای خوا.** ئینجا لێرە بەولاوە بە حەزرەتی(زَیْد) دەگوترا: (زَیْد)ی کوڕی (حارِثَة).

حەزرەتی(زَیْنَب)ش-رضي الله عنها- بووە دایکی ئیمانداڕانو لە ساڵی بیـستی کۆچـی لـە تەمـەنی پەنجاو سێ ساڵیدا لە (مَدِینَة) وەفاتی کرد. بۆ باسی بەکوڕکردن منداڵی کەسێکیتر بروانە (ڕووناکی رب العالمین) بەرگی سێیەم، باسی دانهێنان بە نەژادی کەسێك، هەم بۆ ئـەم مارەکردنـەش بروانـە (تفـسیر ابـن کثیر) الاحزاب: (٥و٣٦و٣٧) و(السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٢٩١-٢٩٣) و (ب:٣) ل(٤٤٨).

**نۆیەم: لە کاتی گەمارۆدانی (بَنِیالنَّضِیر)، شەڕاب حەرام کـرا.** حـەڕامکردنی شـەڕاب بـە سێ قۆناغ بوو:

**لە قۆناغییەکەمدا** خوایگەورە فەرمووی: ﴿وَإِثْمُهُمَا أَكْبَــرُ مِــنْ نَفْعِهِمَــا﴾ البقـرة: ٢١٩، **گوناهی شەڕابو قومار لە سودەکەیان گەورەترە.** جا بەم ئایەتـە هەنـدێك وازیـان لـە

شەڕاب خواردنەوە هێنا، هەندێکیش وازیان نەهێنا؟ چونکە سودەکەی حەرام نەکرابوو.
**ئینجا لە قۆناغیدووەمدا خوایگەورە فەرمووی:** ﴿لا تَقْرَبُوا الصَّلاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى﴾ النساء: ٤٣، **لە حاڵەتی سەرخۆشیدا نزیك نوێژکردن مەکەون. بەم ئایەتەش لە کاتی نوێژکردندا حەرام کرا.**
**ئینجا لە قۆناغیسێیەمدا خوایگەورە فەرمووی:** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ * إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللهِ وَعَنِ الصَّلاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ﴾المائدة: ٩٠-٩١، **ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بە خواو پێغەمبەرﷺ بێگومان شەڕابو قومارو سەنەمەکانو فاڵگرتنەوە گشتی پیسەو لە کردەوەی شەیتانە، کەوابوو: خۆتان لەو پیسە بپارێزنو لێی دور کەونەوە، تاکو بەختەوەرو سەرفراز ببن، شەیتان تەنها دەیەوێ بە هۆی شەڕابو قومار دوژمنایەتی ڕقو قینە بخاتە نێوانتان، هەم دەیەوێ بە هۆی شەڕابو قومار قەدەغەتان بکا لە زیکری خواو لە نوێژکردن، جا ئایا ئێوە واز لە شەڕابو قومار دێنن کە ئەوەندە زیانیان هەیە؟ واتە: واز بێنن.**
جا کە خوایگەورە بەم ئایەتانە شەڕابی حەرام کرد، ئیمام (عُمر)رضي الله عنه فەرمووی: (**إِنْتَهَيْنا، إِنْتَهَيْنا**) خودایە وازمان هێنا، وازمان هێنا.
(صَحابَة)کانیتریش‌رضي الله عنهم دەیانفەرموو: (**حُرِّمَتِ الْخَمْرُ وَجُعِلَتْ عِدْلاً لِلشِّرْكِ**) **شەڕاب حەرام کراو کراوەتە هاوتای کافربوون.** واتە: چونکە لە ئایەتەکەدا لەگەڵ سەنەمەکاندا حەرام کراوە، ئینجا هەموو موسوڵمانەکان شەڕابەکانیان ڕژاندە ناو کوچەو کۆڵانەکانی (مَدينَة)و یەکسەر ملکەچی فەرمانی خوا بون.
**پێناسە:** پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرامٌ، وَمَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيا وَهُوَ يُدْمِنُها لَمْ يَتُبْ لَمْ يَشْرَبْها فِي الآخِرَةِ﴾ رواه الشيخان وأصحاب السنن، **هەموو سەرخۆشکەرێك شەڕابەو هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە، هەر کەسێك لە دونیادا بەردەوام شەڕاب بخواتەوە، جا بمردبێ و تۆبەی نەکردبێ، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا شەڕابی بەهەشت ناخواتەوە.**
جا پێویستە زۆر ئاگادار بین: بەو ناوانەی ئێستا بۆ شەڕاب دەگوترێن، فێڵ لە موسوڵمانان نەکرێ؟ چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَيَشْرَبَنَّ ناسٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ يُسَمُّونَها بِغَيْرِ إِسْمِها﴾ رواه الإمام أحمد وأبوداود وصححه ابن حبان، **کەسانێك لە ئوممەتی من شەڕاب دەخۆنەوە-جگە لە ناویخۆی- ناویتری لێدەنێن.**
**سزای شەڕا بخۆرەوە:** ﴿عن عَلِي:رضي الله عنه -فِي قِصَّةِ جَلْدِ الْوَلِيد-: جَلَدَ النَّبِيُّﷺ أَرْبَعِينَ وَجَلَدَ

أَبُوبَكْرٍ أَرْبَعِينَ وَجَلَدَ عُمَرُ ثَمانِينَ وكُلٌّ سُنَّةٌ، وَهَذا أَحَبُّ إِلَيَّ﴾ رواه مسلم، **پێغەمبەرﷺ چل شوڕکەداری لە شەڕابخۆر داوە، ئیمام (أَبُوبَكْر)ش چل شوڕکەی لێداوە، ئیمام (عُمر) هەشتا شوڕکەی لێداوە، گشتی ڕیبازی پێغەمبەرەﷺ، بەڵام هەشتایەکە لە لای من خۆشەویستره. جا ئەمەش بەڵگەیەکیترە کە ئیمام (علي)ﷺ زۆر ڕێزی لە ئیمام (عُمر)ﷺ ناوەو لە دوای وەفاتیشی ڕەفتاری بە ڕێبازی وی کردوە، هەروەك گوێڕایەڵی ئیمام (عُثمان)ش بووە** ﴿عن عُبَيْدِ الله بن عَدِيٍّ: أنَّ عُثْمانَﷺ أَمَرَ عَلِيّاًﷺ فَجَلَدَ الْوَلِيدَ ثَمانِينَ﴾ رواه البخاري فی مناقب عثمانﷺ، **ئیمام (عُثمان)ﷺ فەرمانی دا ئیمام (عَلِي)ﷺ: هەشتا شۆڕکەی لە (الْوَلِيد)ی شەڕابخۆرەوە دا.**

**کەوابوو: با شەمشەمەکوێرەکانی (شِيعَة)ی (رافِضِي) هەر لە کونە تاریکەکانی (ضَلالَة)دا بە کوێری بمێننەوە، کە دەڵێن: ئیمام (عُمر) ستەمی لە ئیمام (عَلي) کردوەو ئیمام (عَلي) بە (خلافة)ی ئیمام (عُمر)و ئیمام (عُثمان) ڕازی نەبوە. جا ئێمە لێیان دەپرسین: ئیمام (عَلي) ئەوەندە ترسنۆك بووە ستەم قبولٌ بکا؟!.**

**جا بزانە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿لَعَنَ اللهُ الْخَمْرَ وَشَارِبَها وَسَاقِيَها وَبائِعَها وَمُبْتاعَهَا وَعاصِرَها وَمُعْتَصِرَها وَحامِلَهَا وَالْمَحْمُولَةَ إِلَيْهِ﴾ رواه ابوداود بسند صالح، **لەعنەتیخوا لە شەڕاب بدا، هەم لە شەڕابخۆرەوەکەش لە دەرخواردەکەشی و لە فرۆشیارەکەشی و لە کڕیارەکەشی و لە بگوشەکەشی و لە داواکەری گوشینەکەش و لە هەڵگرەکەشی و لەوەی بۆ لایشی هەڵدەگیرێ.**

**کەواتە: شاگردەکانی شەڕابخانەکانو ئەو چێشتخانەو ڕێبوارخانانەی شەڕابیان تێدا دەفرۆشرێو شوفێری ئەو ئوتومبیلەی شەڕاب بار دەکاو ئەوانەی باری دەکەنو دایدەبەزێننو ئەوانەی لە کارگەی شەڕاب کار دەکەن، هەر هەموویان بەر لەعنەت کراون.**

**دیسان بزانە: لە لای (جُمْهُور)=کۆمەڵە زۆرەکەی زانایانیئیسلام: شەڕاب پیسەو نوێژی لێنایێ، بەڵام لە لای ئیمام (رَبِيعَة)ی مامۆستای ئیمام (مالك)و ئیمامی(الْمُزَنِي)ی فەقێو هاوڕێی ئیمامی(الشافعي)و چەند زانایەکیتر: خودی شەڕاب پیس نیە، بەڵکو خواردنەوەکەی حەڕامەو سزای بۆ داندراوە، هەروەك ئیمامی(القُرْطُبِي)و ئیمام (عُمَيْرَة) گێڕاویەتیانەوە.**

**کەوابوو: بۆ مەسەلەکانی گوڵاو و دەرمانەکانی پزیشکی -کە (كُحُول)ی سەرخۆشکەریان تێکەڵ دەکرێ- دروستە: بۆ نوێژکردن (تَقْلِيد)ی ئیمامی(الْمُزَنِي) بکرێ، جا لە بەر پێویستی من فەرموودەی ئەوم پێ باشترە لە (فتوا)ی هەندێك زانایانی ئەم سەردەمە، کە دەڵێن: لە بەر ناچاری (عَفْو)=لێبوردن هەیە. والله أعلم.** بڕوانە: (تفسير القرطبي) النساء: (٤٣) والمائدة: (٩٠-٩١) و(شرح صحيح مسلم) ب(٧) ل(٢٤٠-٢٤٧) و(حاشية عميرة على شرح المحلِّي) ب(١) ل(٧٠).

***　　　***　　　***

## ﴿ غەزای (بَنِی المُصْطَلِق )= (المُرَيْسيع ) لە لای (قُدَيْد )﴾

هەواڵێك گەیشتە پێغەمبەرﷺ: كە هۆزەكەی (بَنِیالمُصطلِق) بە سەركردایەتی (الحارث بن أبیضِرار) خۆیان كۆ كردۆتەوە بۆ جەنگی پێغەمبەرﷺ.

جا پێغەمبەرﷺ ڕۆژی دووشەممەی دووی مانگی (شَعبان)ی ساڵی پێنجەمی كۆچی حەفت سەد (صَحابَة)ی لەگەڵ خۆیا بردو بۆ غەزای (بَنِیالمُصطلِق) كەوتە ڕێ، بەیداغی (مُهاجِر)ەكانی دایە دەست ئیمام (أبُوبَكْر)وﷺ بەیداغی (أنصاري)یەكانیشی دایە دەست حەزرەتی(سَعْد بن عُبادَة)ﷺ، حەزرەتی(زَید بن حارِثة)شیﷺ كردە جێنیشیخۆی لە (مَدِينَة)، جا لەشكری ئیسلام ڕۆیشت تا گەیشتە سەر ئاوی (المُرَيسِيع)، لەوێ لەگەڵ لەشكری كافرەكان بە تیرهاویشتن تا ماوەی سەعاتێك ڕووبەڕوو بونەوە، دروشمی موسوڵمانەكان: (يا مَنصُور، أمِت) بوو، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانیدا (صَحابَة)كان: بە یەك پارچەیی هەڵمەتیان بردە سەر كافرەكانو دە كەسیان لێكوشتنو ئەوانیتریش بە ئافرەتو منداڵەوە گشتی بە دیل گیران: كە ژمارەیان حەفتسەد كەس زیاتر بوو و خێزانەكانی دوو سەد ماڵ بون، هەروەها: دوو هەزار وشترو پێنج هەزار بزنو مەڕ كەوتە دەست لەشكری ئیسلام.

جا لەم غەزایەدا تەنها یەك (صَحابَة) بە هەڵە بە دەستی (صَحابَة)یەكیتر كوژرا، جا پێغەمبەرﷺ تاڵانو دیلەكانی بە سەر موسوڵمانەكاندا بەشكردن، جا (بَرَّة)ی كچی (الحارِث)ی سەركردەی كافرەكان كەوتە بەشی حەزرەتی(ثابت بن قَيس)ﷺ، ئینجا پێغەمبەرﷺ بە (كِتابَة)ی لێی كڕیەوەو ئازادی كردو لەخۆی مارەكردو بووە دایكی ئیمانداران، ناویشی گۆڕی بۆ (جُوَيْرِيَة) رضیالله عنها.

جا بە هۆی ئەم مارەكردنە (صَحابَة)كانﷺ خێزانەكانی سەد ماڵیان بە خۆڕایی ئازاد كردن، ئەوانیتریش بە كڕینەوە هەموویان ئازاد كران، ئەوەش بووە هۆی ئەوە: لە ئەنجامدا ئەم هۆزەو سەرۆكەكەشی بە تێكڕایی موسوڵمان بونو بونە پاڵپشتی ئیسلام.

جا لەم غەزایەدا (صَحابَة)كانﷺ ویستیان (جماع) لەگەڵ ئافرەتە كۆیلەكانیان بكەنو پێشیان خۆش نەبو منداڵیان لەوان ببێ، بۆیێ لەبارەی (عَـزْل) پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ كرد، واتە: ڕێگا نەدەن ئاوەكەیان بگاتە ناو منداڵدانەی ژنەكە، نەوەك ببێتە منداڵ، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لاَ عَلَيْكُمْ أَلاّ تَفْعَلُوا، مامِنْ نَسَمَةٍ كائِنَةٍ إلَى يَوْمِ الْقِيامَةِ إلاّ وَهِيَ كائِنَةٌ﴾ رواه الشيخان، هیچتان لە سەر نیە ئەگەر نەیكەن، چونكە هەر ئادەمیزادێك خوا بڕیاری بوونی دابێ تا ڕۆژی قیامەت، هەر دبێ، واتە: بڕیاری خوا زاڵە بە سەر كرداری ئێوەدا.

## ﴿ ئاژاوەیەکی (مُنافِق)ەکانی (مَدِینَة) ﴾

لەم غەزایەدا ژمارەیەکی زۆر لە (مُنافِق)ەکان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ هاتنە غەزا بۆ تەماعی تاڵانگرتن، جا کە (صَحابَة)کانﷺ لە دوای جەنگ لە سەر ئاوەکەی (الْمُرَیْسِیع) مانەوە، خزمەتکارێکی ئیمام (عُمر)ﷺ-کە ناوی (جَهْجاه) بوو- لەگەڵ (سِنان)ی هاوپەیمانی (الْخَزْرَج) بووە کێشەیان، جا (سِنان) هاواری کرد: هۆ گەلی (أنصار). (جَهْجاه)یش هاواری کرد: هۆ گەلی (مُهاجِر)ەکان. جا پێغەمبەریشﷺ گوێی لێبوو و فەرمووی: ﴿ما بالُ دَعْوَى الْجاهِلِیَّةِ؟...دَعُوها فَإِنَّها مُنْتِنَةٌ، وَفِی رِوایَةٍ: فَإِنَّها خَبِیثَةٌ﴾ رواه الشیخان، ئەوە چ‌ییە بانگەوازیی (جاهِلِیَّة)ی پێش ئیسلام دەکەن؟ واز لەو بانگەوازیەی دەمارگیری بێنن، چونکە بانگەوازیەکە بۆ گەنەو پیسە.

جا (عبدالله بن سلول الْمُنافِق)یش گوتی: ئەوەشیان کرد؟! سەرشۆڕیی وەك ئەمڕۆم نەبینیوە، لە وڵاتی‌خۆماندا بە سەرماندا زاڵ بون، وَاللهِ وا تێدەگەم: ئێمەو ئەو هەرچی‌و پەرچیانەی (قُرَیْش)–واتە: موسوڵمانەکان– وەك ئەوەیە کە پێشینە گوتویانە: (سَمِّنْ كَلْبَكَ یأْكُلْكَ) سەگی خۆت تێر بکە دەتخوا، وَاللهِ ئەگەر بگەڕێینەوە (مَدِینَة)، دەبی سەربەرزترەکان زەلیلترەکان دەر بکەن، ئێوەش–ئەی خەڵکی (مَدِینَة)– بەخۆتان ئەوەتان بە سەر خۆتاندا هێنا، هیچی‌تر یارمەتی (مُهاجِر)ەکان مەدەن، تاکو لە (مَدِینَة) بڕۆنە دەرەوە بۆ شوێنێکی‌تر.

جا حەزرەتی(زَیْد بن أرْقَم)ﷺ گوێی لەم قسە ناڕێکانەی (ابن سلول) بوو و یەکسەر هەواڵەکەی گەیاندە پێغەمبەرﷺ، لەو کاتیش ئیمام (عُمر)ﷺ لە لای بوو، جا ئیمام (عُمر)ﷺ فەرمووی: یا رَسُولَ الله بۆچی ئەم (منافق)ە پیسە نەکوژین؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿دَعْهُ لاَ یَتَحَدَّثُ النّاسُ أَنَّ مُحَمَّداً یَقْتُلُ أَصْحابَهُ﴾ رواه الشیخان، وازی لێبێنە، با خەڵك نەڵێ: (مُحَمَّد) هاوڕێکانی‌خۆی دەکوژێ.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی بارکردنی دا لە کاتێکی وەهادا کە عادەتی نەبو لەو کاتەدا بڕوا، ئیتر ئەم ڕۆژە تا ئێوارێ ڕۆیشت، شەوێش تا سبەینێ ڕۆژ گەرم بوو هەر ڕۆیشت، ئینجا دابەزی‌و خەڵکەکەش بە هۆی ماندووەتی کەوتنە خەوتن، جا پێغەمبەرﷺ بۆیێ ئەوەهای کرد، تاکو خەڵکەکە سەرقاڵ بکاو باسی قسەکانی (ابن سلول المنافق) نەکەن.

جا (ابن سلول) هاتە خزمەت پێغەمبەروﷺ سوێندی بە درۆی خوارد: کە ئەم قسانەم نەکردون. بەڵام خوای‌گەورە سورەتی (الْمُنافِقِین)ی نارده خوارەوە: بۆ باوەڕ پێکردنی حەزرەتی(زَیْد)وﷺ وەدرۆخستنەوەی (ابن سلول)، جا پێغەمبەرﷺ گوێی (زَیْد)ی گرت‌و فەرمووی: ئەمەیە کە بە گوێیەکەی خۆی وەفاداریی بۆ خوا هێنا جێ.

ئینجا (عَبْدُالله)ی كوڕی(عَبْدُالله بن سلُول) هاته خزمەت پێغەمبەروﷺ گوتی: یا رَسُولَ الله بیستومە دەتەوێ (عَبدُالله بن سلُول)ی باوكم بكوژی، ئەگەر هەر دەیكوژی، فەرمان بە من بكە بەخۆم سەری باوكم بۆ تۆ دێنم، چونكە دەترسم فەرمان بە كەسێكیتر بكەی بیكوژێ، جا ئەو كاتە نەفسەكەم وام لێبكا بكوژی باوكم بكوژمو بە هۆی كوشتنی موسوڵمانێك لەتۆڵەی كافرێك، بچمە دۆزەخ؟ جا پێغەمبەرﷺ وەڵامی داوەو فەرمووی: ﴿بَلْ نَترفَّقُ بِهِ وَنُحْسِنُ صُحْبَتَهُ ما بَقِيَ فِينا﴾ نایكوژین، بەڵكو ئێمە نەرمی لەگەڵ باوكت بە كار دێنین‌و بە جوانی هاوڕێیەتیی دەكەین تا لە ناوماندا بمێنێ.

ئیتر لە دوای هاتنە خوارەوەی سورەتی (الْمُنافِقِین)و ئەم قسە ناڕێكانە، (ابن سلُول) وەها زەلیل بوو: وای لێهات هەر قسەیەكی كردبا، خزمەكانیخۆی لۆمەیان دەكردو بە توندی ڕەدیان دەداوە، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی (عُمر) چۆن دەبینی؟ خۆ ئەگەر –لەو ڕۆژەی تۆ پێت گوتم– (ابن سلُول)م كوشتبا، ئەو كات هەندێ دەم‌و لوت نەعرەتەو هەرەشەیان بۆ وی دەكرد، ئەگەر ئەمڕۆ فەرمان بەوان بكەم هەر بەخۆیان دەیكوژن. جا ئیمام (عُمر)ﷺ فەرمووی: وَاللهِ زانیم كاری پێغەمبەرﷺ بەرەكەتی گەورەترە لە كاری من.

## ﴿ بوختان پێكردنی حەزرەتی ( عائِشَة )-رضي الله عنها-﴾

لەم غەزایەدا حەزرەتی(عائِشَة)-رضي الله عنها- لەگەڵ پێغەمبەردا بووﷺ، ئینجا كە لە گەڕانەوەدا لە (مَدِینَة) نزیك بونەوە، لە بەشێكی شەوێدا پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)كان لە شوێنێك دابەزین، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی باركردنی دا، حەزرەتی(عائشة)-رضي الله عنها- فەرموویەتی: منیش هەڵسام ڕۆیشتمە ئەو لا تاكو كاری پێویستی خۆم بەجێ بێنم، ئینجا گەڕامەوە لای بارگەكەم، كە تەماشام كرد گەردەنبەندەكەم لە گەردەنم كەوتووە، ناچار گەڕامەوە شوێنی گەردەنبەدەكەم، جا لەو ماوەیەدا (صَحابَة)كان كەژاوەی منیان لە وشترەكەم باركردو نەیانزانی من لە ناویدا نیم! چونكە لەو كات ئافرەتان لاواز بونو كێشیان سوك بوو، جا ئەوان وشترەكەمیان ڕاكێشاو ڕۆیشتن‌و وایان دەزانی من لە ناو كەژاوەكەدام، ئینجا منیش گەردەنبەندەكەم دۆزیەوەو گەڕامەوە لای بارگەكەم دیتم هیچ كەسێك لەوێ نەماوە، منیش لە شوێن بارگەكەم دانیشتم‌و گوتم لەوانەیە بۆم بگەڕێنەوە، ئیتر هەر لەو شوێنە خەوم بە سەرداهات‌و خەوتم.

ئەمە لە لایەك، لە لایەكی تریش: حەزرەتی(صَفْوان بن الْمُعَطَل السُلَمي‌ﷺ) لە دوای باركردنی لەشكر، لە سەربازگەدا دەماوە، تاكو كەل‌وپەلی بەجێماو هەڵبگرێتەوە، جا كە گەیشتە لای حەزرەتی(عائشة)-رضي الله عنها- ناسییەوەو گوتی: (إنّا لِلّهِ وَإنّا إلَيْهِ راجِعُونَ)؟ چونكە بەجێمانی دایكی ئیمانداران بە تەنهایی موسیبەتێكی گەورەیە. جا حەزرەتی

(عائـشة)-رضي الله عنها- فـەرمووی: لـە دەنگـی وی هەشـیار بۆمـەوەو یەکـسەر ڕووی خـۆم داپۆشی، جا حەزرەتی(صَفْوان)ش–بێ ئەوەی هیچ قسەیەك لەگەڵ مـن بکا– یەکـسەر وشترەکەی بۆ ئیخ کردمو منیش سواری وشترەکە بوم، ئەویش ڕایکێشاو ڕۆیشتین تا لە کاتی ڕۆژ گەرمبوون گەیشتینەوە لەشکرەکە، چونکە لەو کات بۆ پـشوودان دابـەزیبون، جا کە خەڵکەکە ئێمەیان دیت، بوختانەکەرەکان بوختانەکەیخۆیان کرد–واتـە: تۆمـەتی زینا کردنیان دا پاڵ حەزرەتی(عائشة)و حەزرەتی(صفوان) رضیالله عنهما.

جا کە گەیشتنەوە (مَدِينَة)، ئەم بوختانە لـە نـاو خەڵکیدا بڵاو بـۆوەو پێغەمبـەروﷺ دایکمو باوکیشم بەم بوختانەیان زانی، بـەڵام هیچ کەسێك لـە لای مـن باسـی نـەدەکرد، ئیتر منیش نەخۆش کەوتم، جا لەم نەخۆشیەمدا هەستم کرد پێغەمبەرﷺ وەك جاران دڵسۆزیو بەزەیی لەگەڵ مندا نیە، بەڵکو دایکم لە لام بـوو، جـا ئـەویش دەهـات سـەلامی دەکردو هەر ئەوەندەی لێدەپرسیم دەیفەرموو: ﴿كَيْفَ تِيكُمْ؟﴾ ئەو ئافرەتـە نەخۆشـە چۆنە؟ ئینجا نەختێك نەخۆشیەکەم سوك بوو و دایکم چۆوەماڵەکەی خۆی، جا منـیش شەوێك لەگەڵ دایکی (مِسطَح) رضیالله عنهما چومە دەرەوە بۆ پێویستیخۆم، چونکە لە ماڵەوە ئاودەسـخانەمان نـەبو، جـا لـە گەڕانـەوەدا دایکـی (مِـسطَح) رضیالله عنهما بـە پەشـتـەماڵەکەی خلیسکی بردو گوتی: دەك (مِسطَح) بە هیلاك بچێ، منیش گوتم: قسەیەکی خرابت کرد، چـۆن جنێـو دەدەیـە (صَحابَة)یـەکی (بَـدر)؟ ئـەویش گـوتی: نـەتزانیوە (مِـسطَح) چـی گوتووە؟ گوتم: چی گوتووە؟ ئەویش هەواڵی بوختانەکەی بۆ ڕوون کردمەوە، جا منـیش لە خەفەتی ئەم بوختانە تا سبەینێ هەر گریامو نەخـەوتمو نەخۆشیەکەشـم لـە جـاران زیاتر بوو، جا کە سبەینێ پێغەمبـەرﷺ هـات، ئیـزنم لێوەرگرتو ئیزنـی دام: بـچمەوە ماڵی باوکمو لەوێ نەخۆش بکەوم، تا چاك دەبمەوە، جا منیش چـومە مـاڵی بـاوکمو بـە دایکمم گوت: خوا لێت خۆش بێ، ئەو باسە لە ناو خەڵکیدا بڵاو بۆتـەوە، بۆچـی هیـچت بۆ من باس نەکرد؟!.

جا پێغەمبەریشﷺ تا ئێستا لەبارەی ئەم بوختانە هیچ (وَحي)ی بۆ نەهاتبوو، بۆیـێ لەبارەی تەڵاقدانی حەزرەتی(عائِشَة) رضیالله عنها ڕاوێژی بە هەندێك (صَحابَة)کانی کرد، جا ئەوانیش قسەی باشیان کردو حەزرەتی(عائِشَة)یان بە پاك دانا، هـەروەها پرسیاریـشی لە حەزرەتی(زَينَب بنت جَحَش)ی هاوسەرەکەیخۆی کـرد رضیالله عنها؟ ئـەویش فـەرمووی: (ما عَلِمْتُ إلاّ خَيْراً) جگە لە چاکە هیچم لێنەزانیوە.

بۆیێ پێغەمبەرﷺ لە سەرمینبەرەکەی وتارێکی دا و فەرموی: کێ یارمەتیم دەدا مـافم لەو کەسە وەربگرێ کە بە هۆی خێزانەکەیخۆم منی ئازار داوە، وَاللهِ جگە لـە چاکە هیچیترم لە خێزانەکەم نەزانیوە، بوختانەکەشیان بە پیاوێکی وەها کردوە کە جگە

**له چاكه هیچی‌ترم له‌وی نه‌زانیوه؟ جا حه‌زره‌تی(سَعد بن مُعاذ)ﷺ هه‌ڵساو فه‌رمووی: یا رَسُولَ الله من مافت وه‌رده‌گرم، ئه‌گه‌ر ئه‌م بوختانكه‌ره له (الأوس)ی هۆزه‌كه‌ی من بێ من ده‌یكوژم، وه ئه‌گه‌ر هۆزه‌كه‌ی برایانی ئێمه‌ی (الخَزرَج) بێ، ئه‌وه چ فه‌رمانێك بده‌ی ئێمه ده‌یكه‌ین. جا له به‌ر ئه‌وه‌ی (ابن سلُول المنافق) له هۆزه‌كه‌ی (الخَزرَج) بوو، هه‌ندێك غه‌ڵبه غه‌ڵبو توڕه‌بوون‌و ڕووی دا، به‌ڵام پێغه‌مبه‌رﷺ بێده‌نگی كردن.**

**حه‌زره‌تی(عائشة)**-رضي الله عنها- **فه‌رموویه‌تی: مانگێك ڕۆیشت، پێغه‌مبه‌رﷺ هیچ (وَحي)ی له‌باره‌ی بوختانه‌كه بۆ نه‌هات، بۆیێ ڕۆژێك پێغه‌مبه‌رﷺ هاته ماڵی باوكم‌و دانیشت‌و فه‌رمووی: ئه‌ی (عائِشَة) هه‌واڵێكی ئه‌وهاو ئه‌وهام پێگه‌یشتووه،جا ئه‌گه‌ر تۆ پاكی ئه‌وه خوای‌گه‌وره پاكانه‌ت ئاشكرا ده‌كا، وه ئه‌گه‌ر تاوانێكیشت كردوه، ئه‌وه داوای لێخۆشبوون له خوا بكه، خوای‌گه‌وره تۆبه‌ی به‌نده‌كانی قبولْ ده‌كا؟**

**جا حه‌زره‌تی(عائِشَة)**-رضي الله عنها- **به دایك‌و باوكی‌خۆی گوت: وه‌ڵامی پێغه‌مبه‌رﷺ بده‌نه‌وه. ئه‌وانیش گوتیان: نازانین چی بڵێین!. ناچار حه‌زره‌تی(عائِشَة)**-رضي الله عنها- **به‌خۆی وه‌ڵامی داوه‌و فه‌رمووی: ئه‌و قه‌سه‌یه‌تان بیستووه‌و باوه‌ڕیشتان كردوه، خوا ده‌زانی من له‌و گوناهه به‌ریمه‌و پاكم، خۆ ئه‌گه‌ر به درۆ دان به‌م تاوانه‌دا بێنم، ئێوه پێم باوه‌ڕ ده‌كه‌ن، به‌ڵام بۆ خۆم‌و بۆ ئێوه هیچ مه‌سه‌له‌یه‌كم ده‌ست ناكه‌وێ، ته‌نها فه‌رمووده‌یه‌كی باوكی (یُوسُف) پێغه‌مبه‌رﷺ نه‌بێ:** ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ﴾ یوسف: (١٨)، **سه‌برگرتن جوانه، خوای‌گه‌وره‌ش پاڵپشته له سه‌ر ئه‌و قسه‌یه‌ی ئێوه ده‌یكه‌ن.** له به‌ر دڵته‌نگی ناوی حه‌زره‌تی(یعقوب)ی له بیر چوبو.

**حه‌زره‌تی(عائِشَة)**-رضي الله عنها- **فه‌رموویه‌تی: جا پاڵم داوه‌و هیچ بیرم له‌وه نه‌ده‌كرده‌وه قوڕئان له‌باره‌ی من بێته خواره‌وه، چونكه من له دڵدا زۆر خۆم پێ له‌وه كه‌متر بوو كه خوای گه‌وره باسم بكا، جا وَاللهِ پێغه‌مبه‌رﷺ له شوێنی‌خۆی لانه‌چوو، تا له‌باره‌ی پاكانه‌ی من (وَحي)ی بۆ هات‌و خوای‌گه‌وره پاكانه‌ی منی ئاشكرا كردو فه‌رمووی:** ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْأَفْكِ عُصْبَةٌ مِنكُمْ لا تَحْسَبُوهُ شَرّاً لَكُمْ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الْأَثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾النور: ١١و تا كۆتایی ده ئایه‌تی‌تریش، **واته: ئه‌وانه‌ی ئه‌و بوختانه‌یان هێناوه، كۆمه‌ڵێكن له ئێوه، وا تێمه‌گه‌ن ئه‌م بوختانه بۆ ئێوه خراپه، به‌ڵكو بوختانه‌كه بۆ ئێوه باشه؟–چونكه خوای‌گه‌وره له قوڕئاندا ئێوه‌ی به شه‌ڕه‌ف كردن‌و پاكانه‌ی ئێوه‌ی نارده خواره‌وه– هه‌ر یه‌كێك له‌و بوختانكه‌رانه سزای گوناهه‌كه‌ی‌خۆی هه‌یه، ئه‌وه‌ی به‌شه گه‌وره‌كه‌ی بوختانه‌كه‌شی بڵاو كردوه–كه (ابن سلُول الْمُنافِق) بوو– له ڕۆژی قیامه‌ت عه‌زابێكی زۆر گه‌وره‌ی هه‌یه.**

ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: بوختانکەرەکان هەشتا دار سزای بوختانیان لێدرا، جا لە دوای ئەم دە ئایەتە-هەر لەبارەی ئەم بوختانە- شەش ئایەتیتریش هاتنە خوارەوە تا ﴿أُولَئِكَ مُبَرَّأُونَ مِمَّا يَقُولُونَ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾النور: ٢٦، ئەو بەڕێزانە پاكن لەو بوختانەی بوختانكەرەكان دەیڵێن، لێخۆشبوونی خواو ڕزقێكی بەرفراوان لە بەهەشت بۆیان ئامادە كراوە، چونكە داوێنپاكەو ژنی پێغەمبەریخوایەﷺ.

جا ئیمام (أبوبكر)ش﵁ (مِسطح)ی﵁ بەخێو دەكرد؟ چونكە هەژار بوو، هەم دایكی (مِسطح) كیژە پوری ئیمام (أبوبكر)﵁ بوو، جا لە بەر ئەوەی (مِسطح)﵁ یەكێك بوو لە بوختانكرەكان بۆیی ئیمام (أبوبكر)﵁ سوێندی خوارد هیچیتر بەخێوی نەكا، بەلام خوایگەورە لەبارەی ڕێزداریی هەردووكیان ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَلا يَأْتَلِ أُولُو الْفَضْلِ مِنْكُمْ وَالسَّعَةِ أَنْ يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلا تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾النور: ٢٢، ئەو كەسانەی لە ئێوە خاوەن گەورەییئاییین و خاوەنماڵیدونیان، با سوێند نەخۆن: لە سەر ئەوەی هیچیتر بژێو نەدەنە ئەو خزمانەیان كە هەژارن و كۆچكەری ڕێگای خوان، با لێیان ببورن و چاوپۆشی لە خراپەكەیان بكەن، ئایا پێتان خۆش نیە خوا لە ئێوە خۆش ببێ؟! خوایگەورە زۆر لێبوردەیەو بەزەییە.

جا ئیمام (أَبُوبَكْر)﵁ فەرمووی: بەڵێ پێم خۆشە خوا لێم خۆش ببێ. بژێوەكەشی بۆ (مِسطَح) گەڕاندەوە و (كَفّارَة)ی سوێندەكەشی دا. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٥١٦-٥٢٣) و(السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٣٧٧-٤٠٨).

## ﴿ گوڵبژێریك لەم گوڵزارە ﴾

**یەكەم: خوێنی مرۆڤی موسوڵمان.** (صَحابَة)یەك-بە هەڵە-بە دەستی (صَحابَة)یەكیتر كوژرا، واتە: وا تێگەیشت لە دوژمنە كافرەكانە، جا ئەم كوژراوە ناوی (هِشام) بوو، برایەكیشی لە (مَكّة) بوو ناوی (مِقْيَس) بوو، هاتە (مَدينَة)و گوتی: من موسوڵمانم هاتومە داوای خوێنی برایەكەم دەكەم. جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: سەد وشتری درایێ لە خوێنی برایەكەی، ئینجا پاش ماوەیەكی كەم، (مِقْيَس) بكوژی برایەكەیخۆی كوشت و بە كافربوویی گەڕاوە (مَكّة)، بۆییێ لە (فتح مَكّة)دا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: (مِقْيَس) كوژرا.

**كەواتە: خوێنی پیاوی موسوڵمان**-ئەگەر بە هەڵەش بكوژرێ- سەد وشترە، جا ئەگەر وشتر نەبون، ئەو كاتە لەجیاتی وشترەكان: یان هەزار میسقاڵی زێڕە، یان دوانزە هەزار دیرهەمی زیوە، لە لای هەندێ زانایتریش: یان دوو سەد مانگایە، یان هەزار مەڕ، یان بزن. جا بە (إِجْماع)ی زانایانیئیسلام: خوێنی ئافرەت نیوەی خوێنی پیاوە، هەروەك

لە میراتو شاهیدیدا نیوەی پیاوە، جا لە هەموو جۆرە کوشتنێکی بە هەڵەدا خوێنەکە لە سەر خزمەکانی بکوژەکەیەو واجبە: بە سێ ساڵان بیدەن، بەو مەرجەی خزمەکەی هەژار نەبێ، نێرینە بێو بلۆغی بوبێ. (تفسيرالقرطبي) النساء (٩٢) و(البداية والنهاية) ب(٢) ل(٥١٦).

**دووەم: پێغەمبەرﷺ حەزرەتی( جُوَيْرِيةَ )ی کچی ( الحارِث )ی سەرکردەی کافرەکانی لەخۆی مارە کرد** رضي الله عنها، حەزرەتی(جُوَيْرِيَة) ناوی (بَـرَّة) بوو، کە دیل کرا، بووە بەشی حەزرەتی(ثابِت بن قَيْس)ﷺ جا حەزرەتی(ثابِت)ﷺ پێی گوت: ئەگەر نۆ (أُوقِيَّة)ی زێڕم بۆ بێنی ئازادت دەکەم. جا (بَرَّة)ش هاتە لای پێغەمبەروﷺ گوتی: من (بَرَّة) کیژی (الحارِث)ی سەرۆکی ئەم هۆزەمو دیل کراومو کەوتومەتە بەشی (ثابِت)، ئەویش (كِتابَة)ی لەگەڵ کردوم لە سەر نۆ (أُوقِيَّة)ی زێڕ، منیش توانام نیە، بۆیێ هاتومە لای جەنابت تاکو یارمەتیم بدەی. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی ئەگەر باشتر لەوە هەبێ؟ (بَرَّة) گوتی: چىیە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: من (كِتابَة)کەت بۆ دەدەمە (ثابِت)و لەخۆمت مارە دەکەم؟ (بَرَّة) گوتی: بەڵێ منیش ڕازیمە. جا پێغەمبەرﷺ زێڕی (كِتابَة)کەی دایە حەزرەتی(ثابِت)وﷺ (بَرَّة)ی لێوەرگرتو لەخۆی مارە کردو ناوی لێنا (جَوَيْرِيَة)و بووە (أُمّ الْمُؤْمِنِين)=دایکی ئیمانداران رضي الله عنها.

**جا لێرەدا دوو پرسیار:** بۆچی دیسان پێغەمبەرﷺ ئەم بێوەژنەی لەخۆی مارەکرد؟ خۆ کچی جەحێڵ لە ناو دیلەکاندا زۆر هەبون!، یان لە بەرچی پێغەمبەرﷺ هەر بەخۆڕایی ئازادی نەدەکردو بۆچی مەرجی مارەکردنی دانا؟

**وەڵام:** لە مارەبڕینی حەزرەتی(أُمّ سَلَمَة) لە باسەکەیڕابردودا گوتمان: ڕەفتاری پێغەمبەرﷺ ئەوها بوو: هەوڵی دەدا ڕقو قینی دوژمنانیئیسلام کەم بکاتەوەو بیانکاتە دۆستی ئیسلام، جا لێرەشدا پێغەمبەرﷺ هەمان ڕەفتاری بە کار هێنا؟ چونکە کە (صَحابَة)کانﷺ دیتیان پێغەمبەرﷺ کیژی سەرۆك هۆزەکەی (بَنِيالْمُصْطَلِق)ی مارە کرد، گوتیان: ئەم دیلانە خەزوری پێغەمبەرنﷺ!. جا (صَحابَة)کانﷺ خێزانی سەد ماڵیان بە خۆڕایی ئازاد کردنو خێزانی سەد ماڵەکەیتریشیان بە کڕینەوە ئازاد کردنو هیچیان لە دیلیدا نەمانو لە ئەنجامدا هەر هەموویان بونە موسوڵمان، بۆیێ حەزرەتی(عائِشَة)-رضي الله عنها- فەرموویەتی:

نەمزانیوە هیچ ئافرەتێك وەکو (جُوَيْرِيَة) بەرەکەتی گەورەتر بوبێ بۆ گەلەکەیخۆی.

جا (الحارِث)ی باوکی حەزرەتی(جُوَيْرِيَة)ش هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ، ئەویش موسوڵمان بوو، جا گوتی: کیژەکەشم بدەوە لەگەڵ خۆمدا دەیبەوە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بڕۆ بیکە سەرپشك. جا (الحارِث) گوتی: کیژم لەگەڵ من وەرەوە بۆ ناو گەلەکەیخۆت. حەزرەتی(جُوَيْرِية)ش-رضي الله عنها-وەڵامی داوەو فەرمووی: (اِخْتَرْتُ اللهَ وَرَسُولَهُﷺ) من خواو پێغەمبەرم هەڵبژاردون. واتە: لەگەڵ تۆ نایەمەوە. ئینجا حەزرەتی(جُوَيْرِية)-رضي الله عنها- لە ساڵی پەنجاو شەشی کۆچی لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا لە (مَدِينَة)

وەفاتی کرد رضي الله عنها. (السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٣٧٩-٣٨٦) و(عظماء حول الرّسُولِ ﷺ) ب(١) ل(١٦٩-١٧٥).

**سێیەم: بڕیاری ڕێگرتن لە منداڵبوون، لەبارەی ڕێگرتن لە منداڵبوون (صَحابَة) رضي الله عنهم پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد...هتد،** لەبارەی (عَزْل)-واتە: هێنانەوەی ئاوی مێردەکە لە دەرەوەی (فَرْج)ی ژنەکەی- لە فەرموودەی بەهێزی مەزهەبی(الشافعی)دا دروستە، لە هەرسێك مەزهەبەکەیتردا دروست نیە، مەگەر ژنەکەی ئیزنی بدا، ئەو کاتە دروستە، ئیمام (ابن حجر العسقلانی) ئەوها گێڕاویەتیەوە.

جا ئیمام (ابن حجر الهيتمي) فەرموویەتی: حەرامە شتێکی وەها بە کار بێنی کە لە بنەبڕ بە یەکجاری ڕێگای وەزگکەوتنی منداڵ بگرێ-کە ئێستا پێی دەڵێن: (تَحْدِيدُ النَّسْلِ) سنورداركردنی منداڵبوون-، واتە: بەڵام ئەگەر لە بنەبڕ نەبو، بەڵکو تا ماوەیەك بوو تاکو ئەم منداڵە گەورە ببێ، ئینجا منداڵێکیتری ببێ -کە ئێستا پێی دەڵێن: (تَنْظِيم النَّسْلِ) ڕێکخستنی منداڵبوون- ئەو کاتە حەرام نیە، جا لەبارەی لەباربردنی کۆرپەی ناو زگ فەرموویەتی: لە لای ئیمامی(الحنفي) رحمه الله دروستە لە حاڵەتی (مَني)و (عَلَقَة)ییدا، دروستە لەبار ببردرێ، بەڵام لە فەرموودەی بەهێزدا دروست نیە.

جا لە (فتح المبين)دا وا دەردەکەوێ: کە لە حاڵەتی (عَلَقَة)یی‌و بە سەرەوەدا دروست نیە لەبار ببردرێ، بەڵام لە حاڵەتی(مَني)دا -واتە: لە تەمەنی پێش چل‌و دوو ڕۆژیدا- دروستە لەبار ببردرێ، واتە: چونکە لە تەمەنی چل‌و دوو ڕۆژیدا وێنەی ئاشكرایی کۆرپەکە دەست پێدەکا، هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿إذا مَرَّ بالنُّطْفَةِ ثِنْتانِ وَأَرْبَعُونَ لَيْلَةً بَعَثَ اللهُ إِلَيْهَا مَلَكاً فَصَوَّرَها وَخَلَقَ سَمْعَهَا وَبَصَرَهَا وجِلْدَها وَلَحْمَهَا وَعِظامَها...الحديث﴾ رواه مسلم، **کاتێ چل‌و دوو شەو بە سەر (مَنِي)ی ناو منداڵدانەدا ڕۆیشتن، خوایگەورە (مَلائِكَة)یەکی بۆ دەنێرێ: وێنەی دەکێشێ‌و گوێ‌و چاو و پیستەو گۆشت‌و ئێسقانەکانی بۆ دروست دەکا.** واتە: ئینجا بەرە بەرە وێنەکەی تەواو دەکا، ئینجا ئاشكرا دەبێ. والله اعلم.

**جا بزانە:** هەر کەسێك ببێتە هۆی لەباربردنی کۆرپەی ناو زگ، ئەوە خوێنی کۆرپەکەی لە سەر واجب دەبێ بیداتە میراتگرەکانی کۆرپەکە، هەرچەند لەباربەرەکەش دایك، یان باوکی کۆرپەکە بێ، بەو مەرجەی کۆرپەکە گۆشتێکی وێنەکراو، یان بە سەرەوەتر بێ.

جا خوێنی کۆرپەکەش: کۆیلەیەکە، جا ئەگەر نەبو، ئەو کاتە خوێنەکەی: پێنج وشترە، یان نرخی پێنج وشترە.

بەڵام ئیمامی(الزركشی) فەرموویەتی: ئەگەر دایکەکە ناچار بوو دەرمانێکی وەها بخوا: کە کۆرپەکەی لەبار بچێ-وەك بەهۆی کۆرپەکەی، یان بە هۆیەکیتر ژیانی بکەوێتە مەترسی- ئەو کاتە خوێنی لە سەر واجب نابێ.

ئەم باسەم کۆ کردۆتەوە لە (فتح البارى) ب(٩) ل(٣٨٢) و(تحفة المحتاج بحاشية الشرواني) ب(٨) ل(٢٤١) و(فتح المبين شرح الأربعين النواوية) ل(٨٥و٨٨) و(الإقناع شرح متن أبىشجاع) ب(٢) ل(٢١٤).

**چوارەم: لە ئیسلامدا دەمارگیریو ڕەگەزپەرستی حەرامە،** پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ما بالُ دَعْوَى الْجاهِلِيَّةِ؟...دَعُوهَا فَإنَّها مُنْتِنَــةٌ﴾ رواه الشيخان، **ئەوە چیتانە بانگەوازی نەفامیی پێش ئیسلام دەکەن؟ واز لەو دەمارگیریە بێنن چونکە بۆگەنە.**

لێرەدا پێغەمبەرﷺ ڕێنموونیمان دەکا: تاکو هەموومان لە ژێر خێمەی ئیسلامدا بە یەك ناو کۆ ببینەوەو حیزبایەتیو جیاوازیی هۆزو زوبانو ڕەنگ وامان لێنەکا ستەم لە یەکتری بکەینو یەکتری بچەوسێنینەوە، کەوابوو: دەبوا ئەو دوو (صَحابَة)یە هاواریان کردبا هەموو موسولمانانو نەدەبوا یەکێکیان هاوار بکاتە (مُهاجِر)ەکانو ئەویتریش هاوار بکاتە (أنصارى)یەکان، چونکە ئەو جۆرە دەمارگیریە پەرتەوازە دەخاتە ناو موسولمانان، لە کاتێکدا ئیسلام هەموو موسولمانەکانی بە برایەکتری داناوو جیاوازی ڕەگەزو هۆزی نەکردوەو خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾الحجرات: ١٠، **تەنها ئیمانداران برای یەکترین.** هەم پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿وَلْيَنْصُرِ الرَّجُلُ أَخاهُ ظَالِماً أَوْ مَظْلُومــاً؟ إنْ كانَ ظالِماً فَلْيَنْهَهُ فَإنَّهُ لَهُ نَصرٌ وَإنْ كانَ مَظْلُوماً فَلْيَنْصُرْهُ﴾ رواه الشيخان، **با پیاو یارمەتی برایخۆی بدا، جا برایەکەی ستەمکار بێ، یان ستەملێکراو بێ؟ ئەگەر ستەمکار بوو، با لە ستەمەکەی قەدەغەی بکا، ئەو قەدەغەکردنە دەبێتە یارمەتیدانی وی چونکە لە تاوانێك دەیپارێزێ، وە ئەگەر ستەملیکراویش بوو، با یارمەتیی بداو ڕێگە نەدا ستەمی لێبکرێ.** جا لە بەر ئەوەی ئیسلام دەیەوێ موسولمانان لە سەر بنچینەی دادپەروەی برای یەکتری بن، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ مِنَّا مَنْ دَعا إلَى عَصَبِيَّةٍ وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ قاتَلَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ ولَيْسَ مِنّا مَنْ مَاتَ عَلَى عَــصَبِيَّةٍ﴾ رواه ابوداود بسند صالح، **ئەو کەسە لە سەر ڕێبازی ئێمە نیە کە بانگەوازی بۆ دەمارگیری بکا، ئەو کەسە لە سەر ڕێبازی ئێمە نیە کە لە بەر دەمارگیری جەنگ بکا، ئەو کەسە لە سەر ڕێبازی ئێمە نیە کە لە سەر دەمارگیری بمرێ.**

**پێناسەی دەمارگیری:** پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا: ﴿يا رَسُولَ الله مَا الْعَصَبِيَّةُ؟ قالَ: أَنْ تُعِينَ قَوْمَــكَ عَلَــى الظُّلْــمِ﴾رواه ابوداود بسندصالح، **ئەی پێغەمبەریخوا دەمارگیری چیە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دەمارگیری ئەوەیە: یارمەتی گەلەکەیخۆت بدەی لە سەر ستەمکاری.** جا بە داخەوە، سەد جار بە داخەوە، ئەوانەی ئەمڕۆ لافی ئیسلامەتی لێدەدەن هەر یەکەیان بە دەمارگیری گرۆهێکەوە سەگەردان بوینەو لەجیاتی بانگەوازی بۆ ئیسلام بکەن، بانگەوازی بۆ گرۆهەکەیخۆیانو بۆ سەرکردە نەفامەکانیان دەکەن، وا تێدەگەن بەم دەمارگیریە ئیسلامەتی دەپارێزن، نازانن بەو پەرتەوازەیە مالّی موسولمانانیان کاول کردو

ئیسلامەتیشیان ناشیرین کرد، چونکە ئیسلامەتییان وەها بچوك کردۆتەوە کە تەنها لـە نـاو مەڵبەندو بارەگاکانی ئەواندا جێی دەبێتەوە، إنا للّهِ وَإنّا إلَيْهِ راجعُون.

**پێنجەم: (ابـن سـلُول المُنـافِق) چـەند قـسەیەکی نـاڕێکی کـردن و گـوتی: (سَـمِّنْ كَلْبَـكَ يَأْكُلْكَ) سەگی خۆت تێر بکە دەتخوا. لە بەرامبـەر ئـەم گۆتەیـەش گۆتەیـەکیتر هەیـە دەڵێ: (أَجِعْ كَلْبَكَ يَتْبَعْكَ) سەگی خۆت برسی بکە بە دوات دەکەوێ.**

جا کە (ابن سلُول) لە قسە ناڕێکەکانیدا گوتی: ﴿لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ﴾ المنافقون: ٨، **ئەگەر بگەڕێینەوە (مَدینَة)، دەبی سەربەرزترەکان زەلیلترەکان لە (مَدینَة) دەربکەن.** مەبەستی بە زەلیلترەکان: پێغەمبەروﷺ (مُهاجِر)ەکان بوو.

جا کە پێغەمبەرﷺ ڕێگای نەدا: حەزرەتی(عَبْدُالله)ی کوڕیﷺ بیکوژێو فەرمووی: **تا لە ناوماندا بمێنێ بە جوانی هاوڕیەتیی دەکەین.** لە گەڕانەوەدا حەزرەتی(عبدالله)ﷺ لە دەروازەی (مَدینَة) دانیشت، تا (عَبْدُالله بن سلُول)ی باوکی هاتو ڕێگەی لێگرت و گوتی: وَاللهِ نابی بچیتەوە نـاو شـار تـا بـە خـۆت دەڵـێی مـن زەلـیلمو پێغەمبـەرﷺ سـەربەرزو ڕێزدارە. جا دەبی پێغەمبەریشﷺ ئیزنـت بـدا، ئینجـا منـیش ئیزنـت دەدەم. ئـیتر (ابـن سلُول) ناچار بوو گوتی: من لە مندالآن زەلیلترم، مـن لـە ئافرەتـان زەلـیلترم. ئینجـا هـەر ئیزنی نەدا بڕواتە ناو شار، تا پێغەمبەروﷺ گەیشتە دەروازەکەو فەرمووی: **واز لە باوکت بێنە.** ئینجا ڕێگەی دایێ. (السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٣٨٨و٣٩٣).

**شەشەم: مانگێك تەواو بـوو، پێغەمبـەرﷺ لـەبارەی بوختانەکـەی حـەزرەتی (عائـشَة) -رضي الله عنها- هیچ (وَحْي)ی بۆ نەهات، بۆیێ ڕاوێژی بە (صَحابَة)کانﷺ کرد...هتد،**

ئـەوەش ئـەو ڕاسـتیيە دەسـەلمێنێ: کـە پێغەمبـەرﷺ ئادەمیزادێکـە خوایگـەورە–بـە پێغەمبەرایەتی– ڕێزی لێناوە، بەم پێغەمبەرایەتیەش لە سنوری ئادەمیزادی بە سەرەوەتر نیە، بۆیێ لە بەرامبەر ئەم بوختانە گەورەیە لە سنوریخۆی وەستاو بە بێ (وَحْي)ی خودا هـیچ چـارەیەکی پێنـەکرا، تەماشـا بکـە: ئـەم بوختانـە گەورەیـە بـەهێزترین ئـازاردانی پێغەمبەرەﷺ، لە ژیانیا ئەو جۆرە ئازارەی نەدیوە؟ چونکە ئازاردانی ناموسو ئابڕوو زۆر زۆر دژوارترە لە ئازاردانی جەستەیی، برینی جەستە چاك دەبێتەوە، بەڵام برینی ئابڕوو هـەر لە سەر ڕووەو دەرمانی نیە، جا ئەگەر–بە بێ (وَحْي)–پێغەمبەروﷺ شتی پەنهانو نادیـاری زانیبا، ماوەی مانگێك لەم غەمو خەفەتەدا نەدەماوەو ڕاوێژی بە (صَحابَة)کانﷺ نەدەکرد بۆ چارەسەری ڕوودا وەکە، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَداً إِلاَّ مَنِ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ﴾الجن:٢٧و٢٦، **خوایگـەورە زانـای زانـستی پـەنهان و نادیارە، هیچ کەسێك شارەزای نادیاریخۆی ناکا، تـەنها ئـەو پێغەمبـەرەی نـەبێ کـە خـۆی پێی ڕازییە زانستی پەنهان و نادیاری فێر بکا.**

بـەڵێ، بـەڵێ: کـە خوایگـەورە پـەنهانیی ئـەم بوختانـەی بـە ئایەتـەکانی قورئـان بـۆ پێغەمبەرﷺ ئاشکرا کرد، یەکسەر کێشەکەش چارەسەر کراو کۆتایی هات.

**پرسیار:** ئەوە زانیمان پێغەمبەرﷺ بـە بـێ (وَحْـي) پـەنهانو نادیـار نازانـێ، ئـەدی بۆچـی پێغەمبەرﷺ هەر ئەوەندەی دەفەرموو: ﴿لا أَعْلَمُ عَنْها إِلاّ خَيْراً﴾ **جگە لـە چاکە هیچیتر لە خێزانەکەم نازانم.** بۆچی هەندێ قسەی وەهای ڕێك نەدەخستن کە قەناعەت بە خەڵکەکە بێنێو بەرگری لە ئابڕووی‌خۆی بکا، خۆ هەرچی بیفەرمووبا، خەڵکەکە باوەڕی پێ‌دەکرد؟

**وەڵام:** خوای‌گەورە ئەو ڕێگایەشی نەداوەتە پێغەمبەرﷺ کە بۆ بەرژەوەندی خـۆی، یـان کەسـێکیتر لـە سـەر حیسابی ئـایین قـسە هەڵببەسـتێ! بـەڵکو خوای‌گـەورە هەڕەشەشـی لێکردوەو دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ * لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ * ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ * فَمَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ﴾الحاقـة: ٤٤-٤٧، **ئەگەر (مُحَمَّدﷺ) قسەیەك لـە سەر ئێمـە هەڵببەستی، ئێمـە بە ڕاستە بەهێزو توانا دەیگرینو بە توندی سزای ئەدەین، ئینجا دەماری دڵیشی دەبڕینو دەیکوژین، هیچ کەسێکیش لە ئێوە نیە لەو سزایەی ئێمە ببێتە پەردەو بیگەڕێنێتەوە.** بـە دەسـتکاریەوە لـە (فقـه السـيرة، للبـوطي) ل(٣٠٧-٣١٠).

**حەفتەم: (صَحابَة)کانﷺ قسەی باشیان کردو حەزرەتی(عائِشَة)یان** رضي‌الله عنها **بە پاك دانا:**

**ئیمام (عُمر)**ﷺ فەرمووی: یا رَسُولَ الله، کێ (عائِشَة)ی لە تۆ مارە کـردوە؟ پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: خوای‌گەورە. واتە: بە فەرمانی‌خوا مارەم کردوە، جا ئیمام (عُمـر)ﷺ فـەرمووی: وا تێ‌دەگەی خوا فێڵی لە تۆ کردبێ؟! ﴿سُبْحَانَكَ هَـذَا بُهْتَـانٌ عَظِـيمٌ﴾ النور: ١٦، **پاكو خاوێنی بۆ تۆ ئەی خودایە، ئەمە بوختانێکی گەورەیە.** واتە: ئایەتەکە لە سەر زوبـانی ئیمام (عُمر)ﷺ هاتە خوارەوە. ئینجا فەرمووی: یا رَسُولَ الله، من بەوە دەزانم (عائِشَة) پاکە لەم بوختانە، چونکە خوای‌گەورە جەستەی تۆی پاراستووەو نابێ مێش لێی بنیشێ چونکە لە سەر پیسایی دەنیشێ، جا چۆن ژنی داوێنپیس لەگەڵ تۆ جووت دەکا؟!.

**ئیمـام (عُثْمـان)**ﷺ فـەرمووی: یـا رَسُـولَ الله، خوای‌گـەورە وای‌نـەکردوە جەسـتەی تـۆ سێبەری هەبێ، نەوەك سێبەرەکەت بکەوێتە سەر زەویو بە پێ وەسەری بکەون، جا چۆن خوای‌گەورە ژنەکەت لەوە ناپارێزی بێناموس وەسەری بکەوێ؟.

**ئیمام (عَلي**ﷺ فەرمووی: یارَسُولَ الله، خوای‌گەورە دونیای لە سەر تۆ بەرتەنگ نەکردوەو ئافرەتی‌تریش زۆر هەنە مارەیان بکەی، خۆ ئەگـەر پرسـیاریش لـە (بَریـرَة)ی خزمـەتکاری (عائِشَة) بکەی ڕاستیت بۆ دەڵێ. جا (بَریرَة)ش پاکانەی بۆ حەزرەتی(عائِشَة) کرد.

هەروەها ئیمام (علی)ﷺ فەرمووی: یا رَسُولَ الله، ئێمە نوێژمان بـە جەماعـە لـە دوای تـۆ کرد، تۆش پێڵاوەکەت داکەندو فەرمووت: (جُبْرائِيل)ﷺ پێی گوتم پیسی پێوەیە. جـا ئەگەر پیسی بـە پێڵاوەکـەتـەوە نـەبێ، چـۆن داوێنپیـسی بـە ژنەکەتـەوە دەبـێ؟!. بڕوانە

(الخصائص الكبرى) ب(١) ل(٦٨) و(السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٤٠٢و٤١٢).

ئيتر هەر (صَحابَة)يەك جۆرە پاكانەيەكى دەكرد، جا پاكانەى خوایگەورەش لە سەرەوەى هەموويانە، كە دەفـەرمویٚ: ﴿الْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ وَالْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَاتِ وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ وَالطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ أُولَئِكَ مُبَرَّأُونَ مِمَّا يَقُولُونَ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾النور: ٢٦، ئافرەتە پيسەكان بۆ پياوە پيسەكانن، پياوە پيسەكانيش بۆ ئافرەتە پيسەكانن، ئافرەتە پاكەكان بۆ پياوە پاكەكانن، پياوە پاكەكانيش بۆ ئافرەتە پاكەكانن، ئەوانە -(عائِشَة)و (صَفْوان)- پاكن لەو بوختانەى پێيان كراوە، لێخۆشبوونیخواو بەهەشت بۆ ئەوانە.

بەڵێ: خوایگەورە داوێنپاكیى حەزرەتی(يُوسُف) پێغەمبەری ﷺ بە شاهيدیی منداڵێكی شيرخۆر ئاشكرا كرد، داوێنپاكیى حەزرەتی(مَرْيَم)شی بە شاهيدیی حەزرەتی(عِيسی ﷺ)ی شيرخۆر ئاشكرا كرد، بەڵام داوێنپاكیى حەزرەتی(عائِشَة)ی رضي‌الله عنها بە فەرموودەكەی خۆی لە قورئاندا ئاشكرا كرد. (تفسيرالقرطبي) النور: (٢٦) و(السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٤٠٢-٤١٢).

**هەشتەم: خوایگەورە پاكانەی حەزرەتی(عائِشَة)ی رضي‌الله عنها لە قورئاندا ئاشكرا كردو فەرمووی:** ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ﴾ تا ﴿أُولَئِكَ مُبَرَّأُونَ مِمَّا يَقُولُونَ﴾ النور: ١١-٢٦، هەندێ زانای تەفسير فەرموويانە: لە دوای سیو حەفت رۆژ خوایگەورە پاكانەی حەزرەتی(عائِشَة)ی-رضي‌الله عنها- ناردە خوارەوە. كەوابوو: بە (إِجْماع)ی زانایانیئيسلام: هەر كەسێك تۆمەتی زينا بداتە پاڵ حەزرەتی(عائشة)-رضي الله عنها- يان گومانی لە داوێنپاكیى حەزرەتی(عائشة) -رضي‌الله عنها- هەبێ، ئەوە كافرەو لە ئيسلام پاشگەز بۆتەوە، چونكە دەققی قورئانی وەدرۆ خستۆتەوە، بەڵكو حەزرەتی(ابن عَبّاس)-رضي‌الله عنهما- فەرموويەتی: ژنی هيچ پێغەمبەرێك زينای نەكردوە. ئيمامی(النواوي) گێڕاويەتيەوە.

**پرسيار:** بۆچی ژنی هيچ پێغەمبەرێك زيناكەر نيە، بەڵام بە فەرموودەی قورئان ژنەكانی حەزرەتی(نُوح) پێغەمبەرو حەزرەتی(لُوط) پێغەمبەر-عليهما الصلاة والسلام- كافر بون؟

**وەڵام:** گشت پێغەمبەرێك بۆ لای كافرەكان ناردراوە تاكو رێنموونييان بكا بۆ ئايينیخوا، جا ئەگەر پێغەمبەرەكە ناتەواويەكی هەبێ-لە خۆی، يان لە خێزانەكەی- ئەوە زياتر لێی دور دەكەونەوەو باوەڕی پێناكەن، جا لە لای كافرەكانيش زينا شتێكی سوكو ناشرينە، بەڵام كافربوون لە لای ئەوان ناشرين نيە، بەڵكو شانازيش بە كوفرەكەی خۆيان دەكەن. (شرح صحيح مسلم) ب(١٠) ل(٢٣٥) و(السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٤٠١و٤١١).

جا بۆيێ لێرەدا درێژەم بەم مەسەلەيە داوە، چونكە چينێكی (شيعَة)ی دەستكردی جولەكە، خۆيان كافر دەكەنو ئێستاش بوختان بە حەزرەتی(عائشة) رضي‌الله عنها دەكەن.

**نۆيەم: سزای بوختانی زينا: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا: بوختانەكەرەكان هەر يەكەو هەشتا دار سزای بوختانەكەيان لێدرا.** خوایگەورە دەفەرمویٚ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ

الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ * إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾النور:٤-٥، **ئەوانەی بوختانی زینا بە ئافرەتانی داوێنپاك دەكەن، ئینجا چوار شاهید ناهێنن لە سەر زینایەكەیان، ئەوانە هەشتا شورِكە داریان لێبدەن و شاهیدیشیان لێقبوڵ مەكەن و ئەوانە فاسقن، تەنها ئەوانە نەبن كە لە دوای ئەم تاوانە تۆبە دەكەن و دەبنە مرۆڤێكی چاك، ئەوە خوایگەورە لێبوردەیەو بە بەزەییە.**

**جا بزانە:** ئەم سزایەی بوختانی زینا مافی ئادەمیزادەكەیەو بە هۆی ئابڕووبردن لە سەر بوختانكرەكە واجب دەبێ، جا ئەگەر لە سزایەكە ببورێ، نابێ سزا بدرێ. ئیتر مەرجەكانی بوختانكەرەكەو بوختان پێكراوەكە لە بەرگی پێنجەمی (رِوونـاكی رب العالمین)دا بخوێنەوە، لەوێ بەدرێژی رِوونم كردۆتەوە، والحمد لله رب العالمین.

**دەیەم: گەورەیی و رِێزداری ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ، كە ئایەتی** ﴿وَلا يَأْتَلِ أُولُوالْفَضْلِ مِنْكُمْ وَالسَّعَةِ﴾النور: ٢٢، **هاتە خوارەوە، ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ بژێوەكەی بۆ (مِسْطَح) گەرِاندەوەو (كَفّارَة)ی سوێندەكەی دا. ئایەتەكە بەڵگەیە: لە سەر گەورەیی و رِێزداری ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ، چونكە خوا بە** ﴿أُولُوالْفَضْلِ﴾ **ناوی هێناوە.**

هەم حەدیسەكەش بەڵگەیە: ئەگەر كەسێك سوێندێكی خوارد لە سەر شتێك، جا شتێكی باشتری بۆ ئاشكرا بوو، سوننەتە: سوێندەكەی بشكێنێ و (كَفّارَة)ی سوێندەكەی بدا، واتە: یان كۆیلەیەك ئازاد بكا، یان دە پارچە جلو بەرگ بداتە دە هەژاران، یان دانەوێڵە بداتە دە هەژاران، جا ئەگەر توانای ئەوانەی نەبو، واجبە سێ رِۆژان بەرِۆژوو ببێ.

هەروەها لەئایەتەكەی ﴿أُولَئِكَ مُبَرَّأُونَ مِمَّا يَقُولُونَ﴾یرابردوو، گەورەیی و داوێنپاكیی حەزرەتی(صَفْوان بن الْمُعَطّل)ﷺ ئاشكرا بوو، هەم پێغەمبەرﷺ دەرهەق وی فەرمووی: ﴿ذَكَرُوا رَجُلاً ما عَلِمْتُ عَلَيْهِ إِلاّ خَيْراً﴾ **لە بوختانەكەدا باسی پیاوێكی وەهایان كرد: كە جگە لە چاكە هیچیترم لێنەدیوە.** (شرح صحیح مسلم) ب(١٠) ل(٢٣٢-٢٣٦).

*** *** ***

## ﴿ غەزای (الْخَنْدَق)= (الأَحْزاب)﴾

**ئەم غەزایە لە مانگی (شوّال) ساڵی پێنجەمی كۆچی رِووی دا، هۆیەكەی ئەوە بوو: كە جولەكەكانی (بَنِی النَّضِير) لە شوێنەكانیخۆیان دەركران، هەردەم هەوڵیان دەدا تۆڵەی خۆیان لە موسوڵمانان بكەنەوە، بۆیێ چەند سەركردەیەكی ئەم جولەكانە چونە (مَكّة)ی پیرۆزو هانی كافرەكانی (قُرَيْشي)یان دا بۆ جەنگی پێغەمبەروﷺ، پێیان گوتن: ئێمە یارمەتیتان دەدەین تا (مُحَمَّد)ﷺ بنەبرِ دەكەین، ئێوە لە (مُحَمَّد)ﷺ رِاستترن و بتپەرستنەكەی ئێوە لە ئایینی (مُحَمَّد)ﷺ چاكترە!.**

ئینجا كه كافرەكانی (قُرَیْش) ڕازی بونو گفتیان دا، جولەكەكان چونە لای كافرەكانی (غَطفان)، ئەوانیشیان ڕازی كردن بێنە جەنگی پێغەمبەرﷺ، بەڵام بەو مەرجەی قەسپی (خَیْبَر) بەرهەمی ساڵێك بۆ كافرەكانی (غَطفان) بێ.
جا كافرەكانی (قُرَیْش)و (غَطفان)و شوێنكەوتەكانیان لە هۆزە كافرەكانی‌تری عەرەب، هەر هەموویان خۆیان بۆ جەنگ ئامادە كرد، تا ژمارەی لەشكری كافرەكان بووە دە هەزار چەكدار: ژمارەی چەكدارانی (قُرَیْش)و هاوپەیمانەكانیان چوار هەزار كەس بوو، (غَطفان)و هاوپەیمانەكانیان شەش هەزار كەس بون، (أبُوسُفْیان)ش بەڕیوەبەری كاروباری جەنگەكە بوو، جا كە كافرەكان خۆیان ئامادە كرد، هەواڵگری پێغەمبەرﷺ لە هۆزی (خُزاعَة)، لە ماوەی چوار شەودا هەواڵەكەیان گەیاندە پێغەمبەرﷺ، ئیتر پێغەمبەریشﷺ هەواڵەكەی بە (صَحابَة)كان ڕاگەیاندو ڕاوێژی پێ‌كردن: ئایا بۆ جەنگكردن بڕۆینە دەرەوەی (مَدِینَة)، یان هەر لە ناو (مَدِینَة)دا بمێنینەوە؟ جا حەزرەتی(سَلْمان الْفارسي)ﷺ ئاماژەی بە هەڵكەندنی (خَنْدَق) كردو پێغەمبەریشﷺ ئەم ڕەئیەی پەسند كرد.
جا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی (ابن أُمّ مَكْتوم)یﷺ كردە جێنیشی‌خۆی لە (مَدِینَة)و سێ هەزار (صَحابَة)ی چەكداری ئامادە كردنو سەربازگەی لە بن كێوی (سَلْع) دانا، واتە: كێوی (سَلْع) كەوتە پشتەوەیان، جا ئاڵای (مُهاجِر)ەكانی دایە دەست حەزرەتی(زَیْد بن حارِثة)ﷺو ئاڵای (أنْصار)یشی دایە دەست حەزرەتی(سَعْد بن عُبادَة)ﷺ، دروشمی (صَحابَة)كانیشﷺ (حم لا یُنْصَرُونَ) بوو.
ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: لە پێش سەربازگەكە لە لای باكوری (مَدِینَة)ی پیرۆز (خَنْدَق)=چاڵێكی درێژو قووڵ هەڵكەنن: لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا؟ چونكە لای باكوری (مَدِینَة) بەرهەڵو مەترسیدار بوو، لایەكانی‌تریشی بە دارخورماو خانووەكان تێك هەڵچنا بوو دوژمن نەیدەتوانی بەو لایانەدا بێتە ناو (مَدِینَة)، جا پێغەمبەرﷺ كاركردنی (خَنْدَق)ی لە نێوان (صَحابَة)كاندا بەش كرد: چل گەز= بیست مەتر بۆ دە (صَحابَة)، جا پێغەمبەرﷺ بە خۆیشی كاری لەگەڵ دەكردن، جا ئەگەر (صَحابَة)یەكیش كارێكی تایبەتی‌خۆی هەبوایە، پێغەمبەرﷺ ئیزنی دەدا، بەڵام (مُنافِق)ەكان لە كاركردن دەكشانەوەو هەندێكیشیان بێ‌ئیزنی پێغەمبەرﷺ دەگەڕانەوە ماڵەوەیان، ئیتر بەردەوام زۆر بە پەلە كاریان دەكرد، تا پێش تەواوبوونی مانگێك هەڵكەندنی (خَنْدَق) تەواو بوو، بەڵكو ئیمامی(التواوي) فەرموویەتی: بە پانزە ڕۆژ تەواویان كرد.
حەزرەتی(جابر)ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژێك پارچەیەكی توندو ڕەق لە هەڵكەندنی (خَنْدَق) بە ملماندا هات، جا هاتینە لای پێغەمبەرﷺ، ئەویش بەخۆی دابەزیە ناو

(خَندَق)، له بەر برسیەتی بەردێکی لە سەر زگیخۆی بەستبوو، چونکە ماوەی سێ ڕۆژ بوو هیچمان نەخواردبوو، جا پێغەمبەرﷺ کولێنکی لە شوێنە ڕەقەکە دا، یەکسەر بووە لمێکی نەرمی ڕژاو، جا گوتم: یا رَسُولَ اللهﷺ ئیزنم بدە بچمەوە ماڵەوەم. جا چومەوە بە ژنەکەیخۆم گوت: برسیەتیەکی وەهام بە پێغەمبەرەوەﷺ بینیوە، خۆم بۆ ناگیرێ، ئایا خواردنێك هەیە؟ ژنەکەم گوتی: هەندێ جۆ و جوشتیرێکمان هەیە، جا من جوشتیرەکەم سەربڕیو وردم کردە ناو مەنجەڵو لە سەر ئاگرم دانا، ژنەکەشم جۆیەکەی هاڕیو ئامادەی کرد بیکاتە نان، جا هاتمەوە خزمەت پێغەمبەروﷺ گوتم: یا رَسُولَ الله خواردنۆکەیەکم ئامادە کردوە جەنابت بفەرموو لەگەڵ پیاوێك، یان دوو پیاو. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خواردنەکە چەندە؟ منیش گوتم: جوشتیرێك و هەندێك نانە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خواردنەکە زۆرەو خۆشە، بە ژنەکەت بڵێ: تا من دێم مەنجەڵەکە لە سەر ئاگر مەهێننە خوارەوەو هەویرەکەش مەکەنە نان. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هۆ خەڵکی (خَنْدَق) هەڵسن وەرن (جابِر) زیافەتێکی کردوە!.

ئیتر منیش بە پەلە گەڕامەوە ماڵەوەو گوتمە ژنەکەم: ماڵوێران، پێغەمبەرﷺ (مُهاجِر)و (أنصار)ی لەگەڵ خۆیا هێناون!، جا ژنەکەم گوتی: پرسیاری لێنەکردی خواردنەکە چەندە؟ گوتم بەڵێ. ژنەکەشم گوتی: خواو پێغەمبەرﷺ چاکتر دەزانن. جا پێغەمبەرﷺ هاتو تفی کردە ناو هەویرو گۆشتەکەو بە (صَحابَة)کانی فەرموو: وەرنە ژوورەوەو پاڵەپەستە مەکەن، جا دە کەس دە کەس دایدەنانو خواردنی دەدانێ، حەزرەتی(جابر)ﷺ فەرموویەتی: ئەوانەی خواردنەکەیان خوارد ژمارەیان هەزار کەس بوو!، سوێندم بە خوا: هەموویان تێر بونو خواردنەکەش وەك خۆی مایەوەو بەشی خەڵکیشمان لێدا.

ئینجا کە هەڵکەندنی (خَندَق) تەواو بوو، لەشکری کافرەکانیش گەیشتە (مَدِینَة)، لە لای (مَجْمَعُ الأسْيال)و (أحُد) دابەزین، جا کە دیتیان (خَندَق) هەڵکەندراوە سەریان سوڕما، چونکە پێشتر ئەو جۆرە فێڵە لە وڵاتی عەرەبەکاندا نەبو، بۆیێ هەر لە دەورەی (خَندَق)دا دەسوڕانەوەو بە تیرهاوێشتن جەنگیان لەگەڵ (صَحابَة)کان دەکرد، تا وەڕەز بون، ناچار هەندێکیان هەوڵیان دا بە سواری بە سەر (خَندَق)دا باز بدەنە ئەو بەری لای موسوڵمانەکان، جا لەو بازدانەدا (نَوْفَل بن عبدالله) خۆیو ئەسپەکەی کەوتنە ناو (خَندَق)و ئەستۆی شکاو مرد، بەڵام (عِكْرِمَة)و (هُبيرة)و (ضِرار)و (عَمْرِو بن وَدّ) هاتنە ئەم بەرە، جا (عَمْرِو بن وَدّ) مەیدانی خواستەوە، جا ئیمام (عَلِي)ﷺ سێ جار ئیزنی لە پێغەمبەرﷺ خواست: تا ئیزنی دا و بۆی چووە مەیدان، جا (عَمْرو) گوتی: تۆ

کێی؟ فەرمووی: من (عَلِي بن أبى طالِب)م. (عَمْرو) گوتی: با یەکێکی لە تۆ بەهێزتر بۆم بێتە مەیدان، من پێم خۆش نیە خوێنت بڕژێنم. جا ئیمام (عَلي)ﷺ فەرمووی: من پێم ناخۆش نیە خوێنت بڕژێنم. جا (عَمْرو) توڕە بوو و یەکسەر بە شمشێرەکەی پەلاماری ئیمام (عَلي)ی دا، جا ئیمام (عَلي)ﷺ قەڵغانەکەی دایە بەر شمشێرەکە، بەڵام شمشێرەکەی ئەوەندە بەهێز بوو: قەڵغانەکەی لەت کردو گەیشتە سەری ئیمام (علی)وﷺ بریندارى کرد، جا ئیمام (علی)شﷺ شمشێرێکی لە دەماری ملی (عَمْرو) دا و خستیە سەر زەمینو کوشتیو فەرمووی: (اَللّٰهُ أكْبَر). جا کە پێغەمبەرﷺ گوێی لە دەنگی (اَللّٰهُ أكْبَر) بوو، زانی ئیمام (علی)ﷺ ئەو کافرەی کوشتووە. جا کە (عَمْرو) کوژرا، ئەوانیتر هەڵاتن، ئینجا کافرەکان ناردیان: بە پارە لاشەی (عَمْرو) بکڕنەوە، بەڵام پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بە خۆڕایی کەلاکەکەیان بدەنەوە، پارەکەشی پیسە.

## ﴿ پەیمانشکاندنی جولەکەکانی (بَنِی قُرَيْظَة) ﴾

ئینجا لەو حاڵەتە ناسكو پڕ ترسەدا (حُيَيّ بن أخطب)–کە سەرۆکی جولەکەکانی (بَنِی النَّضِير)ی دەرکراو بوو– هاتە لای (كَعْب بن أسَد)ی گەورەی جولەکەکانی (بَنِیقُرَيْظَة) –کە هاوپەیمانی پێغەمبەرﷺ بون–، پێی گوت: (قُرَيْش)و (غَطفان)م هێناونو پەیمانیان داومێ: تا (مُحَمَّد)و (صَحابَة)کانی بنەبڕ نەکەن نەگەڕێنەوە. جا (كَعْب) گوتی: ماڵوێران وازم لێبێنە، تا ئێستا جگە لە وەفاداریو ڕاستگۆیی هیچیترم لە (مُحَمَّد)ﷺ نەدیتووە، من پەیمانەکەم لەگەڵ (مُحَمَّد)ﷺ ناشکێنم.

ئیتر (حُيَيّ) هەر وازی نەهێناو گوتی: ئەی (كَعْب)، تۆ پەیمانەکەت لەگەڵ (مُحَمَّد) بشکێنە، من پەیمانت دەدەمێ: ئەگەر (قُرَيْش)و (غَطفان) گەڕانەوەو (مُحَمَّد)یان نەکوشت، من لەگەڵ تۆ لە قەڵایەکەتدا دەمێنمەوە، تاکو چی بە سەر تۆ بێ، بە سەر منیش بێ، جا (كَعْب)ی جولەکە پەیمانەکەی شکاندو پەیماننامەکەشی دڕاندو بڕیاری دا: جولەکەکان لە لای خۆیانەوە هێرش بکەنە سەر (مَدِينَة).

جا کە هەواڵی پەیمان شکاندنەکە ئاشکرا بوو، پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(الزُّبَيْر بن العَوام)یﷺ نارد: تاکو بزانێ هەواڵەکە ڕاستە، یان نا. جا کە حەزرەتی(الزُّبَيْر)ﷺ دیتی هەواڵەکە ڕاستەو جولەکەکان خۆیان بۆ جەنگ ئامادە دەکەن، گەڕاوە لای پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ﴿فِداكَ أَبِي وَأُمِّـي﴾ رواه الشيخان، **باوکمو دایکم گیانفیدات بن**. لە غەزای (أُحُد)ش هەمان ڕستەی بۆ حەزرەتی (سَعْد بن أبِیوقاص) بە کار هێنا.

جا کە پێغەمبەرﷺ هەواڵی پەیمانشکاندنەکەی زانی، پێنجسەد (صَحابَة)ی ناردنەوە ناو (مَدِينَة) بۆ چاودێری ئافرەتو منداڵی (صَحابَة)کان: دوو سەد بە سەرکردایەتی حەزرەتی(سَلَمَة بن أسْلَم)ﷺ، سێسەدیش بە سەرکردایەتی حەزرەتی(زَيْد بن

حارِثة)ﷺ، جا فەرمانی پێکردن: لە ناو (مَدِينة)دا بە دەنگی بەرز بڵێن: (اَللهُ أَكْبَـر).
تاکو جولەکەکانی (بَنِىقُرَيْظَة) بزانن هێزێکی زۆر لە نـاو (مَدِينـة)دا هەیـەو بترسـێن، چونکە هیچ کاتێك پێغەمبەرﷺ لـە جولەکـەکان دڵنیـا نـەبو و بـیری لـەوە دەکـردەوە ئەوان لەو کاتە ناسکەدا پەیمان بشکێنن. بۆیێ دووبارە پێغەمبـەرﷺ حـەزرەتی(سَعْد بـن مُعـاذ)و حـەزرەتی(سَـعْد بـن عُبـادَة)و چـەند (صَـحابَة)یـەکیتریﷺ ناردنـە لای جولەکەکانی (بَنِىقُرَيْظَة)، تاکو زیاتر لە هەواڵەکە بکۆڵنەوەو قسەشیان لەگەڵ بکەن‌و پێی فەرموون: ئەگەر هەواڵەکە ڕاست بوو، بـە ئامـاژە پـێم بڵێن‌و لـە نـاو خەڵکیدا بـڵاوی مەکەنـەوە. جـا کـە ئەوانـەش چـونە لای جولەکـەکان، دیتیـان پەیمانەکـەیان شکاندوەو جنێویش دەدەنە پێغەمبەرﷺ، ئیتر هـەردوو (سَعْد)رضی‌الله عنهما گەڕانـەوە لای پێغەمبەروﷺ گوتیان: (عَضَل وَالْقَارَة). جا پێغەمبەرﷺ تێگەیشت مەبەستیان ئەوەیە: وەکو کافرەکانی (عَضَل)و (الْقَارَة) پەیمانەکەیان شکاندوە–کە لە غـەزای (الرَّجِيـع)دا ڕابـرا– جـا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿اَللّٰهُ أَكْبَر، أَبْشِرُوا يا مَعاشِرَ الْمُسْلِمِين﴾ موژدەی سـەرکەوتنتان لێبێ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان.

ئـیتر بـە هـۆی ئـەم پەیمانـشکاندنە مەترسـی لـە نـاو موسـوڵمانان بـڵاو بـۆوە، چـونکە (منافق)ەکان پڕو پاگندەیان لە دژی ئیسلام بڵاو دەکردەو موسوڵمانەکانیان دەترساندن، لە لایەکیتریش: جولەکەکانی (بَنِىقُرَيْظَة)ش بیست وشتری بارکراویـان بـۆ کافرەکـانی (قُـرَيْش) نـارد: جـۆ و قەسـپو کایـان لێبـارکرابوو، بـەڵام ئـەم کاروانـە کەوتـە دەست (صَحابَة)کان‌و بۆ خۆیان سودیان لێوەرگرت.

جا پێغەمبەرﷺ بیری لە پلانێك کردەوە: تا پەرتەوازە بخاتە ناو لەشکری کافرەکان، بۆیێ ناردیە لای هەردوو سەرکردەکەی (غَطفان)، واتە: (عُيَيْنَـة بـن حِصْن)و (الحـارِث بن عَوْف)، فەرمووی: سێیەکی میوەی (مَدِينَة)تان دەدەمێ، ئێوە بگەڕێنـەوەو یارمـەتی (قُرَيْش) مەدەن. جا ئەوانیش ڕازی بون‌و نوسراوێکیان لە نێوانیاندا نوسی، بەڵام ئیمزا نەکرابوو، جا پێغەمبەرﷺ ناردی حەزرەتی(سَعْد بن مُعاذ)و حەزرەتی(سَعْد بن عُبادَة) رضی‌الله عنهما هاتن‌و پلانەکەی بۆ باس کردن، جا هەردوو (سَعْد) رضی‌الله عنهما گوتیـان: یـا رَسُولَ الله، ئەگەر ئەمە کارێکە خوا فەرمانی پـێکردوی، یـان خـۆت پێت خۆشـە، ئـەوە ئێمـە ملکەچین، یان بـۆ بەرژەوەنـدی ئێمـە دەیکـەی؟ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ئەگـەر خـوا فـەرمانی پێکردبـام پرسـم بـە ئێـوە نـەدەکرد، بـەڵام دەبیـنم هـەموو عەرەبـەکان بـە تێکرایی ئێوەیان کردۆتە ئامانجی تیرەکانیان، بۆیێ دەمـەوێ هێـزی دوژمنـان بـشکێنم.
جا هـەردوو (سَعْد) رضی‌الله عنهما فـەرموویان: یـا رَسُولَ الله لـەو کاتـەی ئێمـە کـافر بـوین‌و خودامان نەدەناسی، ئـەو کافرانـە نـەدەوێران قەسـپو خورمـای ئێمـە بخـۆن تـەنها بـە

میوانداریو کرین نەبێ، جا کە ئێستا بە ئیسلام سەربەرز بوین، چۆن قبوڵ دەکەین ئەوان ماڵی ئێمە بەو جۆرە بخۆن!، وَاللهِ جگە لە شمشێر هیچیتریان نادەینێ. جا پێغەمبەرﷺ بەم وەڵامە دڵخۆش بوو و فەرمووی: خۆتو کارەکەت، نوسراوەکە بدڕێنە. جا حەزرەتی(سَعْد بن مُعاذ)ﷺ نوسراوەکەی وەرگرتو دڕاندیو بە وەفدەکەی (غَطَفان)شی گوت: بگەڕێنەوە، شمشێر لە نێوان ئێمەو ئێوەدا بڕیاردەرە، با هەموو توانایخۆیان لە دژی ئێمە بە کار بێنن.

ئیتر جەنگ لە نێوان (صَحابَة)و کافرەکاندا ڕۆژ بە ڕۆژ توندتر دەبوو و لە هەموو لایەکەوە کافرەکان دەیانویست هێرش بکەن. تا ڕۆژێك بە هۆی توندوتیژیی جەنگ، پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کان نوێژی عەسریان فەوتاو لە دوای ڕۆژئاوابوون قەزایان کردەوە، ڕۆژێکیتریش نوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریبیان فەوتانو لە درەنگی شەویدا قەزایان کردنەوە، جا لەم کاتە تەنگەدا پێغەمبەرﷺ ئەم دوعایەی فێری (صَحابَة)کان کرد: ﴿اَللّٰهُمَّ اسْتُرْ عَوْراتِنا وَآمِنْ رَوْعاتِنا﴾ خودایە عەیبەکانمان داپۆشەو لە مەترسیەکانمان ئەمین بکە.

جا لەم غەزایەدا لە موسوڵمانەکان شەش (صَحابَة) شەهید بون، لە کافرەکانیش سێ کەس کوژران، ئیتر گەمارۆدانی (مَدینَة) لە لایان کافرەکانەوە، تا پانزە ڕۆژان بەردەوام بوو، جا پێغەمبەرﷺ دوعای لێکردنو فەرمووی: ﴿اَللّٰهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتابِ، سَريعَ الْحِسابِ، اِهْزِمِ الْأَحْزابَ، اَللّٰهُمَّ اِهْزِمْهُم وَزَلْزِلْهُمْ، اَللّٰهُمَّ اِهْزِمْهُمْ وَانْصُرْنا عَلَيْهِمْ﴾ رواه الشيخان، ئەی ئەو خوایەی قورئانت ناردۆتە خوارەوەو لێپێچانەوەت بە پەلەیە، گرۆهەکانی دوژمن ببەزێنە، خودایە بیانبەزێنەو بیانلەرزێنە، خودایە بیانبەزێنەو سەرکەوتوومان بکە بە سەریاندا. ئیتر خوایگەورە دوعایەکەی قبوڵ کردو کافرەکانی بەزاندن.

﴿ بەزینی لەشکری کافرەکان ﴾

گوتراوە: (إِذا أَرادَ اللهُ شَيْئاً هَيَّأَ أَسْبابَهُ) کاتێ خوایگەورە ویستی کارێك ببێ، هۆکارەکانی بۆ ئامادە دەکا. جا لەم غەزایەدا بە دوو هۆکار خوایگەورە لەشکری کافرەکانی بەزاند کە دەستی (صَحابَة)کانیﷺ تێدا نەبو:

**هۆکاری یەکەم:** پیاوێك ـ ناوی (نُعَيم بن مَسعُودالغَطَفاني) بوو ـ هات موسوڵمان بوو، جا گوتی: یا رَسُولَ الله هەر فەرمانێکم پێبکەی، جێ بەجێی دەکەم، چونکە هیچ کەسێك نەیزانیوە من موسوڵمان بویمە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر دەتوانی دوژمنەکانمان لە جەنگی ئێمە خاو بکەوە، چونکە ﴿اَلْحَرْبُ خَدْعَةٌ﴾ جەنگ فێڵێکە، واتە: بە فێڵێك کۆتایی دێ.

ئینجا حەزرەتی(نُعَيم)ﷺ چووە لای جولەکەکانی (بَنِیقُرَيظَة)، جا کە دیتیان، زۆر بە

گەرمی پێشوازییان لێکرد، چونکە پێشتریش دۆستی ئەوان بوو و نەیاندەزانی موسوڵمان بووە، جا حەزرەتی(نُعَیم)ﷺ بە جولەکەکانی گوت: خۆ دەزانن من چەند دۆستی ئێوەمە، هەر لە بەر دۆستایەتیش هاتوم قسەیەکیتان پێ بڵێم، بەلام لێم ئاشکرا مەکەن، ئێوە بە چاوی خۆتان دیتتان جولەکەکانی (بَنِیقَیْنُقاع)و (بَنِیالنَّضِیر) چییان بە سەر هات، (قُرَیْش)و (غَطفان)ش وەکو ئێوە نیشتەجێی ئەم شارە نین، ئەوان تەنها بۆ ئەوە هاتون لەگەڵ ئێوەدا جەنگ لە دژی (مُحَمَّد)ﷺ بکەن، جا ئەگەر سەر کەوتن، ئەوە سەرکەوتن، ئەگەر نا: ئەوان دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتیخۆیانو ئێوەش بۆ ئەم پیاوە- مُحَمَّدﷺ- بەجێ دێڵن، جا ئەو کات ئێوە توانای ئەوتان نیە، بۆیێ وا بە باش دەزانم ئێوە لەم جەنگەدا یارمەتی (قُرَیْش)و (غَطفان) نەدەن تا دڵنیاتان دەکەنو حەفتا پیاوماقوڵیخۆیان بە بارمتە لە لای ئێوە دادەنێن. جا جولەکەکان گوتیان: ئەمە ڕەئیەکی جوانەو بە قسەی تۆ دەکەینو سوپاسیشت دەکەین.
جا حەزرەتی(نُعَیم)ﷺ لە لای جولەکەکان ڕۆیشتو چووە لای کافرەکانی (قُرَیْش)و (غَطفان)و پێی گوتن: ئێوە دەزانن من چەند دڵسۆزی ئێوەم، هەواڵێکم زانیوە پێتان دەڵێم، بەلام ناوی من مەڵێن، جولەکەکانی (بَنِیقُرَیْظَة) لەو کردارەی لەبارەی (مُحَمَّد)ﷺ کردویانەو پەیمانەکەیان هەڵوەشاندبۆوە، ئێستا پەشمیان بوینەوەو لەگەڵ (مُحَمَّد)ﷺ ئەوها پێك هاتونەوە: ئەوان حەفتا پیاوماقوڵی ئێوە بگرنو بیاندەنە دەست (مُحَمَّد)ﷺ تاکو بیانکوژن، لە بەرامبەریش (مُحَمَّد‌ﷺ) جولەکەکانی (بَنِیالنَضِیر) بگەڕێنێتەوە سەر مڵكو خانووەکانیان، جا ئەگەر جولەکەکان داوای پیاوماقوڵانی ئێوەیان کرد، نەکەن یەك پیاویش بنێرن.
ئیتر بێمتمانەیی کەوتە ناو هەرسێك لەشکری کافرەکانو وای لێهات ئەوانیش لە یەکتری دەترسان، بۆیێ لە شەوی شەممەدا (أبُوسُفْیان) ناردیە لای جولەکەکانو گوتی: ئێمە هیچیتر ناتوانین لێرە بمێنینەوە، سبەینێ ئامادە بن دەست بە جەنگی یەکلاکەرەوە دەکەین. جولەکانیش وەلامیان داوە: سبەینێ شەممەیە، ئێمە لە شەممەدا جەنگ ناکەین، جگە لەمەش: ئێمە جەنگ ناکەین تا ئێوە حەفتا پیاو بە بارمەتە لە لای ئێمە دادەنێن، نەوەك ئێوە بگەڕێنەوەو ئێمەش بەجێ بێڵن. ئیتر کافرەکان لە جەنگکردن خاو بونەوەو گوتیان: (نُعَیم) ڕاستی گۆت.
**هۆکاری دووەمیش:** خوایگەورە لە شەوی بیستو سێی مانگی (ذِیالْقَعْدَة)دا بایەکی بەهێزو ساردی ناردە سەر کافرەکان، لە تاریکی شەویدا زیڕەی دەهاتو خێمەکانیانی هەڵکەندنو دیزەو گۆزەکانیان سەراو بن بون، جا لەگەڵ بایەکەشدا خوایگەورە (مَلائِکَة)ی ناردنە سەر لەشکری کافرەکان-نەك بۆ جەنگکردن، بەڵکو- بۆ ترساندنی

کافرەکـان، جـا (مَلائِکَـة) بـە تەقـە تـەقی چـەکیخۆیان تـرسو لـەرزیان خـستە نـاو کافرەکان، تا وایان لێهات: هەر سەرکردەیەك بـە سـەربازەکانیخۆی دەگوت: وەرنـە لای مـن. جـا کافرەکـان زیـاتریش لـەوە دەترسـان لـەم تاریـە شـەوەدا موسـوڵمانەکانو جولەکەکان وێکڕا هێرشـیان بکەنـە سـەر، بۆیـێ بڕیاریـان دا: لـەم شـەوەدا بـار بکـەنو بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

جا پێغەمبەرﷺ هەستی کرد ناکۆکیو سەرلێشێواوی کەوتوتە ناو لەشکری کافرەکان، بۆیێ فەرمانی بە حەزرەتی(حُذَیفَة بن الیَمان)ﷺ کرد بڕواتە ناو لەشکری کافرەکانو هەواڵی لەشکرەکەیانی بۆ بێنێو پێی فەرموو: هیچ کەتنێك نەکەی.

جا حەزرەتی(حُذَیفة)ﷺ فەرمووی: لەم سەرماو تاریە شەوەدا ڕۆیشتم وەك بڵێی لـە گەرماودا دەڕۆیشتم، تا چومە ناو لەشکری کافرەکان، گوێم لێبوو (أبُوسُفیان) دەیگوت: هەر کەسەتان دەستی دانیشتووی لایخۆی بگرێو ئاگاداری جاسوسەکەکان بن.

جا بۆ ئەوەی هەستم پێنەکەن، یەکسەر منـیش دەسـتی پیاوەکـەی لای ڕاسـتەم گـرتو گوتم: تۆ کێی؟ گوتی: من (مُعاوِیَة)ی کوڕی (أبُوسُفیان)م. دەسـتی لای چەپەشـم گـرت، ئەویش گوتی: من (عَمْرِو بن العاص)م. جا (أبُوسُفیان) گـوتی: وڵاغـەکانمان بـە هـیلاك چونو (بَنِیقُرَیظَة)ش پەشێمان بوینەوەو ئەو ڕەشەبایەش دەبینن چی دەکا، کەوابوو: ئێوە بار بکەن، وا منیش بار دەکەم. ئیتر یەکسەر (أبوسُفیان) سـواری وشـترەکەی بـوو، بەڵام (عِکرَمَة) پێیگوت: تـۆ سـەرکردەی لەشـکری، چـۆن بـەخۆت دەڕۆیو خـەڵکیش بەجێ دێڵی؟! جا (أبوسُفیان) شەرمی کردو دابەزی، تا خەڵکەکەش لەم شەوەدا دەسـتی بە بارکردن کرد، ئینجا حەزرەتی(حُذَیفَـة)شﷺ گـەڕاوە لای پێغەمبـەروﷺ هـەواڵی بارکردنی لەشـکری کافرەکـانی بـۆ هێنـاوە. جا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ﴿لـە ئێـستا بەولاوە ئێمە دەچینە جەنگی ئەوان، ئەوان نایەنە جەنگی ئێمە﴾.

جا حەزرەتی(حُذَیفَة)ﷺ لـە دوای گەڕانـەوەی، یەکسەر سـەرمای تـووش بـۆوە، بـۆیێ پێغەمبەرﷺ بەشـێکی عەبایەکـەیخۆی بـە سـەر داداو لـە نـاو عەبایەکـەدا خـەوت تـا بەیانی، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿قُمْ یا نَوْمانُ﴾ هەڵسە لە خەو ئەی خەواڵۆ.

## ﴿ غەزای جولەکەکانی (بَنِیقُرَیْظَة) ﴾

ئینجا کە لە شەوی بیستو سێی مانگی (ذِیالقَعْدَة)دا کافرەکان گەڕانەوە، لە سبەینەی هەمان شەو پێغەمبـەرﷺ هاتـەوە نـاو شـاری (مَدِینَـة)و چـەکی دانـاو خـۆی شوشـتو نوێژی نیوەڕۆی کرد، جا حەزرەتی(جُبْرائیل)ﷺ هاتە لایو فەرمووی: ئێـوە چـەکتان داناوە، وَاللهِ تا ئێستا ئێمەی (مَلائِکَة) چەکمان دانەناوە!، هەڵسە بۆ غەزای جولەکەکانی (بَنِیقُرَیظَة) بڕۆ. جا هەر لەم ڕۆژەدا یەکسەر پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(عبـدالله ابـن اُمّ

مَكتوم)یﷺ کردە جێنیشیخۆی لە (مَدینة)، ئینجا فەرمووی: ﴿یا خَیْلَ اللهِ ارْكَبِـــی﴾ هۆ ئەسپسوارەکانیخوا، سواری وڵاغەکانتان بن.

جا ئاڵایەکەی دایە دەست ئیمام (علی)وﷺ فەرمانیشی بە حەزرەتی(بلال)ﷺ کرد بانگەوازی بکا: پێغەمبەرﷺ دەفەرمووی: ﴿أَلاَ لا یُصَلِّینَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلاّ فِی بَنِی قُرَیْظَةَ﴾ هیچ کەسێك نوێژی عەسر نەکا، تا لە ناو ماڵەکانی (بَنِیقُرَیْظَة)دا دەیکا.

جا یەکسەر سێ هەزار (صَحابَة)ﷺ بە دەم بانگەوازیەکە هاتنو بەرەو (بَنِیقُرَیْظَة) کەوتنە ڕێ، جا هەندێکیان لە ڕێگەدا کاتی نوێژی عەسریان گەیشتیو نوێژەکەیان کردو گوتیان: مەبەستی پێغەمبەرﷺ پەلە کردنە، نەك دواخستنی نوێژەکە. هەندێکیتریش نوێژی عەسریان نەکرد تا گەیشتنە (بَنِیقُرَیْظَة)، لەوێ لە دوای عیشا نوێژەکەیان قەزا کردەوە، جا پێغەمبەرﷺ ڕەخنەی لە هیچیان نەگرت.

جا حەزرەتی(جِبرائیل)ش ﷺ لەگەڵ چەند (مَلائِکَة)یەکیتر بەرەو (بَنِیقُرَیْظَة) ڕۆیشت تاکو ترسو لەرز بخاتە ناو دڵیان، جا کە پێغەمبەریشﷺ گەیشتە قەڵایەکانی (بَنِیقُرَیْظَة)، بانگی کردنو فەرمووی: ﴿یا إِخْوانَ الْقِرَدَةِ وَالْخَنَازِیرِ وَعَبَدَةَ الطَّاغُوتِ، هَلْ أَخْـزاكُمُ اللهُ وَأَنْـزَلَ بِكُـمْ نِقْمَتَـهُ؟﴾ ئەی برایەکانی سەکسارو بەرازەکان، ئەی (طاغُوت)پەرستەکان، خوا ئێوەی ڕیسوا کردو سزای خۆی بە سەر ئێوەدا باراند؟ واتە: سزای خیانەتکاریو پەیمانشکاندنەکە.

جا پێغەمبەرﷺ ماوەی بیستو پێنج ڕۆژان جولەکەکانی گەمارۆ دان، تا وایان لێهات لە خۆیان بێزار بونو ترسو دڵەڕاوکێ دایگرتن، بۆیێ (کَعب بن أسَد) بە جولەکەکانی گوت: دەبینن چیتان بە سەر هات! من سێ ڕێگاتان بۆ دادەنێم، کامەیان حەز دەکەن وەریبگرن:

یەکەمیان: با موسوڵمان ببینو شوێن ئەو پیاوە بکەوین، وَاللهِ بۆتان ئاشکرا بووە: ئەوە پێغەمبەریخوایەو لە (تَوراة)دا ناوی هەیە، بەم موسوڵمانبوونە گیانو ماڵو منداڵمان دەپارێزین؟ جولەکەکان گوتیان: ئێمە هەتا هەتایی لە ئایینی (تَوراة) جیا نابینەوە.

دووەمیان: کەوابوو: هەڵسن با ژنو منداڵەکانمان بکوژینو یەکسەر هێرشێك بکەینە سەر (مُحَمَّد)و (صَحابَة)کانی، جا ئەگەر بشفەوتێین هیچ ژنو منداڵمان لە دوا بەجێ نامێنێ؟ جولەکەکان گوتیان: تاوانی ئەو هەژارانە چییە؟ لە دوای ئەوان چ تامێك لە ژیاندا هەیە؟.

سێیەمیان: کەوابوو: ئەم شەو شەممەیە، لەوانەیە (مُحَمَّد)و (صَحابَة)کانی لە ئێمە دڵنیا بن، با هێرشێك بکەینە سەریان بەڵکی لە ناکاو زیانێکیان لێبدەین؟ گوتیان: چۆن شەممەی خۆمان بشکێنین؟!.

جا جولەکەکان داوایان لە پێغەمبەرﷺ کرد: وەکو جولەکەکانی (بَنِیالنَّضِیر) ڕێگەیان بداتێ لەم وڵاتە بڕۆنو مڵكوماڵەکەشیان بەجێ بهێڵن؟ بەڵام پێغەمبەرﷺ ڕازی نەبو و فەرمووی: دەبێ لە سەر بڕیاری پێغەمبەریخواﷺ دابەزن.

جا جولەکەکان زانییان هیچ چارەیان نەماوە، بۆیێ داوایان کرد پێغەمبەرﷺ (أبُو لُبابَة)ﷺ بنێریتە لایان تاکو ڕاوێژی پێبکەن، چونکە حەزرەتی(أبُولُبابَة) دۆستی ئەو جولەکانە بوو، ژنو منداڵیشی لەگەڵ ئەواندا بوو، جا کە حەزرەتی(أبُولُبابَة)ﷺ چووە لای جولەکەکان، پێیان گوت: چی دەڵێی لە سەر بڕیاری (مُحَمَّد)ﷺ دابەزین؟ حەزرەتی(أبُولُبابَة)شﷺ گوتی: بەڵێ. بە دەستیشی ئاماژەی بۆ گەرویخۆی کرد، واتە: بڕیارەکەی پێغەمبەرﷺ سەربڕینە. جا حەزرەتی(أبُولُبابَة)ﷺ فەرمووی: وَاللهِ لە دوای ئەم ئاماژەیە پێیەکانم نەجولان تا زانیم خیانەتم لەگەڵ خواو پێغەمبەرﷺ کردوە. بۆیێ شەرمی کرد بگەڕێتەوە لای پێغەمبەرﷺ، بەڵکو یەکسەر گەڕاوە (مَدِینَة)و لە ناو مزگەوتی پێغەمبەرداﷺ خۆی لە ستونەیەك بەستەوە، تا تۆبەی قبوڵ بوو.

ئینجا جولەکەکان لە سەر بڕیاری پێغەمبەرﷺ دابەزینو هەموو پیاوەکانیان-کە ژمارەیان چوار سەد جەنگاوەر بوو- پەلبەست کران، ژمارەی ژنو منداڵەکانیش هەزار کەس بوو، جا چەند پیاوێکی بنەماڵەی(الأوْس) هاتنە لای پێغەمبەروﷺ گوتیان: یا رَسُولَ الله، لەمەو پێش لە بەر خاتری بنەماڵەی(الخَزْرَج) جولەکەکانی (بَنِیقَیْنُقاع)ی هاوپەیمانی ئەوانت لە کوشتن عەفو کردن، ئەم جولەکانەی (بَنِیقُرَیْظَة)ش هاوپەیمانی ئێمەی (الأوْس)ن، بە ئێمەیان ببەخشە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئێوە ڕازی دەبن پیاوێك لە خۆتان بڕیاریان لە سەر بدا؟ (الأوْس) گوتیان: بەڵێ، با (سَعْد بن مُعاذ)ی گەورەی خۆمان بڕیاریان لە سەر بدا.

جا پێغەمبەرﷺ ناردنیە لای (سَعْد)ﷺ، بە سواری گوێدرێژێك هێنایان، چونکە لە غەزای (خَنْدَق) تیرێکی وێکەوتبوو و برینـدار بوبوو، جا کە حەزرەتی(سَعْد)ﷺ گەیشتە جێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ فَأَنْزِلُوهُ﴾ لە بەر گەورەکەتان هەڵسن دایبەزێنن. جا کە دابەزێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی (سَعْد) لەبارەی جولەکەکانی (بَنِیقُرَیْظَة) بڕیار بدە. جا حەزرەتی(سَعْد)ﷺ فەرمووی: بڕیاری من ئەوەیە: جەنگاوەرەکانیان بکوژرێنو ژنو ماڵو منداڵیان بۆ موسوڵمانان بمێنێتەوە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿قَضَيْتَ بِحُكْمِ اللهِ﴾ بە بڕیاریخوا تۆ بڕیارت دا.

ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: لە ناو بازاری (مَدِینَة)دا چەند چاڵێك هەڵکەندران کۆمەڵ کۆمەڵ جەنگاوەرەکانی جولەکەکانیان دەکوشتنو فڕێیان دەدانە ناو چاڵەکان،

تا چوارسەد جەنگاوەرەکە –ئەوەی بلۆغی بوبوو– هەموویان کوژران، (کَعْب بـن أَسَـد)ی سـەرۆکی (بَنِیقُرَیْظَـة)و (حُیَـي بـن أخطَـب)ی سـەرۆکی(بَنِیالنَّـضِیر)ش لەگـەڵ ئـەو چوارسەد کوژراوەدا بون، بەڵام (رِفاعَة) موسوڵمان بوو، بۆیێ نەکوژرا.

دەسـکەوتووی ئـەم غەزایـە: هـەزارو پێنجـسەد شمـشێرو سێـسەد زرێو دوو هـەزار ڕمو پێنجسەد مەتاڵو چەندەها کەلوپەلی ناو ماڵو مەڕو بزنو وشتر بوو، هەمووی بـە سـەر (صَحابَة)کاندا بەش کرا، لەم غەزایەش تەنها (خَلاد بـن سُوَیْد) شـەهید کـرا، ئـافرەتێکی جولەکە دەستاڕێکی بە سەردا بەرداوەو کوشتی، ئینجا ئافرەتەکەش لە تۆڵەی وی کوژرا.

جا لە دوای غەزای(خَندَق) پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(أمّ حَبِیبَة)ی رضي‌الله عنها لەخۆی مارە کرد.

(البداية والنهاية) ب(٢) ل(٤٤٩–٤٨٤) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٤٩٠–٥١٩) و(السيرة الحلبية) ب(٢) ل(٤١٥–٤٥٠).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**پێشەکی:** بۆیێ غەزایەکـە پـێی دەگـوترێ: (اَلْخَنْـدَق)، چـونکە ئـەو شـورەیە لـە دەورەی (مَدِینَة) هەڵکەندرا، هەم پێی دەگوترێ: غەزای (اَلأحْزاب) واتە: گرۆهەکان، چونکە کۆمـەڵی کافرەکانی (قُرَیْش)و (غَطْفان)و جولەکەو هاوپەیمانی هەمووان لەم جەنگەدا بەشدار بون.

**جا ئەوەش بزانە:** خوایگەورە سوڕەتی (الأحْزاب)ی بـە نـاوی ئـەم غەزایـە نـاو لێنـاوە، بەندەش دەڵێ: ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوڕەتە: حـەفتاو سـێ ئایـەتن، ئـەم ژمارەیـەش لەگەڵ ژمارەی گرۆهەکانی ئەم حەدیسە تێك دەکاتـەوە، کـە پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿إِفْتَرَقَتِ الْیَهُودُ وَالنَّصارَى عَلَى ثِنْتَیْنِ وَسَبْعِینَ فِرْقَةً، وَسَتَفْتَرِقُ أُمَّتِی عَلَى ثَلاثٍ وَسَبْعِینَ فِرْقَةً ثِنْتانِ وَسَبْعُونَ فِی النَّارِ وَواحِدَةٌ فِی الْجَنَّةِ وَهيَ الْجَماعَةُ–وَفـی رِوایَـةٍ:–قِیل ما هِيَ؟ قالَ مَا أَنَا عَلَیْهِ الْیَوْمَ وَأَصْـــحَابِی﴾ حدیث صحیح رواه أصحاب السنن والحاکم، **جووەکـانو دیانـەکان لـە ئاییندیخۆیاندا پەرتەوازە بونو بونە حەفتاو دوو کۆمەڵ، ئوممەتی منیش دەبێتـە حـەفتاو سـێ کۆمـەڵ، حـەفتاو دوو دەچنە دۆزەخ، یـەکێکیان دەچێتە بەهەشـت، ئەویش کۆمەڵە گەورەکەی موسوڵمانانە، گوترا: ئەم کۆمەڵەکە کێیە؟ پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: ئەو کۆمەڵەی لە سەر ڕێبازی ئێستای منو (صَحابَة)کانمە.**

جا–سُبْحانَ الله– ئایەتی ژمارە حەفتاوسێی کۆتاییسوڕەتەکەش لەگەڵ کۆتایی حەدیسەکە تێك دەکاتەوە کە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَیَتُوبَ اللهُ عَلَى الْمُؤْمِنِینَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ الأحزاب: ٧٣، **تاکو خوایگەورە تۆبە لە ئیماندارانی نێر و مێ قبوڵ بکا.**

**یەکەم: جولەکە لەگەڵ ئایینی خۆیانیش خائینن، بۆیێ خوا لەعنەتی لێکردونو غەزەبی لێگرتـون،** وەفـدی جولەکـە بـە کافرەکـانی (قُـرَیْش) دەڵـێن: **بتپەرستنەکەی ئێـوە لـە ئایینی (مُحَمَّد)ﷺ چاکترەو ئێوە لەوی ڕاستترن.**

خوایگەورە بۆ ڕیسواکردنی ئەو جولەکانەو هاوبیرانیان ئـەم ئایەتـەی ناردۆتـە خـوارەوە:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيباً مِنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَؤُلاءِ أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلاً * أُولَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللهُ وَمَنْ يَلْعَنِ اللهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ نَصِيراً﴾ النساء: ٥١و٥٢، **ئايا تەماشای ئەو جولەكانە ناكەی كە بەشێكی (تَوراة) لە لای خواوە دراوەتە ئەوان، لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیان بە بتپەرستی و (حُكْم)ی شەیتان هەیەو بە كافرەكانی بتپەرست دەڵێن: ڕێبازی ئێوە لە ڕێبازی (مُحَمَّد)وﷺ (صَحابَة)كانی باشترە، ئەوانە ئەو جۆرە كەسانەن كە خوا لەعنەتی لێكردون، هەر كەسێكیش خوا لەعنەتی لێبكا، هیچ یارمەتیدەرێكت بۆ وی دەست ناكەوێ لەعنەتی خوای لێ لاببا.**

لێرەدا مەبەست سەرسوڕمانە لەو كەسەی–بۆ بەرژەوەندیخۆی– بتپەرستیو بێباوەڕی بە باشتر دابنێ لە ئایینێكی ئاسمانیی یەكخواپەرستی!، لە هەمان كاتیشدا خۆی بە خواناس دابنێو وا تێبگا شوێنكەوتەی پێغەمبەرێكی خوایەو كیتابیشی لە لای خوا بۆ هاتووە!.

جا ئەوەش بەڵگەیە: كە جولەكەكان ڕێزی هیچ ئایینێكیان لە لا نیە؟ چونكە ئەم شاهیدیە بە درۆیەی ئەم جولەكانە هەستی تەنها موسوڵمانان بریندار ناكا، بەڵكو هەستی ئاینداره‌كانیتریش–جولەكەو دیان– بریندار دەكا، جا لە هەمان كاتیشدا ئایەتەكە ئەو كەسانەش دەگرێتەوە كە دەڵێن: **ڕێبازی گرۆهە (علمانیة) بێباوەڕەكانی ئەم سەردەمە لە ئیسلام باشترە،** یان دەڵێن: **جولەكەو دیان لە موسوڵمانان باشترن،** بەڵكو بەو گوتەیە كافریش دەبنو لە ئیسلام دەردەچن. بڕوانە (تفسير ابن كثير) النساء: (٥١–٥٢) هەم (حاشية الشرواني على تحفة المحتاج) ب(٩) ل(٨٤).

**دووەم: حەزرەتی (سَلْمان الْفارسِي)ﷺ ئاماژەی بە هەڵكەندنی (خَنْدَق) كرد،** ئەمەش بەڵگەیە: كاری چاكو قسەی چاك لە هەر كەسانێكەوە بێ، دەبی موسوڵمان وەریبگرێ، واتە: هەر چەند فارسەكان كافر بونو دوژمنی ئیسلام بون، بەڵام پێغەمبەرﷺ ئەم فێڵەی جەنگی فارسەكانی پێ باش بووو قبوڵی كردو هیچ (صَحابَة)یەكیش دەمارگیریی گەلپەرستیی نەبو، تا بڵێ: ئەمە (سَلْمان)ە فارسەو تازە موسوڵمان بووە، چۆن پێغەمبەرﷺ ئاماژەی ئەوی قبوڵ دەكا؟.

**جا بزانە:** یەكەم كەس كە (خَنْدَق)ی بۆ بەرگریكردن هەڵكەندوە (مَنُوشَهْر)ی كوڕی (إيرَج) بوو، كە پاشایەكی فارس بوو، لە سەردەمی حەزرەتی(مُوسى) پێغەمبەرداﷺ بوو.

**دیسان بزانە:** حەزرەتی(سَلْمان الْفارِسِي)ﷺ خەڵكی (أَصْبَهان) بوو و ئاگرپەرست بوو، بەڵام لە كتێبەكانی ئاسمانیدا خوێندبویەوە: كە پێغەمبەرێك لە كۆتایی زەماندا دێ، جا ئەویش لە (أَصْبَهان) بەرەو عەرەبستان هات بۆ شوێنكەوتنی ئەو پێغەمبەرەﷺ، بەڵام ئەو كاروانەی ئەو لەگەڵیاندا بوو، فێڵیان لێكردو بە كۆیلەیی فرۆشتیانە جولەكەیەك،

ئەویش فرۆشتیە مامۆزایەکی خۆی لە (مَدِینَة)، جا حـەزرەتی(سَـلْمان)ﷺ فەرمووەیـەتی: کە چاوم بە (مَدِینَة) کەوت، یەکسەر زانـیم ئەمـە شـاری پێغەمبـەرەﷺ، ئـیتر حـەزرەتی (سَلْمان)ﷺ هەر لە (مَدِینَة) بە کۆیلەیی مایەوە، تا پێغەمبەرﷺ کۆچی کرد بۆ (مَدِینَـة)، ئینجا حەزرەتی(سَلْمان)ﷺ چووە خزمەت پێغەمبەرﷺ بـە دەورەیـدا دەسـوڕاوە، تـا مۆری پێغەمبەرایەتیی لە نێوان شانەکانی دیتو یەکسەر ماچـی کـردو بـە سـەرهاتەکەی خۆی بۆ باس کردو موسوڵمان بوو.

ئیتر حەزرەتی(سَلْمان)ﷺ هەر بە کۆیلەیی مایەوە، تای دوای غەزای (أُحُد)، ئینجا خـۆی کڕیەوەو ئازاد کرا، لـەو کڕینەوەیـە پێغەمبـەرﷺ (صَـحابَة)کـانﷺ یارمـەتیان دا، جـا یەکەم غـەزای حـەزرەتی(سَـلْمان)ﷺ: غـەزای (خَنْـدَق) بـوو و لـە هەڵکەنـدنی (خَنْـدَق)دا کارێکی زۆری دەکـرد، بۆیـێ (مُهـاجِر)و (أَنْـصار) بـووە کێـشەیان: هـەردوو لا دەیـانگوت: (سَلْمان) لە ئێمەیە ! . جا پێغەمبەریشﷺ کێشەکەی براندەوەو فـەرمووی ﴿سَلْمانُ مِنّـا أَهْـلَ الْبَیْـتِ﴾ (سَـلْمان) لـە کەسـەکانی نـاو مـاڵی ئێمەیـە. ئـا بـەم جـۆرە لـە دوای دەرەبەدەریو کۆیلایەتی–بە هۆی موسوڵمانبوون– ئەم پلەو پایە بەرزەی دەست کەوت.

**ئینجا بزانـە:** بێگومان حەزرەتی(سَلْمان الْفارسِي)ﷺ دوو سەدو پـەنجا سـاڵ ژیـاوەو لـە ساڵی سیو پێنجی کۆچی لە (مَدائِن)=( سَـلْمان پـاك) وەفـاتی کـردووەو ئێـستا گۆڕەکـەی لەوێیەﷺوعن بقیة الصَحابَة اجمعین (البدایة والنهایة) ب(٢) ل(٤٥٢) و(عظماء حول الرَسُولﷺ) ب(٢) ل(٩٢٦).

**سێیەم: پێغەمبەرﷺ بەخۆی کاری لە هەڵکەندنی (خَنْدَق)دا دەکرد.** پێغەمبەرﷺ یەکەم کەسە لە ئیسلامدا: کە (خَنْدَق)ی بۆ بەرگریکردن هەڵکەندبێ، جا بـەم (خَنْـدَق)ە پیلانـی لەشکری کافرەکـانی پووچـەڵ کـردەوەو خوایگـەورە ئـەوانی بـە سەرشـۆڕی گەڕانـدەوە وڵاتیخۆیان، جا لێرەدا دوو دادەپەروەریی گرنگ بۆ ئێمە ئاشکرا دەبن:

**یەکەمیان:** پێغەمبەرﷺ کاری هەڵکەندنی (خَنْدَق)ی لە نێوان (صَحابَة)کاندا بەش کرد: کە بە دە کەسان چل گەز=بیست مەتر هەڵکەنن، جا لێرەدا مەبەست چل گەزی خـشتەییە، کە ئاشکرا دەبێ: لە لێدانی ئەندازەیەکی درێژایی لە پانایی، کۆی لێدانەکەش لە قـووڵایی. (شرح الزرقاني علیالمواهب) ب(٢) ل(١٢٣).

**دووەمیان:** پێغەمبەرﷺ هەر بەخۆی چاودێریی دەکردو کاروباری هەڵکەندنەکەی بەڕێوە دەبردو بەخۆی لەگەڵ (صَحابَة)کاندا کاری لە هەڵکەندنی (خَنْدَق)دا دەکردو تورەگەی گڵی هەڵدەگرتنو لە دەرەوەی (خَنْدَق) دەیڕێشتن، تا پیستەی زگی موبارەکی بە تۆزی گڵەکـە داپۆشرا بوو، جا کە پێغەمبەرﷺ دەیدیت (صَحابَة)کان لەو سەرمایەدا بـە برسـیەتی کـار دەکەن، دوعای بـۆ دەکـردنو دەیفـەرموو: ﴿اَللّهُمَّ إِنَّ الْعَیْشَ عَیْشُ الْآخِرَة فَاغْفِرْ لِلأَنْـصارِ وَالْمُهاجِرَة﴾ **خودایە ژیان هەر ژیانی قیامەتە، خودایـە لـە (أنْصار)و (مُهاجِرة)کـان خـۆش ببـە.** جـا (صَـحابَة)کـانیشﷺ وەڵامـی پێغەمبـەریانﷺ دەداوەو

دەیـانگوت:
﴿نَحْنُ الَّذِينَ بايَعُوا مُحَمَّداً * عَلَى الْجِهَادِ مَا بَقِينا أَبَداً﴾ رواه الشيخان، **ئێمە ئەو کەسانەین پەیمانمان داوەتە (مُحَمَّد)ی پێغەمبەرمانﷺ لە سەر (جِهاد)و تێکۆشان بۆ ئیسلام، تا ماوین.**

**بەڵێ:** پێغەمبەرﷺ بەوە ڕازی نەبو: (صَحابَة)کان کار بکەن‌و ئەویش لە دورەوە، یان لە ناو کۆشك‌و تەلارێکدا چاودێرییان بکاو فەرمانیان پێبکا، بۆ چەواشەکردنیش بە تەنها کۆڵینگێك‌و بێڵێك بەشداریی نەکرد، بەڵکو تا هەڵکەندنی (خَنْدَق) تەواو بوو، لە برسیەتی‌و لە سەرماو لە تۆزدا هاوبەشی (صَحابَة)کانی بوو، (مُعْجِزَة)کەی دەعوەتی (جابِر)ﷺ شاهیدەو شاهیدیی‌ترم ناوێ، جا ئەم بەشداریەی پێغەمبەرﷺ وای لە (صَحابَة)کان کرد–بەو سەرماو برسیەتیە–پێش هاتنی دوژمن کاری هەڵکەندن تەواو بکەن.

**بەڵێ:** پێش تەواوبوونی مانگێك (خَنْدَق) هەڵکەندرا، **درێژایی: (٥٥٤٤)مەتر=پێنج کیلۆ مەترو نیو، بەرینی: (٤,٦٢)مەترو شەست‌و دوو سم، قووڵی: (٣,٣) مەترو سێ سم**، ئەمەش بیروباوەڕی بەهێز وای‌کرد خوای‌گەورە یارمەتییان بدا لەم ماوەیەدا ئەو کارە قورس‌و زۆرە تەواو بکەن، جا بە درێژایی (خَنْدَق)ش بەردەوام ڕۆژو شەو پاسەوانی هەشیار داندرابونﷺ. (فقه السيرة، للبوطي) ل(٣٢١) و(سيرة الصلابي) ب(٢) ل(٣٦١–٣٦٣و٧٥٤=شكل ١٠) و(نظرة جديدة فى سيرة رَسُول اللهﷺ لـ(كونستانس)) ل(٢٩٠).

**چوارەم: بەهێز کردنی بەرەی ناوخۆ: بە هۆی پەیمانشکاندنی جولەکەکانی (بَنِیقُرَیْظَة) ترس لە ناو موسوڵماناندا بڵاو بۆوە.** ژن‌و منداڵی (صَحابَة)کان لە ناو (مَدِینَة)دا بون، دڵنیابون کە دوژمن نایانگاتێ، کەوابوو: پێویستە جەنگاوەر لە ژن‌و منداڵەکانی دڵنیا بێ، چونکە بە هۆی ئەو دڵنیابوونە ورەی جەنگاوەر بەرزتر دەبێ‌و بە بێگەردی جەنگ دەکا، چونکە جگە لە جەنگ سەرقاڵی هیچی‌تر نابێ.

بەڵام کە جولەکەکانی (بَنِیقُرَیْظَة) پەیمانەکەیان شکاندو وەگەڵ لەشکری کافرەکانی (قُرَیْش) کەوتن، ترسێکی چاوەڕواننەکراو کەوتە ناو دڵی (صَحابَة)کان: لە لایەك کافرەکانی (قُرَیْش)و (غَطْفان) لە باکوری (مَدِینَة) لە لای سەرەوەی دۆڵەکەو لە لای خوارەوەی دۆڵەکە هێرش دێنن، لە لای باشوریش: جولەکەکان دەیانەوێ هێرش بکەنە سەر ژن‌و منداڵی موسوڵمانان لە ناو (مَدِینَة)دا.

جا جولەکەکان بۆ هەواڵگری جولەکەیەکیان ناردە لای ئەو قەڵایەی ژن‌و منداڵی (صَحابَة)کانی تێدا حەشار درابون، جولەکەکەش هات بە دەورەی قەڵایەکەدا دەسوڕاوە، جا حەزرەتی(صَفِيّة)ی پوری پێغەمبەرﷺ چاوی لێبوو، یەکسەر دابەزەی‌و لە پشتەوەڕا بە دارێکی گەورە لە جولەکەکەی داو کوشتی، جا بە کوشتنی ئەم جولەکەیە، جولەکەکان ترسان‌و تێگەیشتن پاسەوانی بەهێز هەنە بۆ پاراستنی ژن‌و منداڵەکان.

بەلأم لە هەمان كاتيشدا (صَحابَة)كان مەترسى ژنو منداڵەكانيان زياتر بوو لە مەترسى لاى (خَنْدَق)، جا ئەم مەترسيەى ژنو منداڵيش جەنگاوەر سەرقاڵ دەكاو ورەى دادەبەزێنێ، چونكە واى لىٚدەكا تەنها بير لە پاراستنى ژنو منداڵەكانى بكاتەوە، بۆيێ پێغەمبەرﷺ بۆ بەهێزكردنى بەرەى ناوخۆ پێنجسەد (صَحابَة)ى لە بەرەى جەنگ گەڕاندەوە ناو (مَدينَة) بۆ بەرگرىٚگرتنو پاراستنى خێزانەكان، جا خواىٚگەورە باسى ئەو تەنگانەيە دەكاو دەفەرموێ: ﴿إِذْ جَاءُوكُمْ مِنْ فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللهِ الظُّنُونَا﴾ الأحزاب: ١٠، **ئەو كاتەى كافرەكان بۆتان هاتن: لە سەرەوەتانو لە خوارەوەتان، چاوەكانتان لە ئاستى بينينىٚخۆيان لايانداو دڵەكانتان گەيشتە گەرووەكانتان، واتە: تەنگ بون، تاواى لىٚهات گومانى جۆراوجۆر دەهاتە سەر دڵتان: موسوڵمانەكان گومانيان لە سەركەوتن هەبوو، (منافق)كانيش گومانيان وا بوو موسوڵمانەكان بنەبڕ دەكرێن.** (صفوةالتفاسير) الاحزاب: (١٠) و(السيرةالحلبية) ب(٢) ل(٤٢٢-٤٢٥).

**پێنجەم: پێكهاتنێك لە نێوان پێغەمبەرﷺ سەركردەكانى (غَطْفان)دا نوسرا، بەلأم ئيمزا نەكراو هەڵوەشێندراوە.** لە سەرەتادا باسمان كرد: كافرەكانى (غَطْفان) بەو مەرجە هاتبونە جەنگى ئيسلام: جولەكەكان بەرهەمى ساڵێكى خورماى (خَيْبَر) بدەنە ئەوان. لێرەدا پێغەمبەرﷺ دەيزانى: كافرەكانى (غَطْفان) بە هيچ هاندەرێكى بيروباوەڕەوە نەهاتبونە ئەم جەنگە، بەڵكو هەموو ئامانجەكەيان خێروبێرى (مَدينَة) بوو، لە لايەكىٚتريش (غَطْفان) زۆرينەى لەشكرى كافرەكان بون، بۆيێ پێغەمبەرﷺ ئەوانى ديارى كردن كە گفتوگۆيەكى پێكهاتنيان لەگەڵ بكا، ئينجا ناردى هەردوو سەركردەى (غَطْفان)-كە (عُيَيْنَة بن حِصْن)و (الحارث بن عَوْف) بون- هاتن، جا لە دواى گفتوگۆيەكى كەم هەردووك سەلماندیان: واز لە جەنگى ئيسلام بێننو گەمارۆى دەورەى (مَدينَة) بشكێننو بگەڕێنەوە ولأتىٚخۆيان، لە بەرامبەريش: موسوڵمانان سێيەكى ميوەى (مَدينَة)-بەرهەمى ساڵێك- بدەنە ئەوان، جا پێكهاتنەكە نوسراوە، بەلأم ئيمزا نەكراو هەردوو (سَعْد)رضىالله عنهما وەلأمێكى زۆر بە توندى سەركردەكانيان دايەوەو نوسراوەكەشيان دڕاند.

**جا لەم پێكهاتنەدا پێغەمبەرﷺ چەند مەبەستێكى هەبوو:**

*هەموو (صَحابَة)كان بزانن لەشكرى (غَطْفان) لەشكرێكى بە بيروباوەڕ نيەو تەنها دونيا ويستە، ئەم جۆرە لەشكرەش لە بەرامبەر لەشكرێكى بە بيروباوەڕ لە جەنگدا خۆى ڕاناگرێ، بەمەش ورەى (صَحابَة)كان بەرزتر بوو.

*(صَحابَة)كان بزانن: پێغەمبەرﷺ سەركردەيەكى خۆسەپێنەر نيەو بارودۆخى (صَحابَة)كان ڕەچاو دەكا، ئەوەش بە ئاشكاريى لە فەرموودەكەى پێغەمبەرﷺ دەردەكەوێ: كە فەرمووى: (ئەگەر خوا فەرمانى پێكردبام، پرسم بە ئێوە نەدەكرد).

*هەردوو سەرکردەکەی (غَطْفان) بە چاوی خۆیان ببینن: (صَحابَة)کان چەند ورەیان بەرزەو تا چ ڕادەیەك گوێڕایەڵی پێغەمبەرن ﷺ، چونکە هەردوو سەرکردەکەی (غَطْفان) بە چاوی خۆیان دیتیانو بە گوێیخۆیان گوێیان لێبوو: وەڵامەکەی هەردوو (سَعْد) رضی‌الله عنهما چەند ملکەچیی بۆ خواو پێغەمبەر ﷺ تێدا بوو، چەندیش توندوتیژیی بۆ (غَطْفان) تێدا بوو: (ئەگەر پێکهاتنەکە بڕیاری خوا بێ، یان پێغەمبەر ﷺ بەخۆی پێی خۆش بێ، ئەوان ملکەچن، بەڵام ئەگەر بۆ بەرژەوەندی ئەوان بێ، وەڵامەکەی شمشێرە). ئیتر نوسراوەکە دڕێندراو هەردوو سەرکردەکەی (غَطْفان) بە بێئومێدی بە ڕێگەیخۆیاندا گەڕانەوە ناو لەشکریخۆیانو بۆیان ئاشکرا بوو: ورەی (صَحابَة)کان چەند بەرزە.

جا کە ئەوەت زانی، هەڵەی ئەو نەزانو گومڕابووە ترسنۆکانەت بۆ ئاشکرا دەبێ، کە دەڵێن: (واجبە: لە کاتی پێویستیدا موسوڵمانەکان سەرانە بدەنە کافرەکان!؟ چونکە لەم پێکهاتنەی غەزای (خَنْدَق) پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی بە (صَحابَة)کان کردوە، ئەگەر ڕازی بوبان پێکهاتنەکە ئیمزا دەکرا).

جا ئەمە بۆچوونێکی هەڵەیە، چونکە ئەگەر مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بڕیاردانێکی شەریعەت بوایە، ئەو کات هیچ کەسێك نەیدەتوانی ڕەخنە بگرێو هەڵیبوەشێنێتەوە، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ الأحزاب: ٣٦، هەر کاتێك خواو پێغەمبەر ﷺ بڕیارێکیان دا، هیچ ئیماندارێکی پیاو و ئافرەت بۆی نیە لە کاروباری خۆیاندا سەرپشك بنو گوێڕایەڵی بڕیارەکەی خواو پێغەمبەر ﷺ نەبن.

جا هەر بە هۆی ئەم تێگەیشتنە هەڵەیە ئێستا وایلێهاتووە هەموو خێروبێری وڵاتانی ئیسلام کافرەکان بۆ خۆیان دەیبەنو موسوڵمانانیش هەر لە برسیەتیو هەژاریدا ماونەوەو فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ هاتۆتە جێ، کە دەفەرموێ: ﴿سَتَظْهَرُ مَعَادِنُ وَسَيُحَضِّرُها شِرارُ الْخَلْقِ﴾رواه البيهقي، لە مەودوا هەندێك کانگا ئاشکرا دەبن، خراپترینی خەڵك -کە جولەکەو دیانەکانن- وەبەرهەمی دێنن. بە دەستکاریەوە: لە (فقه السيرة، للبوطي) ل(٣٢٤-٣٢٦) و(سيرة الصلابي) ب(٢) ل(٢٦٨-٢٧١).

*بە قوربانت بم یا رَسُولَ الله، فەرموودەکەت چەند ڕاستە، ئێستا نەفتو کانگاکانیتری ئێمەی موسڵمان هەمووی جولەکەو دیانەکان دەیبەن، ئێمەی بێدەسەڵاتیش هەر لە برسیەتیو هەژاریدا ماوینەوە.*

**شەشەم: قەزاکردنەوەی نوێژ**، بە (إِجْماع)=یەکدەنگی زانایانی ئیسلام: واجبە نوێژی واجب قەزا بکرێتەوە، بە بەڵگەی ئەم حەدیسانەیداهاتوو و چەند حەدیسێکیتر:

**حەدیسی یەکەم:** ﴿عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قالَ النَّبيُّ ﷺ يَوْمَ الأَحْزابِ: شَغَلُونا عَنِ الصَّلاةِ الْوُسْطَى صَلاةِ الْعَصْرِ مَلَأَ اللهُ بُيُوتَهُمْ وَقُبُورَهُمْ ناراً. ثُمَّ صَلاّها بَيْنَ الْمَغْرِبِ والْعِشَاءِ﴾ رواه الشيخان، لە

غەزای (الأحْزاب)دا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کافرەکان ئێمەیان بە جەنگکردن سەرقاڵ کردو ماوەیان نەدا (الصَّلاةُالْوُسْطَی)=نوێژی عەسر بکەین، خودا ماڵەکانیان و گۆڕەکانیان پڕ ئاگر بکا. ئینجا پێغەمبەرﷺ لە نێوان مەغریب و عیشادا نوێژەکەی عەسریی قەزا کردەوە.

جا بزانە: بە بەڵگەی ئەم حەدیسە لە لای زۆرترینی زانایانی ئیسلام: نوێژی عەسریێ پێی دەگوترێ: (الصَّلاةُ الْوُسْطَی).

**پرسیار:** لە غەزای (ذاتُ الرِّقاع)دا پێغەمبەرﷺ نوێژی عەسریی بە (صَلاةُ الْخَوْف)= نوێژی ترس کرد، ئەی بۆچی لە غەزای (خَنْدَق)=(الأحزاب)دا بە (صَلاةُالْخَوْف) نەیکرد؟

**وەڵام:** لە گوڵبژێرەکەی (ذات الرِّقاع)دا گوتمان: (صَلاةُالْخَوْف) چەند جۆرێکی هەنە، جا ئەو جۆرەی (شِدَّةُالْخَوْف)=ترسی بەهێز -کە لەوێ ڕوونمان کردەوە- هێشتا لە غەزای (خَنْدَق)دا ئایەتەکەی نەهاتبۆ خوارەوەو لە بەر دژواری جەنگەکەش جۆرەکانیتر لە (خَنْدَق)دا نەدەگونجان، بۆیێ پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانﷺ نوێژی عەسریان فەوتا، ڕۆژێکیتریش سێ نوێژیان فەوتان، هەروەك ئیمامی(النواوي)و (الحافظ العسقلاني) لە شەرحی حەدیسەکەدا فەرموویانە، بە بەڵگەی ئەم حەدیسەیدووەمەیداهاتوو:

**حەدیسی دووەم:** ﴿عن أَبي سَعِيدﷺ: حُبِسْنا يَوْمَ الْخَنْدَقِ حَتّى ذَهَبَ هَوِيٌّ مِنَ اللَّيْلِ، حَتَّى كُفِينَا...فَدَعَا رَسُولُ اللهِﷺ بِلالاً فَأَمَرَهُ فَأَقَامَ، فَصَلَّى الظُّهْرَ كَما كان يُصَلِّيهَا فِي وَقْتِها، ثُمَّ أَقامَ الْعَصْرَ فَصَلاَّهَا كَذَلِكَ، ثُمَّ أَقامَ الْمَغْرِبَ فَصَلاَّها كَذَلِكَ، ثُمَّ أَقامَ الْعِشاءَ فَصَلاَّها كَذَلِكَ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يُنَزَّلَ-أَيْ فِي صَلاةِالْخَوْفِ-: (فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَاناً) البقرة: ٢٣٩﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد والنسائي، لە غەزای (خَنْدَق) ڕێگای نوێژکردنمان گیرا، تا بەشێکی شەوێ ڕۆیشت، ئینجا جەنگ کۆتایی هات، جا هەر لەو شەوەدا پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە (بِلال) کرد: ئیقامەتی بۆ نوێژی نیوەڕۆ کرد، جا نوێژەکەی قەزا کردەوە، هەروەك لە کاتیخۆیدا دەیکرد، ئینجا عەسرو مەغریبیش بەم شێوەیە قەزای کردنەوە، ئینجا نوێژی عیشای کرد، ئەمەش پێش ئەوەی ئایەتەکەی نوێژی ترسیبەهێز بێتە خوارەوە. بگەڕێوە شەشەم گوڵبژێری غەزای (ذات الرِّقاع).

**حەدیسی سێیەم:** لە غەزای (خَيْبَر)دا پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کان بۆ نوێژی سبەینێ لە خەو هەڵنەستان تا ڕۆژ گەرم بوو، جا حەزرەتی(أَبُو هُرَيْرَة)ﷺ فەرموویەتی: ﴿...ثُمَّ تَوَضَّأَ رَسُولُ اللهِﷺ وَأَمَرَ بِلالاً فَأَقامَ الصَّلاةَ فَصَلَّى بِهِمُ الصُّبْحَ، فَلَمّا قَضَى الصَّلاةِ قالَﷺ: مَنْ نَسِيَ صلاةً فَلْيُصَلِّها إِذا ذَكَرَها-وفي رِوايَة-: سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الصَّلاةُ فَصَلَّى الْغَداةَ﴾ رواه مسلم في قضاء الصلاة الفائتة، ئینجا پێغەمبەرﷺ دەستنوێژی گرت و دوو ڕەکعەت سوننەتی پێش نوێژی کردن، جا فەرمانی بە (بِلال) کرد ئیقامەتی نوێژی

**کردو نوێژی سبەینێی بە جەماعت قەزا کردەوە، جا کە نوێژەکەی قەزا کردەوە، فەرمووی: (هەر کەسێك نوێژێکی لە بیر کرد، هەر کاتێك هاتەوە بیری با بیکا).**

جا ڕستەی ﴿فَلَمّا قَضَى الصَّلاةَ﴾ بەڵگەیە: کە نوێژەکەیان بە نیەتی قەزا کردوە. ئیتر حەدیسەکەی عەسری (بَنِيقُرَيْظَة)ش هەر بەڵگەیەو لە (البخاري)و (مسلم)دایە.

**جا بزانە:** جیاوازی نیە: نوێژەکەی لەبیر چوبێ، یان خەوتبێ، یان بە قەسدی نەیکردبێ، لە هەموو حاڵەتێکدا واجبە قەزای بکاتەوە، چونکە مرۆڤی خەوتوو عوزریشی هەیەو نوێژەکەی لە سەر لاناچێ، کەواتە: ئەو کەسەی بە قەسدی نەیکردوە، ئەو شیاوترە لە سەری لانەچێ، جا ئەو کەسانەی دەڵێن: نوێژنەکەری بە قەسدی قەزاکردنەوەی لە سەر نیە، قسەکەیان پوچەڵەو دژی (إجماع)=یەکدەنگی زانایانیئیسلامە. (شرح صحيح مسلم) ب(٣) ل(٣٠٨-٣١١و ٣٦٧-٣٧٠) و(فتح الباري) ب(٢) ل(٩٠-٩٣).

**حەفتەم: (مُعْجِزَة)کانی غەزای (الخَنْدَق)**، لە کاتی هەڵکەندنی (خَنْدَق)دا چەند (مُعْجِزَة)یەکی پێغەمبەرﷺ ئاشکرا بون:

**١-لە کاتی هەڵکەندنی (خَنْدَق)دا، لەو ترس و تەنگانەدا، پێغەمبەرﷺ موژدەی سەرکەوتنی-بە سەر (روم)و (فارس)دا- دەداتە (صَحابَة)کان:** حەزرەتی(الْبَراء)رضي الله عنه فەرموویەتی: لە هەڵکەندنی (خَنْدَق) بەردێکی گەورە هاتە پێشیمان، هیچ کوڵینگێك کاری لێنەدەکرد، جا پێغەمبەرﷺ هات و کوڵینگەکەی وەرگرت و فەرمووی: (بِسْمِ الله). جا کوڵینگێکی لێداو بروسکە ئاگرێکی کردو لەتێکی لێکردەوەو فەرمووی: (اَللّهُ أَكْبَر)، کلیلەکانی (شام)م درانێ. جا کوڵینگێکیتری لێداو بە هەمان شێوە بروسکەی داو لەتیکیتری لێکردەوەو فەرمووی: (اَللّهُ أَكْبَر)، کلیلەکانی (فارس)م درانێ. جا کوڵنیگێکیتری لێدا بە هەمان شیوە بروسکەی داو هەموو بەردەکەی شکاندو فەرمووی (اَللّهُ أَكْبَر)، کیلەکانی (یَمَن)م درانێ. واتە: لەو تەنگانەدا پێغەمبەرﷺ موژدەی دا: ئەو سێ دەوڵەتە دەبنە موسوڵمان.

جا (منافق)ەکان گاڵتەیان بە فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ دەهاتو دەیانگوت: (مُحَمَّد)ﷺ گفتی پوچەڵ دەداتە ئێوە، دەڵێ: تەلارەکانی (الْحِيرَة)و شارەکانی (كِسْرى)ی فارس دەکەوێتە ژێر دەستتان، خۆ ئێوە ناوێرن بچنە پیساییکردنو لە ترسان (خَنْدَق) هەڵدەکەنن! خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ مَا وَعَدَنَا اللهُ وَرَسُولُهُ إِلاَّ غُرُوراً﴾ الأحزاب :١٢، **باس بکە: کە (مُنافِق)و دڵنەخۆشەکان دەڵێن: خواو پێغەمبەرەکەیﷺ جگە لە گفتی پوچەڵ هیچ گفتێکیان نەداوینێ.**

اَلْحَمْد لله گفتی خواو پێغەمبەرﷺ هاتە جێ، (منافق)ەکانیش ڕووڕەشبوونیان بۆ ماوەتەوە.

**٢-حەزرەتی(جابِر)رضي الله عنه فەرموویەتی: پارچەیەکی ڕەق و توند لە هەڵکەندنی (خَنْدَق) هاتە پێشمان، جا سکاڵامان بردە خزمەت پێغەمبەرﷺ، ئەویش داوای جامە**

ئاوێکی کردو تفی تێکردو دوعای لێخوێند، ئێمەش ئاوەکەمان پرژاندە سەر شوێنە توندەکە، سوێند بەو خوایەی ئەوی کردۆتە پێغەمبەرﷺ: شوێنەکە وەك لمی ورد بە سەرێکدا ڕما: نە تەور و نە بێڵی نەدەگەڕاندەوە.

٣-هەروەها حەدیسەکەی‌تری حەزرەتی(جابر)ﷺ: کە هەزار کەس لە چوشتیرەکەی خواردو زیادیشی کرد. ئەویش (مُعْجِزَة)یەکی‌تری پێغەمبەرەوﷺ (البخاري) گێڕاویەتەوەو بەڵگەیە: کە پێغەمبەرﷺ لە کارکردن‌و لە برسیەتی‌دا لە (صَحابَة)کانی جیا نەبۆتەوەو لە بەر برسیەتی بەردی لە سەر زگی‌خۆی بەستووە. (تفسیر الخازن) الاحزاب (٩و١٢) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٤٩٤-٤٩٦).

٤-پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿خوای‌گەورە لە غەزایەك ڕۆژی ڕاگرت بۆ پێغەمبەرێك تا گوندێکی (فَتْح) کرد﴾. ئیمامی (البخاري) و(مسلم) لە (باب تحليل الْغَنائِم لِهَذِهِ الأُمَّة) گێڕاویەتیانەوە.

جا لە شەرحی حەدیسەکەدا ئیمامی(النّواوي)و ئیمام (ابن حجر العسقلاني) لە ئیمامی (الطّحاوي) گێڕاویەتیانەوە: ﴿لە غەزای (خَنْدَق)ش خوای‌گەورە-لە دوای ڕۆژئاوابوون- ڕۆژی بۆ پێغەمبەرﷺ گەڕاندەوە تا نوێژی عەسرێ‌ی کرد﴾.

جا ئیمامی(الطّحاوي) فەرموویەتی: (رُواتُه ثِقات) حەدیسگێڕەوەکانی ئەم حەدیسە باوەڕپێکراون.

جا ئەم ڕووداوەش (مُعْجِزَة)یەکی‌تری غەزای (خَنْدَق)ەو لە ڕۆژێکی‌تری جگە لە دوو ڕۆژەکانی‌ڕابردوو ڕووی داوە، واتە: جیایە لەو دووڕوژانەی لە شەشەمەکەدا باسمان کردن. والله أعلم.

هەروەها دووجاری‌تریش ئەم (مُعْجِزَة)یە لە سەر دەستی‌پێغەمبەرﷺ ڕووی داوە: جاری‌یەکەمیان: (أسْماء بِنْت عُمَيْس) دەگێڕێتەوە: ﴿ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ سەری‌خۆی لە ناو کۆشی ئیمام (عَلي)ﷺ دانابوو، لەو کاتیش (وَحْي)ی بۆ هات، جا- لە دوای ڕۆژئاوابوون- پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نوێژی عەسرت کردوە؟ ئیمام(عَلي)ﷺ فەرمووی: نا. جا پێغەمبەرﷺ دوعای کردو لە خوا پاڕاوە، خوای‌گەورە ڕۆژی-لە دوای ئاوابوون- گەڕاندەوە تا ئیمام (عَلي)ﷺ نوێژی عەسرێ‌ی کرد﴾. رواه الطحاوي والطبراني والحاكم والبيهقي، وقال الحافظ الهيثمي: رواه الطبراني بأسانيد، ورجال أحَدِها رجال الصحيح. کەواتە: (سند)ێکی حەدیسەکە ڕاستە، بەڵام هەندێ زانا ئەم حەدیسەیان بە بێ‌هێز داناوە، والله أعلم.

جاری‌دووەمیان: ﴿عَنْ جابِرٍﷺ: أنَّ رَسُولَ اللهِﷺ أمَرَ الشَّمْسَ فَتَأَخَّرَتْ سَاعَةً مِنْ نَهارٍ﴾ رواه الطبراني فى الأوسط، قال الحافظان: الهيثمي والعسقلاني: إسناده حسن، پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە ڕۆژێ کرد: ماوەی سەعاتێك لە هەڵاتن دوا کەوت. جا هەندێك زانا فەرموویانە: ئەم (مُعْجِزَة)یە لە بەیانیەکەی (الإسْراء والْمِعْراج)دا بوو، کە پێغەمبەرﷺ بە (قُرَيْش)ی فەرموو: لەگەڵ ڕۆژهەڵاتندا کاروانەکەتان دەگاتە جێ. هەروەك لە باسی (الإسراء والمعراج)دا ڕابرا. (شرح صحيح مسلم) ب(٧) ل(٣١٤) و (مجمع الزوائد ومنبع الفوائد) ب(٨) ل(٣٧٦) و(فتح الباري) ب(٦) ل(٣٦٦).

**هەشتەم: فێڵ کردن لە جەنگدا**، پێغەمبەرﷺ بە حەزرەتی(نُعَيْم)ی‌ﷺ فەرموو: ﴿اَلْحَرْبُ

خَدْعَةٌ﴾ جەنگ فێڵێکە، واتە: بە فێڵێك کۆتایی دێ. بێگومـان حـەزرەتی(نُعَـيْم)ﷺ قـسەی ناڕاسـتی کـردن‌و سـەرکەوتووش بـوو: پەرتـەوازەی خـستە نـاو لەشـکری دوژمـن، ئەمەش هەموو بە ئیزنی پێغەمبەرﷺ بوو، جا ئەمەش بەڵگەیە: کە درۆکردن لـە جەنگدا دروستە: بۆ سەرکەوتن‌و بەزاندنی دوژمن، یان بۆ ڕزگارکردنی لەشکری‌ئیسلام لە مەترسی، مەبەستیش بە درۆ: قسەی بە پێچ‌و پەنایە، پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿لا يَحِلُّ الْكَذِبُ إلاَّ فِي ثَلاثٍ: تَحْدِيثُ الرَّجُلِ اِمْرَأَتَهُ لِيُرْضِيَها، وَالْكَذِبُ فِي الْحَرْبِ، وَ فِي اْلإِصْـلاحِ بَـيْنَ النَّاسِ﴾ رواه الترمذي ومسلم، درۆکـردن حـەڵاڵ نیە، تـەنها لـە سـێ حاڵـەتدا نـەبێ: مێـرد قسەی درۆ لەگەڵ ژنەکەی بکا تاکو ڕازی‌ی بکاو خێزانەکە تێك نەچێ، درۆکـردن لە جەنگدا تـاکو لەشکری‌ئیـسلام شکـست نـەهێنێ، درۆکـردن بـۆ ئاشـتکردنەوەی خەڵك تاکو دوژمنایەتی لە کومەڵگەدا پەیدا نـەبێ. جا گوتمان: ئەم فێڵەی حـەزرەتی (نُعَيْم‌ﷺ) هۆکاری یەکەم بوو.

هۆکاری‌دووەمیش: خوای‌گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُـرُوا نِعْمَةَ اللهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحاً وَجُنُوداً لَمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيراً﴾ الأحزاب:٩، ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، باسی نیعمەتی‌خوا بکەن لەو کاتەی لەشکرەکانی کافرەکان هاتنە سەرتان، جا ئێمەش بایەکی بەهێزو هەندێك سەربازمان ناردنە سەر کافرەکان-کە (مَلائِكَة) بون- ئێوە نەتاندیتن، خوای‌گەورە بینەری ئەو کارە بوو کە لە (خَنْدَق)دا دەتانکرد.

جا لەبارەی ئەم بایـە پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿نُصِرْتُ بِالصَّبَا وَأُهْلِكَتْ عَادٌ بِالدَّبُورِ﴾ رواه الشيخان، بە بای (صَبا) سەرکەوتنم دراپی، گەلی (عاد)ش بە ڕەشە با بە هیلاك درا.

جا لەبارەی ئەنجامی جەنگەکەش، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَرَدَّ اللهُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْراً وَكَفَى اللهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ وَكَانَ اللهُ قَوِيّاً عَزِيـزاً﴾ الأحـزاب: ٢٥، خوای‌گەورە کافرەکـانی بـە ڕق‌و قینـەی خۆیانـەوە لـە (مَدِينَـة) گەڕاندنـەوە بـۆ وڵاتی‌خۆیـان، نەگەیـشتنە هـیچ سـودێك‌و سـەرکەوتنیان وەدەسـت نـەهێنا، خوای‌گـەورە ئـەو جەنگەی لە کۆڵ موسوڵمانان کردەوە-بە (مَلائِكَة)و بـای (صَبا)ی بەهێز- خـوای گەورە بەهێزو زاڵە بە سەر دوژمنانی‌دا.

جا لە بەر ئەو نیعمەتە، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ﴿لاَإِلَهَ إلاَّاللهُ وَحْدَهُ، صَدَقَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَأَعَزَّ جُنْدَهُ، وَهَزَمَ اْلأَحْزابَ وَحْدَهُ، فَلا شيْءَ بَعْدَهُ﴾ رواه الشيخان، جگە لە خودا هیچ پەرستراوێك نیەو هەر ئەو تاك‌و تەنیایە، خودا وەعدەی‌خۆی بەڕاستی هێنا جێ، بەندەکـەی‌خۆی-مُحَمَّـدﷺ-سـەکەوتوو کـرد، لەشـکری‌خۆی سـەربەرز کـرد، بـە تەنهایی لەشکرەکانی کافرەکانی بەزاندن، جگە لە خودا هیچ شتێك نامێنێ. (تفسير ابن كثير) الاحزاب (٩و٢٥) و(فتح الباري) ب(٥) ل(٣٦٩) ب(٦) ل(١٩١).

**نۆیــەم: جیــاوازی زانایــانی(مُجْتَهِـد) شــتێکی شــەرعییە، پێغەمبــەرﷺ لــە غــەزای (بَنیقُرَیْظَـة)دا فــەرمووی:** ﴿أَلاَ لا يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ اَلْعَصْرَ-وفِي روايَةِ مُسْلِم: اَلظُّهْــرَ- إلاَّ فِــي بَنيقُرَيْظَةَ، فَأَدْرَكَ بَعْضُهُمْ الْعَصْرَ فِي الطَّرِيقِ، فَقالَ بَعْضُهُمْ: لا نُصَلِّي حَتَّى نَــأْتِيَهُمْ. وَقــالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ نُصَلِّي لَمْ يُرِدْ مِنَّا ذلِكَ. فَذُكِرَ ذلِكَ لِلنَّبِيِّﷺ فَلَمْ يُعَنِّفْ واحِداً مِنْهُمْ﴾ رواه‌الشيخان، **هیچ کەسێك نوێژی عەسر نەکا-ئەگەر نوێژی نیوەڕۆشی نەکردوە، با نەیکا- تا لە گەڕەکی (بَنِیقُرَیْظَة)دا دەیکا. جا لە ڕێگەدا هەندێکیان گەیشتنە کاتی عەسر و بونە دوو چین: چینێکیان گوتیـان: نوێژەکە ناکەین تا دەگەینە (بَنِیقُرَیْظَـة)، چـونکە واتـەی ئاشـکرای فەرموودەکـەی پێغەمبـەرﷺ ئەوهایـە. چینەکەیتریش گوتیان: ئێمە ئێستا لە ڕێگەدا نوێژەکە دەکەین، چونکە مەبەستی پێغەمبـەرﷺ نوێژنەکردن نەبوە، بەڵکو مەبەستی پەلەکردن بووە، جا ئەم دوو بۆچوونەشیان بۆ پێغەمبەرﷺ باس کرد، ئەویش ڕەخنەی لە هیچیان نەگرت.**

ئەم حەدیسە بەڵگەیە: کە جیاوازی زانایانی(مُجْتَهِد) لـە ڕوونکردنـەوەی قورئـانو حەدیـسدا شتێکی شەرعییەو پێغەمبەرﷺ ڕێگای داوە، چونکە ئەو دوو چینە (صَحابَة)یە هەردووکیان (مُجْتَهِد) بونو هەر یەکەو جۆرە بۆچوونێکی جیاوازی هەبوو لە تێگەیشتنی ئەم حەدیسە، جا کە پێغەمبەرﷺ ڕەخنەی لە هیچیان نەگرت، دیارە هەردوو چینەکان لە سەر ڕاستی بوینە.

جـا ئـەی بـرای موسـوڵمان: کـە پێغەمبــەری خۆشەویــستمانﷺ بــەو هــەموو زانــستو لەخواترسیەی خۆی ڕەخنەی لەو جیاوازییە نەگرتبێ، چۆن بـە ڕەوای دەزانـی: فەریکـە خوێندەوارەکانی ئەم سەردەمە، ڕەخنە لە هـەر چـوار ئیمامەکـەی سـەر مەزهـەب بگـرنو بانگەوازی بۆ (لامَذْهَبِي)= بێمەزهەبیو بەرەڵلایی بکەنو بڵێن: نابی مەزهەبـەکان بمێـنن. ئایا دەبێ ئەوان لە پێغەمبەرﷺ زاناترو لەخواترستر بن! ؟ تکات لێدەکەم بۆ شارەزایی ئەم باسە پێشەکیەکەی (ڕووناکی رب العالمین) بخوێنەوە سودی لێوەردەگری، هـەم بروانـە (شـرح صـحیح مـسلم) ب(٧) ل(٣٦٨-٣٦٩) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٥١٠-٥١٢) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٣٣٢).

**دەیەم: حەزرەتی( أَبو لُبابَة ) خۆی لە ستونەیەکی مزگەوت بەستەوە، تا تۆبەی قبوڵ بوو.**

لەبارەی تاوانەکەی حەزرەتی(أَبولُبابَة) خوایگەورە دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُــوا لا تَخُونُوا اللّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُــونَ﴾ الأنفال: ٢٧، **ئـەی ئـەو کەسانەی باوەڕتـان بـە خـواو پێغەمبـەرﷺ هێنـاوە، خیانـەت لەگـەڵ خـواو پێغەمبـەرﷺ مەکەنو نهێنیەکان بە کافرەکان مەڵێن، خیانەتیش لـە ئـەو ئەرکـەدا مەکـەن کـە بـە ئەمانەت پێتان سپێردراوە، دەشزانن ئاسەواری خیانەت چۆنە.**

جا حەزرەتی(أَبولُبابَة)ﷺ تا ماوەی شەش ڕۆژان هـەر بـە بەسـتراوەیی مـاوەو ژنەکـەی لـە کـاتی نوێژەکانـدا دەهـات دەیکـردەوە تـا نوێـژی دەکـرد، ئینجـا دەیبەسـتەوە، ئینجـا خوایگەورە تۆبەکەی لێقبول کردو فـەرمووی: ﴿وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُــوا عَمَــلاً

صَالِحاً وَآخَرَ سَيِّئاً عَسَى اللّهُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ التوبة: ١٠٢، **هەندێکیتر لە ئیماندارن دانیان بە گوناهیخۆیاندا هێنا، کردەوەی چاکو خراپیان تێکەڵ کردوە، تکا وایە خودا تۆبەیان قبوڵ بکا، خوایگەورە لە تۆبەکار دەبوریو ڕەحمی پێدەکا.**

ئیتر (صَحابَة)کان پەلەیان کرد بیکەنەوە، بەڵام حەزرەتی(أَبُولُبابَة)ﷺ گوتی: والله جگە لە پێغەمبەرﷺ نابی هیچ کەسێکیتر بمکاتەوە، جا پێغەمبەرﷺ لە کاتی نوێژی سبەینێ کردیەوە. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٤٧٨).

**یازدەهەم: گوتنی وشەی (سَـیِّـد).** پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ فَأَنْزِلُوهُ﴾ **بۆ گەورەکەیخۆتان هەڵسن دایبەزێنن.** باسی هەڵسان لە بەر یەکتری-إن شاء الله- لە غەزای (خَيْبَر)دا ڕوون دەکەینەوە.

جا حەدیسەکەش بەڵگەیە: پێویستە ڕێز لە پیاوماقوڵو سەرۆك هۆزەکانی موسوڵمان بندرێ، هەم دروستیشە وشەی (سَيِّد)=گەورە بۆ پیاوماقوڵی موسوڵمان بگوترێ، بەڵام گوتنی وشەی (سَيِّد) بۆ پیاوی (فاسق)و (منافق) حەرامە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ تَقُولُوا لِلْمُنافِقِ: سَيِّد، فَإِنَّهُ إِنْ يَكُ سَيِّداً فَقَدْ أَسْخَطْتُمْ رَبَّكُمْ عَزَّ وجَلَّ﴾رواه أبوداود والنسائي بإسناد صحيح، **بە مرۆڤی (منافق) مەڵێن: (سَيِّد)=گەورە، چونکە ئەگەر ئەو گەورەی ئێوە بێ، ئەوە خوای خۆتان لە خۆتان تووڕە کردوە.** واتە: چونکە وا دەگەیەنێ: ئێوە لەوی کەمتر بن، خوای گەورەش بەوە ڕازی نابێ موسوڵمان خۆی لە (منافق) بە کەمتر دابنێ.

**ئینجا بزانە:** گوتنی وشەی (سَيِّد) بۆ پێغەمبەرﷺ، زانایان بە سوننەتێکی گەورەیان داناوە-هەروەك (الشّرواني) گێڕاویەتیەوە-چونکە پێغەمبەرﷺ بۆ خۆی بە کاری هێناوەو فەرموویەتی: ﴿أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيامَةِ﴾ رواه الشيخان، **من گەورەی خەڵکیمە لە ڕۆژی قیامەت.** کەوابوو: سوننەتە لە کاتی سەلاوات لێدانیش بگوترێ: **(اَللّهُمَّ صَلِّ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ)**، چونکە هەم فەرمانیخوا بەجێ دەهێندرێو هەم ڕێزلێنانی پێغەمبەریشیﷺ تێدایە، ئیمام (ابن حجر العسقلاني) فەرموویەتی: بە یەکدەنگی زانایانیئیسلام: ئایەتەکەی سەلاوات بە گەورەدانانی پێغەمبەریﷺ تێدایە. ئیمامی(الحلبي) فەرموویەتی: واتەی سەلاوات بەگەورەدانانی پێغەمبەرەﷺ لە دونیاو قیامەت.

**جا بزانە:** لێرەدا مەبەست سەلاواتی دەرەوەی نوێژەکان بوو، چونکە لەبارەی سەلاواتی تەحیاتینوێژ، زانایان فەرمودەی جیاوازیان هەیە: هەندێکیان فەرموویانە: لە ناو نوێژیشدا ڕێزلێنانی پێغەمبەرﷺ لەپێشترە لە گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەرﷺ، کەوابوو: سوننەتە لە سەلاواتی تەحیاتینوێژیشدا بگوترێ: (سَيِّدِنا مُحَمَّد). جا (نهاية) پشتی بەم فەرموودەیە بەستووە، بەڵام لە لای هەندێ زانایتر: گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەرﷺ لەپێشترە لە ڕێزلێنانی پێغەمبەرﷺ.

جا ئیمامی(الإسنوي) دوو دڵی لە سوننەتایەتی‌دا هەیە، هەم ئیمامی(الشربیني) لە (مغني)دا فەرموویەتی: لە ئاشکرایی فەرموودەی زانایاندا ئەم دووەمە پشت پێبەستراوە.

واتە: لە سەلاواتی تەحیاتی‌نوێژدا سوننەت نیە بگوترێ: (سَیِّدنا مُحَمَّد).

واتە: نوێژ خواپەرستی‌یەو پێویستە: شوێنکەوتنی پێغەمبەری‌ﷺ-زیاتر- تێدا ڕەچاو بکرێ، چونکە پێغەمبەرﷺ بەخۆی فەرموویەتی: لە سەلاواتی ناو نوێژدا بڵێن: ﴿اَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ..إلخ﴾ حدیث صحیح رواه الإمام الشافعي وأصحاب السنن، جا بۆیێ لێرەش درێژەم دایێ، چونکە هەندێ کەس هەردوو مەسەلەکانی لێ تێکەڵ دەبن‌و دەیکاتە ململانیەکی بێسود. (الترغیب والترهیب) ب(٣) ل(٥٧٩) و(فتح الباري) ب(١١) ل(١٨٧و١٩٥) و(حواشي الشرواني وابن قاسم على تحفة المحتاج) ب(٢) ل(٨٦).

**دوانزهەم: التَّحْکِیم**)= دادوەر دانان بۆ بڕیاردانێکی شەرعی، پێغەمبەرﷺ بە حەزرەتی (سَعْد)ی‌رضي الله عنه فەرمووی: ﴿قَضَیْتَ بِحُکْمِ اللهِ﴾ رواه الشیخان، **بە بڕیاری‌خوا تۆ بڕیارت دا.**

ئەمەش بەڵگەیە: دروستە کەسێکی لێزان‌و لێهاتوو بکرێتە دادوەر لە کاروباری موسوڵمانانداو، بڕیارەکەشی جێبەجێ دەکرێ.

**هەروەها دروستە: ئەو کەسانە بکوژرێن کە پەیمان دەشکێنن‌و یارمەتی دوژمنانی‌ئیسلام دەدەن،** خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ مِنْ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لا أَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنْتَهُونَ﴾ التوبة: ١٢، **ئەگەر ئەوان پەیمانەکەیان لە دوای پەیمانبەستن هەڵوەشاندەوەو عەیبیان لە ئایینی ئێوە گرت، ئێوەش سەرکردەکانی کوفر بکوژن، چونکە تازە هیچ پەیمانێکیان نیە، بەڵکی واز لە تاوانەکانیان بێنن.**

بەڵێ: جولەکەکانی (بَنِی قُرَیْظَة) پەیمانیانی دۆستایەتییان شکاندو دەیانویست لە پشتەوە خەنجەر لە پشتی‌ئیسلام بدەن‌و پایەتەختی ئیسلام‌و ژن‌و منداڵی موسوڵمانان تەسلیمی دوژمنانی ئیسلام بکەن، بەڵام خوای‌گەورە فێڵی خراپ دەگەڕێنێتەوە سەر فێڵبازەکە، ئەگەر جڵەوی ستەمکاریش شل بکا، بەری‌هەڵناداو هەر دەیگرێ، بۆیێ جولەکە ستەمکارەکانی (بَنِی قُرَیْظَة)ش هەر لە دونیادا بە سزای‌خۆیان گەیشتن‌و چوار سەد جەنگاوەریان لێ‌کوژراو ماڵ‌و منداڵیان بە سەر موسوڵماناندا بەش کرا، چونکە ئەوان ئەوها پیلانیان لە دژی پێغەمبەرﷺ موسوڵمانان دانابوو.

تەماشا بکە: (حُیَي بن أَخْطَب)ی سەرۆکی جولەکەی (بَنِی‌النَّضِیر)، پێکهێنەری بەرەی کافرەکان بوو لە دژی پێغەمبەرﷺ، جا کاتێ هێنایان لە سەری بدرێ، تەماشای پێغەمبەری‌ﷺ کردو گوتی: ئەی (مُحَمَّد) وَاللهِ لۆمەی خۆم ناکەم کە دوژمنایەتی تۆم کردوە، بەڵام هەر کەسێك یارمەتی خوا نەدا، خوای‌گەورە یارمەتی‌ی نادا، جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: لە سەری درا.

هەروەها: (كَعْب بن أسَد)ی سەرۆكی (بَنیقُرَيْظَة)، بە پێغەمبەریﷺ گـوت: ئەگـەر عـەيبم لێنەگیرێ كە لە ترسـی كوشـتن موسـوڵمان بويمـە، ئـەوە شـوێنت دەكـەوتمو موسـوڵمان دەبوم، بەلاّم من جولەكەم. ئیتر بە فەرمانی پێغەمبەرﷺ ئەویش لە سەری درا.
ئەوەش بەڵگەیە: كە سەركردەكانی جولەكە دەیانزانی پێغەمبەرﷺ ڕاستە. خۆ ئەگەر لەم حاڵەتەی كوشتنیشدا موسوڵمان ببوان، ئەوە لە كوشتن ڕزگاریان دەبوو و لە خیانەتەكەش عەفو دەكران، بەلاّم دەمارگیری جولەكەیەتی وای لێكردبون هەر بـە جولەكايـەتی بمـرنو ببنە سـوتەمەنیی ئـاگری دۆزەخ. بـە دستكاریەوە لـە (فقـه السيرة، للبـوطي) ل(٣٣٢و٣٣٤) و(سـيرة الصلابي) ب(٢) ل(٢٨٠و٢٩٤و٢٩٦).
**سێزدەهەم: ڕێزداریی حەزرەتی( سَعْد بن مُعاذ )ﷺ**، پێغەمبەرﷺ دەرهەق وی فەرمووی: ﴿قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ﴾ رواه الشيخان، **لە بەر گەورەی خۆتان هەڵسن.**
حەزرەتی(سَعْد)ﷺ هەرچـەند لـە تەمـەنی گەنجیـدا بـوو، بـەلاّم لـە ڕێزداریـدا گـەورەی (أَنْصار)ی (مَدِينَة) بوو، هەروەك ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ گەورەی (مُهاجِر)ەكان بوو، حەزرەتی (سَعْد)ﷺ لە سەر دەستی حەزرەتی(مُصْعَب بن عُمَيْـر)ﷺ لـە (مَدِينَـة) موسـوڵمان بـوو- هەروەك باسمان كرد- جا لە غەزای (خَنْدَق) تیرێكی وە باسكی كەوتو برینـداری كـرد، جا لـە خـوا پـاڕاوەو گـوتی: **(خودایە نەممرێنە تا دەردم لە (بَنِیقُرَيْظَة) دەرمان دەكەی). هەم فەرمووی: (خودایە ئەگەر جەنگی (قُرَيْش) ماوە، بمهێڵەوە تا لە ڕێگای تۆ جەنگیان لەگەڵ بكەم).**
ئینجا كە بڕیاری دا: جـەنگاوەرەكانی (بَنِیقُرَيْظَـة) بكـوژرێن، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی بـە بڕیاریخوا بڕیارت دا. ئینجا دووبارە حەزرەتی(سَعْد)ﷺ دوعای كردو فەرمووی: **(خودایە وا تێدەگەم جەنگی ئێمەو كافرەكان تەواو بوو، خودایە بەم برینەم بممرێنە).**
جا خوایگەورە دوعایەكەی قبوڵ كردو بەم برینە لە تەمەنی سیو حەفت ساڵیدا وەفـاتی كرد، جا پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: ﴿اهْتَزَّ عَرْشُ الرَّحْمنِ لِمَوْتِ سَعْد بن مُعاذٍ﴾ رواه الـشيخان، **عەرشی خوا هەژاوە بە هۆی مردنی (سَعْد بن مُعاذ).** هـەم فـەرمووی: ﴿شَهِدَهُ سَبْعُونَ أَلْفاً مِنَ الْمَلائِكَةِ﴾ رواه النسائی، **حەفتا هەزار (مَلائِكَة) ئامادەی (جَنازَة)ی (سَعْد) بونو هەڵیاندەگرت.** جا كە گۆڕەكەیان هەڵدەكەند بۆنی میسكی لێدەهات، فرضي الله عنه حيا وميتا. (عظماء حول الرّسُولﷺ) ب(٢) ل(٨٩٩-٩٠٤).
**چواردەهەم:** لە كۆتایی غەزای(الأحـزاب)دا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ﴿آلانَ نَغْــزُوهُمْ وَلاَ يَغْزُونَنا﴾رواه البخاری، **لـە ئێستا بـەولاوە ئێمـە دەچینە جەنگی ئـەوان، ئـەوان نایەنـە جەنگی ئێمە.** حەزرەتی(سَعْد بن مُعاذ)ش ﷺ لە كۆتایی جەنگەكەدا دوعای كردو گـوتی: خودایە وا تێدەگەم كۆتایی جەنگت هێناوە لە نێوان ئێمەو كافرەكانی (قُرَيْش)دا...خودایە ئەگـەر كۆتاییـت هێنـاوە برینەكـەم بتەقێنـەوەو بـەم برینـە بممرێنـە. جـا خوایگـەورە دوعایەكەی قبوڵ كردو برینەكەی هەڵوەشاوەو هەر خوێنی لێهات تـا وەفـاتی كـرد، ئـیتر

فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ دوعایەکەی حەزرەتی(سَعْد)ﷺ لە یەك ئامانجدا یەکتری دەگرنەوە: ئەویش ئاگادارکردنەوەیە: **(کە قۆناغی غەزایەکانی بەرگری کۆتایی هاتو لەمەودوا قۆناغی غەزایەکانی هێرشکردن دەست پێدەکاو بێباوەڕان و بتپەرستەکان جگە لە ئیسلام هیچیتریان لێ قبولْ ناکرێ و جولەکەو دیانەکانیش دەبێ سەرانە بدەن).**

**بەڵێ**: بە لەناوبردنی جولەکەکانی (بَنِيقُرَيْظَة) بەرەی ناوخۆیی موسوڵمانان بەهێز بوو و کرمی ناوخۆ نەماو جارێکیتر لە دەرەوەڕا دوژمن ناتوانێ هێرش بهێنێتە سەر (مَدِينَة).

ئیمام (ابن حجر العسقلاني) فەرموویەتی: (سَعْد)ﷺ لە دوعایەکەیدا پێکای و دوعایەکەی قبولْ بوو، چونکە هیچ جەنگێکیتر لە نێوان موسوڵمانانو (قُرَيْش)دا ڕووی نەدا، بەڵکو پێکهاتنی جەنگ وەستاندن مۆر کرا، جا ئەوان پەیمانەکەیان شکاندو پێغەمبەرﷺ هێرشی کردنە سەر، (مَكَّة)ی ڕزگار کردو دوعایەکەی (سَعْد) وەکو فەرموودەکەیڕابردووی پێغەمبەریﷺ لێهات. (فتح الباري) ب(٧) ل(٥٠٥و٥١٧). و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٣٣٧).

**پانزەهەم: مارەکردنی حەزرەتی (أُمُّ حَبِيبَة)ی دایکی ئیمانداران** رضي الله عنها، حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة)-رضي الله عنها-کیژی (أَبِيسُفْيان)ی سەرکردەی کافرەکانی (قُرَيْش) بوو، ئەویش وەکو (أَبُوجَهل)و (أَبُولَهَب) لە توندترین دوژمنانی ئیسلام بوو، لە هەموو جەنگێکی دژ بە ئیسلام دەستی هەبوو، حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة)ش -رضي الله عنها-لە (مَكَّة) خۆیو مێردەکەی—(عُبَيْدُالله بن جَحْش)— موسوڵمان بونو کۆچیان کرد بۆ (حَبَشَة)، جا لەوێ (عُبَيْدُالله)ی مێردی لە ئیسلام پاشگەز بۆوەو بووە دیان=گاوڕ، هەر بە گاوریش لەوێ مرد.

جا گوتمان: پێغەمبەرﷺ هەر ژنێکی لە خۆی مارە کردبێ بەرژەوەندیەکی ئیسلامی تێدا بووە، یەکێکیش لەو بەرژەوەندیانە کەمکردنەوەی ڕقو قینەی دوژمنانیئیسلام بوو، جا مارەکردنی حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة)ش-رضي الله عنها-لەم بابەتە بوو، واتە: پێغەمبەرﷺ ویستی خزمایەتی لەگەڵ (أَبُوسُفْيان) پەیدا بکاو لە دوژمنایەتیی کەم بکاتەوە، بۆیێ حەزرەتی (عَمْرِو بن أُمَيَّة)یﷺ ناردە لای (النَّجاشِي)ی پاشای (حَبَشَة)، تاکو حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة)ی لێمارە بکا، جا (النَّجاشِي) ناردیە لای حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة)-رضي الله عنها- تاکو یەکێك لە موسوڵمانان بکاتە سەرپەرشتکاری مارەبڕینەکە، جا حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة)ش-رضي الله عنها- حەزرەتی(خالد بن سَعِيد)یﷺ کردە سەرپشتکاریخۆی، جا (النَّجاشِي) فەرمانی بە حەزرەتی(جَعْفَر بن أبي طالب)ﷺ کرد: خۆیو موسوڵمانەکانیتری (حَبَشَة) ئامادەی مارەبڕینەکە بن، جا بە ئامادەبوونی هەمووان مارەبڕینەکە ئەنجا دراو (النَّجاشِي) لە ماڵی خۆی چوار سەد دیناری زێڕی کردە مارەیی حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة) رضي الله عنها، زیافەتیکیشی بۆ موسوڵمانەکانی (حَبَشَة) کرد، جا حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة)ش رضي الله عنها لەگەڵ کۆچکەرەکانیتر لە (حَبَشَة) گەڕاوە (مَدِينَة) جا لە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ لە ساڵی چلو چواری

کۆچیدا حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة)ش رضي الله عنها وەفاتی کرد.
جا لەبارەی ئەم مارەبڕینە،خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿عَسَى اللهُ أَنْ يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُمْ مِنْهُمْ مَوَدَّةً﴾ الممتحنة:٧، نزیکە خوایگەورە خۆشەویستی بخاتە نێوان ئێوەو ئەوانەی دوژمنایەتییان دەکەن لە کافرەکانی (قُرَيْش). ئیمامی(البیهقـي)و ئیمامی (القرطبي) لە حەزرەتی(ابن عَبّاس) رضي الله عنهما گێڕاویەتیانەوە: ئەم خۆشەویستییە لە دوای مارەبڕینی (أُمُّ حَبِيبَة) بوو، (أُمُّ حَبِيبَة) بووە دایکی ئیمانداران و (مُعاوِيَة)ش بووە خاڵی ئیمانداران. جا کە هەواڵی ئەم مارەبڕینە گەیشتە (أبوسُفْيان)، گوتی: (هَذا الْفَحْل لاَ يُقْدَعُ أَنْفُهُ) ئەم نێرییە لە لوتی نادرێ، واتە: (مُحَمَّد)ﷺ ڕێزدارەو ڕەد ناکرێتەوە.
جا بەم مارەبڕینەی حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة) دڵی (أبوسُفْيان) نەرم بوو و توندوتیژیەکەی دوژمنایەتیی خاو بۆوەو لە (فَتْح مَكَّة)دا موسوڵمان بوو، والحمد لله تعالى. (تفسيرالقرطبي) الممتحنة: (٧) و(البداية والنهاية) ب(٢) ل(٥٠٢-٥٠٤).

*** *** ***

## ﴿ غـەزای (بَنِي لَحْيان) ﴾

لە مانگی (جُمادَى الأُولى) ساڵی شەشەمی کۆچی، پێغەمبەرﷺ دوو سەد (صَحابَة)ی لەگەڵ خۆیا برد بۆ سەر (بَنِي لَحْيان) کە لە (الرَّجِيع)دا خیانەتیان لە حەزرەتی (خُبَيْب)و هاوڕێکانی رضي الله عنهم کردبوو و لە (بِئْرِمَعُونَة)دا شەهید کران، تاکو تۆڵەیان لێبکاتەوە، ئینجا کە پێغەمبەرﷺ گەیشتە شوێنی شەهیدبوونی ئەوان، دوعای بۆ کردن و لە خوا پاڕاوە لێیان خۆش ببێ. جا (بَنِي لَحْيان)ش هەواڵی هێرشی پێغەمبەریانﷺ گەیشتێ و هەڵاتن و بە سەر چیایەکاندا پەرت بون، جا پێغەمبەرﷺ و (صَحابَة)کانی بەو ناوچەیەدا پەرت کردن، بەڵام هیچ کەسێکیان دەست نەکەوت، ئینجا بۆ ترساندنی کافرەکانی (مَكَّة) پێغەمبەرﷺ لەشکرەکەی بردە (عُسفان)، ئینجا لەوێش دە سوار ئەسپی بە سەرکردایەتی ئیمام (أبُوبَكْر)رضي الله عنه ناردن تا گەیشتنە دۆڵی (کُراع الغَمِيم) لە نزیك (مَكَّة)، ئینجا ئەوانیش بە سەلامەتی گەڕانەوە، جا لە دوای چواردە ڕۆژان پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کان رضي الله عنهم بە سەلامەتی گەڕانەوە (مَدِينَة)، لەم ماوەیەشدا حەزرەتی(عبدالله ابن أُمِّ مَكْتوم رضي الله عنه) جێنیشی پێغەمبەرﷺ بوو لە (مَدِينَة).

## ﴿غەزای (ذِي قَرَد)=غەزای (اَلْغابَة)﴾

کە پێغەمبەرﷺ لە غەزای (بَنِي لَحْيان) گەڕاوە، پاش چەند شەوێکی کەم، (عُيَيْنَة بن حِصن)-کە لە غەزای(خَنْدَق)دا سەرکردەیەکی(غَطْفان) بوو- لەگەڵ چل ئەسپسواری هۆزەکەی، شەوێك هێرشیان کردە سەر وشترەکانی پێغەمبەرﷺ، کە لە (اَلغابَة) دەلەوەڕان و ژمارەیان بیست وشتر بوو، (ذَر)ی کوڕی حەزرەتی(أبِى ذَرّ الغِفاري)و ژنەکەی

(أبی‌ذَر)ﷺ له‌گه‌ڵ وشتره‌كاندا بون، جا كافره‌كان (ذر)یان شه‌هید كردو ژنه‌كه‌شیان به‌ دیل كرتو له‌گه‌ڵ وشتره‌كاندا بردیان، جا یه‌كه‌م كه‌س كه‌ ئه‌م هه‌واڵه‌ی زانی: حه‌زره‌تی(سَلَمَة بن الأكْوَع)ﷺ بوو، چونكه‌ له‌ به‌ره‌به‌یاندا به‌ره‌و (الغابَة) ڕۆیشتو له‌ ڕێگه‌دا خزمه‌تكارێكی حه‌زره‌تی(عبدالرحمن بن عَوف)ی رضی‌الله عنهما گه‌یشتێو پێی گوت: (عُیَیْنَة) وشتره‌كانی پێغه‌مبه‌ری‌ﷺ به‌ تالان بردن، جا حه‌زره‌تی(سَلَمَة)ﷺ خزمه‌تكارێكی حه‌زره‌تی (طَلحَة)شی رضی‌الله عنهما له‌گه‌ڵدا بوو و پێی گوت: به‌ سواری ئه‌م ئه‌سپه‌ به‌ په‌له‌ بڕۆ هه‌واڵه‌كه‌ بگه‌ینه‌ پێغه‌مبه‌رﷺ. جا خزمه‌تكاره‌كه‌ ڕۆیشتو حه‌زره‌تی (سَلَمَة)شﷺ له‌ سه‌ر (ثَنِیَّةُالوَداع) به‌ ده‌نگێكی به‌رز سێ جار هاواری كرد: (وا صَباحاهْ). ئه‌م وشه‌یه‌ بۆ هاواركردنی ته‌نگانه‌ به‌ كار ده‌هات.

جا حه‌زره‌تی(سَلَمَة) به‌ خۆیشی به‌ دوای كافره‌كاندا ڕۆیشتو وه‌كو نه‌ڕه‌ شێر غاری ده‌دا تا گه‌یشته‌ تالانچیه‌ كافره‌كانو تیربارانی ده‌كردن، جا كه‌ ئه‌وان هێرشیان بۆ ده‌هێنا ڕای‌ده‌كردو نه‌یده‌گه‌یشتنی، كه‌ ده‌گه‌ڕانه‌وه‌ دیسان تیربارنی ده‌كردنه‌وه‌، تا وای لێكردن چه‌ند وشترێكو چه‌ند كه‌لوپه‌لێكی پێ به‌جێ هێشتن...به‌م جۆره‌ حه‌زره‌تی (سَلَمَة)ﷺ هه‌ر له‌ جه‌نگدا بوو، له‌ لایه‌كی‌تریش: كه‌ پێغه‌مبه‌رﷺ هه‌واڵه‌كه‌ی گه‌یشتێ، فه‌رمووی: ﴿یا خَیْلَ اللهِ اِرْكَبی﴾ هۆ ئه‌سپسواره‌كانی‌خوا سواری ولاغه‌كانتان بن.

جا یه‌كه‌م ئه‌سپسوار گه‌یشته‌ خزمه‌ت پێغه‌مبه‌رﷺ: حه‌زره‌تی(المِقْداد بن الأسْود) بووﷺ، ئینجا پێغه‌مبه‌رﷺ ئالایه‌كه‌ی دایه‌ ده‌ست حه‌زره‌تی(سَعْد بن زَیْد)وﷺ فه‌رمووی: به‌ ئه‌میرایه‌تی ئه‌م كۆمه‌ڵه‌ به‌ په‌له‌ بڕۆ، تا خه‌ڵكی‌تریش به‌ دواتاندا ده‌نێرم. ئینجا پێغه‌مبه‌ریشﷺ حه‌زره‌تی(عبدالله ابن أمِّ مَكْتوم)یﷺ له‌ جێی خۆی داناو حه‌زره‌تی(سَعْد بن عُبادَة)شیﷺ له‌گه‌ڵ سێسه‌د (صَحابَة) كردنه‌ پاسه‌وانی (مَدینَة)و به‌خۆیشی له‌گه‌ڵ پێنجسه‌د (صَحابَة) كه‌وتنه‌ ڕێ، تا له‌ (ذِی‌قَرَد) گه‌یشتنه‌ دوژمنو چه‌ند وشتریكی‌تریان لێسه‌ندنه‌وه‌، به‌ڵام كافره‌كان قورتار بونو وشتره‌كانی‌تریان له‌گه‌ڵ خۆیانا برد، جا پێغه‌مبه‌رﷺ ڕۆژێكو شه‌وێك له‌وێ مایه‌وه‌و له‌م غه‌زایه‌دا (مُحَرِّز=الأخْرَم الأسَدي) شه‌هید بووﷺ، دوو كافریش كوژران.

ئینجا ژنه‌كه‌ی (أبی‌ذَر)ش رضی‌الله عنهما شه‌وێك به‌ نهێنی-له‌ دوای خه‌وتنی كافره‌كان- سواری وشتره‌كه‌ی پێغه‌مبه‌رﷺ بوو-كه‌ ناوی (العَضْباء) بوو- ڕای‌كردو كافره‌كان نه‌یگه‌یشتنێو به‌ سه‌لامه‌تی گه‌یشته‌وه‌ پێغه‌مبه‌روﷺ (صَحابَة)كانﷺ، جا له‌ ڕێگه‌دا نه‌زری كردبوو: ئه‌گه‌ر خوا ڕزگاری بكا، ئه‌م وشتره‌ بۆ خوا سه‌ر ببڕێ. جا ئه‌مه‌ی بۆ پێغه‌مبه‌رﷺ باس كرد، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: ﴿بِئْسَ ما جَزَیْتِها﴾ پاداشتێكی خراپت داوه‌ته‌وه‌ وشتره‌كه‌. واته‌: تۆی له‌ دوژمن ڕزگار كردوه‌، چۆن سه‌ری

دەبڕیێ، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لاَ وَفاء لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللهِ وَلاَ فِيما لا يَمْلِكُ ابْنُ آدَمَ﴾ رواه مسلم، بەجێهێنانی نەزر لە گوناهدا دروست نیە، هەم لەو شتەشدا دروست نابێ: کە مڵکی نەزرکەرەکە نیە. جا فەرمووی: ئەم وشترە وشتری منە، تۆش بۆ خۆت بگەڕێوە (مَدِينَة). جا پێغەمبەرﷺ بە سواری ئەم وشترەی (العَضباء) گەڕاوە (مَدِينَة)و لەم غەزایەدا پێنج ڕۆژی پێچوون.

﴿ڕووداوەکەی (الْـعُـرَنِـيِّـين)﴾

لە مانگی (شوال) ساڵی شەشەمی کۆچی، هەشت پیاو لە هۆزەکانی (عُکَل)و (عُرَيْنَة) هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ موسوڵمانبوونیخۆیان ڕاگەیاند، بەڵام ئاو و هەوای (مَدِينَة)یان لێنەکەوتو توشی نەخۆشی بون، جا پێغەمبەرﷺ ناردنیە لای وشترەکانی خۆی، تاکو شیرو میزی وشترەکان بخۆنەوەو لەو نەخۆشیە چاك ببنەوە، جا ئەوانیش چونە لای وشترەکانو ماوەیەك مانەوە، تا چاك بونەوە، ئینجا کافر بونەوەو شوانی وشترەکانیان کوشتو وشترەکانیشیان بە تاڵان بردن، جا پێغەمبەرﷺ لەشکرێکی بە دوادا ناردنو گرتنیان، جا دەستو پێیان بڕینو چاویان دەرهێنانو لە لای (الْحَرَّة) بەجێیان هێشتنو ئاویان نەدانێ تا هەموویان مردن.

﴿(سَـرِيَّـة)ی (الْـخَـبْـط) بە سەرکرکدایەتی حەزرەتی(أَبِی عُـبَـيْـدَة بن الْـجَـرَاح)ﷺ﴾

ئێنجا لە پێش پێکهاتنەکەی (الْحُدَيْبِيَة)یداهاتوو، پێغەمبەرﷺ سێسەد (صَحابَة)ی بە سەرکردایەتی حەزرەتی(أبُوعُبَيْدَة)ﷺ ناردنە لای کەناری دەریای سوێر، بۆ گرتنی کاروانێکی (قُرَيْش)، جا هەر لە ڕێگەدا ئازوقەیان نەما، بۆیێ حەزرەتی(أبُوعُبَيْدَة)ﷺ قەسپی لە هەموویان وەرگرتنو تێکەڵیکردنو ڕۆژێ تەنها یەك دانە قەسپی دەدانێو دەیانمژی، ناچار لە بەر برسیەتی (الْخَبط)=گەڵای درەختیان دەخوارد–بۆیێ بە لەشکری (الخَبْط) ناوبراوە– ئینجا لەو ماوەیەدا حەزرەتی(قَيْس بن سَعْد بن عُبادَة)رضیالله عنهما هەندێك وشتری بە قەرز کرینو ڕۆژێ سێ وشتری بۆ لەشکرەکە سەر دەبڕین، تا نۆ وشتری سەر بڕین، جا حەزرەتی(أبُوعُبَيْدَة)ﷺ قەدەغەی کردو ڕێگای نەدایێ هیچیتر سەر ببڕێ، واتە: چونکە ئیمام (عمر)ﷺ–کە ئەویش سەربازێکی لەشکرەکە بوو– فەرمووی: ئەمە خۆی قەرزدار دەکاو هیچ ماڵیشی نیە، بەڵکو ماڵ ماڵی باوکیەتی.

جا لە ناکاو شەپۆلەکانی دەریا نەهەنگێکی (العَنبَر)ی فڕێدا دەرەوە کە بە قەد تەپۆلکەیەکی گەورە بوو، جا (صَحابَة)کانﷺ ماوەی مانگێك لە گۆشتی نەهەنگەکەیان خواردو تێر بونو لاوازیو برسیەتییان نەما، جا کە گەڕانەوەو بۆ پێغەمبەریانﷺ باس کرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ئەمە ڕزقێکە خوا بۆ ئێوەی هێناوەتە دەرەوە، ئایا هیچتان وێماوە دەخواردی ئێمەش بدەن؟﴾ لە (رِوايَة)یێکیتردا فەرمووی: ﴿ئەگەر بزانین دەگەینە گۆشتەکەو بۆگەن نەبوبێ، پێمانخۆش بوو:

هەندێكمان لەو گۆشتە هەبوایە﴾. جا ئەوانیش هەندێك گۆشتی نهەنگەكەیان بۆ پێغەمبەرﷺ ناردو خواردی، واتە: گۆشتەكە بۆگەن نەبووبوو، بۆیێ خواردی. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٥٠٩و٥٤٠و٦٣٨) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٥٧١و٥٧٤)، ب(٨) ل(٩٧و١٠٢).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەكەم: غەزای (بَنِی لَحْیان) بۆ ئەوە بوو تۆڵەی حەزرەتی(خُبَیْب)و هاوڕێكانیﷺ بكاتەوە.** ئاشكرایە: لە غەزای (خَنْدَق) لەشكری كافرەكان لە هەموو غەزایەكانی‌تر زۆرترو بەهێزتر بوو، ئینجا كە خوایگەورە ئەو هێزە زۆرەی بەزاندو پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: لەمەودوا ئێمە بۆ غەزای ئەوان دەچین. پێغەمبەرﷺ كاتی بۆ رەخسا: دوژمنە تاوانكارەكانی تەمبێ بكا، جا ئەو كافرانەی لە (الرَّجيع) خیانەتیان لە حەزرەتی(خَبَیْب)و هاوڕێكانیﷺ كردو بە شەهیدكردنیان دان، لە لای پێغەمبەرﷺ بە گەورەترین خائین دادەندران‌و شیاوی لێبوردن نەبون ئەگەر موسوڵمان نەبن.

جا هەرچەند حەزرەتی(خَبَیْب)و هاوڕێكانیﷺ بە شەهیدبوون شاد بون، بەڵام پێغەمبەرﷺ زۆر بۆیان غەمبار بوو، هەردەم دەویست تۆڵەیان بستێنێ، چونكە هەر تاوانكارێك تاوانەكەی بە بێ لێپێچانەوە بڕوا، ئەوە تاوانی گەورەتر دەكاو ترسی كەم دەبێتەوە، هەر بۆێش خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً﴾التوبة: ١٢٣، **با كافرەكان توندو تیژی لە ئێوە ببینن.** هەم دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لا تَعْلَمُونَهُمُ اللهُ يَعْلَمُهُمْ﴾ الأنفال: ٦٠، **ئامادە بكەن بۆ دژایەتی كافرەكان هەرچەندی لە تواناتاندا هەیە لە هێزی چەك هاوێشتن‌و ڕاگرتنی ولاغی جەنگی، تاكو بەو هێزە دوژمنی خواو دوژمنی خۆتان بترسێنن، هەم هەندێك دوژمنی‌تری جگە لەوانیش بترسێنن كە ئێوە نازانن چ دوژمنێكن، هەر خوا ئەیانزانێ.**

جا پێغەمبەرﷺ گەیشتە وڵاتی ئەم تاوانكارانەو ماوەی دوو ڕۆژان لەوێ بە دوایاندا گەڕا، بەڵام ئەوان هەڵاتن‌و چونە چیایەكانی ئەم ناوچەیە، جا هەرچەند هیچ كەسێكیان نەكەوتە بەردەستی لەشكری‌ئیسلام، بەڵام بەم غەزایە بۆیان ئاشكرا بوو: ئیسلام زۆر بەهێز بووەو توانای هەیە لە هەر كاتێكدا بیەوێ بگاتە خاكی دوژمنەكانی، بەڵكو بەم غەزایە كافرەكانی (قُرَیْش)ش ترس دایگرتن‌و وا تێگەیشتن پێغەمبەرﷺ هێرشیان دەكاتە سەر. بڕوانە (السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٣) و(سيرة الصلابي) ب(٢) ل(٣٢٩-٣٣١).

**دووەم: بڕیاری (نَذْر)**، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لاَ وَفاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةٍ وَلا فِيما لا يَمْلِكُ الْعَبْدُ﴾ رواه مسلم، **بەجێهێنانی نەزر لە گوناهدا دروست نیە...هتد.**

**بزانە:** مەبەست بە (نَذْر) واجبكردنی خواپەرستنێكە لە سەر خۆی، كە لە سەرەتادا لە

سەری واجب نەبوبێ، خوایگەورە لە مەدحی پیاوچاكان دەفەرموێ: ﴿يُوفُــونَ بِالنَّـــذْرِ﴾ الإنسان: ٧، **پیاوچاكان نەزر بەجێ دێنن.** هەم پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللهَ فَلْيُطِعْهُ وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَهُ فَلا يَعْصِهِ﴾رواه الشيخان، **هەر كەسێك لە سەر خۆی نەزر كرد خواپەرستنێك بكا با بیكا، وە هەر كەسێك نەزی كرد گوناهێك بكا نابی بیكا.**

جا بە بەڵگەی ئەم حەدیسانە: هەر كەسێك نەزری كرد تاوانێك بكا: وەك شەڕابخواردنەوەو كوشتنی بە ناهەق و زیناو...هتد، ئەوە نەزرەكەی بەتاڵەو دانامەزرێ، جا لە لای كۆمەڵە زۆرەكەی زانایانیئیسلام: كەففارەتیشی لە سەر نیە، بەلأم لە لای ئمام (أحمد) كەففارەتێكی سوێندی لە سەرە.

هەروەها ئەگەر شتێك ملكی خۆی نەبێ، ئەویش نەزركردنی داناەمەزرێ: وەك مەسەلەی وشترەكەی پێغەمبەرﷺ كە ڕابرا، بەلأم ئەگەر نەزرەكەی بە ملكایەتی شتەكە هەڵبواسێ، یان بە وەدەسكەوتنی سودێكی هەڵبواسێ، ئەو كاتە نەزرەكەی دادەمەزرێو لە سەری واجب دەبێ، وەك بڵێ: ئەگەر خانووی فلانەكەس بووە ملكی من لە سەرم نەزر بێ بیكەمە خێر. یان بڵێ: ئەگەر نەخۆشەكەم چاك بۆوە، لە سەرم نەزر بێ مەڕێك بكەمە خێر. ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا نەزرەكەی دادەمەزرێو هەر كاتێكیش پێهەڵواسراوەكە هاتە جێ، واجبە: جێبەجێی بكا هەرچەند هیچ مەڕیشی نەبێ، جا ئەگەر نەزركەرەكە مرد، ئەو كاتە واجبە میراتگرەكەی پێش میراتگرتن لە میراتەكەی نەزرەكەی بۆ جێبەجێ بكا. (شرح صحيح مسلم) ب(٧) ل(١٠٣-١٠٩). ئەم باسەم بە درێژی لە بەرگی پێنجەمی (ڕووناكی رب العالمين)دا ڕوون كردۆتەوە.

**سێیەم: سزای ڕێگرەكان، پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە (الْعُرَنِيِّين) كرد: میز و شیری وشترەكان بخۆنەوە...هتد.** بە بەڵگەی ئەم حەدیسە ئیمام (مالك)و ئیمام (أحمد)و چەند زانایەكی مەزهەبی(الشافعي) فەرموویانە: میز و ڕیخی ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان دەخورێ گشتی پاكە. بەلأم ئیمامی(الشافعي)و كۆمەڵە زۆرەكەی زانایان فەرموویانە: میزو ڕیخی ئەو ئاژەڵەی گۆشتی دەخورێ وەكو هی ئاژەڵەكانیتر پیسە، ئەم حەدیسەی ئەم باسەش نابێتە بەڵگە؟ چونكە ئەم میز خواردنەوەیە بۆ دەرمانكردن بوو، دەرمانكردنیش بە هەموو شتێكی پیس-جگە لە شەڕاب- دروستە.

**دیسان بزانە:** لەبارەی ئەم جۆرە ڕێگرانەی وەكو (الْعُرَنِيِّين)، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَاداً أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾المائدة: ٣٣، **سزای ئەو كەسانەی جەنگی خواو پێغەمبەرﷺ دەكەن-واتە ڕێگری دەكەنو هەوڵی وێرانكاریو تێكدانی كۆمەڵگە دەدەن- هەر ئەوەیە: بكوژرێن، یان لە سێدارە بدرێن، یان دەستو پێییان لە ڕاستەو چەپە**

بپردرێن، یان دور بخرێنەوەو بەند بکرێن، ئەو سزایە سەر شۆڕیە بۆ ئەوان لە دونیادا، لە ڕۆژی دواییشدا سزایەکی گەورەیان هەیە.

**جا بزانە:** بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: چاویان دەرهێنان، چونکە ئەوان چاوی شوانەکەیان دەرهێنابوو، هەم تێنوو بونو ئاویان نەدانێ، چونکە کافر بوبونەوەو ڕێزی ئایینیان نەمابوو، بۆیێ زانایان فەرموویانە: ئەگەر کەسێك ئاوی وێبوو بۆ دەستنوێژگرتن، لە هەمان کاتیش ئاژەڵێك، یان گاورێك، یان جولەکەیەك –کە جەنگ لە دژی ئیسلام ناکەن– پێویستیان بەو ئاوە هەبوو بۆ خواردنەوە، ئەوە واجبە: ئاوەکەیان بداتێ تاکو بیخۆنەوەو بەخۆیشی لە جیاتی دەستنوێژگرتن تەیمموم دەکا. بەڵام ئەگەر موسوڵمانی کافربووەوە تێنوو بوو نابی ئاوەکەی بداتێ.

هەروەها حەدیسەکەش بەڵگەیە ئەگەر کۆمەڵێك یەك کەس بکوژن دروستە هەموویان لە تۆڵەی کەسەکە بکوژرێن. (شرح صحيح مسلم) ب(٧) ل(١٦٧) و(فتح الباري) ب(١) ل(٤٣٦).

**چوارەم: (صَحابَة)کان گۆشتی نەهنگەکەیان بۆ پێغەمبەرﷺ نارد و خواردی.**

ئەمەش بەڵگەیە: کە گشت گیانلەبەرێکیدەریایی –کە تەنها لە ئاودا بژیێ– حەڵاڵە بخورێ، جیاوازی نیە: بەخۆی مردبێ: وەکو نەهنگەکەی ئەم حەدیسە، یان کەسێك کوشتبێتی، هەرچەند کەسەکەش موسوڵمان نەبێ، واتە: پێویست بە سەربڕین نیە، بەڵام ئەگەر ئاژەڵەکە –لە دوای مردن– هەڵاوسابێو بۆگەن بوبێ، ئەو کاتە ئەگەر زیانی هەبێ حەرامە بخورێ، هەروەها ئەوگیانلەبەرەی لە ئاو و لە وشکانیدا دەژیێ–وەك سەگی ئاویو کیسەڵو...هتد، ئەوانیش جگە لە بۆقو ئاژەڵ ژەهراویەکان لە لای ئیمام (مالك)و ئیمام (أحمد)و ئیمامی(النواوي)ی مەزهەبی(الشافعي) بە سەربڕین حەڵاڵ دەبن، بەڵام بۆق حەڵاڵ نابێ؟ چونکە پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە بۆق بکوژرێ. (مغني ابن قدامة) ب(١١) ل(٨٤–٨٦) و(تحفة المحتاج بشرح المنهاج) ب(٩) ل(٣٧٧و٣٧٨).

***　　***　　***

## ﴿ غەزای (الْحُدَيْبِيَة)و (صُلْحُ الْحُدَيْبِيَة) ﴾

پێغەمبەرﷺ لە خەونـدا دیتی: خۆیو (صَحابَة)کانیﷺ چونە (مَكَّة)ی پیرۆز ئیحرامیان بە (عُمْرَة) بەستبوو، بە ئەمینی (عُمْرَة)یان کردو سەریخۆیان تاشی.

جا پێغەمبەرﷺ خەونەکەی بۆ (صَحابَة)کانﷺ گێڕاوەو ئەوانیش زۆر دڵخۆش بون، جا بە (صَحابَة)کانی ڕاگەیاند خۆیان ئامادە بکەن بۆ (عُمْرَة)، هەم داوای لە (أعْراب)ەکانی دەوروبەری (مَدِينَة)ش کرد: لەگەڵی بڕۆنە (عُمْرَة)، نەوەك (قُرَيْش) جەنگی لەگەڵ بکەنو ڕێگەی نەدەنێ (عُمْرَة) بکا، بەڵام زۆربەی (أعْراب) لێی دواکەوتنو لەگەڵی نەڕۆیشتنو گوتیان: ئێمە بە ماڵو منداڵی خۆمانەوە سەرقاڵین.

جا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(نُمَیْلَة بن عبدالله)یﷺ کردە جێنیشی خۆی لە (مَدِینَة)و حەزرەتی(ابن أمِّ مَكْتُومٍ)شیﷺ بۆ جەماعەتی نوێژەکان دانا، ئینجا لە رۆژی دووشەممەی یەکەمی (ذِی الْقَعْدَة)ی ساڵی شەشەمی کۆچی پێغەمبەرﷺ هەزارو چوار سەد (صَحابَة)ی لەگەڵ خۆیا بردو لە (ذِیالْحُلَیْفَة) ئیحرامیان بە (عُمْرَة) بەستو ئاژەڵەکانی (هَدْي)شی لە گەڵ خۆیا هێنا، تاکو خەڵك بزانێ بۆ (عُمْرَة) دەچنە (مَكَّة) نەك بۆ جەنگ، بۆیێ جگە لە شمشێرەکانیان هیچ چەکێکیتریان نەبرد، (هَدْي) بەو ئاژەڵە دەگوترێ: کە حاجی لەگەڵ خۆیا بە دیاری دەیباتە (مَكَّة)، تاکو لەوێ سەری ببڕێو بیداتە هەژارەکان.

جا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(بشر بن سُفْیان)یﷺ ناردە (مَكَّة)، تاکو هەواڵی (قُرَیْش)ی بۆ وەربگرێ، ئینجا کە پێغەمبەرﷺ گەیشتە (عُسفان)، لەوێ حەزرەتی(بشر)یﷺ پێگەیشتەوەو پێی گوت: کافرەکانی (قُرَیْش) هەواڵی هاتنی ئێوەیان پێگەیشتووەو هێزیان کۆ کردۆتەوەو رێگە نادەن ئێوە بچنە ناو (مَكَّة)، دوو سەد ئەسپسواریشیان بە سەرکردایەتی (خالد بن الْوَلِید) ناردۆتە (کُراع الغَمِیم) تاکو رێگە لە موسوڵمانان بگرن بەرەو پێش نەرۆن.

جا کە پێغەمبەرﷺ ئەم هەواڵەی پێگەیشت، فەرمووی: ﴿خەڵکینە راوێژتان پێدەکەم چی بکەین؟﴾. جا ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ فەرمووی: یارَسُولَ الله تۆ بۆ ئەوە هاتوی زیارەتی ئەم ماڵەیخوا بکەیو مەبەستت جەنگ نیە، کەوابوو: بەرەو ماڵیخوا برۆ، جا هەر کەسێك رێگەی لێگرتین، جەنگی لەگەڵ دەکەین.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە سەر ناوی خوا بە رێگەیخۆتاندا برۆن. جا فەرمووی: ئایا پیاوێك هەیە بە رێگایەکی وەهادا بمانبا کە هێزی کافرەکانی (قُرَیْش)ی لێنەبێ؟ جا حەزرەتی(ناجِیَة بن جُنْدُب)ﷺ گوتی: من ئەی پێغەمبەری خوا. جا حەزرەتی(ناجِیَة) بە رێگەیەکی سەختدا بە ناو گەڵیەکاندا بردنیو زۆر ماندوو بون، تا گەیشتنە شوێنێکی نەرمو خۆش، جا کە ئەسپسوارەکانی(خالِد بن الْوَلِید) تۆزی لەشکری ئیسلامیان دیت بە رێگایەکیتردا هاتون، یەکسەر بە راکردن گەرانەوە (مَكَّة)، تاکو (قُرَیْش) ئاگادار بکەنەوەو خۆیان ئامادە بکەن.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: بە لای راستەدا بە دەربەندی (الْمِرار)دا برۆنە (الْحُدَیْبِیَة) لە لای خوارەوەی رۆژئاوای (مَكَّة). ئینجا کە گەیشتنە دەربەندەکەی نزیك (الْحُدَیْبِیَة)، لەوێ وشترەکەی پێغەمبەرﷺ ئیخ بوو و نەرۆیشت، جا هەرچەند هەوڵیان دا هەڵنەستاوە، جا گوتیان: (الْقَصْواء)=وشترەکە جەنەی گرتووە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿مَا خَلَأَتْ، وَمَا ذاكَ لَها بِخُلُقٍ وَلَكِنْ حَبَسَها حَابِسُ الْفِيلِ﴾ وشترەکەم جەنەی نەگرتووەو عادەتیشی نیە جەنە بگرێ، بەڵام ئەو خوایەی (فِیل)ی لە (مَكَّة)

گەڕاندەوە، هەر ئەویش وشترەکەی ڕاگرتووە.

جا فەرمووی: ﴿سوێندم بەو خوایەی گیانی منی بە دەستە: (قُرَيْش) داوای هەر کارێکم لێبکەن کە ڕێزلێنانی قەدەغەکراوەکانی خوای تێدا بێ، من دەیاندەمێ﴾.

ئینجا پێغەمبەرﷺ هەیهەی لە وشترەکەی کردو هەڵساوەو پێغەمبەرﷺ لە ڕێگەی (مَكّة) لایداو لە (الحُدَيْبِيَة) دابەزیو فەرمانیشی بە خەڵکەکە کرد دابەزین.

جا لەوێ بیرێکی بچکۆڵە هەبوو، ئاوێکی کەمی تێدا بوو، ئاوەکەیان هەموو هەڵێنجاو هیچی تێدا نەما، جا خەڵکەکە سکاڵایان بردە بەر پێغەمبەرﷺ، ئەویش تیرێکی لە تیردانەکەیخۆی دەرهێناو فەرمانی بە حەزرەتی(البَراءرضي الله عنه) کرد: تیرەکەی چەقاندە ناو بیرەکەو یەکسەر پڕ ئاو بۆوە و (صَحابَة)کانو وڵاغەکانیان هەموو تێر ئاو بون.

## ﴿ دەستپێکردنی گفتوگۆی پێغەمبەروﷺ کافرەکان ﴾

جا کە پێغەمبەرﷺ دابەزیو پشووی دا، (بُدَيْل بن وَرْقاء الخُزاعي) لەگەڵ کۆمەڵێکی پیاوانی (خُزاعَة) لە لایەن (قُرَيْش) هاتنە لای پێغەمبەروﷺ لێی پرسی: بۆچی هاتوی؟ پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئێمە بۆ جەنگ نەهاتوین، بەڵکو بۆ (عُمْرَة) هاتوین، بەڕاستی جەنگ (قُرَيْش)ی بێهێز کردون، جا ئەگەر حەز دەکەن: با ماوەیەك واز لە منو لەو خەڵکەی عەرەب بێنن، جا ئەگەر من سەرکەوتم ئەو کات ئەگەر حەزیان کرد: با موسوڵمان بن، ئەگەر نا: ئەو کات بۆ جەنگ بەهێز دەبن، سوێندم بەو خوایەی گیانی منی بە دەستە: ئەگەر هیچ لایەکم لەگەڵ نەکەن، ئەوە لە سەر ئەم ئایینە جەنگیان لەگەڵ دەکەم تا سەر دەکەوم، یان تا ئەستۆم لە لاشەم جیا دەبێتەوە. جا (بُدَيْل) گوتی: ئەوەی گوتت بە (قُرَيْش)ی ڕاگەیەنم.

جا (بُدَيْل) گەڕاوەو فەرموودەکانی پێغەمبەریﷺ گەیاندە کافرەکانی (قُرَيْش)، بەڵام (قُرَيْش) پێیان باوەڕ نەکردو بە تۆمەتباراپان دانا، چونکە هۆزی (خُزاعَة)–موسوڵمانو کافرەکانیان– لە بەرژەوەندی پێغەمبەرداﷺ بونو هەر شتێك لە (مَكّة) ڕویدابا، یەکسەر هەواڵەکەیان بۆ پێغەمبەرﷺ دەناردە (مَدينَة)، جا گوتیان: ئەگەر (مُحَمَّد) بۆ جەنیگش نەهاتبێ، هەر ڕێگەی نادەین بە زۆرەملی بێتە (مَكّة)و ئەم باسە لە ناو عەرەبەکاندا بڵاو ببێتەوە.

جا (قُرَيْش) ئەم جارەش (الحُلَيْس بن عَلْقَمَة)ی هاوپەیمانیخۆیان ناردە لای پێغەمبەرﷺ، جا کە ئەویش هاتو دیتی (صَحابَة)کان لە ئیحرامدانەو (لَبَّيْك) دەڵێن، یەکسەر گەڕاوەو نەگیشتە لای پێغەمبەرﷺ، چونکە قەدەغەکردنی (عُمْرَة)ی بە تاوانێکی گەورە دانا، جا ئەم ڕووداوەی بۆ کافرەکانی (قُرَيْش) گێڕاوەو گوتی:

قەدەغەکردنی ئەوانە بە حەڵاڵ نازانم. جا (قُرَیْش) پێیان گوت: دانیشە، تۆ عەرەبێکی دەشتاویی‌و هیچ نازانی. جا (الْحُلَیْس) تورە بوو و گوتی: سوێندم بە خوا: یان ڕێگەیان دەدەنێ (عُمْرَة) بکەن، یان خۆم (الأحابیش)ی شوێنکەوتەم لە هاوپەیمانیەتی ئێوە دەردەچوێنم. جا (قُرَیْش) ترسان‌و گوتیان: ئەی (حُلَیْس) ئەوە نەکەی تا ئێمە بۆ خۆمان هەندێك مەرج لە سەر (مُحَمَّد) دادەنێین.

ئینجا ناچار (قُرَیْش) ئەم جارەش (عُرْوَة بن مَسْعُودالثَّقَفِي)ی گەورەی(طائف)یان ناردە لای پێغەمبەرﷺ، جا ئەویش هات‌و گوتی: ئەی (مُحَمَّد)ﷺ چەند خەڵکێکی جۆراو جۆرت کۆ کردونەوەو هاتوی بنچینەو گەلەکەی خۆت بنەبڕ بکەی؟ وا (قُرَیْش) خۆیان کۆ کردۆتەوەو ڕێگەت نادەنێ بە زۆرەملی بچیە ناو (مَكَّة)، منیش هیچ پیاوماقوڵێك لە دەورەی تۆ نابینم، تەنها خەڵکێکی تێکەڵبوو دەبینم لە دەورەی تۆ، هەڵدێن‌و بەجێت دێڵن!. جا ئیمام (أبُوبَكْر)رضي الله عنه ڕقی هەڵساو فەرمووی: (اُمْصُصْ بَظْرَ اللاَّت، أنَحْنُ نَفِرُّ عَنْهُ؟!) عەوڕەتی بت‌و سەنەم بمژە، ئایا ئێمە لە دەورەی پێغەمبەرﷺ هەڵدێین‌و بەجێی دێڵین؟!.

جا (عُرْوَة) گوتی: ئەی (أبُوبَكْر) چاکەیەکت لە سەر من هەیە، ئەگەر نا: وەڵامم دەدایەوە. ئیتر (عُرْوَة) هەر قسەی لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دەکردو دەستیشی بە ڕیشی پێغەمبەردا دەهێناﷺ، جا حەزرەتی(الْمُغِیرَة بن شُعْبَة)شرضي الله عنه بە زرێپۆشی‌و بە چەکەوە لە پێوە ڕاوەستابوو، هەر جارێك (عُرْوَة) دەستی بۆ ڕیشی پێغەمبەرﷺ دەبرد، حەزرەتی(الْمُغِیرَة)ش بنکە شمشێرێکی لە دەستی دەداو دەیگوت: دەست نەگەینیە ڕیشی پێغەمبەرﷺ. جا (عُرْوَة) گوتی: ئای ئەمە چەند دڵڕەقە، ئەمە کێیە؟ پێغەمبەرﷺ بەزەردەخەنەوە فەرمووی: ئەمە (الْمُغِیرَة)یە برازای خۆتە.-واتە: چونکە (عُرْوَة) مامی باوکی (الْمُغِیرَة)یە- جا (عُرْوَة) گوتی: ئەی غەدرکار، هەر دوێنێ عەیبەکەی تۆم شۆردوە. مەبەستی ئەوەیە: (الْمُغِیرَة) پێش موسوڵمانبوون سێزدە کەسی کوشتن‌و ماڵی ئەو سێزدە کەسانەی لەگەڵ خۆیا هێنا (مَدِینَة)و موسوڵمان بوو، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئیسلامبوونەکەت قبوڵ دەکەین، بەڵام ماڵی ئەوانت لێقبوڵ ناکەین، جا ناچار (عُرْوَة) خوێنی کوژراوەکانی بۆ دابوو. جا پێغەمبەرﷺ ئەو قسەیەی بە (بُدَیْل)ی ڕاگەیاندبوو، هەمان قسەشی لەگەڵ (عُرْوَة) دووبارە کردەوەو فەرمووی: بۆ جەنگ نەهاتوم، بۆ (عُمْرَة) هاتوم.

جا لە ماوەی گفتوگۆیەکەشدا (عُرْوَة) بیری لە (صَحابَة)کان دەکردەوەو تەماشای دەکردن: پێغەمبەرﷺ هەر تفێکی فڕێدابایە، (صَحابَة)کانرضي الله عنهم دەستیان لە بەر ڕادەگرت‌و بیستەو ڕووەکانی خۆیان بە تفەکەی پێغەمبەرﷺ چەور دەکرد، هەم کە پێغەمبەرﷺ دەستنوێژی دەگرت، بۆ ئاوی دەستنوێژەکەی پێشبڕکێیان

دەكردو خۆیان پێ تەڕ دەكرد، هەر داوە مووەكی لێكەوتبا، هەڵیاندەگرتەوە، لە بەر گەورەیی و ڕێزلێنان بە تەواوی تەماشایان نەدەكردو دەنگیان نزم دەكرد.

جا كە (عُرْوَة) گەڕاوە لای كافرەكانی (قُرَیْش)، پێی گوتن: ئەی گەلی مـن، وَاللهِ مـن چوومە لای پاشایەكان: وەك (قَیصَر)ی ڕۆم و (كِسرا)ی فارس و (النجاشي)، وَاللهِ هیچ پاشایەكم نەدیتووە ئەوەندە ڕێزی لێبندرێ: وەك (صَحابَة)كانی (مُحَمَّد)ﷺ ئەوەندە ڕێز لە (مُحَمَّد)ﷺ دەنێن. وَاللهِ هیچ كاتێك ئەوان پشتی (مُحَمَّد) بەرنادەن و تەسلیمی هیچ شتێكی ناكەن، (مُحَمَّد)یش ﷺ داواكاریەكی باشی هەیە لێی قبوڵ بكەن، من ئامۆژگاریتان دەكەم: دەترسم ئێوە سەركەوتوو نەبن، ئیتر ئێوەش بڕیاری خۆتان بدەن. جا (عُرْوَة) ئەم قسانەی كردن و یەكسەر گەڕاوە بۆ (طائِف).

﴿(بَیْعَـةُ الرِّضْوان)= پەیمانی ژێر درەختەكە﴾

ئینجا پێغەمبەرﷺ داوای لە ئیمام (عُمر)ﷺ كرد بڕواتە (مَكّة)و گفتوگۆ لەگەڵ كافرەكانی (قُرَیْش) بكا. بەڵام ئیمام (عُمر)ﷺ فەرمووی: یا رَسُولَ الله من زۆر دوژمنایەتی و توندوتیژیم لەگەڵ (قُرَیْش) بە كار هێناوەو هێچ خزمم لە (مَكّة)دا نیە بمپارێزن، بۆیە دەترسم، كەوابوو: (عُثمان بن عفان) بنێرە، چونكە خزمەكانی دەیپارێزن. جا پێغەمبەرﷺ ئیمام (عُثمان)یﷺ ناردە (مَكّة)و فەرمووی: پێیان بڵێ: من بۆ جەنگ نەهاتوم، بۆ (عُمْرَة) هاتوم، هەم سەردانی موسوڵمانەكانی ناو (مَكّة)ش بكەو پێیان بڵێ: سەركەوتنی ئیسلام و ڕزگاركردنی (مَكّة) نزیك بووە.

جا ئیمام (عُثمان)و دە (صَحابَة)ی تریشﷺ بە ئیزنی پێغەمبەرﷺ چونە (مَكّة)و نامەكەی پێغەمبەریﷺ گەیاندە گەورەكانی(قُرَیْش)، جا (قُرَیْش) پێیان گوت: ئەگەر بۆ خۆت (طواف)ی (بَیْت) دەكەی ڕێگەت دەدەین؟ ئیمام (عُثمان)یشﷺ فەرمووی: تا پێغەمبەرﷺ (طواف) نەكا، من (طواف) ناكەم، ئەگەر ساڵێكیش لە ژێر ئیحرامدا بمێنمەوە. جا كافرەكانی (مَكّة) ماوەی سێ ڕۆژان ئیمام (عُثمان)یان لە (مَكّة)دا هێشتەوە، جا هەواڵەكە وەها بڵاو بۆوە: كە ئیمام (عُثمان)و دە (صَحابَة)كانﷺ كوژراون، بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لا نَبْرَحُ حَتَّى نُناجِزَ الْقَوْمَ﴾ لێرە لاناچین تا جەنگ لەگەڵ گەلی (قُرَیْش) دەكەین.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە ئیمام (عُمر)ﷺ كرد: (صَحابَة)كانی بانگ كردن بۆ (بَیْعَة)=پەیمان دانە پێغەمبەرﷺ: لە سەر هەڵنەهاتن و جەنگكردن تا شەهیدبوون، یان سەركەوتن، جا ژمارەی (صَحابَة)كانی (الْحُدَیْبیَة): هەزارو چوار سەد (صَحابَة) بون، هەموویان بێ دواكەوتن لە بن درەختێك پەیمانیان دا پێغەمبەرﷺ، تەنها (جدّ بن

قَیس) نەبێ، خۆی لە بن هەنگڵی وشترەکەیدا شاردبۆوەو پەیمانی نەدا پێغەمبەرﷺ! چونکە (منافق) بوو، جا پێغەمبەرﷺ لەجیاتی ئیمام (عُثمان)ﷺ دەستە ڕاستەی خۆی لە ناو دەستە چەپەیخۆی داناو فەرمووی: ﴿هَذِهِ لِعُثْمانَ﴾ ئەم پەیمانبەستنەش لەجیاتی (عُثْمان)ﷺ. ئینجا لە دوای پەیمانبەستنەکە ئاشکرا بوو: هەواڵێ کوشتنی ئیمام (عثمان)ﷺ ڕاست نیەو درۆیە.

## ﴿(صُلْحُ الْحُدَيْبِيَة)= پێکهاتنەکەی (اَلْحُدَيْبِيَة)﴾

لە ماوەیڕابردوودا، کافرەکانی(قُرَیش) پەنجا چەکداریان ناردبووە دەرەوەی سەربازگەی (صَحابَة)کان، تاکو لە شەویدا لە ناکاو زیانێك لە موسوڵمانان بدەن، جا پاسەوانەکانی سەربازگە هەموویانی گرتن، تەنها سەرکردەکەیان قورتار بوو، جا کە ئەم پەنجا کەسەیان لێگیرا، ئەم جارەش کافرەکان کۆمەڵە چەکدارێکیتریان نارد (صَحابَة)کانیان تیرباران کردنو (صَحابَة)یەکیان شەهید کرد-ناوی (ابن زنَیم) بووﷺ- جا (صَحابَة)کان دوانزە کەسیتریشیان لەوان گرتن، جا کە هەواڵی ئەو گیراوەانەو هەواڵی پەیمانبەستنەکە گەیشتە کافرەکانی(قُرَیش)، ترس کەوتە دڵیان، ناچار وەفدێکیان بە سەرکردایەتی (سُهَیل بن عَمْرو)ی ناردە لای پێغەمبەرﷺ، تاکو پێکهاتنێکی لەگەڵ مۆر بکا، جا (سُهَیل) گوتی: ئەی (مُحَمَّد) گرتنی (عُثمان)و ئەو جەنگەی ڕوویداوە هیچی بە بڕیاری پیاوماقوڵانمان نەبوە، کەوابوو: دیلەکانی جاری یەکەمو دووەم ئازاد بکە.

جا لە فەرموودەکەی ئیمام (ابن کثیر) وا دەردەکەوێ: کە پێغەمبەرﷺ لێیبوردنو بە خۆڕایی ئازادی کردن، بەڵام لە (رِوایَة)ی (السیرةالحلبیة)دا: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پێشدا ئێوە (عُثمان)و دە (صَحابَة)کانیتر بنێرنەوە لامان، ئینجا ئێمەش دیلەکانی ئێوە دەنێرینەوە. ئینجا کە ئیمام (عُثمان)و دە (صَحابَة)کانﷺ گەڕانەوە لای پێغەمبەرﷺ، (سُهَیل) مەرجەکانی (قُرَیش)ی-بۆ پێکهاتن- بە پێغەمبەرﷺ ڕاگەیاندنو پێغەمبەرﷺ بە مەرجەکان ڕازی بوو و پێك هاتن: تا ماوەی دە ساڵان جەنگ لە نێوانیاندا ڕابگیرێ.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە ئیمام (عَلي)ﷺ کرد: پێکهاتنەکە بنوسێو فەرمووی: بنوسە (بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ). جا (سُهَیل) گوتی: من (الرَّحمن الرَّحیم) ناناسم، بەڵام بنوسە (بِسْمِكَ اللَّهُمَّ). جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بنوسە (بِسْمِكَ اللَّهُمَّ)، ئەمە پێکهاتنی (مُحَمَّد)ی پێغەمبەریخوایەﷺ لەگەڵ (سُهَیل). جا (سُهَیْل). گوتی: ئەگەر باوەڕم هەبوایە تۆ پێغەمبەریخوای جەنگم لەگەڵ نەدەکردیو لە (عُمْرَة) قەدەغەم نەدەکردی، با بنوسێ (مُحَمَّد)ی کوڕی (عبدالله). جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی

(عَلي) وشەی (رَسُولُ الله) بسڕەوە. ئیمام (علی)شﷺ فەرمووی: وَاللهِ هیچ کاتێك ناوی تۆ ناسڕمەوە. جا پێغەمبەرﷺ بە دەستیخۆی (رَسُولُ الله)ی سڕیەوە، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بنوسە: (مُحَمَّد بن عبدالله)و (سُهَیْل بن عَمْرو) پێك هاتن:

١-ماوەی دە ساڵان جەنگ لە نێوان هەردوو لادا بوەستێندرێ.

٢-هەر کافرێکی (قُرَیْش) موسوڵمان ببێ و بێئیزنی سەرپەرشتکارەکەی بێتە لای (مُحَمَّد)ﷺ، دەبی بیگەڕێنێتەوە، بەڵام ئەگەر موسوڵمانێك بڕواتە ناو کافرەکان نەیگەڕێننەوە!.

٣-هەرکەسێك پێی خۆش بێ: با پەیمان لەگەڵ (قُرَیْش) ببەستێ، هەر کەسێکیش پێی خۆش بێ: با پەیمان لەگەڵ (مُحَمَّد)ﷺ ببەستێ.

جا (خُزاعَة) لەگەڵ پێغەمبەرﷺ پەیمانیان بەست، چونکە پێشداش هاوپەیمانی (عَبْدُ المُطَّلِب)ی باپیری پێغەمبەرﷺ بون، (بَنوبَکْر)ش لەگەڵ (قُرَیْش) پەیمانیان بەست.

٤-ئەم ساڵ (مُحَمَّد)و (صَحابَة)کانی بگەڕێنەوەو ساڵیداهاتوو بۆ (عُمْرَة) بێنەوە (مَکَّة)و جگە لە شمشێری ناو کێلان هیچ چەکێکیتریان لەگەڵ نەبێ و تەنها سێ ڕۆژانیش لە (مَکَّة)دا بمێننەوە.

جا پێکهاتنەکە بەم مەرجانە نوسراوەو پێغەمبەرﷺ هەندێك موسوڵمانو هەندێك کافری کردنە شاهید لە سەر پێکهاتنەکە، فەرمانیشی بە حەزرەتی(مُحَمَّد بن مَسْلَمة)ﷺ کرد: وێنەیەکی پێکهاتنەکەشی بۆ (سُهَیْل) نوسی.

جا بە هۆی ئەم مەرجانە موسوڵمانان زۆر نارەزاییان دەربڕیو دەیانگوت: (سُبْحانَ الله) چۆن موسوڵمان بگەڕێندرێتەوە لای کافرەکان؟!. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿مَنْ ذَهَبَ مِنّا إلَیْهِمْ فَأَبْعَدَهُ اللهُ، وَمَنْ جاءَنا مِنْهُمْ إلَیْنا فَسَیَجْعَلُ اللهُ لَهُ فَرَجاً وَمَخْرَجاً﴾ هەر کەسێك لە ئێمە بڕواتە ناو کافرەکان خوا دوری بخاتەوە، هەر کەسێکیش لەوان بێتنە لای ئێمەو بیگەڕێنینەوە، خوایگەورە دەرچوونو دڵخۆشیی دەداتێ.

جا ئیمام (عمر)ﷺ لە هەموو (صَحابَة)کان نارازیتر بوو، خۆی بۆ نەگیراو هاتە خزمەت پێغەمبەروﷺ فەرمووی: ئەدی تۆ بەراستی پێغەمبەری خوا نیی؟ ئەدی ئێمە لە سەر ڕێگەی ڕاست نینو ئەوان لە سەر ناڕاستی نین؟ ئەدی کوژراوەکانی ئێمە لە بەهەشتدا نینو کوژراوی ئەوان لە دۆزەخدا نین؟ پێغەمبەرﷺ هەموو جارێك دەیفەرموو: بەڵێ وایە. جا ئیمام (عُمر)ﷺ فەرمووی: ئەدی بۆچی ئەم سوکایەتیە لە ئایینی خۆماندا قبوڵ بکەین؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إنِّي رَسُولُ الله وَلَسْتُ أَعْصِیهِ وَهُوَ ناصِرِی﴾ من پێغەمبەریخوامە، لە فەرمانیخوا دەرناچم خوا یارمەتیدەریمنە.

جا ئیمام (عمر)ﷺ فەرمووی: ئەدی تۆ نەتفەرموو: دێینە ماڵیخواو (طواف)ی

دەكەین؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خۆ نەمگوت ئەم ساڵ؟ ساڵێكیتر دێیە (مَكَّة)و (طَواف)ی (بَیْت) دەكەی.

ئیتر ئیمام (عمر)ﷺ خۆی بۆ نەگیراو چووە لای ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ، بەڵام لە لای ئەویش هیچی بە هیچ نەكردو ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ پێی گوت: ئەی پیاو، ئەو پێغەمبەریخوایەو لە فەرمانی خوایخۆی دەرناچێو خوا یارمەتیدەریەتی. ئینجا كە بۆ (مَدِینَة) گەڕانەوە، لە (كُراع الغَمِیم) سورِەتی (الفَتح) هاتە خوارەوو پێغەمبەرﷺ بۆ ئیمام (عمر)ی خوێندەوەو دڵی خۆش بوو.

جا سەیر ئەوە بوو: یەكێك لە (صَحابَة)كان لە (مَكَّة)دا بەند كرابوو، ناوی (أبُوجَندَل)ی كوڕی ئەم (سُهَیل)ە بوو، جا بە فێڵێك خۆی قورتار كردو بە زنجیركراوی لە كاتی نوسینی پێكهاتنەكە، هاتە ناو لەشكری موسوڵمانان.

جا كە (سُهَیل) دیتی، یەكسەر بەربووە سەریو بە لقی درەختێك لێیدا و گوتی: ئەی (مُحَمَّد) ئەم كوڕەی من بگەڕێنەوە، ئەگەر نا: پێكهاتنەكە ناڕوێنم. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بە منی ببەخشە؟ (سُهَیل) گوتی: بە تۆی نابەخشم. جا (مِكْرَز)و (حُوَیطِب) گوتیان: باشە لە بەر خاتری تۆ سزای نادەین. جا (سُهَیل) هەڵساو (أبُوجَندَل)ش هاواری دەكرد: هۆ موسوڵمانەكان چۆن بگەڕێندرێمەوە ناو كافرەكان، ئێوە نازانن چەند ئازار دراوم؟ جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی (أَبُوجَنْدَل) ئێمە پێكهاتنەكەمان براندۆتەوەو پەیمانمان داوە: فێڵی تێدا نەكەین، تۆش خۆت ڕابگرە، خوایگەورە بۆ تۆو هاوڕێكانت خۆشیو دەرچوون لە نەخۆشی دەنێرێ.

جا دیسان ئیمام (عمر)ﷺ خۆی بۆ نەگیراو هاتە تەنیشت حەزرەتی(أبُوجَندَل)وﷺ پێی گوت: ئەی (أبُوجَندَل) خۆت ڕابگرە، ئەوانە كافرن، خوێنی ئەم كافرانە وەك خوێنی سەگە، وَاللهِ ئەگەر من گەیشتبامە باوكیخۆم دەمكوشت، جا ئیمام (عمر)ﷺ شمشێرەكەشی لە حەزرەتی(أبُوجَندَل) نزیك دەكردەوە تاكو لێیوەربگرێو باوكیخۆی بكوژێ، بەڵام حەزرەتی(أبُوجَندَل)ﷺ فەرمووی: بۆچی تۆ نایكوژی؟ ئیمام (عمر)ﷺ فەرمووی: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی كردووین. جا حەزرەتی(أبُوجَندَل)ﷺ فەرمووی: تۆ لە من باشتر گوێڕایەڵی پێغەمبەرﷺ نی. ئیتر حەزرەتی(أبُوجَندَل)ﷺ لەگەڵ باوكیدا گەڕاندراوە (مَكَّة).

ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە (صَحابَة)كان كرد: ئیحرامەكەیان بشكێنن، واتە: سەریان بتاشنو ئاژەڵ سەر ببڕن. بەڵام (صَحابَة)كان ئیحرامەكەیان نەشكاند بە هۆی خەفەتباری پێكهاتنەكەو گەڕانەوەیان بە بێ (عُمرَة)، جا پێغەمبەرﷺ چووە لای

حـەزرەتی(أمُّ سَـلَمَة)ی دایکـی ئیمانـدارانو فـەرمووی: ئـەم خەڵکـە فـەرمانم بـەجێ ناهێننو ئیحرام ناشکێنن!. جا حەزرەتی(أمُّ سَلَمَة)رضي الله عنها فەرمووی: هەڵسە بـەخۆت وشـترەکەت سـەر بـبڕەو سەریـشت بتاشـە. جـا پێغەمبـەرﷺ وشـترەکەی سـەر بـڕیو فەرمووی: (بِسْمِ اللهِ اَللهُ أَكْبَـر). ئینجا بانگی سەرتاشی کردو سەریخۆی تاشـی، جا کـە (صَحابَة)کان دیتیان پێغەمبەرﷺ ئیحرامیخۆی شکاند، هیچ ئومێدێکیان نەماو ناچار هەڵسانو ئاژەڵی خۆیان سەربڕیو سەریخۆیان تاشیو ئیحرامیخۆیان شکاند، بەڵام بە هۆی خەفەتباری نزیك بوو خۆبەخۆ جەنگ بکەن.

جا پێغەمبەرﷺ حەفتا وشتری بە (هَدْي) هێنابوو، لەو حەفتایە بیـست وشـتری ناردنـە (مَكَّـة)، لـەوێ سـەربڕانو گۆشـتەکەیان بـە سـەر هـەژارەکانی (مَكَّـة)دا بـەش کـرا، ئەوانیتریـشی هەرلـە (الْحُدَيْبِيَـة)دا سـەر بـڕینو لـەوێ گۆشـتەکەی بـەش کـرد، ئینجا گەڕاوە بۆ (مَدِينَة)، واتە: ماوەی نۆزدە ڕۆژان لە (الْحُدَيْبِيَة)دا مایەوە.

ئینجا کە گەیشتەوە (مَدِينَة) ئافرەتێکی ناو (أمُّ كُلثوم) موسوڵمان بوو و هاتە (مَدِينَة)، بەڵام پێغەمبـەرﷺ نەیگەڕانـدەوە (مَكَّة)، هـەروەها حـەزرەتی(أبُوبَصِير)ش‌رضي الله عنه هاتـە (مَدِينَة)، بەڵام پێغەمبەرﷺ ئەوی گەڕاندەوە، هەروەك لە (گوڵبژێرەكەدا) ڕوونكراوەتەوە.

جـا هـەر لـەم سـاڵەی شەشـەمدا حـەج لـە سـەر موسـوڵمانان واجـب کـرا، هـەم ژنـە موسوڵمانەکانیش لە پیاوە کافرەکـان حـەرام کـران. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٥٢٥–٥٣٨و٥٤١) و(فتح الباري) ب(٥) ل(٤٠٣–٤٣٢) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(١٢–٤١).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکـەم: پێکهاتنەکـەی (الْحُدَيْبِيَـة) کلیلـی ڕزگـارکردنی (مَكَّـة)یـە، پێغەمبـەرﷺ لـە خەونـدا دیتـی خـۆیو (صَـحابَة)کـانی ئیحرامیـان بەسـتو چونە (مَكَّة)ی پـیرۆزو (عُمْـرَة)یـان کـرد... ئینجـا پێکهاتنەکـەی (اَلْحُدَيْبِيَـة) مـۆر کـراو خوایگـەورە سوڕەتی(الْفَتْح)ی ناردە خوارەوە.**

خوایگـەورە دەفـەرموێ: ﴿لَقَدْ صَدَقَ اللهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَـسْجِدَالْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُؤُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِنْ دُونِ ذَلِكَ فَتْحاً قَرِيباً﴾الفتح: ٢٧، **بێگومان خوایگەورە خەونەکەی پێغەمبەریخۆیﷺ بە ڕاست داناوە، چونکە خـەونی پێغەمبـەران-عليهم الصلاة والسلام- (وَحْـي)ی خودایە، ئێـوە-ئـەی پێغەمبـەرو (صَـحابَة)کـان-سـاڵێکیتر دەچـنە نـاو (اَلْمَـسْجِدُالْحَرَام)و بـە دڵنیـایی (طَـواف) دەکەنو سەری خۆتـان دەتاشـنو بە مەقەس مووەکانی دەبڕنو لە هـیچ کـافرێکیش ناترسـێن، خوایگـەورە بەرژەوەندیـەکی وەهـای لـە پێکهاتنەکـەی (الْحُدَيْبِيَة)دا زانیوە: کە ئێوە نەتانزانیوە لە مەودوا چی دەبێ، جا خوایگەورە**

پێش هاتنەجێی خەونەکەی پێغەمبەرﷺ، سەرکەوتنێکی نزیکی بۆ ئێوە ئەنجام دا کە پێکهاتنەکەی (الْحُدَيْبِيَة)یە، گەورەترین سەرکەوتنی ئیسلامە تا ئێستا.

﴿عَنِ الْبَراءِ رضي الله عنه: تَعُدُّونَ أَنْتُمُ الْفَتْحَ فَتْحَ مَكَّةَ...وَنَحْنُ نَعُدُّ الْفَتْحَ بَيْعَةَ الرِّضْوانِ يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ﴾ رواه البخـاري، ئێـوە وا تێدەگـەن: مەبەسـت بـە (فَتْحاًمُبِينـاً)ی سـورەتی(الْفَـتْح) ڕزگـارکردنی (مَكَّـة)یـە، بـەڵام ئێمـەی (صَـحابَة)ی پێغەمبـەرﷺ وا دادەنـێین: کـە مەبەست سەرکەوتنەکەی (بَيْعَةُالرِّضْوان)ە، کە بووە هۆی پێکهاتنەکەی (اَلْحُدَيْبِيَة).

واتە: پێکهاتنەکەی(الْحُدَيْبِيَة)ش بووە سەرەتایەك بۆ ڕزگارکردنی (مَكَّة)ی پیرۆز.

ئیمـام (ابـن إسـحاق) فەرموویـەتی: (فَتْحاًقَرِيبـاً)ی ئایەتەکـەیڕابردوو، پێکهاتنەکـەی (الْحُدَيْبِيَـة)یـە. ئیمـامی(الزُّهْـري) فەرموویـەتی: پـێش پێکهاتنەکـەی(الْحُدَيْبِيَـة) هـیچ سەرکەوتنێکی گەورەتر لەم سەرکەوتنە نەبوە، چونکە بـە هـۆی ئـەم جـەنگ وەسـتاندنە موسوڵمانو کافرەکان لە یەکتری ئەمین بـونو تێکـەڵی یـەکتری بـونو گفتوگۆیـان لەگـەڵ یەکتری دەکرد، جا هـەر کەسـێك بـەم گفتوگۆیـە لـە ئیـسلام تێگەیـشتبا، ئـەوە دەبـووە موسوڵمان، بێگومان لە ماوەی تـەنها ئـەم دوو سـاڵەی جـەنگ وەسـتاندا بـە قـەد-نـۆزدە ساڵەکەی-ڕابردوو کافرەکان موسوڵمان بون، بەڵکو زیاتریش.

بەڵگەی فەرموودەکەی ئیمامی(الزُّهْري) ئەمەیە: لە پێکهاتنەکەی (الْحُدَيْبِيَة)دا پێغەمبەرﷺ هەزارو چوار سەد (صَحابَة)ی لەگەڵدا بون، بەڵام لە دوای دوو ساڵ بۆ ڕزگارکردنی (مَكَّـة)، دە هەزار (صَحابَة)ی لەگەڵدا بون، کەواتە: پێکهاتنەکەی(الْحُدَيْبِيَة) بووە کلیلی ڕزگارکردنی (مَكَّة). (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٥٣٢) و(فتح البارى) ب(٥) ل(٤٢٦)، ب(٧) ل(٥٤٩-٥٥١).

شێخ (مُحَمَّد)ی خاڵ لەم بارەیەوە فەرموویەتی:

ئەی پێغەمبەری شیرین کردوە * (كَعْبَة)ت لە ژەنگی بت پاك کردەوە
خوا مژدەی دایێ بە کەیفو مەڕام * (لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَالْحَرامَ)
(إِنّا فَتَحْنا) کە سورەی (فَتْح)ە * سەراپا هیوای سەربەرزیو مەدحە
ئەو ڕۆژە شێوەی بلندیت نواند * کە (مَكَّة)ت گرتو (قُرَيْش)ت شکاند
لە (مَكَّة)دا بوی بێ باوكو بێ کەس * بۆ (مَكَّة)و (كَعْبَة) بوی بە فەریادڕەس
(مَكَّة)ت لە دەستی بەدکار سەندەوە * بەوە ئاییـنی خـۆت هەڵسەندەوە

**دووەم: پێکهاتنی (اَلْحُدَيْبِيَة) دانهێنانی کافرەکانە بە هەبوونی هێزی ئیسلامو بە مافی موسوڵمانان لە (حَرَمِ مَكَّة)دا**، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿وَالَّذى نَفْسِى بِيَدِهِ: لا يَسْأَلُونِى خُطَّةً يُعَظِّمُونَ فِيها حُرُماتِ اللهِ إلاَّ أَعْطَيْتُهُمْ إيّاهَا﴾ سوێندم بەو خوایەی گیانی منی بە دەستە: (قُرَيْش) داوای هەر کارێکم لێبکەن کە ڕێزلێنانی قەدەغەکراوەکانی خوای تێدا بێ، من دەیاندەمێ.

شتێکیئاشکرایە: (بَيْتُ الله)=(حَرَم)ی(مَكّة) ڕێزداریەکی تایبەتیی هەبوو، تا لە ناو عەرەبە کافرەکانیش، بەڵکو (قُرَيْش) لە سەر حیسابی ڕێزداریی (كَعْبَة) دەژیان، جا هەموو مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو: ڕێزی ماڵیخوا نەشکێندرێو جەنگ ڕوو نەداو بە بێ جەنگ بڕواتە ناو (مَكّة)و (طَواف)ی ماڵیخوا بکا، بۆیێ پێغەمبەر ﷺ ماوەی نۆزدە ڕۆژان لە (الْحُدَيْبِيَة)دا مایەوەو گفتوگۆو هاتوچۆی نوێنەرەکان لە نێوان هەردوو لا هەر بەردەوام بوو، بەڵکو لە (صحيح مسلم)دا لە (سَلَمَة)ی گێڕاوەتەوە: ﴿ڕۆژێك لە حاڵەتی گفتوگۆی **پێکهاتنەکە لە (اَلْحُدَيْبِيَة)، موسوڵمانەکان حەفتا هەشتا کافریان بە دیل گرتنو پێغەمبەر ﷺ بێ بەرامبەر ئازادی کردن﴾.**

جگە لە مەش: پێغەمبەر ﷺ لە سەر داواکاری کافرەکانی (قُرَيْش) ڕازی بوو، هەر چەند (صَحابَة)کانیش ﷺ ناڕازی بون، چونکە بەرژەوەندیی پێکهاتنەکەو ئەنجامە باشەکانی پێکهاتنەکە لە سەرەوەی بیرو بۆچوونی هەموو (صَحابَة)کان بوو ﷺ، تەماشا بکە خوای گەورە لەبارەی پێکهاتنەکە دەفەرموێ: ﴿فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا﴾ الفتح: ٢٧، **خوایگەورە بەرژەوەندیەکی وەهای لە پێکهاتنەکەی (الْحُدَيْبِيَة)دا زانیوە کە ئێوە نەتانزانیوە.**

ئیمامی(النواوي) فەرموویەتی: بەرژەوەندیەکە بە ڕەهەمو سودەکانی پێکهاتنەکە بون کە لەمەودوا ئاشکرا بونو ئەنجامەکەی ڕزگارکردنی(مَكّة)و موسوڵمانبوونی کافرەکانی(مَكّة) بوو. جا ئیمام (ابن حجر العسقلاني) فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامی ئیمام (عُمر)دا فەرمووی: ﴿إِنِّي رَسُولُ اللهِ وَلَسْتُ أَعْصِيهِ﴾ رواه البخاري، **من پێغەمبەریخوامەو لە فەرمانی خوا دەرناچم.** بەڵگەیە: کە پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکی لەم پێکهاتنە نەکردوە تەنها بە (وَحْي)ی خودا نەبێ.

جا لە بەر ئەوەی ئەم (وَحْي)یە بۆ (صَحابَة)کان ﷺ ئاشکرا نەکرابوو، بۆیێ ناڕەزاییان دەربڕیو ئیمام (علي)ش ﷺ سوێندی خوارد: وشەی (رَسُولُ الله) نەسڕێتەوەو (صَحابَة)کان ﷺ دەنگیان بەرز کردەوەو گوتیان: (سُبْحانَ الله)! چۆن موسوڵمان بگەڕێندرێتەوە لای کافرەکان!. لە هەموانیشیان ناڕازیتر ئیمام (عُمر) بوو ﷺ، ئەوەندە ڕقی هەڵساو خەفەتبار بوو: ئەگەر دەسەڵاتی هەبوایە پێکهاتنەکەی تێك دەدا، بەڵام ئیمام (أَبوبَكْر) ﷺ ئامۆژگاریی کردو نەختێك هاتەوە سەرخۆ، جا ئەم ناڕەزاییە بە هۆی گومان نەبو، بەڵکو بە هۆی ئەوە بوو: ئەنجامی پێکهاتنەکە دیار نەبو، بۆیێ کە سورەتی (الْفَتْح) هاتە خوارەوە، ئیمام (عُمر)و (صَحابَة)کانیتریش ﷺ دڵخۆش بون.

جا ئیمام(عمر) ﷺ فەرموویەتی: لە ترسی ئەو قسانەی لە (الْحُدَيْبِيَة) بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ کردنم، بەردەوام خێرو نوێژو ڕۆژوو دەکەمو چەند کۆیلەشم ئازاد کردون.

(شرح صحيح مسلم) ب(٧) ل(٤٢٠-٤٢٣و٤٦٢و٤٧٤) و(فتح الباري) ب(٥) ل(٤٢٤و٤٢٥).

**سێیەم:** پێغەمبەرﷺ لە وەڵامی نارەزایی (صَحابَة)کاندا فەرمووی: ﴿**هەر کەسێك لە ئێمە بڕواتە ناو کافرەکان خوا دوری بخاتەوە، هەر کەسێکیش لەوان بێتە لای ئێمە، خوایگەورە لە تەنگانە ڕزگاری دەکاو دڵخۆشیی دەداتێ**﴾.

ماشاءالله! زانستی پەنهانیی‌خوا (صَحابَة)کانﷺ نەیاندەزانی، خوایگەورەش پێغەمبەری خۆیﷺ ئاگادار کردبۆوە: ئەنجامی ئەم خاڵەی پێکهاتنەکە بە چی دەگا؟ ئەوە بوو: کە پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(أبُوجَنْدَل)یرضي الله عنه گەڕاندەوە، فەرمووی: ﴿يا أَبـا جَنْـدَل اِصْـبرْ وَاحْتَسِبْ فَإِنّا لا نَغْدِرُ وَإِنَّ اللهَ جاعِلٌ لَكَ وَلِمَنْ مَعَكَ فَرَجـاً ومَخْرَجـاً﴾ **ئەی (أَبُوجَنْدَل) خۆت ڕابگرە، ئێمە فێڵ لەو پێکهاتنەدا ناکەین، خوایگەورە بۆ تۆو هاوڕێکانت خۆشی و دەرچوون لە نەخۆشی دەنێرێ.**

جا کە پێغەمبەرﷺ گەڕاوە (مَدِينَة)، (صَحابَة)یەك –کە ناوی حەزرەتی(أبُوبَصِير) بوورضي الله عنه– لە بەندیخانەی (مَكَّة) خۆی ڕزگار کردو هاتە (مَدِينَة)، جا کافرەکانی (مَكَّة) دوو کەسیان بە دوادا ناردن تاکو بیگەڕێننەوە (مَكَّة)، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **ئەی (أَبُوبَصِير) تۆ دەزانی ئێمە پێکهاتنەکەمان لەگەڵ ئەوان بڕاندۆتەوەو ئێمەش فێڵ ناکەین، چونکە لە ئایینی ئێمەدا فێڵبازی ناگونجێ، کەوابوو: لەگەڵ ئەم دووانەدا بگەڕێوە (مَكَّة).**

جا حەزرەتی(أبُوبَصِير)رضي الله عنه گوتی: يا رَسُولَ الله چۆن دەمگەڕێنیەوە! خۆ ئەوان ئازارم دەدەن و هەوڵ دەدەن بمکەنەوە کافر. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **خۆت ڕابگرە، خوایگەورە لە تەنگانە ڕزگارت دەکا.**

جا کە موسوڵمانەکان دیتیان ئەم دوو کافرانە حەزرەتی(أبُوبَصِير) دەگەڕێننەوە (مَكَّة)، گوتیان: ئەی (أبُوبَصِير) پیاو هەیە لە هەزار پیاو چاکترە! بەڵکو ئیمام (عمر)رضي الله عنه ڕاستەوخۆ پێی گوت: تۆ پیاویو ئەویش پیاوە شمشێریشت پێیە!.

جا حەزرەتی(أبُوبَصِير) لەگەڵیان ڕۆشت تا گەیشتنە (ذِيالْحُلَيْفَة)، لەوێ دابەزینو حەزرەتی(أبُوبَصِير)رضي الله عنه دوو ڕەکعەت نوێژی کردو خواردنێکیان خوارد، جا حەزرەتی (أبُوبَصِير)رضي الله عنه بە یەکێکیانی گوت: ئەرێ شمشێرەکەت تیژە؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، فەرموو تەماشای بکە. جا حەزرەتی(أبُوبَصِير)رضي الله عنه شمشێرەکەی لێوەرگرتو لێیدا و کوشتی، جا هاوڕێکەیتریشی بەرەو (مَدِينَة) هەڵاتو بە غاردان هاتەوە مزگەوتی پێغەمبەرﷺ، بەرد لە بن پێیەکانی دەردەپەڕینو حەزرەتی(أبُوبَصِير)شرضي الله عنه بە دوایدا غاری دەدا، جا پیاوەکە گوتیە پێغەمبەرﷺ: بمپارێزە، وَالله هاوڕێکەمی کوشت، منیش دەکوژێ!. جا حەزرەتی(أبُوبَصِير)رضي الله عنه گوتی: يا رَسُولَ الله، خوایگەورە پەیمانەکەی تۆی گەیاندە جێو ئەوەی من کردم لە سەر تۆ نازمێردرێ–واتە: چونکە بێ فەرمانی تۆ لە دەرەوەی (مَدِينَة) ئەم کارەم کردوە– جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿وَيْلَ أُمِّهِ مِسْعَرُ حَرْبٍ

لَوْ كانَ لَهُ أَحَدٌ﴾ ماڵویٚرانی بۆ دایكی، ئەمە هەڵگیرسیٚنەری جەنگە ئەگەر كەسیٚك هەبێ یارمەتی‌ی بدا. واتە: ئەمەش ئاماژەیەكە: تاكو لە (مَدِینَة) بڕواتە دەرەوە، ئەگەر نا: جاریٚكی‌تریش هەر تەسلیمی كافرەكانی دەكاتەوە.

ئینجا حەزرەتی(أَبُوبَصِیر)ﷺ لە (مَدِینَة) ڕۆیشتە دەرەوە بۆ كەناری دەریای سوٚر لە سەر ڕیٚگەی بازرگانیی (قُرَیْش) بۆ وڵاتی(شام)، ئینجا حەزرەتی(أَبُوجَنْدَل)ش لەگەڵ حەفتا موسوڵمانی‌تری بەندكراو، لە (مَكّة) ڕایانكردو خوٚیان گەیاندە حەزرەتی(أَبُوبَصِیر)ﷺ، هەر بەم جوٚرە هەر كەسیٚك دەبووە موسوڵمان، خوٚی دەگەیاندە حەزرەتی(أَبُوبَصِیر)و نەدەهاتە (مَدِینَة)، تا ژمارەیان بووە سیٚ‌سەد كەس، جا ڕیٚگەی بازرگانیەكەیان گرت‌و هەر كاروانیٚكیان دەست كەوتبا دەیانگرت‌و كاروانچیەكانیشیان دەكوشتن، ناچار (قُرَیْش) وەفدیٚكیان ناردە خزمەت پیٚغەمبەرﷺ: بۆ خاتری خوا بنیٚرە با ئەوانە بیٚنەوە (مَدِینَة)، وا ئیٚمە ئەو خاڵە لە پیٚكهاتنەكە لادەبەین، هەر كەسیٚك موسوڵمان دەبێ با لە لای توٚ بێ، ئیٚمە گلەیی ناكەین.

جا پیٚغەمبەرﷺ نامەیەكی بۆ حەزرەتی(أَبُوبَصِیر) نارد: تاكو خوٚی‌و هاوڕیٚكانی بگەڕیٚنەوە (مَدِینَة)، جا كە نامەكەیان گەیشتێ، لەو كات حەزرەتی(أَبُوبَصِیر)ﷺ لە حاڵەتی مردندا بوو، نامەكەی پیٚغەمبەریﷺ هەر لە دەستدا بوو و گیانی دەرچووﷺ، جا حەزرەتی (أَبُوجَنْدَل)ﷺ لەوێ ناشتی‌و مزگەوتیٚكیشی لە نزیك گوٚڕەكەی دروست كردو خوٚی‌و هاوڕیٚكانیشیﷺ گەڕانەوە (مَدِینَة).

جا توخودا ئەم ڕووداوە چەند بەڵگەیەكی بەهیٚزە لە سەر پیٚغەمبەرایەتی پیٚغەمبەرﷺ! خوای‌گەورە چوٚن ئەوانەی لە تەنگانە ڕزگار كردن؟ جا بوٚ (صَحابَة)كانﷺ ئاشكرا بوو: گوێڕایەڵی پیٚغەمبەرﷺ چاكتر بوو لەو بوٚچوونەی ئەوان دەریاندەبڕی، بوٚیێ ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ فەرموویەتی: (لە ئیسلامدا هیچ سەركەوتنیٚكی گەورەتر لە پیٚكهاتنەكەی (الْحُدَیْبِیَة) پیٚشتر نەبوە، بەلاٚم خەڵكەكە كورتبین بون‌و پەلەیان دەكردو نەیاندەزانی لە نیٚوان خواو پیٚغەمبەرداﷺ چ نهیٚنی‌یەك هەیە، خوای گەورەش بە قسەی هیچ بەندەیەك پەلە ناكا تا كارەكان دەگەنە مەبەستی‌خوٚی، من بەخوٚم (سُهَیْل)م دیت لە (حَجَّةالْوَداع)دا مووەكانی سەری پیٚغەمبەریﷺ لە سەر چاوی خوٚی دادەنان، هەر (سُهَیْل)ش بوو ڕازی نەبو لە پیٚكهاتنەكەدا (الرَّحْمَنُ الرَّحِیم)و (رَسُولُ الله) بنوسرێ). (فتح الباري) ب(٥) ل(٤٢٧–٤٣٠) و(السیرة الحلبیة) ب(٣) ل(٣٩–٤١).

**چوارەم: نابێ ئافرەتی موسوڵمان بگەڕیٚندریٚتەوە ناو كافرەكان.** لە پیٚكهاتنەكەدا نوسرابوو: هەر كەسیٚك لە لایەن كافرەكانەوە بیٚتە (مَدِینَة)، دەبی بگەڕیٚندریٚتەوە بۆ (مَكّة). جا هەر پیاویٚك هاتبا، پیٚغەمبەرﷺ دەیگەڕاندەوە، بەلاٚم لەبارەی ئافرەتانی موسوڵمان خوای‌گەورە ئەم خاڵەی (نَسْخ) كردەوەو حەرامی كرد ئافرەتی موسوڵمان

بگەڕێندرێتەوە ناو کافرەکانو فەرمووی: ﴿فَلا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾الممتحنة: ١٠، **ئافرەتانی موسوڵمان مەگەڕێننەوە بۆ لای کافرەکان، نە ئەوان بۆ کافرەکان حەڵاڵن، نە کافرەکانیش بۆ ئەوان حەڵاڵن.**

جا بۆیێ کە (أُمُّ كَلْثُوم)رضي‌الله عنها هاتە (مَدِينَة)، پێغەمبەرﷺ نەیگەڕاندەوە بۆ (مَكَّة)، ئینجا لە هەمان ئایەتدا خوایگەورە فەرمووی: ﴿وَلا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ﴾ **دەست بە ژنە کافرەکانتانەوە مەگرن.** بەم ئایەتەش ئافرەتی کافر لە پیاوی موسڵمان حەڕام کراو (صَحابَة)کانرضي‌الله‌عنهم ژنە کافرەکانیان تەڵاق دان، بەڵکو ئیمام(عمر)رضي‌الله‌عنه دوو ژنی کافری هەبونو هەردووکی تەڵاق دان.

**جا ئەم بڕیارەی خوایگەورە چەسپاو هەرگیز نابێ ئافرەتی کافر-کە (أَهْلُ الْكِتاب)ی ڕەسەن نەبێ- لە پیاوی موسوڵمان مارە بکرێو نابێ ئافرەتی موسوڵمانیش لە پیاوی کافر مارە بکرێ، هەرچەند کافرەکەش (أَهْلُ الْكِتاب) بێ.**

جا ئەگەر ژنو مێردێك موسوڵمان بون، بەڵام لە دوای مارەبڕینو جیماعکردن: ژنەکە، یان مێردەکە کافر بوو، ئەوە تا (عِدَّة)ی ژنەکە تەواو دەبێ، چاوەڕوان دەکرێ: ئەگەر کافربووەکە موسوڵمان بۆوە، ئەوە ژنو مێردایەتییان بەردەوام دەبێ، ئەگەر (عِدَّة)ش تەواو بوو و موسوڵمانیش نەبۆوە، ئەوە لە یەکتری حەڕام دەبنو ژنو مێردایەتییان نامێنێ، پێچەوانەکەشی هەمان بڕیاری هەیە، واتە: ئەگەر ژنو مێردێکی کافر لە دوای مارەبڕینو جیماعکردن: ژنەکە، یان مێردەکە موسوڵمان بوو، ئەوە تا (عِدَّة)ی ژنەکە تەواو دەبێ، چاوەڕوان دەکرێ: ئەگەر هاوسەرەکەشی موسوڵمان بوو، ئەوە ژنو مێردایەتییان بەردەوام دەبێ، ئەگەر نا ژنو مێردایەتییان نامێنێ.

بەڵام ئەگەر موسوڵمانبوون، یان کافربوونی ژن، یان مێرد، پێش جیماعکردن بوو، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا یەکسەر مارەبڕینەکە هەڵدەوەشێتەوەو ژنو مێردایەتییان نامێنێ.

(تفسيرالقرطبي) الممتحنة:(١٠) و(فتح الباري) ب(٩) ل(٥١٦-٥٢٥).

**پێنجەم: ئافرەتو پیاو لە ڕاوێژ پێکردندا یەکسانن، بەڵام بڕیاری خواو پێغەمبەرﷺ (إجْماع)ی زانایان لە سەروەی ڕای هەموو کەسێکە.** خوایگەورە فەرمانی بە ڕاوێژکردن کردوە، بۆیێ کە پێغەمبەرﷺ زانی (خالِد بن الْوَلِيد) لەگەڵ دوو سەد ئەسپسوار هاتونەتە ڕێگە گرتن، ڕاوێژی بە (صَحابَة)کان کردو ئیمام (أَبُوبَكْر)رضي‌الله‌عنه فەرمووی: بەرەو ماڵیخوا بڕۆ، هەر کەسێك ڕێگەی لێگرتین جەنگی لەگەڵ دەکەین.

جا لە سەرەتادا پێغەمبەرﷺ بە قسەی ئیمام (أَبُوبَكْر)ی کردو بەرەو (مَكَّة) کەوتە ڕێ، بەڵام کە وشترەکەی ئیخ بوو و نەڕۆیشت، زانی خوایگەورە ڕێگەی جەنگکردنی ناداتێ، بۆیێ لە ڕایەکەی ئیمام (أَبُوبَكْر) پەشیمان بۆوەو هەموو مەرجەکانی کافرەکانی قبوڵ

کردن بۆ پێکهاتنەکە، جا چونکە پێکهاتنەکە بە فەرمانیخوا بوو، پێغەمبەرﷺ پرسی بە هیچ (صَحابَة)یەك نەکرد، بەڵکو هەر گوێشی نەدا ناڕەزایی(صَحابَة)کانﷺ.

هەروەها لەبارەی ئیحرام شکاندن کە بە (أُمُّ سَلَمَة)ی هاوسەریخۆی گوت: خەڵکەکە بە قسەم ناکەن و ئیحرام ناشکێنن. حەزرەتی(أُمُّ سَلَمَة)رضیالله عنها وا لێحاڵی بوو: کە (صَحابَة)کان وا تێگەیشتون: پێغەمبەرﷺ بەخۆی لە ئیحرامدا دەمێنێتەوەو بۆ ئاسنکاریش ئیحرام بەوان دەشکێنێ، بۆیێ گوتی: یا رَسُولَ الله گلەیی لە موسوڵمانان مەکە! چونکە ئەوان بەو پێکهاتنە زۆر خەفەتبار بوینە، هەڵسە بەخۆت ئیحرامی خۆت بشکێنەو شترەکەت سەر ببڕەو سەرت بتاشە. واتە: تاکو (صَحابَة)کان ئەو تێگەیشتنەیان نەمێنێ.

جا پێغەمبەرﷺ قسەکەی حەزرەتی(أُمُّ سَلَمَة)ی پێ ڕاست بوو، بۆیێ ئیحرامیخۆی شکاند، ئەوانیش بە خەفەتبارییەوە –ناچار– ئیحرامیخۆیان شکاند، جا ئەمەش بەڵگەی ڕاوێژکردنە بە ئافرەتی ژیرو ڕێزدار، چونکە لەم غەزایەدا پێغەمبەرﷺ بێ جیاوازی ڕاوێژی بە ئافرەتو بە پیاو کردوە، واتە: ئەمەش لە خۆیدا ڕێزلێنانێکی ئافرەتەو ئافرەتیش لە هەندێك کاردا مافی ڕاوێژپێکردنی هەیە، بە تایبەتیش لە کاروباری خێزانیدا، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿آمِرُوا النِّساءَ فِي بَناتِهِنَّ﴾ حديث حسن رواه أبوداود، **ڕاوێژ بە ئافرەتان بکەن لە بەشودانی کیژەکانیاندا**. (فتح الباري) ب(٥) ل(٤٢٦) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٣٥٢).

جا بۆ ناسینی حەزرەتی(أُمُّ سَلَمَة)ش بگەڕێوە باسی( **پێغەمبەرﷺ ( أُمُّ سَلَمَة )ی مارە کرد** ) لەم کتێبەدا.

**شەشەم: پێغەمبەروﷺ ( صَحابَة )کانﷺ ئیحرامیان شکاند**، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ البقرة: ١٩٦، **ئەگەر قەدەغە کران لە تەواوکردنی حەج، یان عومرە، ئەو ئاژەڵەی بۆتان ئاسانە سەری ببڕن.**

کەوابوو: هەر کەسێك لە دوای ئیحرامبەستن قەدەغە کرا لە تەواوکردنی حەج، یان عومرە، با خۆی حەڵاڵ بکا–واتە: ئیحرام بشکێنێ– بەم جۆرە: مەڕێك، یان بزنێك بە نیەتی ئیحرام شکاندن سەر ببڕیو لەگەڵ سەربڕینەکەش نیەتی ئیحرام شکاندن بێنێ، ئینجا لە دوای سەربڕینەکەش بە نیەتی ئیحرام شکاندن سەریخۆی بتاشێ، جا ئەگەر لەو شوێنە ئاژەڵی دەست نەکەوت، ئەوە بە فەرموودەیەکی ئیمام (الشافعي): لەجیاتی سەربڕینی ئاژەڵەکە دە ڕۆژان بەڕۆژوو دەبێ –سێ ڕۆژ بە جیا، حەفتیش بە جیا–وەك خوێنی (التَّمَتُّع)– کەوابوو: هەر لەو شوێنەی لێی قەدەغە کراوە، بە نیەتی ئیحرام شکاندن سەریخۆی دەتاشێو هەر بە نیەتی ئیحرام شکاندن دەست بە ڕۆژووەکان دەکا.

جا بۆیێ ئەم فەرموودەیەم هەڵبژارد، چونکە زۆر بە سودە بۆ ئەو کەسانەی لە دوای ئیحرامبەستن لە فرۆکەخانە، یان لە خاڵی سنوورەکان دەیگەڕێننەوەو ڕێگەی نادەنێ بڕواتە (مَكَّة)و ئاژەڵیشی دەست ناکەوێ.

**جا بزانە**: ئەگەر ئەو جۆرە کەسە– پێشتر–حەجو عومرەی لە سەر واجب

نەبوبێ، ئەوە قەزاکردنەوەی لە سەر واجب نابێ، چونکە هەزارو چوار سەد (صَحابَة) لەگەڵ پێغەمبەرﷺ لە (الْحُدَيْبِيَة) ئیحرامیان شکاندو لە ساڵیداهاتووش تەنها حەفتسەد کەسیان بۆ (عُمْرَة) چونەوە (مَكَّة)، بەڵام ئەگەر پێشتر حەج‌و عومرەی لە سەر واجب بوبن، ئەو کاتە واجبە قەزایان بکاتەوە. (شرح جلال الدين المحلي على المنهاج مع القليوبي وعميرة) ب(٢) ل(١٤٨–١٥٠) لە بەرگی دووەمی (ڕووناکی ربّ العالمین)دا درێژترم ڕوون کردۆتەوە.

**حەفتەم: بەرەکەت وەرگرتن لە ئاسەواری پێغەمبەرﷺ، ڕاوەستانی (الْمُغِيرَة)رضي الله عنه بە شمشێرەوە لە سەر سەری پێغەمبەرﷺ**، بەڵگەیە: دروستە پاسەوان بە پێوە ڕابوەستێ‌و کاربەدەستەکەش دانیشتوو بێ، چونکە ئەوها چاکتر دەپارێزرێ‌و ڕێزیشی زیاترە، جا باسی هەڵسان لە بەر یەکتری لە غەزای (خَيْبَر)دا ڕوون دەکەینەوە، ان شاء الله تعالى.

**(عُرْوَة) تەماشای (صَحابَة)کانی دەکرد: بە تفی پێغەمبەرﷺ ڕووی‌خۆیان چەور دەکەن...هتد**، ئەوەش بەڵگەیە: کە (صَحابَة)کن بە بێ‌سنور پێغەمبەریانﷺ خۆش ویستووەو ڕێزیان لێناوە، هەم بەڵگەیە: کە بەرەکەت وەرگرتن بە ئاسەواری پێغەمبەرﷺ سوننەتە، جا هەرچەند ئەمڕۆ ئاسەواری پێغەمبەرﷺ–وەك ئاو و موو و جل‌و بەرگی پێغەمبەرﷺ– لە ناو ئێمەدا نەماوە، بەڵام (تَوَسُّل)=پاڕانەوە لە خوا بە خاتری پێغەمبەرﷺ هەر ماوەو بەردەوامیشە، چونکە بە وەفاتکردنی پێغەمبەرﷺ پێغەمبەرایەتیەکەی نابڕێ‌و هەر بەردەوامەو بە زیندوویی‌و بە مردوویی پێغەمبەرﷺ هەر (رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ)و هەر گەورەی پێغەمبەرانیشە عليهم الصلاة والسلام.

جا لێرەدا خەڵکانێك گومڕا بوینەو لە خۆشویستنی پێغەمبەرﷺ بێبەش بوینەو دەڵێن: پێغەمبەرﷺ لە دوای مردنی هیچ کاری‌گەر نیەو پاڕانەوەش لە خوا بە خاتری پێغەمبەرﷺ سودی نیە!. ئەوانە خوا کوێری کردون لە دونیاو قیامەت، ئایا نازانن پێغەمبەرﷺ لە گۆڕەکەی‌دا زیندووەو ئاگایشی لە ئوممەتی‌خۆی هەیەو دەفەرموێ: ﴿حَياتِي خَيْرٌ لَكُمْ تُحَدِّثُونَ وَيُحَدَّثُ لَكُمْ، وَمَماتِي خَيرٌ لَكُمْ تُعْرَضُ عَلَيَّ أَعْمَالُكُمْ: فَما رَأَيْتُ مِنْ خَيْرٍ حَمِدْتُ اللهَ–تَعالى– وَما رَأَيْتُ مِنْ شَرٍّ اِسْتَغْفَرْتُ لَكُمْ﴾ رواه البزار ورجاله رجال الصحيح، **ژیانی من بۆ ئێوە باشە، چونکە گفتوگۆم لەگەڵ دەکەن‌و گفتوگۆشتان لەگەڵ دەکرێ، مردنیشم بۆ ئێوە باشە چونکە کردەوەکانتان دەهێندرێتە بەرچاوم: ئەگەر دیتم کردەوەکانتان چاکە، ئەوە سوپاسی خوا دەکەم، ئەگەر دیتم کردەوەکەتان خراپە، ئەوە داوای لێخۆشبوونتان بۆ لە خوا دەکەم.**

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿الأَنْبِياءُ أَحْياءٌ فِي قُبُورِهِم يُصَلُّونَ﴾ حديث صحيح رواه أبويعلي، **پێغەمبەران**–عليهم الصلاة والسلام–**زیندوونە لە گۆڕەکانیاندا نوێژ دەکەن، واتە: (تَسْبِيحات)و زیکری‌خوا دەکەن.** بڕوانە (فيض القدير) ب(٣) ل(٢٣٩و٥٣٢) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٣٥٤). هەم لە نۆیەم گوڵبژێرەکەی کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ چەند حەدیسێکی‌ترم هێناون بیانخوێنەوە.

**هەشتەم: پێکهاتنی (اَلْهُدْنَة)=جەنگ وەستاندن لە نێوان موسوڵمانان و کافرەکاندا،**

پێکهاتنەکەی (اَلْحُدَیْبِیَة) بەڵگەیە: دروستە پێکهاتنی (الْهُدْنَة)=جەنگ وەستاندن لە نێوان موسوڵمانان و کافرەکاندا مۆر بکرێ، بەو مەرجەی ماوەی جەنگ وەستاندنەکە دیاری بکرێ و لە دە ساڵیش زیاتر نەبێ، جا ئەگەر پێویست بوو، ئەو کاتە دروستە لە دوای دە ساڵەکە پێکهاتنەکە نوێ بکرێتەوە، هەم بەو مەرجەش پیاوی موسوڵمان نەگەڕێندرێتەوە ناو کافرەکان، تەنها ئەگەر خزمی هەبن و بەرگریی لێبکەن و بیپارێزن، ئەو کاتە دروستە بگەڕێندرێتەوە، بەڵام گەڕاندنەوەی ئافرەتی موسوڵمان بە هیچ جۆرێك دروست نیە.

جا هەر کاتێك موسوڵمانێك گەڕاندراوە، ئەوە لە بەرپرسیاریەتی ئێمەی موسوڵمان دەردەچێ و بۆی دروستە کافرەکانی پەیمان لەگەڵکراو بکوژێ و هەم بۆ ئێمەش دروستە: بە پێچ و پەنا پێی بڵێین: بیانکوژێ، هەروەك ئیمام (عمر)و (صَحابَة)کانﷺ بە پێچ و پەنا وایان بە حەزرەتی(أَبُوبَصِیر)و حەزرەتی(أَبُوجَنْدَل) گوت، بەڵکو فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ کە فەرمووی: **(هەڵگیرسێنەری جەنگە، ئەگەر کەسێك هەبێ یارمەتیی بدا)**. هاندانێك بوو بۆ حەزرەتی(أَبُوبَصِیر)، تا وای لێهات لە ئەنجامدا بە هۆی (حَرْب الْعَصَابَات) جەنگی کۆمەڵ کۆمەڵ وەهایان بە سەر کافرەکانی (قُرَیْش)دا هێنا: کە دەوڵەتی ئیسلام نەیتوانی– لە بەر پێکهاتنەکە– ئەو شکستە بە سەر کافرەکاندا بێنی، کەوابوو: جاری وا هەیە جەنگی کۆمەڵ کۆمەڵ زۆر بە سودترە لە جەنگی بەرەیی رووبەڕوو. بڕوانە (تحفة المحتاج لشرح المنهاج ب(٩) ل(٣٠٥–٣١١) و(سيرة الصلابي) ب(٢) ل(٣٩١و٤٠١).

*ئیتر بزانە: مست لە درێشە دەگەڕێتەوە، کوتەك دەزانێ قۆناغ لەکوێیە، (أبو تمام)ش دەڵێ:* **(اَلسَّيْفُ أَصْدَقُ إِنْباءً مِنَ الْكُتُبِ * فِی حَدِّهِ الْحَدُّ بَيْنَ الْجِدِّ وَاللَّعِبِ)**

شمشێر لە ڕاگەیاندنی هەواڵەوە ڕاستترە لە نوسراوەکان * لە تیژایی شمشێردا سنور هەیە لە نێوان ڕاستی و گاڵتەدا.

**نۆیەم: گەوریی و ڕێزداریی پەیمانبەستەکانی ژێر درەختەکەی (الْحُدَیْبِیَة)ﷺ**

خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ﴾الفتح: ١٨، **وَاللهِ بێگومان خوایگەورە لەو ئیماندارانە ڕازی بوو کە لە ژێر درەختەکەی (الْحُدَیْبِیَة) پەیمانیان دا تۆ، واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ.**

جا ئەی موسوڵمانیڕێزدار کەسێك خوا لێی ڕازی بوبێ، بێگومان بەختەوەرە، چونکە خوا لە ڕازیبوونەکەی پەشیمان نابێتەوە، هەروەها ﴿عَنْ جابِرٍﷺ: قالَ لَنا رَسُولُ اللهِﷺ يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ: أَنْتُمْ خَيْرُ أَهْلِ الأَرْضِ وَكُنّا أَلْفاً وَأَرْبَعَمِأَةٍ﴾ رواه الشيخان، **لە غەزای (الْحُدَیْبِیَة)دا پێغەمبەرﷺ بە ئێمەی فەرموو: ئێوە چاکترینی دانیشتووی سەر زەمینن. ژمارەمان هەزار و چوار سەد (صَحابَة) بوو.**

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ يَدْخُلُ النَّارَ–إِنْ شاءَ اللهُ– مِنْ أَصْحابِ الشَّجَرَةِ

أَحَدٌ: الَّذِينَ بايَعُوا تَحْتَها﴾ رواه مسلم، **هیچ کەسێك لە (صَحابَة)ی درەختەکە ناچێتە ئاگری دۆزەخ: ئەوانەی لە ژێر درختەکە پەیمانیان داومێ.**

هەم پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ یَدْخُلُ النَّارَ مَنْ شَهِدَ بَدْراً وَالْحُدَیْبِیَةَ﴾ رواه مسلم، **هەر (صَحابَة)یەك ئامادەی غەزای (بَدْر)و (الْحُدَیْبِیَة) بوبێ، ناچێتە ئاگری دۆزەخ.**

**جا بزانە:** (شیعَة)کانی (رافضِي)، تانە لە ئیمام (عُثمان)ﷺ ئەدەن‌و دەڵێن: (عُثمان) لە پەیمانبەستنەکەدا ئامادە نەبوە. بەڵام گوتەکەیان پوچەڵە؟ چونکە ئیمام(عُثمان)ﷺ بە فەرمانی پێغەمبەرﷺ چوبووە (مَکّة)، هەر بە هۆی دەستگیرکردنی ئەویش پەیمانەکەی ژێر درەختەکە بەسترا، هەم پێغەمبەرﷺ دەستێکیخۆی لەجیاتی ئیمام (عُثمان)ﷺ لە ناو دەستەکەیتری داناو فەرمووی: **ئەمەش لەجیاتی پەیمانبەستنی (عُثمان).**

*جا بەو گومڕابووانە دەڵێین: لە بەر چی بانێکەو دوو هەوایە؟ خۆ ئیمام (أَبوبَکْر)و ئیمام (عُمر)و (صَحابَة)کانیتریشﷺ لە پەیمانبەستنەکەدا ئامادە بون، ئەدی ئەوان تاوانیان چییە؟ بۆچی ڕقتان لێیانەو بە ستەمکاریان دادەنێن؟.*

**ئینجا بزانە:** ئەم پەیمانە پێی دەگوترێ: (بَیْعَةَالرِّضْوان)=پەیمانی لێڕازیبوون، چونکە لە ئایەتەکەیڕابردوودا فەرمووی: **خوایگەورە لە هەمووانیان ڕازی بووە.** هەروەك لە (تحفة المرید)دا فەرموویەتی. هەم درەختەکەش پێ دەگوترێ: (شَجَرَةَالرِّضْوان)، چونکە لە بن درەختەکە (صَحابَة)کان پەیمانیان دا پێغەمبەرﷺ، هەروەك لە (نور الیقین)دا فەرموویەتی.

جا ئەوانە مەبەستی وتارخوێنەکانی (جُمُعَة)ن کە دەڵێن: (**وَعَنِ الَّذینَ بایَعُوا النَّبِيَّﷺ تَحْتَ الشَّجَرَة**) خودایە ڕازی بە لەو هەزارو چوار سەد (صَحابَة)یەی لە بن درەختەکە پەیمانیان دا پێغەمبەرﷺ.

**جا ئەوەش بزانە:** ئیمام (ابن سَعْد، بسند صحیح) فەرموویەتی: بە ئیمام (عُمر)ﷺ گوترا: کۆمەڵ خەڵکێك دەچنە لای درەختەکە نوێژ دەکەن!. ئەویش هەڕەشەی لێکردن‌و فەرمانی دا: درەختەکەیان بڕی. جا ئەوە وا دەگەێنێ: تا سەردەمی (خِلافَة)ی ئیمام (عُمر)ﷺ درەختەکە مابێ، بەڵام لە (البخاري)و (مسلم)دا هاتووە: ساڵیداهاتوو (صَحابَة)کان شوێنی درەختەکەیان لێ ون بوو و نەیاندۆزیەوە.

جا هەر لایەك بێ، ئیمامی(النواوي) فەرموویەتی: زانایان فەرموویانە: هۆی ونبوونی درەختەکە ئەوە بوو: خەڵك بە هۆیەوە توشی بێشەرعی نەبێ، لە بەر ئەوەی ڕازیبوونی خواو چاکە لە بن ئەو درەختەدا هاتۆتە خوارەوە، جا ئەگەر درەختەکە بمابا، ترسی ئەوەی لێدەکرا: نەزانەکان بە گەورەی دابنێن‌و بیپەرستن، بۆیێ حەزرەتی(ابن عمر) رضی‌الله عنهما فەرموویەتی: **ونبوونی درەختەکە ڕەحمەتێك بوو لە لایەن خواوە.** (شرح صحیح مسلم) ب(٨) ل(٥٩)، ب(٩) ل(٣٩١) و(فتح الباري) ب(٦) ل(١٤٢)، ب(٧) ل(٧٦و٥٤٨-٥٥٢).

**دەیەم: (مُعْجِزَة)کانی (الْحُدَیْبِیَة):**

*–ئەوەمان باس کرد: کە بیری (الْحُدَیْبِیَة) ئاوی تێدا نەماو پێغەمبەرﷺ تیرێکی لە تیردانەکەیخۆی دەرهێناو تیرەکەیان چەقاندە ناو بیرەکەو بیرەکە پڕ ئاو بۆوە.

*–هەم: پێغەمبەرﷺ لە سەر لێوی بیرێکی (الْحُدَیْبِیَة) دانیشتو هەندێك ئاوی لە دەمی خۆی وەرداو دوعای کردو ڕژاندیە ناو بیرکەو بیرەکە پڕ ئاو بۆوە. ئەم دووانە لە (صحيح البخاري) لە (اَلشُّرُوط)و (اَلْحُدَیْبِیَة)دا گێردراونەوە.

*–**هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجەکانی پێغەمبەرﷺ**، ئەمەش هەر لەم غەزایەدا –پێش دوو (مُعْجِزَة)کەیڕابردوو– لە کاتی نوێژی عەسرێدا ڕوویدا ﴿عن جابرﷺ: عَطِشَ النَّاسُ يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ، وَالنَّبِيُّﷺ بَيْنَ يَدَيْهِ رِكْوَةٌ فَتَوَضَّأَ مِنْها، فَجَهِشَ النَّاسُ نَحْوَهُ وَقالُوا: لَيْسَ عِنْدَنا ماءٌ نَتَوَضَّأُ وَلاَ نَشْرَبُ إلاّ مَا فِي رِكْوَتِكَ؟ فَوَضَعَﷺ يَدَهُ فِي الرِّكْوَةِ، فَجَعَلَ الْماءُ يَفُورُ مِــنْ بَيْنِ أَصابِعِهِﷺ كَأَمْثالِ الْعُيُونِ فَشَرِبْنا وَتَوَضَّأْنا...كُنّا خَمْسَ عَشْرَةَ مِأَةً﴾ رواه البخاري في علامات النُّبُوَّة والْحُدَيْبِيَة، ورواه مسلم في المعجزات، ورواه أحمد والترمذي والطبراني، **لە غەزای (الْحُدَیْبِیَة)دا (صَحابَة)کان تێنوو بون، پێغەمبەریشﷺ قاپە ئاوێکی لە بەردەستدا بوو دەستنوێژی لێدەگرت، جا خەڵکەکەش ڕوویان کردە پێغەمبەرﷺ گوتیان: هیچ ئاو لە لامان نیە دەستنوێژی پێ بگرینو بیخۆینەوە، تەنها ئاوی ناو ئەم قاپەی تۆ نەبێ؟ جا پێغەمبەرﷺ دەستە پیرۆزەکەی خۆی لە ناو قاپەکە داناو یەکسەر ئاو لە نێوان پەنجەکانی بە فوڕکە دەهاتە دەرەوە، بە وێنەی ئاوی سەرچاوەکان!، جا ئێمەش ئاوەکەمان خواردەوەو دەستنوێژیشمان پێگرت...ژمارەمان پانزە سەد بوو، واتە: هەزارو پێنج سەد کەس.**

**ئاگاداری:** لەم (روایة)دا فەرموویەتی: ژمارەمان هەزارو پێنجسەد کەس بوو. لە زۆربەی (روایة)کانیشدا فەرموویەتی: ژمارەمان هەزارو چوار سەد بوو. (روایة)یتریش هەنە، مەبەست ئەوەیە: ئەو جەنگاوەرانەی پەیمانیان دا پێغەمبەرﷺ ژمارەیان هەزارو چوار سەد (صَحابَة) بوو، مەبەستیش بە ژمارە زیادەکان: کۆیلەو ئافرەتو منداڵن: کە لە گەڵ (صَحابَة)کاندا بونو بۆ (عُمْرَة) هاتبون، والله اعلم.

(الحافظ العسقلاني) لە ئیمامی(القرطبي) گێڕاویەتیەوە: هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجەکانی پێغەمبەرﷺ، چەند جارێك لە چەند شوێنێك دووبارە بۆتەوەو گومانی تێدا نیە...–جگە لە پێغەمبەری ئێمەﷺ–نەبیستراوە هیچ پێغەمبەرێکیتر ئەم (مُعْجِزَة)ی هەبوبێ.

ئیمامی(الْمُزَنِي) فەرموویەتی: هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجەکانی پێغەمبەرﷺ زۆر کاریگەرترو سەیرترە لە هەڵقوڵانی ئاو لەو بەردەی حەزرەتی(موسی) پێغەمبەرﷺ بە دارعەسایەکەی لێیدا و لە دوانزە شوێن ئاوی لێهەڵقوڵا، چونکە دەرچوونی ئاو لە بەرد خەڵك دیتویەتیو دەبینی، بەڵام دەرچوونی ئاو لە نێوان گۆشتو خوێن هیچ کەسێك نەیدیتبوو.

ئیتر (مُعْجِزَة)ی‌تریش له (الْحُدَیْبِیَة) هه‌نه، له به‌ر درێژی نه‌منوسین. *هه‌ر ئه‌وه‌نده ماوه: به دایکمو باوکمه‌وه به قوربانت بم یا رَسُولَ اللهﷺ به‌نده‌ی خوداموو ئوممه‌تی تۆم، ئه‌گه‌ر شه‌فاعه‌تم بۆ نه‌كه‌ی ماڵم وێرانه.* (شرح صحیح مسلم) ب(٩) ل(١٢٩-١٣١) و(فتح الباري) ب(٥) ل(٤١٣)، ب(٦) ل(٧١٠-٧١٦)، ب(٧) ل(٥٤٩-٥٥١).

**یازده‌هه‌م: له ساڵی شه‌شه‌می كۆچیدا حه‌ج واجب كرا،** به (إجماع)ی ئوممه‌تی‌ئیسلام: حه‌ج واجبه‌و ڕوكنی پێنجه‌می ئیسلامه، هه‌ر كه‌سێك باوه‌ڕی به واجببونی حه‌ج نه‌بێ، كافر ده‌بێ، خوای‌گه‌وره ده‌فه‌رموێ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾ آل عمران: ٩٧، **خوای‌گه‌وره واجبێكی له سه‌ر خه‌ڵك هه‌یه كه حه‌ج كردنی (بَیْت)ی خوایه له (مَكَّة) له سه‌ر ئه‌و كه‌سه واجبه: كه توانای ڕێگه‌ی حه‌جی هه‌بێ، هه‌ر كه‌سێك خۆی كافر بكاو حه‌ج به واجب دانه‌نێ، ئه‌وه خوای‌گه‌وره ده‌وڵه‌مه‌نده‌و پێویستی به‌و خه‌ڵكه نیه.**

كه‌واته: ئایه‌ته‌كه هه‌ڕه‌شه‌یه له‌و كه‌سانه‌ی توانای حه‌ج كردنیان هه‌یه‌و حه‌ج ناكه‌ن، هه‌روه‌ك ئیمامی(القرطبي) له ته‌فسیری ئایه‌ته‌كه‌دا فه‌رموویه‌تی.

جا بزانه: به فه‌رمووده‌ی به‌هێزتری ئیمامی(الشافعي)و به مه‌زهه‌بی ئیمام (أحمد): (عُمْرَة)ش واجبه، به‌ڵام به مه‌زهه‌بی ئیمامی(الحنفي)و ئیمام (مالك): (عُمْرَة) واجب نیه، به‌ڵكو سونه‌ته. جا له درێژایی ته‌مه‌ندا ته‌نها یه‌ك (حَج)و یه‌ك (عُمْرَة) واجبن‌و زیاتر سوننه‌تن، واجبیه‌كه‌شیان به په‌له نیه، به‌ڵكو دروسته دوا بخرێن به‌و مه‌رجه له دڵدا نیه‌تی كردنیانی هه‌بێ، چونكه پێغه‌مبه‌رﷺ تا ساڵی ده‌یه‌می كۆچی حه‌جی نه‌كرد، به‌ڵام هه‌ر كه‌سێك توانای حه‌جی هه‌بوبێ‌و به قه‌سدی نه‌یكردبێ‌و مردبێ، ئه‌وه به فاسقی ده‌مرێ. (فتح الباري) ب(٣) ل(٤٧٦و٧٥٣) و(تحفه المحتاج لشرح المنهاج) ب(٤) ل(٣-٥).

***    ***    ***

## ﴿ غه‌زای ( خَیْبَر ) له ڕۆژئاوای باكوری ( مَدِینَة ) ﴾

**كه پێغه‌مبه‌رﷺ له (الحُدَیبِیَة) گه‌ڕاوه‌-له ڕێگه‌دا- له نێوان (مَكَّة)و (مَدِینَة) سوره‌تی (الفَتح)ی بۆ هاته خواره‌وه‌و خوای‌گه‌وره وه‌عده‌ی سه‌ركه‌وتن‌و ده‌ستكه‌وتووی (خَیْبَر)ی دایێ‌و فه‌رمووی:** ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحاً قَرِيباً * وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا وَكَانَ اللهُ عَزِيزاً حَكِيماً﴾ الفتح: ١٨و١٩، **وَاللهِ بێگومان خوای‌گه‌وره له‌و ئیماندارنه ڕازی بوو: كه له ژێر درخته‌كه‌ی (الْحُدَیْبِیَة) په‌یمانیان دا تۆ-ئه‌ی پێغه‌مبه‌رﷺ- جا خوای‌گه‌وره زانی ئه‌و ئێماندارانه چه‌ند ڕاستی‌و وه‌فادارییان له دڵدایه، بۆیێ خوای‌گه‌وره دڵفراوانی‌و دڵخۆشی بۆ سه‌ر ئه‌وان نارده خواره‌وه‌و له پاداشتی په‌یماندانه‌كه‌ش**

سەركەوتنێكی نزیكی دانی–لە (خَیْبَر)–، هەم دەستكەوتێكی زۆریشی دانیٚ–لە (خَیْبَر)– كە بۆ خۆیان وەریدەگرن، خوایگەورە هەر لە (أَزَل)دا زاڵ‌و كارلەجێیە.

جا بزانە: پێشتر جولەكەكانی (خَیبَر) بە ئاشكرایی دوژمنایەتی ئیسلامیان نەدەكرد، بەلاٚم كە جولەكەكانی (بَنِیالنَّضِیر) لە (مَدِینَة) دەركران‌و گەورەكانیان چونە (خَیبَر)، ئەوانیش وەكو ئەوان كەوتنە پیلان‌و ئاژاوە نانەوە لە دژی ئیسلام، كافرەكانیان هان دەدان لە دژی ئیسلام، هەم میوەجاتی (خَیبَر)ش بۆ ئەو دوژمنایەتییە بە كار دەهێندرا، –هەروەك لە غەزای (خَنْدَق)دا رابرا– بۆیێ كە پێغەمبەرﷺ لە (الْحُدَیْبِیَة) گەڕاوە (مَدِینَة)، لە بیستی (مُحَرَّم)ی ساڵی حەفتەمی كۆچی بۆ غەزای (خَیبَر) ڕۆیشت‌و حەزرەتی(سِباع بن عُرْفُطَة)یرضي الله عنه كردە جێنیشیخۆی لە (مَدِینَة).

جا پێغەمبەرﷺ بۆ غەزای (خَیبَر) هەزارو پێنج سەد (صَحابَة)ی لەگەڵ خۆیا برد، هەزارو چوار سەدیان (صَحابَة)كانی پەیمانی (الْحُدَیْبِیَة) بون، ئەوانیتریش وەگەڵیان كەوتن، بەلاٚم پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەو مەرجەی هیچ دەستكەوتوێكی ئەو غەزایەتان نەدرێتیٚ؟ چونكە دەستكەوتووی (خَیبَر) خوایگەورە بە تایبەتی دابویە (صَحابَة)كانی پەیمانی (الْحُدَیْبِیَة)رضي الله عنهم، بۆیێ كە ئەوانەی لە (الْحُدَیْبِیَة) دواكەوتبون، گوتیان: ئێمەش لەگەڵتان دێینە غەزای (خَیبَر)، خوایگەورە فەرمووی: ﴿قُلْ لَنْ تَتَّبِعُونَا كَذَلِكُمْ قَالَ اللهُ مِنْ قَبْلُ﴾ الفتح: ١٥، ئەی پێغەمبەرﷺ بەو دواكەوتووانە بڵیٚ: نابیٚ ئێوە لەگەڵ ئێمە بێنە (خَیْبَر)، خوا پێشتر ئەوها بڕیاری داوە: دەستكەوتووی (خَیْبَر) بۆ پەیماندەرەكانی(الْحُدَیْبِیَة)یە.(تفسیر القرطبي) و(ابن كثیر الفتح: ١٥.

جا پێغەمبەرﷺ بە شەویٚ بۆ (خَیبَر) دەرۆشت‌و لە ڕێگەدا لە بەرزایی‌و دۆڵەكاندا (صَحابَة)كانرضي الله عنهم بە دەنگی بەرز دەیانگوت: (اَللهُ أَكْبَر)–(لاَإِلَه إلاَّالله). جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿أَيُّها النّاسُ اِرْبَعُوا عَلَى أَنْفُسكُمْ، فَإِنَّكُمْ لا تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غائِباً إِنَّكُمْ تَدْعُونَ سَمِيعاً بَصِيراً...ثُمَّ قالَﷺ: لاَحَوْلَ وَلاقُوَّةَ إلاَّ بِاللهِ، كَنْزٌ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ﴾ رواه الشیخان، ئەی خەڵكینە لەگەڵ گیانیخۆتان لە سەرخۆ بن، ئەوەندە دەنگ بەرز مەكەنەوە، چونكە ئێوە هاوار ناكەنە كەڕو نادیارێك، ئێوە زیكری خودایەكی بیسەرو بینەر دەكەن...
ئینجا فەرمووی: گوتنی (لاَحَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاّ بِاللهِ)، گەنجینەیەكی بەهەشتە.

ئینجا كە لە (خَیبَر) نزیك بونەوەو لێیان وەدەر كەوت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بوەستن. ئینجا ئەم دوعایەی كرد: ﴿اَللَّهُمَّ رَبَّ السَّماواتِ السَّبْعِ وَما أَظْلَلْنَ وَرَبَّ الْأَرَضِينَ السَّبْعِ وَما أَقْلَلْنَ، وَرَبِّ الشَّياطِينِ وَمَا أَضْلَلْنَ، وَرَبَّ الرِّيَاحِ وَما أَذْرَيْنَ، فَإِنّا نَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذِهِ الْقَرْيَةِ وَخَيْرَ أَهْلِها وَخَيْرَ ما فِيها، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ هَذِهِ الْقَرْيَةَ وَشَرِّ أَهْلِها وَشَرِّ ما

فِيها، اِقْدَمُوا بِاسْمِ اللهِ﴾. پێغەمبەرﷺ چوبا هەر گوندێكو شارێك، ئەم دوعایەی دەخوێند.

جا عادەتی پێغەمبەرﷺ ئەوها بوو: ئەگەر غەزای شوێنێكی كردبا، هێرشی نەدەكردنە سەر، تا ڕۆناكی بەیان دەردەكەوت، جا ئەگەر گوێی لە بانگ بوبایە، وازی لێدەهێنان، ئەگەر نا: هێرشی دەكردنە سەر، جا شەوێ پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)كانﷺ خەوتنو بۆ بەیانی خەڵكی (خَیبَر) بە بێڵو زەنبیلەوە هاتنە دەرەوە، تاكو بەرەو كێڵگەكانیان بڕۆن، كە لە ناكاو لەشكری ئیسلامیان دیت، هاواریان كردو گوتیان: (مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ) ئەمە (مُحَمَّد)و لەشكرە گەورەكەیە. ئینجا هەڵاتنو پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ﴿اَللهُ أَكْبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنّا إِذا نَزَلْنا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَساءَ صَباحُ الْمُنْذَرِين﴾ اَللهُ أَكْبَر، (خَيْبَر) وێران بوو، ئێمە ئەگەر لە گۆڕەپانی گەلێك دابەزین، بەیانیی ترسێندراوان بەیانییێكی خرابە.

ئیتر جەنگ دەستی پێكردو (صَحابَة)كان قەڵا بە دوای قەڵادا بە جەنگ دەیانگرت، جا یەكەم جار لە قەڵای (ناعِم) جەنگ دەستی پێكردو حەزرەتی(مَحمُود بن مَسْلَمَة)ﷺ لە بن ئەم قەڵایە شەهید بوو، چونكە (مِرحَب)و (كِنانَة) دەستاڕێكیان بە سەردا بەرداوەو سەری تەقیو گیانی دەرچوو، جا لە هەر ڕۆژێكدا بە سەركردایەتی (صَحابَة)یەك هێرشی بۆ دەكرا، بەڵام نەدەگیرا، یەكێك لەوان ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ بوو، ئاڵایەكەی وەرگرتو جەنگی كرد بەڵام قەڵایەكەی پێنەگیرا، هەروەها ئیمام (عُمَر)ﷺ ئاڵایەكەی وەرگرتو جەنگی كرد، بەڵام ئەویش قەڵایەكەی پێنەگیرا، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لَأُعْطِيَنَّ هَذِهِ الرّايَةَ غَداً رَجُلاً يَفْتَحُ اللهُ عَلى يَدَيْهِ يُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ وَيُحِبُّهُ اللهُ وَرَسُولُهُ﴾ ئەم ئاڵایە سبەینێ دەدەمە دەست پیاوێك خوایگەورە لە سەر دەستی وی ئەم قەڵایە دەگرێ، خواو پێغەمبەرﷺ ئەم پیاوەیان خۆش دەوێو ئەویش خواو پێغەمبەریﷺ خۆش دەوێن.

جا شەوێ هەر كەسێك بە جۆرێك بیری دەكردەوە: ئایا ئاڵایەكە دەداتە كێ؟ جا سبەینێ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (عَلي بن أبيطالِب) لەكوێیە؟ گوتیان: چاوی دێشێ. جا ناردیان ئیمام (عَلي)ﷺ هاتو پێغەمبەرﷺ تفی لە چاوی كردو دوعای بۆ كردو چاك بۆوەو ئاڵایەكەی دایە دەست، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە سەرخۆ بە، تا دەچیە مەیدانەكەیان، ئینجا داوای موسوڵمانبوونیان لێبكەو پێیان بڵێ: چ واجبێكی خودایان لە سەرە، ﴿فَواللهِ لَأَنْ يَهْدِيَ اللهُ بِكَ رَجُلاً واحِداً خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ﴾ رواه الشيخان، سوێندم بە خوا ئەگەر خوایگەورە بە هۆی تۆ یەك پیاو بهێنێتە سەر ڕێگای ڕاست، بۆ تۆ لە خێری وشترە سوورەكان خێرترە.

جا ئیمام (علی)ﷺ هێرشی كردو ئاڵایەكەی لە بن قەڵایەكە چەقاند، ئینجا (مِرحَب)

–كە سەركردەی جولەكەی (خَيبَر) بوو– هاتە مەيدان خواستنەوەو گوتی:

قَدْ عَلِمَتْ خَيْبَرُ أَنِّي مِرْحَبُ * شاكِيالسِّلاحِ بَطَلٌ مُجَرَّبُ

إِذا الْحُرُوبُ أَقْبَلَتْ تَلَهَّبُ

بەراستی (خَيبَر) دەزانێ من (مِرحَب)م ★ چەكم تەواوەو پاڵەوانێكی تاقیكراوەم

لەو كاتەی كە جەنگ هەڵدەگیرسێو بڵێسە دەدا.

ئینجا حەزرەتی(عامِر بن الأكْوَع)ﷺ بۆی چووە مەیدانو (مِرحَب) شمشێرێكی لە (عامِر) دا، شمشێرەكە چەقیە ناو قەڵغانەكەی، جا حەزرەتی(عامر)ﷺ ویستی لە لای خوارەوە لە (مِرحَب) بدا، بەڵام شمشێرەكەی كورت بوو و بۆ خۆی گەڕاوەو شەهید بوو، جا (صَحابَة)كانﷺ گوتیان: بەخۆی خۆی كوشت، چاكەكانی بەتاڵ بونەوە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وا نیە، ﴿إِنَّهُ لَشَهِيدٌ– إِنَّ لَـهُ أَجْـرَيْنِ﴾ ئەو شەهیدەو دوو پاداشتی هەنە.

ئینجا دووبارە (مِرحَب) مەیدانی خواستەوەو هەمان شیعریڕابردووی گۆتەوە، جا ئەم جارە شێریخودا=ئیمام(علی)ﷺ بۆی چووە مەیدانو فەرمووی:

أَنَاالَّذِي سَمَّتْنِي أُمِّي حَيْدَرَهْ * كَلَيْثِ غاباتٍ كَرِيهِ الْمَنْظَرَهْ

أَكِيلُكُمْ بِالسَّيْفِ كَيْلَ السَّنْدَرَهْ

من ئەو كەسەم دایكم ناوی لێناوم (حَيدَر) ★ وەك شێری بیشەكان دیمەن ترسێنەر،

بە شمشێر دەتانپیوم پێوانەی سەندەر

جا ئیمام (علی)ﷺ شمشێرێكی لە سەری (مِرحَب) دا بە خودەكەیەوە لەتی كرد تا گەیشتە ددانەكانی. جا لە (رِوایَة)ێكی زۆر بێهێزدا هاتوە: پێشدا (مِرحَب) شمشێرێكی لە ئیمام (علی) داو قەڵغانەكەی لە دەستی فڕێدا، ناچار لەجیاتی قەڵغانەكە ئیمام (علی)ﷺ دەرگەیەكی قەڵای بە دەستەوە گرتو جەنگی كرد تا قەڵایەكە گیرا.

﴿ شوانە ڕەشەكەﷺ بەهەشتییە ﴾

كۆیلەیەكی ڕەشی (حَبَشِي)، شوانی جولەكەیەكی (خَيبَر) بوو، دیتی جولەكەكان خۆیان بۆ جەنگ ئامادە دەكەن، جا لێی پرسین: دەتانەوێ چی بكەن؟ گوتیان: جەنگ لەگەڵ ئەم پیاوە دەكەین، كە وا تێدەگا پێغەمبەریخوایە. ئیتر ناوی پێغەمبەرﷺ كەوتە ناو دڵی شوانەكەو هاتە خزمەت پێغەمبەروﷺ موسوڵمان بوو، جا گوتی: یا رَسُولَ الله ئەم مەڕو بزنانە ئەمانەتن، چییان لێبكەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: مستێك وردە بەردیان بۆ بهاوێ، خوایگەورە ئەیانگەینێتەوە دەست خاوەنەكەیان. جا شوانەكە وایكردو مەڕو بزنەكان چونەوە لای خاوەنەكەیان، جا خاوەنەكەش یەكسەر زانی شوانەكەی موسوڵمان بووە، جا كە هێرشی قەڵای (ناعِم) دەستی پێكرد، شوانەكەش

لەگەڵ (صَحابَة)کانﷺ هێرشی کردو تیرێکی وێکەوتو شەهید بوو، جا هێنایانەوە لای پێغەمبەرﷺ پێغەمبەریشﷺ ڕووی خۆی لێ لادا، گوتیان: یا رَسُولَ الله بۆچی ڕووی خۆت لێ لادا؟! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دوو ژنەکانی خۆی لە حۆریەکانی بەهەشت ئێستا لەگەڵیدانەو تۆزی گڵی لێدەتەکێنن–لە (رِوایَة)ێکدا–حۆریەکان پێشبڕکێ دەکەن: کامەیان پێشتر بچێتە نێوان کەوایەکەیو لاشەکەی، خوایگەورە ئەوها ڕێزی لەم کۆیلەیە نا، یەك سوجدەشی بۆ خودا نەبردبووﷺ.

﴿ پاڵەوانەکە دۆزەخییە ﴾

لەم غەزایەی (خَیبَر)، پیاوێکی ئازا هەبوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿هَذا مِنْ أَهْلِ النّارِ﴾ ئەم پیاوە دۆزەخییە. جا کە جەنگ هەڵگیرسا، پیاوەکە جەنگێکی زۆر ئازایانەی دەکرد، تا برینی زۆری کەوتنە لاشەی، جا خەریك بوو هەندێ کەس گومانی لێ پەیدا ببێ!، جا پیاوەکە لە بەر ئازاری برینەکانی بە تیرێکیخۆی خۆی کوشت، جا بە پێغەمبەریانﷺ گوت: خوایگەورە قسەکەی تۆی بە ڕاست هێنا جێ: فلانکەس بەخۆی خۆی کوشت!. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی ﴿لا یَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاّ مُؤْمِنٌ، إِنَّ اللهَ یُؤَیِّدُ هَذا الدِّینَ بِالرَّجُلِ الْفاجِرِ﴾رواه البخاري، جگە لە ئیماندار هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشت، خوایگەورە پشتگیری ئەم ئایینەیئیسلام دەکا بە مرۆڤی گوناهبار.

جا بزانە: لە غەزای (أُحُد)ش ڕووداوێکی لەم جۆرە باس کرا.

ئینجا قەڵا بە دوای قەڵادا دەگیران، تا بە سەرکردایەتی ئیمام (عَلي)ﷺ قەڵای (القَمُوص)ش گیرا، کە گەورەترین قەڵای (خَیبَر) بوو، (صَفیَّة)ی کیژی (حُیَيْ)=گەورەی جولەکەکان لەوێ بە دیل گیرا، جا پێغەمبەرﷺ ئازادی کردو لەخۆی مارە کرد.

جا لە قەڵایەکی (خَیبَر)دا (صَحابَة)کانﷺ قاپو کەلوپەلی خواردنو خواردنەوەیان دەست کەوت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بیانشۆنو خواردنیان تێدا بخۆن.

ئینجا قەڵایەکیتریشیان گەمارۆ دا تا سێ ڕۆژان، جا پیاوێکی جولەکە هاتە لای پێغەمبەرﷺ پێی گوت: دڵنیام بکە، من شارەزات دەکەم چۆن ئەم قەڵایە بگری.

جا پێغەمبەرﷺ بە ماڵو منداڵەوە دڵنیای کرد، جا جولەکەکە گوتی: دانیشتووانی قەڵایەکە بە نۆینە ئاویان لە ژێر زەویدا هێناوەو بە شەوێ دەچن ئاوی لێدەخۆنەوە، جا پێغەمبەرﷺ ئاوەکەی لێبڕینو زۆر بە توندی جەنگیان دەکرد، تا لە ئەنجامدا ئەم قەڵایەشیان گرت.

ئینجا قەڵایەکانی (خَیبَر) هەموویان گیران، تەنها قەڵای (الوَطِیح)و (السَّلالِم) مابون، هەڵاتووەکانی قەڵایەکانیتر گشتی هاتبونە ئەم دوو قەڵایە، جا ئەم دوو قەڵایەش ماوەی چواردە ڕۆژان گەمارۆ دران، جا کە جولەکەکان زانییان هیچ ڕێگایەکیان نیە،

ناچار داوای پێکهاتنیان کرد، جا پێغەمبەرﷺ لەگەڵیان پێك هات بەم مەرجانە:
١-خۆیانو ژنو منداڵیان سەلامەت بن. ٢-لە (خَیْبَر) بڕۆنە دەرەوە. ٣-جگە لە جلوبەرگیخۆیان هیچیتر نەبەن. ٤-ئەگەر هیچ شتێکیش لە موڵمانان بشارنەوە، ئەوە بە پەیمانشکاندن دادەندرێ.

جا لەم دوو قەڵایەدا: سەد زرێو چوار سەد شمشێرو هەزار ڕمو پێنجسەد کەوان کەوتە دەست موسوڵمانان، جا پێغەمبەرﷺ (كِنانَة بن أبِيالحُقَيق)و (الرَّبيع)ی بـرای بـانگ کردنو فەرمووی: ئەو پیستەی گەنجینەی (بَنِیالنَّضِير)ی تێدایە لەکوێیە؟-واتە: ئەو پیستەی لەگەڵ خۆیان هێنایانە (خَيْبَر)، لەو کاتەی لە (مَدِينَة) دەرکران- ئەوانیش گوتیان: نازانین. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر دۆزیمەوە، خوێنو ژنو منداڵتان حەڵاڵ بێ؟ گوتیان: بەڵێ. جا پێغەمبەرﷺ پیستەکەی لە ناو کاولگەیەکدا دۆزیەوەو بە ئەندازەی دە هەزار میسقالی زێڕ گەنجینەی تێدا بوو لە هەموو جۆرێك، جا بە هۆی ئەم خیانەتە، پێغەمبەرﷺ هەردووکی کوشتنو ژنو منداڵەکانیشیانی دایە (صَحابَة)کان.

ئینجا جولەکەکان داوایان لە پێغەمبەرﷺ کرد بە سەپانی لە (خَيْبَر)دا بمێننەوەو نیوەی میوەو بەرهەمی کشتوکاڵەکە بۆ ئەوان بێ، پێغەمبەریشﷺ ڕازی بوو، بەڵام بەو مەرجەی هەر کاتێك حەز بکا: لە (خَيْبَر) دەریان بکا، جا هەر لە (خَيْبَر)دا مانەوە، تا بە هۆی خیانەتکاریی ئەوان، ئیمام (عُمر)ﷺ دەریکردن.

## ﴿ گەڕانەوەی حەزرەتی ( جَعْفَر بن أبِيطالِب )ﷺ لە ( حَبَشَة ) ﴾

جا لە دوای سەرکەوتنی (خَيْبَر)، موسوڵمانەکانی (حَبَشَة) لەگەڵ حەزرەتی(جَعْفَر بن أبِيطالِب)ﷺ لە (حَبَشَة) گەڕانەوەو هاتنە (خَيْبَر)، ژمارەیان شانزە پیاو بون لەگەڵ ژنەکانیان، حەزرەتی(أمّ حَبِيبَة)ی دایکی ئیمانداران رضيالله عنها-کە لە (حَبَشَة) لە پێغەمبەرﷺ مارە کرابوو- ئەویشیان لەگەڵدا بوو، هەروەها حەزرەتی(أبُومُوسَى الأشعَرِي)شﷺ لەگەڵ پەنجاو سێ موسوڵمانیتری هۆزەکەیخۆیان لە (يَمَن)، ئەوانیش لەگەڵ حەزرەتی(جَعفَر)ﷺ هاتنە (خَيْبَر)؟ چونکە ئەم (أبُومُوسَى)یەﷺ لەگەڵ دوو برای خۆیو لەگەڵ ئەم پەنجا موسوڵمانەی هۆزەکەیخۆی لە (يَمَن) سواری کەشتیەك بون تاکو بێنە خزمەت پێغەمبەرﷺ، بەڵام لە ناو دەریای سوردا ڕێگەی لێگۆڕاو چونە (حَبَشَة)، جا لەوێ چاویان بە حەزرەتی(جَعفَر)ﷺ کەوتو دوای گفتوگۆو لێك حاڵیبوون، حەزرەتی(جَعفَر)ﷺ فەرمووی: لەگەڵمان بمێننەوەو بە یەکەوە دەچینەوە لای پێغەمبەرﷺ، جا لەوێ مانەوە تا بە یەکەوە هەموویان هاتنەوە لای پێغەمبەرﷺ، لەو کاتی لە (خَيْبَر) بوو.

جا کە حەزرەتی(جَعفَر)ﷺ بۆ لای پێغەمبەرﷺ هات، پێغەمبەرﷺ لە بەری هەڵساو

نێوچاوانی ماچ کردو باوەشی لێوەرینـاو فـەرمووی: ﴿وَاللهِ ما أَدْرِي بِأَيِّهما أَفْرَحُ: بِفَــتْحِ خَيْبَرَ، أَمْ بِقُدُومِ جَعْفَرَ؟﴾ وَاللهِ نازانم بە کامیان دڵخۆش ببم: بە سەرکەوتنی (خَيْبَر)، یان بە هاتنەوەی (جَعْفَر)؟.

هەروەها حەزرەتی(أبُوهُرَيْرَة)ش ﷺ لەگەڵ کۆمەڵە خزمێکی خۆی لە هۆزی (الدُوسِي) لە (خَيْبَر) هاتنـە خزمـەت پێغەمبـەرﷺ، جـا پێغەمبـەرﷺ ئیزنـی لـە (صَحابَة)کـان وەرگـرت: (جَعْفَــر)و هاوڕێکـانیو (أبُومُوسَىٱلأشْـعَرِي)و هاوڕێکـانیو (أبُـوهُرَيْرَة)و هاوڕێکانی ﷺ گشتی کردنە هاوبەش لە دەسکەوتووی (خَيْبَر)، واتـە: بەشـی بـۆ دانـان.

جـا پێغەمبــەرﷺ دەسـتکەوتووی (خَيْبَــر)ی بــە ســەر (صَـحابَة)کانــدا بــەش کــرد: سوارئەسپ سێ بەشی دانێ: بەشێکی خۆیو دوو بەشی ئەسپەکەی، پیادەش یەك بەشی دایێ، هـەروەها کۆیلـەو ئافرەتـەکانیش بەخشیـشێکی کـەمتر لـە بەشـی پیـاوانی دانـێ؟ چونکە بیـست ئـافرەتی موسـوڵمان لـە غـەزای (خَيْبَـر)دا بەشـدار بـون، جـا لـە غـەزای (خَيْبَر)دا پێغەمبەرﷺ ژن هێنانی (ٱلمُتعَة)=کاتی حەرام کرد.

## ﴿ هەوڵی کوشتنی پێغەمبەرﷺ ﴾

ئافرەتێکی جولەکە ناوی (زَينَب) بوو، ژنی (سَلاَم بن مِشْكَم) بوو، مەڕێکی بـرژاوی پـڕ لە ژەهر کردو بـە دیـاری بـۆ پێغەمبـەریﷺ هێنـا، جـا پێغەمبـەروﷺ (صَحابَة)کان دستیان بـە خـواردن کـرد، پێغەمبـەرﷺ پـارووەکی خـستە دەمـیو جویـیو فڕێیـدا دەرەوەو فـەرمووی: ﴿واز لـە خـواردن بێـنن، ئـەم ئەندامەیمەڕەکـە پـێم دڵـێ: مـن ژەهراویم=ژەهرم تێکراوە﴾!. بەڵام (صَحابَة)یەك—ناوی (بِشر) بـوو ﷺ—پارووەکـەی فڕێنـەدا دەرەوە، نـەوەك پێغەمبـەرﷺ بێـزی ببێتـەوە!، جـا کـە پارووەکـەی قـوت دا یەکسەر ڕەنگی گۆڕا، جا پاش ماوەیەك وەفاتی کرد، ئینجا ئافرەتەکەیان هێنـاو لێیـان پرسی: بۆ ئەم تاوانەت کرد؟ ئافرەتەکەش گوتی: ئـەم بەڵایـەو ماڵوێرانیـەت بـە سـەر گەلەکەی مندا هێنا، جا گوتم: ئەگـەر (مُحَمَّد)ﷺ درۆزن بـێو پاشا بـێ، بـەم ژەهـرە دەمـرێو دەحەسـێینەوە، ئەگـەر پێغەمبـەریش بـێ، ئـەوە لـە لایـەن خـواوە ئاگـادار دەکرێتەوەو زیانی ناگاتێ. جا ئافرەتەکە موسوڵمان بوو و پێغەمبەرﷺ عـەفوی کـرد، بەڵام کە حەزرەتی(بِشر)ﷺ بەم پارووە مرد، لە تۆڵەی (بِشر) کوشتیان.

ئینجا پێغەمبەرﷺ لە نەخۆشـی وەفاتیـدا فـەرمووی: ﴿مَا أَزالُ أَجِدُ أَلَمَ الطَّعامِ الَّــذِي أَكَلْتُ بِخَيْبَرَ، فَهَذا أَوانَ وَجَدْتُ انْقِطاعَ أَبْهَرِي﴾رواه البخاري، بـەردەوام ئـەو خواردنـەی لـە (خَيْبَـر) خـواردم—واتـە: خـستمە دەمـم—هـەر ئـازارم دەدا، وا ئێـستا دەبینـم کـاتی بچڕانی دەماری دڵەکەمە بە هۆی ئەو خواردنە. واتە: ژەهرەکە بە هۆی جوینی پارووەکە کاری لە پێغەمبەرﷺ کردبوو، کەواتە: پێغەمبەرﷺ بە شەهیدی وەفاتی کردوە.

## ﴿فێڵە سەیرەکەی حەزرەتی (الْحَجّاج بن عِلاط السُّلَمي) رضي الله عنه﴾

ئینجا کە قەڵایـەکانی (خَیْبَـر) گیران، حـەزرەتی(الحَجّاج بـن عِـلاط) رضي الله عنه هاتـە خزمـەت پێغەمبەروو ﷺ گوتی: یا رَسُولَ الله من ماڵێکی زۆرم لە لای بازرگانەکانی (مَکّة)یە، ئەگەر بزانن من موسوڵمان بویمە، هیچم نادەنەوە، جا ئەگەر ئیزنم بدەی بچمە (مَکّة)و قسەی ناڕاست بکەمو بە فێڵ ماڵەکەی خۆم وەربگرمـەوە؟ جا پێغەمبـەر ﷺ ئیزنـی دا، ئینجا حەزرەتی(حَجّاج) رضي الله عنه بەرەو (مَکّة) ڕۆیـشتو لـە دەرەبەنـدی (الْبَیْضاء)ی نزیـك (مَکّـة)، کۆمەڵە کافرێکی (قُرَیْش)ی دیتن بۆ وەرگرتنی هەواڵی جەنگی (خَیْبَر) هاتبوون، چونکە پێیان خۆش بوو پێغەمبەر ﷺ لەم جەنگەدا سەر نەکەوێ، جا کە ئـەوانیش چاویان بـە حـەزرەتی(حَجّـاج) کـەوت—نـەیانزانی موسـوڵمان بـووە— لێیـان پرسـی: بیـستومانە (مُحَمَّـد) ﷺ بـۆ جـەنگی (خَیْبَـر) چـووە؟ حـەزرەتی(حَجّـاج) رضي الله عنه گـوتی: هـەواڵێکی دڵخۆشکەرم لە لایە!. جا ئەوانیش لـە دەورەی کـۆ بونـەوەو گوتیـان: دەی بۆمـان بڵـێ؟ حەزرەتی(حَجّاج)ش رضي الله عنه گوتی: (مُحَمَّد) ﷺ بـۆ جەنگـی (خَیْبَـر) ڕۆیـشت، هـەر ئەوەنـدە بوو: (صَحابَة)کانی کوژرانو تەفروتونا بـون، (مُحَمَّـد)ش ﷺ بـەخۆی دەسـتگیر کـراوەو جولەکـەکان وەعـدەیان داوە لـەوێ نـەیکوژن، تـا دەیهێننـە (مَکّـة)و لـە بەرچـاوی ئێـوە دەیکوژن... جا (حَجّاج) گوتی: من یارمەتیەکم لە ئێوە دەوێ. گوتیـان: چـیە؟ گـوتی: ئـەو تاڵانـەی لـە (مُحَمَّـد)و ﷺ (صَحابَة)کـانی گـیراوە، جولەکـەکان دەیفرۆشـن، بۆیـێ دەمەوێ بە پەلە پارەی لای قەرزدارەکانم بۆ کۆ بکەنەوە، تـاکو پـێش بازرگانـەکان مـن ئەو تاڵانـە بـۆ خـۆم بکـڕم. جـا کافرەکـانی (مَکّـة) زۆر بـە پەلـەو بـە دڵخۆشـی هـەموو قەزرەکەیان داوەو دڵخۆشی لە (مَکّة) بڵاو بۆوە.

بەڵام کە ئیمام (الْعَبّاس)=مامی پێغەمبەر ﷺ ئەم هەواڵەی گەیـشتێ، خـۆی لـە سـەر پـێ ڕانەکرتو نەیتوانی هەڵسێتەوە، جا یەکسەر خزمەتکارێکیخۆی نارده لای (حَجّاج): ئایا ئەم هەواڵە ڕاستە؟ حەزرەتی(حَجّاج)ش رضي الله عنه گوتی: سەلامی لێبکە، من بەخۆم دێمە لایو هەواڵێکی خۆشی پێدەڵێم. جا کـە خزمەتکارەکـە هاتـەوە، ئیمـام (الْعَبّـاس) رضي الله عنه یەکـسەر هەڵساوە پێو خزمەتکارەکەشی ئازاد کردو فەرمووی: لە سەرم نەزر بێ: دە کۆیلـە ئـازاد بکەم، جا —لە کاتی گەڕانەوەی بـۆ (مَدِینـة)— لـە کـاتی نیـوەڕۆدا حـەزرەتی(حَجّـاج) رضي الله عنه هاتە لای ئیمـام (الْعَبّـاس)و گـوتی: ئـەو هەواڵـەی پێـت دەڵێم، تـا سـێ ڕۆژیـتر ئاشـکرای نەکـەی، نـەوەك کافرەکـان بـە دوامـدا بـێنو بمگـرن، وَاللهِ پێغەمبـەر ﷺ سـەرکەوتووەو هەموو قەڵایەکانی (خَیْبَر)ی گرتونو (صَفِیَّة)ی کیژی گەورەی جولەکەکانیش ئێستا بـە بوك لە لای پێغەمبەرەوو ﷺ لەخۆی مارە کردوە!. جا ئیمـام (الْعَبّـاس) گـوتی: ئـەوە چـی دەڵێی؟! (حَجّاج) گوتی: دەڵێم وَاللهِ قسەکەم ڕاستە، لێم ئاشکرا مەکە.

ئینجا حەزرەتی(حَجّاج)ﷺ گەڕاوە (مَدینَة)، ئیمام (العَبّاس)ش ﷺ ئەو سێ شەوانەی زۆر پێ درێژ بونو نەدەڕۆیشتن، جا کە سێ شەوەکان ڕۆیشتن، جوانترین بەرگی دەبەر کردو خۆی بۆنخۆش کردو هات لە پێش چاوی کافرەکان (طَواف)ی کرد، جا کافرەکان- وەك گاڵتە پێکردن- گوتیان: ئەمە خۆ بەهێزکردنو خۆڕاگرتنە بۆ گەرمی بەڵایەکە؟. ئیمام (العَبّاس)ش ﷺ فەرمووی: نا وَاللهِ، اَلحَمْدُ لِلّه خوا هەر خۆشیو چاکەم دەداتێ، وا پێغەمبەرﷺ بە تەواوی دەستی بە سەر (خَیْبَر)دا گرتووەو کیژی گەورەی جولەکەکانیشی لەخۆی مارە کردووە، بەڵام (حَجّاج) فێڵی لە ئێوە کرد، ئێوەی تەفرە دان تا قەرزەکەی لە ئێوە وەربگرێتەوە، ئەگەر نا: ئەویش موسوڵمان بووە.

جا بەم جۆرە، غەمباری هاتەوە سەر ڕووی کافرەکانو موسوڵمانەکانیش بە سەرکەوتنی ئیسلام دڵخۆش بون.

جا لە مانگی (صَفَر) گرتنی (خَیْبَر) تەواو بوو، ژمارەی شەهیدەکانی ئیسلام هەژدە (صَحابَة) بون-هەروەك ئیمام (ابن کثیر) گێڕاویەتیەوە- ژمارەی کوژراوەکانی جولەکەکان نەوەدو سێ پیاو بون، هەروەك لە (نورالیقین)دا فەرموویەتی.

جا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(عبدالله بن رَواحَة)ی ﷺ کردە فرسێنەری قەسپەکانی (خَیْبَر)، حەزرەتی(سَواد بن غَزِیّة)شی ﷺ کردە ئەمیری (خَیْبَر)، جا حەزرەتی(سَواد) هەندێك قەسپی باشی بۆ پێغەمبەرﷺ هێنانە (مَدینَة)، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: هەموو قەسپەکانی (خَیْبَر) ئەوها باشن؟ حەزرەتی(سَواد)ش ﷺ گوتی: نا وَالله، ئێمە یەك ڕبەی ئەم قەسپە بە دوو ڕبە بە سێ ڕبە وەردەگرین. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لاَ تَفْعَلْ، بِعِ الْجَمْعَ بِالدَّراهِمِ ثُمَّ اشْتَرِ بِالدَّراهِمِ جَنِيباً﴾ رواه الشيخان، وەها نەکەی-قەسپی خراپ بە زێدە لەجیاتی باشەکە وەرمەگرە-، قەسپە خراپەکان بە پارە بفرۆشە، ئینجا بەو پارەیە قەسپە باشەکە بکڕە، واتە: تا نەبێتە ڕیبا، چونکە ڕیبا حەڕامە.

## ﴿ تەسلیمبوونی (فَدَك) ﴾

لە دوای سەرکەوتنی (خَیْبَر)، پێغەمبەرﷺ ناردیە لای جولەکەکانی (فَدَك)، ئەوانیش لەگەڵ پێغەمبەرﷺ پێك هاتن، جا وەك دانیشتووانی (خَیْبَر) گیانیان پارێزرا، زەویەکەشیان بۆ خودی پێغەمبەرﷺ بوو.

## ﴿ غەزای (وادِیالقُرَی) ﴾

ئینجا کە پێغەمبەرﷺ لە (خَیْبَر) گەڕاوە، هاتە (وادِیالقُرَی) کە ئەوانیش جولەکە بون، جا داوای موسوڵمانبوونی لێکردن، بەڵام موسوڵمان نەبونو جەنگیان کردو یازدە پیاویان لێکوژران، ناچار ئەوانیش تەسلیم بون، جا پێغەمبەرﷺ ئەوانی بە سەپانی لە سەر زەویەکانی (وادِیالقُرَی) هێشتنەوە. جا کە جولەکەکانی (تَیماء) هەواڵی جولەکەکانی

(خَیبَر)و (فدَك)و (وادیالقُری)یان گەیشتێ، ئەوان بە سولح لەگەڵ پێغەمبەرﷺ پێك هاتن: (جزیَة)یان دا و لە سەرملك‌و ماڵی خۆیان مانەوە.
ئینجا كە پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)كانﷺ بۆ (مَدینة) گەڕانەوە، شەوێ لە شوێنێك خەوتن‌و تا ڕۆژ گەرم بوو لە خەو هەڵنەستان، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (لێرە بڕۆن، ئێرە شەیتانی لێیە). جا فەرمانی بە حەزرەتی(بلال) كرد: بانگی دا، ئینجا پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)كانﷺ سوننەتی پێش نوێژی سبەینێ‌و نوێژی سبەینێیان قەزا كردەوە. جا ئەم باسەمان بە بەڵگەوە لە حەفتەم گوڵبژێری غەزای (خَنْدَق)دا ڕوون كردەوە، والحمد لله تعالی. (البدایة والنهایة) ب(٢) ل(٥٤٢–٥٨١) و(فتح الباری) ب(٧) ل(٥٧٨–٦٢٣) و(السیرةالحلبیة) ب(٣) ل(٤٥–٨٧).

## ﴿ كوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەكەم: زیكری خوا چۆن دەكرێ؟** لە ڕێگەی (خَیْبَر)دا (صَحابَة)كان بە دەنگی بەرز زیكری خوایان دەكرد، جا پێغەمبەروﷺ فەرمووی: ﴿اِرْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلا غائِباً﴾ رواه الشیخان، **لەسەرخۆ بن، ئەوەندە دەنگ بەرز مەكەنەوە، چونكە ئێوە هاوار ناكەنە هیچ كەڕو نادیارێك.** هەروەها خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ﴾ الأعراف: ٢٠٥، **زیكری خوایخۆت بكە لە دڵیخۆتدا بە ملكەچی‌و بە ترسەوە، بە دەنگ هەڵێنان زیكرەكە مەكە.**
ئیمامی(القرطبي) لە تەفسیری ئایەتەكەدا فەرموویەتی: ئەمە بەڵگەیە كە دەنگ هەڵێنان لە زیكر كردندا قەدەغەیە. هەروەها ئیمام (ابن حجر العسقلاني) لە شەرحی حەدیسەكەدا لە ئیمامی(الطَّبري) دەگێڕێتەوە: دەنگ هەڵێنان لە دوعاو زیكردا ناپەسندە، (صَحابَة)و (التابعین) ئەوهایان فەرمووە، جا كاری ئیمامی(البخاري)ش وا دەگەیەنێ: ئەم ناپەسندیە تایبەت بە كاتی جەنگ بێ، بەڵام دەنگ هەڵێنان لە كاتەكانیتردا، حەدیسی لە سەرە: كە دەنگ هەڵێنان لە زیكردا لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ هەبووە.
جا مەبەستی ئیمام (ابن حجر) ئەم حەدیسەیە: ﴿عن ابْنِ عَبّاس رضیالله عنهما: أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بالذِّكْرِ–حِينَ يَنْصَرِفُ النَّاسُ مِنَ الْمَكْتُوبَةِ–كانَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّﷺ﴾ رواه الشیخان، **دەنگ هەڵێنان لە زیكری دوای نوێژ–كە خەڵك لە نوێژە واجبەكان دەبونەوە– لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ هەبوو.**
ئیمامی(النواوي) لە شەرحی ئەم حەدیسە لە زانایان دەگێڕێتەوە: كە خاوەن مەزهەبەكانی شوێنكەوتوو و زانایانیتریش یەكدەنگن: دەنگ هەڵێنان لە زیكر كردندا سوننەت نیەو ئیمامی(الشافعي)ش–رحمه الله تعالی– لە واتەی ئەم حەدیسەدا فەرموویەتی: **(كاتێكی كەم دەنگی هەڵیناوە تا چۆنیەتی زیكرەكەی فێر كردون، نەك بەردەوام دەنگیان هەڵێنابێ، بۆیێ من بۆ ئیمام‌و بۆ مەئمووم وام پێباشە لە دوای نوێژەكان بە نهێنی**

زیکریخوا بکەن، مەگەر ئیمامەکە بیەوێ ئەوان فێر بن، ئەو کاتە هەر ئەوەندە دەنگ هەڵدێنێ تا دەزانێ ئەوان فێر بوینە، ئینجا بە نهێنی زیکرەکە دەکا).

جا ئێستا لە کوردستاندا-بە بەڵگەی ئەم حەدیسە-بە ڕوونکردنەوەی ئیمامی(الشافعي): زکیری دوای نوێژەکان دەکرێو تەنها یەك جار ئیمام بە دەنگ دەڵێ: (سُبْحانَ الله)، یەك جار دەڵێ: (اَلْحَمْدُ لِلّٰه)، یەك جار دەڵێ: (اَللهُ أَكْبَر). ئینجا مەئمووکانیش بە نهێنی هەر زیکرێك لەوانە سیو سێ جار دەڵێن، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿تُسَبِّحُونَ وَتُحَمِّدُونَ وَتُكَبِّرُونَ خَلْفَ كُلِّ صَلاةٍ ثَلاثاً وَثَلاثِينَ﴾ رواه الشيخان، (سُبْحانَ الله)و (اَلْحَمْدُ لِلّٰه)و (اَللهُ أَكْبَر)، هەر یەکەیان سیو سێ جار بیانڵێن لە دوای هەموو نوێژێکدا.

(شرح صحيح مسلم) ب(٣) ل(٢٦٠و٢٦٩) و(فتح الباري) ب(٢ ل(٤١٩)، ب(٦) ل(١٦٣).

**دووەم: پێغەمبەرﷺ حەزرەتی ( صَفِيَّة )ی** رضي‌الله عنها **لە خۆی مارەکرد.** (صَفِيَّة) کیژی (حُيَيٍّ بن أَخْطَب) بوو، کە بۆ جەنگی (خَنْدَق) کافرەکانی لە دژی ئیسلام کۆ کردنەوە، ئینجا لە غەزای (بَنِيقُرَيْظَة)دا گیراو بە هۆی خیانەتکاریەکەی کوژرا، لە لایەکیتریش (صَفِيَّة): ژنی (كِنانَة بن الرَّبِيع بن أَبِيالْحُقَيْق) بوو، کە خاوەنی قەڵای (الْقَمُوص) بوو، جا ئەم قەڵایە بە دەستی ئیمام (علی)رضي‌الله‌عنه گیرا، (صَفِيَّة)ش لەم قەڵایەدا بە دیل کراو کەوتە بەشی حەزرەتی (دِحْيَةُ الْكَلْبِي)رضي‌الله‌عنه، جا (صَحابَة)یەك بە پێغەمبەریﷺ گوت: تۆ (صَفِيَّة)ت داوەتە (دِحْيَة)؟ خۆ (صَفِيَّة) گەورەی جولەکەکانی (قُرَيْظَة)و (النَّضِير)ە! جگە لە تۆ بۆ کەسیتر ناگونجێ. جا پێغەمبەرﷺ (صَفِيَّة)ی لە حەزرەتی(دِحْيَة) کڕیەوەو لەخۆی مارەکردو بووە دایکی ئیمانداران رضي‌الله عنها، جا پێغەمبەرﷺ دیتی لە پشتەوەی چاوی حەزرەتی(صَفِيَّة) پەڵەیەکی ڕەش هەیەو لێی پرسی ئەمە چیە؟ حەزرەتی(صَفِيَّة) رضي‌الله عنها گوتی: لە خەونمدا دیتم مانگ کەوتە ناو کۆشم، جا خەونەکەم بۆ (كِنانَة) گێڕاوە، ئەویش لەپەدەستێکی لێدامو گوتی: تۆ خۆزگەی پاشای (يَثْرِب)=(مَدِينَة) دەکەی؟ جا ئەوەشمان باس کرد: کە (كِنانَة)ی مێردی (صَفِيَّة)ش لەم غەزایەدا کوژرا.

**پرسیار:** بۆچی پێغەمبەرﷺ ئەم بێوەژنە مێرد کوژراوەی مارە کرد؟ خۆ کچی جوانو جەحێڵ زۆر لە ناو دیلەکاندا هەبون.

**وەڵام:** لە فەرموودەی (صَحابَة)کەرضي‌الله‌عنه وەڵامەکە دەردەکەوێ: **چۆن (صَفِيَّة)ت داوتە (دِحْيَة)؟ (صَفِيَّة) جگە لە تۆ بۆ کەسیتر ناگونجێ:**

یەکەم: لەم غەزایەدا (صَحابَة)ی لە حەزرەتی(دِحْيَة)رضي‌الله‌عنه گەورەترو بەرێزتر هەبونو سەرکردایەتی هێرشەکانیشیان کردبوو، وەك هەرسێك ئیمامەکان: (أَبُوبَكْر)و (عُمَر)و (عَلِي)و...هتدرضي‌الله‌عنهم، جا وێنەی حەزرەتی(صَفِيَّة)ش رضي‌الله عنها لە ناو دیلەکاندا نەبو بیداتە ئەم بەڕێزانەو ڕازییان بکا، جا کە حەزرەتی(صَفِيَّة)ی لەخۆی مارە کرد، هیچ ناڕەزاییەك لە ناو (صَحابَة)کاندا نەما.

دووەم: ئەگەر (صَفيَّة)ی دابایە حەزرەتی(دِحْيَة)ﷺ، یان هەر (صَحابَة)یەکیتری هاوێنـەی حەزرەتی(دِحْيَة)ﷺ، لەوانە بوو دوژمنانی ئیسلام بلێن: (مُحَمَّد)ﷺ سوکایەتی بە خێزانەکانی گەورە ماڵان دەکاو رێزیـان لێنانـێ. جا کـە حـەزرەتی(صَـفيَّة)ی لـەخۆی مـارەکرد، بـووە گەورەترین رێزلێنان، چونکە–جگە لە خودا– هیچ کەسێك لە پێغەمبەرﷺ گەورەتر نیە.

سێیەم: حەزرەتی(صَفيَّة) رضيالله عنها نـەژادی دەگەیـشتەوە حـەزرەتی(هـارُون) پێغەمبـەری برای حەزرەتی(موسى) پێغەمبەر عليهما الصلاة والسلام، جا کە لە دوای دیلبوون موسوڵمان بوو، ئەم گەورەییەی بۆ بەرزتر بۆوەو شیاوی ئەو بوو ببێتـە هاوسـەری گـەورەی موسـوڵمانان: کـە پێغەمبەری خوداﷺ، جا پێغەمبەرﷺ ئەم گەورەییـەی بـۆ حـەزرەتی(صَـفيَّة) رەچـاو دەکردو زۆریش رێـزی لێـدەنا، ئـەوە بـوو: رۆژێـك هـەردوو دایکـی ئیمانـداران: حـەزرەتی (عائشة)ی کیژی ئیمام(أبُوبَكْر)و حەزرەتی (حَفْصَة)ی کیژی ئیمام(عمر)ﷺ شـانازییان بـە سەر (صَفيَّة)ی دایکی ئیمانداراندا کردو پێیان گوت: ئێمە لە تۆ رێزدارترین!.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿دەبوا پێیان بڵێی چۆن ئێوە لە من رێزدارترن؟ مێردی من (مُحَمَّد)ەﷺ، باوکم (هارُون)ە، مامم (مُوسَى)یە﴾عليهما الصلاة والسلام.

بەڵێ: بەم رێزلێنانەوە حەزرەتی(صَـفيَّة) رضيالله عنها بـووە دایکـی ئیمانـداران، بـاوكو مێـردە کوژراوەکەی لە بیر چونەوەو هەر بە رێزداریش مایەوە تا لە مانگی رەمەزانی ساڵی پەنجای کۆچی وەفاتی کردو لە (بَقِيع) نێژرا، فرضي الله عنها وعن سائر الصَحابَة وامهات المؤمنين.

کەوابو: ئەم ژن هێنانەی پێغەمبـەرﷺ بـۆ بەرژەوەنـدی گـشتی بـوو، نـەك بـۆ تێرکردنـی شەهوەتو حەزی خۆی، هەوەك درۆزنە دڵنەخۆشەکانی واتێدەگەن.

**جا ئەوەش بزانە:** کە پێغەمبەرﷺ لە غەزای (خَيْبَر) تەواو بوو، (صَـفيَّة)ش رضيالله عنها لـە حەیز پاك بۆوەو (عِدَّة)یشەرعیی تەواو بوو، ئینجا–کە گەڕانەوە– لە رێگەدا پێغەمبـەرﷺ گواسـتیەوەو زیافـەتی بـۆك گواسـتنەوەی کـرد، جـا لـە شـەوی زاوەیەتیـشدا حـەزرەتی (أبُوأيُّوب الأنْصاري)ﷺ پاسەوانی پێغەمبەر بووﷺ، جا پێغەمبەرﷺ دوعـای کـرد خـوا بیپارێزێ. هەروەك لە باسی (أبُوأيُّـوب)دا رابـرا. ئـەم روونکردنەوەیـەم پێـك هێنـاوە لـە (فـتح البـاري) ب(٧) ل(٥٨٦–٥٩٩) و(سيرة الصلابي) ب(٢) ل(٤٢٠–٤٢٣)

**سێیەم: باغەوانیو سەپانی دروستە، پێغەمبەرﷺ رازی بوو جولەکەکان بە سەپانی لە (خَيْبَر)دا بمێننەوەو نیوەی میوەو دانەوێلەی (خَيْبَر)ش بۆ ئەوان بێ.**

ئەم حەدیسە بەڵگەیە: کە (المُساقاة)=باغەوانی دروستە، واتە: خاوەن باغەکە یەکێکیتر بە کرێ بگرێ بە بەشێکی میوەیدرەختەکان، تاکو درەختەکان ئاو بـداو پـەروەردەیان بکـا. جگە لە ئیمامی(الحنفي) ئیمامەکانیتری سەرمەزهەب ئەم جۆرە باغەوانیەیان بـە دروسـت داناوە، هەم بە مەزهەبی ئیمام (مالك)و فـەرموودەی کـۆنی ئیمـامی(الـشافعي): لـە گـشت درەختێکی بەردەردا ئەم باغەوانیە دروستە.

هەروەها حەدیسەکە بەڵگەیە: کە سەپانیی دانەوێڵەش دروستە، لە بەرامبەر ئەوەی بەشێکی بەرهەمەکە بۆ سەپانەکە بێ، جیاوازی نیە تۆوەکەی داچێندراو: هی سەپانەکە بێ، یان هی خاوەن زەویەکە بێ، جا ئەم جۆرە سەپانیە—کە لە کوردستاندا دەکرێ— جگە لە ئیمام (أحمد) سێ ئیمامەکانیتر بە نادروستیان داناوە، بەڵام لە لای ئیمام (أحمد)و چەند زانایەکی مەزهەبی(الحنفي)و چەند زانایەکی مەزهەبی(الشافعي): ئەم جۆرە سەپانیەی دانەوێڵەش دروستە، ئیمامی(النواوي)ش لە(شرح صحيح مسلم)دا فەرمودەی ئەوانەی هەڵبژاردوە، چونکە حەدیسەکەی (خَيْبَر) پشتگیری ئەوانە دەکا، کە دەفەرموێ: ﴿أَنَّ النَّبيَّ ﷺ عامَلَ أَهْلَ خَيْبَرَ بِشَطْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ﴾ رواه الشيخان، **پێغەمبەرﷺ لەگەڵ دانیشتووانی(خَيْبَر) ڕێك کەوت بە نیوەی بەرهەمەکەی (خَيْبَر): لە میوەو لە دانەوێڵە.** واتە: حەدیسەکە هیچ جیاوازی نێوان میوەو دانەوێڵەی تێدا نیە. (شرح صحيح مسلم) ب(٦) ل(٤٠٧و٤١٩).

**ئاگاداری:** لە سەپانیی‌دانەوێڵەدا زەکات تەنها لە سەر خاوەن تۆوەکەیە، واتە: لە بەشی وی دەژمێردرێ، جیاوازی نیە خاوەن تۆوەکە: سەپانەکە بێ، یان خاوەن زەویەکە بێ. جا ئەم مەسەلەیەم لە بەرگی دووەم و سێیەمی (ڕووناکی رب العالمين)دا درێژتر ڕوون کردۆتەوە.

**چوارەم: هەڵسان لە بەر یەکتری و باوش لێکوەرێنان و یەکتری ماچکردن، کە حەزرەتی (جَعْفَر)ﷺ لە (حَبَشَة) گەڕاوە، پێغەمبەرﷺ لە بەری هەڵساو نێوچاوانی ماچ کردو باوەشی ایێوەرێنا.**

**بزانە:** ماچ کردن و باوەش لێوەرێنان تەنها لەو حاڵەتەدا سوننەتە: کە یەکێکیان لە سەفەر گەڕابێتەوەو ماوەیەکی زۆر یەکترییان نەدیتبێ، وەك حەدیسەکەی حەزرەتی (جَعْفَر)ﷺ کە لە (حَبَشَة) گەڕاوە، (أبوداود بسند صحيح) گێڕاویەتیەوە، هەم ﴿قَدِمَ زَيْد بن حَارِثَةَ الْمَدِينَةَ، فَقَرعَ الْبابَ فَقامَ إلَيْهِ النَّبيُّ ﷺ فَاعْتَنَقَهُ وَقَبَّلَهُ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، **حەزرەتی (زَيْد)ﷺ لە سەفەرێك گەڕاوە (مَدِينَة)و هات لە دەرگەی ماڵی پێغەمبەریﷺ دا، جا پێغەمبەرﷺ لە بەری هەڵساو باوەشی ایێوەرێناو ماچی کرد.**

کەواتە: ئەگەر لە سەفەر نەگەڕابێتەوەو ماوەیەکی زۆریش پێ نەچوبوو و یەکترییان دەدیت، ئەو کاتە ماچکردن و باوەش لێك وەرێنان سوننەت نیە، بەڵکو (مَكْرُوه)=ناپەسندە ﴿قالَ رَجُلٌ: يا رَسُولَ اللهِﷺ، اَلرَّجُلُ مِنّا يَلْقَى أَخاهُ أَوْ صَدِيقَهُ أَيَنْحَني لَهُ؟ قالَ لاَ. قالَ: أَفَيَلْتَزِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ؟ قالَ: لاَ. قالَ: أَفَيَأْخُذُ بِيَدِهِ وَيُصَافِحُهُ؟ قالَ: نَعَمْ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، **ئەی پێغەمبەری‌خواﷺ مرۆڤ دەگاتە برای‌خۆی، یان دۆستی‌خۆی، ئایا سەری بۆ بچەمێنێتەوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نا. گوتی: ئایا باوەشی ایێوەربێنێ و ماچی بکا؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نا. گوتی: ئایا تۆقەی لەگەڵ بکا؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ.**

**دەست ماچ كردن،** سوننەتە: دەستی پیاوچاكو زاناو ڕێزدار ماچ بكرێ، هەم سوننەتە: دەستی دایكو باوكی خۆیشی ماچ بكا ﴿عن زارعٍ﷛ -وكانَ فِي وَفْدِ عَبْدِ قَيْسٍ- فَجَعَلْنَا نَتَبادَرُ مِنْ رَواحِلِنَا فَنقبِّلُ يَدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَرِجْلَهُ﴾رواه أبوداود والترمذي بسند صحيح، **ئێمە -نوێنەری (عَبْدِ قَيْس)- بە پەلە لە وڵاغەكانمان دابەزینو دەستو پێی پێغەمبەرمان ﷺ ماچ كردن.** ﴿وعَن ابن عُمَر رضي الله عنهما -فِي قِصَّةِ رُجُوعِهِ مِنْ غَزْوَةِ مُؤْتَة- فَقَبَّلْنا يَدَ النَّبِيِّ ﷺ﴾ رواه البخاري في الادب المفرد وأبوداود والترمذي بسند حسن، **ئێمە دەستی پێغەمبەرمان ﷺ ماچ كرد.** هەم بە بەڵگەی ئەم حەدیسەیداهاتووی حەزرەتی(فاطِمَة)ش:

**هەڵسان لە بەر یەكتری:** ﴿عَنْ عائِشَةَ-رضي الله عنها-: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذا دَخَلَ عَلَى فاطِمَةَ رضي الله عنها قامَتْ إِلَيْهِ فَأَخَذَتْ بِيَدِهِ وأَجْلَسَتْهُ فِي مَجْلِسِها﴾ رواه أصحاب السنن بسند حسن، **كە پێغەمبەر ﷺ دەچووەماڵی (فاطِمَة)ی كیژیخۆی، (فاطِمَة)-رضي الله عنها- لە بەری هەڵدەستاو دەستی ماچ دەكردو لە جێگەی خۆی دایدەنا.** هەروەها لە غەزای (بَنِي قُرَيْظَة)دا حەزرەتی(سَعْد بن مُعاذ)﷛ هات، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە (صَحابَة)كانی (مَدِينَة) كردو فەرمووی: ﴿قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ﴾ رواه الشيخان، **لە بەر گەورەی خۆتان هەڵسن.**

ئیمامی(النـواوي) لە شەرحی حەدیسەكەدا فەرموویەتی: حەدیسەكە بەڵگەیە: ڕێز لە پیاوماقوڵان بگیرێو لە بەریان هەڵسن، چونكە ئەو لە بەرهەڵسانە لەو جۆرانە نیە كە قەدەغە كراون، بەڵكو لەبارەی هەڵسان لە بەر پیاوی ڕێزدار چەندەها حەدیس هاتونو هیچ حەدیسێكی(صحیح)ش لەبارەی قەدەغەكردنی هەڵسان لە بەریەكتری نەهاتووە.

**پرسیار:** چۆن ئیمامی(النّواوي) فەرمووی: هیچ حەدیسێكی(صحیح) لەبارەی قەدەغەكردنی لەبەرهەڵسان نەهاتووە؟ ئایا ئەم حەدیسە بەڵگەی قەدەغەكردن نیە؟ كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَتَمَثَّلَ لَهُ الرِّجالُ قِياماً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ﴾ رواه ابوداود والترمذي بسند حسن، **هەر كەسێك پێی خۆش بێ: پیاوان لە بەردەستی ڕابوەستن، با جێگەی خۆی لە ئاگر ئامادە بكا.**

**وەڵام:** ئەم حەدیسە نابێتە بەڵگەی قەدەغەكردنی لەبەرهەڵسان، چونكە واتەی لەبەرهەڵسانو واتەی لەبەردەست ڕاوەستان، جیاوازن: واتەی (يَتَمَثَّلَ لَهُ الرِّجالُ قِياماً) ئەوەیە: بەخۆی دانیشێو پیاوەكانیش بە پێوە لە بەردەستی ڕابوەستن، هەروەك عادەتی ستەمكارەكان ئەوهایە، جا بەم لێك جیاكردنەوەیە ئاشكرا بوو: هەڵسان لە بەر یەكتری سوننەتە، بەڵام ڕاوەستان بە پێوە لە بەر دەستی یەكتری حەڕامە، هەروەك ئیمامی (البیهقي) ئاماژەی بۆ كردوە. (شرح صحيح مسلم) ب(٧) ل(٣٦٣) و(تحفة المحتاج بحاشية الشرواني) ب(٩) ل(٢٢٩)، ب(٧) ل(٢٠٨).

**پێنجەم: ( ربا ) حەڕامە، لە خواردەمەنیو زێڕو زیوو پارەی ئەم سەردەمەدا،** پێغەمبەر ﷺ لەبارەی قەسپەكانی (خَيْبَر) فەرمووی: ﴿**قەسپی خراب بە زێدە لەجیاتی**

**باشەکە وەرمەگرە، قەسپە خرابەکان بە پارە بفرۆشە، ئینجا بەو پارەیە قەسپە باشەکە بکڕە﴾، واتە: تا نەبێتە ڕیبا، چونکە ڕیبا حەڕامە.**

**بزانە: ڕیبا لە گوناهەکانی هەرە گەورەیەو لە هیچ شەرعێکدا حەڵاڵ نەکراوەو لە قورئان‌و حەدیسدا هەڕەشەی توندی لە سەر هاتووە، خوای‌گەورە دەفەرموێ:** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ * فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِنَ اللهِ وَرَسُولِهِ﴾ البقرة: ٢٧٨-٢٧٩، **هۆ ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، لە خوا بترسن‌و ئەو ڕێبایەی ماوە وازی لێبێنن، ئەگەر ئێوە ئیماندارن، جا ئەگەر واز لە ڕیبا ناهێنن، ئاگادار ببنەوە بۆ جەنگێك لە لایەن خواو پێغەمبەرەوەﷺ.**

**هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿الرِّبَا ثَلاثَةٌ وَسَبْعُونَ باباً، أَيْسَرُهَا مِثْلُ أَنْ يَنْكِحَ الرَّجُلُ أُمَّهُ﴾ صححه الحاكم على شرط البخاري ومسلم، **ڕیبا حەفتاو سێ دەرگەیە، کەم گوناهترەکەیان وەکو ئەوەیە: پیاو زینا لەگەڵ دایکی خۆی بکا.**

**جا بزانە: گوناهی ڕیبا ئەم کەسانە دەگرێتەوە:** ﴿لَعَنَ رَسُولُ اللهِﷺ آكِلَ الرِّبَا وَمُوكِلَهُ وَكَاتِبَهُ وَشَاهِدَيْهِ، وَقَالَ: هُمْ سَوَاءٌ﴾ رواه مسلم واصحاب السنن، **پێغەمبەرﷺ لەعنەتی کردوە: لە ڕیبا خۆرو لە ڕیبا دەرو لە نوسەری مامڵەتی ڕیباو لە هەردوو شاهیدەکانی ڕیبا، فەرمووی: ئەوانە لە تاوانی ڕیبادا یەکسانن.**

**کەواتە: ئەم لەعنەتە ئەو موچەخۆرو نوسەرانەش دەگرێتەوە: کە لە بانکەکاندا لە بەشی ڕیبا کار دەکەن، واتە: ئەو بەشەی پارە بە قەرز دەداتە خەڵکی‌و زیادە وەردەگرێتەوە، چونکە ئیمام (مالك) گێڕاویەتیەوە: ڕیبای (جاهِلِيَّة)ی پێش ئیسلام ئەوە بوو: ئەگەر کەسێك قەرزێکی لە سەر کەسێك هەبوایە، پێی دەگوت: دەمدەیەوە، یان زیادی دەکەی؟ جا ئەگەر ماوەی دانەوەی دواخستبا، ئەویش مافی‌خۆی لە سەر زیاد دەکرد. ئیمامی(الطبري)ش هەر بەم جۆرەی گێڕاوەتەوە.**

**جا بزانە: جگە لە ڕیبای قەرز وەرگرتن-کە ئێستا لە بانکەکانی دەوڵەتدا زۆرە-هەندێك ڕیبای‌تر لە ئیسلامدا حەڕام کراون‌و لە کتێبەکانی حەدیس‌و شەرعدا باسیان کراوە، هەم چەند ڕیبای‌تریش لە بازاردا هەنە: وەك فرۆشتنی زێڕ بە قەرز، هەم گۆڕینەوەی پارە بە پارە بە قەرز، ئەم دووانە هەردووکی ڕیبانە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿...اَلذَّهَبُ بِالْوَرِقِ رِباً إِلاَّ هاءَ وَهاءَ﴾. **هەم** ﴿نَهَى رَسُولُ اللهِﷺ عَنْ بَيْعِ الذَّهَبِ بِالْوَرِقِ دَيْناً﴾ رواهما الشيخان، **زێڕ فرۆشتن بە زیو دەبی دەست بەدەست بێ. پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: زێڕ بە زیو بفرۆشرێ بە قەرز.**

**جا وردکردنەوەی پارەی ئێستا، هەم گۆڕینەوەی بە پارەی دەوڵەتێکی‌تر، هەمان بڕیاری ڕابردووی زێڕو زیوی بۆ دەدرێ، چونکە پارەی ئەم سەردەمە جێگری زێڕو زیوە،**

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿لا تَبيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ وَلاَ تَبيعُو الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ إلاّ مِثْلاً بِمِثْلٍ وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلاَ تَبيعُوا شَيْئاً غائِباً مِنْهُ بناجِزٍ إلاّ يَداً بِيَدٍ﴾ رواه الشيخان واللفظ لمسلم، **زێڕ بە زێڕ مەفرۆشن و زیو بە زیو مەفرۆشن تەنها بە وێنەی یەکتری نەبێ، بەشێکی ڕەگەزێکی زێڕ، یان زیو، لە سەر هەمان ڕەگەز زیاد مەکەن و هیچ زێڕو زیوێکی قەرزو نادیار مەفرۆشن بە حازرو بەرچاو، تەنها دەست بە دەست نەبێ.**

**ئاگاداری:** لەم سەردەمەدا کەسانێکی بێئاگا هەنە دەڵێن: پارەی ئەم سەردەمە (ریبا)ی تێدا نیە، بەڵام زەکاتی تێدایە!. سەیرە: بانێکەو دوو هەوایە، جا بۆ ئەوەی بزانی گۆتەی ئەوانە پوچەڵە، تەماشا بکە ئیمام (مالك)ﷺ فەرموویەتی: **(وَلَوْ أنَّ النّاسَ أَجَازُوا بَيْنَهُمْ الْجُلُودَ حَتَّى يَكُونَ لَهَا سِكَةٌ وَعَيْنٌ، لَكَرِهْتُهَا أَنْ تُباعَ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ نَظِرةً...)** ئینجا فەرموویەتی: **(لا يَجُوزُ فَلْسٌ بِفَلْسَيْنِ، وَلاَ تَجُوزُ الْفُلُوسُ بِالذَّهَبِ والْفِضَّةِ وَالدَّنانِيرِ نَظِرَةً)** نقله في المدونة: كتاب الصرف، واتە: **ئەگەر خەڵك لە نێوان خۆیاندا پیستەی ئاژەڵ بکەنە پارەو سیکەیەکی دیارکراوی هەبێ، ناپەسندی دەکەم -حەرامە-: بە زێڕو زیو بفرۆشرێ بە قەرز...** هەم فەرموویەتی: **دروست نیە فلسێك بە دوو فلس بدرێ، هەم دروست نیە: فلوس بە زێڕو زیو و دینار بدرێ بە قەرز.**

جا ئەی موسوڵمانی ڕێزدار باش بیر بکەوە: مەبەستی ئیمام (مالك) ئەوەیە: هەر شتێك سیکەی دەوڵەتی لێبدرێ، دەبێتە پارەو ریبای تێدایە، جیاوازی نیە ئەو پارەیە: لە پیستە دروست بکرێ، یان لە سفر -وەکو فلوس-، یان لە کاغەز: وەکو پارەی ئەم سەردەمە.

**چارەسەرێك:** ئەگەر کەسێك بیەوێ زێڕ بکڕێ و پارەشی نەبێ، دەتوانێ پارە قەرز بکا: لە خاوەن زێڕەکە، یان لە کەسێکی تر، ئینجا بەم پارە قەرزکراوە دەست بەدەست زێڕی حازر بکڕێ، تاکو توشی ڕیبا نەبێ.

**جا بزانە:** لە باسی (ربا)دا چاکی و خراپی لایەك و بە نرخی و کەم نرخی لایەك، هیچ کار لە حەرامی ڕیبا ناکا، بە بەڵگەی حەدیسەکەی قەسپەکانی (خَيْبَر)، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە کۆتایی حەدیسەکەدا فەرمووی: ﴿لا تَفْعَلُوا ولَكِنْ مِثْلاً بِمِثْلٍ، أَوْ بِيعُوا هَذا وَاشْتَرُوا بِثَمَنِهِ مِنْ هذا وَكَذلِكَ الْمِيزانُ﴾ رواه الشيخان، **ئەوها مەکەن واتە: باشەکان و خراپەکان بە زێدەو کەمی مەگۆڕنەوەو بە یەکتری مەفرۆشن، بەڵکو دەبی بە وێنەی یەکتری بن، یان ئەم خرابانە بە پارە بفرۆشن، ئینجا بە پارەی خراپەکان باشەکان بکڕن، واتە: تاکو توشی ڕیبا نەبن، خواردەمەنی بە کێشانی تەرازوش هەر ئەوهایە.**

## ﴿ فرۆشتنی ( عِينَة ) دروستە ﴾

جا ئیمامی(النـواوي) فەرموویەتی: ئەم حەدیسە بەڵگەی زانایانی(الشافعي)یە،

كه دەڵێن: كڕین‌و فرۆشتنی (عِینَة) حەڕام نیە، بەڵام ناپەسندە: وەك شتێك بە دوو سەد دینار–بە قەرز–بكڕێ‌و وەریبگرێ، ئینجا بە سەد دینار–بە حازر بیفرۆشێتەوە كڕیارەكە، یان كەسێكی‌تر. بەڵام هەندێك زانای‌ئایینی بە حەڕامیان داناوە.

**جا بزانە:** حەدیسەكەی حەڕامی‌ی (عِینَة) ئیمام (أبوداود) گێڕاویەتیەوە، بەڵام بێ‌هێزە، بۆیێ ئیمامی(الشافعي) ڕەفتاری پێ‌نەكردوە. (شرح صحيح مسلم) ب(٧) ل(٢–٢٢) و(فتح الباری) ب(٤) ل(٣٩٥–٣٩٧و٤٧٩و٥٠٥) و(المدونة الكبرى) ب(٣) ل(٤٨٧–٤٨٨) و(التاج الجامع للأصول) ب(٢) ل(٢١٠).

ئیتر باسی ڕیبا بە درێژی لە بەرگی سێیەمی (ڕووناكی رب العالمین)دا ڕوون كراوەتەوە، والحمد لله تعالى.

**شەشەم: لە غەزای (خَيْبَر)دا پێغەمبەرﷺ ژن هێنانی (اَلْمُتْعَة)ی حەڕام كرد.**

**(اَلْمُتْعَة):** ژن هێنانێكە بۆ كاتێكی دیاركراو، هیچ میرات لێككرتنیش لە نێوانیاندا نەبێ‌و هەر كاتێكیش كاتە دیاركراوەكە تەواو بوو، بە بێ تەڵاقدان لێك جیا دەبنەوە، جا ئیمامی (النواوي) فەرموویەتی: ئەم جۆرە ژن هێنانەی (الْمُتْعَة) دوو جار حەڵاڵ كراوەو دوو جاریش حەڕام كراوە:

**یەكەم:** لە سەرەتای ئیسلامدا حەڵاڵ بوو: بۆ ئەو كەسانەی ناچار بون‌و نەیاندەتوانی بۆ بەردەوامی ژن بێنن، ئینجا ئەم ژنهێنانەی (مُتْعَة) لە غەزای (خَيْبَر)دا حەڕام كرا ﴿عَنْ عَلِيٍّ كرم الله وجهه: أَنَّ النَّبِيَّﷺ نَهَى عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ يَوْمَ خَيْبَرَ وَعَنْ أَكْلِ لُحُومِ الْحُمُرِ الْإِنْسِيَّةِ﴾ رواه الشيخان، **پێغەمبەرﷺ ژن هێنانی (مُتْعَة)ی لە غەزای (خَيْبَر)دا حەڕام كردو هەم گۆشتی كەری كەیی=خۆماڵی‌ی حەڕام كرد.**

**دووەم:** دیسان لە (فَتْح مَكَّة)و لە غەزای (حُنَيْن) حەڵاڵ كراوە، ئینجا لە دوای سێ ڕۆژان بە یەكجاری هەتا هەتایی حەڕام كراوە ﴿عن سُبرَةَ بن مَعْبَد عن أَبيهِ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِﷺ قائِماً بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْبابِ وَهوَ يَقُولُ: يا أَيُّها النَّاسُ إِنِّي قَدْ كُنْتُ أَذِنْتُ لَكُمْ فِي الْإِسْتِمْتاعِ مِنَ النِّساءِ وَإِنَّ اللهَ قَدْ حَرَّمَ ذلِكَ إِلَى يَوْمِ الْقِيامَةِ، فَمَنْ كانَ عِنْدَهُ مِنْهُنَّ شيءٌ فَلْيُخَلِّ سَبِيلَهُ وَلاَ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيئاً﴾ رواه مسلم وأبوداود، لە (فَتْح مَكَّة)–یان (حَجَّة الْوَداع)– دیتم **پێغەمبەرﷺ لە نێوان قوڕنەی (الْحَجَرُ الْأَسْوَد)و دەرگەی (كَعْبَة) لە پێوە ڕاوەستابوو و دەیفەرموو: هۆ خەڵكینە، لە مەوپێش ئیزنم دابون بۆ ماوەیەكی دیاركراو–بە (مُتْعَة)– ژن بهێنن، ئێستاش خوای‌گەورە ئەم ژنهێنانەی (مُتْعَة)ی بە یەكجاری حەڕام كرد تا ڕۆژی قیامەت، جا هەر كەسێك ژنێكی لەو جۆرە ژنانەی بە (مُتْعَة)ی لە لایە، با وازی لێ‌بێنێ‌و ئەو مارەییەی داوتانە ئەو ژنانە هیچیان لێ‌وەرمەگرنەوە.**

كەواتە: بەم حەدیسە حەدیسەكانی‌تر– كە (مُتْعَة) حەڵاڵ دەكەن– گشتی (نَسْخ) بونەوەو بە (إجْماع)ی زانایانی‌ئیسلام: (مُتْعَة) تا ڕۆژی قیامەت هەر حەڕامە، هەروەك لە

حەدیسەکەدا فەرموویەتی، بەلاّم (شِیعَة)کانی(رافضِي) ئـەم ژنهێنانـەی (مُتْعَـة) بـە حـەلاّلْ دەزانن‌و ئەمەش نیشانەی گومڕابوونیانە.

جا حەزرەتی(ابن عَبّاس)-رضیالله عنهما- سـەردەمێك دەیگـوت: (مُتْعَـة) حەلاّلـە !. چـونکە ئـەم حەدیسەی نەبیستبوو، بەلاّم کـە حـەزرەتی(عبـدالله بـن الزُّبَیْـر)-رضیالله عنهما- بـووە گـەورەی (مَكّة)، بە حەزرەتی(ابن عَبّاس)ی ڕاگەیاند: ژنهێنانی (مُتْعَـة) حـەرام کـراوەو حەلاّلّیەکـەی (نَسْخ) بۆتەوە... ئینجا پـێی گـوت: ﴿جَرِّبْ نَفْسَكَ فَوَاللهِ لَئِنْ فَعَلْتَها لَأَرْجُمَنَّكَ بِأَحْجارِكَ﴾ رواه مسلم، خـۆت تـاقی بکـەوە، وَاللهِ ئەگـەر ژن بـە (مُتْعَة) بێنـی، هـەر بـە بـەردەکانی خۆت بەردبارانت دەکەم. واتە: چونکە دەبیە زیناکەر.

جا لە ئەنجامدا حەزرەتی(ابن عَبّاس)ش-رضیالله عنهما- لە (فتوا)یەکەی خۆی پەشـیمان بـۆوەو فـەرمووی: ﴿كانَتِ الْمُتْعَةُ فِي أَوَّلِ الْإِسْلامِ...فَكانَ الرَّجُلُ يَقْدَمُ الْبَلَدَ لَيْسَ لَهُ بِهـا مَعْرِفَـةٌ فَيَتَزَوَّجُ بِقَدْرِ ما يَرَى أَنَّهُ يَفْرُغُ مِنْ حاجَتِهِ...فَنَسَخَ اللهُ الْأُولَى فَحُرِمَتِ الْمُتْعَةُ﴾ وفي رواية عنه: ﴿هِيَ حَرامٌ كَالْمَيْتَةِ وَالدَّمِ وَلَحْمِ الْخِنْزِيـرِ﴾ رواهما البيهقي، (مُتْعَـة)=ژنهێنـانی کـاتی لـە سەرەتای ئیسلامدا دروست بوو...پیاو دەچووە شارێك ناسراوی لەوێ نەبو، جا ژنێکی بۆ خۆی دەهێنا بە ئەندازەی ئەو ماوەیەی دەیزانـی کارەکـەی لـەوێ تـەواو دەبێ...جا خوایگـەورە حـەلاّلکردنی (مُتْعَة)ی (نَسْخ) کردەوەو (مُتْعَة)ی حـەڕام کرا.—لە (رواية)ێکدا— فەرمووی: (مُتْعَة) وەك مردارو خوێن‌و گۆشـتی بـەراز حەڕامـە.

(شرح صحيح مسلم) ب(٦) ل(١١٨–١٣٠) و(فتح الباري) ب(٩) ل(٢٠٨–٢١٨).

***  ***  ***

## ﴿ نامەکانی پێغەمبەرﷺ بۆ پاشایەکان ﴾

ئینجا لە دوای پێکهاتنەکەی (الحُدَيْبِيَـة) لـە سـاڵی حەفتـەمی کۆچـیدا، پێغەمبـەرﷺ نامەی بۆ پاشایەکانی ولاّتەکان ناردن تاکو موسوڵمان بـبن، هـەر (صَحابَة)یـەکیش—کـە نامەکەی دەبرد— زمانی ئەو گەلەی دەزانی کە نامەکەی بۆ دەبردن.

جا کە ویستی نامەکان بنوسێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، پاشایەکان هیچ نامەیەك ناخوێننەوە، تەنها ئەگەر مۆرکراو بێ دەیخوێننەوە.

بۆیێ پێغەمبەرﷺ ئەنگوستیلەیەکی زیوی بۆ خۆی دروست کرد، بە سێ دێڕ لە سەری هەڵکەنـدرابوو: (مُحَمَّـد رَسُـولُ اللهِ)، جـا ئـەم نوسـینەش: لـە بنـەوەڕا بـۆ سـەرەوە دەخوێندراوە، تاکو وشەی (ألله) بکەوێتە سەرەوە. جا بەم ئەنگوستیلەیە نامەکانی مۆر دەکردن، جا تا وەفاتی کرد ئەم ئەنگوستیلەیەی هەر لـە دەسـتیخۆیدا بـوو، ئینجا لـە دوای وەفاتی، لە دەستی ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ، ئینجا لە دەستی ئیمام (عُمر)ﷺ، ئینجا لـە دەستی ئیمام (عُثمان)ﷺ تا لە ساڵی وەفاتکردنیدا ئەنگوستیلەکەی لێکەوتە ناو بـیری

(أَرِيس)، تا سێ ڕۆژان بۆی گەڕان نەیاندۆزیەوە.

جا پێغەمبەر نۆ نامەی بۆ نۆ پاشای وڵاتەكان ناردن، هەر یەكەیان جۆرە هەڵوێستو جۆرە وەڵامێكی هەبوو، بۆ نموونە:

**نامەی یەكەم:** بۆ (النَّجاشِي)ی پاشای (حَبَشَة)، ئەم نامەیە حەزرەتی(عَمْرِو بن أُمَيَّة الضَّمْرِي)ﷺ بۆی برد، جا كە (النَّجاشِي) نامەكەی بە دەست گەیشت، لە سەرچاوەكانی داینـاو موسوڵمان بوو، هەروەك لە باسی (كۆچكردن بۆ (حَبَشَة) ڕونمان كردەوە.

**نامەی دووەم:** بۆ (هِرَقْل) پاشای ڕۆم=(قَيْصَرِ رُوم)، ئەم نامەیە حەزرەتی(دِحْيَة الكَلْبِي)ﷺ بردیو لە ڕێگەی (الحارِث)ی گەورەی (بُصْرَى)وە حەزرەتی(دِحْيَة) گەیشتە (هِرَقْل)، كە لەو كات لە (بَيْتُ الْمُقَدَّس) بوو، جا كە (هِرَقْل) نامەكەی پێغەمبەریﷺ خوێندەوە، بە گەورە پیاوەكانی (رُوم)ی گوت: ئایا ئێوە بەختەوەریو مانەوی دەوڵەتی خۆتان دەوێ؟ پەیمان بدەنە ئەم پێغەمبەرەو شوێنی بكەون. جا پیاوە گەورەكانی (رُوم) ئەم قسەیان گوێ لێبوو وەك كەرە كێوی ڕەوینەوەو (صَلِيب)یان بەرز كردەوە، جا كە (هِرَقْل)ئەمەی دیت، ترساو پێی گوتن: مەبەستم تاقیكردنەوەی ئێوە بوو، ئایا ئێوە هەر لە سەر توندی خۆتانن بۆ ئایینەكەتان؟ جا ئەوانیش دڵیان خۆش بوو و سوجدەیان بۆ برد.

جا (هِرَقْل) زۆر ڕێزی لە (دِحْيَة) نا، دیاریەكو نامەیەكی بۆ پێغەمبەرﷺ پێدا ناردنو تێیدا نوسیبوو: (من موسوڵمانم، بەڵام توانام نیە ئیسلامەتیەكەم ئاشكرا بكەم). جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿دوژمنیخوا درۆ دەكا: موسوڵمان نیە هەر لە سەر گاوریەكەیەتی﴾. جا دیاریەكەشی بە سەر موسوڵماناندا بەش كرد.

**نامەی سێیەم:** بۆ (كِسْرَى)ی پاشای (فارس)، ئەم نامەیە، حەزرەتی(عبدالله بن حُذافة السَّهْمِي)ﷺ بۆی برد، ئینجا كە سەرەتای نامەكەی بۆ خوێندراوە و تێیدا نوسرابوو: (مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللهِﷺ إِلَى كِسْرَى عَظِيمِ فَارِس)، یەكسەر نامەكەی دڕاند، چونكە پێغەمبەرﷺ ناویخۆی لە پێش ناوی ئەویدا نوسیبوو، جا فەرمانی دا: حەزرەتی (عبدالله)شیان دەركردە دەرەوە، جا كە حەزرەتی(عبدالله)ﷺ گەڕاوە (مَدِينَة)و هەواڵەكەی بۆ پێغەمبەرﷺ گێڕاوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿خودا دەوڵەتەكەی پارچە پارچە بكا﴾.

ئینجا (كِسْرَى) فەرمانی بە (باذان) كرد–كە كارگێری خۆی بوو لە (يَمَن)–: دوو پیاو بنێرە (حِجاز)، تاكو ئەم پیاوە–مُحَمَّدﷺ– دەستگیر بكەنو بیهێننە لای من!. جا (باذان) دوو پیاوی بەهێزی خۆی ناردنو نامەیەكیشی دانە دەست، تێیدا فەرمانی بە پێغەمبەرﷺ كردبوو: لەگەڵیاندا بڕواتە لای (كِسْرَى)!.

جا كە ئەم دوو پیاوە هاتنە (مَدینَة)و چونە خزمەت پێغەمبەرﷺ، دیتی هەردوو پیاوەكان ڕیشی خۆیان تاشیوەو سمێڵەكانیشیان بە گەورەیی هێشتونەوە، بۆیێ پێغەمبەرﷺ پێی ناخۆش بوو تەماشایان بكا-واتە: ڕووی‌خۆی لێوەرگێران- جا فەرمووی: (ماڵوێرانینە كێ فەرمانی پێ‌كردون: ئەوها بكەن؟) ئەوانیش گوتیان خودامان (كِسری) ئەوها فەرمانی پێ كردوین. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵام خودای من فەرمانی پێ كردوم: سمێڵم كورت بكەم‌و ڕیشم بەرهەڵدەم.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سبەینێ وەرنە لام وەڵامی نامەكەتان دەدەمەوە. جا سبەینێ هەردوو پیاوەكان هاتنەوەو پێغەمبەریشﷺ (وَحي)ی بۆ هاتبوو: كە لە كاتژمێری شەشی شەوی سێ‌شەممەی دەی مانگی(جُمادَی‌الأُولَی)ی ساڵی حەفتەمی كۆچی، (كِسْری) بە دەستی كوڕی خۆی (شێروێیە) كوژراوە.

جا پێغەمبەرﷺ ئەم هەواڵەی بە دوو پیاوەكەدا بۆ (باذان) نارد، هەم فەرمووی: ئەگەر تۆ موسوڵمان ببی، لە سەر دەسەڵاتی خۆت لە (یَمَن) دەتهێڵمەوە. جا ئەو دوو پیاوە گەڕانەوە بۆ (یَمَن)و هەواڵەكەیان گەیاندە (باذان)، جا هەندەی پێ‌نەچو هەواڵی كوشتنی (كِسری) بەگوێرەی فەرموودەكەی پێغەمبەرﷺ بۆ (باذان) هات، جا (باذان) خۆی‌و گەلەكەی موسوڵمان بونو هەواڵی موسوڵمانبوونیشیان بۆ پێغەمبەرﷺ نارد.

**نامەی چوارەم:** بۆ (شُرَحبیل الغَسَّاني) گەورەی (بُصری)، ئەم نامەیە حەزرەتی(الحارِث الأَزدِي)ﷺ بردی، بەڵام (شُرَحبیل) یەكسەر پەلبەستی كردو كوشتی، هەروەك لە غەزای (مُؤْتَة)دا ڕوونی دەكەینەوە، إن شاء الله تعالی.

**نامەی پێنجەم:** بۆ (المُقَوْقِس)ی (القِبطِي) پاشای (مِصر)، ئەم نامەیە حەزرەتی(حاطِب بن أبی‌بَلْتَعَة)ﷺ بۆی بردو لە (الأسنكَدَرِیَّة) دایە دەستی، جا كە (المُقَوْقِس) نامەكەی خوێندەوە، بە حەزرەتی(حاطِب)ی گوت: ئەگەر (مُحَمَّد) پێغەمبەرە، بۆچی دوعای لە دژو نەیارانی خۆی ناكا: خوا لەناویان ببا؟ جا حەزرەتی(حاطِب)ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: تۆ باوەڕت بە پێغەمبەرایەتی (عِیسی ابن مَرْیَمَ)عليه السلام هەیە؟ (المُقَوْقِس) گوتی: بەڵێ. حەزرەتی(حاطِب)ﷺ فەرمووی: ئەی بۆچی لەو كاتەی ویستیان بیكوژن، ئەویش دوعای لە دژو نەیارەكانی خۆی نەكرد خوا لەناویان ببا؟ جا (المُقَوْقِس) گوتی: وەڵامێكی جوانت دامەوە، تۆ دانای‌و لە لایەن دانایێكەوە هاتوی!.

جا (المُقَوْقِس) نامەكەی پێغەمبەریﷺ ماچ كردو بە حەزرەتی(حاطِب)ی گوت: گەلەكەم گوێڕایەڵم نابن بۆ موسوڵمانبوون، منیش نامەوێ پاشایەتی خۆم لەدەست بدەم، واتە: موسوڵمان نابم.

ئینجا بە ڕێزلێنانەوە حەزرەتی(حاطِب)ی وەرێ‌كردو (مارِیَة)و (سِیرِین)-كە دوو

کەنیزە بون– لەگەڵ هێسترێکی سپی کە ناوی (دُلدُل) بوو، لەگەڵ پزیشکێكو چەند دیاریەکیتری بۆ پێغەمبەرﷺ ناردن، جا پێغەمبەرﷺ پزیشکەکەی گەڕاندەوەو فەرمووی: ﴿ئێمە تا برسی نەبین خواردن ناخۆین، کە خواردنیشمان خوارد خۆمان تێر ناکەین﴾. واتە: بۆیێ نەخۆش نابینو پێویستیمان بە پزیشك نیە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ (سیرین)ی پێشکەش بە حەزرەتی(حَسّان بن ثابت) کردو (مارِیَة)شی بۆ خۆی دانا، لەم (مارِیَة)یە خوایگەورە (إبراهِیم)ی پێ بەخشی–کە سێیەمین کوڕی پێغەمبەر بووﷺ– بەڵام (إبراهِیم)ش وەکو کوڕەکانیتری بە منداڵی لە تەمەنی دووساڵیدا وەفاتی کرد.

**نامەی شەشەم:** بۆ (المُنذِر بن ساوِی) پاشای (اَلبَحرَین)، ئەم نامەیەش حەزرەتی(العَلاء بن الحَضرَمي)ﷺ بۆی برد، جا بەم نامەیە (المُنذِر)و چەند کەسێکیتر لە (البَحرَین) موسوڵمان بون.

**نامەی حەفتەم:** بۆ (جَیفَر)و (عَبد)–کە هەردووکیان برا بونو گەورەی (عُمان) بون– ئەم نامەیەش حەزرەتی(عَمرو بن العاص)ﷺ بۆی بردنو هەردووکیان موسوڵمان بون...هەروەها چەند نامەیەکیتریش لە بەر درێژی نەمنوسین.

## ﴿ (عُمْرَةُ الْقَضاء) عومرەکەی بڕیاردراو ﴾

واتە: لە تۆڵەی عومرەکەی ساڵیڕابردوو، کە کافرەکانی (قُرَیْش) ڕێگەیان لێگرت. ئینجا لە مانگی (ذیالقَعْدَة)ی ساڵی حەفتەمی کۆچی، پێغەمبەرﷺ لەگەڵ دوو هەزار (صَحابَة)ﷺ چونە (مَکّة) بۆ (عُمرَة)، جا پێغەمبەرﷺ سەد ئەسپو چەکێکی زۆری لەگەڵ خۆیا بردو لە نزیك (حَرَمِ مَکّة) بۆ پاریزکاری لەگەڵ دوو سەد (صَحابَة) بە ئامادەباشی دانا، واتە: تاکو ئەگەر (قُرَیْش) خیانەتێك بکەن، چەكو کەرستەی جەنگ لێیان نزیك بێو زوو فریایان بکەوێ.

جا پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کان چونە ناو (مَکّة)، گەورەکانی (قُرَیْش) لە (مَکّة) چونە دەرەوە، تاکو پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانﷺ نەبینن، هەندێکیتریش لە لای (دارُ النّدوَة)و چیایەکەی بەرامبەر (بَیْت) دانیشتن تا تەماشای پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کان بکەن، چونکە دەنگۆی ئەوەیان بڵاو کردبۆوە: کە پێغەمبەروﷺ(صَحابَة)کان بە هۆی تاو نەخۆشیی (مَدینَة) بێهێز بوینە، جا خوایگەورە پێغەمبەریﷺ لەم دەنگۆیە ئاگادار کردەوە، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ﴿رَحِمَ اللهُ امْرأً أَراهُمْ مِنْ نَفْسِهِ قُوَّةً﴾ خوا ڕەحم بەو کەسە بکا: کە هێزیخۆی نیشانی کافرەکان دەدا.

جا پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانﷺ بە پەشتەماڵەکانیان شانی چەپەیان داپۆشیو ڕاستەیان ڕووت کردو بە تاڵوکە سێ تەوافان ڕۆیشتنو چوارەکەیتریش بە ڕۆیشتن

دەرِۆیشتن، جا کە کافرەکان توندوتۆڵی (صَحابَة)کانیان دیت، بە یەکتریان گوت: ئەوانە بون ئێوە وا تێگەیشتبون تای (مَدِینَة) بێهێزی کردون؟ ئەوانە لەو شتە بەهێزترن، ئەوانە وەك ئاسك رِادەپەرِن!.

ئینجا کە (عُمْرَة)یان تەواو کرد، پێغەمبەرﷺ هەندێك (صَحابَة)ی ناردنە شوێنی ئەو چەكو ئەسپەی لە نزیك (مَكَّة) دانابوو، تاکو ئەو دوو سەد (صَحابَة)یەش بێن عومرەی خۆیان بکەن.

ئینجا لە دوای عومرە، سێ رِۆژان لە (مَكَّة)دا مانەوەو لەو ماوەیەشدا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(مَيْمُونَة)ی-رضي الله عنها- لەخۆی مارەکرد، جا ویستی هەر لە (مَكَّة) بیگوازێتەوەو زیافەتی بوك گواستنەوەش لە (مَكَّة)دا بکا، بەڵام لە دوای تەواوبوونی سێ رِۆژان کافرەکان هیچیتر رِێگەیان نەدایێ لە (مَكَّة)دا بمێنێتەوە، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە (صَحابَة)کان کرد لە (مَكَّة) رِۆیشتنە دەرەوەو بەخۆیشی لە رِێگەدا –لە (سَرِف)– لە حەزرەتی(مَيْمُونَة) رضي‌الله عنها بووە زاوا.

ئینجا کە گەرِاوە (مَدِينَة)، سێ گەورە پیاوی (قُرَيْش)–کە (خالِد بن الْولِيد)و (عَمْرو بن الْعاص)و (عُثمان بن طَلْحَةالحَجَبِي) بون– هاتنە (مَدِينَة)و موسوڵمان بون، والحمد لله تعالى. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٥٨٨–٥٩٥و٦٢٥–٦٣٥) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٨٧–٩٣و٣٣٧و٣٥٦).

## ﴿ گوڵبژێریك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: پێغەمبەرﷺ نامەی بۆ پاشایەکان نارد**...نامە ناردنی پێغەمبەرﷺ بۆ گەورە پیاوانی وڵاتەکان شێوازێکی نوێی بانگەوازیی ئیسلام بوو، چونکە تا پێکهاتنەکەی (الْحُدَيْبِيَة) موسوڵمانەکان–شان بە شانی بانگەوازیی ئیسلام–هەر لە قۆناغی بەرگریدا بون، وا ئێستاش لە دوای پێکهاتنەکەی (الْحُدَيْبِيَة)، موسوڵمانان حەسانەوەو دڵنیا بون: کە (قُرَيْش) هیچیتر جەنگ ناکا، بۆیێ شێوازێکیتری بانگەوازیو جەنگکردن دەستی پێکرد: کە پێناساندنی ئیسلامە بە گشت ئەو کەسانەی دەتواندرێ بانگەوازیی ئیسلامیان بگەیەندرێتی، جا ئەگەر موسوڵمان نەبون، ئەو کاتە لە رِێگای‌خوا جەنگیان لەگەڵ دەکرێ، جا ئەم قۆناغە بووەتە برِیارێکی شەرعی تا رِۆژی قیامەت.

جا بەم نامە ناردنەش هەڵوێستی پاشاو گەورە پیاوانی وڵاتەکان بۆ پێغەمبەرﷺ ئاشکرا بوو، بە ئاشکرابوونی ئەم هەڵوێستەش پێغەمبەرﷺ توانی بەرنامەیەکی رامیاریو سەربازی بۆ رِووبەرِووبوونەوەی ئەو دەوڵەتانە دابنێ.

**پرسیار:** چۆن رِەوایە کافرەکان–کە خاوەن بیرو باوەرِی خۆیانن– ئازادییان لێ زەوت بکرێو بە زۆر بهێندرێتە ناو ئاینیئیسلام؟

**وەڵام:** ئەی تۆ چۆن بە رِەوای دەزانی هاووڵاتیان بە زۆر ملکەچی ئەو یاسا دەستکردە بن

کە پیاوەکانی دەوڵەت بە بۆچوونی خۆیان دایدەڕێژن! کە ئەوانیش وەکو ئەوان ئادەمیزادن؟ خۆ ئادەمیزاد بۆ ئەوە دروست نەکراوە ببێتە کۆیلەی بۆچوونی کەسێکیتر، بەڵکو بۆ ئەوە دروست کراوە لە سەر ئەم زەویەدا خوا بپەرستێ، چونکە خوا ئەوی دروست کردوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات: ٥٦، **من جنۆکەو ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردون تا بمپەرستن.**

**بەڵێ**: زۆر زۆر بەڕەوای دەزانین: ئادەمیزاد ملکەچی بڕیاری ئەو خودایە بێ: کە دروستی کردوەو دەیژیێنێو دەیمرێنێ، بەڵام زۆ زۆر بە ستەمیشی دەزانین: ئادەمیزاد ڕزقی خوا بخواو لە هەمان کاتیشدا قبوڵ بکا ببێتە کۆیلەی بۆچوونی دروستکراوێکی وەکو خۆیو ئازادیی لێزەوت بکرێو لە سەر زەمینی خوا دوژمنایەتی خوا بکا. بەڵێ: مرۆڤ هەرچەند بەندەی خوایخۆی بێ، هەر بە ئازادی دەژیێ، چونکە خۆی بە قەرزداری خوایخۆی دەزانێ، بەڵام لە پێناوی چیدا ملکەچی دروستکراوێکی وەکو خۆی بێ: کە ناتوانێ ڕزقی بداتێو بیژیێنێو مردنی لە سەر لابداو ئەویش وەکو ئەوی دروستکراوی خوا بێ؟. بە دەستکاریەوە لە (فقه السيرة، للبوطي) ل(٣٧٣).

**دووەم: پێغەمبەرﷺ ئەنگوستیلەیەکی زیوی بۆ خۆی دروست کرد.**

**بزانە**: ئەنگوستیلە ئەوەیە: گلێنەی هەبێ، چونکە ئەگەر گلێنەی نەبێ، پێی دەگوترێ: ئاڵقە. ﴿عَنْ أَنَسٍ: كَانَ خاتَمُ رَسُولِ اللهِﷺ مِنْ فِضَّةٍ وَكَانَ فَصُّهُ مِنْهُ﴾ رواه البخاري، وعَنه: ﴿فِيهِ فَصٌّ حَبَشِيٌّ﴾ رواه مسلم، **ئەنگوستیلەی پێغەمبەرﷺ زیو بوو، گلێنەکەشی هەر لە خۆی بوو، بەردێکی (عَقِيق)ی(حَبَشِي)ی تێدا بوو.**

ئیمامی(الحلبي) فەرموویەتی: لەم بەردەی گلێنەکە (مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله) هەڵکەندرابوو.

جا بە (إِجْماع)ی زانایانیئیسلام: سوننەتە ئەنگوستیلە لە پەنجەی قلیچە=هەرە بچکۆلەکەدا بێ، جیاوازی دەستی ڕاستەو چەپەش نیە ﴿عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّﷺ: لَبِسَ خاتَمَ فِضَّةٍ فِي يَمِينِهِ﴾ وعَنه: ﴿كانَ خاتَمُ النَّبِيِّﷺ فِي هذِهِ، وَأَشارَ إِلَى الْخِنْصَرِ مِنْ يَدِهِ الْيُسْرَى﴾ رواهما مسلم، **پێغەمبەرﷺ ئەنگوستیلەیەکی زیوی دە دەستی ڕاستەی کردبوو، جارێکیتر: دەپەنجەی قلیچەی دەستی چەپەی کردبوو.**

﴿عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ: عَنِ النَّبِيِّﷺ: أَنَّهُ نَهَى عَنْ خاتَمِ الذَّهَبِ﴾ رواه الشيخان، **پێغەمبەرﷺ ئەنگوستیلەی زێڕی قەدەغە کردوە.**

جا بە (إِجْماع)ی زانایانیئیسلام: ئەنگوستیلەی زێڕ بۆ پیاوان حەرامە، بەڵام بۆ ئافرەتان حەڵاڵە. (شرح صحيح مسلم) ب(٨) ل(٣٨٠-٣٨٨) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٣٣٨).

**سێیەم: گفتوگۆی (هِرَقْل)و (أَبُوسُفْيان) لەبارەی پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەرﷺ نامەی بۆ (هِرَقْل)ی گەورەی ڕۆم نارد. بزانە: پاشایەکانی ڕۆم پێیان دەگوترا: (قَيْصَر). هەروەك**

پادشایەکانی فارس پێیان دەگوترا: (كِسْرى). جا (قَيْصَر) بـە واتـەی لەتکردنـە، چـونکە دایکی (قَيْصَر) لە حاڵەتی منداڵ لێبووندا مرد، (قَيْصَر)ش هەر لە ناو زگیدا زینـدوو بـوو، جا زگیان هەڵدڕیو (قَيْصَر) بە زیندوویی دەرهێنـدار، بۆیـێ: پزیـشکەکانی ئێـستاش بـەم جۆرە نەشتەرگەریە دەڵێن: **نەشتەرگەریی (قَيْصَرِي).**

جا لە کاتی نامە ناردنەکەدا (أَبُوسُفْيان) بۆ بازرگانی لە (شام) لە شاری (غَزَّة) بوو–هێشتا موسـوڵمان نـەبوبوو–(هِرَقْـل)ش لـەو کاتـدا لـە (بَيْـتُ الْمُقَـدَّس) بـوو، جـا سـەرکردەی پاسەوانەکانی (هِرَقْل) هات، (أَبُوسُـفْيان)و هاوڕێکـانی بردنـە لای (هِرَقْـل)، تـاکو لـەبارەی پێغەمبەروﷺ پرسیاریان لێبکا، جا (هِرَقْل) گوتی: کامەتان نەژادی لەم پیاوە نزیکترە: کە وا تێدەگا پێغەمبەرەﷺ؟ (أَبُوسُفْيان)گوتی: من لە هەمووانیان لە نـەژادەوە نزیکترم. واتە: چونکە (عَبْدُ مَناف) باپیرەی چوارەمی پێغەمبەروﷺ (أَبُوسُفْيان) بوو.

جا (هِرَقْل) گوتی: ئەم پیاوەی دەڵێ پێغەمبەرم، نەژادی لە ناو ئێوەدا چۆنە؟ (أَبُوسُفْيان) گوتی: خاوەن نەژادێکی گەورەیـە. (هِرَقْـل) گـوتی: پـێش ئـەم پیـاوە کەسـێتر لـە ئێـوە گوتویەتی من پێغەمبەرمﷺ؟ (أَبُوسُفْيان) گوتی: نا. (هِرَقْل) گوتی: لە باوكو باپیرانی ئەم پیاوە کەسێکیان پاشا بوو؟ (أَبُوسُفْيان) گوتی: نا. (هِرَقْل) گوتی: گەورە پیـاوان شـوێنی دەکەون، یان بێهێزو چەوساوەکان–لە (رِوايَة)ێکدا: یان گەنجەکان–؟ (أَبُوسُفْيان) گـوتی: بـێهێزو هـەژارو گەنجـەکان شـوێنی دەکـەون. (هِرَقْـل) گـوتی: شـوێنکەوتەکانی لـە زیادبووندانە؟ (أَبُوسُفْيان) گوتی: بەڵێ لە زیادبووندانـە. (هِرَقْـل) گـوتی: هـیچ کەسـێك لـە شوێنکەوتەکانی کافر دەبنـەوە؟ (أَبُوسُـفْيان) گـوتی: نـا، کـافر نابنـەوە. (هِرَقْـل) گـوتی: پێشتر بە درۆکردن تۆمەتبارتان کردوە؟ (أَبُوسُفْيان) گوتی: درۆمان لێنەدیتووە. (هِرَقْـل) گوتی: فێڵو خیانەت دەکا؟ (أَبُوسُفْيان) گوتی: نا، بـەڵام ئێـستا ئێمـەو ئـەو لـە پـەیمانی جـەنگ وەسـتاندنداین، نـازانین چـی دەکـا. (هِرَقْـل) گـوتی: جـەنگتان لەگـەڵ کـردووە؟ (أَبُوسُفْيان) گوتی: بەڵێ. (هِرَقْل) گوتی: جەنگتان چۆن بوو؟ (أَبُوسُـفْيان) گـوتی: جارێـك ئەو سەردەکەوتو جارێك ئێمـە. (هِرَقْـل) گـوتی: فـەرمانی چـیتان پێدەکـا؟ (أَبُوسُـفْيان) گوتی: پێمان دەڵێ تەنها خوا بپەرستنو هاوبەشی بۆ دامەنێنو نوێژ بکەنو ڕاستی بڵـێنو داوێنپاك بن...هتد.

جا (هِرَقْل) گوتی: تۆ چۆن وەڵامی منت داوە، پێغەمبەرانو شوێنکەوتەکانیان ئەوهانە، جا ئەگەر وەڵامەکانی تۆ ڕاست بن، ئەو پیاوە دەسەڵاتی دەکەوێتـە سـەر شـوێنی پێیـەکانی من–واتە: (بَيْتُ الْمُقَدَّس) دەکەوێتـە ژێـر دەسەڵاتیئیـسلام– مـن دەمزانـی پێغەمبـەرێکی ئەوها پەیدا دەبێ، بەڵام نەمدەزانی لـە ئێوەیـە، ئەگـەر بـزانم دەگەمـە لای، خـۆم مانـدوو دەکرد تا دەیگەیشتمێو بەخۆم هەردوو پێیەکانی ئەوم دەشوشتن.

کەواتــە: (هِرَقْـل) پاشـایەتیی پێخۆشـتر بـوو لـە موسـوڵمانبوون، ئەگـەر نـا: دەیزانـی پێغەمبەرﷺ ڕاست دەکاو پێغەمبەری ئاخیر زەمانەﷺ، خۆ ئەگـەر (هِرَقْـل) بـە تـەواوی بیری لە فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ کردباوە، کە لە نامەکەیدا نوسیبووی: (أَسْلِمْ تَسْلَمْ) موسوڵمان ببە، سەلامەت دەبی. ئەوە ئەگەر موسوڵمان بوبا، سـەلامەت دەبـوو، بـەڵام موسوڵمان نەبو، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: ﴿كَذَبَ بَلْ هُوَ على نَـصْرانيَّتِهِ﴾ (هِرَقْل) درۆ دەکا، هەر لە سەر گاوریەکەی خۆیەتی. (فتح الباری) ب(١) ل(٤٣–٥٢).

**چـوارەم: هێـشتنەوەی ڕیـش سـوننەتە.** **پێغەمبـەرﷺ پـێی نـاخۆش بـوو تەماشـی پیاوەکانی (کِسْری) بکا، چونکە سمێڵ گەورەو ڕیش تراشـراو بـون، پێغەمبـەرﷺ** فەرموویـەتی: ﴿خالِفُوا الْمُشْرِكِينَ، أَحْفُوا الشَّوارِبَ وَأَعِفُّوا اللِّحَى﴾ رواه الـشيخان، **خۆتـان لـە کافرەکان جیا بکەنەوە سمێڵەکانتان ببڕنو ڕیشتان بهێڵنەوە.**

**بزانـە:** لەبارەی ڕیش هەڵگرتن، هەنـدێ لـە زانایانیئـایینی فەرموویانـە: هـیچ دەسـتکاری ڕیشی نەکا: نـە لـە درێـژیو نـە لـە بـەرینی هیـچی لێنـەبڕێ. جـا ئیمـامی(النـواوي) ئـەم فەرموودەیەی هەڵبـژاردوە، هەنـدێ زانـایتریش فەرموویانـە: وا جوانـە: ئـەو مووانـەی لـە بەرینی زیاد بوینە بیانبڕێ، هەم لە درێژاییش ئەوەی لە گرتنی لەپەدەست زیـادە بیـبڕێ، هەروەك حەزرەتی(ابن عمر)رضيالله عنهما وای دەکرد.

**لەبارەی سمێڵ:** هەندێ زانایئـایینی فەرموویانـە: لـە سـەر پییـستە سمێڵـەکانی دەبـڕیو هیچی نـاهێڵێ. جـا ئەمـەیان مەزهـەبی ئیمـام (أبوحنیفـة)و ئیمـام (أحمـد)ە، بەڵگەشـیان حەدیسەکەیڕابردووە؟ چونکە لە لای ئەم زانایانە واتەی (أَحْفُوا): بنەبڕکردنە.

بەڵام هەندێ لە زانایانی(الحنفي) فەرموویانە: لە حاڵەتی جەنگدا دروستە: پیاو سمێڵەکانی بهێڵێتەوە، تاکو دوژمن لێی بترسێ.

هەروەها چەند زانایەکیتریش فەرموویانـە: نـابی سمێڵـی خـۆی بنـەبڕ بکـا، بـەڵکو ئیمـام (مالك) فەرموویەتی: تراشینی سمێـڵ هەتککردنـەو هـەر کەسـێك سمێڵـی بتاشـێ، تـەمبێ دەکرێ...هەم فەرموویەتیی تاشینی سمێڵ (بِدْعَة)یە.

جا ئیمامی(النواوي) دەفەرموێ: فەرموودەی هەڵبژێردراو ئەمەیـە: سمێـڵ بنـەبڕ نـەکرێن، بەڵکو لە سەر لێوەکان ببڕدرێن تا ڕۆخی لێوەکان دەردەکەون، چونکە لە لای ئەم زانایانە (أَحْفُوا) بە واتەی کورتکردن هاتووە، نەك بنەبڕکردن، هەم ﴿عَنْ زَيْد بن أَسْلَم: أَنَّ عُمَرَرضي الله عنه كانَ إذا غَضِبَ فَتَلَ شارِبَهُ﴾ رواه الإمام مالك، ورواه الطبراني، قال الحافظ الهيثمي: رجاله رجال الـصحيح، خلا عبدالله بن أحمد وهو ثقة مأمون، **کە ئیمام (عُمر)رضي الله عنه توڕە دەبوو، سمێڵی خۆی لول دەدا.**

واتە: سمێڵەکانی ئەوەندە هێشتۆتەوە بکەوێتە بەر پەنجەکانیو لولی بدا، هەروەك (الحافظ ابن حجر العـسقلاني) فەرموویـەتی. (شـرح صـحيح مـسلم) ب(٢) ل(٢٦٤و٢٦٨) و (فـتح البـاري) ب(١٠)

ل(٤٢٦–٤٣٠) و(مجمع الفوائد ومنبع الفوائد) ب(٥) ل(٢١٦).

**پێنجەم: (اَلْمُقَوْقَس) بە (حاطِب)ی ﷺ گوت: تۆ دانای، لە لای داناێکەوە هاتوی.**

بەڵێ: ئەوها گەورە پیاو گەورە پیاوان دەناسن، بە تەنها وەڵامەکەی حەزرەتی(حاطـِب) رضي الله عنه (اَلْمُقَوْقَس) زانی: پێغەمبەرﷺ داناو ڕێزدارە. جا هەر چەند موسوڵمانیش نەبو، بەڵام دیاریەکی پاشایانەی بۆ پێغەمبەرﷺ نارد–هەروەك باسمان كرد– کەوابوو: دەبی کاربەدەستی موسوڵمانان پیاوی شیاو و لێهاتوو بکاتە نوێنەریخۆی، تا لە کارەکانیدا سەرکەوتوو بێ، پێشینەی عەرەب گوتویانە: (رَسُولُكَ حاجَتُكَ) نێردراوی خۆت پێویستیەکەی خۆتە.

واتە: ئەگەر نێردراوەکەت لێزان و لێهاتوو بێ، کارەکەت بۆ پێك دێنێ.

بەڵێ: پێغەمبەرﷺ هەر (صَحابَة)یەکی نامەکەی پێدا ناردبوو، زمانی ئەو وڵاتەی دەزانی، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ کارلەجێیی پێغەمبەرﷺ، کە بۆ هەر شوێنێك پیاوێکی شیاوی خۆی دادەنا، هەم بەڵگەیە: کە فێربوونی زمانەکانیتری جگە لە زمانی خۆت، سوننەتێکی پێغەمبەرەﷺ، حەزرەتی(زَيْد بن ثابت) رضي الله عنه فەرموویەتی: ﴿أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِﷺ أَنْ أَتَعَلَّمَ لَهُ كِتابَ يَهُودَ، قالَ إِنِّي وَاللهِ ما آمَنُ يَهُودَ عَلَى كِتابٍ، قالَ: فَما مَرَّ بِي نِصْفُ شَهْرٍ حَتَّى تَعَلَّمْتُهُ لَهُ، فَلَمَّا تَعَلَّمْتُهُ كانَ إِذا كَتَبَ إِلَى يَهُودَ كَتَبْتُ إِلَيْهِمْ وَإِذا كَتَبُوا إِلَيْهِ قَرَأْتُ لَهُ كِتابَهُمْ﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، **پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکردم: نوسینی زمانی جولەکەکان فێر ببم و فەرمووی: من لە هیچ نوسینێك لێیان دڵنیا نیم. جا نیو مانگ نەڕۆیشت نوسینەکە فێر بوم، جا من نامەی پێغەمبەرمﷺ بۆ جولەکەکان دەنوسی و نامەی ئەوانم بۆ پێغەمبەرﷺ دەخوێندەوە.**

جا جگە لە زمان زانینیش: پێویستە نوێنەرەکە زمانێکی ڕەوانی هەبێ و قسە زان بێ، هەم لە بواری نوێنەرایەتیەکەشی زانستی تەواوی هەبێ، تەماشا بکە: چۆن حەزرەتی(حاطب) رضي الله عنه بە یەك وەڵام پاشای (مِصْر)ی بێدەنگ کرد. هەم پێویستە نوێنەرەکە خۆڕاگر بێ و ئازاو نەترس بێ، هەروەك نێردراوەکانی پێغەمبەرﷺ هەزاران کیلۆ مەتر ڕۆیشتن و نامەکانیان گەیاندە جێ و لە کۆشکی پاشەیەکانیشدا نەحەپەسان و ترس و لەرز داینەگرتن.

هەروەها پێویستە نوێنەرەکەش بەژن و باڵاو شێوەیەکی جوانی هەبێ و بەرچاو بێ، هەوەك لەبارەی نێردراوەکان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِذا أَبْرَدْتُمْ إِلَيَّ بَرِيداً، فَابْعَثُوهُ حَسَنَ الْوَجْهِ حَسَنَ الْإِسْمِ﴾ حديث حسن رواه الطبراني فی الأوسط، **کاتێ نێردراوێکتان ناردە لای من، یەکێکی وەها بنێرن: شێوەی ڕووی جوان بێ و ناوی جوان بێ.** (فیض القدیر ب(١) ل(٣٠٦) و(التاج الجامع للأصول) ب(٥) ل(٢٥٣) و(سیرة الصلابي) ب(٢) ل(٤٣٦و٤٣٧)

**شەشەم: لە (عُمْرَةُ الْقَضاء)دا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(مَيْمُونَة)ی رضي الله عنها لەخۆی مارە کرد.**

حەزرەتی(مَيْمُونَة)-رضي الله عنها- دوايین ژن بوو پێغەمبەرﷺ لەخۆی مارەکرد، جا لە ساڵی

پەنجاو یەکی کۆچی لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا لە (سَرِف) وەفاتی کردو هەر لەوێش نێژرا، واتە: لەو شوێنەی پێغەمبەرﷺ لێی بوبووە زاوا. (عظماء حَوْلَ الرَسُولِ) ب(١) ل(٢٠٢).

**جا بزانە:** لە حەدیسەکەی (ابن عَبّاس)دا-رضیالله عنهما- دەفەرموێ: ﴿تَزَوَّجَ رَسُولُ اللهِﷺ مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ﴾ رواه الشيخان، **پێغەمبەرﷺ (مَيْمُونَة)ی لەخۆی مارە کرد، لەو کات لە ئیحرامدا بوو.** جا ئیمامی(الحنفي) بەبەڵگەی ئەم حەدیسە دەفەرموێ: مارەبڕین لە ژێر ئیحرامدا دروستە. بەڵام هەر سێك ئیمامەکەیترو کۆمەڵە زۆرەکەی زانایانیئیسلام فەرموویانە: مارەبڕینی ژێر ئیحرام دروست نیە، جیاوازی نیە: مێردەکە لە ئیحرامدا بێ، یان ژنەکە، یان سەرپەرشتکارەکە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەر موویەتی: ﴿لا يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ وَلاَ يُـنْكِحُ﴾ رواه مسلم، **پیاو لە ئیحرامدا نابێ: نە ژن لە خۆی مارە بکا، نە لە کەسێکیتریش مارەی بکا.**

جا وەڵامی حەدیسەکەی حەزرەتی(ابن عَبّاس)ش-رضیالله عنهما- بەم حەدیسە دراوەتەوە، کە حەزرەتی(مَيْمُونَة)-رضي الله عنها-بەخۆی فەرموویەتی: ﴿تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللهِﷺ وَهُوَ حَلالٌ﴾ رواه مسلم وغيره، **پێغەمبەرﷺ منی لەخۆی مارە کرد لەو کات لە ئیحرامدا نەبو.**

واتە: ئەوانەی حەدیسەکەی حەزرەتی(مَيْمُونَة)یان گێڕاوەتەوە، زۆرنو حەزرەتی(ابن عَبّاس) بە تەنهایە. هەم حەزرەتی(مَيْمُونَة)ش لە کاروباری خێزانیخۆی ئاگادارترە لە حەزرەتی(ابن عَبّاس) رضي الله عنهما. هەم حەدیسەکەیڕابردووش ﴿لا يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ﴾ پشتگیری حەدیسەکەی حەزرەتی (مَيْمُونَة)یە رضي الله عنها.

**پرسیار:** گوتمان: حەزرەتی(مَيْمُونَة)-رضي الله عنها- دوایین ژنی پێغەمبەرﷺ بوو، واتە: لە دوای حەزرەتی(مَيْمُونَة)-رضي الله عنها- ژنیتری نەهێناوە، ئەی بۆچی دوایین ژنی بوو؟ بۆچی ئەم جارەش ئەو بێوەژنەی هێنا؟

**وەڵام:** زۆر جار ئەوەمان باس کرد:کە پێغەمبەرﷺ هەوڵی دەدا لە ڕێگای زاوایەتیو خەزورایەتیەوە ڕقو قینەی دوژمنانی ئیسلام کەم بکاتەوە. جا حەزرەتی(مَيْمُونَة)ش-رضي الله عنها- خزمی زۆری لە (مَكّة)دا هەبون، ئەم خزمایەتیەش بووە ئاسانکاریەك بۆ ڕزگارکردنی (مَكّة)، جا کە (مَكّة)ش ڕزگار کرا، هێزی دوژمنانی ئیسلام زۆر کەم بۆوەو قۆناغێکیتری غەزا دەستی پێکردو پێویستی نەما بە هۆی خزمایەتی دڵی دوژمنانیئیسلام نەرم بکرێ، بۆیێ لە دوای حەزرەتی(میمونة)-رضي الله عنها- پێغەمبەرﷺ هیچ ژنێکیتری نەهێنا، کەوابوو: مارەکردنی حەزرەتی(میمونة)ش-رضي الله عنها- بۆ بەرژەوەندی ئیسلام بوو.

(کونستانس جیورجیو)–وەزیری دەرەوەی پێشووی (رومانیا)، دەڵێ: (مُحَمَّد)ﷺ ویستی خزمایەتیەك پێك بینێ لە نێوان خۆیو (قُرَيْش)، بۆیێ (مَيْمُونَة)ی لەخۆی مارە کرد، کە خوشکی ژنی (الْعَبّاس)ی مامیخۆی بوو، جا ئەم مارەکردنە تەنها سیاسی بوو،

چونكه (مَيْمُونَة) هەشت خوشكى هەبون، هەر يەكەيان ژنى گەورە پياوێكى (مَكَّة) بوو، بەم جۆرە خزمايەتى لە نێوان (مُحَمَّد)وﷺ مێردەكانى هەشت خوشكەكان جێگير بوو...هەر كەسێك (مَيْمُونَة) مارە بكا، دەبێتە خزمى هەموو دانيشتووانى (مَكَّة)، ئامانجێكى پێغەمبەرﷺ لەم مارەكردنە: خزمايەتى (خالِد بن الْوَلِيد)بوو، چونكه (مَيْمُونَة) پورى (خالِد) بوو، وەك منداڵیخۆی تەماشای (خالِد)ی دەكرد، ئامانجێكیتری پێغەمبەرﷺ ئەمە بوو: هەر لە (مَكَّة)دا زيافەتى بوككواستنەوى (مَيْمُونَة) بكاو گەورە پياوانى (قُرَيْش) دەعوەت بكا...بەڵام (قُرَيْش) ڕازى نەبونو ناچار بوو لە(مَكَّة) برواتە دەرەوە. (شرح صحيح مسلم) ب(٦) ل(١٣٤-١٣٨) و(نظرة جديدة فى سيرة رَسُول اللهﷺ): لـ(كونستانس) ل(٣٣٧).

**حەفتەم: لە مانگى (صَفَر) ساڵى هەشتەمى كۆچى حەزرەتى (خالِد بن الْوَلِيد)و حەزرەتى (عَمْرِو بن العاص)و حەزرەتى (عُثْمان بن طَلْحَة)ﷺ موسوڵمان بون:**

حەزرەتى(خالِد بن الْوَلِيد)ﷺ فەرموويەتى: كە پێغەمبەرﷺ بۆ عومرە هاتە (مَكَّة)، من خۆم شاردەوە، جا براى خۆم (الْوَلِيد بن الْوَلِيد) لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بوو، ئەويش بە دوامدا گەڕا، بەڵام نەيدۆزيمەوە، جا لە نامەيەكدا بۆى نوسيم: (**بِسْمِ الله الرَّحْمنِ الرَّحِيم، من لەوە سەيرترم نەبينيوە: كە بيرت لە ئيسلام ڕۆيشتووە، تۆ ئەو جۆرە خاوەن عەقڵەی!...پێغەمبەرﷺ پرسيارى تۆى لێكردمو فەرمووى: (خالِد) لەوانە نيە ئيسلام نەناسێ...ئەی برام ئەوەی لە دەستت چووە، وەدەستى بێنەوە).**

جا كە (خالِد) نامەكەی خوێندەوە، بە فەرموودەكەی پێغەمبەرﷺ دڵخۆش بوو، جا لەگەڵ (عُثْمان بن طَلْحَة) بڕياريان دا: موسوڵمان ببنو بەرەو (مَدِينَة) ڕۆيشتن، جا لە ڕێگەدا لە (الْهَدَّة) گەيشتنە (عَمْرِو بن الْعاص)، ئەويش لە (حَبَشَة) دەگەڕاوە بۆ (مَدِينَة)، تاكو موسوڵمان ببێ؟ چونكه (عَمْرو)ش لە ڕقى پێغەمبەرﷺ لە (مَكَّة) ڕۆيشتبوو بۆ (حَبَشَة)، جا لەوێ لە سەر دەستى (النَّجاشِي) پەيمانى دا: موسوڵمان ببێ، جا كە لە (حَبَشَة) گەڕاوەو لە كەنارى دەرياى سوور لە كەشتى دابەزیو نەگەڕاوە (مَكَّة)، بەڵكو يەكسەر بەرەو (مَدِينَة) ڕۆيشت جا لە ڕێگەدا-لە (الْهَدَّة)- گەيشتە (خالِد)و (عُثْمان)و هەرسێكيان هاتنە (مَدِينَة)، جا كە پێغەمبەرﷺ هەواڵى هاتنى ئەوانى گەيشتێ، فەرمووى: ﴿رَمَتْكُمْ مَكَّــةُ بِأَفْلَاذِ كَبِدِها﴾ (مَكَّة) پارچە جەرگەكانى خۆى بۆ ئێوە فڕێداوە. مەبەستى ئەو سێ پياوماقوڵانەيە، جا پێغەمبەرﷺ بە هاتنيان زۆر دڵخۆش بوو و هەرسێكيان موسوڵمان بونو (اَلْبَيْعَة)=پەيمانيان دا پێغەمبەرﷺ، جا تكاى دوعاى لێخۆشبوونيان لە پێغەمبەرﷺ كرد، پێغەمبەريشﷺ فەرمووى: ﴿الإِسْلاَمُ يَجُبُّ-يَهْدِمُ- ما قَبْلَهُ﴾ رواه مسلم، **موسوڵمانبوون تاوانەكانى پێشە خۆى دەسڕێتەوە.**

جا هاتنى ئەم سێ پياوانە بۆ (مَدِينَة)، لە مانگى (صَفَر)ی ساڵى هەشتەمى كۆچى بوو، هەر

لەو ڕۆژەوەش پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(خالِد)یﷺ دەکردە سەرکردەی ئەسپسوارەکان.
(البداية والنهاية) ب(٢) ل(٥٩٨-٦٠١) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٨٧-٨٩).

*** *** ***

## ﴿ غەزای (مُؤْتَة )= جَيْش الْأُمَرَاء )﴾

لە مانگی (جُمادَیالأولی) ساڵی هەشتەمی کۆچی ئەم غەزایە ڕووی دا، هۆیەکەشی کوشتنی حەزرەتی(الحارِث بن عُمَيْرالأزدِي)ﷺ بوو-کە هەڵگری نامەی پێغەمبەرﷺ بوو، (شُرَحْبيل الغَسّانی) پەلبەستی کردو کوشتی-جگە لەم نێردراوە، هیچ نێردراوێکیتری پێغەمبەرﷺ نەکوژراوە، (شُرَحْبيل) کاربەدەستێکی (قَيْصَر)ی (رُوم) بوو لە سەر وڵاتی (شام)، بە خۆیشی عەرەبێکی گاور=دیان بوو، جا پێغەمبەرﷺ بە کوشتنی ئەم نێردراوەیخۆی زۆر غەمبار بوو، بۆیێ فەرمانی دا: موسوڵمانان خۆیان بۆ غەزای ئەم کافرانە ئامادە بکەن، جا بیدواکەوتن سێ هەزار (صَحابَة) ئامادە بون و پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(زَيد بن حارِثة)یﷺ کردە ئەمیری لەشکرەکەو فەرمووی: ﴿ئەگەر (زَيْد) شەهید بوو، (جَعْفَر بن أَبِيطالِب) ببێتە ئەمیری لەشکرەکە، ئەگەر ئەویش شەهید بوو، (عَبْدُالله بن رَواحَة) ببێتە ئەمیری لەشکرەکە، ئەگەر ئەویش شەهید بوو، با موسوڵمانەکان بە ڕەزامەندیخۆیان یەکێك بکەنە ئەمیری خۆیان﴾.

جا بزانە: بە هۆی ئەم سێ ئەمیرە، بەم غەزایە دەگوترێ: (جَيْشُ الْأُمَراء)=لەشکری ئەمیرەکان، هەم لە بەر زۆری لەشکرەکەش پێی دەگوترێ: غەزا. ئەگەر نا: لە زاراوەی خۆیدا دەبی بە (سَرِيَّة)=پارچە لەشکر ناو ببرێ؟ چونکە پێغەمبەرﷺ بەخۆی لەگەڵدا نەبوە.

جا لە کاتی خواحافزیدا حەزرەتی(عبدالله بن رَواحَة)ﷺ گریا، لێیان پرسی: بۆ دەگرێی؟ فەرمووی: وَاللهِ لە بەر خۆشویستنی دونیام نیە، دڵیشم زۆر بە ئێوە نیە، بەڵام گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو: ئایەتێکی قورئانی دەخوێندەوە باسی ئاگری تێدا بوو: ﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْماً مَقْضِيّاً﴾مريم: ٧١، هەر یەکێك لە ئێوە هەیە، دەبی بڕواتە دۆزەخ و تێیدا ڕابب‌رێ، خوای تۆ ئەم بڕیارەی لە سەر خۆی واجب کردوەو بڕاوەتەوە. جا حەزرەتی(عبدالله)ﷺ فەرمووی: نازانم لە دوای چوونە دۆزەخ چۆن دەردەچم.

جا پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانﷺ لەگەڵ لەشکرەکە لە (مَدِينَة) چونە دەرەوەو خواحافیزییان لێکردن و پێیان گوتن: ﴿صَحِبَكُمُ اللهُ وَدَفَعَ عَنْكُمْ وَرَدَّكُمْ إِلَيْنَا صالِحِينَ﴾ خوا لەگەڵتاندا بێ، خوا بەرگریتان لێبکا، خوا بە پیاوچاك بتانگەڕێنێەوە لای ئێمە.

جا پێغەمبەرﷺ ئاڵایەکەی دایە دەست حەزرەتی(زَيد بن حارِثة)وﷺ فەرمووی:

﴿بڕۆنە ئەو شوێنەی (اَلْحارِث) لێی كوژراوە، داوای موسوڵمانبوونیان لێبكەن، ئەگەر موسوڵمان نەبون، پشت بە خوا ببەستن و جەنگیان لەگەڵ بكەن... ئامۆژگاریتان دەكەم لە خوا بترسن و لەگەڵ هاوڕێكانتان باشن بن، بە ناوی خوا غەزا بكەن، جەنگ لەگەڵ دوژمنانی خواو دوژمنی خۆتان بكەن، خواپەرستەكانی ناو كەنێسەكان مەكوژن، ژن و منداڵ و پەككەوتە مەكوژن، درەخت مەبڕن، خانوو مەڕوخێنن﴾.

جا لەشكری (صَحابَة)كانﷺ ڕۆیشت تا گەیشتە (مَعان)—لە وڵاتی (أُردُن)ی ئێستا—لەوێ هەواڵیان بۆ هات: كە دوژمن هەواڵی هاتنی ئەوانی زانیوەو عەرەبە گاورەكان بە سەركردایەتی (مالِك بن زافِلَة) سەد هەزار چەكداریان كۆ كردۆتەوە، هەروەها (هِرَقْل)ش سەد هەزار چەكداری ڕۆمی بۆ یامەتیدانی ئەوان ئامادە كردوە.

جا (صَحابَة)كانﷺ دوو شەوان لە (مَعان) مانەوەو ڕاوێژیان دەكرد: ئایا هەواڵی ئەم لەشكرە زۆرەی دوژمن بۆ پێغەمبەرﷺ بنێرن؟ تاكو هێزی زیاتریان بۆ بنێرێ، یان فەرمانێكی تریان پێبكا—چونكە لەشكری كافرەكان: شەست و شەش ئەوەندەی موسوڵمانان بوو— جا حەزرەتی(عبدالله بن رَواحَة)ﷺ هانی دان و فەرمووی: وَاللهِ ئەوەی ئێستا پێتان ناخۆشە، هەر بۆ ئەوە هاتون: كە شەهیدبوونە، خۆ ئێمە بە زۆری ژمارەو چەك جەنگ ناكەین، بەڵكو بە بەرەكەتی ئەم ئایینە جەنگ دەكەین كە خوا ڕێزی پێ لێناوین، هەڵسن غەزا بكەن، ئەنجامەكەی (إِحْدَىالْحُسْنَيَيْن)=یەكێكە لە دوو خەسلەتە جوانترەكان: یان شەهیدبوون، یان سەركەوتن.

جا (صَحابَة)كان گوتیان: (عبدالله) ڕاست دەكا. ئینجا بۆ جەنگ ڕۆیشتنە (مُؤْتَة)=(الكَرَك)—كە سەر بە (أُردُن)ی ئێستایە— لەوێ لەگەڵ كافرەكان ڕووبەڕووی یەكتری بونەوەو جەنگ دەستی پێكردو حەزرەتی(زَید بن حارِثة)شﷺ—كە ئەمیر بوو— ئاڵایەكەی پێغەمبەریﷺ بە دەستەوە گرت و هەڵمەتی بردە ناو كۆمەڵی كافرەكان و جەنگی دەكرد، تا كافرەكان ئەوەندە بە ڕمەكانیان لێیان دا شەهید بووﷺ.

جا حەزرەتی(جَعفَر بن أبیطالِب)ﷺ بووە ئەمیر و ئاڵایەكەی هەڵگرت و جەنگی كرد تا جەنگ تێنی بۆ هێناو كافركان دەورەیان لێداو چارەی نەما، بۆیێ لە ئەسپەكەی دابەزی و هەرچوار پەلی ئەسپەكەی بە شمشێر بڕین—نەوەك بە ساغی بكەوێتە دەست دوژمن و بۆ جەنگ سودی لێوەربگرن—جا حەزرەتی(جَعفَر)ﷺ بە پیادەیی جەنگی كرد، تا شمشێرێكی لە دەستی ڕاستەی دراو دەستەكەی لێبۆوە، جا بە دەستی چەپە ئاڵایەكەی هەڵگرت، جا دەستی چەپەشیان لێكردەوە، ئەم جارە بە هەردوو قۆڵەكانی ئاڵایەكەی بەرز كردەوە، دیسان كافرێكی ڕۆمی شمشێرێكی لێداو كردیە دوو پارچەو

ئەویش شەهید بووﷺ.

ئینجا حەزرەتی(عَبْدالله بن رَواحَة)ﷺ بووە ئـەمیر و ئالآیەکـەی هـەڵگرتو لـەو کاتـدا ماموزایەکیخۆی پارچە گۆشتێکی بۆ هێنـا تـاکو بیخوا، بـەڵام کـە دیتـی جـەنگ گـەرم دەبێ، گۆشتەکەی فرێدا و نەیخوارد، جـا ئـەویش جـەنگی کـرد تـا لـە ڕۆژی شەشـەمی جەنگەکەدا لە کاتی ئێوارێ شەهید بوو و ئالآیەکە کەوتە خوارەوە.

جا کە حەزرەتی(عبدالله)شﷺ شەهید بـوو و هـیچ ئـەمیرێك نـەما، موسـوڵمانان لێـك پـەرت بـونو شکـستێکیان کـەوتێو ژمارەیـەکی کـەمیش لـە بـەرەی جـەنگ هـەڵاتنو هاتنەوە (مَدِینَة)، بەڵام لەشکرەکە هەر لە مەیدانی جەنگدا بە پەرتبوویی مابۆوە، تـا حەزرەتی(ثابت بن أقْرَم)ﷺ ئالآیەکەی هـەڵگرتو گـوتی: خەڵکینـە بـە پەلـە ئـەمیرێك دابنێن. جا حەزرەتی(ثابت)ﷺ یەکسەر ئالآیەکـەی دایـە دەسـت حـەزرەتی(خالِـد بـن الْوَلِید)وﷺ (صَحابَة)کانیشﷺ بە ئەمیرایەتی وی ڕازی بون.

جا ئەمیر (خالِد)ﷺ ئالآیەکەی وەرگرتو تا ڕۆژ ئاوابوون لـە مەیدانـدا چەقیو بـەرە بەرەش موسوڵمانەکانی دەکشاندەوە، تا وای لێهات هەر دوو لا لە بەرەی جەنگ کشانەوە بـۆ سـەربازگەکانیان، جـا لـە شـەوێدا-کـە شـەویحەفتەمی جەنگەکـە بـوو- ئـەمیر (خالِد)ﷺ پلانێکیتری بۆ جەنگەکە دانـا: لەشـکری لای ڕاسـتەی هێنـا لای چـەپە، لای چەپەی بردە لای ڕاستە، پێشەوەی لەشکرەکەی بردە پشتەوە، پشتەوەی هێنا پێـشەوە، جا لە ڕۆژی حەفتەمیجەنگەکەدا لە کاتی بەیانیدا هێرشی کـردە سـەر کافرەکان، جا کە کافرەکان دیتیان شـێوەی لەشـکرەکە وەکـو دوێنـێ نیـە، وا تێگەیـشتن هێـزکیتر بـۆ یارمەتی موسوڵمانان هاتوە!، جا خـودا ترسـی خـستە نـاو دڵیـانو شـکانو کوشـتارێکی زۆریشیان لێکرا، جگە لەم پلانەش: حەزرەتی(قُطْبَة بن قَتـادَة)-کـە ئـەمیری ڕاسـتەی لەشکریئیسلام بووﷺ- خۆی گەیاندە (مالِك بـن زافِلَـة)ی ئـەمیری لەشـکری عەرەبـە گاورەکـانو یەکـسەر کوشـتیو عەرەبـە گاورەکـان شـکانو مەیـدانیان بـەجێ هێـشت، ئەمەش هۆکارێکیتری بەزینی کافرەکان بوو.

جا ئەمیر (خالد)ﷺ لە دوای ئەم سەرکەوتنە هیچیتربە دوای هەڵاتووەکانـدا نەچـو و لەشکرەکەی لە مەیدان کشاندەوەو گەڕاوە بۆ (مَدِینَة)، چونکە گەڕاندنەوەی موسوڵمانان بە سەلامەتی-بۆ (مَدِینَة)-دەستکەوتێکیگەورەیەو بە سـەرکەوتن دەژمێـردرێ، واتـە: نەوەك کافرەکان دووبارە خۆیان بۆ جەنگ ئامادە بکەنەوەو زیانێکی گەورە لە لەشکری ئیسلام بدەن، بەڵام لەشکری کافرەکانیش ئەوەندە لەو شکستەیان ترسـابون، ئـەوانیش نەوێران بە دوای موسوڵمانەکاندا بێن.

**﴿ ژمارەی شەهیدەکانی ( مُؤْتَة ) ﴾**

ئەمیر (خالد)ﷺ فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ اِنْقَطَعَتْ فِي يَدِي يَوْمَ مُؤْتَةَ تِسْعَةُ أَسْيافٍ، فَما بَقِيَ فِي يَدِي إِلاَّ صَفِيحَةٌ يَمانِيَّةٌ﴾ رواه البخاري، لە ڕۆژی غەزای (مُؤْتَة)دا نۆ شمشێر لە دەستمدا شکان، تەنها شمشێرێکی پانی یەمەنی لە دەستمدا مابوو.

ئیمام (ابن کثیر) فەرموویەتی: ئەمە بەڵگەیە: کە (صَحابَة)کان زۆریان لە کافرەکان کوشتون، هەم ئەمیرو پیاوە گەورەکانیشیان لێکوشتون. جا لەبارەی شەهیدەکانی ئەم غەزایەش: هەرسێك ئەمیرەکان–(زَید)و (جَعفَر)و (عبدالله)ﷺ– لە یەك گۆڕدا بە خاك سپێردران، هەروەك لە (فتح الباری)و (شرح المواهب)دا فەرموویانە.

جا لە گێڕانەوەیەکی (شرح المواهب)دا فەرموویەتی: جەنگەکە حەفت ڕۆژان بەردەوام بوو، لە موسوڵمانان سێزدە کەس شەهید بون، یەکێکیان ناوی (هَوبَجَة) بوو، لاشەکەی ون بوو و نەدۆزراوە. بەڵام ئیمام (ابن کثیر) فەرموویەتی: ژمارەی شەهیدەکان دوانزە شەهیدن، جا ئەمەش زۆر گەورەییە کە لە شکرێکی سێ هەزار کەسی لە ڕێگای خوا ڕوبەڕووی لەشکرێکی دووسەد هەزار کەسی ببێتەوە–کە شەست و شەش هەندی خۆیەتی– جا لەگەڵ ئەوەشدا تەنها دوانزە کەس شەهید ببن!.

ئەمەیە: ئەمیر (خالد)ﷺ نۆ شمشێری لە دەستدا شکاون!، جا دەبێ بەم نۆ شمشێرە چەند کافری کوشتبن؟ ئەدی پاڵەوانەکانیتری ئیسلام–کە هەڵگرانی قورئانن– ئەبێ ئەوان چەندیان کوشتبن؟ دیارە کوشتارێکی زۆریان لە کافرەکان کردوە، ئەگەر نا: ئەم لەشکرە کەمە، لە دەستی ئەو لەشکرە زۆرە قورتار نەدەبوو، کافرەکانیش نەدەشکان، چونکە حەدیسەکەی(صَحِيح البخاري)یداهاتوو شاهیدە: کە لە جەنگەکەدا (صَحابَة)کان سەرکەوتن و کافرەکان شکان.

جا پێغەمبەرﷺ لە (مَدِينَة) لە سەر مینبەرەکەی دانیشتبوو، خوایگەورە مەیدانی جەنگی (مُؤتة)ی هێنا بەرچاوی پێغەمبەرﷺ تەماشای جەنگەکەی دەکرد، جا کە ئەمیر (خالد)ﷺ ئاڵایەکەی هەڵگرت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿اَلآنَ حَمِيَ الْوَطِيسُ﴾ ئێستا کورەی جەنگ گەرم بوو.

ئینجا پێش ئەوەی هەواڵی جەنگەکە بگاتە (مَدِينَة)، پێغەمبەرﷺ هەواڵەکەی بە خەڵکەکە ڕاگەیاندو فەرمووی: ﴿أَخَذَ الرّايَةَ زَيْدٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَ جَعْفَرُ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَ اِبْنُ رَواحَةَ فَأُصِيبَ–وَعَيْناهُ تَذْرِفانِ–حَتَّى أَخَذَ الرَّايَةَ سَيْفٌ مِنْ سُيُوفِ اللهِ حَتّى فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِمْ، وَما يَسُرُّهُمْ أَنَّهُمْ عِنْدَنا﴾ رواه البخاری، (زَيْد)ﷺ ئاڵایەکەی هەڵگرت و شەهید بوو، ئینجا (جَعْفَر)ﷺ هەڵیگرت و شەهید بوو، ئینجا (ابن رَواحَة)ﷺ هەڵیگرت و شەهید بوو– لەو حاڵەتەدا چاوەکانی پێغەمبەرﷺ فرمێسکیان لێدەڕژان– تا ئاڵایەکە شمشێرێك لە شمشێرەکانیخوا هەڵیگرت، تا خوایگەورە سەرکەوتنی دانێ، سێ

شەهیدەکان پێیان خۆش نیە لە لای ئێمە بن، واتە: چونکە لە بەهەشتدانە. جا لەم ڕۆژەوە ئەمیر (خالِد)ﷺ ناوی لێندرا: (سَيفُ الله)= شمشێری خوا.

*شوێنی بەڵگەی سەرکەوتن: (حَتَّى فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِمْ) تا خوا سەرکەوتنی دانێ.*

جا هەر لەو ڕۆژەی حەزرەتی(جَعْفَر)ﷺ شەهید بوو، پێغەمبەرﷺ چووە ماڵی حەزرەتی(جَعْفَر)و منداڵەکانی بۆن کردنو فرمێسکی لە چاوەکان دەهاتنە خوارەوە، ژنەکەی حەزرەتی(جَعْفَر)ش رضي‌الله عنهما دەستی بە گریان کرد، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إصْنَعُوا لِآلِ جَعْفَرٍ طَعَاماً فَقَدْ أَتاهُمْ أَمْرٌ يُشْغُلُهُمْ﴾ خواردنێك بۆ ماڵی (جَعْفَر)ﷺ دروست بکەن، چونکە کارێکی وەهایان بە سەر هاتووە: سەرقاڵی کردون.

جا کە لەشکرەکەش لە (مَدِينَة) نزیك بۆوە، پێغەمبەروﷺ خەڵکی (مَدِينَة) هاتنە پێشوازییان، هەندێ کەس پێیان گوتن: هۆ هەڵاتووەکان، ئێوە هەڵاتوون. بەڵام پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوانە هەڵاتوو نین، بەڵکو هەڵمەتبەرن إن شاءَ الله. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٦٠٢-٦٢١) و(فتح الباري) ب(٧) ل(٦٣٩-٦٤٦) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٩٥-١٠١).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: خواحافیزی لە جەنگاوەرانی غەزا و ڕێبوارانیش سوننەتە**، کە (صَحابَة)کانﷺ بۆ غەزای (مُؤْتَة) ڕۆیشتن، پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانﷺ خواحافیزییان لێکردنو گوتیان: ﴿صَحِبَكُمُ اللهُ وَدَفَعَ عَنْكُمْ وَرَدَّكُمْ إلَيْنا صَالِحِينَ﴾.

هەروەها کە پێغەمبەرﷺ خواحافیزیی لە لەشکری غەزا دەکرد، دەیفەرموو: ﴿أَسْتَوْدِعُ اللهَ دِينَكُمْ وَأَمانَتَكُمْ وَخَواتِيمَ أَعْمالِكُمْ﴾ رواه أبوداود بالإسنادالصَحيح، **ئایینەکەتانو ئەمانەتەکەتان-ماڵو منداڵو- دواکردەوەتان بە خوا دەسپێرم.**

جا بۆ سەفەرەکانیتریش پێغەمبەرﷺ ئەو خواحافیزیەی دەکرد، هەم ئەم خواحافیزیەشی کردوە: ﴿زَوَّدَكَ اللهُ التَّقْوَى وَغَفَرَ ذَنْبَكَ وَيَسَّرَ لَكَ الْخَيْرَ حَيْثُما كُنْتَ﴾ حديث حسن رواه الترمذي. **خوایگەورە زەخیرەی لەخواترسانت بداتێ و لە گوناهت خۆش ببێ و کاری چاکەت بۆ ئاسان بکا، لە هەر شوێنێك بوی.** (الاذكار، للإمام النواوي) ل(١٨٧).

**دووەم: پێغەمبەرﷺ حەزرەتی (زَيْد بن حارِثَة)یﷺ کردە ئەمیری لەشکری (مُؤْتَة)...**

ئیمام (ابن حجر العسقلاني) فەرموویەتی: ئەمەش بەڵگەی تێدایە دروستە: دانانی ئەمیر بە مەرجێکەوە هەڵبواسرێ و هەم چەند ئەمیرێکیش بە ڕیز-یەك لە دوای یەك- دابندرێنو ئەمیرایەتی هەموویانیش دادەمەزرێ، بەڵام بەگوێرەی ڕیزەکەش جێبەجێ دەکرێ.

هەروەها دانانی ئەمیر (خالد) لە لایەن (صَحابَة)کانﷺ، بەڵگەیە: کە دروستە: یەکێك لە جەنگدا بەخۆی خۆی بکاتە ئەمیر.

جا ئیمامی(الطحاوي) فەرموویەتی: لەو بنچینەیە وەردەگیرێ: واجبە موسوڵمانان پیاوێك

بکەنە پێشەوایخۆیان لەو کاتەی گەورەی موسوڵمانان ئامادە نیە، تا ئامادە دەبێ.
ئیمام (ابن حجر الهیتمی) فەرموویەتی: لە هەر شوێنێك کاربەدەستی موسوڵمانان نەبو، لە سەر (أَهْلُ الْحَلِّ وَالْعَقْد)=دانیشتووانی شوێنەکە–کە دەتوانن کار پێك بێنن‌و هەڵبوەشێنن– واجبە: یەکێك بکەنە کاربەدەستی خۆیان‌و دەبی بڕیارەکانیشی جێ بەجێ بکرێن...
(إمامُ الْحَرَمَيْن)ش فەرموویەتی : ئەگەر دەسەڵاتی کاربەدەستی موسوڵمانان لە شوێنێکدا نەما، ئەوانیش واجبە: بۆ خۆیان کاربەدەستێك دابنێن، هەروەك (الإمامُ الأشْعَري)و چەند زانایەکیتر فەرموویانە، جا ئیمامی(الخطابي) بەڵگەی بە ڕووداوەکەی ئەمیر (خالد)ﷺ هێناوەتەوە. (فتح الباری) ب(٧) ل(٦٤٢) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٧) ل(٢٦١).
**سێیەم: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: درەخت مەبڕن‌و خانوو مەڕوخێنن.** ئەوەش لە حاڵەتێکدایە: کە پێویستی نەبێ، واتە: ئەگەر لە جەنگدا بۆ سەرکەوتن پێویستی هەبوو، دروستە: درەختیش ببڕدرێ‌و خانووش بڕوخێندرێ، چونکە پێغەمبەرﷺ دارخورمایەکانی جولەکەکانی (بَنِي النَّضِير)ی بڕین، هەروەك ڕابرا، هەروەها دروستە: ئاژەڵەکانیش سەر ببڕێن، ئەگەر بترسێن بکەوێتەوە دەست کافرەکان، بەڵام لە مەزهەبی (الْحَنَفي)دا لە دوای سەربڕین دروستە: بسوتێندرێن، تاکو دوژمن سودیان لێوەرنەگرێ، هەم دروستە: چەکیش بسوتێندرێ، ئەگەر نەگونجا بگوازرێتەوە، جا ئەگەر نەدەسوتا، لە شوێنێك دەشاردرێتەوە. مەبەستی مەزهەبی (الحنفي)و (الشافعي) ئەوەیە: هەر شتێك مەترسی هەبێ بکەوێتە دست دوژمن‌و سودی لێوەربگرێ، دروستە: بە ڕێگایەکی شەرعی بفەوتێندرێ، بەڵگەش ئەوەیە: ئەمیر (جَعْفَر بن أبِيطالب)ﷺ هەر چوار پەلی ئەسپەکەیخۆی بڕین، تاکو لە دوای شەهیدبوونی وی کافرەکان سودی لێوەرنەگرن، جا پێغەمبەریشﷺ ڕەخنەی لێنەگرتووە، هەروەك ئیمامی(السُّهَيْلي) فەرموویەتی. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٦٠٦) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٩) ل(٢٤٦) و(مجمع الأنهر) ب(١) ل(٦٤٩).
**چوارەم: دروستکردنی خواردن بۆ کەس‌وکاری مردووەکە،** پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿اصْنَعُوا لآلِ جَعْفَرَ طَعاماً فَإنَّهُ قَدْ جاءَهُمْ ما يَشْغُلُهُمْ﴾رواه أبوداود والترمذي بسند صَحِيح، **خواردنێك بۆماڵی (جَعْفَر) دروست بکەن، چونکە ڕووداوێکی وەهایان توش بووە سەرقاڵی کردون.** بە بەڵگەی ئەم حەدیسە، ئیمامی(النـواوي) فەرموویەتی: بۆ دراوسێکانی ماڵی مردووەکە–هەم بۆ خزمەکانیش– سوننەتە: خواردەمەنی ئامادە بکەن بۆ خێزانی مردووەکە، کە تێرایی شەوێك‌و ڕۆژێکیان بکا، هەم زۆریش داوایان لێبکرێ خواردنەکە بخۆن، نەوەك شەرم بکەن، یان لە بەر غەمباری دڵیان بۆ خـواردن نەچێ، بەڵام حەرامە خواردن بۆ ئەو ئافرەتانە دروست بکرێ: کە گریان‌و شین دەگێڕن.
**جا بزانە:** لە دوای تەواوبوونی سێ ڕۆژەکەی تازیە، سوننەتە: کوڵ‌و خاوێنی بۆ تازیەدارەکان بکرێ‌و سەری نێرینەکان بتاشرێ ﴿عن عَبْدِالله بن جَعْفَرَرضي‌الله عنهما: أَنَّ النَّبيَّﷺ

أَمْهَلَ آلَ جَعْفَرَ ثَلاثاً، ثُمَّ أَتاهُمْ فَقالَ: لا تَبْكُوا عَلَى أَخِي بَعْدَ الْيَوْم، اُدْعُوا لِي اِبْنَـيْ أَخِـي. فَجِيءَ بِنا كَأَنّنا أَفْرُخٌ، فَقالَ اُدْعُوا لِي الْحَلاّقَ. فَجِيءَ بِالْحَلاّقِ فَحَلَّقَ رُؤُوسَنا...فَجائَتْ أُمُّنـا فَذَكَرَتْ لَهُ يُتْمَنا...فقالَﷺ: اَلْعَيْلَةَ تَخافِينَ عَلَيْهِم وَأَنَا وَلِيُّهُمْ فِي الدُّنْيا وَالآخِـرَةِ؟﴾ الحديث بتمامه رواه الإمام أحمد والنسائي بسند صَحِيح، **حەزرەتی(عبدالله)ی کوڕی حەزرەتی(جَعْفَر)** رضي‌الله عنهما **فەرموویەتی: پێغەمبەرﷺ سێ ڕۆژان مۆڵەتی دایە ژن و منداڵەکانی (جَعْفَر): بۆی بگریێن و تازیەداری بکەن، ئینجا لە دوای سێ ڕۆژەکە هاتە لایان و فەرمووی: لەمڕۆ بەولاوە هیچیتر لە سەر برام-(جَعْفَر)- مەگریێن...جا فەرمووی: هەر دوو کوڕەکانی برام بۆ بانگ بکەن. جا ئێمەیان هێنا، ئێمەش وەك بێچووی باڵندە بوین، جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی کرد: سەرتاشیان هێناو سەری ئێمەی تاشی...جا دایکم هات باسی یەتیمیی ئێمەی بۆ پێغەمبەرﷺ کرد، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تۆ لە هەژاریی ئەم منداڵانە دەترسێی لە حاڵەتێکدا من سەرپەرشتکاری ئەوانم لە دونیاو قیامەت؟.** (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٢٠٧).

## پێنجەم: گەورەیی و ڕێزداریی ئەمیرەکانی غەزای (مُؤْتَة) ﷺ

**شاهیدیی پێغەمبەرﷺ بۆ هەرسێکیان، کە فەرمووی:** ﴿ما يَسُرُّهُمْ أَنَّهُـمْ عِنْـدَنا﴾ رواه البخاري، **ئەو سێ شەهیدانە پێیان خۆش نیە لە لای ئێمە بن، واتە: چونکە بە هۆی شەهیدی لە بەهەشتدا ڕێزیان لێنراوە. هەم پێغەمبەرﷺ فەرمووی:** ﴿لَقَدْ رُفِعُوا إِلَيَّ فِـي الْجَنَّةِ فِيما يَرَى النَّائِمُ عَلَى سُرُرٍ مِنْ ذَهَبٍ﴾ رواه ابن اسحاق، **لە خەوندا هەرسێك شەهیدەکان بۆم بەرز کرانەوە: لە بەهەشتدا لە سەر تەختەکانی زێڕ بون.**

**ئەمیر (زَيْد بن حارِثَة)** رضي‌الله عنه: **کۆیلەی پێغەمبەرﷺ بوو و ئازادی کرد، چەند ئایەتێك لە سورەتی (الأحْزاب) لەبارەی حەزرەتی(زَيْد)** رضي‌الله عنه **هاتونە خوارەوەو تاکە (صَحابَة)یە ناوی لە قورئاندا هاتبێ: لە ئایەتی** ﴿فَلَمَّا قَضَى زَيْد مِنْهَـا وَطَـراً﴾ الأحزاب: (٣٧)، **هەروەك لە باسی مارەکردنی حەزرەتی(زَيْنَب)**-رضي‌الله عنها- **ڕوونمان کردەوە، پێغەمبەرﷺ دەربەق حەزرەتی(زَيْد)** رضي‌الله عنه **فەرموویەتی:** ﴿وَإِنْ كان لَمِنْ أَحَبِّ النّاسِ إِلَيَّ، وَإِنَّ هَذا-أَيْ أُسامَةَ بنَ زَيْدٍ- لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ بَعْدَهُ﴾ رواه الشيخان، **(زَيْد) یەکێك بوو لەو کەسانەی لە لای من لە هەموو کەسێك خۆشەویستترن، وە ئەم (أُسامَة)ی کوڕی(زَيْد)ش لە دوای وی یەکێکە لەو کەسانەی لە لای من لە هەموو کەسێك خۆشەویستترن.**

**ئەمیر (جَعْفَر بن أَبِيطالِب)** رضي‌الله عنه: **کوڕە مامی پێغەمبەرەﷺ، برای ئیمام(علی)یە** رضي‌الله عنه **قسەکەری کۆچکەرەکانی (حَبَشَة) بوو، لە ڕۆژی غەزای (خَيْبَر) لە (حَبَشَة) گەڕاوە، هەروەك باسمان کرد. لەو ڕۆژەی شەهید بوو، تەمەنی سی‌وسێ ساڵ بوو، حەزرەتی(ابن عُمَر)** رضي‌الله عنهما **فەرموویەتی:** ﴿...فَوَجَدْناهُ-جَعْفَرَ-فِيالْقَتْلَى وَوَجَدْنا فِي جَسَدِهِ بِضْعاً وَتِسْعِينَ مِـنْ طَعْنَـةٍ

وَرَمْيَـــةٍ﴾ رواه البخاري، لـه نـاو كوژراوەكاندا (جَعْفَر)مـان دۆزيـەوە، نـەوەدو هەنـدەك برينى تێدا بون: بريني رِم لێدان و تير لێدان.

جا لە بەر ئەوەی لەم غەزايەدا هەردوو دەستەكانی لێكراونەوە، خوایگەورە لە بەهەشتدا دوو باڵی داونێ لە تۆڵەی دەستەكانی، پێغەمبەرﷺ فەرموويـەتی: ﴿دَخَلْتُ الْبارِحَةَ الْجَنَّةَ فَرَأَيْتُ فِيها جَعْفَراً يَطِيرُ مَـــعَ الْمَلائِكَـــةِ﴾حديث صَحيح رواه الطبراني والترمذي، دوێنـێ چـومە بەهەشت، ديتم (جَعْفَر) لەگەڵ (مَلائكَة)كاندا دەفرِێ.

هەروەها ﴿كانَ ابنُ عُمَر رضىالله عنهما إذا حَيَّا ابْنَ جَعْفَرَ رضىالله عنهما قالَ: اَلسَّلاَمُ عَلَيْكَ يا ابْـــنَ ذِي الْجَناحَيْنِ﴾ رواه البخاري، (ابن عُمَر) رضىالله عنهما بە (عبدالله بن جَعْفَر)ی دەگـوت: (اَلـــسَّلاَمُ عَلَيْكَ) هۆ كورِی خاوەنی دوو باڵـەكان. واتە: بۆيێ پێی دەلێن: (جَعْفَرُ الطَّيّـــار)رضي الله عنه.

ئەمیر ( عبدالله بن رَواحَة )رضي الله عنه: زوو موسوڵمان بووەو لە پەيمانی (الْعَقَبَة)و لە غەزايـەكانی (بَـدْر)و (أُحُـد)و (خَنْـدَق)و (خَيْبَـر) گـشتی ئامـادە بـووەو لـە (عُمَـرة الْقَـضاء)دا جلـەوی وشـترەكەی پێغەمبـەریﷺ بـە دەسـتەوە گرتبـوو، هـەر ئـەويش لـە (مَعـان) لـە كـاتی راوێژكردن (صَحابَة)كانی هان دان بۆ غەزا كردن، يەكێك بوو لە شاعيرەكانی پێغەمبەرﷺ.

ئەمیر ( خالد بن الْوَليد )رضي الله عنه: سێ مانگ پێش ئەم غەزايە موسوڵمان ببوو، كورِە خوشكی حـــەزرەتی(مَيْمُونَـــة)ی دايكیئيماندارانـــە رضىالله عنها—هـــەروەك باسمـــان كـــرد—، لـــەم غەزايـــەدا پێغەمبەرﷺ ناوی لێنا: (سَيْفُ الله)=شمشێری خوا، چونكە بە ئازايـەتیو لێزانیخـۆی لەشـكری كافرەكـانی بەزانـد و بـە كارلـەجێيش لەشكریئيـسلامی لـە بـەرەی جـەنگ كشاندەوەو بە دوای هەڵاتووەكاندا نەچو؟ نەوەك لەشكرەكەی تووشی فەوتان ببێ.

جا دەبی سەركردەی لێهاتوو ئەوها دڵسۆزو لێزان بێو لەشـكرەكەی لـە شـوێنەكانی بـە ترسدا بكشێنێتەوەو نەيانفەوتێنێ، هەر لە بەر ئەم لێزانينو لێهاتوويەش پێغەمبەرﷺ زۆر رێزی لێدەناو دەيكردە سەركردەی ئەسپسوارەكان.

هـەم لـەم غەزايـەش (صَـحابَة)يـەكی (يَمَـن)ی، پاڵـەوانێكی كـافری كوشـتو ئەسـپەكەیو كەلوپـەلی جـەنگی بـۆ خـۆی هێنـا، جـا ئـەمیر (خالـد)رضي الله عنه ئەسـپەكەو كەلوپەلەكـەی لێوەرگرت، جا (صَحابَة)يەك لـە لای پێغەمبـەرﷺ شـكايەتی لێكـرد، جا پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: ئەی (خالد) ئەسپەكەو كەلوپەلەكەی بدەوە. جا (صَحابَة)كە گـوتی: دە بيگـرە ئەی (خالد)، ئەدی قسەكەی خۆم نەگەياندە جێ! جا پێغەمبەرﷺ ئەمەی بە زماندرێژی داناو تورِە بوو و فەرمووی: ئەی (خالد) مەيدەوە. جـا فـەرمووی: ﴿هَلْ أَنْتُمْ تارِكُونَ لِـــي أُمَرائِي؟...﴾ رواه مسلم، ئايا ئێوە بۆ من واز لـە ئەميرەكانی من نـاهێنن. واتـە: لێـرەدا پێغەمبەرﷺ بە ئەميریخۆی ناوی حـەزرەتی(خالـد)یرضي الله عنه هێنـاوە، ئەمـەش شـەرەفێكی گەورەيە.

هــەم حەدیــسەكەش بەڵگەیــە: دەبــی ئــەمیر ڕێــزی لیَبنــدریَ، هــەم بەڵگەیــە: كــە (صَحابَة)كانﷺ كەلوپەلی كافرەكانیان گرتووەو پاڵەوانی كافرەكانیشیان كوشتون. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٦٠٦-٦٠٧-٦١١-٦١٦).

**شەشەم: هەندێ لە پێشوازیكارەكان بە لە شكری (مُؤْتَة)یان گوت: (هـۆ هـەڵاتووەكان).**

پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ﴿ئەوانـە هـەڵاتوو نـین، بـەڵكو هەڵمەتبـەرن إن شـاءالله﴾.

ئیمام (ابن كثير) فەرموویەتی: ئەم گوتەیە بۆ هەموو لەشكرەكە نەبو، بەڵكو بۆ ئەو كەسـانە بوو: كە لە جەنگدا هەڵاتن. ئەوە بوو: پێشتر گوتمان: كە ئـەمیر (عبـدالله)ﷺ شـەهید بـوو، موسوڵمانەكان پەرتەیان كەوتە ناو، هەندێكیان هـەڵاتن و گەڕانـەوە (مَدِينَـة). جـا ئەوانـە لـە (مَدِينَة) هاتنە خزمەت پێغەمبەروﷺ گوتیان: ئێمە لە جـەنگ هـەڵاتوین. جـا پێغەمبـەروﷺ فەرمووی: ئێوە هەڵاتوو نین، بـەڵكو دەگەڕێنـەوە بـۆ جـەنگكردن، جـا هەنـدێك لەوانـە-كـە دەهاتنە نوێژكردن- خەڵكەكە لێیان دەقیڕاندن و پێیان دەگوتن: **هۆ هەڵاتووەكان**. تا وایان لێهات لە شەرمی خەڵكەكە لە ماڵەوە نوێژیان دەكردو نەدەوێران بێنە مزگەوت.

**جا بزانە:** بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوانە هەڵاتوو نین. چونكە خوایگەورە حەڕامی كردوە: لەشكری موسوڵمان لە جەنگدا هەڵبێ، هەرچەند ژمارەی دوژمنەكەشی دوو هەندی خۆیان بێ، واتە: ئەگەر ژمارەی دوژمن لە دوو هەندی خۆیان زیاتر بـوو، دروسـتە مەیـدان بەجێ بێڵن، كەواتە: لە ڕاستیدا ئەو هەڵاتووانە بە پێچەوانەی شەرع نەجولاونـەوە، بـەڵام ئەوانەی لە مەیدانی جەنگدا مانەوەو توانییان لەشكرێكی دوو سەد هەزاری بكشێنن، ئەوانە پاڵەوانی ڕاستەقینەن و مەردی خودانەﷺ اجمعين. بڕوانە (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٦٠٩-٦١٠).

***　　***　　***

## ﴿(فَتْحُ مَكَّة)= ڕزگاركردنی (مَكَّة)ی پیرۆز﴾

**لە نۆزدەی ڕەمەزان، ساڵی هەشتەمی كۆچی، شاری (مَكَّة)ی پیرۆز ڕزگار كرا.**

**هۆیەكەی: لە پێكهاتنەكەی(الحُدَيبِيَة)، پێغەمبـەروﷺ كافرەكـانی(قُـرَيش) وەهـا پێـك هاتبون: ﴿هەر كەسێك پێی خۆش بێ، با ببێتە هاوپەیمانی پێغەمبەرﷺ، هـەر كەسێكیش پێی خۆش بێ، با ببێتە هاوپەیمانی (قُرَيْش)﴾.**

**جا هۆزی (خُزاعَة) بونە هاوپەیمانی پێغەمبەرﷺ، چونكە لە كۆنەوە هـۆزی(خُزاعَـة) هاوپـەیمانی (عَبْـدُالمُطَلِب)ی بـاپیری پێغەمبـەرﷺ بـون، هـۆزی (بَنِیبَكـر)ش بونـە هاوپەیمانی (قُرَيش)،** هەروەك ڕابرا.

**جا ئەم دوو هۆزەش پێشتر دوژمنایەتیەكی كۆنیـان لـە نێوانـدا هـەبوو، ئینجا لـە دوای پێكهاتنەكەی (الحُدَيبِيَة)، ڕۆژێك پیاوێكی (بَنِیبَكر) جنێوی دا پێغەمبەرﷺ، پیاوێكی (خُزاعَة)ش گوێی لە جنێوەكە بوو و هەڵسا لە جنێودەرەكەی دا و سەری بریندار كرد، جـا (بَنـوبَكر) داوای یارمـەتییان لـە (قُـرَيش) كـرد، كافرەكـانی(قُـرَيش)ش**

چەك و چەكداریان بۆ یارمەتی (بَنِیبَكْر) ناردن و لە شەوێدا بە نهێنی لە لای ئاوەكەی (اَلْوَتِير) هێرشیان كردە سەر (بَنِیخُزاعَة) و بیست پیاویان لێكوشتن، (خزاعَة)ش هیچ ئاگایان لەم هێرشە نەبو، جا (عَمْرو بن سالِم الخزاعي)ی گەورەی هۆزی(خزاعَة) لەگەڵ چل كەسی هۆزكەی بۆ سكالا هاتنە (مَدِينَة) و (عَمْرو) لە مزگەوت هاتە خزمەت پێغەمبەروﷺ بە پێوە ڕاوەستاو ئەم بەندەی گۆت:

يارَبِّ إِنِّي ناشِدٌ مُحَمَّدا * حِلْفَ أَبِينا وَأَبِيهِ الْأَتْلَدا
إِنَّ قُرَيْشاً أَخْلَفُوكَ الْمَوْعِدا * وَنَقَضُوا مِيثاقَكَ الْمُؤَكَّدا
هُمْ بَيَّتُونا بِالْوَتِيرِ هُجَّدا * وَقَتَلُونا رُكَّعاً وَسُجَّدا
فَانْصُرْ هَداكَ اللهُ نَصْراً أَعْتَدا * وَادْعُ عِبادَاللهِ يَأْتُوا مَدَدا

خودایە من لە (مُحَمَّد)ﷺ دەپاڕێمەوە بەو هاوپەیمانیەی لە كۆنەوە لە نێوان باوكی ئێمەو باوكی ئەودا هەیە، ئەی پێغەمبەرﷺ، (قُرَيْش) وەعدەكەیان نەگەیاندە جێ و پەیمانەكەی تۆیان هەڵوەشاندەوە، ئەوان شەوێ–لە ناكاودا– لە لای (الْوَتِير) هێرشیان كردینە سەر لەو كاتەی ئێمە خەوتوو بوین، هەم لە ڕوكووع و سوجدەدا ئێمەیان كوشت، كەوابوو: بە یارمەتیدانێكی ئامادەكراو یارمەتیمان بدە–خودا ڕێنموونیت بكا– داوا لە بەندەكانیخوا بكە بێنە یارمەتیمان.

جا پێغەمبەرﷺ فرمێسكی لە چاوەكان هاتنە خوارەوەو فەرمووی: یارمەتیت دەدرێ، ئەی (عَمْرو بن سالِم)، یارمەتیم نەدرێ ئەگەر یارمەتی (بَنِیكَعْب)=(خُزاعَة) نەدەم.

جا لەو كاتیشدا پارچە هەورێك بە ئاسماندا هات و پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەم هەورە سەركەوتنی (بَنِیكَعْب)=(خُزاعَة)ی لێدەبارێ.

جا پێغەمبەرﷺ بە وەفدەكەی (خزاعَة)ی فەرموو: ئێوە بگەڕێنەوەو لە ڕێگەشدا پەرت بن. واتە: تاكو خەڵك نەزانێ هاتونە خزمەت پێغەمبەرﷺ.

لە لایەكیتریش: كافرەكانی(قُرَيْش) لەم پەیمانشكاندنە زۆر پەشێمان بونەوەو داوایان لە (أَبُوسُفْيان) كرد: بچێتە لای پێغەمبەرﷺ، تاكو پێكهاتنی جەنگ وەستاندنەكە نوێ بكاتەوەو ماوەكەشی زیاتر بكا، نەشیاندەزانی پێغەمبەرﷺ هەواڵەكەی زانیوە.

جا (أَبُوسُفْيان) بە پەلە هاتە (مَدِينَة) و یەكسەر چووە ماڵی حەزرەتی(أُمِّ حَبِيبَة)ی كیژیخۆی رضیالله عنها- كە ژنی پێغەمبەرﷺ بوو- جا (أَبُوسُفْيان) ویستی لە سەر یاتاغی پێغەمبەرﷺ دابنیشێ، بەلام حەزرەتی(أُمِّ حَبِيبَة)-رضي الله عنها-یا تاغەكەی پێچاوەو ڕێگای نەدایێ لە سەری دابنێشێ، جا (أَبُوسُفْيان) گوتی: كیژم نازانم یاتاغەكەت پێ شیاوی من نەبو، یان منت پێ شیاوی یاتاغەكە نەبو؟ حەزرەتی(أُمِّ حَبِيبَة)ش-رضي الله عنها-فەرمووی: ئەمە یاتاغی پێغەمبەرەﷺ، تۆش كافری و پیسی، بۆیێ پێم خۆش نەبو لە سەر

یاتاغەکەی دابنیشی. جا (أبُوسُفیان) گوتی: کیژم وا دیارە لە دوای مـن خرابـەت تـوش بووە؟ حەزرەتی(أمُّ حَبیبَة)ش-رضی الله عنها- فەرمووی: بـەڵکو خوایگەورە هیدایـەتی داومو بویمە موسوڵمان، تۆش بەردێکی وەها دەپەرستی کە نابیسیو نابینێ.

جـا (أبُوسُـفیان) هاتــە خزمــەت پێغەمبــەروﷺ گـوتی: ئـەی (مُحَمَّـد)ﷺ هاتومـە پێکهاتنەکەی (الحُدَیبیَة) پتەوتر بکەینو ماوەکەشی زیاد بکەین؟ پێغەمبـەریشﷺ فەرمووی: شتێك لە لایەن ئێوە ڕوویداوە؟ (أبُوسُفیان) گوتی: نـا، ئێمـە هـەر لـە سـەر پێکهاتنەکــەیخۆمانین. پێغەمبـــەریشﷺ فـــەرمووی: ئێمـــەش هـــەر لـــە ســـەر پێکهاتنەکـەی خۆمـانین. جـا هەرچـەند (أبُوسُـفیان) داوایەکـەی دووبـارە کـردەوە، پێغەمبەرﷺ هیچیتر وەڵامی نەداوە.

جا (أبُوسُفیان) چووە لای ئیمام (أبُـوبَکر)ﷺ، بـەڵام ئیمـام (أبُـوبَکر)شﷺ فـەرمووی: پاراستنی من لە پاراستنی پێغەمبەردایەﷺ، وَاللهِ ئەگەر گێرکە جـەنگتان لەگـەڵ بکـا، من لە دژی ئێوە یارمەتیی دەدەم. جا ئەم جارە (أبُوسُفیان) چووە لای ئیمام (عُمَر)ﷺ ئیمام (عُمَر)شﷺ فەرمووی: من بـۆ ئێـوە تکـا لـە پێغەمبـەرﷺ بکەم؟! وَاللهِ ئەگـەر تەنها گێرکەم دەست بکەوێ لەگەڵ گێرکەش غـەزای ئێـوە دەکەم، هـەر پـەیمانێکمان لەگەڵ ئێوە هەیە، خودا کۆنی بکاو بیپچڕێنیو پێکی وەنەنێنێتەوە.

جا (أبُوسُفیان) چووە لای ئیمام (عُثمان)ﷺ، ئـەویش هیـچی بـۆ نـەکرد، ناچـار چـووە ماڵی ئیمام (علی)ﷺ، ئیمام (علی)شﷺ فەرمووی: ناتوانین لـەم بارەیـە قسە لەگـەڵ پێغەمبـەرﷺ بکـەین. جـا (أبُوسُـفیان) گـوتی: ئـەی (فاطِمَـة) تـۆ شـتێکمان بـۆ بکـە. حـەزرەتی(فاطِمَـة)ش-رضی الله عنها- فـەرمووی: مـن ئـافرەتم. جـا (أبُوسُـفیان) گـوتی: بـە کوڕەکانت-(حَسَن)و (حُسَین)-بڵـێ: ئـەوان شـتێك بکـەن. حـەزرەتی (فاطِمَـة)-رضی الله عنها- فەرمووی: ئەوان مندالْن، مندالْی ئەوها ئەم کارە ناکا.

ئـیتر (أبُوسـُفیان) دەچـووە لای هـەموو گـەورە پیـاوان، هـەموویان وەڵامیـان دەداوەو دەیانفەرموو: بڕیاری ئێمە لەگەڵ بڕیاری پێغەمبەردایەﷺ.

جا بۆ ئەوەی وازیان لێبێنێ، ئیمام (عَلِي)ﷺ پـێی فەرموو: بەخۆت بڕیاری پاراستنی خەڵك بدە، جا (أبُوسُفیان) چووە مزگەوتو بە دەنگی بـەزر گـوتی: هـۆ خەڵکینـە، مـن خەڵکم لە یـەکتری پاراسـتووە، واتـە، هـیچ کەسـێك جـەنگ لەگـەڵ کەسـیتر نـەکا. جـا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بۆ خۆت ئەو قسەیە دەکەی.

جا (أبُوسُفیان) گەڕاوەو ئەنجامی سەفەرەکەی بۆ کافرەکانی(قُرَیش) گێڕاوە، جا (قُرَیش) گوتیان: هیچت بە هیچ نەکردوەو (عَلِی)ش بەم ڕێنموونیکردنە گاڵتەی پێکردوی.

جا لە دوای گەڕانـەوەی (أبُوسُفیان)، پێغەمبـەرﷺ فـەرمانی دا: خەڵکەکـە خۆیـان بـۆ

غەزا ئامادە بکەن. بەڵام شوێنی غەزایەکەی ئاشکرا نەکرد، جا ئیمام (أبُوبَکْر) رضي الله عنه چووە ماڵی حەزرەتی(عائِشَة)ی کیژی خۆی و -رضي الله عنها- دیتی پێویستیەکانی سەفەر بۆ پێغەمبەر ﷺ ئامادە دەکا، بەڵام نەیدرکاند پێغەمبەر ﷺ مەبەستی کوێیە.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی بە ئیمام (أبُوبَکْر)و ئیمام (عُمَر) رضي الله عنهما کردو فەرمووی: ئەوانە پەیمانی پێکهاتنەکەیان شکاندوە؟ جا ئیمام (أبُوبَکْر) رضي الله عنه وای پێخۆش بوو ئەم جارە لێیان ببورێ، بەڵام ئیمام (عُمَر) رضي الله عنه هانی داو فەرمووی: ئەوانە سەری کوفرن، ئەوان دەیانگۆت: تۆ ساحیری و درۆزنی، وَاللهِ عەرەبەکان زەلیل نابن و سەر شۆڕ ناکەن تا دانیشتووانی(مَکَّة) سەر شۆڕ دەکەن. جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە پێناوی خوادا (عُمَر) لە بەرد ڕەقترە.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ بڕیارەکەی ئیمام (عُمَر)ی رضي الله عنه هەڵبـژاردو فەرمانی [illegible] کارە ئاشکرا نەکرێ و هەم لە سەر هەموو ڕێگەکانیش چاودێری دانان، تاکو هەر کەسێکی نەیناسن بیگەڕێننەوە، بەخۆیشی دوعای کردو فەرمووی: ﴿اَللَّهُمَّ خُذْ عَلَــى أَسْــماعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ فَلا يَرَوْنا إلاّ بَغْتَةً﴾ خودایە گوێ و چاوەکانی کافرەکانی(قُرَيْش) بگری، تاکو نەمان بینن تەنها لە ناکاودا نەبێ. واتە: تاکو نەتوانن خۆیان بۆ جەنگ ئامادە بکەن.

**﴿ ڕووداوەکەی حەزرەتی(حاطِب بن أبِی بَلْتَعَة) رضي الله عنه ﴾**

ئینجا کە خەڵکەکە ئامادە بوو، پێغەمبەر ﷺ بۆی ئاشکرا کردن کە بۆ غەزای (مَکَّة) دەڕوا، جا حەزرەتی(حاطِب بن أبیبَلتَعَة) رضي الله عنه نامەیەکی بۆ کافرەکانی(قُرَيْش) نوسی و لەم غەزایە ئاگاداری دەکردنەوە، نامەکەشی بە ئافرەتێکدا نارد ناوی (سارَة) بوو.

جا یەکسەر لە لایەن خواوە—لەبارەی ئەم نامەیە— (وَحي) بۆ پێغەمبەر ﷺ هات، بۆیێ پێغەمبەر ﷺ ئیمام (عَلي)و چەند (صَحابَة)یەکیتری رضي الله عنهم بە دوای ئافرەتەکەدا ناردن و فەرمووی: بڕۆن تا دەگەنە مێرگەکەی (خاخ)، لەوێ ئافرەتێك نامەیەکی لە لایە، نامەکەی لێوەربگرن و وازی لێبێنن. واتە: مەیگرن و مەیکوژن.

جا ئیمام (عَلي)و (صَحابَة)کان رضي الله عنهم بە سواری ئەسپەکانیان بە غاردان ڕۆیشتن و لە مێرگەکەدا ئافرەتەکەیان گرت و گوتیان: نامەکەمان بدە دەست. ئەویش گوتی: هیچ نامەیەکم لە لا نیە. جا ئیمام (عَلي) رضي الله عنه فەرمووی: سوێندم بە خوا پێغەمبەر ﷺ درۆی لەگەڵ نەکردوین، یان نامەکەمان دەدەیێ، یان ڕووتت دەکەینەوە. جا ئافرەتەکە نامەکەی لە ناو پەلکە=کەزیەکانیخۆی دەرهێناو نامەکەیان لێوەرگرت و گەڕانەوە لای پێغەمبەر ﷺ، جا نامەکەیان خوێندەوە، تێیدا نوسرابوو: وا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ لەشکرێکی وەك شەو بۆ سەر ئێوە هات، وەك لافاو لەشکرەکە دەڕوا...هتد، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی (حاطِب) ئەم نامەیە چییە؟

حـەزرەتی(حاطـب)ش‌ﷺ گـوتی: پەلـەم لێمەکـە، مـن هـەر موسـوڵمانم‌و ئـاینی‌خۆم نەگۆڕیوە، بەڵام من لە خودی (قُرَیش) نیم‌و ماڵ‌و منداڵ‌و کەسەکانم لە ناو ئەواندایە، جا ویستم چاکەیەکیان لەگەڵ بکەم تاکو خزم‌و کەسەکانم بپارێزم. جا پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: ئەمە ڕاستیی پێ‌گوتن.

جا ئیمام (عُمَر)ﷺ فەرمووی: یا رَسُولَ الله ئیزنم بدە لە ئەستۆی ئەم مونافقە بـدەم؟ جا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ﴿إِنَّهُ قَدْ شَهِدَ بَدْراً وَما یُدْرِیكَ لَعَلَّ اللهَ اِطَّلَعَ عَلَى مَنْ شَـــهِدَ بَدْراً فَقالَ: إِعْمَلُوا ما شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ؟﴾ رواه الشیخان، بەڕاستی (حاطِب) لـە غـەزای (بَدْر) ئامادە بووە، بە چی دەزانی، بەڵکی خوای‌گەورە بە ڕەحمەتی‌خۆی بە سـەر ئامادە بووانی (بَدْر)ی‌دا ڕوانیوەو فەرموویەتی: چی ئەکەن بیکەن، وا من لێتـان خۆش بوم؟. جا ئیمام (عُمَر)ﷺ دەستی بە گریـان کـرد، ئینجا خوای‌گەورە لـەبارەی حەزرەتی(حاطِب)ﷺ ئەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە: ﴿یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُـــوا لا تَتَّخِـــذُوا عَدُوِّی وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِیَاءَ...﴾ الممتحنة: ١، هـۆ ئەوکەسـانەی ئیمانتـان هێنـاوە، دوژمنـی من‌و دوژمنی‌خۆتان مەکەنە دۆستی‌خۆتان... تا کۆتایی.

ئینجا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(أبـو رُهْـم کلثـوم بـن حُصَین)ی کـردە جێنیـشی‌خۆی لـە (مَدِینَة)و بە لەشکرەوە لە ڕۆژی چوارشەممەی دەی مانگی ڕەمەزان لە دوای عەسر لـە (مَدِینَـة) چـونە دەرەوەو بـەرەو (مَكَّـة) کەوتنــە ڕێ، ژمـارەی لەشـکرەکە دە هـەزار (صَحابَة) بـون: چـوار هـەزار لـە (أنْـصار)ی (مَدِینَـة)، حەفتـسەد لـە (مُهـاجِر)ەکـان، ئەوانی‌تریش لە هۆزە موسوڵمانەکانی‌تر.

ئینجا کە پێغەمبەرﷺ گەیشتە (الكَدِید) لـە نێـوان (قُدَیـد)و (عُسفان) لـەوێ ڕۆژووی شـکاندو لـە بەرچـاوی (صَحابَة)کـانﷺ جامـە ئـاوێکی خـواردەوە، جـا هەنـدێك لـە (صَحابَة)کانیشﷺ ڕۆژوویان شکاند، هەندێکی‌تریش نەیانشکاندو هـەر بـەڕۆژوو بـون، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿أُولَئِكَ الْعُصاةُ﴾ رواه مسلم، ئەوانەی بەڕۆژوون تاوانبارن –واتە: چونکە لەم سەفەرەدا بە هۆی ڕۆژوو زیانیان گەیشتبوێ– جا تا مانگی ڕەمەزان تەواو بوو، پێغەمبەرﷺ هیچی‌تر بەڕۆژوو نەبو.

**﴿ کۆچکردنی ئیمام(الْعَبّاس)ی مامی‌پێغەمبەرﷺو (أبی‌سُفْیان)ی ماموزای‌پێغەمبەرﷺ﴾**

جا لە ڕێگەدا پێغەمبەرﷺ گەیشتە ئیمام (العَبّاس)ی مامی‌خۆی، بە ماڵ‌و منداڵەوە لە (مَكَّة)وە کۆچی دەکـرد بـۆ (مَدِینَـة)، جـا ئیمـام (العَبّـاس) مـاڵ‌و منداڵەکـەی ڕەوانـی (مَدِینَـة) کـردو بەخۆیـشی لەگـەڵ پێغەمبـەرداﷺ بـۆ غـەزای (مَكَّة) ڕۆیـشت، جـا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿مامە، کۆچکردنەکەی تـۆ کۆتـایی کۆچکردنە لـە (مَكَّة)،

هەروەك پێغەمبەرایەتی من كۆتایی پێغەمبەرایەتییە﴾.

هەروەها: (أبُوسُفیان)ی كوڕی(الحارث)ی مامیپێغەمبەرﷺ لەگەڵ (عبدالله بن أبی أمَیَّة)ی كوڕە پوری پێغەمبەرﷺ–كە هەم برای حەزرەتی(أمّ سَلَمَة)ی دایكی ئیمانداران بوو رضی‌الله عنها– لە ڕێگەدا گەیشتنە پێغەمبەروﷺ ویستیان بێنە خزمەتی، بەڵام پێغەمبەرﷺ ڕێگای نەدانێ؟ چونكە هەردووكیان لە (مَكّة)دا لە گەورەترین دژانی پێغەمبەرﷺ بون، جا (أبُوسُفیان)ی ماموزای گوتی: یان پێغەمبەرﷺ ئیزنم دەدا بێمە لای، یان دەستی كوڕەكەم دەگرمو بە بیاباندا دەڕۆین تا بە برسیەتیو تێنووەتی دەمرین، جا پێغەمبەرﷺ بەزەیی پێدا هاتو ئیزنی دان هەردووكیان هاتنە لایو موسوڵمان بون، والحمد لله تعالی.

﴿دەستگیركردنی (أبُو سُفْیان بن حَرْب) گەورە پیاوی (مَكّة)﴾

ئینجا پێغەمبەرﷺ ئاڵایەكانی دانە دەست سەركردەكانیو گەیشتە (مَرُّ الظّهْران)، تا ئێستاش كافرەكانی(قُرَیْش) هیچ هەواڵێكیان نەگەیشتبوێو نەیاندەزانی پێغەمبەرﷺ چی دەكا، بەڵام لە چاوەڕوانیدا بون شتێك ڕوو بدا، بۆیێ كافرەكانی(قُرَیْش) داوایان كرد: (أبُوسُفْیان بن حَرْب)و (حَكِیم بن حِزام)و (بُدَیْل بن وَرْقاء) بڕۆنە دەوروبەری (مَكّة)، تاكو هەواڵێك بزانن، جا شەوێ لە (مَرُّ الظّهْران)دا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: دە هەزار ئاگر بكەنەوە، ئیمام (عُمَر)شیرضي الله عنه كردە سەركردەی پاسەوانەكانی شەوێ، جا لە كاتێكدا (أبُوسُفْیان)و هاوڕێكانی ئەو هەموو ئاگرانەیان دیتن، بە سەرسوڕمانەوە لە یەكتریان دەپرسی: ئەم هەموو ئاگرانە چین؟ دەڵێی ئاگرەكانی (عَرَفَة)نە!.

جا یەكسەر كۆمەڵێك پاسەوان لە (صَحابَة)كانی (أنصار)رضي الله عنهم گەیشتنە سەریانو دەستگیریان كردن، جا (أبُوسُفْیان) گوتی: ئێوە كێن؟ (صَحابَة)كانرضي الله عنهم فەرموویان: ئیمە (صَحابَة)ی پێغەمبەرینﷺ. جا (أبُوسُفْیان) گوتی: شتی واتان بیستووە لەشكرێكی وەها گەورە دابەزێتە سەر جەرگەی گەلێكو ئەوانیش نەزانن؟!.

جا پاسەوانەكان هەرسێك دەستگیركراوەكانیان هێنانە لای ئیمام (عُمَر)رضي الله عنه، بەڵام لەو كاتیش ئیمام (العَبّاس)ی مامیپێغەمبەرﷺ دەنگی (أبُوسُفْیان)ی ناسیو فریایان كەوتو پاراستنی تا بردنیە لای پێغەمبەرﷺ، ئیمام (عُمَر)شرضي الله عنه بە ڕاكردن خۆی گەیاندە پێغەمبەروﷺ فەرمووی: یا رَسُولَ الله ئەمە (أبُوسُفْیان)ی دوژمنیخوایە، خودا بە بێ پەیمانو بەڵێن خستیە دەست ئێمە، ئیزنم بدە تا بیكوژم؟

جا ئیمام (العَبّاس)رضي الله عنه فەرمووی: یا رَسُولَ اللهﷺ من پاراستنم داوەتێ-واتە: نابێ بكوژرێ-. جا هەر لەم شەوەدا (حَكِیم)و (بُدَیْل) موسوڵمان بون، بەڵام (أبُوسُفْیان)

موسـوڵمان نـەبو، جـا پێغەمبـەرﷺ بـە ئیمـام (العَبّـاس)یرضي الله عنه فـەرموو: ئـەم شـەو (أَبُوسُفْیان) لەگەڵ خۆت ببەو سبەینێ بیهێنە لام.

جـا سـبەینێ ئیمـام (العَبّـاس)رضي الله عنه (أبُوسـفْیان)ی بـردە خزمـەت پێغەمبـەرﷺ، جـا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ئـەی (أَبُوسُـفْیان) هـەی مـاڵوێران کـاتی ئـەوە نـەهاتووە، بزانی: تەنها یەك خودا هەیە؟ (أبُوسُفْیان) گوتی: بە دایکمو باوکمەوە بە قوربانت بم، چـەند نـەرمو ڕێـزداری، وَاللهِ وا تێدەگـەم ئەگـەر لەگـەڵ (اَللهِ)دا خوایـەکیتر هەبوایـە، سودێکی بـۆ مـن دەبـوو.—لـە (رِوایَـة)ێکدا —(أبُوسُفْیان) گوتـی: ئـەدی بتـی (العُـزّیٰ) چ لێبکەم؟ ئیمام (عُمَر)شرضي الله عنه فەرمووی: گووی پـێدا بکـە!. (أبُوسُفیان)ش گوتـی: ئـەی (عُمَر) تۆ زمانپیسی، لێم گەڕێ لەگەڵ کوڕە مامیخۆم قسە دەکەم.

جـا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: هـەی مـاڵوێران کـاتی ئـەوە نـەهاتووە، بزانـی: مـن پێغەمبەریخوام؟ (أبُوسُفْیان) گوتی: لەمەیان تا ئێستا شتێك لە دڵمدا هەیە.

جا ئیمام (العَبّاس)رضي الله عنه فەرمووی: مـاڵوێران موسـوڵمان ببـە پـێش ئـەوەی لـە ئەسـتۆت بدرێ. جا (أبُوسُفْیان) شادەی هێناو موسوڵمان بوو.

﴿پێغەمبەرﷺ (مَنْعُ التَّجَوُّل)=قەدەغەکردنی جوڵانەوە لە (مَکَّة)دا ڕادەگەیێنێ﴾

جا کە (أبُوسُفْیان) موسوڵمان بوو، گوتی: یارَسُولَ الله، پێم بڵێ: ئەگەر (قُرَیْش) خۆیـان بێدەنگ بکەنو جەنگ نەکەن، دڵنیـا دەبـن کـە نایـانکوژی؟ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: بەڵێ، هەر کەسێك جەنگ نەکاو دەرگەیخۆی کلیل بدا، ئەوە ئەمینەو ناکوژرێ.

جا ئیمام (العَبّاس)رضي الله عنه فەرمووی: یارَسُولَ الله، (أبُوسُفْیان) پیاوێکە ناوبـانگو شـانازی خۆش دەوێ، شتێکی بۆ دابنێ. جا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: هەرکەسێك بڕواتـە نـاو خـانووی (أَبُوسُـفْیان) لـە کوشـتن ئـەمین دەبـێ، هـەر کەسـێك بڕواتـە نـاو مزگـەوتی (کَعْبَة)، هەر کەسێك چەك فڕێبدا، هەرکەسێك دەرگەیخۆی کلیل بدا، هەرکەسێك بڕواتە ناو خانووی (حَکِیم بن حِزام)، ئەوانەش هەموویان لە کوشتن ئەمین دەبن.

جـا پێغەمبـەرﷺ بـە ئیمـام (العَبّـاس)یرضي الله عنه فـەرموو: (أَبُوسُـفْیان) لـە تەسـکایی دۆڵەکەدا ڕابگرە، تا لەشکریخوا ببینێ.

جا ئیمام (العَبّاس)رضي الله عنه هەڵساو (أبُوسُفْیان)ی لەگەڵ خۆی بردە تەسکایی دۆڵەکە، تا ئەو هەموو لەشکرە هەر پۆلەی لەگەڵ سەرۆکەیخۆی بە لایاندا ڕابردو ئیمام (العَبّاس)شرضي الله عنه یەکە یەکە بە (أبُوسُفْیان)ی دەناساندن، تا پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هێـزە تایبەتیەکـەیخۆی هات—کە لە (مُهاجِر)و (أنْصار)رضي الله عنهم پێـك هـاتبوو— هـەزار کەسـیان زرێپـۆش بـوو، تـەنها چـاویان دیـار بـون، (أبُوسـفْیان) گـوتی: سُـبْحانَ الله ئەوانـە کـێن؟ ئیمـام (العَبّـاس)رضي الله عنه فەرمووی: ئەمە پێغەمبـەرەﷺ لەگەڵ (مُهـاجِر)و (أنْـصار)دا. جـا (أبُوسـفْیان)

گوتی: ئەی (أبُوالفَضل)=(العَبّاس) ئەمڕۆ پاشایەتی کوڕە برای تۆ زۆر گەورە بووە!، ئیمام (العَبّاس)ش فەرمووی: ئەمە پێغەمبەرایەتییە. واتە: پاشایەتی نیە.

جا کە حەزرەتی(سَعد بن عُبادَة)ی سەرکردەی (الأنصار)ﷺ بە لای (أبُوسُفیان)دا تێپەڕی، گوتی: (اَلْیَوْمَ یَوْمُ الْمَلْحَمَة، اَلْیَوْمَ تُسْتَحَلُّ فِیهِ الْکَعْبَةُ) ئەمڕۆ ڕۆژی جەنگە، ئەمڕۆ (کَعْبة) حەڵاڵ دەکرێ.

جا سکاڵایان بردە لای پێغەمبەرﷺ، ئەویش فەرمووی: (سَعد) ڕاست ناکا ﴿اَلْیَوْمَ یَوْمُ الْمَرْحَمَة، اَلْیَوْمَ یُعَظِّمُ اللهُ فِیهِ الْکَعْبَـــةُ﴾ ئەمڕۆ ڕۆژی بەزەییە، ئەمڕۆ خوای گەورە (کَعْبة) گەورەو ڕێزدار دەکا. جا پێغەمبەرﷺ بۆ تەمبێکردنی (سَعد)ﷺ، فەرمانی دا: ئاڵایەکەیان لە (سَعد) وەرگرتو دایانە دەست کوڕی وی کە ناوی (قَیس) بووﷺ.

جا ئیمام (العَبّاس) فەرمووی: ئەی (أبُوسُفیان) پەلە بکەو زوو خۆت بگەیەنە گەلەکەی خۆت. جا (أبُوسُفیان) بە پەلە چۆوە (مَکّة)و بە دەنگی بەرز هاواری کرد: هۆ گەلی (قُرَیش) ئەمە (مُحَمَّد)ەﷺ بە لەشکرێکی وەها هاتووە: توانای ئەو لەشکرەتان نیە، هەر کەسێك بڕواتە ناو خانووی (أبُوسُفیان)، لە کوشتن ئەمین دەبێ.

جا ژنەکەیخۆی–(هِند بنت عُتبَة)–هەڵساو سمێڵەکانی (أبُوسُفیان)ی گرتنو گوتی: ئەم مەشکە ڕونە چڵکنە بێسودە بکوژن، ناشیرنترین دەرکەوتووی گەلە.

جا (أبُوسُفیان) گوتی: ماڵوێرانیە بە قسەی ئەم ئافرەتە هەڵمەخەڵەتین، لەشکرێکی وەها هاتووە تواناتان نیە. جا خەڵکەکە گوتی: خانووەکەی تۆ بە تەنها چۆن بەشی هەموومان دەکاو سودی چیە؟ جا (أبُوسُفیان) گوتی: هەر کەسێك دەرگەیخۆی کلیل بدا، هەر کەسێك چەك فڕێبدا، هەر کەسێك بڕواتە مزگەوت، هەر کەسێك بڕواتە ناو خانووی (حَکِیم بن حِزام)، ئەوانە گشتی لە کوشتن ئەمین دەبن. جا خەڵکەکە پەرت بون: بۆ مزگەوتو بۆ ماڵیخۆیان ڕۆیشتن.

## ﴿ پێغەمبەروﷺ (صَحابَة)کانﷺ دەچنە ناو شاری (مَکّة) ﴾

بۆ چوونە ناو شاری (مَکّة)، پێغەمبەرﷺ لەشکرەکەی کردە چوار بەش:

١–باڵی ڕاستە بە سەرکردایەتی ئەمیر (خالِد بن الوَلِید)ﷺ، پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکرد: بە ڕۆژئاوای(مَکّة)دا بسوڕێتەوەو لە لایخوارەوە بڕواتە ناو (مَکّة).

٢–باڵی چەپە بە سەرکردایەتی حەزرەتی(الزُّبَیر بن العَوام)ﷺ، پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکرد لە لای سەرەوە بڕواتە ناو (مَکّة)و ئاڵایەکەی لە (اَلحَجُون) هەڵبداو لەوێ چاوەڕوانی پێغەمبەرﷺ بکا.

٣–هێزی (الأنصار) بە سەرکردایەتی حەزرەتی(سَعد بن عُبادَة)ﷺ–واتە: پێش ئەوەی

ئالآیەکەی لێبستێندرێ–پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکرد بە (كَداء)دا بڕواتە ناو (مَكّة).
٤–هێزی پیادە بە سەرکردایەتی حەزرەتی(أبُوعُبَيْدَة بن الجَراح)ﷺ، پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکرد لە بەر دەستی پێغەمبەرداﷺ بڕواتە ناو (مَكّة).
جا پێغەمبەرﷺ بە سەرکردەکانی فەرموو: هیچ کەسێك مەکوژن، تەنها ئەو کەسە نەبێ کە جەنگتان لەگەڵ دەکا. جا هەندێك هەرچیوپەرچی (قُرَيْش) لە چەند هۆزەێك هێزێکیان کۆ کردبۆوە، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿يا مَعْشَرَ ٱلْأَنْصارِ، هَلْ تَرَوْنَ أَوْباشَ قُرَيْشٍ؟ أُحْصُدُوهُمْ حَصْداً﴾ ئەی گەلی (أنْصار)، هەرچیوپەرچییەکانی (قُرَيْش) دەبینن؟ بە دروێنە بیاندورنەوە، واتە: ئەگەر جەنگیان کرد.
هەروەها پێغەمبەرﷺ خوێنی چوار ئافرەتو هەندێك پیاوی بە فیڕۆ دا و فەرمووی: ئەوانە لە هەر شوێنێك دەستتان کەوتن بیانکوژن، هەرچەند لە بن پەردەی (كَعْبة)ش بن. جا پێغەمبەرﷺ لە سبەینەی ڕۆژی (جُمُعَة) بە (كَداء)دا چووە ناو شاری (مَكّة)–واتە: لە نۆزدەی مانگی ڕەمەزان، هەروەك (شرح صحيح مسلم)و (فتح الباري) لە باسی ڕۆژووی ڕێبواردا فەرموویانە.
جا پێغەمبەرﷺ بە سواری وشترەکەی–لەگەڵ هێزە زرێپۆشەکەی (مُهاجر)و (أنْصار)– هاتە ناو (مَكّة)و ئالآیەکەی سپی بوو و خودە پۆڵاییی لە سەریخۆی دانابوو و سوڕەتی(الْفَتح)ی دەخوێند، ئەوەندە ملکەچی بۆ خوا دەنواند: سەریخۆی نەوی کردبوو تا لە سەر باری وشترەکەی دادەنا، چونکە دیتی چۆن خوایگەورە ڕێزی لێناو (مَكّة)ی بۆ ڕزگار کرد، جا پێغەمبەرﷺ لە لای سەرەوەی (مَكّة) لە (الحَجُون) دابەزی، واتە: لەو شوێنەی حەزرەتی(الزُبَيْر)ﷺ ئالآیەکەی لێهەڵدابوو.
جا بزانە: هیچ کەسێك ڕووبەڕووی لەشکرەکانی پێغەمبەرﷺ نەبۆوە، تەنها لە بەرەی ئەمیر (خالِد بن الوَلِيد)ﷺ: (صَفْوان بن أُمَيَّة)و (عِكْرِمَة بن أبيجَهْل) کۆمەڵە چەکدارێکیان کۆ کردبۆوەو لە (الْخَنْدَمَة) ڕێگەیان لە ئەمیر (خالد)ﷺ گرت، بەڵام (صَحابَة)کانﷺ جەنگیان لەگەڵ کردنو بیستو هەشت کەسیان لێکوشتنو کافرەکان بەزینو هەڵاتن، بەڵام دوو (صَحابَة)ش شەهید بون، جا پێغەمبەرﷺ لە دورەوە بریقەی شمشێرەکانی دیتو فەرمووی: ئەوە چییە؟ گوتیان: (خالِد)ﷺ جەنگی لەگەڵ دەکرێ، ئەویش بە ناچاری جەنگ دەکا. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بڕیاری خوا چاکترە. واتە: چونکە بڕیاریخوا زاڵە بە سەر بڕیاریپێغەمبەرداﷺ
جا (أُمّ هانِئ)ی خوشکی ئیمام (عَلي)ﷺ–کە ئەویش لە (فتح مَكّة)دا موسوڵمان بووبوو– دەفەرموێ: دوو پیاویکافر–(زُهَير)و (الحارث)–کە خزمی مێردەکەم بون، پاراستنم دابونێ، بەڵام (عَلي)ی برام ویستی بیانکوژێ، جا هاتمە لای پێغەمبەرﷺ

**دیـتم خـۆی دەشـوا، ئینجـا کـە لـە خـۆ شوشـتنەکە تـەواو بـوو، هەشـت ڕەکعـەت چێشتەنوێژی کـرد، ئینجا کـە نوێـژەکانی تـەواو کـردن، فـەرمووی: مەرحـەبا ئـەی (أمِّ هـانئ)، بۆچـی هـاتوی؟ منـیش گـوتم: دوو خزمـی مێردەکـەم لـە کوشـتن پاراسـتون، (علي)ش دەیەوێ بیانکوژێ!، جا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ﴿أَجَرْنا مَنْ أَجَـرْتِ يـا أُمَّ هانِئ﴾ ئەی (أُمِّ هانِئ)، ئێمەش ئەو کەسە دەپارێزین کە تۆ پاراستنت داوەتێ.**

**جـا کـە خەڵکەکـە دامـەزرا، پێغەمبـەرﷺ بـەرەو (کعبـة)=(بَیْـتُ الله) ڕۆیـشت، ئیمـام (أبُوبَکْر)شرضي الله عنه لە تەنیشتی دەڕۆیشت، تا گەیشتە (کعبة)، لەو کات سێسەدو شەست بت لە سەر (کعبة) دانـدرابون، جا پێغەمبـەرﷺ دارێکـی بـە دەسـتەوە گـرتو یەکـە یەکـە بتەکانی بە دارەکە فڕێدانە خوارەوەو دەیفەرموو: ﴿جاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْباطِلُ، جاءَ الْحَقُّ وَما يُبْدِئُ الْباطِلُ وَما يُعِيـدُ﴾ ئـایینی ڕاست هـاتو کوفری پـوچ نـەما، ئـایینی ڕاست هاتو کوفری پوچ دەرناکەوێو ئاسەواری نامێنێ.**

**ئینجا پێغەمبەرﷺ هاتە لای (الحَجَرُالأسْوَد)و دەسـتی لێـداو تـەوافی (بَیْـت)ی کـرد، لـە کاتی تەوافکردندا گەیـشتە بتـی (هُبَـل)–کـە گەورەترین بـت بـوو لـە تەنیـشت (بَیْـت) دانـدرابوو و دەیانپەرسـت–جـا پێغەمبـەرﷺ بـە کـەوانێك لـە چاوی بتەکـەی دەداو دەیفـەرموو: ﴿جاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْباطِلُ إِنَّ الْباطِلَ كانَ زَهُوقاً﴾الإسراء:٨١، ئـایینی ڕاست هـاتو کـوفری پـوچ نـەما، بەڕاسـتی کـوفری پـوچ هـەر لاچـووە. جـا فـەرمانی دا: بتەکەیان شکاند.**

**ئینجا لـە دوای تـەواف ویـستی بڕواتـە نـاو (کعبـة)، بۆیـێ ناردیـە لای (عثمـان بـن أبـی طلحة)ی دەرگەوانی (کعبة)، تاکو کلیلەکانی بۆ بێنێو دەرگەی (کعبة)ی بۆ بکاتەوە، جا (عثمـان) هـاتو کلیلەکـەی دایـە دەسـت پێغەمبـەرﷺ، جـا پێغەمبـەرﷺ دەرگـەی (کعبة)ی کردەوەو دیتی لە ناو (کعبة)شدا هەنـدێك بـت دانـدراون، بۆیـێ فـەرمانی دا: بتەکانی فڕێدرانە دەرەوە، هەم دیتی وێنەی حەزرەتی(إبراهیم) پێغەمبەروﷺ وێنەی حەزرەتی(إسماعیل) پێغەمبـەرﷺ لـە نـاو (کعبـة)دانـەو تیرەکـانی فاڵگرتنـەوەیان لـە دەستدانە، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خوایگەورە ئەو کافرانە بە کوشتن بدا، خۆ دەیانزانی هیچ کاتێك (إبْراهِيم)و (إسْماعِيل)–عليهما الصلاة والسلام– فاڵیان پێ نەگرتۆتەوە.**

**جـا فـەرمانی دا: وێنـەی ئـەوانیش فڕێدرانـە دەرەوە، هـەم چـەند وێنەیـەکیتریش لـە (کعبة)دا هەبون پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە ئیمام (عُمَر)رضي الله عنه کـرد بـە پـەڕۆکێکی تـەڕ وێنەکانی سڕینەوە.**

**جا پێغەمبەرﷺ چووە نـاو (کعبـة)و لـەم لاو لـەو لای (کعبـة)دا (الله أکبَـر)ی دەگـوت، ئینجا دوو ڕەکعـەت نوێـژی لـە نـاو (کعبـة)دا کـرد، ئینجـا لـە (کعبـة) هاتـە دەرەوەو**

کیلەکانی دانەوە دەست (عثمان)و فەرمووی: ﴿هەتا هەتایی کلیلەکان لە لای ئێوە بن، جگە لە ستەمکار هیچ کەسێك کلیلەکانتان لێ ناستێنێ﴾.
ئینجا پێغەمبەرﷺ چووە سەر ئاوی (زَمْزَم)و تێر ئاوی خواردەوەو دەستنوێژی بە ئاوی (زَمْزَم) گرتو خەڵکەکە پێشبڕکێیان دەکرد: تاکو دلۆپە ئاوێکی دەستنوێژەکەیان دەست بکەوێو ڕوویخۆیان پێ تەڕ بکەن بۆ بەرەکەت، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە حەزرەتی(بلال)ﷺ کرد: بچێتە سەر (كَعْبَة)و لە سەر بانی (كَعْبَة)دا بانگی نیوەڕۆ بدا، تاکو کافرەکان خەفەتبار ببن، جا حەزرەتی(بلال)ﷺ سەر کەوتو لە سەر بانی (كَعْبَة) بانگی نیوەڕۆی دا، جا کافرەکان زۆر ڕقیان لە بانگدانی حەزرەتی(بلال) هەڵساو هەندێکیان قسەی ناڕێکیان کردو بە قەڵە ڕەشکە ناوی حەزرەتی(بلال)یانﷺ دەهێنا.

## ﴿ موسوڵمانبوونی ( أَبُوقُحافَة )ی باوکی ئیمام ( أَبُوبَكْر )رضي‌الله عنهما﴾

ئینجا پێغەمبەرﷺ لە مزگەوتی (الْحَرام) دانیشتو خەڵك دەهاتە مزگەوتو لە دەورەی کۆ دەبونەوە، ئیمام (أَبُوبَكْر)شﷺ (أَبُوقُحافَة)ی باوکیخۆی -کە ناوی (عُثمان) بوو- هێنایە لای پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دەبوا ئەم پیرە هەر لە ماڵیخۆی بوایە، تا من بەخۆم دەهاتمە لای؟ جا ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ فەرمووی: ئەو شیاوترە بێتە لای جەنابت، جا پێغەمبەرﷺ (أَبُوقُحافَة)ی لە پێشە خۆی دانیشاندو دەستی بە سەر سینگیدا هێناو موسوڵمان بوو، جا پێغەمبەرﷺ پیرۆزبایی موسوڵمانبوونی وی لە ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ کرد، جا سەرو ڕیشی (أَبُوقُحافَة) وەکو کڵۆکی سپی بونو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿غَيِّرُوا هَذا بِشَيْءٍ وَاجْتَنِبُوا السَّوادَ﴾ رواه مسلم، ئەم مووە سپیەیە بە ڕەنگێك بگۆڕن، بەڵام خۆتان لە ڕەنگی ڕەش بپارێزن.
جا بزانە: لە ناو (صَحابَة)کاندا: تەنها ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ خۆیو باوکیو دایکیو هەموو کوڕەکانیو کیژەکانیو نەوەکانی (صَحابَة)نەﷺ.

## ﴿ لێبوردنی گشتی ﴾

ئینجا خەڵکەکە هەر لە مزگەوتدا چاوەڕوان بون: ئایا پێغەمبەرﷺ چ بڕیارێك دەدا؟ جا پێغەمبەرﷺ لە لای دەرگەی (كَعْبَة) وتارێکی دا و فەرمووی: ﴿لاإلهَ إلاَّالله وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، صَدَقَ وَعْدَهُ وَنَصرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الأَحْزابَ وَحْدَهُ﴾...ئینجا لە وتارەکەیدا چەند بڕیارێکی شەریعەتیئیسلامی بۆ خەڵکەکە باس کردن:
**هەندێك لەو بڕیارانە**: ﴿نابێ موسوڵمان لە تۆڵەی کافر بکوژرێ، موسوڵمانو کافر میرات لە یەکتری ناگرن، نابێ لە ژێر مارەبڕی پیاوێکدا ژنێكو پورەکەی کۆ بکرێنەوە، واتە: نابێ ئافرەت ببێتە هەوێی پوری خۆی-خوشکی باوکی، یان خوشکی دایکی-، شاهید لە سەر داواکارەو سوێند لە سەر داوالێکراوە، نابێ ئافرەت

ئەندازەی سێ ڕۆژە ڕێ بۆ سەفەر بڕوا تەنها لەگەڵ مەحرەمێکیخۆی نەبێ، لە دوای نوێژی عەسرێو لە دوای نوێژی سبەینێ نابی هیچ نوێژێك بکرێ، نابێ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قورباندا بەڕۆژوو ببێ﴾...

ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿هۆ گەلی (قُرَیْش) خوایگەورە خۆ بەزلزانینی سەردەمی نەفامی و شانازیکردنی بە باوك باپیرانی لە ناو ئێوەدا نەهێشت، هەموو کەسێك لە باب (آدَم) بووە، باب (آدَم)ش لە گڵ دروست کراوە﴾.

ئینجا پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ﴾ الحجرات: ١٣، ئەی خەڵکینە، ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروست کردون–کە باب (آدَم)و دایکە (حَواء)یە–و ئێوەمان کردۆتە چەند گەلێكو چەند هۆزێك تاکو یەکتری بناسن–نەك یەکتری بچەوسێننەوە– بەڕاستی ڕێزدارترتان لە لایخوا ئەو کەسەیە لەخواترستر بێ.

ئینجا پێغەمبەرﷺ بە خەڵکی (مَکَّة)ی فەرموو: چۆن بیر دەکەنەوە: من چیتان لێبکەم؟ خەڵکەکەش گوتیان: بیر لە چاکەی تۆ دەکەینەوە، تۆ برایەکی ڕێزداریو کوڕە برایەکی ڕێزداریو دەسەڵاتیشت بە سەر ئێمەدا هەیە!. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿اِذْهَبُوا فَأَنْتُمُ الطُّلَقَاءُ﴾ بڕۆن ئێوە دیلی ئازادکراون.

جا بزانە: بۆیێ بە خەڵکی (مَکَّة) دەگوترێ: (الطُّلَقاء)=ئازادکراوەکان، چونکە لەم ڕۆژەدا پێغەمبەرﷺ ئازادی کردونو نەیکردنە کۆیلە، ماڵو ژنو منداڵیشیان تاڵان نەکرا.

جا خەڵکەکە بەم لێبوردنە ئەوەندە دڵخۆش بون: وەك لە ناو گۆڕ هاتبنە دەرەوە، ئەوها دڵخۆش بون، بۆیێ لە ئەنجامدا هەموویان موسوڵمان بون.

ئینجا پێغەمبەرﷺ چووە سەر (صَفا)و تەماشای (بَيْت)ی دەکردو دەستی بە دوعاکردن کرد، جا (أنصار)ی (مَدِينة)ش لە بن (صَفا) بونو بە یەکترییان گوت: ئەم پیاوە دڵگری شارەکەیو خۆشویستنی هۆزەکەی گەیوەتێ، واتە: دەیەوێ بێتەوە ناو شارو هۆزەکەی خۆی. جا پێغەمبەرﷺ لەبارەی ئەم گۆتەیە (وَحي)ی بۆ هات، جا کە (وَحي)ی کۆتایی هات، فەرمووی: هۆ گەلی (أَنْصار) ئێوە قسەیەکی ئەوهاتان گوتووە؟ گوتیان: بەڵێ، ئەو قسەمان کردوە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: من کۆچم کردوە بۆ لای خواو بۆ لای ئێوە، ژیانم ژیانی ئێوەیە، مردنم مردنی ئێوەیە.

جا (أنصار) دەستیان بە گریان کردو گوتیان: بۆیێ ئەو قسەیەمان کردوە، چونکە دڵمان ڕێ نادا پێغەمبەریخواﷺ لە شارێکیتری جگە لە شاری ئێمە بێ. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خواو پێغەمبەر باوەڕتان پێدەکەنو عوزریشتان قبوڵ دەکەن.

ئینجا پێغەمبەرﷺ لە (صَفا) دانیشتو پەیمانی ئیسلامەتیی لە پیاو و ئافرەتەکان وەرگرتو کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵکەکە دەهاتن بۆ پەیماندان، جا پیاوێك هات

پەیمان بدا، بەڵام لە ترسی پێغەمبەرﷺ دەلەرزی، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خۆت بێ ترس بکە، خۆ من پاشا نیم، من کوڕی ئافرەتێکم گوشتی وشککراوەی دەخوارد.

جا (مُعاوِيَة)ی کوڕی (أبُوسُفيان)ش هات موسوڵمان بوو، پێغەمبەرﷺ حەزرەتی (مُعاوِيَة)ی کردە نوسەرەی (وَحي)، لە دوای (الخُلَفاءالرّاشِدِين)ش حەزرەتی(مُعاوِيَة)ﷺ بووە یەکەم (خَلِيفَة)ی دەوڵەتی (أمَوِيّ).

جا لە دوای پەیمانی پیاوانیش، ئافرەتەکان هاتنو پێغەمبەرﷺ تەنها بە قسە کردن پەیمانی لێوەرگرتنو فەرمووی: ﴿من تۆقە لەگەڵ ئافرەتان ناکەم﴾.

کەواتە: پێغەمبەرﷺ تۆقەی لەگەڵ هیچ ئافرەتێکی نامەحرەم نەکردوە، مەوەرك لە هەشتەم گوڵبژێری پەیمانی (العَقَبَة)دا ڕوونمان کردەوە.

جا یەکێك لەو ئافرەتانەی بۆ پەیماندان هاتبون: (هِند)ی ژنەکەی (أبُوسُفيان) بوو، بەڵام خۆی داپۆشی بوو، تاکو پێغەمبەرﷺ نەیناسێتەوە؟ چونکە لە غەزای (أحُد) جەرگی ئیمام (حَمزَة)یﷺ دەرهێنابوو، بەڵام لە ئەنجامدا خۆی ئاشکرا کردو شادەی هێناو موسوڵمان بوو، پێغەمبەریشﷺ عەفوی کرد، ئینجا (هِند) بە پێغەمبەریﷺ گوت: (أبُوسُفيان)ی مێردم پیاوێکی بەخیلە، بەشی خۆمو منداڵەکانم بژێوم ناداتێ، مەگەر بە دزی لە ماڵەکەی وی ببەم؟ پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ﴿خُذِي مِنْ مالِهِ بِالْمَعْرُوفِ ما يَكْفِيكِ وَيَكْفِي بَنِيكِ﴾ رواه الشيخان، بەگوێرەی عادەت بەشی خۆتو منداڵەکانت بژێو لە ماڵی (أَبُوسُفْيان) ببە.

جا بزانە: پێغەمبەرﷺ هۆزی (خزاعَة)ی ئیزن دابون: تا کاتی نوێژی عەسرێ تۆڵەی کوژراوەکانیخۆیان لە (بَنِيبَكْر) بکەنەوە، ئینجا کە پێغەمبەرﷺ نوێژی عەسرێی کرد، فەرمووی: چیتر چەك بە کار مەهێننو واز لە کوشتن بێنن.

بەڵام (خزاعَة) لە سنور دەرچونو بۆ سبەینێ پیاوێکی(خزاعَة) پیاوێکیتری (بَنِيبَكْر)ی کوشت، بۆیێ پێغەمبەرﷺ لە دوای نیوەڕۆ وتارێکیتری خوێندوەو فەرمووی: ﴿بەڕاستی خوایگەورە (مَكّة)ی حەرام کردوەو ڕێزی لێناوە لەو ڕۆژەوە کە خوا ئاسمانەکانو زەمینی دروست کردون، تا ڕۆژی قیامەتیش (مَكّة) هەر حەرامو ڕێزدارە، کەوابوو: هەر مرۆڤێك باوەڕی بە خواو ڕۆژیدوایی هەبێ نابی خوێنی تێدا بڕێژێ، نابی درەختیشیببڕدرێ، جا ئەگەر کەسێك جەنگی پێغەمبەریﷺ لە (فَتح مَكّة)دا کردە بەڵگەیخۆی، پێی بڵێن: خوایگەورە تەنها ماوەیەکی دیارکراو–لە بەیانی تا عەسر–(مَكّة)ی بۆ پێغەمبەرﷺ حەڵاڵ کرد، بۆ ئێوە حەڵاڵی نەکردوەو حەرامیو ڕێزداریەکەی بۆ گەڕاندوەو وەك دوێنی حەرامو ڕێزدار بۆتەوە، ئەوەی لێرەیە با ئەم وتارەم بگەینێتە ئەو کەسانەی لێرە نین﴾.

جا پێغەمبەرﷺ سەد وشتر خوێنی ئەم کوژراوەی دایە (بَنِیبَکْر)؟ چونکە لە دوای کۆتایی هاتنی ئیزندانەکە کوژرابوو.

**جا ئەو کەسانەش کە پێغەمبەرﷺ خوێنی بە فیڕۆ دابون، ئەمانەن:**

١-( **عبدالله بن أَبِیسَرْح** ): نوسەری (وَحي) بوو، ئینجا کافر بۆوەو چۆوە (مَکّة)، بەلاَم ئیمام (عُثمان)ﷺ تکای بۆ کردو پێغەمبەرﷺ عەفوی کرد.

٢-( **هَبّار بن الأَسْوَد** ): وشترەکەی حەزرەتی(زَینَب)ی کیژی پێغەمبەریﷺ ڕەواندەوە، لەو کاتەی لە (مَکّة) کۆچی دەکرد بۆ (مَدِینَة)، جا حەزرەتی(زَینَب)-رضي الله عنها- کەوتە خوارەوەو کۆرپەکەی ناو زگی لەبار چوو و هەر خوێنی لێدەهات، تا بەو نەخۆشیە وەفاتی کرد، ئینجا ئەویش موسوڵمان بوو و پێغەمبەرﷺ عەفوی کرد.

٣-( **عِکْرِمَة** )ی **کوڕی** ( **أَبُوجَهْل** ): خۆیو باوکی توندترین دوژمنی ئیسلام بون، ئەویش کە لە جەنگی (خَندَمَة) بەزی، یەکسەر لە (مَکّة) هەلاَتە دەرەوە بەرەو کەناری دەریای سۆر ڕۆیشت، بەلاَم ژنەکەی–کە ناوی (أمُ حَکِیم)بوو–هاتە خزمەت پێغەمبەروﷺ تکای پاراستنی (عِکْرِمَة)ی لێکرد، پێغەمبەریشﷺ پاراستنی دایێ، جا ژنەکەی بە دوایدا ڕۆیشت تا گەیشتە کەناری دەریای سۆر، دیتی (عِکْرِمَة) سواری کەشتی بووەو دەیەوێ بڕوا، جا ژنەکەی گوتی: ماموزا، من لە لای باشترینی خەڵکەوە هاتومو پاراستنم بۆ وەرگرتوی، لەگەڵم بگەڕیوە، خۆت بە هیلاك مەدە، جا لەگەڵی گەڕاوەو هاتە خزمەت پێغەمبەروﷺ موسوڵمان بوو، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿مَرْحَباً بِمَنْ جَاءَ مُؤْمِناً مُهاجِراً﴾ بەخێر بێ ئەوکەسەی بە ئیمانداریو کۆچکەری هاتووە.

جا پێش ئەوەی (عِکْرِمَة) بگاتە جێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (عِکْرِمَة) دێ، بەلاَم جنێو بە باوکی مەدەن ﴿لا تَسُبُّوا الأَمْواتَ فَتُؤْذُوا الأَحْياءَ﴾ جنێو بە مردووان مەدەن نەوەك زیندووان ئازار بدەن.

٤-( **صَفْوان بن أُمَیَّة** ): ئەویش لە توندترین دوژمنانیئیسلام بوو، لە (مَکّة) هەلاَتە دەرەوە، تا خۆی بهاوێتە ناو دەریا، بەلاَم حەزرەتی (عُمَیْر بن وَهْب)ﷺ پاراستنی بۆ وەرگرتو بە دوایدا ڕۆیشتو گەڕاندیەوەو هێنایە خزمەت پێغەمبەرﷺ، جا (صَفْوان) بۆ موسوڵمانبوون داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەرﷺ کرد، پێغەمبەریشﷺ تا چوار مانگ ماوەی دایێ، ئینجا ئەویش لە دوای غەزای (حُنَین) موسوڵمان بوو.

٥-( **وَحْشِي** ): بکوژی ئیمام (حَمْزَة)ﷺ، ئەویش لە (مَکّة) هەلاَتو چووە (طائِف)، ئینجا لەمەودوا موسوڵمان بوو و پێغەمبەرﷺ عەفوی کرد.

٦-( **عبدالله بن خَطَل** ): هاتە (مَدِینَة)و موسوڵمان بوو، ئینجا (صَحابَة)یەکی (أَنصاري)ی

کوشتو گەڕاوە (مَكّة)و کافر بۆوە، ئەمەیان دوو (صَحابَة) بە هاوبەشی کوشتیان.

٧-( مِقْيَس بن صُبابَة ): هاتە (مَدِينة)و خوێنی برا کوژراوەکەی وەرگرت، ئینجا بکوژی برایەکەشی کوشتو بە کافربوویی گەڕاوە (مَكّة)—هەروەك لە غەزای (بَنِيالْمُصْطَلِق)دا ڕابرا— ئەمەش کوڕە مامەکەیخۆی کوشتی.

٨-( الْحُوَيْرِث بن نُقَيْذ ): ئەمەش لە (مَكّة) زۆر پێغەمبەریﷺ ئازار دەداو قسەی ناشیرینی پێدەگوت، جا کە هەردوو کیژەکانی پێغەمبەرﷺ (أمُّ كَلْثوم) و(فاطِمَة)-رضیالله عنهما- کۆچیان کرد بۆ (مَدِينة)، ڕێگەی لێگرتنو لە سەر وشترەکەیان فڕێیدانە خوارەوە، ئەمەش بە دەستی ئیمام (علي)ﷺ کوژرا.

٩ و ١٠-( زُهَيْر بن أُمَيَّة )و ( الْحارِث بن هِشام )ی برای (أبُوجَهْل): ئەم دووانەش (أمُّ هانِئ) پاراستنی دانیو پێغەمبەرﷺ لێیقبول کرد—هەروەك باسمان کرد— جا ئەم دووانەش هەردووکیان موسوڵمان بون.

١١-( هِنْد بِنْت عُتْبَة ): ژنەکەی (أبُوسُفْيان) موسوڵمان بوو و عەفو کرا، هەروەك باسمان کرد.

١٢-( سارَة ) ئەو ئافرەتەی نامەکەی (حاطِب)ی هەڵگرتبوو، کە نامەکەی لێگیرا، گەڕاوە بۆ (مَكّه)و کافر بۆوە، بەڵام موسوڵمان بۆوەو عەفو کرا.

١٣و١٤-( فَرْتَنَى )و ( قُرَيْنَة ): دوو کەنیزەی(ابن خَطَل) بون، بە گۆرانیگۆتن جنێویان دەدا پێغەمبەروﷺ موسوڵمانان، جا (قُرَينَة) کوژرا، (فَرتَنى)ش موسوڵمان بوو و عەفو کرا.

جا پێغەمبەرﷺ بە ئیمام (الْعَبّاس)یﷺ فەرموو: بۆچی (عُتبَة)و (مُعتَب) کوڕەکانی (أبُولَهَب) دیار نینە؟ جا ئیمام (الْعَبّاس) چوو ئەوانیشی هێناو موسوڵمان بون، پێغەمبەرﷺ بە موسوڵمانبوونیان دڵخۆش بوو، واتە: چونکە کوڕە مامیخۆی بونو -وەکو باوکیان- زیانیان لە موسوڵمانان نەدابوو.

## ﴿ مانەوەی پێغەمبەرﷺ لە ( مَكّة )دا ﴾

ئینجا پێغەمبەرﷺ ماوەی نۆزدە ڕۆژان لە (مَكّة)دا مایەوەو نوێژی کورت دەکردنەوە، جا لە دوای ئەم نۆزدە ڕۆژە، نەگەڕاوە بۆ (مَدينة)، بەڵکو بۆ غەزای (حُنَين)و (طائِف) ڕۆیشت، جا لە ماوەی مانەوەی لە (مَكّة)دا (سَرِيَّة)ی دەناردن تاکو بتەکانی دەوروبەری (مَكّة) بشکێنن، هەر لەو ماوەیەشدا ئافرەتێك دزی کردو پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: دەستیان بڕی، هەر لە (فتح مَكّة)دا پێغەمبەرﷺ ماوەیەك ژنهێنانی (مُتعَة)ی حەڵاڵ کردەوەو ئینجا لە دوای سێ ڕۆژان حەرامی کردەوەو فەرمووی: ﴿لەمڕۆوە تا ڕۆژی قیامەت ژنهێنانی (الْمُتْعَة) حەرامە﴾. هەروەك لە غەزای (خَيْبَر)دا ڕوونمان کردەوە.

ئینجا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(عَتاب بن أسِيد)یﷺ کردە (والی)=سەپەرشتکاری

(مَكّة)و فەرمانی پێکرد: بەخۆی پێشنوێژی بۆ خەڵکی (مَكّة) بکا، لەو کات تەمەنی بیست‌و یەك ساڵ بوو، هەروەها حەزرەتی(مُعاذ بن جَبَل)شی‌ﷺ لە (مَكّة)دا هێشتەوە، تاکو خەڵکی فێرە شەرعی ئیسلام بکا. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٦٤١–٦٨٤) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(١٠٢–١٥٠) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٣٨٩–٣٩٨).

## ﴿ كوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم:** بزانە: لە ڕۆژی (فَتْح مَكّة)دا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿هَذا مَا وَعَدَني رَبّي، ثُمَّ قَرَأَ إذا جَاءَ نَصْرُالله...﴾ رواه الطبراني في الأوسط، ئەمە ئەو سەرکەوتنەیە کە خوا وەعدەی پێ دابوم. ئینجا سورەتی (إذَا جَاءَ نَصْرُ الله...)ی خوێندەوە، کە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، إذَا جَاءَ نَصْرُ اللهِ﴾ ئەی پێغەمبەرﷺ کاتێ سەرکەوتن‌و یارمەتیی خوا بۆ تۆ هات لە سەر دوژمنەکانت ﴿وَالْفَتْحُ﴾ کاتێ (مَكّة)ش ڕزگار کرا ﴿وَرَأَيْتَ النَّاسَ﴾ وە لە دوای ڕزگارکردنی (مَكّة)ش ئەو خەڵکەت دیت ﴿يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللهِ أَفْوَاجاً﴾ کۆمەڵ کۆمەڵ دێنە ناو ئایینی‌ئیسلام، ئەو کاتە ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ﴾ بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ)، واتە: شوکرو سوپاسی خوا بکە لە بەرامبەر ئەو سەرکەوتن‌و ڕزگارکردنەی (مَكّة)، هەم ﴿وَاسْتَغْفِرْهُ﴾ بڵێ: (أَسْتَغْفِرُاللهَ) واتە: داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە ﴿إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً﴾ چونکە خوایگەورە زۆر تۆبە قبوڵ دەکاو لە گوناهەکان خۆش دەبێ.

حەزرەتی(ابن عَبّاس)رضي‌الله عنهما فەرموویەتی: ئەم سورەتە–(إذا جاءَ)– دوایین سورەتی قورئانە کە هەمووی بە یەکەوە بۆ پێغەمبەرﷺ هاتۆتە خوارەوە. هەم فەرموویەتی: ئەم سورەتە–(إذا جاءَ)– ئاشکراکردنی وەفاتکردنی پێغەمبەرەﷺ، واتە: زمانحاڵی سورەتەکە دەفەرموێ: (ئەی پێغەمبەرﷺ کە خوایگەورە سەرکەوتنی دایێ‌و (مَكّة) لە ژێر دەستی کافرەکانی (قُرَيْش) ڕزگار کرا، ئەو کاتە عەرەبەکانی‌تریش سەر شۆڕ دەکەن‌و کۆمەڵ کۆمەڵ دێنە ناو ئایینی‌ئیسلام، لە ئەنجامدا موسوڵمانەکان دەبنە گەورەترین هێزی دورگەی عەرەب‌و هیچ کەسێك ناتوانێ بەرهەڵستییان بکا، بەڵکو هێزی ئیسلام دەگاتە ئەو پلەیەش: دەتوانی ڕووبەڕووی زۆڵهێزەکانی دەوروبەری ببێتەوەو خەڵکی لە ژێر ستەمی ئەوان ڕزگار بکا، جا ئەو کاتە–ئەی پێغەمبەرﷺ– کاری تۆ لە دونیادا تەواو دەبێ‌و خۆت ئامادە بکە بۆ وەفاتکردن‌و چوونە لای خوا، کەوابوو: لە سەر ئەو نیعمەتە گەورەیە زۆر تەسبیحات‌و شوکری خوا بکەو داوای لێخۆشبونیش لە خوا بکە بۆ خۆت‌و ئوممەتت).

حەزرەتی(عائشَة)–رضي الله عنها– فەرموویەتی: لە دوای هاتنی ئەم سورەتە، پێغەمبەرﷺ زۆر دەیفەرموو: ﴿سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، أَسْتَغْفِرُاللهَ وأَتُوبُ إِلَيْهِ﴾ رواه مسلم، لە (رِوايَة)ێکی‌تر: لە

ڕوکوع‌و سوجده‌دا ده‌یفه‌رموو: ﴿سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنا وَبِحَمْدِكَ اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي﴾ رواه البخاری.

**پرسیار: ئه‌وه زانیمان ئه‌و سه‌رکه‌وتن‌و ڕزگارکردنه‌ی (مَكَّة) به یارمه‌تیدانی خوای‌گه‌وره بوو، به‌لام (إذا أَرادَ اللهُ شَيْئاً هَيَّأَ أَسْبابَهُ) ئه‌گه‌ر خودا ویستی کارێك بکا، هۆکاره‌کانیشی بۆ ئاماده ده‌کا. ئایا هۆکاری ئه‌م سه‌رکه‌وتنه چی بوو؟**

**وه‌لام:** پێش هه‌موو شتێك لێزانی‌و کارله‌جێیی پێغه‌مبه‌رﷺ بوو، به ته‌واوی پێکهاتنه‌که‌ی (الْحُدَيْبِيَة) بینه‌وه بیر خۆت: له لایه‌ك: (صَحابَة)کان‌ﷺ ناڕازی بون‌و به دڵی شکاو گه‌ڕانه‌وه؟ چونکه ئه‌نجامه‌که‌یان نه‌ده‌زانی، له لایه‌کیتریش: پێغه‌مبه‌رﷺ گوێی نه‌دا ناڕه‌زایی ئه‌وان، به‌ڵکو به ڕه‌زامه‌ندی خوای‌گه‌وره پێکهاتنه‌که‌ی ئیمزا کردو خوای‌گه‌وره‌ش ناوی له‌و پێکهاتنه نا: (فَتْحاًمُبِيناً) سه‌رکه‌وتنێکی ڕوون‌و ئاشکرا، چونکه ئه‌نجامه‌که‌ی ڕزگارکردنی(مَكَّة) بوو.

جا له دوای لێزانین‌و کارله‌جێیی پێغه‌مبه‌ریشﷺ: تێکۆشان‌و قوربانی‌دانی (صَحابَة)کان‌ﷺ بوو، (أَحَدٌ أحَدٌ)ی حه‌زره‌تی(بِلال الْحَبَشِي)ﷺ بوو، کۆچکردن‌و به‌جێهێشتنی ماڵ‌و وڵات بوو، ئه‌و (صَحابَة) به غیره‌ت‌و ڕێزدارانه‌ی له سه‌ربازگه‌ی پێغه‌مبه‌رداﷺ مه‌شقی قوربانی‌دان‌و گیانفیداییان کردبوو، ئه‌و (صَحابَة) خاوه‌ن هه‌ڵوێستانه‌ی له پێناوی‌خوادا خزم‌و که‌سیان فڕێ‌دان‌و ڕازی نه‌بون له ژێر سته‌می کوفردا بژیێن، ئه‌وان بون (مَكَّة)یان ڕزگار کردو له دوای هه‌شت ساڵان به سه‌ربه‌رزی هاتنه‌وه سه‌ر مڵك‌و ماڵی‌خۆیان‌ﷺ، دڕنده‌ترین دوژمن سه‌ری بۆ شۆڕ کردن.

**به‌ڵێ:** ئه‌و (بِلال)ه‌ی له ژێر ئازاردانا له (مَكَّة)دا ده‌یگوت: (أَحَدٌ أحَدٌ)، هه‌ر ئه‌ویش ئێستا له سه‌ربانی (كَعْبَة)دا ده‌ڵێ: (اَللّـــــــهُ أَكْبَر، اَللّـــــــهُ أَكْبَر). تا هه‌ندێك له کافره‌کان ده‌یانگوت: چاك نه‌بو باوکم زیندوو نه‌بو و ئه‌م ڕه‌شپێسته‌ی له سه‌ربانی (كَعْبَة)دا نه‌دیت؟ ئه‌گینا: له خه‌فه‌تان شه‌قی ده‌برد!. که‌وابوو: ئه‌ی موسوڵمانی‌ڕێزدار، خاك‌و وڵات‌و خزم‌و که‌س به‌رامبه‌ر به ئیسلام هیچ نرخێکی نیه، ئه‌وانه هه‌مووی به قوربانی ئیسلام بکه، هه‌ر له دونیادا پاداشتی‌خۆت وه‌رده‌گریه‌وه، ته‌ماشا بکه: (صَحابَة)ی پێغه‌مبه‌رﷺ به نهێنی کۆچیان کردو له (مَكَّة)، چونه ده‌ره‌وه، وا ئێستاش به ئاشکرایی‌و به سه‌ربه‌رزی دێنه‌وه ناو (مَكَّة)، ﷺ رضي الله عنهم اجمعين، باسه‌کەم پێك هێناوه: له (تفسير ابن كثير) سورة النصر، و(الخصائص الكبرى ب(١) ل(٢٩٥) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٣٩٨) و(سيرة الصلابي) ب(٢) ل(٥٣٠-٥٣١).

**دووه‌م: هه‌ر دوژمنێك په‌یمان بشکێنێ، دروسته: جه‌نگی له‌گه‌ڵ بکرێ،** خوای‌گه‌وره ده‌فه‌رموێ: ﴿وَإِنْ نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ مِنْ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لا أَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنْتَهُـــونَ﴾ التوبة: (١٢)، **ئه‌گه‌ر ئه‌وان په‌یمانه‌که‌یان له دوای به‌ستن هه‌ڵوه‌شانده‌وه‌و عه‌یبیان له ئاینی ئێوه گرت، ئێوه‌ش سه‌رکرده‌کانی‌کوفر**

**بکوژن، چونکە تازە هیچ پەیمانێکیان لەگەڵ ئێوە نیە، بەڵکی واز لە تاوانەکانیان بێنن.**

جا لە غەزای(بَنِيقُرَيْظَة)دا، پێغەمبەرﷺ بە فەرمانی ئەو ئایەتە ڕەفتاری کرد، هەروەك ڕابرا.

بەڵام لێرەدا ئەم بڕیارەش لە ئایەتەکە وەردەگیرێ: ئەگەر کافرەکان جەنگ لەگەڵ ئەو کەسانەش بکەن کە پەیمانیان لەگەڵ موسوڵمانان هەیە—وەکو (خُزاعَة)—ئەوەش هەر بە پەیمانشکاندن دادەندرێو واجبە: موسوڵمانان بەرگری لە دۆستەکانیخۆیان بکەن.

جا کافرەکانی(مَكَّة)ش زۆر باش دەیانزانی: ئەم تاوانەی ئەوان بەرامبەر بە (خُزاعَة) پەیمانشکاندنە، بۆیێ (أَبُوسُفْيان) هات پەیمانەکە نوێ بکاتەوە، کەوابوو: بەگوێرەی شەرعی خودا، هەم بەگوێرەی یاسایکافرەکانیش: پێغەمبەرﷺ هەلی دەست کەوتو پەیمانشکاندنەکەی کردە هۆی غەزای (مَكَّة)، چونکە لە ماوەی پێکهاتنەکەی (الْحُدَيْبِيَة)دا پێغەمبەرﷺ دەوروبەری (مَدِينَة)ی لە دوژمنان پاك کردەوەو لە دورگەی عەرەبدا تەنها دوژمنە دڕندەکەی ناو (مَكَّة) مابۆوە، عەرەبەکانیتریش هەر هەموویان چاوەڕوانی کافرەکانی (مَكَّة)یان دەکرد، بۆیێ لە کاتیڕاوێژکردنەکەدا ئیمام (عُمَر)ﷺ بە پێغەمبەریﷺ گوت: (**وَايْمُ اللهِ لا تَذِلُّ الْعَرَبُ حَتَّى تَذِلَّ أَهْلُ مَكَّةَ**) **سوێندم بە خوا عەرەبەکان سەر شۆڕ ناکەن تا دانیشتووانی(مَكَّة) سەر شۆڕ دەکەن.**

جا پێغەمبەریشﷺ زۆر بە گرنگی خۆی بۆ ئەم غەزایە ئامادە کرد: تا کاتی وەڕێکەوتن ئاشکرای نەکرد، ڕێگاکانیشی هەموو داخستن. (السیرةالحلبیة) ب(٣) ل(١٠٧) و(فقه السیرة، للبوطي) ل(٤٠٠) و(سیرة الصلابي) ب(٢) ل(٤٨٤).

**سێیەم: ئەگەر باوكو براو خزمو کەسەکان دوژمنیئیسلام بن، نابێ دۆستایەتییان بکرێو ڕێزیان لێبندرێ.** حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة)ی ژنی پێغەمبەرﷺ بە (أَبُوسُفْيان)ی باوکیخۆی گوت: **تۆ کافریو پیسی...ڕێگای نەدایێ لە سەر یاتاغیپێغەمبەرﷺ دابنیشێ.** خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ﴾التوبة: ٢٨، **کافرەکان پیسن.** ئیمام (الحَسَن الْبَصْرِي) فەرموویەتی: **هەر کەسێك تۆقەی لەگەڵ کافرێك کرد، با دەستنوێژ بگرێ.** کەواتە: لە لای هەندێك لە زانایان: کافرەکان وەکو سەگو بەراز پیسن. بەڵام لە فەرموودەیڕاستتردا: خودیکافرەکە پیس نیە، بەڵکو بیروباوەڕەکەی پیسە کە کوفرەکەیەتی، کەوابوو: مەبەستی حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة)-رضي الله عنها- لێرەدا ئەوەیە: یاتاغی پێغەمبەرﷺ یاتاغێکی بە بەرەکەتو ڕێزدارە، نابێ کافرێکی بێڕێز—کە بیروباوەڕێکی پیسی هەیە— لە سەری دابنیشێ.

جا ئەم هەڵوێستەی حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة)-رضي الله عنها- شتێکی سەیر نیە، چونکە حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة)-رضي الله عنها- کۆچی کردبوو بۆ (حَبَشَة)و لەوێ (النَّجاشِي)ﷺ لە پێغەمبەری مارە کردبوو، تا ئێستاش ماوەی شانزە ساڵە (أَبُوسُفْيان)ی باوکیخۆی نەدیوە، بەڵام لە بەر

ئەوەی (أَبوسُفْيان) سەركردەی كوفر بوو و درندەترين دوژمنیئیسلام بوو، بە شیاوی ئەوەی نەزانی ڕێزی باوكایەتیی لێبنێو لە سەر یاتاغی گەورەی ماڵێی دابنێ.
كەوابوو: ئەگەر باوك‌و براو خزم‌و كەسەكان دوژمنی ئیسلام بن، نابێ دۆستایەتییان بكرێ‌و ڕێزیان لێبندرێ. باسەكەم پێك هێناوە لە (تفسير الخازن) التوبة (٢٨)و (سيرة الصلابي) ب(٢) ل(٤٨٤).
*جا ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، لێت دەپرسم: ڕات چۆنە بەرامبەر ئەو جۆرە موسوڵمانانەی لافی ئیسلامەتی لێدەدەن‌و بەردەوامیش دەست لە دەستی كافراندا دادەنێن‌و لە لای زۆری دانیشگەش دایاندەنێن؟ با وەڵامەكە لە لای جەنابت بێ.*
**چوارەم: بڕیاری (جاسُوس)=سیخوڕ لە ئیسلامدا،** ئیمام (عُمَر)ﷺ بە پێغەمبەری ﷺ گوت: **ئیزنم بدە ئەم (مُنافِق)ە=(حاطِب) بكوژم. پێغەمبەریش ﷺ ڕێگەی نەدایێ و فەرمووی:** (إِنَّهُ شَهِدَ بَدْراً...) رواه الشيخان، **(حاطِب) ئامادەی غەزای (بَدْر) بووە...**
واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەم تاوانەی جاسوسیی(حاطِب)یﷺ لە لا تەرازووێك دانا، ئەو خزمەتەیڕابردووشی كە بۆ ئیسلام كردویەتی‌و لە غەزای (بَدْر)ش بەشداریی كردوە، لە لایەكیتری تەرازووی دانا، جا دیتی خزمەتەكەی گەورەترە لە تاوانەكەی جاسوسیی، بۆیێ عەفوی كردو ڕێگای نەدا بەم تاوانانە بكوژرێ.
**جا بزانە:** ئیمامی(النـواوي) فەرموویەتی: بە یەكدەنگی زانایانیئیسلام دروستە: (جاسُوس)ی كافری جەنگی بكوژرێ ﴿عَن سَلَمَةَﷺ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ عَيْنٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ –فِي غزوَةِ هَوازِنَ– فَجَلَسَ مَعَ أَصْحابِهِ يَتَحَدَّثُ ثُمَّ انْفَتَلَ، فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: اُطْلُبُوهُ وَاقْتُلُوهُ، فَقَتَلْتَهُ فَنَفَلَنِي سَلَبَهُ﴾ رواه الشيخان وأبوداود، **لە غەزای (هَوازِن) جاسوسێكی كافرەكان هات لەگەڵ (صَحابَة)كان دانیشت‌و قسەی دەكرد، ئینجا ڕۆیشت، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە دوایدا بگەڕێن‌و بیكوژن، حەزرەتی(سَلَمَة)ﷺ فەرمووی: من جاسوسەكەم كوشت‌و پێغەمبەر ﷺ كەلوپەلەكەیی دامێ.**
هەروەها جاسوسی كافری پەیمان لە ئەستۆو پەیمان لەگەڵكراویش لە مەزهەبی ئیمام (مالِك)دا: پەیمانەكەی هەڵدەوەشێتەوەو دروستە بكوژرێ، بەڵام جاسوسیموسوڵمان: لە لای ئیمام (أَبوحَنيفَة)و ئیمامی(الشافِعي)و كۆمەڵە زۆرەكەی زانایان: دروست نیە بكوژرێ، بەڵكو تەمبێ دەكرێ بە لێدان‌و بەندكردن، بەڵام ئیمام (مالِك)و چەند زانایەكیتر: فەرموویانە: دەرهەق جاسوسی موسوڵمان پێشەوای موسوڵمانان (إِجْتِهاد) دەكا: ئەگەر بەرژەوەندی لە كوشتنیدا بوو، ئەو كات دروستە بیكوژێ.
جا ئیمام (ابن حجر العسقلاني) بە ڕووداوەكەی (حاطِب)ﷺ بەڵگەی كوشتنی جاسوسی موسوڵمانی هێناوەتەوە، واتە: پێغەمبەر ﷺ بە ئیمام (عُمَر)ی نەفەرموو: (حاطِب) مەكوژە چونكە موسوڵمانە، بەڵكو فەرمووی: لە غەزای (بَدْر) ئامادە بووە. كەوابوو: ئامادەبوونی

غەزای (بَدْر) بووە ڕێگری کوشتنی (حاطِب)ﷺ، نەك ئیسلامەتیی، بۆیـێ پێغەمبـەرﷺ نەیفەرموو: چۆن موسوڵمان دەکوژی؟ جا ئێستاش ئەو پلە بەرزەی غەزای (بَـدْر) لـە هـیچ جاسوسێکی موسوڵماندا نایەتە جێ، کەوابوو: دروستە بکوژرێ، لە سـەر مەزهـەبی ئیمـام (مالك). (شرح صحيح مسلم) ب(٧) ل(٣٣٢) و(فتح الباري) ب(٦) ل(٢٠٢-٢٠٤)، ب(٨) ل(٨١٠).

**پێنجـەم: نابـێ موسـوڵمان پـشتیوانی کافرەکـان بکـا**. خوایگـەورە لـەبارەی حـەزرەتی (حاطِب)ﷺ ئەم ئایەتەی ناردە خـوارەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَـاءَكُمْ مِـنَ الْحَـقِّ...﴾الممتحنة: ١، **هـۆ ئـەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، دوژمنی منو دوژمنیخۆتان مەکەنە دۆستی خۆتـان، ئێوە خۆشویستنی خۆتان دەدەنە ئەوانو لە نهێنییەکانیموسوڵمانان ئاگاداریان دەکەنەوە، لـە کاتێکدا ئـەوان باوەڕیـان بە قوڕئانەکـەو ئایینەکـەی ئێوە نیـە...تـا کۆتایی ئایەتەکە**، بەڵگەیە: بـە هـیچ جۆرێك دروسـت نیـە موسـوڵمان دەسـتی یارمـەتیو برایەتی بۆ کافرەکان درێژ بکا، بەڵکو واجبە: موسوڵمان تەنها دۆستی خواو پێغەمبەرﷺو موسوڵمانان بێ، هـەروەك خوایگـەورە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ﴾ المائدة: ٥٥، **دۆستی ئێـوە تـەنها خـواو پێغەمبەریخواوﷺ ئیمانداره‌کانن، ئەو ئیماندارانەی نوێژ ئەکەنو زەکات ئەدەنو ملکەچی بڕیارەکانی خواو پێغەمبەرنﷺ.**



واتە: ئەگەر موسوڵمانیش نوێژ نەکاو زەکات نەداو ملکەچی بڕیارەکانی خواو پێغەمبەرﷺ نەبێ، دروست نیە: دۆستایەتی ئەویش بکەی.

جا سەیر ئەوەیە: زۆر لەو موسوڵمانانەی خۆیان بە خواپەرستی ڕاستەقینە دادەنێنو دەم بە ویـردو سـەلاوات بـە ڕیـشی جـوانو شـێوەی پیاوچاکان ڕوو لـە مزگەوتـەکان دەکـەنو خۆشیان بە غەمخۆری ئیسلام دادەنێن، لە لایـەکیتریش: دۆسـتایەتیو پەیوەنـدییان لـەو پـەڕی پتەوییدایـە: لەگـەڵ کافرەکـانو نوێژنەکـەرو زەکاتنـەدەرو ئـەو کاربەدەسـتە ستەمکارانەی بە شەرعی خواو پێغەمبەرﷺ ڕەفتار ناکەن.

بەڵێ: لە ئیسلامدا زۆر نالەبارییە، کەم عەقڵییە، زۆر هەڵەیەکی گەورەیە: مرۆڤی موسـوڵمان دۆسـتایەتی کەسـێك بکـا کـە خوایگـەورە بـە دژمنـی ئـەویی دانابـێ، خوایگـەورە دەفـەرمووی: ﴿قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ * هَا أَنْتُمْ أُولاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلا يُحِبُّونَكُمْ﴾ آل عمـران: ١١٨-١١٩، **بێگومـان ئـەو ئایەتانـەمان بـۆ ئێـوە ئاشـکرا کـردن، کـە لـە سـەر ئێوەی واجب کردوە: دۆستی موسوڵمانان بنو دوژمنی کافرەکان بن، ئەگەر ئێوە عاقڵ بن، ئێـوە ئـەی موسـوڵمانان بـە هەڵـەدا چوینە: کافرەکانتـان خـۆش دەوێ، ئەوانیش ئێوەیان خۆش نـاوێو زیـانی ئێوەیـان دەوێ.** بڕوانـە (صفوةالتفاسـير) آل عمـران (١١٨-١١٩) والمائدة (٥٥) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٤٠٣).

**شەشەم: بۆ ڕێبوار دروستە بەڕۆژوو نەبێو قەزای بکاتەوە، پێغەمبەرﷺ لە ڕێگەی (فَتْح مَكَّة)دا ڕۆژووی شکاند...**

**بزانە:** مەرجە سەفەرەکەی تاوانکاری نەبێو هەم دوو قۆناغ=(٨٠) کیلومەتر، یان زیاتر بێ، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضاً أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ البقرة: ١٨٤، **ئەگەر کەسێك لە ئێوە لە ڕەمەزاندا نەخۆش بوو، یان لە سەفەردا بوو- ئەگەر بەڕۆژوو نەبو- با بە ژمارەی ئەو ڕۆژووانەی نەیگرتون قەزا بکاتەوە.**

**ڕوونکردنەوەیەك:** لە کۆتایی ئەم ئایەتەدا خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنْ تَصُومُوا خَيْرٌ لَكُمْ﴾ البقرة: ١٨٤، **ئەگەر لە نەخۆشیو لە سەفەردا ئێوە بەڕۆژوو بن بۆ ئێوە چاکترە.** بەڵام لە سەفەرەکەی (فَتْح مَكَّة)دا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿أُولَئِكَ الْعُصَاةُ﴾ رواه مسلم وأبوداود، **ئەوانەی بەڕۆژوون گوناهبارن.**

جا بۆ ئەوەی دژایەتی لە نێوان ئایەتەکەو حەدیسەکەدا نەبێ، زانایان بەم شێوەیە لێکیان داونەوە: هەرسێك ئیمامەکان (أبوحنيفة)و (مالك)و (الشافعي)و زۆرترینی زانایانیئاینی فەرموویانە: ئەگەر کەسێك لە سەفەردا توانای ڕۆژووی هەبێو بە هۆی ڕۆژوو ئازارو زیانی نەگاتێ، ئەوە-بە بەڵگەی ئایەتەکە- بەڕۆژووبوون خێرترە، بەڵام ئەگەر زیانی دەگەیشتێ، ئەو کات-بە بەڵگەی حەدیسەکە- ڕۆژوو شکاندن خێرترە.

ئیمام (أحمد) فەرموویەتی: لە سەفەردا ڕۆژوو شکاندن خێرترە. هەندێ زانایتریش فەرموویانە: بەڕۆژووبوونو بەڕۆژوونەبوون لە سەفەردا یەکسانن، چونکە هەردووکیان حەدیسی (صحيح)ی لە سەر هاتووە.

جا ئیمامی(النواوي) فەرموویەتی: فەرموودەیڕاستتر فەرموودەکەی زۆرترینیزانایانە-کە یەکەمەکەیە-واتە: چونکە ئەوان ئایەتەکەو حەدیسەکەیان پێك گەیاندونەوەو هیچیان لە کار نەخستون...جا فەرموویەتی: کە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (أُولَئِكَ الْعُصَاةُ) **ئەوانەی بەڕۆژوون گوناهبارن.** مەبەستی ئەوانە بون: کە بە هۆی بەڕۆژووبوون زیانیان گەیشتبوێ، چونکە لە (رواية)یێکی حەدیسەکەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ النَّاسَ قَدْ شَقَّ عَلَيْهِمُ الصِّيامُ﴾ **ئەم خەڵکە بە هۆی ڕۆژوو توشی ئازارو ماندوویی بوینە.** جا پێغەمبەرﷺ ڕۆژووی شکاندو هەندێکیش نەیانشکاند، کەوابوو: لە بەر ئەوە گوناهبارن چونکە پێغەمبەرﷺ -بۆ بەرژەوەندی- فەرمانی ڕۆژووشکاندنی پێکردبونو ئەوانیش گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەرﷺ نەبونو گوناهبار بون. (تفسير القرطبي) البقرة (١٨٤) و(شرح صحيح مسلم) ب(٥) ل(٩٣-٩٨) و(فتح الباري) ب(٤) (٢٣٣).

**حەفتەم: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿مَنْ دَخَلَ دارَ أَبِيسُفْيانَ فَهُوَ آمِنٌ﴾ هەر کەسێك بچێتە ناو خانووی (أبِيسُفْيان)، دڵنیایە ناکوژرێ.**

دەزانی (أَبُوسُفْيان) کێیە؟ (أَبُوسُفْيان) ئەو کەسەیە: کە توندرتین دوژمنی ئیسلام بوو،

وەكو (أَبُوجَهْل)و (أَبُولَهَب) قين لە دڵ بوو بەرامبەر بە موسوڵمانان، هەر جەنگێك لە دژی پێغەمبەرﷺ كرابێ، (أَبُوسُفْيان) دەستی تێدا بووە، وا ئەمڕۆش (أَبُوسُفْيان) بووە دیلی بەر دەستی موسوڵمانان، سەرۆكایەتیی‌و ملك‌و ماڵی‌و هەبوونی‌خۆی هیچی فریای ناكەوێ، تەنها موسوڵمانبوونی نەبێ، بۆیێ ئیمام (الْعَبّاس)ﷺ فەرمووی: ئەی (أَبُوسُفْيان) هەی ماڵوێران شادە بێنە پێش ئەوەی لە ئەستۆت بدرێ. ئینجا شادەی هێناو بووە موسوڵمان.

**پرسیار:** موسوڵمانبوون لە ژێر هەڕەشەدا چۆن دروست دەبێ؟

**وەڵام:** لە دونیادا تەنها ئەوەندە داوا لە كافر دەكرێ: شادە بێنێ‌و لە ئاشكراییشدا ملكەچی بڕیارەكانی‌ئیسلام بێ‌و واجبەكانی‌ئیسلام ئەنجام بدا، بەڵام بیروباوەڕی ناو دڵی دەدرێتە دەست خوای‌گەورەو بەرە بەرەش زیاد دەبێ، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە ئیمام (الْعَبّاس)ﷺ كرد: (أَبُوسُفْيان) لە تەسكایی دۆڵەكەدا ڕابگرێ، تاكو لەشكری‌ئیسلام ببینێ‌و بیروباوەڕی بە ئیسلام بتەو ببێ‌و ورەی دابەزێ‌و جارێكی‌تر بیر لە جەنگی دژ بە ئیسلام نەكاتەوە، چونكە ئەگەر ورەی (أَبُوسُفْيان)ی گەورە پیاو و پاڵەوانی (مَكّة) دابەزێ، ئەو كاتە ورەی خەڵكی‌تری (مَكّة)ش دادەبەزێ، بۆچی؟ چونكە (مَكّة) ڕێزی تایبەتی‌خۆی هەیەو خواو پێغەمبەرﷺ وەهایان پێ‌خۆشە: بە بێ خوێن ڕژان (مَكّة) ڕزگار بكرێ، جا بە پشتیوانی خواو بە كارلەجێیی پێغەمبەرﷺ ئەم پلانە سەری گرت‌و (أَبُوسُفْيان) یەكەم كەس بوو: كە ورەی خەڵكی(مَكّة)ی دابەزاندو داوای خۆ تەسلیمكردنی لێكردن.

بەڵام بۆچی (أَبُوسُفْيان)؟ چونكە پێغەمبەرﷺ بە ئاماژەی ئیمام (الْعَبّاس)ﷺ پلەو پایەكی وەهای دا (أَبُوسُفْيان)-كە خانووەكەیویی كردە شوێنی دڵنیابوون- (أَبُوسُفْيان) قەناعەتی هات: كە بە هۆی موسوڵمانبوون پلەوپایەی لە (مَكّة)دا كەم نابێتەوەو بە زەلیلی تەماشای ناكرێ ئەگەر بە بێگەردی خزمەتی ئیسلام بكا، بۆیێ ئەویش بە بێگەردی كارەكەی خۆی ئەنجام دا و لە بەرەی وی هیچ خوێن ڕشتنێك نەبو.

كەوابوو: پێویستە بانگەوازكارانی‌ئیسلامیش هەمان مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ گەورە پیاوانی دوژمی بكەن، تەماشا بكە: كە حەزرەتی(سَعْد بن عُبادَة)ﷺ هەڕەشەی لە (أَبُوسُفْيان) كردو فەرمووی: ئەمڕۆ ڕۆژی جەنگەو (كَعْبة) حەڵاڵ دەكرێ. یەكسەر-بێ دواخستن- پێغەمبەرﷺ تەمبێی كردو ئاڵایەكەی لێسەند؟ نەوەك دڵی (أَبُوسُفْيان) بشكێ‌و پلانەكە تێك بچێ‌و جەنگ ڕوو بدا، بەڵام لە هەمان كاتیشدا دڵی (الأَنْصار)ی نەشكاندو حەزرەتی(سَعْد)شی نەتۆراند، بەڵكو ئاڵایەكەی دایە دەست حەزرەتی(قَيْس)ی كوڕی (سَعْد)، تاكو سەركردەی (الأَنْصار)، هەر پیاوێكی (الأَنْصار)ی بێ، بێگومان حەزرەتی(سَعْد)ش دڵشكاو نابێ ئەگەر كوڕی خۆی لەخۆی پیاوتر بێ. بە دەستكاریەوە (فقه السیرة، للبوطي) ل(٤٠٤) و(سیرةالصلابي) ب(٢) ل(٤٩٧و٥٠٥).

**هەشتەم: پێغەمبەرﷺ بە ملکەچیو بە خوێندنی سورەتی (الْفَتْح) چووە ناو (مَكَّة)،**
بەڵێ: ئەم ملکەچیەی سەرکردەی ئەم لەشکرە زۆرە، ئەم ملکەچیەی ئەم سەرکردە سەرکەوتووە، نیشانەی بەندایەتی‌یە بۆ خودا، خۆ پێغەمبەرﷺ پاشا نیە–وەك (أَبُوسُفْيان) وا تێگەیشتبوو– تا بە سینگی کراوەو لەخۆباییبوون بڕواتە ناو (مَكَّة)، بەڵکو پێغەمبەری خوایەوﷺ بە ملکەچیەوە شوکریخوا دەکا لە سەر نیعمەتی سەرکەوتنو ڕزگارکردنی (مَكَّة)، شوکریخوا دەکا چونکە پلانەکەی سەرکەوتوو بوو و بێ خوێن ڕشتن لەشکری ئیسلام لە چوار قۆڵەوە چووە ناو شاری (مَكَّة)، (أَبُوسُفْيان)ش بە فەرمانی پێغەمبەرﷺ (مَنْع التَّجَوُّل)=قەدەغەکردنی جولانەوەی ڕاگەیاندو بە ئاسانی (مَكَّة) کەوتە باوەشی ئیسلام، بێ ئەوەی هیچ جەنگێك ڕوو بدا، جگە لە (خَنْدَمَة)ی لایخوارەوەی (مَكَّة) نەبێ: کە (عِكْرِمَة بن أَبِيجَهْل)و (صَفْوان بن أُمَيَّة) کۆمەڵێك چەکدارایان کۆ کردنەوەو ڕێگەیان لە هێزەکەی ئەمیر (خالد)ﷺ گرت، ئەوەشیان لێبووە جەنگی خۆبەزینو لە بیست کەس زیاتریان لێکوژرانو هەموویان هەڵاتن! بەڵام چ هەڵاتنێك؟ ئەم چیرۆکە بۆمان باس دەکا: (حِماس بن قَيْس) هاتە ماڵەوەو چەکیخۆی ئامادە کردو ژنەکەی لێی پرسی: بۆچی ئەم چەکە ئامادە دەکەی؟ گوتی: بۆ (مُحَمَّد)وﷺ (صَحابَة)کانی. ژنەکەشی گوتی: وا تێدەگەم هیچ شتێك بەرەوەستی (مُحَمَّد)وﷺ (صَحابَة)کانی ناکا. (حِماس)ش گوتی: یەکێك لە (صَحابَة)کانی (مُحَمَّد)ﷺ دەگرمو دەیکەمە خزمەتکاری تۆ، ژنەکەشی گوتی: لە بەرچاومە دەگەڕێیەوەو کونێك نابێ خۆتی تێدا حەشار بدەی!. ئینجا کە (عِكْرِمَة)و (صَفْوان) لە (خَنْدَمَة) بەزینو هەڵاتن، ئەم پیاوەش هەڵاتو هاتەوە ماڵەوەو بە ژنەکەی گوت: دەرگاکە کلیل بدە!. ژنەکەشی گوتی ئەدی خزمەتکارەکەم لەکوێیە؟ (گاڵتەی بە مێردەکەی دەکرد)، جا مێردەکەشی ئەم بەندەی بۆ ژنەکەی گوت، تاکو لۆمەی نەکا:

وَأَنْتِ لَوْ أَبْصَرْتِنا بِالْخَنْدَمَهْ * إِذْ فَرَّ صَفْوانُ وَفَرَّ عِكْرِمَهْ
وَاسْتَقْبَلَتْنا بِالسُّيُوفِ الْمُسْلِمَهْ * يَقْطَعْنَ كُلَّ ساعِدٍ وَجُمْجُمَهْ
ضَرْباً فَلا تَسْمَعُ إِلاَّ غَمْغَمَهْ * لَهُمْ نُهِيتٌ حَوْلَنَا وَهَمْهَمَهْ
لا تَنْطِقِي فِي اللَّوْمِ أَدْنَى كَلِمَهْ

ئافرەت ئەگەر تۆ لە (خَنْدَمَة)دا ئێمەت دەدیت، لەو کاتەی (صَفْوان)و (عِكْرِمَة) هەڵاتن، موسوڵمانەکان بە شمشێر ڕووبەڕوومان بونەوەو گشت باسكو سەرێکیان بە لێدانی شمشێر پەل دەدا، جگە لە ورتە ورت هیچیترت گوێ لێنەدەبوو، ئەوان لە دەورەی ئێمە نەعرەتەو مرەمریان لێدەهات، کەوابوو: کەمترین وشە گلەییت لە دەم نێتە دەرەوە.
(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(١١٩) و(فقه السيرة للبوطي) ل(٤٠٨).

**نۆیەم: پێغەمبەرﷺ چووە ناو (مَكَّة)، خودە پۆڵایی لە سەریخۆی دانابوو...ئینجا (طَواف)ی (بَيْت)ی کرد.** ئەمەش بەڵگەیە: دروستەمرۆڤ بە بێ ئیحرامبەستن بڕواتە ناو

شاری(مَكَّة)، جیاوازی نیه: هاتوچۆیەكەی بۆ ناو شاری(مَكَّة) بەردەوام دووبارە ببێتەوە: وەك شوفێری ئۆتومبیلەكانو ئەو جۆرە كەسانە، یان جارجارە بێ: وەك بازرگانو ئەو جۆرە كەسانە، كەوابوو: ئیحرامبەستن بۆ ئەو جۆرە كەسانە واجب نیە، بەڵكو سوننەتە، بەڵام ئەگەر بە مەبەستی حەجو عومرە برواتە ناو شاری(مَكَّة)، ئەو كاتە واجبە –لە (میقات)دا– ئیحرام ببەستێ: یان بە حەج، یان بە عومرە.

هەروەها حەدیسەكە بەڵگەیە: كە (طَواف)ی (بَیْت) بۆ گشت كەسێك سوننەتە، جیاوازی نیە: ئیحرامی بە حەجو عومرە بەستبێ، یان نا: وەك بۆ بازرگانیو سەردانی كەسێك چوبێتە (مَكَّة)، ئەمە پوختەی فەرموودە بەهێزەكەی مەزهەبی(الشافعي)یە رضي الله عنه (شرح صحيح مسلم) ب(٦) ل(٦٤)، ب(٧) ل(٤٠٧).

**دەیەم: ( صَلاةُ الضُّحَى )=چێشتەنوێژ سوننەتەیكی گەورەیە،** حەزرەتی(أُمُّهانِئ)-رضي الله عنها- فەرمووی: **دوو پیاوم لە كوشتن پاراستبون، ئینجا چومە خزمەت پێغەمبەرﷺ، دیتم هەشت ڕەكعەت چێشتەنوێژی كرد.** (البخاري ومسلم) گێڕاویەتیانەوە.

جا بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: لای زۆری چێشتەنوێژ هەشت ڕەكعەتە، كاتەكەشی لە نێوان ئەو كاتەی ڕۆژ بە قەد ڕمێك بەرز دەبێ، تا بۆ لای چاوی ڕاستە لادەدا، جا سوننەتە لە هەر دوو ڕەكعەتێكدا سەلام بداتەوە ﴿عن أُمِّ هانِئٍ-رضي الله عنها-: أَنَّهُﷺ صَلَّى يَوْمَ الْفَتْحِ سُبْحَةَ الضُّحَى ثَمانِ رَكَعاتٍ يُسَلِّمُ مِنْ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ﴾ رواه أبوداود بإسناد صحيح على شرط البخاري، **لە (فَتْح مَكَّة)دا پێغەمبەرﷺ هەشت ڕەكعەت (صَلاةُ الضُّحَى)=چێشتەنوێژی كرد، لە هەر دوو ڕەكعەتێكدا سەلامی دەداوە.**

**جا بزانە: لای كەمی چێشتەنوێژ: دوو ڕەكعەتە** ﴿عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَوْصَانِي خَلِيلِيﷺ بِثَلاثٍ: صِيامِ ثَلاثَةِ أَيّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَرَكْعَتَيِ الضُّحَى، وَأَنْ أُوتِرَ قَبْلَ أَنْ أَنامَ﴾رواه الشيخان، **دۆستەكەیخۆم=پێغەمبەرﷺ ئامۆژگاریی كردم: لە هەموو مانگێكدا سێ ڕۆژان بەڕۆژوو ببم، دوو ڕەكعەت چێشتەنوێژ بكەم، پێش خەوتن نوێژی(وَتْر) بكەم.**

هەروەها لای ناوەنجی چێشتەنوێژ: چوار ڕەكعەتو شەش ڕەكعەتیش هاتووە ﴿عَنْ عائِشَةَ-رضي الله عنها-: كانَ رَسُولُ اللهِﷺ يُصَلِّي الضُّحَى أَرْبَعَ رَكَعاتٍ وَ يَزِيدُ ما شاءَ﴾رواه مسلم، **پێغەمبەرﷺ چوار ڕەكعەت چێشتەنوێژی دەكردو هەر چەندی حەزی كردبا زیاتریشی دەكرد.** (شرح صحيح مسلم) ب(٣) ل(٤٢١–٤٢٨) و(فتح الباري) ب(٣) ل(٦٧–٧٤).

**یازدەهەم: هەڵواسینی وێنە حەرامە، پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: وێنەكانی ناو (كَعْبَة) فڕێدرانە دەرەوەو، ئەوانەی لە دیوارەكانی (كَعْبَة)شدا بون بسڕێنەوە.**

**لەبارەی وێنەكردن،** پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَذاباً يَوْمَ الْقِيامَةِ الْمُصَوِّرُونَ﴾ رواه الشيخان، **لە هەموو كەسێك كە سزای بەهێزتر بێ لە ڕۆژی قیامەت،**

**وێنەکەرەکانن**. ئیمامی(النواوي) فەرموویەتی: زانایان فەرموویانە: دروستکردنی وێنەی گیاندار حەرامەو حەرامێکی بەهێزەو لە گوناهە گەورەکانە، جیاوازی نیە وێنەکردنەکە: بۆ بێڕێزی بێ، یان نا، هەم جیاوازی نیە وێنەکە: لە جلوبەرگ بێ، یان لە ڕایەخ، یان لە پارە، یان لە دیوار، یان لە قاپو شتیتر، بە هەموو جۆرێك وێنە دروستکردن هەر حەرامە –واتە: جیاوازی نیە وێنەکە: سێبەری هەبێ، یان نەیبێ– بەڵام دروستکردنی وێنەی شتە بێگیانەکان حەڵاڵە: وەك وێنەی درەختو چیاو...هتد.

جا لەبارەی وێنەگرتنی فۆتۆغرافیی ئەم سەردەمە، جەنابی (الْبُوطي) ڕای هەندێ زانایانی هێناوە: کە وێنەگرتنی فۆتۆغرافی حەرام نیە، چونکە ئەم وێنەگرتنەی فۆتۆغراف هیچ هونەرێکی دەستی وێنەگرەکەی تێدا نیە، بەڵکو هونەرەکە دەگەڕێتەوە بۆ خودی ئامێرەکەو منداڵێکی نەفامیش دەتوانێ پەنجەی لێدابگرێو وێنە دەردەچێ. بەڵام لە ڕووی پارێزکاریەوە: ئەو وا بە ڕاست دەزانێ کە هیچ جیاوازیەك نەبێ، والله أعلم.

**لەبارەی وێنە هەڵواسینیش**، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لا تَدْخُلُ الْمَلائِكَةَ بَيْتاً فِيهِ كَلْبٌ وَلا صُورَةٌ﴾ رواه الشيخان، **(مَلائِكَة)ی ڕەحمەت ناچنە ئەو ماڵەی سەگی تێدا بێ، یان وێنەی تێدا بێ**. جا لە لای ئیمامی(الْخَطابي): مەبەست ئەو سەگو ئەو وێنەیە کە حەرامن، واتە: ئەگەر سەگەکە بۆ پاسەوانیی ئاژەڵو بۆ ڕاو بوو، وێنەکەش سوکایەتی پێ دەکرا، ئەوە ڕێگەی (مَلائِكَة)ی ڕەحمەت ناگرێ.

جا لەبارەی وێنەی حەرام، ئیمامی(النواوي)و ئیمام (ابن الْعَرَبي) فەرموویانە: وێنەی گیانلەبەر ئەگەر سێبەری هەبێ–واتە: لاشەی هەبێ– ئەوە بە (إِجْماع)ی زانایانیئیسلام حەرامە، جا قازی (عَياض) فەرموویەتی: تەنها بوکوڵەی کیژان نەبێ، ئەویان ڕێگەی دراوە.

جا ئیمامی(النواوي) فەرموویەتی: لە لای کۆمەڵە زۆرەکەی (صَحابَة)و (التابِعِين)و ئیمام (أَبُوحَنِيفَة)و ئیمام (مالِك)و ئیمامی(الشّافِعِي)و چەند زانایەکیتر: جیاوازی هیچ جۆرە وێنەیەك نیە–واتە:سێبەری هەبێ، یان نەیبێ– هەر حەرامە: لە جلو بەرگو پەردەو دیوارەوە بێ، بەڵام ئەگەر لە سەر ڕایەخو سەرینو ئەو جۆرە شتانە بێ: کە سوکایەتییان پێ دەکرێ، ئەو کاتە حەرام نیە.

ئیمامی(الرّافِعِي)و ئیمام (ابن الْعَرَبي) فەرموویانە: ئەگەر سەری وێنەکە ببڕدرێ، یان شێوەکەی لێك جیا بکرێتەوە–واتە: ئەوەندەی لێبکرێتەوە بە بێ ئەو پارچەیە ژیانی نەمێنێ– ئەو کاتە حەرام نیە.

جا هەندێ زانا فەرموویانە: هەڵواسینی وێنەی بێسێبەر= بێ لاشە حەرام نیە. بەڵام ئیمامی(النّواوِي) فەرموویەتی: ئەمەیان مەزهەبێکی پوچەڵە، چونکە پەردەکەی ماڵی حەزرەتی(عائِشَة)رضي الله عنها وێنەی تێدا بون سێبەریشیان نەبو، پێغەمبەریشﷺ بە دەستی

خۆی دڕاندی. هەروەك ئیمام (مسلم) گێڕاویەتیەوە. هەم ئەو حەدیسەش کە فەرموویەتی: (إلاّ رَقْماً فِي ثَوْبٍ) **تەنها وێنەی سەر جل و بەرگ حەڵاڵە**، مەبەستی وێنەی درەختو شتە بێگیانەکانە، نەك وێنەی گیاندارەکان. (شرح صحیح مسلم) ب(٨) ل(٣٩٨-٤٠٤) و(فتح الباري) ب(١٠) ل(٤٦٧-٤٨٠) و(فقه السیرة، للبوطي) ل(٤١٧).

**دوانزەهەم: پیرۆزبایی سوننەتە**، کە باوکی ئیمام(أَبُوبَکْر)ﷺ موسوڵمان بوو پێغەمبەرﷺ پیرۆزبایی لێکرد. ئەمەش بەڵگەیە: ئەگەر موسوڵمانێك خۆشیەکی گەیشتێ، سوننەتە: پیرۆزبایی لێبکرێ. هەروەها کە پێغەمبەرﷺ سوڕەتی (الْفَتْح)ی بۆ هاتە خوارەوە، (صَحابَة)کانﷺ پیرۆزباییان لێکردو فەرموویان: ﴿هَنِیئاً لَكَ یا رَسُولَ اللهِ﴾ رواه الشیخان، **پیرۆزت بێ ئەی پێغەمبەری خوا.**

هەم بۆ جەژنە پیرۆزانەش (صَحابَة)ﷺ بە یەکترییان دەگوت: ﴿تَقَبَّل اللهُ مِنّا وَمِنْکُمْ﴾ رواه أبُوأحْمَد الْفَرَضِي بسند حسن، **خوا لە ئێمەو لە ئێوە قبوڵ بکا**. ئیتر پیرۆزبایی تۆبەکردن و چاکبوونەوە لە نەخۆشیو گەڕانەوە لە سەفەری حەجو غەزا و ژن مارەکردن و منداڵبوون و جلوبەرگی نوێ گشتی سوننەتن.

بەڵام پیرۆزکردنی جەژنەکانی گاورو جولەکەو کافرەکانیتر حەرامە، چونکە قەدەغەیەو نابی لە (دارُالإِسْلام)دا کافرەکان جەژنیخۆیان بە ئاشکرایی بکەن، کەوابوو: ئەگەر موسوڵمانێك هاوکاری جەژنەکەیان بکا، یان یارمەتییان بدا، واجبە: تەمبێ بکرێ، هەروەك چاوەشو بەد ڕەوشتەکان تەمبێ دەکرێن: بە تێهەڵدانو سەرتاشینو ڕوو ڕەشکردنو بەند کردنو...هتد. بروانە (الحاوی للفتاوی، للامام السیوطي) ب(١) ل(٩٠-٩٥) و(تحفة المحتاج بحاشیة الشرواني) ب(٩) ل(١٧٨و١٨١و٣٠١).

**سێزدەهەم: ڕەشکردنی موو حەرامە**. کە باوکی ئیمام (أَبُوبَکْر)ﷺ هات موسوڵمان بوو، سەرو ڕیشی سپی بوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿غَیِّرُوا هَذا بِشَيْءٍ واجْتَنِبُوا السَّوادَ﴾ رواه مسلم، **ئەم مووە سپیە بە ڕەنگێك بگۆڕنو خۆتان لە ڕەنگی ڕەش بپارێزن.**

ئەمەش بەڵگەیە: سوننەتە بۆ پیاو و ئافرەت موو سپیەکانیان بە ڕەنگی زەرد، یان سۆر یان قاوەیی ڕەنگ بکەن، بەو مەرجەی ڕەنگەکە تفڵی نەبێو ڕێگای ئاو نەگرێ بۆ غوسلو دەستنوێژ، بەڵام ڕەنگی ڕەش حەرامە، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو و هەم ئەم حەدیسەش کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿یَکُونُ قَوْمٌ یَخْضِبُونَ فِي آخِرِ الزَّمانِ بِالسَّوادِ کَحَواصِلِ الْحَمامِ لا یَرِیحُونَ رائِحَةَ الْجَنَّةِ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، **لە کۆتایی زەماندا چینە خەڵکێك بە ڕەنگی ڕەش مووەکانیان ڕەنگ دەکەن، ڕیشیان وەك جیقەدانەی کۆتر لێدەکەن، ئەوانە بۆنی بەهەشت ناکەن.**

بەڵام ڕەشکردنی موو بۆ غەزا، حەڵاڵە، هەندێ فەرموودەی بێهێزیش ڕەشکردنی مووی بە (مَکْرُوه)=ناپەسند داناوە، والله أعلم، (شرح صحیح مسلم) ب(٨) ل(٣٩٦) و(فتح الباری) ب(١٠) ل(٤٣٥).

**چواردەهەم: پێغەمبەرﷺ لە وتارکەیدا: خۆ بە زل زانین و شانازی بە باوك و باپیرانی نەهێشت**، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إذا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ يَتَعَزَّى بِعَزاءِ الْجاهِلِيَّةِ، فَأَعِضُّوهُ بِهَنِ أَبِيهِ وَلا تَكْنُوا﴾ رواه الإمام أحمد والطبراني ورجاله ثقات، **ئەگەر کەسێکتان دیت بانگەوازی سەردەمی نەفامی دەکاو شانازی بە باوك و باپیرانی دەکا، پێی بڵێن: گونی باوکیخۆت بگەزە، بە پێچ و پەنا پێی مەڵێن.**

بەم فەرمودە بەڕێزانە: پێغەمبەرﷺ خۆ بە زل زانین و شانازیکردن بە ڕەگەزو هۆزو باوك و باپیر، گشتی خستە ژێر پێیو ئاشکرای کرد: عەرەب لە گەڵەکانیتر گەورەتر نین و گەلەکانیتریش لە عەرەب گەورەتر نین، تەنها بە لەخواترسان نەبێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ﴾ رواه مسلم، **هەر کەسێك بە هۆی نەبوونی کردەوەی چاك دوا بکەوێ، ئەوە بە هۆی نەژادی باوك و باپیرانی ناگاتە کاروانیپیاوچاکان**. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ب(١٠) ل(١٣١) و(مجمع الزائد ومنبع الفوائد) ب(٣) ل(٦٠).

**بە کێلی قەبری باوکت مەنازە * ئێستا قوت ناچێ ئەو نان و پیازە**

**پیاو ئەو پیاوەیە بە چاکە پیاو بێ * نەك بە هۆی باوکی ناوبانگی دیار بێ**

**پانزەهەم: پێغەمبەرﷺ بە قسەکردن پەیمانی لە ئافرەتان وەرگرت،**

**بزانە**: ژمارەی ئەو ئافرەتانەی پێغەمبەرﷺ پەیمانی لیوەرگرتن: (٤٥٧)چوارسەدو پەنجاو حەفت ئافرەت بون، پێغەمبەرﷺ لە سەر (صَفا) وەستابوو، ئیمام (عُمَر)ش رضي الله عنه لە بن (صَفا) وەستابوو، فەرموودەکانیپێغەمبەریﷺ دەگەیاندە ئافرەتەکان، واتە: پەیماندانی ئافرەتەکان تەنها بە قسەکردن بوو، وەکو پەیماندانی پیاوان پێغەمبەرﷺ تۆقەی لەگەڵ نەکردن، هەروەك حەزرەتی(عائشة)-رضي الله عنها- فەرموویەتی ﴿...وَاللهِ مَا مَسَّتْ يَدُهُ يَدَ إمْرَأَةٍ قَطُّ فِي الْمُبايَعَةِ، غَيْرَ أَنَّهُ يُبَايِعُهُنَّ بِالْكَلامِ...﴾رواه الشيخان، **سوێندم بە خوا: لە پەیمانبەستنەکەدا دەستیپێغەمبەرﷺ بە دەستی هیچ ئافرەتێك نەکەوتووە هیچ کاتێك، تەنها بە قسەکردن پەیمانی لیوەردەگرتن.**

جا پەیماندانیئافرەتەکان بە ئایەتی ژمارە (١٢)ی سورەتی (الْمُمْتَحَنَة) بوو، واتە: **هاوبەش بۆ خوا دانەنێن، دزی نەکەن، زینا نەکەن، منداڵیخۆیان نەکوژن، منداڵی پیاوێکیتر نەکەنە منداڵی مێردیخۆیان، لە فەرمانی پێغەمبەرﷺ دەرنەچن.**

جا ئەم پەیمان وەرگرتنەش بەڵگەیە: ئافرەت لەگەڵ پیاو لە گشت بەرپرسیاریەتیەکانی ئاییندا یەکسانەو واجبە کاروباری ئاییندئیسلام فێر ببێ بە هەموو ڕێگایەکی شەرعی، خێزان و کۆمەڵگە لەگەڵ پیاودا پێك بێنێ.

بەڵام لە هەمان کاتیشدا پێویستە دایك و خوشك و کیژەکانی ئەم سەردەمە لە فێڵ و پیلانە پیسەکانی کافرەکان ئاگادار بن: بە ناوی ئازادیو یەکسانیو مافی ئافرەت و...هتد، لە ڕەووشتە بەرزەکانیئیسلام لایاننەدەن و بست بە بست و گەز بە گەز نەیانکەنە شوێنکەوتەی

خۆیان، به ناوی پێشکەوتن پۆشاکی شەرمو شەرەف دادەنێنو تێکەڵی پیاوی نامەحرەم نەبنو تۆقە لەگەڵ پیاوی بێگانە نەکەن.
ئەی ئافرەتی موسوڵمانی قەدر گران، نەکەی بە ناوی دابو نەریتی ئەم سەردەمە توشی گوناه ببیو لە شەرعیئیسلام لابدەی، چونکە شەرعیئیسلام بنەمایەکی نەگۆڕاوەو هیچ دابو نەریتێك دەسەڵاتی بە سەر شەریعەتیئیسلامدا نیە، نەکەی ئەو گورگانەی لە بەرگی ئاینیدانە لە ئیسلام لاتبدەن.
جا ئەوەش بزانە: بە مەزهەبی کۆمەڵە زۆرەکەی زانایانی ئیسلام دروستە: بۆ پێویستی گوێ لە دەنگی ئافرەتی بێگانە ڕابگرێو دەنگەکەی عەورەت نیە. بەڵام لە لای هەندێ زانایانی مەزهەبی(حَنَفي): دەنگی ئافرەتیبێگانەش عەورەتە. (تفسير الخازن) الممتحنة (١٢) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٤٢٠).
**شانزەهەم: (مَسْأَلَةُ الظَّفْر)=دزینی مافیخۆی دروستە، (هِنْد)= ژنەکەی (أَبُوسُفْيان) گوتی: یارَسُولَ الله (أَبُوسُفْيان)ی مێردم بەخیلە، بەشی خۆمو منداڵەکانم بژێوم ناداتێ، مەگەر بە دزی بژێوەکە لە ماڵی وی ببەم؟ جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی:** ﴿خُذِي ما يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ﴾ رواه الشيخان، **بەگوێرەیعادەت بەشی خۆتو منداڵەکەت بژێو لە ماڵی (أبِيسُفْيان) ببە.**
ئەم مەسەلەیە لە شەرعدا پێی دەگوترێ: (مَسْأَلَةُ الظَّفَر)=دزینەوەی مافیخۆی، ئەم مەسەلەیە بە مەزهەبی ئیمامی(الشّافِعي)و بە فەرموودەیەکی ئیمامی(الحنفي)و ئیمام (مالك): دروستە، کەواتە: ئەگەر کەسێك شتێکی لە لای کەسێکیتر بوو و نەیدەداوە، دروستە بە دزی شتەکەیخۆی بباتەوە، بەو مەرجەی لە ئاژاوە نەترسێ، جا ئەگەر شتەکە فەوتا بوو، یان قەرزێکی لە سەر کەسێك بوو و نەیدەداوە، دادوەریش بۆی وەرنەدەگرتەوە، ئەو کاتەش بۆی دروستە بە ئەندازەی مافیخۆی لە ماڵی ستەمکارەکە ببا، جا ئەگەر شتەکە وێنەی مافیخۆی نەبو، شتەکە دەفرۆشیو ئەندازەی مافیخۆی لێی وەردەگرێو زیادکەش بە هەر ڕێگایەك بگونجێ واجبە: بۆ ستەمکارەکەی بگەڕێنێتەوە.
هەروەها حەدیسەکە بەڵگەیە: کە بژێوی منداڵەکانو ژنەکان لە سەر مێردەکە واجبە، هەم ئافرەتیش مافی لە پەروەردەو بەخێوکردنی منداڵدا هەیە، چەند بڕیارێکیتری شەرعیش لە حەدیسەکە وەردەگیرێن، لە بەر درێژی نەمنوسین. (فتح الباري) ب(٩) ل(٦٢٨-٦٣٢) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(١٠) ل(٢٨٧-٢٩١).
**حەڤدەهەم: پێغەمبەرﷺ ماوەی نۆزدە ڕۆژان لە (مَكَّة)دا مایەوە، نوێژی کورت دەکردنەوە،** ئەمەش بەڵگەیە: ئەگەر ڕێبوارێك لە شوێنێکدا مایەوەو نیەتی مانەوەی چوار ڕۆژانیشی نەبو، بەڵکو چاوەڕوانی کارێکی دەکرد، ئەوە تا ماوەی هەژدە ڕۆژان (قَصْر)و (جَمْع)= کورتکردنەوەو کۆکردنەوەی نوێژەکانی بۆ دروستە، چونکە پێغەمبەرﷺ لەو ماوەیەدا

نیەتی مانـەوەی نـەبو، بـەڵكو چـاوەڕوانی ڕێكخستنی كاروبـاری (مَكَّـة)و غـەزای (حُنَـیْن)ی دەكرد.

جا بزانە: ڕۆژی هاتنو ڕۆژی دەرچوون لـەو هەژدەیـە نـاژمێردرێ، بۆیـێ لـە حەدیـسەكەدا نۆزدە ڕۆژ هاتووە، بەڵام ئەگەر هەر لە سەرەتاوە نیەتی مانەوی چوار ڕۆژانی هەبوو –جگە لە ڕۆژەكانی هاتنو دەرچوون– ئەوە بە هیچ جۆرێك: نە(قَصْر)و نە (جَمْع)= كورتكردنەوەو كۆكردنەوەی نوێژەكانی بۆ دروست نیە.

**جا بزانە:** مەرجە: سەفەرەكەشی لای كەم دوو قۆناغ=هەشتا كیلۆمەتر دور بـێو سـەفەری گوناهكاریش نەبێ. جا بۆ شارەزابوونی ئەم باسە، بڕوانە بەرگی دووەمی (ڕووناكی رب العالمین).

**دیسان بزانە:** لە دوای ئەم نۆزدە ڕۆژە، پێغەمبەرﷺ بۆ غەزای (حُنَیْن) ڕۆیشت، جا لەو ڕۆژەی بۆ (فَتْح مَكَّة) دەرچوو، تا لە غەزای (حُنَیْن)و (طائف) گەڕاوە بۆ (مَدِینَة)، زیاتر لـە هەشتا ڕۆژی پـێچوو، والله أعلم (فتح الباري) ب(٢) ل(٧٢٤–٧٢٦)، ب(٨) ل(٢٧).

**هەژدەهەم: سزای دزین دەست بڕینە، تكاكردن بۆ سزانەدانی تاوانكار لە لای كاربەدەست حەرامە، لـە (مَكَّـة)دا ئافرەتێك دزیـی كـردو پێغەمبـەرﷺ فـەرمانی دا: دەسـتیان بڕی.** جا پێش دەست بڕین حەزرەتی(أُسامَة بن زَیْد)یانڕضي الله عنه ناردە لای پێغەمبەرﷺ، تاكو تكای بۆ بكاو دەستی نەبڕی، جا پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: ﴿أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِـــنْ حُـــدودِ اللهِ؟﴾ **تۆ چۆن تكا دەكەی لـەبارەی سـزایەكیخوایگەورە؟**. واتـە: خوایگـەورە ئـەو بڕیارەی داوەو دەفەرموێ: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا﴾المائدة: (٣٨)، **پیاوی دزو ئافرەتی دز دەستیان ببڕن.**

ئینجا پێغەمبەرﷺ وتارێكی دا و فەرمووی: ﴿یا أَیُّها النّاسُ إِنَّما ضَلَّ مَنْ كانَ قَبْلَكُمْ أَنَّهُـــمْ كانُوا إِذا سَرَقَ فِیهِمُ الشَّرِیفُ تَرَكُوهُ وَإِذا سَرَقَ فِیهِمُ الضَّعِیفُ أَقامُوا عَلَیْهِ الْحَدَّ، وَأَیْمُ اللهِ لَوْ أَنَّ فاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍﷺ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ یَدَها﴾ رواه الشیخان، **هـۆ خەڵكینـە ئوممەتـەكانی پێش ئێوە بـەوە گـومڕا بـون: ئەگـەر كەسێكی گـەورەو خـاوەن خزموكـەس دزیـی كردبا، وازیان لێدەهێنا، ئەگەر بێهێزو بێكەسیش دزیی كردبا، سزای دزییـان لە سەر جێبەجێ دەكرد، سوێندم بە خـوا: ئەگـەر (فاطِمَـة)ی كیـژی پێغەمبـەرﷺ دزیی كردبا، دەستی وێم دەبڕی.**

ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، بەم یەكسانیە–كە دەوڵەمەندو هەژار، بە كەسو بێكەس، لە ژێر بڕیـاری خـوادا یەكـسانن– عەدالەتیئیـسلام جـێگیر بـووە، كـەوابوو: ئەگـەر كاربەدەست تاوانەكەی گەیشتێ، حەرامە: تكـا بـۆ تاوانكارەكـە بكـرێ: تـاكو سـزای نـەدا، چـونكە لـە حەدیسەكەدا پێغەمبەرﷺ ڕەخنەی لە حەزرەتی(أُسامَة)ڕضي الله عنه گرتو فەرمووی: **چۆن تكا دەكەی لەبارەی سزای خوایگەورە؟**. هەم پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَـــنْ حالَـــتْ شَفاعَتُهُ دُونَ حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ، فَقَدْ ضادَّ اللهَ فِي حُكْمِـــهِ﴾ رواه الإمام أحمد وصححه

الحاكم، **هەر کەسێك تکاکردنەکەی بێتە هۆی سزا نەدانێك لە سزایەکانی‌خوا، ئەوە بەڕاستی دژایەتی خوای‌گەورەی کردوە لە بڕیارەکەی‌دا.**

بەڵام ئەگەر تاوانەکە نەگەیشتبووە کاربەدەست، یان سزای بۆ دانەندرابوو، بەڵکو تەنها تەمبێ‌کردنی بۆ داندرابوو، ئەو کاتە تکاکردن دروستە.

**پرسیار:** بۆچی ئەگەر بە ئەندازەی نرخی چوارێکە میسقالێکی زێڕ، ماڵی کەسێك بدزێ، ئەوە واجبە دەستی ڕاستەی ببڕدرێ، بەڵام ئەگەر کەسێك بە ناهەق دەستێکی کەسێك ببڕێ، ئەو کاتە خوێنی تەنها دەستەکە: پێنجسەد میسقالی زێڕە!؟

**وەڵام:** چونکە دەستی ئەمین‌و بێ‌تاوان ڕێزدارو پارێزراوە، بەڵام دەستی خائین‌و تاوانکار بێ‌ڕێزو لەناوبردراوە، جا ئەگەر بە پێچەوانەوە بوایە، ئەو کاتە تاوانەکان زۆرتر دەبون، واتە: ئەگەر خوێنی دەستی ئەمین چوارێکە میسقالێك بوایە، ئەو کاتە–لە بەر کەم نرخی– زیاتر دەستدرێژی دەکرایە سەر دەستی ئەمین، وە ئەگەر ڕادەی دەستبڕینی دزیش پێنجسەد میسقال بوایە، ئەو کاتە دزینی ماڵی خەڵك زۆتر دەبوو، چونکە درەنگ دەگەیشتە ڕادەی دەستبڕین. (شرح صحيح مسلم) ب(٧) ل(٢٠٦) و(فتح الباري) ب(١٢) ل(١٠٦و١١٩).

**نۆزدەهەم: (مُعْجِزَة)کانی (فَتْح مَكَّة): یەکەم:** خەبەرداربوونی لە نامەکەی (حاطِب)ﷺ. **دووەم:** خەبەرداربوونەوەی پێغەمبەرﷺ لە گوتەی (أَنْصار)، کە گوتیان: پێغەمبەرﷺ دەیەوێ لە ناو شارو هۆزەکەی‌خۆی‌دا بمێنێتەوە. **سێیەم:** (أَبُوسُفْيان) دالّغەیەکی لێ‌داو گوتی: ئەگەر کۆمەڵە خەڵکێك بۆ جەنگی (مُحَمَّد)ﷺ کۆ بکەمەوە؟ جا یەکسەر پێغەمبەرﷺ دەستێکی لە نێو شانی دا و فەرمووی: ئەگەر وا بکەی خوا سەرشۆڕت دەکا. جا (أَبُوسُفْيان) گوتی: تا ئەم کاتە دڵنیا نەبوم تۆ پێغەمبەری!. **چوارەم:** کە (مَكَّة) ڕزگار کرا، شەوێ تا سبەینێ (صَحابَة)کان خەریکی (اَللّهُ أَكْبَر)و (لاإلَهَ إلاّالله) بون، جا (أَبُوسُفْيان) بە ژنەکەی‌خۆی گوت: وا تێدەگەی ئەمە لە خواوە بێ؟ ژنەکەشی گوتی: بەڵێ، لە خواوەیە. جا سبەینێ (أَبُوسُفْيان) چووە خزمەت پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئەم شەو ئەم قسەیەت بە ژنەکەت گوت! جا (أَبُوسُفْيان)ش گوتی: شاهیدی دەدەم تۆ پێغەمبەری‌خوای، جگە لە ژنەکەم کەسی‌تر ئەم قسەیەی لە من نەبیستبوو. **پێنجەم:** (فُضالَة بن عُمَيْر) خۆی ئامادە کرد: لە کاتی تەوافکردندا پێغەمبەرﷺ بکوژێ، جا لێی نزیك بۆوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (فُضالَة)یە؟ گوتی: بەڵێ (فُضالَة)م. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دالّغەی چیت لێ‌داوە؟ گوتی: هیچ نیە، بۆ خۆم زیکری خوا دەکەم. جا پێغەمبەرﷺ پێکەنی‌و فەرمووی: بڵێ: (أَسْتَغْفِرُالله). ئینجا پێغەمبەرﷺ دەستی لە سەر سینگی (فُضالَة) دانا و یەکسەر خۆشویستنی پێغەمبەرﷺ کەوتە ناو دڵی‌و هیچ کەسێك لە لای وی لە پێغەمبەرﷺ خۆشەویستتر نەبو. (البداية والنهاية) ب(٢) ل(٦٦٧و٦٦٨و٦٧١).

*** *** ***

## ﴿ غەزای ( حُنَيْن )=( هَوازِن )=( أَوْطاس ) ﴾

( **حُنَيْن** ) دۆڵێکە لە نێوان (مَكّة)و (طائِف) لە تەنیشت (ذِىالْمَجاز)، هەروەها ( **أَوْطاس** )و ( **هَوازِن** )ش لەوێ نزیکن. جا کە لە دوای (فتح مَكّة) دەوڵەتی بتپەرستی هەرەسی هێناو (قُرَيْش)و هۆزەکانیتریش کۆمەڵ کۆمەڵ موسوڵمان دەبون، گەورە پیاوەکانی هۆزی (هوازِن)و هۆزی (ثقِيف) چونە لای یەکتریو ڕقو قینەی خۆیان وەدەرخست بەرامبەر ئەو سەرکەوتنە گەورەی ئیسلامو بە یەکترییان گوت: (مُحَمَّد)ﷺ بە سەر خزمو کەسەکانیخۆیدا سەرکەوتو هیچ ڕێگرێکی نیە هێرش بکاتە سەر ئێمە، کەوابوو: پێش ئەوەی ئەو هێرش بێنێ، با ئێمە هێرش بکەینە سەر ئەوی.

ئینجا هەردوو هۆزەکان لەشکرێکی زۆریان کۆ کردەوەو (مالِك بن عَوف)ی سەرۆك هۆزی (هَوازِن) بووە سەرکردەی هەموو لەشکرەکە، کە ژمارەی لە بیست هەزار زیاتر بوو، جا چەند هۆزێکیتری عەرەبەکانیشیان وەگەڵ کەوتن، یەکێك لەو هۆزانە (بَنِى سَعْد بَنِىبَكْر) بون–کە هۆزکەی (حَلِيمَةالسَعْدِيَّة)ی دایکە شیریەکەی پێغەمبەرﷺ بوو– جا (مالِك) فەرمانی بە خەڵکەکە کرد: ماڵو ژنو منداڵەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا بێهننە جەنگ؟ تاکو مەیدانی جەنگ بەجێ نەهێڵنو بەرگری لە ماڵو خێزانیان بکەن. بەڵام (دُرَيْد بن الصِّمَّة)–کە پیاوێکی لێزانی تەمەن سەدو بیست ساڵی بوو– ڕەخنەی لەم کارەی (مالِك) گرتو گوتی: ئایا هیچ شتێك پیاوی هەڵاتوو دەگەڕێنێتەوە؟ جا گوتی: ئەم ماڵو منداڵە بگەڕێنەوە. بەڵام (مالِك)گوێی نەدایێو لەشکرەکەی بە ماڵو منداڵەوە لە (أَوْطاس) لە نێوان (مَكّة)و (طائِف) دابەزاند.

ئینجا کە پێغەمبەرﷺ هەواڵی ئەم لەشکرەی گەیشتێ، (صَحابَة)یەکیخۆی نارد–کە ناوی (عبدالله بن أبىحَدْرَدِ الأسلمي) بووﷺ–فەرمانی پێکرد: بچێتە ناو ئەو هۆزانەو هەواڵی لەشکرەکەیانی بۆ بهێنێ. جا حەزرەتی(عبدالله)ﷺ چووە ناو هۆزەکانو دوو ڕۆژان لە ناویاندا مایەوە، ئینجا گەڕاوەو هەواڵەکەیانی بۆ پێغەمبەرﷺ هێناوە.

جا کە پێغەمبەرﷺ ویستی بۆ غەزایەکە بڕوا، پێیان گوت: (صَفوان بن أُمَيَّة)–کە هێشتا موسوڵمان نەبوبوو– چەند زرێو چەکی لە لایە، جا پێغەمبەرﷺ ناردیە لای: تاکو ئەم چەكو زرێیانەیان بۆ بنێرێ. جا (صَفوان) گوتی: ئەی (مُحَمَّد)ﷺ بە داگیرکردن لێم وەردەگری؟ پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ﴿بَلْ عارِيَةٌ مَضْمُونَةٌ حَتَّى نُؤَدِّيَهَا إِلَيْكَ﴾ بەڵکو بە خواستنێکی زامینکراو لێت وەردەگرم، تا دەیاندەینەوە تۆ، واتە: ئەگەر فەوتا تۆڵەی دەژمێرین. جا (صَفوان) سەد زرێی بە تەواوی چەکەوە تەسلیمی پێغەمبەرﷺ کرد.

ئینجا پێغەمبەرﷺ لە شەشی مانگی (شَوّال)ی ساڵی هەشتەمی کۆچی لە (مَكّة)

دەرچوو، دوانزە هەزار چەکداری لەگەڵدا بوو: دە هەزار (صَحابَة)ی (مَدِینَة)-کە لە (فَتح مَکَّة) بەشدار بون- دوو هەزاریش خەڵکی (مَکَّة) -کە تازە موسوڵمان بوبوون- هەر لە خەڵکی(مَکَّة): هەشتا چەکداری کافرو چەند ئافرەتێکیش لەگەڵ لەشکرەکەدا ڕۆیشتن بۆ تالاَنگرتن، جا (صَحابَة)کان بە سەرسوڕمانەوە تەماشای ئەم لەشکرە زۆرەیان دەکردو یەکێکیان بە شانازیەوە گوتی: ئەمڕۆ لە بەر کەمی ئێمە نابەزێندرێین. بەڵام پێغەمبەرﷺ ئەم قسەیەی پێ ناخۆش بوو.

جا لەشکری ئیسلام لە دەی مانگی (شَوّال) گەیشتە (حُنَین)، ئینجا کە (مالِك بن عَوف) زانی پێغەمبەرﷺ بۆ جەنگ هاتووە، یەکسەر لەشکرەکەیخۆی هێنا (حُنَین)و لە ناو تەنگاییو گەلێەکانی دۆڵی (حُنَین)دا خۆیان حەشار دا و (کَمِین)=بۆسەیان بۆ (صَحابَة)کانﷺ داناوە، ئینجا لە تاریو ڕۆنی بەیاندا (صَحابَة)کانﷺ گەیشتنە دۆڵی (حُنَین)و کافرەکان بە تێکڕایی تیربارانیان کردن، جا (صَحابَة)کانﷺ خۆیان پێڕانەگیراو پاشەکشەیان کردو مەیدانیان بەجێ هێشت، بەڵام پێغەمبەرﷺ هەڵنەهاتو خۆی گەیاندە لای ڕاستەو بانگی (صَحابَة)کانی دەکرد دەیفەرموو: وەرنە لای من.

هەروەها دە (صَحابَة)ش لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ مانەوە: وەك ئیمام (أبُوبَکر)و ئیمام (عُمَر)و ئیمام (عَلِي)و ئیمام (العَبّاس)ی مامی پێغەمبەروﷺ لەگەڵ (الفَضل)ی کوڕیو (أبُوسُفیان بن الحارِث)ی کوڕە مامیپێغەمبەروﷺ هەندێکیترﷺ، جا پێغەمبەرﷺ بە سواری هێسترە سپیەکەیخۆی بەرەو کافرەکان غاری دەداو دەیفەرموو: ﴿أَنَا النَّبِيُّ لا كَذِبْ، أَنَا ابْنُ عَبْدِالْمُطَّلِب﴾ من پێغەمبەرم هیچ درۆ نیە، من کوڕی (عَبْدُالْمُطَّلِب)م.

جا ئیمام (العَبّاس)ﷺ جڵەوی هێسترەکەی گرتبوو، (أبُوسُفیان بن الحارِث)ﷺ سەر پاڵوەکەی گرتبوو تا بەرەو پێش نەڕوا، ئینجا پێغەمبەرﷺ بە ئیمام (العَبّاس)ی فەرموو: هاوار بکەو بڵێ: هۆ (صَحابَة)کانی بن درەختەکەی (بَیعَةُ الرِّضوان)، هۆ گەلی (أنصار)ی (مَدِینَة). جا ئیمام (العَبّاس)ﷺ ئەم هاوارەی کرد-لە بەر ئەوەی دەنگێکی بەرزی هەبوو-(صَحابَة)کانﷺ گوێیان لێبوو و وەڵامیان داوە: (لَبَّیكَ، لَبَّیكَ) لە خزمەتین، لە خزمەتین، جا هەر ئەوەندە بوو کە گوێیان لەم هاوارەی ئیمام (العَبّاس) بوو، دەستیان بە گەڕانەوە کردو پیاوی وەها هەبوو: دەیویست وشترەکەی بسوڕێنێتەوە، بەڵام لە بەر پاڵەپەستەی خەڵکەکە نەیدەتوانی، بۆیە لە وشترەکەی دادەبەزیو زرێیەکەی فڕێ دەداو تەنها شمشێرو قەڵغانەکەی بە دەستەوە دەگرتو بەرەو پێغەمبەرﷺ دەگەڕاوە، تا سەد کەس لە دەورەی پێغەمبەرﷺ کۆ بونەوەو هێرشیان کردە سەر کافرەکان.

بەڵێ: ئەم سەد (صَحابَة)یەﷺ لەگەڵ ئەو هەموو لەشکرە زۆرە کەوتنە جەنگکردنو

شمشێر لێدان، جا كە پێغەمبەرﷺ چاوی بەم جەنگە كەوت، فەرمووی: ﴿آلْآنَ حَمِيَ الْوَطِيسُ﴾ ئێستا كوورەی جەنگ گەرم بوو. جا پێغەمبەرﷺ چەنگێكی وردە بەردی هەڵگرتو پرژاندیە لای كافرەكانو فەرمووی: ﴿إنْهَزَمُوا وَرَبِّ مُحَمَّدٍﷺ﴾ كافرەكان هەڵاتن، سوێندم بە خوای(مُحَمَّد)ﷺ. ئیتر كافرەكان هەر یەكەو هەندێك وردە بەردیان كەوتە ناو چاوەكانیانو لەو كاتیشدا خوایگەورە (مَلائِكَة)ی ناردنە خوارێ، وەك عەبای ڕەش لە ئاسمانەوە دادەبەزینو لە ناو دۆڵەكەشدا وەك مێرو بڵاو دەبونەوە، ئیتر ئەم جارە كافرەكان خۆیان پێ ڕانەگیراو بەزینو لە مەیدان هەڵاتن، (صَحابَة)كانیشﷺ بە دوایاندا دەرۆیشتنو دەیانكوشتنو دیلیان دەكردن، تاوای لێهات: هەڵاتووەكانیموسوڵمانان بە تەواوی نەگەڕابونەوە، كە دیلەكانیكافرەكان لە بەردەست پێغەمبەرداﷺ بە پەلبەستكراوی كۆ كرابونەوە.

هەروەها (مالِك بن عَوْف)ی سەركردەی كافرەكانیش لە مەیدان هەڵات تا چووە (طائِف)، لەوێ لەگەڵ كۆمەڵێكی سەركردەكان لە ناو قەڵای (طائِف)دا خۆیان قایم كرد.

جا لەم غەزایەی (حُنَیْن)، پێغەمبەرﷺ دیتی حەزرەتی(أُمُّ سُلَیْم)= (الرُمَیْصاء) لەگەڵ حەزرەتی(أبُوطَلْحَة)ی مێردیخۆی رضيالله عنهما هاتۆتە غەزاو خەنجەرێكی پێیەو دەیگوت: هەر كافرێك لێم نزیك ببێتەوە، بەم خەنجەرە زگی هەڵدەدڕم. جا پێغەمبەرﷺ پێكەنی، (أُمُّ سُلَیْم)ش گوتی: یارَسُولَ الله، ئەوانەی لە جەنگ هەڵاتن دەیانكوژم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خوا جەنگی لە كۆڵ كردوینەوەو چاكەشی لەگەڵ كردوین.

جا حەزرەتی(أبُوطَلْحَة)ی مێردیشی رضيالله عنهما بە تەنهایی بیست كافری كوشتبونو كەلوپەلی هەموویانی بۆ خۆی هێنابوو.

﴿( سَرِیَّة )ی ( أَوْطاس )﴾

ئیجا كە كافرەكان لە (حُنَیْن) شكانو هەڵاتن، هەندێكیان لەگەڵ (مالِك بن عَوْف)ی سەركردەیان چونە (طائِف)، هەندێكیش چونە (أوْطاس)، كۆمەڵێكی كەمیش بەرەو (نَخْلَة) هەڵاتنو (صَحابَة)كانﷺ بە دوایاندا چونو (دُرَیْد بن الصُمَّة) لەوێ كوژرا.

ئینجا پێغەمبەرﷺ بە سەركردایەتی حەزرەتی(أبُوعامِرالأشْعَرِي)ﷺ كۆمەڵێكی (صَحابَة)كانی ناردنە (أوْطاس) لەوێ لەگەڵ كافرەكانیهەڵاتوو ڕووبەڕووی یەكتری بونەوە، جا لەم جەنگەدا دە برای كافر–یەك لە دوای یەك– بۆ حەزرەتی(أبُوعامِر)ﷺ هاتنە مەیدان، جا هەر یەكێكیان دەهات، حەزرەتی(أبُوعامِر)ﷺ داوای موسوڵمانبوونی لێدەكرد، ئەویش نابووە موسوڵمان، تا نۆ برا لەو دە برایانەی كوشتن، ئینجا دەیەمینەكەیان هاتو حەزرەتی(أبُوعامِر)ﷺ داوای موسوڵمانبوونی لێكردو فەرمووی: خودایە لە سەری ببە شاهید. كافرەكەش گوتی: خودایە لە سەر من

نەبیە شاهید. جا حەزرەتی(أبُوعامِر)ﷺ وا تێگەیشت موسوڵمان بووە، بۆیێ وازی لێهێناو نەیکوشت‌و قورتار بوو، ئینجا لەمەودوا ئەم پیاوە موسوڵمان بوو و کە پێغەمبەرﷺ دەیدیت، دەیفەرموو: ئەمەیە قورتاربووەکەی (أَبُوعامِر).

ئینجا حەزرەتی(أبُوعامِر)ﷺ تیرێکی وە ئەژنۆی کەوت‌و بەم تیرە شەهید بوو، جا پێش ئەوەی گیانی دەربچێ، حەزرەتی(أبُومُوسَى الأشعَرِي)ﷺ—کە کوڕی برای خۆی بوو— کردیە سەرکردەی لەشکرەکە، جا خوای گەورە بە سەرکردایەتی حەزرەتی(أبُومُوسَى)ﷺ سەرکەوتنی دا لەشکری ئیسلام‌و کافرەکانیش هەڵاتن‌و ماڵ‌و ژن‌و منداڵیان کەوتنە دەست (صَحابَة)کانﷺ هێنانیانەوە لای پێغەمبەرﷺ.

جا لەم هەردوو جەنگەی (حُنَين)و (أوْطاس) تەنها چوار (صَحابَة) شەهید بونﷺ ئەمیر (خالِد)شﷺ بریندار بوو، کوژراوەکانی کافرەکانیش لە سەد کوژراو زیاتر بون، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: ماڵ‌و ژن‌و منداڵی کافرەکان هەر هەمووی لە (الْجِعْرانَة) کۆ کرانەوە، تا لە غەزای (طائِف) گەڕاوە.

## ﴿غەزای ( طائِف ) لە ڕۆژهەڵاتی ( مَكَّة )﴾

ئینجا کە پێغەمبەرﷺ لە غەزای (حُنَين) سەر کەوت، لەگەڵ (صَحابَة)کانﷺ ڕووی کردە (طائِف)، بۆ غەزای (ثَقِيف)و هەڵاتووەکانی‌تری (هَوازِن)، ئینجا کە لە شکری موسوڵمانان گەیشتە (طائِف)، دیتیان کافرەکان خۆیان لە ناو قەڵای (طائِف)دا حەشار داوەو ئازوقەیەکی زۆریشیان بردۆتە ناو قەڵایەکە، ئینجا پێغەمبەرﷺ سەربازگەی لە نزیك قەڵایەکە دانا، بۆیێ کافرەکانیش لە قەڵایەکەوە موسوڵمانەکانیان تیرباران کردن تا لە ئەنجامدا دوانزە (صَحابَة)ﷺ شەهید بون‌و ژمارەیەکی زۆریشیان لێ بریندار بون، یەکێك لە بریندارەکان: حەزرەتی(أبُوسُفْيان بن حَرْب) بووﷺ چاوێکی دەرهێندرا، یەکێکی‌تریش حەزرەتی(عبدالله)ی کوڕی ئیمام (أبُوبَكْر) بوو رضي‌الله عنهما، ئەویش بەم برینە لە سەردەمی (خِلافَة)ی ئیمام (أبُوبَكْر)داﷺ وەفاتی کرد.

جا پێغەمبەرﷺ ناچار سەربازگەکەی کشاندەوە بۆ ئەو شوێنەی ئێستا مزگەوتی پێغەمبەرەﷺ لە (طائِف)، ئینجا تا ماوەی هەژدە ڕۆژان گەمارۆی کافرەکانی دا، هەر چەند مەیدانیان لێدەخواستنەوە کەسێکیان نەدەهاتە دەرەوە بۆ جەنگکردن، بەڵکو لە قەڵایەکەوە بانگیان دەکردن‌و دەیانگوت: بەشی چەند ساڵێك ئازوقەمان لە لایە، کە ئازوقەکە نەما، ئەوجا بۆ جەنگکردن دێینە دەرەوە.

ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: بە (مَنْجَنِيق) بەردبارانیان کردن‌و هەم بانگەوازیش کرا: هەر کەسێك لە قەڵایەکە بێتە دەرەوە، ئازادە. جا بیست‌وسێ کەس هاتنە دەرەوەو موسوڵمان بون‌و ئازاد کران.

جا كە پێغەمبەرﷺ زانی لە لایەن خوداوە ئیزن نەدراوە (طائِف) ڕزگار بكا، ڕاوێژی بـە یەكێك لە (صَحابَة)كان كرد، ئەویش گـوتی: یـا رَسُولَ الله، وەك ڕێـوی لـە نـاو كونیـیـە؛ ئەگەر بۆی بمێنیەوە دەیگری، ئەگەر وازیشی لێبێنی زیانی نیـە. بۆیـێ پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: ﴿إنَّا قافِلُونَ غداً إنْ شاءَ الله﴾ ئێمە سبەینێ دەڕۆین، إن شاء الله.

جا (صَحابَة)كانﷺ گـوتیان: چۆن بـڕۆینو (طائِف)ش ڕزگار نەكەین؟ جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: كەوابوو: ﴿فَاغْدُوا عَلَى الْقِتالِ﴾ سبەینێ بڕۆن بۆ جەنگ كردن.

ئیتر سبەینێ (صَحابَة)كانﷺ هێرشیان كردو لە جەنگدا بریندار بون، جا ئەم جارەش پێغەمبەرﷺ فەرمووی: إن شاء الله سبەینێ دەڕۆین. جا ئەم جارە (صَحابَة)كانﷺ زۆریـان پـێخۆش بـوو و خۆیـان ئامـادە كـرد، جـا پێغەمبـەریشﷺ پێكـەنی؟ چـونكە (صَحابَة)كان زوو ڕایخۆیان گۆڕیو زانییان بڕیاری پێغەمبەرﷺ بە سودترە، ئینجا كە دەستیان بە ڕۆیشتن كرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بڵێن: ﴿آيِبُونَ تائِبُونَ عابِدُونَ لِرَبِّنَــا حامِدُون﴾. ئینجا هەنـدێك گوتیـان: یارَسُولَ الله دوعـا لـە دژی (ثَقِیف)=دانیـشتووانی (طائِف) بكە. بەڵام پێغەمبەرﷺ دوعای بۆ كردنو فـەرمووی ﴿اَللَّهُمَّ اهْدِ ثَقِيفاً وَأْتِ بِهِمْ مُسْلِمِينَ﴾ خوایە (ثَقِیف) بهێنە سەر هیدایەتو بە موسوڵمانی بیانهێنە لای من.

ئینجا كە پێغەمبەرﷺ بەرەو (الجعرانة) گەڕاوە، (سُراقَة) خۆی گەیاندیو نوسراوەكەی ڕێگەی كۆچكردنی نیشانی پێغەمبەر داﷺ، جا موسوڵمان بوو و تكاشی لێكرد هێرش نەكاتە سەر هۆزەكەی. هەروەك لە گوڵبژێرەكەی كۆچكردندا ڕوونمان كردەوە.

## ﴿ بەشكردنی دەستكەوتووی كافرەكان ﴾

كە پێغەمبەرﷺ گەیشتەوە (الجعرانة)، دەستكەوتووەكە سەر ژمێر كرا: شـەش هـەزار ژنو منداڵ بون، بیستوچوار هەزار وشتر، زیاتر لە چل هەزار مەڕو بزن، چوار هـەزار (أوقِيَة)ی زیو، جا پێغەمبەرﷺ بە سەر (صَحابَة)كانیدا بەشی كردو بە تایبەتیش بۆ دڵڕاگرتن بەشێكی زۆری دایە تازە موسوڵمانبووەكانو هەم دایە ئەوانەی موسـوڵمانیش نەبوینە؟ تاكو موسوڵمان ببن، جا (أنصار)ی (مَدينة)ﷺ لەم بەشـكردنە ڕازی نـەبونو گوتیان: سەیرە! پێغەمبەرﷺ بەخشین دەداتە ئەو كەسانەی جەنگیان لەگـەڵ دەكـرد، ناشیداتە ئێمە كە تا ئێستا شمشێرەكانمان خوێنی ئەوانی لێدەچكێتەوە.

جا كە پێغەمبەرﷺ ئەم قـسەیەی گەیـشتێ، فـەرمانی دا: (أنـصار)ی(مَدينـة)ی بـۆ كـۆ كرانەوەو لەگەڵیان دانیشتو فەرمووی: ﴿ئەو قسەیە چییە لە ئێوە پێم گەیـشتووە؟ ئەدی ئێوە گومڕا نەبونو خوایگەورە بە هۆی من ئێوەی كردنە موسوڵمان؟ ئەدی ئێوە هەژار نەبونو خوایگەورە بە هۆی من ئێوەی دەوڵەمەند كردن؟ ئـەدی ئێـوە دوژمنی یەكتری نەبونو خوایگەورە بـە هـۆی مـن ئێـوەی پێك هێنـاوە؟﴾.

جـا (أنـصار)ش ﷺ دەیـانگوت: بـەڵێ وَالله. جـا پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: بـۆ وەڵامـم نادەنـەوە؟ (أنـصار)ش ﷺ گوتیـان: بـە چـی وەڵامـت بدەینـەوە؟ ئێمـە منـەتباری خـواو پێغەمبەرین ﷺ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿ئەگـەر حـەز دەکـەن بڵـێن-باوەڕیشتان پـێدەکرێ-: تـۆ هاتیەی لای ئێمە خەڵك بە درۆزنی دانابوی، ئێمە باوەڕمان پـێکردی، یارمـەتیت نەدەدرا، ئێمە یارمەتیمان دای، لە شوێنیخۆت دەرکرای، ئێمە تۆمان حاواندەوە، بێ ماڵ بوی، ماڵمان بۆ دانای، دەترسای، ئێمە تۆمان دڵنیا کرد﴾. جا (أنصار) ﷺ گوتیان: بەڵکو هەر ئێمە منەتباری خواو پێغەمبەرین ﷺ.

جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿هۆ گەلی (أَنْصار) چۆن ئێوە دڵتەنگ دەبن کە بەشێکی ماڵیدونیا بدەمـە کەسـانێك تـاکو دڵیـان ڕابگـرمو موسـوڵمان بـبن، خـۆ مـن ئێـوەم داوەتە دەست ئاییندیخۆتانو لێتان دڵنیام، ئایا ئێوەی (أَنْصار) بەوە ڕازی نابن: خەڵك وشترو مەڕ بۆ خۆی ببا، ئێوەش لەگەڵ پێغەمبەریخوا بگەڕێنەوە؟ سوێندم بـەو خوایـەی گیـانی(مُحَمَّـد)ی بـە دەسـتە: ئەگـەر لـە بـەر کۆچـکردن نەبوایـە، مـن دەبومە پیاوێکی (أَنْصار)، ئەگەر خەڵك بە گەڵیەکدا بڕوا، (أَنْصار)یش بە گەڵیەکدا بـڕۆن، مـن بـە گەڵیەکـەی(أَنْـصار)دا دەڕۆم، خودایـە ڕەحـم بکـە: بـە (أَنْـصار)و بـە کوڕەکانی (أَنْصار)و بە کوڕەکانی کوڕەکانی(أَنْصار)﴾.

جا (أنصار) ﷺ گریان تـا ڕیـشەکەیان تـەڕ بـوو، جـا فـەرموویان: ئـەی پێغەمبـەریخوا، گەورەو عەقڵمەندەکانمان هیچیان نەگوتووە، تەنها گەنجەکانمان ئەو قسەیان کردوە، یا رَسُولَ الله ئێمـە ڕازی بـوین خـواو پێغەمبـەر ﷺ بەشـی ئێمـە بـن. جـا پێغەمبـەر ﷺ ڕۆیشتو ئەوانیش پەرتەیان کرد.

## ﴿ پەیدابوونی بنچینەی ( خَوارِج ) لەم غەزایەدا ﴾

کـە لـەم غەزایـەی (حُنَـێن) پێغەمبــەر ﷺ دەســتکەوتووەکەی کافرەکـانی بـە سـەر (صَحابَة)کاندا ﷺ بەش کرد، (حَرْقُوس)=(ذوالخُوَیْصِرَة) کە پیاوێکی چاو قوپاوی کوڵمە زەقی نێوچاوان بەرزی ڕیش پەرچو پڕی سەر تاشراوی دامـێن هـەڵوێزراو بـوو، گـوتی: ئەم بەشکردنە بۆ خوا نەبو، دادپەروەری تێدا نەکرا. جا گوتی: (یـا رَسُـولَ الله إتَّـقِ اللهَ) وَفِی رِوایَة: (یا رَسُولَ الله إعْدِلْ) هۆ پێغەمبەریخوا لە خوا بترسە، دادپـەروەر بـە لەم بەشکردنەدا، جا پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ﴿وَیْلَكَ، مَنْ یَعْدِلُ إذا لَمْ اَعْدِلْ﴾ قـوڕت بە سەر کێ دادپەروەری دەکا، ئەگەر من دادپەروەری نەکەم؟.

جا هەر یەکە لە ئیمام (عُمَر)و ئەمیر (خالِد) رضی‌الله عنهما گوتیـان: یارَسُولَ الله ئیـزنم بـدە بیکوژم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿دَعْهُ إنَّ لَهُ أَصْحَاباً یَحْقِرُ أَحَدُکُمْ صَلاَتَهُ مَعَ صَـــلاتِهِمْ

وَصِيامَهُ مَعَ صِيامِهِمْ يَقْرؤُونَ الْقُرآن لا يُجاوِزُ تَراقِيَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّين كما يَمْرُقُ الـسَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ﴾ رواه الشيخان، وازى لێبێنه، ئەم پیاوە هەندێك شوێنكەوتەی هەنە–واتە: پەیدا دەبن–ئێوە نوێژیخۆتان بەرامبەر بە نوێژی ئەوان پێ هیچ نیە، ڕۆژووی خۆتان بەرامبەر ڕۆژووی ئەوان پێ هیچ نیە، قورئان دەخوێنن بەڵام لە گەرویان تێناپەڕێ، بە هۆی توندوتیژی لە ئایین دەردەچن هەروەك تیر لە نێچیر دەردەچێ.

إنْ شاء الله لە گوڵبژێرەكە زیاتر نیشانەكانیان دەڵێین.

## ﴿ هاتنی (شَیْماء)= خوشكە شیریەكەی پێغەمبەرﷺ ﴾

ئەوەمان باس كرد: كە (حَلِیمَةالسَعْدیَّة) شیری داوەتە پێغەمبەرﷺ، ئەم (حَلِیمَة)یە ئافرەتێكی بەرەبابی (بَنِیسَعْد) بوو، (بَنِیسَعْد)ش بەشێكی هۆزی (هَوازِن)ن، جا یەكێك لە دیلەكانی (بَنِیسَعْد)ش: (شَیْماء)ی كیژی (حَلِیمَةالسَعْدیَّة) بوو، ئینجا كە دیلەكانیان هێنانە (الْجِعْرانَة)، لە ڕێگەدا (شَیْماء) بە (صَحابَة)كانی گوت: من خوشكی پێغەمبەری ئێوەمﷺ! ئەوانیش باوەڕیان پێنەكرد، تا هێنایانە لای پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نیشانەت چییە كە تۆ خوشكی منی؟ ئەگەر ڕاست بكەی ئاسەوارێكی من بە تۆ وەیەو لە ناو ناچێ. جا (شَیْماء) گوتی: گەزەیەكت لە شانم داوە لەو كاتەی منداڵ بویو لە پشتێم كردبوی. جا (شَیْماء) قۆڵیخۆی ڕوت كردو پێغەمبەرﷺ گەزەكەی ناسیەوە، جا لە بەری هەڵساو پەشتەماڵەكەیخۆی بۆ داناو لە سەری دانیشت، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: داوای هەر شتێك بكەی دەتدەمێ، تكا بۆ هەركەسێك بكەی تكایەكەت قبوڵە، ئەگە پێت خۆشە: لە لای من بمێنیەوە، تۆ ڕێزداریو خۆشەویستی، ئەگەر پێت خۆشە هەندێك ماڵت دەدەمێو بگەڕێوە ناو گەلەكەی خۆت؟ (شَیْماء) گوتی: دەگەڕێمەوە لای گەلەكەیخۆم.

جا (شَیْماء) موسوڵمان بوو و پێغەمبەرﷺ هەندێك ماڵی دایێو كۆیلەیەكو كەنیزەیەكیشی دایێو گەڕاندیەوە ناو هۆزەكەی (بَنِیسَعْد).

جا بزانە: بۆیێ لێرەدا–تەنها– باسی خوشكەكەی پێغەمبەرمانﷺ كرد، چونكە دیل كرابو، ئەگەر نا: دایكە شیریەكەیو باوكە شیریەكەیو برا شیریەكەشی، هەموویان لێرەدا هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ ئەوانیش–وەكو حەزرەتی(شَیْماء)–موسوڵمان بونرضي الله عنهم، پێغەمبەریشﷺ ڕێزی لێناون، هەروەك ئیمام (أبوداود) گێڕاویتیەوەو لە گوڵبژێرەكەی (شیرخواردنی پێغەمبەردا)ﷺ باسمان كرد، والحمد لله تعالی.

## ﴿ هاتنی وەفدی (هَوازِن)و موسوڵمانبوونیان ﴾

ئینجا لە دوای بەشكردنی ماڵو ژنو منداڵەكانی (هَوازِن)، لە دوای چەند شەوێك وەفدی (هَوازِن)–كە ژمارەیان چواردە كەس بون– بە سەرۆكایەتی (زُهَیْر بن صُرَد)

هاتنــه خزمــەت پێغەمبــەرﷺ، (أبُـوبَرْقـان)ی مامــه شـیریەکەی پێغەمبەریـشیانﷺ لەگەڵدا بوو، هەم (شَیْماء)شیان لەگەڵ خۆیانا هێنابوو، ئەوانیش موسوڵمانبوونیخۆیان ڕاگەیاند، جا هەم لە ڕێگای (شَیْماء)و هەم بەخۆیشیان تکایان لـە پێغەمبـەرﷺ کـرد: مـاڵو منـداڵو ژنــەکانیان بداتــەوەو گوتیـان: یـا رَسُـولَ الله، ئێمـە ڕەسـەنینو خـاوەن عەشیرەتین، بەڵایەکی وەهامان بە سەر هاتووە کە لە تۆ شاراوە نیە، ئەوانـەی بـە دیـل گرتونتان: دایکە شـیرەکانیخۆتن، خوشکە شـیرەکانیخۆتن، پـورە شـیرەکانیخۆتن، ئـەو ئافرەتانەن: کە تۆیان لە کۆشو باوەشیخۆیان دادەنا، ئێمەش پەنا دەبەینە بەر خوداو تکا لە تۆش دەکەین ئەی پێغەمبەریخوا منەتێکمان بە سەردا بکەو بماندەوە.

جا (زَهێر) پارچە شیعرێکی گوت، هەندێك لەو شیعرانە:

اُمْـنُـنْ عَـلَـيْنَـا رَسُولَ الله فِي كَرَمٍ * فَإنَّكَ الْمَـرْءُ نَـرْجُـوهُ وَنَـنْـتَـظِـرُ
اُمْنُنْ عَلَى نِسْوَةٍ قَدْ كُنْتَ تَرْضَـعُهَا * إِذْ فوكَ تَمْلَؤُهُ مِنْ مَخْضِها الدِّرَرُ
فَـأَلْبِسِ الْعَفْوَ مَنْ كُـنْتَ تَرْضَـعُهُ * مِـنْ اُمَّهاتِكَ، إِنَّ الْعَفْوَ مُشْتَهِرُ

منەتبارمان بکە، ئەی پێغەمبەریخواﷺ لـە ڕێزداریخۆت، چونکە تـۆ ئـەو پیـاوەی تکات لێبکەینو چاوەڕوانی چاکەی بکەین. چاکە لەگەڵ ئەو ئافرەتانە بکە: کـە شـیرت لێدەخواردنو شیرە زۆرەکەیان دەمـی تـۆی پـڕ دەکـرد. لێبـوردن بکـە بـە بـەرگی ئـەو دایکانەت کە شیرت لێدەخواردن، چونکە لێبوردن چاکەیەکی بە ناوبانگە.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوانەی دەیانبینن، لەگەڵمدانـە، خۆشەویسترین قسە لـە لای مـن ڕاسـترەکەیەتی، یـان ژنو منـداڵتان، یـان تـەنها ماڵتـان–یـەکێك لـەو دوانە–هەڵبـژێرن دەتاندەمـەوە، مـن–دە ڕۆژ زیـاتر– چاوەڕوانم کردن واتـە: ئێـوە نەهاتن، تا وا تێگەیشتم ئێوە نایەنـە لای من، ئێستاش هـەموویان بـەش کـراونو دەتوانم داوای تەنها یەکێکیان بکەم؟.

جا وەفدەکە گوتیـان: ژنو منداڵـەکانمان بـدەوە، باسـی وشـترو مـەڕو بـزن ناکـەین. جـا پێغەمبـــەرﷺ فـــەرمووی: هــەر کەســێکی کەوتبێتــە بەشــی مــنو بنەماڵــەی (عَبْدُالْمُطَّلِبِ)، هـەر هـەمووی بۆ ئێـوە بـێ، واتـە: دامـەوە ئێـوە، ئینجا کـە نوێـژی نیوەڕۆم بە جەماعەت بۆ خەڵکەکە کرد، ئێـوە هەڵسن ئیـسلامەتیخۆتان ئاشـکرا بکەنو بڵێن: ئێمە برای ئێوەینـە، پێغەمبـەریخواﷺ دەکەینـە تکاکاریخۆمـان لـە لای موسـوڵمانان، هـەم موسـوڵمانانیش لـە لای پێغەمبـەرﷺ دەکەینـە تکاکـار: لەبارەی ژنو منداڵەکانمان، تاکو بماندنەوە.

ئینجا کە پێغەمبەرﷺ نوێژی نیوەڕۆی بـە جەماعـەت کـرد، وەفدەکـە هەڵسانو ئـەو قسانەی پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکردبون، بە (صَحابَة)کانیان گوت، جا پێغەمبەرﷺ

هەڵساو (حَمد)و (شكْر)ی‌خوای كردو فەرمووی: ئەوانە برای ئێوەن بە موسوڵمانبوویی هاتون، من وەهام پێ‌باشە: ژن‌و منداڵەكانیان بدەینەوە، جا هەر كەسێك لە ئێوە پێی خۆشە: بەشەكەی‌خۆی-لەو ژن‌و مندالانە- بە خۆڕایی بداتەوە، با بیانداتەوە، هەر كەسێكیش پێی خۆش نیە بە خۆرایی بیانداتەوە، ئەوە من بۆ ئەوان لێی‌دەكڕمەوەو لەجیاتی هەر ژنێك، یان هەر منداڵێك شەش وشتری دەدەمێ لە یەكەم دەستكەوتووێكی‌داهاتوو...جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر ژن‌و منداڵێك بەشی‌و من‌و بنەماڵەی (عَبْدُالْمُطَّلِب) بێ، ئەوە دامەوە.

هەروەها تێكرای (مُهاجر)و (أنصار)ش‌ﷺ گوتیان: هەر ژن‌و منداڵێك بەشی ئێمە بێ، ئەوە بۆ پێغەمبەری‌خوا بێﷺ، واتە: لە بەر خاتری پێغەمبەرﷺ دامانەوە. بەلام كەسانێكیش گوتیان: ئێمە بە خۆرایی نایاندەینەوە.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئێمە نازانین كێ-لە ئێوە- ئیزنی داوەو كێ ئیزنی نەداوە، بگەڕێنەوە تاكو سەركردەكانتان كارەكەتان بۆ ئێمە ڕوون دەكەنەوە.

جا هەر سەركردەیەك لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵ كۆمەڵەكەی‌خۆی كرد، ئینجا گەڕانەوە لای پێغەمبەروﷺ گوتیان: یا رَسُولَ الله هەموویان ڕازی بون. جا ژن‌و منداڵەكانیان هەموو بۆ گەڕاندنەوە، بەلام ئەوانەی ڕازی نەبون بە خۆڕایی بیاندەوە، پێغەمبەرﷺ بە قەرز لێی كڕینەوە، هەر نەفەرێك بە شەش وشتر، ئیتر ئەو شەش هەزار ژن‌و منداڵە هەمویان ئازاد كران بە بەرەكەتی شیرخواردنی پێغەمبەرﷺ، هەروەك لە كاتی شیرخواردنیشی ئەم هۆزەی پڕ پیت‌و بەركەت كردبوو، ئەبێ ئەوەش بزانین: كە تكاكردنەكەی (شَیماء)ش بۆ ئازادكردنی ئەم دیلانە زۆ كاریگەر بوو، چونكە هیچ ئافرەتێك بە قەد (شَیماء) ڕێزدارو بە بەرەكەت نەبوە بۆ گەلەكەی.

ئینجا پێغەمبەرﷺ پرسیاری لە (وَفْد)ی (هَوازِن) كرد: (مالِك بن عَوْف)ی سەركردەكەیان چی بە سەر هاتووە؟ گوتیان: ئەویش لەگەڵ (ثقِیف)دا چووەتە قەلای (طائِف). جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەوالی بۆ بنێرن ئەگەر بێتە لای من‌و موسوڵمان ببێ، ژن‌و منداڵەكانی دەدەمەوەو سەد وشتریشی دەدەمێ.

جا كە (مالِك) ئەو هەواڵەی گەیشتێ، بە نهێنی لە قەلای (طائف) دابەزی‌و هاتە (الجعْرانَة)و لە خزمەت پێغەمبەرﷺ موسوڵمان بوو، جا پێغەمبەرﷺ هەموو ماڵ‌و ژن‌و منداڵەكانی دانەوەو سەد وشتریشی دانێ، هەم كردیەوە گەورەی موسوڵمانەكانی هۆزی (هوازِن).

### ﴿ عومرەكەی پێغەمبەرﷺ لە (اَلْجِعْرانَة )﴾

بزانە: كە پێغەمبەرﷺ لە (طائِف) گەڕاوە، ماوەی سێزدە ڕۆژان لە

(الجعرانة) مایەوە، جا لە (الجعرانة)دا ئیحرامی بە (عُمرَة) بەستو شەوێ هاتە ناو (مَكّة)و (عُمرَة)كەی تەواو كردو هەر لەم شەوەدا گەڕاوە (الجعرانة)، جا لە (الجعرانة)وە لەگەڵ (صَحابَة)كانی گەڕاوە بۆ (مَدینة)و لە كۆتایی مانگی (ذِیالقَعدَة) گەیشتەوە (مَدینة)ی پیرۆز، واتە: لە ڕۆژی دەرچوونیەوە بۆ (فتح مَكّة)، تا ئێستا، نزیكەی هەشتا ڕۆژی پێچوو، هەروەك لە (فتح مَكّة)دا باسمان كرد. (البدایة والنهایة) ب(٣) ل(٥-٥٨) و(السیرة الحلبیة) ب(٣) ل(١٥١-١٨٣).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەكەم: (عارِیَة)=خواستنی شتێك بۆ پێكهێنانی پێویستیەكانی خۆی، دروستە**، پێغەمبەرﷺ سەد زرێی بۆ غەزای (حُنَین) لە (صَفْوان بن أُمَیَّة) خواستو فەرمووی: ﴿عارِیَةٌ مَضْمُونَةٌ﴾ **بە خواستنێكی زامینكراو لێت وەردەگرم**. لەو كاتیش (صَفْوان) كافر بوو، جا بەشێكی ئەو زرێیانە ون بون، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **تۆڵەی فەوتاوەكانت بدەمێ؟** (صَفْوان)یش گوتی: نا، ئەی پێغەمبەریخواﷺ تۆڵەم ناوێ، چونكە من ئەمڕۆ شتێكم لە دڵدایە، كە ئەو ڕۆژە لە دڵمدا نەبو، واتە: دەمەوێ موسوڵمان ببم. (ابوداود والنسائي بسند صحیح) گێڕاویەتیانەوە.

جا ئەم حەدیسە بەڵگەیە: ئەگەر شتی خواستراو لە لای ماڵخوازەكە فەوتا، فەوتانەكەشی بە هۆی بەكارهێنانێكی ئیزندراو نەبو، تۆڵەی شتە فەوتاوەكەی لە سەر واجب دەبێ، وەك زرێ ونبووەكانی (صَفْوان)، بەڵام ئەگەر بە هۆی بەكارهێنانێكی ئیزندراو لە ناو بچێ: وەك داس بە هۆی دروێنە بشكێ، یان چەك بە هۆی بەكارهێنانی بۆ جەنگ خراپ ببێ، ئەو كاتە تۆڵەی لە سەر نیە.

هەروەها حەدیسەكە بەڵگەیە: كە دروستە موسوڵمانەكان چەكو كەرستەی جەنگ لە كافران وەربگرن، بەو مەرجەی سەرشۆڕیو ژێر دەستیی بۆ موسوڵمانان تێدا نەبێ، واتە: چونكە (صَفْوان) لە ڕۆژی خواستنی زرێیەكانیدا (كافر) بوو، لە هەمان كاتیشدا ئەو لە ژێر دەسەڵاتی پێغەمبەردا بووﷺ، هەروەها دروستە-بۆ جەنگكردن- پشت بە خودی كافرەكانیش ببەستن، بەو مەرجانەی لە چوارەم گوڵبژێری غەزای (أُحُد)دا ڕوونمان كردنەوە. (البدایة والنهایة) ب(٣) ل(٧) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٥) ل(٤٢١).

**دووەم: سەركەوتنو بەزین بە هۆی زۆریو كەمی نیە**. یەكێك بە هۆی زۆریی لەشكرەكە گوتی: ئەمڕۆ بە هۆی كەمی نابەزێندرێین...هتد، غەزای (بَدْر) ئەوەمان بۆ بڕیار دەدا: ئەگەر موسوڵمانان خۆڕاگر بنو پشت بە خوا ببەستن-ئەگەر كەمیش بن- سەر دەكەون، لە بەرامبەریش غەزای (حُنَین) بڕیار دەدا: ئەگەر موسوڵمانان خۆڕاگر نەبنو پشت بە خوا نەبەستن، ئەنجامەكەیان شكانو بەزینە، هەرچەند ژمارەشیان زۆر بێ، چونكە لە غەزای

(بَدْر) ژمارەی موسوڵمانان لە هەموو غەزایەکان کەمتر بوو، لە غەزای (حُنَيْن)ش ژمارەیان لە هەمو غەزایەکیڕابردوو زۆرتر بوو، جا خوایگەورە باسی غەزای (حُنَيْن) دەکاو دەفەرموی: ﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنْكُمْ شَيْئاً وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُمْ مُدْبِرِينَ﴾ التوبة: ٢٥، **لە غەزای (حُنَيْن) لە دوای هەڵاتن خوایگەورە سەرکەوتنی دانێ، هەڵاتنەکەتان لەو کاتەدا بوو: کە بە هۆی زۆریی لەشکرەکەتان سەرتان سوڕما -شانازیتان دەکردو دەتانگوت بە هۆی کەمی نابەزێندرێین-، جا ئەم زۆرییەی ئێوە سودی نەدانێو ئەو زەمینە پانو بەرینە لێتان بەرتەنگ بوو لە ئەنجامدا هەڵاتن.** واتە: سەرکەوتن لە دەست خودایەو بە زۆریی لەشکر نیە، بەڵکو ئەگەر حەز بکا: لەشکرێکی کەم بە سەر لەشکرێکی زۆردا سەرکەوتوو دەکا.

**جا بزانە:** هۆی ئەم شکستە -لە ڕووی سەربازیەوە- ئەوە بوو: گەنجێکی زۆر بە بێچەك هاتبونە ئەم غەزایە، هەم هەندێك کافرو ئافرەتیش بۆ تەماعی تاڵانگرتن لەگەڵدا بون، هەم موسوڵمانەکان بە زۆریی خۆیان دەنازیو حیسابیان بۆ هێزی دوژمن نەدەکرد؟ چونکە ژمارەی لەشکری کافرەکان دوو هەندی لەشکری موسوڵمانەکان بوو، هەم دوژمن پێشتر خۆی لە شوێنە گرنگەکاندا قایم کردبوو و موسوڵمانەکان لەوە ئاگادار نەبون.

جا لە هەموو هۆیەکانیش بەهێزتر: بەشداربوونی دانیشتووانی (مَكَّة) بوو، کە تازە موسوڵمان بوبونو دونیا ویست بونو ئیمان لە دڵی هەموانیاندا نەچەسپا بوو، بۆیێ کە موسوڵمانەکان شکان، (أبُوسُفْيان) گوتی: هەڵاتنەکەیان تا دەریای سوور کۆتایی نایێ. (كِلْدَة)ش گوتی: ئەمڕۆ سیحرەکە پوچەڵ بۆوە. جا (صَفْوان بن أُمَيّة) خۆی لێتوڕە کردو گوتی: بێدەنگ بە، خودا دەمت بتەقێنێ، وَاللهِ ئەگەر پیاوێکی (قُرَيْش) سەرپەرشتیم بکا پێم خۆشترە، نەك پیاوێکی (هَوازِن). پیاوێکیتر گوتی: موژدەت لێبێ (مُحَمَّد)و (صَحابَة)کانی بەزین، وَاللهِ هەتا هەتایی پڕی ناکەنەوە...ئیتر ئەم جۆرە کەسانەی باوەڕ بێهێز بەشداریی غەزایەکەیان کردبوو، بەڵام بە ئازایەتیو دڵسۆزیی سەعد (صَحابَة)کە، خوایگەورە سەرکەوتنی بۆ موسوڵمانان ناردو هەڵمەتیان بردەوە سەر کافرەکانو بەزاندنیان، جا کە کافرەکانی (مَكَّة) ئەم سەرکەوتنەیان دیت، زۆریان موسوڵمان بون. (نور اليقين) ل(٢١٨-٢٢٠) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٤٢٩) و(سيره الصلابي) ب(٢) ل(٥٥٤).

**سێیەم: لە غەزای (حُنَيْن) خوایگەورە (مَلائِكَة)ی ناردنە خوارێ**، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَنْزَلَ اللهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنْزَلَ جُنُوداً لَمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَذَلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ﴾ التوبة: ٢٦، **ئینجا لە دوای هەڵاتنەکە، خوایگەورە ڕەحمەتو دڵڕاگرتنی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەیﷺ سەر ئیمانداران، هەندێك سەربازیشی دابەزاندن-کە (مَلائِكَة) بون- ئێوە نەتاندیتن، هەم خوایگەورە**

**کافرەکانیشی بە کوشتن‌و دیلکردن سزا دان، ئەوە سزای کافرەکانە.**

**جا بزانە:** (مَلائِکَة) تەنها لە غەزای (بَدْر) جەنگیان کردوە، بەڵام لەم غەزایەو لە غەزایەکانی‌تریش تەنا بۆ ترساندنی کافرەکان دادەبەزین‌و جەنگیان نەدەکرد، هەوەك ئیمامی (القُرْطُبي) لە تەفسیری ئایەتەکەدا فەرموویەتی.

کافرێك گوتویەتی: کە ئێمەو موسوڵمانەکان گەیشتینە یەکتری، بە قەد دوشینی مەڕێك موسوڵمانەکان خۆیان ڕانەگرت‌و ڕاومانان، تا گەیشتینە لای خاوەنی هێسترە سپیەکە—کە پێغەمبەرەﷺ— جا دیتمان هەندێك پیاوی سپیی ڕوو جوان لە نێوان ئێمەو ئەودانەو پێییان گوتین: ئەم ڕووانە ناشیرین بن، بگەڕێنەوە. جا ئێمە لە ترسی ئەم قسەیە گەڕاینەوە.

کافرێکی‌تر گوتویەتی: کە پێغەمبەرﷺ وردە بەردەکانی بۆ هاویشتین، ئێمە هەڵاتین‌و وامان بە سەر دڵدا دەهات: گشت بەردێك‌و گشت درەختێك ئەسپسوارێکە بە دواماندا دێت، جا من بە سواری ئەسپەکەم هەڵاتم تا گەیشتمەوە (طائِف).

ئەمە لە بارە دابەزینی (مَلائِکَة)، لە بارەی خۆڕاگرتنی پێغەمبەریشﷺ: ئیمام (ابن کَثیر) لە تەفسیری ئایەتەکەدا فەرموویەتی: ئەمە ئەو پەڕی ئازایەتیی تەواوە، کە پێغەمبەرﷺ لەم جۆرە ڕۆژەدا لە گەرمەی جەنگدا لەشکرەکەی لە لا نەمێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بە سواری هێسترێك لە مەیداندا مایەوەو هێسترەکەشی بە رەو پێشەوە بۆ لای دوژمن غاری دەداو ناوی خۆیشی ئاشکرا دەکرد، تاکو ئەوەی نەشیناسیوە بیناسێ، هێستریش بە کەڵکی هەڵمەت‌و هەڵاتنی جەنگ نایێ، ئەوە هەموو بە هۆی ئەوە بوو: کە باوەڕی تەواوی بە خوا هەبوو: کە یارمەتیی دەداو سەرکەوتووی دەکا.

حەزرەتی(الْبَراء)ﷺ لەبارەی ئازایەتیی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿كُنّا وَاللهِ إِذا اِحْمَرَّ الْبَأْسُ نَتَّقِي بِهِﷺ وَإِنَّ الشُّجاعَ مِنّا الَّذِى يُحاذِي بِهِ أَيْ النَّبيِّﷺ﴾ رواه مسلم، ئێمە وَاللهِ لەو کاتەی جەنگ سۆر دەبوو—واتە: لە جەنگدا خوێن دەڕژا—، ئێمە خۆمان بە پێغەمبەرﷺ دەپاراست، پیاوی ئازا ئەو کەسە بوو: لە ئاستی پێغەمبەرﷺ جەنگی کردبا.

**جا ئەوەش بزانە:** لە بەزاندنی کافرەکاندا ئەمیر (خالد)ﷺ بریندار بوو، بۆیێ پێغەمبەرﷺ سەردانی کردو دیتی پاڵی وەبارگەکەی‌خۆی داوەو بە هۆی سەختی برینەکەی زۆر بێ‌هێز بووە، جا پێغەمبەرﷺ تفی کردە ناو برینەکەی‌و چاك بۆوە. (البداية والنهاية) ب(٣) ل(١٦) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(١٥٧و١٦٢).

**چوارەم: حەزرەتی ( أُمُّ سُلَيْم )** رضی‌الله عنها **لەگەڵ مێردەکەی خۆی هاتبووە غەزای ( حُنَيْن )و خەنجەرێکی پێ بوو...هتد،** ﴿عَنْ ابْن عَبّاس رضی‌الله عنهما: كانَ رَسُولُ اللهِ يَغْزُو بِالنِّساءِ فَيُداوِينَ الْجَرْحَى وَيُحْذَيْنَ مِنَ الْغَنِيمَةِ وَأَمّا بِسَهْمٍ فَلَمْ يَضْرِبْ لَهُنَّ﴾ رواه مسلم وأصحاب السنن، **پێغەمبەرﷺ ئافرەتەکانی دەبردنە غەزا، بۆ ئاودان‌و دەرمانکردنی بریندارەکان، لە دەستکەوتووی کافرەکانیش بەخشیشێك دەدرا ئافرەتەکان، بەڵام وەك پیاوان**

بەشی تەواویان نەدەدرایێ. ئەوەش بەڵگەیە دروستە: ئافرەت لەگەڵ مەحرەمێکیخۆی بڕواتە غەزا، هەم دروستە برینداره‌کانیش دەرمان بکا، ئەگەر پیاوەکان نەیانتوانی دەرمانیان بکەن، هەم بۆ ئەوەی خزمەتیتریش پێشکەش بە لەشکریئیسلام بکەن، بەڵام بەو مەرجەی بێشەرعی ڕوو نەدا، هەروەك لە یازدەهەم گوڵبژێری (أُحُد)ش ڕوونمان کردەوە. (شرح صحيح مسلم) ب(٧) ل(٤٧٥-٤٧٨) و(فتح الباري) ب(٦) ل(٩٦-٩٨).

**پێنجەم: لە غەزادا کەلوپەلی کوژراوەکە بۆ بکوژەکەیەتی،** حەزرەتی(أَبُوطَلْحَة)ﷺ بە تەنهایی بیست کافری کوشتنو کەلو پەلەکەیانی بۆ خۆی هێنان. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَـلَبُهُ﴾ رواه الشيخان، **هەر کەسێك کافرێك بکوژێ، شاهیدیشی هەبێ، ئەوە کەلوپەلی کوژراوەکە بۆ خۆیەتی.**

**جا بزانە:** لە لای ئیمام (أَبُوحَنِيفَة)و ئیمام (مالك) مەبەستی ئەم حەدیسە (فَتْوى) نیە، بەڵکو بڕیارێکی دادوەرییەو لە دەست ئەمیری لەشکرەکەدایە، کەواتە: بکوژەکە مافی کەلوپەلەکەی نیە، تەنها ئەگەر پێش دەستپێکردنی جەنگ ئەمیری لەشکرەکە بڵێ: **(هەر کەسێك کافرێك بکوژێ کەلوپەلەکەی بۆ خۆی بێ)**. ئەو کاتە مافی هەیە، واتە: ئەگەر ئەمیری لەشکرەکە ئەو قسەیە نەکا، ئەو کاتە کەلوپەلەکەش وەگەڵ تالآن دەکەوێتەوەو نادرێتە بکوژەکە.

بەڵام لە لای ئیمامی(الشافعي)و ئیمام (أحمد): ئەم حەدیسە (فَتْوى)ی پێغەمبەرەﷺ، واتە: بڕیارێکی بەردەوامی شەرعییە، کەواتە: بکوژەکە بە تەنها کوشتن مافی کەلوپەلی کوژراوەکەی هەیە، هەر چەند ئەمیرەکەش ئەو قسەیە نەکا، بەڵام بەو مەرجە: بکوژەکە خۆی گیانفیدا بکاو ڕووبەڕوو لە حاڵەتی هێرشو تێکەڵبوونی جەنگدا، کافرێکی هێرشکەر بکوژێ: بە ڕمو شمشێرو خەنجەرو کێردو بەردو خنکاندنی بە دەست، واتە: ئەگەر لە دوورەوە چەکی بۆ بهاوێو بیکوژێ، ئەو کاتە مافی کەلوپەلەکەی نیە، کەوابوو: لەم سەردەمەدا ئەگەر بە تفەنگو تۆپو موشەك کافرێك بکوژێ، ئەوە بە مەزهەبی ئیمامی (الشافعي)و ئیمام (أحمد)ش: کەلوپەلەکەی نادرێتێ، واتە: فەرموودەی هەر چوار مەزهەبەکان لەم مەسەلەیەدا تێك دەکەنەوە، والله أعلم. (شرح صحيح مسلم) ب(٧) ل(٣٢٢) و(مغني ابن قدامة) ب(١٠) ل(٤١١-٤١٦) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٧) ل(١٤٣).

**شەشەم: بەکارهێنانی چەکی گەورەو بەهێز لە دژی کافرەکان، هەرچەند خانووەکانیشیان بڕوخێنو بە کۆمەڵیش بکوژرێن،** پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: لە قەڵای (طائِف)دا بە (مَنجَنيق) کافرەکان بەردباران بکرێن. شتێکی ئاشکرایە: کافرەکان هەر چۆنێك بۆیان بگونجێ موسوڵمانان دەکوژن بە چەکی گەورەو کۆمەڵکوژ: وەك ناپاڵمو موشەکو قومبولەی نۆ تۆنیو...هتد، بۆیە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾ التوبة: ٣٦، **ئێوە-ئەی موسوڵمانان- بە کۆو یەکدەنگی کافرەکان**

بکوژن، هەروەك ئەوان بە کۆو یەکدەنگی ئێوە دەکوژن.

ئەمەش بەڵگەیە: دروستە کافرەکان گەمارۆ بدرێن، هەم دروستە چەکی گەورەو بەهێز لە دژی کافرەکان بە کار بهێندرێ، هەرچەند بە کۆمەڵیش بکوژرێنو موسوڵمانو دیلەکانی موسوڵمانەکانیشیان لە ناودا هەبێ، نەوەك کافرەکان بە هۆی بە بارمتەگرتنی موسوڵمانان (جِهاد) بە ئێمەی موسوڵمان ڕابگرن، بەڵام بەگوێرەی توانا خۆمان لە کوشتنی موسوڵمانەکان دەپارێزین.

هەروەها ئەگەر کافرەکان ئافرەتو منداڵیخۆیان لەگەڵدا بون، ئەو کاتەش دروستە: بە هەموو جۆرە چەکێك لێیان بدرێو بەگوێرەی تواناش خۆمان لە کوشتنی ئافرەتو منداڵەکانیان دەپارێزین ﴿عَن الصَّعْبﷺ: سُئِلَ النَّبِيُّﷺ عَنِ الدّارِ مِنَ الْمُشْرِكِينَ يُبَيَّتُونَ فَيُصِيبُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذرارِيِّهِمْ؟ قالَﷺ: هُمْ مِنْهُمْ﴾ رواه الشيخان، **پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا لەبارەی (دارُالْكُفْر): لە شەوێدا هێرشیان دەکرێتە سەر، ئافرەتو منداڵەکانیشیان دەکوژرێن؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوانیش لەوانن.**

هەروەها ئەگەر ئافرەتو منداڵەکانی کافرەکان جەنگ بکەن، ئەو کاتەش دروستە بکوژرێن، چونکە لە غەزای (حُنَيْن) پێغەمبەرﷺ بە لای ئافرەتێکیکوژراودا ڕابردو پێی ناخۆش بوو کوژراوەو فەرمووی: ﴿ما كانَتْ هذِهِ لِتُقاتِلَ﴾ حديث صحيح رواه أبوداود والنسائى، **ئەم ئافرەتە لەوانە نیە جەنگ بکا**—واتە: ئەگەر جەنگ بکا دروستە بکوژرێ— جا فەرمووی: **خۆت بگەینە (خالِد)و پێی بڵێ: ژنو منداڵو خزمەتکار نەکوژێ.** (فتح البارى) ب(٦) ل(١٧٧-١٧٩) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٩) ل(٢٤٠-٢٤٢).

## ﴿کێ ستەمکارە ؟﴾

لەم گوڵبژێرەدا باسی چەکیکۆمەڵکوژمان کرد، جا لەوانەیە کەسێکی سادەو ناتێگەیشتوو، یان نۆکەریکافرەکان بڵێ: ئیسلام بۆچی ئەوها ستەمکارەو ڕێگای بەکارهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ دەدا؟! بەڵام بەخۆی چاوپۆشی لە ستەمی کافرەکانی ڕۆژ ئاوا دەکاو هەر بە ئاغای خۆیشیان دادەنێ، هەرچەند بەچەکی ناوەکیش (هیرۆشیما) بۆردومان بکەنو لە یەك خولەکدا هەشتا هەزار کەس بکوژرنو حەفتاو پێنج هەزاریش بریندار بکەن!، یان کیمابارانی (هەڵەبجە) لە بیر خۆی دەباتەوە: کە حیزبی بەعسی عیراقی—حیزبێکی (علماني)ی (صَلیبي) بوو— گاورێکی دوژمنیئیسلام: کە ناوی (مِیشیل عَفْلَق) بوو، ئەم حیزبەی پێك هێنابوو، لە (٢٧)ی (رَجَب)ی (١٤٠٨) کۆچی، بەرامبەر (١٦)ی ئازاری (١٩٨٨)ی زایینی، بە چەکی کیمیاوی شاری (هەڵەبجە)ی کیمیاباران کردو زیاتر لە (٥٠٠٠) پێنج هەزار موسوڵمانی کوردی شەهید کردنو هەزارانیتریشی بریندار کردن.

جا وەکو ڕۆژی ڕۆناك ئاشکرا بوو: حیزبی بەعس ئەم چەکەی لە کافرەکانی ڕۆژئاوا وەرگرتبوو، بە زۆریش لە (ألمانِیا)، جا لەوانەیە کەسێك بڵێ: حیزبی بەعس لە

ڕووی نەتەوایەتیەوە ئەم کورد کوژیەی کردوە؟ دەڵێین: ڕاستە لایەنی نەتەوایەتیی مەبەست بوو، بەڵام دوژمنایەتیەکی ئاینیشی تێدا بوو، چونکە حیزبی بەعس گاورەکانی(صَلِيبِي) پێکیان هێناوەو هەم گاورەکانی(صَلِيبِي)ی ڕۆژئاواش یارمەتییان دەداو هەم لە (٢٧)ی (رَجَب)ش ئەم تاوانە گەورەیەی بەرامبەر بە کورد ئەنجام دا؟ چونکە لە (٢٧)ی (رَجَب)دا (صلاح الدِّين الأيُّوبِي) ئەوانی شکاندنو لە (قُدْس) دەریکردن، هەروەك لە (الإسْراء وَالمِعْراج)دا ڕوونمان کردەوە.

جا ئەی برای موسوڵمان، ئەگەر ئێمەی کورد چەکی کۆمەڵکوژمان هەبوایە، دوژمنەکانمان نەدەوێران بەو چەکە کۆمەڵکوژە لە ئێمە بدەن، هەروەك پێشینەی کورد گوتویانە: **(مست لە درێشە دەگەڕێتەوە)**. لە کۆتاییدا ئامۆژگاری گەلی کورد دەکەمو دەڵێم: خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿هَا أَنْتُمْ أُولاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلا يُحِبُّونَكُمْ﴾ تا ﴿وَإِذَا خَلَوْا عَضُّوا عَلَيْكُمُ الأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ﴾آل عمران: ١١٩، **ئێوە-ئەی موسوڵمانان-ئەو کافرانەتان خۆش دەوێن، ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێ...تا دەفەرموێ: هەر کاتێك ئێوەی موسوڵمان لە لایان نەبن، ئەوان ئەوەندە ڕقیان لە ئێوەیە: سەرە پەنجەیخۆیان لە ڕقی ئێوە دەگەزن.** جا ئەی کوردی موسوڵمان، ئەوە خوایگەورە ئاگاداری کردیەوە کێ دوژمنی تۆیە!، دەك ئەو چاوە کوێر بێ: کە دوژمنی خۆی نەناسێ.

**حەفتەم: مەبەستی (جهاد) ڕقو قینە نیە لە دژنی کافرەکان، بەڵکو مەبەست موسوڵمانبوونی کافرەکانە**. مەندێك لە (صَحابَة)کانﷺ گوتیان: دوعا لە دژی (ثَقِيف)=دانیشتووانی(طائِف) بکە. بەڵام پێغەمبەرﷺ دوعای بۆ کردنو فەرمووی: ﴿**خودایە هیدایەتیان بدەو بە موسوڵمانی بیانهێنە لای من**﴾. کەوابوو: پێویستە موسوڵمان شوێنکەوتەی پێغەمبەرﷺ بێو دوعای هیدایەتو موسوڵمانبوون بۆ کافرەکان بکا، چونکە مەبەست لە (جِهاد) تەنها هیدایەتدانی خەڵكو چەسپاندنی حوکمیخودایە، جا ئەگەر ئەوەش بە ڕێگایەکی ئاسانو بەڵگە هێنانەوە بێتە جێ، پێویست بە ڕێگایەکیتری سەخت ناکا، هەروەك ئیمام (ابن حجر الهيتمي) لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

**جا ئەوەش بزانە:** بۆیێ خوایگەورە ڕێگای نەدا: پێغەمبەرﷺ (طائِف) ڕزگار بکا، چونکە لەو کاتەی پێغەمبەرﷺ لە (مَكَّة) بوو، لە دوای مردنی (أَبُوطالِب)ی مامی، چووە (طائِف) تاکو یارمەتیی بدەن بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام، بەڵام ئەوان زۆر زۆر بە نامەردانە وەڵامیان داوەو بێڕێزەکانو منداڵەکانیان بەردانە سەر پێغەمبەرﷺ بەردبارانیان کردو برینداریان کرد، جا خوایگەورە (مَلائِكَة)ی کێوەکانی ناردە لای پێغەمبەرﷺ تاکو دوو کێو بە سەر دانیشتووانی (طائف) دابداو بنەبڕیان بکا؟ بەڵام پێغەمبەرﷺ ئەم لەناوبردنەی نەویستو فەرمووی: ﴿**تکام لە خوایە: کەسانێکی خواپەرست لە پشتی ئەو کافرانە پەیدا ببێو هاوبەش بۆ خوا دانەنێن**﴾. هەروەك باسمان کرد.

جا له بەر ئەوەی پێغەمبەرﷺ ﴿رَحْمَةً لِلْعَـــالَمِينَ﴾، نابێ لـه تكايەكەیخۆی پەشـێمان ببێتەوەو بە جەنگكردن كافرەكانی (طائِف) بكوژێو بنەبڕیان بكا، بەڵكو-هەر وەكو ئـەو ڕۆژە تكـای هیدایـەتی بـۆ كـردن- ئـەمڕۆش دوعـای هیدایـەتی بـۆ كـردنو خوایگـەورە دوعایەكەی قبوڵ كردو لە ساڵیداهاتوو لە مانگی ڕەمەزاندا (ثَقِيف)=دانیشتووانی (طائِف) بە خۆشیی‌خۆیان هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ هەموویان موسوڵمان بون، والحمد لله تعالى.
(البداية والنهاية) ب(٣) ل(٤٠) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٤٣٥).

**هەشتەم: (اَلْغُلُول)=خیانەتكردن لە تالاّندا حەرامە**، خوایگـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَمَـــنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ آل عمران: ١٦١، **هەر كەسێك شتێك لـە تالاّن بـە دزی ببـا، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا شتەكە لە سەر ملیخۆی دادەنێ و دێتە مەیدانی مەحشەر.**
هەم پێغەمبەرﷺ لەم غەزایەدا فـەرمووی: ﴿أَدُّوا الْخِياطَ وَالْمِخْيَطَ فَإنَّ الْغُلُولَ عارٌ وَنَـــارٌ وشَنارٌ عَلَى أَهْلِهِ يَوْمَ الْقِيامَةِ﴾حديث حسن رواه الإمام أحمد والبيهقی، **داو و دەرزی بهێننـەوە نـاو كۆمـەڵی تـالاّن، چـونكە شـاردنەوەی بەشـێكی تـالاّن سـزایەكەی لـە ڕۆژی قیامـەت شەرمەزاریو ئاگرو عەیبێكیگەورەیە.** حـەزرەتی (عَقِيـل)ﷺ دەرزیـەكی هـەڵگرتبۆوەو دابویـە ژنەكـەیو گـوتی: جلـەكانیخۆت پێبـدورەوە. جـا كـە گـوێی لـە بانگـەوازیی ئـەم حەدیسە بوو، یەكسەر دەرزیەكەی لە ژنەكەی سەندەوەو خستیەوە ناو تالاّنەكە.

**جا ئەوەش بزانە**: ئەو بەخشیشانەی كە پێغەمبەرﷺ دایـە تـازە موسـوڵمانبووەكان لـە پێنجێكی تالاّنەكە بوو، ئەوەش بەڵگەیە: پێشەوای موسـوڵمانان دەتوانـێ بەشـێكی مـاڵی (بَيْت المال) بداتە ئەو جۆرە كەسانەی تازە موسوڵمان بوینـەو بیروباوەڕیـان بەرامبـەر بـە ئیسلام بێهێزە هەروەك بەشێكی زەكاتیش بۆ ئەو جۆرە كەسانە داندراوە.
هـەروەها ئەگـەر بەرژەوەنـدیی تـێدا بـێ، دروسـتە بەشـێكی (بَيْـت المـال) بـشداتە ئـەو كەسانەی قین لەدڵن بەرامبەر بە ئیسلام، هەروەك پێغەمبەرﷺ سەد وشتری دایـە (صَـفْوان بن أُميّة)و لە ئەنجامدا موسوڵمان بوو، چونكە ماڵی دونیـا بەرامبـەر بـە موسـوڵمانبوون هـیچ نرخێكی نیە، هەروەك پێغەمبەرﷺ لە وتارەكەیدا بۆ (أنْـصار)ی(مَدينَـة) ڕوونـی كـردەوەو پێی ڕاگەیاندن: وشترو مەڕ بەرامبـەر بـە خۆشویـستنی پێغەمبـەرﷺ بـە هـیچ دانانـدرێنو (أنْـصار) بـە هـۆی خۆشویـستنی پێغەمبـەرﷺ یارمەتیدانیئیـسلام ئـەو پلـە بـەرزەیان وەدەست هێناوە، نەك بە هۆی ماڵی دونیا، ئەو خەڵكە بە هێزی ماڵی دونیا ئیمانیـان بـەهێز دەكرێو دەكرێنە موسوڵمان، بەلاّم (أنْصار) بە یارمەتیدانی پێغەمبەریخواﷺ ئیمانیان ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندا بوو رضي الله عليهم أجمعين. (فتح الباري) ب(٨) ل(٦٠و٦٩) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(١٧٢).

**نۆیەم: پێناسەو بنچینەو نیشانەكانی (خَوارِج)=(وَهابِي)=(سَلَفِي):**
لـەم غەزایـەی (حُنَـيْن)دا پێغەمبـەرﷺ شـتێكی بـەش دەكـرد، جـا (ذُوالْخُوَيْـصِرَة)

گوتی: ئەی پێغەمبەریخوا لە خوا بترسە، داپەروەرانە ئەم شتە بەش بکە...هتد.

**پێناسە:** (خَوارِج) گرۆهێکی ئاژاوەچیو گومرابووی (اْلبِدْعَة وَالضَّلالَة)ن، واتە: لە حەفتاو دوو گرۆهەکەی گومرابوو دەژمێردرێن. بنچینەی (خَوارِج) دەگەڕێتەوە سەر پیاوێکی بێئەدەب کە لە سەردەمیپێغەمبەرداﷺ بوو، ناوی (ذُوالْخُوَيْصِرَة) بوو، لە غەزای (حُنَيْن)دا بێئەدەبیی بەرامبەر بە پێغەمبەرﷺ کرد، جا لەم حەدیسەدا بێئەدەبیو پاشەڕۆژی ئەم پیاوە ڕوون کراوەتەوە: ﴿عَنْ أَبِیسَعِيد الْخُدْرِيِّ ﷺ: بَيْنَما نَحْنُ عِنْدَ رَسُول اللهﷺ وَهُوَ يَقْسِمُ قَسْمًا، أَتاهُ ذُوالْخُوَيْصِرَة–وَفِی رِوايَة–: فَقام رَجُلٌ غائِرُ الْعَيْنَيْنِ مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْن ناشِزُ الْجَبْهَةِ كَثُّ اللِّحْيَةِ مَحْلُوقُ الرَّأْسِ مَشَمَّرُ اْلإِزار، فقالَ: يا رَسُولَ الله إتَّقِ الله– وَفِی رِوايَة–: إعْدِلْ. فَقالَ رَسُولُ اللهﷺ: وَيْلَكَ مَنْ يَعْدِلُ إذا لَمْ أَعْدِلْ؟! ثُمَّ أَدْبَرَ الرَّجُلُ، فَقالَ عُمَرُ ﷺ–وَفِی رِوايَة–: خالِدٌ ﷺ: يا رَسُولَ الله أَلا أَضْرِبُ عُنُقَهُ؟ فَقالَ رَسُولُ اللهﷺ: دَعْهُ، إنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذا قَوْمٌ يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلاتَهُ إلَی صَلاتِهِمْ، يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ لايُجاوِزُ حَناجِرَهُمْ، يَقْتُلُونَ أَهْلَ اْلإِسْلامِ وَيَدَعُونَ أَهْلَ اْلأَوْثانِ، يَمْرُقُونَ مِنَ اْلإِسْلامِ كَما يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ عادٍ﴾ رواه البخاري ومسلم بألفاظ متعددة، لە غەزای (حُنَيْن) پێغەمبەرﷺ شتێکی بەش دەکرد، جا (ذُوالْخُوَيْصِرَة)= پیاوێکی چاو قوپاوی کوڵمە زەقی نێوچاوان بەرزی ڕیش پەڕچو پرچ سەر تاشراوی دامێن بڵندکراو، گوتی: ئەی پێغەمبەریخوا لە خوا بترسە، داپەروەرانە ئەم شتە بەش بکە!. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ( وەیل بۆ تۆ، کێ دادپەروەرە ئەگەر من دادپەروەر نەبم؟!). ئینجا پیاوەکە ڕۆیشت، جا هەر یەك لە ئیمام (عُمَر)و ئەمیر (خالد)رضی‌الله عنهما فەرموویان: ئەی پێغەمبەریخواﷺ بۆ لە ملی نەدەمو بیکوژم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وازی لێبێنە، چونکە لە بنچینەی مەزهەبی ئەم پیاوە کۆمەڵێك دەردەچن: ئێوە نوێژیخۆتان بەرامبەر نوێژیئەوان بە کەم دادەنێن، ئەوان قورئان دەخوێننو لە گەردنیان تێناپەڕێ، موسوڵمانان دەکوژنو واز لە کافران دەهێنن،–بە هۆی توندو تیژی– لە کۆمەڵیئیسلام دەردەچن هەروەك تیر لە نێچیر دەردەچێ، ئەگەر من بمێنم وەکو گەلی (عاد) لەناویان دەبەم. (شرح صحيح مسلم ب (٥) ل(١٦–٢٢) و(فتح البارى) ب(١٢) ل(٣٦٢–٣٧٢).

کەواتە: هەر لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ ئەم بیرۆکە پیسەی (خَوارِج) پەیدا بووە، ئینجا لە سەردەمی ئیمام (عُمَر)داﷺ (خَوارِج) ویستیان بیرۆکەیخۆیان ئاشکرا بکەنو یەکێکیان–کە ناوی (صَبِيغ) بوو– هاتە (مَدِينَة)و پرسیاری لە (مُتَشابِهات الْقُرآن) دەکرد، جا ئیمام (عُمَر)ﷺ گرتیو ئەوەندەی لێدا ئەوەندەی لێدا: تا سەری شکاندو خوێنی پێدا هاتە خوارەوە، جا بەم لێدانە (صَبِيغ) تەمبێ بوو و گوتی: بەسە–ئەی ئەمیری

ئیمانداران– وَاللهِ ئەو بیرۆکەی لە سەرمدا بوو ڕۆیشت. ئا بەم جۆرە: (خَـوارِج) لـە ترسـی ئیمام (عمر)ﷺ هیچیان بۆ نەکرا.

ئینجا لـە سـەردەمی (خِلافَـة)ی ئیمـام (عَلـي)داﷺ خۆیـان ڕێـك خـستو لـە دژی ئیمـام (عَلِي)ﷺ بەرەیەکی چەکدارییان پێك هێناو ئیمام (عَلِي)و کۆمەڵی (صَحابَة)کانیانﷺ بـە کافر دانانو ناویان لە خۆیان نا: (شُراة)، واتە: بەهەشت کڕ، یان خۆفرۆش بە خوایگەورە. بەڵام موسوڵمانان ناویان لێنان: (خَوارِج)، واتە: دەرچووەکان لە کۆمەڵی (السُّنَّة وَالْجَماعَة). ئینجا (خَوارِج) دروشمی (لاحُكْمَ إلاّ لِلّه)یان دەگوت، واتە: بڕیاردان تەنها مافیخوایە. جا ئیمام (علی)ﷺ وەڵامی دانەوەو فەرمووی: **(کَلِمَةُ حَقٍّ أُرِيدَ بِها باطِلٌ) ئەمە وشـەیەکی ڕاسـتە، بـەڵام مەبەسـت بـەم وشـەیە کارێکیناڕەوایـە. ئینجـا فـەرمووی: ئێـوە سـێ مافتان لە سەر ئێمە هەنە:**

**یەکـــەم: لـە مـزگەوتەکان قەدەغـەتان ناکـەین کـە زیکریخـوای تێیانـدا بکـەن.**

**دووەم: لـە دەستکەوتووەکانیئیـسلام بێبەشـتان ناکـەین تـا لەگـەڵ ئێمـەدا بـن.**

**سێیەم: جـەنگتان لەگەڵ ناکەین تا ئێوە جـەنگمان لەگەڵ نەکەن.**

جا لە ئەنجامدا کۆمەڵێکی (خَوارِج) بڕیاریان دا: ئیمام (علی)ﷺ بکـوژن، ئینجـا لـە پـێش دەرگەی ماڵیخۆی، لـە کـاتی نوێـژی سـبەینەی ڕۆژی جومعـەی (١٧)ی مـانگی ڕەمـەزانی ساڵی (٤٠)ی کۆچی، (عبدالرحمن بن مُلْجَم)ی (خَوارِج)ی ڕووڕەش، شمشێرێکی لـە سـەری ئیمام (عَلِي) داﷺ، جا بەم برینە سەختە لە ڕۆژی یەکشەممەدا وەفاتی کرد، إنا لله وإنا إليه راجعـون. (تفـسیرالقرطبي) آل عمـران: (٧) والـذّاريات: (١) و(فـتح البـاری) ب (١٢) ل (٣٥٤–٣٥٧) و(الخلفـاء الراشدون) ل (٤٣٠)و (٤٤٢)و (٤٤٥).

## ﴿( خَوارِج )ەکانی ( وَهابِي )=( سَلَفِي )﴾

بە شەهیدکردنی ئیمام (عَلِي)ﷺ، (خَوارِج) نەیانتوانی دەسەڵات وەربگرن، بەڵام لـە دژی دەوڵەتیئیـسلام هـەر خـەریکی ئـاژاوە بـون، جـا کـاتی وا دەهـات هـەر ناویـان نەئـەما، جا لە سەرەتای سەدەی دوانزەمی کۆچیدا جارێکیتر سەریان هەڵداوەو بە سەرکردایەتی (مُحَمَّد بن عَبْـدالْوَهّاب) هاتنـەوە مەیـدانی ئـاژاوەو ململانـە لـە دژی دەوڵەتیئیـسلام، بـەو جۆرەی باسـی دەکـەین، جـا ئـەوەش بزانـە: ئـەم جـارە (خَـوارِج) ناویـان لـە خۆیـان نـا: (المُوَحِّدُون)، واتە: یەکخواپەرست. بەڵام موسوڵمانان ناویان لێنان: (وَهابي)، واتە بە ناوی (عبدالوَهّاب)ی باوکی سەرکردەکەیان ناویان دەهێنان.

دامەزرێنەری ئەم گرۆهە گومڕابووە–ناوی (مُحَمَّد بن عَبْدالْوَهّاب) بوو– لـە سـاڵی (١١١١)ی کۆچی لە دایك بوو، لە ساڵی (١٢٠٦)دا مرد، یەکەم جار قوتابیی ئایینی بوو، لە (مَدِينَة)ی پیرۆز دەیخوێند، بـەڵام هـەر لـەوێ گومڕاییـەکانیخۆی ئاشـکرا دەکـردن، تـا وای لێهـات: مامۆستایەکانی خۆیو (الشّيخ سُلَيْمان)ی برایخۆی ڕەدیان دەداوەو کتێبیان لـە دژی وی

دانان، ناچار ڕووی کردە لای ڕۆژهەڵاتی (مَكَّة)و (مَدِينَة)، لەوێ پەیوەندیی بەست: لەگەڵ (مُحَمَّد بن سُعُود) ئەمیری (الدِّرْعِيَّة)–کە لە هۆزەکەی (مُسَيْلِمَةالْكَذّاب) بوو– تاکو یارمەتیی بدا بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازیەکەی، کە دەیگوت: (**ئەم خەڵکە ماوەی شەشسەد ساڵە کافرەو پێویستە بهێندرێنەوە سەر یەکخواپەرستی**).

ئینجا کە (مُحَمَّد بن سُعُود) مرد، (عَبْدالْعَزِيز)ی کوڕی لە جێی دانیشتو یارمەتیی دەدا، لە لایەکیتریش: دەوڵەتی (إنگلیز)یکافر، دەستی کرد بە یارمەتیدانی (وَهابِي)یەکان لە ڕێگەی ئەم (عبدالعزیز بن محمد بن سُعُود)ەوە، ئەوەندە چەكو ماڵی بۆ ناردن تا وایان لێهات کەوتنە جەنگ لە دژی (خَلِيفَة)یئیسلام، بە پشتیوانی (إنگلیز) ڕووبەڕووی لەشکری دەوڵەتیئیسلام بونەوەو بۆ بەرژەوەندی (إنگلیز) چەند شارێکی ئیسلامیان داگیر کرد: وەکو (مَكَّة)و (مَدِينَة)و (كُوَيْت)...هتد. بڕوانە (كيف هدمت الخلافة) ل (١٣و١٤) و(الفتوحات الإسلامية) ل (٢٥٧و٢٥٨) و(الدرر السنية) ل (٣٩ تا٥٤).

ئینجا لە سەرەتای سەدەی پانزەهەمی کۆچیدا دیسان (خَوارِج) سەریان هەڵداوەو هاتنەوە مەیدانی ئاژاوەو ململانە: بۆ تێکدانی ڕیزی موسوڵمانانو بۆ مراندنی هەستی (جِهاد) لە دڵی موسوڵماناندا، جا ئەم جارەش ناویان لە خۆیان نا: (سَلَفِي)، واتە: شوێنکەوتەی (سَلَف)، تاکو ناوی (وَهابِي)یان لە سەر لابچێو خەڵك متمانەیان پێبکا، بەڵام لە ڕاستیدا (سَلَفِيّة)کانی ئەمڕۆش هەر (وَهابِيَة)کانی دوێنێو (خَوارِج)ی پێرێنو دوژمنترین کەسن لەگەڵ (سَلَف)ی (أَهْلِ السُّنَّة وَالْجَماعَة)! چونکە هەر ئەوانەن ناوی هەرچوار ئیمامەکەی (سَلَف)–(أبوحَنيفَة)و (مالك)و (الشافعي)و (أحْمَد)– بە سوکی دەهێننو دەڵێن: ئەو زانایانە وەکو (قەشە)و (مالم)ی جولەکەو گاورەکاننو شوێنکەوتەکانیشیان وەکو جولەکەو گاورەکانن. هەر ئەوانەن دەرس بە گەنجەکانمان دەڵێنو لە ڕێبازی (أَهْلِ السُّنَّة وَالْجَماعَة) لایاندەدەنو پێیان دەڵێن: ئەو زانایانە بە کتێبە پەڕ زەردەکان پەروەردە کراونو لە ئیسلام تێنەگەیشتون. هەر ئەوانەن دەڵێن: شوێنکەوتەی ئەم چوار مەزهەبانە گومڕا بوینەو لە (عَقِيدة) تێنەگەیشتون. بەم جۆرە (سَلَفِي)یەکانی (خَوارِج)و ئاژاوەچی، بە ناوی ئیسلام لە ئیسلام دەدەنو ڕیزی موسوڵمانان تێك دەدەن.

## ﴿ نیشانەکانی ( خَوارِج )=( وَهابِي )=( سَلَفِي )﴾

ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، تەبیعەتی (خَوارِج)= (وَهابِيَة)کان= (سَلَفِيّة)کان ئەوەیە: پەیدا دەبنو دەبڕێنەوە، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿يَنْشَأُ نَشْأٌ يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ لايُجَاوِزُ تَراقِيَهُمْ، كُلَّما خَرَجَ قَرْنٌ قُطِعَ، قالَ ابْنُ عُمَرَ رضیالله عنهما: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَقُولُ: كُلَّما خَرَجَ قَرْنٌ قُطِعَ أَكْثَرَ مِنْ عِشْرِينَ مَرَّةً، حَتَّى يَخْرُجَ فِي عِراضِهِمُ الدَّجَّالُ﴾ رواه ابن ماجه بسند صَحِيح، **چینە خەڵكێك پەیدا دەبن: قوڕئان دەخوێننو لە گەردەنیان تێناپەڕێ، هەر چینێکیان دەردەچێ، دەبڕێندرێتەوە–زیاتر لە بیست جار**

وەهـای فـەرموو– تـا لـە مەیـدانی ئەوانـدا (دَجَّـال) دەردەچـێ. واتــە: بــە هــۆی ئاژاوەگێڕیو پەرتەوازەیی، ئەوان دەبنە ڕێخۆشکەری (دَجَّال).
جا ئاشکراترین نیشانەی (خَوارِج)=(وَهابِيّ)=(سَلَفِيّ) ئەمەیە:–وەکـو (صَـبِيغ)یڕابـردوو– بەردەوام گفتوگۆ لە (مُتَشابِهات الْقُرآن وَالْحَديث) دەکەنو بـە دەرس دەیـانخوێنن: وەکـو (اِسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ)و (خَلَقْتُ بِيَدَيَّ)و (يَـدُ اللهِ فَـوْقَ أَيْـدِيهِمْ)و (وَيَبْقَـى وَجْـهُ رَبِّـكَ)...هتـد، تەفسیری ئەم جـۆرە ئایـەتو حەدیـسانە بـە هـەواو هەوەسـیخۆیان دەکـەنو دەیانکەنـە بەڵگەیخۆیان بۆ بڵاوکردنەوەی (عَـقِيدَة)ی (مُجَـسِّمَة)و دەڵێن: خوا لاشەیە، وێنـەی هەیـە، ڕووی هەیە، چاوی هەیە، دەستی هەیە، تەنیشتی هەیە، پێی هەیە، ئەنگوستی هەیە، لـە سەر (عَرْش) جێگیرە...تا کۆتایی ئەم جۆرە قسانەی لە جولەکەکان وەرگیراون.
لەبارەی ئەم نیشانەیە، خوایگـەورە دەفـەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِى أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْـهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللهُ، وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُـلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُولُوا الأَلْبَابِ﴾ آل عمران:٧، **خوایگەورە قوڕئانی بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە: هەندێك لە ئایەتەکانی ئەم قوڕئانە واتەیان ئاشکرایەو ئەوان مەبەستی بنەڕەتی قوڕئانن–چونکە بۆ حەڕامو حەڵاڵو کاروباریتری ژیان هـاتون– هەنـدێك ئایەتیتریش (مُتَشابِهات)ن، چونکە وشـەکەی بە وشـەیەکیتر ئەچیو واتەکەشی جیایەو ئاشکرا نیە، جا ئەو کەسانەی گـومڕا بوینـەو لە ڕاستی لایانداوە–وەکو (خَـوارِج)– بـە شـوێن ئایـەتی (مُتَـشابِهات)دا ئەگـەڕێنو خۆیـان بەوانـەوە خـەریك ئەکەنو ئەیانکەنە بەڵگەی خۆیان: تاکو خەڵکی گومڕا بکەن، بە هەوەسیخۆیان مانای لێئەدەنەوە، لە کاتێکدا هیچ کەسێك مەبەستی ئەم وێکچووانە نازانێ تەنها خوا ئەیزانێ، جا ئەوانەی لە زانستدا ڕووچوون ئـەڵێن: باوەڕمـان بـەم وێـکچووانە هەیە: گشتی فەرموودەی خوایە، کەس ئەو ئامۆژگارییە وەرناگرێ، تەنها خاوەن عەقڵەکان وەریدەگرن.**
﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَاللهُ عَنهـا قَالَتْ: تَلاَ رَسُولُ اللهِﷺ هَذِهِ الآيَةَ–آل عمران:٧– فَقَالَ: إِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ، فَأُولَئِكَ الَّذِينَ سَمَّى اللهُ، فَاحْذَرُوهُمْ﴾رواه الإمام أحمد والشيخان، **حەزرەتی (عَائِـشَة)رَضِـيَاللهُ عَنهـا فـەرموی: پێغەمبـەرﷺ ئـەو ئایەتـەی–ڕابـردووی آل عمـران:٧ی– خوێندەوە، ئینجا فەرمووی: هەر کاتێك ئەو کەسانەتان دیتن کە بە دوای ئایـەتی (مُتَشابِهات)دا ئەگەڕێن، ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا لەم ئایەتەدا بە خراپـە نـاوی هێناون، ئێوە خۆتان لەم جۆرە کەسانە بپارێزنو لێیان دور کەونەوە.**
ئیمـام (أَحْمَـد)و ئیمـامی(القـرطبي)و ئیمـام (ابـن کـثیر) ئیمـام (ابـن حَجَرالْعَـسْقَلاَنِي)

گێڕاویەتیانەوە: مەبەستی ئەم ئایەتە (خَوارِج)ن. جا ئەم ئایەتە باسی ئەو کەسانەی بە خراپە کردوە: کە بە شوێن (مُتَشابِهات)دا ئەگەڕێن، باسی ئەو کەسانەشی بە چاکە کردوە: کە زانستەکە (تَفْوِیض) ئەکەن و ئەیدەنە پاڵ زانستیخوا.

ئینجا ئیمام (ابـن حَجَرالْعَسْقَلاَنِی) فەرمویەتی: یەکەمجار شوێنکەوتنی (مُتَشَابِه) لە جولەکەکانەوە ئاشکرا بوو، ئینجا یەکەم جاریش لە ئیسلامدا لە ناو (خَوارِج)دا ئاشکرا بوو، تا حەزرەتی(ابـن عَبّاس)ش رضي‌الله عنهما تەفسیری ئەم ئایەتەی بە (خَوارِج) کردوەو چیرۆکەکەی ئیمام (عُمَر)ﷺو (صَبِیغ)ش ئیمامی(الدّارِمِي)و کەسانیتر گێڕاویەتیانەوە.
(تفسیرالقرطبي) و(تفسیر ابن کثیر) آل عمران: (٧) و(فتح الباري) ب(٨) ل(٢٦٤-٢٦٦).

*ئەی موسوڵمانی بەڕێزدار، ئەوا خواو پێغەمبەرﷺ ئەو گومڕابووانەی پێناساندی، خۆت لەوان بپارێزە، جا لە [ڕوونکردنەوەی(العقیدةالطحاویة)]و لە [گوڵزاری ئیسلام]دا چەند نیشانەیەکیتری (خَوارِج)م نوسیون، بیانخوێنەوە تاکو چاکتر بیانناسیو لێیان دور کەویەوەو تەفرەت نەدەن و لە ڕێبازی (أَهْل السُّنَّة وَالْجَماعَة) لاتنەدەن.*

**دەیەم: بڕیاری شیرخواردن:** پێغەمبەرﷺ پەشتە ماڵەکەی بۆ (شَیْماء)ی خوشکە شیریەکەیخۆی دانا...هتد، ئەمەش بەڵگەیە: هەروەك ڕێزلێنانی خزمەکانی نەژادی پێویستە، ئەوهاش ڕێزلێنانی خزمەکانی شیری پێویستە، هەم بە بەڵگەی ئەم حەدیسەش: ﴿عن أَبِیالطُّفَیْلﷺ: رَأَیْتُ النَّبِيَّﷺ یَقْسِمُ لَحْماً بالْجِعْرانَةِ، إِذْ أَقْبَلَتْ امْرَأَةٌ حَتّى دَنَتْ مِنَ النَّبِيِّﷺ فَقامَ إِلَیْها فَبَسَطَ لَها رِدائَهُ فَجَلَسَتْ عَلَیْهِ، فَقُلْتُ مَنْ هِيَ؟ فَقالُوا: هَذِهِ أُمُّهُ الَّتِي أَرْضَعَتْهُ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، پێغەمبەرﷺ لە (الْجِعْرانَة) گۆشتێکی بەش دەکرد، لەو کاتدا ئافرەتێك هات لە پێغەمبەرﷺ نزیك بۆوەو پێغەمەریشﷺ لە بەری هەڵساو پەشتەماڵەکەیخۆی بۆ ڕاخستو لە سەری دانیشت، گوتم: ئەوە کێیە؟ گوتیان: ئەمە ئەو دایکەیەتی کە شیری داوەتێ. واتە: (حَلِیمَةالسَّعْدِیَّة)رضي الله عنها.

جا بزانە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿یَحْرُمُ مِنَ الرِّضاعِ ما یَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ﴾ رواه الشیخان، ئەو ئافرەتانەی بە خزمایەتی حەرام دەبن، بە شیرخواردنیش حەرام دەبن.

**ڕوونکردنەوەی ئەم حەدیسە، بەم شێوەیە:** خودی شیرخۆرەکەو منداڵەکانی شیرخۆرەکە- نێر و مێ- هەر هەموویان دەبنە کوڕو کیژو نەوەی دایکە شیریەکەو باوکە شیریەکە، ژنی شیرخۆرەکەش دەبێتە ژنی کوڕی باوکە شیریەکە. دایکە شیریەکەو باوکە شیریەکەش دەبنە دایكو باوکی شیرخۆرەکە، دایكو باوکی دایکە شیریەکەو باوکە شیریەکەش دەبنە داپیرەو باپیرەی شیرخۆرەکە. خوشكو برایەکانی دایکە شیریەکەو باوکە شیریەکەش دەبنە خاڵو مامو پوری شیرخۆرەکە. کیژو کوڕەکانی دایکە شیریکەو باوکە شیریەکەش دەبنە خوشكو برای شیرخۆرەکە، جیاوازی نیە ئەم کیژو کوڕانە: لەم دایكو باوکە بن، یان دایکیان جیابێ، یان باوکیان جیا بێ:

**بۆ وێنە:** ئەگەر دایکە شیریەکە نۆ مێردی کردبن، لـە هـەر مێردێك کیـژو کـوڕی هـەبن، هەموویان دەبنە خوشكو برای شیرخۆرەکە، هەروەها: ئەگەر باوکە شیریەکەش چوار ژن، یان زیاتری هێنـابن، لـە هـەر ژنێـك کیـژو کـوری هـەبن، هـەموویان دەبنـە خوشـكو بـرای شیرخۆرەکە، ئیتر بەم جۆرە بیر لەوانیتریش بکەوە.

**دیسان بزانە:** مەرجە: تەمەنی شیرخۆرەکە دوو ساڵ تەواو نەبوبێ، هەروەها بە مەزهەبی ئیمامی(الشافعی) مەرجە: پێنج جار شیر لە ئافرەتەکە بخوا، بەڵام تێرخواردن مەرج نیـە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ﴿خَمْسُ رَضَــعاتٍ مَعْلُومــاتٍ يُحَــرِّمْنَ﴾ رواه مسلم، **پێـنج جار شیرخواردنی زاندراو حەرام دەکەن.**

بەڵام هەرسێك ئیمامەکەیترو زۆرینەی زانایـانی ئیـسلام فەرموویانـە: بـە تـەنها یـەك جـار شیرخورادن حەرامی شیرخواردن جێگیر دەبێ.

جا هەر چەند لە ڕووی بەڵگەوە مەزهەبی ئیمامی(الشافعي) بەهێزە، بەڵام سێ مەزهەبەکانیتر پارێزکارییان تێدایـە، کـەوابوو: لـەم مەسـەلەیەدا وا باشـە: موسـوڵمان ڕەفتـار بـەو سـێ مەزهەبانە بکا، تاکو لە جیاوازی فـەرموودەکان ڕزگـاری ببـێ، زانایـانی مەزهـەبی ئیمـامی (الشافعی) ئەم پاریزکاریەیان لە م مەسەلەیەدا بە (وَرْع)=خۆپاراستن داناوە، والله أعلم.

**جا بزانە:** ئەم حەڕامیـەی شـیرخواردن: تـەنها بـۆ مـارەکردنو تەماشـاکردنو دەسـتنوێژ نەشکانو لەگەڵدابوونی بە تەنهایە، واتە: میرات لە یـەکتری نـاگرن بـژێوی یـەکتریان لـە سـەر یـەکتری واجـب نیـە. (شـرح صـحيح مـسلم) ب(٦) ل(٢٠٢و٢١٢و٢١٤) و(فـتح البـاري) ب(٩) ل(١٧٧و١٨٣و١٩١) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٨) ل(٢٩٠).



**یازدەهـەم: پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: هـەموو ژنو منداڵـەکانتان بـەش کـراوە...هتـد،** ئەمەش بەڵگەیە: کە ژنو منداڵی کافرەکانی بنەڕەتی بە تەنها دیلکردن دەبنە کۆیلەو وەکو ماڵی کافرەکان بە سەر جەنگاوەرە موسوڵمانەکاندا بەش دەکرێن.

**جا بزانە:** بە فەرموودەیەکی بێهێزی ئیمامی(الشافعي)و بە مەزهەبی ئیمـام (أحمـد): بـە خودی دەست بەسەرداگرتن، تاڵانەکە دەبێـە ملکـی جـەنگاوەرەکان، بـەڵام بـە مەزهـەبی ئیمام (أبوحَنِيفة)و ئیمام (مالِك)و بە فەرموودە بەهێزەکـەی ئیمـامی(الـشافعي): بـەخودی دەست بە سـەرداگرتنن تاڵانەکـە نابێتـە ملکـی جـەنگاوەرەکان، بـەڵکو بـە بەشـکردن لـە نێوانیاندا دەبێتە ملکی ئەوان، بۆیێ پێغەمبەرﷺ تکـای لـە (صَـحابَة)کـانﷺ کـرد: ژنو منداڵـەکانی (هَـوازِن) بـە خـۆڕایی بدەنـەوە، ئەوانـەش کـە بـە خـۆرایی نەیاندانـەوە، پێغەمبـەرﷺ بـە قـەرز لێیـانی کڕینـەوەو دانیـەوە کەسـەکانیان، واتـە: چـونکە لـە دوای بەشکردنەکە وەفدەکەی (هَوازِن) هاتن. (فتح الباري) ب(٦) ل(١٨٤و٢٩٢) و(مغـني ابـن قُدامَـة) ب(١٠) ل(٣٩٣و٤٥٨) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٩) ل(٢٦١).

**دوانزهەم: چەند (مُعْجِزَة)یـەکی غـەزای (حُنَـيْن): ١**–پڕژانـدنی وردە بـەردەکان

بەرەو چاوی کافرەکان‌و پرخۆڵبوونی چاوەکانیان. ٢-(انْهَزَمُوا وَرَبِّ مُحَمَّدٍﷺ) هەڵاتن سوێندم بە خوای (مُحَمَّد)ﷺ، واتە پێش هەڵاتنی کافرەکان ئەوەای فەرموو. ٣-تفکردنە برینەکەی ئەمیر (خالد)رضي الله عنهو چاك بوونەوەی. ٤-(شَيْبَةُالْحَجَبِي) گوتویەتی: ئەوەندە ڕقم لە پێغەمبەرﷺ دەبۆوە، دەمگوت: ئەگەر هەموو عەرەب‌و عەجەم شوێن (مُحَمَّد)ﷺ بکەون من شوێنی ناکەوم. جا لە غەزای (حُنَيْن) وەگەڵ لەشکری ئیسلام کەوتم لە دڵمدا گوتم: بەڵکی لە کاتی تێکەڵبوونی جەنگ دەرفەتێکم دەست بکەوێ‌و (مُحَمَّد)ﷺ بکوژم لە تۆڵەی باوکم‌و مامم-کە لە غەزای (بَدْر) بە دەستی (حَمْزَة)و (عَلِي) کوژرابون- جا لە کاتێکدا دیتم پێغەمبەرﷺ لە هێسترەکەی دابەزی، منیش شمشێرەکەم هەڵێنا لێی بدەم، یەکسەر بڵێسەیەکی ئاگر وەکو بروسك لە نێوان من‌و ئەودا بەرز بۆوەو ترسام بمسوتێنێ، ناچار پشتاوپشت کشامەوە، جا پێغەمبەرﷺ ئاوڕی لێدامەوەو بە زەردەخەنەوە فەرمووی: لێم نزیك ببەوە. جا دەستی بە سەر سینگمدا هێناو فەرمووی: ﴿اَللَّهُمَّ أَذْهِبْ عَنْهُ الشَّيْطَانَ﴾ خودایە شەیتانی لێبڕوێنە. لە (روایَة)یێکی‌تردا: (شَيْبَة) گوتی: من بە موسوڵمانی نەچومە غەزای (حُنَيْن)، کاتێك لە (حُنَيْن) لەگەڵ پێغەمبەرﷺ ڕاوەستا بوم‌و گوتم: یارَسُولَ الله من هەندێك ئەسپی بازوو دەبینم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: جگە لە کافرەکان کەسی‌تر ئەم ئەسپانە نابینێ-واتە: چونکە ئەوانە ئەسپی (مَلائِکَة)ی غەزانە-، جا سێ جار دەستی لە سینگم دا و دوعای موسوڵمانبوونی بۆ کردم‌و موسوڵمان بوم‌و پێغەمبەرﷺ لە چاو و گوێم لە گشت کەسێکی‌تر خۆشترم دەویا. (البداية والنهاية ب(٣) ل(١٧) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(١٥٩و١٦٣).

*** *** ***

## ﴿ لە دایکبوونی (إِبْرَاهِيم)ی کوڕی پێغەمبەرﷺ﴾

پێشەکی بزانە: لە سەرەتای ساڵی هەشتەمی کۆچیدا حەزرەتی(زَيْنَب)ی کیژی پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، جا ئەوەش بزانە: لە باسی نامە ناردنەکانی پێغەمبەرﷺ، ئەوە باس کرا: کە پاشای (مِصْر) کەنیزەیەکی بە دیاری بۆ پێغەمبەرﷺ نارد، ناوی (مارِيَة) -رضي الله عنها- بوو، جا لەم (مارِيَة)یە خوایگەورە کوڕێکی دایە پێغەمبەرﷺ، لە مانگی (ذِیالحِجَّة)ی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا ئەم کوڕە لە دایك بوو، پێغەمبەرﷺ زۆر پێی دڵخۆش بوو و فەرمووی: ﴿وُلِدَ لِيَ اللَّيْلَةَ غُلاَمٌ فَسَمَّيْتُهُ بِاسْمِ أَبِي إِبْـــرَاهِيمﷺ﴾ رواه مسلم، ئەمشەو کوڕێکم بۆ بوو، بە ناوی باوکم (إِبْراهِيم) پێغەمبەرﷺ ناوم لێنا.

جا پێغەمبەرﷺ (إِبراهِيم)ی لە لای (أُمُّ بَرْدَة)=(أُمُّ سَيْف)ی ژنەکەی (أَبِي سَيْف)ی ئاسنگر دانا، تاکو شیری بداتێ، ئینجا لە تەمەنی شانزە مانگیدا لە ڕۆژی سێ‌شەممەی دەی (رَبِيع الأوَّل)ی ساڵی دەیەمی کۆچی لە ماڵی شیردەرەکە وەفاتی کرد.

جا كە (إبراهيم) لە حاڵەتیمردندا بوو، پێغەمبەرﷺ چووە ماڵی ئاسنگرەكەو (إبراهیم)ی وەرگرتو لە ناو كۆشیخۆی داناو فرمێسكی بە چاوە پیرۆزەكاندا هاتنە خوارەوەو فەرمووی: ﴿إنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ وَلا نَقُولُ إلاّ مَا يَرْضَى رَبُّنَا وَإنَّا بِفِراقِكَ يا إِبْراهِيمُ لَمَحْزُونُونَ﴾ رواه الشيخان، چاو فرمێسك دەڕژێنیو دڵ غەمبار دەبێ، هیچ قسەیەكی ناشەرعی ناڵێین، تەنها ئەو قسەیە نەبێ كە خوا ڕازی دەبێ، ئێمە بە جیابوونەوەت–ئەی (إبْراهیم)–غەمبارین.

ئینجا كە (إبراهیم) گیانی دەرچوو، حەزرەتی(الفَضل) كوڕی ئیمام (العَبّاس)رضیالله عنهما شوشتیو پێغەمبەرﷺ نوێژی جەنازەی لە سەركردو لە (البَقِیع)دا ناشتیان.

جا بزانە: جا لەو ڕۆژەی (إبراهیم) وەفاتی كرد، ڕۆژ گیرا، كەسانێكیش گوتیان: بە هۆی مردنی (إبراهیم) ڕۆژ گیراوە!، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آياتِ اللهِ تَعالَى لا يَنْكَسِفانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلا لِحَيَاتِهِ، فَإذا رَأَيْتُمُوهُما فَصَلُّوا وَادْعُوا اللهَ حَتّى يُكْشَفَ مابِكُمْ﴾ رواه الشيخان، ڕۆژ و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەكانیخوا، نە لە بەر مردنو نە لە بەر ژیانی هیچ كەسێك ناگیرێن، جا هەر كاتێك دیتان یەكێك لەم دووانە گیران، ئێوە نوێژ بكەنو دوعا بكەن، تا ئەو گیرانە لادەچێ. (فتح الباري) ب(٢) ل(٦٧٨)، ب(٣) ل(١٦٤و٢٢١–٢٢٣) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٤٣٣–٤٣٦).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەكەم: مردنی منداڵی ساوا و كۆرپەی لەبارچوو، كە (إبْراهِیم)ی كوڕی پێغەمبەرﷺ گیانی دەرچوو، شوشتیان، ئینجا پێغەمبەرﷺ نوێژیجەنازەی لە سەر كرد.**

١–**منداڵی ساوا**، بە (إجْماع)ی زانایانیئیسلام واجبە: منداڵی ساوا–وەكو مرۆڤیگەورە– بشورێو كفن بكرێو نوێژیجەنازەی لە سەر بكرێو بنێژرێ، هەروەها میرات دەگرێو میراتیشی لێدەگیرێ، هەرچەند تەنها یەك خولەكیش ژیابێ.

جا بزانە: لە هەندێك (روایَة)ی حەدیسەكەیڕابردوودا هاتووە: پێغەمبەرﷺ نوێژی (جَنازَة)ی لە سەر (إبْراهیم) نەكردوە. مەبەستی ئەم (روایَة)ە ئەمەیە: بەخۆی نوێژی جەنازەی لە سەر نەكرد، چونكە بە نوێژی ڕۆژگیرانەوە خەریك بوو، ئەو (روایَة)ش كە دەفەرموێ: نوێژی (جَنازَة)ی لە سەر كردوە، مەبەستی ئەمەیە: فەرمانی بە یەكێكیتر كرد نوێژەكەی لە سەر بكا، هەروەك ئیمامی(النواوي) ئەوها هەردوو (روایَة)كانی كۆ كردونەوە.

٢–**كۆرپەی لەبارچوو**، ئەگەر بە زیندوویی لە دایكی جیا ببێتەوە: وەك بجوڵێ، یان بگریێ، یان بپژمێ، ئەوەش وەكو منداڵی ساوا بڕیاری بۆ دەدرێ، واتە: دەشورێو كفن دەكرێو نوێژیجەنازەی لە سەر دەكرێو دەنێژرێو میرات دەگرێو میراتیشی لێدەگیرێ. بەڵام ئەگەر بە مردووی لە دایكی جیا ببێتەوە، ئەوە میرات ناگرێ، جا تەماشا دەكەین:

ئەگەر وێنەی ئادەمیزادیی ئاشکرا نەبوبێ، ئەو کاتە شوشتن‌و نوێژی‌جەنازە واجب نابێ، بەلاّم کفن‌و ناشتنی سوننەتە، بەلاّم ئەگەر وێنەی ئادەمیزادی ئاشکرا بوبێ، ئەو کاتە واجبە بشورێ‌و کفن بکرێ‌و بنێژرێ، تەنها نوێژ لەسەرکردنی واجب نیە، بەلاّم ئەگەر تەمەنی بوبێتە شەش مانگ، ئەو کاتەش لە فەرموودەی بەهێزدا: نوێژ لەسەرکردنی واجب نیە، لە لای هەندێ زانای‌تریش: نوێژ لەسەرکردنی واجبە، والله اعلم. (المجموع بشرح المهذب) ب(٥) ل(٢١٥–٢١٧) و(تحفة المحتاج بحاشية الشرواني) ب(٣) ل(١٦٢)، ب(٦) ل(٤٢٣).

**دووەم: نوێــژی ڕۆژگــیران مــانگگیران، لــە ڕۆژی مردنــی (إِبْـراهِیم)دا ڕۆژ گــیرا...**

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ڕۆژ و مانگ نە بە هۆی مردنی هیچ کەسێك‌و نە بە هۆی ژیانی هیچ کەسێك ناگیرێن...ئێوە نوێژ بکەن‌و دوعا بکەن، تا گیرانەکە لادەچی﴾.

ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لە سەر بێ فێڵی‌و بێ خیانەتیی پێغەمبەرﷺ، ئەگەر نا: زۆرینەی خەڵکەکە قەناعەتیان وەها بوو: بە هۆی مردنی (إِبْراهِیم) ڕۆژ گیراوە، بەلاّم پێغەمبەرﷺ قەناعەتەکەی ئەوانی پوچەڵ کردەوەو ڕووداوەکەی گەڕاندەوە ژێر ویستو دەسەلاّتی‌خوا، موسوڵمانەکانیشی ئاگادار کردنەوە: گەورەیی‌و ڕێزداریی هیچ کەسێك کار لە گۆڕانکاری ئەم بونەوەرە ناکا.

**ئینجا بزانە:** هۆی ڕۆژگیران ئەمەیە: مانگ دەکەوێتە نێوان ڕۆژ و نێوان ئێمەی دانیشتووانی سەر زەوی، بۆیێ بە ئەغلەبی لە کۆتایی مانگی ئیسلامدا ڕۆژگیران ڕوو دەدا.

هۆی مانگگیرانیش ئەمەیە: زەوی دەکەوێتە نێوان ڕۆژ و مانگ، سێبەری لێدەکاو تیشکی ڕۆژ لە مانگ نادا؟ چونکە مانگ ڕوناکی‌خۆی لە ڕۆژ وەردەگرێ، بۆیێ بە ئەغلەبی کەمۆکەك پێش بە نیوەبوونی مانگی‌ئیسلام مانگگیران ڕوو دەدا.

**جا بزانە:** نوێژی ڕۆژگیران‌و مانگگیران (سُنَّةٌ مُؤَكَّدَة)یە لە لای هەندێ زانایانیش واجبە. جا ئەم نوێژە دروستە بە تەنهایی بکرێ، بە جەماعەتیش سوننەتە، لای کەمی ئەم نوێژە: دوو ڕەکعەتە، وەکو سوننەتی پێش نوێژی سبەینێ، ئەمەیان لە دوو حەدیسی (صَحِیح)دا هاتووە، بەلاّم شێوەی تەواوی ئەم نوێژە بەم جۆرەیە: (فاتِحَة) بخوێنێ، ئینجا سورەتێك لە دوای (فاتِحَة) بخوێنی، ئینجا ڕوکووع ببا، ئینجا لە ڕوکووع هەڵسێتەوەو نەچێتە سوجدە، بەڵکو دیسان (فاتِحَة)و سورەتێکی دوای (فاتِحَة) بخوێنێ، ئینجا ئەم جارەش ڕوکووع ببا، ئینجا لەڕکووع هەڵسێتەوە، ئینجا دوو سوجدە ببا، ئینجا هەڵسێتەوە ئەم جارەش وەك ڕەکعەتی‌یەکەم دوو (فاتِحَة)و دوو سورەت‌و دوو ڕوکووع ببا، ئینجا دوو سوجدە بباو تەحیات بخوێنێ‌و سەلاّم بداتەوە، جا ئەگەر بیەوێ لەمەش تەواوتر بکا، با سورەتی درێژ لە دوای (فاتِحَة)کان بخوێنی‌و زۆر (تَسْبِیحات) لە ڕوکووع‌و سوجدەکاندا بکا، ئینجا ئیمام دوو وتار بخوێنێتەوە، هەروەها سوننەتە خەڵکیش زۆر خێرو چاکە بکەن. (شرح صَحِیح مسلم) ب(٤) ل(٢١٤) و(تحفة المحتاج بحاشية الشرواني) ب(٣) ل(٥٦–٥٩).

*** *** ***

## ﴿ موسوڵمانبوونی (عَدِيِّ بن حَاتَمِ الطّائِي)ﷺ﴾

پێشەکی بزانە: بۆیێ ئەم باسەمان لێرەدا هێنا، تاکو زنجیرەی ڕوداوەکان تێك نەچێ، هەم باسی (عَقِيدَة)و بڕیارەکانی شەرعیشی تێدایە.

لە مانگی (رَبيع الآخِر) ساڵی نۆیەمی کۆچی، پێغەمبەرﷺ سەردو پەنجا (صَحابَة)ی بە سەرکردایەتی ئیمام (عَلِي)ﷺ ناردنە ناوچەی (طَيِّء) بۆ ڕووخاندنی بتەکەی (الفُلْس)– کە بتێکی گەورەی هۆزی (طَيِّء) بوو– جا (عَدِيِّ بن حاتم)ی گەورەی هۆزی (طَيِّء)، یەکسەر بێ جەنگکردن هەڵاتو چووە لای گاورەکانی وڵاتی شام–چونکە بەخۆیشی گاور بوو– خێزانو منداڵەکانیخۆی لەگەڵ خۆیا بردن، خوشکەکەی خۆیشی بەجێ هێشت.

ئینجا لە ئەنجامدا (صَحابَة)کانﷺ بتەکەیان ڕوخاندو سوتاندیان، هەم هەندێك ماڵو ژنو منداڵیان کەوتە دەستو لەگەڵ خۆیانا هێنانیانەوە بۆ (مَدِينَة)، جا یەکێك لەو دیلانە (سَفّانَة)ی کیژی (حاتم الطّائِي) بوو–واتە: خوشکی (عَدِيِّ)ی هەڵاتوو– جا کە پێغەمبەرﷺ بە لای دیلەکاندا ڕابرد، (سَفّانَة) بە پێغەمبەریﷺ گوت: (من کیژی گەورەی گەلەکەیخۆمم، باوکم ناموسی دەپاراست، دیلی بەرهەڵ دەدا، برسیی تێر دەکرد، ڕووتی بەرگ دەکرد، میوانی دەحاواندەوە، خواردەمەنیی دەدا خەڵك...من کیژی (حاتَم الطّائِيِم)!.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ئەوانە ڕەووشتی ئیمانداراننن، ئەگەر باوکت موسوڵمان بوایە، ڕەحمەتمان بۆ دەنارد﴾. جا فەرمووی: ﴿بەریبەهەڵدەن، چونکە باوکەکەی ڕەووشتە باشەکانی خۆش دەویا﴾. جا پێغەمبەرﷺ دەستە جلکێكو وڵاغێکی سواریو بژێوی دایێو لەگەڵ هەندێك باوەڕپێکراوی گەلەکەیخۆیدا ناردیەوە، ئینجا (سَفّانَة) ڕۆیشتە وڵاتی (شام) بۆ لای (عَدِيِّ)ی برایخۆیو پێی گوت: هەی بێ ڕەحمی ستەمکار، خێزانو منداڵەکانیخۆت بردن، ناموسو پاشماوەکەی باوکیشت بەجێ هێشت؟!

جا (سَفّانَة) ڕێزداریو ڕێزلێنانی پێغەمبەریﷺ بۆ باس کردو گوتی: وام پێباشە تۆ بچیە لای ئەم پیاوە: جا ئەگەر پێغەمبەر بێ، ئەوە کێ پێشتر موسوڵمان ببێ، گەورەیی پێشتریی هەیە، ئەگەر پاشا بێ، ئەوە تۆ خاوەن هۆزی خۆتی.

جا (عَدِيِّ) هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەریشﷺ لەگەڵ خۆیا بردیەوە ماڵەوە، جا لە ڕێگەدا پیرەژنێك هاتە سەر ڕێگەی پێغەمبەروﷺ ماوەیەکی زۆر بە پێوە لەگەڵی ڕاوەستا، بۆ کارێکیخۆی قسەی لەگەڵ دەکرد، جا (عَدِيِّ) گوتی: وَاللهِ ئەمە پاشا نیە، واتە: چونکە دەعیەی نیە.

جا کە چونە ماڵەوە، پێغەمبەرﷺ بالیفێکی بۆ (عَدِيِّ) داناو فەرمووی: لە سەر ئەم

باليفه دانیشه. جا پێغەمبەرﷺ بەخۆی لە سەر زوی دانیشتو (عَدِيّ)ش لە سەر باليفەكە دانیشتو لە دڵدا گوتی: وَاللهِ ئەمە کاری هیچ پاشایەك نیە.

جا (عَدِيّ) دەڵێ: (صَلِيب)ێکی زیوم لە ملدا بوو، پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿اِتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللهِ﴾التوبة: ٣١، جولەکەو دیانەکان=گاورەکان مالمو قەشەکانی خۆیان کردونەتە خوایەکیتری جگە لە خوا. جا (عَدِيّ)گوتی: خۆ ئەوان مالمو قەشەکانیان نەپەرستون؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿بەڵێ، حەڵاڵیان لێ حەرام کردونو حەرامیان بۆ حەڵاڵ کردون، ئەوانیش شوێنیان کەوتون، ئەم شوێنکەوتنە پەرستنی ئەوانە﴾.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إِنَّ الْيَهُودَ مَغْضُوبٌ عَلَيْهِمْ وَالنَّصارَى ضالُّونَ﴾ جووەکان غەزەبی خوایان هاتۆتە سەر، گاورەکانیش=دیانەکان گومڕا بوینە...

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ئەی (عَدِيّ) تۆ چوارێکی تالانت لە گەلەکەیخۆت وەردەگرت، ئەوەش لە ئایینی تۆدا حەڵاڵ نیە...ئەی (عَدِيّ) لەوانەیە: تۆ لە بەر ئەوە موسوڵمان نەبی، چونکە دەبینی ئێمەی موسوڵمانان هەژارو پێویستین، وَاللهِ نزیکە ئەوەندە ماڵ لە ناو موسوڵماناندا بلاو ببێتەوە، کەسێك نابێ وەریبگرێ، هەم دەبینی ئێمەی موسوڵمانان دوژمنمان زۆرە، وَاللهِ نزیکە گوێت لێببێ: ئافرەت بە تەنهایی لە (الْحِيرَة)=(الْقادِسِيَّة)وە بە سواری وشتر دێتە زیارەتی (بَيْت)یخوا لە (مَكَّة)، لە هیچ کەسێکیش ناترسێ، هەم دەبینی دەسەڵاتو کاری وڵاتان لە دەست کەسانێکیتردایە، وَاللهِ نزیکە گوێت لێببێ: کۆشكو تەلارە سپیەکانی (كِسْرَى) دەکەوێتە ژێر دەستی موسوڵمانان﴾.

حەزرەتی(عَدِيّ)ﷺ فەرموویەتی: جا من موسوڵمان بومو بە موسوڵمانبوونم پێغەمبەرﷺ زۆر دڵخۆش بوو، ئینجا من بە چاویخۆم دیتم: ئافرەت لە (كُوفة)وە بە سواری وشتر دەهات (طواف)ی (بَيْت)ی دەکردو لە هیچ کەسێك نەدەترسا، هەم بەخۆم یەکێك بوم لەو سەربازانەی گەنجینەی (كِسرَى)ی پاشای فارسەکانمان گرت، وَاللهِ سێیەمەکەش دەبینن، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی.

واتە: سێیەمەکەش لە سەردەمی (عُمَر بن عَبْدالعَزِيز)دا هاتە جێ: هیچ هەژارێك نەمابوو زەکات وەربگرێ، هەروەك لە باسی واجبوونی زەکاتدا باسمان کرد، والحمد لله تعالى. (تفسير ابن كثير) التوبة: (٣١) و(البداية والنهاية) ب(٣) ل(١٢٨–١٣٢).

## ﴿ کوڵبژێریك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: پێغەمبەرﷺ لەبارەی (سَفّانَة)ی کیژی (حاتَم الطّائِي) فەرمووی: بەریبەهڵدەن چونکە باوکەکەی ڕەوشتە باشەکانی خۆش دەویان.** ئەمەش بەڵگەیە: هەروەك غەزای

چەکداری کاریگەرە بۆ موسوڵمانکردنی کافرەکان، ڕەووشتی جوانو ڕێزلێنـانی ڕێـزدارانو قەدرگرتنی گەورەماڵانیش ئەوەندە کاریگەرە، تەماشا بکە: بەرهەڵدانی ئەم ئافرەتـە—کـە کیژی سەرۆك هۆزی (طَيِّء) بوو— هـەم ڕێـز لێنـانو بەخـشینی جـلو وڵاغـی سـواری، وای لێکرد قەناعەت بە برایەکەشـی بێنـێ: کـە بێتـە خزمـەت پیغەمبـەروﷺ لـە ئەنجامیـشدا موسوڵمان بوو، بۆیێ پێغەمبەرﷺ ڕێنموونیمان دەکـاو فەرموویـەتی: ﴿إِنَّكُمْ لاَ تَـسَعُونَ النَّاسَ بِأَمْوالِكُمْ، وَلَكِنْ لِيَسَعْهُمْ مِنْكُمْ بَسْطُ الْوَجْهِ وَحُسْنُ الْخُلُـقِ﴾ حديث حسن رواه الحاكم وأبويعلى، **ئێوە بەرەوەستی خەڵك ناکەن بە بەخشینی ماڵتان، بەڵام با ڕووخۆشیو ڕەووشت جوانیی ئێوە بەروەستیان بکا**. واتە: ناگونجێ بە کردار چاکە لەگەڵ هەموو خەڵك بکەی، بەڵام قسەکردنی جوان دەگونجێ، چونکە خوایگەورە دەفـەرموێ: ﴿وَقُولُوا لِلنّاسِ حُسْناً﴾ البقرة: ٨٣، **قسەی جوان بە خەڵکی بڵێن**.

جا خواناسی بە ناوبانگ (إِبْراهِيم بن أَدْهَم) فەرموویەتی: پیاو بە ڕەووشـتی بـاش دەگاتـە ئەو مەبەستەی کە بە ماڵیخۆی نایگاتێ، چونکە ماڵ زەکاتو بەخێوکردنی خزمـانی تـێدا واجبە، بەڵام ڕەووشتیجوان زەکاتو بەخێوکردنی تێدا واجب نیە. فيض القدير ب(٢) ل(٧٠٦).

**دووەم: (عَدِيّ) دیتی پێغەمبەرﷺ لە ڕێگەدا لەگەڵ پیرەژنێك ڕاوەستا، لە ماڵەوەش لـە سەر زەوی دانیشت، جا گوتی: وَاللهِ ئەمە پاشا نیە**. (عَـدِيّ) بـە قـسەی خوشـکەکەیخۆی هـاتبوو، جـا بـە بۆچـوونیخۆی وای دانـابوو: ئـەم پیـاوە—مُحَمَّـدﷺ—: یـان پاشـایەکی دەسەڵاتدارە، یان پێغەمبەرە، جـا (عَـدِيّ) ڕەفتـاری پاشـاو سـەرۆکەکانی بـاش دەزانـی، چونکە بەخۆیشی سەرۆك هۆزیخۆی بوو، جا کـە دیتـی پێغەمبـەرﷺ لـە ڕێگـەدا لەگـەڵ پیرەژنەکە ڕاوەستاو ماوەیەکی زۆر قسەی لەگەڵ کرد، لـە دڵدا گـوتی: ئەمـە پاشـا نیـە! چونکە گەورەو کاربەدەستەکان لە ڕێگەدا لەگەڵ بێدەسەڵاتەکاندا ڕاناوەستنو قـسەشیان لەگەڵ ناکەن، بەڵکو تێیانهەڵدەدەنو لە ڕێگـەش دەریاندەکـەن! تـاکو ڕێگـە بـۆ خۆیـانو پاسەوانەکانیان چۆل ببێ، ڕێگە نادەن هیچ کەسێك لە ڕێگەیان ڕابووەستێ.

جگە لەمەش: (عَدِيّ) دەبینێ پێغەمبەرﷺ بێ پاسەوان لەگەڵ خۆیا دەیباتـە مـاڵیخۆی، لەوێش بەخۆی لە سەر زەوی دادەنیشێ! بە خودا ئەمەش کاری پاشایان نیە، (عَدِيّ) هیچ کۆشكو تەلارێکی بەرزی نەدیت، بـەڵکو گـەورەی ئیـسلامﷺ وەك هـەژارەکانی ئوممـەتی خۆی لە خانووی قـوڕدا نیـشتەجێیە! وَاللهِ ئەمـەش کـاری پاشـایەتی نیـە، خـۆ لـە مـاڵی پێغەمبەرداﷺ کورسیو قەنەف نەبو، بەڵکو هەر زەمینە ڕەقو تۆزاویەکە بوو و بەخۆی لە سەری دانیشتو (عَدِيّ)شی لە سەر بالیفێك دانا: کە لـە (لِیـف)ی دارخورمـا هـەڵاخنابوو! وَاللهِ ئەمـەش کـاری پاشـایەتی نیـە، جـا ئەگـەر (عَـدِيّ) لـە کـاتی مزگـەوت دروسـتکردنو هەڵکەنـدنی (خَنْـدَق)دا پێغەمبـەریﷺ دیتبـا، چـۆن سـەری سـوڕ دەمـا؟! ئـەوە ژیـانو

ڕەفتـاری پێغەمبەرایەتییـە، ناچـار (عَـدِيّ) دانـی پێـدا هێنــاو موسـوڵمان بـووﷺ. بـە دەستکاریەوە لە (فقه السيره، للبوطي) ل(٤٧٤) و(سيرة الصلابي) ب(٢) ل(٥٧٠).

**سێیەم: هەڵگرتن و ڕێزلێنانی دروشمـەکانی کافرەکـان حەرامـە، حـەزرەتی(عَـدِيّ)ﷺ فەرموویەتی: چومە خزمەت پێغەمبەرﷺ (صَلِیب)ێکم لە ملدا بوو، پێغەمبـەرﷺ فەرمووی:** ﴿إِطْرَحْ عَنْكَ هَذا الْوَثَنَ﴾ **ئەم بتـە لـە ملت فرێدە. جا پێغەمبـەرﷺ ئـەم ئایەتەی خوێندەوە:** ﴿اِتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللهِ﴾التوبة: ٣١، **جولەکەو گاورەکـان مـالمو قەشـەکانی خۆیـان کردونەتـە خوایـەکیتری جگـە لـە خـودا. جـا فـەرمووی:** ﴿إِنَّهُمْ حَرَّمُوا عَلَيْهِمُ الْحَلالَ وَأَحَلُّوا لَهُمُ الْحَرامَ فَاتَّبَعُوهُمْ فَذلِكَ عِبادَتُهُمْ إِيّاهُمْ﴾ حديث حسن رواه الإمام أحمد والترمذي، **مـالمو قەشـەکان حـەڵاڵیخوایان لێ حـەرام کـردن و حەرامیخواشیان بۆ حەڵاڵ کردن، ئەوانیش شـوێنیان کـەوتن و گوێڕایـەڵیان بـون، ئەم گوێڕایەڵیە پەرستنی ئەوانە.**

ئەم حەدیسە بەڵگەیە: بە هیچ جۆرێك دروست نیە: موسوڵمان (صَلِیب)و نیـشانەکانیتری کافرەکان وەخۆی هەڵبگرێ، هەم بەڵگەیە: جگە لە خواو پێغەمبەرﷺ هیچ کەسێك مـافی حەرامکردن و حەڵاڵکردنی نیە، خوایگەورە دەفـەرموێ: ﴿وَلا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْـــسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَذَا حَلالٌ وَهَذا حَرَامٌ لِتَفْتَرُوا عَلَى اللهِ الْكَذِبَ﴾ النحل: ١١٦، **بەو درۆیەی زوبانتـان دەیکا، مەڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە. تاکو درۆو بوختان بە سەر بڕیارەکانی خوادا هەڵببەستن.**

کەوابوو: ئەوانـەی ئێـستا یاسـای دەسـتکرد بـە پێـچەوانەی قورئـان و حـەدیس دادەنـێن و حەڵاڵیخوا حەرام دەکەن و حەرامیخوا حەڵاڵ دەکـەن، گـشتی دێنـە ژێـر هەڕەشـەی ئـەم ئایەتەو دێنە ڕیزی مالمو قەشەکانی جولەکەو گاورەکان، هەم ئەوانەی بـە خۆشـییخۆیان گوێڕایەڵیان دەبن، ئەوانیش وەکو جولەکەو گاورەکانن.

## ﴿ باسی (تَقْلید)کردنی زانایانی ئایینی ﴾

چـینێکی(لامَـذْهَبِي)=بێمەزهـەب، ئایـەت و حەدیـسەکەی باسـی (عَـدِيّ)، دەهێننـە سـەر ئیمامەکانی هەرچوار مەزهەبەکان و شوێنکەوتەکانیان و دەڵێن: ئەو چوارانە وەکـو قەشـەو مالمەکانن و شوێنکەوتەکانیشیان وەکو جولەکەو دیانەکانن! بە ئاشکرایی ئەوها دەڵێن و لە کتێبەکانیشیاندا ئەوها نوسراوە! جا هەرچەند ئەم گوتەیە (کُفْر)ێکی ئاشکرایە، بـەڵام بـۆ دەمکوتکردنی ئەو گومڕابووانە، ئەم ئایەت و حەدیسانە دێنینە بەرچاو:

بە بەڵگەی قورئان و حەدیس: جگە لە زانایانی (مُجْتَهِد)یئایینی، هیچ کەسێکیتر مافی نیـە: حـەرام و حـەڵاڵ و بڕیارەکـانیتری شـەریعەت لـە قورئـان و حـەدیس وەربگـرێ، خوایگـەورە دەفەرموێ: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾الأنبياء: ٧، **ئێوە پرسیار لـە زانایـانی قورئان بکەن ئەگەر بەخۆتان نـازانن.** هەم دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولَ

وَإِلَى أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ ﴾النساء: ٨٣، **ئەگەر ڕووداوی‌خۆیان بگەڕێننەوە لای پێغەمبەرﷺ لای خاوەنانی کاروباری ئایینی، ئەو کەسانە بڕیاری ڕووداوەکە دەزانن، کە دەتوانن بڕیارەکان لە قورئان وەدەربێنن.**

پێغەمبەرﷺ بە (صَحابَة)کانی فەرموو: ﴿فَمَا عَرَفْتُمْ مِنْهُ فَاعْمَلُوا بِهِ، وَما جَهِلْتُمْ مِنْهُ فَرُدُّوهُ إِلَى عالِمِهِ﴾ حديث حسن رواه الإمام أحمد، **ئەوەی بەخۆتان لە قورئان زانیتان ڕەفتاری پێبکەن، ئەوەی نەشتان زانی، بیگەڕێننەوە لای زانای‌قورئان.**

جا کە پێغەمبەرﷺ بەرامبەر (صَحابَة)کانﷺ ئەوەهای فەرموبێ‌و فەرمانی پێ‌کردبن: شوێن زانایانی‌قورئان بکەون، ئەبێ حاڵی ئێمەی نەزان چۆن بێ؟ بێگومان چارەی ئێمەش تەنها شوێنکەوتنی زانایانی‌ڕابردووە، حەزرەتی(عبدالله بن مَسْعُود)ﷺ فەرموویەتی: ﴿لا يُقَلِّدَنَّ أَحَدُكُمْ دِينَهُ رَجُلاً، فَإِنْ آمَنَ آمَنَ وَإِنْ كَفَرَ كَفَرَ، وإِنْ كُنْتُمْ لاَ بُدَّ مُقْتَدِينَ فَاقْتَدُوا بِالْمَيِّتَ فَإِنَّ الْحَيَّ لاَ يُؤْمَنُ عَلَيْهِ الْفِتْنَةُ﴾ رواه الطبراني في الكبير، قال الحافظ الهيثمي: رجاله رجال الصَحيح، **کەستان لە ئایینەکەی‌دا (تَقْلِيد)=شوێنکەوتەی پیاوێکی وەها نەبێ: ئەگەر ئەو باوەڕی هێنا، ئەویش باوەڕ بێنێ، ئەگەر ئەو کافر بوو، ئەویش کافر ببێ، جا ئەگەر پێویست بوو (تَقْلِيد) بکەن، واتە: لە ئاییندا شوێن کەسێك بکەون، ئەو کاتە شوێن زانایەکی مردوو بکەون، چونکە زانای زیندوو لێی دڵنیا نین لەوانەیە توشی (فِتْنَة)یەکی‌ئایینی ببێ‌و بگۆڕێ، واتە: بەڵام زانای مردوو لە دوای مردن گۆڕانکاریی بە سەر ئایین‌و زانستەکەی‌دا نایێ، والله أعلم.** (تفسر ابن كثير النساء: (٨٣) والتوبة: (٣١) والنحل: (١١٦) و(مجمع الزوائد ومنبع الفوائد) ب(١) ل(٢٤٥).

***          ***          ***

## ﴿ غەزای ( تَبُوك )=( غَزْوَةُ العُسْرَةِ )=( جَيْشُ العُسْرَةِ )﴾

**ئەمەیان دوایین غەزایەکانی پێغەمبەرەﷺ، لە مانگی (رَجَب) ساڵی‌نۆیەمی کۆچی‌دا بوو، هۆی غەزایەکەش ئەمەیە: هەواڵێك گەیشتە پێغەمبەرﷺ: کە کافرەکانی (رُوم) لەشکرێکی چل هەزار سەربازییان کۆ کردۆتەوەو پێشەکەی لەشکرەکەش گەیشتۆتە (البَلْقاء) لە نزیك (عَمّان)، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە موسوڵمانان کرد: خۆیان بۆ ئەم غەزایە ئامادە بکەن، واتە: پێغەمبەرﷺ وەك غەزایەکانی‌تر شوێنی غەزایەکەی نەشاردەوە، بەڵکو شوێنی غەزایەکەی بۆ ئاشکرا کردن تاکو بە تەواوی خۆیان ئامادە بکەن، چونکە کاتەکە سەرەتای پایز بوو، میوەی (مَدِينَة)ش پێگەیشتبوو، گەرما بەهێز بوو، خەڵك پێی خۆش بوو لە سێبەرەکاندا پشوو بدا، ساڵەکەش نەهات بوو، موسوڵمانەکانیش نەبوویی بون، بۆیێ بەم غەزایە دەگوترێ: (غَزْوَةُ العُسْرَةِ)=غەزای تەنگانەو زەیقەتی. بە لەشکرەکەش دەگوترێ: (جَيْشُ العُسْرَةِ)=لەشکری تەنگانەو**

زەیقەتی، چونکە شوێنی غەزایەکە دور بوو و ڕێگاکەش سەختو گەرم بوو.
بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمانەکانی (مَكّة)و (مَدينة)و هۆزەکانیتر، بەو پەڕی خۆ نەویستیو دونیا نەویستی بۆ ئەم غەزایە کۆ بونەوە، ژمارەی لەشکری ئیسلام گەیشتە (٣٠)سی هەزار جەنگاوەر، جا پێغەمبەرﷺ هانی دەوڵەمەندەکانی دا؛ بۆ بژێوی ئەم لەشکرە زۆرەو بۆ یارمەتیدانی جەنگاوەرەکان لە هەموو بوارێکی سەربازیەوە، فەرمووی: ﴿مَنْ جَهَّزَ جَيْشَ الْعُسْرَةِ غَفَرَ اللهُ لَهُ﴾ رواه النسائي بسند صحيح، هەر کەسێك پێویستیەکانی لەشکری(الْعُسْرَة) ئامادە بکا، خوا لێی خۆش بێ.
جا موسوڵمانەکان بەگوێرەی توانایخۆیان: پارەو خواردەمەنیو کەرستەی جەنگیان دەهێنا، تا ئافرەتانیش خشڵیخۆیان دەبەخشی.
جا یەکەم کەس: ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ هەمووماڵیخۆی هێنا: کە چوار هەزار دیرهەمی زیو بوو، ئیمام (عُمَر)ش ﷺ نیوەی ماڵیخۆی هێنا، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی (أَبُوبَكْر) چەندت بۆ منداڵەکانت هێشتۆتەوە؟ ئیمام (أبُوبَكْر) فەرمووی: خواو پێغەمبەرمﷺ بۆ هێشتونەوە. جا ئیمام (عُمَر)ش ﷺ فەرمووی: زانیم من هیچ کاتێك پێش (أبُوبَكْر) ناکەوم.
هەروەها دەوڵەمەندەکانیتریش پارەو خورمایەکی زۆریان هێنا، بەڵام لە هەمووانیان باڵا دەستتر ئیمام (عُثمان) بووﷺ؟ چونکە ئەو پەنجا ئەسپو سێسەد وشتری بە تەواوی بارگەو کەلوپەلەوە هێنان، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿اَللّهُمَّ ارْضَ عَنْ عُثمانَ فَإنِّي عَنْهُ راضٍ﴾ خودایە لە (عُثمان) ڕازی ببە، چونکە من لێی ڕازیمە.
ئینجا ئیمام (عُثمان)ﷺ هەزار دینار=میسقال زێریشی هێناو ڕژاندیە ناو کۆشی پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ بە دەستیخۆی هەڵگیرو وەرگێڕی بە زێرەکە دەکردو دەیفەرموو: ﴿ما ضَرَّ عُثْمانَ مَا فَعَلَ بَعْدَ الْيَوْمِ﴾ حديث حسن رواه الترمذي، زیان لە (عُثمان) نادا هەر کردەوەیەکی لەمەودوا بیکا.

## ﴿ حەفت گریاوەکە ﴾

ئینجا حەفت (صَحابَة)ی شەرعزانیشﷺ هاتنو گوتیان: یا رَسُولَ الله وڵاغی سواریمان دەوێ بۆ ئەم غەزایە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لا أَجدُ ما أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ﴾ هیچ وڵاغێکم دەست ناکەوێ لە سەر ئەو وڵاغە هەڵتان بگرم. ئینجا ﴿تَوَلَّوْا وَأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ حَزَناً أَلاَّ يَجدُوا مَا يُنْفِقُونَ﴾ التوبة: ٩٢، ئەو حەفت کەسانە ڕۆیشتنو بە هۆی غەمباری، فرمێسك لە چاوەکانیان دەڕژا خوارەوە، چونکە هیچیان دەست ناکەوێ بۆ ئەم غەزایە سەرف بکەنو پێغەمبەریشﷺ هیچ وڵاغێکی لە لا نەبو، هەڵیانبگرێ.
ئینجا ئیمام (العَبّاس)ﷺ دووی لەم حەفت کەسانە هەڵگرتن، ئیمام (عُثمان)شﷺ

سێ‌ی هەڵگرتن، حەزرەتی(یامِین)ش‌ﷺ وشترێکی دایە دووەکانی‌تر، هەروەها حەزرەتی (أبُومُوسَى‌الأشْعَرِي)ش‌ﷺ هاتە لای پێغەمبەروﷺ داوای وڵاغی سواری بۆ هاورێکانی کرد، لە ئەنجامدا پێغەمبەرﷺ شەش وشتریشی دانە ئەوان.

ئینجا (مُنافِق)ەکانیش پیسی‌و خیانەتی خۆیان دەست پێ‌کردو دەیانگوت: لەم گەرمایەدا مەڕۆنە غەزا، هەندێکی‌تریش بە عوزری جۆراوجۆر ئیزنیان لە پێغەمبەرﷺ وەردەگرت‌و ئەویش ئیزنی دەدان، هەروەها کۆمەڵە (مُنافِق)ێکی‌تریش بە سەرکردایەتی (ابن سَلُول المُنافِق) لە دەرەوەی (مَدِينَة)وە گەڕانەوەو نەچونە ئەم غەزایە، جا (ابن سَلُول) لە کاتی گەڕانەوەی‌دا گوتی: (مُحَمَّد) وا تێ‌دەگا: جەنگی (رُوم) گاڵتەیە، وَاللهِ وا لە بەرچاومە (صَحابَة)کانی (مُحَمَّد) بە گوریسان لێك دەبەسترێنەوە.

ئینجا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(مُحَمَّد بن مَسْلَمَة الأنْصارِي)ی‌ﷺ کردە جێنیشی‌خۆی لە (مَدِينَة)، ئیمام (عَلِي)شی‌ﷺ بۆ چاودێری ماڵ‌و خێزانەکانی‌خۆی بەجێ هێشت، جا (مُنافِق)ەکان گوتیان: (عَلِي) ڕەزاگران‌و بێ‌ڕێزە، بۆیێ پێغەمبەرﷺ بەجێی هێشتووە.

جا ئیمام (علی)ﷺ یەکسەر چەکی‌خۆی دەست دایێ‌و ڕۆیشت‌و لە دەرەوەی (مَدِينَة) گەیشتەوە پێغەمبەروﷺ قسەی (مُنافِق)ەکانی پێ‌گوت، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوان درۆیان کردوە، بگەڕێوە ئاگات لە ماڵ‌و خێزانی من بێ ﴿أَفَلاَ تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى-عليهما الصلاة والسلام-إِلاَّ أَنَّهُ لاَ نَبِيَّ بَعْـدِي؟﴾رواه الشيخان، ئەی (عَلِي) تۆ ڕازی نابی: لە لای من لە پلەی (هارُون) بی لە لای (مُوسی)،؟ بەڵام هیچ پێغەمبەرێك لە دوای من نیە). جا ئیمام (عَلِي)ﷺ گەڕاوە بۆ (مَدِينَة)و پێغەمبەریشﷺ بۆ (تبُوك) ڕۆیشت‌و ئاڵا گەورەکەی جەنگی دایە دەست ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ.

جا چوار موسوڵمانی ڕاستەقینە-کە هیچ گومانیان لێ‌نەدەکرا-لەم غەزایە لە پێغەمبەرﷺ دواکەوتن: حەزرەتی(كَعْب بن مالِك)و حەزرەتی(هِلال بن أُمَيَّة)و حەزرەتی(مُرارَة بن الرَّبِيع)و حەزرەتی(أبُوخَيْثمَة)ﷺ.

جا حەزرەتی(أبُوخَيْثمَة)ﷺ-لە دوای ڕۆیشتنی‌پێغەمبەرﷺ- لە ڕۆژێکی گەرمادا چووە ماڵەوەو دیتی هەردوو ژنەکانی لە ناو کەپرەکانی‌خۆیاندا لە ناو باغەکەی‌دا ئاوی ساردیان داناوەو کەپرەکانیان ئاو ڕشێن کردوەو خواردنیان ئامادە کردوە، جا حەزرەتی (أبُوخَيْثمَة)ﷺ لە دەرگەی کەپرەکەدا ڕاوەستاو تەماشای هەردوو ژنەکانی کردو گوتی: پێغەمبەری‌خواﷺ لە بەر تیشکی ڕۆژو بای گەرمدا بێ، (أبُوخَيْثمَة)ش لە بەر سێبەرو ئاوی ساردو لە لای ژنە جوانەکەی بێ؟! وَاللهِ ئەمە ویژدان‌و دادپەروەری نیە. جا گوتیە هەردوو ژنەکانی: وَاللهِ نایەمە ناو کەپری هیچێکتان تا دەگەمەوە پێغەمبەرﷺ.

ئیتر حەزرەتی(أبُوخَيْثمَة) بە دوای پێغەمبەرداﷺ ڕۆیشت، تا لە (تبُوك) گەیشتەوە

پێغەمبەرﷺ، جا بەسەرهاتەکەیخۆی بۆ پێغەمبەر گێڕاوەو پێغەمبەریشﷺ دوعای چاکی بۆ کرد، بەڵام سێ (صَحابَة)کانیترﷺ هەر لە (مَدينة)دا مانەوە، تا پێغەمبەرﷺ لە (تبُوك) گەڕاوەو سزای دان، هەروەك لە دوایئێرە باسی دەکەین، ان شاء الله تعالى.

هەروەها لە ڕێگەدا وشترەکەی حەزرەتی(أبُوذَرالغِفاري)ﷺ ماندوو بوو و لە لەشکر دواکەوت، ناچار حەزرەتی(أبُوذَرّ)ﷺ کەلوپەلەکەی لە سەر پشتیخۆی داناو بە پیادەیی بە دوای لەشکرەکەدا ڕۆیشت، تا گەیشتەوە لەشکرەکە، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿خوا ڕەحم بە (أبُوذَرّ) بکا، بە تەنهایی دەڕوا، بە تەنهایی دەمرێ، بە تەنهایی زیندوو دەکرێتەوە﴾.

جا لە سەردەمی (خِلافة)ی ئیمام (عثمان)داﷺ بە زۆرلێکردن حەزرەتی (أبُو ذَرّ)ﷺ لە (الرَّبَذَة)دا نیشتەجێ کراو هەر لەوێ بە تەنهایی وەفاتی کرد، جا خێزانەکەی جەنازەکەی لە سەر ڕێگە داناو ڕێبوارەکان لەوێ ناشتیانﷺ.

ئینجا پێغەمبەروﷺ لەشکرەکەی بە (الحِجر)=هەوارگەکانی(ثمُود)دا تێپەڕی–کە ئوممەتی حەزرەتی(صالِح) پێغەمبەرﷺ بونو خودا غەزەبی لێگرتبونو لەناوی بردبون، چونکە وشترەکەیان کوشتبوو–، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لە بیرەکانی (ثَمُود) ئاو مەخۆنەوەو دەستنوێژی پێمەگرنو هەر خواردنێکتان بە ئاوی ئەو بیرانە کولاندوە بیڕژێننو هەویرەکەشی بدەنە ئاژەڵەکانتانو هیچی لێمەخۆن﴾.

جا پێغەمبەرﷺ بە پەشتەماڵەکەیخۆی سەرو ڕووی خۆی داپۆشیو بە پەلە وشترەکەیخۆی لێخوڕیو فەرمووی: ﴿لا تَدْخُلُوا مَساكِنَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ–إِلاَّ أَنْ تَكُونُوا باكِينَ– أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلَ مَا أَصَابَهُمْ﴾ رواه الشيخان، نەڕۆنە ناو ماڵەکانی ئەو کەسانەی ستەمیان لە خۆیان کردوە –تەنها بە گریانەوە نەبێ–نەوەك ئەو بەڵایەی خوا بە سەر ئەوانیدا هێناوە، بە سەر ئێوەشیدا بێنێ.

ئینجا پێغەمبەرﷺ بە لەشکرەکەی بار کرد، تا گەیشتنە ئەو بیرە ی وشترەکە ئاوی لێ دەخواردەوە، جا فەرمانی پێکردن: لەم بیرە ئاو بخۆنەوەو بە کاری بێنن...

جا فەرمووی: ئەم شەو بایەکی بەهێز دێ، هەر کەسەتان جڵەوی وشترەکەی بگرێو کەستان بە تەنهایی لە سەربازگە نەڕواتە دەرەوە. جا لە شەویدا یەکێك بە تەنهایی چووە پیسایی‌کردنو یەکسەر لە سەر پیسایی‌کردنەکە تووشی تەنگە نەفەسی بوو، جا پێغەمبەرﷺ دوعای بۆ کردو چاك بۆوە، یەکێکیتریش ڕۆیشت بە شوێن وشترەکەیدا بگەڕێ، ئەویش بایەکە هەڵیگرتو لە کێوی (طيِّء) فڕێیدا، ئەمەشیان لە دوای گەڕانەوەی پێغەمبەرﷺ لە (تبُوك)، گەیشتەوە (مَدينة).

ئینجا لە نێوان (حِجرِ ثمُود)و (تبُوك)دا لە دوای بانگی سبەینێ، پێغەمبەرﷺ بۆ

پێویستیخۆی له سەربازگەکه دور کەوتەوە، جا تا دەستنوێژی گرت، دونیا ڕۆناك بـوو و نەگەڕاوە، بۆیێ (صَحابَة)کان حەزرەتی(عَبْدالرَّحمن بن عَوْف)یانﷺ بۆ جەماعەتکردن کـردە (إمـام)و پێـشنوێژی بـۆ کـردن، جا پێغەمبـەرﷺ لـه ڕەکعەتیـدووەم گەیـشته جەماعەتو ڕەکعەتەکەیتریشی به تەنهایی تەواو کرد، ئینجا که نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: کارێکی باشتان کرد. کەوابوو: حەزرەتی(عَبْدالرَّحمن بـن عَـوْف)ﷺ یەکـەم (صَحابَة)یە: که پێغەمبەرﷺ نوێژی به جەماعەتی له دوا کردبێ.

ئینجا لەم غەزایەدا پێغەمبەرﷺ نوێژەکانی (جَمْع) دەکردن، واته: نیوەڕۆو عەسر به یەکەوەو مەغریبو عیشا به یەکەوە کۆی دەکردنەوە، جا فەرمووی: سبەینێ دەگەینه (تَبُوك)، تا من بەخۆم دەگەمه جێ، کەستان دەست له ئاوی سەرچاوەکەی نەدا.

جا تا پێغەمبەرﷺ گەیـشته جـێ، دوو پیـاو خۆیـان گەیانـده ئاوەکـەو دیتیـان باریکـه ئاوێکی وەك قەیتانی پێڵاوی لێدەچکێتەوەو دەستیان له ئاوەکه دا، جا پێغەمبـەرﷺ زۆر تــوڕە بـوو و قـسەی پـێگوتن، ئینجـا فـەرمانی دا: هەنـدێك ئاویـان هـەڵێنجاو پێغەمبـەرﷺ دەسـتو ڕووی خـۆی پـێ شوشـتو لـه دەمـی وەرکـرد، ئینجا ئاوەکـەی ڕژاندەوە ناو سەرچاوەکەو پڕ ئاو بۆوەو ئاوی له بەر ڕۆیشتو لەشکرەکه تێر ئاو بـوو، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ئەی (مُعاذ) نزیکه ئەگەر تەمەنت درێـژ بـێ، دەبینـی ئێره پڕ باغو سەوزایی دەبێ﴾.

ئینجا که پێغەمبەرﷺ گەیشته (تبُوك)، هیچ لەشکرێکی کافرەکان لـەوێ نـەبو، بۆیـێ هیچ جەنگێك ڕووینەدا، جا پێغەمبەرﷺ زیاتر له دە ڕۆژان له (تبُوك) مایەوەو لـەو ماوەیەشـدا (یُحَنَّة)ی گـەورەی (أیْلَـة)، هـەم دانیـشتووەکانی (جَرْبـاء)و (أذْرَح) گـشتیان هاتنه خزمەت پێغەمبـەرووﷺ لەگـەڵی پێـك هـاتن: (جزْیَـة)=سـەرانه بدەنـه دەوڵـەتی ئیـسلامو لـه سـەر ئایینیخۆیـان بمێننـەوە، هەروەها لـەم غەزایـەدا حـەزرەتی(عبـدالله ذُوالبَجادَین)ﷺ وەفاتی کرد، جا پێغەمبەرووﷺ ئیمام (أبُوبَکْر)و ئیمام (عُمَر)رضیالله عنهما گۆڕەکەیان بۆ هەڵکەندو له شەوێدا لـه بـەر ڕۆنـاکی مۆمێـك ناشـتیانو پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: ﴿خودایه من لێیڕازیمه، تۆش لێیڕازی به﴾.

ئینجا پێغەمبەرﷺ ڕاوێژی به (صَحابَة)کان کرد: ئایا له (تبُوك) بەولاوە زیاتر بڕۆین، یان نا؟ جا ئیمام (عُمَر)ﷺ فەرمووی: ئەگەر له لایخوا فەرمانت پێکراوە، زیاتر بڕۆ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر له لایخوا فەرمانم پێکرابا، ڕاوێژم نەدەکرد.

جا ئیمـام (عُمَـر)ﷺ فـەرمووی: وا ئێمـه لـه کافرەکـانی(ڕُوم) نزیـك بوینـەوەو ئـەم نزیکبوونەوەیەش ترسی خستۆته دڵیان، کەوابوو: ئەم ساڵ دەگەڕێینـەوە، بـزانین خـوا چی دەکا. مەبەستی ئیمام (عُمَر)ﷺ ئەمەیه:

*بۆ دەوڵـەتـی (رُوم) ئاشـکرا بـوو: ئیسلام بووەتـە هێزێکیگـەورەی وڵاتیعـەرەب، دەتـوانـێ ڕووبـەڕووی زلهێزەکـانـی دەوروبـەری ببێتـەوە، کـەوابوو: لەمـەودوا دوژمنانی ئیسلام لە هێزی ئیسلام دەترسێنو بیر لە هێرشکردنە سەر ئیسلام ناکەنەوە، چونکە مست لە درێشە دەگەڕێتەوە، کەوابوو: ئەگەر لەشکری ئیسلام لە (تَبُوك) بەو لاوەتریش نەڕوا، هەر بە سەرکەوتوو دادەندرێ، چونکە هاتۆتە ناو خاکی دوژمن.* ئینجا پێغەمبەرﷺ بڕیاری دا: گەڕانەوە بۆ (مَدِینَة).

## ﴿ هەوڵدانی کوشتنی پێغەمبەرﷺ﴾

ئینجا لە ڕێگەیگەڕانەوەدا دوانزە (مُنافِق) ویـستیان لـە ڕێگـە سـەختەکەی کێوەکەوە پاڵەپەستە لە ڕێگەکەدا بکەنو پێغەمبـەرﷺ هەڵبدێرنـە خـوارەوە، جا خوایگەورە پێغەمبەریﷺ ئاگادار کردەوە، بۆیـێ کـە لەشـکرەکە گەیـشتە کێوەکە، پێغەمبـەرﷺ فەرمانی دا بانگەواز کرا: تەنها پێغەمبەرﷺ بە ڕێگەیکێوەکەدا دەڕوا، لەشکرەکەش بە ناو دۆڵەکەدا دەڕوا. جا لەشـکرەکە هـەمووی بـە دۆڵەکـەدا ڕۆیـشت، بـەڵام دوانـزە (مُنافِق) خۆیان دەمامك کردو بە دوای پێغەمبەرداﷺ بـە ڕێگـەی کێوەکـەدا ڕۆیـشتن، جا لە تاریکیی شەوەدا خۆیـان گەیانـدە پێغەمبـەروﷺ وشـترەکەیان ڕەوانـدەوە، لـەو کـاتیش حـەزرەتی(عَمّار بـن یاسِر)ﷺ وشـترەکەی ڕادەکێـشاو حـەزرەتی(حُذَیفَـة بـن الیَمان)شﷺ لێیدەخوڕی، جا حەزرەتی(حُذَیفَة)ﷺ بە گۆچانەکەیخۆی لە وشترەکانی ئەوانی دا و گەڕاندنیەوە، ئەوانیش زوو هەڵاتنو چونەوە نـاو لەشـکرەکە تـاکو ئاشـکرا نەبن، جا پێغەمبەروﷺ هەردوو هاوڕێکانی، زوتر لـە ڕێگـەی کێوەکـە دەرچـونو لـەو بەر چاوەڕوانیان کرد تا لەشکرەکەش گەیشتە جێ.

جا لە ڕێگەدا پێغەمبەرﷺ ناوی هەر دوانزە (مُنافِق)ەکانی بە حەزرەتی(حُذَیفَـة)ﷺ گوت: بەڵام فەرمووی: بە کەسیتر مەڵێ. جا بە پێغەمبەریانﷺ گوت: بۆچی فـەرمان نـادەی خزمـەکانیخۆیان بیـانکوژن؟ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ﴿پـێم ناخۆشـە خـەڵك بڵێ: (مُحَمَّد)ﷺ (صَحابَة)کانیخۆی دەکوژێ﴾.

ئینجا بزانە: حەزرەتی(حُذَیفَـة بـن الیَمـان)ﷺ پـێی دەگـوترا: (صـاحِبُ سِـرِّ رَسُـولِ اللّهِﷺ) خـاوەنی نهێنیـی پێغەمبـەرﷺ. چـونکە پێغەمبـەرﷺ (مُنـافِق)ەکـانی ئـەم غەزایـەو (مُنـافِق)ەکـانیتری (مَدِینـة)شـی بـۆ ئاشـکرا کردبـون، بـەڵام پـێی فـەرموو: ناوەکانیان بۆ هیچ کەسێك ئاشکرا نەکا، بۆیێ ئیمام (عُمَر)ﷺ بە حەزرەتی(حُذَیفَة)ی فەرموو: توخوا من لە (مُنافِق)ەکانم؟ حەزرەتی(حُذَیفَـة)شﷺ فـەرمووی: نـا. جا لـە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ ئەگەر حـەزرەتی(حُذَیفَـة)ﷺ نوێـژی (جَنـازَة)ی لـە سـەر کەسێك نەکردبا، ئیمام (عُمَر)شﷺ نەیدەکرد.

## ﴿مَسْجِدُ الضِّرار﴾

پیاوێکی گاور=دیان لە (مَدِینَة) هەبوو، ناوی (أبُوعامِرالرّاهِب) بوو، لە رِقی پێغەمبەرﷺ چووە (مَكّة)و لە دژی پێغەمبەرﷺ خۆیو پەنجا کەسیتر لە جەنگی (أحُد) بەشدارییان کرد، جا پێغەمبەرﷺ ناوی لێنا: (أبُوعامِرالْفاسِق). ئەم (أبُوعامِر)ە باوکی حەزرەتی(حَنْظَلَة)یەﷺ: کە لە غەزای (أُحُد) شەهید بوو و (مَلائِكَة) شوشتیان.

جا کە (أبُوعامِر) لە (مَكّة)دا شوێنی حاوانەوەی نەما، چووە (شام)، لەوێوە نامەی بۆ (مُنافِق)ەکانی (مَدِینَة) ناردو گوتی: لەشکری (قَیْصَر)ی (رُوم) دەهێنم (مُحَمَّد) لە (مَدِینَة) دەردەکەم، کەوابوو: ئێوە شوێنێك دروست بکەن بۆ کۆبونەوەو حەشاردانی جاسوسەکان کە دێنە (مَدِینَة).

جا دوانزە (مُنافِق) لە نزیك مزگەوتی (قُباء) مزگەوتێکیان دروست کرد، ئینجا گوتیان: یا رَسُولَ الله مزگەوتێکمان دروست کردوە بۆ نەخۆش‌و کەسانی پێویست لە شەوانی باران‌و زستاندا، پێمان خۆشە نوێژی تێدا بکەی؟ مەبەستیان ئەوە بوو: لە ئاشکرایی‌دا ببێتە مزگەوتێکی‌شەرعی، بۆ ئەوەی بتوانن لە پەنهانی‌دا مەبەستە پیسەکانیان تێیدا ئەنجام بدەن. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وا ئێستا خەریکی رۆیشتنین بۆ غەزای (تَبُوك)، کاتێ گەڕاینەوە إنْ شاءالله نوێژی تێدا دەکەین.

ئینجا کە پێغەمبەرﷺ لە غەزای (تبُوك) گەڕاوەو گەیشتە نزیك (مَدِینَة)، لەبارەی مزگەوتەکە (وَحي)ی بۆ هات‌و خوایگەورە فەرمووی: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِداً ضِـــراراً وَكُفْراً وَتَفْرِيقاً بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإرْصَاداً لِمَنْ حَارَبَ اللهَ وَرَسُولَهُ مِنْ قَبْلُ وَلَيَحْلِفُنَّ إنْ أَرَدْنَـــا إلاّ الْحُسْنَى وَاللهُ يَشْهَدُ إنَّهُـــمْ لَكَـــاذِبُونَ، لا تَقُـــمْ فِيـــهِ أَبَـــداً...﴾التوبة: ١٠٧و١٠٨، ئەوانەی مزگەوتێکیان دروست کردوە بۆ زیان لێدانی مزگەوتی(قُباء)و ئیسلام، بۆ یارمەتیدانی کوفرو بۆ پەرتەوازەکردنی موسوڵمانان‌و دورخستنەوەیان لە مزگەوتی (قُباء)، بۆ مۆڵگەو حەشارگەی ئەو کەسەی پێشتریش جەنگی خواو پێغەمبەریﷺ کردوە–کە (أبُوعامِرالْفاسِق)ە– سوێندیش دەخۆن‌و دەڵێن: مەبەستمان بە دروستکردنی ئەم مزگەوتە کارێکی جوان‌و باشە. خوایگەورە شاهیدی دەدا: ئەوانە درۆزنن، ئەی پێغەمبەرﷺ نەکەی، هەتا هەتایی نەچیە ئەو مزگەوتەو نوێژی تێدا نەکەی...تا کۆتایی ئایەتەکە.

جا یەکسەر پێغەمبەرﷺ کۆمەڵە (صَحابَة)یەکی نارد: مزگەوتەکەیان سوتاندو دیوارەکانیشیان روخاند، جا فەرمانی دا: شوێنەکەشی کرا زبڵخانە.

ئینجا پێغەمبەرﷺ لە رێگەی گەڕانەوەیدا فەرمووی: هەندێ کەس لە (مَدِینَة)دا ماونەوە، ئێوە لە هەر شوێنێك‌و لە هەر دۆڵێکدا رۆیشتبن، ئەوان لەگەڵ ئێوەدا

هاوبەشن لە پاداشتی غەزادا، چونکە ئەوان بە هۆی عوزرێکی‌شەرعی دوا کەوتون، واتە: چونکە نیەتی غەزایان هەبووە، بە هۆی نیەتەکەیان پاداشتیان بۆ دەنوسرێ.

ئینجا کە پێغەمبەرﷺ لە (مَدِينَة) نزیك بۆوە فەرمووی: ﴿ئەمە (طابَة)یە، ئەمە کێوی (أُحُد)ە ئێمەی خۆش دەوێ‌و ئێمەش خۆشمان دەوێ﴾. جا خەڵکی (مَدِينَة) هاتنە پێشوازییان‌و سرودی (طَلَعَ الْبَدْرُ عَلَيْنا)یان دەگوت.

﴿ بەسەرهاتی (صَحابَة)کانی دواکەوتوو لە غەزای (تَبُوك) ﴾

ئینجا کە پێغەمبەرﷺ لە مانگی ڕەمەزاندا لەم غەزایە گەیشتەوە جێ‌و هاتەوە ناو (مَدِينَة)، یەکسەر چووە ناو مزگەوت‌و دوو ڕەکعەت سوننەتی کرد، ئینجا دانیشت بۆ کاروباری خەڵك، جا هەشتاو هەندەك (مُنافِق)ی دواکەوتوو لەم غەزایە، هاتنە لای پێغەمبەروﷺ بە درۆ عوزریان هێناوەو بە درۆ سوێندیان خوارد، پێغەمبەریشﷺ ئاشکرایەکەی لێ‌قبوڵ کردن‌و نهێنیی ناو دڵیانیشی دایە دەست خودا.

هەروەها دە (صَحابَة)ش بە بێ‌عوزر لەم غەزایە دواکەوتبون، ئینجا کە پێغەمبەرﷺ گەڕاوە بۆ (مَدِينَة)، حەفت (صَحابَة) لەو دەیانە، خۆیان لە ستونەکانی مزگەوت بەستەوە، تاکو پێغەمبەرﷺ عوزریان قبوڵ بکاو بەریان هەڵبدا، بەڵام پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿سوێندم بە خوا: من بەریان هەڵنادەم تا خوای‌گەورە بەریان هەڵدەدا، ئەوانە وازیان لە من هێناو لە غەزاش دواکەوتون﴾.

جا خوای‌گەورە تۆبەی ئەو حەفت کەسانەی قبوڵ کردو فەرمووی: ﴿وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا عَمَلاً صَالِحاً وَآخَرَ سَيِّئاً عَسَى اللهُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ التوبة: ١٠٢، هەندێك (صَحابَة)ی‌تری دواکەوتوو دانیان بە گوناهەکانی‌خۆیاندا هێناو درۆیان نەکردو هیچ عوزرێکی بە درۆیان نەهێناوە، ئەو حەفت (صَحابَة)یە کردەوەی چاکیان تێکەڵی کردەوەی خراب کردوە –واتە: غەزایەکانی‌ڕابردوویان تێکەڵی دواکەوتنی ئەم غەزایە کردوە– خوای‌گەورە تۆبەیان لێ‌قبوڵ دەکا، خوای گەورە لە گوناه خۆش دەبێ‌و ڕەحم بە تۆبەکار دەکا.

جا بزانە: یەکێك لەم حەفت کەسانە حەزرەتی(أبُولُبابَة) بووؓ–کە لە غەزای (بَنِي‌قُرَيْظَة)شدا خۆی بەستبۆوەو باسمان کرد–جا کە ئەم جارەش خوای‌گەورە تۆبەی لە خۆی‌و لە هاوڕێکانی قبوڵ کردو بەرهەڵ دران، ویستی هەموو ماڵی‌خۆی بکاتە خێر، بەڵام پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سێیەکی ماڵت بەسە بیکەیە خێر.

ئینجا لەبارەی سێ (صَحابَة)کەی‌تریش–کە خۆیان نەبەستبۆوە –خوای‌گەورە فەرمووی: ﴿وَآخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ اللهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَاللهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ التوبة: ١٠٦، هەندێ دواکەوتووی‌تریش دواخراون تا خوا فەرمانێك دەدا: یان سزایان

دەدا، یان تۆبەیان لیٚقبولٚ دەکا، خوایگەورە زاناو کارلەجیٚیە.

ئینجا ئەم سیٚ (صَحابَة) دواکەوتووەش–(کَعب بن مالِك)و (مُرارَة بن الرَّبیع) و(هِلال بن أمیَّة)رضي الله عنهم– هاتنە لای پیٚغەمبەرﷺ دانیان بە تاوانی خۆیاندا هیٚناو هیچ درۆیان نەکردو سویٚندیشیان نەخوارد، حەزرەتی(کَعب)رضي الله عنه فەرمووی: کە چومە خزمەت پیٚغەمبەرﷺ بە زەردە خەنەیەکی تورِەییەوە فەرمووی: بۆچیلە غەزا دوا کەوتی؟ حەزرەتی(کَعب) گوتی: یارَسُولَ الله ئەگەر جگە لە تۆ لە لای کەسیٚکیتر دانیشتبام دەمتوانی بە عوزریٚك خۆم دەرباز بکەم، بەلاٚم ئەگەر ئیٚستا لە لای تۆ درۆ بکەمو رِازیت بکەم، ئەوە خوایگەورە لیٚم تورِە دەبیٚ، بەلاٚم رِاستی دەلیٚمو تکای لیٚبوردنیخوا دەکەم، نا وَالله یا رَسُولَ الله لەم دواکەوتنەم هیچ عوزریٚکم نەبو.

جا پیٚغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەمە رِاستیی گوت، هەلٚسە بـرِۆ تا خوایگەورە برِیاریٚکت بۆ دەدا. جا حەزرەتی(مُرارَة)و حەزرەتی(هِلال)ش وەکو حەزرەتی (کَعب)رضي الله عنه رِاستییان گوتو پیٚغەمبەرﷺ بەوانیشی فەرموو: هەلٚسن برِۆن تا خوایگەورە برِیاریٚکتان بۆ دەدا. جا خزمەکانی (کَعب) گوتیان: ئەی (کَعب) بۆچی تۆش عوزریٚکت نەهیٚناوە، خۆ پیٚغەمبەرﷺ عەفوی دەکردیو تکای لیٚخۆشبوونی گوناهیشی بۆ دەکردی؟ منیش گوتم: کەسیتر وەکو منی بە سەر هات؟ گوتیان: بەلٚیٚ، (مُرارَة)و (هِلال)ش وەکو تۆی پیٚگوتن. حەزرەتی(کَعب)رضي الله عنه گوتی: ئەو دوو پیاوە چاکانە

ئامادەی غەزای (بَدر) بوینە، منیش وەکو ئەوان دەبم.

ئینجا پیٚغەمبەرﷺ برِیاری دا: نابی هیچ کەسیٚك قسەلە گەلٚ ئەو سیٚ (صَحابَة)یە بکا. ئیتر موسولٚمانەکان خۆیان لیٚ دور خستنەوە: نە سەلامو نە قسەیان لەگەلٚ نەدەکردن، تا پەنجا رِۆژ لەو حالٚەدا مانەوە، جا حەزرەتی(مُرارَة)و حەزرەتی(هِلال) رضي الله عنهما لە مالٚەکەیاندا دانیشتنو دەگریان، بەلاٚم حەزرەتی(کَعب)رضي الله عنه لەوان بەهیٚزتر بوو، دەهاتە مزگەوتو نویٚژی بە جەماعەت لە پشت پیٚغەمبەرﷺ دەکردو لە بازارِدا دەگەرِاو کەسیش قسەی لەگەلٚ نەدەکرد، تا رِۆژیٚك لە بازارِدا ئازوقە فرۆشیٚکی ولاٚتی (شام) نامەیەکی دایە دەست حەزرەتی(کَعب)رضي الله عنه، کە پاشای (غَسّان) بۆی ناردبوو و نوسیبوی: (بیستومە هاوریٚکەت–مُحَمَّدﷺ– دلٚتەنگی کردوی، خوایگەورە تۆی لە خانەی زەلیلیو لەدەستچوون دانەناوە، وەرە لای ئیٚمە یارمەتیت دەدەینو دلٚت دەدەینەوە). جا حەزرەتی(کَعب)رضي الله عنه گوتی: ئەمەش بەلاٚیەکیترە. جا یەکسەر نامەکەی سوتاند.

ئینجا کە لەم پەنجا رِۆژە، چل شەو رِۆیشت، پیٚغەمبەرﷺ فەرمانی دا: هەرسیٚکیان لە

ژنەکانیان جیا ببنەوە، واتە: لە یەك ماڵدا لەگەڵیاندا نەبن‌و نزیکیان نەکەون.

جا ژنەکەی حەزرەتی(هِلال) رضی الله عنهما هات‌و گوتی: یا رَسُولَ الله (هِلال) پیرێکی بە ساڵداچووە کەسێك نیە خزمەتی بکا، پێت ناخۆشە خزمەتی بکەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نا، بەڵام نزیکت نەکەوێ. ژنەکەشی گوتی: وَالله جولەی هیچی نەماوەو هەر خەریکی گریانە.

حەزرەتی(کَعب)ﷺ دەفەرموێ: ئینجا کە پەنجا ڕۆژ تەواو بوو، ڕۆژێك نوێژی سبەنێم لە سەربانی ماڵەکەم کردو دانیشتم‌و لەو پەڕی دڵتەنگیدا بوم، لە ناکاو بیستم یەکێك لە سەر کێوی (سَلع) هاواری دەکاو دەڵێ: هۆ (کَعْب بن مالِك) موژدەت لێبێ. منیش یەکسەر سوجدەی شوکرم بۆ خوا برد، چونکە زانیم دڵخۆشبوون هاتوەو تۆبەمان قبوڵ بووە، جا ئەوەی گوێم لە دەنگەکەی بوو و موژدەی دابومێ، هاتە لام‌و منیش هەردوو پەشتەماڵەکەیخۆمم لە مزگێنی دانێ، وَالله جگە لەم پەشتەماڵانە هیچی جلێترم نەبو، بۆیێ دوو پارچە جلم بە ئەمانەت لە (أبُوقَتادَة) وەرگرتن‌و چومە خزمەت پێغەمبەرﷺ، جا کۆمەڵ کۆمەڵ موسوڵمانەکان پێشوازییان لێدەکردم‌و پیرۆزبایی قبوڵبوونی تۆبەیان لێدەکردم، جا کە چومە ناو مزگەوت، پێغەمبەرﷺ دانیشتبوو و موسوڵمانەکان لە دەورەی بون، جا (طَلحَة بن عُبَیْدِالله)ﷺ لە بەرم هەڵساو غاری دا تۆقەی لەگەڵ کردم‌و پیرۆزبایشی لێکردم، ئەم ڕێزلێنانەی (طَلحَة)م لە بیر ناچێتەوە، چونکە لە (مُهاجِر)ەکان جگە لە (طَلحَة) کەسێتر لە بەرم هەڵنەستا، ئینجا سەلامم لە پێغەمبەرﷺ کرد، جا پێغەمبەرﷺ لە خۆشیان ڕوخسارە پیرۆزەکەی بریقەی دەداو فەرمووی: ﴿موژدەت لێبێ بە چاکترین ڕۆژی تەمەنت لەو کاتەوە کە لە دایکت بوی﴾. جا حەزرەتی(کَعب)ﷺ گوتی: ئەم تۆبە قبوڵکردنە لە تۆوەیە، یان لە خواوەیە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە خواوەیە.

جا حەزرەتی(کَعب)ﷺ گوتی: یارَسُولَ الله بە هۆی قبوڵبوونی تۆبەکەم هەموو ماڵم واز لێدێنم‌و دەیکەمە خێر. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەشێکی ماڵەکەت بۆ خۆت بهێڵەوە، ئەوها باشترە. واتە: تەنها بەشێکی بکە خێر.

جا لەبارەی قبوڵکردنی تۆبەی ئەم سێیانە، خوایگەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَعَلَى الثَّلاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنْفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَنْ لا مَلْجَأَ مِنَ اللهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا إِنَّ اللهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ التوبة: ١١٨، خوایگەورە تۆبەی لەو سێ (صَحابَة)یەش قبوڵ کرد کە لە غەزایەکەی (تَبُوك) دواکەوتبون‌و قبوڵکردنی تۆبەکەیان دواخرابوو، تا وایان لێهات ئەم زەمینە فراوانەیان لێ بەرتەسك بوبوو، هەم گیانیخۆیشیان لێ بەرتەسك بوبوو؟

چونكە قسەیان لەگەڵ نەدەكرا، زانییان هیچ پەنادانێك لە عەزابیخوا نیە تەنها تۆبەو گەڕانەوە بۆ لایخوا نەبێ، ئینجا خوایگەورە تۆبەی لێقبوڵ كردن تاكو لە سەر تۆبەكەیان بەردەوام بن، بەڕاستی خوایگەورە بە بێئەندازەیی تۆبە لە بەندەكانی قبوڵ دەكاو ڕەحمیان پێدەكا.

كەوابوو: دواكەوتووەكانی غەزای (تبُوك) چوار جۆرن: جۆرێكیان بە فەرمانی پێغەمبەرﷺ دواكەوتبون: وەكو ئیمام (علي)و حەزرەتی(مُحَمَّد بن مَسلَمَة)رضيالله عنهما.

جۆرێكیش بە عوزر دوا كەوتبون: وەك كوێرو بێهێزو نەبووەكان. جۆرێكیش بێعوزر دوا كەوتبونو گوناهبار بون: وەكو ئەم دە (صَحابَة)یە، واتە: سێ دواخراوەكەو (أبُولُبابَة)و هاوڕێكانی. جۆرێكیش (مُنافِق)بونو سوێندی بە درۆیان خوارد.

جا ئەوەش بزانە: لە مانگی (شَعبان)ی ساڵی نۆیەمی كۆچی، حەزرەتی(أمُ كَلثوم) كیژی پێغەمبەرﷺ وەفاتی كرد رضيالله عنها.

## ﴿ هاتنی وەفدی (ثَقِیف)و ڕووخاندنی بتەكەی (اَللاّت) ﴾

پێغەمبەرﷺ لە مانگی ڕەمەزاندا لە غەزای (تَبُوك) گەیشتەوە (مَدِینَة)، جا هەر لەم مانگەدا وەفدی (ثَقِیف)=دانیشتووانی(طائِف) هاتنە خزمەت پێغەمبەروﷺ موسوڵمان بون، چونكە باسمان كرد كە پێغەمبەر لە گەمارۆدانی (طائِف) گەڕاوە، دوعای موسوڵمانبوونی بۆ كردن، جا لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا (عُروَة بن مَسعُود الثَقَفِي)ﷺ هاتە لایو موسوڵمان بوو، ئینجا ئیزنی لە پێغەمبەرﷺ وەرگرت: بگەڕێتەوە لای گەلەكەی=(ثقِیف)، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دەتكوژن. ئەویش گوتی: یا رَسُولَ الله خۆشیان دەوێمو نامكوژن، جا گەڕاوە لای (ثَقِیف)و داوای موسوڵمانبونی لێكردن، ئەوانیش تیربارانیان كردو كوشتیانﷺ.

ئینجا لە دوای مانگێك گەورە پیاوانی (ثَقِیف) كۆ بونەوەیان كردو گوتیان: تازە ئێمە توانای جەنگی موسوڵمانانمان نیە، چونكە دەوروبەرمان گشتی موسوڵمان بوینە، بۆیێ لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی نۆیەمی كۆچیدا شەش كەسیان بە وەفد هاتنە لای پێغەمبەرﷺ، جا كە لە (مَدِینَة) نزیك بونەوە، حەزرەتی(اَلمُغِیرَة بن شُعبَة)ﷺ–كە لە هۆزی(ثَقِیف) بوو– ئەوانی دیتو یەكسەر بە پەلە هاتەوە (مَدِینَة)، تاكو موژدەی هاتنیان بداتە پێغەمبەرﷺ، جا لە ڕێگەدا گەیشتە ئیمام (أبُوبَكر)وﷺ هەواڵەكەی پێگوت، ئیمام (أبُوبَكر)شﷺ فەرمووی: توخوا پێش من مەكەوە، تاكو من لە پێش تۆدا موژدەی هاتنیان بدەمە پێغەمبەرﷺ. جا ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ موژدەی دایە پێغەمبەرﷺ، جا وەفدەكە هاتنە خزمەت پێغەمبەروﷺ لە مزگەوت دابەزین، پێغەمبەریشﷺ خێمەیەكی لە تەنیشت مزگەوت بۆ هەڵدان، تاكو گوێیان لە قورئان

ببێو فێره نوێژ ببن.

جا هەموو ڕۆژێکیش دەهاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەریشﷺ دوای نوێژی عیشا دەچووە لای ئەوانو لەبارەی ئایین قسەی بۆ دەکردن، جا وەفدەکە موسوڵمان بون، بەڵام داوایان لە پێغەمبەرﷺ کرد: نوێژیان لە سەر لاببا. پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ﴿لا خَيْرَ فِي دِينٍ لا صَلاةَ فِيهِ﴾ ئاینێك نوێژی تێدا نەبێ، هیچ چاکەی تێدا نیە. جا ئەم جارە داوایان کرد: زیناو ڕیباو شەراب بۆ ئەوان حەڵاڵ بێ. پێغەمبەرﷺ ئەوانەشی لێقبوڵ نەکردن، ئەم جارە داوایان کرد: بتەکەی (اَللات) تا سێ ساڵیتر نەڕوخێنێ. بەڵام پێغەمبەرﷺ بۆ تەنها ڕۆژێکیش ڕازی نەبو ئەم بتە بمێنێ، بۆیێ گوتیان: کەوابوو: یا رَسُولَ الله بە خۆت کەسێك بنێرە بیڕوخێنێ؟ واتە: نەوەك ئەوان لەگەڵ ئافرەتو کەم عەقڵەکانیان توشی ئاژاوە ببن.

جا کە وەفدەکە ویستی بگەڕێتەوە، پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(عُثمان بن أبيالعاص)یرضي الله عنه کردە ئەمیری (ثقِيف)، تاکو پێشنوێژییان بۆ بکا، چونکە لەو ماوەیەدا ئەو لە هەمووانیان زیاتر قورئانی لەبەر کردبوو و زیاتر فێری شەریعەتیئیسلام بوبوو، لەگەڵ ئەوەشدا: لە هەموو ئەندامەکانی وەفدەکە بچوکتر بوو و تازە پێگەیشتوو بوو.

ئینجا پێغەمبەرﷺ ئەمیر (خالِد)و حەزرەتی(أبُوسُفيان)و حەزرەتی(اَلمُغِيرة)یرضي الله عنهم ناردن بۆ ڕوخاندنی بتەکەی (اللات)، جا کە دەستیان بە ڕوخاندن کرد، ئافرەتەکانی (ثقِيف) بە سەری رووتو هاوارو ڕۆڕۆوە لە بەرامبەری وەستابون، بۆیێ حەزرەتی (اَلمُغِيرة)رضي الله عنه گوتی: ئێستا گاڵتەیەکیان پێدەکەم! جا کولینگێکی لە بتەکە دا و خۆی بەرداوە سەر زەویو هەڵات، جا ئافرەتو منداڵەکان هاواریان کرد: خوای ئێمە کوشتی، چۆن دەتوانێ بیڕوخێنێ؟ جا حەزرەتی(اَلمُغِيرة)رضي الله عنه گەڕاوەو گوتی: بێعەقڵینە گاڵتەم بە ئێوە کرد، جا ئەم جارە بە تەواوی ڕوخاندی تا لەگەڵ زەمین ڕاستی کرد، بەڵام ئەمیر (خالِد)رضي الله عنه بەوەندە ڕازی نەبو، بەڵکو بەردەکانی بناغەشی دەرهێنان.

*دەك بە قوربانی دەستەکانتان بم ئەی قوتابیانی قوتابخانەیپێغەمبەرﷺ، ئەی بت شکێنەکانو کافر بەزێنەکان، ئەی نەڕەو شێرانی ڕۆژێو خواپەرستانی شەوێ، رضي الله عنهم اجمعين.*

ئینجا لە دوای موسوڵمانبوونی (ثقِيف) لە هەموو لایەکەوە وەفدی عەرەبەکان دەهاتنە خزمەت پێغەمبەروﷺ موسوڵمان دەبون، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللهِ أَفْوَاجاً﴾ النصر: ٢، دەبینی خەڵك مۆمەڵ کۆمەڵ دێنە ناو ئایینی خواو موسوڵمان دەبن. بۆیێ بەم ساڵەی ئۆیەم دەگوترێ: (عامُ الْوُفُود) ساڵی وەفدەکان، جا ئێمە لە بەر زۆری ناوی وەفدەکان نانوسین.

## ﴿ حەج کردنی ئیمام ( أَبُوبَكر ) بە ئەمیرایەتی ﴾

ئینجا له مانگی (ذیالقَعْدَة)ی ساڵی نۆیەمی کۆچی، پێغەمبەرﷺ ئیمام (أبُوبَکْر)یﷺ کردە ئەمیری حەج، جا سێسەد (صَحابَة)ی له (مَدِینَة)وە بردنو بۆ حەج کردن چونه (مَکَّة)، تا ئەم ساڵەش کافرەکان دەهاتنە حەج کردنو قەدەغە نەکرابون، ئینجا کە ئیمام (أبُوبَکْر)ﷺ له گەڵ حاجیەکان له (مَدِینَة) چونە دەرەوە، خوایگەورە سەرەتای سورەتی (بَراءَة)=(التَوبَة)ی بۆ پێغەمبەرﷺ ناردە خوارەوە، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿تەنها دەبی پیاوێك له بنەماڵەیخۆم ئەم ئایەتانە بە خەڵکی ڕابگەیەنێ﴾.

جا پێغەمبەرﷺ ئیمام (عَلِي)یﷺ بە دوای ئیمام (أبُوبَکْر)داﷺ ناردو له (عَرَفَة)و له (مِنَی) چل ئایەتەکەی سەرەتای سورەتی (بَراءَة)ی بۆ خەڵکی خوێندەوەو بە خەڵکی ڕاگەیاند: ﴿هیچ کافرێك ناچێتە بەهەشت، لەم ساڵ بەولاوە: نابی هیچ کافرێك حەج بکا، نابی هیچ کەسێك بە ڕووتی تەواف (بَیْت) بکا، هەر کافرێك تا ماوەیەك پەیمانی جەنگ نەکردنی لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ هەیە، ئەوە تا ماوەی پەیمانەکەی تەواو دەبێ دەستی لێنادرێ، هەر کافرێکیش بێ ماوە دانان پەیمانی جەنگ نەکردنی هەیە، ئەویش  تا چوار مانگیتر دەستی لێنادرێ، هەر کافرێکیش هیچ پەیمانێکی جەنگ نەکردنی نیە، ئەویش تا (الأَشْهُرالحُرُم) تەواو دەبن –واتە: تا پەنجا ڕۆژیتر– دەستی لێنادرێ، ئینجا کە ئەو سێ کاتانە تەواو بون، کافرەکان لەگشت کاتو شوێنێکدا دەکوژرێن، هەروەك له (تفسیرالقُرْطُبِي)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ مردنی ( عبدالله بن أُبَيِّ ابن سَلُول )ی سەرۆکی ( مُنافِق )ەکان ﴾

له مانگی (ذیالقَعْدَة)ی ساڵی نۆیەمی کۆچی، (عبدالله بن أُبَيِّ ابن سَلُول المُنافِق)ی گەورەی (مُنافِق)ەکانی (مَدِینَة)، مرد، جا حەزرەتی(عبدالله)ی کوڕیﷺ –کە (صَحابَة)یەکی بێگەرد بوو– هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ داوای لێکرد: کراسەکەیخۆی بداتێ تاکو باوکە (مُنافِق)ەکەی تێدا کفن بکا، هەم نوێژی(جَنازَة)ش لە سەر بکا. جا پێغەمبەرﷺ کراسەکەی دایێو هەڵسا نوێژی (جَنازَة)شی لە سەر بکا.

جا ئیمام (عُمَر)ﷺ فەرمووی: یا رَسُولَ الله چۆن نوێژ لە سەر ئەم (مُنافِق)ە دەکەی؟ جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: من کراومە سەرپشك. جا کە پێغەمبەرﷺ نوێژی (جَنازَة)ی لە سەر کرد، خوایگەورە حەرامی کرد: لە مەودوا نوێژی(جَنازَة) لە سەر کافرەکان بکرێو ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَلا تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَداً وَلا تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ﴾ التوبة: ٨٤، نوێژی(جَنازَة) لە سەر هیچ کەسێك لە کافرەکان مەکەو لە سەر گۆڕەکەشی ڕامەوەستە، واتە: بەشداری ناشتنی مەکە. (البدایة والنهایة) ب(٣) ل(٦٨–١٠٥) و(السیرة الحلبیة) ب(٣) ل(١٨٣–٢٠٧و٣٠٢).

**یەکەم: بە غەزای ( تَبُوك ) دەگوترێ: ( غَزوَةُالعُسْرَە )=غەزانی تەنگانە؟**

**پشەکی بزانە:** (تَبُوك) ناوچەیەکە دەکەوێتە باکوری (حِجان)، لەو کات لە ژێر دەسەلاتی (رُوم)دا بوو، (٧٧٨) میل لە (مَدِینَة)ی پیرۆز دور بوو. ئینجا بزانە: کە (مَكّة)ی پیرۆز ڕزگار کراو دەسەلاتی کوفر لەوێدا نەماو ئایینیئیسلام لە دورگەی عەرەبیدا بڵاو بۆوە، دەوڵەتی (رُوم) بەم سەرکەوتنە زۆر خەفەتبار بوو، بۆیێ بڕیاری دا: لە ڕووی بڵاوبوونەوەی ئیسلام بوەستێو هێرش بکاتە سەر (مَدِینَة)ی پیرۆز= پایتەختیئیسلام، جا بۆ ئەم مەبەستە لەشکرێکیگەورەی چل هەزار سەربازیی کۆ کردەوەو ئەم هەواڵەش گەیشتە پێغەمبەرﷺ، جا ئەم جارەش وەکو جاران نیە: موسوڵمانان تەنها لە حاڵەتی بەرگریدا بن، چونکە ئیسلام زۆر لە جاران بەهێزترە، بۆیێ پێغەمبەرﷺ بە پەلە خۆی بۆ ئەم غەزایە ئامادە کرد، تاکو پێش ئەوەی دژمن وەڕێبکەوێ، لەشکریئیسلام بگاتە ناو خاکی دوژمن، بۆ ئەوەی ورەی دوژمن داببەزێنیێو ترسو دڵەڕاوکێ بخاتە ناو دەوڵەتی (رُوم).

جا هەرچەند ساڵەکە ساڵێکی نەهات بوو، موسوڵمانان نەبوویی بون، کاتەکە گەرما بوو، ڕێگەی غەزایەکە بە ئەندازەی (٧٧٨)میل لە (مَدِینَة) دور بوو، بەڵام ئەوانە هیچیان نەبونە کۆسپ لە ڕێگەی ئەم غەزایە! چونکە بە ڕاستی (صَحابَة)ی پێغەمبەرﷺ پیاو بون، پیاوی ڕۆژی تەنگانە بون، نەڕرە شێری مەیدان بون، پێشینە گوتویانە: (**هِمَةُ الرِّجَالِ تَقْلَعُ الْجِبالِ**) **ویستنو هەوڵدانی پیاوان کێوەکان هەڵدەکەنێ.**

جا بەڕاستی هەموو (صَحابَة)کانیپێغەمبەرﷺ بە گیانو بە ماڵ ئامادەی تێکۆشانو قوربانیدان بونو بە کرداریش سەلماندیان کە باوەڕیان ئەوەندە بەهێزە: بۆ خزمەتی ئەم ئیسلامە هەموو ماندووبونێکو ئازارێك قبوڵ دەکەنو گوێڕایەڵیی ئەوان بۆ خواو پێغەمبەرﷺ لە سەرەوەی هەموو شتێکە، هەر بۆیش خوایگەورە لە دونیادا–هەروەك لە قیامەتیشدا–پاداشتی ئەم غەزایەی دانەوەو جەنگی لە کۆڵ کردنەوەو چەند گەورەو سەرکردەیەکی (ڕوم) ملکەچ بونو (جِزيَة)=سەرانەیان دا.

جگە لە مەش خوایگەورە بە بەرەکەتی ئەم غەزایە لە هەموو کەمو کورەیەکانیان خۆش بوو، هەروەك دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ تَابَ اللهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهاجِرِينَ وَالأَنْصارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِنْ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ﴾ التوبة: ١١٧، **بێگومان خوایگەورە تۆبەی قبوڵ کرد: لە پێغەمبەروﷺ لە (مُهاجِر)و لە (أَنْصار)، ئەوانەی لە کاتی تەنگانەدا لە غەزای (تَبُوك) شوێن پێغەمبەرﷺ کەوتن، پاش ئەوەی نزیك بوو دڵی هەندێکیان لە ڕاستی لابدا بە هۆی سەختیی کات و شوێنەکە، ئینجا خوایگەورە تۆبەی ئێقبوڵ کردن، بەڕاستی خوایگەورە بە بەزەییو بە ڕەحمە لەگەڵ ئەوان.** پوختە کراوە: لە (فقه السيرة، للبوطي) ل(٤٤٧–٤٤٩) و(سيرة

الصلابي) ب(٢) ل(٥٧٣-٥٧٥).

**دووەم: گەورەیی و ڕێزداری ئیمام (عُثمان)**ﷺ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿...مَنْ جَهَّزَ جَيْشَ الْعُسْرَةِ فَلَهُ الْجَنَّةُ. فَجَهَّزَهُ عُثْمانُ﴾ رواه‌البخاری فی‌الوقف، **هەر کەسێك پێویستیەکانی (جَيْشُ الْعُسْرَة)=لەشکری(تَبُوك) پێك بێنێ، بەهەشتی بۆ دەبێ.**

جا ئیمام (عُثمان)ﷺ پێویستیەکانی لەشکرەکەی پێك هێناو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ما ضَرَّ عُثْمانَ ما فَعَلَ بَعْدَ الْيَوْمِ﴾ **لە دوای ئەمڕۆ زیان لە (عُثمان) نادا هەرچی بیکا.**

دەك ئەم موژدەیەت پیرۆز بێ: ئەی ئیمامی شەهیدی ستەم لێکراو، ئەی بەهەشتیی تۆمەت پێکراو، ئەی خاوەنی هەردوو کۆچەکەی (حَبَشَة)و (مَدِينَة)، ئەی (ذِي النُّورَيْن)ی دوو جار زاوای پێغەمبەری ئاخیر زەمانﷺ، ئەی ئەو کەسەی لەبارەی وی‌و هاوڕێکانی خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِنْدَ اللهِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ * يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُمْ بِرَحْمَةٍ مِنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّاتٍ لَهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُقِيمٌ﴾ التوبة: ٢٠و٢١. **ئەوانەی ئیمانیان بە خواو پێغەمبەرﷺ هێناوە لە ڕێگای‌خوا کۆچیان کردووە بە گیانیان‌و بە ماڵیان لە ڕێگای‌خوا غەزایان کردووە، ئەوانە لە لای‌خوا پاداشتیان گەورەترەو ئەوانە بەختەوەرن‌و بە بەهەشت شاد بوینە، خودای‌خۆیان موژدەیان دەداتێ: بە ڕەحمەتی‌خۆی‌و بە ڕازی‌بوونی خۆی‌و بە چەند بەهەشتێك کە بۆ ئەوان ئامادە کراوەو خۆشی‌و مانەوەیەکی بەردەوام لەو بەهەشتانەدایە.**

**بەڵێ:** کە تەماشای کۆچکردن دەکەی، ئیمام (عُثمان)ﷺ دوو جار کۆچی کردوە: جارێك بۆ (حَبَشَة)، جارێك بۆ (مَدِينَة). کە تەماشای غەزای بە گیان‌و بە ماڵ دەکەی، ئیمام (عُثمان)ﷺ لەم غەزایەدا لە هەموو (صَحابَة)کان زیاتر ماڵی بەخشیوە. جگە لەمەش: کە بیری (رُومَة)ی کڕی، موژدەی بەهەشتی درایێ. کە پارچە زەویەکەی تەنیشت مزگەوتی پێغەمبەریﷺ کڕی‌و وەگەڵ مزگەوتی دا، موژدەی بەهەشتی درایێ. کە لە سەر کێوی (حراء) لەگەڵ پێغەمبەردا بووﷺ موژدەی بەهەشتی درایێ.

ئیتر ناتوانم هەموو گەورەیی ئیمام (عُثمان)ﷺ باس بکەم، بەڵام ئەوەندە دەڵێم: ئەمەیان ئیمام (عثمان)یﷺ منە، هەی شەمشەمە کوێرەی تاریکی نەزانی، هەی بۆقە ڕەشکەی چڵکاوی (ضَلالَة)، دەك چاوت کوێر بێ‌و زوبانت لاڵ بێ‌و دەستت بشکێ، کە ڕەخنە لە ئیمام (عثمان)ﷺ دەگری‌و دەنوسی‌و دەڵێی: (عُثمان) نەیتوانیوە دەوڵەتی ئیسلام بەڕێوە ببا، پیاوێکی بێ‌هێز بووە، تەماعی کورسیی هەبوو، لە کورسیەکەی دانەبەزی، بۆیێ ئاژەوەو کوشتار کەوتە ناو موسوڵمانان، ئەگەر من لە جێی ئەوی بام، ئەوهام نەدەکرد، (عُثمان) بیدعەی لە ئیسلامدا پەیدا کردوە: وەك بانگە زیادەکەی جومعەو چەند شتێکی‌تر...جا ئەو قسانە هەمووی سەگ بە ئاسمان وەڕینەو بەو قسانە بەهەشت لە

دەست ئیمام (عُثمان)ﷺ ناچیو ڕێزیشی کەم نابێتەوە.

**مـاڵ بەخشین بـۆ غـەزا وەك غـەزای چـەکدارییە**، بزانـە: ئـەم مـاڵ بەخشینەی (صَحابَة)کانﷺ بۆ غەزای (تَبُوك)، بەڵگەیە: کە غەزا لە ڕێگای‌خوا، تەنها چەك هەڵگرتنو ڕۆیشتن نیە بۆ غەزا، بەڵکو بەخشینی ماڵو پارەو پول، بۆ پێویستیەکانی غەزا، بەشێکی گرنگی غەزایە، هەروەك لە ئایەتەکەیڕابردوودا خوای‌گەورە گیانو ماڵی وێکرا باس کردون. کەوابوو: ئەگەر دەوڵەتی‌ئیسلام بـۆ غـەزاکردن پێویـستیی بـە مـاڵ هـەبوو، هیـچیش لـە خەزێنـەی دەوڵەتـدا نـەبو، ئـەو کاتـە واجبـە دەوڵەمەنـدەکان–بـە خێـر، یـان بـە قـەرز– پێویستیەکانی لەشکری‌ئیسلام جێبەجێ بکەن، جا ئەگەر دەوڵەمەندەکان بە خۆشی‌خۆیان هیچیان نەدا، ئەو کاتە گەورەی موسوڵمانان بە زۆرلێکردن بە ئەندازەی پێویست بە قەرزی سەر (بَیْت الْمال) لێیان وەردەگرێ، بەڵام بـەو مەرجـەی لـە (بَیْـت الْمـال)دا بـە ئەنـدازەی پێویست ماڵو پارە نەبێ. (فتح البارى) ب(٥) ل(٤٩٦–٤٩٩) و(تحفة المحتاج بحاشية الشرواني) ب(٩) ل(٢٢٠–٢٢٢) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٤٤٩و٤٥٠).

**سێیەم: دانیشتن لەگەڵ ستەمکاران دروست نیە**، پێغەمبەرﷺ بە هەوارگـەکانی (ثَمُـود)دا بە پەلە ڕابردو فـەرمووی: ﴿لاَ تَدْخُلوُا مَساكِنَ الّذِينَ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ إلاّ أَنْ تَكُونُوا باكِينَ، أَنْ يُصِيبَكُمْ ما أَصابَهُمْ﴾روه الإمام أحمد والبخاري، **نەچنە ناو ماڵەکانی ئەو کەسانەی ستەمیان لـەخۆیان کـردوە، تـەنها بـە گریانـەوە نـەبێ، نـەوەك خوای‌گـەورە وەك ئـەوانتان بـە سـەردا بێنـێ**. جـا پێغەمبـەرﷺ فـەرمانی دا: ﴿**هـەر خواردنێك بە ئـاوی بیرەکانیـان دروست کرابێ، فڕێی بدەنو بیدەنە ئاژەڵەکانیانو فەرمانی دا: لە بیری وشترەکە ئاو بخۆنەوەو بە کاری بێنن**﴾.

ئیمامی(النواوي) فەرموویەتی: ئەم حەدیسە هاندانی تێدایە تاکو موسوڵمان ئاگاداری خۆی بێ لەو کاتەی بە شوێنی ستەمکاراندا ڕادەبرێ، بگریـێو لـە خـوا بترسـێو خـۆی بـە خـوا بپارێزی لە عەزابی‌خوا...هەم خۆی بپارێزێ لە ئاسەواری ستەمکاران.

جا ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، ئەوەی لە بەر چاوتە، حەدیسێکی (صحیح) بوو، ڕێگا نـادا بـە شوێنی ستەمکاراندا لە سەر خۆ بڕۆی، جا ئەبێ حاڵی ئەو موسوڵمانانە چۆن بـێ: کـە لـە (برلمـان)ی (علمانیـة)کانـدا بـەو پـەڕی شـانازیەوە لەگـەڵ شـەیتان پەرسـتو گـاورو بـێ باوەڕەکان دادەنیشنو بیر لەم ئایەتە ناکەنەوە، کە خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلا تَقْعُـدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَـوْمِ الظَّـالِمِينَ﴾الأنعام: ٦٨، **کاتـێ هاتـەوە بیرت کـە خـوا قەدەغـەی کردوی، هیچی‌تر لەگەڵ ستەمکاران دامەنیشە**.

ئیمامی(القرطبي) فەرموویەتی: حەڕامە موسـوڵمان بڕواتـە نـاو خـاکی دوژمـنو بـچێتە نـاو کەنێسەو دێرەکانیانو حەڕامە لەگەڵ کافرەکانو بیدعەکارەکانو تاوانبارەکـان دابنیـشیو

گوێ لە قسەکانیان ڕابگرێو کێشەکێشان لەگەڵ بکا...هەرکەسێك لە دانیشگەی تاوانبارىدا دابنێشێو قەدەغەی نەکا، لە گوناهەکەدا لەگەڵ ئەواندا یەکسانە، جا ئەگەر توانای قەدەغەکردنی نەبو، واجبە لەوێ بڕوا، بە بەڵگەی ئەم ئایەتە: ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِـي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذاً مِثْلُهُمْ﴾ النساء: ١٤٠، **بێگومان خوایگەورە لە قورئاندا بۆ ئێوەی ناردۆتە خوارەوە: هەر کاتێك گوێتان لێبوو کوفر بە ئایەتەکانیخوا دەکرێو ڕەفتاری پێناکرێو گاڵتەی پێدەکرێ، ئێوە لەگەڵیان دامەنیشن تا دەچنە ناو باسێکیتر، ئەگەر لەوێ دانیشن، ئێوەش لە تاواندا وەکو ئەوانن.** (تفسير القرطبي) النساء (١٤٠) والانعام (٦٨) و(شرح صحيح مسلم) ب(١٠) ل(٤٣٩-٤٤٠).

*جا (برلمان)ی ئەمڕۆش وەکو گەلی (ثَمود) دژایەتی خوای تێدا دەکرێو (دیمقراطی)یان کردۆتە بەرنامەیخۆیانو ئیسلامیان پشت گوێ خستووە، إنا لله وإنا إليه راجعون.*

**چوارەم: لە نێوان بانگو ئیقامەتدا ماوەیەك چاوەڕوان دەکرێ، ئینجا نوێژ دادەبەسترێ، ﴿لە غەزای (تَبُوك)دا لە نوێژی سبەینێدا حەزرەتی(عبدالرحمن بن عَوْف)ﷺ پێشنوێژی بۆ (صَحابَة)کان کرد، چونکە پێغەمبەرﷺ لە دەستنوێژگرتن درەنگ گەڕاوە، ئینجا پێغەمبەرﷺ لە ڕەکعەتیدووەم گەیشتە جەماعەتو نوێژی لە دوای حەزرەتی(عبدالرّحمن) دابەست. ئینجا ڕەکعەتەکەیتریشی بە تەنهایی تەواو کرد، جا فەرمووی: کارێکی باشتان کرد﴾.** ئیمام (مسلم) گێڕاویەتیەوە،

**هەروەها ڕۆژێکیتریش ﴿پێغەمبەرﷺ بۆ براندنەوەی کێشەی (بَنِیعَمْرو) ڕۆیشتە (قُباء) جا بۆ نوێژی عەسر حەزرەتی(بِلال)ﷺ بانگی دا، پێغەمبەریشﷺ نەگەڕابۆوە، بۆیێ ئیمام (أَبوبَکْر)ﷺ پێش کەوت پێشنوێژی بکا، جا کە نوێژی دابەست، پێغەمبەرﷺ گەیشتەوە جێ، بەلاّم ئیمام (أَبوبَکْر)ﷺ کشاوە دواوە؟ چونکە تازە نوێژی دابەستبوو، جا پێغەمبەرﷺ نوێژەکەی بۆ تەواو کردن، جا فەرمووی: ئەی (أَبوبَکْر) بۆچی لە پێشنوێژیەکەت بەردەوام نەبوی کە ئامـاژەم بۆ کردی؟...﴾** (البخاری)و (مسلم) گێڕاویەتیانەوە،

ئەم دوو حەدیسانە بەڵگەنە: کە لە دوای بانگدان تەنها ئەوەندە چاوەڕوان دەکرێ: تا خەڵکەکە کۆ دەبنەوەو دەستنوێژ دەگرنو سوننەتەکەی پێش نوێژەکە دەکەن، جا ئەمەش -جگە لە نوێژی مەغریب- ئەندازەی چوارێکە سەعاتێکی بۆ داندراوە، واتە: لە دوای چوارێکە سەعاتێك نوێژەکە دەست پێدەکەن، جا ئەگەر ئیمام مزگەوتەکە ئامادە نەبو، نابێ لە چوارێکە سەعاتێك زیاتر چاوەڕوانی بکەن، بەڵکو یەکێك وەپێش دێخن پێشنوێژییان بۆ بکا، هەروەك لەم دوو حەدیسەدا (صَحابَة)کانﷺ وایان کردوە، بەلاّم لە نوێژی مەغریب تەنها بە ئەندازەی دوو ڕەکعەت سوننەتەکەی پێش نوێژ چاوەڕوان دەکرێ نەك زیاتر.

جا بزانە: هەروەك لەم غەزایەدا پێغەمبەرﷺ نوێژی بە جەماعەت لە دوای حەزرەتی (عبدالرحمن بن عَوْف)ﷺ کردوە، لە نەخۆشیی وەفاتیشیدا ڕەکعەتێکی نوێژی سبەینێی بە جەماعەت لە دوای ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ کردوە. (فتح الباري) ب(٢) ل(٢١٧-٢١٩) و(تحفة المحتاج بحاشية الشرواني) ب(١) ل(٤٣١و٤٨٣).

**پێنجەم: (جَمْع) کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە کاتی یەکێکیاندا، پێغەمبەرﷺ لە غەزای (تَبُوك) نوێژەکانی (جَمْع) دەکردن.** ﴿عَنْ ابْنِ عَبّاس وَمُعاذٍﷺ: جَمَعَ رَسُولُ اللهِﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ بَيْنَ الظُّهْرِ والْعَصْرِ وَبَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشاءِ، وَقالا: أَرادَ انْ لا يُحْرِجَ أُمَّتَهُ﴾ رواهما الشيخان واللفظ لمسلم، **پێغەمبەرﷺ لە غەزای (تَبُوك) نوێژی نیوەڕۆو عەسری وێکڕا کۆ کردنەوەو نوێژی مەغریب و عیشایشی وێکڕا کۆ کردنەوە، ویستی ئۆممەتیخۆی توشی تاوان و زەیقەتی نەکا.**

جا لە حەدیسەکەی ئیمام (أحمد)و ئیمام (أبوداود)و ئیمامی(الترمذي)دا بەم جۆرە ڕوون کراوەتەوە: **﴿ئەگەر پێش بارکردن کاتی نیوەڕۆ هاتبا، پێغەمبەرﷺ نیوەڕۆو عەسری بە (جَمْعُ التَّقْدِيم) دەکردن، بەڵام ئەگەر پێش کاتی نیوەڕۆ باری کردبا، ئەو کاتە نیوەڕۆی دوا دەخست و لەگەڵ عەسردا بە (جَمْعُ التَّأْخِير) دەیکرد، وە ئەگەر پێش بارکردن ڕۆژ ئاوا بوبا، ئەوە مەغریب و عیشای بە (جَمْعُ التَّقْدِيم) دەکردن، بەڵام ئەگەر پێش ڕۆژ ئاوابوون باری کردبا، ئەو کاتە مەغریبی دوا دەخست و لەگەڵ عیشادا بە (جَمْعُ التَّأْخِير) دەیکرد﴾.**

**جا بزانە:** ئەندازەی سەفەری (جَمْع)-وەکو (قَصْر)- دوو قۆناغە، واتە: هەشتا کیلۆمەتر، جا دروستە: (قَصْر)و (جَمْع) وێکرا بکا، هەم دروستە: تەنها یەکێکیان بکا، یان هەر هیچێکیان نەکا، جا باسی (قَصْر) لە (فَتْح مَكَّة)دا ڕابرا. ئیتر باسی (قَصْر)و (جَمْع) لە بەرگی دووەمی (ڕووناکی رب العالمين)دا بە درێژی ڕوون کراوەتەوە، هەم بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ب(٣) ل(٤٠٣-٤٠٨) و(فتح الباری) ب(٢) ل(٧٤٨-٧٥٣).

**شەشەم: پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: (مَسْجِدُ الضِّرار) سوتێندرا.**

**پرسیار:** خۆ پێغەمبەرﷺ دەسەڵاتی هەبوو، ئەی بۆچی (صَحابَة)یەکیخۆی نەکردە ئیمام (مَسْجِدالضِّرار)؟ خۆ بە وەندەش فێڵ و پیلانی (مُنافِق)ەکان پوچەڵ دەبۆوە، یان بۆچی سوتاندی؟ خۆ گەداو هەژار لە (مَدِينَة)دا هەبون و دەیتوانی نیرو کاریتەکانی مزگەوتەکە بداتە گەداو هەژارەکان؟

**وەڵام:** تاکو ئەم بنەبڕکردنە ببێتە بڕیارێکیشەرعی تا ڕۆژی قیامەت: بەرامبەر بە هەر شوێنێك کە بە ناوی ئاین دژایەتیئیسلامی تێدا بکرێ، یان بە ناوی ئاین تاوانی تێدا بکرێ، تاکو ئاسەواری نەمێنی، هەروەك پێغەمبەرﷺ لە هەموو شوێنێك بتەکانیشی دەڕوخاندن و ئاسەواریشی نەدەهێشتن، چونکە ئەوانیش وەکو خوا دەپەرستران.

جـا ئـەم بڕیـارەش تـەنها لـە شەریعەتیئیـسلامدا نیـە، بـەڵكو لـە شـەرعی پێغەمبـەرانی ڕابردووشدا-علیهم الصلاة والسلام- هـەبوو، تەماشـا بكـە: حـەزرەتی(إِبْـراهِیم) پێغەمبـەرﷺ چۆن بتـەكانی شـكاندن، حـەزرەتی(موسـی) پێغەمبـەرﷺ چۆن كوێلكەكـەی (بَنِیإِسْـرائِیل)ی سوتاندو فڕێیدا نـاو دەریـا، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەم كۆیلكەیـە لـە زێـڕ دروسـت كرابـوو و هـەژارەكانی(بَنِیإِسْـرائِیل) زۆر پێویـستییان بـەو زێـڕە هـەبوو، چـونكە لـە سـەر وڵاتو ماڵیخۆیان دەركرابون.

ئـیتر بڕیـاری ئـەم وێكرانكردنـە گـشت ئـەو شـوێنانەش دەگرێتـەوە: كـە بێئـەخلاقیو بەدڕەوشتیی تێدا دەكرێ، هەم شەڕابخانەو قومارخانەو گشت شوێنەكانیتری گوناه تێدا كردنو زوڕناو مۆسیقا دەگرێتەوە، بۆیێ ئیمام (عُمَر)ﷺ دوكانەكەی (رُوَیْشِدُ الثَّقَفِي)ی سوتاند؟ **چونكه شەڕابی تێدا بوو، هەم گوندێكی بە تەواوی سوتاند؟ چونكە شەڕای تێدا دەفرۆشرا.**

جا ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، بێگومان بڕیاری (مَسْجِدُالضِّرار) گشت ئەو گرۆهو ڕێكخراوانەش دەگرێتـەوە: كـە ڕەووشـتو ئـەخلاقی موسـوڵمانان تێـك دەدەن، هەرچـەند بـە نـاوی چاكسازیش فێڵ لـە خـەڵكی بكـەن؟ چـونكە ئەوانـە لـە لایـەن كافرەكانـەوە پـشتگیرییان دەكـرێ، خوایگـەورەش دەفـەرموێ: ﴿مَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَلَا الْمُشْرِكِينَ أَنْ يُنَزَّلَ عَلَيْكُمْ مِنْ خَيْرٍ مِنْ رَبِّكُمْ﴾ البقرة ١٠٥، **نـە كافرەكـانی (أَهْلِ الْكِتـاب)=جولەكەو گاورەكانو نە كافرەكانیتر، پێیان خۆش نیە هیچ چاكەیەك لە لای خواوە بۆ ئێوە بێتە خوارەوە. ئیتر زۆر سەیرە: موسوڵمان بە خوایخۆی باوەڕ نەكاو بە درۆی كافرەكان باوەڕ بكا !.** ئەم باسە كۆ كراوە: لە (تحفة المحتاج بحاشیة الشرواني) ب(٦) ل(٢٨) و(فقـه السیرة، للبـوطي) ل(٤٦٣) و(سیرة الصلابي) ب(٢) ل(٦١٥-٦١٨).

**حەفتـەم: لـە باسـی (صَـحابَة)كانیدواكـەوتوو لـە غـەزای (تَبُـوك)، چـەندەها بڕیـار وەردەگیرێن، ئیمە هەندێكیان باس دەكەین:**

١-هەر كەسێك لە سەفەر گەڕاوە، سوننەتە لابداتە نزیكترین مزگەوتی لای ماڵیخۆیو دوو ڕەكعەت سوننەتی گەڕانەوە لە سەفەر بكا، جا ئەگەر پیاوێكی بە ناوبانگ بوو، سونەتە لە شوێنێكی ئاشكراو بەرفراواندا دابنیشێ، تاكو خـەڵك بێتـە لای بەخێرهاتنـەوەی لێبكـەن، هەروەك پێغەمبەرﷺ وەهای دەكرد.

٢-لە دونیادا بڕیارەكـانی شـەرع لـە سـەر ئاشـكرایی جێبـەجێ دەكـرێن، بـۆ قیامـەتیش نهێنیی ناو دڵ دەدرێتـە دەسـت خوایگـەورە، چـونكە (مُنـافِق)ەكـان بـە درۆ سـوێندیان خواردو پێغەمبەرﷺ عوزری دواكەوتنی لێ قبوڵ كردن.

٣-بۆ كاربەدەست دروستە شوێنكەوتەكانیخۆی بـە سـزادانی دەرونـی سـزا بـدا لـە سـەر بەجێنەهێنانی فەرمانیخۆی، چونكە پێغەمبەرﷺ هەرسێك (صَحابَة) دواكەوتووەكانی تـا

پەنجا ڕۆژ ئەوها سزادان.

٤-پێویستە مرۆڤ بەردەوام ڕاستگۆ بی، هەرچەند ڕاستگۆتنەکەشی زەرەرو ماندووبوونی تێدا بێ، چونکە ئەنجامی ڕاستگۆتن هەر باش دەبێو ڕاستگۆیی ڕێنموونی بۆ چاکە دەکاو چاکەش ڕێنموونی بۆ بەهەشت دەکا، هەر بۆیش پێغەمبەرﷺ چاو پۆشیو ئاسانکاری لەگەڵ (مُنافِق)ە درۆزنەکاندا بە کار هێناو لەگەڵ هەرسێك (صَحابَة) ڕاستگۆیەکاندا توندو تیژیی بە کار هێنا، چونکە (مُنافِق)ە درۆزنەکان شیاوی ئەنجامی خێرو بەهەشت نینو شیاوی ئەوەش نین لە دونیادا ئایەتی قورئان لە مەدحی ئەواندا بێنە خوارەوە، بەڵام هەرسێك (صَحابَة)کانی ڕاستگۆو دواکەوتووﷺ، شیاوی هەموو ئەنجامێکی باش بون، پێغەمبەرﷺ سزای دان تا وەك زێڕی بێگەرد پاك بونەوە، جا ئایەتی قورئانیش بۆ تۆبەی ئەوان هاتە خوارەوەو بەم سزایەی دونیا سزای قیامەتیشیان لە سەر لاچوو. ئێمەش وەکو (صَحابَة)کان پیرۆزباییان لێدەکەینو پیرۆزیان بێﷺ.

٥-قسە نەکردنو ڕوونەدانە (بِدْعَة)کارو گوناهکارەکانو سەلام لێنەکردنیان، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: هیچ کەسێك قسە لەگەڵ ئەو سێ (صَحابَة) دواکەوتووە نەکا، بۆیێ هیچ کەسێك سەلامی لێنەدەکردنو بەخۆیشی سەلامی لێوەرنەدەگرتنەوە.

٦-ئەگەر گەورەی موسوڵمانان یەکێکی سزا دا، نابێ دوژمنایەتیی بکاو دڵی بۆ تۆڵە سەندنەوە بچێ، تەماشا بکە: لەو هەموو ناخۆشیو زەیقەتیەدا حەزرەتی(کَعْب)ﷺ نامەکەی پاشای (غَسّان)ی سوتاندو هەر وەڵامیشی نەداوەو هیچ ملكو ماڵیدونیای نەویستو هەر چاوەڕوانی ڕازیبوونی خواو پێغەمبەرﷺ بوو، جا لە بەر ئەوەی لەم تاقیکردنەوەیەو تاقیکردنەوەکانیتریش سەرکەوتوو بوو، خوایگەورە گەورەترین (شَهادَة)=بڕوانامەی تۆبەی لە سورەتی(التَّوْبَة) دایێو بەختەوەری دونیاو قیامەت بوو.

٧-**سوجدەی شوکر** سوننەتە: بۆ کەسێك کە نیعمەتو خۆشیەکی نوێی بگاتێ، یان بەڵایەکی لە سەر لابچێ، هەروەك حەزرەتی(کَعْب)ﷺ لە کاتی مۆژدەی تۆبەکەیدا سوجدەی شوکری برد، جا ئەم سوجدەیە تەنها یەك سوجدەیەو واجبە: بەرەو قیبلە بێو هەموو مەرجەکانی نوێژیشی لێ بێنە جێو سەلامیش بداتەوە.

٨-سوننەتە: شتێك لە مزگێنی بداتە ئەو کەسەی هەواڵێکی خۆشی بۆ دێنێ، چونکە حەزرەتی(کَعْب)ﷺ جلەکانیخۆی دانە مۆژدەدەرەکەی.

٩-هەر کەسێك بەڵایەکی لە سەر لاچوو، یان نیعمەتێك ڕووی تێکرد، سوننەتە: بەگوێرەی تواناىخۆی خێرێك بکا-هەروەك سوجدەیشوکریش سوننەت بوو-، چونکە حەزرەتی (کَعْب)ﷺ ئەم دووانەی کردن.

١٠-سوننەتە: موسوڵمانان لە بەر یەکتری هەڵبستنو تۆقەش لەگەڵ یەکتری بکەن، هەروەها سوننەتە: پیرۆزباییش لە یەکتری بکەن، چونکە لە بەرچاوی

پێغەمبەرﷺ حەزرەتی(طَلْحَة)ﷺ لە بەر حەزرەتی(كَعْب)ﷺ هەڵساو غاری دا تۆقەی لەگەڵ كرد، (صَحابَة)كانیشﷺ پیرۆزباییان لێدەكرد.

١١–هەر كەسێك بە هۆی نەبوونیو هەژاری توشی تەنگانە دەبوو، سوننەتە بەشێكی زۆری ماڵەكەی بۆ خۆی بهێڵێتەوەو تەنها بەشە كەمەكەی بكاتە خێر، چونكە پێغەمبەرﷺ ڕێگای نەدا: حەزرەتی(كَعْب)ﷺ هەموو ماڵیخۆی بكاتە خێرو فەرمووی: ﴿**سێیەكی ماڵەكەت بەسە بیكەیە خێر**﴾. (شرح صحیح مسلم) ب(١٠) ل(٢٠١–٢١٧) و(فتح الباري) ب(٨) ل(١٤١–١٥٦).

**هەشتەم: (مُعْجِزَة)كانی غەزای (تَبُوك)**، چەند (مُعْجِزَة)یەكمان باس كردن، وەك:

١–خەبەردانی بە مردنی حەزرەتی(أَبُوذَرّ الْغِفارِي)ﷺ بە تەنهایی. ٢– دوو (صَحابَة) لە سەربازگە چونە دەرەوەو یەكێكیان تەنگە نەفەس بوو، ئەویتریش ڕەشەبا فڕاندیو لە كێوی (طَيِّء) بەریداوە. ٣– زۆربوونی ئاوی سەرچاوەكەی (تَبُوك). ٤– ئاگاداركردنەوەی پێغەمبەرﷺ لە هەوڵدانی كوشتنی بە دەستی دوانزە (مُنافِق)ەكان. ٥– ئاگاداركردنەوەی لە پیلانە گڵاوەكەی (مَسْجِدُالضِّرار).

٦– هەروەها چەند (مُعْجِزَة)یەكیتریش لەم غەزایەدا ڕوی دا، وەك: **باران بارین بە دوعایەكەی پێغەمبەرﷺ**، یەكێك بە ئیمام (عُمَر)یﷺ گوت: حەدیسەكەی (ساعَةُ الْعُسْرَة)= كاتی تەنگانەكەمان بۆ بگێڕەوە؟ ئیمام (عُمَر)ﷺ فەرمووی: ﴿لە ڕۆژێكی غەزای (تَبُوك) لە شوێنێك دابەزین، كاتەكەی ئەوەندە گەرما بوو، ئەوەندە تێنوو بوین، خەریك بوو گەردەنمان بپچڕێ، ناچار هەندێكمان وشترەكەیخۆی سەر دەبڕیو شیاكی ناو ورگەكەی دەگوشیو دەیخواردەوە، پاشماوەكەشی لە سەر سینگیخۆی دادەنا، جا ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ فەرمووی: یارَسُولَ الله دوعامان بۆ بكە. جا پێغەمبەرﷺ دەستی بەرز كردنەوەو دوعای كرد، دەستەكانی دانەناوە، تا خوایگەورە هەورێكی ناردو بارانی لێباراند، جا (صَحابَة)كان ئاویان لێ خواردەوەو شتیان لێ پڕ كرد، جا كە تەماشامان كرد: هەورەكە لە سەربازگەكەمان تێنەپەڕیبوو﴾. ئیمام (ابن كثیر) فەرموویەتی: (إسناده جيّد).

٧–﴿ڕۆژێكیتریش لە غەزای (تَبُوك) ئەوەندە برسی بوین، تا وای لێهات كۆمەڵێك یەك دانە قەسپیان بە نۆبەت دەمژی، بۆیێ گوتیان: یا رَسُولَ الله ئیزنمان بدە وشترەكانمان سەر ببڕینو گۆشتەكەیان بخۆین؟ جا ئیمام (عُمَر)ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەریخواﷺ ئەگەر وا بكەین، وڵاغی سواری نامێنێ، بەڵام داوا بكە: هەر كەسێك خواردەمەنیەكی لە لا مابێ، بیهێنێو دوعای لە سەر بخوێنە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: كەوڵێكیان ڕاخستو (صَحابَة)كانیشﷺ خواردەمەنیەكانیان هێنا: وەك چەنگە قەسپێك، لەتە نانێك...تا شتێكی كەم لە سەر كەوڵەكە كۆ بۆوە، جا پێغەمبەرﷺ دوعای بەرەكەتی لێكرد فەرمووی: بیخەنە زەرفەكانتان. جا هەموو لەشكرەكە زەرفەكانیان پڕ كردنو تا تێریش

بون خواردیانو هەندێکیش مایەوە، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَـــه إلاَّ اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، لاَ يَلْقَى اللهَ بِها عَبْدٌ غَيْرُ شاكٍّ فَيُحْجَبُ عَنِ الْجَنَّة﴾رواه الإمام أحمد ومسلم، **هەر کەسێك بە بێگومانی بەم شادەو ئیمانەوە بگاتە خزمەت خوا، نابێ ڕێی بەهەشتی لێبگیرێ﴾**.

٨- هەروەها وشترەکەی پێغەمبەرﷺ ون بوو، جا (مُنافق)ێك گوتی: (مُحَمَّد) وا تێدەگا پێغەمبەرەو هەواڵی لە ئاسمانەوە بۆ دێ، ئەی بۆچی نازانی وشترەکەی لەکوێیە؟! جا ئەم قسەیان گەیاندە پێغەمبەرﷺ، ئەویش فەرمووی: **﴿وَاللهِ من هیچ شتێکی نادیار نازانم تەنها ئەوە نەبێ، کە خودا پێم بڵێ، ئێستاش خوایگەورە شوێنی وشترەکەی نیشان دام: لە ناو دۆڵەکە جڵەوەکەی بە درەختێکەوە ئاوقاوەو گرتویەتی﴾**. جا (صَحابَة)کان چون وشترەکەیان لە شوێنەکە هێناوە. (البداية والنهاية) ب(٣) ل(٧٤و٧٥) و(سيرة الصلابي) ب(٢) ل(٥٩٨-٦٠١).

**نۆیەم: ئیسلامەتی بە بڕیاری شەرعیئیسلامە، نەك بە پێکهاتن.** وەفدەکەی(ثَقِیف) داوایان لە پێغەمبەرﷺ کرد: نوێژیان لە سەر لاببا، زیناو ڕیباو شەڕابیان بۆ حەڵاڵ بێ، بتەکەشیان لێنەڕوخێنێ. بەڵام پێغەمبەرﷺ هیچ داواکاریەکی لێقبوڵ نەکردن. ئەمەش بەڵگەیە: کە موسوڵمانبوون بە پێکهاتنێکی پێچەوانەی شەرعیئیسلام قبوڵ نیە، بەڵکو هەر کەسێك موسوڵمان دەبێ، واجبە: لە هەموو بوارێکەوە ملکەچی بڕیارەکانی خواو پێغەمبەرﷺ بێ.

کەوابوو: خواو پێغەمبەرﷺ بەو دەوڵەتە ڕازی نابن: کە زیناو ڕیباو شەڕابو گوناهەکانیتری تێدا بکرێو هیچ سزادانێکی ئەو گوناهبارانەشی تێدا ئەنجام نەدرێ، کەواتە:: دروست نیە: ئەو جۆرە دەوڵەتە (علمانی)یە بە حکومەتێکی موسوڵمان ناو ببرێو بۆ هیچ موسوڵمانێکیش دروست نیە بەشداری لەم جۆرە حکومەتەدا بکا، ئەگینا: ئەویش هاوبەشی ئەوانە لە تاوانەکەدا.

**دەیەم: هەموو جۆرە پەرستراوێكو هەموو جۆرە جەژنو ئاسەوارێکی کوفر، واجبە بنەبڕ بکرێو لە ڕەگو ڕیشەوە دەربهێندرێ**، پێغەمبەرﷺ ئەمیر (خالِد)یرضي الله عنه نارد بتەکەی (ثَقِیف)ی ڕوخاند. ئەمەش بەڵگەیە: واجبە هەموو جۆرە پەرستراوێکیکافرەکان لەناو ببردرێ، تاکو بە هیچ جۆرێك بیرەوەریی ئەم پەرستراو و ئاسەوارانە نەکرێتەوەو جەژنیان بۆ ئەنجام نەدرێ، واتە: هەروەك پەرستنی بتو سەنەمەکان بە کوفر دادەندرێ، جەژنو بیرەوەریی پەرستنەکەشیان حەڕامەو واجبە: ئەو بیرەوەریەش نەکرێو لە بیر ببردرێ ﴿عن ثابتٍرضي الله عنه: نَذَرَ رَجُلٌ أَنْ يَنْحَرَ إبلاً ببوانَة، فَقالَ النَّبيُّﷺ هَلْ كانَ فِيها صَنَمٌ يُعْبَدُ؟ قالَ: لاَ. فَقالَﷺ: فَهَلْ كانَ فِيهَا عِيدٌ مِنْ أَعْيادِهِم؟ قالَ: لا. قالَﷺ: أَوْفِ بِنَذْرِكَ﴾ رواه أبودود والطبراني باسناد صحيح، **پیاوێك نەزری کرد وشترێك لە (بَوانَة) سەر ببڕێ،**

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئایا لە (بَوانَـة)دا هیچ بتێك هەبووە بپەرسترێ؟ پیاوەکە گوتی: نا. فەرمووی: ئایا هیچ چەژنێکی کافرەکان لە (بَوانَة)دا دەکرا؟ پیاوەکە گوتی: نا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نەزرەکەت بەجێ بێنە.

واتە: لەم حەدیسەدا پێغەمبەرﷺ جیاوازی بیرەوەریی بتپەرستن‌و بیرەوەریی جەژنی کافرەکانی نەکردو هەردووکی وەکو یەکتری بە حەرام دانان، بەڵام پیاوەکە هیچێکی لەو دوو بیرەوەریانە مەبەست نەبو، بۆیێ پێغەمبەرﷺ ڕێگای دایێ لەوێ نەزرەکەی بەجێ بێنێ.

*** *** ***

## ﴿ ناردنی نوێنەرەکانی پێغەمبەرﷺ بۆ فێرکردنی ئیسلام ﴾

لە باسی وەفدەکەی (ثقیف)دا گوتمان: لە ساڵی نۆیەمی کۆچیدا وەفدی عەرەبەکان لە هەموو لایەکەوە ڕوویان لە (مَدِینَة)کردو کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتنە خزمەت پێغەمبەرووﷺ دەبونە موسوڵمان. جا ئەو موسوڵمانبووانەش پێویستییان بە مامۆستایانی ئایینی هەبوو، تاکو لە ئایینیئیسلام شارەزا ببن.

بۆیێ پێغەمبەرﷺ بۆ هەر لایەك، (صَحابَة)یەك، یان زیاتری دەناردن، تاکو خەڵکی فێرە ئایینیئیسلام بکەن‌و هەم کاروباری دەوڵەتیئیسلامیش لەجیاتی پێغەمبەرﷺ لەوێ بەڕێوە ببەن، جا ئێمە هەموو ئەو نوێنەرانە باس ناکەین، بەڵکو تەنها هەندێکیان باس دەکەین:

### ﴿ناردنی حەزرەتی( أَبُومُوسَىالأَشْعَرِي )و حەزرەتی( مُعاذ بن جَبَل ) رضي‌الله عنهما بۆ ( يَمَن )﴾

پێغەمبەرﷺ ئەم دوو بەڕێزانەی‌و وێکڕا ناردنە (يَمَن)و فەرمووی: ﴿يَسِّرا وَلا تُعَسِّرا وَبَشِّرا وَلاَ تُنَفِّرا–وفِي رِوايَة–: وَتَطاوَعا وَلا تَخْتَلِفا﴾ ئاسنکاری بکەن‌و خەڵکی توشی ناخۆشی‌و تەنگانە مەکەن، موژدەی خۆشی بدەن، خەڵکی لە ئیسلام مەڕەوێننەوە، بە قسەی یەکتری بکەن‌و ململانەو پەرتەوازەیی مەکەن.

هەروەها پێغەمبەرﷺ ئامۆژگاری حەزرەتی(مُعاذ)یﷺ کردو فەرمووی: ﴿تۆ دەچیە لای گەڵێکی خاوەن (کتاب)، جا یەکەم جار داوایان لێبکە بڵێن: (أَشْهَدُ أَنْ لاَإِلَـهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداًرَسُولُ الله)، جا ئەگەر بە قسەیان کردی، پێیان بڵێ: خوایگەورە پێنج نوێژی لە سەر واجب کردون لە هەموو شەوێك‌و ڕۆژێکدا، جا ئەگەر بە قسەیان کردی، پێیان بڵێ: خوا زەکاتی لە سەر دەوڵەمەندەکان واجب کردوەو لێیان وەردەگیرێ‌و دەدرێتەوە هەژارەکانیان، جا ئەگەر بە قسەیان کردی، ئاگات لێبێ: ماڵە باشەکەیان لە زەکات لێمەستێنەو لە دوعای ستەملێکراو بترسە، چونکە هیچ پەردەیەك لە نێوان خوداو دوعای ستەملێکراودا نیە. واتە: زوو قبوڵ دەبێ﴾.

ئینجا پێغەمبەرﷺ تا دەرەوەی (مَدینَة) لەگەڵ حەزرەتی(مُعاذ)داﷺ ڕۆیشتو ئامۆژگاری دەکردو فەرمووی: ﴿یا مُعاذُ إنَّكَ عَسَی ألاّ تَلْقانی بَعْدَ عامِی هَذا، وَلَعَلَّكَ أنْ تَمُرَّ بِمَسْجِدِی هَذا وقَبْرِی!﴾ ئەی (مُعاذ) لەوانەیە: لە دوای ئەمساڵ هیچیتر تۆ من نەبینیەوە، لەوانەیە: تۆ بە لای ئەم مزگەوتەمو گۆڕەکەمدا ڕابڕی.

جا حەزرەتی(مُعاذ)ﷺ کەوتە گریان لە پەرۆشی جیابوونەوەی پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ ئاوڕێکی لە (مَدینَة) دایەوەو فەرمووی: ﴿إنَّ أوْلَی النَّاسِ بِی اَلْمُتَّقُونَ، مَنْ کانُوا وَحَیْثُ کانُوا﴾ حدیث صحیح رواه الإمام أحمد، بەڕاستی لە پێشترین کەس لە من، لەخواترسەکانن، هەر کەسێك بن و لە هەر کوێ بن.

جا لەو کات (یَمَن) لە دوو هەرێم پێك هاتبوو، هەر یەکێك لە حەزرەتی(أبُومُوسَی)و حەزرەتی(مُعاذ) رضی‌الله عنهما چونە هەرێمێك‌و جار جارەش سەردانی یەکتریان دەکرد، جا ڕۆژێك حەزرەتی(مُعاذ)ﷺ سەردانی حەزرەتی(أبُومُوسَی)یﷺ کرد، دیتی حەزرەتی (أبُومُوسَی) دانیشتووەو خەڵك لە دەورەیەتی‌و پیاوێکی پەلبەستکراویش لە لایەتی، جا حەزرەتی(مُعاذ)ﷺ فەرمووی: ئەم پیاوە چیە؟ حەزرەتی(أبُومُوسَی)ﷺ فەرمووی: ئەمە لە دوای موسوڵمانبوون کافر بۆتەوە. جا حەزرەتی (مُعاذ)ﷺ فەرمووی: ﴿لاَ أجْلِسُ حَتَّی یُقْتَلَ، قَضاءُ اللهِ وَرَسُولِهِﷺ-ثَلاثَ مَرّاتٍ- فَأُمِرَ بِهِ فَقُتِلَ﴾ رواه البخاري، دانانیشم تا ئەم کافربووە دەکوژرێ، کوشتنی موسوڵمانی‌کافربوو، بڕیاری خواو پێغەمبەرەﷺ، -سێ جار وای فەرموو- جا پیاوە کافربووەکە کوژرا.

جا حەزرەتی(أبُومُوسَی)ﷺ لە (یَمَن) گەڕاوەو لە (مَکّة) لە کاتی (حَجَّةالْوَداع)دا بە خزمەت پێغەمبەرﷺ گەیشت، بەڵام حەزرەتی(مُعاذ)ﷺ هەر لە (یَمَن) مایەوە تا پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد-هەروەك پێغەمبەرﷺ پێی ڕاگەیاندبوو-، ئینجا لە (خِلافة)ی ئیمام (أبُوبَکْر)داﷺ گەڕاوە بۆ (مَدینَة).

جا لێرەدا مەبەست ئەوەیە: حەزرەتی(مُعاذ)ﷺ لە (یَمَن)دا قازی پێغەمبەرﷺ بوو، سەرکردەی جەنگ بوو، وەرگری زەکات بوو، پێشنوێژیشی بۆ موسوڵمانان دەکرد.

**ڕووداوێکی سەیر:** ڕۆژێك حەزرەتی(مُعاذ)ﷺ لە پێشنوێژی سبەینێدا ئایەتی ﴿وَاتَّخَذَ اللهُ إبْراهِیم خَلِیلاً﴾ی خوێند، واتە: خوا (إبْراهِیم) پێغەمبەری کردۆتە دۆستی‌خۆی. جا لە پشتەوە پیاوێك لە ناو نوێژدا گوتی: (لَقَدْ قَرَّتْ عَیْنُ أُمِّ إبْراهِیمﷺ)! رواه البخاري، بەڕاستی دایکی(إبراهیم)ﷺ دڵخۆش بوو.!

## ﴿ ناردنی ئیمام ( عَلِي )و ئەمیر ( خالِد ) رضی‌الله عنهما بۆ ( یَمَنْ ) ﴾

هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەمیر (خالِد)یﷺ ناردە (یَمَن) بۆ بانگەوازی ئیسلام، جا

ماوەی شەش مانگ لەوێ مایەوە، ئینجا پێغەمبەرﷺ ئیمام (عَلِي)یﷺ بە دوادا نارد، تاکو ئەمیر (خالِد)ﷺ بگەڕێتەوە بۆ (مَدِینَة)و ئەو لە جێی وی بانگەوازی بکا، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوانەی لەگەڵ (خالِد)دانە: هەر کەسێك پێی خۆش بێ، با لەگەڵ ویدا بگەڕێتەوە، هەرکەسێکیش پێی خۆش بێ با لەگەڵ تۆدا بمێنێتەوە.

جا ئەمیر (خالِد)و کۆمەڵە (صَحابَة)یەكﷺ گەڕانەوە، هەندێکیش لەگەڵ ئیمام (عَلِي)دا لە (یَمَن) مانەوەﷺ، جا هۆزی (هَمَدان) گشتی لە سەر دەستی ئیمام (علی)ﷺ موسوڵمان بون، جا کە هەواڵیموسوڵمانبوونیان گەیشتە پێغەمبەرﷺ، یەکسەر سوجدەی شوکری بۆ خوا بردو فەرمووی: ﴿اَلسّلامُ عَلَى هَمَدانَ، السَّلامُ عَلَى هَمَدانَ﴾.

جا پێش ئەوەی ئیمام (عَلِي)ﷺ وڕێبکەوێ بۆ (یَمَن)، گوتی: یا رَسُولَ الله، من گەنجێکی تازە پێگەیشتومو دەمنێریە لای کەسانێکی لە خۆم بە تەمەنتر، هیچ زانستی (قضاء)=دادگاییم نیە؟ جا پێغەمبەرﷺ دوعای بۆ کردو ڕێنموونیی کردو فەرمووی: ﴿إذا جَلَسَ إلَيْكَ الْخَصْمَانِ فَلا تَقْضِ بَيْنَهُما حَتَّى تَسْمَعَ مِنَ اْلآخَرِ كَما سَمِعْتَ مِـنَ اْلأَوَّلِ، فَإنَّكَ إذا فَعَلْتَ ذلِكَ تَبَيَّنَ لَكَ الْقَضاءُ﴾ حديث حسن رواه الإمام أحمد والترمذي، هەر کاتێك دوو کێشەچی بۆ براندنەوەی کێشەکەیان لە لای تۆ دانیشتن، بڕیار لە نێوانیاندا مەدە، تا قسەی دووەمەکەشت گوێ لێدەبێ وەك گوێلێبوونی قسەیەکەمەکە، تۆ ئەگەر ئەوها بکەی، بڕیاردانەکەت بۆ ڕوّن دەبێتەوە.

جا ئیمام (علی)ﷺ فەرمووی: لەمەودوا هیچ بڕیارێکی دادوەریم لێتێکەڵ نەبو و نەکەوتمە گومان. ئینجا کە پێغەمبەرﷺ هاتە (حَجَّةُالْوَداع)، ئیمام (علی)یش لە (یەمەن) 
گەڕاوەو لە (مَكّة) گەیشتە پێغەمبەروﷺ ئیحرامی بەست. (البداية والنهاية) ب(٣) ل(١٦٣و١٧٢).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: پێغەبەرﷺ نوێنەریخۆی دەناردن تاکو خەڵکی لە ئیسلام شارەزا بکەنو کاروباریان بۆ بەڕێوە ببەن.** ئەمەش بەڵگەیە: ئەرکی ئیسلام تەنها بە تایبەتی لە سەر شانی هەندێ کەس نیەو بە تەنهاش واجبی پێشەوای ئیسلام نیە، بەڵکو واجبی سەر شانی گشت موسوڵمانێکە، هەم بەڵگەیە: بە تەنها موسوڵمانبوون، مرۆڤی موسوڵمان لەم واجبە دەرناچێ، بەڵکو واجبە: بانگەازیو ڕێنموونیشی بۆ ئاییندیئیسلام لەگەڵدا بێ.

بەڵام لە هەمان کاتیشدا لە سەر دەوڵەتیئیسلام واجبە: شوێنی نیشتەجێبوونو -بۆ هاتوچۆش- شتێکی سواری بۆ بانگەوازکاران تەرخان بکا، بەڵکو ئەگەر پێویستیی بە هاوسەر هەبوو، واجبە: ژنیشی بۆ بهێنێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ ئەوهای فەرمووە، ئیمام (أحمد)و ئیمام (أبوداوُد) گێڕاویەتیانەوە.

هەروەها لە سەر کاربەدەست واجبە: پیاوێکی ئازاو لێزانو بەناوبانگ بۆ ئەم کارە گرنگانە دابنێ، تاکو لە کارەکەی سەرکەوتوو بێ.

جا ئەوەش بزانە: پێغەمبەرﷺ ئامۆژگاری نوێنەرەکانی دەکرد: **﴿ئاسانکاری بکەنو توندوتیژی بە کار نەهێنن، هەم موژدەی خۆشی بدەنو هەڕەشەو ترساندن زۆر بە کار نەهێننو خەڵکی لە ئیسلام نەڕەوێننەوە﴾**. بەڵام ئەوەش وا ناگەیەنێ: ئاسانکاریەکە بگاتە سنوری حەرامو (مَکْرُوه)= ناپەسند: وەك (فتوا) بە فەرمودە بێهێزەکانی زانایان بداو ڕێگا بۆ خەڵکی ئاسان بکا، چونکە هەر کەسێك ئەو جۆرە ئاسانکاریە بکا، حەرامە داوای (فتوا)شی لێبکرێ، هەروەك ئیمامی (النواوی) لە پێشەکیی (المجموع)دا فەرموویەتی، بەڵگەش ئەم حەدیسەیە: ﴿ما خُيِّرَ رَسُولُ اللهِﷺ بَيْنَ أَمْرَيْنِ إلاّ اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا مالَمْ يَكُنْ إثْماً، فَإنْ كانَ إثْماً كانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ﴾ رواه الشيخان، **پێغەمبەرﷺ کە لە نێوان دوو کاردا دەکرا سەرپشك، ئاسانترەکەی هەڵدەبژارد، بەو مەرجەی گوناه نەبوایە، ئەگەر گوناه بووایە، لە هەموو کەسێك زیاتر لێی دور دەکەوتەوە.** (المجموع بشرح المهذب) ب(١) ل(٤٠و٤٦) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٤٧٨) و(سيرة الصلابي) ب(٢) ل(٦٦٢).

**دووەم: هەر موسوڵمانێك کافر ببێ، واجبە بکوژرێ**، حەزرەتی(مُعاذ)رضي الله عنه فەرمووی: **﴿کوشتنی موسوڵمانیکافربوو، بڕیاری خواو پێغەمبەرەﷺ﴾**. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ﴾ رواه البخاري، **هەر کەسێك ئاینیخۆی گۆڕی بیکوژن.**

**بزانە:** هەر موسوڵمانێك کافر ببێ واجبە: بکوژرێ، جا هەندێ لە زانایانیئیسلام فەرموویانە: داوای تۆبەی لێناکرێو یەکسەر دەکوژرێ. هەندێکیتر فەرموویانە: واجبە: داوای تۆبەی لێبکرێ، جا ئەگەر تۆبەی نەکردو نەبۆوە موسوڵمان، یەکسەر دەکوژرێ. هەندێ زانایتر فەرموویانە: داواکردنی تۆبە، واجبە نیە، بەڵام سوننەتە: تا سێ ڕۆژان داوای تۆبەی لێبکرێ. جا لە لای کۆمەڵە زۆرەکەی زانایان: لەم بڕیارانەدا جیاوازی ئافرەتو پیاو نیە، بەڵام لە لای ئیمامی(الْحَنَفي) ئافرەتی کافربوو ناکوژرێ، بەڵکو بەند دەکرێ تا دەبێتەوە موسوڵمان. (فتح الباري) ب(١٢) ل(٣٤٠-٣٤٤).

## ﴿ هەر کەسێك جنێو بداتە (صَحابَة)ی پێغەمبەرﷺ، کافر دەبێ ﴾

چەند موسوڵمانێکی کافربوو هەنە، ئەگەر موسوڵمانیش ببنەوە، هەر واجبە بکوژرێن، واتە: تۆبەکردنەکەیان تەنها بۆ ڕزگاربوونی قیامەت سودی هەیە:

**یەکەمیان:** هەر کەسێك جنێو بداتە پێغەمبەرﷺ، ئەگەر موسوڵمانیش ببێتەوە، هەر واجبە: بکوژرێ، هەروەك لە گوڵبژێرەکەی کوشتنی (كَعْب بن الأشْرَف)دا ڕونمان کردەوە.

**دووەم:** هەر کەسێك جنێو بداتە (الشَّيْخَيْن)=ئیمام (أَبُوبَکْر)و ئیمام (عُمَر)رضي الله عنهما، یان جنێو بداتە حەزرەتی(الْحَسَن)و حەزرەتی(الْحُسَيْن) رضي الله عنهما، رضي الله عنهما، ئەوەش لە

فەرموودەیەکی مەزهەبی(الشافعی)دا کافر دەبێ. جا بە فەرموودەیەکی مەزهەبی(الحنفـي) کە لە ڕووی (فتوا)وە هەڵبژێردراوە: جنێودەری ئیمام (أبوبَكْر)و ئیمام (عُمَر) رضي‌الله عنهما، کافر دەبێ‌و ئەگەر تۆبەش بکا، هەر واجبە بکوژرێ.

**سێیەم‌و چوارەم:** سیحربازو (زَنْدِيق)، واتە: ئەو کەسەی دان بە هیچ ئایینێکدا نانێ، ئـەویش بە مەزهەبی (الحنفی)و (مالکی)و بە فەرموودەیەکی مەزهەبی(الشافعی): ئەگەر تۆبەش بکـا، هەر واجبە: بکوژرێ، لە فەرموودەی هەندێ زانایانیش ئەگەر بانگەوازی بۆ بێدینیەکەی‌خۆی نەکا، تۆبەی قبوڵ دەکرێ‌و ناکوژرێ، هەندێکی‌تر فەرموویانـە: ئەگـەر پـێش دەسـتگیرکردن تۆبە بکا ناکوژرێ، ئەگەر لە دوای دەستگیرکردن تۆبە بکا، هەر دەکوژرێ.

جا ئیمامی(النواوی) فەرموویەتی: (زَنْدِيق) ئەو کەسەیە: دان بە شەرعی ئیسلامدا نەنێ. جا ئەم پێناسەیە بـە پلـەی یەکـەم ئـەو (علمـانی)یانـەش دەگرێتـەوە: کـە بـە بیروبـاوەڕەوە شەریعەتی‌ئیسلام بە ڕاست نازانن‌و یاسای دەستکردیان پێ باشترە، جا بـۆ ئـەم باسـە گرنگە بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ب(١) ل(٢٦٤و٢٦٥) و(فـتح البـاری) ب(١٢) ل(٣٣٥-٣٤١) و(تحفة المحتـاج لـشرح المنهاج) ب(٩) ل(٨٩و٩٦و٩٧) و(رد المحتار على الدرالمختار) ب(٦) ل(٣٧٦و٣٨٣و٣٨٤).

جـا ئـەوەی‌ڕابردوو لـەبارەی ئیمـام (أبُـوبَكْر)و ئیمـام(عُمَـر) بـوو رضي‌الله عنهما، لـەبارەی (صَحابَة)کـانی‌تریش رضي الله عنهم، چـەند زانایەکی‌ئیـسلام فەرموویانـە: هـەر کەسـێك جنێـو بداتـە (صَحابَة)کان‌و تانەیان لێبدا، ئەویش کـافر دەبـێ‌و دروسـتە بکـوژرێ، مەگـەر تۆبـە بکـاو دوعایان بۆ بکا، جـا ئیمـامی(السَّرَخْسِي) فەرموویـەتی: دەرمـانی ئـەو جـۆرە جنێـودەرە شمـشێرە ئەگـەر تۆبـە نـەکا. هـەروەها ئیمـامی(الفریـابی)ش فەرموویـەتی: جنێـودەری (صَحابَة)کان کافر دەبێ‌و نابێ نوێژی (جَنازَة)ی لە سـەر بکـرێ. بـەڵام کۆمەڵـە زۆرەکـەی زانایانی‌ئیسلام فەرموویانە: جنێودەری (صَحابَة)کان کافر نیە، بەڵکو (فاسـق)و گومڕایـە. کەوابوو: نابێ بکوژرێ، بەڵکو تەمبێ دەکرێ‌و بەند دەکرێ.

جا بە هەر جۆرێك بـێ، جنێـودەری (صَحابَة)کان رضي الله عنهم بەرلەعنـەت کـراوەو پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿لا تَسُبُّوا أَصْحابِی لَعَنَ اللهُ مَنْ سَبَّ أَصْـحابِی﴾ رواه الطبراني فى الأوسط ورجالـه رجال الصحيح غير على بن سهل وهو ثقة، **جنێو مەدەنە (صَحابَة)کانی من، لەعنەتی خـوا لـەو کەسە بێ: کە جنێو دەداتـە (صَحابَة)کـانی مـن.** (مجمـع الزوائـد ومنبـع الفوائـد) ب(٩) (٥٥٤)و (صَحابَة رَسُول الله ﷺ فى القرآن والسنة) ل(٣٨٩-٣٩٧).

**سێیەم: چۆنیەتی دادکردن:** پێغەمبەر ﷺ بە ئیمـام (عَلـي)ی رضي الله عنه فـەرموو: **﴿کـاتی دوو کێـشەچی دینـە لای‌تـۆ، تـا قـسەی هـەردووکیان دەبیـسی، بڕیـار بـۆ هیـچێکیان مەدە﴾**. ئینجا بۆ براندنەوەی کێشەکەش پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی ﴿اَلْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي وَالْيَمِينُ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ﴾ حديث حسن رواه البيهقي والترمذي، وبعضه فى الـصحيحَين، **شـاهید لـە سـەر داواکارەکەیە، جا ئەگەر شاهیدی نەبو، ئەو کاتە سوێند لە سەر ئەو داوالێکراوەیە:**

كه دان به مافەكە داناني. كەواتە: ئەگەر داوالێكراو سوێند نەخوا، ئەو كاتە سوێندەكە دەگەڕێندرێتەوە سەر داواكارەكە، جا ئەگەر سوێندە گەڕاوەكەی نەخوارد لەم داوایەدا مافی دەسوتێ‌و هیچی نادرێتێ.
جا بزانە: كە ئیمام (عُمَر)ﷺ نوێنەری دەناردنە هەرێمەكان، ئامۆژگاریی دەكردن‌و دەیەفەرموو: ﴿ئەگەر دوو كێشەچی هاتنە لای تۆ، بە شاهیدی دادپەروەر، یان بە سوێندێكی بڕندە كێشەكە بڕێنەوە، لە كاتی دادكردندا كێشەچیەكەی بێ‌هێز لە خۆت نزیك بكەوە، تاكو دڵی بە هێز ببێ‌و زوبانی ببێتەوە، هەروەها ئاگاداری خەڵكی بێ‌كەس‌و نامۆ بە، چونكە ئەگەر ئاگات لێ‌نەبێ، واز لە مافی‌خۆی دێنی‌و دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی‌خۆی، یەكسانی لە نێوان خەڵكدا بكە لە تێڕوانین‌و چاولێكردن، ئەگەر نەتزانی بە بڕیاری دادكردن كێشەكە بڕێنیەوە، ئەو كات بە (صُلْح)و پێكهاتن كێشەكە بڕێنەوە﴾. واتە: پێكهێنانی كێشەچیەكان چارەسەریەكی باشە، چونكە هیچێكیان قین‌و گلەییان نامێنێ، هەروەك ئیمام (عُمَر)ﷺ فەرموویەتی: ﴿رُدُّوا الْخُصُومَ حَتَّى يَصْطَلِحُوا، فَإِنَّ فَصلَ الْقَضَاءِ يُورِثُ الضَّغَائِنَ بَيْنَ النَّاسِ﴾ كێشەچیەكان بگەڕێننەوە تا بەخۆیان پێك بێن، چونكە بڕیاری دادگا ڕق‌و قینە لە نێوان خەڵكدا دەهێڵێتەوە. (سيرة أمير المؤمنين عُمَر بن الخطابﷺ، للصلابي) ل(٢٧٣و٢٧٨).

***          ***          ***

## ﴿ باسی ( حَجَّةُ الْوَدَاع )=( حَجَّةُ الْبَلَاغ )=( حَجَّةُ الْإِسْلَام )﴾

( حَجَّةُالْوَدَاع ) حەجی ماڵئاوایی، چونكە پێغەمبەرﷺ خواحافیزیی لە موسوڵمانان كردو هیچ حەجی‌تری نەكرد. ( حَجَّةُالْبَلَاغ ) حەجی ڕاگەیاندن، چونكە لەم حەجەدا پێغەمبەرﷺ بە كردارو گوفتار شەرعی‌خوای بە خەڵك ڕاگەیاندو فەرمووی: ﴿هَلْ بَلَّغْتُ؟﴾ ئایا ڕامگەیاند؟. ( حَجَّةُالْإِسْلَام ) حەجی ڕوكنی‌ئیسلام، چونكە لە دوای واجببوونی‌حەج، پێغەمبەرﷺ تەنها ئەم حەجەی كردوە، واتە: ئەو حەجانەی پێش واجببوونی‌حەج لە (مَكّة)دا كردبونی، حەجی ڕوكنی‌ئیسلام نەبون.

**جا بزانە:** پێغەمبەرﷺ چوار عومرەی كردون:

**یەكەم:** (عُمْرَة)ی(الحُدَيْبِيَة) لە مانگی (ذِیالقَعْدَة) ساڵی شەشەمی كۆچی.

**دووەم:** (عُمْرَةُالقَضَاء) لە مانگی (ذِیالقَعْدَة)ی ساڵی حەفتەمی كۆچی.

**سێیەم:** (عُمْرَة)ی(الجِعْرانَة) لە مانگی (ذِیالقَعْدَة)ی ساڵی هەشتەمی كۆچی.

**چوارەم:** (عُمْرَة)ی گەڵ (حَجَّةُالوَدَاع) لە مانگی (ذِیالحِجَّة)ی ساڵی دەیەمی كۆچی.

دیسان بزانە: پێغەمبەرﷺ نۆ ساڵان لە (مَدِينَة) مایەوە، هیچ حەجی نەكرد، ئینجا لە ساڵی دەیەمی كۆچیدا بە خەڵكی ڕاگەیاند: ئەم ساڵ پێغەمبەرﷺ حەج دەكا.

بۆیێ خەڵكێكی زۆر رووی كردە (مَدِينَة)، تاكو لەگەڵ پێغەمبەرﷺ حەج بكەن. ژمارەیان لە هەندێ (رِوايَة)دا: چل هەزارە، لە هەندێ (رِوايَة)دا: نەوەد هەزارە، لە هەندێ (رِوايَة)دا: (١١٤٠٠٠)سەدو چواردە هەزار بون، (رِوايَة)ی‌تریش هەنە.

﴿ كورتەیەكی حەجی پێغەمبەرﷺ ﴾

لە سەفەری (حَجَّةُالوَداع)دا پێغەمبەرﷺ هەموو ژنەكانی‌خۆی لەگەڵ خۆیا بردن بۆ حج كردن، حەزرەتی(أبُودُجانَة)شی‌ﷺ كردە جێنیشی‌خۆی لە (مَدِينَة).

جا پێغەمبەرﷺ لە رِۆژی شەممە بستو پێنجی مانگی (ذِیالقَعْدَة)ی ساڵی دەیەمی كۆچی، نوێژی نیوەرِۆی لە (مَدِينَة) بە چوار رِەكعەتی كرد، ئینجا لە دوای نیوەرِۆ لە (مَدِينَة) وەرِێكەوت، تا گەیشتە (ذِیالحُلَيْفة)، نوێژی عەسری‌ لەوێ بە (قَصر)=دوو رِەكعەتی كرد، ئینجا شەوێ لە (ذِیالحُلَيْفَة) مایەوەو نوێژەكانی مەغریبو عیشاو سبەینی‌ لەوێ كردن، ئینجا هەر لە (ذِیالحُلَيْفَة) مایەوە تا نوێژی نیوەرِۆشی لەوێ كرد، ئینجا دوو رِەكعەت سوننەتی لە پێش ئیحرِامبەستندا كردو سواری وشترەكەی بوو، ئینجا لە سەر پشتی وشترەكەی ئیحرامی بەستو دەستی بە (لَبَّيْكَ) كردو بەرەو (مَكَّة) رِۆیشتن، ئینجا لە سبەینەی رِۆژی یەك شەممەی چواری مانگی (ذِیالحِجَّة) چونە ناو (مَكَّة)، چونكە مانگی (ذِیالقَعْدَة) كەمە مانگ بوو، بۆیێ بە (إِجْماع)ی هەموو موسوڵمانان: شەوی پێنج شەممە یەكەم شەوی مانگی (ذِیالحِجَّة) بوو، رِۆژی جومعەی نۆی مانگ وەستانی (عَرَفَة) بوو.

جا پێغەمبەرﷺ یەكسەر (طَواف)ی كردو (سَعْي)ی نێوان (صَفا)و (مَرْوَة)ی كرد، ئینجا رِۆژانی دووشەممەو سێ‌شەممەو چوارشەممە=پێنجەمو شەشەمو حەفتەمی (ذِیالحِجَّة)، لە (مَكَّة)دا مایەوە، ئینجا لە رِۆژی پێنج شەممەی هەشتی(ذِیالحِجَّة) چووە (مِنـی)، نوێژەكانی نیوەرِۆو عەسرو مەغریبو عیشاو هەم سبەینەی‌جومعەی لە (مِنـی) كردن، واتە: شەوی جومعەی نۆی (ذِیالحِجَّة) لە (مِنی) مایەوە، ئینجا لە رِۆژی جومعەی نۆی (ذِیالحِجَّة) چووە (عَرَفات)و نوێژەكانی نیوەرِۆو عەسری بە (قَصر)و (جَمْع) لەوێ كردنو تا دوای رِۆژ ئاوابوون لە (عَرَفات) مایەوە، ئینجا شەوی شەممەی دەی (ذِیالحِجَّة) لە (عَرَفات) گەرِاوە بۆ (مُزْدَلِفَة)، ئینجا سبەینەی شەممە=دەی (ذِیالحِجَّة) لە (مُزْدَلِفَة)وە هاتە (اَلْمَشْعَرُالحَرام)و لەوێشەوە هاتە (مِنی)و شەیتانی گەورەی (رَجْم) كرد، ئینجا هاتەوە (مَكَّة)و (طَواف الإفاضَة)ی كرد، ئینجا گەرِاوە بۆ (مِنـی)، یەك شەممەو دووشەممە=یازدەو دوازدەی (ذِیالحِجَّة) لە (مِنـی) مایەوەو لە رِۆژی سێ‌شەممەی سێزدەی (ذِیالحِجَّة) لە (مِنـی) رِۆیشتو هاتەوە (مَكَّة)، ئینجا لە رِۆژی چوارشەممەی چواردەی (ذِیالحِجَّة) لە (مَكَّة) هاتە دەرەوەو گەرِاوە بۆ (مَدِينَة)، واتە:

دە ڕۆژان لە حەج کردندا ماوەتەوە.

جا مەبەستی حەزرەتی(أنس بن مالك)ش رضي الله عنه: هەر ئەم دە ڕۆژانەنە، کە فەرموویەتی: ﴿خَرَجْنا مَعَ النَّبيِّ صلى الله عليه وسلم مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَكانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ حَتّى رَجَعْنا إِلَى الْمَدِينَةِ. قُلْتُ: كَمْ أَقامَ بِمَكَّةَ؟ قال: عَشْراً﴾ رواه الشيخان، لەگەڵ پێغەمبەرداصلى الله عليه وسلم بۆ حەج کردن لە (مَدِينَة)وە چووینە (مَكَّة)، پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم نوێژەکانی کورت دەکردنەوەو دوو ڕەکعەتی دەکردن تا گەڕاینەوە (مَدِينَة)، جا گوتی: ماوەی دە ڕۆژان لە (مَكَّة)دا– واتە: لە حەج کردنەکەدا–مایەوە.

کەواتە: پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم –جگە لە ڕۆژی هاتن– سێ ڕۆژی تەواو بە دوای یەکدا لە ناو شاری (مَكّة)دا ماوەتەوە، حەفت ڕۆژەکەی تر لە دەوروبەردا بۆ حەج کردن ماوەتەوە.

ئەمەی ڕابردوو کورتەی حەجی پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم بوو: لە (صحيح البخاری)و (صحيح مسلم)دا، بۆێش ئەوها بە وردیم ڕوون کردەوە، چونکە لەم سەردەمەدا چەند کەسانێکی بێئاگا–بە ناوی شارەزاکارێکی ئاینی– لەگەڵ کاروانی حاجیەکاندا دەڕۆنە حەج، لە هەموو حاڵەتێکدا (قصر)و (جَمْع) بە حاجیەکان دەکەنو دەڵێن: پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم لە (حَجَّة الْوَداع)دا (قصر)و (جَمْع)ی کردوە، ئەم حەدیسەی ڕابردووی (أنس) رضي الله عنه دەکەنە بەڵگە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان لە حەدیسەکە حاڵی نەبوینەو ئاگایان لەم ڕوونکردنەوەی ڕابردوو نیەو نازانن بە مانەوەی چوار ڕۆژی تەواو، ڕێبوار مافی (قصر)و (جَمْع)ی نامێنیو واجبە: نوێژەکانی بە تەواوی لە کاتیخۆیاندا بکا، هەروەك لە (فتح مَكّة)دا ڕوونمان کردەوە. جا تکات لێدەکەم: بۆ ئەم ڕوونکردنەوەیە، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) باسی (صلاة المسافرين) ب(٣) ل(٣٩١–٣٩٢) و(فتح الباری) ب(٢) ل(٧٢٤–٧٣٠)، ب(٣) ل(٥١٠و٥١٣و٥١٩و٦٤١).

جا لە بەر ئەوەی باسی حەجی پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم زۆر درێژە، لێرەدا بە تەواوی ناینوسم، کەوابوو: ئەگەر دەتەوێ شارەزای حەج ببی، ئەوە کتێبێکم کۆ کردۆتەوە بە ناوی (**چۆنیەتی حەج و عومرە وەك لە پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم وەرگیراوە**) ئەم کتێبە بخوێنەوەو لەگەڵ خۆتا ببیە بۆ سەفەری حەج سودی لێوەردەگری، إنْ شاء الله تعالى، هەروەها لە بەرگی دووەمی (ڕووناکی ربِّ العالمين)دا باسی حەجو عومرە بە درێژی ڕوونم کردۆتەوە، والحمد لله تعالى.

## ﴿ وتارەکەی ( حَجَّةُ الْوَداع ) ﴾

پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم لە (عَرَفات) وەستا، ئینجا لە کاتی نیوەڕۆدا لە سەر پشتی وشترەکەی وتارێکی دا بۆ ئەو هەموو موسوڵمانانەی لە (عَرَفات) وەستابونو فەرمووی:

﴿ئەی خەڵکینە گوێ بدەنە قسەی من، من نازانم لەوانەیە: لە دوای ئەم ساڵ لەم شوێنە هەتا هەتایی بە یەك نەگەینەوە، خەڵکینە خوێنتانو ماڵتان لە یەکتری حەڕامە وەك حەڕامەیی ئەم ڕۆژەی(عَرَفَة) لەم مانگەدا لەم شارەی(مَكّة)دا، ئاگادار

بن: هەر كارێكی سەردەمی(جاهِلِيَّة)ی پێش ئیسلام هەبێ، گشتی لە ژێر پێی منداییەو بێ نرخە، خوێن سەندنەوەی سەردەمی(جاهِلِيَّة)ش لابراوە، یەكەم خوێنیش كە لە خوێنەكانی بنەماڵەیخۆمان لایدەبەم: خوێنی (ابن رَبِيعَة)یە، هەروەها ڕیبای (جاهِلِيَّة)ش لابراوە، یەكەم ڕیبا كە لایدەبەم: ڕیبای (العَبّاس بن عَبْدُالْمُطَّلِب)ی مامیخۆمە، ئەو ڕیبایە هەمووی لادراوە، واتە: نابێ هیچی وەربگیرێ، خەڵكینە، شەیتان بێئومێد بووە لەوەی جارێكیتر لەم زەمینەی ئێوەدا بپەرسترێ، بەڵام ئەگەر شەیتان–جگە لە پەرستن– بە گوێی بكرێ، ئەوە لێتان ڕازی دەبێ بەو گوناهانەی ئێوە بە كەمیان دەزانن، كەوابوو: لەبارەی ئایینەكەتان لە شەیتان بترسن...لەبارەی ژنەكانتان لە خوا بترسن، چونكە ئەوانتان بە ئەمانەتیخوا وەرگرتوونو بە فەرموودەیخوا عەوڕەتی ئەوانتان حەڵاڵ كردوە، ئێوە مافتان لە سەر ژنەكانتان هەیە، ژنەكانیشتان مافیان لە سەر ئێوە هەیە، مافی ئێوە ئەوەیە: ژنەكانتان هیچ كەسێك نەهێننە ماڵەكەتان كە ئێوە پێتان ناخۆش بێ، ئەگەر وایان كرد لێیاندەن بە لێدانێكی بێشكاندنو بێبریندارکردن، مافی ژنەكانیشتان ئەوەیە: بژێو و بەرگیان بدەنێ بەگوێرەی تواناتان...خەڵكینە لە قسەكانم تێبگەن، من پێم ڕاگەیاندنو شتێكی وەهاشم لە دوایخۆم بۆ ئێوە هێشتۆتەوە، تا دەستی پێوە بگرن ئێوە گومڕا نابن، ئەویش قوڕئانیخودایەو حەدیسەكانی پێغەمبەریخودایەﷺ، خەڵكینە، گوێڕایەڵی گەورەكانیخۆتان بن، هەرچەند قولە ڕەشێكی لوت بڕاویش بكرێتە گەورەتان، بەو مەرجەی ڕەفتار بە قوڕئانی پیرۆز بكا، خەڵكینە گوێتان لە قسەكانم بێ و لێی تێبگەن، دەزانن: گشت موسوڵمانێك برای موسوڵمانە، موسوڵمانان هەموویان برای یەكترین، ماڵی هیچ موسوڵمانێك بۆ هیچ كەسێك حەڵاڵ نیە، تەنها ئەگەر بە خۆشیی دڵیخۆی ماڵەكەی بداتێ، ئەو كات حەڵاڵ دەبێ، كەوابوو: ستەم لە یەكتری مەكەن، خودایە تۆ شاهید بە، ئێوە دەگەڕێنەوە لای خوا، نەكەن لە دوای من گومڕا ببنو یەكتری بكوژن، خەڵكینە خوای ئێوە یەك خوایە، باوكتان یەك باوكە، هەمووتان لە (آدم)ن، (آدم)ش لە گڵ دروست كراوە، ڕێزدارترتان لە لای خوا لەخواترسترتانە، هیچ عەرەبێك لە هیچ عەجەمێك–كە عەرەب نەبێ– گەورەتر نیە تەنها بە لەخواترسان نەبێ، ئاگادار بن: ئەوەی لێرە ئامادەیە، با ئەم وتارەم بگەیەنێتە ئەوەی لێرە نیە، جا ئێوە لەبارەی من پرسیارتان لێدەكرێ، ئێوە چی دەڵێن؟﴾.

(صَحابَة)كانﷺ فەرموویان: شاهیدی دەدەین: بە ئێمەت ڕاگەیاند، جێبەجێت كرد، ئامۆژگاریت كرد، جا پێغەمبەرﷺ پەنجەی شادەی سێ جار بۆ ئاسمان بەرز كردەوەو بۆ لای خەڵكەكە دەیهێنا خوارەوەو دەیفەرموو: ﴿خودایە شاهید بە﴾.

ئینجا كە پێغەمبەرﷺ وتارەكەی تەواو كرد، فەرمانی دا: حەزرەتی(بِلال) بانگی نێوەڕۆی دا، ئینجا ئیقامەتی كردو نوێژی نیوەڕۆی بە (قـصر) كـرد، ئینجا ئیقامەتێكیتری كردو نوێژی عەسرێشی بە (جَمْعُ التقْدِيم) كرد.

جا پێغەمبەرﷺ هەر لە (عَرَفات) بوو و لە دوای نوێژی عەسر ئایەتی ﴿اَلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ی بۆ هاتە خوارەوە، ئینجا لە دوای ڕۆژ ئاوابوون، لە (عَرَفَة) گەڕاوە بۆ (مُزدَلِفَة)و (مِنی)، ڕوكنو واجبەكانی حەجی تەواو كردن، ئینجا لە چواردەی مانگ گەڕاوە بۆ (مَدِينَة). هەروەك ڕوونمان كردەوە.

## ﴿ وتارەكەی ( غَـدِيرُ خُـمّ ): لەبارەی گەورەیی ئیمام ( عَلِي )رضي الله عنه﴾

ئینجا لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا لە (غَدِيرخَمّ)—لە نێوان (مَكّة)و (مَدِينَة)— لە ڕۆژی یەكشەممە هەژدەی (ذِیالحِجَّة)، پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)كانی كۆ كردنەوەو وتارێكی بۆ دان و لە وتارەكەیدا گەورەیی ئیمام (عَلِي)یرضي الله عنه بۆ باس كردن فەرمووی:

﴿ئەی خەڵكینە منیش وەكو ئێوە ئادەمیزادێكم، نزیك بۆتەوە لە لای خواوە بانگەوازی مردنم بۆ بێ و منیش وەڵام بدەمەوە، دوو شتی زۆر قورسو بە قەدرم لە دوای خۆم بۆ ئێوە هێشتۆتەوە، یەكێكیان لەویتر گەورەترە: كە قورئانی خودایە، ئەویتریش (أَهْلُ الْبَيْت)=بنەماڵەی منە، تەماشا بكەن: لەگەڵ ئەم دووانەدا لە دوای من چۆن ڕەفتار دەكەن؟ ئەم دووانە لێك جیا نابنەوە، تا وێكڕا لە سەر حەوزی كەوسەر دێنە لای من...ئینجا فەرمووی: خوایگەورە دۆستو خۆشەویستی منە، منیش دۆستو خۆشەویستی گشت ئیمانداریكم...ئینجا پێغەمبەرﷺ دەستی ئیمام (عَلِي)ی گرتو فەرمووی: ﴿مَنْ كُنتُ مَوْلاَهُ فَهذا— أَيْ عَلِيٌّ— مَوْلاهُ، اَللّهُمَّ والِ مَنْ والاهُ وَعادِ مَنْ عاداهُ وَانْصُرْ مَنْ نَصَرَهُ، وَاخْذُلْ مَنْ خَذَلَهُ﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد والنسائي وابن ماجه، هەر كەسێك من دۆستو خۆشەویستی بم، ئەمەش—واتە: (عَلِي)— دۆستو خۆشەویستیەتی، خودایە دۆستایەتی ئەو كەسە بكەو خۆشت بوێ: كە دۆستایەتی (عَلِي) دەكاو خۆشی دەوێ، خودایە یارمەتی ئەو كەسە بدە: كە یارمەتی (عَلِي) دەدا، ئەو كەسەش سەر شۆڕ بكە: كە هەوڵی سەرشۆڕكردنی (عَلِي) دەدا﴾. (البداية والنهاية) ب(٣) ل(١٧٣—١٨٠و٢٤١—٢٤٣و ٢٨٦—٢٨٨) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٣٦٠—٣٨٨).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەكەم: دوو ڕەكعەت سوننەتی پێش ئیحرام،** ﴿عن ابن عُمَررضي الله عنهما: كانَ رَسُـولُ اللهِﷺ يَرْكَعُ بِذِیالْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ إذا اسْتَوَتْ بِهِ النّاقَةُ قائِمَةً عِنْدَ مَسْجِدِ ذِیالْحُلَيْفَةِ أَهَـلَّ﴾ رواه الشيخان واللفظ لمسلم، وله في حديث جابر الطويل مثله، پێغەمبەرﷺ لە (ذِیالْحُلَيْفَة) دوو ڕەكعەت سونەتی دەكردن، ئینجا سواری وشترەكەی دەبوو، جا كە وشترەكەی

هەڵدەستاوە پێوە، لە لای مزگەوتی (ذِيالْحُلَيْفَة) ئیحرامی دەبەست.
ئیمامی(النواوي) فەرموویەتی: ئەمە بەڵگەیە: کە دوو ڕەکعەت لە پێش ئیحرامدا سوننەتن، ئەمە مەزهەبی هەموو زانایانیئیسلامە، تەنها ئیمام (الحَسَن البَصْرِي) نەبێ، ئەو فەرموویەتی: سوننەتە لە دوای نوێژێکی واجب ئیحرام ببەستێ، نەك لە دوای نوێژی سوننەت. جا هەر فەرموودەکەی کۆمەڵی زانایان ڕاستەو ئەم حەدیسەش پشتگیری ئەوان دەکا، جا ئەگەر هیچ نوێژێکیش لە پێش ئیحرامبەستندا نەکا، ئیحرامەکەی دروست دەبێ، بەڵام خێرە گەورەکەی لە دەست دەچێ. (شرح صحيح مسلم) ب(٥) ل(٢٠٤-٢٩٧).
**دووەم: گوناهی بچوکیش مرۆڤ بە هیلاك دەدەن**، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **شەیتان بێئومێد بووە جارێکیتر لەم زەمینەیئیسلامدا بپەرسترێ، بەڵام بە گوناهکردن لێتان ڕازی دەبێ**. هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِيَّاكُمْ وَمُحَقَّرات الذُّنُوب فَإِنَّهُنَّ يَجْتَمِعْنَ عَلَى الرَّجُلِ حَتَّى يُهْلِكْنَهُ...كَمَثَلِ قَوْمٍ نَزَلُوا أَرْضَ فَلاةٍ فَحَضَر صَنِيعُ الْقَوْمِ، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَنْطَلِقُ فَيَجِيءُ بِالْعُودِ وَالرَّجُلُ يَجِيءُ بِالْعُودِ، حَتَّى جَمَعُوا سَواداً فَأَجَّجُوا ناراً وَأَنْضَجُوا ما قَذَفُوا فِيها﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد والطبراني، **ئێوە ئاگاتان لە خۆتان بێ: لە گوناهە بچوکەکان، چونکە ئەو گوناهە بچوکانە لە سەر مرۆڤ کۆ دەبنەوە تا بە هیلاکی دەدەن، وەك کۆمەڵە کەسێك لە بیابانێکدا کاتی ئامادەکردنی خواردنیان هاتبێ، جا پیاوێك دەچوو وردە دارۆچکەیەکی دەهێنا، یەکێکیتر دەچوو وردە دارۆچکەیەکی دەهێنا، تا کۆمەڵە دارێکیان کۆ کردەوەو ئاگرێکیان داگیرساندو خواردنەکەیان پێ ساز کرد**. (مجمع الزوائد ومنبع الفوائد) ب(١٠) ل(٢٢٣).
**سێیەم: مافی ئافرەت بپارێزن، خۆتان لە ئازاوەی ئافرەتان بپارێزن**، پێغەمبەرﷺ لە وتارەکەی (حَجَّةُالْوَداع)دا فەرمووی: ﴿فَاتَّقُوا اللهَ فِي النِّساءِ فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللهِ وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللهِ﴾ رواه مسلم، **لەبارەی ژنەکانتان لە خوا بترسن، چونکە ئەوانتان بە ئەمانەتیخوا وەرگرتونو عەوڕەتی ئەوانتان بە فەرموودەیخوا حەڵاڵ کردوە**. مەبەست بە (كَلِمَةُالله) لێرەدا: وشەی (إنْكاحُ)و (تَزْوِيج)ە، کە لە قورئاندا هاتون. ئەمەش بەڵگەیە: مەرجە لە مارەبڕیندا یەکێك لەم دوو وشەیە بگوترێ، بەڵام مەرج نیە: وشەکان بە عەرەبی بگوترێن، بەڵکو دروستە: بە گشت زمانێکیتری جگە لە عەرەبیش بگوترێن،هەروەك ئیمامی(النواوی) فەرموویەتی.
**بۆ نموونە**: لە جیاتی (أَنْكَحْتُكَ بِنْتِي)، بە کوردی بڵێ: کیژی خۆم کردە ژنی تۆ. هەم لە جیاتی (زَوَّجْتُكَ بِنْتِي)، بڵێ: کیژی خۆم کردە جووت لەگەڵ تۆ. جا مێردەکەش لە وەڵامدا بڵێ: قبوڵم کرد کیژی تۆ بە ژن بۆ خۆم، بە جووت لەگەڵ خۆم. جا ئەگەر یەکێك لەم دوو وشەیەی قورئان-بە عەرەبی، یان بە زمانێکیتر- نەگوترێ، ئەوە مارەبڕینەکە دانامەزرێ، وەك ئەو مارەبڕینانەی لە دادگا (علمانی)یەکانی ئەم سەردەمەدا دەکرێن.

**لەبارەی ماف ئافرەتانیش: پێغەمبەرﷺ ئافرەتەکانی بە ئەمانەت داناون، کەوابوو: دەبێ زۆر ئاگامان لێیان بێ‌و مافیان نەفەوتێنین‌و ستەمیان لێنەکەین، پێغەمبەرﷺ لەبارەی ماف ئافرەتان دەمانترسێنێ‌و فەرمویەتی:** ﴿اَللَّهُمَّ إِنِّي أُحَرِّجُ حَقَّ الضَّعِيفَيْنِ: اَلْيَتِيمِ وَالْمَرْأَةِ﴾ رواه الامام احمد والنسائي باسناد حسن جيد، **خودایە من ئەو کەسە تاوانبار دەکەم کە ماف ئەم دوو بێهێزانە دەفەوتێنێ: ماف یەتیم‌و ماف ئافرەت.**

**بەڵام لە هەمان کاتیشدا پێغەمبەرﷺ لە ئاژاوەی ئافرەتان دەمانترسێنێ و فەرموویەتی:** ﴿ما تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً هِيَ أَضَرَّ عَلَى الرِّجالِ مِنَ النِّـــساءِ﴾ رواه مسلم، **لە دوای خۆم هیچ فیتنەو ئاژاوەیەکم نەهێشتۆتەوە کە لە ئافرەتان زیانی زیاتر بێ لە سەر پیاوان.**

**هەم پێغەمبەرﷺ فەر موویەتی:** ﴿فَاتَّقُوا الدُّنْيا وَاتَّقُوا النِّساءَ فَإِنَّ أَوَّلَ فِتْنَةِ بَنِي إِسْرائِيلَ كانَتْ فِي النِّساءِ﴾ رواه مسلم، **لە دونیا بترسن‌و لە ئافرەتانیش بترسن، چونکە یەکەم گوناهو ئاژاوەی (بَنِي‌إِسْرائِيل) لە ئافرەتانەوە دەستی پێکرد.**

**ئیتر ئەم سێ حەدیسانە بەڵگەنە: کە ئافرەت ئەمانەتێکە لە لای پیاوان، پیاوەکان لێیان بەر پرسیارن، ئەگەر ئەم ئەمانەتە نەپارێزن، ئافرەت بەرەڵڵا دەبێ، ئاژاوەو کوشتن‌و گوناهکاری‌و بێناموسی گشتی لە بەرەڵڵایی ئافرەت ڕوو دەداو (بَنِي‌إِسْرائِيل)ش بە هۆی بەرەڵڵایی ئافرەت ماڵیان وێران بوو، خوا بمانپارێزێ.** (شرح صحيح مسلم) ب(٥) ل(٣١١)، ب(١٠) ل(١٦٥) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٧) ل(٢٢٠–٢٢١).

**چوارەم: کەینێ گوێڕایەڵی کاربەدەست واجب دبێ؟ پێغەمبەرﷺ لە وتارەکەیدا فەرمووی:** ﴿**ئەگەر قولە ڕەشێکی لووت بڕاویش بکرێتە سەرکردەتان، ئێوە گوێڕایەڵی بن، بەو مەرجەی بەگوێرەی قورئان ئێوە بەرێوە ببا**﴾. **کەواتە: ئەگەر کاربەدەست ڕەفتاری بە قورئان نەدەکرد، یان فەرمانی بە گوناه دەکرد، ئەو کاتە دروست نیە گوێڕایەڵی بین، ئیمامی(النواوي) لە قازی (عیاض) گێڕاویەتیەوە: (نابی کافر ببێتە کاربەدەستی موسوڵمانان، هەروەها ئەگەر کاربەدەست کافر ببێ، یان بانگەوازی بۆ نوێژکردن نەکا، یان بیدعەو بێشەرعی ئەنجام بدا، یان گۆڕانکاری بهێنێتە سەر بڕیارێکی شەرعی‌ئیسلام، ئەوە لەو حاڵەتانەدا لە فەرمانڕەوایی لادەچێ‌و نابی موسوڵمانان گوێڕایەڵی بن، بەڵکو واجبە: لە دژی ڕاپەڕن‌و لە کاربەدەستی لایبەن‌و یەکێکی‌دادپەروەر لە جێی دابنێن ئەگەر بۆیان بگونجێ، ئەگەر نەگونجا، ئەو کاتە واجبە: موسوڵمان کۆچ بکا بۆ شوێنێکی باش ئەگەر دەست بکەوێ.** (شرح صحيح مسلم) ب(٨) ل(٣٥) و(فتح الباري) ب(١٣) ل(١٥١–١٥٣).

**پێنجەم: سەرچاوەی ئایین، لە وتارەکەیدا پێغەمبەرﷺ ئاشکرای کرد: لە کۆمەڵگەی‌ئیسلامدا موسوڵمانان یەکسانن‌و تەنها بە خواپەرستی لە یەکتری گەورەترن، نەك بە ڕەگەزو نەتەوەو ڕەنگ، چونکە هەموویان بەندەی یەك خودان‌و**

ئوممەتی یەك پێغەمبەرن‌وﷺ لە نەتەوەی یەك باوكن –كە باب (آدَم)ە –، جا لە گوڵبژێرەكەی (دُستُور)دا ئەمەیان درێژتر ڕون كراوەتەوە، والحمد لله تعالى.

هەروەها پێغەمبەرﷺ پێی ڕاگەیاندین: سەرچاوەی ئایین‌و ژیانی ئابوری‌و ڕامیاری‌و... هتد، گشتی قورئانی پیرۆزو فەرمودەكانی‌پێغەمبەرەﷺ، بە دەست پێوەگرتنی ئەم دوو سەرچاوەیە موسوڵمانان‌و خەڵكی‌تریش بەختەوەر دەبن‌و لە گومڕایی ڕزگاریان دەبێ، ئێستا وا بە چاوی‌خۆمان دەبینین موسوڵمانان هەر لە ئاژاوەو گێچەڵدا دەژیێن! هۆیەكەشی پشت تێكردنی قورئان‌و حەدیسەو دەست پێوەگرتنی یاسای دەستكردە.

جا پێغەمبەرﷺ ئێمەی لە پشت تێكردنی قورئان‌و حەدیس ئاگادار كردۆتەوەو فەرموویەتی: ﴿لَتُنْتَقَضَنَّ عُرَى الْإِسْلامِ عُرْوَةً عُرْوَةً، فَكُلَّما اِنْتَقَضَتْ عُرْوَةٌ تَشَبَّثَ النَّاسُ بِالَّتِي تَلِيهَا، أَوَّلُهُنَّ نَقْضاً اَلْحُكْمُ وَآخِرُهُنَّ الصَّلاَةُ﴾حديث صحيح رواه الإمام أحمد والطبراني والحاكم، **دەستپێوەگرەكانی ئیسلام یەك بە دوای‌یەكدا هەڵدەوەشێنەوە، هەر دەستپێوەگرێك هەڵدەوەشێتەوە، خەڵكەكە دەست بە دەستپێوەگری دواوەترەوە دەگرن، یەكەم دەستپێوەگری‌ئیسلام كە هەڵدەوەشێتەوە: فەرمانڕەوایی و دادكردنە –واتە: ڕەفتار بە شەریعەتی‌ئیسلام ناكرێ كە سەرچاوەكەی لە قورئان‌و حەدیسەوەیە– دوایین دەستپێوەگریش نوێژكردنە، واتە: خەڵكی نوێژنەكەر زۆر دەبێ.** (فیض القدیر) ب(٥) ل(٣٣٥) و(سیرة الصلابي) ب(٢) ل(٦٧٣-٦٧٤).

**شەشەم: نوێژی جومعە لە چۆڵ‌و بیاباندا دروست نابێ، پێغەمبەرﷺ لە (عَرَفات)دا لە دوای وتارەكەی، یەكسەر نوێژەكانی نیوەڕۆو عەسری بە (قَصْر)و (جَمْع)كردن.**

**واتە: ڕۆژی وەستانی پێغەمبەرﷺ لە (عَرَفات)، ڕۆژی جومعە بوو، دانیشتووانی (مَكَّة)شی لەگەڵدا بون، بەڵام نوێژی‌جومعەی نەكرد؟ چونكە (عَرَفات) شوێنی نیشتەجێبوون نەبو، كەوابوو: نوێژی جومعە لە چۆڵ‌و بیاباندا دروست نابێ.**

جگە لەمەش: پێغەمبەرﷺ بەخۆی لە بیست‌و حەفت غەزادا بەشداری كردوەو زۆریشی لە ڕۆژی جومعەدا بون، بەڵام پێغەمبەرﷺ هەر نوێژی نیوەڕۆی دەكرد، (جُمُعَة)ی نەدەكرد، چونكە شوێنی غەزایەكان ئاوەدانی نەبو، بۆیێ زانایانی‌ئایینی فەرموویانە: **(لَمْ تُقَمِ الْجُمُعَةُ فِی عَصْرِ النَّبِيِّﷺ وَالْخُلَفاءِ الرَّاشِدِينَ إلاَّ فِی مَواضِعِ الْإقَامَةِ) لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ‌و هەر چوار خەلیفەكاندا نوێژی جومعە تەنها لە شوێنەكانی نیشتەجێبووندا كراوە.** واتە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفاءِ الرَّاشِدِينَ...﴾الحديث رواه أبوداود والترمذي وقال: حسن صحيح، **ئێوە دەست بگرن بە ڕێبازی من‌و ڕێبازی هەرچوار خەلیفەكانی دوای من.**

كەوابوو: جومعە كردن لە چۆڵ‌و بیاباندا پیسترین (بِدْعَة)یەو پیشەی گومڕابووەكانی (بِدْعَة)كارە؟ چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنا فَهُوَ رَدٌّ﴾

رواه الشيخان واللفظ لمسلم، هەر کەسێك کردەوەیەکی ئایینی بکا: کە بڕیاری ئێمەی لە سەر نەبێ، ئەوە بە سەریدا ڕەد ئەکرێتەوەو لێی‌وەرناگیرێ.

جا لێرەدا ئیمام (مالك)و ئیمام (أَبُويُوسُف) بووە کێشەیان: ئیمام (أَبُويُوسُف) فەرمووی: ئەم نوێژە دوو ڕەکعەتیەی پێغەمبەرﷺ لە (عَرَفَات) کردی، نیوەڕۆی کورتکراوە نەبو، بەڵکو نوێژی‌جومعە بوو، چونکە لە پێش نوێژەکەدا پێغەمبەرﷺ وتاری داوە.

ئیمام (مالك) فەرمووی: تۆ بە هەڵەدا چوی؟ چونکە ئەگەر شەممەش بوایە، پێغەمبەرﷺ ئەم وتارەی بۆ حاجیەکان دەدا، کەوابوو: وتارەکە وتاری جومعە نەبو، بەڵکو وتاری (عَرَفَات) بوو، نوێژەکەش نوێژی جومعە نەبو، بەڵکو نیوەڕۆی کورتکراوە بوو، بەڵگەش ئەمەیە: پێغەمبەرﷺ بە نهێنی (فاتِحَة)و سورەتی دوای (فاتِحَة)ی خوێندن. واتە: ئەگەر نوێژی جومعە بوایە، (فاتِحَة)و سورەتەکەی بە ئاشکرایی دەخوێندن، جا بەم بەڵگەیە ئیمام (مالك) لە ئیمام (أَبُويُوسُف)ی بردەوە. (شرح المحلى على المنهاج) ب(١) ل(٢٧٢) و(حاشية الشرواني على التحفة) ب(٢) ل(٤٢٤) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٣٧٣).

## ﴿ کۆکردنەوەی نوێژ لە (عَرَفَات) ﴾

جا ئەوەش بزانە: (جَمْع)=کۆکردنەوەی نیوەڕۆو عەسر لە (عَرَفَات)، بە هۆی سەفەر بوو، چونکە پێغەمبەرﷺ ماوەی دە ڕۆژان خەریکی حەج بوو، هەروەك لە سەرەتای باسەکەدا ڕوونمان کردەوە، بەڵام لە هیچ شوێنێکدا چوار ڕۆژی تەواو نەماوەتەوە، هەروەك لە (کورتەی حەجی پێغەمبەرﷺ)دا ڕوونمان کردەوە. کەواتە: ئەگەر ڕێبوار نیەتی مانەوەی کەمتر لە چوار ڕۆژانی هەبێ –جگە لە ڕۆژانی هاتن‌و چون– ئەوە سەفەرەکەی نابچڕێ، بەڵام ئەگەر نیەتی مانەوەی چوار ڕۆژانی هەبێ، ئەو کاتە سەفەرەکەی دەبچڕێ‌و (قَصْر)و (جَمْع)ی بۆ دروست نیە، ئەمە مەزهەبی ئیمامی (الشافعی)و کۆمەڵە زۆرەکەی زانایانی‌ئاپینی‌یە، بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی(الحَنَفي)و بە فەرموودەی هەندێك لە زانایانی مەزهەبی(الشافعی) کۆکردنەوی دوو نوێژەکەی (عَرَفَات) –نەك کورتکردنەوە– بە هۆی حەج کردنە، والله اعلم. (شرح صحيح مسلم) ب(٣) ل(٣٩٣)، ب(٥) ل(٣١٣).

**حەفتەم: پێغەمبەرﷺ لە دوای عەسر لە (عَرَفَات) ئەم ئایەتەی بۆ هاتە خوارەوە:**
﴿اَلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلامَ دِيناً﴾ المائدة: ٣، **ئەمڕۆ شەریعەتی‌ئیسلامم بۆ ئێوە تەواو کردو نیعمەتی‌خۆم بە سەر ئێوەدا تەواو کرد، ڕازی بوم ئیسلام ئایینی ئێوە بێ.**

واتە: جگە لە ئیسلام خوای‌گەورە بە هیچ ئایین‌و بەرنامەیەکی‌تر ڕازی نابێ، هەروەك خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلامِ دِيناً فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ﴾ آل عمران: ٨٥، **هەر کەسێك جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی‌تری بوێ، خوا لێی قبوڵ ناکا.**

جا لە بەر ئەوەی ئایەتی ﴿اَلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ...﴾ گەورەترین شەرەف‌و ڕێزداری

بۆ ئێمەی موسوڵمان تێدایە، جولەکەیەك بە ئیمام (عُمَر)ی گوت: ﴿ئەی ئەمیری ئیمانداران ئایەتێك لە قورئانەکەی ئێوەدا هەیە، ئێوە دەیخوێننەوە، ئەگە ئەو ئایەتە بۆ سەر ئێمەی جولەکە هاتبا، ئەو ڕۆژەمان دەکردە جەژن!. ئیمام (عُمَر) فەرمووی: کامە ئایەت؟ جولەکەکە گوتی: ئایەتی ﴿اَلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ...﴾ تا کۆتایی. جا ئیمام (عُمَر) فەرمووی: ئێمە ڕۆژو شوێنی هاتنی ئایەتەکەمان زانیوە، لە ڕۆژی جومعە پێغەمبەرﷺ لە (عَرَفات) وەستابوو، ئەو ئایەتەی بۆ هاتە خوارەوە﴾ رواه الشيخان. واتە: ڕۆژی عالفەو ڕۆژی جومعە هەردووکی جەژنی ئێمەیموسوڵمانە، چونکە ڕوکنەکانیئیسلامو شەریعەتیئیسلام لەو کاتدا تەواو بون.

ئیمامی(السُّدِّيّ) فەرموویەتی: لە دوای ئەم ئایەتە هیچیتر حەرامو حەڵاڵ نەهاتنە خوارەوە. جا کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، ئیمام (عُمَر) گریاو فەرمووی: تا ئێستا ئێمە لە ئایینەکەماندا لە زیادبووندا بوین، بەڵام هەر شتێك تەواو کرا، ناتەواو دەبێ. پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ڕاست دەکەی. فصلى الله عليه في الدنيا والآخرة. (تفسير ابن كثير) المائدة (٣) و(فتح الباري) ب(١) ل(١٤١-١٤٢).

**هەشتەم: گەورەیی ئیمامی (عَلِي)، پێغەمبەرﷺ لە وتارەکەی (غَدِيرُ خُمٍّ) دەستی ئیمام (عَلِي)ی گرتو فەرمووی:** ﴿مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَعَلِيٌّ مَوْلاهُ﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد، **هەر کەسێك من دۆستو خۆشەویستی بم، (عَلِي)ش دۆستو خۆشەویستیەتی. هەروەها پێغەمبەرﷺ بە ئیمام (عَلِي)ی فەرموو:** ﴿أَنْتَ أَخِي فِي الدُّنْيا وَالآخِرَةِ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، **ئەی (عَلِي) تۆ برای منی لە دونیاو قیامەت.**

**هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ﴿أَنا دارُ الْحِكْمَةِ-وَفِي رِوايَةٍ: أَنا مَدِينَةُ الْعِلْمِ-وَعَلِيٌّ بابُها، فَمَنْ أَرادَ الْعِلْمَ فَلْيَأْتِهِ مِنْ بابِهِ﴾ رواه الترمذي وابن عبدالبرّ وصححه الحاكم، **من شاری زانستم، (عَلِي)ش دەرگەیەتی، جا هەر کەسێك زانستی دەوێ، با لە دەرگاکەیەوە بۆی بێ. هەروەها ئیمام (عَلِي) فەرموویەتی:** ﴿إِنَّهُ لَعَهْدُ النَّبِيِّﷺ إِلَيَّ: أَلاَّ يُحِبَّنِي إِلاَّ مُؤْمِنٌ وَلاَ يُبْغِضَنِي إِلاَّ مُنافِقٌ﴾ رواه مسلم والترمذي، **فەرموودەی پێغەمبەرەو بە منی فەرموو: ئەی (عَلِي) تەنها ئیماندار تۆی خۆش دەوێو تەنها (مُنافِق) ڕقی لە تۆیە. جا زانای ڕێزداری کورد: (اَلسّيّد عَبْدُالرَّحِيم)ی مەولەوی ئاماژە بۆ ئەم حەدیسانە دەکاو دەفەرموێ:**

**فَمَنْ أَرادَ عِلْمَ كُلِّ باب * فَلْيَأْتِ خاضِعاً لِذاكَ الْباب**
**باب مَدِينَةِ الْعُلُومِ وَالْهُدَى * وَقالِعِ لِباب خَيْبَرَ الْعِدَى**
**وَلِيِّ كُلِّ مُؤْمِنٍ وَالْمُقْتَدَى * وَالْمُرْتَضَى وَالْمُجْتَبَى وَالْمُهْتَدَى**
**ماذا تُرِيدُ بَعْدَ ذا النَّصِّ الْجَلِيِّ؟ * (مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَمَوْلاهُ عَلِيٌّ)**

**هەر کەسێك زانستی گشت دەرگایەکی دەوێ، با بە ملکەچی بێتە بەر ئەو**

دەرگەی شاری زانستو هیدایەت، هەڵكەنی دەرگەی (خَيْبَر)ی دوژمنكاری، دۆستی هەموو ئیمانداریكو شوێنكەوتووی گشت ئیمانداریك، لێ‌ڕازیبووی خواو پێغەمبەرﷺ هەڵبژێردراو بۆ هاوسەریەتی حەزرەتی(فاطِمَة)، ڕێنموونیكراو بە نوریخودا، ئایا چیترت دەوێ؟ لە دوای ئەم فەرموودە ئاشكرایەی پێغەمبەرﷺ: ﴿هەر كەسێك من دۆستی بم، (عَلِي)ش دۆستیەتی﴾. (التاج الجامع للاصول) ب(١) ل(٢٦)، ب(٣) ل(٣٣٠) و(الوسيلة فى شرح الفضيلة) ل(٧٧٠).

***          ***          ***

## ﴿( سَرِيَّة )ی ( أُسامَة بن زَيْد ) رضىالله عنهما بۆ ( أُبْنَى ) لە ( شام )و نەخۆشبوونی پێغەمبەرﷺ﴾

ئەمەیان دوایین (سَرِيَّة)=ناردراوەكانی پێغەمبەرەﷺ.

لە مانگی (صَفَر) ساڵی یازدەی كۆچی، پێغەمبەرﷺ فەرمانیدا: موسوڵمانان خۆیان ئامادە بكەن بۆ غەزای (رُوم)، حەزرەتی(أُسامَة)ی كوڕی (زَيد)شی رضىالله عنهما دیاری كرد بۆ سەركردەی لەشكرەكە، ئینجا لە ڕۆژی سێیەمینی ئامادەبوونی لەشكرەكە، واتە: لە ڕۆژی چوارشەممەی كۆتایی مانگی (صَفَر) ساڵی یازدەی كۆچی، پێغەمبەرﷺ تایەو سەر ئێشە گرتی، لە ڕۆژی پێنج شەممەی یەكەمی (رَبِيعُ الأوَّل) بە دەستیخۆی ئاڵای جەنگی بۆ حەزرەتی(أسامَة) بەستو فەرمووی: ﴿بە ناویخوا لە ڕێگایخوا غەزا بكە، جەنگ لەگەڵ ئەو كەسانە بكە كە كوفر بە خوا دەكەن، بڕۆ ئەو شوێنەی باوكت لێی كوژراوە، تۆم كردە سەركردەی ئەم لەشكرە، هێرش بكە سەر خەڵكی (أُبْنَى)، لە ڕێگەشدا بە پەلە بڕۆ﴾.

جا حەزرەتی(أسامَة)ﷺ لە دەرەوەی (مَدِينَة) سەربازگەی داناو ژمارەی لەشكرەكە سێ هەزار (صَحابَة) بوو، لەوانە حەفتسەد (صَحابَة)ی (قُرَيْش) بونﷺ، گەورە پیاوانی (مُهاجِر)و (أنصار)ی لەگەڵدا بون: وەك ئیمام (أبُوبَكْر) و ئیمام (عُمَر)و حەزرەتی (أبُوعُبَيْدَة بن الْجَرَاح)و حەزرەتی(سَعْد بن أبيوَقاص)ﷺ...هتد.

جا هەندێك بە ئەمیرایەتی حەزرەتی(أسامَة)ﷺ نارازی بون؟ چونكە تەمەنی حەزرەتی (أسامَة)ﷺ هەژدە ساڵان بوو و گوتیان: پێغەمبەرﷺ ئەم منداڵە دەكاتە سەركردەی (مُهاجِر)و (أنصار)!. جا كە ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەرﷺ، زۆر توڕە بوو، بۆیێ لە ڕۆژی شەممەی دەی (رَبِيعُ الأوَّل) هاتە سەر مینبەری مزگەوت—لە بەر نەخۆشیش بە پەڕۆكێك سەریخۆی بەستبوو— جا فەرمووی: ﴿ئەوە چیيە؟ لەبارەی ئەمیرایەتی (أُسامَة) قسەیەكم لە ئێوە پێگەیشتووە، ئەگەر ئێوە ئێستا تانە لە ئەمیرایەتی (أُسامَة) دەدەن، پێشتریش تانەتان لە ئەمیرایەتی باوكی(أُسامَة) دا، سوێندم بە خوا: باوكی(أُسامَة) شیاوی ئەمیرایەتی بوو، لەو كەسانەش بوو كە لە هەموو

کەسێك لە لای من خۆشەویستترن، (أُسامَة)ش-لە دوای باوکی- شیاوی ئەمیرایەتی‌یەو لەو کەسانەیە کە لە هەموو کەسێك لە لای من خۆشەویستترن، ئامۆژگاریتان دەکەم لەگەڵ (أُسامَة) چاك بن».

جا بە هۆی ئەم فەرموودەیە بە حەزرەتی(أسامَة)ی کوڕی حەزرەتی(زَید)رضی‌الله عنهما دەگوترا: (اَلْحِبُّ ابْنِ الْحِبِّ) خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست.

ئینجا لە دوای وتارەکە، پێغەمبەرﷺ چووە ماڵەوەی‌و نەخۆشیەکەی زیاتر گران بوو و بێهێزی کرد، بۆیێ پێغەمبەرﷺ ئیمام (أبُوبَکْر)یرضی‌الله‌عنه لە لەشکرەکە جیا کردەوەو فەرمانی دا: بگەڕێتەوە تاکو لە جیاتی وی پێشنوێژی بۆ (صَحابَة)کان بکاﷺ.

جا پێغەمبەرﷺ نەخۆشیەکەی هەر گرانتر دەبوو و دەیفەرموو: لەشکری(أُسامَة) بنێرن. ئینجا لە ڕۆژی دووشەممە دوانزەی (رَبیعُ الأوّل) پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، لەو کاتیش لەشکری(أسامَة) خەریکی وەرێکەوتن بوو، جا کە هەواڵی وەفاتی پێغەمبەریانﷺ گەیشتێ، نەڕۆیشتن‌و لە سەربازگەکەدا مانەوە، ئینجا هەر لە ڕۆژی دووشەممە ئیمام (أبُوبَکْر)رضی‌الله‌عنه کرایە (خَلِیفَة)=جێنیشی پێغەمبەرﷺ.

جا لە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ زۆربەی عەرەبەکان کافر بونەوەو (مُنافِق)ەکان خۆیان وەدەرخست‌و دونیا لە موسوڵمانان بەرتەنگ بوو، بۆیێ (صَحابَة)کانرضی‌الله‌عنه داوایان لە ئیمام (عُمَر)رضی‌الله‌عنه کرد: بە ئیمام (أبُوبَکْر)رضی‌الله‌عنه بڵێ: لەشکری (أسامَة) نەنێرێ‌و بیگەڕێنێتەوە، بەڵام ئیمام (أبُوبَکْر)رضی‌الله‌عنه فەرمووی: وَاللهِ ئەو ئاڵایەی پێغەمبەرﷺ بەستویەتی هەڵیناوەشێنمەوە، ئەگەر باڵندە بمانڕفێن‌و دڕندەش لە دەرەوەی (مَدِینَة) بن‌و سەگەکان دایکەکانی ئیمانداران بە قاچیان ڕابکێشن، من لەشکری(أُسامَة) هەر دەنێرم.

جا ئەم جارەش هەندێك لەو کەسانەی وتاری پێغەمبەریانﷺ پێنەگەیشتبوو، تکایان لە ئیمام (عُمَر)رضی‌الله‌عنه کرد: بە ئیمام (أبُوبَکْر)رضی‌الله‌عنه بڵێ: یەکێکی بە تەمەنتر لە جێی (أسامَة) بکاتە ئەمیری لەشکرەکە.

جا کە ئیمام (عُمَر)رضی‌الله‌عنه ئەم داوایەی کرد، ئیمام (أبُوبَکْر)رضی‌الله‌عنه ڕیشی ئیمام (عُمَر)ی گرت‌و فەرمووی: ئەی کوڕی(الْخَطّاب) دایکت زگسوتاو بێ، چۆن-جگە لە ئەمیری پێغەمبەرﷺ- ئەمیرێکیتر دابنێم؟.

ئیتر ئیمام (أبُوبَکْر)رضی‌الله‌عنه لە یەکی مانگی (رَبیع ألآخر)ی ساڵی یازدەی کۆچی لەشکرەکەی وەرێکردو بەخۆیشی ڕێگەی سەعاتێك بۆ خواحافیزی لەگەڵیان چووە دەرەوەی (مَدِینَة)و لە ڕێگەدا بە پیادەیی لە تەنیشت حەزرەتی(أسامَة)رضی‌الله‌عنه دەڕۆیشت، حەزرەتی (أسامَة)شرضی‌الله‌عنه بە سواری دەڕۆیشت، جا هەر چەند

حەزرەتی(أسامَة)ﷺ هەوڵی دا: داببەزێو ئەویش بە پیادەیی بڕوا، ئیمام (أبُوبَکْر)ﷺ فەرمووی: وَاللهِ نابێ دابـبەزی، جا ئیمام (أبُوبَکْر)ﷺ تکای لە حەزرەتی(أسامَة) کرد: ئیمام (عُمَر)ﷺ ئیزن بدا بگەڕێتەوە؟ تاکو لە (مَدِینَة) یارمەتی بدا. جا حەزرەتی(أسامَة)ش ﷺ ئیمام (عُمَر)ی ئیزن دا، بۆیێ کە ئیمام (عُمَر)ﷺ چاوی بە حەزرەتی(أسامَة) دەکەوت، دەیفەرموو: (اَلسَّلامُ عَلَيْكَ أيُّها الأمِيرُ).

ئینجا حەزرەتی(أسامَة)ﷺ بیست شەو ڕۆیشتو گەیشتە (أُبْنَی)و لەوێ لەگەڵ کافرەکان ڕووبەڕووی یەکتری بونەوەو زۆریان لە کافرەکان کوشتنو زۆریشیان لێ بە دیل گرتن، جا دڵخۆشی لەوەدا بوو: لەم غەزایەدا یەك موسوڵمانیش شەهید نەبو، حەزرەتی (أسامَة)ش ﷺ لەم غەزایەدا بکوژی باوکیخۆی بە دەستیخۆی کوشتو بە سەرکەوتوویی گەڕانەوە بۆ (مَدِینَة)، لە ڕێگەشدا بە پەلە دەڕۆیشتن، بۆیێ لەم غەزایەدا تەنها چل ڕۆژیان پێچوو، والحمدلله تعالی. (البداية والنهاية) ب(٤) ل(٨٠) و(فتح الباري) ب(٨) ل(١٩٠) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٢٩١).

## ﴿ ژمارەی شەهیدەکانیئیسلامو کوژراوەکانیکافرەکان لە جەنگەکانیپێغەمبەردا ﷺ ﴾

لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لە ماوەی دەساڵدا (٦٥) شەستو پێنج جەنگ لەگەڵ کافرەکاندا ڕوویدا: لە کۆی (٢٧) بیستو حەفت غەزا و (٣٨)سیو هەشت (سَرِيَّة)، جا ژمارەی شەهیدەکانیئیسلام لەو هەموو جەنگانەدا گەیشتە نزیکەی (٢٦٢) دووسەدو شەستو دوو شەهید، کوژراوەکانی دوژمنانیئیسلام گەیشتە دەوری (١٠٢٢) هەزارو بیستو دوو کوژراو، واتە: تێکڕای ژمارەی هەردوو لا دەگاتە: (١٢٨٤) کوژراوی جەنگ، ئەمە کۆی زیانی گیانیی موسوڵمانانو دوژمنەکانیان بوو تا وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، هەروەك دكتۆر (راغب السّرجانی) ڕوونی کردۆتەوە لە کتێبی (ماذا قدّم المسلمون للعالم) ب(٢) ل(٥٣٤) ط: ٢.

## ﴿ باسی نەخۆشبوونو وەفاتی پێغەمبەر ﷺ ﴾

لە شەوی چوارشەممەی کۆتایی مانگی (صَفَر)، ساڵی یازدەی کۆچی، پێغەمبەر ﷺ لە نیوەی شەودا بە حەزرەتی(أبُومُوَیْهِبَة)ی ﷺ فەرموو: ﴿من فەرمانم پێکراوە تکای لێخۆشبوون بۆ مردووەکانی گۆڕستانی(اَلْبَقِيع) بکەم، تۆ لەگەڵم وەرە﴾.

جا کە چونە ناو گۆڕستانەکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿اَلسَّلامُ عَلَيْكُمْ يا أَهْلَ الْمَقابِرِ﴾ سەلامتان لێبێ ئەی خەڵکیگۆڕەکان، با دڵتان خۆش بێ بەو مردنەی ئێوە تێیدانە، بە هۆی ئەو ژیانەی خەڵك تێیدایە: فیتنەو ئاژاوە وەك پارچەکانی شەوی تاریك ڕووی لە خەڵك کردوە، دواییەکەیان بە شوێن سەرتاییەکاندا دێ، دواییەکەیان لە سەرەتاییەکان خرابترە﴾.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿ئەی (أبُومُوَیْهِبَة) من کلیلەکانی گەنجینەکانی

دونیاو مانەوەم لە دونیادا دراوەتێو ئینجا چوونە بەهەشتیش، جا کراومە سەرپشك لە نێوان ئەوەیانو لە نێوان چوونە لایخوداو بەهەشت﴾.

جا حەزرەتی(أبُومُوَيْهِبَة)ﷺ گوتی: بە دایکمو باوکمەوە گیانفیدات بم، کلیلەکانی دونیاو مانەوەت لە دونیاو ئینجا بەهەشت هەڵبژێرە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿نا، وَالله من چوونە لایخواو بەهەشتم هەڵبژارد﴾.

جا پێغەمبەرﷺ تکای لێخۆشبوونی بۆ مردووەکانی گۆڕستانی (الْبَقِيع) کرد، ئینجا گەڕاوە ماڵەوەیو بۆ سبەینێ نەخۆشیی وەفاتکردنی دەستی پێکرد، سەرەتای نەخۆشیەکەی ژانە سەرێکی زۆر بەهێز بوو، حەزرەتی(عائِشَة)-رضي الله عنها- فەرموویەتی: کە پێغەمبەرﷺ لە (الْبَقِيع) گەڕاوە، سەرم دەئێشا، جا پێشوازیم لێکردو گوتم: ئای سەرم. پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: بەڵکو من–وَالله– ئای سەرم... جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿تۆ زەرەر ناکەی ئەگەر پێش من بمری، جا من سەرپەرشتیت بکەمو کفنت بکەمو نوێژت لە سەر بکەمو بتنێژم﴾.

جا پێغەمبەرﷺ نەخۆشیەکەی هەر بەهێزتر دەبوو و ڕۆژێك لە نۆبەتی حەزرەتی (مَيْمُونَة)ی هاوسەریدا-رضیالله عنها-لەهۆش چوو، جا گوتیان: لەوانەیە پێغەمبەرﷺ نەخۆشیی (ذاتُ الْجَنب)=بەرەنگی بێ، بۆیێ بێئیزنی وی دەرمانیان لە دەمی کرد، جا پێغەمبەرﷺ هاتەوە هۆشو فەرمووی: کێ وای لێکردم؟ گوتیان: (الْعَبّاس)ی مامت، چونکە مەترسی نەخۆشیی بەرەنگی لێدەکردی، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەم نەخۆشیە لە شەیتانەوەیە، خوایگەورە شەیتان بە سەر مندا زاڵ ناکا، هەر کەسێك لەم ماڵەدا بێ، دەبی ئەو دەرمانەی لە دەمی بکرێ، جگە لە (الْعَبّاس)ی مامم.

ئینجا پێغەمبەرﷺ هەر دەیفەرموو: من سبەینێ لەکوێ دەبم؟ جا بە دوای ژنەکانیدا ناردو ئیزنی لێوەرگرتن: تا لە ماڵی حەزرەتی(عائِشَة)دا رضیالله عنها نەخۆش بکەوێ و لە نۆبەتکردن بیبورن. ئەوانیش ئیزنیان دا، جا ئیمام (عَلِي)و ئیمام (الْعَبّاس)رضیالله عنهما پێغەمبەریانﷺ بە دەست گرتو ئەویش لە نێوانیادا ڕۆیشت، تا گەیشتنە ماڵی حەزرەتی(عائِشَة) رضیالله عنها، جا حەزرەتی(عائِشَة)- رضیالله عنها-(الْمُعَوِّذات)=[قُلْ هُوَاللهُ أَحَدٌ]و [قُلْ أَعوُذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ]و [قُلْ أَعوُذُ بِرَبِّ النّاسِ]ی دەخوێندنو فوی دەکردە پێغەمبەرﷺ، چونکە کە پێغەمبەرﷺ نەخۆش دەبوو ئەوهای دەکرد.

جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ئەی (عائِشَة) باوکتو کوڕەکەی بانگ بکە، تاکو بۆ (أَبُوبَكْر) وەسیتێك بنوسم، نەوەك کەسانێك خۆزگە بکەنو خوداو ئیماندارەکانیش ڕێگە نەدەنە کەسێکیتری جگە لە (أَبُوبَكْر)﴾.

جا حەزرەتی(فاطِمَة)ی کیژی پێغەمبەرشﷺ هاتو پێغەمبەرﷺ مەرحەبای لێکردو

له ڕاستەی‌خۆی داینیشاندو بە نهێنی قسەیەکی لەگەڵ کرد، حەزرەتی(فاطِمَة)ش-رضي الله عنها- گریا، ئینجا قسەیەکی‌تری بە نهێنی لەگەڵ کرد، ئەم جارە حەزرەتی(فاطِمَة)-رضي الله عنها- پێکەنی، جا حەزرەتی(عائِشَة)-رضي الله عنها- لێی پرسی چی پێ‌گوتی؟ حەزرەتی (فاطِمَة)ش -رضي الله عنها-فەرمووی: نهێنی پێغەمبەرﷺ ئاشکرا ناکەم. ئینجا کە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، حەرزەتی(فاطِمَة)-رضي الله عنها- ئاشکرای کردو فەرمووی: جاری یەکەم پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿هەموو ساڵێك (جُبْرائِيل)عليه السلام یەك جار دەوری قورئانی پێ‌دەکردمەوە، بەڵام ئەم ساڵ دوو جار دەوری قورئانی پێ‌کردومەوە، وا دەزانم کاتی مردنم هاتووە، تۆش–ئەی (فاطِمَة)– یەکەم کەسی لە بنەماڵەی من بە دوامدا دێی‌و دەمری﴾. منیش گریام، جا دوو بارە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿تۆ ڕازی نابی ببیە گەورەی ئافرەتانی بەهەشت‌و گەورەی ئافرەتانی ئیمانداران=ئەم ئوممەتە؟﴾ منیش لە خۆشیان پێکەنیم.

هەروەها ڕۆژی پێنج شەممە کۆمەڵە پیاوێکی لە لا بوون‌و فەرمووی: ﴿وەرن نوسراوێکتان بۆ بنوسم تا لە دوای ئەم نووسراوە گومڕا نەبن﴾.

جا ئیمام (عُمَر)رضي الله عنه فەرمووی: پێغەمبەرﷺ بە هۆی ئێش‌و ئازار ئەو قسەیە دەکا، قورئان بەسەو پێویست بە هیچی‌تر ناکا. هەندێکی‌تریش فەرموویان: با بۆمان بنوسێ. ئیتر کە بووە کێشەکێش، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەڵسن بڕۆنە دەرەوە.

لە حەدیسێکی‌تردا هاتووە: کە کۆمەڵەکە بووە کێشەیان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ناگونجێ لە لای هیچ پێغەمبەرێك کێشە کێش بکرێ. جا گوتیان: ئەوە چیەتی؟ ئایا وەخۆی‌دا دەڵێ؟ پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: وازم لێ‌بێنن...جا فەرمووی: ﴿کافرەکان لە دورگەی عەرەب دەربکەن، ڕێزیش لە وەفدەکان بنێن وەك من ڕێزم لێ دەنان﴾.

ئینجا هەر لە ڕۆژی پێنج شەممەی هەشتی (رَبيع الأوّل) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە حەفت کوندەی ئاو، کە زاربێنیان نەکرابێتەوەو لە حەفت بیر پڕ کرابن، ئاوم بە سەردا بکەن تاکو خۆم بشۆم‌و بچمە لای خەڵکی مزگەوت‌و قسەیان بۆ بکەم.

جا لە ناو تەشتێکی گەورەیان دانا و ئاویان پێدا کرد، تا فەرمووی: بەسە بەسە. ئینجا فەرمووی: ﴿ئەی (عائِشَة)، تا ئێستاش هەست بە ئازاری خواردنە ژەهرکراوەکەی (خَيْبَر) دەکەم، ئەوە کاتی بچڕانی دەماری دڵمە بە هۆی ئەو ژەهرە﴾.

جا پێغەمبەرﷺ پەڕۆکێکی لە سەری‌خۆی بەست‌و چووە سەر مینبەری مزگەوت‌و دانیشت، پێش هەموو شتێك (حَمْد)و (شُكْر)ی خوای کرد، ئینجا دوعای ڕەحمەتی بۆ شەهیدەکانی (أحُد) کردو تکای لێخۆشبوونی بۆ لە خوا کردن....ئینجا فەرمووی:

﴿بەندەیەك خوایگەورە كردویەتیە سەرپشك: لە نێوان خۆشیی‌دونیاو لە نێوان نیعمەتی لایخۆی؟ ئەویش نیعمەتی لایخوای هەڵبژاردوە﴾.
جا ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ تێگەیشت: پێغەمبەرﷺ خودیخۆی مەبەستە، بۆیێ دەستی بە گریان كردو فەرمووی: بە خۆمانو ماڵو منداڵمان فیدای تۆ بین. پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئەی (أبُوبَكر) لە سەرخۆ بە. ئینجا پێغەمبەرﷺ لە وتارەكەیدا باسی گەورەییو ڕێزداریی ئیمام (أبُوبَكر)یﷺ كردو فەرمووی: ﴿لە هەموو كەسێك خاوەن منەتتر بە لای منەوە (أَبُوبَكْر)ە: لە هاوڕێیەتیی و لە ماڵبەخشین، ئەگەر هیچ كەسێكم كردبا دۆستیخۆم، (أَبُوبَكْر)م دەكردە دۆستیخۆم، بەڵام دۆستایەتی ئیسلام گەورەترە، هەر دەرگایەكی خەڵكی كە بۆ هاتوچۆی نوێژ لە مزگەوتدا كراونەتەوە، گشتی بگرن، تەنها دەرگای(أَبُوبَكْر) نەبێ﴾.
جا ئەمەیان دوایین وتاری پێغەمبەرﷺ بوو، هەروەها لە دوای ئەم ڕۆژەی پێنج شەممە، پێشنوێژیی مەغریبی شەوی‌جومعەی كردو هیچیتر نەیتوانی لە مزگەوت پێشنوێژی بكا، هەروەك لە (صَحِيح البخاري)دا لە (أمُّ الفَضل) گێڕدراوەتەوە، بۆیێ فەرمانی دا: ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ پێشنوێژی بۆ (صَحابَة)كانﷺ بكا.
جا حەزرەتی (عائِشَة)-رضي الله عنها-فەرمووی: (أبُوبَكر)ﷺ دڵ ناسكە، ئەگەر لە شوێنی تۆ نوێژ بكا، لە بەر گریان دەنگی ناگاتە گوێی خەڵك. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿ئێوە وەكو ئافرەتەكانی چیرۆكی یوسف پێغەمبەرنﷺ–واتە: دڵو زوبانتان لێك جیایە– دەبی (أَبُوبَكْر) پێشنوێژی بكا﴾. جا لە نوێژی عیشای شەوی‌جومعەوە ئیمام (أبُوبَكر) دەستی بە پێشنوێژی كرد، تا پێغەمبەرﷺ وەفاتی كرد، واتە: لە حەڤدە نوێژاندا پێشنوێژیی كرد، چونكە پێغەمبەرﷺ جومعەو شەممەو یەكشەممە نەیتوانی بێتە مزگەوت، لە ڕۆژی دووشەممەش لە چێشتەنگاودا وەفاتی كرد.
جا لەو سێ ڕۆژانەدا ڕۆژێكیان ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ لە مزگەوت نەبو و لە نوێژی سبەینەدا ئیمام (عُمَر)ﷺ پێشنوێژیی كرد، جا كە ئیمام (عُمَر)ﷺ (اَللهُ أكْبَر)ی نوێژدابەستنی گوت، پێغەمبەرﷺ لە ماڵەوە گوێی لێبوو، جا فەرمووی: ﴿نا، نا، نا، دەبی (أَبُوبَكْر) پێشنوێژی بكا﴾. جا نوێژەكەیان بڕیو ئیمام (عُمَر)یشﷺ لاكەوت، جا ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ هات پێشنوێژیەكەی كرد.
ڕۆژێكیتریش پێغەمبەرﷺ بۆ نوێژی نیوەڕۆ هاتە مزگەوت، ئیمام (أبُوبَكر)یشﷺ پێشنوێژیی دەكرد، جا ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ وازی لە ئیمامەتی هێناو كشاوە دواوە، جا پێغەمبەرﷺ بە دانیشتوویی پێشنوێژیەكەی تەواو كرد، ئیمام (أبُوبَكر)یشﷺ دەنگی (اَللهُ أكْبَر)ەكانی دەگەیاندە نوێژەكەرەكان. هەروەها پێغەمبەرﷺ لە نوێژێكی

سبەینەدا-بە دانیشتوویی-ڕەکعەتێکی بە جەماعەت لە پشت ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ کرد، ئینجا کە سەلامی داوە، پێغەمبەرﷺ ڕەکعەتەکەی‌تری بە تەنهایی تەواو کرد.

بەڵام ئیمامی (الترمذي) فەرموویەتی: سێ جار پێغەمبەرﷺ لە نەخۆشیی وەفاتی‌دا نوێژی بە جەماعەت لە پشت ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ کردوە.

جا لە سبەینەی ڕۆژی وەفاتی‌دا-کە دووشەممە بوو- پێغەمبەرﷺ پەردەی ژوورەکەی لادا و تەماشای (صَحابَة)کانی کرد لە پشت ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ بۆ نوێژکردن ڕیز بوینە، جا ئیمام (أبُوبَكر)ش‌ﷺ ویستی بکشێتەوەو وای‌زانی پێغەمبەرﷺ بۆ نوێـژکردن دێ، بـەڵام پێغەمبـەرﷺ ئامـاژەی بـۆ کـردن: ئێـوە نوێژەکـەتان بکـەن. جـا پەردەکـەی داخستەوەو لە کاتی چێشتەنگاودا وەفاتی‌کرد، واتـە: ئەمـەیان دوایـین چاوپێکەوتنی پێغەمبەرﷺ بوو لە مزگەوتدا.

جا کە (صَحابَة)کان چاویان بە پێغەمبەرﷺ کەوت، زۆر دڵیان خۆش بوو و وایان زانی لـە نەخۆشـیەکەی چاك بۆتـەوە، بۆیـێ ئیمـام (أبُـوبَكر)ﷺ گـەڕاوە ماڵەکـەی‌خۆی لـە (السُنح)، هەروەها ژنەکانی‌پێغەمبەریش‌ﷺ هەر یەکەیان گەڕاوە ماڵەکەی‌خۆی.

ئینجا لـە سـەرەتای چێـشتەنگاودا دیـسان نەخۆشـیەکەی تونـدو بـەهێزتر بـۆوە، بـۆیێ حەزرەتی(عائِشَة)-رضي الله عنها- سەری پێغەمبەری‌ﷺ هێنـا نـاو کۆشـی‌خۆی‌و لـە سـەر ڕانـی خۆی داینا، ناوە ناوەش ئازاری گیـان دەرچـوون دەهاتـە سـەر پێغەمبـەروﷺ بـێ‌هۆش دەبوو، جا کە دەهاتەوە هۆش خۆی، جامە ئاوێکی لە لا بوو، دەسـتی‌خۆی تـەڕ دەکـردو بە ڕووی‌خۆی‌دا دەهێنـاو دەیفـەرموو: (لاإِلَهَ إِلاَّاللهُ) بەڕاسـتی مـردن ئـازاری هەنـە، جـا دەیفەرموو: خودایە یارمەتیم بدە لە سەر ئازارەکانی مردن.

جـا حـەزرەتی(فاطِمَـة)ش-رضي الله عنها-دەیفـەرموو: هـەی هـاوار لـەو ناخۆشـیەی بـاوکم، پێغەمبـەریش‌ﷺ دەیەفـەرموو: لـەمڕۆ بـەولاوە باوکـت هـیچ ناخۆشـی‌ی‌تر نابینـێ.

جا لـەو حاڵەتـەدا پێغەمبـەرﷺ دەیفـەرموو: ﴿لەعنـەتی‌خوا لـە جولەکـەو دیانـەکان بـدا، گـۆڕی پێغەمبـەرەکانیان کردۆتـە مزگـەوت﴾. ئینجـا فـەرمووی: ﴿ئاگاتـان لـە نوێژو لە کۆیلەکانتان بێ﴾. جا هەر دووبارەی دەکردەوە تا غرەغر لە سینەی هات.

جا لەو کاتـدا حـەزرەتی(عَبْـدالرَّحمن) کـوڕی ئیمـام(أبُـوبَكر)-رضي الله عنهما- هاتـە ژوورەوەو سـیواکێکی لـە دەسـتدا بـوو، پێغەمبـەرﷺ تەماشـای سـیواکەکەی کـرد، جـا حـەزرەتی (عائِشَة)-رضي الله عنها- فەرمووی: بـۆت وەربگـرم؟ پێغەمبـەرﷺ ئامـاژەی کـرد: بـەڵێ، بـۆم وەربگرە. جا حەزرەتی(عائِشَة)-رضي الله عنها- سەری پێغەمبـەری‌ﷺ بڵنـد کـردو دایـە پـاڵ سینگی‌خۆی‌و سیواکەکەی دایـە دەسـت، جـا کـە پێغەمبـەرﷺ سـیواکەکەی خـستە نـاو دەمـی پـیرۆزی، هەسـتی کـرد سـیواکەکە ڕەقـە، بۆیـێ حـەزرەتی(عائِـشَة)-رضـي الله عنهـا-

فەرمووی: سیواکەکەت بۆ نەرم بکەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ. جا حەزرەتی (عائِشَة)-رضي الله عنها- سیواکەکەی بە ددانەکانی جوی‌و نەرمی کردو دایەوە دەستی، جا پێغەمبەرﷺ بەخۆی سیواکی پێدەکرد، جار جارەش دەستی لە ناو جامە ئاوەکە دادەناو (لا إِلَهَ إلاّ الله)ی دەگوت، ئینجا سێ جار فەرمووی: ﴿فِی الرَّفِيقِ الأَعْلَى﴾ لەگەڵ هاوڕێی شوێنی بەرزتردا دەبم. واتە: پێغەمبەران‌و ڕاستگۆیان‌و شەهیدان.

جا ڕستەی (الرَّفِيق الأَعْلَى) دوایین فەرموودەی پێغەمبەرﷺ بوو، لە دوای ئەم فەرموودەیە لە نێوان سینگ‌و چەناکەی حەزرەتی(عائِشَة)دا-رضي الله عنها-گیانی موبارەکی دەرچوو و سیواکەکەی لە دەستی بەربۆوەو دەستی کەوتە ناو جامە ئاوەکە.

حەزرەتی(عائِشَة)-رضي الله عنها- فەرموویەتی: یەکێك لە نیعمەتەکانی‌خوا بۆ من، ئەوە بوو: پێغەمبەرﷺ لە ماڵی مندا وەفاتی کرد، لە نێوان چەناکەو سینگی مندا گیانی دەرچوو، خوای‌گەورە لە کاتی وەفاتی‌دا تفی منو تفی ئەوی بە یەکەوە کۆ کردەوە– واتە: لەو کاتەی سیواکەکەی بە ددانەکانی‌خۆی بۆ نەرم کرد–جا کە پێغەمبەرﷺ گیانی دەرچوو، بۆنێکی زۆر خۆشی لێهات، بۆنی ئەوها خۆشم نەبینیوە، بەڵام نەزانینی من ئەوە بوو: کە پێغەمبەرﷺ گیانی دەرچوو، سەری ئەویم دانا سەر بالیفێك‌و لەگەڵ ژنەکان دەستم بە گریان کرد.

جا حەزرەتی(فاطِمَة)ش-رضي الله عنها- دەستی بە گریان کردو فەرمووی: ﴿يا أَبَتاه أَجابَ رَبّاً دَعاه، يا أَبَتاه مَنْ جَنَّةُ الْفِرْدَوْسِ مَأْواه، يا أَبَتاه إِلَى جِبْرِيلَ نَنْعاه﴾ هۆ باوکە وەڵامی خودایەکی داوەتەوە کە دەعوەتی کردوە، هۆ ئەو باوکەی بە هەشتی (الْفِرْدَوْس) شوێنیەتی، هۆ باوکە هەواڵی وەفاتت بۆ لای (جُبْرائِيل) دەبەین.

ئینجا کە پێغەمبەریانﷺ بە خاك سپارد، حەزرەتی (فاطِمَة)-رضي الله عنها- فەرمووی: ئەی (أَنَس) چۆن دڵتان هات گڵ بە سەر پێغەمبەرداﷺ بکەنەوە؟.

## ﴿ کاتی وەفاتکردنی پێغەمبەرﷺ ﴾

حەزرەتی(ابن عَبّاس)رضي الله عنهما فەرموویەتی: ﴿پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی دووشەممەدا لە دایك بووە، لە دووشەممەدا بووەتە پێغەمبەر، لە دووشەممەدا کۆچی کردوە بۆ (مَدِينَة)، لە دووشەممەدا چووەتە ناو شاری(مَدِينَة)، لە دووشەممەدا وەفاتی کردوە﴾. واتە: لە چێشتەنگاوێکی درەنگی نزیك نیوەڕۆ، ڕۆژی دووشەممەی دوانزەی (رَبِيع الأوَّل)ی ساڵی یازدەی کۆچی، بەرامبەر (٨)هەشتی (حزیران)ی ساڵی (٦٣٣)ی زایینی، پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، ماوەی (١٣)سێزدە ڕۆژان لە نەخۆشی وەفاتی‌دا مایەوە، کە وەفاتی کرد تەمەنی شەست‌و سێ ساڵ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە سەرو ڕیشی‌دا بیست مووی سپی نەبو، ماوەی پێغەمبەرایەتی (٢٣)بیست‌و سێ ساڵ بوو:

سێزده ساڵ له (مَكَّة)، ده ساڵیش له (مَدینة).

ئینجا كه (صَحابَة)كانﷺ هەواڵی وەفاتی پێغەمبەریانﷺ گەیشتی، سەریان لێ‌شێواو هۆشیان تێك چوو: ئیمام (عَلِي)ﷺ لە پێ كەوتو نەیتوانی هەڵسێتە پێوە، ئیمام (عُثمان)ﷺ لاڵ بوو و قسەی پێ نەدەكرا، ئیمام (عُمَر)یشﷺ شێوراو هۆشی تێك چوبوو لە مزگەوتدا وتاری دەداو دەیگوت: (پێغەمبەرﷺ نەمردوە، پێغەمبەرﷺ نامرێ تا (مُنافِق)ەكان لە ناو دەبا، پێغەمبەرﷺ وەكو حەزرەتی(مُوسَى)ﷺ چووەتە لای خواو دەگەڕێتەوە، هەر كەسێك بڵێ: پێغەمبەرﷺ مردووە، دەیكوژم).

ئیتر هەر ئەوها هەڕەشەی دەكردن تا ڕۆخەكانی دەمی كەفیان كردبوو.

بەڵام ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ هیچ نەشێوابوو، بەڵكو لە ماڵی‌خۆی لە (السُنح) بە سواری ئەسپەكەی هات دابەزی‌و فرمێسكی لە چاوەكان دەهاتنە خوارەوەو یەكسەر ڕووی كردە لاشە پیرۆزەكەی پێغەمبەرﷺ، دیتی بە بەرماڵێك داپۆشراوە، جا بەرماڵەكەی لە سەر ڕووی پێغەمبەرﷺ لاداو دەستی بە ماچكردنی پێغەمبەرﷺ كردو دەشگریاو دەیفەرموو: بە دایكم‌و باوكمەوە فیدات بم ئەی پێغەمبەری‌خوا بە زیندوویی‌و بە مردوویی پاك‌و بۆنخۆشی، وَالله خوای‌گەورە دوو مردنت لە سەر كۆ ناكاتەوە، ئەو مردنەش كە خوای‌گەورە لە سەری نوسیبوی، ئەوە مردی.

ئینجا هاتە دەرەوەو فەرمووی: هۆ (عُمَر) دانیشە. بەڵام ئیمام (عُمَر)ﷺ دانەنیشتو هەڕەشەی دەكردن. جا ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ دەستی بە وتار كرد، خەڵكەكەش وازیان لە ئیمام (عُمَر)ﷺ هێناو ڕوویان كردە لای ئیمام (أبُوبَكر)ﷺ، جا فەرمووی: خەڵكینە هەر كەسێك لە ئێوە (مُحَمَّد)یﷺ دەپەرست، ئەوە بێگومان (مُحَمَّد)ﷺ مرد، هەر كەسێكیش لە ئێوە خوای‌گەورە دەپەرستێ، ئەوە خوای‌گەورە زیندووەو نامرێ، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إلاّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللهَ شَيْئاً وَسَيَجْزِى اللهُ الشَّاكِرِينَ﴾ آل عمران: ١٤٤، (مُحَمَّد)ﷺ هەر پێغەمبەرێكە، پێش ئەویش چەندەها پێغەمبەری‌تر نەماون: یا مردون، یان كوژراون—چونكە هەر هەموویان ئادەمیزادن—جا ئەگەر (مُحَمَّد)یشﷺ بمرێ، یان بە دەستی كافرەكان بكوژرێ، ئایا ئێوە لە ئایینی ئیسلام پاشگەز دەبنەوە؟ هەر كەسێك لە ئایینی‌خۆی پاشگەز ببێتەوە، ئەوە هیچ زیانێك لە خوا نادا، بێگومان خوای‌گەورە پاداشتی شوكركاران دەداتەوە: كە لە سەر ئایینی‌خۆیان دەمێننەوە.

جا ئیمام (عُمَر)ﷺ فەرمووی: وەك بڵێی پێش ئێستا ئەو ئایەتەم هەر نەبیستبێ، ئەوجا زانیم پێغەمبەرﷺ وەفاتی كردوە، بۆیێ لە پێوە كەوتمە سەر زەوی‌و خۆم پێ

ڕانـەگیرا. جـا موسـوڵمانەکانیش ئـەم ئایەتـەیان لـە ئیمـام (أبُـوبَکْر)ﷺ وەرگرتـەوەو بەردەوام دەیانخوێندەوە.

## ﴿شۆردنی پێغەمبەرﷺ﴾

ئینجـا لـە دوای نیـوەڕۆی ڕۆژی دووشـەممە، موسـوڵمانان سـەرقاڵی (بَیْعَـة)ی ئیمـام (أبُـوبَکْر)ﷺ بـونو ئـەویان کـردە (خَلِیفَـة)=جێنیـشی پێغەمبـەرﷺ، لـە ڕۆژی سـێ شەممەش (بَیْعَة)ی گشتی وەرگیرا، ئینجا دەستیان بە کاروباری جەنازەی پێغەمبەرﷺ کرد، بەڵام بۆ شوشتنی پێغەمبەرﷺ گوتیان: نازانین وەك مردووەکانیخۆمـان ڕووتـی بکەینەوە، یان لە بەرگیخۆیـدا بیـشۆین؟ جا لـەو کـات بۆرژانێکیـان بـە سـەردا هاتو یەکێکی نەناسراو لە قوڕەنـەی ژوورەکـە پـێی گـوتن: لـە بەرگیخۆیـدا پێغەمبـەرﷺ بشۆن. جا دەستیان بە شوشتنی پێغەمبەرﷺ کردو کراسەکەشـی هـەر لەبـەردا بـوو و ئاویان پێدا دەکردو بە کراسەکەش هەڵیاندەگوشی.

ئەوانەی بەشداری شوشتنیان کرد: ئیمام (عَلِي)و ئیمـام (العَبّـاس)و هـەردوو کوڕەکـانی ئیمـام (العَبّـاس)ش: (الفَـضل)و (قُـثم)، هـەم حـەزرەتی(أسـامَة بـن زَیـد)و حـەزرەتی (صالِح)ی ئازادکراوی پێغەمبەرﷺو،ﷺ، جا لە کاتی شوشتنیشی (کوله)=پەردەیـەکیان دانابوو، لە بیری (أرِیس)ش ئاوی شۆردنیان بۆ هێنا.

## ﴿کفن کردنی پێغەمبەرﷺ﴾

ئینجا لە دوای شوشتن، کراسەکەیان لێداکەناندو لە سێ پارچە کفنی سپیدا–کـە لـە لۆکە دروست کرابـون– کفنیـان کـرد، کـراسو مێـزەر لەگـەڵ ئـەو سێ پارچە کفنـەدا نـەبون.

## ﴿ نوێژ لەسەرکردنی پێغەمبەرﷺ﴾

ئینجا لە دوای کفنکـردن، پێغەمبـەریانﷺ لـە سـەر تـەختێك دانـاو (صَحابَة)کانﷺ کۆمـەڵ کۆمـەڵ دەهـاتن بـە تـەنهایی–بـێ ئیمـام–نوێژیجـەنازەیان لـە سـەر دەکـرد، هۆیەکەشـی ئـەوە بـوو: خوایگـەورە دەفـەرموێ: خـوداو (مَلائِکَة) سـەلاوات لـە سـەر پێغەمبـەرﷺ لێـدەدەن. هـەم فـەرمانی کـردوە ئیمانـدارەکانیش سـەلاواتی لـە سـەر لێبـدەن، بـۆیێ پێویـستە هـەر کەسـەو ڕاسـتەوخۆ سـەلاواتی لـە سـەر لێبـدا، نوێـژ لـە سەرکردنیشی هەر ئەوهایە، ئەگەر نا: ئەو کات ئیمام (أبُوبَکْر)ﷺ کرابـووە (خَلِیفَـة)و ماڤ پێشنوێژیی جەنازەشی هەبوو.

هەندێ زانایتریش فەرموویانە: هۆیەکەی ئەوە بوو: تاکو نوێژ لە سـەرکردنەکەی زۆر جار دووبارە ببێتەوە. وَاللہ اعلم.

## ﴿ ناشتنی پێغەمبەرﷺ﴾

لەبارەی ناشتنی پێغەمبەرﷺ، ڕای جیاواز هەبون: هەندێك گوتیان: لە (اَلْبَقِيع)، هەندێك گوتیان: لە لای (إِبْراهِيم) پێغەمبەرﷺ، هەندێك گوتیان: لە لای مینبەرەکەی، هەندێك گوتیان: لە شوێنی نوێژکردنی.

جا ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ هاتو فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو فەرمووی: ﴿هەر پێغەمبەرێك وەفات بکا، لە شوێنی وەفاتکردنی‌دا دەنێژرێ﴾.

جا بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە: یاتاغەکەی پێغەمبەریانﷺ لاداو لە ژێر یاتاغەکە لە ژوورەکەی حەزرەتی(عائِشَة)دا-رضي الله عنها- گۆڕەکەیان بۆ هەڵکەند.

جا لەبارەی چۆنیەتی‌گۆڕەکەش، دوو ڕای جیاواز هەبون: ئایا (لَحْد)=لادڕ بێ، یان (شِق)=ناودڕ بێ، جا حەزرەتی(أَبُوطَلْحَة)ﷺ وەستای گۆڕی لادڕ بوو، حەزرەتی (أَبُو عُبَيْدَة)شﷺ وەستای گۆڕی ناودڕ بوو، جا ئیمام (عُمَر)ﷺ فەرمووی: بە دوای هەردووکیاندا بنێرن، کامەیان پێشتر هات، با ئەو گۆڕەکە هەڵبکەنێ، ئینجا فەرمووی: خودایە بۆ پێغەمبەری‌خۆتﷺ چاکترەکە هەڵبژێرە. جا حەزرەتی (أَبُوطَلْحَة)ﷺ پێشدا هاتو گۆڕێکی لادڕی هەڵکەند، جا ئیمام (عَلِي)و ئیمام (الْعَبّاس)و (الفَضل)ی کوڕیﷺ دابەزینە ناو گۆڕەکەو (شَقْران)شﷺ پارچە جلێکی لە ناو گۆڕەکە ڕاخست.

بزانە: ڕاخستنی ئەم پارچە جلە، تایبەتە بە پێغەمبەرﷺ، چونکە لاشەی پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام لە ناو گۆڕدا ناڕزێ.

ئینجا لە شەوی چوارشەممەی چواردەی (رَبِيع الأوَّل) پێغەمبەرﷺ لە لای پێ‌یەکانیەوە داندرا ناو گۆڕەکەی و گڵی بە سەردا کراوە، ئینجا کە لە کاتی گڵ بە سەرداکردنەوەدا دەنگی بێڵەکان هات، ژنەکانی‌پێغەمبەرﷺ دەستیان بە گریان کردەوەو خەڵکی ناو مزگەوتیش دەستیان بە گریان کرد، دانیشتووانی (مَدِينَة)ش یەکدەنگ هاواریان لێ‌هەڵساو شاری(مَدِينَة) بە گریانی ئەوان لەرزیەوە، کاتی حەزرەتی (بِلال)شﷺ بانگی سبەینەی دا، ئەویش گریاو زیاتر خەڵکەکە غەمبار بوو.

جا ئێستا گۆڕەکەی پێغەمبەرﷺ کەوتۆتە ناو مزگەوتی پێغەمبەرﷺ لە (مَدِينَة)، ئیمام (أَبُوبَكْر)و ئیمام (عُمَر)ش-رضي‌الله عنهما- لە ژوورەکەی گۆڕی پێغەمبەرداﷺ نێژراون، وَصَلّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَأَصْحابِهِ فِى الآخِرَةِ وَالأُولى. (البداية والنهاية) ب(٣) ل(٣٠٢-٣٥٥) و(فتح الباري) ب(٨) ل(١٦٢-١٨٩) و(السيرة الحلبية) ب(٣) ل(٤٨٤-٥١٨).

## ﴿ گوڵبژێرێك لەم گوڵزارە ﴾

**یەکەم: پیاوی لێهاتوو دەکرێتە کاربەدەست**، لەبارەی حەزرەتی(أُسامَة)ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (أُسامَة) شیاوی ئەمیرایەتی‌یەو لەو کەسانەیە کە لە هەموو کەسێك لە لای من خۆشەویستترن. بزانە: باوکی حەزرەتی(أُسامَة): ناوی (زَيْد بن حارِثَة) بوو-رضي الله عنهما-

کۆیلەیەکی ئازادکراو بوو، حەزرەتی(أُسامَة)ش‌ﷺ گەنجێکی تەمەن هەژدە ساڵان بوو، جا نە کۆیلایەتی باوکیو نە بچوکیی تەمەنی، نەبونە ڕێگر: کە پێغەمبەرﷺ حەزرەتی (أُسامَة)ﷺ بکاتە ئەمیری لەشکرێك: کە زۆرینەی پیاوماقوڵانو ڕیش سپیی (مُهاجِر)و (أنْصار)ی تێدا بون، بەڵێ: ئیمام (أبُوبَکْر)و ئیمام (عُمَر)ش-رضي الله عنهما- سەربازێکی ئەم لەشکرە بون، سُبْحانَ الله! ئەم (أُسامَة)یە چ (أُسامَة)یەکە ببێتە سەرکردەی ئەم جۆرە لەشکرە؟ یان ئەو دوو ئیمامە ڕێزدارانە چ (أبُوبَکْر)ێكو چ (عُمَر)ێکن ئەوها گوێڕایەڵی پێغەمبەرﷺ بنو ئەمیرایەتی (أُسامَة)یەکی هەژدە ساڵی قبوڵ بکەن؟ پێنووسەکەم ناتوانێ گەورەیی ئەوان ڕوون بکاتەوە! بەڵام ئەوەندە دەڵێم: بە گوێڕایەڵی بۆ خواو پێغەمبەرﷺ، (صَحابَة)کانﷺ ئەو سەرکەوتنانەیان وەدەست هێنان.

جا هەرچەند کەسانێك بە ئەمیرایەتی حەزرەتی(أُسامَة)ﷺ ناڕازی بون، بەڵام بڕیاری شەریعەتیئیسلام لە سەرەوەی بۆچوونو حەزکردنی هەموو کەسێکەو گەورەیی لە ئیسلامدا بە هۆی نەژادو خزمو کەس نیە، بەڵکو بە هۆی کردەوەی چاكو لێهاتوویی مرۆڤە بۆ ئەو کارەی پێی دەسپێردرێ، پێغەمبەریشﷺ دەیزانی حەزرەتی(أُسامَة)ﷺ شیاوی ئەمیرایەتی ئەم لەشکرەیە، بۆیێ کردیە ئەمیر، جا ئەنجامەکەش بەگوێرەی زانینو بۆچوونی پێغەمبەرﷺ بوو، حەزرەتی(أُسامَة)ﷺ لەم غەزایەدا بکوژی باوکیخۆی کوشتو هیچ (صَحابَة)یەکیش شەهید نەبونو بە سەرکەوتوویی گەڕانەوە.

بەڵێ: بە ئەمیراتی حەزرەتی(أُسامَة)ﷺ، پێغەمبەرﷺ گشت دابونەریتێکی (جاهِلیَّة)ی تێك شکاندو کردەوەی چاكو لێهاتوویی مروڤی کردە پێوەری ڕێزدارىو کاربەدەستی، بە ئاشکراییش پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ اِسْتَعْمَلَ رَجُلاً مِنْ عِصابَةٍ وَفِيهِمْ مَنْ هُوَ أَرْضَى لِلّهِ مِنْهُ، فَقَدْ خانَ الله وَرَسُولَهُ وَالْمُــؤْمِنِينَ﴾ رواه الحاكم وصححه، **هەر کەسێك پیاوێك لە کۆمەڵێك بکاتە کاربەدەست، لەو کۆمەڵەشدا لەوی شیاوتر هەبوو بۆ کاربەدەستی، بەڕاستی ئەوە خیانەتی لە خواو پێغەمبەروﷺ ئیمانداران کردوە.**

ئەمە لە لایەك، لە لایەکیتریشەوە: کە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، چەند هۆزێکی عەڕەبەکان کافر بونەوەو (مُنافِق)ەکان خۆیان ئاشکرا کرد، (صَحابَة)کانیشﷺ وایان لێهات: **وەك مەڕی باران وێکەوتوو لە شەوێکی پڕ باراندا لە کۆزێکی بچوکدا بێو ترسی دڕندەی هەبێ**،-واتە: ترسی ئەوەیان هەبوو کافرەکان هێرش بێننە سەر (مَدِينَة)- جا کە ئیمام (أبُوبَکْر)ﷺ لەشکری (أُسامَة)ی نارده ئەم غەزایە، ئەم ناردنە بووە نیعمەتێکیگەورە بۆ ئیسلامو موسوڵمانان؟ چونکە لەشکرەکە بە هەر شوێنێکدا ڕابردبا- ئەگەر مەبەستی کافر بوونەوەشیان هەبوایە- لە سەر ئیسلامەتی دەمانەوەو دەیانگوت: ئەگەر (صَحابَة)ی (مُحَمَّد)ﷺ بەهێز نەبن، چۆن دەتوانن ئەم لەشکرە زۆرە بنێرنە

جەنگی (رُوم)؟.

کەواتە: لەشکری (أُسامَة) بووە پێشاندانێکی هێزی سەربازیو جەرگی دوژمنانیئیسلامی لەت لەت کرد. فَبارَكَ اللهُ سِياسَةَ إِمامِ الشُّجْعانِ سَيِّدنا أَبِيبَكْرٍ رضي الله عنه (البداية والنهاية) ب(٤) ل(٨١) و(فيض القدير) ب(٦) ل(٧٣) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٥٠٧).

**دووەم: جەنگەکانی پێغەمبەرﷺ خوێن ڕێژیو وێرانکاری نەبون،** لە هەموو جەنگەکانی پێغەمبەرداﷺ تێکڕای ژمارەی شەهیدەکانیئیسلامو کوژراوەکانیکافرەکان: (١٢٨٤) هەزارو دووسەدو هەشتاو چوار کوژراو بون، جا لەوانە: ژمارەی شەهیدەکانیئیسلام: نزیکەی (٢٦٢) دووسەدو شەستو دوو شەهید بون، ئەوەش دەکاتە ١٪ بەرامبەر بە ژمارەی لەشکریئیسلام، هەروەها ژمارەی کوژراوەکانیکافرەکان: (١٠٢٢) هەزارو بیستو دوو کوژراو بون، ئەوەش دەکاتە ٢٪ بەرامبەر بە ژمارەی لەشکریکافرەکان، ئەوەش ڕێژەیەکی زۆرکەمە بە بەراورد لەگەڵ ئەو (٦٥) شەستو پێنج جەنگەی ڕووی داوە لە ماوەی دە ساڵی ژیانی پێغەمبەرﷺ لە (مَدِينَة)دا.

ئەوەش هەمووی بەڵگەیە: کە جەنگەکانی پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)کانرضي الله عنهم خوێن ڕێژیو وێرانکاری نەبون، بەڵکو مەبەستیان پاراستنی بانگەوازیی ئیسلام بوو، بۆیێ پێغەمبەرﷺ ئامۆژگاری سەرکردەکانی دەکردو دەیفەرموو: ﴿**ئافرەت مەکوژن، پیرو منداڵ مەکوژن، کوژراوەکان هەتك مەکەن، وێرانکاری مەکەن، ئاژەڵ مەکوژن، درەخت مەسوتێنن، پەرستگای جولەکەو دیانەکان مەڕوخێنن**﴾.

**ئا ئەمە عەدالەتیئیسلامە لە کاتی جەنگیدوژمنانیشیدا،** جا با ئاورێك لە جەنگەکانی کافرەکان بدەینەوە، تاکو لە تاوانی جەنگی ئەوان سەرمان سوڕ بمێنێ، بە تایبەتی جەنگی جیهانیی دووەم، کە کافرەکانی (أمریکا)و (بریطانیا)و (فرنسا)و (روسیا)و (صین)و (ایطالیا)و (یابان) تێیدا بەشدار بون، **بە وردی تەماشا بکە:**

دەبینی ژمارەی کوژراوەکانی ئەم جەنگە بەرامبەر بە لەشکرەکە: دەکاتە ٣٥١٪، سُبْحانَ اللهِ **لەم تاوانکارییە!!! کاکە گیان ژمارەکان درۆ ناکەن، چونکە ژمارەی لەشکرەکان: (١٥,٦٠٠,٠٠٠) پانزە ملیۆنو شەسەد هەزار سەرباز بون، ژمارەی کوژراوەکانی جەنگەکەش (٥٤,٨٠٠,٠٠٠) پەنجاو چوار ملیۆنو هەشتسەد هەزار کوژراو بون،** واتە: ژمارەی کوژراوەکان لە سێ ئەوەندەی ژمارەی سەربازەکانی لەشکرەکە زیاتر بوو، ئەمەش بە تاوانێکیگەورەی جەنگی دادەندرێ، هۆیەکەشی ئەوە بوو: هەر هەموو دەوڵەتە ناوبراوەکان زۆر بێویژدانانە هەزار تۆن تەقەمەنییان –بە فڕۆکەو تۆپ– فڕێ دەدا سەر گوندو شارەکانو خەڵکی بێتاوانو بێچەك –پیرو منداڵو ئافرەتو پیاو– بە ناهەق دەکوژران، درەختو کێڵگەو خانوو وێران دەکران.

**بۆ نمونە:** لەم جەنگەی جیهانیی دووەمدا لە (٦) ئاب (١٩٤٥)ز، کافرەکانی(أمریکا) بۆمبێکی ناوەکییان فڕێدا سەر شاری (هیروشیما)ی(یابان)، بەم بۆمبە (٨٠,٠٠٠) هەشتا هەزار کەسیان کوشتو (٧٥,٠٠٠) حەفتاو پێنج هەزار کەسیشیان بریندار کرد، جا لە دوای سێ ڕۆژیتریش بۆمبێکیتریان فڕێدا سەر شاری (ناغازاکی)ی(یابان)، ئەم جارەش (٤٠,٠٠٠) چل هەزار کەسیتریان لەم شارەدا کوشت، کوژراوەکانی ئەم دوو شارە: پیرو منداڵو ژنو پیاو بون، ئەمە جگە لە خانووی وێرانکراو و کەلوپەلی لەناوبردراو. بڕوانە (ماذا قدّم المسلمون للعالم، ط: ٢) ب(٢) ل(٥٣٢-٥٣٦) و(المنجد فی‌الأعلام، ط: ٩) ل(٧٠٥و٧٣٦).

*بەڵێ: ئەمە شارستانیەتو عەدالەتی دەوڵەتە کافرەکانی پێشکەوتوو و پیشکەوتووخوازە، ئەو دەوڵەتە کافرانەی موسوڵمانەکانی ساویلکەو ناتێگەیشتوو دەهۆڵو زوڕنایان بۆ لێدەدەنو لە هەموو ڕەوشتو دابونەریتێکدا لاسای ئەوان دەکەنەوەو شوێنیان دەکەون، ئایا ئیسلام مافی مرۆڤ، مافی ئافرەت، مافی منداڵ، مافی ژینگە، شارستانیەت... دەپارێزێ، یان کافرەکان؟ خۆت وەڵام بدەوەو بڕیار بدە.*

**سێیەم: دوعا خوێندن بە سەر نەخۆشدا، کە پێی دەگوترێ: (رُقْیَةٌ)**، واتە: لە کاتی دوعا خوێندندا دەست بە سەر نەخۆشەکەدا بهێنێو فووی لێبکا ﴿عَنْ عائِشَةَ-رضی الله عنها-: أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ کانَ إذا اشْتَکَی نَفَثَ عَلَی نَفْسِهِ بالْمُعَوِّذاتِ وَمَسَحَ عَنْهُ بِیَدِهِ، فَلَمّا اشْتَکَی وَجْعَهُ الَّذِی تُوُفِّیَ فِیهِ طَفِقْتُ أَنْفُثُ عَلَی نَفْسِهِ بالْمُعَوِّذاتِ وَأَمْسَحُ بِیَدِ النَّبِیِّﷺ عَنْهُ، رَجاءَ بَرَکَتِها﴾ رواه الشیخان، **کە پێغەمبەرﷺ شوێنێکی دەئێشا، (اَلْمَعَوِّذات)=﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾ و﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾ و﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النّاسِ﴾ی بە سەر خۆیدا دەخوێندنو فووی لە خۆی دەکردو دەستی بە سەر خۆیدا دەهێنا، جا لە نەخۆشیی وەفاتیشیدا حەزرەتی(عائِشَةَ)-رضی الله عنها- ئەم سێ سورەتانەی بە سەر پێغەمبەرداﷺ دەخوێندنو فووی لێدەکردو دەستی پێغەمبەریشیﷺ بۆ بەرەکەت بە سەر پێغەمبەرداﷺ دەهێنا.**

**جا بزانە:** مەرج نیە (رُقْیَّة)=دوعای سەر نەخۆش تەنها بە قورئانی پیرۆز بێ، بەڵکو بە دوعایەکانیتریش دروستە، چونکە کاتێ یەکێك لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ شوێنێکی دەئێشا، پێغەمبەرﷺ دەستی بە سەردا دەهێناو ئەم دوعایەی بە سەردا دەخوێند: ﴿أَذْهِبِ الْبَأْسَ رَبَّ النّاسِ وَاشْفِ أَنْتَ الشّافِی لاَ شِفاءَ إلاّ شِفاؤُكَ، شِفاءً لاَ یُغادِرُ سَقَماً﴾ رواه الشیخان، ئیتر بە (إِجْماع)ی زانایانیئیسلام: دوعا خوێندن بە سەر نەخۆشداو دەست بە سەرداهێنانیو فوو لێکردنی دروستە، بەو مەرجەی دوعایەکە: یان بە ئایەتەکانی قورئان بێ، یان بە سیفەتو ناوەکانیخوا بێ، هەم بە زمانی عەرەبی، یان بە زمانێکیتر کە واتەکەی بزانێ، هەم باوەڕی وابێ: خودی (رُقْیَّة) کار ناکا، بەڵکو خوایگەورە کار دەکا.

جا بزانە: (رُقَيَّـة) بـۆ گـشت جـۆرە نەخۆشـيەك دروسـتە، وەك: سـيحرو چـاوزارو تـا و پێوەدانی گشت خاوەن ژەهرێك، هەروەها دروستە: كرێی ئەم دوعا خوێندنەش وەربگرێ، چونكە كۆمەڵە (صَحابَة)يەكی پێغەمبەرﷺ بە لای هۆزێكی عەرەبدا ڕابردن‌و میوانداریيان نەكردن، جا گەورەی هۆزكە دوپشك پێ‌یوەداو داوای دوعایان لە (صَحابَة)كانﷺ كرد، جا یەكێك لەو كۆمەڵە (صَحابَة)یە–كەناوی (أَبُوسَعِيدالخُدْرِي)ﷺبوو– فـەرمووی: مـن دوعـای دوپشك دەزانم، بەڵام دوعای بۆ ناكەم تا كرێی دوعایەكەم نەدەنێ. جا ئەوانیش (٣٠) سی سەر مەڕیان دانێ‌و حەزرەتی(أبوسَعِيد)ﷺ سورەتی(فاتِحَة)ی بە سەردا خوێنـدو تفـی بـە سەردا كرد، گەورەكەش لە بەرەكەتی (فاتِحَة) یەكسەر چاك بۆوە، جا ئەوانیش مەڕەكانیان وەرگرتن‌و گەڕانەوە، جا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ﴿قَدْ أَصَبْتُمْ، إِقْسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ سَهْماً﴾ رواه الـشيخان، وفي رواية: ﴿إِنَّ أَحَقَّ ما أَخَذْتُمْ عَلَيْهِ أَجْراً كِتابُ اللهِ﴾ **كـارێكی باشـتان كرد، مەڕەكان بەش بكەن‌و لەگەڵ خۆتان بەشێكیش بۆ مـن دابـنێن، شیاوتر شت كە كرێی لە سەر وەربگرن: قوڕئانی خوایگەورەی.**

جا هەر ئەم حەدیسەش بەڵگەیە: دروستە كرێی فێركردنی قوڕئانیش وەربگیرێ، ئەمەیان مەزهـەبی ئیمـامی(الـشافعی)و ئیمـام (مالـك)و ئیمـام (أحمـد)و كۆمەڵـە زۆرەكـەی زانایـانی ئایینی‌یە، بەڵام ئیمامی(الحنفی) فەرموویەتی: كرێی فێركردنی قوڕئان دروسـت نیـە، بـەڵام كرێی دوعاكردن بە قوڕئان دروستە. ئیتر بۆ دوعای نەخۆشیەكان بڕوانە (كتاب الطب) لە (صحيح البخاري ومسلم)دا، بۆ ئەم باسەش بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ب(٧) ل(٨و٢٩) و(فتح الباري) ب(٤) ل(٥٧١–٥٧٨).

**چوارەم: پێغەمبەرﷺ چەند ئامـاژەیەكی بۆ (خِلافَة)ی ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ كردوە.**

١–پێغەمبەرﷺ لە نەخۆشیی وەفاتیدا بە حەزرەتی(عائِشَة)ی فـەرموو: ﴿اِدْعِـي لِـي أَبابَكْرٍ–أَباكِ–وَأَخاكِ، حَتَّى أَكْتُبَ كِتاباً، فَإِنِّي أَخافُ أَنْ يَتَمَنَّى مُتَمَنٍّ وَيَقُولَ قائِلٌ: أَنَا أَوْلَـى وَيَأْبَى اللهُ والْمُؤْمِنُونَ إِلاَّ أَبابَكْرٍ﴾ رواه الإمام أحمد والشيخان واللفظ لمسلم، **(أَبُـوبَكْر)–بـاوكـت–و برایەكـەت بـۆ مـن بـانگ بكـە، تـا نوسـراوێك بنوسـم، چـونكە مـن دەترسـم كەسـێك خۆزگـە بكـاو بڵـێ: مـن لـە (أَبُـوبَكْر) لەپێـشترم. خوایگـەورەو ئیمانـدارەكانیش قەدەغە بكەن‌و جگە لە (أَبُوبَكْر) كەسێكی‌تریان نەوێ.**

ئەم حەدیسە گەورەیی ئیمام (أَبُوبَكْر)ی تێدایە، هەم ئاماژەیە: كە ئیماندارەكان–لە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ دەكەنە جێنیشی پێغەمبەرﷺ.

ئیمام (ابن كثير) فەرموویەتی: لەوانەیە وتارەكەی پێغەمبەرﷺ لە نەخۆشـیی وەفاتیـدا لەجیاتی ئەم نوسراوە بێ. واتـە: ئـەو وتـارەی باسمـان كـرد: كـە باسـی گـەورەیی ئیمـام (أَبُوبَكْر)یﷺ تێدا كردوە.

٢–ئافرەتێـك داوای شـتێكی لـە پێغەمبـەرﷺ كـرد، جـا پێغەمبـەرﷺ فـەرمانی دایـێ:

بگەڕێتەوە لای. جا ئافرەتەکەش گوتی: ئەگەر تۆم دەست نەکەوتەوە؟-واتە: وەفاتت کردبوو- پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿فَإِنْ لَمْ تَجِدْنِي فَأْتِي أَبَابَكْرٍ﴾ رواه الشيخان، **ئەگەر منت دەست نەکەوتەوە، وەرە لای (أَبُوبَكْر)ﷺ.**

ئیمام (ابن كثير) فەرموویەتی: ئاشکرایە-والله أعلم-ئافرەتەکە ئەم قسەیەی لە نەخۆشیی وەفاتی پێغەمبەرداﷺ کردوە. کەوابوو: ئەمەش گۆتنی هەواڵێکی نادیارە کە خوای گەورە بە پێغەمبەریﷺ ڕاگەیاندوە.

٣-فەرمانی پێغەمبەرﷺ کە ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ پێشنوێژی بکاو سووربوونی لە سەر بەجێهێنانی ئەم فەرمانە، بە جۆرێك ڕەددی حەزرەتی(عائِشَة)ی داوەو فەرمووی: **﴿ئێوە ئافرەتەکانی چیرۆکی (يُوسُف)نﷺ﴾.**

هەم ڕێگای نەدا ئیمام (عُمَر)ﷺ پێشنوێژی بکا، هەروەك باسمان کرد، جا (صَحابَة)کانﷺ ئەم پێشنوێژیەیان کردە بەڵگە، واتە: چونکە پێغەمبەرﷺ بۆ کاروباریئاینی بە ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ ڕازی بووە، بۆ کاروباری دونیاش زیاتر ڕازی دەبێ.

هەم پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا: هەموو دەرگاکانی خەڵکی-کە لە مزگەوتدا کرابونەوە- دابخرێن، جگە لە دەرگاکەی ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ، ئەمەش ئاماژەیە کە دەبێتە جێنیشی پێغەمبەرﷺ بەم دەرگایەدا دێتە ناو مزگەوت بۆ پێشنوێژی کردن.

جا ئیمام (ابن كثير) لە ئیمامی(الأشْعَرِي) دەگێڕێتەوە: وەپێشخستنی ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ کارێکی زانراوە لە ئاینی ئیسلام، زانراوێکی ناچارییە، وەپێشخستنەکەی بەڵگەیە: کە ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ زاناتری (صَحابَة)کانەو لە هەموانیان زیاتر قورئانخوێنترە، لە فەرموودەیەکی پێغەمبەرداﷺ هاتووە-کە بە یەکدەنگی زانایان فەرموودەیەکی ڕاستە-: **﴿ئەو کەسە پێشنوێژی دەکا: کە لە هەموو کەسێك زیاتر لە قورئان شارەزاترە، جا ئەگەر لە قورئاندا یەکسان بون، ئەوەی لە حەدیس شارەزاترە، جا ئەگەر لە حەدیسدا یەکسان بون، ئەوەی بە تەمەنترە، ئینجا ئەوەی پێشتر موسوڵمان بووە﴾.** جا دەفەرموێ: ئەم قسەیەی ئیمامی(الأشْعَرِي) لەوانەیە: کە پێویستە بە ئاوی زێڕ بنوسرێتەوەو ئەو سیفەتانەش گشتی لە ئیمام (أَبُوبَكْر)داﷺ هاتونە جێ.

٤-گەورەیی‌و زانستی ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ لە وتارەکەی پێغەمبەرداﷺ ئاشکرا دەبێ، چونکە پێغەمبەرﷺ لە وتارەکەیدا فەرمووی: ﴿لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذاً خَلِيلاً لاتَّخَذْتُ أَبَابَكْرٍ خَلِيلاً﴾ رواه الشيخان، **ئەگەر جگە لە خودا کەسێکم کردبا دۆستی خۆم، (أَبُوبَكْر)م دەکردە دۆستی خۆم.** جگە لە فەرموودەکەی منەتباریی هاوڕێیەتی‌و ماڵبەخشین‌و هێشتەوەی دەرگاکەی لە مزگەوتدا.

جا لە وتارەکەش تەنها ئیمام (أَبُوبَكْر)ﷺ لە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ تێگەیشت، کە

فەرمووی: ﴿بەندەیەك خوایگەورە كردویەتیە سەرپشك﴾...هتد، ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ زانی ئەم بەندەیە پێغەمبەرەووﷺ كراوەتە سەرپشكو وەفات دەكا. جا ئەم وتارەی پێغەمبەرﷺ ئاماژەیە بۆ جێنیشنیی ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ بەڵكو لەوانەیە: لەجیاتی نوسراوەكەش بێ-كە لە یەكەمەكەدا باسمان كرد-هەروەك ئیمام (ابن كثیر) فەرموویەتی.

جا هەر بەو بەڵگە بەهێزانە: (صَحابَة)كانﷺ-بە تێكرایی-ئیمام (أبُوبَكْر)یانﷺ كردە جێنیشی پێغەمبەرﷺ، لە ڕۆژانی دووشەممەو سێشەممە بە تێكرایی (بَیْعَة)=پەیمانیان دایێ، جا لەگەڵ ئەو هەموو گەورەییو ڕێزداریەش ئیمام (أبُوبَكْر)ﷺ لە وتارەكەیدا فەرمووی: ﴿**من كرامە سەرپەرشتكاری ئێوە، بەڵام لە ئێوەش باشتر نیم، جا ئەگەر چاكەم كرد یارمەتیم بدەن، ئەگەر خرابەشم كرد ڕاستم بكەنەوە**﴾. (شرح صحیح مسلم ب(٧) ل(٩٧-٩٨) ب(٩) ل(٣٥١-٣٥٨) و(البدایة والنهایة) ب(٣) ل(٣٠٨و٣١٠و٣١٦) ، ب(٤) ل(٧٨-٧٩).

**پێنجەم: نابێ كافرەكان لە (حجاز)دا نیشتەجێ ببن.** پێغەمبەرﷺ لە نەخۆشیی وەفاتیدا فەرمووی: ﴿أَخْرِجُوا الْمُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ﴾ رواه الشیخان، **كافرەكان لە دورگەی عەرەب دەربكەن.** بزانە: سنووری (جَزِیرَةُ الْعَرَب)=دورگەی عەرەب: لە (جِدَّة)وە تا دەگاتە (شام)، لە (عَدَن)ی(یَمَن) تا گوندە كشتوكاڵیەكانی(عراق).

جا بۆیش پێی دەگوترێ: دورگەی عەرەب، چونكە لە پێش هاتنی ئیسلامدا عەرەبی تێدا نیشتەجێ بوینەو هەم كەوتۆتە نێوان دەریایەكان، واتە: دەریای سوورو دەریای (هِنْد)و دەریای (فارِس)و ڕووبارەكانی (دِجْلَة)و (فُرات).

جا -جگە لە ئیمامی(الحَنَفِي)- لە لای كۆمەڵە زۆرەكەی زانایان: نابێ ڕێگا بدرێ كافرەكانی جولەكەو دیانو بتپەرستو ئەوانیتریش، لە دورگەی عەرەبدا نیشتەجێ ببن، بەڵام لە لای ئیمامی(الشافِعِي) مەبەست لەو قەدەغەكردنە: تەنها خاكی (حِجاز)ە، كە (مَكَّة)و (مَدِینَة)و (اَلْیَمامَة)و ئەوشوێنانەی سەر بەوانیشە، وەك: (طائِف)و (جِدَّة)و (خَیْبَر)و (یَنْبَع)؟ چونكە ئیمام (عُمَر)ﷺ جولەكەو دیانەكانی تەنها لەو شوێنانە دەركردن، نەك لە هەموو دورگەی عەرەب، واتە: ئیمام (عُمَر)یشﷺ باشتر لە مەبەستی پێغەمبەرﷺ تێدەگا.

جا ئەمە لەبارەی نیشتەجێبوون بوو، بەڵام ئەگەر كافرەكە بۆ بازرگانی هاتبێ، ئەو كاتە دروستە: بە ئیزنی گەورەی موسوڵمانان تا ماوەی سێ ڕۆژان بێتە خاكی (حِجاز)، بەڵام لە سێ ڕۆژان زیاتر دروست نیە، هەروەها لە لای زۆربەی زۆری زانیانیئیسلام بە هیچ جۆرێك دروست نیە: هیچ جۆرە كافرێك بێتە ناو (حَرَمِ مَكَّة)، هەرچەند بەرژەوەندیشی تێدا بێ، چونكە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ﴾ التوبة: (٢٨)، **كافرەكان پیسن، نابێ لە (اَلْمَسْجِدالْحَرام)=(حَرَمِ مَكَّة) نزیك ببنەوە.** (شرح صحیح مسلم) ب(٧) ل(١٠١) و(تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ب(٩) ل(٢٨٠-٢٨٣).

**شەشەم: گۆڕ لە ناو مزگەوتدا،** پێغەمبەرﷺ لە نەخۆشیی وەفاتیدا

فەرمووی: ﴿لَعَنَ اللهُ الْيَهُودَ وَالنَّصارَى إِتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيائِهِمْ مَسَاجِدَ﴾ رواه الشيخان، **لەعنەتی خوا لە جولەکەو دیانەکان بدا گۆڕی پێغەمبەرکانیان کردۆتە مزگەوت.**

ئیمامی(النواوي) لە شەرحی ئەم حەدیسەدا فەرموویەتی: زانایان فەرموویانە: بۆیێ پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: گۆڕی خۆیو پێغەمبەرکانیتریش-عليهم الصلاةوالسلام- بکرێتە مزگەوت، لە ترسی زۆر بە گەورە زانینیو توشبوونی بێشەرعی، چونکە زۆر جار ئەم بێ شەرعی‌یە سەر دەکێشێتە لای کافربوون-نعوذ بالله- هەروەك ئوممەتەکانیڕابردوو وایان لێهات، جا لە کاتێکدا کە موسوڵمان زۆر بونو (صَحابَة)کانو (التابِعين)ﷺ پێویستییان بە گەورەکردنی مزگەوتی پێغەمبەرﷺ بوو، بە هۆی ئەم گەورەکردنە ژوورەکانی (أُمَّهات الْمُؤْمِنِين)= ژنەکانی پێغەمبەرﷺ وەگەڵ (حَرَم)ی مزگەوت دران، یەکێك لەم ژوورانەش ژوورەکەی حەزرەتی(عائِشَة) بوو-رضي‌الله عنها- کە گۆڕی پێغەمبەرﷺ ئیمام (أَبُوبَكْر)و ئیمام (عُمَر)ی رضي‌الله عنهما لە ناودا بون، جا (صَحابَة)کانو (التابعين)ﷺ دیوارێکی بازنەیی بڵندیان لە سەر گۆڕەکە دروست کرد، تاکو دیار نەبێ، نەوەك خەڵك نوێژی بۆ لا بکەنو بێشەرعی ڕوو بدا. (شرح صحيح مسلم) ب(٣) ل(١٧٧).

هەروەها (الشرواني) فەرموویەتی: مەبەست بە نوێژ بۆ لا کردن ئەوەیە: گۆڕەکە بکرێتە قیبلەی نوێژو بە گەورە دابندرێ وەك بە گەورەدانانی پەرستراوی ڕاستەقینە. (حاشية الشرواني على تحفة المحتاج) ب(٣) ل(١٥٢).

جا لەم ڕوونکردنەوەی ئیمامی(النواوي)و (الشرواني) دەرکەوت: ئەگەر خودیگۆڕەکە بکرێتە مزگەوتو وەکو قیبلە بە مەبەستی ڕێزلێنانو بە گەورە زانین نوێژی بۆ لا بکرێ، ئەوە حەرامە، بەڵکو ئەگەر بە مەبەستی پەرستن بێ، ئەو کاتە کافریش دەبێ، بەڵام ئەگەر هیچ مەبەستێك نەبێ، ئەو کاتە زیانی نیە، جیاوازی نیە گۆڕەکە: لە دەرەوەی (حَرَم)ی مزگەوت بێ، یان لە ناو ژوورێکی جیاوازدا لە ناو مزگەوت بێ –وەکو گۆڕی پێغەمبەرﷺ– هەم جیاوازیش نیە گۆڕەکە: لە ڕاستەی نوێژکەرەکە بێ، یان لە چەپەی، یان لە قیبلەی، یان لە پشتەوەی؟ چونکە بە(إِجْماع)ی (صَحابَة)و (التابِعين)ﷺ بە هۆی گەورەکردنی مزگەوتی پێغەمبەرﷺ گۆڕی پێغەمبەرﷺ هەردوو هاوڕێکانی کەوتونەتە ناو مزگەوتەکە، هەروەك ئیمامی(النواوي) ڕوونی کردەوە.

**حەفتەم: زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرﷺ**، لە باسی گەورەیی مزگەوتیپێغەمبەرﷺ ئەوەمان ڕوون کردەوە: **کە پارچە خاکەکەی گۆڕیپێغەمبەرﷺ لە (كَعْبَة) گەورەترە بە (إِجْماع)ی زانایانیئیسلام، بەڵکو لە (عَرْش)ش گەورەترە لە لای هەندێ لە زانایانیئیسلام.**

ئینجا بە (إِجْماع)ی زانیانیئیسلام زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرﷺ سوننەتە، جا هەر کەسێك بڵێ: زیارەتی گۆڕیپێغەمبەرﷺ سوننەت نیە. ئەوە خۆی گومرایەو

خەڵكیش گومڕا دەكا، هەروەك ئیمام (ابن حجر الهیتمي) لە (تحفة المحتاج)دا فەرموویەتی، واتــە: چــونكە گۆتەكــەی دژی (إجْمــاع)ی زانایانیئیــسلامە، هــەم زیــارەتی گــۆڕی پێغەمبەریشﷺ دەچێتە ژێر ئەم فەرمانە، كە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوها فَإِنَّهَا تُذَكِّرِكُمُ الْمَوْتَ﴾ وفي رِوايَة: ﴿فَإنَّها تُذَكّرُ ٱلآخِرةَ﴾ رواه مسلم وأصحاب السنن، لەمەوپێش زیارەتی گۆڕەكانم لە ئێوە قەدەغە كردبوو، ئێستا زیارەتی گۆڕەكان بكەن، چونكە مردنو ڕۆژی قیامەتتان بە بیر دێنێتەوە.

هــەروەها پێغەمبــەرﷺ بەخۆیــشی ســەردانی گۆڕەكــانی (ٱلْبَقِيــع)ی دەكــردو ســەلامی لێدەكردنو دوعای بۆ دەكردنو دەیفەرموو: ﴿اَلسَّلامُ عَلَيْكُمْ دارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وَإنَّا إنْ شاءَ اللهُ بِكُمْ لاحِقُونَ، أَسْأَلُ اللهَ لَنا ولَكُمُ الْعَافِيَةَ﴾ رواه مسلم وأبوداود، وفيالترمذي: ﴿يَغْفِرُ اللهُ لَنا وَلَكُمْ﴾.

جا ئەی موسوڵمانیڕێزدار، كە چویە ناو مزگەوتیپێغەمبەرﷺ، بڵێ: ﴿بِسْمِ اللهِ اَلْحَمْدُ لِلّهِ وَالصّلاةُ وَالسَّلامُ عَلَى رَسُولِ اللهِ، رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي وَافْتَحْ لِي أَبْوابَ رَحْمَتِكَ﴾.

ئینجا دوو ڕەكعــەت (تَحِيَّةُالْمَسْجِد) بكــە لــە (اَلرَّوْضَــةُالْمُطَهَّرَة)دا—كــە نێـوان مینبەرەكـەو گۆڕەكەی پێغەمبەرەﷺ—چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ما بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِياضِ الْجَنَّةِ﴾ رواه الشيخان، نێوان مینبەرەكەمو ماڵەكەم—كە گۆڕەكەیی تدایە—مێرگێكە لە مێرگەكانی بەهەشت.

ئینجا ڕوو بكە گۆڕە پیرۆزەكەی پێغەمبەرووﷺ سەلامی لێبكەو بڵێ: (اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يا رَسُولَ اللهِﷺ). چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مامِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إلاَّ رَدَّ اللهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلامَ﴾ رواه أبوداود بسند صَحِيح، هەر كەسێك سەلامم لێبكا، خوای گەورە گوفتارم دەداتەوە تا وەڵامی سەلامەكەی بدەمەوە.

ئینجا بە قەد گەزێك بەرەو ڕاستە بڕۆو سەلام لە ئیمام (أَبُوبَكْر) بكەرضي الله عنه، ئینجا بـە قـەد گەزێكیتر هەر بەرەو ڕاستە بڕۆو سەلام لە ئیمام (عُمَر) بكەرضي الله عنه، چونكە ئەم دوو بەڕێزانـە بەم ڕیزە لە پشت پێغەمبەرﷺ نێژراون لە هەمان ژوورەكەی حەزرەتی(عائشَة)دا-رضي الله عنها- هەروەك باسما كرد، ئینجا بگەڕێوە شوێنەكەی یەكەمت ڕوو لە پێغەمبەرﷺ بكەو پـشتت لە قیبلە بكەو تكای شەفاعەت لە پێغەمبەرﷺ بكەو لە خوا بپاڕێوە لە گوناهەكانت خۆش ببێ، بەڵام ئاگادار بە: بە دەورەی گۆڕی پێغەمبەرداﷺ مەسوڕێوەو دەستو زگو پشتت بە دیوارو پەنجەرەكانی گۆڕەكەدا مەهێنە.

ئینجا ڕوو لە قیبلە بكەوەو تا دەتوانی دوعا بكەو بە خاتری پێغەمبەرﷺ لە خوا بپاڕێوە: لە خۆتو دایكو باوكت خۆش ببێو بەر شەفاعەتی پێغەمبەرمانﷺ بێخی.

جا لێرەدا ئیمام (ابن قُدامَة)و ئیمامی(النَّواوي)و ئیمام (ابن كثير) گێڕاویەتیانەوە: (اَلْعِتْبِي) فەرموویەتی: جارێك لـە خزمـەت گـۆڕی پێغەمبەرﷺ دانیشتبوم، عەرەبێك هاتو

گوتی: (السَّلامُ عَلَيْكَ يا رَسُولَ الله)، بیستومە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ جَاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوااللهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولَ لَوَجدُوا اللهَ تَوّاباً رَحِيماً﴾، واتە: ئەگەر ئەوانە ستەمیان لە خۆیان کرد: بە تاوانکردن جا هاتنە لای تۆ-ئەی پێغەمبەرﷺ-جا لە خوا پاڕانەوە تاکو لە گوناهیان خۆش ببێ و پێغەمبەریشﷺ بۆیان پاڕاوە، دەبینن خوایگەور تۆبەیان قبولّ دەکاو ڕەحمیان پێدەکا. ئینجا عەڕەبەکە گوتی: وا هاتمە لای تۆ-ئەی پێغەمبەرﷺ- لە خوا دەپاڕێمەوە لە گوناهم خۆش ببێ، تۆش دەکەمە تکاکار لە لای خوایگەورە. ئینجا عەڕەبەکە ئەم شیعرانەی گوتن:

يا خَيْرَ مَنْ دُفِنَتْ بِالْقاعِ أَعْظُمُهُ * فَطَابَ مِنْ طِيبِهِنَّ الْقاعُ وَالأَكَمُ
نَفْسِي الْفِداءُ لِقَبْرٍ أَنْتَ ساكِنُهُ * فِيهِ الْعَفافُ وَفِيهِ الْجُودُ وَالْكَرَمُ

زادَ غَيْرُهُمْ:

أنْتَ النَّبِيُّ الَّذِي تُرْجَى شَفَاعَتُهُ * عِنْدَ الصِّراطِ إِذا مازَلَّتِ الْقَدَمُ
وَصاحِباكَ فَلا أَنْساهُما أَبَداً * مِنِّي السَّلامُ عَلَيْكُمْ ما جَرَى الْقَلَمُ

(الْعِتْبِي) فەرموویەتی: ئینجا عەڕەبەکە ڕۆیشت، منیش خەوتمو پێغەمبەرمﷺ لە خەونمدا بینیو فەرمووی: ﴿ئەی (الْعِتْبِی) موژدە بدە عەڕەبەکە خوایگەورە لێی خۆش بوو﴾. (تفسير ابن كثير) النساء (٦٤) و(مغنى ابن قدامة) ب(٣) ل(٥٩٩-٦٠٢) و(الأذكار لِلإمام النّواوي) ل(٩٧و١٧٤) و(فقه السيرة، للبوطي) ل(٥٢٠-٥٢٤) و(روضة المحتاجين) ل(٣٧٥).

جا بزانە: زیارەتی گۆڕیپێغەمبەرﷺ لە گشت کاتێکدا سوننەتەو هیچ کاتێکی تایبەتیی بۆ دانەندراوە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لا تَجْعَلُوا قَبْرى عِيداً وَصَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّ صَلاتَكُمْ تَبْلُغُنى حَيْثُ كُنْتُمْ﴾ حديث حسن رواه أبوداود، گۆڕی من مەکەنە جەژن-واتە: وەکو جەژن لە مانگو ڕۆژێکی تایبەتدا زیارەتی گۆڕەکەم مەکەن- سەلاواتم لە سەر لێبدەن، چونکە سەلاواتی ئێوە دەگاتە من لە هەر شوێنێکدا بن.

جا تکایە: باسی گۆڕی پێغەمبەروﷺ گۆڕەکانیتر لە (گولزاری ئیسلامدا) بخوێنەوە.



دیسان تکات لێدەکەم: کە زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرت کردﷺ، دوعاش بۆ منی گوناهبار بکەو بڵێ: خودایە بۆ خاتری ئەم پێغەمبەرەﷺ لە گوناهەکانی (عبدالله هەرتەلی)و دایکو باوکی خۆش ببەو بەر شەفاعەتی پێغەمبەریانﷺ بێخەو بە بەهەشتیان شاد بکە.

***          ***          ***

## پاشکۆ: ( پێداچوونەوەو بەسەرکردنەوە )

**نەژادی پێغەمبەرﷺ:** (مُحَمَّد)ﷺ کوڕی(عبدالله) کوڕی(عَبْدُالْمُطَّلِب) کوڕی(هاشِم)...هتد.

**دایکی پێغەمبەرﷺ:** (آمِنَة) کچی (وَهَب)ی(الزُّهْرِي)

**دا پیرەکانی پێغەمبەرﷺ:** دایکیباوکی ناوی (فاطِمَة)یە، دایکیدایکی ناوی (بَرَّة)یە.

**لەدایکبوونی پێغەمبەرﷺ:** ڕۆژی دووشەممەی (١٢)دوانزەی مانگی (رَبِیع الأوَّل) ساڵی (فِیل) بەرامبەر (٢٠) بیستی مانگی(نیسان) ساڵی (٥٧١) پێنجسەد حەفتاو یەکی زایینی لە شاری(مَكَّة)دا لە دایك بوو.

**بەخێوکردنی پێغەمبەرﷺ:** پێغەمبەرﷺ هەر لە زگی دایکیدا بوو باوکی وەفاتی کرد، تەمەنی بووە شەش ساڵ دایکی وەفاتی کرد، تەمەنی بووە هەشت ساڵ باپیری وەفاتی کرد، جا (أبُوطالِب)ی مامی بەخێوی کرد، ئینجا لە تەمەنی (٢٥) بیستوپێنج ساڵیدا بۆ یەکەم جار ژنی هێنا: کە ناوی (خَدِیجَة)ی کیژی(خُوَیْلِد) بوو رضي‌الله عنها.

**بوونی بە پێغەمبەرﷺ:** کە تەمەنی بووە چل ساڵ، لە ڕۆژی دووشەممەی (١٧)حەڤدەی مانگی ڕەمەزان، بەرامبەر بە (١) یەکی (شُباط)ی ساڵی (٦١٠) شەشسەدو دەی زایینی، لە ئەشکەوتی (حِراء)ی شاری(مَكَّة)، لە لای خوا قورئانی بە (وَحْي) بۆ هاتو بووە پێغەمبەرﷺ، واتە: یەکەم جار سەرەتای سورەتی ﴿إقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ﴾ تا ﴿مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ بە (وَحْي) لە لای خواوە بۆی هات.

**(اَلإسْراء وَالْمِعْراج)=شەوڕۆیپێکردنیو سەرکەوتنی بۆ ئاسمانەکان:** لە شەوی هەینی (٢٧) بیستو حەفتی مانگی (رَجَب) ساڵی دوانزەی پێغەمبەرایەتی، لە بەشێکی شەویدا، پێغەمبەرﷺ بە گیانو جەستەوە چووە (اَلْمَسْجِدالأقْصى) لە (فَلَسْطِين)، لەوێش بەرز کراوە بۆ هەر حەفت ئاسمانەکانو لە هەمان شەودا گەڕاوە بۆ (مَكَّة)ی پیرۆز.

**کۆچکردنی بۆ (مَدِینَة):** پێغەمبەرﷺ سێزدە ساڵان لە (مَكَّة)دا پێغەمبەرایەتی کرد، ئینجا لە (٢)دووی مانگی (رَبِیع الأوَّل) ساڵی سێزدەی پێغەمبەرایەتی، بەرامبەر (٢٠) بیستی (أيلول) ساڵی (٦٢٢)شەشسەدو بیستو دووی زایینی لە (مَكَّة) کۆچی کرد بۆ (مَدِینَة)، جا لە ڕۆژی دووشەممەی (١٢) دوانزەی (رَبِیع الأوَّل) ساڵی یەکەمی کۆچی، بەرامبەر بە (٣٠)سی (أيلول)ی ساڵی (٦٢٢) شەشسەدو بیستو دووی زایینی گەیشتە (مَدِینَة)ی پیرۆز.

**وەفاتکردنی پێغەمبەرﷺ:** جا (١٠)دە ساڵیش لە (مَدِینَة) پێغەمبەرایەتیی کرد، ئینجا لە ڕۆژی دووشەممەی (١٢)دوانزەی (رَبِیع الأوَّل) ساڵی (١١)یازدەی کۆچی، بەرامبەر(٨) هەشتی (حزیران) ساڵی (٦٣٣) شەشسەدو سیو سێی زایینی لە شاری (مَدِینَة) وەفاتی کرد، واتە: (٢٣) بیستو سێ ساڵان پێغەمبەرایەتی کردوە: سێزدە ساڵ لە (مَكَّة)، دە ساڵ لە (مَدِینَة)، جا کە وەفاتی کرد تەمەنی (٦٣) شەستوسێ ساڵ بووﷺ.

**هاوسەرەکانی پێغەمبەرﷺ:** کە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، نۆ ژنی لە پاش بەجێمان: حەزرەتی(سَوْدَة)، حەزرەتی(عائِشَة)، حەزرەتی(حَفْصَة)، حەزرەتی(أُمُّ سَلَمَة)، حەزرەتی(زَيْنَب)، حەزرەتی(جُوَيْرِيَة)، حەزرەتی(أُمُّ حَبِيبَة)، حەزرەتی(صَفِيَّة)،

حەزرەتی(مَيْمُونَة)رضىالله عنهن.

هەروەها دوو ژنیتریشی هەبون، بەڵام ئەوان لە ژیانیخۆیدا وەفاتیان کرد: حەزرەتی (خَدِيجَة الْكُبْرَى)و حەزرەتی(زَيْنَب بِنْت خُزَيْمَة) رضي الله عنهما.

هەروەها حەزرەتی(رَيْحانَة)و حەزرەتی(مارِيَة الْقِبْطِيَّة)ش-رضي الله عنهما-کەنیزەی بون، جا ئەم (مارِيَة)یە دایکی (إِبْراهِيم)ی کوڕی پێغەمبەرەﷺ.

**منداڵەکانی پێغەمبەرﷺ:** سێ کوڕی هەبون: (الْقاسِم)و (عبدالله)، ئەم دووانە لە تەمەنی منداڵیدا لە (مَكَّة) وەفاتیان کرد. هەروەها (إِبْراهِيم)ش لە تەمەنی منداڵیدا لە (مَدِينَة) وەفاتی کرد.

هەم چوار کیژی هەبون (رُقَيَّة، زَيْنَب، أُمُّ كَلْثُوم، فاطِمَة)رضىالله عنهنّ ئەوانەش-جگە لە (فاطِمَة)- لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ لە (مَدِينَة) وەفاتیان کرد، (فاطِمَة)ش شەش مانگ دوای وەفاتی باوکی لە (مَدِينَة) وەفاتی کرد، جگە لە (إِبْراهِيم) هەموو منداڵەکانی لە (خَدِيجَة) بون، بەڵام (إِبْراهِيم) لە (مارِيَةالْقِبْطِيَّة) بوو، هەروەك باسمان کردﷺ.

**شیردەرەکانی پێغەمبەرﷺ** بە بەردەوامیو بە تەواوی: (حَلِيمَة السَعْدِيَّة)-رضي الله عنها-، ماوەی سێ ڕۆژانیش دایکیخۆی شیری داوەتێ، هەروەها (ثُوَيْبَة)و (عاتِكَة)ش-پێش (حَلِيمَة السَعْدِيَّة)-چەند ڕۆژێك شیریان داوەتێ .

**خوشكو برایەانی پێغەمبەرﷺ:** لە نەژاددا خوشكو برای نەبون، بەڵام لە شیردا: برا شیریەکەی ناوی (عبدالله)یە، خوشکە شیریەکانی ناویان (شَيْماء)و (أُنيسَة)یە، کە هەرسێکیان منداڵی (حَلِيمَةالسَّعْدِيَّة)نە، مێردی (حَلِيمَةالسَعْدِيَّة) ناوی (الحارِث) بوو، کە باوکە شیریی پێغەمبەرەﷺ، ئەوانە هەموویان موسوڵمان بونﷺ.

هەروەها لە لایەن (ثُوَيْبَة)ش: (مَسْرُوح)ی کوڕی(ثُوَيْبَة)و ئیمام (حَمْزَة)ی مامیخۆی برای شیری بونﷺ.

**مامەکانی پێغەمبەرﷺ:** دوانزە مامی هەبون: (اَلْحارِث، قُثَم، الزُّبَيْر، حَجْل، ضِرار، اَلْمُقَوَّم، أَبُولَهَب، الْعَبّاس، حَمْزَة، أَبُوطالِب، الْغَيْداق، عَبْدُالْكَعْبَة). جا لەوانە تەنها ئیمام (الْعَبّاس)و ئیمام (حَمْزَة) رضىالله عنهما موسوڵمان بون.

**خاڵەکانی پێغەمبەرﷺ:** یەکەم: (عُمَيْر) کوڕی (وَهَب). دووەم: (عَبْدُ يَغُوث) کوڕی (وَهَب). سێیەم: (الأَسْوَد) کوڕی (وَهَب). جا کە (الأَسْوَد)ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ، پەشتەماڵەکەیخۆی بۆ دانا سەر زەوی تا لە سەری دابنیشێ.

**پورەکانی پێغەمبەرﷺ:** ١-خوشکانیباوکی: (أُمُّ حَكِيم، عاتِكَة، بَرَّة، أَرْوَى، أُمَيْمَة، صَفِيَّة). لەوانە تەنها حەزرەتی(صَفِيَّة) موسوڵمان بووە رضىالله عنها.

٢-خوشکیدایکی: (فُرَيْعَة بِنْت وَهَب)، پێغەمبەرﷺ کەنیزەیەكو کۆیلەیەکی دانێو

فەرمووی: ئەم كۆیلەیە نەكەیە: زێرینگر، خوێنگر، سەربڕی ئاژەڵ.

**ژمارەی (صَحابَة)كان:** كە پێغەمبەرﷺ وەفاتی كرد، ژمارەی (صَحابَة)كان–ئافرەت و پیاو–(١٢٤٠٠٠) سەدو بیستو چوار هەزار (صَحابَة) بون، وەك ژمارەی پێغەمبەرانی خوا علیهم الصلاة والسلام، (نثر اللآلي) ل(١٤٩).

**(صَحابَة)كانی حەدیسگێڕەوە:** كە پێغەمبەرﷺ وەفاتی كرد، (١١٤٠٠٠) سەدو چواردە هەزار (صَحابَة)ی حەدیسگێڕەوە لە دوای بەجێمان، گشتیان گوێیان لە پێغەمبەرﷺ بووەو حەدیسەكانیان گێڕاونەوە، هەروەك ئیمام (ابن الصّلاح) لە (مقدمة علوم الحدیث) ل(١٤٩)دا فەرموویەتی.

**خزمەتكارەكانی پێغەمبەرﷺ:** حەزرەتی(أَنَس بن مالك)ﷺ ئەمەیان ماوەی دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەریﷺ كرد. حەزرەتی(عبدالله بن مَسْعُود)ﷺ ئەمەش سیواك و پێڵاوەكانی بۆ پێغەمبەرﷺ هەڵدەگرتن. حەزرەتی(مُعَيْقِبُ الرُّومِي)ﷺ، ئەمەش ئەنگوستیلەی پێغەمبەریﷺ هەڵدەگرت. حەزرەتی(عُقْبَة بن عامِر الْجُهَنِي)ﷺ، ئەمەش هێسترەكەی پێغەمبەریﷺ كورتان دەكردو ڕایدەكێشا كاتێ بە سەفەر دەچون. حەزرەتی(أَسْلَع بن شَرِيك)ﷺ، ئەمەش وشترەكەی پێغەمبەریﷺ بار دەكردو ڕێكی دەخست. حەزرەتی(بِلال الْحَبَشِي)ﷺ هەم بانگدەر بوو، هەم بەرپرسی بژێوەكانی پێغەمبەرﷺ بوو. حەزرەتی (حُنَيْن): ئەمەش ئاوی دەستنوێژگرتنی پێغەمبەریﷺ هەڵدەگرت و بەرماوەكەشی دەدا (صَحابَة)كانﷺ، ئەوانیش بۆ بەرەكەت بەرماوەكەیان دەخواردەوەو خۆیان پێ تەڕ دەكرد، هەندێ جاریش حەزرەتی(حُنَيْن) بۆ خۆی پاشەكەوتی دەكردو دەیخواردەوە. حەزرەتی (رَباح) دەرگەوانی ماڵی پێغەمبەرﷺ بوو.

**ئازادكراوەكانی پێغەمبەرﷺ:** لە پیاوان ئەم كۆیلە ئازادكراوەنە بون: حەزرەتی(زَيْد بن حارِثَة)و حەزرەتی(أَبُورافِع)و حەزرەتی(شَقْران)و حەزرەتی(رَباح)و حەزرەتی(يَسار)و حەزرەتی(سَفِينَة)و حەزرەتی(سَلْمان الْفارِسِي)و حەزرەتی(ثَوْبان)و حەزرەتی(أَنْجَشَة)و حەزرەتی(مابُور)و حەزرەتی(سَنْدَر)ﷺ.

لە ئافرەتانیش: حەزرەتی(أُمُّ أَيْمَن)و حەزرەتی (أُمَيْمَة)و حەزرەتی(سِيرِين)رضي الله عنهن.

**نوسەرەكانی پێغەمبەرﷺ:** ئیمام (أَبُوبَكْر)و ئیمام (عُمَر)و ئیمام (عُثْمان)و ئیمام (عَلِي)و حەزرەتی(أُبَيّ بن كَعْب)و حەزرەتی(زَيْد بن ثابِت)و حەزرەتی(مُعاوِيَة بن أَبِي‌سُفْيان)و حەزرەتی(خالِد بن الْعاص)و حەزرەتی(أَبان بن سَعِيد)و حەزرەتی(الْعَلاء بن الْحَضْرَمِي)و حەزرەتی(حَنْظَلَة بن الرَّبِيع)و حەزرەتی(عبدالله بن سَعْد)ﷺ، ئەوانە نوسەری (وَحْي) بون. حەزرەتی(حُذَيْفَة)ﷺ خاونی نهێنی پێغەمبەرﷺ بوو، هەم بەری دارخورمایەكانی دەنوسی. حەزرەتی(الْمُغِيرَة)و حەزرەتی(الْحُصَيْن) قەرز و مامڵەتەكانیان دەنوسی. حەزرەتی (الزُّبَيْر بن الْعَوام)و حەزرەتی(جَهْم بن الصَّلْت) ماڵی زەكاتەكانیان دەنوسی.

حـەزرەتی(عبـدالله بـن الأرْقـم)و حـەزرەتی(شُـرَحْبِيل بـن حَـسَنَة) نامـەکانی پاشـایەکانیان دەنوسی. چەند (صَحابَة)یەکیتریش جارجارە نوسینیان بۆ کردوە.

**پاسەوانەکانی پێغەمبەرﷺ:** حەزرەتی(سَعْد بـن مُعـاذ)و حـەزرەتی(مُحَمَّـد بـن مَـسْلَمَة)و حەزرەتی(الزُّبَيْر بن الْعَوام)و حەزرەتی(اَلْمُغيرَة بن شُعْبَة)و حەزرەتی(أبُو أيُّوب الأنْـصاري) حەزرەتی(بِلالُ الْحَبَشِي)و حەزرەتی(سَعْد بن أبِيوَقّاص)و حەزرەتی(ذَكْوان بن عَبْدِ قَيْس)و حەزرەتی(ابْنُ أبِی مَرْثَد)، ئینجا کە ئایەتی ﴿وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾ المائدة (٦٨)، هاتە خـوارەوە، وازی لـە پاسـەوانەکان هێنـاو پێویـستی بـە پاسـەوانەکان نـەما، واتـە: **خـوا دەتپارێزێ لە خەڵکی.**

**بەڕێوەبـەری ئـاسـایش:** ﴿عَنْ أنَسٍ قال: إنَّ قَيْسَ بن سَعْد كَانَ يَكُونُ بَيْنَ يَدَي النَّبيِّﷺ بِمَنْزِلَةِ صَاحِبِ الشُّرْطَةِ مِنَ الْأَمِيرِ﴾ رواه البخاري في الأحكام، **(قَيْس)ی کوڕی(سَعْد)** رضي‌الله عنهما **لە پلەی بەڕێوەبەری (شُرْطَة)=ئاسایش بوو، لە بەر دەستی پێغەمبەرداﷺ.**

**بەرپرسـەکان و چـاودێرەکانی بـازاڕ:** ئیمـام(عُمَـر) بەرپرسـی بـازاڕی (مَدينَـة) بـوو. حەزرەتی(سَعْد بن سَعيد)یش بەرپرسی بازاڕی (مَكَّة) بوو.

**شاعیرەکانی پێغەمبەرﷺ:** حەزرەتی(حَسّان بـن ثابِـت)و حـەزرەتی(عبـدالله بـن رَواحَـة)و حەزرەتی(كَعْب بن مالك).

**(مُؤَذِّن)= بانگدەرەکان:** حەزرەتی(بِـلال الْحَبَـشي)و حـەزرەتی(عبـدالله ابـن أُمِّ مَكْتُـوم) لـە (مَدينَة)، هەم حەزرەتی(سَعْد الْقَرَظ) لە (قُباء). هەم حەزرەتی(أبُومَحْذُورَة) لە (مَكَّة).

**قازیەکانی پێغەمبەرﷺ:** ئیمام(عَلي)و حەزرەتی(مُعاذ بن جَبَل)و حـەزرەتی(أبُـو مُوسَـى الأشْعَري) هەرسێکیان لە (يَمَن) قازی بون لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ.

**(فتوا)دەرەکان:** لـە سـەردەمی پێغەمبـەرداﷺ ئـەم بەرێزانـە (فتـوا)یـان دەدا: هەرچـوار خەلیفەکان: (أبُوبَكْر و عُمَر و عُثْمان و عَلِي)و حەزرەتی(عَبْدُالرَّحْمن بـن عَـوْف)و حـەزرەتی (أُبَيٌّ بن كَعْبٍ)و حەزرەتی(عبدالله بن مَسْعُود)و حەزرەتی(مُعاذ بن جَبَل)و حەزرەتی(عَمّار بن ياسِر)و حەزرەتی(حُذَيْفَة بن الْيَمان)و حەزرەتی(زَيْد بن ثابِت)و حەزرەتی(سَلْمان الْفارِسي)و حەزرەتی(أبُوالدَّرْداء)و حەزرەتی(أبُومُوسَىالأشْعَري).

**(حُفّاظُ الْقرآن) ئەوانـەی لـە سـەردەمی پێغەمبـەرداﷺ هـەموو قورئـانیـان لەبـەر بـوو:** حەزرەتی(أُبَيٌّ بـن كَعْـبٍ)و حـەزرەتی(مُعـاذ بـن جَبَـل)و حـەزرەتی(أبُـو يَزيـد الأنْـصاري)و حەزرەتی(أبُوالدَّرْداء)و حەزرەتی(زَيْد بن ثابِت)و ئیمام(عُثْمان)و حـەزرەتی(تَمـيمُ الـدّاري)و حەزرەتی(عُبادَة بن الصّامت)و حەزرەتی(أبُوأيُّوب الأنْصاري).

**(اَلْعَشَرَةُ الْمُبَشَّرَة)=دە (صَحابَة)کانی موژدە پێدراو بە بەهەشت:** ئیمـام (أبُـوبَكْر)و ئیمـام (عُمَر)و ئیمام (عُثْمان)و ئیمام (عَلِي)و حەزرەتی(طَلْحَة)و حەزرەتی(الزُّبَيْر)و حەزرەتی(سَعْد

بن أبِي وَقّاص)و حەزرەتی(سَعِيد بن زَيْد)و حەزرەتی(عَبْدُالرَّحْمن بن عَوْف)و حەزرەتی(أبُـو عُبَيْدَة بن الْجَرّاح)ﷺ.

**چـەك و كەرسـتەی جـەنگ:** پێغەمبـەرﷺ حـەفت زرێی هـەبون، یـەكێكیان نـاوی (ذاتُ الفُضُول) بوو، ئەمەیان بە بارمتە لە لای جولەكەیەك بوو، چونكە پێغەمبـەرﷺ سـی ڕبـە جۆی بە قەرزیسالێك لێ كڕی بوو و پارەی نەبو بیـداتێ، هـەروەها نـۆ شمـشێری هـەبون، یەكێكیان پـێی دەگوترا: (ذُوالْفَقار)، ئەمەیان شمشێرەكەی (العاص بن وائل) بوو لە غەزای (بَدْر) بووە دەستكەوتووی پێغەمبەرﷺ، ئەمـەیان شمـشێرێكی زۆر بـاش بـوو، بۆیـێ لـە (أثَر)ێكـد هـاتووە: (لا سَيْف إلاّ ذُوالْفَقار وَلا فَتـى إلاّ عَلِـيّ) جگـە لـە (ذُوالْفَقار) هـیچ شمشێرێك شمشێر نیە، جگە لە (علی)ﷺ هیچ لاوێك لاو نیە.

هەروەها لە سەر شمشێرێكیتریشی نوسرابوو: (**فِي الْجُبْنِ عَارٌ وَفِي الإقْدام مَكْرُمَةٌ * وَالْمَرْءُ بِالْجُبْنِ لا يَنْجُو مِنَ الْقَدَرِ**) لە ترساندا شەرمەزارییەو لە هەڵمەتبردندا ڕێزدارییە، مرۆڤ بە ترسان قورتار نابێ لە قەزاو قەدەر. جا ئەم شمشێرەی لە غەزای (أُحُد) دابووە دەست حەزرەتی(أبُودُجانَة)ﷺ، هەروەك باسمان كرد.

هەروەها شەش كەوانو سێ مەتاڵو دوو ڕمو دوو خودەپۆلایشی هەبون.

**ئەنگوستیلەكەی پێغەمبەرﷺ** لە زیو دروست كرابوو، لە سەری نوسرابوو: (مُحَمَّد رَسُـولُ اللّه)، هەروەك باسمان كرد.

**پەرداغی پێغەمبەرﷺ:** كە ئاوی پـێ دەخواردەوە، لە دار دروست كرابوو.

**نەعلەكانی پێغەمبەرﷺ:** لە پێستەیەكی ڕووتی بێ موو دروست كرابون.

هەروەها پێغەمبەرﷺ كلدانو كلچێوكو شانەو ئاوێنەی هەبون.

**ئاژەڵەكانی پێغەمبەرﷺ:** حەفت ئەسپی هەبون، شەش هێستری هەبون، دوو گوێدرێـژی هـەبون، سـێ وشـتری سـواریی هـەبون، سـەد سـەر مـەڕو حـەفت سـەر بزنـی هـەبون، كەڵەشێرێكی سپیشی هەبوو.

**بەجێهێشتراوەكانی پێغەمبەرﷺ:** كە پێغەمبەرﷺ وەفاتی كـرد، لـە مڵـكو مـاڵی دونیـا هیچی بەجێ نەهێـشت، جگـە لـە هێـسترە سـپیەكەیو چـەكی جـەنگیو پارچـە زەویـەك، ئەمەشی كردبووە خێر بۆ ڕێبواران، هەروەها زرێیەكەشی بە بارمتەی قەرزەكەیڕابردوو لە لای جولەكەكە بوو، واتە: پێغەمبەرﷺ بە قەرزداری وەفاتی كرد.

جـا ئـەو بەجێهێـشتراوانەش هیـچی نەبونـە مـیرات، چـونكە پێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: ﴿لاَ نُورَثُ، ما تَرَكْنا صَدَقَةٌ﴾ رواه الشيخان، **ئێمـەی پێغەمبـەران**-صلى الله عليهم اجمعين- **میراتمان لێناگیرێ، هەر شتێك لە پاش خۆمان بەجێ بێڵین خێراتە.**

ئەم پاشكۆیە لە (البداية والنهاية)و (السيرة الحلبية)و (الإصـابة في تمييـز الـصَحابَة)و (شـرح

الزرقانى على المواهب)و (نورالأبصار) وەرگیراوە...**کۆتایی**.

**يا رَبّنا لَكَ الْحَمْدُ كَما يَنْبَغِي لِجلال وَجْهِكَ ولِعَظِيمِ سُلْطانِكَ، لاَ أُحْصِي ثَناءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَما أثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ، اَلْحَمْدُ لِلّهِ حَمْداً يُوافِي نِعَمَهُ وَيُكافِىءُ مَزِيدَهُ، اَلْحَمْدُ لِلّهِ بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصّالِحاتُ، حَمْداً كَثِيراً طَيِّباً مُبَارَكاً فِيهِ مِلْءَ السَّماواتِ وَمِلْءَ الْأَرْضِ وَمِلْءَ ما بَيْنَهُما وَمِلْءَ ما شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، اَللَّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ وَبارِكْ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ كَما صَلَّيْتَ وَبارَكْتَ عَلَى سَيِّدِنا إِبْراهِيمَ وَآلِ إِبْراهِيمَ فِي الْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ وَسَلِّمْ تَسْلِيماً كَثِيراً**، خودایە بەردەوام حەمدو شوکر بۆ تۆ کە یارمەتیت دام: **(مێرگو گوڵزاری بەهار) ژیاننامەی پێغەمبەری ڕێزدارﷺ**، تەواو بکەم، (اَلْحَمْدُ لِلّه) تەواو بوو لە ماڵیخۆم لە شاری هەولێر، لە شەوی دووشەممەی (٥) پێنجی مانگی(جُمادَىالأُولَى)ی ساڵی(١٤٣١) هەزارو چوارسەدو سی‌و یەکی کۆچی، بەرامبەر (٣٠)ی (خاکەلێوە)ی ساڵی (٢٧١٠)ی کوردی‌و (١٩)ی (نیسان)ی ساڵی (٢٠١٠)ی زایینی، منیش بەندەی گوناهبارو بێ دەسەڵات: (عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی)م، خودا لە خۆم‌و دایکم‌و باوکم‌و خۆشەویستەکانم خۆش ببێ‌و بەر شەفاعەتی پێغەمبەرمانﷺ بێخی‌و بە بەهەشت شادمان بکا، آمین، **وَصَلّى اللهُ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ، سُبْحانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحانَ اللهِ الْعَظِيمِ.**

**هەولێر–کوردستان**

**(٥)ی جمادیالأولی – (١٤٣١)ی کۆچی**

**(٣٠)ی خاکە لێوە – (٢٧١٠)ی کوردی**

**(١٩)ی نیســــــان – (٢٠١٠)ی زایینی**

## ناوەڕۆکی ژیانی پێغەمبەرﷺ

## ناوەڕۆکی ژیانی پێغەمبەرﷺ

## ناوەڕۆكی ژیانی پێغەمبەرﷺ

**ئەم کتێبەی ژیانی پێغەمبەرﷺ :**

بــەهـــار بـە بـاران گـوڵان ئـەڕوێـنـێ
گــوڵـزار بە گـــوڵان باڵا ئـەنـوێـنــێ
بــەهـــار هـێـزێـکـی تـازە ئەهـێنێ
بەهـەشـتی جیهان بۆ گیان ئەنوێنێ
بــۆ دیـــن و بـۆ ژیـــن بـــۆ ئـاوەدانــی
بۆ عیلم و زانست بۆ خووی ئینسانی
بۆ بەرزکردنەوەی پایەی نیشتمان
بە عــەقڵ و عیلم و کردەوەو پەیمان
بـۆ ڕۆڵـەی گـەنجـم هـەتـا تـێبگــەن
بــۆ خـــاوەن ڕەنجـم هـەتا پـێبگـەن
پێشکەشم کردن بە بەچکەی مـەردان
بــە ڕۆڵـەی هوشیار لە گەلی کوردان